# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی سی و یەکەم

سووڕەتەکانی

(نوح) و(الجن) و(المزمل) و(المدثر) و(القيامة) و(الإنسان) و(المرسلات) و(النبأ) و(النازعات)

عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# نُوحٍ تاکو النَّازِعَاتِ

نووسینی : عەلی باپیر
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
چاپی یەکەم ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز
٩٧٨ لاپەڕە
١٧* ٢٤ سم
بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ بِاللَّهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْـده اللَّـهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضلِـلْ فَـلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إِلَـهَ إلاّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب .

أَمَّا بَعْـدُ: فإنَّ أَصْـدَقَ الحَديـث كَلامُ اللَّـه، وَخَـيْرَ الْهَـدِي هـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[١].

**خوێنـەرە بەڕێـزو خۆشـەویستەکان!**

هیـچ گومـانی تێدانیـە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - کـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دواییـن کتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هـەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی لە خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفکریـن و ڕامـان، فێرکـردن، کارپێکـردن ... هتـد، بـە باشتـرین جێگرتـن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەکـەی لـە دنیـاو دوارۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) کـە پێغـەمبـەر ﷺ هـاوەڵانی بەڕێـزی فێـردەکرد، پێـش هـەر قسـەیەکی گرنگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعـەو داخـوازییکردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتـارە، هـەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسـائي: (١١٠٤)، ابن ماجـه: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطّبـراني: (٢٤١٤) هێنـاویانەو (مسلم)یش بەشـێکی هێنـاوە.

منیــش - کــە وەك باســکردنی چاکــەی خــوا (**التحــدّث بنعمــة اللّــه**) دەیخــەمەڕوو- لــەوەتی فامــم کردۆتــەوە، خــوای بەبەزەیــی و بەخشــەر چاکــەی لەگــەڵ کــردووم و، بــە فەرمایشــتی بــەرزو بــێ وێنــەی خۆیــەوە ســەرگەرمی کــردووم و، بــەر لــە تەمــەنی بیســـت ســاڵییەوە هیدایــەتی داوم، قورئــانی بەڕێــزو پێــز لەبــەر بکــەم و، ســەرقــاڵی خوێندنــەوەی تەفســیرەکانی قورئــان و، تێوەڕامــانی ئایەتــە پــڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیــان بــم.

هــەر بۆیــەش تێکــڕای کتێــب و نامیلکــەو وتــارو دەرســەکانم، کــەم و زۆر لەبــەر ڕۆشــنایی قورئــان دابــوون، کــە دیــارە هــەر ئەمــەش شــتێکی سرووشــتییە؛ ئاخــر ئایــا ئیســلام، بێجگــە لــە قورئــان پاشــان ســوننەتی پێغــەمبــەر ﷺ، کــە ئەویــش هــەر ڕوونکردنــەوەی قورئــان و چۆنیــەتی جێبەجێکــردن و کارپێکردنیــەتی، شــتێکی دیکەیــە؟! بێگومــان نەخێــر.

ئنجــا لەمێــژ ســاڵیش بــوو، کــە بــراو خوشــکانێکی دڵســۆزی نزیــك و ئاشــنام، داوایــان لێدەکــردم کــە دەســت بکــەم بــە دانــانی تەفســیــرو لێکدانەوەیــەکی قورئــان، هــەتا لــە ڕەمــەزانی ســاڵی (١٤٢٨)دا هاتــە دڵمــەوە، کــە نــاوی خــوای لێبهێنــم و دەســت بــەو کارە گــەورەو گرنگــە بکــەم، بەڵکــو وردە وردە بەپێــی بــوارو دەرفــەت، هــەرساڵە هــەندێکی لــێ ئەنجــام بــدەم، لەگــەڵ ســەرقاڵیی زۆرو جــۆراو جۆریشــدا، هــەتا دەرفەتێــکی وام بــۆ دەڕەخســێ کــە بتوانــم خێرایــی تێــدا بکــەم و خۆمــی بــۆ یەکلایــی (**متفــرّغ**) بکەمــەوەو، خــوا پشــتیوان بــێ تــەواوی بکــەم، ئەگــەر تەمــەن بەبەریــــەوە مابێ.

ســەرچاوەی دانــانی ئــەم تەفســیرو لێکدانەوەیەشــم، وێــڕای ســەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفســیــرانەی کــە بــاون و، دەســتم پێیان گەیشــتوە، بریتیە لــە وردبوونــەوەو تێوەڕامانی خــۆم لە خــودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هــەندێکی هــەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسّــر بَعضُهُ بَعْضَــاً**)، پاشان ســوننەتی پێغــەمبــەری خوا ﷺ، چونکە پێغــەمبــەری خــــواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئـــانە، وەك خـــوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتـە: هەروەهـا زیکرمـان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تاکـو ئـەوەی بـۆ خـەڵکی نێرراوەتـە خـوار، بۆیـان ڕوون بکەیـەوە، وە بەڵـکو خۆشـیان بیـربکەنەوە.

ئومێدیشـم وایـە - بـە یارمـەتی خـوای بەخشـەر ﷻ - شایسـتەیی ئـەوەم هـەبێ تەفسـیـرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئـان پێشـکەش بە مسـوڵمانانی کوردسـتان بکەم، کـە لـە قورئـان بوەشـێتەوەو، مایـەی بەهـرەو سـوودی خوێنـەران بـێ، بەتایبـەتیش کـە زیاتـر لـە سـی (٣٠) ساڵە لەگـەڵ قورئـانی بـەرزو مـەزن و تەفسـیـرەکانی و کتێبەکانی سـوننەتدا خـەریکم و، دەیـان کتێـب و بەرهـەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بـوارەکانی زانسـتەکانی شـەریعەتدا پێشـکەش کردوون.

شـایانی باسیشـە کـە ئەو بیسـت و دوو مانگ زیندانیـی کرانەم لەلایـەن ئەمریکاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکـو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێـکی گـەورەو گرنـگ بـوو، بـۆ زیاتـر پێدا قووڵـبوونەوەی کتێبـی خـوا (تبـارك و تعالـی) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبـارەی زۆرێـك لـە ئایەتـەکانییەوە، ئـەم ڕاسـتییەش لـە مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجـلّى فـي كتـاب اللّـه تعالـى**)دا زۆر چـاك درەوشـاوەتەوە[1]، بـەڵام هـەڵبەتە ناڵـێم و هیچکەسـیش بـۆی نیە بڵـێ: کـە ئـەم تەفسـیرەی من تێروتـەواوە، چونکـە وێـڕای سـنوورداربوونی توانـاو بڕسـتم، لـە بەرانبـەر کتێبـی لـە هـەموو ڕووێکـەوە ڕەهـا (مطـلق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشمویسـتوە کـە زۆر بەمـلاولادا بچـم و بچمـە نێو هـەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیـدا پسپۆڕو

---

(١) ئـەو مەوسـووعەیە ئێسـتا چـاپ کـراوەو، کەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنـەران و، سـەرجەم هەشـت بەرگ و دەوری سـێ هـەزارو پێنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هـەوڵمـداوە بەگشـتی تێیـدا باسـی سـەرجەم لایەنـەکانی ئیسـلام بکـەم و، تاکـە سـەرچـاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەکانی سـوننەت، کـە لـە هـۆش (ذاكـرة)دا بـووون.

شـایانی باسـە ئەو مەوسـووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبـی سـەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسـانتـر سوود لێ بینـرانی .

شــارەزا نیم، یـان خوێنــەر پێویســتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبـارك وتعــالـی) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیــریی، ســەرجــەم ئـەم زنجیــرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیــرەوە کێشــاوە، خــوا بـە باشتــرین شــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صــاڵح و ســاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیــرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حــزب) - ناکەیـن، چونکـە هــەر ســوورەتێك بۆخــۆی شــتێکی ســەربەخۆیــەو، ســەرجەم ئایەتــەکانی وەك ئاڵقــەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەستن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەشــدا، دیسـان حیســاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگــەکانی دیــاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بــرا دڵسـۆزە ئێســتاش پاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشــی جــەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمــان بەردەوام بێ، هەتــا کۆتــایی ئەم تەفسیــرە ســەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکەییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هەولێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون[1]، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنن، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

---

(١) دوایی وا بەباش زانرا ناوی تەفسیرەکان لابرێن و، لە کۆتایی کۆی بەرگەکانی [تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز]دا دەیاننووسین.

شایانی باسیشـە جاری وا هەیـە بیـرۆکەو تێگەیشـتنێکی تایبەتیـی خـۆمم، دەربارەی کۆمەڵـە ئایەتێـك یـان ئایەتێك یـان ڕسـتەو بڕگـەیەکی ئایەتێـك، بۆ دروسـت دەبێ، وەك تێگەیشـتن و بۆچـوونـی خـۆم دەینووسـم، کەچـی ڕەنگـە لـە تەفسیـرەکانی دیکـەش - یەکێکیـان یـان زیـاتر - دا هەبێ، ئەویـش بەهـۆی ئەوەوەیـە کـە مـن ئەو تەفسیـرەم نەکەوتـۆتـە بەر دیـدە، یان دیـتوومـەو لەیـادم نەمـاوە.

# پێشەكی ئەم بەرگە

**الحمدلله رب العالمين وصلواته وسلامه وبركاته على سيدنا الأولين والآخرين محمد النبي الأمي المبعوث رحمة للعالمين وآله أجمعين من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم إلى يوم الدين.**

**بەڕێـــــزان!**

ئەمە بەرگی سی و یەكەمینی قورئانی بەرز و بەپێزە و، نۆ لە سووڕەتەكانی قورئانی مەزنی گرتوونە خۆی كە بریتین لە:

(نوح، الجن، المزمل، المدثر، القيامة، الإنسان، المرسلات، النبأ، النازعات).

میتۆد و بەرنامەی تەفسیركردنی ئەم نۆ سووڕەتەی ئەم بەرگەش، هەروەک هی بەرگە پێشووەكانە كە بەحەوت قۆناغ مانادەكەین و شییان دەكەینەوە. لەم بەرگەشدا وێڕای تەفسیرو لێكدانەوەی ئایەتەكانی ئەو نۆ سووڕەتە، كۆمەڵێک كورتەباسیش خراونەڕوو، بەم جۆرەی خوارێ:

**یەكەم: لەسووڕەتی (نوح) دا:**

كورتەباسێک لەبارەی بت پەرستییەوە، لەچواربڕگەدا.

**دووەم: لەسوورەتی (الجن) دا:**

١- كورتەباسێک دەربارەی جند، لەنۆ بڕگەدا.

٢- كورتەباسێک لەبارەی پەنهان (غیب) و سنووری پەی پێبردنیەوە،

**سێیەم: لەسووڕەتی (المزمل) دا:**

١- كورتەباسێک لەبارەی ئەدەبەكانی قورئانخوێندن و پێناسە و حوكم و گرنگیی پلەكان و چۆنییەتی قورئانخوێندنەوە لە دوو تەوەرەدا.

**چوارەم:** لەسووڕەتی (المدثر) دا:

**کورتەباسێک:** ئازادیی مرۆڤ لەنێوان ویستی رەهای خواو ویستی جوزئی خۆیدا

**پێنجەم:** لەسووڕەتی (القیامة) دا:

١- کورتەباسێک: بینینی بڕواداران بۆ خوای بەرز و بێ وێنە لە بەهەشتدا.

٢- کورتەباسێک لەبارەی ڕۆژی دواییەوە، لەشەش تەوەرەدا.

**شەشەم: لەسووڕەتی (الإنسان) دا:**

١- کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو گێڕاوانەی دەڵێن: ئەو ئایەتانەی لەبارەی عەلی و فاطیمەوە (رضی الله عنها) هاتوونە خوارێ.

٢- کورتەباسێک لەبارەی چییەتی مرۆڤەوە.

٣- کورتەباسێک لەبارەی چەمک و واتای هیدایەتەوە.

٤- کورتەباسێک: پەیوەندی نێوان ویستی خواو ویستی مرۆڤ.

**حەوتەم: لەسووڕەتی (المرسلات) دا:**

١- چوار کورتە سەرنج.

٢- ئایا بێبڕوایەکان بە بەڵگەکانی شەریعەت ئەرکدار (**مکلف**) کراون؟

**هەشتەم: لەسووڕەتی (النبأ) دا:**

١- کورتەباسێک: یازدە (١١) چاکە ونیعمەتەکانی خوا کە یازدە بەڵگەشن لەسەر پەروەردگارێتی خواو، هاتنی ڕۆژی سزا و پاداشت.

٢- کورتەباسێک: مانەوەی بێبڕوایان لەدۆزەخدا هەتاهەتایی و نەبڕاوەیە.

٣- کورتەباسێک: حەوت ڕوونکردنەوە لەبارەی ئایەتەکانی (٣١-٣٧) ەوە.

**نۆیەم: لەسوورەتی (النازعات) دا:**

١- کورتەباسێک لەبارەی سوێندەکانی قورئانەوە، لەپێنج بڕگەدا.

٢- کورتەباسێک، سێ هەڵوەستە.

٣- دوو سەرنجدانی کورت لەزەوی و چیایەکان.

٤- بەرپەچدانەوەی قسەیەکی (إبن عثیمین)، کە گوایە مرۆڤ سێ نەفسی هەن!

هیواداریشـم خوێنـەرە بەڕێـزەکان بەهـری پێویسـت لـەم بەرگـەش وەربگـرن و خـوا پشـتیوان بـێ بـۆ دوو بەرگـی کۆتایـی: (٢٣ و٣٣)ش بەزویـی بەدواییـدا چـاپ دەکرێـن.

**١٨/ ربیع الأول/ ١٤٤٥ك-٣/١٠/٢٠٢٣ز**

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کە (١١)ی شـەووالی سـاڵ (١٤٤١) کۆچییە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/١/٣) ی زاینیی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (نـوح)، سـەرەتا پێناسـەو نێـوەڕۆکی سـوورەتی (نـوح) لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـەڕوو، بـۆ ئـەوەی بـەر لـەوەی بچینـە نێـو وردەکارییـەکانی ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـای ئایەتـە بـە پێـزەکانی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەوە، نەخشـەو هێڵـە گشـتییەکانی و، چوارچێـوەی واتـاو مەبەسـتەکانیمان لەبـەر چـاو بـێ.

## پێناسەی سوورەتی (نوح)و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیا بە نـاوی (**سُـورَة نُـوح**) نـاسراوە، هەرچەنـدە پێشـەوا بوخاریی لـە صەحیحەکـەی خـۆی لـە: (**کتـاب التفسـير**)دا، بەنـاوی: (**سُـورَةُ إِنَّـا أَرْسَـلْنا نُوحَـاً**) هێناویـەتی، بـەڵام نـاوی بـاوی هـەر (**سُورَة نُـوح**)ە، صـەڵات و سـەلامی خـوا لەسـەر نـووح و لەسـەر تێکـڕای پێغەمبـەرانی بـرای بـێ.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بـە یەکدەنگیـی زانایـان، ئـەم سـوورەتە لـە مەککـە دابەزیـوەو، سـوورەتێکی مەککەییـە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکان:

ژمێـرەرانی ئایەتـەکانی قورئـان، سـێ ژمارەیـان بـۆ ئایەتـەکانی ئـەم سـوورەتە موبارەکــە دانــاون:

أ- ئەهلی مەککەو مەدینە گوتوویانە: سیی (٣٠) ئایەتە

ب- ئەهلی بەصڕاو شام گوتوویانە: بیست و نۆ (٢٩) ئایەتە.

ج- ئەهلی کووفەش گوتوویانە: بیست و هەشت (٢٨) ئایەتە، لە موصحەفەکانی لای ئێمەدا، ژمارە بیست و هەشت (٢٨) تەبەننیی کراوە، بۆیەش وا دەڵێم، چونکە لە هەندێك لە موصحەفەکانی دی، کە لە هەندێ وڵاتانی دیکەی ئیسلامیی دا چاپ دەکرێن، ڕەنگە ژمارە سیی (٣٠)، یان ژمارە بیست و نۆ (٢٩) هەبێ، ئەگەر کەسێك موصحەفێکی بینی و تێیدا ئایەتەکانی سوورەتی نووح بە سیی (٣٠) ئایەت، یان بە بیست و نۆ (٢٩) ئایەت، دانرابوون، با پێی وانەبێ شتێك زیاد کراوە، بەڵکو جیاوازیی لە ژمارەی ئایەتەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکانی قورئان بە بۆچوونی زانایان، یەکێکیان پێی وایە دەبێ لێرە بوەستی، یەکێکی دیکە دەڵێ: نەخێر دەبێ چەند وشەیەکی دیکە بڕۆی ئنجا بوەستی، بۆیە جاری وایە ئایەتێك لە لای زانایەك دەبێتە دوو ئایەت، ڕستەیەك دەبێتە دوو ئایەت، لە لای زانایەکی دیکەش دەبێتە یەك ڕستەو یەك ئایەت.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ئـەم سـوورەتە لـە موصحەفـدا، ژمـارە حەفتـاو یـەك (٧١)ەو، لـە دابەزینـدا ژمـارە حەفتـاو سـێ (٧٣)یـە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوورەتە بـە هـەر بیسـت و هەشـت (٢٨) ئایەتەکەیـەوە، واتـە: لـە ئایـەتی یەکەمــەوە تاکــو کۆتایــی، بــاسی بەســەرهاتی نــووح عليه السلام لەگــەڵ گەلەکەیــدا

دەکات، هەرچەندە بەسەرهاتی نووح عليه السلام لە زۆر سووڕەتاندا هاتوە، - بۆیەش سووڕەتەکە بەناوی (نوح)ەوە، ناو نراوە - چونکە لەم سووڕەتەدا، نووح عليه السلام وەك ڕاپۆرتی خۆ خوێندنەوەو بەسەرهاتی خۆگێڕاندنەوە دەدوێ، وردەکاریی زۆری لە بارەی بانگکردنی بۆ گەلەکەی بەرەو لای خواو ئایین و بەرنامەی خواو، هەڵوێستی نەرێنییانەو کەللەڕەقانەو عینادییانەی گەلەکەی خستۆتە ڕوو، سەرەنجامیش چۆنیەتیی فەوتێندرانیان باسکراوەو، بە پاڕانەیەکی توندو گشتگیری نووح عليه السلام کۆتایی هێنراوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە چوار تایبەتمەندییمان بۆ ئەم سووڕەتە هاتوونە بەرچاو:

تایبەتمەندیی یەکەم: تەنیا لەم سووڕەتەدا نووح عليه السلام بەو جۆرە هەواڵی خۆی و گەلەکەی بەو وردەکارییە گێڕاوەتەوە، لە هەموو قوڕئاندا تەنیا لەم سووڕەتەدا، نووح عليه السلام ئاوا بە درێژیی بەسەرهاتی خۆی گێڕاوەتەوە، خوا سبحانه وتعالى ڕاستەوخۆ لە زاری نووحەوە عليه السلام بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ گەلەکەیدا: چی پێگوتوون و، چەند خۆی لەگەڵ ماندووکردوون و، بە چەند جۆر دواندوونی و، ئەوان چەند کەللەڕقبوون و، سەرەنجام چۆن فەوتاون؟ تەنیا لەم سووڕەتەدا بەم شێوەیە هاتوە.

تایبەتمەندیی دووەم: تەنیا لەم سووڕەتەدا ناوی ئەو پێنج بتە هاتوە، کە گەلی نووح عليه السلام پەرستوویانن: (**ودًّا، سُواع، يَغُوث، يَعُوق، نَسْر**) لە ئایەتی: ﴿ **وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا** ﴿٢٣﴾ ﴾دا.

تایبەتمەندیی سێیەم: تووك و نزای نووح عليه السلام لەگەلەکەی کە خوا لە بەینیان بەرێ و قڕەبڕیان بکات، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٢٦)دا: ﴿ **وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا** ﴾، واتە: نووح عليه السلام گوتی: پەروەردگارم! ماڵنشینێك لە بێبڕوایان مەهێڵە، واتە: تاقیان لێ ببڕە، قڕەبڕیان بکە.

تایبەتمەندیی چوارەم: چەند وشەو تەعبیرێك تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

١- ﴿جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ﴾، لە ئایەتی ژمارە (٧)دا، پەنجەکانیان خستنە گوێیەکانیان، کە مەبەست پێی سەرە پەنجەکانیانن، (جَعَلُوا أنَامِلَ أَصَابِعِهِم فِي آذانهم) (أنَامِل) کۆی (أُنْمُلة)یە، واتە: سەرەپەنجە، ئەگەرنا هەموو پەنجە ناچێتە نێو گوێ، بەڵام لێرەدا بۆ زێدەڕۆیی پێشاندانی ئەوان لە گوێ نەگرتندا، وەك بڵێی هەموو پەنجەکەیان خستبێتە گوێیان تاکو گوێیان لە هیچ شتێك نەبێ.

٢- ﴿وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ﴾، لە هەمان ئایەتی ژمارە (٧)دا، داوایان لە پۆشاکەکانیان کرد دەم و چاویانی پێدابپۆشن، یانی: دەم و چاویان داپۆشی بەپۆشاکەکانیان.

٣- ﴿وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا كُبَّارٗا﴾، لە ئایەتی ژمارە (٢٢)دا، (كُبَّارٗا) واتە: زۆر گەورەو زەبەلاح، (كَبِيْر) گەورەیە (كِبَار) گەورەترە، بەڵام (كُبَّار) واتە: زۆر زەبەلاح، یانی: پیلانێکی زەبەلاحیان گێرا.

١- وشەی ﴿دَيَّارٗا﴾، (دَيَّار) لە ئایەتی ژمارە (٢٦)دا، دەگوترێ: (مَا فِي الدَّار مِنْ دَيَّار) (دَيَّار) کەسێکی ماڵنشین، کەسێك لە شوێنێدا نیشتەجێیە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە:

**کۆی بیست و هەشت(٢٨) ئایەتەکەی ئەم سورەتە بۆ دوو دەرس دابەش دەکەین:**

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی (١ - ٢٠)، باسی نێردرانی نووح عليه السلام بۆ لای گەلەکەی و، وردەکاریی چۆنیەتیی بانگکردنی بۆیان.

دەرسی دووەم: هەشت ئایەتی کۆتایی: (٢١ - ٢٨)، باسی گەیشتنە بنبەستی نووح عليه السلام لەگەڵ گەلەکەیداو، سەرەنجام پاڕانەوەی لە خواو، تووككردنی لە گەلە یاخییەکەی، کە قڕەبڕیان بکات و تاکیان لێ نەهێڵێ، پاشان پاڕانەوەی لەخوا بۆ خۆی و باب و دایکی و بڕوادارانی پیاو و ئافرەت، کە لێیان ببووریّ.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە بیسـت (٢٠) ئایەتی سـەرەتای سـوورەتی نـووح ﷺ، پێکهاتوە، ئایەتـەکانی: (١ - ٢٠) کـە تێیانـدا خـوای زانـاو شـارەزا، بـاسی نـاردنی نـووح ﷺ بۆ لای گەلەکـەی و، گەیانـدنی پەیامـی خوا پێیـان، دەکات، خوا ﷻ ئـەوە دەخاتەڕوو کە نووح بـە گەلەکـەی دەڵـێ: ئـەی گەلەکـەم! مـن بـۆ لای ئێـوە ترسـێنەرو وریاکەرەوەیـەکی ئاشـکرام، یاخـود: ڕوونکـەرەوەم، هەمـوو شـتێکتان بـۆ ڕووندەکەمـەوە، هاتـووم پێتان ڕابگەیەنـم کـە بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن و پارێـزی لـێ بکـەن و، فەرمانبەریـی مـن بکـەن، بۆیـەش پێویسـتە فەرمانبەریـی نـووح ﷺ بکـەن، تاکـو هـەم بەندایەتیـی کـردن بـۆ خوایـان لـێ حاڵیـی بـکات، هـەم پارێزکاربـوون لـە خزمـەت خوادایـان فێـر بـکات، ئنجـا پێشـیان ڕابگەیەنـێ: ئەگـەر ئێـوە وابکـەن، خـوا لـە گوناهەکانتـان دەتانبـووڕێ، دواشـتان دەخـات بـۆ کاتێـکی دیارییکـراو، واتـە: بـە بـەڵای ناگەهـان[١] لەبەینتـان نابـات و، دەتانهێڵێتـەوە تاکـو بەمـردنی ئاسـایی خۆتـان دەمـرن، چونکـە کاتێـك کـە خـوا دایناوە بـۆ فەوتانـدنی گەلـە یاخییـەکان، دواناکـەوێ و لـە ژوانگـەی خۆیـدا دێتـە دی، ئەگـەر ئێـوە بزانـن.

ئنجـا نـووح ﷺ بـۆ خـوای پـەروەردگاری دەگێڕێتـەوە، هەڵبەتـە خـوا ﷻ بـە هەمـوو شـتێك زانایـە، بـەڵام خـوا ﷻ لێـرەدا هـەر لەسـەر زاری نـووح چۆنیەتیـی بانگکـردنی بـۆ گەلەکـەی دەگێڕێتـەوە، تاکـو هـەم بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ و هـەم بـۆ ئۆممەتەکـەی ببێتـە سـەر مەشـق و دەرس و پەنـد وەربگـرن، لەچۆنیەتیـی بانگکـردنی نـووح ﷺ بـۆ گەلەکـەی، ئـەو هەمـوو سـەبرو پشـوو درێژیـی و تەحەممولـەی لەگەڵیانـدا نواندوویـەتی، دەڵـێ: پـەروەردگارم! مـن گەلەکەی خۆمـم بەشـەو و ڕۆژ بانـگ کـرد، کۆمەڵگایەکـەی خۆمـم شـەو و ڕۆژ بانگکـرد، بـەڵام

---

(١) ناگهان: کت و پڕ و لەناکاو، وشەیەکی فارسییە و کوردێنراوە.

بانگکـردنی مـن، هـەر ڕاکـردنی تێـدا زیـاد دەکـردن، کاتێـك بانگـم دەکـردن کـە تـۆ لێیـان ببـووری ئـەی خوایـە! ئەوانـە پەنجـەکانی خۆیـان دەخسـتە گوێیەکانیـەوەو، بـە پۆشاکەکانیشـیان دەم و چـاوی خۆیـان دادەپـۆشی و، هـەر مکـوڕ بـوون و خۆبەزلگربـوون، بەخۆبەزلگرییـەکی تایبـەت، دوایـی مـن بـە ئاشـکرا بانگمکـردن، ئنجا جـاری وا هەبـوو بـە دەنگـی بـەرز بانگـم دەکـردن و جـاری وا هەبـوو بـە چپـە (بـە دەنگـی کـپ) بانگـم دەکـردن، دەمگـوت: داوای لێبـوردن لـە پەروەردگارتـان بکـەن ئـەو زۆر لێبوردەیـە، ئەگـەر ئێـوە داوای لێبـوردن لـە پەروەردگارتـان بکـەن و بگەڕێنـەوە بـۆ لای، خـوا ئـاوی بـە خورزەمتـان لەسـەرێوە بەسـەردا دەبارێنـێ، (لـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەرزەدا) و مـاڵ سـامانتان بـۆ زیـاد دەکات، وەچـەو ڕۆڵەکانتـان بـۆ زیـاد دەکات و، باخانتـان بـۆ دەڕەخسـێنێ و، ڕووبـار گـەل و جۆگـەو جۆبارتـان بـۆ دەڕەخسـێنێ، هەروەهـا پێمگوتـن: بۆچـی مەزنیـی بـۆ خوا بڕیـار نادەن و، بۆچـی بـە ئومێـدی ئەوەنیـن خـوا بـە مەزنیـی خـۆی لەگەڵتانـدا مامەڵـە بـکات، لـە حاڵێکـدا ئێـوەی بـە چەنـد قۆناغانـدا تێپەڕانـدوە؟ ئایـا نابینـن خـوا چـۆن حـەوت ئاسـمانی چیـن بەچینـی لەسـەرتانەوە هێناونـە دی و، مانگـی تێـدا گێڕاون بە ڕۆشـنایی و، خـۆری تێـدا کـردوون بـە چـراو، خـوا ئێـوەی لـە زەویـدا ڕوانـدوەو پێگەیانـدوە، دواییـش دەتانگێڕێتـەوە بـۆ نێـو زەوی و جارێکـی دیکـەش لـەوێ دەرتاندێنێتـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا، هەروەهـا خـوا زەوی وەك فەرشـێك بـۆ ڕاخسـتوون، تاکـو لـە کەلێـن و بۆشـایی و قەدپاڵەکانیـدا، ڕێ و بانـان بـۆ خۆتـان دروسـت بکـەن، ئیـدی بـەو شـێوەیە نـووح عليه السلام لـە سـەر بانگکـردنی گەلەکـەی بـەردەوام بـووە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ٢ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ٣ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٤ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا ٥ فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا ٦ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوۡتُهُمۡ لِتَغۡفِرَ لَهُمۡ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ وَأَصَرُّواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ ٱسۡتِكۡبَارٗا ٧ ثُمَّ إِنِّي دَعَوۡتُهُمۡ جِهَارٗا ٨ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعۡلَنتُ لَهُمۡ وَأَسۡرَرۡتُ لَهُمۡ إِسۡرَارٗا ٩ فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا ١٠ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا ١١ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ جَنَّٰتٖ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ أَنۡهَٰرٗا ١٢ مَّا لَكُمۡ لَا تَرۡجُونَ لِلَّهِ وَقَارٗا ١٣ وَقَدۡ خَلَقَكُمۡ أَطۡوَارًا ١٤ أَلَمۡ تَرَوۡاْ كَيۡفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا ١٥ وَجَعَلَ ٱلۡقَمَرَ فِيهِنَّ نُورٗا وَجَعَلَ ٱلشَّمۡسَ سِرَاجٗا ١٦ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ نَبَاتٗا ١٧ ثُمَّ يُعِيدُكُمۡ فِيهَا وَيُخۡرِجُكُمۡ إِخۡرَاجٗا ١٨ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ بِسَاطٗا ١٩ لِّتَسۡلُكُواْ مِنۡهَا سُبُلٗا فِجَاجٗا ٢٠﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئێمە نووحمان بۆ لای گەلەکەی نارد، کە گەلەکەت بترسێنەو وریایان بکەوە، بەر لەوەی ئازارێکی بە ئێشیان بۆبێ (١) (نووح عليه السلام) گوتی: ئەی گەلەکەم! من بۆ ئێوە ترسێنەرو وریاکەرەوەیەکی ڕوونم (٢) (هاتووم پێتان بڵێم:) کە خوا بپەرستن و پارێزی لێبکەن و فەرمانبەرییم بکەن (٣) (خوا) لە گوناهەکانتان دەتانبووڕێ و بۆ کاتێکی ناوبراو دواتان دەخات، بە دڵنیایی کاتی دیارییکراوی خوا (بۆ سزادانتان) هەرکات هات، دواناخرێ،

ئەگەر زانیباتان (ئیمانتان دەهێنا) ﴿٤﴾ (نووح ﷺ) گوتی: پەروەردگارم! من بە شەوو ڕۆژ بانگی گەلەکەمم کرد (بۆ لای تۆ) ﴿٥﴾ کەچی بانگکردنم تەنیا ڕاکردن (و دوورکەوتنەوە)ی تێدا زێدەکردن ﴿٦﴾ هەر کاتێکیش بانگم دەکردن تاکو لێیانببووری، پەنجەکانیان دەخستنە گوێیەکانیانەوەو بە پۆشاکەکانیان (ڕووی) خۆیان داپۆشی و (لەسەر کوفر) مکوڕ بوون و بەخۆبەزلگرتنێکی بێڕەزا خۆیان بەزلگرت ﴿٧﴾ دوایی من بە دەنگی بەرز بانگم کردن ﴿٨﴾ پاشان (بانگکردنەکەم) بۆ ئاشکراکردن، هەروەها (بانگکردنەکەم) بە پەنهانکردن بۆم پەنهان کردن ﴿٩﴾ پێمگوتن: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، بێگومان ئەو هەر لێبوردە بووە ﴿١٠﴾ (ئەگەر وابکەن کە پێمگوتن) (ئاوی) ئاسمانتان بە خورزەم بەسەردا دەبارێنێ ﴿١١﴾ هەروەها ماڵ و سامانەکان و کوڕانتان پێدەدات (و بۆ زۆر دەکات) و باخان و (جۆگەو) ڕووبارتان بۆ دەڕەخسێنێ ﴿١٢﴾ چیتانە ئومێدەوار (و بڕواداری) مەزنیی و شکۆنین بۆ خوا! ﴿١٣﴾ لە حاڵێکدا جاردوای جار، (قۆناغ قۆناغ)، دروستیکردوون؟ ﴿١٤﴾ ئایا (بە عەقڵ و دڵ) نەتاندیوە چۆن خوا حەوت ئاسمانی چین چینی دروستیکردوون ﴿١٥﴾ مانگیشی تێدا ڕووناك (و تریفەدار) کردوون و، خۆریشی گێڕاوە بە چرا! ﴿١٦﴾ هەروەها خوا ئێوەی بەڕواندن لە سەر زەوی ڕواندوە ﴿١٧﴾ دوایش دەتانگێڕێتەوە نێوی (و دواتریش) بەدەرهێنانەوەیەك (ی سەرسوڕهێنەر) دەرتاندێنێتەوە ﴿١٨﴾ هەروەها خوا زەوی بۆ کردوونە (ڕایەخ و بۆی پان ڕاخستوون) ﴿١٩﴾ تاکو ڕێیە فراوانەکانی تێدا بگرنەبەر (بۆ کارو کاسبیی و گوزەران پێیاندا بڕۆن) ﴿٢٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَجَلٍ): (الأَجَـلُ: المُـدَّةُ المَضْرُوبَـةُ لِـشَيءٍ)، (أجـل) یـانی: کاتێـك کـە دیارییکـراوە بـۆ شـتێك، (أَجَلْتُـهُ: جَعْلَـتُ لَـهُ أَجَـلاً)، (أَجَلْتُـهُ)، واتـە: کاتێکـی دیارییکـراوم بـۆ دانـا، (الأجَـلُ: المُـدَّةُ المَضْرُوبَـةُ لِحَيَـاةِ الإِنْسَـانِ)، هەروەهـا (أجَـل): ئـەو کاتەیـە کـە بـۆ ژیانـی مـرۆڤ دانـراوە، دەگوتـرێ: ئەجەلـی هـات، واتـە: ئـەو کاتـەی بـۆ کۆتایـی ژیانـی مـرۆڤ دانـراوە، هـات.

(مُّسَمًّى): (المُقَـدَّر: المُعَيَّن)، (مُسَـمَّى)، بـە مانـای ناوبـراو دێ، بـەڵام لێـرەدا یـانی: دیارییکـراو، ئەندازەگیریـی کـراو.

(فِرَارًا): (أَصْلُ الفَـرِّ: الكَشْـفُ عَـنِ سِـنِّ الدَابَّـةِ، وَالإِفْـتِرَارُ: ظُهُـورُ السِـنِّ مِـنَ الضُّحْـكِ، وَفَـرَّ مِـنَ الحَـرْبِ فِـرَاراً)، وشـەی (فَـرّ) لـە ئەصڵـدا دەرخسـتنی ددانـی ئاژەڵـە، بزانـێ ددانـی مـاون، یـان بـە پێـی ددانەکانـی تەمەنەکـەی دیاریـی بکـرێ، بـۆ کەسـانی شـارەزا، (إفْـتِرَار): بریتیـە لـە دەرکەوتنـی ددان لـە ئەنجامـی پێکەنینـدا، ئنجـا لـەوەوە خوازراوەتـەوە بـۆ: (فَـرَّ مِـنَ الحَـرْبِ فِـرَاراً)، وەك چـۆن ددان دەردەکـەوێ لـە کاتـی پێکەنینـدا، کاتێـك کەسـێکیش لـە جەنـگ ڕادەکات و شـوێنەکەی. خـۆی چـۆڵ دەکات، شـوێنەکەی خـۆی کـە تاکـو ئێسـتا داپۆشـیوە، کەشـفی دەکاو دەری دەخـات.

(وَٱسْتَغْشَوْاْ ثِيَابَهُمْ): بـە پۆشـاکەکانیان خۆیـان داپۆشـی، کـە مەبەسـت پێـی دەم و چـاوە، (الغِشَـاوَةُ: مَـا يُغَطَّـى بِـهِ الـشَّيء)، (غِشَـاوَة): هـەر شـتێکە شـتێکی پـێ دا بپـۆشرێ، کەواتـە: (وَٱسْتَغْشَوْاْ ثِيَابَهُمْ)، یانـی: (جَعَلُوهُـا غِشَـاوَةً عَلَـى أَسْـمَاعِهِمْ، وَذَلِـكَ عِبَـارَةٌ عَـنِ الإِمْتِنَـاعِ مِـنَ الإِصغَـاء)، پۆشـاکەکانیان لەسـەر گوێیـەکان کردنـە داپۆشـەر کـە مەبەسـت پێـی گـوێ نەگرتنـە، بـەڵام: (وَٱسْتَغْشَوْاْ ثِيَابَهُمْ)، زیاتـر مەبەسـت پێـی دەم و چـاو داپۆشـینە، کـە بێگومـان گوێـش و چاویـش دەدەگرێتـەوە.

(وَأَصَرُّواْ ): (الإِصْرَارُ: التَّعَقُّدُ فِي الذَّنْبِ وَالتَّشَدُّدِ)، (إِصْرَار): بریتیە لەوەی مرۆڤ بە توندیی و سەختیی گوناهو تاوان بگریٚ و بەری نەدات، (والإصرار: الإِمْتِنَاعُ عَنِ الإِقْلَاعِ عَنْهُ، وَأَصْلُهُ مِن الصَّرِّ وهو الشدّة، والصُّرَّة: مَا يُجْعَلُ فِيْهَا الدَّرَاهِم)، (إِصْرَار): بریتیە لەوەی مرۆڤ سەختگیریی بکا لە گوناهو تاوانێکداو، ئامادە نەبیٚ دەستی لیٚ هەڵبگریٚ، وشەی (إِصْرَار) لە (صَرّ)ەوە هاتوە، یانی: (شَدَّة)، توندیی، (صُرَّة)ش پڕێسکەیەکە درەم و دراوی تیٚ هاویشتراوەو توند بەستراوە.

(جِهَارًا ): (يُقَالُ لِظُهُورِ الشَّيءِ بِإِفْرَاطِ حَاسَّةِ البَصَرِ أو حَاسَّةِ السَّمْعِ: جَهْر)، وشەی (جَهْر): بەکاردەهێنریٚ بۆ دەرکەوتنی شتێك بە هەستی بینین، یان بیستن، واتە: دەنگێکی بەرز، یاخود ڕەنگێکی زەق.

(إِسْرَارًا): (الإِسْرَارُ: خِلَافُ الإِعْلَانِ)، (إِسْرَار)، واتە: دەنگی پەنهان، دەنگی کپ، پێچەوانەی (إِعْلَان)ە، واتە: ئاشکرا کردن.

(مِّدْرَارًا): (أَصْلُهُ مِنَ الدَّرِّ وَالدِّرَّةِ: اللَّبَن وَيُسْتَعَارُ لِلْمَطَرِ)، وشەی (مِدْرَار)، لە ئەصڵدا لە (دَرّ)ەوەو لە (دِرّة)وە هاتوە، (دَرّ ودِرَّة)، هەردووکیان بە مانای شیرن (شیر کە لە گوانی ئاژەڵ دێتە دەریٚ، بە خورزەم و فیچقە دێتە دەریٚ)، دوایی خوازراوەتەوە بۆ باران (یانی: ئەو ئاوەی لە سەرێوە دادەبەزیٚ)، هەرچەندە ئەو دەڵیٚ: (لِلْمَطَر)، بەڵام ئاشکرایە (مَطَر)، یەکێکە لە سیٚ جۆرەکانی ئاوێك کە لە ئاسمان دێتە خواریٚ، کە باران و بەفرو تەرزەن، بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان، ئەو شوێنانەی لێیان بوون، تەنیا بارانیان بینیوەو، بەفر (ثلج)یان نەبینیوە، ڕەنگە تەرزە (بَرَدْ)یشیان کەمتر بینیبیٚ، بەس باسی بارانیان کردوە، ئەگەرنا ئەوەی خوا لە قورئاندا باسی دەکات دەفەرمویٚ: ئاو، ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ ﴿١٨﴾ ﴾المؤمنون، یان لێرە کە دەفەرمویٚ: ﴿ مِّدْرَارًا ﴾، بە دڵنیایی هەم بەفر دەگرێتەوە، هەم باران و تەرزەش دەگرێتەوە.

(نَرْجُونَ): (الرَّجَـاءُ: ظَـنٌّ يَقْتَـضِي حُصُـولَ مَـا فِيْـهِ مَـسَرَّة)، (رَجَـاءُ): بـە کوردیـی دەڵێـن: ئومێـد، گومانێکـە خوازیاری ئەوەیـە شـتێك کـە دڵخۆشـیی تێدایـە پەیدابـێ، (وَالرَّجَـاءُ وَالخَـوْفُ يتَلاَزَمَـان)، ئومێـدو ترسـیش پێکـەوە پەیوەسـتن، بۆیـە لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾﴾، هەندێـك لـە زانایـان (رَجَـاءُ) یـان بـە (خَـوْف) لێکداوەتـەوەو گوتوویانـە: (لِمَاذَا لَا تَخَافُونَ للـه عَظَمَـةً)، بۆچـی لـە مەزنیـی خـوا ناترسـن، بـەڵام ئێمـە بـە جۆرێکـی دیکـە مانامـان کـردوە.

(وَقَارًا): (الوَقَـارُ: السُّكُونُ وَالحِلْمُ)، (وَقَـار): بریتیـە لـە ئارامیـی و هێدیـی و مەندیی، دەگوتـرێ: (هُـو وقـورٌ أي: لَـهُ وَقَـارٌ وَوِقَـارٌ)، (وَقُـوْر): کەسـێکە هێدیـی و مەنـدەو بـە هەڵپـە نیـە، کەواتـە: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾﴾، بۆچـی ئـەو حاڵەتـی نەگۆڕانـی خـوای بـەرز، حاڵەتـی هێدیـی و مەندیـی خـوا، پێـی ئومێـدەوار نیـن؟ بۆچـی ناترسـن لـە مەزنیـی خـواو لـە پایـە بەرزیـی خـوا، ئاوایـان لێکداوەتـەوە: (مَـا لَكُـمْ لاَ تَخَافُـوْن للـه عَظَمَـةً)، بۆچـی لـە مەزنیـی خـوا ناترسـن و بێباکـن؟

(أَطْوَارًا): (أَطْـوَاراً جَمْـعُ طَـور أي: طَـوْرَاً بَعْـدَ طَـوْر، تَـارَةً بَعْـد تَـارَة، يُقَـالُ عَـدَا طَـوْرَهُ: تَجَـاوَزَ حَـدَّهُ)، (أَطْـوار) کـۆی (طَـور)ە، کەواتـە: (أَطْـوَاراً: طَـوْرَاً بَعْـدَ طَـوْر)، (طَوْر)یـش بـە مانـای جـار دێ، جـار لـە دوای جـار، یـان قۆنـاغ دوای قۆنـاغ، دەگوتـرێ: (عَـدَا طَـوْرَهُ: تَجَـاوَزَ حَـدَّهُ)، لـە سـنووری خـۆی دەرچـوو، سـنووری خـۆی بەزانـد.

(طِبَاقًا): (المُطَابَقَـةُ: جَعْـلُ الـشَّيءِ فَـوْقَ آخَـر بِقَـدَرِه)، (مُطَابَقَـةٌ): بریتیـە لـە شـتێك لەسـەر شـتێك بـێ بـە ئەنـدازەی ئـەو، واتـە: چیـن لەسـەر چیـن، دەگوتـرێ: (طَابَقْـتُ النَّعْـلَ)، واتـە: نەعلەکـەم پێکەڵپێـك کـرد، یانی: دوو پێڵاوەکـەم لەسـەر یەکـدی دانـان و جووتـم کـردن، کەواتـە: (طِبَـاق)، یانی: چیـن لەسـەر چیـن.

(سِرَاجًا): (الـسِّرَاجُ: الزَّاهِـرُ بِفَتِيْلَـةٍ وَدُهْـنٍ، وَيُعَبَّـرُ بِـهِ عَـنْ كُلِّ مُـضِيء)، (سِرَاج): بریتیـە لـە چرایـەك کـە فتیلەیەکـی هەیـەو ڕۆنـی تێدەکـرێ، {کاتـی خـۆی ڕۆن زەیتیـان تێکـردوە،

ئێستا نەوتی تێدەکرێ، یان شتی دیکەی تێدەکرێ و دەسووتێ}، ئنجا هەر شتێك ڕووناکیی و تیشکی هەبێ، پێی دەگوترێ: (**سِرَاج**)، لێرەشدا بە مانای خۆرە.

(بِسَاطًا): (**بَسَطَ الشَّيءَ: نَشَرَهُ وَوَزَّعَهُ**)، شتەکەی بڵاوکردەوەو دابەشی کرد، (**البَسْطُ: النَّشْر وَالتَّوْزِيْع**)، (**بسط**) بڵاوکردنەوەو دابەشکردنە، (**البِسَاطُ وَالمَبْسُوط**)، (**بِسَاط**): مەبەست پێی (**مَبْسُوط**)ە، تاکو شتێکی پانڕاخراو کە زەوییە.

(لِّتَسْلُكُواْ مِنْهَا): (**السُّلُوكُ: النَّفَاذُ فِي الطَّرِيْق**)، (**سُلُوك**): بریتیە لە چوونە نێو ڕێ، بە ڕێدا ڕۆیشتن، کەواتە: (لِّتَسْلُكُواْ مِنْهَا)، واتە: بەو زەوییەدا بڕۆن، (**سُبُل**)یش کۆی (**سَبِيْل**)ە، یانی: ڕێ.

(فِجَاجًا): (**فِجَاج**)، کۆی (**فَجّ**)ە، (**الفَجُّ: شَقٌّ يَكْتَنِفُهُ جَبَلاَنِ، وَيُسْتَعْمَلُ فِي الطَّرِيْقِ الوَاسِع**)، (**فَجّ**): بریتیە لە دابڕاوەییەك دەکەوێتە نێوان دوو چیایانەوە، یان دوو گردانەوەو بەرکادەهێنرێ بۆ ڕێی فراوان، واتە: ڕێیەك کە دەکەوێتە نێوان دوو چیایانەوە، ڕێیەکی فراوان پێی دەگوترێ: (**فَجّ**) و بە (**فِجَاج**) کۆ دەکرێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێــــــزان!

خــوا ﷻ لــەم ســوورەتەدا بــاسی بەســەرهاتی نــووح ﷺ دەکات، بەســەرهاتی نــووح ﷺ لــە قورئانــدا لــە زۆر شــوێناندا هاتــوەو، ئێمــە درێــژەی بەســەرهاتی نــووح ﷺو گەلەکەیــمان لــە کاتی تەفسـیر کردنــی ســوورەتی (هــود)دا خســتەڕوو، ئەگــەر لێــرە خــوای پــەروەردگار لــە دوو توێــی بیســت و هەشــت (٢٨) ئایەتــدا بــاسی بەســەرهاتی نــووح ﷺ دەکات لەســەر زمــانی خــۆی، لــەوێ لــە دوو توێــی بیســت و پێنــج (٢٥) ئایەتــدا، کــە پانتاییەکــەی گرتوویانەتــەوە، لــە هــی ئــەو بیســت و هەشــت ئایەتــەی ئێــرە زیاتــرەو، لــەوێ قۆنــاغ بــە قۆنــاغ بەســەرهاتی نــووح ﷺ خراوەتــە ڕوو، بۆیــە ئێمــە درێــژەی گێڕانــەوەی بەســەرهاتی نــووح و گەلەکەیــمان خســتۆتە تەفسـیری ســوورەتی (هــود)ەوە.

بــەڵام ئــەوەی لێــرەدا خــوا ﷻ بــاسی دەکات، ئەوەیــە کــە لەســەر زمــانی خــودی نــووح ﷺ، چــی لــە نێــوان ئــەوو و گەلەکەیــدا گــوزەراوە، خــوا ﷻ دەیخاتــەڕوو، چــۆن بانگــی گەلەکــەی خــۆی کــردوە، بــە هەمــوو شــێوازێك و هەوڵــی لەگــەڵ داون و، چاکــەو نیعمەتــەکانی خــوای بیرخســتوونەوەو ویســتوویەتی لــە هەمــوو دەروازانــەوە، ئیــمان و پەیامــی خــوا بخاتــە نێــو عەقــڵ و دڵیانــەوە، بــەڵام ئــەوان هــەر کەللــەڕەق و نەســەلمێن بــوون و، لەســەر بتپەرســتیی خۆیــان بــەردەوام بــوون، واتــە: ئــەوەی لێــرەدا خــوا ﷻ خســتوویەتە ڕوو لــە بــارەی نووحــەوە ﷺ، وا دێتــە بەرچــاو، وەك چــۆن کەســێك دەنێــردرێ بــۆ ئەنجامــدانی کارێــك، ئەویــش دوای ئــەوەی زۆر بەجیددیــی ئــەو کارە ئەنجــام دەدات، دوایــی دێتــەوەو ئــەو کەســەی ناردوویــەتی، بەســەرهاتەکەی بــۆ دەگێڕێتــەوە، ئــەوەی بەســەری هاتــوە، ئــەو چــی کــردوەو، چــۆنی کــردوەو، بەرانبــەرەکانی چۆنیــان کــردوە؟ بــاسی دەکات.

بەکورتیی و بەکوردیی دەتوانین بڵێین:

ئـەوەی ئێـرە وەك خوێندنـەوەی ڕاپۆرتـە لـە لایـەنی نووحـەوە عليه السلام بـۆ خـوای پـەروەردگار، کـە ئـەی خـوای زانـاو شـارەزا! خـۆت زاناتـری، ئـەو ئەرکـەت بـە مـن سپاردو، منیش ئـاوام کـردوە و ئـاوام گوتوەو، بەو شێوەیە مامەڵـەم لەگـەڵ گەلەکەمدا کـرد، ئەوانیـش ئاوایـان گـوت و، ئاوایـان کـردو، سـەرەنجام بـەم شێوەیە بـوو.

سـەرەتا خـوا سبحانه وتعالى دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، کە ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.
٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.
٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.
٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

خـوا سبحانه وتعالى دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ﴾، بێگومـان ئێمـە نووحـمان بـۆ لای خەڵکەکـەی، بـۆ لای گەلەکـەی، ڕەوان کـرد، (إنَّـا) ئەسـڵی خـۆی (إنَّنَا)یـە واتـە: بـە دڵنیایـی ئێمـە (نوح)مـان ڕەوان کـرد، ئـەم جەختکردنەوەیـەش، یـان هـەر بـۆ شـێوازی گێڕانـەوەی هـەواڵ و بەسـەرهاتە، یاخـود بـۆ ئەوەیـە هەمـوو کـەس بزانـێ کـە نـووح عليه السلام لـە لایـەن خـوای پـەروەردگارەوە نێردرابـوو، ڕەوانکـرا بـوو، وشـەی (قَـوْم)ش، پێشـتریش گوتوومانـە: (**الَّذِيْـنَ يَقُومـوُنَ مَـع الإنسـان**) ئەوانـەی لەگـەڵ مرۆڤـدا هەڵدەسـتن و دادەنیشـن، واتـە: کۆمەڵگایەکـەی، خەڵکەکـەی، ئـەو کۆمەڵـەی لـە نێویانـدا بـووە، ﴿أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، پێـمان ڕاگەیاند: خەڵکەکـەت وریـا بکـەوە، بترسێنە، (**إنْـذار**) هـەم بەمانـای ئاگادارکردنـەوەو، هـەم بـە مانـای ترسـاندن دێ، چونکـە گوتـراوە: (**الإنْـذار: إعْـلَامٌ مَـعَ تَخْوِيْـفٍ**)، (**إنْـذار**) بریتیـە لـە ئاگادارکردنـەوە لەگـەڵ ترسـاندن، واتـە: هۆشـدارییان پێبـدەو وریایـان بکـەوە.

ئنجا ئایا لەچییان وریا بکاتەوە؟ لەوەی ئەوان بۆ حیکمەتێك لەم سەرزەوییە داندراون و، ئەم ژیانی دنیایەیان بۆ ئەنجامدانی ئامانجێك لە ژیانیاندا بۆ ڕەخسێنراوە، کەواتە: با وریابن و وریایان بکەوە لەو حیکمەت و ئامانجەی بۆی دروستکراون، کە دەبێ لەژیانیاندا بیهێننەدی، یاخود: وریایان بکەوەو بیانترسێنە، لەو سەرەنجامەی چاوەڕێیان دەکات، ئەگەر بەوشێوەیە نە ژیان کە پەسندی خوای پەروەردگارە، ﴿مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾، بەر لەوەی ئازارێکی بە ئێشیان بۆ بێ، بێگومان مەبەست لە ئازاری بە ئێش، ئازاری دنیایە، سزای خوایە لە دنیادا لەسەر لاملییان لە پەیام و بەرنامەی خواو، لە پێغەمبەری خوا ﷺ، دەشگونجێ مەبەست پێی ئازاری ڕۆژی دوایی بێ، واتە: ئازاردرانیان لە ڕۆژی دوایی دا.

﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾، نووح عليه السلام گوتی: ئەی خەڵکەکەم! ئەی کۆمەڵەکەم! من بۆ ئێوە ئاگادارکەرەوەو ترسێنەرێکی ئاشکرام، یاخود: من بۆ ئێوە ئاگادارکەرەوەو ترسێنەرێکی ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەرم، واتە: ئەوەی خوا سبحانه وتعالى لە ئێوەی ویستوە، بۆتان ڕوون دەکەمەوەو ئاشکرای دەکەم، چونکە (**مُبِيْن**) دەگونجێ لە (**أَبَانَ**)ی (لازم)ەوە بێ، کە بە مانای (**بَانَ**) دێ، وەك دەگوترێ: (**بَانَ الْقَمَرُ**) مانگەکە دەرکەوت، دەشگونجێ لە (**أَبَانَ**)ی تێپەڕێنەر (**مُتَعدِّي**)ەوە بێ، واتە: بەرکار بخوازێ، ئەو کاتەش بە مانای ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر دێ.

﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ﴾، نووح عليه السلام ئەو پەیامەی خوا پێیدا ناردوە، ئەو هۆشدارییپێدانەی خوا ئەوی پێوە پابەند کردوە، کە بەگەلەکەی ڕابگەیەنێ، لە سێ وشەدا کورت و پوختی دەکاتەوە، دەفەرموێ: هاتووم پێتان ڕابگەیەنم کە:

١- بەندایەتیی بۆ خوا بکەن.

٢- پارێز لە خوا بکەن.

٣- فەرمانبەریی منیش بکەن.

بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، واتە: هەمووو هەڵسوكەوت و ڕەفتارو هەستان و دانیشتنتان بەو جۆرە بێ، کە خوا پێی خۆشە، ئەوەیە بەندایەتیی بۆ خوا، بەندایەتیی بۆ خوا لە شتێك و دوو شتاندا بەرجەستە نابێ، لە لایەنێك و دوو لایەناندا کورت هەڵنەهاتوە، بەندایەتیی بۆ خوا (**العبادة الله**) واتە: ئەوپەڕی ملکەچیی، کە دەبێ ئەوپەڕی خۆشویستن و، سام لێکردن و، ڕێزگرتن و، بە مەزنگرتن و، بەپاکگرتن و، پشت پێ بەستنیشی لەگەڵدا ئاوێتە بێ، ئەوەش تەنیا شایستەی خوایە.

بەو شێوەیە ژیانتان بگوزەرێنن و بەندەی خوابن، بۆ ئەوەی نەبنە کۆیلەی ئەم و ئەو، بەندایەتیی خۆتان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، ﴿ وَٱتَّقُوهُ ﴾ خۆشتان بپارێزن لە خوا، یانی: خۆتان بپارێزن لە سزای خوا، پارێزکارانە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا مامەڵە بکەن، ﴿ وَأَطِيعُونِ ﴾ گوێڕایەڵیی منیش بکەن، فەرمانبەریم بۆ بکەن، پەیڕەویی من بکەن، تاکو پێتان پیشاندەم چۆن بەندایەتیی بۆ خوا دەکرێ، چۆن بە پارێزکارییەوە لەگەڵ خوادا مامەڵە دەکرێ؟

﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴾، ئەگەر ئێوە واتان کرد، (**مِنْ**) ئەگەر بۆ هەندێك (**بعض**) بێ، واتە: لە هەندێك لە گوناهەکانتان دەتانبووری، ئەو گوناهانەی پەیوەندییان بە نێوان خۆتان و خواوە هەیە، بەڵام ئەو گوناهانەی پەیوەندییان بە نێوان خۆتان و خەڵکەوە هەیە، دەبێ مافەکان بۆ خەڵك ڕەتبکەنەوە، یان گەردنی خۆتانیان پێ ئازاد بکەن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴾، دەشگونجێ (**مِنْ**) بۆ ڕوونکردنەوە (بیان) بێ، ئنجا ئەگەر بۆ ڕوونکردنەوەبێ واتە: خوا لە هەمووو گوناهەکانتان دەتانبووری.

﴿ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، هەروەها دواتان دەخات بۆ کاتێکی دیارییکراو، کاتێکی ناوبراو، واتە: ئەو کاتەی بە شێوەیەکی ئاسایی تەمەنەکەتان تەواو

دەبێ و دەمرن، ﴿ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، ئەو کاتەی خوا دیارییکردوە (بۆ فەوتاندن و سزادانی گەل و کۆمەڵگایەك کە لامل و سەرپێچیی کار دەبن)، دواناخرێ، ئەگەر بزانن.

لەڕستەی پێشێدا وشەی (**أجَل**) واتە: کاتی مەرگ و مردن، بەڵام هەمان وشە لەڕستەی دواییدا: ﴿ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئەو کاتەی خوا دیاریی دەکات بۆ فەوتاندن و سزادانی گەل و کۆمەڵگایەك، لەبەر ئەوەی بەدەم بانگی خواوە ناچن. واتە: لەو ئایەتە موبارەکەدا، وشەی (**أجَل**) جاری یەکەم بە مانایەك هاتوەو، لەڕستەی دواییدا بەمانایەکی دیکە هاتوە.

ئنجا دەفەرموێ: کاتی دیارییکراوی خوا[1]، ئەو کاتەی خوا دیاریی کردوە بۆ سزادانی ئێوە، ﴿ لَا يُؤَخَّرُ ﴾ دواناخرێ، ﴿ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، ئەگەر ئێوە بزانن، واتە: ئەگەر زانیارییتان هەبووایە، دەتانزانی ئەو کاتەی خوا دیاریی کردوە، دواناخرێ. یاخود: ئەگەر ئێوە زانیباتانەیە کاتی دیارییکراوی خوا دواناخرێ، بڕواتان دەهێناو سەرپێچییتان لە پەیامبەری خوا نەدەکرد.

ئنجا نووح عليه السلام دێتە سەر باسی گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی و گەلەکەی، چۆن گەلەکەی خۆی بانگ کردوە، بەشەوو بەڕۆژ، بە ئاشکراو بە پەنهان و، بەهەموو شێوەکان لەگەڵیاندا خەریك بووە کە ئیقناعیان بکات بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴾، نووح عليه السلام، فەرمووی: پەروەردگارم! من کۆمەڵەکەی خۆمم، گەلەکەی خۆمم، بەشەوو بەڕۆژ بانگ کردوون، واتە: بانگم کردوون بۆ لای تۆ، بۆ بەندایەتیی کردن بۆ تۆ، بۆ شێوە ژیانێك کە شایستەی مرۆڤە، شێوە ژیانێکی ڕێك و پێك و، پاك و خاوێن و چاك لە دونیادا، کە سەرفرازیی ڕۆژی دوایی بەدوادا دێ.

---

(١) (الأجَلُ: الـمُدَّة المَضْروبَةُ لِلشَّيء):(أجل) ئەو کاتەی دیارییکراوە بۆ ئەنجامدانی کارێك.

﴿ فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا ﴾، کەچی بانگکردنی من تەنیا ڕاکردنی تێدا زیاد دەکردن، تەنیا دوورکەوتنەوەی تێدا زیاد دەکردن.

﴿ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوۡتُهُمۡ لِتَغۡفِرَ لَهُمۡ ﴾، من هەر کاتێك بانگم دەکردن بۆ ئەوەی تۆ لێیان ببووری، ﴿ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ ﴾، پەنجەکانیان دەخستنە گوێیەکانیانەوە، (أَصَابِع) کۆی (أُصْبع)ە، بێگومان پەنجە هەمووی ناخرێتە نێو گوێوە، واتە: سەرە پەنجەکانیان، بەڵام بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَصَٰبِعَهُمۡ ﴾ نەك (أَنَامِلَهُم)، بۆ پێشاندانی زێدەڕۆیی ئەوان، لە نەبیستندا، کە ئەگەر بۆیان کرابایە، هەموو پەنجەکانیان دەخستنە نێو گوێیەکانیانەوەو تاکو هیچ شتێك نەبیستن، لەوەی نووح ﷺ پێیان دەفەرموێ.

ئنجا هەر بەوەندەش وازیان نەدەهێنا کە پەنجەکانیان دەخستە گوێیەکانیانەوە، بەڵکو ﴿ وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ ﴾، دەم و چاویان بە پۆشاکەکانیان دادەپۆشی، ﴿ وَأَصَرُّواْ ﴾، زۆریش مکوڕبوون، (إِصْرَار) لە (صَرّ)ەوە هاتووە، واتە: (شَدّ) زۆر بە توندیی و سەختیی مکوڕبوون لەسەر ئەوەی گرتبوویانە بەر لە بتپەرستیی و دوور لە خوایی، هەروەها لە هاوبەش بۆ خوا دانان، ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ ٱسۡتِكۡبَارٗا ﴾، بە خۆبەزلگرتنێکی زۆر سەرسوڕهێنەریش خۆیان بەزل گرت.

بەڵام ئایا نووح ﷺ کە ئەوان ئەوپەڕی عینادیی و کەللە ڕەقیی و گوێنەگرتنیان لە خۆیاندا بەرجەستە کردوە، بەوەندە وازی لێهێناون و نائومێد بووە؟ نەخێر، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنِّي دَعَوۡتُهُمۡ جِهَارٗا ﴾، دوایی من بە دەنگی بەرز بانگم کردن.

﴿ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعۡلَنتُ لَهُمۡ وَأَسۡرَرۡتُ لَهُمۡ إِسۡرَارٗا ﴾، دوایی من ئەو بانگەوازەم بۆ ئاشکرا کردن و، بە پەنهانکردنێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بۆم پەنهان کردن، واتە: هەم بە دەنگی بەرز بانگم دەکردن، هەم بە دەنگی نزم، هەم بە ئاشکرا هەم بە پەنهانیی، بە هەموو شێوەکانی دواندن، دەمدواندن، بە هەموو شێوەکانی بانگکردن، بانگم

دەکردن، دیارە بە پێی سرووشتی کاتەکان و، بە پێی دۆخی خەڵکەکەو، بە پێی قۆناغەکە، وەك گوتراوە: (لِكُلِّ مَكَانٍ مَقَال)، هەندێك لە توێژەرەوان و ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: بۆ خەڵکەکە بە گشتیی بە دەنگی بەرز بانگی کردوون، بەڵام بۆ سەرانیان، بۆ بەرپرسەکانیان بە دەنگی نزم، بۆ هەندێکیان بە ئاشکرا لە کۆڕو مەجلیسداو لە بۆنەکاندا بانگی کردوون، بەڵام بۆ ئەوانی دیکە چووە بە تایبەتیی و بە پەنهانیی و پەنامەکیی دواندوونی، چونکە بۆ ئەوان ڕەنگە ئاوا باشتر وەربگیرێ، بەڵام بێگومان یەك یەکی خەڵکەکە ناگونجێ بە تایبەتی قسەیان لەگەڵدا بکات، واتە: هەموو شێوازەکانی بانگەوازی گرتوونە بەر.

ئنجا دێتە سەر باسی نێوەڕۆکی بانگەوازو پەیامەکەی، کە پێشتریش بە گشتیی باسیکردو فەرمووی: ﴿ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴾، ئێوە ئەو سێ کارە ئەنجام بدەن: بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، پارێز لە خوا بکەن و، گوێڕایەڵیی من بکەن، هەروەها پێشیگوتن: ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ لە گوناهەکانتان دەتانبووڕێ و دواشتان دەخات بۆ کاتێکی دیارییکراو، واتە: دەتانژیەنێ، وەك لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴿٣﴾ ﴾**هود**، واتە: بە بەهرەمەندکردنێکی باش بەهرەمەندتان دەکات، تاکو کاتی دیارییکراو، تاکو کاتی مردنی ئاساییتان، کە تەمەنی سرووشتییتان تەواو دەبێ، بەڵام ئەمجارە زیاتر تیشك دەخاتە سەر نێوەڕۆکی بانگەوازو پەیامەکەی و دەفەرموێ: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾ پێمگوتن: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴾، بە دڵنیایی ئەو زۆر لێبوردەیە، زۆر تاوانپۆشە.

واتە: داوای لێبوردنی لێبکەن کە تاکو ئێستا هاوبەشتان بۆ داناوەو بت و سەنەمتان پەرستوەو ستەم و خراپەتان کردوە، ...هتد، ئەگەر وا بکەن، ئەو زۆر تاوانپۆش و لێبوردەیە، واتە: پێتان وانەبێ هەر گوناهێکتان هەرچەندە زۆر گەورەو بێڕەزابێ، خوای لێبوردە نەتوانێ بیبەخشێ و لێیببووری، بە مەرجێك ئێوە داوای لێبوردنی لێ بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای.

ئنجا وێڕای ئەوە چیدیکەشتان بۆ دەكات؟

پێشـێ تەنیـا فەرمـووی: ﴿ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، دواتـان دەخـات بـۆ كاتـی دیارییكـراوی كۆتایـی پێهاتنـی ژیـان و تەمەنتـان، بـەڵام ئەمجـارە وردەكاریـی زیاتـر بـاس دەكات، لـەو چاكـەو نیعمەتانـەی خـوای بـە بەزەیـی لەگەڵیانـدا دەكات، لـە ئەنجامـی داوای لێبـوردن كردنیـان لـە خـواو گەڕانەوەیـان بـۆ لای و بەندایەتییـان بـۆی دا.

دەفەرمـوێ: ﴿ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴾، ﴿ ٱلسَّمَآءَ ﴾، چ بـە مانـای سـەرەوە بـێ، چ بـە مانـای ئـەو ئاوەبـێ كـە لەسـەرەوە دێتـە خـوار، چ بـە مانـای هـەور بـێ، واتـە: لەسـەرێوە بـە خـورزەم ئاوتـان بـۆ دادەبارێنـێ، یاخـود: لـە هەورێـك كـە لەسـەرێیە بـە خـورزەم ئاوتـان بـۆ دادەبارێنـێ، یاخـود: ئـەو ئـاوەی لەسـەرێیە بـە خـورزەم بۆتـان هەڵدەڕێـژێ، بـە هـەر سـێ شـێوەكانی: بـاران و بەفـرو تـەرزە.

ئنجـا لـە ئەنجامـی ئـاوی هەڵـڕژاوی زۆر لـە ئاسـمانەوە - كـە بێگومـان هەمـوو نیعمەتەكانـی دیكـەی ژیانـی دنیـا پەیوەندییـان بـە ئـاوەوە هەیـە، وەك گوتـراوە: (ئـاوو ئاوەدانیـی) - كۆمەڵێـك چاكـەو نیعمـەتی دیكـە دێنـە ئـاراوە، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ ﴾، هەروەهـا مـاڵ و سـامانتان بـۆ زۆر دەكات، یـان بۆتـان دەڕەخسـێنێ و كوڕانیشـتان بـۆ دەڕەخسـێنێ، لێـرەدا مەبەسـت وەچەیـە بـە گشـتیی، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئـەوان زیاتـر دڵیـان بـە كـوڕان خۆشـبووە، وەك پشـت و هێـزو دەبنـە درێژەپێـدەری وەچـەی خۆیـان، یاخـود وەك زاڵكردنـی باسـی نێرینـان بەسـەر مێینانـدا، ئـەوەش بنچینەیەكـە لـە زمانـی عەرەبییـدا (**تَغْلِيْب الذكُور عَلَى الإنَاث**) بۆیـە تەنیـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَبَنِينَ ﴾ بـە یەكێـك لـەو دوو ئیعتیبارانـەی باسـمان كـردن، واتـە: هـەم مـاڵ و سـامانتان بـۆ زۆر دەكات، هـەم كوڕانتـان بـۆ زۆر دەكات، یـان: ڕۆڵەكانتـان لـە كـوڕان و كچـان بـۆ زۆر دەكات، ﴿ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ

﴿وَيَجۡعَل لَّكُمۡ أَنۡهَٰرٗا﴾، هەروەهـا باخەكانتـان بـۆ دەڕەخسـێنێ و ڕووبـارو جۆگـەو جۆباریشـتان بـۆ دەڕەخسـێنێ.

ئنجـا دوای خسـتنەڕووی ئـەو نیعمەتانـە: هەڵڕژانـی ئـاوی زۆر لەسـەریێوە، پاشـان زۆركردنـی مـاڵ و سـامان بۆیـان و، زۆركردنـی ڕۆڵـەكان كـوڕان و كچـان، یـان بـەس كـوڕان بۆیـان، هەروەهـا ڕەخسـاندنی بـاغ و گـوڵ و گوڵـزارو بێسـتان و كشـتوكاڵ و جۆگـەو جۆبـارو ڕووبـار بۆیـان.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿مَّا لَكُمۡ لَا تَرۡجُونَ لِلَّهِ وَقَارٗا﴾، ئـەوە چیتانـە وەقـاڕو پێگـەی بـەرز بـۆ خـوا ئومێـدەوار نیـن، یاخـود (**تَرْجـوُن**) واتـە: (**تَعْتَقِـدُون**) یانـی: (**مَـا لَكُـمْ لَا تَعْتَقِـدُوْن للـه وَقَـارًا**)، بۆچـی بڕواتـان نیـە بـە پایـە بەرزیـی خـوا، زانایـان هەندێكیـان گوتوویانـە: (**تَرْجـوُن**) واتـە: (**تَخَافُـون**)، (**مَـا لَكُـمْ لَا تَخَافُـون للـهِ عَظَمَـةً**)، چیتانـە! بۆچـی مەترسییتان نیـە لـە مەزنیـی خـوا سبحانە و تعالی؟ لەبـەر ئـەوەی گوتوویانـە: (**الخَـوْفُ وَالرَّجَـاءُ يَتَلَازَمَـان**)، تـرس و ئومێـد پێكـەوەن، كەواتـە: هەنـدێ جـار وشـەی (**رَجَـاء**) بـە مانـای ترسـەو، جـاری وایـە ترسـیش بـە مانـای ئومێـدە، واتـە: ئـەوە چیتانـە، چ شـتێك ڕێگرتانـە، بۆچـی مەزنیـی و بەرزیـی خـوا ڕەچـاو ناكـەن و، ترسـتان بەرانبـەری نیـەو ئومێدتـان بەرانبـەری نیـە و، پێـی بـڕوادار نیـن؟

﴿وَقَدۡ خَلَقَكُمۡ أَطۡوَارًا﴾، لـە حاڵێكـدا خـوا ئێـوەی قۆنـاغ قۆنـاغ پێگەیانـدوە، (**أَطْوَار**) كـۆی (**طَـوْر**)ە، واتـە: كـەڕەت، قۆنـاغ، دەڵـێ: (**خَـرَجَ مِـنْ طَـوْرِه**) واتـە: فڵانكـەس لـە قۆناغـی خـۆی دەرچـووە، لـە كەوڵـی خـۆی دەرچـووە، (**أَطْـوَار**) دەگونجـێ مەبەسـت پێـی قۆناغـەكان بـێ، كـە مـرۆڤ لـە منداڵدانـی دایكیـدا دەیانبـڕێ، لـە (**نطفـة**)ەوە بۆ عەلەقـە، بـۆ زارجـوو (**مضغـة**)، ئنجـا بـۆ ئێسـقان و، داپۆشرانـی ئێسـقان بـە گۆشـت، دوایـی ڕووح بەبەرداكـران، وەك لـە سـەرەتای سـوورەتی (**المؤمنـون**)دا خـوا سـبحانە و تعالـی بـە حـەوت قۆنـاغ باسـی كـردوە، ئێمـە كاتـی خـۆی كورتـە باسـێكمان لـە بـارەی درووسـتكرانی مرۆڤـەوە لـەوێ خسـتە ڕوو، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی

قۆناغەکانی دیکە بێ، کۆرپەیی، منداڵیی، هەرزەکاریی، گەنجیی، کامڵ بوون، پیریی، تاکو کۆتایی، یاخود مەبەستی پێی هەموویان بێ، هەم قۆناغەکانی کە لە نێو منداڵدانی دایکدا دەبڕدرێن، هەم قۆناغەکانی دوایی کە لە ژیانی دوای لە دایك بوون، دەگوزەرێن.

﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴾ ئایا نەتانڕوانیوە (بە چاوی سەر سەرنجتان نەداوە) چۆن خوا حەوت چین ئاسمانی هێناونە دی، ئنجا ئەگەر مەبەست لە دیتن، چاوی سەر بێ، ئێمە تەنیا شینایییەك لەسەر سەری خۆمانەوە دەبینین، حەوت ئاسمانەکان نابینین، بەڵام خوا سبحانە و تعالی بۆیە بەو گوزارشتە باسی کردوە، چونکە ئەگەر خوا بناسی، مانای وایە هەرچی خوا دەیفەرمویٚ، دەبێ لە بە چاو بینینی خۆت، زیاتر باوەڕت پێی هەبێ، چونکە چاوی تۆ شتێك دەبینێ، بەهەڵەدادەچێ، بەڵام ئەوەی خوا دەیفەرمویٚ، سەدا سەد وایەو هەڵەی تێدا نیە، چونکە خوا لە زانیاریی بێ سنوورەوە فەرمایشت دەکات، بەڵام ئەگەر مەبەست بینینی عەقڵ بێ، واتە: ئایا بە عەقڵ و دڵ سەرنجتان نەداوە، خوا چۆن حەوت چین ئاسمانی لەسەر ئێوەوە دروست کردوون، کە دیسان ئەو حەوت چین ئاسمانەش بە چاوی عەقڵ و دڵ نابینرێن، مەگەر لە ڕێی هەواڵپێدانی خواوە، ئەگەرنا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، زانست نەگەیشتوە بەوەی مەتەڵی حەوت ئاسمانەکان حەل بکات، بەڵام بێگومان بە چاوی عەقڵ و دڵ دەرك دەکرێ، کە خوای پەروەردگار هەواڵت پێدەدا لە بارەی ئەوەوەی دروستیکردوە، مانای وایە هەواڵپێدانی خوات پێ وەك بینینی خۆت بێ، بەڵکو دەبێ پێت لە بنینی خۆشت زیاتر بێ.

﴿ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴾، هەروەها خوا لە نێو ئەو حەوت ئاسمانانەدا مانگی گێڕاوە بە ڕووناکیی، ﴿ وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴾، خۆریشی گێڕاوە بە چرا، بە زۆریی خوای زاناو توانا لە قورئاندا کە باسی مانگ دەکات، هەر باسی ڕووناکیی (نور) دەکات لەگەڵیدا، لەبەر ئەوەی ڕووناکیی مانگ هی

خـۆی نیـە، بەڵکـو هـی خـۆرە لێیـدەداو عەکسـی دەداتـەوە، بـەڵام بـۆ خـۆر (شـمس) دەفەرمـوێ: (سِرَاجًا)و، لـە سـوورەتی (النبـأ)دا دەفەرمـوێ: ﴿ سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ ﴾ **النبـأ**، چرایەکـی زۆر تیشـکدەر، لەبەرئـەوەی (خـۆر) تیشـکەکەی هـی خۆیەتـی.

﴿ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴾، هەروەهـا خـوا ئێـوەی لـە زەوییـدا ڕوانـدوە بـە ڕوانـدن، وەك چـۆن كشـتوكاڵێك پێـدەگا، خـوای كاربەجێـش ئێـوەی ئـاوا وردە وردە پێگەیانـدوە، ئنجـا ئەمـە چ مەبەسـت قۆناغەكانـی نێـو منداڵدانـی دایـك بـێ، وەك چـۆن درەختێـك لـە نێوكێكـەوە چەكـەرە دەكات، دوایـی وردە وردە دەبێتـە نەمـام و گـەورە دەبـێ، مرۆڤیـش بـە هەمـان شـێوە لـە (نُطفة)یەكـەوە قۆنـاغ بـە قۆنـاغ، چ مەبەسـت دوای لـە دایـك بـوون بـێ، كـە سـەرەتا كۆرپەیـەو تەنیا دەتوانـێ شـیری دایكـی بخـوا، دوایـی وردە وردە گەشـە دەكات و دەچێتـە قۆناغـی منداڵیـی و هەرزەكاریـی و تاكـو كۆتایـی.

﴿ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴾، دوایـی خـوا دەتانگێڕێتـەوە نێـو زەوی، یـانی: دوای مردنتـان خـوا جەسـتەكەتان دەگێڕێتـەوە نێـو زەوی و، دەبێتـەوە بـە خـاك و خـۆڵ، ﴿ وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴾، جارێكـی دیكـەش بـە دەرهێنانێكـی سەرسـوڕهێنەر دەرتـان دەهێنێتـەوە، كـە ڕۆژی قیامـەت و زیندووكرانـەوە و هەڵسـێنرانەوەیە.

﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴾، خـوا زەوی بـۆ كـردوون بـە ڕایـەخ، یاخود زەوی بـۆ پـان ڕاخسـتوون، (بِسَاط) هـەر شـتێكە ڕاخرابـێ، وەك چـۆن ڕایەخێـك ڕادەخـرێ، ئـاوا خـوای پـەروەردگار زەوی بـۆ پانڕاخسـتوون. یاخـود: زەوی بـۆ وا لێكـردوون وەك چـۆن شـتێك ڕادەخـرێ، بـەو شـێوەیەی بـۆی لێكـردوون.

﴿ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ﴾، تاكـو لـە نێـو كەلێـن و شـیوو دۆڵەكانـی زەویـدا ڕێیـەكان بگرنـە بـەر، (سُبُل) كـۆی (سَـبِيْل)ە، (فِجَاج)یـش كـۆی (فَـجّ)ە، بـە مانـای كەلێـن و درز، واتـە: ڕێیـەكان بەكەلێنەكانـی زەویـدا، بەنێـو دابڕاواییەكانـی چیاكان و گردۆلكەكانـدا بگرنـە بـەر.

کەواتـە: خوایـەك ئـەو هەمـوو نـازو نیعمەتانـەی بـۆ ڕەخسـاندووون، شایسـتەی ئەوەیـە تەنیـا ئـەو بپەرسـتن و بەندایەتیـی بـۆ ئـەو بکـەن، ئـەو پەیامـەی بـە نـووح ﷺ دا بـۆی نـاردوون لێـی وەربگـرن و، گوێڕایەڵیـی لـە پێغەمبەرەکـەی بکـەن، پێشـتان دەکـەوێ تاکـو بەندایەتیـی بـۆ خـواو، پارێزکاریـی لـە خـواو شـێوە ژیانێـك کـە لـە لای خـوا پەسـندە، فێرتـان بـکات.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی خوا سبحانه و تعالى: ناردنی نووح (عليه السلام) بۆ لای خەڵکەکەی، کە وریایان بکاتەوەو بیانترسێنێ، بەر لەوەی ئازاری بە ئێشیان بۆ بێ:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ﴾، بە دڵنیایی ئێمە نووحمان (عليه السلام) ڕەوان کرد بۆ لای خەڵکەکەی، وشەی (إِنَّآ) لە ئەسڵدا (إنّنا)یە، (نا)یەو (إنّ)ی خراوەتە سەر، بۆتە (إنّنا)، بێگومان ئێمە، ئنجا ئەم جەختکردنەوەیە، چونکە (إنّ): **(إنّ تَنْصِب الإسْمَ وَترفَعُ الخَبَرَ، وَتُفِيْدُ التَّأكِيْد)**، (إنَّ) لە ڕێزمانی عەرەبییدا ناو (منصوب) دەکات و، گوزارەش (مرفوع) دەکات و، جەخت لەسەر کردن دەگەیەنێ و جەختکردنەوەکەش بۆ گرنگیی دان بەو هەواڵەیە کە دەیدا، چونکە لێرەدا مەقام مەقامی نکووڵییلێکردن نیە، تاکو خوا سبحانه و تعالى جەختی بکاتەوە، یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان وا دەڵێ، بەڵکو بۆ گرنگییدا بە هەواڵەکەیە، یانی: بە دڵنیایی و بە گرنگیی پێدانەوە، پێتان ڕادەگەیەنین کە نووحمان ڕەوانکرد بۆ لای خەڵکەکەی.

بەڵام من دەڵێم: بەڵکو لێرەدا مەقام مەقامی نکووڵییلێکردنە، چونکە هەم گەلی نووح نکووڵییان کردوە لە پێغەمبەربوونی نووح (عليه السلام)، هەم ئەو کۆمەڵگایەی قورئانی بۆ دابەزیوە، وەك کۆمەڵگایەکەی پێغەمبەر نووح، نکووڵییان کردوە

لەوەی خوا پێغەمبەرانی ناردبن، بەڵێ دەماو دەم بیستوویانە کە نووح هاتوە بۆ لای گەلەکەی و، مووسا بۆ لای بەنی ئیسرائیل، بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی تیۆرییش وەك بەسەرهاتێك ئەوەیان قبووڵ بووبێ، بە کردەوە قبووڵیان نەبووە، چونکە هەم کۆمەڵگایەکەی پێغەمبەری خوا، هەم کۆمەڵگایەکانی دیکەش هەمیشە نکووڵییان لەوە کردوە، خوا لە بەشەران پێغەمبەران بنێرێ و گوتوویانە: ﴿أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا ﴿٦﴾﴾ **التغابن**، یان گوتوویانە: ﴿أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَسُولًا ﴿٩٤﴾﴾ **الإسراء**، واتە: ئایا بەشەر ڕێنماییمان دەکەن (بۆ لای خوا)؟ ئایا خوا پێغەمبەرێکی مرۆڤی ناردوە؟ کەواتە ئەوان نکووڵییان لەوە کردوە کە نووح عليه السلام پێغەمبەری خوا بووبێ، بۆیەش خوا جەختی کردۆتەوە کە بەدڵنیایی ئێمە نووحمان ناردبوو، نووح عليه السلام لەخۆوە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیی نەکردوەو، لەخۆوە پەیامی بەناوی خواوە بە خەڵك ڕانەگەیاندوە.

٢) ﴿أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ﴾، (پێمانگوت): کە خەڵکەکەت بترسێنە، وریایان بکەوە، ﴿أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، ئەمە نیوەڕۆکی پەیامەکەی نووح عليه السلام بووە، پەیامەکەی نووح عليه السلام کە خوا پێیدا ناردوە، ئەوە بووە کە خەڵکەکەت بترسێنەو وریایان بکەوە، ﴿مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، بەر لەوەی ئازارێکی بەئێشیان بۆ بێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ﴾ خەڵکەکەت بترسێنە، وریایان بکەوە، نەیفەرمووە لەچی؟ بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە کە پێغەمبەران خەڵکەکەی خۆیانیان لێ ترساندوون و وریایان کردوونەوە بەرانبەریان، کە ئێوە ئەگەر خوا نەپەرستن لە دنیادا سزاتان دەدات و بەڵاتان بۆ دەنێرێ، لە دوارۆژیشدا تووشی سزاو مەینەتیی دەبن، هەروەها ئەگەر خوا نەپرستن، لە دنیادا تووشی کۆیلایەتیی و بت و سەنەم پەرستیی دەبن، هەروەها ئەگەر خوا نەپرستن، تووشی دەردو بەڵا دەبن، تووشی نەخۆشیی و گرفتاریی دەبن، هەموو ئەوانە بخە بەرچاوی خەڵکەکەت و ئەوانی پێ بترسێنە، بۆیە لێرەدا خوا ئەوەی خەڵکەکەی پێ دەترسێنێ، باسی نەکردوە، تاکو هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە.

٣) ﴿ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، بەرلەوەی ئازارێكی بە ئێشیان بۆبێ، هەندێك گوتوویانە: (مِنْ) لێرەدا: (**زَائِدَةٌ للتَّأكِيْد، أي: قَبْلَ أنْ يَأتِيَهُم**)، واتە: (مِنْ) زیادكراوە بۆ جەختكردنەوە، واتە: وریایان بكەوە كە هەر لە سەرەتاوە ئازاری بەئێشیان بۆ نەیەت، یاخود: (مِنْ) بۆ هەندێكە، یاخود بۆ ڕوونكردنەوەیە، ئنجا ئەم ئازارە بە ئێشە:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئەو تۆفانە بێ، كە دوایی خوا ناردی بۆ گەلی نووح عليه السلام و بەهۆیەوە قڕەبڕی كردن.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی سزای ڕۆژی دوایی بێ.

ج- دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو ئازارو مەینەتییانە بن، كە خەڵك بەهۆی ژیانی دوور لە خواییەوە، لەگەڵیاندا دەستەویەخە دەبێ.

وشەی (قَوْمُ) كە دەفەرموێ: ﴿ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ ﴾، دەڵێ: (**والقَوْمُ: الجَماعَةُ مِنَ النّاسِ الَّذِينَ يَجْمَعُهم مَوْطِنٌ واحِدٌ، أوْ نَسَبٌ واحِدٌ، بِرِجالِهِمْ ونِسائِهِمْ وأطْفالِهِمْ**). واتە: (قەوم): كۆمەڵێك لە خەڵك، كە شوێنێك یاخود ڕەچەڵەكێك كۆیان دەكاتەوە، پیاویان و ئافرەتیان و منداڵیان هەموویان دەگرێتەوە، ئنجا پێشتریش باسمان كرد كە ئێمە بەسەرهاتی نووحمان لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا بە درێژیی باس كردوەو، پێم وایە لە قەدەر قەبارەی ئەم تەفسیرە مافی خۆیمان پێداوە، بۆیە ئێمە لێرە ناچینە نێو وردەكارییەكانی بەسەرهاتی نووح عليه السلام و چەند شتێكی بنەڕەتیی دەخەینەڕوو:

١- بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وا پێدەچێ نووح یەكەمین پێغەمبەری خاوەن ئوممەت بووبێ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**أَوَّلُ رَسُولٍ أُرْسِلَ نُوحٌ وَأُرْسِلَ إِلَى جَمِيعِ أَهْلِ الْأَرْضِ**}[1] واتە: یەكەمین نێردراوێك كە نێردرابێ نووح بووەو، بۆ تێكڕای خەڵكی سەرزەوی نێردراوە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٨، ص٢٩٨.

**٢-** وا پێدەچێ گەلی نووح ﷺ ئەوكاتە تێكڕای مرۆڤەكانی ئەو ڕۆژگارە بووبن، هەم بەپێی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەم بە پێی ئەوەش كە تۆفانەكەی نووح ﷺ چ هەموو سەر زەوی داگرتبێ، چ تەنیا ئەو ناوچە جوگرافییەی داگرتبێ كە گەلی نووحی لێبووە، گرنگ ئەوەیە لە دوای ئەوانەوە كە فەوتێنراون لە گەلی نووح، هیچ بەشەرێك لەسەر زەوی نەماوەتەوە، چونكە خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾**الصافات**، واتە: وەچەكەی نووحمان كردن بە ماوەكان، واتە: ئەوانەی مابوونەوە لە مرۆڤان، تەنیا ئەوانەبوون كە لەگەڵ نووحدا سواری كەشتییەكە بوون، كەواتە: تۆفانەكە چ گشتگیر بووبێ بۆ هەموو سەر زەوی، چ تەنیا ئەو شوێنەی گرتبێتەوە كە گەلی نووحی ﷺ لێبووە، گرنگ ئەوەیە مرۆڤەكان تەنیا ئەوانە بوون كە لەوێ بوون.

چونكە ڕێی تێناچێ لە شوێنێكی دیكە كۆمەڵێك مرۆڤ بووبن و خوا بە تۆفانەكەی نووح فەوتاندبنی، بێ ئەوەی پەیامی نووحیان پێ بگات!! بۆیە هەر ئەوەندە مرۆڤە بوون لەو شوێنەی نووحی لێبووەو، ئاگاداری كردوون و ترساندوونی و وریای كردوونەوە، دوای ئەوەی (٩٥٠) ساڵ لە نێویاندا ماوەتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَـٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾**العنكبوت**، كەواتە: ئەو خەڵكە دیارە یەك كۆمەڵی دیارییكراو بوون و، هەر ئەوەندە مرۆڤە هەبوون ئەو كاتە لەسەر زەوی.

**٣-** لە فەرموودەی شەفاعەتی گەورەشدا هاتوە، كە خەڵك پێشی دەچن بۆ لای ئادەم تاكو تكایان بۆ بكات لە لای خوای پەروەردگار، لێپرسینەوەو سزاو پاداشت دەست پێ بكات، ئەویش دەڵێ: من لە درەختە قەدەغەكراوەكەم خواردو توانای ئەو داوایەم نیە، ئنجا دەچن بۆ لای نووح ﷺ و پێی دەڵێن: تۆ یەكەمین پێغەمبەرو ڕەوانەكراوی خوا بووی بۆ سەر زەوی، كەواتە: دیارە نووح ﷺ یەكەمین پێغەمبەری خاوەن كۆمەڵگەیەكی گەورە بووە، ئەگەرنا دیارە لە پێش نووحیشدا پێغەمبەرانی دیكە بوون، خوای پەروەردگار جگە لە ئادەم، باسی ئیدریسیشی كردوە لە پێش نووحدا ﷺو، لە هەندێ شوێنەواراندا باسی (شیث)یش كراوە.

### مەسەلەی دووەم:

**بانگکردنی نووح بۆ گەلەکەی کە ترسێنەرێکی ڕوونە بۆ لایان، تاکو خوا بپەرستن و پارێزی لێ بکەن و، گوێڕایەڵیی وی بکەن، کە لە ئەنجامدا لە گوناهەکانیان ببوورێ و، هەتا کاتی دیاریکراویش کە بە شێوەی ئاسایی تێیدا دەمێننەوە، دوایان بخات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ۝٢ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ۝٣ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٤ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، نووح ﷺ بە گەلەکەی خۆی فەرموو: ئەی گەلەکەم! (ئەی خەڵکەکەم) بە دڵنیایی من بۆ ئێوە ترسێنەرو وریا کەرەوەیەکی ڕوونم، یاخود: ترسێنەرو وریا کەرەوەیەکی ڕوونکەرەوەم، وەك زۆرجار گوتوومانە: (**مُبِيْن**)، لە هەندێك سیاقاندا کە دێ، هەم دەگونجێ بە مانای ئاشکرا بێ، هەم دەگونجێ بە مانای ڕوونکەرەوە بێ، چونکە وشەی (**مُبِيْن**)، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە دەگونجێ لە (**أَبَان**)ی (لازم)ەوە بێ، (**أَبَان القَاصِر**)، وەك: (**أَبَان اللَّيْل**)، یانی: (**بَانَ اللَّيْل**)، شەوگارەکە دەرکەوت، یاخود: (**أَبَان القَمَر**)، یانی: (**بَانَ القَمَر**)، مانگەکە دەرکەوت، واتە: پێویستیی بە بەرکار (**مَفْعُول بِه**) ناکات، دەشگونجێ لە (**أَبَان**)ی تێپەڕەوە بێ بۆ بەرکار، (**أَبَانَ المُتَعَدِّي إلى المَفْعُول**)، ئەو کاتەش، واتە: ڕوونکەرەوە، وەك: (**أَبَان النَّهَارُ الأَرْضَ**)، ڕۆژگار سەر زەوی ڕۆشنکردەوە، یاخود: (**أَبَانَ المُدَرِّسُ الدَّرْس**)، وانەبێژەکە وانەکەی ڕوونکردەوە، (بۆ وانە پێبێژراوەکە)، لێرەش دا هەردووك واتایەکە گونجاون: ئەی خەڵکەکەم! من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکرام، یان ترسێنەرێکی ڕوونکەرەوەم، واتە: ڕوونکەرەوەی ئەو شتانەم کە خوا پێیدا ناردووم و پێویستە بیانزانن، لێرەشدا دیسان: ﴿ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ ﴾، وشەی (**نَذِيْرٌ**)، کە بە مانای (**مُنْذِر**)

ە، واتە: ترسێنەر یان ورياكەرەوە، بەڵام باسی نەکردوە کە لەچی دەیانترسێنێ و وریایان دەکاتەوە؟ بەڵکو بە گشتیی گوتوویەتی، تاکو هەموو شتێك بگرێتەوە، یانی: دەتانترسێنم لەوەی ئەگەر ڕوو لە خوا نەکەن، شەیتان زەفەرتان پێ دەبات، یان ئەگەر ڕوو لە خوا نەکەن و خوا نەپەرستن و بەندایەتیی بۆ خوا نەکەن، دەردو نەخۆشیی و بەڵاتان لە نێودا بڵاو دەبێتەوە، زوڵم و ستەم و خراپەتان لە نێودا بڵاودەبێـەوە، بەدڕەوشتیی و ناتەبایی و خراپەتان لە نێودا بڵاودەبێتەوە، هەروەها ئەگەر بەندایەتیی بۆ خوا نەکەن، بەڵاتان بۆ دەنێرێ لە دنیاداو لەبەینتان دەبات، یان لە ڕۆژی دوایی دا، خوا ﷻ سزاتان دەدات، هەموو ئەوانە دەگرێتەوەو جگە لە ئەوانەش دەگرێتەوە.

٢)- ﴿ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴾، (بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە هاتووم ئاگادارتان بکەمەوەو بتانترسێنم) تاکو ئێوە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و پارێزی لێ بکەن و، گوێڕایەڵیی منیش بکەن، کەواتە: ئەو سێ موفرەدەیە نێوەڕۆك و جەوهەری پەیام و بەرنامەکەی نووح عليه السلام بوون: بەندایەتیی بۆ خواو، پارێزکردن لە خواو، فەرمانبەریی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

لێرە لەم ڕستەی یەکەمدا کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴾، پێنج جەختکەرەوە هەن:

١- (يَٰقَوۡمِ)، ئەی گەلەکەم! واتە: منیش یەکێکم لە خۆتان و ئێوەش کۆمەڵ و خەڵکی منن پەرۆشمن و بەتەنگتانەوەم.

٢- (إِنِّي)، بە دڵنیایی من (إِنِّي)یش، دیسان لە ئەسڵ دا (إنّني)یە.

٣- (لَكُمۡ)، بۆ ئێوە.

٤- (نَذِيرٞ)، ترسێنەرو وریاکەرەوەم.

٥- (مُّبِينٌ)، ڕوون، ڕوونکەرەوە.

ئنجا ئایا ئەگەر ئێوە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، پارێزی لێ بکەن و، گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی من بکەن، خوا چیتان بۆ دەکات؟.

٣)- ﴿ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ ﴾، لە گوناهەکانتان دەتانبووریٚ.

وشەی (مِّنْ):

١- یان بۆ جەختکردنەوەیە واتە: لە هەموو گوناهەکانتان دەتانبووریٚ، هەر لە سەرەتای گوناهان تاکو کۆتایی.

٢- یاخود بۆ هەندیٚکە، ئنجا ئەگەر بۆ هەندیٚك بیٚ، واتە: لەو گوناهانەی مافی خوان لەسەر ئیٚوە، لە نیٚوان خۆتان و خواداو زیانیان بۆ خەڵك نەبووە، لەو گوناهانە دەتانبووریٚ، بەڵام ئەوانی دیکە کە ماف و هەقی خەڵکتان کەوتۆتەلا، دەبیٚ مافەکان بۆ خەڵك ڕەت بکەنەوە، یان گەردنتان ئازاد بکەن.

٣- دەشگونجیٚ (مِنْ)، بۆ ڕوونکردنەوە بیٚ، واتە: خوا لە هەموو گوناهەکانتان دەتانبووریٚ، تەنانەت ئەوانەش کە مافی خەڵکن، ئەگەر ئینسان بەڕاستیی بۆ لای خوا بگەڕیٚتەوە: (**الإِسْلَامِ يَجبُّ مَا قَبْله، وَالتَّوْبة تجَبُّ مَا قَبْلَهَا**)، ئیسلام پیٚش خۆی دەسڕیٚتەوەو، گەڕانەوەش بۆ لای خوا پیٚش خۆی دەسڕیٚتەوە.

٤)- ﴿ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ ﴾، دواشتان دەخات بۆ کاتیٚکی دیارییکراو، ﴿ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ ﴾، (**التَّأْخِيْرُ: التَّأْجِيْلُ وَأُطْلِقَ عَلَى التَّمْدِيْد وَالتَّوْسِيع**)، کە دەفەرمویٚ: دواتان دەخات، لیٚرەدا مەبەست پیٚی تەمەنتان دریٚژ دەکات، تەمەنتان بۆ فراوان دەکات تاکو کویٚ؟ ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ ﴾، تاکو ئەو کاتەی ناوبراوەو دیارییکراوە، کە مەبەست پیٚی کۆتایی ژیانە، واتە: تاکو تەمەنی سرووشتییتان بە شیٚوەیەکی ئاسایی دەگوزەریٚنن، دەتانژیەنیٚ، (**وَالْأَجَلُ الْمُسَمَّى: هُوَ الْأَجَلُ الْمُعَيَّنُ بِتَقْدِيرِ اللَّهِ عِنْدَ خَلْقه كُلِّ أَحَدٍ مِنْهُمْ، فَالتَّنْوِينُ فِي (أَجَلٍ) لِلنَّوْعِيَّةِ**)، ﴿ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ ﴾، واتە: بۆ ئەو کاتەی بە ئەندازەگیریی خوا دانراوە، لە کاتی دروستکردنی بۆ هەر کەسیٚکدا، کە دەفەرمویٚ: ﴿ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ ﴾، ئەم تەنوینە بۆ جۆرە، تاکو ئەو کاتە دیارییکراوەی خوا بۆی داناون، مانایەکەی ئاوای لیٚدیٚتەوە: (**وَيُؤَخِّرُكُمْ إِلى إِتْمَامِ أَعْمَارِكُمْ المُقَدَّرَةِ، فَلَا يُهْلِكُكُم بِبَلَاءٍ عَام**)، خوا دواتان دەخات تاکو تەمەنەکانتان تەواو دەکەن، ئەو تەمەنانەی بۆتان دیارییکراون بە شیٚوەی ئاسایی و، بە بەڵایەکی گشتیی ناتانفەوتیٚنیٚ.

٥)- ﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، بە دڵنیایی کاتی دیارییکراوی خوا هەر کات هات، دواناخرێ ئەگەر بزانن، وشەی (أجَل)، لە ڕستەی یەکەمدا ﴿أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ﴾، مەبەست پێی کاتی دیارییکراوە بۆ مردنی هەر کەسێك، بەڵام وشەی (أجَل)، لە ڕستەی دووەمدا: ﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، بە مانای کاتی دیارییکراوی خوایە بۆ ناردنی بەڵاو سزا، بۆ هەر گەل و کۆمەڵگایەکی سەرپێچییکار لە خواو لە پێغەمبەرەکەی، بۆیە هی پێشێیان فەرموویەتی: ﴿وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ﴾، هی دواییان فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ﴾، ئنجا ئەگەر کەسێك بە ڕواڵەت تەماشا بکات و وردنەبێتەوە، وا دەزانێ ئەو دوو ڕستەیە دژیەکییان لە نێوان دا هەیە! بۆیەش خوا ﷻ هێندە داکۆکیی دەکات و دەفەرموێ: لە قوڕئان وردببنەوەو تێوەی ڕامێنن، بابای سەرکێڵ وادەزانێ ئەم دوو ڕستەیە تێك دەگیرێن:

پێشێ دەفەرموێ: ﴿وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ﴾، دواتان دەخات بۆ کاتێکی دیارییکراو.

کەچی دوایی دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ﴾، ئەجەلی خوا کە هات دوا ناخرێ! بەڵام ئەجەلی یەکەم کە ئەوانی بۆ دوادەخات، بریتیە لە فەوتان و مردنیان، ئەجەلی دووەم کە دواناخرێ، بریتیە لە کاتی هاتنی بەڵاو فیتنەو سزا بۆیان، لە کاتێکدا کە بڕوا نەهێنن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، وەڵامی (لَوْ)، بە گشتیی دوو ئەگەری هەن و لە هەردووك حاڵاندا قرتێندراوە:

أ- ئەگەر ئێوە زانیباتان، (لأيْقَنْتُم أَنَّه لاَ يُؤَخَّر)، دڵنیادەبوون کە ئەو کاتەی خوا دیارییکردوە بۆ سزادانی گەل و کۆمەڵگایەکان دوا ناخرێ.

ب- یاخود وەڵامەکەی ئاوایە: (لَوْ كُنْتُم تَعْلَمُون لآمَنْتُمْ بِاللهِ وَاتَّقيتموه وَأَطَعْتُمُونِي)، ئەگەر زانیباتان، بڕواتان بەخوا دێناو بەندایەتییتان بۆ خوا دەکردو، پارێزتان لە خوا دەکردو، گوێڕایەڵیی منیشتان دەکرد.

بۆیەش خوا ﷻ وەڵامی ئەگەر (لَوْ)ی، قرتاندوە، تاکو ئەم دوو واتایە، بەڵکو زیاتر لەو دوو واتایەش بگرێتەوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

خستنەڕووی نووح بۆ چۆنیەتیی بانگەوازکردنی خەڵکەکەی کە پێی گوتوون: بگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێبوردنی لێ بکەن و لەبەرەکەتی ئەوەش دا:

١- ئاوی بە خورزەمیان بۆ دادەبارێ، ٢- سامان و منداڵیان زۆر دەبن، ٣- باخ و ڕووباریان بۆ دەڕەخسێن، دوایی سەرزەنشتکردنیان لەسەر ئومێدەوار نەبوونیان بە مەزنیی خواو، نەترسانیان لە پێگەی بەرزو بێ وێنەی خوا، لە حاڵێکدا کە خوا ﷻ:

١- بە چەند قۆناغ دروستیکردوون.

٢- حەوت چینە ئاسمانی هێناونە دی.

٣- مانگی تریفەدارو خۆری پڕشنگداری لە نێو ئاسمانەکاندا داناون.

٤- لە زەویدا ڕواندوونی و دواییش پاش گێڕانەوەیان (جەستەکەیان) بۆ نێو خاك، دەریان دێنێتەوە.

٥- زەمینی بۆ ڕاخستوون و وای لێکردوە ڕێ و بانانی تێدا دروست بکەن، لە کەلێن و بۆشایی نێوان چیاو گردەکاندا.

خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَاءِي إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ

﴿نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ۝١٦ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ۝١٧ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ۝١٨ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ۝١٩ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ۝٢٠﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و سێ بڕگەدا:

**١)-** ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّى دَعَوْتُ قَوْمِى لَيْلًا وَنَهَارًا﴾، {نووح ﷺ لێرەدا دەکەوێتە سەر باس و خواسی گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ گەلەکەی دا}، فەرمووی: پەروەردگارم! من خەڵکەکەی خۆمم بە شەوو ڕۆژ بانگکرد، بۆیە پێویستیی نەکردوە (**قَالَ**)، (و)ی بکەوێتە پێش (**وَقَالَ**)، یان (**ف**)ی بخرێتە سەر (**فَقَالَ**)، چونکە ئەمە گێڕانەوەی وەڵامی نووحە ﷺ بۆ فەرمایشتی خوا کە فەرموویەتی: ﴿أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ﴾، ئنجا وەك وەڵامی ئەو قسەیە، مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، یانی: لە وەڵامی ئەم فەرمانەی خوادا، نووح فەرمووی: پەروەردگارم! من خەڵکەکەی خۆمم بە شەوو ڕۆژ بانگ کرد.

**٢)-** ﴿فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِىٓ إِلَّا فِرَارًا﴾، کەچی بانگکردنەکەم تەنیا ڕاکردنی تێدا زێدەکردن، (**دُعَائِيْ**)، خوێندراویشەتەوە: (**دُعَائِيَ**)، یانی: هەم بە زەنە (**سكون**)، هەم بە سەر (**فتحة**) کە هەر یەك واتایان هەیە، بانگکردنەکەی من تەنیا ڕاکردنی تێدا زیادکردن، (**وَاسْتِثْنَاءُ الفِرَارِ مِنْ عُمُومِ الزِّيَادَاتِ، اسْتِثْنَاءٌ مُنْقَطِعٌ، وَالتَّقْدِيرُ: فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي قُرْبًا مِنَ الْهُدَى، لَكِنْ زَادَهُمْ فِرَارًا وَابْتِعَادًا**)، ئەم هەڵاواردنەش هەڵاواردنی دابڕاو (**اسْتِثْنَاءُ منقطع**)ە، چونکە جیاکردنەوەی (ڕاکردن) لە مانای (زیادکردن) لێك جیان، [یانی: جیاکراوە (**مُستثنى**) لە لێجیاکراوە (**مُستثنى منه**) جیاوازە، بۆیە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی دابڕاو] واتە: هەتا من بانگم دەکردن بەرەو ڕێی ڕاست، ئەوان هەر زیاتر ڕایان دەکردو دوور دەکەوتنەوە.

**٣)-** ﴿وَإِنِّى كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ﴾، من هەر کاتێ بانگم دەکردن، تاکو لێیان ببووری، (**كُلَّمَا**)، لە دوو بەش پێکهاتوە: (**كُلّ**) و (**مَا**)، (**كُلّ**)، واتە: هەموو شتێك، (**مَا**) لێرەدا بۆ چاوگە (**مَصْدَرِيَّة**)، واتە: ئەوانە هەڵوێستیان هەر بەو شێوەیە بوو، لە هەموو

حاڵان دا کە بانگم دەکردن، تاکو تۆ لێیان ببووری، ئەوان هەر بەو شێوەیان دەکرد، کە دوایی باسی دەکات:

٤)- ﴿جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ﴾، (تاکو بانگم دەکردن، تۆ لێیان ببووری، ئەوان هەر عادەتیان وابوو)، پەنجەکانیان دەخستنە گوێکانیانەوە، پێشتریش گوتمان: پەنجە هەمووی ناخرێتە نێو گوێ، بەڵکو مەبەست پێی سەرە پەنجەکان (**أَنَامِل**)ە، کە کۆی (**أُنْمُولَة**)یە، وەك چۆن (**أَصَابِع**)، کۆی (**أُصْبع**)، یان (**إِصْبع**)ە، بەڵام بۆچی دەفەرموێ: پەنجەکانیان دەخستنە گوێکانیانەوە؟ ئەمە بۆ پێشاندانی زۆر مکووڕبوونیانە لەسەر ئەوەی هیچ شتێك لە نووح نەبیستن، کە ئەگەر بۆیان کرابایە هەموو پەنجەیان دەخستە نێو گوێیانەوە.

٥)- ﴿وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ﴾، بە پۆشاکەکەشیان خۆیان دادەپۆشی، واتە: بەرگ و پۆشاکەکانیان بکەنە پۆشەر بۆ دەم و چاوو بۆ گوێیان، واتە: دوای ئەوەی پەنجەیان دەخستە گوێیانەوە بۆ ئەوەی هیچ نەبیستن، کارێکیان دەکرد کە بە پۆشاکەکانیشیان دەم و چاوەکانیان بگرن، بۆ ئەوەی نووح هەر نەشبینن، نە قسەی ببیستن و نە ڕەنگی ببینن.

٦)- ﴿وَأَصَرُّواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ ٱسۡتِكۡبَارٗا﴾، زۆریش مکوڕبوون (لەسەر مانەوەیان لەسەر ڕێبازی خۆیان)و، خۆیان بەزلگرت بە خۆ بەزلگرتنێکی ناوازە، (**الْإِصْرَارُ: تَحْقِيقُ الْعَزْمِ عَلَى فِعْلٍ، وَهُوَ مُشْتَقٌّ مِنَ الصَّرِّ وَهُوَ الشَّدُّ عَلَى شَيْءٍ، وَحُذِفَ مُتَعَلِّقُ أَصَرُّوا لِظُهُورِهِ، أَيْ أَصَرُّوا عَلَى مَا هُمْ عَلَيْهِ مِنَ الْكُفْرِ**)، (**إِصْرَار**): بریتیە لە دڵی خۆ ساغکردنەوە لەسەر شتێك (**إِصْرَارُ**)، لە (**صَرّ**)ەوە هاتوە، (**صَرّ**)یش، بریتیە لە توندکردن، یاخود گرێدانێك، (**صَرَّة**)، واتە: پرێسکەیەك کە پارەی تێدەهاویشترێ و توند دەبەسترێ، ئنجا ئەوەی (**أَصَرُّوا**)ی، پێوە پەیوەستە ئایا لەسەر چی مکووڕبوون؟ قرتێنراوە چونکە ئاشکرایە، واتە: مکووڕ بوون لەسەر مانەوە لەسەر کوفرو شیرك و بتپەرستیی، ئەمەش سکاڵای نووحە عليه السلام بۆ لای پەروەردگاری وەك ڕێخۆشکردن بۆ ئەوەی دوایی تووکیان لێ بکات کە خوا سزایان بدات.

هەروەها نووح (عليه السلام) لەسەر گێڕانەوەی حاڵ و بەسەرهاتی لەگەڵ گەلەکەیدا بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

٧)- ﴿ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴾، دوایی من بە دەنگی بەرز بانگم کردن، (**ثُمَّ**)، بۆ ڕیزبەندیی گێڕانەوەکەیە، (**جِهَاراً: مَصْدَرٌ جَهَرَ نَائِبٌ عَن المَفْعُول المُطْلَق**)، (**جِهَاراً**)، چاوگی (**جَهَرَ**)یە، واتە: دەنگی بەرز کردەوە، لە شوێنی بەرکاری ڕەها دانراوە، ﴿ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴾، کە ئەمە دەبێتە بەرکاری ڕەها بۆ ﴿ دَعَوْتُهُمْ ﴾ و لە شوێنی ئەو دانراوە، یانی: بانگم کردن بە بانگکردنێکی بە دەنگی بەرز.

٨)- ﴿ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ ﴾، دوایی من بانگەوازم بۆ ئاشکرا کردن.

٩)- ﴿ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴾، هەروەها بۆشم پەنهانکردن بە پەنهانکردنێکی زۆر ناوازە، چونکە (**إِسْرَار**)، دەبێتە بەرکاری ڕەها (**مفعول مطلق**) بۆ جەختکردنەوەی (**أَسْرَرت**).

زانایان لەو بارەوە زۆریان قسە کردووەو، ئەوەی لەم ئایەتانە وەردەگیرێ، ئەوەیە کە نووح (عليه السلام) بە چوار شێواز بانگی کردوون:

**١و٢-** بە دەنگی نزم و بەرز: دەنگی بەرزیش لە بەرانبەریدا دەنگی نزم هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴾، دیارە جاری پێشێ بە دەنگی نزم بانگی کردوون، پاشان بە دەنگی بەرز، چونکە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴾، دوایی من بە دەنگی بەرز بانگم کردن.

**٣و٤-** بە پەنهانیی و ئاشکرا، وەك دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴾، دوایی بە ئاشکرا بانگم کردن، ئنجا بە پەنهانییش بانگم کردن، کەواتە: چوار شێوازن: بە دەنگی بەرزو بە دەنگی کپ و، بە ئاشکراو بە نهێنیی و بە پەنهانیی، ئەو شێوازە بانگکردنانەی نووح (عليه السلام) کە بەکاری هێناون بۆ بانگەوازکردنی گەلەکەی بۆیە جۆراو جۆر بوون، چونکە خەڵکەکەش جۆراو جۆر بووە، بۆ وێنە: بۆ بەرپرسەکان نەگونجاوە بە دەنگی بەرز بانگیان بکات، چونکە ئەو کاتە زیاتر شێتگیر دەبوون، بەڵکو بە دەنگێکی

کپ و لە قەدەر ئەو کۆڕو مەجلیسەی تێیدا بوون، بەڵام بۆ خەڵکەکە بە دەنگی کپ گوێیان لێنابێ و لە مەحفەل و کۆبوونەوەی گشتییاندا دەنگی بۆ بەرز کردوونەوە، هەروەها بۆ هەندێکیان بە ئاشکرا بانگی کردوون هەندێ جارو، هەندێ جاریش بە پەنهانیی پەنامەکیی، بە جۆرێك ئەو کەسەی بانگ دەکرێ تەماشای کردوە: چ مەقامێکی هەیە؟ تاکو بەپێی ئەو مەقامە، مەقالەکەی بۆ بگۆڕێ، وەك گوتراوە: (**لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَال، وَلِكُلِ مَيْدانٍ رِجَال**)، بۆ هەر شوێنە جۆرە قسەیەك هەیەو، بۆ هەر گۆڕەپانێك جۆرە پیاوانێك هەن.

١٠)- ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴾، پێم گوتن: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، بە دڵنیایی ئەو زۆر لێبوردەیە، پێشتریش نووح ﷺ بۆ خوای پەروەردگاری گێڕایەوە: ﴿ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ ﴾، ئەوەی باسکرد، هەروەها لەوە پێشتریش کە پێی گوتن: ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴾، بەڵام ئەم جارە دووبارەی دەکاتەوە، چونکە پێشێ بە گشتیی پێیگوتوون: ئەگەر وابکەن خوا لە گوناهەکانتان دەتانبووری، بەڵام ئەمجارە بەشێوەی دواندن پێیگوتوون: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن بە دڵنیایی ئەو زۆر لێبوردەیە، واتە: با ئەوە نەبێتە پەرچ و کۆسپ لەبەر دەمتاندا، کە پێتان وابێ گوناهو تاوان و خراپەتان زۆر کردوەو، لێبوردنی خوا بەشتان ناکات! لێبوردنی خوا زۆر زۆرە، چونکە ئەو زۆر زۆر لێبوردەیە، لێبوردەیی خوا سنووری نیە.

١١)- ﴿ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴾، {ئەگەر ئێوە داوای لێبوردن لە خوای پەروەردگارتان بکەن}، خوا ﷻ لە سەرێوە ئاوی بە خورزەمتان بەسەردا دەبارێنێ، وشەی (**سَمَاء**):

أ- دەگونجێ مەبەست پێی خودی باران و ئاوەکە بێ، وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە: {**عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ** ﵁، **قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ** ﷺ **صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالحُدَيْبِيَةِ فِي إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ**} (**أخرجه البخاري: ٨٤٦، ومسلم: ٧١**)، واتە: زەیدی کوڕی خالید ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین لە حودەیبیيە، دوای بارانێك کە بەشەو باری بوو.

ب- وشەی (سَمَاء)، بە مانای سەرێش دێ: ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، الملك: ١٦.

ج- هەروەها (سماء) بە مانای هەوریش دێ: ﴿ أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴿١٩﴾ ﴾البقرة.

١٢)- ﴿ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ ﴾، {جگە لەوەی خوا لە سەرێوە ئاوی بە خورزەمتان بەسەردا هەڵدەڕێژێ، ئەگەر داوای لێبوردنی لێ بکەن و بۆ خوا صوڵحاو بن}، سامانەکانیشتان بۆ زۆر دەکات و، کوڕانیشتان بۆ زۆر دەکات، (إِمْدَاد)، بریتیە لە بۆ درێژکردنەوە، (أَمَدَّهُ يُمِدُّه إِمْدَاداً)، (إِمْدَاد)، بۆ درێژکردنەوەیە، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە بۆتان زۆر دەکات، یاخود ئە و ماڵ و سامانەی هەتانە بۆتان درێژە پێدەدا، ئەو کوڕو منداڵانەی هەتانن، بۆتانیان دەهێڵێتەوەو، بۆتانیان درێژە پێدەدا.

١٣)- ﴿ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ جَنَّٰتٖ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ أَنۡهَٰرٗا ﴾، باخانیشتان بۆ دەڕەخسێنێ و ڕووبارانیشتان بۆ دەڕەخسێنێ، لە ئەنجامی هەبوونی ئاوی زۆردا، هەم باخ و دێبەرو بێستان زۆر دەبن، هەم جۆگەو ڕووباریش زۆر دەبن.

دوایی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ دەفەرموێ:

١٤)- ﴿ مَّا لَكُمۡ لَا تَرۡجُونَ لِلَّهِ وَقَارٗا ﴾، چیتانە! ئومێدی وەقارتان نیە بۆ خوا، (وَقَار)، لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا بە مانای چەسپان (ثَبَات) دێ، وەك خوا بە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری فەرمووە: ﴿ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ﴾الأحزاب، لە ماڵەکانی خۆتاندا نیشتەجێ بن، واتە: بۆچی ئەو پێگە بەرزو چەسپاوەی خوا هەیەتی، پێی ئومێدەوار نین؟ ئەوە واتایەکی، یاخود: (وَقَار)، بە مانای مەزنییە (**وَالوَقَارُ: العَظَمَةُ. وَالتَّوْقِيرُ: التَّعْظِيمُ، وَقَّرَهُ يُوَقِّرُه تَوْقِيْراً، يَعْنِي: عَظَّمَهُ يُعَظِّمُهُ تَعْظِيْمَاً**)، کەواتە: (وَقَار)، بە مانای مەزنییش دێ، یانی: بۆچی ئومێدەوار نین بە مەزنیی خوا؟ هەروەها (**تَرْجُونَ**)، دەڵێ: (**خَوْفٌ و رَجَاء**)، پێکەوە پەیوەستن، کەواتە: ﴿ لَا تَرۡجُونَ لِلَّهِ وَقَارٗا ﴾، یانی: (**لَا تَخَافُون لِلَّهِ عَظَمَةً**)، بۆچی لە مەزنیی خوا ترستان نیە، یان بۆچی ئومێدەوار نین بە مەزنیی خوا، بە پایە بەرزیی خوا، کە لێتان ببوورێ و چاکەتان لەگەڵدا بکات و، میهرەبانییتان لەگەڵدا بنوێنێ؟ بۆچی کارێك ناکەن

شایستەی ئەوە بن، خوا بە مەزنیی و پایە بەرزیی خۆی و، بە چاکەکانی خۆی مامەڵەتان لەگەڵدا بکات؟.

لە بارەی ئەوەوە کە داوای لێبوردن لە خوا کردن دەبێتە هۆی دابارینی ئاوو زۆربوونی ماڵ و سامان و کوڕان و کچان و، دەبێتە هۆی پیت و پێزو ڕووبارو ڕەزو باخ و ...هتد، خوا ﷻ لە چەند شوێنێك لە قورئاندا ئاماژەی بەو ڕاستییە کردوە، بۆ نموونە: لە سوورەتی (**هود**)دا ئەوە هاتوە لەسەر زمانی هوود ﷺ بۆ گەلەکەی خۆی (عاد): ﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ ٥٢﴾هود.

لێرەش ئەو دەقە دێنین: (**قَالَ الْأَوْزَاعِيُّ: خَرَجَ النَّاسُ يَسْتَسْقُونَ، فَقَامَ فِيهِمْ بِلَالُ بْنُ سَعْدٍ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا سَمِعْنَاكَ تقول: ﴿مَا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ مِن سَبِيلٖ ٩١﴾التوبة، وَقَدْ أَقْرَرْنَا بِالْإِسَاءَةِ، فَهَلْ تَكُونُ مَغْفِرَتُكَ إِلَّا لِمِثْلِنَا؟! اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَاسْقِنَا! فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَرَفَعُوا أَيْدِيَهُمْ، فَسُقُوا**)[1]، واتە: ئەوزاعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: خەڵك چوونەدەر بۆ داواکردنی باران، بیلالی کوڕی سەعد (یەکێك بووە لە خواناسان و لە نێویاندا بوو)، ستاییشی خوای کردو مەدح و سەنای خوای کرد، دوایی گوتی: ئەی خوایە! ئێمە گوێبیستت بووین دەفەرمووی: ﴿مَا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ مِن سَبِيلٖ﴾**التوبة**، واتە: چاکەکاران هیچ ڕێی ڕەخنەو گلەییان نایەتە سەر، ئێمەش ئەوە دانمان هێنا بە هەڵەو خراپەی خۆماندا، ئنجا ئایا لێبوردنی تۆ هەر بۆ وێنەی ئێمە نابێ؟ (واتە: چاکەکاران ئەوە چاکن، بەڵام ئێمە دانمان بە هەڵەو کەم و کوڕیی خۆماندا هێناو، ئەگەر چاکەکاران پێویستییان بە لێبوردنی تۆ ناکات، بەڵام ئێمەی خراپەکار حەوجێی لێبوردنی تۆیش، ئایا لێبوردنی تۆ هەر بۆ خەڵکی وەك ئێمە نیە)؟، ئەی خوایە! لێمان ببوورەو بەزەییت پێماندا بێ و، ئاومان بۆ

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٩، ص٢٣٠.

دابارێنــە، دەسـتی بــەرز کــردەوەو خەڵکەکــەش دەسـتیان بــەرز کــردەوەو، یەکسـەر خــوای پەروەردگاریــش هــەوری هێنایــە ئاسـمان و بارانــی بەسـەردا باراندیــن.

زانایــان و ڕوونکەرەوانــی قورئــان لــە بەرانبــەر ئــەم ڕستەیەدا، زۆر قسـەیان کــردوە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴾، ئنجـا ئــەوەی پێویسـت بــوو لــە ڕابردوودا گوتـم، بــەڵام بــۆ زیاتــر تیشــك خستنەســەری، قسـەی هەندێــك لــە زانایــان، دێنیــن بــێ ئــەوەی ناویــان بێنین:

**١-** (**لَا تَرْجُونَ تَعْظِيْمَ الله إيَّاكُمْ وَتَكْرِيْمَه لَكم فِي الآخَرِة؟**)، بۆچی بە ئومێدی ئەوە نین خوا لە ڕۆژی دوایی دا، بە مەزنتان بگرێ و ڕێزتان لێبگرێ؟.

**٢-** (**مَا لَكُمْ لَا تَخْشَوْنَ لله عِقَاباً، وَلَا تَرْجُونَ مِنْه ثَوَاباً**)، بۆچی مەترسیی سزای خواتان نیەو، بە ئومێدی پاداشتی خوا نین؟.

**٣-** (**مَا لَكُمْ لَا تَعْتَقِدُوْن لِلَّهِ عَظَمَةً؟**)، بۆچی بڕواتان نیە بە مەزنیی خوا.

**٤-** (**مَا لَكُمْ لَا تَخَافُون لِلَّهِ عَظَمَةً وَقُدْرَة عَلَى أَحَدِكُم عُقُوبَتكم؟**)، بۆچی مەترسیی مەزنیی خواتان نیەو ئەوە کە خوا دەتوانێ سزاتان بدات {هەر کامێك لە ئێوە خوا بیەوێ سزای بدات؟}.

**١٥)-** ﴿ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴾، لە حاڵێکدا خوا ئێوەی لە چەند قۆناغاندا دروست کردوە؟ (**أَطْوَارُ**)، کۆی (**طَوْر**)ە، (**طَوْراً بَعْدَ طَوْر، أي: تَارَة بعد تَارَة**)، جار لە دوای جار، دەگوترێ: (**خَرَجَ عَنْ طَوْره، أي: جَاوَزَ حَدَّه، وَالأَطْوَار: المَرَاحِل**)، (**طَوْر**)، وەك چۆن بە مانای جار دێ، جار لە دوای جار، بە مانای قۆناغیش دێ، ئنجا ئەو قۆناغانەش: أ- مەبەست پێیان قۆناغەکانی نێو منداڵدانی ئافرەت بێ، منداڵدانی دایك، کە مرۆڤ پێشێ نوتفەیە، دوایی دەبێتە عەلەقە و خوێنپارە، ئنجا دەبێتە زارجوو (**مُضغة**)، {پارچە گۆشتێك هێندەی زارجوو}، ئنجا دەبێتە ئێسقان، دوایی ئێسقانەکە بە گۆشت دادەپۆشرێ و، دوایی لە قۆناغێکی دیکەدا ڕووحی بەبەردا دەکرێ.

ب- یاخود مەبەست پێی قۆناغەکانی دوای لە دایك بوون بێ: کۆرپە، منداڵی ساوا، پێڕۆچکە، وردە وردە، ئنجا گەورەتر دەبێ، دوایی دەبێتە هەرزەکار، دوایی باڵغ دەبێ، دوایی دەبێتە گەنج و کامڵ دەبێ و تاکو دوایی.

هەروەها لە یەك کاتدا دەگونجێ مەبەست پێی هەموویان بێ، خوا ﷻ ئێمەی هەم لە منداڵدانی دایکدا بە چەند قۆناغاندا تێدەپەڕێنێ، هەم دوایی کە لە دایکیش دەبین بەچەند قۆناغاندا تێدەپەڕین، ئەگەر مرۆڤ هەر تەماشای خۆی بکات، خوا چۆنی هێناوەتە دی، ئنجا ئەو خۆ ناسینەی، وای لێ دەکات کە خوا بناسێ و ئنجا زانینی ئەوەی خوا چۆن خوڵقاندوویەتی؟ پاڵنەرو هاندەری دەبێ کە خوا بپەرستێ و بەندایەتیی بۆ بکات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴾، بە هەموو ئەو واتایانەی کە گوتمان، بۆچی ئێوە بە ئومێدی بەزەیی، پاداشتی خوا نین و، ترستان نیە لە سزای خوا؟ ﴿ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴾، لە حاڵێکدا خوا ئێوەی بە چەند قۆناغاندا هێناوەتە دی و، بە چەند قۆناغ ئێوەی دروست کردوە، بە چەند قۆناغاندا تێیپەڕاندوون، هەر وەك شتێکی کورت دەڵێین: مرۆڤ لەچی دروست دەبێ؟ لە نوتفە، نوتفە لە ئەصڵدا لە دوو زیندەوەری بچووك دروست دەبێ، یەکەم: (حَيمَنْ)، کە لە ئاوی پیاودایە، کە کورتکراوەی (الحيوان المَنَوي)یە، کە بە (حَيَامِن)، کۆ دەکرێنەوە، واتە: زیندەوەریی تۆوی و، زانایان دەڵێن: لە هەر کاتێکدا پیاو ئاو دەڕێژێ ئاوەکەی پێنجسەد (٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ملیۆن زیندەوەری بچووکی تێدایە کە پێیان دەگوترێ: (حَيمَنْ)، ئەو ئاوەش هەمووی قەبارەکەی یەك سانتیمەتر سێجا (ا سم[٣])یە، کەچی پێنج سەد (٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ملیۆن زیندەوەری بچووکی تێدایەو، یەکێك لەو زیندەوەرە بچووکانە دەچێ بە هێلکۆڵە (بويضة)وە لە نێو ئاوی ئافرەتدا پەیوەست دەبێ و، بە هەردووکیان زیندەوەرێکی دیکە پێکدێنن پێی دەگوترێ: نوتفەو مرۆڤ لەوەوە دروست دەبێ.

١٦)- ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ كَيۡفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا ﴾، ئایا سەرنجتان نەداوە خوا ﷻ چۆن حەوت چین ئاسمانی هێناونە دی! (طِبَاقًا، أي: مُطَابِقَةً)، واتە: لەسەر یەکدی، چین لەسەر چین، واتە: ئایا ئەو خوایەی حەوت چینە ئاسمانی بەسەر سەری ئێوەوە دروستکردوون، شایستەی ئەوە نیە بەندایەتیی بۆ بکەن و بیپەرستن، هەروەك چۆن ئێوەی بە چەند قۆناغاندا تێپەڕاندوەو، بۆ ئێوەی ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی ڕەخساندوون؟ زانایان گوتویانە: کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ ﴾، ئایا نابینن؟ بێگومان ناگونجێ ئێمە بە چاو حەوت چینە ئاسمانەکان ببینین؟ (الشنقيطي) خاوەنی (أضواء البيان)[1]، لەو بارەوە هەندێ قسە دەکات و دەڵێ: لێرەدا دەگونجێ مەبەست دوو شت بێ:

١- ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ ﴾، مەبەست پێی دیتنی چاو نیە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە خوا هەواڵێکی دڵنیاکەری پێداون و، هەواڵی خوای پەروەردگاریش پابەندکەرە بۆ هەموو لایەك، بۆ هەر کەسێك کە ببیستێ، کەواتە: ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ ﴾، واتە: ئایا بە چاوی عەقڵ نەتانبینیوە، دوای ئەوەی خوا هەواڵی پێداون: حەوت ئاسمانم خوڵقاندوون؟

٢- ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ ﴾، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە شەوی شەوڕۆو بەرز بوونەوەدا بە حەوت ئاسمانەکاندا تێپەڕیوەو، دەروازەی حەوت ئاسمانەکانی بۆ کراونەوەو چۆتە سەرووی حەوت ئاسمانەکان و، لەگەڵ خوای بەرزدا گفتوگۆی کردوە، ئنجا ئەگەر ئێمە بە چاوی خۆشمان نەمانبینیوە، بە چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیومانە و ئێمەش هەرچی فەرموویەتی بە ڕاستی دادەنێین و ئەویش فەرموویەتی: حەوت ئاسمانەکانم دیون، چاوی پێغەمبەریش ﷺ لە چاوی خۆمان باشتر ئەوەی بینیوە.

بەڵام مانای یەکەمیان ڕاستەو لە هەموو قورئانیش دا هەروایە.

١٧)- ﴿ وَجَعَلَ ٱلۡقَمَرَ فِيهِنَّ نُورٗا ﴾، هەروەها (خوا) مانگی تێدا ڕووناك کردوون، کردوویەتی بە ڕووناکیی لە نێو ئاسمانەکاندا، بێگومان مانگ شوێنکەوتووی خڕۆکەی زەوییەو (٣٦٠،٠٠٠)، تاکو (٣٨٠،٠٠٠) کیلۆمەتر لە زەوییەوە دوورە، تەنیا کەمێک لەو

---

(١) ج٨، ص(٣١٣، ٣١٢).

بەینەدا کەم و زیاد دەکات، کە جاری وایە مانگ نزیك دەکەوێتەوە لە زەوی و جاری وایە دوور دەکەوێتەوە، بەڵام بێگومان مانگ لە سنووری ئاسمانی یەکەمدایە، هەروەك خۆریش لە سنوری ئاسمانی یەکەم دایە، وەك زۆر جار باسمانکردوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾فصلت، ئاسمانی نزیکترمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، کە مەبەست پێی ئەستێرەکانن، بەڵام ئاسمانەکانیش مادام چین لەسەر چینن، ئاسمانی یەکەم دەوری ئێمەی داوە، دوایی ئاسمانی دووەم دەوری ئاسمانی یەکەمی داوەو، هی سێیەم دەوری دووەمی داوە، هی چوارەم دەوری سێیەمی داوەو، هی پێنجەم دەوری چوارەمی داوەو، هی شەشەم دەوری پێنجەم و، ئاسمانی حەوتەمیش دەوری شەشەمی داوە، کەواتە: سەرەنجام خۆرو مانگ دەکەونە نێو هەموو ئاسمانەکانەوە.

١٨)- ﴿وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا﴾، هەروەها (خوا) خۆریشی کردوە بە چرا، واتە: وەك چرایە، لێرەدا ئەمە پێی دەگوترێ: (**التَّشْبِيه البَلِيْغ**)، واتە: خۆریش وەك چرایەکی تیشکدەرە.

١٩)- ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا﴾، هەروەها خوا ﷻ ئێوەی لە زەویدا بە ڕواندن ڕواندوە، بێگومان (نَبَاتًا)، لە: (أَنْبَتَ) هاتوەو، (**عُومِلَ مُعَامَلَةَ المَصْدَرِ فَوَقَعَ مَفْعُولًا مُطْلَقًا لِـأَنْبَتَكُمْ**)، لە ئەصڵدا (نَبَاتاً)، ناوەو لە (**أَنْبَتَ: يُنْبِت إِنْبَاتاً فَهُوَ نَبَات**) هاتوە، بەڵام لێرەدا (نَبَاتًا)، وەك چاوگ بۆ (أَنْبَتَ) مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، یانی: خوا ئێوەی ڕواندوە بە ڕواندن لە زەوی دا.

٢٠)- ﴿ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا﴾، دوایی دەتانگێڕێتەوە نێوی، واتە: جەستەکانتان دەگێڕێتەوە نێو زەوی، بۆچی خوا وا دەفەرموێ؟ چونکە ئەوانە بەس هەستیان بە جەستەی خۆیان کردوە، بۆیە خواش ﷻ بەپێی عەقڵی خۆیان دواندوونی، واتە: ئەو جەستەیەی کە ئێوە تەنیا هەست بەوە دەکەن، دوای مردنتان دەگێڕرێتەوە نێو زەوی.

٢١)- ﴿وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾، ئنجا هەر ئەو جەستەیەش جارێکی دیکە دەردێنێتەوە لە زەوی، بۆیە دەفەرموێ: (**إِخْرَاجًا**)، ﴿وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾، واتە: بە دەرهێنانەوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەرتان دێنێتەوە.

**٢٢)- ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴾**، هەروەها خوا زەوی بۆ کردوون بە ڕایەخ، **(وَالْبِسَاطُ: مَا يُفْرَشُ لِلنَّوْمِ عَلَيْهِ وَالجُلُوسِ، مِنْ ثَوْبٍ أَوْ زُرْبِيَّةٍ، فَالإِخْبَارُ عَنِ الْأَرْضِ بِبِسَاطٍ تَشْبِيهٌ بَلِيغٌ)**، **(بِسَاطاً)**، هەر شتێکە کە بۆ خەوتن یان بۆ لەسەر دانیشتن ڕادەخرێ و، هەواڵدانیش لە زەوی بەوەی کراوە بە ڕایەخ **(فِرَاش)**، دیسان لە جۆری وێچواندنی بەلیغە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، یانی: وەك فەڕش بۆی ڕاخستوون.

**٢٣)- ﴿ لِّتَسْلُكُواْ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ﴾**، تاکو لە زەویدا ڕێیان و کەلێنان بگرنەبەر، واتە: بە کەلێنەکانیدا ڕێ و بانان بگرنە بەر، چونکە وشەی **(سُبُل)**، کۆی **(سَبِيل)**ە، بە مانای ڕێ و بان دێ، **(فِجَاج)**یش، کۆی **(فَجّ)**ە، بە مانای ڕێیەکی فراوان دێ، بە تایبەت ئەوەی دەکەوێتە نێوان چیایەکانەوە، واتە: ئێوە ڕێ و بانەکان بگرنەبەر بە کەلێن و بۆشایی نێوان چیاکاندا، کەواتە: خوا ﷻ ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی بۆ ئێوە ڕەخساندوون:

١- خۆتانی بە چەند قۆناغ خوڵقاندوە.

٢- حەوت ئاسمانی بۆ دروستکردوون.

٣- زەوی بۆ کردوون بە ڕایەخێك.

٤- مانگی بۆ کردوون بە ڕووناکیی بۆ شەو.

٥- خۆری بۆ کردوون بە چرا بۆ ڕۆژ.

٦- پاشان ئێوەی لە زەوی دا پێگەیاندوە، ئەو هەموو کارانەی بۆ ئێوە کردوون و ئەو هەموو چاکەو نیعمەتانەی پێداون و، دەستی چاکەی خوا ﷻ لە ژیانی ئێوەدا هێندە هەیە، کەواتە: بەس خۆی شایستەی ئەوەیە بەندایەتیی بۆ بکرێ و بپەرسترێ و نەچن ڕوو لە جگە لە خوا بکەن، ئاوا نووح ؑ ئەو هەموو نازو نیعمەت و چاکانەی خوا ﷻ و، ئەو هەموو چاکەکارییانەی خوا لە ژیانی بەشەردا، خستوونیە بەر چاوی گەل و کۆمەڵگایەکەی، بۆ ئەوەی سەرنجیان ڕابکێشێ و دڵیان بجووڵێنێ بەرەو بەندایەتیی کردن بۆ خوا ﷻ.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ**

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت (٨) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٢١ - ٢٨)ی كۆتایـی سـوورەتی (نـوح)، لـە دوو توێـی ئـەو هەشـت (٨) ئایەتـەدا، دوو هەڵوێسـتی كۆتایـی نـووح عليه السلام لـە بـارەی گەلەكەیـەوە خراونـەڕوو:

هەڵوێسـتی یەكـەم: ئەوەیـە كـە نـووح عليه السلام لـە كۆتایـی گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی خۆیـدا، لـە پـەروەردگاری دەپاڕێتـەوەو هەواڵـی پـێ دەدات، هەڵبەتـە خـوا سبحانه وتعالى لـە نـووح بـە هەمـوو شـتێك و بـە هەمـوو هەواڵـەكان ئاگادارتـرە، بـەڵام نـووح سـكاڵای خـۆی لـە لای خـوای پـەروەردگار دەكات و دەڵێ: پـەروەردگارم! گەلەكەم سـەرپێچییان لێكـردم و، تەنیـا شـوێن كەسـانێك كەوتـن، زلـە زلانێـك، بڕیـار بەدەسـتانێك كـە مـاڵ و سـامانی زۆریـان هەیـەو وەچـەو قـە رەباڵغیـی زۆریـان بـەدەورەوە هەیـە، بـەڵام مـاڵ و سـامان و ڕۆڵەكانـی دەوروبەریـان هـەر زیانبارییـان بـۆ زیـاد كـردوون و، پیلانێكـی زۆر گەورەیـان گێـڕا كـە گوتیـان: دەسـتبەرداری پەرسـتراوەكانتان مەبـن و، دەسـتبەرداری: (وەددو سـواع ویەغـووث ویەعـووق ونەسـڕ)، ئـەو پێنـج صەنەمـە مەبـن و، خەڵكێكـی زۆریشـیان گومڕاكـرد، تـۆش ئـەی پـەروەردگار! سـتەمكاران هـەر گومڕاییـان بـۆ زیـاد بكـە، دواییـش خـوا سبحانه وتعالى یەكسـەر سـەرەنجامی سامناكی دژوارو سـەختی گـەلی نـووح دەخاتـەڕوو، كـە بریتیـە لـە نغـرۆ بـوون و خنكانیـان لـە تۆفانـدا كـە دەفەرمـوێ: ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔتِهِمۡ أُغۡرِقُواْ فَأُدۡخِلُواْ نَارٗا فَلَمۡ يَجِدُواْ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارٗا ٢٥﴾ نـوح، بەهـۆی تاوانەكانیانـەوە خنكێـنران، یەكسـەریش خرانـە نێـو ئاگـرەوە (لـە قۆناغـی بەرزەخـدا)و، جگـە لـە خـواش پشـتیوانیان چنـگ نەكەوتـن، ئەمـە هەڵوێسـتی یەكەمـی نـووح.

هەڵوێسـتی دووەم: لـە سـێ ئایەتـی كۆتاییـدا، بریتیـە لـە تـووك و نزاكردنـی نـووح لـە گەلەكـەی: ﴿وَقَالَ نُوحٞ رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ٢٦﴾، نـووح عليه السلام

گوتـی: پـەروەردگارم! تاقـەواری بێبڕوایـان لەسـەر زەوی مەهێڵـە، خانـوو نشـینیان لـێ مەهێڵـە، ئنجا نـووح عليه السلام بەڵگـەو پاسـاو دێنێتـەوە کـە بۆچـی کەسـیان لـێ نەهێڵـێ، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ ﴾، چونکـە ئەگـەر تـۆ لێیـان گەڕێـی و هـەر کامێکیـان لـێ بمێنـێ، بەندەکانـی کـە مـاون ئەوانیـش گومـڕا دەکـەن و، ئـەوەی لێشـیان دەبـێ، هـەر تاوانبـاری زۆر بێبـڕوا، یاخـود زۆر سـپڵەیەو، لـە کۆتایـی دا دەپاڕێتـەوە: ﴿ رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا ﴿٢٨﴾ ﴾، پـەروەردگارم! لێـم ببـوورەو لـە بـاب و دایکـم و لـە هـەر کەسـێك کـە بـە ئیمانـەوە دێتـە ماڵەکـەم و، لـە پیاوانـی بـڕوادارو ئافرەتانـی بـڕوادارو، سـتەمکارانیش هـەر سـەر بـە فەتـارەت چـوون و بـە هیـلاك چوونیـان بـۆ زیـاد بکـە.

﴿ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا ﴿٢٤﴾ مِّمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا ﴿٢٨﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{نووح گوتی: پەروەردگارم! ئەوانە (خەڵکەکەم) سەرپێچییان لێکردم و، شوێن کەسێك کەوتن کە سامان و ڕۆڵەکانی تەنیا زیانبارییان بۆ زێدەکردن ﴿٢١﴾ (زلە زلەکانی گەلەکەم) پیلانێکی بێرەزاشیان لە دژم گێڕا ﴿٢٢﴾ گوتیشیان: (بە شوێنکەوتووەکانیان) واز لە پەرستراوەکانتان مەهێنن و دەستبەرداری وەدوو سواع و یەغووس و یەعووق و نەسر مەبن ﴿٢٣﴾ بە دڵنیایی ئەو (بڕیار بەدەست) انە (خەڵکێکی) زۆریان گومڕا کردو، (ئەی خوایە!) بۆ ستەمکارانیش هەر گومڕایی زیاد بکە ﴿٢٤﴾ (سەرەنجام کۆمەڵە بێبڕوایەکەی نووح) لە سۆنگەی گوناهەکانیانەوە (تێکڕاو وێکڕا لە تۆفان دا) نغرۆ بوون و، یەکسەریش خرانە ئاگرێك (ی تایبەت)ەوەو، جگە لە خواش هیچ پشتیوانانێکیان چنگ نەکەوتن ﴿٢٥﴾ نووحیش گوتی: پەروەردگارم! (یەك کەس خانوونشینێك) لە کافران لەسەر زەوی مەهێڵە (بنبڕو قەلاچۆیان بکە) ﴿٢٦﴾ چونکە تۆ ئەگەر بیانهێڵی، بەندە (بڕوادارە)کانت سەرگەردان دەکەن و، جگە لە منداڵی خراپەکاری سپڵە (و بێبڕوا) شیان نابێ ﴿٢٧﴾ پەروەردگارم! لێم ببوورە هەروەها لە باب و دایکم و، لە هەر کەسێك بە بڕواداری هاتۆتە ماڵەکەم و، لە بڕوادارانی پیاوو بڕوادارانی ئافرەت و، بۆ ستەمکارانیش تەنیا فەوتان و سەر بە فەتارەت چوون، زیاد بکە ﴿٢٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(عَصَوْنِى): سەرپێچییان لێکردم، (عَصَى عِصْيَانَـاً، أي: خَـرَجَ مِـنَ الطَّاعَـة)، (عَـصَى): سەرپێچیی کرد کرداری ڕابردووە، (يَعْـصِي)، سەرپێچیی دەکات کرداری (مُضَارِع)ە، (عِصْيَان) سەرپێچیکردن چاوگەکەیە واتە: لە فەرمانبەریی دەرچوون.

(خَسَارًا): (الخُسْرُ والخُسْرَانُ: انْتِقَاصُ رَأسِ المَال)، (خُسْر) و (خُسْرَان)، هەردووکیان چاوگن بریتین لە کەمبوونی (یاخود لە دەستدانی) دەستمایە.

(مَكْرًا): (المَكْرُ: صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يَقْصُدُهُ بِحِيلَةٍ، وَالمَكْرُ مِنْهُ مَحْمُودٌ، وَمِنْهُ مَذْمُومٌ)، (مَكْر): بریتیە لە لادانی ئەوی دیکە لەو ئامانجەی دەیەوێ، بە فێڵێك، (مَكْر): دەگونجێ ستاییشکراو بێ (کە ئەو نەخشە دانانە بۆ شتی باش و ئامانجی باش) بێ، دەشگونجێ زەمکراو بێ، کە بریتیە لە پیلانگێڕان بۆ ئامانجی خراپ.

(كُبَّارًا): (الكَبِير وَالكُبَـارُ أَبْلَـغُ مِنْـهُ، وَالكُبَّـارُ أَبْلَـغُ مِنْـهُ)، (كَبِير)، واتە: گەورە (كُبَار)، زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە واتە: گەورەتر، (كُبَّار)، لە هەردووکیان زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە واتە: زۆر گەورەتر.

(خَطِيٓـَٔاتِهِمْ): (خَطِيْئَات)، کۆی (خَطِيْئَة)یە، (الخَطِيْئَةُ وَالسَّيِّئَةُ يَتَقَارَبَانِ)، (خَطِيْئَة)، بە مانای تاوان (سَيِّئَة)، بە مانای خراپە، واتایان لێك نیزیکە، (خَطِيْئَات)، کۆی (خَطِيْئَة)یە، هەروەك بە (خَطَايَا)ش، کۆ دەکرێتەوە.

(دَيَّارًا): دەگوترێ: (مَا بِهَا دَيَّارٌ: سَاكِنٌ، وَهُوَ فِيْعَالٌ، وَلَوْ كَانَ فَعَّالًا لَقِيْلَ دَوَّارا، مِثْل: قَوَّال وَجَوَّاز)، (مَا بِهَا دَيَّارٌ: سَاكِنٌ)، واتە: نیشتەجێ، وشەی (دَيَّار)، لەسەر کێشی (فِيْعَال)ە، بەڵام ئەگەر لەسەر کێشی (فَعَّال) بووایە، دەگوترا (دَوَّار)، وەك (قَوَّال وَجَوَّاز)، (قَوَّال)، واتە: کەسێك کە زۆر قسە دەکات و، (جَوَّاز)یش، واتە:

کەسێك کـە زۆر تێدەپـەڕێ (جَـازَ يَجُـوُز فَهُـوَ جَائِـزٌ)، واتـە: پێپـەڕی و (جَـوّاز)، زۆر تێپـەڕ.

(فَاجِرًا): (الفُجُـورُ: شَـقُّ سِـتْرِ الدِّيَانَـةِ، فَجَـرَ فُجُـوراً فَهُـوَ فَاجِـرٌ، وَالجَمْـعُ: فُجَّـار وَفَجَـرَة)، (فُجُـوُر): بریتیـە لـە دڕینـی پـەردەی دینداریـی، دەگوتـرێ: (فَجَـرَ فُجُـوراً)، تاوانیکـرد، تاوانکـردن، (فَهُـوَ فَاجِـرٌ)، ئـەو تاوانبـارە یـان تاوانـکارەو، (فَاجِـر)، بـە (فُجَّـار)، و بـە (فَجَـرَة)ش کـۆ دەکرێتـەوە، واتـە: تاوانبـاران یـان تاوانـکاران.

(كَفَّارًا): (الكَفَّـارُ: أَبْلَـغُ مِـنَ الكَفُـوُرِ وَقَـدْ يَجِـري الكَفَّـارُ مَجْـرِى كَفُـوُر: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾﴾ إبراهيـم)، (كَفّـارُ)، زێدەڕۆیـی زیاتـری تێدایـە لـە (كَفُـور)، (كَفُـور)، بـە مانای سـپڵە دێ و، بـە مانای زۆر بێبـڕواش دێ، (كَفَّـار)، یانی: زۆر سـپڵە یـان زۆر بێبـڕوا، جـاری واش هەیـە (كَفّـارُ)، بـە مانـای (كَفُـوُر)، بەکاردەهێـنرێ، وەك دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾﴾ إبراهيـم، واتـە: بـە دڵنیایـی مرۆڤـی بێبـڕوا زۆر سـتەمکارو زۆر سـپڵەیە، مەبەسـت لـە ئینسـان واتـە: ئینسـانێك کـە دەسـتی هیدایەتـی خـوای نەگەیشـتووەتێ، یاخـود ئینسـانێك کـە بێبڕوایـە.

(تَبَارًا): (التَـبْرُ: الكَـسْرُ وَالإِهْـلَاك، تـبرَهُ وَتـبَّرَهُ)، (تَبَار)یـش چاوگـە لـە (تَـبْر)ەوە، هاتوە، (التَّـبْرُ: الكَـسْرُ وَالإِهْـلَاك)، (تـبر) شـکاندن و فەوتاندنـە، (تَّـبَرَهُ وَتـبَّرَهُ)، هەردووکیـان بـە مانـای (أَهْلَكَـهُ)، فەوتانـدی، یاخـود شـکاندیی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا، لە نووحەوە دەگێڕێتەوە، کە دووجاران ڕووی کردۆتە خوای پەروەردگارو، لێی پاڕاوەتەوەو سکاڵای بۆ لای کردوە.

دوای ئەوەی لە بیست (٢٠) ئایەتی پێشوودا کە پێشتر شیمان کردنەوەو باسمان کردن، نووح ﷺ هەرچی کە لە توانایدا هەبوو بەکاری هێنا، هەموو شێوازەکان و، هەرچی پێویست بوو لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا خستنیە بەر چاوو بیری گەلەکەی و، بە ئاسۆیەکاندا گێڕانی و بە نەفسەکەی خۆشیاندا گێڕانی و، سەرنجی ڕاکێشان بۆ چاکەو نیعمەتەکانی خوا، سەرەنجام ئەوانە هەر لەسەر قسەو عینادیی و کەللەڕەقیی خۆیان بەردەوام بوون، بۆیە نووح ﷺ لە کۆتایی گێڕانەوەی باس و خواسیدا، کە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئەو دەیگێڕێتەوە، لەم هەشت ئایەتەدا دووجاران ڕوو دەکاتە خوا ﷻ یان سێ جار، بەڵام لێرەدا دووجاران دەفەرموێ: ﴿ قَالَ نُوحٌ ﴾، ﴿ وَقَالَ نُوحٌ ﴾.

جاری یەکەم دەفەرموێ: ﴿ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي ﴾، نووح گوتی: پەروەردگارم! ئەوانە سەرپێچییان لە من کرد، واتە: گەلەکەم سەرپێچییان لێکردم، هەرچەندە هەرچی هەوڵ و تەقەللابوو لەگەڵمدا دان، بەڵام بێ سوود بوو، سەرپێچییان لە من کرد کە من ڕەوانەکراوو پێغەمبەری خوام، پەیامی خوام بۆ هێناون، بێگومان نووح ﷺ و هەموو پێغەمبەرانی خوا لە لووتکەی عەقڵ و زانیاریی و ڕەوشتبەرزیی و دڵسۆزیی و ئاکار پەسندیی و، هەموو شتێکی باشدا بوون، کەچی سەرپێچییان لە نووح کرد، بەڵام ﴿ وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا ﴾، کەوتنە شوێن کەسێك کە سامانەکەی و ڕۆڵەکانی تەنیا زیانبارییان بۆ زیاد کرد، واتە: کەوتنە شوێن کەسانێك کە خاوەنی سامان بوون

و، خاوەنـی قەرەباڵغیـی و خـزم و کەسـی زۆر بـوون بـە دەوریانـەوە، لـە حاڵێکـدا ئـەو مـاڵ و سـامان و ئـەو قەرەباڵغیـی دەوریـان و خـزم و کـەس و ڕۆڵـەو وەچـەی دەوریـان، هـەر زیاتـر سـەری بـە فەتارەتـدان و بوونـە مایـەی زیانبارییـان، لەبـەر ئـەوەی وەك چاکـەو نیعمەتـی خـوا تەماشـایان نەکـردن، کـە شـوکری خوایـان لەسـەر بکـەن، بەڵکـو پێیـان بوغـڕا بـوون، بـە مـاڵ و سـامانەکەیان و بـە قەرەباڵغیـی و خـزم و کـەس و ڕۆڵەکانیـان بوغـڕا بـوون و لـە خۆبایـی بـوون.

﴿ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا كُبَّارٗا ﴾، هەروەهـا فێڵێکـی زۆر گـەورەو بێڕەزایـان لـە دژی مـن کـرد، پیلانێکـی گەورەیـان گێـڕا، پیـلان و فێڵەکـە دیـار نیـە چییـەو، زۆر شـت هەڵدەگـرێ:

أ- دەگونجێ ئەوە بووبێ کە پڕوپاگەندەیان لە دژی نووح کردوەو گوتوویانە: شێت بووە!.

ب- دەشگونجێ ئەوە بووبێ کە هەر کامێکیان ئامۆژگاریی کوڕو نەوەکانی خۆی کردوە: ئاگاتان لێ بێ، ئەگەر منیش مردم بە دوای نووح مەکەون، وەك لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا هاتوە! زۆر واتایان هەڵدەگرێ، گرنگ ئەوەیە نووح ﷺ دەڵێ: پیلانێکی بێڕەزاو گەورەیان لە دژی من گێڕا، ﴿ وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ ﴾، گوتیشیان، لە نێو خۆیاندا بەیەکدییان گوت: دەستبەرداری پەرستراوەکانتان مەبن: ﴿ وَلَا تَذَرُنَّ وَدّٗا وَلَا سُوَاعٗا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسۡرٗا ﴾، دەستبەرداری وەدوو سواع و یەغووث و یەعووق و نەسر، ئەو پێنج پەرستراوەتان مەبن، دەستبەرداری هیچ کام لە پەرستراوەکانتان مەبن، بە تایبەتی ئەم پێنجە، کە واپێدەچێ لە هەموویان گەورەتر بووبن.

﴿ وَقَدۡ أَضَلُّواْ كَثِيرٗا ﴾، نـووح ﷺ هـەر لەسـەر سـکاڵاکردنی خۆی لـە لای خوا ﷻ بـەردەوام دەبـێ و دەڵـێ: بـە دڵنیایـی ئـەوان خەڵکێکـی زۆریـان گومـڕاو سـەرگەردان کـرد بـەو بـت پەرسـتییە، ﴿ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلٗا ﴾، تـۆش بـۆ ستەمکاران تەنیا گومڕایـی و سـەرگەردانیی زیـاد بکـە، واتـە: بـا هـەر نەیەنـەوە سـەر ڕێ، وەك چـۆن مووسـا ﷺ تـووك و نـزای لـە فیرعـەون و لـە دارو دەسـتەکەی کـردو، فەرمـووی:

﴿ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ ﴾یونس، خوایە! دڵیان توند بکەو مەهێڵە بڕوا بێنن، تاکو ئازاری بە ئێش دەبینن، دەگونجێ لێرەشدا نووح ﷺ ئاوا تووکی توندی لە گەلە کافرەکەی کرد بێ، دەشگونجێ ﴿ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا ﴾، یانی: خوایە! تۆ هەر بێمرادیی و، گومڕایی و سەرگەردانیی بۆ ستەمکارەکان زیاد بکە، کە زەفەرم پێ نەبەن، واتە: ڕێی بە ئامانج گەیەنەر بۆ خۆیان نەدۆزنەوە، کە زیانی پێ لە من بدەن و با هەوڵەکانیان و پیلان و فێڵەکانیان ببنە بڵقی سەر ئاو، ئەوەش واتایەکی دیکەیەتی، بەڵام واتای یەکەمیان زیاتر پێدەچێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکانیشدا شیی دەکەینەوە.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ ﴾، بەهۆی گوناهو تاوانەکانیانەوە نغرۆکران و خنکێنران، ﴿ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا ﴾، یەکسەریش خرانە نێو ئاگرێکی بێڕەزاوە، وەك پێشتریش گوتمان: ئەمە بەڵگەیە لەسەر هەبوونی سزاو، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: نازو نیعمەت، لە قۆناغی بەرزەخدا دوای ئەوەی مرۆڤ ڕووحی لە جەستەی جیادەبێتەوە، چونکە لێرە بە (ف)ی بە دواداهاتن (**فاء التعقیب**)، هاتووە: ﴿ مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا ﴾، یانی: دوای ئەوەی خنکێنران یەکسەر خرانە نێو ئاگرەوە، واتە: ڕووحەکانیان خرانە نێو ئاگرەوە لە قۆناغی بەرزەخدا.

ئنجا ئایا هەر ئەو دۆزەخەیە کە خوا دایناوەو لە ڕۆژی دواییدا بێبڕوایان دەیچنەتێ؟ یاخود دۆزەخی قۆناغی بەرزەخ دۆزەخێکی دیکەیە؟ هەردوو ئەگەرەکەی هەن، ﴿ فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴾، جگە لە خوا پشتیوانانێکیان چنگ نەکەوتن لە فریایان بێن.

ئنجا خوا سکاڵاو پاڕانەوەی دووەمی نووح باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾، نووح گوتی: پەروەردگارم! ماڵنشینێك لە بێبڕوایەکان لەسەر زەوی مەهێڵە، (**دیّار**)، بە مانای کەسێك کە (**سَاكِن**) بێ،

(مَـنْ يَسْـكنِ الـدَّار)، کەسـێك نیشـتەجێی خانـوو بـێ و، وشـەی (دیّـار)، یانـی: لـە حاڵەتـی لابـردن (نفـي)دا دێ.

﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەگـەر تـۆ بیانهێڵـی، بەندەکانـت گومـڕا دەکـەن، ﴿ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴾، جگە لە تاوانباری سپڵەو بێبڕواشیان نابـێ، واتـە: ئـەو وەچەیـەش کـە لێیـان دەبـێ، هەموویـان هـەر بـەو شـێوەیە دەبـن، بێگومـان خـوا ﷻ نووحـی لـەوە ئـاگادار کردۆتـەوە، ئەگەرنـا ئـەوە شـتێکی پەنهانـە، کـە ئایـا ئەوانـەی لێشـیان دەبـن، هـەر تاوانبـارو سـپڵەو بێبـڕوا دەبـن، یـان نـا؟ دیـارە خـوا ﷻ ئـاگاداری کردۆتـەوە، وەك لـە سـوورەتی (هـود)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَأُوحِىَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ ﴿٣٦﴾ ﴾، سروش کـرا بـۆ لای نـووح (ئـەی نـووح!) جگـە لەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە لـە کۆمەڵەکـەت لـە گەلەکـەت کەسـی دیکـە ئیـمان ناهێنـێ، کەواتـە: نـووح عليه السلام لەلایـەن خـواوە زانیاریـی پێـدراوە، ئەگەرنـا ئـەوە نادیـار و پەنهانـەو تەنیا خـوا دەیزانـێ، بـەڵام ئەگـەر خـوا یەکێـك لـە پێغەمبـەران (عَلَيهُـم الصَّلَاة وَالسَّلَام) لـە پەنهـان و غەیبێکـی خـۆی ئـاگادار بکاتـەوە، ئەویـش دەیزانـێ، ﴿ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ ﴾، پـەروەردگارم! لـە مـن ببـوورەو لـە بـاب و دایکـم، دیـارە بـاب و دایکـی بـڕوادار بـوون، ﴿ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا ﴾، هەروەهـا لـە هـەر کەسـێکیش ببـوورە کـە بـە ئیمانـەوە، دێتـە ماڵەکەمـەوە، ﴿ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾، هەروەهـا لـە پیاوانـی بـڕوادارو ئافرەتانـی بـڕوادار ببـوورە، ﴿ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴾، ستەمکارانیش تەنیا سـەر بەفەتـارەت چـوون و بـە هیـلاك چوونیـان بـۆ زیـاد بکـە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

گەیشتنە بن بەستی نووح لەگەڵ کۆمەڵگایەکەیداو، گەیاندنی ئەو ڕاستییە کە سەرپێچییان لێی کردو، شوێن زلەزلە ساماندارو دەور قەرەباڵغە بوغڕاکان کەوتن، کە فێڵێکی گەورەیان لە خەڵکەکە کردو پێیان گوتن: دەست لە بتەکانتان هەڵنەگرن: وەدو سواع و یەغووث و یەعووق و نەسر، سەرەنجام بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە نغرۆ بوون و، یەکسەریش خرانە نێو ئاگرەوە لە قۆناغی بەرزەخ دا:

خوا دەفەرمووێ: ﴿قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا ﴿٢٤﴾ مِّمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي﴾، نووح گوتی: پەروەردگارم! ئەوان (خەڵکەکەم، کۆمەڵگایەکەم) سەرپێچییان لێکردم، (الطبري)، ئاوای ئەم ئایەتە موبارەکە لێکداوەتەوە: (رَبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي فَخَالَفُوا أَمْرِي، وَرَدُّوا عَلَيَّ مَا دَعَوْتُهُمْ إِلَيْهِ مِنَ الْهُدَى وَالرَّشَادِ)، واتە: پەروەردگارم! ئەوان، کۆمەڵەکەم سەرپێچییان لێکردم و، فەرمانی منیان جێبەجێ نەکردو شکاندیان و، ئەو بانگەوازەی بۆم کردن بەرەو ڕێنمایی و سەرڕاستیی بەرپەرچیان دایەوە.

بێگومان ئەمە سکاڵاکردنی نووحە عليه السلام بۆ لای خوا سبحانه وتعالى و، زەمینە خۆشکردنیشە کە دوایی ئەو تووك و نزایەیان لێ بکات: خوا لە بەینیان بەرێ و قڕەبڕیان بکات.

٢)- ﴿ وَٱتَّبَعُواْ مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا ﴾، کەوتنە شوێن کەسێکەوەش کە سامانەکەی و ڕۆڵەکانی تەنیا زیانبارییان بۆ زیاد کرد، واتە: ئەو سامانەی خوا پێیدابوون، ئەو کوڕو کچانەی خوا پێیدابوون، لە جیاتی ئەوەی بیانکاتە ئامڕازێك بۆ خۆ پێ لە خوا وەنیزیك خستن و، سوپاسگوزاریی بۆ خواکردن، بە پێچەوانەوە: بەهۆی سامانەکەیانەوە زیاتر بوغڕا بوون و لە کەوڵی خۆیان دەرچوون و، بەهۆی ڕۆڵەکانیشیانەوە زیاتر لە خوا یاخیی بوون، وشەی ﴿ وَوَلَدُهُۥٓ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (وَوُلْدُهُ)، (وُلْدُ و وَلَد)، هەردووکیان کۆی (مَوْلُود)ن، و بە مانای (أَوْلَاد) دێن، واتە: ڕۆڵەکان.

کە دەشفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي ﴾، ئەوانە سەرپێچییان لێکردم واتە: بەردەوام بوون لەسەر سەرپێچیی لێکردنم، ئەگەرنا پێشێش وەنەبێ فەرمانبەری بووبن.

٣)- ﴿ وَمَكَرُواْ مَكْرًا كُبَّارًا ﴾، فێڵێکی بێڕەزایان کرد، (كُبَّار)، واتە: زۆر گەورە، چونکە (كَبِيْر)، بە مانای گەورە دێ (كُبَار) یان (كِبَار)، بە مانای گەورەتر دێ، بەڵام (كُبَّار)، واتە: زۆر گەورە، زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە، (إبن زيد)، دەڵێ: (كُبَّاراً أي كَثِيْراً)[1] (كبّار)واتە: زۆر، هەندێکیان گوتوویانە: (كُبَّاراً أي: عَظِيْمَاً)، واتە: پیلانێکی مەزن.

زانایان گوتوویانە: (كبير و كُبار وكُبَّار)، وەك (عَجِيْب وَعُجَاب وعجَّاب)، وان، (عَجِيْب)، واتە: سەیر (عُجَاب)، واتە: زۆر سەیر، (عُجّاب)، یانی: ئەو پەڕی سەیرو سەرسوڕهێنەر، هەروەها وەك: (حَسَن حُسَان حُسّان)، چاك، زۆر چاك، زۆر زۆر چاك.

٤)- ﴿ وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ ﴾، گوتیشیان: دەستبەرداری پەرستراوەکانتان مەبن، ﴿ لَا تَذَرُنَّ ﴾، واتە: (لَا تَتْرُكُنَّ لَا تَدَعُنَّ)، دەستبەرداری پەرستراوەکانتان مەبن بۆ قسەی نووح ﷺ کە بانگتان دەکات بۆ خوا پەرستیی و بە قسەی مەکەن.

٥)- ﴿ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴾، هەروەها دەستبەرداری وەدو سواع و یەغووث و یەعووق و نەسڕ، مەبن، ﴿ وَدًّا ﴾، خوێندراویشەتەوە: (وُدّا)، (وَلَا تَذَرُنَّ وُدَّاً)، گومانی تێدا نیە کە ئەو بت و صەنەمانە پێش هەڵسانی تۆفان پەرستراون.

---

(١) جامع البيان: ٣٥١٢٣ .

ئـەوەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە بتپەرسـتیی شـتێکی دێرینـەو، ڕیشـەی بـە قوڵایـی مێـژوودا چۆتـە خـوار، بـەڵام چونکـە لـە کۆتایـی ئـەم دەرسـەدا کورتـە باسێك لـە بـارەی بـت پەرسـتییەوە دەکەیـن: هـەم مانـای بتپەرسـتیی، هـەم مێـژووی بتپەرسـتیی، هۆکارەکانـی بتپەرسـتیی، هـەم پەیوەندیـی نێـوان بتپەرسـتیی و شـیرك، بۆیـە لێـرە لەسـەری ناچیـن.

٦)- ﴿ وَقَدۡ أَضَلُّواْ كَثِيرٗاۖ ﴾، بێگومان ئەوان خەڵکێکی زۆریان گومڕا کرد، پێدەچێ لێرەدا مەبەست لە ڕاناوی کۆ لە (أَضَلُّواْ )دا، سەرکردەکان (رُؤَسَاء)بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی صەنەمەکان بێ، بۆیەش ڕاناوی کۆی عاقڵانی بۆ بەکارهێناون ﴿ أَضَلُّواْ ﴾، وەك مامەڵەکردن لەگەڵ عەقڵی ئەوانەدا کە بتەکانیان پەرستوون و، پێیان وابووە خاوەن عەقڵ و شعوورو ئیرادەن.

٧)- ﴿ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلٗا ﴾، (پەروەردگارم!) ستەمکاران تەنیا گومڕاییان بۆ زیاد بکە، (**ضلال**) لەم ڕستەیەدا سێ واتای هەن:

أ- دەگونجێ لێرەدا مەبەست پێی لە بەین چوون بێ، (**هَلَاكاً**).

ب- دەشگونجێ مەبەست ئاوابێ: (**ضَلَالًا: عَنِ الكَيْدِ الخَبِيْث**)، واتە: ئەو پیلانەی دەیگێڕن، خوایە! تۆ هەر گومڕاییان بۆ زیاد بکە، کە پیلانەکەیان سەرنەگرێ.

ج- منیش ڕام وایە - کە ڕەنگە لە هەندێك لە تەفسیرەکانیشدا هاتبێ - (**ضلال**) لێرەدا بەمانای گومڕاییەوە، ئەوە وەک تووك و نزایەکەی مووسا عليه السلام وایە، لە کاتێك دا زۆر پەست و تووڕەو بێزار بوو بوو لە فیرعەون و دارو دەستەکەی و فەرمووی: ﴿ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٨٨ ﴾یونس، پەروەردگارمان! ماڵ و سامانی فیرعەون و دارو دەستەکەی لەبەین بەرەو مەیهێڵە (**طَمْس**)، {بریتیە لە کوژانەوەو سڕینەوەی شتێك}، ﴿ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ ﴾، دڵیشیان ببەستەو گرێی بدە، وەك چۆن زاری توورەکەیەك دەبەسترێ و مەشکەیەك، کوندەیەك، دەمەکەی دەبەسترێ بۆ ئەوەی ئەو ئاوەی تێیدایە نەڕژێ، ئاوا دڵیان ببەستە با ئیمانی نەچێتەتێ، ﴿ فَلَا

﴿يُؤْمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ٨٨﴾، با بڕوا نەهێنن تاكو ئازاری بە ئێش دەبینن، دیارە خواش ﷻ تووكەكەی[1] لێ قبووڵ كردوە: ﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا ٨٩﴾يونس، (خوا) فەرمووی: پاڕانەوەكەی هەردووكتان (تۆو هاروونی برات) قبووڵ بوو، لێرەش كە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی نووح دەیگێڕێتەوە كە گوتوویەتی: ﴿وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا ٢٤﴾، ستەمكاران هەر گومڕاییان بۆ زیاد بكە، پێم وایە هەرچەندە دەگونجێ بە مانای: لە بەینچوون و، بە مانای ئەوەبێ كە پیلانەكەیان سەر نەگرێ، بەڵام دەشگونجێ بە مانای ئەوە بێ، خوایە! هەر زیاتر گومڕایان بكە و باپتر بە گومڕاییدا نغرۆ بن و قووڵ ببنەوە، چونكە نووح زانیویەتی كە هەتا گومڕا تربن، سزای خوا لێیان نیزیكترەو، سزای خوا بۆشیان سەختترە، وەك پێشتریش باسمكرد لە مانا گشتییەكەیدا دیارە نووح عليه السلام لە لایەن خواوە هەواڵی پێدراوە كە ئەوانە بڕوا ناهێنن، بۆیە ئەو تووك و نزایەی لێكردوون.

٨)- ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٰٔتِهِمْ أُغْرِقُواْ﴾، بەهۆی تاوانەكانیانەوە نغرۆ بوون، خوێندراویشەتەوە: (**مِمَّا خَطَايَاهُم**)، هەروەها ﴿أُغْرِقُواْ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**غُرِّقوا**)، (**أُغْرِقُوا وَغُرِّقُوا**)، یەك واتایان هەیە، واتە: بەهۆی گوناهو تاوانەكانیانەوە نغرۆ بوون، خنكێنران، وشەی (**ما**) لە: ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٰٔتِهِمْ﴾دا، زیاد كراوەو ئەصڵی خۆی (**مِنْ خَطِيئَاتِهم**)ە، یانی: (**مِنْ أَجْلِ خَطِيْئَاتِهم**)، بەهۆی گوناهەكانیانەوە، بەڵام (**مَا**)یەكە زیاد كراوە بۆ جەختكردنەوەو گەورە پێشاندانی گوناهەكانیان.

٩)- ﴿فَأُدْخِلُواْ نَارًا﴾، یەكسەر دوا بە دوای ئەوەی خنكێنران لە ئاودا، خرانە نێو ئاگرەوەش، ئاگرێكی بێڕەزا، ئنجا ئەمەش دوو ئەگەری هەن:

**١**- دەگونجێ مەبەست پێی ئاگری دۆزەخ بێ لە قۆناغی بەرزەخدا، وەك لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، كە لە دوای جیابوونەوەی ڕووح لە جەستە، مرۆڤ دەكەوێتە نێو نازونیعمەت خۆشیی و ئەگەر ئەهلی ئیمان بێ دەچێتە بەهەشت، یاخود دەكەوێتە ناخۆشیی و سزاو ئازارەوە، ئەگەر بێبڕواو خراپەكار بووبێ.

---

(١) تووك: لە زمانی كوردیی دا یانی: پاڕانەوە بۆ زیان پێگەیشتن (دعاء بالشّر).

**٢-** دەشگونجێ مەبەست لەم ئاگرە، ئاگری ڕۆژی دوایی بێ، ئەم ئەگەرەش هەر هەیە، بەڵام مادام ﴿فَأُدۡخِلُواْ نَارٗا﴾، بە (**فَاء التَّعْقِيب**) هاتوە، یانی: یەکسەر دوا بە دوای ئەوەی خنکێنران، یەکسەر چوونە نێو ئاگرەوە، ئەو شیمانەو ئەگەرە بەهێزترە کە مەبەست پێی سزاو ئازاری قۆناغی بەرزەخ بێ.

**١٠)-** ﴿فَلَمۡ يَجِدُواْ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارٗا﴾، جگە لە خواش هیچ پشتیوانانێکیان چنگ نەکەوتن، ئەمەش جۆرێك لە توانج تێگرتنیانە، یانی: پەرستراوەکانیان کە پێیان دەنازین و توند توند دەستیان پێوە گرتبوون، هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن، نە شەفاعەتیان بۆ کردن، نە بەرگرییان لێکردن، نە سوودیان پێگەیاندن، نە زیانیشیان لێ دوورخستنەوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**لە خوا پاڕانەوەی نووح ﵇ کە هیچ تاکێك و خانوونشینێك لە کافرەکان نەهێڵێ و قڕە بڕیان بکات، چونکە ئەگەر بیانهێڵێ، بەندەکانی خوا گومڕا دەکەن و، بێجگە لە بێبڕوایانی تاوانباریشیان لێ وەپاش ناکەون، پاشان لە خوا پاڕانەوەی بۆ خۆی و بابی و دایکی و بڕوادارانی پیاو و ئافرەت و، هەرچی زیاتر فەوتاندنی کافرەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴾، هەروەها نووح گوتی: پەروەردگارم! هیچ تاکێك لەسەر زەوی لە بێبڕوایان مەهێڵە، وێڕای ئەوەی نووح ﵇ ئەو قسەیەی پێشێی کرد کە لە خوا پاڕایەوەو فەرمووی: ﴿ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا ﴾، ئەم پاڕانەوەیەشی گوت، ئەم داوایەشی لە خوا کرد: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ ﴾، هەروەها نووح گوتی: پەروەردگارم! ﴿ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴾، تاکێك، ماڵنشینێك لە بێبڕوایەکان لەسەر زەوی مەهێڵە، (الطبري)، گوتوویەتی: (**وَيَعْنِي بِالدَّيَّارِ مَنْ يَدُورُ فِي الْأَرْضِ، فَيَذْهَبُ وَيَجِيءُ فِيهَا، كَمَا قِيلَ: الديَّار: الْحَيُّ الْقَائِمُ**)، یانی: (دَیَّار)، کەسێکە لە زەویدا دێ و دەچێ و دێ و دەڕوا، هەندێکیش گوتوویانە: (دَیَّار)، لێرەدا مەبەست پێی زیندوویەکی ڕاوەستاوە، واتە: پەروەردگارم! مرۆڤی بە پێوەیان لێ مەهێڵە.

بەڵام مانای دیارتری (دَیَّار)، بریتیە لە: (**مَنْ يَسْكُنِ الدَّار**)، کەسێك کە لە ماڵدا نیشتەجێیە.

٢)- ﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ ﴾، {نووح عليه السلام بەڵگەو پاساو دێنێتەوە کە بۆچی کەسیان لێ نەهێڵێ؟ دەفەرموێ:} بە دڵنیایی (پەروەردگارم!) ئەگەر تۆ بیانهێڵی (وازیان لێ بێنی و نەیانفەوتێنی)، تێکڕای بەندەکانت گومڕا دەکەن، واتە: ئەو بەندانەت کە بڕوایان بە من هێناوە، ئەوانەش گومڕا دەکەن، چونکە هەر بەردەوامن، لەسەر بێبڕوایی و ملهوڕیی و دژایەتیی.

٣)- ﴿ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴾، تەنیا تاوانباری سپڵەو بێبڕواشیان لێ دەبن، واتە: ئەوەی لێشیان دەبێ، زۆر تاوانبارو خراپەکارە، (**الفَاجِرُ: المُتَّصِفُ بِالفُجُورِ، وَهُوَ العَمَلُ الشَّدِيدُ الفَسَادِ**)، (**فَاجِر**)، کەسێکە سیفەتی (**فُجُور**)ی تێدا هەیەو (**فُجُور**)یش، بریتیە لە کارێکی زۆر تێکدەرانەو خراپ، (**وَالْكَفَّارُ: مُبَالَغَةٌ فِي الكُفْرِ، أَو الكُفْرَان**)، (**كُفَّار**)، زێدەڕۆییە لە (کفر) یان لە (**كُفْرَان**)دا، (**كُفْر**)، واتە: بێبڕوایی (**كُفْرَان**)یش، واتە: سپڵەیی و ناسوپاسیی، لێرەدا نووح عليه السلام بە تەنگ ئەوەوەیە کە ئەگەر کەسیان لێ بمێنێ، بەندەکان گومڕا دەکەن، هەروەها ئەگەر ئەوانە نەسل و وەچەیان بەردەوام بێ، هەر مرۆڤی خراپەکارو بێبڕواو سپڵەیان لێ دەبێ.

لێرەدا (**إبن عاشور**)، قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: (**وَفِي كَلَامِ نُوحٍ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْمُصْلِحِينَ يَهْتَمُّونَ بِإِصْلَاحِ جِيلِهِمُ الْحَاضِرِ، وَلَا يُهْمِلُونَ تَأْسِيسَ أُسُسِ إِصْلَاحِ الأَجْيَالِ الْآتِيَةِ**)، واتە: ئەو قسەیەی نووح (پاڕانەوەکەی نووح عليه السلام) ئەوە دەگەیەنێ کە چاکسازییکاران، وێڕای ئەوەی گرنگیی دەدەن بە چاککردنی ئەو کۆمەڵگایەی تێیدان، ئەوەش پشت گوێ ناخەن کە بناغەیەك دابنێن بۆ چاککردنی جیل و وەچەکانی کە دواتر دێن.

٤)- ﴿ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ ﴾، پەروەردگارم! لە خۆم و لە باب و دایکم خۆشبە، لە تەوراتدا دەڵێ: بابی نووح ناوی (لەمەك) بووە، دایکیشی ناوی (شەمخا کچی ئانووش) بووە، بەڵام ئەوە جێی پشت پێبەستن نیەو، هیچ بەرژەوەندییەکیش نەبەستراوەتەوە بەوەوە کە ناوی باب و دایکی نووح، بزانرێ، ئەگەرنا خوای کاربەجێ باسی دەکرد،

گرنگ ئەوەیە نووح دەپاڕێتەوە بۆ خۆی و بۆ باب و دایکی و ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی باب و دایکی بڕوادار بوون، ئەگەرنا بۆیان نەدەپاڕایەوە، چونکە دەزانێ کە خوا ﷻ پاڕانەوە بۆ بێبڕوایان قبووڵ ناکات.

٥)- ﴿وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا﴾، هەروەها (پەروەردگارم!) لە هەر کەسێکیش ببوورە کە بە بڕواداریی دێتە ماڵەکەی منەوە، ﴿بَيْتِيَ﴾، خوێندراوەتەوەش: (**بَيْتِي**)، لێرە کە دەفەرموێ: ئەو کەسەی بە بڕواداریی دێتە ماڵەکەم، واتە: ئەوەی زیاتر لەگەڵم تێکەڵەو، هاموشۆم دەکات، کە بە دڵنیایی بڕوادارو پارێزکارانن، پێغەمبەری خاتەمیش فەرموویەتی: {**لاَ تُصَاحِبْ إلاَّ مُؤْمِناً، وَلاَ يَأْكُل طَعَامُكَ إلاَّ تَقِيّ**}[1]، واتە: هاوەڵایەتیی بڕوادار نەبێ مەکەو، با پارێزکار نەبێ خواردنت نەخوات.

٦)- ﴿وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾، هەروەها (ئەی پەروەردگارم!) لە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕواداریش ببوورە، چاوپۆشییان لێ بکە لە هەڵەو کەم و کوڕییەکانیان.

٧)- ﴿وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا﴾، ستەمکارانیش هەر سەر بە فەتارەت چوون و، تێك و پێك شکان و، دۆڕان و زیانبارییان بۆ زیاد بکە، (**التَّبَارُ: الهَلاَكُ، تَبَّرَهُ تَتْبِيْراً أي: كَسَّرَهُ وَأَهْلَكَهُ** ﴿مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ﴾ **الأعراف، مُكَسَّرٌ مُهْلَك**)، (**تَبَارُ**)، یانی: (**هَلاَكُ**)، فەوتان (**تَبَّرَهُ تَتْبِيراً**)، {هەروەها (**تَبْرَهُ، تَبَارًا**)}، واتە: فەوتاندی بە فەوتاندن یان شکاندیی، ﴿مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ﴾ **الأعراف**، واتە: (**مُكَسَّرٌ أو مُهْلَك**)، واتە: تێکشکاوەو فەوتاوە ئەوەی ئەوان تێیدان، واتە: ئەوانەی بتان دەپەرستن، خۆیان و بتپەرستییەکەیان سەریان بە فەتارەت دەچێ و، تێکشکاو و بێ ئەنجام و بێ ئاکامن.

---

(١) أخرجه أحمد: ١١٣٥٥، والدارمي: ٢٠٥٧، وأبو داود: ٤٨٣٢، والترمذي: ٢٣٩٥، وقال: حسن، وأبو يعلى: ١٣١٥، وابن حبان: ٥٥٤، والحاكم: ٧١٦٩، وقال: صحيح الإسناد.

## کورتە باسێک لە بارەی بتپەرستییەوە

بەڕێزان! ئەم کورتە باسە لە چوار بڕگەدا دەخەینەڕوو:

**بڕگەی یەکەم: پێناسەی وشەکانی: (صَنَمَ، وَثَنْ، نَصَب).**

**ئەم سێ وشەیە لە قورئاندا بەکارهاتوون، بۆ ئەو پەرستراوانەی جگە لە خوا دەپەرسترێن، لە شێوەی بەردو پەیکەرو ئەو شتانەدا کە دایانناون لە پەرستگاکاندا، بۆیە بە پێویستم زانی سەرەتا ئەم سێ وشەیە لە ڕووی زمانەوانییەوە شیی بکەینەوە:**

**١-** وشەی (الصَّنَمَ): (المعجم الوسيط)[1]، دەڵێ: (صَنَّمَ فُلَانٌ: صَنَعَ صَنَماً، وَصَنَّمَ الشَّيءَ: مَثَّلَهُ عَلَى صُورَةِ الصَّنِمِ، الصَّنَمُ: تمثالٌ من حَجَرٍ أو خشبٍ أَو مَعْدن، كَانُوا يَزْعمُونَ أَن عِبَادَته تُقَرِّبُهُمْ إِلَى الله، وَالجَمْعُ الأَصْنَام، وَفِي التَّنْزِيْل: ﴿فَأَتَوْا۟ عَلَىٰ قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصْنَامٍ لَّهُمْ ۝١٣٨﴾ الأعراف)، واتە: (صَنَّمَ فلانٌ)، واتە: فڵانکەس صەنەمێکی دروستکرد، (صَنَّمَ الشَّيءَ)، واتە: وێنەی شتەکەی کێشا لە سەر شێوەی صەنەم، (صَنَم): پەیکەرێکە لە بەرد، یان لە دارو تەختە، یاخود لە کانزا، لەسەر شێوەیەك لە شێوەکان دروست دەکرێ، (ئنجا لەسەر شێوەی مرۆڤە، یان لەسەر شێوەی دروستکراوێکە بە ئەندێشەو خەیاڵ، یان لەسەر شێوەی ئاژەڵێکە یان باڵندەیەکە، یان بە خەیاڵی خۆیان لەسەر شێوەی شەیتانە، یان لەسەر شێوەی فریشتەیە بە خەیاڵی خۆیان و، چونکە کەس شەیتان و فریشتەی نەبینیون)، پێیان وابووە پەرستنی ئەو صەنەمە لە خوایان نزیك دەخاتەوە، کۆی (صَنَم)یش، (أَصْنَام)ەو، لە قورئانیش دا هاتوە: ﴿فَأَتَوْا۟ عَلَىٰ قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصْنَامٍ لَّهُمْ ۝١٣٨﴾ **الأعراف**، بەنوو ئیسرائیل بە لای کۆمەڵێکدا تێپەڕین کە دەمانەوە لەسەر هەندێك لە بتەکانیان، واتە: لە دەوریان دەمانەوەو دەیانپەرستن.

---

(١) ص: ٥٢٦.

لـە کوردیـی دا (صَنَـم): وشـەی صەنەمیشـی بـۆ بـەکاردێ و، بتیـشی بـۆ بـەکاردێ و، پەیکەریـشی بـۆ بـەکاردێ.

خـاوەنی (**مفـردات ألفـاظ القـرآن**)[١]، دەڵـێ: (**الصَّنَـمَ: جُثَّـةٌ مُتَّخَـذَةٌ مِـنْ فِضَّـةٍ، أو نُحَـاسٍ، أو خَشَـبٍ، كَانُـوُا يَعْبُدُونَهَـا مُتَقَرِّبِـيْنَ بِـهِ إِلى اللَّـه تَعَـالى، وَجَمْعُـهُ أَصْنَـام قَـالَ تَعَـالَى:** ﴿أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ۝٧٤﴾ **الأنعـام، وَقَـالَ:** ﴿لَأَكِيدَنَّ أَصْنَمَكُم ۝٥٧﴾ **الأنبيـاء، قَـالَ بَعْـضُ الحُكَـمَاء: كُلُّ مَـا عُبِـدَ مِـنْ دُونِ اللَّـهِ بَـل كُلُّ مَـا يُشْـغِلُ عَـنِ اللَّـه تَعَـالَى يُقَـالُ لَـهُ: صَنَـم، وَعَـلَى هَـذَا الوَجِـه، قَـالَ إِبْرَاهِيْـم صَلَـواتُ اللَّـه عَلَيْـه:** ﴿وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ۝٣٥﴾ **إبراهيـم، فَمَعْلُـومٌ أَنَّ إِبْرَاهِيْـم مَـعَ تَحَقُّقِـهِ بِمَعْرِفَـةِ اللَّـهِ تَعَـالَى واطِّلَاعِـهِ عَـلَى حِكْمَتِـه، لَـمْ يَكُـنْ مِمَّـن يَخَـافُ أَنْ يَعُـودَ إِلى عِبَـادَة تِلْـكَ الجُثَّـثِ الَّتِـي كَانُـوُا يَعْبُدُونَهَـا، فَكَأَنَّـهُ قَـالَ: اجْنُبْنِـي عَـنِ الإِشْـتِغَال بِمَـا يَصْرِفُنِـي عَنْـكَ**).

واتـە: (صَنـم): جەسـتەیەکە لـە زیـو، یـان لـە مـس، یـان لـە تەختـە دروسـت دەکـرێ و پەیکەرێکـە، عادەتیـان وابـوو دەیانپەرسـت، بەحیسـابی خۆیـان بـۆ ئـەوەی پێـی لـە خـوای بـەرز نزیـك کەونـەوە، کـۆی (صَنـم)، (أصْنَـام)ە، خـوای بـەرز فەرموویـەتی: ﴿أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ۝٧٤﴾ الأنعـام، ئایـا تـۆ صەنەمـان دەکـەی بـە پەرسـتراو؟ ئـەوە ئیبراهیـم ﷺ بـە بـابی دەڵـێ، هەروەهـا ﴿لَأَكِيدَنَّ أَصْنَمَكُم ۝٥٧﴾ الأنبيـاء، واتـە: پلانێـك لـە دژی بتەکانتـان دادەنێـم، ئەویـش هـەر قسـەی ئیبراهیمـەو، هەندێـك لـە حەکیمـەکان گوتوویانـە: هـەر شـتێك جگـە لـە خـوای بپەرسـترێ، بەڵکـو هـەر شـتێك کـە مـرۆڤ لـە خـوای بـەرز بـێ ئـاگا بـکات، پێـی دەگوتـرێ: (صَنَـم)، ئنجـا لـەم ڕووەوەیـە کـە ئیبراهیـم ﷺ لـە خـوا پاڕاوەتـەوەو فەرموویەتـی: ﴿وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ۝٣٥﴾ إبراهيـم، واتـە: (خوایـە!) خـۆم و ڕۆڵەکانـم بپارێـزە لـەوەی بتانپەرسـتین، چونکـە شـتێکی زانـراوە ئیبراهیم دوای ئـەوەی خـوای بـەرزی چـاك ناسـیوەو، ئـاگاداری حیکمـەتی خـوا بـووە، لەوە نەترسـاوە بگەڕێتـەوە بـۆ پەرسـتنی ئـەو بتانـە، ئـەو جەسـتانەی گەلەکـەی پەرسـتوویانن، بەڵکـو

(١) ص: ٤٩٤.

وەك ئـەوەی فەرموویێتــی: دوورم بخـەوەو بمپارێـزە لـەوەی سـەرقاڵبم بـە هــەر شـتێکەوە کـە لـە تـۆم بـێ ئـاگام بـکات.

**٢-** وشەی (**الوَثَنْ**): کە لە قورئانیشدا هاتوە، خاوەنی (**المعجم الوسيط**)[1]، دەڵێ: (**وَثَنَ الشَّيْء بِالْمَكَانِ يَثِنُ وَثْنَاً: أَقَامَ وَثَبَتَ فَهُوَ وَاثِن، وَالجَمْعُ وُثَّن، الوَثَنُ: التِّمْثَالُ يُعْبَدُ سَوَاءً كَانَ مِنْ خَشَبٍ، أم حَجَرٍ، أم نُحَاسٍ، أم فِضَّةٍ، أم غَيْرِ ذَلِك.. الوَثَنِيُّ: مَن يَتّخذ عِبَادَةِ الوَثَن، يُقَالُ: رَجلٌ وَثَنِيٌّ، وَقَوْم وَثَنِيُّون، وَأَمْرَةٌ وَثَنِيَّة، وَنِسَاءٌ وَثَنِيّات، وَالوَثَنِيَّةُ: مَذْهَبُ عَبَدَةِ الأَوْثَان**).

واتــە: لــە زمــانی عەرەبیــی دا دەگوتــرێ: (**وَثَــنَ الـشَّيْء بِالْمَـكَانِ يَـثِنُ وَثْنَـاً: أَقَـامَ وَثَبَـتَ**)، واتــە: شـتەکە لـە شـوێنەکە چەسـپاو لێـی نیشـتەجێ بـوو، (**فَهُـوَ وَاثِـن**)، ئـەو نیشـتەجێیە، کـۆی (**وَاثِن**)یـش (**وُثَّـن**)ە، (**وَثَن**)یـش بریتیـە لـەو پەیکـەرەی دەپەرسترێ، ئنجـا ئایـا لـە دارو تەختـە بـێ، لـە بـەرد بـێ، یـان لـە مـس بـێ، یـان لـە زیـو بـێ، یـان هــەر ماددەیـەکی دیکـە بـێ، (**وَثَنِـيٌّ**)، کەسـێکە دینەکـەی بریتیـە لـە پەرسـتنی (**وثـن**)، (واتــە: پەیکـەرو بـت)، دەگوتـرێ: پیاوێـکی بتپەرسـت و کۆمەڵێـکی بتپەرسـت و ئافرەتێـکی بتپەرسـت و ئافرەتانێکـی بتپەرسـت، (**وَثَنِيـة**)ش، ڕێبـازی بتپەرسـتەکان و پەیکـەر پەرسـتەکانە.

**٣-** وشەی (**نصب**): ڕاغیبی ئەسفەهانیی لە (**مفردات ألفاظ القرآن**)دا[2]، دەڵێ: (**نَصْبُ الشَّيْءِ: وَضْعُهُ وَضْعًا نَاتِئًا ; كَنَصْبِ الرُّمْحِ وَالْبِنَاءِ وَالْحَجَرِ، وَالنَّصِيبُ الْحِجَارَةُ تُنْصَبُ عَلَى الشَّيْءِ، وَجَمْعُهُ نَصَائِبُ وَنُصُبٌ بِضَمَّتَيْنِ، وَكَانَ لِلْعَرَبِ حِجَارَةٌ تَعْبُدُهَا وَتَذْبَحُ عَلَيْهَا، قَالَ تعالى:** ﴿كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾﴾**المعارج، وَقَالَ:** ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ ﴿٣﴾﴾**المائدة، وَقَد يُقَال فِي جَمْعِه: أَنْصَاب قَالَ:** ﴿وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ ﴿٩٠﴾﴾**المائدة**).

واتــە: (**نَصْـبُ الـشَّيْءِ**)، یـانی: چەقاندنـی ئـەو شـتە بـە شـێوەیەك بـەرز بێتــەوە، وەك چـۆن ڕم و نێـزەو خانـوو و بـەرد دەچەقێنرێـن و بەرزدەکرێنـەوە، (**نَصِيب**)یـش

(١) ص: ١٠١٣.

(٢) ص: ٨٠٧.

بەردێکە لەسەر شتێك دەچەقێنرێ و بە (نَصَائِبُ)، کۆ دەکرێتەوەو بە (نُصُب)یش، عەرەب بەردێکیان هەبووە پەرستوویانەو، ئاژەڵیان لەلا سەر بڕیوە بۆ بتەکانیان، خوای بەرز دەفەرمووێ: ﴿كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾﴾ المعارج، بێبڕوایەکان بەرەو ڕووی تۆ دێن (ئەی موحەممەد ﷺ) یاخود: بێبڕوایەکان لە ڕۆژی دوایی دا کە بانگ دەکرێن و لە گۆڕەکانیان هەڵدەستێنرێنەوە، وەك بەرەو بتەکانیان بچن ئاوا بە خێرایی دەڕۆن، هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ ﴿٣﴾﴾ المائدة، ئەوەی لەسەر بەردەکان سەر دەبڕرێ، {(نصُب)، کۆی (نَصِیب) ە، یانی: ئەو بەردەی دادەنرێ و دەپەرسترێ}، هەروەها بۆ کۆی (نصیب) وێڕای (نُصُب)، (أنْصَاب)یش، هەر دەگوترێ، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ ﴿٩٠﴾﴾ المائدة، نەصەبەکان و زەلەمەکان.

(المعجم الوسيط)[1]، لە بارەی نەصەبەوە دەڵێ: (**النَّصَبُ: العَلَمُ المَنْصُوبُ، والنَّصْبُ: عَلاَمَةٌ تُنْصَبُ عِنْدَ الحَدِّ، أو الغَايَةِ، والنَّصَبُ: مَا كَانَ يُنْصَبُ ليُعْبَدَ مِنْ دُونِ اللهِ، وَالجَمْعُ أَنْصَابٌ، وَالنُّصْبُ: المَنْصُوبُ، وَالنُّصُبُ: مَا يُقَامَ مِنْ بِنَاء ذِكْرَى لِشَخْصٍ أو حَادِثَةٍ، وَالنُّصْبُ: مَا نُصِبَ وَعُبِدَ مِنْ دُونِ الله، وَالجَمْعُ أَنْصَاب**).

واتە: (**نَصَبْ**)، یان (**نَصْب**)، بریتیە لە نیشانەیەکی چەقێندراو، نیشانەیەك کە لە لای سنوورێك یاخود لە لای کۆتایی شتێك دادەنرێ، هەروەها (**نَصَبْ**)، بەوەش گوتراوە کە لە جیاتی خوا پەرستراوەو بە (**أنْصَاب**)، کۆ دەکرێتەوە، هەروەها وەك چۆن (**نُصب**)، ئاوایە (**نُصب**)یش {ئەوەی پێشێیان بە بۆر بوو، ئەمیان بە زەنە}، بە مانای (**مَنْصُوب**)، واتە: چەقێندراو، هەروەها بینایەك کە دروست دەکرێ بۆ یادەوەری کەسێك، یادەوەری ڕووداوێك، هەروەها (**نُصُب**)، دیسان بەوە دەگوترێ کە دادەنرێ و دەپەرسترێ لە جیاتی خوا، کە ئەویش بە (**أَنْصَاب**)، کۆدەکرێتەوە.

---

(١) ص٩٢٥.

ئەمە ئەو سێ وشەیە کە خوا لە قورئاندا بەکاری هێناون، بۆ هەموو ئەو شتانەی لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، کە ئێمە لە زمانی کوردییدا وشەی: بت و پەیکەرو، جاری واشە هەر وشەی صەنەم بەکاردێنین بۆ هەموو ئەوانە، کە وا پێدەچێ وشەی صەنەم تێیدا بە مەرج نەگیرابێ لەسەر وێنەی شتێك بێ و، هەر شتێك دابنرێ صەنەمی پێ دەگوترێ، بەڵام (**وثن**) وا پێدەچێ تێیدا بە مەرج بگیرێ کە لەسەر شێوەیەك بێ و پەیکەرێك بێ، (**نُصب**)یش، دیسان مەرج نیە وێنەداربێ و لەوانەیە بەردێك بێ شوێنێك بێ پێی دەگوترێ: (**نُصُب**)، جیاوازییەکەیان ئەوەیە، بەڵام وەك گوتم: لە زمانی کوردیغدا بە هەموویان دەگوترێ: بت، صەنەم، پەیکەر.

## بڕگەی دووەم: هۆکارو هاندەرەکانی بتپەرستیی:

ئەم بڕگەی دووەمە یەکسەر لە تەفسیرەکەی (**فخر الدين الرازي**): (**التفسير الكبير أو مفاتيح الغيب**)[1]، دەگوازینەوە، ئەویش لە کتێبی (**الرُّد على عبدة الأصنام**)ی (**أبو زيد البلخي**)یەوە، هێناوە.

(**أبو زيد البَلْخي**)، لە سەرەتاوە قسەیەکی جوان دەکات و دەڵێ: ئەوە کە مرۆڤ زانیاریی هەبێ بەوەی ئەو دارو تەختەیە، یان ئەو بەردە داتاشراوە، لەو کاتەدا، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی نیەو، بەدیهێنەری ڕووەك و ژیاندار نیە، شتێکی زانراوو ڕوون و بەڵگە نەویستەو، زانراوە بەڵگە نەویستەکانیش نابێ ڕاجیاییان لە نێوان عاقڵاندا لەسەر هەبێ ئەوە لەلایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە: بتپەرستیی ئایینێك بووە پێش نووحیش ﵇ هەر هەبووە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتە موبارەکە، کە گەلەکەی نووح لە نێو خۆیاندا دەڵێن: ﴿وَلَا نَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾﴾، کەواتە: لەسەردەمی نووحەوەو لە پێش نووحیشەوە، ئەو بت و صەنەمانە هەر بوون، چونکە نووح هاتووە

---

(١) بەرگی (٣٠)، جوزئی (٢٩)، لاپەڕە (١٣١ - ١٣٢).

بڵێ: دەست هەڵبگرن لەوان، کەواتە: پێش هاتنی نووحیش ﷺ دیاردەی بتپەرستیی هەر بووە، هەروەها ئەو دیاردەی بتپەرستییە بەردەوام بووە تاکو ئەم ڕۆژگارەش، (ئەو لە کاتی خۆیدا گوتوویەتی، بەڵام تاکو ڕۆژگاری ئێستای ئێمەش هەر بەردەوامە)، دەڵێ: زۆربەی دانیشتووان و خەڵکی زەوی ئێستاش هەر لەسەر بتپەرستیین، ئنجا دەبێ ئەو ئایینی بتپەرستییە بەشێوەیەك پاساو بدرێتەوە، کە عەقڵ بە ئاسانیی لە خراپەکەی و هەڵەکەی تێنەگات، ئەگەرنا ئەو هەموو ماوە درێژە نەدەمایەوە، (وەك ئەو دەڵێ) لە لایەن زۆربەی خەڵکی دنیاوە.

ئنجا (**أبو زيد البلخي**) دێتە سەر پاساوەکانی و حەوت پاساو و بیانووان دێنێ، یاخود حەوت هاندەران دێنێ بۆ ئەوانەی بت و پەیکەرو صەنەمیان پەرستوون، بە یەکێك لەو حەوت هاندەرو پاڵنەرانە، یاخود: بە یەکێك لەو حەوت پاساوو بیانووە، بت و صەنەمیان پەرستوون، منیش یەکسەر وەری دەگێڕمە سەر کوردیی:

١- بیانووی یەکەم: (**أبو معشر جعفر محمد المنجِّم**)، گوتوویەتی: ئەو بیرۆکەیەی بتپەرستیی لەوانە داکەوتوە، کە پێیان وابووە خوا ﷻ جەستەیەو لە شوێنێکی دیارییکراوە، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە گوتوویانە: خوا ڕووناکییە وەك ئەو ڕووناکییەی ئێمە دەیبینین! بەڵام بێگومان کە خوا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴿٣٥﴾﴾النور، مەبەست پێی ڕووناکییەکی دیکەیە، بەڵام گوتوویانە: خوا ڕووناکییە وەك ئەو ڕووناکییەی ئێمە دەیبینین و، گەورەترین ڕووناکییەو، فریشتەکانیش کە بە دەوری عەرشەوەن، کە شوێنی خوایە، ئەوانیش هەر ڕووناکیین، بەڵام ئەوان ڕووناکیی بچووکن، ئنجا ئەوانەی پێیان وابووە خوا شوێنی دیارییکراوی هەیەو جەستەیەو بریتیە لە ڕووناکیی، بتێکی گەورەو مەزنیان دروستکردوە لەسەر شێوەی ئەو خەیاڵەی خۆیان، کە پێیان وابووە وێنەی خوای پەروەردگارە، هەروەها هی بچووکیشیان دروستکردوون، وەك پەیکەر بۆ فریشتەکان، ئیدی هەم بتە گەورەکەیان پەرستوە، کە بە حیساب وێنەی خوای پەروەردگارەو، هەم

وردە بتەکانیشیان پەرستوون، کە بە حیساب ئەوانیش وێنەی ئەو فریشتانەن کە بە دەوری خوای پەروەردگارەوەن.

**٢-** بیانووی دووەم: کۆمەڵێك لە صابیئە پێیان وابووە خوا ﷻ ئەستێرەو خڕۆکەکانی دروستکردوون، چ گەڕۆکەکان و چ چەسپاوەکان، (کاتی خۆی پێیان وابووە چەسپاون و ئێستا دەرکەوتوە، نەخێر ﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ٣٣﴾ **الأنبياء**)، ئنجا صابیئەکان یان کۆمەڵێکیان پێیان وابووە خوا سەرپەرشتییکردنی کاروباری خوارەوەی دنیا، زەوی، عایدی ئەو خڕۆکەو ئەستێرانەی کردوەو، ئەستێرەو خڕۆکەکانیش بەندەی خوان و خوا دەپەرستن، بۆیە پێویستە مرۆڤەکان ئەو خڕۆکەو ئەستێرانە بپەرستن، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو خڕۆکەو ئەستێرانە جارێك هەڵهاتوون و جارێك ئاوا بوون، هەندێك پەیکەریان لەسەر شێوەی ئەو خڕۆکەو ئەستێرانە، وەك نوێنەری ئەوان لەسەر زەوی داناون و، پەرستوویانن، کە لە ڕاستییدا مەبەستیان پێ پەرستنی خڕۆکەو ئەستێرەکان بووە، گوایە خوا کاروباری سەر زەوی عایدی ئەوان کردوە و بە ئەوانی سپاردوە.

**٣-** بیانووی سێیەم: ئەوەیە کە ئەو بتپەرستانە لە ڕۆژگاری زووەوە، لە ئەستێرە پەرستان بوون، لەوانە بوون کە پێیان وابووە بەختەوەریی و، بێخێریی و نەگبەتیی ئەم ژیانە دنیاییە پەیوەندیی هەیە بە ئەستێرەکانەوە، ئنجا پێیان وابووە ئەگەر بێت و شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دروست بکرێ بۆ ئەو ئەستێرانە، بە شێوەی طِلّسْم.

(طِلّسم)یش وەك (**المعجم الوسيط**)[1]، مانای دەکات دەڵێ: {(**طِلّسْم) في علم السِّحر خُطُوطٌ وأعدادٌ يَزْعُمُ كاتبُها أَنَّهُ يُرْبَطُ بِهَا رُوحانيَّات الكَواكِب العُلْويَّة بالطَّبائِع السّفليّة، لجَلْبِ مَحْبُوبٍ أَو دَفْعِ أَذًى، وهو لفظٌ يُونَانِيٌّ لكلِّ مَا هُوَ غامِضٌ مُبْهَمٌ كالأَلغاز والأَحاجِي**)، واتە: طیللەسم لە زانیاریی جادوودا بریتیە لە هەندێك هێڵ و ژمارە کە نووسەرەکەیان پێی وایە بەهۆی ئەو هێڵ و ژمارانەوە ڕووحانییەتی ئەستێرە بەرزەکان پەیوەست دەکاتەوە بە سرووشتی دروستکراوە نزمەکانەوە {لە خوارێ لەسەر زەوی}، بۆ هێنانی

---

(١) ص٥٦٣.

شتێکی خۆشەویست یاخود دوور خستنەوەی ئازارێك و، وشەکەش یۆنانییەو بۆ هەر شتێك کە نامۆو نەزانراو بێ بەکاردێ وەك مەتەڵەکان.

کەواتە: هەندێکیان لەو ڕووەوە بتەکانیان پەرستوون، کە ئەگەر ئەو بتانە بە شێوەی **طیللەسم** بانگ بکرێن، مایەی ئەوە دەبن پێیان لە خوا نیزیك ببنەوە، بۆیەش گوتراوە: وەدد کە یەکێك بووە لە صەنەمەکانی گەلی نووح، لەسەر شێوەی پیاوێك بووەو، سواع لەسەر شێوەی ئافرەتێك بووەو، یەغووث لەسەر شێوەی شێرێك بووەو، یەعووق لەسەر شێوەی ئەسپێك بووەو، نەسرِیش لەسەر شێوەی داڵ بووە.

٤- بیانووی چوارەمی بتپەرستەکان بۆ بتپەرستیی:

ئەوەیە کاتێك کەسانێکی چاکەکاریان لێ مردوون، وێنەی ئەو چاکەکارانەیان کێشاوەو پەیکەریان بۆ دروستکردوون و، مەبەستیان ئەوە بووە ئەو چاکەکارانە ئەگەر پیاون، ئەگەر ئافرەتن، بە مەزن بگرن و، خۆیانیان لێ نیزیك بخەنەوە، تاکو تکایان بۆ لەلای خوای پەروەردگار بکەن، وەك لە قورئاندا خوا فەرموویەتی: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ ٣﴾الزمر، (بتپەرستەکان دەیانگوت:) ئێمە تەنیا بۆ ئەوە دەیانپەرستین تاکو لە خوامان نزیك بخەنەوە.

٥- بیانوو و پاساوی پێنجەم:

ئەوەیە کە جاری وا هەبووە حوکمڕانێکی مەزن، یان کەسێکی مەزن مردوە، ئەوانیش پەیکەرێکیان لەسەر شێوەی وی دروستکردوەو تەماشایان کردوە، سەرەتا تەنیا وەك یادکردن و وەفایەك، بەڵام کە ئەوانەی دوایی هاتوون، پێیان وابووە باب و باپیرانیان ئەو پەیکەرەیان پەرستوە! ئەوانیش وەك لاساییکردنەوەی باب و باپیرانیان بە هەڵە ئەو پەیکەرەیان پەرستوەو، واش پێدەچێ ئەو پێنج ناوە: وەددو سواع و یەغووث و یەعووق و نەسرِ، ناوی پێنج لە کوڕەکانی ئادەم بن، کاتێك کە مردوون، ئیبلیس بە پاشینەکانیانی گوتوە: ئەگەر بێت و وێنەی ئەو

پێنج کـوڕەی ئـادەم بکێشـن لـە پەرسـتگاکانتانداو، هەمـوو ڕۆژێـك تەماشـایان بکـەن بـۆ ئـەوەی بەهـۆی سـەرنجدانتانەوە لێیـان، خـوا پەرسـتیی و بەندایەتیـی ئەوانتـان بۆ خـوا، بکەوێتـەوە یـاد، ئەوانیـش وایانکـردوە، ئنجـا کاتێـك ئەوانـە مـردوون، ئەوانـەی دوایـی گوتوویانـە: بـاب و باپیرانمـان ئەوانەیـان پەرسـتوون، هەڵبەتـە ئەمـە وەك دوایـی باسـی دەکەیـن، عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـیش وەك لـە صەحیحـی بوخاریـی دا هاتـوە، لێـی گێڕدراوەتـەوە کـە هەمـان شـتی گوتـوە، هـەر بۆیـەش پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لـە سـەرەتادا ڕێگریـی و، قەدەغـەی کـرد سـەردانی گۆڕسـتان بکـرێ، بـەڵام دوایـی ڕێـگای پێـدان، دوای ئـەوەی دڵنیـا بـوو تـازە ئـەو خەڵکـە لـە مـردووەکان ناپارێنـەوەو، تەنهـا خواپەرسـتی (**توحیـد اللـه**) لـە دڵیانـدا چەسـپاوە، وەك لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە: {**كُنْـتُ نَهَيْتُكُـمْ عَـنْ زِيَـارَةِ الْقُبُـورِ، أَلاَ فَزُورُوهَـا فَـإِنَّ فِي زِيَارَتِهَـا تَذْكِـرَةً**}، (**أخرجـه مسـلم: ١٩٧٧، ٩٧٧**).

واتـە: لێـم قەدەغـە کردبـوون سـەردانی گۆڕسـتان بکـەن، بـەڵام ئێسـتا سـەردان بکـەن، چونکـە لـە سـەردانتاندا بیرخسـتنەوەو پەنـد وەرگرتـن هەیـە.

٦- بیانووی شەشەم: ئەوەیە کە بەشێك لە بتپەرستەکان پێیان وابووە: خوا ﷻ جەستەو ماددەیەو بەرهەستە، دەشتوانێ بگوازێتەوەو بێت و بچێ و بێتە نێو جەستەی کەسێکەوە، بۆیە بەدووریان نەزانیوە خوای بەرز بێتە نێو جەستەی مرۆڤێکەوە، یان بێتە نێو پەیکەرێکەوە، ئنجا ئەوەیان بەدڵدا هاتوە کە لەوانەیە خوا ﷻ لە نێو ئەو پەیکەرە دابێ، یان لە جەستەی فڵانکەسەدا بێ، هەر بۆیەش هەندێك لە شیعەکان لە تێپەڕێنەرەکان (**غُلاة**) کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ) - گوایە - دەرگای قەڵای خەیبەری هەڵقەڵاندوە گوتوویانە: خوا ﷻ چۆتە نێو جەستەیەوە، هەندێك لە شیعەکان کە تێپەڕێنەر(**غُلاة**)ن، جۆرێك لە ئیعتیقادی وایان هەیە بە عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، هەروەها گوتوویانە: هەورە تریشقە دەنگەکەیەتی و، بروسکەکەش بریتیە لە زەردەخەنەکەی! بەڵام بەندە ڕووداوی هەڵقەندنی دەرگای خەیبەریش کە گوایە دوایی بە دە کەسان بۆیان نەجووڵاوە، ئەوەش بە ڕاست نازانم و سەنەدێکی ڕاستی نیە، هەرچەندە ئاسانە خوای بەرزو مەزن وەك

کەڕامەتێك بۆ عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) یان بۆ هەر کام لە بڕوادارانێك کە دۆستی خوابن، شتی لەو جۆرە بڕەخسێنێ، بەڵام ئەو ڕووداوە لە ڕووی مێژووییەوە سەنەدێکی ڕاستی نیەو زیاتر هەڵبەستراوی شیعانە.

٧- پاساوو بیانووی حەوتەم و کۆتایی بۆ بتپەرستیی:

وەك ئەبوو زەیدی بەڵخیی لە کتێبی (**الردُّ على عبدة الأصنام**)دا، هێناویەتی ئەوەیە، کە ڕەنگە ئەو بتانەیان وەك میحرابێك و پەرستگایەك سەرنجدابێ و، مەبەستیشیان پەرستنی خوا بووبێ، واتە: پەیکەرەکانی ئەو بتانەیان داناون، یان نەخش و نیگارو وێنەیان بۆ کێشاون و لە ئەصڵدا مەبەستیان خواپەرستیی بووە، بەڵام ئەوانیان وەك پەرستگایەك و میحرابێك و وەك نیشانەیەك داناون، بەڵام ئەوانی دوایی هەڵساون پەرستوویانن.

## بڕگەی سێیەم: چۆنیەتیی و مێژووی سەرهەڵدانی بتپەرستیی:

ئایا بتپەرستیی چۆن سەری هەڵداوەو مێژووەکەی چۆنە؟ هەڵبەتە ئەوەی لە بڕگەی دووەمیشدا: (هۆکارو هاندەرەکانی بتپەرستیی) هێنامان لە ئەبوو زەیدی بەڵخییەوە لە کتێبەکەی: (**الرد على عبدة الأصنام**)دا، کە (**فخرالدين الرازي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا لێی خواستبۆوە، ئەویش تیشکی باشی بۆ خستینە سەر مێژوو و سەرهەڵدانی بتپەرستیی و هۆکارەکانی، بەڵام لەو بارەوە ئەم دوو دەقەش دێنین:

**١- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: صَارَتِ الْأَوْثَانُ الَّتِي كَانَتْ فِي قَوْمِ نُوحٍ فِي العَرَبِ بَعْدُ: أَمَّا وَدٌّ، فَكَانَتْ لِكَلْبٍ بِدَوْمَةِ الجَنْدَلِ، وَأَمَّا سُوَاعٌ، فَكَانَتْ لِهُذَيْلٍ، وَأَمَّا يَغُوثُ، فَكَانَتْ لِمُرَادَ ثُمَّ لِبَنِي غُطَيْفٍ بِالْجُرُفِ عِنْدَ سَبَأ، وَأَمَّا يَعُوقُ، فَكَانَتْ لِهَمْدَانَ، وَأَمَّا نَسْرٌ، فَكَانَتْ لِحِمْيَرَ لِآلِ ذِي كَلَاعٍ، وَهِيَ أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ أَنِ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمُ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ فِيهَا أَنْصَابًا، وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ، فَفَعَلُوا فَلَمْ تُعْبَدْ حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ وَتَنَسَّخَ الْعِلْمُ، عُبِدَتْ} (أخرجه البخاري: ٤٦٣٦).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ دەڵێ: ئەو بت و پەیکەرانەی لە نێو گەلی نووح دا هەبوون، دوایی پەڕینەوە بۆ نێو گەلی عەرەب، (لەو بارەشەوە هەندێك دەق هەن، کە ئەو بتانە چۆن پەڕیونەوە بۆ نێو گەلی عەرەب) دەڵێ: وەدد لە نێو هۆزی (**كَلْب**) دابوو لە (**دَوْمَةِ الْجَنْدَلِ**)و، سواع لە نێو هۆزی (**هُذَيْل**)دا، بوو، یەغووث لە نێو هۆزی (**مُرَادَ**)، دوایی لەنێو (**بَنِي غُطَيْفٍ**)، لە (**سبأ**)دا بوو، یەعووق لە نێو هۆزی (**هَمْدَانَ**)دا، بوو، نەسر لە نێو هۆزی (**حِمَير لِآلِ ذِي كَلَاع**)دا، بوو، ئەو ناوانەش ناوی پیاوانێکی چاك بوون لە گەلی نووح، {ڕایەکیش هەیە کە ناوی پێنج لە کوڕەکانی ئادەم بوو بن}، ئنجا کاتێك ئەو پیاوە چاکانە مردوون، شەیتان وەسوەسەی بۆ خەڵکەکە کرد، کە لەو کۆڕو مەجلیسانەی ئەو پیاوە چاکانە تێیان دا دانیشتوون، ئێوە پەیکەریان بۆ دابنێن، یان وێنەیانیان بکێشن و، بە ناوی ئەوانەوە ناویان بنێن، {بە پاساوی ئەوەی خواپەرستیی ئەوانیان بکەوێتەوە یاد}، ئەوانیش وایان کردووەو پێشێ نەپەرستراون، بەڵام دوایی کە ئەوانەی کارەکەیان داهێناوە، مردوون و زانیاریی نەماوە، ئەوانی دیکە کە دوایی هاتوون، دەستیان کردوە بە پەرستنیان و ئەو شتانە پەرستراون.

**٢- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالْحَبَشَةِ، فِيهَا تَصَاوِيرُ، لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أُولَئِكَ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} (أخرجه البخاري: ١٣٩٠، ومسلم: ٥٢٨٠، وابن حبان: ٣١٨١، وابن خزيمة: ٧٩٠).**

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گێڕاویەتەوە لە ئوممو حەبیبەو ئوممو سەلەمەوە (کە وەك چۆن عائیشە هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ بووەو دایکی ئیمانداران، ئەوانیش هەردووکیان هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ بوون و، ئوممو حەبیبە کچی ئەبوو سوفیانەو لەگەڵ ئەوانەی کۆچیان کردوە بۆ حەبەشە،

ئەویش چووە، هەروەها ئوممو سەلەمەش کاتی خۆی لەگەڵ کۆچکەرەکاندا بووە لە حەبەشە)، کە باسی کڵێسایەکیان کردوە لە حەبەشە بینیویانە پێی گوتراوە: (**مارية**)، وێنەکان یان پەیکەرەکانی تێدا بوون، بۆ پێغەمبەری خوایان باسکردوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوانە ئەگەر پیاوێکی چاکیان تێدا ببووایەو مردبایە، مزگەوتێك، (پەرستگایەك)یان لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکردو، ئەو وێنانەیان تێدا دەکێشان، (واتە: وێنەیان لە دەرو دیوارەکاندا دەکێشا، یاخود پەیکەریان تێدا دادەنان)، ئەوانە خراپترین دروستکراوانی خوان لە ڕۆژی قیامەتدا، (کە بە بیانووی ڕێزگرتن لە پیاو چاکان، پیاو چاکەکانیان پەرستوون و، وەك بت و صەنەم مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون).

کەواتە: ئەمە ڕیشەی بتپەرستییە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی و، دیارە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) هەر لە پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ فێربووەو، ئەویش هەر وای گوتوە.

## بڕگەی چوارەم: شیرك و بتپەرستیی دوو ڕووی دراوێکن:

برایان و خوشکانی بەڕێز! وەك ئەبوو زەیدی بەڵخیی گوتوویەتی کە بێگومان بۆ ڕۆژگاری خۆی گوتوویەتی (زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی دنیا ئێستا بتپەرستن)، دەڵێم: ئێستاش ئەگەر زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی دنیاش بتپەرست نەبن، بەڵام بەشێکی زۆری خەڵکی دنیا، زیاتر لە یەك لەسەر چوار (٤/١)یان بتپەرستن، ئنجا ئایا بتپەرستیی و شیرك هاوبەش بۆ خوا دانان، چ پەیوەندییەکیان پێکەوە هەیە؟ پێم وایە هاوبەش بۆ خوا دانان و بتپەرستیی، دوو ڕووی دراوێکن و دوو شتی پێکەوە تێکهەڵکێش و پێکەوە پەیوەستن، بەڵگەمان چییە؟ با تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (**الزمر**) بکەین، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ۚ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ

كَفَّارٌ ﴿٣﴾، واتـه: ئاگاداربـن! ملكەچیـی سـاغ و بـێ خڵتـه تەنیـا شایسـتەی خوایـه، ئەوانـەش كـه لـه جیاتـی خـوا سەرپەرشـتیارانێك دەگـرن، (پەرسـتراوانێك دەگـرن)، دەڵێـن: نایانپەرسـتین، مەگـەر بـۆ ئـەوەی لـه خوامـان نزیـك بخەنـەوە... كەواتـه: پەرسـتنی جگـه لـه خـوا لەگـەڵ خـوادا، بـۆ لـه خـوا نیزیـك بوونـەوە بـووەو بتپەرسـتییش هـەر بەهەمـان شـێوە، كەواتـه: شـیرك و بتپەرسـتیی دوو شـتی تێكهەڵكێشـن، یـان دوو وشـەن تەعبیـر لـه یـەك حەقیقـەت دەكـەن.

ئنجـا بـا لـه سـوورەتی (**الشعراء**)ش دا، تەماشـای ئـەو دوازده ئایەتـەی خـوای پـەروەردگار بكەیـن، كـه دەفەرمـوێ: ﴿ وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ اللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَا أَضَلَّنَا إِلَّا الْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَافِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾، واتـه: دۆزەخ بـۆ بێمـرادان و بـۆ سـەرگەردانان هێندرایـه گـۆڕێ و، پێیـان گوتـرا: كـوان ئەوانـەی دەتانپەرسـتن (لـه جیاتـی خـوا)؟ ئایـا سـەرتان دەخـەن، یـان خۆیـان دەتوانـن (بەرگریـی لـه خۆیـان بكـەن و) خۆیـان سـەربخەن؟ ئنجـا هـەم ئـەوان (پەرسـتراوەكان و صەنەمـەكان) و، هـەم سـەرگەردان و بێمرادەكانیـش هەموویـان لەپـەو ڕووو خرانـه نێـو دۆزەخـەوە، هەروەهـا سـەربازەكانی ئیبلیسـیش تێكـرا (ئەوانیـش هەمـووی خرانـه دۆزەخـەوە)، ئنجا لـه حاڵێكـدا كـه لـه دۆزەخـدا پێكـەوە دەمەقاڵەیـان بـوو (مشـت و مڕیـان بـوو) گوتیـان: سـوێند بـه خـوا ئێمـه لـه گومڕاییـەكی ئاشـكرا دابوویـن، كاتێـك ئێوەمـان یەكسـان دەكـرد لەگـەڵ پـەروەردگاری جیهانییـان دا[1]. تەنیـا تاوانبارانیـش ئێمەیـان گومڕاكـرد، ئێسـتاش هیـچ تكاكارانێكـمان نیـن، هەروەهـا هیـچ دۆسـتێك و برادەرێكی

---

(١) بتپەرستەكان و هاوبەش بـۆ خـوا دانـەرەكان، بـه پەرسـتراوەكانیان بـه بـت و صەنەمـەكان دەڵێـن: سـوێند بـه خـوا ئێمـه لـه گومڕاییـەكی ئاشـكرادا بوویـن كـه ئێوەمـان یەكسـان دەكـرد لەگـەڵ پـەروەردگاری جیهانییانـدا.

نیزیك و دڵسۆزیشمان نیه (بەرگرییمان لێ بكات)، ئنجا خۆزگە (دەرفەتێكمان بووبایە) جارێك گەڕانەوەمان ببووایە، تاكو لە بڕواداران بین.

كەواتە: پوختەی قسان ئەوەیە: بتپەرستیی و هاوبەش بۆ خوا دانان، دوو وشەن، دوو تەعبیرن بۆ یەك حەقیقەت، كە بریتیە لە بەندایەتیی بۆ كردن و پەرستنی جگە لە خوا، بە مەبەستی نیزیك كەوتنەوە لە خوا، چونكە هەموو ئەوانەی بتپەرستن بە مسۆگەریی هاوبەش بۆ خوا دانەرن، بۆیەش بیرۆكەی ئیلحاد واتە: دان بە بوونی خوا دانەهێنان، بیرۆكەیەكی ڕیز پەڕەو كەمترین شوێنكەوتووانی هەن، ئێستاش لەگەڵدابێ، كە ئەم سەردەمە سەردەمی زاڵبوونی ماددەیە بەسەر ڕووح داو، زاڵبوونی دنیا پەرستییە بەسەر خوا پەرستییداو، زاڵبوونی لە باوەش گرتنی دنیاو حیساب نەكردن بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵام ئێستاشی لەگەڵدابێ، زۆربەی هەرە زۆری خەڵكی سەر زەوی خواناسن، چونكە:

١- یەك لەسەر چوار (٤/١)یان، یان زیاتر مسوڵمانن.

٢- یەك لەسەر چوار (٤/١)یان، یان زیاتر نەصڕانیین و جوولەكەن و ئەوانی دیكەن مەجووسیین و، سابیئەن و یەزیدیین، ئەوانەش هەموویان خواناسن، بەڵام بە هەڵە خوا دەپەرستن و هاوبەشی بۆ دادەنێن.

٣- ئنجا هەموو بتپەرستەكان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانیش بە هەموو شێوەكانیانەوە، چ ئەوانەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا كە بووزایین و پەیكەرەكانی بووزا دەپەرستن و، هیندۆسییەكان كە مانگاو مشك و مارو جڕو جانەوەری دیكە دەپەرستن، یان دارو درەخت دەپەرستن لە ئەفریقیا، لە كوێ و لە كوێ كە بەلای كەمەوە سێیەك (٣/١)ی خەڵكی دنیا دەبن، هەموو ئەوانەش خواناسن و، ئەو شتانەش بۆیە دەپەرستن كە لە خوایان نزیك بخەنەوە، كەواتە: كەمینەیەك دەمێننەوە كە پێیان بگوترێ: مولحید، ئەویش جاری وایە ئەو ئیلحادە بە زەبری ئاگرو ئاسن فەرز كراوە، وەك كاتی خۆی ماوتسی تۆنگ لە وڵاتی

چین دا فەڕزی کردبوو، هەروەها یەکێتی سۆڤیەتی پێشووی لێکهەڵوەشاویش فەڕزی کرد بوو، کە ئێستا بە گوێرەی زانیاریی من جگە لە کۆریای باکوور، هیچ وڵاتێك نیە بە فەرمیی ئیلحادی تەبەننیی کردبێ، کاتی خۆشی بە زەبری ئاگرو ئاسن ئیلحادیان فەڕز کردبوو لەسەر خەڵك، بە ناوی مارکسیزم و لینینزم وماویزمەوە، بەڵام سەرئەنجام زگماکی بەشەرو عەقڵی سەلیمی بەشەر زاڵبوو بەسەر ئیلحاد دا، هەرچەندە تەواو ڕێی ڕاستیشی نەدۆزیبێتەوە، کە ڕووکردنە ئیسلامە، لەبەر ئەوەی بە ئیسلام ئاشنانین، یان لەبەر ئەوەی دۆخی مسوڵمانان بەو شێوەیەیە کە هاندەری خەڵك نیە بەگشتیی، بەرەو ئیسلام بێ، چونکە کە تەماشای واقیعی مسوڵمانان دەکەن، وادەزانن واقیعەکەیان بەرهەم و زادەی دینەکەیانە، بۆیە لە دینەکەیان دەسڵەمنەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی سەر زەوی، ئێستاشی لەگەڵدابێ، خواناسە، چونکە بتپەرست و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش بە خواناس لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام بێگومان لە ناسین و پەرستنی خوادا بەهەڵە داچوون، بۆیە ئەو شتانەی دیکە دەپەرستن، شیرکیش دیارە خوا لێی خۆشنابێ، بەڵام خوا لە شیرکی کەسانێك خۆشنابێ، کە بانگەوازی خوای بەرزو مەزنیان پێ گەیبێ و، دینی ڕاست و دروستی خوای میهرەبانیان لێ حاڵیی کرابێ و، ڕەفزیان کردبێ، ئەگەرنا کەسێك لە بنەڕەت دا پەیامی خوای پێ نەگەیبێ و لە دینی ڕاستی خوا تێنەگەیبێ، یاخود بەسەرەوبنیی و هەڵاوگێڕیی پێی گەیبێ و، بەهەڵەو بە شێوێنراویی پێی گەیبێ، ئەوە ئەگەر کەمتەرخەم نەبووبێ لە پەیداکردنی زانیاریی لە بارەی دینی ڕاستی خوای پەروەردگارەوە، بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵگەو پاساو بیانوویەکی هەیە، هەڵبەتە تەنیا خوای پەروەردگاریش لێپرسینەوە لە نێوان بەندەکانیدا دەکات، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾﴾الغاشية، بەڵام بە پێی ئەوەی دەردەکەوێ لە ڕواڵەتی ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەسانێك بە بێبڕوا (کافر) لە قەڵەم دەدرێن، کە ئایینی خوای پەروەردگاریان پێگەیبێ، بە ڕاست و دروستیی و، ڕەفزیان کردبێ، بەڵام کەسێك ئایینی خوای هەر

پێنەگەیبێ، یان پێی گەیبێ، بەڵام بەشێویێنراویی، ئەگەر بڕوای پێ نەهێنابێ، بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵگەو بیانووی بەدەستەوە هەیەو بواری بەرگریی لە خۆکردنی هەیە.

لێرەشـدا کۆتایـی بـەم کورتـە باسـەمان دێنیـن و، کۆتایـی بـە تەفسـیرکردنی کـۆی سـوورەتی نووحیـش دێنیـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کـە (١٤) شـەووالی سـاڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٦/٦) زایینیـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الْجِـنِّ**)و، وەك عـادەتی خۆمـان پێشـەکی پێناسـەو نێـوەڕۆکی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەخەینـە ڕوو لـە حـەوت بڕگـەدا:

## پێناسەی سوورەتی (الجن) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

نـاوی هـەرە بـاوی ئـەم سـوورەتە (**سُـورَةُ الْجِـنِّ**)ە، وەك (**الترمـذي**) لـە (**کتـاب التفسـير**)ی (**الجامـع الصحيح**)ەکەیـدا هێناویەتـی و، (**بخاري**)یـش لـە (**کتـاب التفسـير**) ی صەحیحەکـەی خۆیـدا بـە (**سُـورَةُ قُـلْ أُوحِـيَ إِلَيَّ**) هێناویەتـی، زۆرجاریـش بـە (**قُـلْ أُوحِـيَ**) ناوبـراوە.

کەواتـە: نـاوی هـەرە بـاوی ئـەم سـوورەتە (**سـورة الْجِـنّ**)ە، بـەڵام هەندێـك لـە زانایـان بـە (**سُـورَةُ قُـلْ أُوحِـيَ إِلَيَّ**) ناویـان هێنـاوە، وەك سـەرەتای سـوورەتەکە، هەندێکیشـیان بـە سـوورەتی (**قُـلْ أُوحِـيَ**) ناویـان نـاوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە بـە یەکدەنگیـی زانایـان سـوورەتێکی مەککەییـە، لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە هەیـە:

**{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ﷺ: قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ الْجِـنِّ بِمَكَّـة) (أخرجـه الـدر اًلمنثـور ج٨، ص٢٩٦، للسـيوطي، ونسـبه لابـن الضريـس والنحـاس وابـن مردويـه والبيهقـي، وقـال: أخـرج ابـن مردويـة عـن عبداللـة ابـن الزبـير مثلـه}.**

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس ﷺ گوتوویەتـی: سـووڕەتی (**الجِـنّ**) لـە مەککـە دابەزیـوە، هەروەهـا هەمـان شـت لـە عەبـدوڵای کـوڕی زوبەیریشـەوە (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) گێڕدراوەتـەوە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکان:

بـە یەکدەنگیـی ژمێرەرانـی ئایەتەکانـی قوڕئـان، ژمـارەی ئایەتەکانـی ئەم سـووڕەتە بیسـت و هەشـت (٢٨) ئایەتـە، لـەو بـارەوە ڕاجیاییـان نیە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

لـە موصحـەف دا ڕیزبەندیـی ئـەم سـووڕەتە حەفتـاو دوو (٧٢)یـە، واتـە: لـە سـووڕەتی (**الفاتحـة**)ەوە کـە دێین لە لای ڕاسـتەوە، حەفتـاو دوو (٧٢)ەمین سـووڕەتە، بـەڵام لـە دابەزیـن دا، ژمـارە چـل (٤٠)ی بـۆ دانـراوە، پێـش سـووڕەتی (**یـس**) و دوای سـووڕەتی (**الأعـراف**) دابەزیـوە، بـەڵام بەپێـی ئـەوەی کـە ئیبنـو ئیسـحاق لـە (**السـیرة النبویـة لابـن هشـام**) **ج٢، ص: ٢١٦و، ص: ٢١٧**)دا، هێناویەتـی، دوای سـەفەری پێغەمبـەر ﷺ بـۆ شـاری (**طائـف**) دابەزیـوە، کـە چـووە بـۆ لای هـۆزی (**ثقیـف**)، بـۆ داوای هاوکاریـی لێکردنیـان، ئەوانیـش ناجوامێـر بـوون و پێشـوازییان لـێ نەکـردوەو، دەریـان کـردوەو وەڵامیـان نەداوەتـەوە، کـە بێگومـان ئـەوەش لـە سـاڵی دەیەمـی پێغەمبەرایەتیـی دا بـووە، یانـی: سـێ سـاڵ پێـش کۆچکردنـی پێغەمبـەر ﷺ و هاوەڵانـی بـۆ (**یـثرب**)، کەواتـە: نابـێ ڕیزبەندییەکـەی ژمـارە چـل (٤٠) بـێ.

ئنجا جێی سەرسوڕمانە کە زانایان، بۆ وێنە: **(إبن عاشور)**، سووڕەتی **(الحاقة)** یان لە ڕیزبەندییدا، بە ژمارە حەفتاو حەوت (٧٧) داناوەو، گوتووشیانە لە ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتیی دا دابەزیوەو، ئەم سووڕەتەشیان بە ژمارە چل (٤٠) داناوەو، گوتووشیانە لە ساڵی دەیەمدا دابەزیوە، **(إبن عاشور)** کە زانایەکی موعتەبەرەو تەفسیرەکانی دیکەش هەر وایان گوتوە!

بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیە، وەك پێشتریش لە بارەی سووڕەتی **(الحاقة)** ەوە قسەمان کرد، چونکە ئەگەر سووڕەتی **(الحاقة)**، ڕیزبەندیی لە دابەزینـدا ژمارە حەفتاو حەوت (٧٧) بێ، ئنجا بشگوترێ لە ساڵی پێنجەمدا دابەزیوە، ئەم سووڕەتەش بگوترێ: لە ڕیزبەندیی دابەزیندا ژمارە چل (٤٠)ە، کەچی لە ساڵی دەیەمدا دابەزیوە، ئەوە پێچەوانەی لۆژیك و مێژوویەو دەبێ پێچەوانە بکرێنەوەو بگوترێ: سووڕەتی **(الحاقة)** لە ساڵی پێنجەمدا دابەزیوەو، سووڕەتی **(الجنّ)** لە ساڵی دەیەمدا دابەزیوە، چونکە بێگومان هەتا ژمارەی سووڕەتە دابەزیوەکان زیاتر بێ، دەبێ ساڵەکان زیاتر هەڵکشێن، ئەگەرنا چۆن دەبێ بە پێنج (٥) ساڵان، حەفتاو حەوت (٧٧) سووڕەت دابەزین، بەڵام بە دە (١٠) ساڵان چل (٤٠) سووڕەت دابەزین؟!.

بۆیەش من لێرەوە ئامۆژگاریی خۆم و هەر براو خوشکێکی مسوڵمانیش دەکەم، کە هەرچی لە کتێباندا هاتوەو نووسراوە، نووسەرو دانەر هەر کەسێك بێ، با یەکسەر ڕادەستی نەبین، ئەوەتا یەکێك لەو زانا موعتەبەرانە کە **(محمد الطاهر بن عاشور)**ە، لە تەفسیرەکەی خۆیدا بەو شێوەیەی نووسیوە، کە بێگومان ئەوە پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقە، مادام سووڕەتی **(الجنّ)** لە ساڵی دەیەمدا دابەزیبێ، وەك **(إبن إسحاق وإبن هشام)** لە سیرەکەیاندا هێناویانە، نابێ ڕیزبەندییەکەی ژمارە چل (٤٠) بێ، هەروەها سووڕەتی **(الحاقة)**ش مادام لە ساڵی پێنجەمدا دابەزیبێ، ڕێی تێناچێ بە پێنج (٥) ساڵان حەفتاو حەوت (٧٧) سووڕەت دابەزین!.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە بـە گشـتیی هەمـووی لـە بـارەی جندەوەیـە، پێشـتریش گوتوومـە، وشـەی (جِـنّ) بـە عەڕەبیـی دەگوتـرێ و، کوردەواریـی خۆمـان وشـەی (جینـن) و (جند)یـش دەڵێـن و، وشـەی (جنۆکـە)ش و، هەندێکیـان وشـەی (پەریـی) یـش بەکاردێنـن، منیـش جاری وایـە وشـەی (جینـن) بەکاردێنـم و، جاری واشـە هـەر وشـەی (جنـد) بەکاردێنـم.

ئنجـا لـە سـەرەتای ئـەم سـووڕەتەوە تاکـو ئایەتـی پـازدە (١٥) و دوایـی ئایەتـی نـۆزدە (١٩)ش، هەمـووی هـەر گێڕانـەوەی قسـەی جنـدە، کـە خـوای بـەرزو مـەزن بـۆ پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ سروش کـردوە، کەواتـە: ئـەم سـووڕەتە شـازدە (١٦) ئایـەتی باسـی جنـدەو، دوازدە (١٢) ئایەتەکـەی دیکـەش چـوار جاران (قُلْ)یـان تێـدا هاتـوە، هەمـووی ڕێنمایـی و ئامۆژگاریـی خوایـە بـۆ پێغەمبـەری خاتەم ﷺ و خسـتنە ڕووی چەنـد ڕاسـتییەکی مەزنـە، لـە بـواری خواناسـیی و تەنیـا خواپەرسـتیی دا، بـە تایبـەت کورتهەڵاتنـی زانینـی پەنهـان (الغیـب) لـە خـوای پەنهانـزان دا، چونکـە زۆر کـەس وایانزانیـوە جنـد پەنهـان و نادیـار دەزانـن، کـە وانیـە.

خـوا ﷻ لـە سـووڕەتی (سبأ)دا لـەو بـارەوە بـە ڕاشـکاویی خاڵـی خسـتۆتەر سـەر پیـت، کـە باسـی سـولەیمان دەکات و جنـدی بـۆ دەسـتەمۆو ملکەچ کـراون، سـۆغرەو بێـگاری پێکـردوون، دیـارە شـەیتانەکانی جنـد، ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾ ﴾، کاتێـك مردنمـان لەسـەر بڕیـاردا، هیـچ شـتێك ئـەوەی بـە جنـدەکان نەزانانـد، (کـە بزانـن سـولەیمان کۆچـی دوایـی کـردوە، بـۆ ئـەوەی چیدیکـە سـۆغرەو بێگار نەکـەن)، مەگـەر مۆرانـە، گۆچانەکـەی دەخـوارد، (گۆچانەکـەی لـە نێـوەوە خـوارد بـوو، بـۆش و پووچەڵـی کردبـوو، ئنجـا گۆچانەکـە کەلـە نێوێـڕا خـوراو قرپـۆك بـوو بـوو شـکا، گۆچانەکـە

سولەیمان خۆی دابۆوە سەرێ بە مردوویی بەڵام جند نەیانزانیبوو، ئنجا کاتێك سولەیمان گۆچانەکەی شکاو) کەوت بەسەر ڕوودا، جند بۆیان دەرکەوت ئەگەر پەنهانیان زانیبایە، لەو ئازارو ئەشکەنجە ڕیسواکەرەدا نەدەمانەوە (کە بریتی بوو لە سۆغرەو بێگار).

کە هەر خوا ﷻ دەزانێ چەند ماونەوە! هەندێك لە زانایان وەك لە تەفسیری سوورەتی (**السبأ**)دا باسمان کردوە، گوتوویانە: شەوو ڕۆژێك سولەیمان بە مردوویی ماوەتەوە لەسەر گۆچانەکەی، هەندێك گوتوویانە: هەفتەیەك، هەندێك گوتوویانە: مانگێك، هەندێك زیاتریشیان گوتوە، وەك لە شوێنی خۆیدا باسمان کردوە، بەڵام ڕێی تێناچێ زیاتر بووبێ، دەگونجێ گوتبێتی: تاکو مانگێك دەچم ئیعتیکاف دەکەم، با کەس بە لامدا نەیەت، بەڵام دەگونجێ هەر لە سەرەتای چوونە ئیعتیکاف و خەڵوەکەیەوە، خوای پەروەردگار گیانی کێشابێ، بەڵام بۆ ئەوەی خەڵك بزانن جند پەنهان نازانن، لە کاتێکدا کە سولەیمان وەفاتی کردوە، نەیانزانیوە تاکو مۆرانە لە گۆچانەکەی داوەو گۆچانەکەی ڕزیوەو شکاوەو سولەیمان کەوتوە، ئنجا جند پێیان زانیوەو وازیان لە سۆغرەو بێگار هێناوە، چونکە جند تەنیا بۆ سولەیمان دەستەمۆو ملکەچ کراون، کە کاری قورسی پێکردوون، جندی کافر کە بەشەیتانەکان (**شیاطین**) ناسراون.

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٦٥)ی (**النمل**)یشدا، دیسان خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە پەنهان تەنها خوا دەیزانێ: ﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾، واتە: پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی تەنیا خوا دەیزانێ و، ناشزانن کەی زیندوو دەکرێنەوە.

هەروەها لە ئایەتی (١٨٨)ی سوورەتی (**الأعراف**)یشدا هەمان ڕاستی دووبارە بۆتەوە، کە خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ

﴿ ٱلسُّوٓءُۚ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٨﴾ ﴾، واتە: بڵێ من سوودو زیانی خۆمم بەدەست نیە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، ئەگەر پەنهانم زانیبایە هەر چاکەم بۆ خۆم پەلکێش دەکردو، زیانم تووش نەدەبوو، من تەنیا ترسێنەرو موژدەدەرم بۆ کەسانێك بڕوا بێنن.

ئەمە نێوەڕۆك و هێڵە گشتییەکانی چەمك و واتای ئایەتە موبارەکەکانی ئەم سوورەتی (**الجن**)ە، کە وەك گوتمان لە بیست و هەشت (٢٨) ئایەت پێکهاتوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە چوار تایبەتمەندییمان لەم سوورەتە موبارەکەدا، کەوتوونە بەرچاو:

١- تایبەتمەندیی یەکەم و هەرە بەرچاوی ئەو سوورەتە ئەوەیە، کە تاکە سوورەتێکە ژمارەیەکی زۆر ڕاستیی لە بارەی جندەوەو، لەسەر زمانی خۆیان خستوونەڕوو، سەرجەم لەم سوورەتەدا دەوری بیست و پێنج (٢٥) زانراوە (**معلومة**) لەسەر زمانی جند لە بارەی خۆیانەوە خراونە ڕوو، کە تیشکی تەواو دەخەنە سەر ئەو دروستکراوە پەنهانە نا بەرهەستەی خوا ﷻ.

٢- ڕاست وەستاویی مرۆڤ و جند لەسەر ڕێبازی خوا، هۆکاری پێزو بەرەکەت بەسەردا ڕژێنرانیانە، لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، وەك لە ئایەتی (١٦)دا هاتوە: ﴿ وَأَلَّوِ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَـٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ ﴾.

٣- مزگەوتەکان تەنها هی خوان و نابێ تێیاندا پاڕانەوە لە جگە لە خوا بۆ هیچ کەسی دیکە بکرێ، ئەویش تەنیا لەم سوورەتەدا بەو شێوەیە هاتوە، لەگەڵ باسی مزگەوت دا، ئەگەرنا لە قورئاندا زۆر باسی ئەوە کراوە کە دەبێ تەنیا پاڕانەوە لە خوا بکرێ: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ ﴾.

٤- خوا جگە لە پێغەمبەران عليهم السلام هیچ كەس لە پەنهانی خۆی - پەنهانێك كە تایبەت بێ بە خۆی - ئاگادار ناكات، ئەویش بە دانانی فریشتەی پارێزەرو ئێشكچیی بەدەوروبەریانەوە، كە لە دوو ئایەتەكانی: ﴿ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ ﴾دا، هاتوە.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە كۆی (٢٨) ئایەتەكەی ئەم سوورەتەمان بۆ دوو دەرس دابەشكردوون:

دەرسی یەكەم: ئایەتەكانی: (١ - ١٩) كە باسی جندو سیفەتەكانیان لەسەر زمانی خۆیان دەكەن، دەوری (٢٥) سیفەت و تایبەتمەندیین.

دەرسی دووەم: ئایەتەكانی: (٢٠ - ٢٨)، چەند ڕێنماییەكی گرنگی خوای بەرزو مەزن بۆ پێغەمبەر ﷺ، وێڕای خستنەڕووی چەند ڕاستییەكی دیكە، كە سەرجەم چوار ڕێنمایین و ژمارەیەك ڕاستییان گرتوونە خۆیان.

# کورتە باسێک دەربارەی جند

مەبەستمان لەم کورتە باسە ئەوەیە کە بەرلەوەی بچینە سەر تەفسیرکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە، چەند زانیارییەکمان هەبن لە بارەی جندەوە، ئەو زانیارییانەش زۆربەیان هەر لەم سوورەتە موبارەکە وەردەگرین، هەندێکیشیان لە ئایەتەکانی سوورەتی (**الأحقاف**)و، هەندێکیشیان لە هەندێك ئایەتی دیکەی قورئان، یان لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

بۆیەش ئەم کورتە باسە دەکەینە پێشدەستیی تەفسیرکردنی سوورەتی (**الجن**)، تاکو دوایی تەفسیرکردن و لێتێگەیشتنی ئایەتەکانی ئەو سوورەتە موبارەکەمان زۆر بۆ ئاسان بێ، لەبەرئەوەی تەنیا ئەم سوورەتە بە ناوی جندەوەیە لە قورئان داو، جندیش لە قورئاندا زۆر باسکراون، بە تایبەتی لە سوورەتی (**الرحمن**)دا، خوا ﷻ سی و یەك (٣١) جاران جند لەگەڵ مرۆڤ دەدوێنێ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾، ئەی کۆمەڵی مرۆڤ و جند! بە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بێبڕوان، یان نکووڵیی لە کام چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الرحمن**)دا بە درێژیی باسمان کردوە، ئنجا لە هەر شوێنێکی دیکەی قورئاندا کە باسی جند کراوە، دەبێ خوێنەرانی بەڕێز بگەڕێنەوە بۆ ئەم کورتە باسەی لێرەدا دەیکەین، واش پێدەچێ هەندێك شت لەم کورتە باسەدا باس بکەین، لە کەم سەرچاوان دا لە بارەی جندەوە دەست بکەون.

ئەم کورتە باسەش کە نۆ (٩) بڕگەیە، پێنج بڕگەیان لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله، الكتاب الرابع: الإيمان بملائكة الله تعالى وبالجن**)، دەخوازینەوە، بە کورتیی و گوشراویی، چوار بڕگەکەی دیکەش لە هەندێك سەرچاوەی دیکەوە دێنین:

## بڕگەی یەکەم: ماناو حوکمی ئیمان بە جند:

**أ-** ئیمان بە جند: بریتیە لە بە ڕاستدانانی بوونیان، وەك جیهانێكی تایبەت كە كۆمەڵێك تایبەتمەندیی هەن و، تەماشاكردنیان و مامەڵە لەگەڵ كردنیان، لەسەر بناغەی وەحیی پارێزراوی خوا، كە لە قورئاندا هاتوە بە پلەی یەكەم، پاشان لە ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ تەنیا لەسەر ئەو بناغەیە لێیان بڕوانرێ و مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێ.

**ب-** حوكمی ئیمان هێنان بە جند: بریتیە لە پێویست بوون و فەڕزە ئیمان بە جند بهێنرێ، ئەوەش وەك حوكمی ئیمان بە هەر شتێكی دیكە، كە وەحیی خوا هەواڵی پێداوە، هەرچەندە پەنهان و شێردراوەش بێ، وەك: ڕووح، بەرزەخ، بەهەشت، دۆزەخ، درەختی كۆتایی (**سدرة المنتهى**)، عەرشی خوا.

لە ڕاستییدا ئیمان بە پەنهان (**الإيمان بالغيب**)، بریتیە لە بناغەی ئیمان و عەقیدە لە ئیسلامدا، وەك خوا ﷻ لە سەرەتای سوورەتی (**البقرة**)دا بەندە پارێزكارەكانی خۆی ئاوا پێناسە دەكات: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ الم ﴿١﴾ ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾﴾، واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە ئەلیف، لام، میم، ئەو كتێبە هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، ڕێنماییە بۆ پارێزكاران (یان بە ئامانج گەیەنەرە بۆ پارێزكاران)، ئەوانەی بڕوایان بە پەنهان، نادیار هەیەو، نوێژ بەرپا دەكەن، لەوەی پێمان داون دەبەخشن، ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەوەی بۆ لای تۆ دابەزێنراوەو بەوەی لە پێش تۆشدا دابەزێنراوە، دڵنیاشن لە مەنزڵگای كۆتایی ڕۆژی دوایی، ئەوانە لەسەر ڕێنماییەكن لە پەروەردگاریانەوەو، ئا ئەوانەن سەرفرازان.

(**غیب**)یش بریتیە لە هەر شتێك كە بەرهەست نەبێ بۆ مرۆڤ و، مرۆڤ بە پێنج هەستەكانی نەتوانێ دەركی بكات، واتە: نەبینراو بێ، نەبیستراو بێ، نەدەستلێدراو (**ملموس**) بێ، نەتامكراو بێ، نەبۆنكراو بێ.

بەڵام لێرەدا دەبێ ئەوە ڕوون بكەینەوە كە دەڵێین: حوكمی ئیمان بە جند بریتیە لە فەڕز بوون، مەبەستمان لە فەڕز بوون (**وجوب**)، ئەوە نیە كە لە بەرانبەر پەسند (**ندب**) دایە، بەڵكو مەبەستمان لە فەڕز بوون ئەوەیە كە لە بەرانبەر كوفر دایە، واتە: هەر كەس بڕوای بە (جن) نەبێ، بە بێبڕوا دادەنرێ، چونكە بێگومان ئیمان نەهێنان بە یەك ئایەتی خوای پەروەردگار، یان بە حوكمێكی بە ئاشكرا زانراوی شەریعەت، بە كوفر دادەنرێ، وەك زانایان گوتوویانە: (**إِنْكَارُ مَا عُلِمَ مِنَ الدِّيْنِ بِالضَّرُوْرَةِ كُفْرٌ**)، نكووڵییكردن لە هەر شتێك كە بە ئاشكرا زانرابێ، بەشێكە لە دین، كوفرە، چ لە قوڕئاندا هەبێ، چ لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ، مادام زۆر ئاشكراو ڕوون بێ و، بەڵگەی ڕوون و بێ چەندو چوونی لەسەر بێ، نكووڵییلێكردنی بە كوفر دادەنرێ، بابەتی جندیش لەو بابەتانەیە كە یەكجار ڕوون و ئاشكرایە، بۆیە كەسێ نكووڵیی لێ بكات، بە بێبڕوا دادەنرێ، چونكە خوا ﷻ نەك ئایەتێك، سوورەتێكی بیست و هەشت ئایەتیی بە تایبەت لە بارەی جندەوە ناردوە، جگە لە چوار ئایەتەكەی سوورەتی (**الأحقاف**) كە دوایی دەیانهێنین، هەروەها جگە لەوەی كە لە سوورەتی (**الرحمن**)دا، خوا ﷻ جندو مرۆڤ دەدوێنێ و، سی و یەك (٣١) جار بە هەردووكیان دەفەرموێ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾، ئەی جندو مرۆڤ! نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ جگە لەوەی لە سوورەتەكانی دیكەشدا، بۆ وێنە: (**الأعراف والأنعام**)، خوا ﷻ باسی جندی كردوەو باسی جند نە ئایەتێكەو نە دووانەو نە بیستەو نە سییە.

بۆیە دەبێ بزانرێ، بڕوا هێنان بە جند، فەڕزە، فەڕزێك، كە بەرانبەرەكەی بریتیە لە كوفرو، كەسێك بڵێ: بڕوام بە جند نیە، پێی كافر دەبێ، ئەوەش

بۆیە دەڵێم، چونکە هەندێك كەس وادەزانن، لەبەرئەوەی بڕوا هێنان بە جند یەكێك نیە لە پێنج پایەكانی ئیمان، كە لە قورئاندا باسكراون، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ١٧٧﴾، هەروەها یەكێك نیە لە شەش پایەكانی ئیمان كە لە سوننەتدا باسكراون و، وێڕای ئەو پێنجە، ئیمان بە قەدەریش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، كە بوخاریی و موسلیم هێناویانە، هەندێك كەس پێیان وایە مادام ئیمان بە جند، یەكێك نیە لە پێنج یان شەش پایەكانی ئیمان، كەواتە: ئەگەر بڕواشت بە بوونی جند نەبێ، پێی كافر نابی!! كە لە ڕاستییدا ئەمە ڕاست نیەو، زاراوەی پایەكانی بڕوا (**أركان الإيمان**) زاراوەیەكە زانایان لە نێو خۆیاندا دایانناوە، ئەگەرنا نە زاراوەیەكی قورئانییەو نە زاراوەیەكی ڕێبازی پێغەمبەریشە ﷺ، مەبەست لە پایەكانی ئیمان - كە تەنیا دەربڕین و زاراوەیەكی زانایانە - ئەو بنەماو بنەڕەتانەن كە كۆی ئیمانیان لەسەر دەوەستێ، نەك ئیمان بەس ئەوەندە بێ، ئەگەرنا لە پایەكانی ئیماندا باسی بەهەشتیش بە تایبەت نەكراوەو، باسی دۆزەخ نەكراوە، هەروەها باسی عەڕش و درەختی كۆتایی (**سدرة المنتهى**) و ئەوانەش نەكراوە، بەڵام بە دڵنیایی ئیمان هێنان بەوانە، فەڕزێكە بەرانبەرەكەی بریتیە لە كوفرو بێبڕوایی.

ئنجا ئیمان بە خواش ﷻ دیسان خوازیاری ئەوەیە كە هەرچییەك خوا هەواڵی پێداوە، ئیمانمان پێی هەبێ، دیسان ئیمان بە پێغەمبەری خواش ﷺ، خوازیارە هەر شتێك پێغەمبەری خوا هەواڵی پێ بدات، ئیمانمان پێی هەبێ، دواتر ئیمان بە كتێبی خواش، واتە: هەر شتێك لە كتێبی خوادا هاتبێ، دەبێ ئیمانمان پێی هەبێ، ئەم سێ پایەی بڕواش هەر سێكیان ئەوەش دەگرنە خۆیان كە دەبێ ئیمانمان بە جند هەبێ، چونكە هەم خوا هەواڵی داوە لە بارەی جندەوە، هەم پێغەمبەری خوا ﷺ و، هەم كتێبی خواش.

ئەمەشـم بۆیـە گـوت، چونکـە هەندێـك لـە زانایـان پێیـان وابـووە، کەسـێك ئیمانیـشی بـە جنـد نەبـێ، لەبـەر ئـەوەی یەکێـك نیـە لـە شـەش پایەکانـی ئیـمان، ئـەو کەسـە بـە بێبـڕوا ناژمێـررێ، بـۆ وێنـە:

(**محمـد الطاهـر ابـن عاشـور**)[1] لـە تەفسـیرەکەیدا ئـەم تەعبیـرەی هێنـاوە، دوای چەنـد قسـەیەك دەڵـێ: (**وَبِتَعَاضُـدِ هَـذِهِ الدَّلَائِـلِ وَتَنَاصُرِهَـا -وَإِنْ كَانَ كُلُّ وَاحِـدٍ مِنْهَـا لَا يَعْـدُو أَنَّـهُ ظَنِّـيَّ الدَّلَالَـةِ، وَهِـيَ ظَوَاهِـرُ الْقُـرْآنِ، أَوْ ظَنِّـيَّ المَـتْنِ وَالدَّلَالَـةِ، وَهِـيَ الْأَحَادِيـثُ الصَّحِيحَـةُ -حَصَـلَ مَـا يَقْتَـضِي الِإعْتِقَـادَ بِوُجُـودِ مَوْجُـودَاتٍ خَفِيَّـةٍ تُسَـمَّى الجِـنَّ، فَتُفَـسَّرُ بِذَلِـكَ مَعَـانِي آيَـاتٍ مِـنَ الْقُـرْآنِ وَأَخْبَـارٍ مِـنَ السُّـنَّةِ، وَلَيْـسَ ذَلِـكَ مِـمَّا يَدْخُـلُ فِي أُصُـولِ عَقِيـدَةِ الْإِسْلَامِ، وَلِذَلِـكَ لَـمْ نُكَفِّـرْ مُنْكِـرِي وُجُـودِ مَوْجُـودَاتٍ مُعَيَّنَـةٍ مِـنْ هَـذَا النَّـوْعِ، إِذْ لَـمْ تَثْبُـتْ حَقِيقَتُهَـا بِأَدِلَّـةٍ قَطْعِيَّـةٍ، بِخِلَافِ حَـالِ مَـنْ يَقُـولُ: إِنَّ الْجِـنَّ لَـمْ يُذْكَـرْ فِي الْقُـرْآنِ بَعْـدَ عِلْمِـهِ بِآيَـاتِ ذِكْـرِهِ**).

بەڕاسـتیی مـن سـەرم سـوڕما لـەم زانـا موعتەبـەرە، کـە تەفسـیرەکەی (**التحریـر والتنویـر**) وردەکاریـی باشـی لـە بـارەی تێگەیشـتنی قوڕئانـەوە، گرتۆتـە خـۆی، پێـم سـەیر بـوو کـە ئـەو قسـەیەم تێیـدا خوێنـدەوە، بۆیـەش ئەوەنـدە جەختـم لەسـەر ئـەوە کـردەوە کـە ئیـمان هێنـان بـە جنـد واجبـە، واجبێـك کـە بەرانبەرەکـەی بریتیـە لـە کوفـر، واتـە: کەسـێك ئیـمان بـە جنـد نەهێنـێ، بـە بێبـڕوا دادەنـرێ.

(ابـن عاشـور)دوای چەنـد قسـەیەك، دەڵـێ: ئـەم بەڵگانـە هەموویـان پشـتی یەکـدی دەگـرن، : [پشـتی یەکـدی دەگـرن - ئەمـە نیهـاد (**مبتـدأ**)ە، دوایـی گـوزارە (**خبر**)ەکـەی دێ - لەسـەر ئـەوەی پێویسـتە بڕوامـان بـە جنـد ببـێ]، هەرچەنـدە هـەر کامێـك لـەو بەڵگانـەش کـە هەندێکیـان ئایەتـی قوڕئانیشـن و هەندێکیشـیان فەرمایشـتی پێغەمبـەرن ﷺ لـەوە زیاتـر نیـن، کـە یـان مانـا گەیاندنەکەیان لـە گومان بـەولاوە نیـە، کـە بریتیـن لـە ڕواڵەتـی ئایەتەکانـی قوڕئـان، یـان هـەر کام لـە دەق

---

(١ ) ج١٢، ص(٢١٨ ، ٢١٩).

(**متن**) و ماناگەیاندن (**دلالة**)یان لە سنووری گومان دایەو جێی دڵنیایی نیە، کە بریتین لە فەرمووده ڕاستەکان، بە هەموو ئەمانە شتێك پەیدادەبێ، خوازیاری ئەوەیە بڕوامان بێ بە چەند دروستکراوێکی پەنهان کە پێیان دەگوترێ: (جند)، مانای ئایەتەکانی قورئان و هەواڵەکانی سوننەت بەپێی ئەوە لێکدەدرێنەوە، بەڵام هەموو ئەوە ناچێتە نێو بنەماو بنچینەکانی عەقیدەی ئیسلام، هەر بۆیە کەسێك کە نکووڵیی بکات لە دروستکراوانێکی دیارییکراوی لەو جۆرە، کە چییەتەکەیان نەچەسپاوە بە بەڵگەی یەکلاییکەرەوە، ئێمە بە بێبڕوای دانانێین و لە بازنەی ئیسلام نایبەینە دەر، بە پێچەوانەی حاڵی کەسێکەوە کە بڵێ: (جند) لە قورئاندا باس نەکراون، لە حاڵێکدا کە ئاگاشی لە ئایەتەکان هەیە، باسی جندیان کردوە.

وەك گوتم، بەڕاستیی ئەو قسەیە، قسەیەکی زۆر بێسەروبەرەو هیچ پاساوێك هەڵناگرێ، جگە لەوەی هەڵەیەکی گەورەیە (**إبن عاشور**) تێیکەوتوەو هەندێك لە زانایانی دیکەش، کە هەر لەبەر ئەوەی (جند) دیار نین و پەنهانن و بە پێنج هەستەکان ناتوانین دەرکیان بکەین، ئەگەر کەسێك نکووڵییشیان لێ بکات بە بێبڕوا دانانرێ!!

## بڕگەی دووەم: ناساندنی جند لە میانی سیفەتەکانیان و حاڵ و باڵیان دا:

سەرەتا بیست و پێنج دەقم هێناون لە قورئاندا، دوایی لەو دەقانەوە بیست تایبەتمەندیی و سیفەت و حاڵ و باڵی جندم خستوونە ڕوو، کە دوای ئەو بیست خاڵە لە حاڵ و سیفەتیان، تاڕاددەیەکی زۆر بۆمان دەردەکەوێ: جند چین و چۆنن؟!:

١- جند لە ئاگر دروستکراون، وەك لە سووڕەتی (**الرّحمن**)دا هاتوە: ﴿ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: جانییشی پێشتر لە بڵێسەی ئاگر دروستکردبوو، هەروەها لە سووڕەتی (**الحجر**)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾، هەروەها لە جگە لە وانیش دا هاتوەو، بە پێویستی نازانم هەموو جارێك ئایەتەکان بخوێنمەوە.

٢- جند پێش مرۆڤ دروستکراون، یاخود باپیان ئیبلیس پێش بابی مرۆڤان دروستکراوە کە ئادەمە، ئەمیش لە سووڕەتی (**الحِجر**) لە ئایەتی ژمارە (٢٧)دا هاتوە: ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾.

٣- ئیبلیس لە جندە، بەڵکو بابی جندانە، هەروەك چۆن ئادەمیش بابی مرۆڤانە، ئەمیش لە ئایەتی ژمارە (٥٠) لە سووڕەتی (**الكهف**)دا هاتوە، کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە: یادبکەوە کاتێك بە فریشتانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، یەکسەر کڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس کە لە جند بوو، ئنجا لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، ئنجا ئایا خۆی و وەچەکەی لە جیاتی من بە دۆست دەگرن کە دوژمنیشتانن...؟

کەواتە: جند وەچەی ئیبلیسن.

٤- ئیبلیس بابی جندەو لەگەڵ فریشتەکاندا کڕنووشی ڕێزلێگرتنی بۆ ئادەم بابی مرۆڤان نەبرد، وەك سەرپێچییکردن لە پەروەردگاری و شانازیی بەخۆوەکردن و خۆ بەزلگرتن، کە ئەو لە ئاگر دروستکراوە، ئەمیش لە سووڕەتی (**ص**)دا هاتوە: ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ ﴾، هەروەها بە تەفصیڵ خوا ﷻ لە سووڕەتی (**الأعراف**)یش دا باسیکردوە.

٥- جند وەك مرۆڤ چاك و خراپیان تێدایە، ئەویش لە ئایەتی ژمارە (١١) سووڕەتی (**الجن**)دا هاتوە: ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ ﴾.

٦- جند دانیان بەوەدا هێناوە کە بەندەی خوان و، ملکەچن بۆ دەسەڵاتی خوا، وەك لە ئایەتی ژمارە (١٢)ی سووڕەتی (**الجن**)دا هاتوە: ﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴿١٢﴾ ﴾.

٧- بەشێك لە جند بڕوایان هێناوە بەو ڕێنماییە دابەزێنراوەی بۆ سەر پێغەمبەری کۆتایی دابەزێنراوە، هەر لەگەڵ گوێبیستی بوون، بڕوایان پێ هێناوە، وەك لە ئایەتی ژمارە (١٣)ی سوورەتی **(الجن)**دا هاتووە: ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ۖ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾﴾.

٨- جندیش وەك مرۆڤ، پەنهان نازانن، ئەو پەنهانەی تەنیا خوای بەرز دەیزانێ، نەك ئەوەی ڕێژەیی **(نسبي)**یەو لە هەندێك کەس پەنهانەو، هەندێك خەڵکی دیکە دەیزانن، یان ئەوەی بۆ وێنە: بە چاوی سەر نابینرێ، بەڵام بە میکرۆسکۆب دەبینرێ، یان بە تەلیسکۆبەکان دەبینرێ، ئەوە پێی دەگوترێ: پەنهانی ڕێژەیی **(الغيب النسبي)**، بەڵام پەنهانی موتڵەق و ڕەها تەنیا خوا دەیزانێ، ئەمیش لە ئایەتی ژمارە (١٤)ی سوورەتی **(سبأ)**دا هاتووە، کە پێشتریش ئایەتەکەمان هێنا: ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾﴾.

٩- جند دەتوانن خولیاو خوتخوتەو دنەدانی خراپ بخەنە دڵی مرۆڤانەوەو، بەرەو خراپە بیانجووڵێنن، وەك لە سوورەتی **(النّاس)**دا هاتووە، بە هەر شەش ئایەتەکەیەوە: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾﴾، هەروەها لە ئایەتی ژمارە (١١٢)ی سوورەتی **(الأنعام)**دا هاتووە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾﴾، دیسان لە ئایەتی ژمارە (١٢١)ی **(الأنعام)**یش دا هاتووە: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾﴾.

١٠- جندە شەیتانەکان، واتە: بێبڕواو خراپەکارەکانیان، تەنیا دەسەڵاتیان بەسەر ئەهلی کوفردا هەیە، ئەوانەی شوێنیان دەکەون و پەیڕەوییان لێ دەکەن و بۆیان ملکەچن،

هەرچەندە جندە شەیتانەکان لە بنەڕەت دا دژی پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیانن و، هەرسەرگەرمی خوتخوتەی زریق و بریق و فریودەرانەن، وەك لە ئایەتی ژمارە (١١٢) ی سوورەتی (**الأنعام**)دا هاتوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾﴾، بەڵام جندە شەیتانەکان تەنیا دەسەڵاتیان بەسەر پەیڕەوانی خۆیانیان دا هەیە، وەك لە سوورەتی (**الأعراف**) لە ئایەتی ژمارە (٢٧)دا هاتوە: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾﴾، هەروەها لە ئایەتەکانی (٩٩ - ١٠٠) سوورەتی (**النّحل**)یش دا بەهەمان شێوە: ﴿إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾﴾.

**١١-** زاڵبوونی وەسوەسەو خوتخوتەو دنەدانی شەیتانەکان، لە ئەهلی ئیمانەوە دوورە، ئەو ئەهلی ئیمانەی بەڕاستیی پارێزکارن و پشتیان بە خوا قایمە، وەك لە ئایەتی (٩٩) سوورەتی (**النّحل**)دا، خوا ئەوەی زۆر بە ئاشکرا ڕاگەیاندوە: ﴿إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾﴾. هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٤٢) لە سوورەتی (**الحجر**)یش دا: ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾﴾، دیسان لە ئایەتی ژمارە (٦٥)ی سوورەتی (**الإسراء**)یش دا: ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾﴾، خوا ﷻ ئەوەی دووبارە کردۆتەوە.

**١٢-** جاری وا هەیە شەیتان زەفەر بە ئەهلی ئیمان و تەقواش دەبات، بەڵام لە کاتی بێ ئاگاییان دا، بەڵام دوای ئەوەی خوایان دەکەوێتەوە یاد، شەیتان لێیان دوور دەکەوێتەوە، ئەمەش لە ئایەتەکانی: (٢٠١ - ٢٠٢)ی سوورەتی (**الأعراف**)دا زۆر بە ڕوونیی باسکراوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾﴾.

**١٣-** شەیتانەكان جگە لە خوتخوتەو دنەدان، هیچ ئامڕازێكی دیكەیان نیە بۆ زیانگەیاندن بە مرۆڤەكان، وەك لە ئایەتی ژمارە (٢٢) سوورەتی **(إبراهيم)**دا هاتوە: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾، لە سوورەتی **(النّاس)**یشدا دیارە بە هەر شەش ئایەتەكەیەوە ئەوە ڕوونكراوەتەوە: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾،

هەروەها ئەم فەرمایشتەش هەیە لەو بارەوە: {**الشَّيْطَانُ جَاثِمٌ عَلَى قَلْبِ ابْنِ آدَمَ، فَإِذَا سَهَا وَغَفَلَ وَسْوَسَ، وَإِذَا ذَكَرَ اللَّهَ خَنَسَ**}، **(أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٥٩١٩ عن ابن عباس** رضي الله عنهما**)**، واتە: شەیتان چۆكی لەسەر دڵی وەچەی ئادەم داكوتاوە، هەر كاتێك بێئاگا بوو دنەی دەدا (خوتخوتەی بۆ دەكات)، بەڵام ئەگەر خوای (پەروەردگاری) یاد كرد دەكشێتەوە.

**١٤-** جاری وا هەیە مرۆڤ وا دەكەوێتە ژێر ڕكێف و كاریگەریی شەیتانەوە، كە دەتوانێ بچێتە نێو جەستەی، یاخود دەتوانێ خۆی پێشان بدات بە شێوەیەك لە شێوەكاندا، دواییش وای لێ بكات هاوسەنگیی تێكبدات، وەك لە ئایەتی (٢٧٥)ی سوورەتی **(البقرة)** دا هاتوە: ﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰا۟ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰا۟ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ ﴾، هەروەها لە ئایەتی (٧١)ی سوورەتی **(الأنعام)**یش دا: ﴿ قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ

﴿ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ ﴾، خوا ﷻ ئاماژەی بەوە داوە.

**١٥-** شەیتانەكان هەوڵدەدەن لە فریشتەكان لە سەرێ نیزیك ببنەوە، بۆ گوێ هەڵخستن و دزینی زانیاریی و، گەیاندنی بە كاهین و فاڵچییەكان، بەڵام فریشتەكان بۆیان لە بۆسەدان و، بە بڵێسەی ئاگر تیر بارانیان دەكەن، وەك ئایەتەكانی: (١٦ - ١٨) لە سوورەتی (**الحجر**) باسیدەكەن: ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ ﴾، هەروەها چەند ئایەتێك لە سوورەتی (**الصافّات**) و سوورەتی: (**الملك**) و سوورەتی (**الجن**)دا هاتوون و، لەو بارەشەوە لە بڕگەی حەوتەم دا بە تایبەت دەدوێین و پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (**الحجر**)دا كورتە باسێكمان كردوە.

**١٦-** شەیتانەكانی جند ناتوانن هەواڵی ئاسمان، (واتە: وەحیی) دەستی تێوەربدەن بە هیچ جۆرێك، چونكە ڕێیان لێگیراوە لە گوێگرتن، دوای هاتنی پێغەمبەری كۆتایی، وەك ئایەتەكانی: (٢١٠ – ٢١٢) لە سوورەتی (**الشعراء**) بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن: ﴿ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ ﴾.

**١٧-** جندەكان ئێمە دەبینن، بەڵام ئێمە ئەوان نابینین، مەگەر لە هەندێك لە حاڵەتی دەگمەن و ڕیزپەڕدا، ئەمیش لە ئایەتی (٢٧)ی سوورەتی (**الأعراف**)دا باسكراوە: ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

**١٨-** ئەوانەی لەگەڵ ئیبلیس دان لە وەچەكەی، هەموو كاریان ئەوەیە دوژمنایەتیی مرۆڤان بكەن و، هەوڵ دەدەن سەرگەردان و سەرلێشێواویان بكەن، وەك لە ئایەتەكانی: (٥ و ٦)ی سوورەتی (**فاطر**)دا هاتوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ

﴿ ٱلدُّنۡيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ٥ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ٦ ﴾.

**١٩-** بە زۆریی شەیتان و دارو دەستەکەی سەرگەرمی دژایەتیی مرۆڤ دەبن، لە کاتێکدا ئەو مرۆڤە خەریکی تاعەت و ئەنجامدانی فەرمانبەرییە بۆ خوای بەرز، بۆیە لە سوورەتی **(النّحل)** ئایەتی (٩٨)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: هەر کاتێك قورئانت خوێند، پەنا بە خوا بگرە لە شەیتان: ﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ٩٨ ﴾، پێغەمبەریش ﷺ فێری کردووین بڵێین: **(أعُوذُ بالله مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ)**، کە ئەمە **(عبدالرزاق)** لە **(المُصنّف)**دا هێناویەتی و ئەلبانیی لە **(إرواء الغليل)**دا بە صەحیحی داناوە، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردووین بڵێین: {**أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ**} **(أخرجه الترمذي: ٢٤٢، وأحمد: ١١٤٩١)**.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردووین، ئەم زیکرە بە جۆرێکی دیکەش بڵێین: {**أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ**} **(أخرجه الترمذي ٢٤٢ وغيره، وَصَحَّحَهُ الألباني)** واتە: پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی دوورخراوە لە بەزەیی خوا، لە دنەدانی و، فوو پێداکردنی و، قسەی خراپ فێرکردنی.

**٢٠-** جاری وا هەیە شەیتان بەهۆی خوتخوتەو دنەدانی خراپیەوە، وا دەکات کە مرۆڤ شتی چاکی لە بیر بچێتەوە، وەك لە ئایەتی ژمارە (٦٨)ی سوورەتی **(الأنعام)**دا هاتووە: ﴿ وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٦٨ ﴾ هەروەها لە ئایەتی (٤٢)ی سوورەتی **(یوسف)**دا: ﴿ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ٤٢ ﴾و، ئایەتی (٦٣)ی سوورەتی **(الكهف)**: ﴿ قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ٦٣ ﴾،

هەرکامیان بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، کە شەیتان لە ڕێی خوتخوتەو دنەدانیەوە، وا لە مرۆڤ دەکات، خوای لە بیربچێتەوە، یادی خوای لە بیر بچێتەوە، یان کارێکی گرنگ کە دەیەوێ ئەنجامی بدات، فەرامۆشی بکات.

## بڕگەی سێیەم: جندیش وەك مرۆڤ ئەركدارن، بە بەندایەتیی كردن بۆ خواو، پاداشت و سزاش چاوەڕێیانە:

زۆر بەڵگە لە كتێبی بەرزو بە پێزی خوای بێ وێنەدا لەو بارەوە هەن، كە جندی دراوسێشمان لە ژیانی سەر زەوی، لەگەڵ ئێمەدا قۆناغی ژیانی تاقیكرانەوە دەگوزەرێنن، هەروەها لە ئەرك و ئامانجیشدا هاوبەشمانن و، ئەو حیكمەتەی ئێمەی بۆ دروستكراوین، ئەوانیش بۆ هەمان حیكمەت دروستكراون، كە بریتیە لە بەندایەتیی كردن بۆ خوا، خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی لە زۆر لە ئایەتەكانی قورئاندا بە ڕوون و ڕاشكاویی ڕاگەیاندوە، بۆ وێنە:

**١-** لە سووڕەتی **(الذّاريات)** لە ئایەتی (٥٦)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾، جندو مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستكردووە بمپەرستن، جندو مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستكردوون، بەندایەتییم بۆ بكەن، لەبەر ئەوەی لە بەندایەتیی كردن بۆ خوا، خۆیان بەهرەمەند دەبن، ئەگەرنا خوا زۆر لەوە بەرزترە كە مرۆڤەكان و جندەكان بە بەندایەتیی كردنیان سوودی پێبگەیەنن، یاخود بە بێ فەرمانیی و سەرپێچییان زیانی پێ بگەیەنن.

**٢-** لە سووڕەتی **(الأنعام)** لە ئایەتی ژمارە (١٣٠)دا، بەڵگەیەكی دیكە هەیە لەسەر ئەوەی جندیش وەك ئێمە ئەركدار كراون، چونكە یەكێكی دیكە لەو بیرۆكانەی **(إبن عاشور)** گوتوویەتی: ئەوەیە جند لەسەریان پێویست نەكراوە ئەركە شەرعییەكان جێبەجێ بكەن، هەروەها ڕای بە لای ئەوەشدایە كە مەرج نیە، ئەوان بچنە بەهەشتەوە!!، وەك لە سووڕەتی **(الرحمن)**یشدا لەو بارەوە، قسەم لەسەر قسەكانی كرد، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِى

وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَاۚ قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾، واتە: ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئایا لە خۆتان ڕەوانەکراوانێکتان بۆ نەهاتن، ئایەتەکانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوەو، لە دیداری ئەمڕۆتان دەیانترساندن و هۆشداریيان پێدەدان، (لە ڕۆژی دواییدا خوا ﷻ بەو شێوەیە جندو مرۆڤ دەدوێنێ)، گوتیان: شایەدییمان لەسەر خۆماندا، (ئنجا خوا دەفەرموێ:) ژیانی دنیا فریوی دان و شایەدییان لەسەر خۆیان دا کە ئەوان بێبڕوا بوون، واتە: دۆزەخییەکانی مرۆڤ و جند، کەواتە: جندیش وەك مرۆڤان سزایان هەیە.

٣- لە سووڕەتی (**الرحمن**)دا سی و یەك (٣١) جار ڕوو دەکاتە مرۆڤ و جندو دەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن، ئەی جندو مرۆڤ؟.

٤- هەروەها خوا لە سووڕەتی (**الرّحمن**)دا هەر لە میانی ئەو ئایەتانەدا، لە ئایەتی ژمارە (٣٢)دا دەفەرموێ: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾﴾، بۆتان دەست بە تاڵ دەبین، ئەی دوو قوڕسەکان، واتە: ئەی مرۆڤ و جند! کە سەر زەویتان قورس کردوە، لە ڕۆژی دواییدا بۆتان یەکلایی دەبمەوە بۆ سزاو پاداشتتان، کەواتە: سزاشیان هەیەو پاداشتیشیان هەیە.

هەروەها دەگونجێ زۆر ئایەتی دیکەش لەو بارەوە بێنین، بەڵام ئەوەی پێویستە لێی ئاگادار بین، دوای ئەوەی زانیمان جندیش وەك مرۆڤ ئەرکدار کراون، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، سزا چاوەڕێیانە، ئەگەر بێبڕواو خراپەکاربن و، پاداشتیش چاوەڕێیانە، ئەگەر بڕوادارو پارێزکارو چاکەکار بن، ئەوەیە کە ئاگادار بین وردەکارییەکانی خواپەرستیی و فەرمانبەریی کە لەسەر جند پێویست کراوە، چۆنیەتییەکەی بۆ ئێمە زانراو نیە، ئایا ئەوانیش بە هەمان ئەو شتانەی ئێمە پێیان ئەرکدار کراوین و لەسەرمان پێویست کراون، ئەوانیش ئەو شتانەیان بەو شێوەیە لەسەر پێویست کراون؟ لە قورئان و سوننەتدا وەڵامی ئەو پرسیارەمان بە ڕوونیی دەست ناکەوێ، بەڵام دوایی لە بڕگەی نۆیەمی ئەو کورتە باسەدا، لەو بارەوە هەندێك زانیاریی دەخەمە ڕوو.

ئـەوەی کـە جێـی دڵنیاییـە ئەوەیـە کـە جندیـش وەك مـرۆڤ بـۆ بەندایەتیـی کـردن بـۆ خـوای پەروەردگاریـان، بـە هەڵبـژاردن و ویسـتی خۆیـان، دروسـتکراون، هەروەهـا وەك ئێمـەش لـەو جیهانـە سـەر زەوییـە کورتـەدا تاقیدەکرێنـەوەو، لەگـەڵ ئێمـەدا دەژیـن و دەمـرن و، لـە ڕۆژی دواییشـدا وەك ئێمـە زینـدوو دەکرێنـەوە، لـە هەمـوو ئـەو ڕووانـەوە وەك مـرۆڤ وان.

**بڕگـەی چـوارەم: ڕەوانەکـراوان و پێغەمبەرانـی خـوا (علیهـم الصـلاة والسـلام) لـە نێـو مرۆڤانـدا کـورت هەڵبژێـراون و، جندیـش وەك مـرۆڤ، ئەرکـدار کـراون شـوێن پێغەمبـەران بکـەون:**

بـە دڵنیایـی هیـچ کام لـە نێردراوەکانـی خـواو پێغەمبەرانـی خـوا (**الرسُـل والأنبيـاء**) لـە جنـد نەبـوون، بەڵکـو نێردراوانـی خـواو پێغەمبەرانـی خـوا هەموویـان لەنێـو مرۆڤانـدان، بـەڵام جندیـش پابەنـد کـراون بە گـوێ لێگرتـن و شـوێنکەوتن و پەیڕەویی کـردن لـەو نێـرراوو پێغەمبەرانـەی خـوا ﷻ لـە نێـو مرۆڤانـدا ناردوونـی، ئـەوەی ئـەم ڕاسـتییەش دەگەیەنـێ ژمارەیـەك ئایەتـن:

١- لە سووڕەتی (**الأنعام**)دا ئایەتەکانی: (١٣٠ و ١٣١)دا خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ١٣٠ ذَٰلِكَ أَن لَّمۡ يَكُن رَّبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا غَٰفِلُونَ ١٣١﴾، دوای ئایەتی یەکەم کە پێشتر تەفسیرمان کرد خوا دەفەرموێ: ئەوەش بە هۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت فەوتێنەری هیچ کام ئاوەدانییەکان نیە، بەهۆی ستەمێکەوە کە دەیکەن، لە حاڵێکدا کە بێ ئاگان، واتە: تاکو ئاگادار نەکرێن و هۆشدارییان پێ نەدرێ، خوا سزایان نادات، ئنجا لێرەدا بە گشتیی خوا فەرموویەتی، کەواتە: ئاوەدانییەکانی مرۆڤ و جند، دەگرێتەوە، چونکە پێکەوە دوێنراون.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (**الأحقاف**) ئایەتەکانی: (٢٩ و ٣٠)دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَـٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَـٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك کۆمەڵێك لە جندمان بۆ لای تۆ ناردن (ئەی موحەممەد ﷺ!)، گوێ بۆ قورئان هەڵدەخەن، کاتێك ئامادەی قورئان خوێندنەکە بوون بە خۆیانیان گوت: بێدەنگ بن، کاتێك (قورئان خوێندنەکە) تەواو بوو، گەڕانەوە بۆ لای کۆمەڵەکەیان ئاگادار کەرەوانەو ترسێنەرانە، (گەڕانەوە کە ئەوانیش ئەو پەیامە بە قەومەکەیان بگەیەنن)، گوتیان: ئەی کۆمەڵەکەمان! ئێمە گوێمان لە کتێبێك بوو لە دوای مووسا دابەزیوە، کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ، خەڵك بەرەو هەق و ڕاستە ڕێ ڕێنمایی دەکات.

٣- هەروەها لە سووڕەتی (**الجن**) ئایەتەکانی: (١ و ٢)دا، خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرمویٚ: ﴿ قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴿٢﴾ ﴾، واتە: بڵێ سروشم بۆ لا کراوە، کە کۆمەڵێك لە جند گوێیان (بۆ من) هەڵخستوە، گوتیان: ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر بوو، بەرەو بە مراد گەیشتن ڕێنمایی دەکات، بۆیە بڕوامان پێیهێنا و هیچ کەس ناکەینە هاوبەشی پەروەردگارمان.

کەواتە: شتێکی ڕوونە کە پێغەمبەران بۆ هەر کام لە جندو مرۆڤ نێردراون و، ئەوەش کە تەنیا لە مرۆڤان بوون، شتێکی ئاشکرایە، چونکە لە هیچ ئایەتێك و لە هیچ فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ باسی ئەوە نەکراوە، جند پێغەمبەریان بۆ هاتوون، بەڵکو جندەکان وەك مرۆڤەکان پابەند کراون گوێ لە پێغەمبەران بگرن، دیارە لە سەردەمی پێغەمبەری خۆماندا موحەممەد ﷺ و لە دوای هاتنی موحەممەدەوەش ﷺو، پێشتریش گوێ بۆ پێغەمبەرانی دیکە بگرن، کە بۆ بەشەر نێردراون هەر لە ئادەمەوە تاکو عیسا.

## بڕگەی پێنجەم: هەندێك حیكمەت و ئەدەبی بەرز لە بواری دینداریيدا، بۆ براو خوشكانی جندمان:

ئێمە ئەم بڕگەیە لە دوو خاڵان دا دەخەینە ڕوو:

**١-** خاڵی یەكەم: ئایەتەكانی: (٢٩ - ٣٢)، واتە: ئەو چوار ئایەتە لە سوورەتی **(الأحقاف)**، لەوێ دا پازدە (١٥) ئەدەب و ڕەوشتی بەرزمان لە جند كەوتوونە بەرچاو.

**٢-** خاڵی دووەم: لە سوورەتی **(الجن)**دا ئایەتەكانی: (١ - ١٥) و، ئایەتی (١٩)، لەوێشدا بیست (٢٠) ئەدەبمان وەرگرتوون، كە بە پێویستی نازانین ئایەتەكان بخوێنینەوەو هەر یەكسەر ئەو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزو جوانانەی جند خۆیانیان پێ ڕازاندوونەوە دەیانهێنین:

### خاڵی یەكەم: (الأحقاف) - ٢٩ - ٣٢ -:

**١-** شەیدایی و تامەزرۆیی بۆ تێگەیشتن لە ئایین و، ئەزیەت بەر خۆدان لە پێناوی ئەوەداو، لێكۆڵینەوەو پشكنین و سۆراغ كردن بۆ دۆزینەوەی ئایین و بەرنامەی خوا ﷻ، بە شێوە ڕاست و دروستەكەی، وەك لەم ئایەتە وەردەگیرێ: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٢٩﴾﴾ **الأحقاف**.

**٢-** ئارامیی و بێدەنگیی لە كاتی ئامادەبوون لە كۆڕو مەجلیسی زانیاریی و یادی خواداو، گوێ هەڵخستن بە تامەزرۆییەوە: ﴿فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ ﴿٢٩﴾﴾ **الأحقاف**، كاتێك ئامادەی بوون، گوتیان: بێدەنگ بن.

**٣-** پەلەنەكردن لە وازلێهێنانی ئەو كۆڕو مەجلیسە، مەگەر دوای ئەوەی ئەو فێركردن و یادی خوا كردنەی كە تێیدایە، تەواو دەبێ: ﴿فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾﴾ **الأحقاف**، كاتێك تەواو بوو، ئاگاداركەرەوانە گەڕانەوە بۆ لای خەڵكەكەیان.

**٤-** دەستكردن بە ڕوونكردنەوەی هەق و گەیاندنی بە خەڵك خەڵكی خۆیان و، هیچ سستیی نەكردن لە بانگەواز كردنی خەڵكدا، وەك ئەم ڕستە قوڕئانییە دەیگەیەنێ:

﴿ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾**الأحقاف**، کاتێك تەواو بوو (گوێیان گرت و وەریان گرت)، یەکسەر گەڕانەوە بۆ لای کۆمەڵەکەیان، کە بیانترسێنن و ئاگاداریان بکەنەوە.

**٥-** جەختکردنەوە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەران، هەندێکیان هەندێکیان بە ڕاست دەزانن و، کتێبەکانیشیان هەموویان یەك سەرچاوەیان هەیە، وەك ئەم ڕستە قورئانییەی دەیگەیەنێ: ﴿ قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴿٣٠﴾ ﴾**الأحقاف**.

**٦و٧-** ناساندنێکی وردو قووڵ بۆ کتێبی خوا، بەوە کە بەرەو هەق ڕێنمایی دەکات، لە ڕووی بووناسیی و تێڕوانین و پێوەرو تەرازووەکان و ئیمانەوە و، هەروەها بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنمایی دەکات، لە ڕووی کردەیی و بەرنامەکانی ژیاندا، وەك ئەم ڕستە قورئانییە دەیگەیەنێ: ﴿ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ ﴾**الأحقاف**.

**٨-** دەستکردن بە بانگەواز دوای ڕوونکردنەوەی هەق و ناساندنی، ئاڕاستەکردنی بانگەوازەکەش بە شێوەیەکی نەرم و نیان و سەرنجڕاکێش: ﴿ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ ﴿٣١﴾ ﴾**الأحقاف**، واتە: ئەی خەڵکەکەمان! بەدەم بانگەوازی خواوە بچن!

**٩و١٠-** داواکردن لە خەڵکەکەیان کە بە دەم بانگەواز کاری خواوە بچن و، بڕوا بە خوای بەرز بێنن: ﴿ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ ﴿٣١﴾ ﴾**الأحقاف**.

**١١و١٢-** ڕوونکردنەوەی بەرهەم و ئەنجامی وەڵامدانەوەی خوای بەرزو بانگەوازکاری ڕێی خواو ئیمان پێ هێنانی، کە لە لێبوردنی خواو، دەربازکردنی خوا لە سزای ڕۆژی دوایی دا، خۆی دەنوێنێ، وەك ئارەزوومەندکردنی بانگکراوەکان بۆ ڕێی خوا، وەك لەو ڕستە قورئانییەوە وەردەگیرێ: ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾**الأحقاف**.

**١٣و١٤-** هەر کەسێك بە دەم بانگەوازی خواوە نەچێ، نە دەتوانێ لە سزای دنیا خۆی دەرباز بکات، نە هیچ کەسیشی دەست دەکەوێ هاوکارو پشتیوانی بێ، وەك لەو ڕستە قورئانییەوە وەردەگیرێ: ﴿ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءُ ﴿٣٢﴾ ﴾**الأحقاف**.

**١٥وکۆتایی-** کە لەم چوار ئایەتەی سوورەتی (**الأحقاف**) وەردەگیرێ: ئەوانەی بەدەم بانگەوازکاری ڕێ خوای بەرزەوە ناچن، لە گومڕاییەکی ئاشکراو بێ چەندو چووندان: ﴿ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءُ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ ﴾**الأحقاف**.

ئەمە ئەو پازدە (١٥) ئەدەب و حیکمەت و ڕەوشتە جوانەی، براو خوشکە جندەکانمان خۆیانیان پێ ڕازاندوونەوە، کە لەو چوار (٤) ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (**الأحقاف**) وەرمانگرتوون.

خاڵی دووەم: (**الجن**) ١ - ١٥ و ١٩:

(١٥) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (**الجن**) لەگەڵ ئایەتی (١٩)دا ئەوە (١٦) ئایەت، لەم شازدە (١٦) ئایەتەشدا، خوا ﷻ بیست (٢٠) لە ئەدەب و ڕەوشت و حیکمەتەکانی براو خوشکانی جندمان بۆ دەخاتەڕوو، کە من بە خێرایی بەسەریاندا دەڕۆم، چونکە ئایەتەکان دیارن:

**١-** یەکەمین شتێك کە جند وەك سەرنجیان لە بارەی قورئانەوە دەیڵێن، ئەوەیە کە قورئانیان پێ سەرسوڕهێنەرە: ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ ﴾**الجن**.

**٢-** دوای ئەوەی قورئان دەناسێنن بەوەی زۆر سەرسوڕهێنەرە، ئنجا لەو ڕووەوە دەیناسێنن، کە چ شوێنەوارێك لەسەر شوێنکەوتووانی بەجێ دەهێڵێ: ﴿ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ ﴿٢﴾ ﴾**الجن**، بەرەو سەر ڕاستیی و بە ئامانج گەیشتن خەڵك ڕێنمایی دەكات.

**٣-** بابای عاقڵی بە ویژدان، کاتێك هەق دەبینێ، دەیگرێ و پێوەی پابەند دەبێ، بۆیە ئەو جندە هیدایەتدراوانەش ڕایدەگەیەنن، کە بڕوایان بەو کتێبە هێناوەو بڕوایان بەخوا هێناوە: ﴿ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ﴿٢﴾ ﴾**الجن**.

**٤-** لەبەر ئەوەی خوا بە یەکگرتن و تەنیا خواپەرستن (**توحید الله في العبادة**) مەزنترین ڕاستییە، کە کتێبی خوا مرۆڤ و جندی بۆ بانگ کردوون، بۆیە جندەکان دوا ڕاگەیاندنی ئیمان بە قورئان، ڕایدەگەیەنن کە تەنیا خوا دەپەرستن و خوا بەیەکگرن و هاوبەش بۆ خوا دانانێن: ﴿ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا ﴿٢﴾ ﴾**الجن**.

**٥-** لەبەر ئەوەی دوای ئەوەی هەق ڕوون دەکرێتەوە، نا هەق پووچەڵ دەبێ و پووچەڵییەکەی دەردەکەوێ، جندەکان کە هەق ڕوون دەکەنەوە، یەکسەر دەست دەکەن بە پووچاندنەوەی باتیڵ و ڕووخاندنی، بۆیە پەروەردگاریان بە بەرزیی و مەزنیی وەسف دەکەن و هاوژین و ڕۆڵەی لێ لا دەبەن: ﴿ وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةٗ وَلَا وَلَدٗا ﴿٣﴾ ﴾**الجن**، واتە: پێگەو پایەی پەروەردگارمان زۆر بەرزە، نە هاوەڵی هاوژینی هەیە، (واتە: هاوسەر)، نە ڕۆڵەشی هەیە، واتە: پێچەوانەی ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەیڵێن، لە مرۆڤ و لە جند.

**٦-** دوایی جند بابیان ئیبلیس بە نەفام و کەودەن وەسف دەکەن، چونکە ئەوە کە ئەو بیرۆکە پووچانە ڕەواج پێدەدا: ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطٗا ﴿٤﴾ ﴾**الجن**، هەروەها نەفامەکەشمان بەرانبەر بە خوا، قسەی دوور لە هەق و ڕاستیی کردوە.

**٧-** دوایی جند سەرسوڕمان و پێ سەیربوونی خۆیان دەردەبڕن، بەرانبەر بەوەی هەندێك لە جندو مرۆڤ درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستن و، هاوسەرو ڕۆڵەو هاوبەشی پاڵدەدەنەلا: ﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿٥﴾ ﴾**الجن**، ئێمە پێمان وابوو مرۆڤ و جند درۆ بە ناوی خواوە ناکەن، درۆ بۆ خوا هەڵنابەستن، (بڵێن: هاوسەری هەیە، یان هاوبەشی هەیە).

**٨-** دوایی جندەکان هەڵەی هەندێك لە مرۆڤە بێبڕوایەکان، ڕوون دەکەنەوە لەوەدا کە لە مامەڵەیان لەگەڵ جندا پەنا بۆ جند دەبەن و، داوای یارمەتییان لێ دەکەن، لە حاڵێکدا جندەکان دەبنە مایەی سەرلێشێوان و سەرگەردانیی و زیانبارییان: ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾﴾ **الجن**، ژمارەیەك لە پیاوانی مرۆڤ پەنایان بردە بەر ژمارەیەك لە پیاوانی جندو، ئەوانیش هەر زیاتر تووشی مەینەتیی و نارەحەتییان کردن.

**٩-** دوایی جندەکان باسی خاڵێکی هاوبەشی نێوان بێبڕوایانی مرۆڤ و جند دەکەن، کە بریتیە لە گومانی مرۆڤەکان و، گومانی جندەکانیش کە خوا هیچ پێغەمبەرێك نانێرێ: ﴿وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾﴾ **الجن**، ئەی جندەکان! بزانن مرۆڤەکانیش وەك بێبڕوایەکانی وەك ئێوە، پێیان وابووە خوا هیچ پێغەمبەرێك نانێرێ.

**١٠و١١-** دوایی جندەکان باسی ئەوە دەکەن کە گوێیان هەڵخستوەو سۆراغیان کردوە، هەواڵی ئاسمان بزانن، بەڵام تەماشایان کردوە حاڵی ئاسمانێ گۆڕاوەو وەك پێشێ نەماوەو، پڕکراوە لە پاسەوان و پڕکراوە لە بڵێسە، دوایی حاڵی پێشێیان یاد دەکەنەوە کە کاتی خۆی لە هەندێ شوێنی ئاسمانەکان دا گوێیان دەگرت، لە قسەی فریشتەکان، بەڵام ئێستا هەر کەسێك ئەوە بکات، خۆی بە هیلاك دەبات و سەری خۆی بە فەتارەت دەدات: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾﴾ **الجن**، ئێمە سۆراغی ئاسمانمان کرد، تەماشامان کرد پڕکراوە لە پاسەوان و لە بڵێسەو، ئێمە پێشتر لە ئاسمان هەندێ شوێنمان هەبوون گوێمان تێدا هەڵدەخستن بۆ قسەی فریشتان، بەڵام ئێستا هەر کەسێك گوێ بگرێ، بڵێسەیەکی لە بۆسەدای بۆ دانراوەو تێیدەگیرێ و پێی لە بەین دەچێ.

**١٢-** جند دان بە نەفامیی و نەزانیی خۆیان دا دێنن، کە نازانن ئەوە بۆچی ڕوویداوە، ئایا ئەوەی ڕوویداوە ئەو گۆڕانکارییەی لە ئاسمان دا بووە، زیانی تێدایە بۆ خەڵکی

سەر زەوی، یاخود پەروەردگاریان سەر ڕاستیی و بە مراد گەیشتنی بۆ ڕەچاو كردوون؟ ﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ۝١٠﴾ **الجن**، ئێمە نازانین خراپەو زیان بۆ خەڵكی سەر زەوی ڕەچاو كراوە (مەبەستیان پێ مرۆڤەكانە)، یاخود پەروەردگاریان سەر ڕاستیی و چاكەی بۆ ویستوون؟ وەك دەبینرێ: خراپەكە پاڵ نادەنە لای خوا، بەڵام سەر ڕاستییەكە پاڵ دەدەنە لای خوا، ئەوەش ئەدەبێكی بەرزی جندە.

**١٣-** دوایی جندەكان حاڵی پێشوویان باس دەكەن، كە چۆن لە ڕابردوودا چاكیان هەبووەو خراپیان هەبووە، ڕێچكەو ڕێبازی جۆراوجۆریان گرتوون: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ۝١١﴾ **الجن**، ئێمە چاكیشمان تێدا هەن و، جگە لەوەشمان تێدا هەن، ئێمە پێشتر ڕێبازی زۆرو جۆراو جۆرمان هەبوون.

**١٤-** دوایی جند باسی بۆچوونی پێشوویان دەكەن، لە بارەی خوای بەرزەوە، كە پێشتریش هەر زانیویانە ناتوانن لە دەستی خوا ڕابكەن و، ناشتوانن نە لەسەر زەوی خوا دەستەوسان بكەن، نە لە سنووری زەویش بچنە دەرو ڕابكەن و خوا دەستەوسان بكەن: ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ۝١٢﴾ **الجن**، ئێمە زانیمان ناتوانین خوا لەسەر زەوی دەستەوسان بكەین و، ناشتوانین لەبەر دەستی دەربچین و ڕابكەین.

**١٥و١٦-** دوایی هەڵوێستی خۆیان لە بارەی ئەو ڕێنمایی و هیدایەتەوەی خوا بە پێغەمبەری كۆتایی موحەممەددا ﷺ ناردوویەتی ڕادەگەیەنن، كە بڕوایان پێهێناوە لەگەڵ پێیان زانیوە بەو هیدایەتە، یەكسەر بڕوایان پێ هێناوە بێ دواكەوتن، دواییش بەرهەمی ئەو ڕێی ڕاستگرتنە، ڕوون دەكەنەوە، كە هەر كەسێك بڕوادار بێ و هیدایەت وەرگرێ، لە ڕۆژی دواییدا نە لە لەدەست چوونی پاداشت دەترسێ، نە لە دووچاربوونی سزا: ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ۖ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ۝١٣﴾ **الجن**، ئێمە هەر لەگەڵ گوێبیستی ڕێنمایی خوا بووین، بڕوامان پێ هێناو، هەر كەسێك بڕوا بە پەروەردگاری بهێنێ، نە لە كەمكردنەوەی پاداشت دەترسێ، نە لە لێ زیادكردنی سزا.

**١٧و١٨و١٩-** لە کۆتایی دا جندەکان هەڵوێستی ئێستایان ڕوون دەکەنەوە، وەك زۆربەی جند کە لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەم مسوڵمانیان تێدان و، هەم بێبڕواو ستەمکارانیشیان تێدا هەن، دوایی سەرەنجامی هەر کام لە بۆ خوا ملکەچان و، ستەمکاران و لادەرانیش ڕووندەکەنەوە، کە بۆ خوا ملکەچان و مسوڵمانان لە هەق گەڕاون و دۆزیویانەتەوە لە شوێنی خۆی و، شوێنی کەوتوون و، سەرەنجام سەرفرازو بە مراد گەیشتوو بوون، بەڵام ستەمکارەکان کە ستەمیان لە خۆیان و لە هەق کردوە، ئەوانە سەرەنجامیان ئەوەیە کە ببنە سووتەمەنیی ئاگری دۆزەخ، وەك دەڵێن: ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ ۖ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ ﴾**الجن**.

**٢٠-** خوا ﷻ وایان وەسف دەکات زۆر سوور بوون لەسەر ئەوەی هیدایەتی خوا بەدەست بهێنن و هەق بناسن، بە جۆرێك کاتێك هاتوونە لای پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ خەریکی قورئان خوێندن بووە، یان خەریکی بانگەواز بووە، یان خەریکی پاڕانەوە بووە لە خوا، خەریك بوون کەڵەکە بکەن لەسەری، واتە: ئەوەندە قەرەباڵغییان کردوە، خەریك بووە بچنە سەر شان و ملی، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ ﴾**الجن**، کاتێك بەندەی خوا هەڵسا بانگەوازی کرد بۆ لای خوا، لە خوا پاڕایەوەو قورئانی خوێند، ئەوان خەریك بوو کەڵەکەی لەسەر بکەن.

کەواتە: لەم شازدە ئایەتەی سوورەتی (**الجن**)دا، بیست ئەدەب و ڕەوشتی جوانی بەرزمان لە مسوڵمانانی جند وەرگرتن و، لە چوار ئایەتەکەی سوورەتی (**الأحقاف**)یش، پازدە ئەدەب ئەوە سی و پێنج (١٥ + ٢٠= ٣٥)، ئنجا ئەو سی و پێنج (٣٥) ئەدەب و ڕەوشتە ئەگەر باش سەرنجیان بدەین، زۆر تێگەیشتنی هەڵەی مرۆڤان لە بارەی جندەوە، ڕاست دەکەنەوە، کە جند خراپەکانیان خراپن، وەك مرۆڤان و، چاکەکانیشیان چاکن وەك چاکی مرۆڤان، بەڵێ پێغەمبەران تەنیا لە مرۆڤاندا هاتوون، بەڵام جندیش ئەگەر بە دوای پێغەمبەران بکەون و بە

دوای هیدایەتی خوا بکەون، ئەوانیش کەم و زۆر، لە ئیمان و چاکەو تاعەت و ڕازانەوە بە ڕەوشتە بەرزەکاندا، هەروەها بژارکران لە سیفەتە نزم و خراپەکاندا، پشکدار دەبن.

## برگەی شەشەم: حەوت دەقی سوننەت لە بارەی جندەوە، کە تیشکی زیاتریان دەخەنە سەر:

١- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: مَا قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْجِنِّ وَمَا رَآهُمْ، انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ! قَالُوا: مَا ذَاكَ إِلَّا من شي حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا مَا هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ؟ فَانْطَلَقُوا يَضْرِبُونَ مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَمَرَّ النَّفَرُ الَّذِينَ أَخَذُوا نَحْوَ تِهَامَةَ (وَهُوَ بِنَخْلَةَ) عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَهُوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلَاةَ الفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا القُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ وَقَالُوا: هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَرَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنا قُرْآناً عَجَباً. يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنا أَحَداً، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عز وجل عَلَى نَبِيِّهِ مُحَمَّدٍ ﷺ: ﴿قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ ١﴾} (أخرجه البخاري: ٧٧٣،٤٢٢١، ومسلم ٤٤٩، والترمذي: ٣٣٢٣، وابن حبان: ٦٨٢٨، والحاكم: ٣٨٥٧).

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بەسەر جندا نەخوێندۆتەوەو نەشیدووتن، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا چوون بۆ بازاڕی عوکاز، لە حاڵێکدا پەردە خرابووە نێوان شەیتانەکان و هەواڵی ئاسمان و، بڵێسەیان بەسەردا نێردرابوون، شەیتانەکان چوونە لای خەڵکەکەی خۆیان گوتیان: بۆچی هاتوونەوە؟ گوتیان: ڕێی هەواڵی ئاسمانمان لێ گیراوەو، بڵێسەمان بەسەردا نێردراون، گوتیان: ئەوە تەنیا بەهۆی شتێکەوەیە کە ڕوویداوە، بڕۆن بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواییەکانی زەویداو سەرنج

بـدەن، بزانـن داخـۆ چ شـتێك وایكـردوە ئێمـە ڕێـی بیسـتنی هەواڵـی ئاسـمانمان لێگیـراوە؟ ڕۆیشـتن بـە ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئاواییەكانـی زەویـدا گـەڕان، ئـەو كۆمەڵـەی بـەرەو تیهامـە چـوون، لـە كاتێكـدا پێغەمبـەر ﷺ لـە شـوێنێك بـوو بـە نـاوی نەخلـە بـەرەو بـازاڕی عـوكاز چـوون، لـە كاتێكـدا ئـەو نوێـژی بەیانـی بـە هاوەڵانـی دەكـرد، كاتێـك گوێیـان لـە قورئـان بـوو، گوێیـان بـۆ هەڵخسـت و گوتیـان: ئـا ئەوەیـە بۆتـە هـۆی ئـەوەی ڕێـی گوێبیسـتبوونی هەواڵـی ئاسـمانمان لـێ بگیـرێ، ئیـدی گەڕانـەوە بـۆ لای خەڵكەكەیـان و گوتیـان: ئـەی خەڵكەكەمـان! ئێمـە گوێـمان لـە قورئانێكـی سەرسـوڕهێنەر بـوو، بـەرەو ڕاسـتە ڕێ ڕێنمایـی دەكات، بڕوامـان پێهێنـاو، هیـچ شـتێك ناكەینـە هاوبەشـی پەروەردگارمـان، ئیـدی خـوا ﷻ ئـەوەی دابەزانـدە سـەر پێغەمبەرەكـەی خـۆی: ﴿ قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ١ ﴾.

**٢- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: كَانَ الجِنُّ يَصْعَدُونَ إِلَى السَّمَاءِ يَسْتَمِعُونَ إِلَى الوَحْيِ، فَإِذَا سَمِعُوا الكَلِمَةَ زَادُوا فِيهَا تِسْعاً، فَأَمَّا الْكَلِمَةُ فَتَكُونُ حَقًّا، وَأَمَّا مَا زَادُوا فِيهَا، فَيَكُونُ بَاطِلًا. فَلَمَّا بُعِثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنِعُوا مَقَاعِدَهُمْ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِإِبْلِيسَ، وَلَمْ تَكُنِ النُّجُومُ يُرْمَى بِهَا قَبْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُمْ إِبْلِيسُ: مَا هَذَا الْأَمْرُ إِلَّا مِنْ أَمْرٍ قَدْ حَدَثَ فِي الأرض، فَبَعَثَ جُنُودَهُ، فَوَجَدُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَائِمًا يُصَلِّي بَيْنَ جَبَلَيْنِ، (أَرَاهُ قال بمكة)، فأتوه فأخبروه، فقال: هذا الحدث الَّذِي حَدَثَ فِي الْأَرْضِ} (أخرجه الترمذي: ٣٣٢٤، قَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، والنسائي في الكبرى: ١١٦٢٦، أحمد: ج١ ص٢٧٤، والطبراني في التفسير: م١٢ ص٤٦).**

واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەڵـێ: جنـد پێشـتر بـۆ ئاسـمان بـەرز دەبوونـەوەو گوێیـان لـە وەحیـی دەگـرت، (گوێیـان لـە قسـەی فریشـتان دەگـرت)، كاتێـك وشـەیەكیان دەبیسـت، نـۆ وشـەی دیكەیـان تێكـەڵ دەكـردن (هـی درۆ)، ئـەو وشـەیەی بیسـتوویانە هـەق بـوو، بـەڵام ئـەو نۆیـەی دیكـەی لێیـان زیـاد دەكـرد، ناهـەق بـوون، بـەڵام كاتێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ نێـردرا، ڕێـی ئـەو شـوێنانەیان لـێ گیـرا كـە گوێیـان لـێ دەگـرت، ئەوەیـان بـۆ ئیبلیـس بـاس كـرد، كـە پێشـتر

ئـەو بڵێسـانەیان بـۆ نەدەنێـردران، ئیبلیـس پێـی گوتـن: ئـەوەی ڕوویـداوە بەهـۆی ئەوەوەیـە ڕووداوێـك لـە سـەر زەوی ڕوویـداوە، ئیـدی سـەربازەكانی نـاردن، پێغەمبـەری خوایـان بینـی لـە نێـوان دوو چیایانـدا، (پێـم وایـە گوتیـان: مەككـە)، نوێـژی دەكـرد، شـەیتانەكان گەڕانـەوە لای ئیبلیـس و هەواڵیـان پێـدا، گوتـی: ئـا ئەوەیـە كـە لەسـەر زەوی ڕوویـداوەو، ئێمـە ڕێـی هەواڵـی ئاسـمانمان لـێ گیـراوە.

**٣- {رَوَى عَامِرٌ الشَّعْبِيّ قَالَ: سَأَلْتُ عَلْقَمَةَ هَلْ كَانَ ابْنُ مَسْعُودٍ شَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ الْجِنِّ؟ فَقَالَ عَلْقَمَةُ: أَنَا سَأَلْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ فَقُلْتُ: هَلْ شَهِدَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ الْجِنِّ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنَّا كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَفَقَدْنَاهُ، فَالْتَمَسْنَاهُ فِي الْأَوْدِيَةِ وَالشِّعَابِ، فَقُلْنَا اسْتُطِيرَ أَوِ اغْتِيلَ، قَالَ: فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ، فَلَمَّا أَصْبَحَ إذا هُوَ يجئ مِنْ قِبَلِ حِرَاءَ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَقَدْنَاكَ وَطَلَبْنَاكَ فَلَمْ نَجِدْكَ، فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ، فَقَالَ: أَتَانِي دَاعِي الجِنِّ، فذهبت معه فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمُ القُرْآنَ، فَانْطَلَقَ بِنَا فَأَرَانَا آثَارَهُمْ وَآثَارَ نِيرَانِهِمْ، وَسَأَلُوهُ الزَّادَ وَكَانُوا مِنْ جِنِّ الْجَزِيرَةِ، فَقَالَ: لَكُمْ كُلُّ عَظْمٍ ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ يَقَعُ فِي أَيْدِيكُمْ أَوْفَرَ مَا يَكُونُ لَحمًا، وَكُلُّ بَعْرَةٍ عَلَفٌ لِدَوَابِّكُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَلَا تَسْتَنْجُوا بِهِمَا، فَإِنَّهُمَا طَعَامُ إِخْوَانِكُمُ الْجِنِّ} (أخرجه مسلم: ٤٥٠، والترمذي: ٣٢٥٨، وإبن حِبان: ١٤٣٢، وابن خزيمة: ٨٢، والبيهقي: ج١ ص١١ عن ابن مسعود).**

واتـە: عامیـری شـەعبیی دەڵـێ: لـە عەلقەمـەم پرسـی [كـە یەكێكـە لـە زانایانـی شـوێنكەوتووان (التابعـين)] ئایـا عەبدوڵـڵای كـوڕی مەسـعوود لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە شـەوی جنـددا (كـە قسـەی بـۆ جنـد كـردوەو قوڕئانـی بـۆ خوێنـدوون)، ئامـادە بـووە؟ عەلقەمـە گوتـی: مـن بـۆ خـۆم لـە عەبدوڵـڵای كـوڕی مەسـعوودم پرسـی گوتـم: ئایـا هیـچ كام لـە ئێـوە لەشـەوی جنـددا (لەدیـداری جنـددا) لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ [قسـەی بـۆ جنـد كـردوە] ئامـادە بـوون؟ گوتـی: نەخێـر، بـەڵام ئێمـە شـەوێك لـە خزمـەت پێغەمبـەردا بوویـن، دوایـی لێمان ون بـوو، ئێمـەش لـە دۆڵ و شـیوەكاندا بـۆی گەڕایـن وەدەسـتمان نەكـەوت، گوتمـان یـان ڕفێـنراوە

یـان کـوژراوە، بۆیـە ئـەو شـەوە زۆر حاڵێکـی ناخۆشـمان هەبـوو، وەک کۆمەڵێـك ناخۆشـترین حاڵیـان بـێ، ئـاوا ڕۆژمـان کـردەوە، کاتێـك بەیانـی بـۆوە، پێغەمبەرمـان ﷺ لـە لای ئەشـکەوتی حیـڕاوە دی، دێتـەوە، گوتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! تۆمـان لـێ ون بـوو، زۆرت بـە دوادا گەڕایـن، تۆمـان چنـگ نەکـەوت، ئێمـە خراپتریـن شـەو کـە بەسـەر کۆمەڵێکـدا هـات، بەسـەرمان دا هـات، [پێغەمبەریـش ﷺ] فەرمـووی: بانگـەوازکاری جنـد هـات بـۆ لام و لەگەڵـی ڕۆیشـتم قورئانـم بـۆ خوێنـدن، دوایـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەگـەڵ خۆیـدا بردیـن، شـوێنەوارەکانیان و شـوێنەواری ئاگرەکانـی پیشـاندایـن.

ئنجـا داوای خواردنیـان لێکـردوە، ئەوانـە لـە جنـدی جەزیـرە بـوون، (ئـەو جەزیـرەی ئێسـتا شـارێك هەیـە، لـە کوردسـتانی تورکیـا پێـی دەگوتـرێ: جەزیـرە، هەر بـەو ناوەیـە)، پێغەمبـەر ﷺ پێـی فەرمـوون: خواردنـی ئێـوە هـەر ئێسـقانێك کـە نـاوی خـوای لەسـەر هاتبـێ، کـە دەکەوێتـە دەسـتتان بـۆ ئێـوە پـڕ بـێ لـە گۆشـت و لێـی بەهرەمەنـد بـن، هـەر تەپاڵەکیـش ئاڵـف بـێ بـۆ ئاژەڵەکانتـان، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: نـە بـە ئێسـقان و نـە بـە شـیاکەو تەپاڵـە تـارەت مەگـرن، چونکـە خواردنـی بـرا جندەکانتانـن.

ئەمە دەقەکەیەو لەو بارەوەش لە بڕگەی کۆتایی دا هەندێ قسە دەکەم.

**٤- {رُوِيَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قال: «أُمِرْتُ أَنْ أَتْلُوَ الْقُرْآنَ عَلَى ال جِنِّ فَمَنْ يَذْهَبُ مَعِي؟» فَسَكَتُوا، ثُمَّ قَالَ الثَّانِيَةَ، ثُمَّ قَالَ الثَّالِثَةَ، ثُمَّ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَا أَذْهَبُ مَعَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَانْطَلَقَ حَتَّى جَاءَ الحَجُونَ عِنْدَ شِعْبِ أَبِي دُبٍّ، فَخَطَّ عَلَيَّ خَطًّا فَقَالَ: «لَا تُجَاوِزْهُ» ثُمَّ مَضَى إِلَى الحَجُونَ فَانْحَدَرَ عَلَيْهِ أَمْثَالُ الحَجَلِ يَحْدُرُونَ الحِجَارَةَ بِأَقْدَامِهِمْ، يَمْشُونَ يَقْرَعُونَ فِي دُفُوفِهِمْ كَمَا تَقْرَعُ النِّسْوَةُ فِي دُفُوفِهَا، حَتَّى غَشَوْهُ فَلَا أَرَاهُ، فَقُمْتُ فَأَوْمَى إِلَيَّ بِيَدِهِ أَنِ اجْلِسْ، فَتَلَا الْقُرْآنَ فَلَمْ يَزَلْ صَوْتُهُ يَرْتَفِعُ، وَلَصِقُوا بِالْأَرْضِ حَتَّى مَا أَرَاهُمْ، فَلَمَّا انْفَتَلَ إِلَيَّ قَالَ: «أَرَدْتَ أَنْ تَأْتِيَنِي»؟ قُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: مَا كَانَ ذَلِكَ لَكَ، هَؤُلَاءِ الْجِنُّ**

أَتَوْا يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ، فَسَأَلُونِي الزَّادَ فَزَوَّدْتُهُمُ الْعَظْمَ وَالْبَعْرَ، فَلَا يَسْتَطِيبَنَّ أَحَدُكُمْ بِعَظْمٍ وَلَا بعر، قَالَ عِكْرِمَةُ: وَكَانُوا اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفًا مِنْ جَزِيرَةِ الْمَوْصِلِ}[1].

واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی مەسـعوود (خـوا لێـی ڕازی بـێ) لێـی گێڕدراوەتـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: فەرمانـم پێکـراوە قوڕئـان بەسـەر جنـدا بخوێنمـەوە، کـێ لەگەڵمـدا دێ؟ ئەوانـەی لـە خزمەتیـدا بـوون بێدەنـگ بـوون، بـۆ جـاری دووەم وای فەرمـوو، هـەر بـێ دەنـگ بـوون، بـۆ جـاری سـێیەم وای فەرمـوو، ئنجـا عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود گوتـی: مـن لەگەڵتـدا دێـم ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! ڕۆیشـت هەتـا گەیشـتە حەجـوون (نـاوی شـوێنێکە)، لـە لای شـیوی (أبي دبّ)، (ئەویـش هـەر نـاوی شـوێنێکە)، هێڵێـك یـان بازنەیەکـی بـە دەوردا کێشـام فەرمووی: ئـەو بازنەیـە لێـی مەچـۆ دەرێ، دوایـی چـوو بـۆ لای حەجوون، جنـد لێـی کۆبوونەوە، وەك چـۆن کـەو بـە ڕەوە دەچـن بـەو شـێوەیە بـەرەو ڕووی چـوون، بـەرد لـە ژێـر پێیانـدا دەخزیـن، ڕۆیشـتن دەفیـان لێـدەداو وەك چـۆن ئافرەتـان دەف لـێ دەدەن (لـە بۆنـەی بـووك گواسـتنەوەو ئەوانـەدا)، هەتـا هێنـدە لێـی کۆبوونـەوە دایانپۆشـی، (واتـە: پێغەمبـەرم لـێ دیارنەمـا)، هەڵسـام، ئامـاژەی بـۆ کـردم، دانیشـە، مەیـە، (هەڵسـاوە کـە بچـێ)، دوایـی قوڕئانـی بەسـەردا خوێنـدن، قوڕئانـی بـۆ خوێندنـەوە، بـەردەوام دەنگـی پێغەمبـەر ﷺ بـەرز دەبـۆوە، ئەوانیـش بـە زەوییـەوە نووسـان، (واتـە: دانیشـتن)، هەتـا وای لێهـات کـە پێشـێ پێغەمبـەرم نەدەبینـی، ئەوەنـدە کەڵەکەیـان لەسـەر کـرد بـوو، ئنجـا ئەوانـم نەبینـی وا بـە زەوییـەوە نووسـان، کاتێـك گەڕایـەوە بـۆ لام فەرمـووی: دەتویسـت بێـی بـۆ لام؟ گوتـم: بەڵـێ، ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! فەرمـووی: ئـەوەت بـۆ نەبـوو، ئەوانـە جنـد بـوون هاتبـوون گـوێ لـە قوڕئان بگـرن، دوایـی ڕۆیشـتنەوەو گەڕانـەوە لای کۆمەڵەکەیـان کـە ئاگاداریـان بکەنـەوە.

لـە بـارەی خۆراکـەوە لێیـان پرسـیم، منیـش گوتـم: هـەر ئێسـقانێك و هـەر شـیاکەیەك بـا خۆراکـی ئێـوە بـێ، بۆیـە هیـچ کام لـە ئێـوە بـا تـارەت نەگـرێ و خـۆی

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ٦١١٨.

پاك نەكاتەوە، نە بە ئێسقان، نە شیاكەو تەپاڵە، عیكریمە گوتوویەتی: دوازدە هەزار كەس بوون لە جەزیرەی موسڵەوە هاتبوون.

ئەمەش پەیوەستە بە ئایەتەكانی سوورەتی (**الأحقاف**)ەوە، كە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾﴾ **الأحقاف**، تا كۆتایی ئایەتەكان كە پێشتر تەفسیرمان كردوون.

جێی سەرنجە كە لێرەدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: داوای خۆراكیان لێكردم، گوتم: هەر ئێسقانێك و هەر شیاكەو تەپاڵەیەك خۆراكتان بێ، بەڵام لە فەرمایشتەكەی پێشێدا كە (**مسلم**) بە ژمارە (٤٥٠) هێنابووی، لەوێدا هاتوە هەر ئێسقانێك خۆراك بێ بۆ خۆتان و، هەر تەپاڵەو شیاكەیەك ئالف بێ بۆ ئاژەڵەكانتان! واتە: لێرەدا هەردووكیانی بە خۆراكی خۆیان داناوە! دواتر قسە لەو بارەوە دەكەم.

**٥- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، قَالَ: انْطَلَقَ بِي عَلَيْهِ السَّلَامُ حَتَّى إِذَا جِئْنَا الْمَسْجِدَ الَّذِي عِنْدَ حَائِطِ عَوْفٍ خَطَّ لِي خَطًّا، فَأَتَاهُ نَفَرٌ مِنْهُمْ، فَقَالَ: أَصْحَابُنَا، كَأَنَّهُمْ رِجَالُ الزُّطِّ، وَكَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَكَاكِيُّ، فَقَالُوا: مَا أَنْتَ؟ قَالَ: «أَنَا نَبِيُّ اللَّهِ» قَالُوا: فَمَنْ يَشْهَدُ لَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: «هَذِهِ الشَّجَرَةُ» فَقَالَ: «يَا شَجَرَةُ» فَجَاءَتْ تَجُرُّ عُرُوقَهَا، لَهَا قَعَاقِعُ حَتَّى انْتَصَبَتْ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: [عَلَى مَاذَا تَشْهَدِينَ [قَالَتْ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ. فَرَجَعَتْ كَمَا جَاءَتْ تَجُرُّ بِعُرُوقِهَا الْحِجَارَةَ، لَهَا قَعَاقِعُ حَتَّى عَادَتْ كَمَا كَانَتْ} (ذكره الهيثمي في المجمع: ج٨ ص٢٩٣، وقال: رواه الطبراني ورجال رجال الصحيح، ورواه أبو يعلى أيضاً والبزّار).**

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خۆیدا بردم، هەتا چووینە لای ئەو مزگەوتە لە لای دیواری عەوف (یاخود لای باخی عەوف، شوێنێك بووە لە مەدینە ئەو ڕووداوە)، پێغەمبەر ﷺ هێڵێكی بۆ كێشام، بازنەیەك، كۆمەڵێك لەوان هاتن، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەوە

هاوەڵەکانمانــن، وەك پیاوانــی (زُطّ) بــوون (کــە جــۆرێ خەڵکــن لــە ســوودان و هیندییــەکان، ڕەشپێســتن)، ڕوویــان دەتگــوت ئێســکی مــژراوە[1]، (یانــی: دەم و چاویــان باریــك بــووە)، بــە پێغەمبەریــان گــوت: تــۆ چــی؟ ئەویــش فەرمــووی: مــن پێغەمبــەری خــوام، گوتیــان: کــێ شــایەدییت بــۆ دەدات لەســەر ئــەوە؟ فەرمــووی: ئــەم درەختــە، درەختێکــی لێبــوو، پێغەمبــەر ﷺ فەرمــووی: ئــەی درەختەکــە وەرە، درەختەکــە هــات بــە ڕەگ و پووکــەوە هــات، تەقــە تەقــی لــێ دەهــات، هەتــا لەبەردەمــی پێغەمبــەردا ﷺ وەســتا، فەرمــووی: لەســەر چــی شــایەدیی دەدەی؟ گوتــی: شــایەدیی دەدەم کــە تــۆ پێغەمبــەری خــوای، ئنجــا گەڕایــەوە وەك چــۆن پێشــێ هاتبــوو گەڕایــەوە، ڕەگ و ڕیشــەکەی بــەردی لەگــەڵ خــۆی ڕادەکێشــان، هەتــا وەك پێشــێی لێهاتــەوە.

٦- {**فِي الْمُوَطَّأ: أَنَّ رَجُلًا حَدِيثَ عَهْدٍ بِعُرْسٍ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِأَنْصَافِ النَّهَارِ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهِ ... ، وَفِيهِ: فَإِذَا حَيَّةٌ عَظِيمَةٌ مُنْطَوِيَةٌ عَلَى الفِرَاشِ، فَأَهْوَى إِلَيْهَا بِالرُّمْحِ فَانْتَظَمَهَا. وَفِي الصَّحِيحِ أَنَّهُ عَلَيْهِ الصَّلاةُ والسَّلامُ قَالَ: «إِنَّ لِهَذِهِ الْبُيُوتِ عَوَامِرَ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَيْئًا فَحَرِّجُوا عَلَيْهَا ثَلَاثًا، فَإِنْ ذَهَبَ وَإِلَّا فَاقْتُلُوهُ فَإِنَّهُ كَافِرٌ». وَقَالَ: «اذْهَبُوا فَادْفِنُوا صَاحِبَكُمْ»**} **(أخرجه مالك في الموطأ: ٦٠٤، ومسلم: ٥٩٧٧، وأبو داود: ٥٢٥٧).**

کورتەکــەی ئەوەیــە کــە پیاوێــك تــازە ژنی هێنــاوە، لە جەنگــی خەنــدەق دا مۆڵەتی لــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ وەرگرتــوە، لــە کاتــی نیــوەڕۆدا، بچێتــەوە لای مــاڵ و خێزانــی، پێغەمبەریــش ﷺ ئیزنــی داوە، بــەڵام فەرموویەتــی لــە جوولەکــەکان ئــاگات لــە خــۆت بــێ، کــە دەچــێ خێزانــی لەبــەر دەرگا وەســتاوە، ئەویــش گومانــی خراپــی پــێ دەبــات و، ڕمەکــەی لــێ ڕاســت دەکاتــەوە پێــی دابــات، یــان ئەزیەتــی بــدات، ئافرەتەکــەش دەڵــێ: ئــارام بگــرە وەرە تەماشــا بکــە، بۆچــی لــە دەرێــم! کــە تەماشــا دەکات، مارێــکی زل پاپۆچکــەی کــردوە[2]، ئەویــش یەکســەر ڕمەکــەی لێــدەداو دەیکــوژێ،

---

(١) المُكاكُّ: المُخّ المصوص: ئێسکی مژراو، میسراو.

(٢) پاپۆچکەی کردوە: خۆی خڕکردۆتەوە سەریەك بە شێوەی چەند بازنەیی.

ئـەو گەنجـەش کـە لـە پشـتیوانەکان بـووە، هـەر یەکسـەر وەفـات دەکات، ئافرەتەکـە دوایـی گێڕاویەتـەوەو گوتوویەتـی: نەمزانـی مارەکـە پێشـێ تۆپـی، یـان ئـەو پێشـێ وەفاتـی کـرد، هەردووکیـان دەمـرن، دوایـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: ئـەم ماڵانـە هەندێك ماریـان تێدان، ئەگـەر یەکێکتـان لـەو مارانـە لـە ماڵەکانتانـدا بینـی، سـێ جـاران ئیزنـی بـدەن بـڕوا، ئەگـەر ڕۆیشـت، ئەگەرنـا بیکـوژن ئـەوە بێبڕوایـە.

{(عَوَامِرَ) واتـە: جندەکانـی چوونـە سـەر شـێوەی مـار، ئنجـا ئەگەر ڕۆیشـت باشـە، ئەگـەر نەڕۆیشـت بیکـوژن و خوێنـی حەڵاڵـە، دوای ئـەوەی سـێ جـاران دەنگتـان دا زیانتـان پـێ ناگەیەنـێ، بـەڵام بەبـێ دەنگـدان دەسـتی لـێ بوەشـێنی، دیـارە زیـان دەدا}، دوایـی پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: بـڕۆن هاوەڵەکەتـان بـە خـاك بسـپێرن.

٧- {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ جَالِسٌ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ إِذْ رُمِيَ بِنَجْمٍ، فَقَالَ: مَا كُنْتُمْ تَقُولُونَ فِي مِثْلِ هَذَا فِي الجَاهِلِيَّةِ؟ قَالُوا: كُنَّا نَقُولُ يَمُوتُ عَظِيمٌ أَوْ يُولَدُ عَظِيمٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: [إِنَّهَا لَا تُرْمَى لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّ رَبَّنَا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى إِذَا قَضَى أَمْرًا فِي السَّمَاءِ، سَبَّحَ حَمَلَةُ الْعَرْشِ ثُمَّ سَبَّحَ أَهْلُ كُلِّ سَمَاءٍ، حَتَّى يَنْتَهِيَ التَّسْبِيحُ إِلَى هَذِهِ السَّمَاءِ، وَيَسْتَخْبِرُ أَهْلُ السَّمَاءِ حَمَلَةَ الْعَرْشِ: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ فَيُخْبِرُونَهُمْ، وَيُخْبِرُ أَهْلُ كُلِّ سَمَاءٍ حَتَّى يَنْتَهِيَ الْخَبَرُ إِلَى هَذِهِ، فَتَتَخَطَّفُ الْجِنُّ، فَيُرْمَوْنَ، فَمَا جَاءُوا بِهِ فَهُوَ حَقٌّ، وَلَكِنَّهُمْ يَزِيدُونَ فِيهِ**}[1].

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﭭ، دەڵـێ: لـە کاتێکـدا پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ کۆمەڵێـك لـە هاوەڵانـی دانیشـتبوو (دیـارە شـەو بـووە)، {بریسـکەیەك لـە ئاسـمانەوە هـات}، ئەسـتێرەیەك هاویشـترا، (پێغەمبـەر ﷺ) فەرمـووی: لـە سـەردەمی نەفامییـدا چیتـان بەمـە دەگـوت (ئەگـەر بڵێسـەیەك لـە ئاسـمان دەردەکـەوت لـە شـەودا)؟ گوتیـان: دەمانگـوت: یـان پیاوێکـی مـەزن دەمـرێ، یاخـود کەسـێکی مـەزن لـە دایك دەبـێ، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ئـەو بڵێسـانە نـە بـۆ مردنـی کـەس و نـە بـۆ ژیانـی

---

(١) الجامع لأحكام القرآن ٦١٢٤.

کەس ناهاویشترێن، بەڵام پەروەردگارمان کاتێك فەرمانێك دەر دەکات، هەڵگرانی عەرش خوا بە پاك دەگرن، دوایی دانیشتووانی هەر ئاسمانێك خوا بە پاك دەگرن، هەتا ئەو خوا بە پاکگرتنە دێتە ئەم ئاسمانە، واتە: ئاسمانی نزیك لە زەوی، {ئاسمانی یەکەم بە نسبەت ئێمەوە}، ئنجا هاوەڵانی، یاخود دانیشتووانی ئاسمان لە هەڵگرانی عەرش دەپرسن: پەروەردگارمان چی فەرمووە؟ ئەوانیش هەواڵیان پێدەدەن، {واتە: دانیشتووانی ئاسمان حەوتەم --- ئەگەر ئاسمانی دنیا یەکەم بێ - لە هەڵگرانی عەرش دەپرسن}، دوایی ئەوانیش هەواڵ دەدەنە ئاسمانی دواتر، ئیدی ئەو هەواڵە ئاسمان بە ئاسمان دێ تاکو ئەم ئاسمانە {یانی: ئاسمانی یەکەم ئاسمانی نزیکتر}، ئنجا جند دەیانەوێ {ئەو هەواڵەی فریشتەکان ئاسمان بە ئاسمان هێناویانە، هەتا هاتۆتە ئاسمانی دنیا}، ئەو هەواڵە بدزن، ئەوانیش تیرباران دەکرێن، ئنجا ئەو هەواڵە ئەگەر بتوانن بیگەیەننە سەر زەوی ڕاستە، بەڵام لێی زیاد دەکەن.

ئێمە لەو بارەوە چەند فەرموودەیەکمان هێناون، هەم لە تەفسیری سوورەتی (**الحجر**)دا، هەم لە تەفسیری سوورەتی (**الشعراء**)دا، کە دەفەرموێ: هەواڵێکی ڕاست دێنن، دوایی نەودوو نۆ درۆی لەگەڵدا تێکەڵ دەکەن، خەڵك بەهۆی ڕاستەکەوە بڕوا بە نەوەدو نۆ درۆیەکەشیان دەکات.

ئەمە ئەو حەوت دەقە بوون کە بە باشم زانی بیانهێنم، هەرچەندە لە ڕووی سەنەدیشەوە هەموویان لە یەك ئاستدا نین، ڕەنگە هەندێکیان لە بارەی سەنەدەکەیانەوە مشت و مڕ لە نێوان زانایاندا هەبێ، بەڵام بە باشم زانی ئەو حەوت دەقە بێنم بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕۆشنتر بێ.

## بڕگەی حەوتەم: شەیتانەكان و گوێگرتنیان لە قسەی فریشتان:

پێشتریش ئاماژەم پێدا، كە لە تەفسیری سوورەتی (**الحجر**)دا باسێكی تا ڕاددەیەك تێرو تەسەلم لەو بارەوە كردوە: (كورتە باسێك دەربارەی گوێگرتنی شەیتانەكان لە هەواڵی ئاسمان و، بەردباران كردنیان بە بڵێسەی ئەستێران).

گوتوومە: ئەو بابەتە بەلای كەمەوە لە حەوت سوورەت لە سوورەتە موبارەكەكانی قورئاندا هاتوە، كە دوایی لە سوورەتی (**الشعراء**)یشدا باسم كردۆتەوە، هەروەها لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**الصافات**)یشدا چەند شتێكم لەو بارەوە باسكردوە.

ئێستاش ئەوەی لێرەدا بەباشم زانی بیڵێم، ئەوەیە كە ڕاستەوخۆ لە بەرگی دوازدەیەمی تەفسیرەكەی خۆم، بیگوازمەوە، {تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز}، كە تەفسیری سوورەتەكانی: (**الرعد و إبراهیم و الحجر**)ی تێدان [1]، ئەنجامگیرییەك، كە لە لێكۆڵینەوەكەم لەو بارەوە كردوومە، لە یازدە خاڵدا هێناومەو لێرەش دا ئەو یازدە خاڵە دەخەمەڕوو:

١- ئەوەی بە چرایان {(**مصابیح**) كۆی (**مصباح**)ە، كە مەبەست ئەستێرەكانە}، ڕازێنراوەتەوەو شەیتانەكانیش دەرفەتی گوێ تێدا هەڵخستنییان هەیە، ئاسمانی یەكەمە، وەك لە فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ یش دا هاتوەو، لە سوورەتی (**الصافات**) ئایەتی (٦): ﴿ إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ ﴾و، سوورەتی (الملك) ئایەتی (٥): ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ ﴿٥﴾ ﴾و، سوورەتی (**فصلت**) ئایەتی (١٢): ﴿ فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾دا، هاتوە، چونكە (**السَّماء الدنیا**): ئاسمانی نیزیكتر، چونكە (**الدُّنْيَا**) (**مؤنث**)ی (**أدْنَى**)یە، واتە: نزیكتر، یانی: ئەو ئاسمانەی لێتانەوە نیزیكترە، ئنجا ئەو ئاسمانەی لە ئێمەوە نیزیكترە،

---

(١) بڕوانە: لاپەڕە: ٥٦٩ - ٥٧٣، چاپی یەكەم.

ئاسمانی یەکەمەو لە سەرووی ئەوەوە ئاسمانەکانی: دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم، هەن، تاکو دەگاتە سەرێ، درەختی کۆتایی (**سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى**) و، دەگاتە عەڕشی خوای پەروەردگار.

٢- مەبەست لە پاراستنی ئاسمان، ئاسمانی یەکەم، پاراستنیەتی لەوەی شەیتانەکان گوێی تێدا هەڵبخەن لە قسەی فریشتان، بە بەڵگەی ئەوەی خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ ﴾**الصّافات**، واتە: ناتوانن گوێ بگرن بۆ کۆمەڵی سەرێ (فریشتەکان)و، لە هەموو لایەکەوە تیرباران دەکرێن.

٣- لە نێوان فەرمایشتی خوادا کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ ﴾**الصّافات** و، ئایەتی ژمارە (١٨) لە سووڕەتی (**الحجر**)دا: ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ ﴿١٨﴾ ﴾، مەگەر کەسێك گوێ هەڵبخاو قسەیەك بە پەنهانیی وەربگرێ، لە نێوان ئەو دووەدا کە هی یەکەمیان دەفەرموێ: گوێ بۆ کۆڕی باڵا ناگرن و لە هەموو لایەکەوە تیر باران دەکرێن، ئەوی دیکەش کە دەڵێ: مەگەر کەسێك قسەیەك بدزێ، لە نێوان ئەو دووانەدا هیچ تێکگیرانێك نیە، چونکە ئەوەی پێشێ دەفەرموێ: گوێ ناگرن، واتە: بە کەیفی خۆیان و بە شێوەیەکی ئاسایی و بە ئاسانیی گوێ ناگرن، ئەوی دیکەش دەڵێ: گوێ هەڵدەخەن و بە پەنهانیی وشەیەك دەدزن، مانای وایە حاڵەتێکی نائاساییە.

٤- پاش هاتنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ئەو ڕێ لێگرتنەی شەیتانەکان قورستر بوو، بە بەڵگەی ئایەتی ژمارە (٩) لە سووڕەتی (**الجن**): ﴿ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ ﴾، جندەکان دەڵێن: ئێمە پێشتر لە ئاسمان دادەنیشتین گوێمان هەڵدەخست، بەڵام ئێستا هەر کەس گوێ هەڵبخات، بڵێسەیەکی ئاگر بۆی لە بۆسە دایە، ئنجا مەرج نیە، تەنیا بە هاتنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ئەو ڕێیە بەسترابێ، بەڵکو دەگونجێ بە نسبەت هەموو پێغەمبەرانەوە هەر وابووبێ، بەڵام لە نێوان هاتنی پێغەمبەر عیسادا تاکو هاتنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد، لەو ماوەیەدا کە شەشسەد ساڵێك بووە، ئەو ڕێیە کراوەتەوە، چونکە وەحیی بۆ پێغەمبەران نەهاتوە تاکو ڕێیەکە ببەسترێ، بۆیە ئەو پاسەوانییکردن و ئێشکگرتنەی

فریشتەکان و هاویشتنی بڵێسە ئاگرەکان لە ئاسمان، کە شەیتانەکان نەچن گوێ نەگرن، ئەو پارێزگارییکردنە بەو شێوەیە نەماوە، چونکە کە وەحیی نەیەت مەترسیی ئەوە نیە شەیتانەکان بیدزن و بیگەیەنن بە کاهین و جادووگەرەکان.

هەرچەندە دەشگونجێ تایبەت بووبێ بە پێغەمبەر موحەممەدەوە ﷺ، بەڵام من وای تێدەگەم بۆ هەموو پێغەمبەران هەر وابووە، بەڵام ئەوەی لە ماوەی ئەو (٦١٠) ساڵەدا، کە کەوتۆتە نێوان لە دایك بوونی عیسا عليه السلام و نێررانی موحەممەدەوە ﷺ، کە عیسا عليه السلام ئەگەر لە ساڵی یەکی زایینی لە دایك بووبێ، موحەممەد ﷺ لە ساڵی (٥٧١) لە دایك بووەو لە (٦١٠) زایینیدا وەحیی بۆ هاتوە، ئنجا لە ماوەی لە دایك بوونی عیسا عليه السلام تاکو وەحیی بۆ هاتنی موحەممەد ﷺ، کە (٦١٠) ساڵە، لەو ماوەیەدا ئەو ڕێیە تارادەیەك ئاسایی کراوەتەوەو، جندەکان وایان زانیوە هەر وابووە، چونکە ماوەیەکی زۆر بووەو چەند سەدەی پێچوون.

هەڵبەتە ئەمە بۆچوونی خۆمەو لە هیچ کتێبێك دا نەمبینیوە، بەڵام وای تێدەگەم و، دەشگونجێ لە تەفسیرو کتێبی دیکەدا باسکرابێ و نەمبینیبێ.

٥- بە پێی مانای زانراو و ڕواڵەتیی ئایەتەکان، مەبەست لە بڵێسەباران، یان تیرباران کردن کە چەند وشەیەك لەو بارەوە هاتوون: (١- **قَذْف**، ٢-**رُجُوم**، ٣-**شُواظٌ مِن نَار وَنُحَاس**، ٤-**شِهَاباً رَصَداً**، ٥-**شِهابٌ ثَاقِب**)، ئەو پێنج وشەیە هاتوون، مەبەست لەو حاڵەتەی ئەو وشانەی بۆ بەکارهاتوون، هاویشترانی پارچە وردە جیابووەوەکانە لە ئەستێرەو خڕۆکەکان، دوای ئەوەی ئەو ئەستێرەو خڕۆکانە لە بەین دەچن، یاخود لە کاتی سووڕانیان دا پارچەیان لێ دەبنەوە، وەك پێشتریش لە ڕووی زانستییەوە باسمان کردوە، لە تەفسیری سووڕەتی (الحجر)دا.

٦- بە پێی فەرموودەی ژمارە (٤٩٢١) لە صەحیحی بوخاریی، ڕێی ئاسمان لە شەیتانەکان گیراوە، بەڵام تەنیا ڕێیان لێ تەنگ و زەحمەت کراوە، نەك یەکجاریی بەسترابێ، چونکە ئایەتەکان کە دەفەرموون:

أ- ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ ﴿١٨﴾ ﴾ **الحجر**.

ب- ﴿ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ ﴾ **الصّافات**، مانای وایە بواری ڕفاندنی وشەیەك و، گوێ هەڵخستنێکی بە پەنهانیی ماوە، بەڵام لەگەڵ مەترسیی فەوتانی ئەو شەیتانەدا کە دەیەوێ ئەو زانیارییە بدزێ.

٧- بە پێی فەرموودەی ژمارە: (٤٧٠١) لە صەحیحی بوخاریی، کە پێشتر دەقی فەرمایشتەکەم هێناوە، شەیتانەکان پێکەوە هاوکاریی دەکەن لە گەیاندنی ئەو هەواڵەدا کە لە فریشتانی دەدزن، چونکە (سوفیان کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی ئەو دەقە)، وای وێنا کردوە کە ئەویش گوێی لە هی پێش خۆی و، ئەویش لە هی پێش خۆی بووە، کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ وێنا کردوون و پەنجەکانی دەستی ڕاستی لەسەر یەك ڕاگرتوون و، فەرموویەتی ئەوەیان دەیگەیەنێ بەوە، ئەوە دەیگەیەنێ بەوە، ئەوە دەیگەیەنێ بە هی خوارێ بەو شێوەیە، مەبەست ئەوە بووە کە شەیتانەکان هاوکاریی یەکدی دەکەن و، مەرج نیە ئەوەی هەواڵەکە دەدزێ بمێنێ، ڕەنگە بەری بکەوێ، بەڵام بەر لەوەی بفەوتێ بە خوار خۆی دەگەیەنێ، ئەویش بەهی خوار خۆی، تاکو دەگاتە سەر زەوی.

٨- بە پێی فەرموودەی ژمارە: (٤٧٠١) لە صەحیحی بوخاریی، ئەوە جادووگەرەکانن کە شەیتانەکان ئەو جۆرە هەواڵانەیان بۆ دەبەن، جادووگەران و ئەوانەی لەگەڵ شەیتاندا سەروکاریان هەیە، ئنجا ئەگەر جادووگەریان پێ بگوترێ، یاخود فاڵچییان پێ بگوترێ، یان کاهینیان پێ بگوترێ، یان عەڕڕافیان پێ بگوترێ، هەتا دوایی، گرنگ ئەوەیە شەیتانەکان ئەو جۆرە هەواڵانە بۆ ئەو جۆرە کەسانە دەبەن.

٩- هەروەها بەپێی فەرموودەکانی ژمارە: (٤٧٠١ و ٦٢١٣) لە صەحیحی بوخارییدا، جادووگەرەکان درۆی زۆر دەخەنە گەڵ هەواڵە دزراوەکان و، زۆر پەنهانکارانە هەواڵەکە دەگەیەنن بە جادووگەرەکان، ئەوانەی سەروکاریان لەگەڵ شەیتان دا هەیە، واتە: ئەو شەیتانە هەواڵێکی ڕاست دەدزێ لە فریشتەکانی گوێ لێ دەبێ، بەڵام دوایی

درۆی زۆری دەخاتە گەڵ و دەیچکێنێتە[1] گوێی ئەو کاهین و جادووگەرانە، ئەویش بەهۆی هەواڵە ڕاستەکەوە، خەڵك متمانەی پێ دەکات و (٩٩) درۆکەشیان بەسەردا ساغ دەکاتەوە.

**١٠-** بە پێی ئایەتەکان و بەپێی فەرموودەکانیش، ئەو شەیتانانەی ئەو هەوڵانە دەدەن کە هەواڵی ئاسمان بدزن، بەردباران دەکرێن و دەسووتێنرێن و دەردەکرێن، چونکە خوا ئەو وشانەی بۆ بەکارهێناون:

أ- ﴿فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ۝١٠﴾ **الصّافات**، بڵێسەیەکی کونکەر، یاخود سووتێنەر شوێنی کەوت و پێی کەوت.

ب- ﴿فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ۝١٨﴾ **الحجر**، بڵێسەیەکی ڕوون شوێنی کەوت و وێی کەوت.

ج- ﴿وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ۝٨﴾ **الصّافات**، لە هەموو لایەکەوە تیرباران دەکرێن، کەواتە: بەپێی ئایەتەکان ئەوانە هیچیان سەلامەت نابن.

**١١-** ئەو هەواڵانەی شەیتانەکان دزیویانن و دەیاندزن، هیچ پەیوەندییان بە وەحییەوە نیە، بە بەڵگەی فەرمایشتی خوا: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ۝٢١٠ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ۝٢١١ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ۝٢١٢﴾ الشعراء، واتە: شەیتانەکان دایان نەبەزاندوە (واتە: قورئان)، بۆیان ناگونجێ وناشتوانن، ئەوانە لە گوێگرتن دەیچکێنێتە.

(لە وەحیی و پەیامی خوا) کەنارگیرکراون (دوورخراونەوە).

چونکە وەحیی خوا بە جیبریل دا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەران، هەر لە ئادەمەوە تاکو پێغەمبەری کۆتایی و خاتەم، بەڵام شەیتانەکان گوێ لە فەرمایشت و ڕێنمایی دیکەی خوا دەگرن، کە بۆ فریشتەکانی دەنێرێ، کە ئێستاش ئەوە هەر هەیە، چونکە خوا بەردەوام فەرمانکردن و ڕێنمایی کردنی هەیە بۆ

---

(١) دەیچکێنێتە: بە شێنەیی و وەستایی دەیخاتە نێو، وەك دڵۆپە ئاوێك یان قەترەیەك..

فریشتەکان، بۆیە شەیتانەکان ئێستاش ئەو هەوڵانە هەر دەدەن، بەڵام مەرج نیە تێیاندا سەرکەوتوو بن.

## بڕگەی هەشتەم: هەڵوەستەیەك لە بەرانبەر قسەی هەندێك لە زانایان لە بەرانبەر جندا:

بۆیە بە باشم زانی ئەو هەڵوەستەیە بکەین، چونکە تەفسیری: (**محاسن التأويل**)ی (**جمال الدين القاسمي**)[1]، هەندێ قسەی هێناون، کە دواییش (**د.محمد راتب النابلسي**)[2]، هەمان قسەی هێناون، ئنجا ئایا هەر لە (**جمال الدين قاسمي**)ەوە هێناونی، یان لە سەرچاوە ئەسڵییەکەی خۆیەوە: (**عبدالرزاق بن أحمد القاشاني**)، ئەو دوو ڕوونکەرەوەیەی قورئان خوا پاداشتیان بداتەوە، چەند قسەیەکیان لە (**عبدالرزاق بن أحمد القاشاني**)ەوە هێناوە، بەبێ ئەوەی هیچ تەعلیقیان لەسەر بدەن، کە ڕەنگە تەفسیری دیکەش هەبن، هەر لە قاشانییەوە ئەو عیبارەتەیان هێنابێ.

**(قَالَ القَاشَانِي: قَدْ مَرَّ أنَّ فِي الوُجُودِ نُفُوساً أرْضِيَّةً قَوِيَّةً، وَتَتَجَرَّدُ مُتَعَلِّقَةً بِأجْرَامٍ عُنْصُرِيَّةٍ لَطِيْفَةٍ، غَلَبَتْ عَلَيْهَا الهَوَائِيَّةُ أو النَّارِيةُ أو الدُّخَانِيَّةُ، عَلَى اخْتِلَافِ أَحْوَالِهَا، سَمَّاهَا بَعْضُ الحُكَمَاءِ، الصُّوَر المُعَلَّقَة، وَلَهَا عُلُومٌ وَإدْرَاكَاتٌ مِنْ جِنْس عُلُومِنَا وَإدْرَاكَاتِنَا).**

پێشتر قاشانی ئاماژە دەکات بە هەندێ قسەی خۆی و دوایی دەڵێ: پێشتر باسمان کرد کە لە بووندا هەندێك ڕووحی زەمینیی بەهێز هەن، ئنجا ئەو ڕووحانە خۆیان دادەڕنن و پەیوەست دەبن بە هەندێك توخمی لەتیف و پەنهانەوە، کە حاڵەتی هەواییان بەسەردا زاڵە، یان حاڵەتی ئاگریی، یان حاڵەتی دوو کەڵیی، بەپێی حاڵە جیاوازەکانیان، کە هەندێ لە حەکیمەکان ناویان لەوانە

---

(١) بەرگی (٩) جوزئی (٢٩)، لاپەڕە: ٢٠٢.

(٢) بەرگی (١٠)، لاپەڕە: ١٠٧.

ناوە: وێنە هەڵواسراوەکان، ئەوانە زانیارییان هەیەو پەی پێبردنیان هەیە، لە شێوەی زانیاریی و پەی پێبردنەکانی ئێمە.

هەڵوەستەکەی منیش ئەوەیە:

خوا ﷻ ناوی لە (جِنّ) ناوە (جینن)، ئنجا دەگونجێ ئێمە هەر ناوە عەرەبییەکەی خوا لێیناون بەکاری نەهێنین، بۆ وێنە: (جن) لە زمانی ئینگلیزییدا هەر (Jinn) جینن و، لە زمانی هیندیی دا ناوێکی دیکەو، لە زمانی فەڕەنسیی دا ناوێکی دیکە، ئەوە دەگونجێ، وەك چۆن لە زمانی کوردیی بە (جِنّ)، هەم (جند) دەگوترێ، هەم (جنۆکە) دەگوترێ، هەندێکیش (پەریی) دەڵێن، بەڵام ئەگەر بە قسەی فەیلەسووفان (حُکَماء) ئەوەی خوا فەرموویەتی تەفسیری بکەین و، لە خۆمانەوە شتێك کە لە قورئان و سوننەتدا نیە، بیخەینە سەر ئەو فەرمایشتانەی خوا، ئەوە شتێکی هەڵەیە، دەربارەی جند خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ ﴾الرّحمن، جندمان لە بڵێسەی ئاگر دروستکردوە، ئنجا یەکێك هەر لە خۆوە بڵێ: ئەوانە سێ جۆرن:

أ- هەندێکیان هەواییین، ب- هەندێکیان ئاگریین، ج- هەندێکیان دووکەڵیین، بە دڵنیایی ئەوە قسەیەکە (**ما أنزل الله بها من سلطان**)، خوا هیچ بەڵگەی لەسەر دانەبەزاندوە، لە بارەی نادیارو پەنهانیشەوە، ئێمە لە ڕێی بیستنەوە غەیب و پەنهان دەزانین و، لە ڕێی زانیارییەکەوە کە بە پێنج هەستەکان و بە عەقڵ و بە ئەزموون پەیدای دەکەین، ئێمە غەیب و پەنهان نازانین، دەبێ تەنیا لە ڕێی بیستنەوە، هەوڵی زانینی پەنهان (**غَیب**) بدەین و خوا چیمان پێ دەفەرموێ، وەحیی چیمان پێ دەفەرموێ، وەری بگرین و ئەوەندەی وەحیی فەرموویەتی، هەر ئەوەندە لەو بارەوە قسە بکەین، بۆیە بە باشم زانیی ئاماژەیەك بەو مەسەلەیە بکەم و لە ڕاستییدا ئەوە شتێکی هەڵەیە، هەر لە خۆمانەوە بڵێین: جند هەندێکیان لە دووکەڵن و، هەندێکیان هەواییین، هەندێکیان ئاگریین، لە کاتێکدا خوا بە ڕوون و ڕاشکاویی دەفەرموێ: جندمان لە ئاگر دروست کردوە.

## بڕگەی نۆیەم و كۆتایی: چەند وردە زانیارییەكی تایبەت لە بارەی جندەوە:

هەمـوو لایـەك لەسـەرمان پێویسـتە، بەپێـی توانـا ئـەو شـتانەی خـوا هەواڵـی پێـداون لێیـان بكۆڵینـەوە، منیـش بەڕاسـتیی زۆر لـە بـارەی جنـدەوە پشـكنین و لێكۆڵینـەوەم كـردوە، هەڵبەتـە لەبـەر ڕۆشـنایی ئایەتەكانـی قوڕئان و فەرمایشـتەكانی پێغەمبـەردا، بـەڵام هـەر لـە بازنـەی شـەریعەت دا دەگونجـێ هەنـدێ وردەكاریـی دیكـەی زیاتریـش بزانیـن.

ئنجا من لە سێ خاڵان دا، هەندێ وردە زانیاریی دیكە دەخەمەڕوو:

### خاڵی یەكەم: لە بواری بەرزبوونەوەیان بۆ ئاسمان دا:

١- چوونی جند بۆ ئاسمان:

بەپێـی ئـەوەی مـن لێـم كۆڵیوەتـەوە، نـەك ڕاسـتەوخۆ، بەڵكـو لـە ڕێـی خەڵكـی دیكـەوە، كـە جنـد چۆتـە نێـو جەسـتەیان و قسـەیان بۆ مـن كـردوە، یان بە شـێوەیەك لـە شـێوەكان پێـم گەیشـتوە، كـە ئـەوە تەنیـا كاتـی خـۆی بـووەو ئێسـتا نەمـاوە، جندەكانـی ئێسـتا وا دەڵێـن، كـە مەرجیـش نیـە زانیارییەكانیـان هەموویـان تـەواو بـن، دەڵێـن: ئێسـتا كەسـمان پـێ شـك نایـەت ئـەو هەوڵانـە بـدات، چونكـە هـەر كـەس ئـەو هەوڵانـەی داون لـە ڕابـردوودا، بـە سـاغی نەگەڕاوەتـەوەو هەموویـان فەوتـاون.

٢- ئایا ئەو بڵێسانەی پێیان تیرباران دەكرێن چین؟:

جندەكانیـش دەڵێـن: هـەر ئـەو پارچانـەن كـە لـە ئەسـتێرەو خڕۆكـەكان جیـا دەبنـەوە، بـەڵام دەڵێـن: دەگونجێ شـتی دیكـەش هەبێ كە فریشـتەكان شـەیتانەكانی پـێ تیربـاران بكـەن، واتـە: مـەرج نیـە بـەس ئـەو پارچـە ئەسـتێرەو خڕۆكانـە بـن، كـە خـوای پەنهانـزان بـە ڕاشـكاویی وا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۝٥ ﴾ الملـك، یـانی: هـەر ئـەو ئەسـتێرانەی كردوومانـن بـە

چرا بۆ ئاسمانی نیزیك لە ئێوە، كردووشمانن بە ئامرازێك بۆ تیرباران كردنی جندەكان، واتە: بە پلەی یەكەم هەر ئەو پارچانەن، بەڵام جندەكان دەڵێن: دەگونجێ هەندێ شتی دیكەش فریشتەكان جندەكانی پێ تیرباران بكەن.

٣- ئایا فریشتەكان چ ڕۆڵێكیان هەیە لەوەدا؟:

جندەكان دەڵێن: ئەوان ڕۆڵی سەرەكییان هەیە، بەڵام ئایا ئەوە چۆنە؟ چونكە ئەو پارچە ئەستێرانە، كە (**شهب**)یان پێ دەگوترێ، كە كۆی (**شِهاب**)ە، واتە: بڵێسەو، (**نَیْزك**) كە بە (**نیازِك**) كۆ دەكرێتەوە، كە ئەگەر تەواو نەسووتێ و هەندێكی لێ بمێنێ و بكەوێتە سەر زەوی، پێی دەگوترێ نەیزەك و، ئەگەر هەمووی بسووتێ، پێی دەگوترێ: (**شِهاب**)، ئەوانە بە دڵنیاییی كاتی خۆیشی هەر بوون، بەبێ ئەوەی لە شەیتانەكانیش بگیرێن، بەردەوام ئەو پارچانە دێن بەرەو بەرگە هەوای زەوی، كە بە مەزەندەی هەندێك لە زانایان دەڵێن: نزیكەی ملیۆنێك بەرد لە شەو و ڕۆژێكدا بەرەو بەرگە هەوای زەوی دێن، ئنجا ئایا فریشتەكان چ ڕۆڵێكیان هەیە؟ دەڵێین: مەرج نیە ڕۆڵی فریشتەكان تەنیا هاویشتنی ئەو پارچە نەیزەكانەو ئەو پارچە بڵێسانە بن، بەڵكو دەگونجێ ڕۆڵەكەیان بە شێوەی دیكەش بێ، كە ئەوە تاكو ئێستا بۆ من ڕوون نەبۆتەوە.

٤- ئایا مەبەستی شەیتانەكان لەو موغامەڕەیەی دەیكەن، چییە؟!:

وا دیارە مەبەستی شەیتانەكان هەر ئەوەیە كە یارمەتیی جادووگەرەكان و فاڵچییەكان بدەن، بەپێی حەدیسەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ و، بەپێی ئەوەش كە من پرسیومەو سۆراغم كردوە.

٥- ئایا جندی مسوڵمانیش ئەو هەوڵە دەدەن؟

وەك من لێم پرسیون، دەڵێن: نەخێر، چونكە ئەوانەی ئەو هەوڵە دەدەن، یان ئەو هەوڵەیان داوە، یان ئەگەر ئێستاش گریمان هەوڵێكی وا هەبێ، هەر

بـۆ یارمەتییـدان و هاوکارییکردنـی جادووگەرەکانـە، جنـدی مسـوڵمانیش هاوکاریـی جادووگـەرو فاڵچییـان ناکـەن، کـە سـەر لـە خەڵـك دەشـێوێنن و درۆو دەلەسـەیان بـۆ دەکـەن.

## خاڵی دووەم: لە بواری هەڵسوکەوتی جند لەگەڵ مرۆڤدا:

**١-** پرسیارم کردوە: ئایا لێ خواردنی شەیتان لە خۆراك و شلەمەنیی چۆنەو، چ کاریگەرییەکی نەرێنیی (**سَلبي**) هەیە، لەسەر خواردنەکەو خواردنێك کە لێیان خواردبێ، جیاوازیی چییە لە خواردنێك کە لێیان نەخواردبێ؟ بەپێی قسەی ئەوان دەڵێن: ئێمە کە لە خواردن دەخۆین، شەیتانەکان تەنیا دەتوانن لە خواردنێك بخۆن، کە (**بسم الله**)ی لێ نەکرێ، دەڵێن: بەڵام ئێمەی جندی مسوڵمان خواردنێك کە (**بسم الله**)ی لێ بکرێ، باشتر بۆمان دەخورێ، بەڵام هیچ زیانی پێ ناگەیەنین.

ئـەدی ئایـا شـەیتانەکان چ زیانێـك لـەو خواردنـەی لێـی دەخـۆن دەدەن؟ دەڵێـن: خواردنەکـە بـێ پێـز دەکـەن، بـەو واتایـە: بابـای کـە دەیخـوات پێـی تێـر ناخـوات، بـەڵام ئەگـەر شـەیتانەکان لەگەڵـی نەخـۆن، ئاسـانترو زووتـر تێـر دەخـوات، دیـارە لـە فەرمایشـتی پێغەمبەریشـدا ﷺ هەیـە، کـە کەسـێك پێـش ئـەوەی مسـوڵمان بـێ تێـری نەدەخـواردو هێنـدەی حـەوت کەسـی دەخـوارد، کە چـی دوای ئـەوەی مسـوڵمان بوو، کەمـی خـوارد، دوایـی پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: مسـوڵمان لـە ڕیخۆڵەیەکـدا دەخـوات، یاخـود لـە گەدەیەکـدا، بـەڵام کافـر لـە حـەوت گـەدەدا دەخـوات[1]، لەبـەر ئـەوەی شـەیتان خواردنەکـەی لـێ بـێ پێـز دەکات و، وای لـێ دەکات پێـی تێـر نەخـوات.

**٢-** لە ڕووی جینسییەوە، تا چ ڕاددەیەك جند تێکەڵییان هەیەو شوێنەواری چییە؟

چونکـە (**إبـن تیمیـة**)ش ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ لـە (**مجمـوع الفتاوی**)کەیـدا بـاس دەکات و، گوایـە ئیمام مالیکیـش پرسـیاری لێکـراوە لـەو بـارەوەو دەبـێ گوتبـێ:

---

(١) {إِنَّ الْمُؤْمِـنَ يَـأْكُلُ فِي مِعًـى وَاحِـدٍ، وَإِنَّ الْكَافِـرَ أَوِ الْمُنَافِـقَ يَـأْكُلُ فِي سَـبْعَةِ أَمْعَـاءٍ} أخرجـه البخـاري: ٥٠٧٩، ومسـلم: ٢٠٦١، والترمـذي: ١٨١٨، وابـن ماجـه: ٣٢٥٧.

کاریگەریی و تێکەڵییان هەیە! بەڵام ئەوەی بۆم دەرکەوتووەو لێم پرسیون، ئەوەیە کە جند هیچ کاریگەرییەکی جینسییان نیە، لەسەر مرۆڤەکان و ڕاست نیە کە بگونجێ بەشداریی بکەن، هەتا لێم پرسین کە لە هەندێ تەفسیراندا دەڵێن: لە کاتی جیماع دا جند خۆی لە زەکەری پیاو دەئاڵێنێ، ئەگەر ناوی خوا نەهێنێ، ئایا ئەوە ڕاستە؟ گوتیان: بەپێی زانیاریی ئێمە ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نیە، هەرچەندە لە هەندێ لە تەفسیران دا هاتووەو لە زانایانی تابیعینەوە گێڕدراوەتەوە، بەڵام گریمان سەنەدی ئەو گێرراوەیەش ڕاست بێ، دەگونجێ ئەو جندەی پرسیاری لێکراوە، ڕاستی وەڵام نەدابێتەوە، بەڵام بە دڵنیایی بەهیچ جۆرێك ناگونجێ وەچە لە نێوان مرۆڤ و جنددا پەیدا ببێ، چونکە هەندێ لە زانایان ئەوەشیان گوتوە! چونکە ئەوانە دوو جۆری مەخلووقی جیان و بە هیچ جۆرێك هیچ مەخلووقێك لە کۆی ئەو دووانە پەیدا نابێ، جند هەر وەچەی خۆیان هەیەو مرۆڤیش وەچەی خۆیان هەیە.

٣- لەو بارەوە کە ئایا جند دەتوانن بچنە نێو جەستەی مرۆڤەوە؟ ئەوان بە ڕاشکاویی و بەڕوونیی دەڵێن: بەڵێ، هەڵبەتە بە لای منیشەوە ئەوە شتێکی زۆر ڕوونەو خۆشم ئەزموونم کردوە، کەسێك کە جند چۆتە نێو جەستەی، دواندوومەو بە هەر حاڵ پێم وایە ئەوە لە بەڵگە نەویستەکانەو پێویستیشیی بە بەڵگەی نەقلیی ناکات، شتێك کە ئەزموونیی و بەرهەست بێ، حەوجێی بەڵگەی نەقلیی نیە، قەڵەمێك شین دەنووسێ، پێویست ناکات، بگوترێ: بەڵگەمان چییە لە قورئان و سوننەت؟ تەجرەبەی بکەو دیارە، ئەو شتانەی بە عەقڵ و ئەزموون دیارن، ئیسپاتیان پێویستیی بە بەڵگەی نەقلیی ناکات.

بەڵام جندیش دەڵێن: لەو بوارەش دا فێڵی زۆر هەیە، مەرج نیە هەر کەسێك سەری ئێشا، لاقی ئێشا، پشتی ئێشا، کاری جند بێ، ڕەنگە کەم و کوڕییەکی ئەندامیی (**خلل عضوي**) بێ و، بێگومانیش جند دەتوانن بچنە نێو جەستەی مرۆڤەوەو، زیانیشیان پێ بگەیەنن، بە پێی ئەزموونی منیش لە کاتی خاڵی بێهێزیی مرۆڤدا، ئەو جۆرە زەفەرەی پێ دەبەن، وەك: لە کاتی زۆر تووڕە

بووندا، لە کاتی زۆر خەفەت خواردندا، لە کاتی زۆر ترساندا، لەو کاتانەدا شەیتان زیاتر زەفەر بە مرۆڤ دەبات و دەتوانێ بچێتە نێو جەستەیەوە، جەماوەری مسوڵمانانی ناسراو بە (**أهل السنة**) لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە جند دەتوانێ بچێتە نێو جەستەی مرۆڤەوە، بەڵام موعتەزیلە نکووڵییان لەوە کردووەو گوتوویانە: جند لە دەرەوە کاریگەریی لەسەر مرۆڤەکە دادەنێن، نەك بچنە نێو جەستەی.

٤- لە بارەی فریشتانەوە زانیاریی جند چۆنە، ئایا فریشتان دەبینن؟ لەو بارەوەش لێم پرسین گوتیان: نەخێر فریشتەکان نابینین، بەڵام هەر شوێنێك فریشتەی لێبێ، ئێمە ناتوانین لەوێ بین، بە تایبەتی شەیتانەکان، دەڵێن: ئێمە هەست دەکەین و یەکسەر دەزانین و شوێنێك فریشتەی لێبێ، ناتوانین توخنی بکەوین.

## خاڵی سێیەم: جندو شێوەی پێکهاتەیان و ژیانیان و پەرستشیان:

١- لە کاتی قسەکردنی ناڕاستەوخۆم لەگەڵ جنددا لێم پرسین:

ئایا وەك چۆن ئێمە جەستەمان هەیەو ڕووحیشمان هەیە، ئێوەش جەستەتان ئەوە دیارە لە ئاگر دروستکراوە، بەڵام ئایا ڕووحیشتان هەیە؟

گوتیان: ئێمە ئەسڵەن لایەنە ڕووحییەکەمان زیاتر زاڵە بەسەر لایەنە جەستەییەکەمانداو، بەس هەست دەکەین کە ڕووحێکین، وەك چۆن فریشتەکانیش ڕووحیان هەیە، بەڵام جەستەشیان لە ڕووناکیی (نور) دروست کراوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: فریشتەکان لە ڕووناکیی دروستکراون (**خُلقتِ الملائكة من نور**) **رواه المسلم**: ٢٩٩٦ مرۆڤ جەستەکەی لە گڵ دروستکراوەو ڕووحیشی هەیە، جندیش لەگەڵ ئاگر دروستکراون و ڕووحیشیان هەیە.

٢- هەروەها لێم پرسین: ئایا ژیانی ئێوە تەنیا لەسەر زەوییە، یاخود لە دەرەوەی زەویش هەیە لەسەر خڕۆکەکان؟

گوتیان: نەخێر ئێمە بەس لەسەر زەوی دەژین.

**٣-** دیسان لێم پرسین: خوا پەرستییتان چۆنە؟ نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات؟ گوتیان: هەموو ئەو خوا پەرستییانەی ئێوە ئەنجامیان دەدەن، ئێمەش پێیان ئەرکدار کراوین، بەڵام ئێمە بە شێوەی خۆمان ئەو خواپەرستییانە ئەنجام دەدەین.

**٤-** دیسان لێم پرسین: ئایا ئێوەش بە تەمای چوونە بەهەشتن و لە ئاگری دۆزەخیش دەترسن؟

گوتیان: بەڵێ سەدا سەد بەتەمای چوونە بەهەشتین و لە دۆزەخیش دەترسێین، ئەو قسەیەش دووبارەیەو بۆیەش گوتم، چونکە هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: جند نە دەچنە بەهەشت و نە دەچنە دۆزەخ، بەڵام وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الرّحمن**)یشدا باسم کردوە، خوا ﷻ کە (٣١) جار مرۆڤ و جند دەدوێنێ و دەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ١٣﴾ **الرّحمن**، کە پازدە (١٥) جاریان پەیوەندییان هەیە بە نیعمەتەکانەوەو بە ژیانی دنیاوەو، شازدە (١٦)شیان پەیوەندییان هەیە بە چوار باخەکەوە کە پەروەردگار دایناون بۆ ئیمانداران، خوا لە هەر سی و یەك (٣١) جارەکەدا هەردووك مەخلووقەکە دەدوێنێ و، هەردووکیان هەم بە دۆزەخ ترسێنراون و، هەم بە بەهەشت ئارەزوومەند کراون، کەواتە: دیارە هەم دەچنە دۆزەخ و هەم دەچنە بەهەشتیش، پێشتریش ئایەتەکانمان هێناو زۆر ڕوونن لەو بارەوە.

ئەمە چەند وردە زانیارییەك بوون، کە ڕاستەوخۆ بۆ زانیاریی زیاتر پەیداکردن لە بارەی جندەوە، هەر لە خۆیان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ پرسیارم کردوەو، هەر لە چوارچێوەی ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەریشدان.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆزدە (١٩) ئایەت پێك دێ، كە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی جند، ژمارەیەكی زۆر زانراو (**معلومة**)ی خستوونە ڕوو، دەوری بیست و پێنج (٢٥) زانراو، كە تارادەیەكی زۆر تیشكمان بۆ دەخەنە سەر ئەو دروستكراوە پەنهان و سەرسوڕهێنەرەی خوا، ئەمانەش ئەو زانیارییانەن، كە ئێمە بە ڕیز دەیاننووسین، وەك بەرچاو ڕوونیی:

**١و٢-** گوێگرتنی كۆمەڵێك لە جند لە قوڕئان و، وەسفكردنی قوڕئان بە قوڕئانێكی سەرسوڕهێنەر.

**٣و٤و٥-** پێناسەكردنی قوڕئان بە: گەیەنەر بەسەر ڕاستیی و بە مراد گەیشتن و، ئیعلانی بڕوا پێ هێنانی و، ڕاگەیاندنی هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار دانەنان.

**٦و٧و٨-** ڕاگەیاندنی بەرزیی شكۆو پایەی خواو، نەبوونی هاوسەر، هەروەها نەبوونی ڕۆڵە بۆی.

**٩و١٠-** زانینی ئەو ڕاستییە كە ئیبلیس نەفامەو، قسەی دوور لە هەقی بەرانبەر بەخوا كردوە.

**١١-** گومان بردنیان كە جندو مرۆڤ درۆ بە خواوە هەڵنابەستن، پێشێ وایان زانیوە، تاكو دوایی بۆیان دەركەوتوە، كە جندی كافرو مرۆڤی كافر درۆ بە ناوی خواوە دەكەن.

**١٢-** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە پیاوانی مرۆڤی پەنابەر بە پیاوانێك لە جند، هەر زیاتر تووشی زیانباریی دەبن.

**١٣-** زانینی جند كە لە مرۆڤانیش بێبڕوا بە زیندوو كرانەوە هەن، یاخود بێبڕوا بەوەی خوا پێغەمبەران بنێرێ.

**١٤و١٥-** ڕاگەیاندنی پشکنین و سۆراغیان بۆ ئاسمان و، زانینی پڕکرانی ئاسمان لە ئێشکچیی و بڵێسان بۆ ڕێگرتن لە شەیتانەکان، کە گوێ لە قسەی فریشتان بگرن.

**١٦و١٧-** باسکردنی گوێگرتنی پێشتریان و، ئێستا ڕێ لێ بەسترانیان، کە گوێ بگرن لە قسەی فریشتان.

**١٨-** نەزانینی هۆکارو حیکمەتی ئەو گۆڕانکارییە، کە ئایا زیانە یان سوودە بۆ مرۆڤانی جێنشینی سەر زەوی؟

**١٩-** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە جندیش چاك و خراپیان هەن.

**٢٠و٢١-** زانین و دەرککردنی ئەوە کە جند زانیویانە، نە دەستەوەسانکەری خوان لەسەر زەویداو، نە توانای هەڵاتنیشیان هەیە بۆ دەرچوون لە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خوا.

**٢٢و٢٣-** خستنەڕووی زوو بڕواهێنانیان، هەر دوای گوێبیست بوونی هیدایەتی خواو، زانینی ئەوەش کە بڕوادار نە ترسی کەمکردنەوەی پاداشت، نە زیادکردنی سزاشیان هەیە لە ڕۆژی دواییدا.

**٢٤-** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە جندیش بۆخوا ملکەچ و لادەریان هەن.

**٢٥-** کەڵەکەکردنیان و قەڕەباڵغیی دروستکردنیان لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی گوێ لێ گرتنیدا.

﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾ وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا

وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَـٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّـٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ۖ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ ۖ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ وَأَلَّوِ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَـٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ ٱلْمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. (ئەی موحەممەد ﷺ!) بڵێ: سروشم بۆ لا کراوە، کە کۆمەڵێك لە جند، گوێیان هەڵخستوە (بۆ قورئان خوێندنەکەم) ﴿١﴾ ئنجا گوتوویانە: ئێمە قورئانێکی (ناوازەو) سەرسوڕهێنەرمان بیست، ڕێنمایی (جندو مرۆڤ) دەکات بەرەو سەر ڕاستیی و بە مراد گەیشتن، ئێمەش بڕوامان پێی هێناو، هەرگیزیش هیچ کەس ناکەینە هاوبەشی پەروەردگارمان ﴿٢﴾ هەروەها بێگومان پایەی پەروەردگارمان هەرە بەرزە، نەهاوسەری (بۆ خۆی) گرتوەو نە ڕۆڵە ﴿٣﴾ بێگومانیش (ئیبلیسە) نەفامەکەمان قسەی دوورو ناڕەوا لە بارەی خواوە دەکات ﴿٤﴾ ئێمەش پێمان وابوو مرۆڤ و جند درۆ لەسەر خوا ناکەن (کە دەڵێن: هاوسەرو ڕۆڵەی هەن) ﴿٥﴾ بە دڵنیاییش پیاوانێك لە مرۆڤان پەنایان بردە بەر پیاوانێك لە جند، کەچی خراپەو زیانی پتریان خستە سەریان ﴿٦﴾ (بێبڕوایانی) ئەوانیش پێیان وابوو وەك ئێوە گومانتان برد (ئەی کۆمەڵی جند)،

کە خوا هیچ کەس دوای مردن هەڵناستێنێتەوە (یان هیچ کەس بە پێغەمبەر ڕەوان ناکات) ﴿٧﴾ ئێمە ئاسمانیشمان پشکنی، وامان لێ هەڵکەوت، پڕکراوە لە ئێشکچییانی بەهێزو بڵێسان ﴿٨﴾ (لە حاڵێکدا) ئێمە پێشتر بۆ گوێگرتن (لە قسەی فریشتان) لە چەند نشینگەیەکی دا ڕۆ دەنیشتین، کەچی ئێستا هەر کەس (لەوێ) گوێ هەڵبخات (دەزانێ) بڵێسەکانی بۆ لە بۆسەدان ﴿٩﴾ ئێمە ناشزانین ئایا (بەو گۆڕانکارییە) خراپەو زیان بۆ ئەوانەی لە زەوییدان ویستراوە، یان پەروەردگاریان سەر ڕاستیی و بە مراد گەیشتنی بۆیان خواستوە! ﴿١٠﴾ ئێمە چاکانیشمان هەن و جیا لەوەشمان هەن، پێشتر (شوێنکەوتووانی) ڕێبازە زۆرو جۆراو جۆرەکان بووین ﴿١١﴾ ئێمە گومانیشمان وابوو کە هەرگیز خوا لەسەر زەوی دەستەوسان ناکەین و، هەرگیزیش بە هەڵاتن لێی قوتار نابین (و لە ژێر ڕکێفی دەرناچین) ﴿١٢﴾ ئێمە هەر کە گوێبیستی ڕێنمایی (کۆتایی خوا) بووین (کە بە پێغەمبەری کۆتاییدا ناردوویەتی)، بڕوامان پێی هێنا، هەر کەسێکیش بڕوا بە پەروەردگاری بێنێ، نە لە کەمکردنەوە(ی پاداشتی کردەوە چاکەکانی) دەترسێ، نە لە زیاد کردن و خستنەسەر(ی سزای خراپەکانی) ﴿١٣﴾ ئێمە هەشمانن ملکەچن (بۆ خوا)و هەشمانن لادەرو ستەمکارن، ئنجا هەر کەس ملکەچ بێ، ئا ئەوانە سۆراغی سەر ڕاستیی و بە مراد گەیشتنیان کردوەو (لێی خەفتاون) ﴿١٤﴾ بەڵام لادەران (و ستەمکاران) ئەوانە بوونە سووتەمەنیی (ئاگری) دۆزەخ ﴿١٥﴾ ئەگەر (مرۆڤ و جند) ڕاست وەستاویش بوونایە لەسەر ڕێباز(ی خوا) ئاوێکی زۆر و زوڵاڵمان پێ دەنۆشین ﴿١٦﴾ تاکو بەهۆیەوە تاقییان بکەینەوە، هەر کەسێکیش ڕوو لە یادی پەروەردگاری وەرگێڕێ، دەیخاتە ئازارێکی قورس و سەختەوە ﴿١٧﴾ مزگەوتەکانیش هی خوان، ئنجا لەگەڵ خوادا لە کەسی دیکە مەپاڕێنەوە ﴿١٨﴾ کاتێکیش بەندەی خوا (موحەممەد ﷺ) هەڵسا (خوای پەرست و) لێی پاڕایەوە، نیزیك بوو لەبەر زێدە قەڕەباڵغیی (جندەکان) کەڵەکەی لەسەر بکەن (و لە دەوری بکەونە سەریەك) ﴿١٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أُوحِىَ إِلَيَّ): واتــە: سروشــم بــۆ لا کــراوە، (أَصْـلُ الوَحِــي: الإِشَــارَةُ السَّرِيْعَــة، أمْـرٌ وَحِــيٌ أي: سَرِيْـعٌ، وَالوَحِــي: الرَّمْــزُ وَالإِشَــارَةُ وَالكِتَــاب)، وشــەی (وحــي): لــە ڕیشــەدا بــە ئامــاژەی خێــرا دەگوتــرێ، (أمْـرٌ وَحِـيٌ) واتــە: کارێکــی خێــرا، وشــەی وەحیــی بــە: هێــماو ئامــاژەو، بــە نووســین و، بــە هانــدان، بەوانــە هەموویــان دەگوتــرێ.

(نَفَرٌ): (النَّفَـرُ وَالنَّفِـيْرُ وَالنَّفَـرَةُ: عِـدَّةُ رِجَـالٍ يُمْكِنُهُـم النَّفـرُ)، وشــەی (نَفَـرُ، نَفِـيْرُ، نَفَـرَةُ)، کۆمەڵـە پیاوێکـن دەتوانـن بـڕۆن و ڕاپـەڕن و بجەنگـن.

(عَجَبًا): (عَجَـبْ: مَـا لَـمْ يُعْهَـد مِثْلُـهُ)، (عَجَـبْ) هــەر شــتێکە وێنــەی وی نەزانرابــێ، واتــە: شــتێکی نامــۆ، (عَجِيْــب): بریتیــە لــە شــتێکی زۆر ســەیر، واتــە: ڕێژگــەی زێدەڕۆییــە، بــەڵام ئــەوەی مــرۆڤ پێــی ســەیر بــێ و ســەری لــە بەرانبەریــدا ســوڕ بمێنــێ، پێــی دەگوتــرێ: (عَجَــبْ).

(الرُّشْدِ): (الرَّشَـدُ وَالرُّشْـدُ: خِـلَافُ الغَـيّ وَيُسْـتَعْمَلُ اسْـتِعْمَال الهِدَايَـة) (رَشَـد و رُشْـد) پێچەوانــەی (غَــيٍّ)ن، (غَــي) بــە مانــای بــێ مرادیــی و بــە ئامانــج نەگەیشــتن دێ، کەواتــە: (رَشَـد و رُشْـد)، واتــە: بــە ئامانــج گەیشــتن، جــاری واش هەیــە وشــەی (رَشَـدُ ورُشْـدُ) لــە جیاتــی هیدایــەت بــەکاردێ، ئــەوە بــۆ چوونــی (راغـب الأصفهـاني)ە، بــەڵام ئــەوەی مــن پێیگەیشــتووم ئەوەیــە کــە (رَشَـد ورُشْـد) بەرهــەم، دەرەنجامــی هیدایەتە، هــەروەك (غَـيٌّ) دەرەنجامــی (ضَـلَال)ە، کەسێك گومڕا بــێ، بێمــراد دەبــێ و، کەسێك ڕێــی ڕاســت بگــرێ، بــە ئامانــج دەگات.

(تَعَـٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا): واتــە: مەزنیــی پەروەردگارمــان بــەرزە یــان بەخششــی پەروەردگارمــان بــەرزە، یاخــود پێگــەی پەروەردگارمــان بــەرزە، وەك لــە فەرمایشــتی پێغەمبــەردا ﷺ هاتــوە: {لاَ يَنْفَـعُ ذَا الْجَـدِّ مِنْـكَ الْجَـدُّ} (أخرجـه البخـاري: ٨٠٨، ومسلم:

٥٩٣) خاوەن هەبوون، یان خاوەن پشك و بەش، هەبوون و پشك و بەشەكەی لە بەرانبەر تۆدا سوودی پێ ناگەیەنێ، (**أي: لا يُتَوَصَّلُ إلى الثَّوابِ فِي الأخرةِ بَالْجَدِّ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ بَالْجِدِّ فِي طَاعَتِه**) واتە: بەهۆی ماڵ و سامان و پشك و بەشی دنیایی، مرۆڤ ناگاتە پاداشتی خوا لە ڕۆژی دواییدا، بەڵكو بەهۆی باش كار كردن و، چاك مشوور خواردن لە فەرمانبەریی خوادا، مرۆڤ دەگاتە پاداشتی خواو لە پاداشتی خوا بەهرەمەند دەبێ.

(شَطَطًا): (**الشَّطَطُ: الإِفْرَاطُ فِي البُعْد**): (**الشَّطَطْ**) بریتیە لە زێدەڕۆیی و، تێپەڕاندن لە دووریيدا، (**شَطّ**) یان (**شَاطِء**)، كەناری ڕووبارو دەریا، لەبەر ئەوەی دوورە، ئەو ناوەی لێنراوە.

(رَهَقًا): (**رَهِقَهُ الشَّرُّ: غَشِيَهُ بِقَهْرٍ، رَهِقْتُهُ أَرْهَقْتُهُ**)، (**رَهِقَهُ الشَّرُّ**) واتە: خراپە كەوتە سەری، واتە: خراپەو زیانێك بە زۆر كەوتە سەری، دەگوترێ: (**رَهِقْتُهُ، أرْهَقتهُ**)، واتە: خستمە سەری، هەم بە سیانیی (**ثُلاثي**) هاتوە، هەم بە چواریی (**رُبَاعِي**)، (**رَهِقَهُ وأَرْهَقَهُ**) هەردووكیان بە مانای: خستیە سەر، دێن، ئەو كاتەش (**مُضارِع**)ەكەیان (**يَرْهَقَهُ ويُرهِقُهُ**) دەبێ.

(لَّن يَبْعَثَ): بە دوو واتایان هاتوە، (**أَصْلُ البَعْثِ: إِثَارَة الشَّيءِ وَتَوْجِيهُهُ**)، (**بعْث**) بریتیە لە هەڵساندنی شتێك و ئاڕاستە كردنی، (**بَعَثَ اللهُ غُرَابَاً، أي: قَيَّضَهُ**)، خوا ﷻ قەلە ڕەشەیەكی نارد، (**فَأَمَاتَهُ اللهُ ثُمَّ بَعَثَهُ**) واتە: خوا سەد ساڵ مراندیی و دوایی هەڵیساندەوە، ﴿بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا ﴿٣٦﴾﴾ النحل، واتە: لە هەر كۆمەڵگایەكدا پێغەمبەرێكمان ناردوە، كەواتە: (**بَعث**) بە مانای ئامادەكردن و، هەڵستاندنەوەو، ناردن، دێ.

بۆیە: ﴿أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا﴾ بە دوو واتایان دێ:

**أ-** كە خوا ﷻ هیچ كەسێك زیندوو ناكاتەوە.

**ب-** خوا هیچ پێغەمبەرێك نانێرێ.

(لَمَسۡنَا ٱلسَّمَآءَ): ئاسمانمان سۆراغ كرد، پشكنیمان، (**اللَّمْسُ: إدْرَاكٌ بِظَاهِرِ البَشْرَةِ كَالمَسِّ، ويُعبَّرُ بِهِ عَنِ الطَّلَبِ**)، (**لَمْس**) بریتییە لە زانین بەهۆی دیوی دەرەوەی پێست، (**لَمْس**) وەك (**مَسّ**) وایە، (**مَسَّهُ أو لَمَسَهُ**) واتە: دەستی لێدا، دوایی بەكاردەهێنرێ بۆ بەدوا گەڕان و لێ خەفتان، ﴿لَمَسۡنَا ٱلسَّمَآءَ﴾ واتە: ئاسمانمان پشكنی، مەبەست ئەوە نیە دەست لە ئاسمان درابێ، یانی: سۆراغمان كردو تێیگەڕاین.

(فَوَجَدۡنَٰهَا): بینیمان، (**أي: صَادَفْنَاهَا وَأَصَبْنَاهَا، وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ التَّمكُّنِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى: حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ، وَقَالَ: فَلَمْ تَجِدوا مَاءً أي: لَمْ تَقْدِروا عَلى المَاء**)، وشەی (فَوَجَدۡنَٰهَا) (**صَادَفْنَاهَا**) واتە: لێمان هەڵكەوت، (**وَأَصَبْنَاهَا**) تووشی بووین، دوایی وشەی (**وَجَدَ**) و (**وِجْدَان**) بەكاردەهێنرێ بۆ (**تَمَكُّن**)، واتە: ئینسان دەستی بگاتە شتێك، وەك: (**حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ**) لە هەر شوێنێك بەر پەلتان كەوتن، لێتان هەڵكەوتن، هەروەها وەك: (**فَلَمْ تَجِدوا مَاءً**) ئاوتان لێ هەڵنەكەوت، ئاوتان و چنگ نەكەوت (**لَمْ تَقْدِروا عَلى المَاء**)، تواناتان بەسەر ئاودا نەبوو.

(حَرَسٗا شَدِيدٗا): (**الحَرسُ وَالحُرَّاسُ جَمْعُ حَارِس**)، (**حَارِس**) واتە: پاسەوان، ئێشكچیی، هەم بە (**حَرَس**) كۆدەكرێتەوە، وەك: (**خَادِم وَخَدَم، حَارِس وَحَرَس**)، هەم بە (**حُرّاس**)یش كۆ دەكرێتەوە، وەك (**خَادِم وخُدَّام**)، (**خَادِم**) واتە: خزمەتكار، (**خُدّام**) واتە: خزمەتكارەكان، (**حَارِس**) پاسەوان، (**حُرّاس**) یان (**حرَس**) یانی: پاسەوانەكان، (**وَالحَارِسُ حَافِظُ المَكَانِ**) (**حَارِس**): بریتییە لە پارێزەری شوێنێك.

(وَشُهُبٗا): (**شِهَاب: جَمْعُه شُهُب، شُهُباً**) (**الشِّهَاب: الشُّعْلَة السّاطِعَةُ مِنَ النَّارِ المُوقَدَةِ وَمِنَ العَارِضِ فِي الجَوِّ**)، (**شِهَاب**) كە كۆیەكەی (**شُهُب**)ە، واتە: بڵێسەیەكی تیشكدەر لە ئاگرێك كە هەڵایساوە، یاخود لە هەور كە بریسكە دەدا، ئەویش پێی دەگوترێ: (**شِهَاب**).

(رَّصَدٗا): (**الرَّصَدُ: الإسْتِعْدَادُ للتَرَقُّب**)، (**رَصَد**): بریتییە لە ئامادەسازیی بۆ چاودێریی كردن، (**رَصَدَ لَه، وَترَصَّدَ لَه، وأرصَدْتُه لَه**)، (**رَصَدَ لَه**) واتە: بۆی لە

بۆسەدایە، لە چاوەڕوانیی دایە، (وَتَرَصَّدَ لَهُ) هەمان واتای هەیە، (وأَرْصَدْتُهُ لَهُ) واتە لە بۆسەدا بۆم دانا، (الرَّصَدُ للوَاحِد وَالجَمْع)، (رَصَد) بۆ تاك و بۆ كۆش بەكاردەهێنرێ، (رَصَد) بە مانای (مَرْصُود)یش دێ، واتە: كەسێك كە چاودێریی دەكرێ، كەسێك جگە لە خۆی، بۆی لە بۆسەدایە.

(طَرَآئِقَ): (جَمْعُ طَرِيْقَة)، (طرائق) كۆی (طَرِيْقَة)یە، (طَرِيْقَة)ش بە مانای ڕێبازە، (إِشَارَةٌ إِلى الإِخْتِلَاف فِي دَرَجَاتِهِم)، (طَرَآئِقَ قِدَدًا) ئاماژەیە بۆ ڕاجیاییان لە پلەكانیاندا، (وَجَمْعُ طَرِيْق: طُرُق، وَجَمْعُ طَرِيْقَة: طَرَائِق)، (طَرِيْق) بە (طُرُق) كۆ دەكرێتەوە، ڕێیەكان، (طَرِيْقَة)ش بە (طَرَائِق) كۆ دەكرێتەوە. ﴿وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾﴾ الجن، (طَرِيْقَة) لێرەدا دیسان بە مانای ڕێباز دێ، بەڵام بە (طَرَائِق) كۆ دەكرێتەوەو، (طَرِيْق)یش بە (طُرُق).

(قِدَدًا): (القَدُّ: قَطْعُ الشَّيءِ طُولاً، كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿قُدَّ مِن دُبُرٍ ﴿٢٧﴾﴾ يوسف، (أي: شُقَّ مِن خَلْفٍ)، (وَالقَدُّ: المَقْدُودُ، وَالقَدُّ: قَامَةُ الإِنْسَان، وَالقِدَدُ: الطَّرَائِق، وَالقِدَّةُ القِطْعَة)، (قَدّ): بریتیە لە بڕینی شتێك بە باری درێژییدا، قڵیشاندنی و داقڵیشاندنی، وەك لە سوورەتی (يوسف)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ ﴿٢٧﴾﴾، ئەگەر كراسەكەی لە پشتەوە هەڵقڵیشابێ هی یوسف عليه السلام، هەروەها (قَدّ) بە مانای (مَقْدُود) دێ، واتە: شتێك كە قڵیشێنراوە دادڕاوە، دیسان (قَدّ) بە مانای قیافەو دیمەن و قامەتی مرۆڤیش دێ، كە بە پێوە دەوەستێ، (قِدد) بە مانای (طَرَائِق) ڕێیەكان و، (قِدَّة) بە مانای (قِطْعَة) دێ، واتە: پارچەیەك.

(بَخْسًا): (البَخْسُ: نَقْصُ الشَّيء عَلَى سَبِيْل الظُّلْم) (بخس): بریتیە لە كەمكردنەوەی شتێك بە شێوەی ستەم لێكردن.

(رَهَقًا): پێشتریش گوتمان (رَهِقَهُ الأَمْرُ)، واتە: كارێكی بەسەرهات، دایپۆشی، ناڕەحەتی كرد، كەواتە: (رَهَقاً)، واتە: زیان بەسەرهاتنێك، خراپە بەسەرهاتنێك،

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴾، نـە دەترسـێ پاداشـتی لـێ کـەم بکرێتـەوە، نـە دەترسـێ سـزای بـۆ زیـاد بکـرێ بـە ناحـەق.

(ٱلْقَـٰسِطُونَ): (القِسـطُ: النَّصِيْـبُ بَالْعَـدْلِ، كَالنَّصَـفِ وَالنَّصَفَـةِ، وَقَسَـطَ: جَـارَ، فَالْقَسْـطُ: أَخْـذُ قِسـطِ الغَـيْرِ، والإِقْسَـاط: إعْطَـاءُ قسـطِ لِغَـيْرِ) (قِسْـط): بـە مانـای دابەشـکردنێکی دادگەرانـە دێ، وەك (نَصَـف و نَصَفَـة) ئەوانیـش بەهەمـان شـێوە بـە مانـای دابەشـکردنێکی لـە نیـوەڕا، لـە نێـو قـەدێ ڕا، بـە شـێوەی یەکسـان، (قَسَـطَ) بـە مانـای (ظَلَـمَ) ستەمی کـرد، چونکـە (القَسْـطُ: أَخْـذُ قِسْـطِ الغَـيْرِ) (قَسْـط): بریتیـە لـەوەی بەشـی جگـە لـە خـۆت بـۆ خـۆت بێنـێ، بـەڵام (إِقْسَـاط) بریتیـە لـەوەی بەشـی ئـەوی دیکـە بـدەی.

(تَحَرَّوْا۟): (حَـرَّ الـشَّيءَ يَحْـري: قَصَـدَ حَـرَاهُ، وَالحَـرَى: الجَانِـبُ، وَتَحَـرّاه كَذَلِـك)، (تَحَرَّوْا۟) واتـە خەفتـاون، هەوڵیـان بـۆ داوە، بـۆی تێکۆشـاون، چونکـە (حَـرّ الـشَّيءَ يَحْـري: قَصَـدَ حَـرَاهُ) واتـە: ڕووی تێکـرد، ڕووی کـردە تەنیشـتەکەی، (حَـرى) بـە مانـای تەنیشـت(جَانب) دێ، (وَتَحَـرَّاه)، واتـە: لێـی خەفتـاوەو هەوڵـی بـۆداو لـە پێناویـدا تێکۆشـا.

(غَدَقًا): (أَي: غَزِيْـراً، غَدِقَـت عَيْنُـه تَغْـدِقُ)، (غَـدَق) بـە مانـای زۆر دێ، (غَدِقَـت عَيْنُـهُ تَغْـدِقُ)، واتـە: چـاوی پـڕ بـوو، پـڕ دەبـێ لـە فرمێسـك.

(يَسْلُكْهُ): (السُّـلُوكُ: النَّفَـادُ فِي الطَّرِيْـق، سَـلَكَهُ وَأَسْـلَكَهُ أَي: أَدْخَلَـهُ)، (سُـلُوك): بریتیـە لـە چوونـە نێـو ڕێـگا، (سَـلَكَهُ وَأَسْـلَكَهُ) هـەم بـە سـیانیی (ثُـلَاثي) هاتـوە، هـەم بـە چواریـی (رُبَاعِـي)، (سَـلَكَهُ) واتـە: خسـتیە نێـو، (أَسْـلَكَهُ) بـە مانای خسـتیە نێو، (سَـلَكَهُ فِي الطَّرِيـق) واتـە: خسـتیە نێـو ڕێیەکـەوە (أَسْـلَكَهُ) بەهەمـان شـێوە، هەردووکیـان بـە مانـای خسـتیە نێـو، مەرجیـش نیـە هـەر بـۆ خسـتنە نێـو ڕێ، بەکاربهێنرێ، جـاری وا هەیـە دەزوویـەك دەخرێتـە نێـو دەنکەکانـی تەسـبیحێکەوە، هـەر وای پێدەگوتـرێ.

(صَعَدًا): دەیخاتە نێو ئازارێکی سەختەوە، (الصُّعُودُ: الذَّهَابُ فِي المَكَان العَالِي)، (صعود) بریتیە لە ڕۆیشتن بەرەو شوێنێکی بەرز، (صَعَداً أي: شَاقًّا، صُعُوداً: عَقَبَةٌ شَاقَّةٌ)، (صَعَداً) بە مانای قورس، هەروەها (صعود) یانی: کۆسپێکی قورس و زەحمەت.

(لِبَدًا): (جمع لِبْدَة)، (لِبَد) کۆی (لِبْدَة)یە، یانی: کەڵەکە بووە سەریەك

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی دابەزینی هەر شەش ئایەتی سەرەتا: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾﴾، هەرچەندە ئێمە لەو کورتە باسەی لە بارەی جندەوە خستمانەڕوو، ئەم دەقەو چەند دەقێکی دیکەشمان لەو بارەوە هێنان، بەڵام لێرەش وەك هۆی هاتنەخوار، ئەم دەقە دووبارە دەکەینەوە:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: مَا قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الجِنِّ وَمَا رَآهُمْ، انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ! قَالُوا: مَا ذَاكَ إِلَّا مِنْ شَيْءٍ حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا مَا هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ؟ فَانْطَلَقُوا يَضْرِبُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَمَرَّ النَّفَرُ الَّذِينَ أَخَذُوا نَحْوَ تِهَامَةَ وَهُوَ بِنَخْلَةَ، عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَهُوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلَاةَ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ وَقَالُوا: هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَرَجَعُوا إِلَى

قَوْمِهِمْ فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنا قُرْآناً عَجَباً. يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنا أَحَداً، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عز وجل عَلَى نَبِيِّهِ مُحَمَّدٍ ﷺ: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ ﴿١﴾﴾]، (أخرجه البخاري: ٧٧٣،٤٢٢١، ومسلم ٤٤٩، والترمذي: ٣٣٢٣، وابن حبان: ٦٨٢٨، والحاكم: ٣٨٥٧).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بەسەر جنددا نەخوێندۆتەوەو نەشیدیون، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی چوون بۆ بازاڕی عوکاز، لە حاڵێکدا کە پەردە خرابووە نێوان شەیتانەکان و هەواڵی ئاسمان و بڵێسەیان بەسەردا نێردرابوون، شەیتانەکان چوونە لای خەڵکەکەی خۆیان گوتیان: بۆچی هاتوونەوە؟ گوتیان: ڕێی هەواڵی ئاسمانمان لێ گیراوەو بڵێسەمان بەسەردا نێردراون، گوتیان: ئەوە تەنیا بەهۆی شتێکەوەیە ڕوویداوە، بڕۆن بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواکانی زەویدا سەرنج بدەن، بزانن داخۆ چ شتێك وای کردوە ئێمە ڕێی بیستنی هەواڵی ئاسمانمان لێگیراوە؟ ڕۆیشتن بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواکانی زەویدا گەڕان، ئەو کۆمەڵەی بەرەو تیهامە چوون، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێك بوو بە ناوی نەخلە لە بازاڕی عوکاز، نوێژی بە هاوەڵانی کرد، نوێژی بەیانی پێدەکردن، کاتێك گوێیان لە قورئان بوو (واتە: لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتییدا)، گوێیان بۆ هەڵخست و گوتیان: ئا ئەوەیە بۆتە هۆی ئەوەی ڕێی گوێبیست بوونی هەواڵی ئاسمانمان لێ بگیرێ، گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەیان و گوتیان: ئەی خەڵکەکەمان! ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر بوو، بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنمایی دەکات و بڕوامان پێهێناو، هیچ شتێك ناکەینە هاوبەشی پەروەردگارمان، ئیدی خوا ﷻ ئەوەی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی خۆی: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾﴾.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەوەش یانی:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوا دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ﴾، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: بڵێ سروشم بۆ لا کراوە، نیگام بۆ لا نێردراوە کە کۆمەڵێك لە جند گوێیان هەڵخستوە، واتە: بە گرنگیی پێدانەوە گوێیان گرتوە بۆ قوڕئان خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ، ﴿فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾، یەکسەر لە دوای گوێ گرتنیان لە قوڕئانەکە گوتوویانە: ئێمە گوێبیستی قوڕئانێکی سەرسوڕهێنەر بووین، (عَجَب) لە بنچینەدا چاوگە، وەك زێدەڕۆیی بۆ وەسفی قوڕئان بەکارهێنراوە، ئەگەرنا (عَجَب)، واتە: سەرسوڕمان، بەڵام لێرەدا بە مانای سەرسوڕهێنەر بەکارهێنراوە.

﴿يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ﴾، ئەو قوڕئانە سەرسوڕهێنەرە بەرەو سەر ڕاستیی و بەرەو بە مراد گەیشتن ڕێنمایی دەکات، ﴿فَآمَنَّا بِهِ﴾ بۆیە ئێمەش بڕوامان پێی هێنا، ﴿وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا﴾، دیارە کرۆك و کاکڵەی ئەوەی قوڕئان خەڵکی بۆ بانگ دەکات، بریتیە لە تەنیا خواپەرستیی و هاوبەش بۆ پەیدا نەکردنی، بۆیە یەکسەر دەڵێن: هەرگیز هیچ کەس ناکەینە هاوبەشی پەروەردگارمان، واتە: نە لە بەدیهێنەرایەتیی داو، نە لە پەروەردگارێتیی داو، نە لە خاوەندارێتیی داو، نە لە پەرستراوێتیی داو، نە لە ناوو سیفەتەکانی داو ....هتد.

﴿ وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا ﴾، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (وَإِنَّهُ)، واتە: بە دڵنیایی مەزنیی پەروەردگارمان زۆر بەرزە، پێگەی پەروەردگارمان زۆر بەرزە، ﴿ مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴾، نە هاوەڵی هەیە، هاوەڵی هاوژین و هاوسەرو، ڕۆڵەشی نیە، واتە: بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەڵێن و، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئیبلیس ڕەواجی پێداوە، هەم لە نێو جندو هەم لە نێو مرۆڤاندا، کە خوا هاوسەرو هاوژینی هەیەو ڕۆڵەی هەیە، کوڕو کچی هەن، پەروەردگارمان پێگەی زۆر بەرزە، نە ڕەگەزی هەیەو، نە هاوسەری هەیە، نە کەسی لێ بووەو نە لە کەس بووە.

﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا ﴾، بە دڵنیایی نەفامەکەی ئێمە، واتە: ئیبلیسە نەفامەکەی ئێمە، قسەی لە هەق دووری لەسەر خوا کردوون، واتە: قسەی دوور و نەگونجاو لەگەڵ خوای بەرزدا، کە یەکێك لە قسە دوورەکانی ئەوە بووە گوتوویەتی: خوا هاوبەشی هەیەو، یەکێك لە قسە دوورەکانی دیکەی ئەوە بووە گوتوویەتی: خوا هاوسەری هەیەو، ڕۆڵەی هەیە، کوڕو کچی هەن!.

﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە زانیمان (ظَنَنَّا) لێرەدا بە مانای (إسْتَيْقَنَّا) دڵنیابووین (عَلِمْنَا)، زانیمان، دەشگونجێ (ظن) هەر بە مانای گومان بێ، واتە: پێمان وابوو کە نە مرۆڤ و نە جند درۆ بە ناوی خواوە ناڵێن، درۆ بە ناوی خواوە ناکەن، واتە: شتێك پاڵ نادەنە لای خوا درۆ بێ، ئنجا ئەگەر (ظَنَنَّا) بە مانای (زانیمان) بێ، لێرەدا واتە: ئێمە لە لای خۆمان یەقینمان پەیدا کردبوو، یان زانیاریمیان پەیدا کردبوو، بەڵام بە دڵنیایی زانیاریی و یەقینەکەیان بێ بنەما بووە، ئەگەر (ظَنّ)یش لێرەدا بە مانای گومان بێ، واتە: پێمان وابوو، گومانمان وابوو، یان بە هەڵە وامان دەزانی و دڵنیاش بووین، بەبێ ئەوەی دڵنیاییەکەمان بناغەیەکی ڕاستی هەبێ، یاخود هەر گومانمان وابوو کە مرۆڤ و جند بە ناوی خواوە درۆ ناکەن، درۆ لەسەر خوا ناکەن.

﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ ﴾، بە دڵنیایی کۆمەڵێک لە پیاوانی مرۆڤ پەنایان دەبردە بەر پیاوانێک لە جندەکان، ﴿ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴾، پیاوە جندەکان ئەو پیاوە مرۆڤانەیان زیاتر تووشی زیان و گومڕایی و گرفتاریی کرد، کە دوایی زیاتر تیشک دەخەینە سەر ئەوە، کە عەڕەبەکان عادەتیان وابووە، ئەگەر لە بیابانێک لە دەشت و چۆڵاییەك، ڕۆیشتبانایەو شەویان بەسەردا هاتبایە، دەیانگوت: پەنا دەبەینە بەر گەورەی ئەم دەڤەرە، گەورەی ئەم شیوە، پەنایان دەگرت بە گەورەی جند، ئەو کەسەی ڕیش سپیی و گەورەی جندەکانە لەو شوێنە، بە حیساب بۆ ئەوەی بیانپارێزێ لە خراپەکاریی ئەو جندە خراپانەی لەبەر دەستیدان، بەڵام ئەوە زیاتر دەبووە هۆی ئەوەی تووشی زیان بن، یان دەبووە هۆی ئەوەی جندەکان بەو پەنا پێ بردنەی مرۆڤەکان، زیاتر تووشی زیان و بوغڕایی و لە خۆبایی بن.

﴿ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا ﴾، جندەکان لە نێو خۆیاندا دەڵێن: ئەی جندەکان! مرۆڤەکانیش پێیان وابوو، وەك چۆن ئێوە پێتان وابوو، کە خوا ﷻ هیچ کەسێك نانێرێ، واتە: هیچ کەسێك نانێرێ وەك پێغەمبەر ﷺ، پێیان وابوو لە دوای پێغەمبەرانی پێشوو، کۆتایی بە پێغەمبەرایەتیی هاتوە ئەوە واتایەکی، یاخود: لێرەدا (**يَبْعَثُ**) بە مانای زیندوو کردنەوەیە، واتە: ئەی جندەکان! مرۆڤەکانیش وەك ئێوە پێیان وابوو خوا ﷻ هیچ کەسێك زیندوو ناکاتەوە، هەڵناستێنێتەوە.

﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئاسمانمان پشکنیی و سۆراغمان کردو گەڕاین، ئاسمانمان وا بینی و وا لێ هەڵکەوت، کە پڕ کراوە لە پاسەوان و لە بڵێسان، (**حَرَس**) کۆی (**حَارِس**)ە، واتە: ئێشکچیی و پاسەوان، (**شُهُب**)یش کۆی (**شِهَاب**)ە، واتە: بڵێسە، (**شُهُب**)، واتە: بڵێسە ئاگرەکان.

﴿ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ﴾، هەروەها ئێمە پێشتر چەند شوێنێك و نشینگەیەکمان هەبوون لە ئاسمان، تێیاندا دادەنیشتین بۆ گوێ گرتن، واتە: گوێگرتن لە قسەی فریشتان، ﴿ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴾، بەڵام هەر کەسێك ئێستا گوێ هەڵبخات (بۆ قسەی فریشتان)، بڵێسەیەك بۆ خۆی لە بۆسەدا دەبینێ، بڵێسەیەك چاوەڕێی دەکات و بۆی لە بۆسەدایە.

﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴾، ئێمە ناشزانین ئایا ئەوانەی لە زەوییدان، واتە: مرۆڤەکان خراپەو زیانیان بەو گۆڕانکارییە بۆ ڕەچاو کراوە، یاخود پەروەردگاریان سەر ڕاستیی و بە ئامانج گەیشتن و خێرو خۆشیی بۆ ڕەچاو کردوون، کە ئەو گۆڕانکارییە بەسەر بارودۆخی ئاسمان دا هاتوە، کە ڕێ لە جند و شەیتانەکان گیراوە، گوێ لە قسەی فریشتان بگرن؟ ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ﴾، ئێمە چاکەکانیشمان هەن و جگە لەوانیشمان هەن، ﴿ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴾، پێشتر ئێمە کۆمەڵ و ڕێبازی جیا جیا بووین، (**طَرَائِق**) کۆی (**طَرِيْقة**)یە بە مانای ڕێباز و مەزهەب و ڕێچکە، (**قِدد**) کۆی (**قِدّة**)یە، بە مانای (**قِطعة**) دێ، ئێمە چەندان ڕێبازی جۆراو جۆرو لێکدابڕاو بووین.

﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴾، ئێمە دەمانزانی و دڵنیا بووین، لێرەدا (**ظَّن**) بە مانای (**علم**) زانین و (**یقین**) دڵنیایی دێ، ئێمە دڵنیا بووین و دەمانزانی کە نە لەسەر زەوی خوا دەستەوسان دەکەین و، نە دەشتوانین دەستەوسانی بکەین وەك هەڵاتن و لەبەر ڕاکردنی.

﴿ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ﴾، ئێمە کاتێك گوێمان لە ڕێنمایی بوو، (کۆتا ڕێنمایی خوا بۆ مرۆڤایەتیی و بۆ جندیش) بڕوامان پێهێنا، هەر لەگەڵ گوێبیستی بوووین، بڕوامان پێهێنا بەبێ وەخران، ﴿ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴾، هەر کەسێك بڕواش بە پەروەردگاری بهێنێ، نە لە کەمکردنەوە (ی پاداشت دەترسێ لەسەر کردەوە باشەکان) و نە لە خستنە سەر

(ی سزا) دەترسێ (لەسەر خراپەکانی)، واتە: نە پاداشتی کردەوە چاکەکانی لێ کەم دەکرێ و، نە سزای خراپەو تاوانەکانیشی بۆ زیاد دەکرێ.

﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ ﴾، ئێمە ملکەچیشمان لە نێودا هەن و، هەمانن ملکەچن (بۆ خوا) و، هەشمانن ستەمکارو لادەرن (لە ڕێی خوا)، ﴿ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ تَحَرَّوْاْ رَشَدًا ﴾، ئنجا هەر کەسێك ملکەچ بێ بۆ خوا، ئا ئەوانە خەفتانی سەر ڕاستییان کردوە، لە سەر ڕاستیی گەڕاون، واتە: هەوڵیان داوە بە ئامانج بگەن و ڕێی ڕاست پەیدا بکەن، ﴿ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴾، بەڵام لادەران و ستەمکاران ئەوانە دەبنە سووتەمەنیی بۆ دۆزەخ.

تاکو ئێرە هەمووی قسەی جندە.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَلَّوِ ٱسْتَقَـٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ ﴾، ئەگەر لەسەر ڕێباز ڕاوەستاو دامەزراو بوونایە، لەسەر ڕاستە ڕێی خوا، ﴿ لَأَسْقَيْنَـٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴾، ئێمە ئاوێکی زوڵاڵی زۆرمان پێ دەنۆشین، لە ئاسمانەوە بۆمان دادەبەزاندن، واتە: ئەگەر ئەوان ڕێ ڕاست گرتوو بوونایە، خوا بەرەکەتی دەخستە ژیانیانەوە و نازو نیعمەتی زۆری بۆ دەڕەخساندن، بۆچی؟ ﴿ لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾، تاکو لەو بژیوەدا - کە سەرچاوەکەی بریتیە لە ئاوی زۆرو زوڵاڵ - تاقییان بکەینەوە، ﴿ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ ﴾، هەر کەسێکیش ڕوو وەچەرخێنێ لە یادی پەروەردگاری، یاخود (**ذِکر**) بە مانای قورئانە، واتە: ئەو قورئانە بیرخەرەوەیەی کە لە پەروەردگاریەوە بۆی دابەزیوە، یاخود (**ذِکر**) بە مانای بەرنامەیە، لە بەرنامەی پەروەردگاری پشت هەڵبکات و ڕوو وەچەرخێنێ، ﴿ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴾، (خوا) دەیخاتە نێو ئازارو سزایەکی قورس و زەحمەت و سەختەوە، وەك چۆن کەسێك کەسێک بە هەوراز هەڵدەگێڕێ، زۆر ماندوو دەبێ، خواش ئەو کەسە دەخاتە سزاو ئازارێکی سەختەوە، وەك وە شاخی هەڵیگێڕێ.

﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ ﴾، بە دڵنیایی مزگەوتەکانیش هی خوان، بەشی کەسیان پێوە نیە، ﴿ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴾، کەواتە: لەگەڵ خوادا لە کەسی دیکە مەپاڕێنەوە، یان (مَسَاجِد) کە کۆی (مَسْجِد)ە، دەگونجێ مەبەست ئەو ئەندامانە

بن کە مرۆڤ کڕنووشیان لەسەر دەبات بۆ خوا، کە بریتین لە حەوت ئەندام: نێو چەوان و، هەردوو لەپە دەست و، هەردوو ئەژنۆو، هەردوو سنگی پێ.

﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ ﴾، بە دڵنیایی کاتێك بەندەی خواش هەڵسا لێی دەپاڕایەوە، لە خوا دەپاڕایەوە، یاخود: (يَدْعُوه) یانی: خوای دەپەرست، قورئانی دەخوێند، پەرستشی بۆ خوا ئەنجام دەدا، ﴿ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدًا ﴾، نیزیك بوو کەڵەکەی لەسەر بکەن، واتە: نیزیك بوو جندەکان لەبەر زۆر تامەزرۆیی بۆ گوێبیست بوونی ئەو قورئانەی پێغەمبەر دەیخوێند، یان ئەو پاڕانەوەیەی دەیکرد، یان ئەو پەرستشەی بۆ خوا ئەنجامی دەدا، ئەوەندە سوور و مکووڕ بوون لەسەر ئەوەی هەموویان گوێیان لێ بێ، خەریك بوو کەڵەکە بکەن لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ و بچنە سەر شانی یەکدی، کە دیارە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لەبەر ئەوەی ئەوان نابەرهەستن، ئەوە نەبووە سەنگی بگاتە سەر، بەڵام خەریك بووە کەڵەکەی لەسەر بکەن و زۆر قەرەباڵغیی لەسەر بکەن، (لِبد) کۆی (لِبْدَة)یە کە هەر شتێکە کۆکرابێتەوە سەر یەك، لبادی کوردیش کە لە خوریی دروست دەبێ، لە خوری پێکەوە پەستراو، هەر لەوەوە هاتووە، لەبەر ئەوەی مووەکانی خورییەکە، هەموویان خڕکراونەوە سەر یەك و پەستێوراونە نێو یەك.

بەڵام لێرەدا ئەوەندە دەڵێین:

لەو دوازدە شوێنەدا (أَنَّه) هاتووە، ئەمە قیرائەتی (حَفْص) و هی هەندێکی دیکەیە لە قورئانخوێنەکان. (قُرّاء) بەڵام زۆربەی قورئانخوێنەکان، بە (إِنَّه)یان خوێندۆتەوەو، زانایان گوتوویانە: ئەو جۆرە خوێندنەوەیەش بەهێزترە، لەوێوە دەست پێدەکات، کە دەفەرموێ: **(وأَنَّه تَعَالَى جدُّ ربِّنا)**، خوێندوویانەتەوە: **(وإِنَّه تَعَالَى جدُّ ربِّنا)**، هەروەها **(وأَنَّه كَانَ)**، **(وإِنَّه كَانَ)**، **(وأَنَّا ظَنَنَّا)**، **(وإِنَّا ظَنَنَّا)**، **(وأَنَّه كَانَ)**: **(وإِنَّه كَانَ رجال من الأنس)**، **(وأَنَّهُم ظَنّوُا)**، **(وإِنَّهم ظَنّوُا)** تا کۆتایی، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

سروشکران بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە کۆمەڵێك لە جند گوێیان بۆ قورئان خوێندنەکەی هەڵخستوەو پێی سەرسام بوون و، ڕایانگەیاندوە کە بەرەو ڕاستە ڕێی بە ئامانج گەیەنەر ڕێنمایی دەکات، بڕوایان پێ هێناوەو ئەوانە هاوبەشیش بۆ پەروەردگاریان دانانێن و، پاکیی لە هاوژین و ڕۆڵە بۆ خوا دەردەبڕن و، نەفامی ئیبلیس کە بە گەوجەکەمان، نەفامەکەمان ناوزەدی دەکەن، ڕادەگەیەنن، ڕاشیدەگەیەنن ئەو پیاوانەی لە مرۆڤان پەنایان بردۆتە بەر پیاوانێك لە جند، تەنیا زیانیان لێ زیاد کردوون، دەشڵێن: مرۆڤە بێبڕوایەکانیش وەك ئێوەی جندی بێبڕوا، پێیان وایە خوا هیچ کەس زیندوو ناکاتەوە، یاخود هیچ کەس ڕەوان ناکات بە پێغەمبەر:

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ﴾، (خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ:) بڵێ: سروشم بۆ لا کراوە، کە کۆمەڵێك لە جند گوێیان هەڵخست، ئێمە وەك چۆن مانا گشتییەکەی بە خێرایی بەسەریدا ڕەتبووین، ئەم مەسەلە گرنگانەش زۆر ناچینە نێو

وردەکارییەکان، چونکە لەو کورتە باسەدا کە کردمان لە بارەی جندەوە، ئەم ئایەتانەو گەلێك لە ئایەتەکانی دیکەش، کە لە قورئاندا لە بارەی جندەوە هاتوون و، زۆرێك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەریشمان ﷺ لەو بارەوە هێنان، ئەو کاتەش گوتمان، بۆ ئەوەی لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئایەتەکان ئاسان بێ.

لێرە کە خوا دەفەرموێ: بڵێ سروشم بۆ لا کراوە، کە کۆمەڵێك لە جند گوێیان گرتوە، وشەی (نَفَر)، (**النَّفَرُ: الجَمَاعَةُ مِنْ وَاحِدٍ إِلَى عَشَرَةٍ مِنَ الإِنْس وَالجِن**)، (**نَفَر**): کۆمەڵێك لە یەکەوە تاکو دە، بۆ مرۆڤ و بۆ جندیش، بەڵام لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا هاتوە کە: جندەکان دوازدە هەزار (١٢،٠٠٠) کەس بوون، کەواتە: وشەی (**نَفَر**) دەگونجێ لە لای هەندێك لە زانایان لە سێ وە تاکو دە بێ، یاخود لە یەکەوە تاکو دە بێ، بەڵام پێم وایە وێڕای ئەو واتایە، ئەوەش دەگەیەنێ: کۆمەڵێك، ئنجا ئەو کۆمەڵە زۆر بن یان کەم بن، هەر دەیگرێتەوە.

ئەم ئایەتە قورئانییەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەي پێغەمبەر ﷺ ئەوجارە هەستی نەکردوە بە ئامادەبوونی جندەکان و، گوێ گرتنیان لە قورئان خوێندنەکەی، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: بڵێ سروشم بۆ لا کراوە، کە کۆمەڵێك لە جند گوێیان هەڵخستوە، واتە: بۆ قورئان خوێندنەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام بێگومان وەك لە کورتە باسەکەدا باسمان کردو، لە هەندێك لە دەقەکانی سوننەتدا هاتوە، جارانی دیکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە مەبەستەوە چووە قسەی بۆ جند کردوەو، بانگی کردوون و قورئانی بۆ خوێندوون، بەڵام ئەوجارەیان خوا ﷻ ئاگاداری کردۆتەوە.

**٢)-** ﴿فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا﴾، (ئەوانە یەکسەر کە گوێبیستی قورئان بوون)، گوتوویانە: ئێمە قورئانێکی سەرسوڕهێنەرمان بیست، (**عَجَباً أي: بَدِيْعَاً مُبَايِناً لِكَلامِ النَّاس**)، واتە: شتێکی سەرسوڕهێنەرو جیا لە قسەی خەڵك، وشەی (**عَجَب**) چاوگە، (**العَجَب: الخَارِجُ مِنَ العَادَةِ، وَهُوَ مَصْدَرٌ وَصَف بِهِ للمُبَالَغَة**)، (**عَجَبْ**) شتێکە لە حاڵەتی ئاسایي

بە دەربێ و، چاوگە بە مانای سەرسوڕمان دێ، بەڵام کراوە بە ئاوەڵناو (**وَصف**) لەبەر زێدەڕۆیی، یانی: کە گوتوویانە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر، لە ئەسڵدا (**عَجَب**) بە مانای سەرسوڕمانەو چاوگە، بەڵام بۆ زێدەڕۆیی لە سەرسوڕهێنەریی قورئاندا، ئەو وەصفە بە شێوەی چاوگ هێنراوە.

٣)- ﴿يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ﴾، ئەم قورئانە خەڵك ڕێنمایی و ڕاستە ڕێ دەكات بەرەو سەر ڕاستیی، (**رُشد وَرَشَد**) بریتیە لە چاكەو ڕاستیی و ڕێنمایی، بەڵام هەر دە (١٠) قورئان خوێنەكە، لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە لێرەدا ئەم وشەیە بە (**رُشد**) دەخوێندرێتەوە، نەك بە (**رَشَد**)، ئەگەرنا (**رُشد ورَشَد**) یەك مانایان هەیە، بەڵام لێرەدا بە (**رُشد**) خوێندراوەتەوە.

٤)- ﴿فَـَٔامَنَّا بِهِۦ﴾، ئنجا بڕوامان پێی هێنا، ڕاناوی سەر: (**بِهِ**) بۆ قورئان دەچێتەوە، هەندێكیش گوتوویانە: بڕوامان پێهێنا واتە: بە موحەممەد ﷺ كە خوێنەرەوەی قورئانە، بەڵام مانای یەكەمیان ڕاسترە، چونكە ڕاناو بۆ نیزیكترین باسكراو دەچێتەوە، مادام ڕێگرێك نەبێ.

٥)- ﴿وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا﴾، هەرگیز ئێمە هاوبەش بۆ پەروەردگارمان دانانێین، واتە: هیچ كەس نە لە جندو، نە لە مرۆڤ و، نە لە فریشتان ناكەینە هاوبەش بۆ پەروەردگارمان، لە هیچ شتێكی پەروەردگارماندا، نە لە بەدیهێنەرایەتییدا، نە لە پەروەردگارێتییدا، نە لە خاوەنداریێتییدا، نە لە پەرستراوێتییدا، تا كۆتایی.

٦)- ﴿وَأَنَّهُۥ تَعَـٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا﴾، كە بە دڵنیایی مەزنیی پەروەردگارمان بەرزە، وشەی (**أَنَّه**) لێرەوە تاكو دوازدە لە ئایەتەكان كە دێن، زۆربەیان بە (**إِنّه**)یان خوێندوونەوە، بەڵام ئەو موصحەفانەی لەبەردەستی ئێمەدان، بەپێی خوێندنەوەی (**حفص**)ن، بۆیە (**حَفْص**)و ژمارەیەك لە زانایان پێیان وابوە بە (**أَنّه**) بخوێندرێنەوە، هەڵبەتە نكووڵییشیان نەكردوە كە بە (**إِنّه**)ش دەخوێندرێنەوە.

شوێنەكانیش ئەو دوازدەیەن:

١- ئایەتی ژمارە (٣): (وَإِنَّهُ تَعَالَى جَدّ رَبِنا).

٢- هەروەها ئایەتی ژمارە (٤): (وَإِنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنا).

٣- ئایەتی ژمارە (٥): (وَإِنَّا ظَنَنَّا).

٤- هەروەها ئایەتی ژمارە (٦): (وَإِنَّه كَانَ رِجَالٌ مِن الإنْس).

٥- ئایەتی ژمارە (٧): (وَإِنَّهُم ظَنُّوا).

٦- ئایەتی ژمارە (٨): (وَإِنَّا لَمَسْنَا السَّمَاء).

٧- ئایەتی ژمارە (٩): (وَإِنَّا كُنَّا نَقْعُد مَقَاعِد للسَّمْع).

٨- ئایەتی ژمارە (١٠): (وَإِنَّا لَا نَدْرِي).

٩- ئایەتی ژمارە (١١): (وَإِنَّا مِنَّا الصَّالِحُون).

١٠- ئایەتی ژمارە (١٢): (وَإِنَّا ظَنَنَّا أَن لَنْ نُعْجِز الله فِي الأَرْض).

١١- ئایەتی ژمارە (١٣): (وَإِنَّا لَمَا سَمِعْنَا الهُدى أَمَنَّا بِه).

١٢- ئایەتی ژمارە (١٤) شوێنی دوازدەیەم و کۆتایی کە بە هەردوو جۆرەکە خوێندراونەوە: (وأنّا مِنَا المُسْلِمُون)، (وإنّا مِنَا المِسْلِمُون).

ئنجا ئەگەر (أنَّه)بن، دەگێڕدرێنەوە سەر ئەو ڕستەیەی خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾، کە لێرەدا هەر دەبێ بە (أنَّه) بخوێنرێتەوە، چونکە (أنّه استمع) دەبێتە جێداری بکەر (نائب فاعل)، وەك لە ئایەتی ئایەتی (١٩)ی سوورەتی (الأنعام) دەفەرموێ: ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ﴾، قورئانخوێنان لەسەر ئەوە یەکڕان، هەروەها لەسەر ئەوەش یەکڕان کە (إنا سمعنا)، هەر بە ژێر (كسرة) دەخوێنرێتەوە.

شایانی باسیشە هەر کام لە: (علقمة و يحيى و أعمش و حمزة وكسائي و ابن عامر و خَلَفْ و حَفْص و سُلَّمي) هەموویان بە (أَنَّ)یان خوێندوونەوە: (يَنْصِبُون

(أنَّ) **في جَمِيْع السّورَة في اثْنَي عَشْر مَوضعاً**)، کە سەرژمێرمان کردن، (**القرطبي**) وا دەڵێ، کە وەك گوتمان: ئەگەر بە سەر (**فتحة**) بخوێندرێنەوە، هەموویان با دەدرێنەوە سەر ڕستەی یەکەم.

بەڵام ئەوانی دیکە کە زۆربەیانن بە ژێر (**کسر**)یان خوێندوونەوە، بە (**إنَّ**): (**القرطبي**) دەڵێ: ئەوەشیان ڕاستە (**وَهُوَ الصَّوَاب**)، کە بە بۆچوونی من دەبووایە گوتبای: (**وَهُوَ أَصْوَب**)، چونکە ئەوی دیکەش هەر ڕاستە، ئنجا ئەگەر بە (**إنَّه**) بخوێندرێتەوە، هەموویان دەگێڕدرێنەوە سەر فەرمایشتی خوا، کە لەسەر زمانی جند دەفەرموێ: (**فقَالُوا إنَّا سَمِعْنَا قرآناً عَجَباً**)، نەك (**أُوحيَ إليَّ أنَّه اسْتمع**)، یانی: دەگێڕدرێنەوە بۆ سەر قسەی (**جند**) و هەموویان دەبن بەوەي ڕاستەوخۆ قسەی جندن، چونکە بێگومان ئەو قسەیە هی جندە، بەڵام هەموو قورئان خوێنەکان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەو چوار شوێنە بە (**أنَّه**) دەخوێندرێنەوە:

١- (**أنَّه اسْتَمَع نَفَرٌ مِنَ الجِن**).

٢- (**وَأَنَّ لَو اسْتَقَامُوا**).

٣- (**وَأَنَّ المَسَاجِد لله**).

٤- (**وَأَن قَد أَبْلَغُوا رِسَالَات رَبِهِم**).

هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن دەبێ (**أنَّ**) لەو چوار شوێنەدا بە سەر (**فَتْحة**) بخوێندرێنەوە، هەروەها ڕاجیاییشیان نیە لەوەدا کە هەموو ئەو وشانەی لە دوای (**قول**)ەوە هاتوون، وەك: (**فَقَالُوا إنَّا سَمِعْنَا**) دەبێ بە ژێر (**كسرة**) بخوێندرێنەوە:

١- (**فَقَالُوا إنَّا سَمِعْنَا**)، ٢- (**قُل إنَّمَا أدْعُوا**)، ٣- (**قُلْ إنْ أدْرِي**)، ٤- (**قُلْ إنِّي لَا أَمْلِكُ**)، قورئانخوێنان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەموویان بە ژێری هەمزەکە دەخوێندرێنەوە، هەروەها ڕاجیاییشیان نیە، لەسەر ئەوە کە هەموو ئەو ڕستانەی لە دوای (**فاء الجزاء**)ەوە هاتوون، وەك: ١- (**فإنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّم**)، ٢- (**فَإنَّهُ يَسْلِك مِنْ بَيْن يَدَيْه**)، ئەوانەش هەموویان بە ژێری هەمزەکە، بە (**إنّ**) دەخوێندرێنەوە.

ئەمە (**القرطبي**) لە تەفسیرەکەی خۆی[١] هێناویەتی.

(**فخرالدين الرازي**)یش هەر لەو بارەوە لە تەفسیرەکەیدا، وەك بنچینەیەك گوتوویەتی:

{**أجمعوا على أن قوله: (أنه استمع) بالفتح، وذلك لأنه نائب فاعلٍ.. وأجمعوا على كسْر إنا في قوله: (إنا سمعنا قرآناً عجباً)، لأنه مبتدأ محكيٌّ بعد القول، ثم ههنا قراءتان، إحداهما: أن نحمل البواقي على الموضِعَيْن اللذين بيّنّا أنهم أجمعوا عليهما، فما كان من الوحي فُتِحَ، وما كان من قول الجن كُسِرَ، وكلّها من قول الجن إلاّ الآخرين وهما: (وأن المساجد الله)، (وأنه لما قام عبدالله) وثانيهما: فتح الكل، والتقدير: فآمنَّابه وآمنّا بأنه تعالى جَدُّ ربِّنا...**}[٢].

واتە: زانایان یەکدەنگن کە: (**أنه استمع**) بەسەر (**فتح**)، دەخوێندرێتەوە، چونکە جێگری بکەر (**نائب فاعل**)ە، هەروەها یەکدەنگن لەسەر بە ژێر (**كَسْر**) خوێندنەوەی: (**إنا سمعنا قرآناً عجباً**)، چونکە نیهادێکی گێڕراوەیە دوای گوتن (**قول**)، ئنجا لێرەدا دوو خوێندنەوە هەن:

**یەکیان:** کە سەرجەم شوێنەکانی دیکە بە پێی ئەو دوو جێیە دابنێین کە گوتمان لەسەریان یەکدەنگن، ئنجا هەرچی لەوەحییەوە بوو بەسەر (**فتح**) بێ و، هەرچی لە قسەی جند بوو بە ژێر (**كَسْر**) بێ کە هەمووشیان جگە لە دووەکەی کۆتایی، قسەی جندن کە بریتین لە: (**وأن المساجد لله**) و (**وأنه لماقام عبدالله**).

**دووەمیان:** کە هەموویان بەسەر (فتح) بخوێنرێنەوە بە بەمەزەنەکردنی: بڕوامان پێهێناو بڕوامان هێنا کە مەزنیی پەروەردگارمان بەرزە...

٧)- ﴿مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾، نە هاوەڵی هەیە (هاوەڵی هاوسەر)و نە ڕۆڵەشی هەیە، هەڵبەتە ئەمە بەرپەرچدانەوەی قسەی جندە کافرەکان و، مرۆڤە هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوایەکانە.

---

(١) ج٢٠، ص٩٨.

(٢) التفسير الكبير أو مفاتيح الغيب، المجلّد ١٥، الجزء الثلاثون، ص ١٤١.

وشـەی (جَـدُّ) بـە مانـای مەزنیـی (عَظمـة) دێ، چونکـە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ گێردراوەتـەوە فەرموویەتـی: {كَانَ الرَّجُـلُ إِذَا قَـرَأَ الْبَقَـرَةَ وَآلَ عِمْـرَانَ جَـدَّ فِينَـا، أَيْ: عَظُمَ} (أخرجـه أحمـد ١٢٢٣٦، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده صحيـح علـى شرط الشـيخين)، هـەر پیاوێـك ئەگـەر سـوورەتی (الْبَقَـرَةَ وَآلَ عِمْـرَانَ)ی خوێندبـان و زانیبانـی (لـە بـەری کردبـان یـان شـارەزایان بووایـە)، لـە چاومانـدا گـەورەو مـەزن دەبـوو.

٨)- ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا﴾، هەروەها بە دڵنیایی نەفامەکەمان لەسەر خوا ﷻ قسەی زۆر دوور لە ڕاستییەوە دەکات، کە دەڵێن: (سَفِيهُنا) کەودەنەکەمان دەگونجێ مەبەست پێی تێکڕای نەفامەکانیان بێ، لە جندە کافرەکان، دەشگونجێ مەبەست پێ ئەوەیان بێ، کە لە هەموویان نەفامترە، کە ئیبلیسە.

(شَـطَط: أي قَـوْلاً ذَا شَـطَطٍ أي بُعـدٍ وجَـوْرٍ، شَـطِطَ الـدّارُ: بَعُـدت)، کـە دەڵێن: (شَـطَطا) یـانی: قسـەیەکی زۆر دوور کەوتـووەوە لـە ڕاسـتیی کـرد لەسـەر خـواو پاڵدایـە لای خوا، کـە بریتیـە لـە پاڵویدانـی هاوبـەش و هاوسـەرو ڕۆڵە بـۆ لای.

٩)- ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾، واتە: ئێمە پێمان وابوو مرۆڤ و جند لەسەر خوا ﷻ درۆ ناکەن (درۆ بە ناوی خواوە ناکەن، درۆ پاڵ نادەنە لای خوا یاخود درۆ بۆ خوا هەڵنابەستن)، (تَقُول) خوێنراوەتەوەش: (تَقَوَّل)، ئەو کاتەش: (كَذِباً، أي: قَوْلاً كَذِباً)، (كذباً) یانی: قسەیەکی درۆ، یاخود: (قَوْلاً مَكْذُوباً فِيْهِ) قسەیەك کە درۆی تێدابێ، ئەویش بریتیە لە پاڵدانی هاوسەرو ڕۆڵە بۆ لای خوا ﷻ، واتە: ئێمە پێشێ واماندەزانی مرۆڤ و جند هەرچی بیڵێن وایە، نەماندەزانی کە بەناوی خواوە درۆ دەکەن و درۆ دەدەنە پاڵ لای خوا.

١٠)- ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾، بە دڵنیایی پیاوانێك لە مرۆڤان پەنایان دەبردە بەر پیاوانێك لە جندەکان، بۆچی پەنایان پێ دەبردن؟ لە کاتێکدا دەچوونە دەشت و ساراو چۆڵاییەك، شوێنێکی چۆڵ و بەسام، کابرا دەیگوت: پەنا دێنمە بەر گەورەکانی جندو ڕیش سپییەکانیان لە جندەکان چەپاڵەم بدەن و بمپارێزن.

**١١)- ﴿ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴾**، (بەڵام ئەو جندانەی پەنایان پێ دەبردرا)، مرۆڤە پەنابەرەكانیان هەر زیاتر گومڕا دەكرد، یان: ناڕەحەتییان زیاتر دەهێنانە سەرێ، یاخود: پیاوە مرۆڤەكان كە پەنایان دەبردە بەر پیاوانی جند، دەبوونە هۆی ئەوەی زیاتر تووشی ناڕەحەتییان بكەن و پتر گومڕا دەبوون و، لە خۆیانبایی دەبوون و دەیانگوت: تەماشا بكەن! مرۆڤەكانیش پەنا دێننە بەر ئێمە!.

**١٢)- ﴿ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا ﴾**، (دیارە جند لە نێو خۆیاندا، ئەو قسەیە دەكەن و دەڵێن:) ئەی جندەكان! مرۆڤەكانیش پێیان وابوو، وەك چۆن ئێوە پێتان وایە، كە خوا هیچ كەس زیندوو ناكاتەوە، یاخود: خوا هیچ كەس نانێرێ بە پێغەمبەر ﷺ، چونكە وشەی (**بَعث**) مانایەكەی بەپێی سیاق و مەقام دەگۆڕێ، لێرەشدا هەردوو واتایەكە هەڵدەگرێ، واتە: كە خوا ﷻ كەس زیندوو ناكاتەوە، ئەو بیرۆكەیە هەبووە لەنێو مرۆڤان و لە نێو جندیشدا، كە خوا ﷻ كەس زیندوو ناكاتەوە، هەروەها ئەوەش هەر هەبووەو هەیە كە خوا ﷻ كەس نانێرێ وەك پێغەمبەر، پێیان وابووە لە دوای عیساوە، خوا هیچ پێغەمبەری دیكە نانێرێ.

لێرەدا ئەم دەقە دێنین لە (**الطبري**)ەوە كە لە (**قتادة**)وە دەیهێنێ، (**قتادة**) گوتوویەتی: (**ذُكِرَ لَنَا هَذَا الحَيّ مِنَ الْعَرَبَ كَانُوا إِذَا نَزَلُوا بِوادٍ قَالُوا: نَعُوذُ بِأَعَزِّ أَهْلِ هَذَا المَكَانِ، قَالَ الله: ﴿ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴾ أي: إِثْمَاً، وَازْدَادَتِ الجِنُّ عَلَيْهِم جُرْئَةً**) (**جامع البيان: ٣٥١٦٨**)، واتە: بۆمان باسكراوە كە عەرەبەكان ئەگەر دابەزیبانایە شوێنێك (شوێنێك لە كاتی سەفەریاندا)، دەیانگوت: پەنا دەبەینە بەر باڵادەسترین و بەهێزترینی خەڵكی ئەم شوێنە، واتە: كێ باڵادەستە، كێ سەرۆكە لە جندەكان، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴾، كە چی گوناهیان بۆ زیادكردن و جندەكانیش زیاتر بوێرییان لەسەریان پەیدابوو، مرۆڤەكان بۆیە گوناهیان بۆ زیاد بوو، چونكە هاوبەشیان بۆ خوا دانا، كە پەنایان بە جگە لە خوا گرت، جندەكانیش بۆیە زیاتر تووشی زیان بوون، چونكە ئەوانیش لە خۆبایی بوون و بوغرا بوونیان تێدا زیاد بوو.

**مەسەلەی دووەم:**

**جند دوای سۆراغ و پشکنینی ئاسمان، بۆیان دەرکەوتوە کە ئاسمان پڕکراوە لە ئێشکچیی و بڵێسە، کە پێشتر لە چەند شوێنێکی ئاسمان دانیشتوون، بۆ گوێگرتن لە قسەی فریشتان، بەڵام ئێستا ئەو بوارەیان نەماوەو نەشیانزانیوە، ئایا ئەو گۆڕانکارییە بۆ خەڵکی سەر زەوی خێرە یان شەڕە؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ ﴾، {خوێندراویشەتەوە: **(وإنَّا)**} بە دڵنیایی ئێمە ئاسمانمان پشکنی، **(الطبري)** دەڵێ: **(طَلَبْنَا السَّمَاءَ وَأَرَدْنَاهَا)** واتە: ئاسمانمان خواست و بۆی گەڕاین، **(طَلَبْنَا بُلُوغهَا لِسمَاع أهْلِهَا)**، ویستمان بیگەینێ بۆ ئەوەی گوێ لە دانیشتووەکانی بگرین کە فریشتەکانن، یاخود **(لَمَسْنَا السَّمَاءَ)** واتە: **(لَمَسْنَا خَبَر السَّمَاء، طَلَبْنَا خَبَرَهَا)** هەواڵی ئاسمانمان ویست و سۆراغمان کرد.

٢)- ﴿ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴾، کە چی بینیمان و لێمان هەڵکەوت، پڕکراوە لە پاسەوانی سەخت و توندو بڵێسەکان، **(حَرَس جَمْعُ حَارِس، مِثْل خَدم وَخَادِم)**، واتە: پاسەوانەکان، **(شَدِيْد)**یش سیفەتی **(حَرَس)**ە، کە ئەگەر مانایەکەی ڕەچاو کرابایە، دەبوو فەرمووبای: **(حَرَسَاً شِدَاداً)**، چونکە **(حَرَس)** ناوی کۆیە، بەڵام لەبەر ئەوەی کێشی **(فَعِيْل)** بۆ تاك و بۆ کۆ، دێ، بۆیە بە **(شَدِيْد)** هاتوە، **(شُهُب)**یش کۆی **(شِهَاب)**ە، **(شِهَاب)** بە مانای بڵێسە دێ، **(شُهُب)** واتە: بڵێسەکان، واتە: ئێمە ئاسمانمان بینی دوای ئەوەی پشکنیمان و سۆراغمان کرد، پڕکراوە لە ئێشکچییان و بڵێسان، ئێشکچییەکان بە دڵنیایی فریشتەکانن، بڵێسەکانیش ئەوەی بۆ ئێمە زانراوە، ئەو پارچانەن کە لە ئەستێرەکان

و خڕۆکەکان جیا دەبنەوە، بەڵام ڕەنگە بڵێسەی دیکەی مەعنەوییش هەبن، کە ئێمە زانیارییمان لەو بارەوە نیە، گرنگ ئەوەیە ئەم وشە قورئانییە - کەپێشتر لە کورتە باسەکەشدا گوتمان - وەك چۆن پارچەکانی ئەستێرەکان و خڕۆکەکان دەگرێتەوە، ڕێگر نیە کە شتی دیکەش هەبێ، فریشتەکان بیگرنە شەیتانەکان، پلارو بڵێسەی مەعنەویی کە ئێمە نەزانین چۆنە؟!

بەڵام بەدڵنیایی خوا ﷻ ئەوەی بڕیوەتەوە، کە ئەستێرەکان وێڕای جوانیی بۆ ئاسمان، ئاسمانی نزیکتر لە ئێمە، بەکاریش دەهێنرێن بۆ بڵێسەباران و تیرباران کردنی شەیتانەکان، کەواتە: بێگومان پارچە ئەستێرەو خڕۆکەکان کە دەبنە بڵێسە، بەکاردەهێنرێن بۆ تیربارانکردنی شەیتانەکان، بەڵام ئایا وێڕای ئەوە شتی دیکەش هەیە، یان نا؟ ئایەتەکە ڕێی لێ ناگرێ شتی دیکەش هەبێ.

٣)- ﴿ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ﴾، هەروەها بە دڵنیایی ئێمە پێشتر لە ئاسمان هەندێك نشینگەمان هەبوون بۆ گوێگرتن، **(وإنَّا كنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقاعِدَ كَائِنةٍ لِلسَّمِع)**، هەندێك نشینگەمان بوون کە بۆ گوێگرتن گونجاو بوون، بۆ ئەوەی تێیاندا بچینە بۆسەوەو، گوێ لە قسەی فریشتەکان بگرین، پێشتر وابووین.

٤)- ﴿ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴾، بەڵام هەر کەس ئێستا گوێ هەڵخا، {بۆ هەواڵی ئاسمان و لە قسەی فریشتەکان}، بڵێسەیەکی لە بۆسەدای چنگ دەکەوێ، لێ هەڵدەکەوێ، **(رَصَد، أي: رَاصِداً)**، بۆسە گرتوو، هەروەها **(رَصَد)** بە مانای لە بۆسەنراو **(مَرْصُود)**یش دێ.

٥)- ﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەروەها ئێمە ناشزانین ئایا ئەوانەی لەسەر زەویین، بەو گۆڕانکارییە زیانیان بۆ ویستراوە؟

٦)- ﴿ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴾، یان پەروەردگاریان سەر ڕاستیی و بە مراد گەیشتنی بۆ ویستوون، بەو گۆڕانکارییە، **(رَشَداً، أي: خَيْراً وَصَلَاحَاً، عَكْسَ الشَرّ وَالفَسَاد)**، **(رشد)** واتە: چاکەو بەرژەوەندیی، پێچەوانەی خراپەو زیان.

(القرطبي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا[1] ئەم دەقە دێنی: (قِيلَ لِلزُّهْرِيِّ: أَكَانَ يُرْمَى فِي الْجَاهِلِيَّةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: أَفَرَأَيْتَ قَوْلَهُ تَعَالَى: ﴿ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ ﴾، قَالَ: غُلِّظَتْ وَشُدِّدَ أَمْرُهَا حِينَ بُعِثَ النَّبِيُّ ﷺ)، زوهری (كە یەكێكە لە زانایانی شوێنكەوتووان) پێی گوتراوە: ئایا لە سەردەمی نەفامیشدا (پێش ڕەوانەكرانی پێغەمبەری كۆتایی)، ئەو بڵێسانە هەر هاویشتراون بۆ شەیتانەكان؟ گوتوویەتی: بەڵێ، دەڵێ: پێمگوت: {ئەو كەسەی لە زوهری پرسیوە}، ئەدی قسەی خوای بەرز كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ ﴾؟!.

ئێمە پێشتر چەند نشینگەیەكمان لە ئاسمان هەبوون بۆ گوێگرتن، هەر كەسێك ئێستا گوێ بگرێ بڵێسەیەكی لە بۆسەدای بۆ دانراوە؟

زوهری گوتی: ئێستا ئەو پاراستن و پاسەوانیی كردنەی ئاسمان بەهێزتر بووەو، كارەكەی زیاتر قایم كراوە، دوای ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ڕەوانكراوە، وەك پێشتریش باسمان كرد، ئەو گۆڕانكارییەی بووە، هەر ئەوەیە كە ئەو بڵێسانە زیاتر كراون و، فریشتەكان زیاتر كراون لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، پێشتریش گوتم: لە سەردەمی هەموو پێغەمبەرانیشدا هەر وابووە، بەڵام ئەو ماوەیەی كەوتۆتە نێوان لە دایكبوونی عیسا ؈ لە یەك (١)ی زایینی تاكو ڕەوانەكرانی موحەممەد ﷺ لە (٦١٠) زایینی، ئەو ماوەی (٦١٠) ساڵە كە شەش سەدە بووە، جندەكان پێیان وابووە هەر وابووەو، لەو فەترەیەدا كە وەحیی نەهاتووە، ئەو ئێشكگرتنە لە ئاسمان كەمبۆتەوە، لەبەر ئەوەی وەحیی نەهاتووە بۆ پێغەمبەران، تاكو مەترسیی ئەوە هەبێ شەیتانەكان دەستكاریی بكەن و بیدزن.

واتە: بەردەوام جۆرێك لە پاراستنی ئاسمان و ئێشكە لێگرتنی هەر بووە، بەڵام دوای ئەوەی موحەممەد پێغەمبەری كۆتایی ﷺ نێردراوە، یەكجاریی

---

(١) ج٢٩، ص١٢.

ئـەو ڕێیـە بەسـتراوە، کـە وەك گوتـم هەرچەنـدە سـەرنجی ئایەتـەکان دەدەیـن، ئـەو قەناعەتەمـان بـۆ پەیدادەبـێ، کـە وێـڕای ئـەو پارچـە ئەسـتێرەو خڕۆکانـەی دەیانبینیـن، کـە دێنـە نێـو مـەودای بەرگـە هـەوای زەوییـەوە، کـە کوردەواریـی خۆمـان دەڵـێ: ئەستێرەیەو ڕادەخـزێ، کە لـە ڕاستییدا هەموویـان پارچـە ئەسـتێرەو پارچـە خڕۆکـەن، وێـڕای ئـەوە دەبـێ ئـەو فریشـتانە جۆرێکـی دیکـەش لـە دەرکـردن و، ڕێ لێگرتنـی شەیتانەکانیشـیان هەبـێ، کـە ئێمـە نایزانیـن چۆنـە، ڕێشـی تێدەچـێ کـە بەهـۆی جووڵـەی فریشـتەکانەوە، ژمـارەی ئـەو پارچـە بڵێسـانە، پارچـە نەیـزەك و خڕۆکانـەی دەبنـە بڵێسـە زیاتـر ببـێ.

ئنجا ئەگـەر ئێمـە تەماعـی ئەوەمـان هەبـێ لـە هەمـوو نهێنییەکانـی فەرمایشـتی خـوا تێبگەیـن و، لـە هەمـوو چەمـك و واتایەکانـی بـە تەواویـی حاڵیـی بیـن، مانـای وایـە تەماعێکـمان هەیـە لـە جگـە لـە جێـگای خۆیـدا، وەك عـەڕەب دەڵێـن: (**طَمَعٌ فِي غَيْرِ مَطْمَعٍ**)، بـەس خـوا ﷻ بـە هەمـوو نهێنییەکانـی فەرمایشـتی خـۆی زانایـە.

## مەسەلەی سێیەم:

**جندیش وەك مرۆڤان چاك و خراپیان تێدان و، كۆمەڵ و تاقمی زۆرو جۆراوجۆرن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ١١﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە چاكانمان لە نێودا هەن، (صَالِح) لە (صَلَح) ەوە هاتوە، (صَلَحَ) واتە: چاك بوو، (صَالِح) ناوی بكەر (**إسم فاعل**)ە، واتە: چاك، كەسێك كە چاكە دەكات، یانی: ئێمە چاكەكارمان تێدا هەن.

٢)- ﴿وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ﴾، هەروەها جگە لە چاكەكارانیشمان تێدا هەن، واتە: كەسانی خراپەكاریشمان هەن.

٣)- ﴿كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا﴾، پێشتر ئێمە (خاوەن) ڕێبازی جۆراجۆر بووین، وشەی (**طَرَائِق**) كۆی (**طَرِيْقة**)، (**طَرِيْقة الرَّجُلُ: مَذْهَبُهُ، القِدد: جَمْعُ قِدة، وَهِيَ دُرُوب وَأَجْنَاس مُخْتَلِفَة، وَالقِدَّة القِطْعَة**)، (**طَرِيْقة**) بە مانای ڕێبازو بەرنامەو ڕێ و شوێنێكە كە پیاو پێیدا دەڕوا، (**قِدَد**) كۆی (**قِدَة**)یەو، بە مانای جۆر دێ، یانی: ڕێ و شوێن و جۆرە جیاوازەكان، (**قِدَّة**) ش بە مانای پارچەیە.

كە دەفەرموێ: ﴿كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا﴾، (**قِدداً**) بۆ جەختكردنەوەی واتای (**طَرَائِق**)ە، واتە: ئێمە شوێنكەوتووی ڕێبازە جۆراو جۆرەكان، چونكە هەر ڕێبازێك بە پارچە (**قِدَّة**)یەك دانراوە، (**قِدّ**)یش بە زوێڵە چەرمێك دەگوترێ، كە لە پێستێكی دەباغ نەكراو دەبڕدرێ، بە كوردیی پێی دەڵێن: زوێڵ، بە عەرەبیی پێی دەڵێن: (**سَيْر**)، واتە: زوێڵە چەرم، پارچە چەرم كە لێی دەكرێتەوە بە باری درێژییدا، عەرەب دەڵێن: (**مَالَهُ قِدٌّ وَلَا قِحْفٌ**)، نە (**قِدّ**)ی هەیە، نە (**قِحْف**)ی هەیە، (**قِدّ**) دەفرێكە لە پێست دروست دەكرێ، (**قِحْف**)یش دەفرێكە لە دار دروست دەكرێ.

بـە کورتیـی: جنـدەکان ئـەو ڕاسـتییە ڕادەگەیەنـن، کـە ئێمـە هـەم خەڵکـی چاکەکارمـان هەیـە، هـەم خەڵکـی جیـا لەوەشـمان هەیـە، یـانی: خەڵکـی خراپەکاریشـمان هەیـەو، ئێمـە پێشـتر ڕێبازگەلـی جۆراوجـۆر بوویـن، واتـە: شـوێنکەوتەی ڕێبـازە جۆراوجـۆرەکان بوویـن.

منیـش بـۆم دەرکەوتـوە کـە جنـد زیاتـر شـوێنکەوتووی مرۆڤانـن، لە هەر شـوێنێك بـن، لـە دەوری جوولەکـەی مـرۆڤ، جنـدی جوولەکـە هـەن و، لـە دەوری جنـدی نەصڕانیـی، هـی نەصڕانیـی و، جنـدی مسـوڵمانیش لـە دەوری مسـوڵمانان هـەن، هەروەهـا لـە نێـو مسوڵمانانیشـدا وەك لایەنـە سیاسـییەکان و لایەنـە فکرییـەکان، جنـد زیاتـر کارتێکـراون بـە مرۆڤـان، چاکیـان شـوێن چاکیـان دەکـەون و، خراپیشـیان شـوێن خراپیـان دەکـەون.

هـەم بـە پێـی ڕواڵەتـی مانـای ئایـەت و فەرمـوودەکان، ئـەوە زانـراوەو، هـەم لـە ڕێـی تایبەتیـی خۆشـمەوە، کـە بـە شـێوەی ناڕاسـتەوخۆش پرسـیارم لێکـردوون، ئـەوان بەڕۆشـنیی ئـەوە ڕادەگەیەنـن، کـە ئێمـە زیاتـر لـە ژێـر کاریگەریـی مرۆڤەکاندایـن، چاکـمان لـە ژێـر کاریگەریـی چـاکی مرۆڤـان دایـەو، خراپیشـمان لـە ژێـر کاریگەریـی خراپـی مرۆڤاندایـە.

## مەسەلەی چوارەم:

**جند زانیویانە کە لە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خوا دەرناچن، لە هەرجێیەکی سەر زەوی بن و، ئەگەر ڕاشبکەن و بیانەوێ لە مەودای ڕکێفی وی بچنە دەر، دەرباز نابن و، کاتێکیش گوێبیستی ڕێنمایی خوا بوون، یەکسەر بڕوایان پێ هێناوە، بابای بڕواداریش نە مەترسیی کەمکردنەوەی پاداشتی هەیەو، نە مەترسیی زیادە خستنەسەر گوناهەکانیشی هەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعۡجِزَ ٱللَّهَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَن نُّعۡجِزَهُۥ هَرَبٗا ١٢ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعۡنَا ٱلۡهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦۖ فَمَن يُؤۡمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخۡسٗا وَلَا رَهَقٗا ١٣ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعۡجِزَ ٱللَّهَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە زانیمان کە لەسەر زەوی خوا ﷻ دەستەوسان ناکەین، لێرەدا وشەی (**ظن**) بە مانای دڵنیایی (**يقين**) و بە مانای زانیاریی (**علم**) دێ، چونکە بنچینەیەك هەیە پێشتریش باسمان کرد، کە دەڵێ: (**ظَنُّ الْمُؤْمِنِيْنَ يَقِيْنٌ، وَظَنُّ الكُفَّارِ شَكٌّ وَتَرَدُّدٌ**)، کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: وشەی گومان هەر کاتێك بۆ ئەهلی ئیمان بەکارهاتبێ لە قورئاندا، بە مانای دڵنیایی و زانیارییە، بەڵام ئەگەر بۆ بێبڕوایان بەکارهاتبێ، بە مانای دوو دڵیی و دڵ لە دڵدانە.

کە جند دەڵێن: (**وإنَّا ظَنَنَّا أنْ لَنْ نُعْجِزَ اللهَ فِي الأرْض**)، (**الإعْجَاز: جَعْلُ الغَيْرِ عَاجِزاً**)، واتە: دەستەوسانکردنی بەرانبەرو بێ دەسەڵات کردنی، یانی: ئێمە زانیمان کە ناتوانین لەسەر زەوی خوا بێ دەسەڵات و دەستە پاچە بکەین، واتە: لە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی خوا دەربچین لەسەر زەوی.

٢)- ﴿ وَلَن نُّعۡجِزَهُۥ هَرَبٗا ﴾، هەروەها زانیشمان کە هەرگیز بە هەڵاتنیش خوا دەستەوسان ناکەین، واتە: زانیمان و دڵنیابووین کە نە لەسەر زەوی توانامان بەسەر خوادا هەیەو، نە بە ڕاکردنیش لێی دەرباز دەبین و لە دەسەڵاتی خوا قوتار دەبین.

٣)- ﴿ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعۡنَا ٱلۡهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە هەر لەگەڵ گوێبیستی ڕێنمایی بووین، بڕوامان پێهێنا، وشەی (**هُدَى**) دەگونجێ مەبەست پێی قورئان بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی کۆی ئەو ئایین و بەرنامەیە بێ کە خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خۆی ﷺ دایبەزاندوە، وشەی (**لَمَّا**) وەك پێشتریش گوتوومانە: کاتێکی دیارییکراو دەگەیەنێ.

کە دەڵێن: ﴿ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعۡنَا ٱلۡهُدَىٰٓ ﴾، (**أي: لَمَّا سَمِعْنا القُرْآن الحَاوِيَ عَلَى الهُدَى أَمَنَّا بِهِ مِنْ غَيْرِ تَلَعْثُمٍ، وَذَلِك لأنَّ الْمُؤْمِنَ بِرَبِّهِ لَا يَخَاف نقصاً فِي أَجْرِهِ وَلَا زَيَادَةً فِي وِزْرِهِ**)، یانی: هەر کە گوێمان لە قورئانی ڕێنمایی وەخۆگر بوو، بڕوامان پێ هێنا، بەبێ تەتەڵەکردنی زمان، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە بڕوادار بە پەروەردگاری، نە مەترسیی کەمکردنەوەی پاداشتەکەی و نە زیاد کردنی گوناهەکەی هەیە.

٤)- ﴿ فَمَن يُؤۡمِنۢ بِرَبِّهِۦ ﴾، بە دڵنیایی هەر کەسێك بڕوا بە پەروەردگاری بهێنێ، (**مَنْ**): (**مَنْ**)ی (**الشَّرْطِيَّة**)یە، یاخود مانای مەرج دەگەیەنێ، هەر کەسێك بە مەرجێك ئیمان بهێنێ بە پەروەردگاری.

٥)- ﴿ فَلَا يَخَافُ بَخۡسٗا وَلَا رَهَقٗا ﴾، {ئەم (**ف**)ە بۆ وەڵامی مەرجەکەیە}، بە دڵنیایی مەترسیی کەمکردنەوەی نیە، مەترسی زیاد کردنیشی نیە، یانی: مەترسیی کەمکردنەوەی پاداشتی نیە، مەترسیی زیادکردنی پاداشتیشی نیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعۡنَا ٱلۡهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە جندیش وەك مرۆڤان ئەرکدار کراون، چونکە دەڵێن: هەر لەگەڵ گوێبیستی فەرمانی خوا بووین، بڕوامان پێهێنا، دواییش دەڵێن: هەر کەسێك بڕوا بە پەروەردگاری بهێنێ، نە مەترسیی کەمکردنەوەی پاداشتی هەیە، نە مەترسیی زیادکردنی سزای هەیە.

کەواتـە: جندیـش وەك مرۆڤـان - وەك پێشـتر گوتمـان و بەڵگەشـمان لـەو بـارەوە هێنانـەوە لـە نێـو کورتـە باسـەکەدا - ئەرکـدار کـراون و، ئەوانیـش دوێـنراون بـە بەرنامەکانـی خـواو، پێغەمبـەران بـۆ ئەوانیـش نێـردراون، کەواتـە: ئـەوەی هەندێـك لـە توێژەرەوانـی قورئـان گوتوویانـە لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەدا کـە دەفەرمـوون: ﴿ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە کاتێـك گوێبیسـتی ڕێنمایـی بوویـن، بڕوامـان پێهێنـا، بـۆ وێنـە:

(**إبـن عاشـور**) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1] دەڵـێ: (**وَهَـذَا لَا يَقْتَـضِي أَنَّ الْجِـنَّ مُكَلَّفُـونَ بِشَرَائِـعِ الْإِسْـلَامِ**)، واتـە: ئەمـە خوازیـاری ئـەوە نیـە کـە جندیـش ئەرکـدار کـراون، پابەنـد کـراون بـە بەرنامەکانـی ئیسـلام، دەڵێیـن: بـە پێچەوانـەوە: ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئەوانیـش ئەرکدارکـراون بـە بـڕوا هێنـان بـە ئیسـلام و پابەندیـی بـە ئیسـلامەوە، مانـای ئایەتەکـەش زۆر ڕوونـەو پێـم وایـە (**إبـن عاشـور**) لـەوەدا خـراپ بەهەڵـەدا چـووە!.

هەرچەنـدە پێشـتریش لـەو بـارەوە دواویـن، بـەڵام ئەمـەش چەنـد بەڵگەیـەکی دیکـە بـە کورتیـی و گوشراویـی:

١- جندیش وەك مرۆڤان ئەرکدار کراون بە خواپەرستیی و لەسەریان پێویست کراوە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾**الذاريات**، واتە: جندو مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە هێناونەدی کە بمپەرستن.

٢- هەروەها خوا لە سوورەتی (**الرحمن**)دا سی و یەك (٣١) جاران جندو مرۆڤان دەدوێنێ، کە لە یەکێك لە دواندنەکانی دا خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: ﴿ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئەگەر توانیتان دەربچن لە سنوورەکانی ئاسمان و زەوی، دەربچن، بەڵام دەرناچن مەگەر بە دەسەڵات (دەسەڵاتەکەشتان نیە).

---

(١ ) التحرير والتنوير، ج:١٢، ص:٢٣٣.

بێگومانیــش جنــد و مــرۆڤ بــە مەبەســتی ڕاکــردن لــە ســزای خــوا هەوڵــی دەرچــوون لــە ســنوورەکانی ئاســمان و زەوی دەدەن.

٣- هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾﴾، واتە: خۆمانتان بۆ یەکلایی دەکەینەوە، ئەی دوو دروستکراوە قورسەکە، کە سەر زەویتان قورس کردوە، ئنجا مادام خوا خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ سزاو پاداشتی جندو مرۆڤ، کەواتە: دیارە هەردووکیان هەم سزاشیان هەیەو هەم پاداشتیشیان هەیە، ئەوەش زۆر ڕوونە، بەڵام نازانم (**إبن عاشور**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ بۆچی ئەوەی گوتوەو، هەندێکی دیکەش لە زانایان جۆرێك لەو جۆرە بیرۆکەو ئیعتیقادانەیان هەبووە.

کــە خــوا دەفەرمــوێ: ﴿فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ﴾، بــە دڵنیایــی هــەر کەســێ بــڕوا بهێنــێ بــە پــەروەردگاری، ﴿فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾، نــە ترســی کەمکردنەوە(**بَخْس**)ی هەیــە، نــە ترســی زێــدە خستنەســەر (**رَهَــق**)ی هەیــە، (**البَخْــسُ: الغَــبْن فِي الأَجْــرِ وَنَحْــوِه، وَالبَخْــس: الإنْقَــاص**)، (بخــس): بریتیــە لــە لــێ داشــکان و زیــان وەبــەر کەوتــن، لــە پاداشــت و وێنــەی ئــەوەدا، هەروەها(**بخس**)لــێ کەمکردنەوەشــە.

(**رَهَــق: أي ظُلْـم فِي الأَعْـمَال السَّـيئَة بِالإضَافَـة إِلَيْـهَا**)، (**رَهَــق**) واتــە: ســتەم و خســتنە ســەری ســزای زیــاد، واتــە: نــە لــە پاداشــتی کــردەوە چاکەکانــی کــەم دەکــرێ و، نــە لــە ســزای کــردەوە خراپەکانیشــی زیــاد دەکــرێ.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**جندیش کەسانی بۆ خوا ملکەچ و هی لادەریشیان تێدان، بێگومان ملکەچان لەسەر ڕاستیی و بە مراد گەیشتن خەفتاون و، دەستگیریشیان کردوە، بەڵام کافران و لادەران و ستەمکاران دەبنە سووتەمەنیی دۆزەخ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ ﴾، هەروەها بە دڵنیایی ئێمە ملکەچانیشمان هەن و لادەرانیشمان هەن، (مُسْلم) لەسەر کێشی (**مُفْعِلْ**) ناوی بکەر (**إسم فَاعِل**)ە، واتە: ملکەچ، کەسێك مل و گەردنی خۆی کەچ کردوە بۆ خوا ﷻ، (**قَاسِط: إسْمُ فَاعل مِنْ قَسَط، قَسْطَاً، وَقُسُوطاً أي: جَار، فَهُوَ كالظُّلْمِ**)، کەواتە: (**قَاسِط**)، واتە: ستەمکار یان لادەر، لە (**قَسَطَ، قَسْطَاً، وَقُسُوطاً**)ەوە هاتوە، واتە: (**ظَلَمَ أو جارَ**) ستەمی کرد یان لایدا، واتە: ئێمە هەم ملکەچانمان هەن بۆ خوا ﷻ شوێنکەوتووانی ئیسلام و، هەم لادەران و ستەمکارانیشمان هەن.

٢)- ﴿ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴾، هەر کەس ملکەچ و گەردنکەچ بووبێ (بۆ خوا ﷻ)، {(**مَنْ**) هەم بۆ تاك و هەم بۆ کۆش بەکاردێ}، ئا ئەوانەی ملکەچ بوون، لەسەر ڕاستیی خەفتاون، لە بە مراد گەیشتن و ڕێ ڕاستگرتن خەفتاون و بۆ ئەوە تێکۆشاون، (**التَّحَرّي: طَلَبُ الحَرَى وَالحَرَى جَانِب الشَيء**)، (**حَرى**) بە مانای تەنیشتی شتێك دێ، ئنجا کەسێك بەرەو تەنیشتی شتێك بچێ، ڕووی لەو شتە کردوە، هەروەها (**التَحَرِّي: طَلَبُ الحَرَى، وَهُوَ الشَّيءُ الَّذِي يَنْبَغِي أن يُفْعَل**)، بەمانای داواکردنی (**حَرَى**)یە، ئەویش بریتیە لەو شتەی پێویستە بکرێ، وەك لە عەڕەبییدا دەگوترێ: (**بِالحَرِيِّ أنْ تَفْعَل كَذَا**) شایستەیە تۆ ئەوە بکەی، یان دەگوترێ: (**أحرى أن تَفْعل كَذا**)، وا باشترە تۆ فڵان شتە

بکەی، کەواتە: ﴿ تَحَرَّوْاْ رَشَدًا ﴾، بە دوای سەر ڕاستیی دا گەڕاون و سۆراغیان کردوە، لە بەمراد گەیشتن بە ئامانج گەیشتن، خەفتاون و پێشیگەیشتوون.

٣)- ﴿ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴾، بەڵام ستەمکاران و لادەران ئەوانە بوونە سووتەمەنیی دۆزەخ.

گێڕدراوەتەوە لە (**حجاج بن یوسف الثقفي**) کە دەیەوێ سەعیدی کوڕی جوبەیر بکوژێ، کە یەکێك بووە لە زانایانی شوێنکەوتووان (تابعین)، پیاوێکی زۆر گەورەو زۆر صاڵح و زۆریش بوێر بووە، لێی دەپرسێ: لە بارەی منەوە چی دەڵێی؟ سەعیدیش کوڕی جوبەیریش دەڵێ: (**قَاسِطٌ عادلٌ**)، تۆ هەم (**قَاسِط**)ی هەم (**عَادل**)ی، خەڵکەکەی لەوێن، دەڵێن: (**مَا أحْسن مَا قَال**)، قسەیەکی چەند باشی لە بارەی (**حجاج**)ەوە کرد، (**فَقَالَ الْحَجَّاجُ: يَا جَهَلَةُ! إنَّهُ سَمَّانِي ظَالِمًا مُشْرِكًا، وَتَلَا لَهُمْ قَوْلَهُ تَعَالَى:** ﴿ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴾، **وقوله:** ﴿ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ۝١ ﴾**الأنعام**)، حەججاج بە سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: چۆنم ناو دەنێی؟ ئەویش دەڵێ: (**قاسطٌ عادلٌ**)، تۆ لادەری و ڕێ لارکەری، {(**عَدَل عَنِ الطَّرِيْق أي: مَالَ**) لە ڕێیەکە لایدا}، خەڵکەکەی لەوێن دەڵێن قسەیەکی چەند باشی کرد!، حەججاجیش دەڵێ: ئەی نەفامەکان! منی بە ستەمکارو بە هاوبەش بۆ خوا دانەر ناوزەد کردوە! ئنجا قسەی خوای بەرزی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴾، بەڵام لادەران دەبنە سووتەمەنیی دۆزەخ، هەروەها قسەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ۝١ ﴾**الأنعام**، ئنجا ئەوانەی بێبڕوان، هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن، یاخود ئەوانەی بێبڕوان بە پەروەردگاریان، لادەدەن، (**يَعْدِلُون أي: يَمِيْلُون، يَنْحَرِفُون**).

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴾، (**وَإقْحَامُ فِعْلِ «كَانُوا» لِتَحْقِيقِ مَصِيرِهِمْ إِلَى النَّارِ حَتَّى كَأَنَّهُمْ كَانُوا كَذَلِكَ مِنْ زَمَنِ مضى**)، (**كَانُوا**): کە خراوەتە

نێو ئـەو ڕسـتەیەوە بـۆ سـاغكردنەوەی سـەرەنجامەكەیانە كـە بـەرەو ئاگـرە، وەك لـە كاتـی پێشـترەوەش ئـەوان هـەر بـەو شـێوەیە بووبـن.

لێرەدا قسەیەكی (**الزَّمَخْشَرِيِّ**) دێنین، كە (**محاسن التأويل**)[1] لێی خواستۆتەوە دەڵێ:

(**وَقَدْ زَعَمَ مَنْ لَا يَرَى لِلْجِنِّ ثَوَابًا أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَوْعَدَ قَاسِطِيهِمْ وَمَا وَعَدَ مُسْلِمِيهِمْ، وَكَفَى بِهِ وَعِيدًا، أَيْ فَأُولَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا، فَذَكَرَ سَبَبَ الثَّوَابِ وَمُوجِبَهُ، وَاللَّهُ أَعْدَلُ مِنْ أَنْ يُعَاقِبَ الْقَاسِطَ وَلَا يُثِيبَ الرَّاشِدَ**)، زەمەخشـەریی لـە كۆمەڵـی موعتەزیلـە بـووە، بـەڵام لـە ڕووی ڕەوانبێژییـەوەو لـە ڕووی تێگەیشـتنی قوڕئانـەوە، لـە زۆر لـە ئایەتـەكان تێگەیشـتنی زۆر وردو جوانـی هەیـە.

دەڵـێ: هەندێـك پێیـان وابـووە، جنـدەكان پاداشـتیان نیـە، بـە بەڵگـەی ئـەوەی خـوای بـەرز هەڕەشـەی كـردوە لـە لادەرەكانیـان، بـەڵام بەڵێنـی نـەداوە بـە ملكەچەكانیـان، فەرموویـەتی: ﴿ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَٰٓئِكَ تَحَرَّوْاْ رَشَدٗا ﴾، ئەوانـەی ملكـەچ بـوون (بـۆ خـوا) لـە ڕێـی ڕاسـت و لەسـەر ڕاسـتیی و بـە مـراد گەیشـتن خەفتـاون، بـەڵام باسـی پاداشـتیان نـاكات، ﴿ وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبٗا ﴾، بـەڵام لادەرەكان دەبنـە سـووتەمەنیی دۆزەخ، (**الزَّمَخْشَرِيُّ**) دەڵـێ: ئەوەنـدە بەسـە كـە بەڵێـن و گفتـی خـوا هەبـێ بـۆ چاكەكانیـان و ملكەچەكانیـان، كـە خـوا فەرموویەتـی: ﴿ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَٰٓئِكَ تَحَرَّوْاْ رَشَدٗا ﴾، ئەوانـە لەسەرڕاسـتیی و بـە ئامانـج گەیشـتن خەفتـاون، هـۆكارو پێویسـتی پاداشـتەكەی باسـكردوون، دوایـی دەڵـێ: خـوا لـەوە دادگەرتـرە كـە بابـای لادەر، سـزا بـدات، بـەڵام بابـای سـەر ڕاسـت و بـە ئامانـج گەیشـتوو بـە مـراد گەیشـتوو، پاداشـت نەداتـەوە، قسەكەشـی زۆر جـوان و بەجێیـە، بـەڵام ئەگـەر سـوورەتی (**الرّحمـن**) بەبەڵگـە بهێنرێتـەوە - بـە بۆچوونـی مـن - بەڵگەكـە بەهێزتریـش دەبـێ، لەسـەر ئـەوەی جندیـش وەك مرۆڤانـن و وەك چـۆن سـزا چاوەڕێیـان دەكات، پاداشـتیش چاوەڕێیـان دەكات، چ لـە دنیـاو چ لـە دواڕۆژدا.

---

(١) ج٩، ص:٣١٠.

مەسەلەی شەشەم:

**ئەگەر بێت و مرۆڤ و جند لەسەر ڕاستە ڕێی خوا ڕاوەستاو بن، خوای بەخشەر ئاوی زۆرو زوڵاڵیان بەسەردا دەبارێنێ، تاکو بەوە تاقییان بکاتەوە، هەر کەسێکیش لە یادی خوا لادەر بێ، بە سزای سەختەوە گرفتاری دەکات:**

﴿وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسۡقَيۡنَٰهُم مَّآءً غَدَقٗا ١٦ لِّنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَمَن يُعۡرِضۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِۦ يَسۡلُكۡهُ عَذَابٗا صَعَدٗا ١٧﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ﴾، هەروەها ئەگەر لەسەر ڕێباز ڕاوەستاو بوونایە، لێرەدا زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە دەبێ (أَلَّو) بەسەر (**فتح**) بخوێنرێتەوە، لێرەدا دەبێ (أَنْ) فەتحەی هەبێ، کە لە ئەسڵدا (**وأَنْ لوِ اسْتَقَامُوا**)یە، نابێ بگوترێ: (**وإن**)، بە دڵنیایی ئەگەر ڕاوەستاو بوونایە لەسەر ڕێباز، واتە: لەسەر ڕاستە ڕێی خوا، کێ ڕاوەستاو بووایە؟:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی (**قَاسِطُوْن**) بێ، یانی: لادەرەکان ڕاوەستاو بوونایە.

ب- دەگونجێ مەبەست مرۆڤەکان بن.

ج- دەشگونجێ مەبەست مرۆڤ و جند بێ، ئەگەر هەموویان ڕاوەستاو بوونایە، منیش ئەو مانایەی سێیەمم زیاتر بە دڵە، (**وَالإِسْتِقَامَةُ عَلَى الطَّرِيقَةِ: اسْتِقَامَةُ السَّيْرِ فِي الطَّرِيقِ، وَهِيَ السَّيْرُ بِالطَّرِيقِ دُونَ اعْوِجَاجٍ**)، (**إستقامة**) ئەوەیە لەسەر ئەو ڕێیە بە ڕێکیی بڕوا بەبێ لادان و خوارو خێچیی، ئەگەر وایانکردبایە:

٢)- ﴿لَأَسۡقَيۡنَٰهُم مَّآءً غَدَقٗا﴾، ئاوێکی زۆرو زوڵاڵمان پێ دەنۆشین، (**المَاءُ الغَدَقُ: المَاءُ الكَثِيْر**) ئاوی زۆر.

٣)- ﴿ لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾، تاكو تێیاندا تاقیان بكەینەوە، (**أي: لِنختَبِرَهِم فِيْه**)، تاكو تاقییان بكەینەوە بەو ئاوە زۆرو زوڵاڵەی بۆمان دابەزاندوون، چونكە گوتراوە: ئاوو ئاوەدانیی، ئاو سەرچاوەی هەموو نیعمەتەكانی دیكەیە.

٤)- ﴿ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ ﴾، هەر كەسێكیش لە یادی پەروەردگاری لابدات و ڕوو وەچەرخێنێ، (**ذِكر**) دەگونجێ:

أ- مەبەست پێی قورئان بێ.

ب- یان بەندایەتیی بۆ خوا بێ.

ج- یان بەرنامەی خوا بێ.

٥)- ﴿ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴾،(خوا) دەیخاتە ئازارو سزایەكی سەخت و قورسەوە، خوێندراویشتەوە: (**نَسْلُكهُ أي: نُدْخِلُهُ**)، دەیخەینە نێو، سزایەكی قورس و بە زەحمەت، (**عَذاباً صَعَداً أي: شَاقّاً صَعْباً يَعْلُو المُعَذَّبَ ويَغلِبُهُ**)، سزایەكی سەخت كە بەسەر بابای سزادراو و ئازاردراودا زاڵ دەبێ و دایدەپۆشێ.

لەو بارەوە ئەو قسەیەی خەلیفە عومەر ﷺ دەیێنین، كە گوتوویەتی: (**مَا تَصَعَّدَنِي شَيْءٌ مَا تَصَعَّدَتْنِي خطْبَةُ النِّكَاحِ، أي: مَا شَقَّ عَلَيَّ**)، واتە: هیچ شتێكم هێندە لەسەر قورس نەبووە، وەك وتاری خوازبێنیی لەسەر دڵم قورسەو پێم زەحمەتە.

دەڵێم: پێم وایە پێ زەحمەتییەكەی لەبەر ئەوە بووە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، پیاوێكی یەكجار ڕاست و ساغ و بێ گرێ و گۆڵ و گرفت بووە، ئنجا لە خوازبێنییشدا دەبێ بەڕاستیی باسی ئەو كەسە بكەی كە ئافرەتەكەی بۆ دەخوازی، ئنجا كە سیفەتی خراپیشی بووبن، لەسەر دڵی قورس بووە، سیفەتە خراپەكانی باس نەكات و، ناشگونجێ باس بكرێ، وای تێدەگەم بۆیە پێی قورس بووە.

وشەی (صَعَداً) چاوگە (وِصفَ بِە مُبَالَغة أي: مشَقّة)، وەك زێدەڕۆیی كراوە بە وەسف، واتە: قورسایی و سەختیی، (صُعُود) یانی: دەروویەكی سەخت كە خەڵك لێی سەردەكەوێ، (الطبري) بە ژمارە: (٣٥٢١٧) لە موجاهیدەوە (صَعَداً) ی بە: (مَشَقّةً مِنَ العَذَاب) سزایەكی سەخت، مانا كردوە، هەروەها (الطبري) بە ژمارە: (٣٥٢٢١) لە قەتادەوە هێناویەتی كە گوتوویەتی: (صَعَداً أي: عَذَاباً لَا رَاحَةَ فِيْه)، سزاو ئازارێك كە هیچ ئاسوودەیی و حەسانەوەی تێدا نیە.

### مەسەلەی حەوتەم:

**مزگەوتەكانیش و ئەندامەكانی كڕنووش پێ بردنیش هی خوان، بۆیە شایستەی پەرستران تەنیا خوایە ﷻ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ ﴾،

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ ﴾، بە دڵنیایی مزگەوتەكان (یان: ئەندامەكانی كڕنووش بردن) هی خوان، لێرەشدا قورئانخوێنەكان لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە (أَنَّ) لێرەدا بە فەتحەی هەمزەكە دەخوێنرێتەوەو، بە دڵنیایی مزگەوتەكان هی خوان:

أ- (مَسَاجِد) كۆی (مَسْجِد)ە، كە ئەو شوێنەیە دروستكراوە بۆ نوێژ تێدا كردن و كڕنووش تێدا بردن.

ب- یاخود (مَسَاجِد) ئەو ئەندامانەن كە كڕنووشیان لەسەر دەبردرێ، كە حەوت ئەندامن: (نێوچەوان و هەردوو دەست و هەردوو ئەژنۆو هەردوو سینگی پێیەكان)، واتە: ئەو ئەندامانەی خوا بۆ مرۆڤی خولقاندوون و كڕنووشیان لەسەر دەبات، بەس هی خوان.

٢)- ﴿ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴾، كەواتە لەگەڵ خوادا لە كەسی دیكە مەپاڕێنەوە.

بێگومان وشەی (مَسَاجِد) زیاتر بە مانای كۆی (مسجد) مزگەوت هاتووەو، ئێمە لە سوورەتی (النور)دا باسێكی مزگەوتمان كردوە، لە تەفسیری ئایەتەكانی: (٣٦ و ٣٧ و ٣٨)دا، بۆیە لێرە ناچینە نێو وردەكارییەكانی باسی مزگەوت و، حوكمەكانی مزگەوت و، چۆنیەتیی مامەڵە كردن لەگەڵ مزگەوتدا.

## مەسەلەی هەشتەم و کۆتایی:

**کاتێك بەندەی خوا موحەممەد ﷺ هەڵسا بۆ لێپاڕانەوەی خواو بەندایەتیی بۆ کردنی، جندەکان هێندە دەوریان قەرەباڵغ کرد، نیزیك بوو کەڵەکەی لەسەر بکەن و لەسەری کۆببنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ١٩﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ﴾، {خوێندراویشەتەوە: (وَإِنَّه)، (نَافِع) وای خوێندۆتەوە}، بە دڵنیایی کاتێك بەندەی خوا هەڵسا، لێی دەپاڕایەوە، لە کێ؟ بێگومان لە خوا ﷻ.

٢)- ﴿كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا﴾، نزیك بوو کەڵەکەی لەسەر بکەن، واتە: جندەکان لەسەری کۆ ببنەوەو بکەونە سەر یەك لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ وشەی (لِبَداً) خوێندراویشەتەوە: (لُبَداً) یانی: جندەکان هێندە مکووڕ بوون و تامەزرۆ بوون، گوێیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، کە هەڵسا بۆ لێپاڕانەوەی خواو، قورئانخوێندن و، پەرستنی خواو، لە دەوری قەرەباڵغ بوون و چوونە نیزیکی، خەریك بوو بکەونە سەر یەك، چونکە (لِبَداً)، (جَمْعُ لِبَدة أي: مُجتَمِعَة)، شتێکی خڕبۆوە سەر یەك، یان (لِبداً) کۆی (لُبْدة)یە (أي: جَمَاعَاتٍ، تَلَبَّدَ شَيءٌ عَلَى شَيءٍ أي اجْتَمَعَ)، واتە: شتێك خڕبۆوە سەر یەك.

(الطبري) ئاوای مانا لێکداوەتەوەو دەڵێ: **(كَادُوا يَكُونُونَ عَلَى مُحَمَّدٍ جَمَاعَاتٍ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ؛ وَاحِدُهَا: لِبْدَةٌ، وَفِيهَا لُغَتَانِ: كَسْرُ اللَّامِ لِبْدَةٌ، وَمَنْ كَسَرَهَا جَمَعَهَا: لِبَدٌ؛ وَضَمُّ اللَّامِ لُبْدَةٌ، وَمَنْ ضَمَّهَا جَمَعَهَا: لُبَدٌ بِضَمِّ اللَّامِ، أَوْ لَابِدٌ؛ وَمَنْ جَمَعَ لَابِدٌ قَالَ: لُبَّدًا، مِثْلُ رَاكِعٍ وَرُكَّعًا)**، واتە: خەریك بوو (جندەکان) کۆمەڵ کۆمەڵ لەسەر یەك کەڵەکە بن (لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ)، (لِبَد) کۆی (لِبْدَة)یە، کە ئەویش دوو لەهجەی تێدا هەن:

(لِبدَة) کـە بـە (لِبَـد) کـۆ دەکرێتـەوەو، (لُبْـدة) کـە بـە (لُبَـد) کـۆ دەکرێتـەوە، یاخـود (لِبَد) تاکەکـەی بریتیـە لـە (لابِـد) و بـە (لُبّد)یـش کـۆ دەکرێتـەوە، وەك (**راكِـع و رُكّـع**)، واتـە: ڕکـووع بـەرو ڕکـووع بـەرەکان.

ئنجا ئەمە دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

**یەکەم:** جندەکان خەریك بوون لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەکە بن، بۆ ئەوەی گوێ لە قوڕئان بگرن، وەك (**الضحاك**) کە (**الطبري**) بە ژمارە (٣٥٢٢٩) لێیەوە هێناوە دەڵێ: (**كَادُوا يَرْكَبُونَهَ حِرْصًا عَلَى مَا سَمِعُوا مِنْهُ مِنَ الْقُرْآنِ**) خەریك بوو بچنە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و کەڵەکە بن، لەبەر ئەوەی زۆر سوور بوون گوێیان لە قوڕئان بێ.

**دووەم:** هەندێکیش گوتوویانەو (**الطبري**) ئەم ڕایەی زیاتر پەسند کردوە، دەڵێ: (**وَأَوْلَى الْأَقْوَالِ بِالصَّوَابِ فِي ذَلِكَ قَوْلُ مَنْ قَالَ: ذَلِكَ خَبَرٌ مِنَ اللَّهِ عَنْ أَنَّ رَسُولَهُ مُحَمَّدًا ﷺ لَمَّا قَامَ يَدْعُوهُ، كَادَتِ الْعَرَبُ تَكُونُ عَلَيْهِ جَمِيعًا فِي إِطْفَاءِ نُورِ اللَّهِ**)، لە پێشترینی قسان لە ڕاستییەوە، قسەی کەسێکە گوتوویەتی: ئەمە هەواڵدانێکە لە خواوە، کە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کاتێك هەڵساوە لە خوا پاڕاوەتەوەو خوای پەرستوە، عەڕەبەکان خەریك بوون هەموویان کەڵەکە بن لەسەر یەك، بۆ کوژانەوەی ئەو ڕووناکییەی خوا پێیدا ناردوە.

هەروەهـا لـە (**قتـادة**)ەوە هێناویەتـی بـە ژمـارە: (٣٥٢٣٣) دەڵـێ: (**لمَّـا قَـام النَّبِـيّ ﷺ تَلَبَّـدَتِ الإِنْـسُ وَالجِـنُّ وَحَرَصُـوا عَـلَى أَنْ يُطْفِئُـوا هَـذَا النُّـورَ الَّـذِي أَنْزَلَـهُ**)، کاتێـك پێغەمبـەر ﷺ هەڵسـا (بانگـەوازی کـرد بـۆ لای خـواو خـوای پەرسـت)، جنـدو مـرۆڤ هەموویـان لەسـەر یـەك کەڵەکـە بـوون، سـوور بـوون لەسـەر ئـەوەی ئـەو ڕووناکییـەی خـوا ناردوویەتـی، خەفـەی بکـەن و بیکوژێننـەوەو لـە بەینـی بـەرن.

هەرچەنـدە (**الطـبري**) وا دەڵـێ: بـەڵام مـن وای تێدەگـەم ئـەو ڕایـە ڕاسـتتر بـێ کـە باسـی جنـدە، چونکـە سـوورەتەکە باسـی جنـد دەکات، بەڵـێ ئـەوەش دەگرێتـەوە، بێگومـان کافرەکانـی جنـدو مرۆڤیـش گەلـە کۆمەکێیـان کـردو خڕبوونـەوە سـەر یـەك

لـە دژی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بـەڵام لێـرەدا سـیاقەکە زیاتـر ئـەو واتایـە پشتڕاسـت دەکاتـەوە، کـە هـەر باسـی جنـدەو ئەمـەش هـەر دەچێتـە نێـو مـەدح کردنـی جنـد، چونکـە ئایەتەکانـی دیکـەش هەموویـان مـەدح کردنیانـن، کە زۆر سـووربوون لەسـەر ئـەوەی گوێیـان لـە پێغەمبـەر بـێ و، پەیامـی خـوای لـێ وەربگـرن، کـە خەریـك بـوو لەسـەر یـەك کەڵەکـە بـبن بـۆ گـوێ لێگرتنـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە نـۆ ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (الجـن) پێـك دێ، تـەوەری سـەرەکییان چەنـد ڕێنماییەکـی خـوای بـەرزو مەزنـە، بـۆ پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەد ﷺ، لـە دوو توێـی چـوار (٤) فەرمـان دا، کـە بـە (قـل) بڵـێ، دەسـت پـێ دەکـەن، هەروەهـا چەنـد ڕاسـتییەکی مەزنیشـیان لەگەڵـدا نێواخـن کـراون، کـە گرنگترینیـان ئەمانـەن:

١- هەر کەس سەرپێچیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، لە دۆزەخ دا بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە.

٢- لە کاتی دیتنی سزای هەڕەشە پێ لێکرانیان دا، بێبڕوایان دەزانن کە چەند بێهێزو کەمن.

٣- خوای پەنهانزان جگە لە پێغەمبەران، هیچکەس لە پەنهان و نادیاری تایبەت بە خۆی ئاگادار ناکات، ئەویش دوای دانانی ئێشکچیی و پاسەوان لە فریشتان.

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْاْ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ قُلْ إِنْ أَدْرِيٓ أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّيٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُواْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًۢا ﴿٢٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: تەنیا لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوەو، هیچ کەس ناکەمە هاوبەشی (لە پەرستندا) ﴿٢٠﴾ بڵێ: بێگومان من نەدوورخستنەوەی زیانتانم بەدەستە، نەبە مرادو بە ئامانج گەیشتنتان ﴿٢١﴾ بڵێ: بێگومان هیچکەس لە سزای خوا ناپارێزرێ و، جگە لەو هیچ پەناگەیەك شك نابەم، (هیچ شتێکم لە سوودو زیانتان بەدەست نیە) ﴿٢٢﴾ مەگەر گەیاندنی پەیامێك لە خواوەو، گەیاندنی نامەکانی و، هەر کەسێکیش سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەرەکەی بکات، بە دڵنیایی ئاگری دۆزەخی وەك سزا بۆ هەیە، بە هەمیشەیی تێیدا دەبێ ﴿٢٣﴾ بێبڕوایان هەر بەردەوام دەبن، تاکو کاتێك ئەوەیان دی، کە گفتیان پێ دەدرێ، باش دەزانن کێ پشتیوانەکەی بێ هێزترو ژمارەکەی کەمترە! ﴿٢٤﴾ بڵێ: نازانم ئایا ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ نیزیکە، یان پەروەردگارم ماوەیەکی زانراوی بۆ دادەنێ؟ ﴿٢٥﴾ خوا زانای پەنهانە هیچکەس لە پەنهانی تایبەتی خۆی ئاگادار ناکات ﴿٢٦﴾ مەگەر ئەوەی پەسندی بکات لە نێردراوێك، بێگومان ئەویش ئێشکچیی لە پێش دوو دەستیەوەو لەدوایەوە دادەنێ ﴿٢٧﴾ تاکو بزانێ کە نامەکانی پەروەردگاریان بە تەواویی بە خەڵك گەیاندوون و، خواش دەوری ئەوەی داوە کە (فریشتەکان) لە لایانەو، هەموو شتێکی بە ژماردن سەرژمێر کردوە ﴿٢٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک وشەکان

(لَن يُجِيرَنِى): هەرگیز ناماپارێزێ، (لَنْ يَحْمِيَنِي)، (الجَارُ: مَنْ يَقْرُبُ مَسْكَنُهُ مِنْكَ) (جـار): ئەوەیـە خانووەکـەی لـە تەنیشـتتەوە بـێ، بـە کوردیـی دەڵێیـن: دراوسـێ، (اسْـتَجَرتُهُ فَأَجَـارَنِي) واتـە: پەنـام پێـبرد، ئەویـش منـی پەنـا دا، ﴿وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۝٤٨﴾، وەك لـە سـوورەتی (الأنفـال)دا هاتـوە، ئیبلیـس بـە بێبڕوایـەکان دەڵـێ: مـن پەنـادەری ئێـوەم، (أَجَـارَهُ يُجِـيْرُهُ) واتـە: پەنـای دا، پەنـای دەدا.

(مُلْتَحَدًا): (إِلْتَحَـدَ إلى كَـذَا: مَـالَ إِلَيْـه)، واتـە: مەیلـی بـەلادا کـرد بـۆ لای چـوو، (مُلْتَحَـد: مَوْضِـعُ التِجَـاءٍ أو التِجَـاءٌ)، (مُلْتَحَـد): شـوێنی پەناپێـبردن، یاخـود خـودی پەناپێـبردن.

(أَمَدًا): (الأَمَـدُ: مُـدَّةٌ لَهَـا حَـدٌّ مَجْهُـول) ماوەیەکـە سـنوورێکی نەزانـراوی هەبـێ، (إذَا أُطْلِـقَ، وَقَـدْ يَنْحَـصِرُ)، ئەگـەر (أَمَـد) بـە ڕەهایـی بگوتـرێ سـنوورێکی نەزانـراوی هەیـە، جـاری واش هەیـە مەبەسـت پێـی کاتێکـی دیاریکـراوە، (وَالفَـرْقُ بَـيْنَ الزَّمَـنِ وَالأَمَـدِ أَنَّ الثانِيَـة بِاعْتِبَـار الغَايَـة)، (زَمَـن وَأَمَـد) لـە زمانـی عەرەبییـدا بـە مانـای کاتێـك، ماوەیـەك، دێـن، بـەڵام (أمـد) بـە کاتێـك دەگوتـرێ سـنوورێکی هەبـێ.

(فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا): (أَي: فَـلَا يُطْلِـعُ) واتـە: هیچکـەس لـە پەنهانەکـەی خـۆی ئـاگادار ناکاتـەوە.

(يَسْلُكُ): (أَي: يُدْخِـلُ، أو يَجْعَـلُ)، ﴿يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا﴾، واتـە: ئێشـکچییان لـە پێـش دەسـتی و دواوەی دادەنـێ، دەگێـڕێ.

(رَصَدًا): (الرَّصَـدُ: الإِسْـتِعْدَادُ للتَرَقُّـبِ، وَالرَّصَـدُ يُقَـالُ للراصِـدِ وَالمَجْمُـوع، وَالمَرْصُـودِ وَاحِـدَاً كَانَ أو جَمْعَـاً)، (رَصَدْ)هـەم بـە مانـای خـۆ ئامادەکـردن دێ بـۆ چاودێریـی، هەروەهـا بـە بابـای لـە بۆسـەدا بـوو دەگوتـرێ، هـەم بـۆ تـاك هـەم بـۆ کـۆش،

هەروەها (رَصَدْ) بە (مَرْصُود)یش دەگوترێ، واتە: کەسێك کە چاودێریی دەکرێ، بۆی لە بۆسەدان، تاك بێ یان کۆ بێ.

(وَأَحۡصَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ): واتە: هەمـوو شـتێکی سـەرژمێر کـردوە، (أي: حَصَّلَهُ وَأَحَاطَ بِهِ)، واتە: دەوری داوەو سەرژمێری کردوە، (والإحْصَاءُ: التَّحْصِيلُ بَالْعَدَد)، (إحصاء) ئەوەیە شتێك بێتە دەست بە ژمارە، کە ژمارەکەی چەندە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای پـەروەردگار لـە کۆتایی سـوورەتی (الجـن)دا، چەند ڕێنماییەك بـە پێغەمبەری خاتەم ﷺ ڕادەگەیەنێ، کە سەرجەمیان چوار ڕێنمایی و ئامۆژگاریین و، چەند ڕاستییەکیشیان نێواخن دەکات.

سەرەتا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي ﴾، بڵێ: من تەنیا لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە، وەك زۆرجار گوتراوە: (إِنَّمَا: أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَات)، (إِنَّمَا) ئامرازی کورتهەڵهێنان و چەسپاندنە، واتە: کاتێك دەچێتە سەر ڕستەیەك، مانایەکەی دەچەسپێنێ و، لەو شتەشدا کە باسکراوە، کورتی هەڵدێنێ، ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي ﴾، بڵێ من تەنیا لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە، ﴿ وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا ﴾، هیچکەسیش ناکەمە هاوبەشی، هاوبەشی خوا ﷻ چ لە زاتیدا، بڵێی زاتێکی دیکە هەیە جگە لە خوا، چ لە یەکێك لە سیفەتەکانیدا، وەك: بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی و، پەرستراوێتیی، یاخود یەکێك لە ناوو سیفەتەکانی دیکەی دا.

﴿ قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا ﴾، بڵێ من هیچ زیانێك و هیچ بە مراد گەیاندنێکی ئێوەم بەدەست نیە، واتە: من خاوەنی لێ دوور خستنەوەی زیان نیم لە ئێوەو، بە ئامانج گەیاندن و بە مراد گەیاندنی ئێوەشم بەدەست نیە، ﴿ قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ ﴾، ئەی موحەممەد ﷺ! بڵێ: بە دڵنیایی من لە

بەرانبەر خوادا، یانی: لە بەرانبەر سزای خوادا، هیچکەس پەنام نادات، (**لَن يَجِيرِنِي، لَنْ يَحْمِيَنِي**) ناماپارێزێ، پەنام نادات، (**مِنَ اللـه**) لە بەرانبەر خوادا، لە بەرانبەر سزای خوادا.

﴿وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا﴾، هەرگیزیش من جگە لەو، پەناپێبردنێکی دیکە شک نابەم، یان پەنا پێبراوێکی دیکە شك نابەم، (**مُلْتَحَد**) هەم بە مانای پەنا پێبردن دێ، وەك: چاوگ، هەم بە مانای شوێنی پەنا پێبردن دێ واتە: پەناگە، ئەدی من چیم بەدەستە بۆ ئێوە؟ ﴿إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ﴾، تاکە شتێك کە بۆ ئێوەم بەدەستە، ئەوەیە کە لەلایەن خواوە پەیام بگەیەنم و، نامەکان و بەرنامەکانی خواتان پێ بگەیەنم، واتە: من تەنیا گەیاندنم لەلایەن خواوە بەدەستە، بە تایبەت نامەو بەرنامەکانی.

﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾، هەر کەسێکیش سەرپێچیی بکات لە خواو پێغەمبەرەکەی، ئەوە بە دڵنیایی ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، واتە: هەرگیز لێی نایەتە دەرێ.

هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾، هەر کەسێك سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەرەکەی بکات، واتە: سەرپێچیی یەکجارەکیی، نەك سەرپێچییەکی بەشیی (**جزئي**)، بەڵکو سەرپێچییەکی گشتیی کە بە هەموو شێوەیەك سەرپێچیی بکات لە خواو لە پێغەمبەری خوا، واتە: بێبڕوا بێ، ئەوە ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە، واتە: ئەگەر ببێتە خاوەنی شتێك، دەبێتە خاوەنی ئاگری دۆزەخ، کە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە.

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ﴾، هەتا کاتێك ئەوەی گفتیان پێ دەدرێ، بینییان، یاخود ئەوەی هەڕەشەیان پێ لێ دەکرێ، دیتیان ﴿مَا يُوعَدُونَ﴾، هەم دەگونجێ لە (**وعد**)ەوە بێ، هەم دەگونجێ لە (**وعيد**)ەوە بێ، (**وَعَدَهُ يَعِدَهُ، وأوعَدَهُ يُوعِدُهُ**)، بەڵام هەردووکیان کرداری (**مضارع**)ی نەزانراویان (**يُوعَدُ**)یە، واتە:

کاتێك ئـەوەی بەڵێنیـان پـێ دەدرێ، بینییـان، ئنجـا بێگومـان ئـەوەی دەیبینـن، بـۆ ئـەوان زۆر جێـی ناڕەحەتییـە، بـەڵام ئەمـە وەك توانـج و بـە تەوسـەوەیە، واتـە: ئەگەر گفـت و بەڵێنێـك هەبـێ بـەوان بـدرێ، لـە ڕۆژی دواییـدا، هـەر ئەوەیـە کـە پێـی ناڕەحـەت بـن و، بریتیـە لـە سـزاو جەزرەبـەی خـوا، ئەگـەر (**یوعَـدون**) لـە (**وَعيـد**) یشـەوە هاتبـێ، واتـە: کاتێـك ئەوەیـان بینـی، کـە هەڕەشـەیان پێـی لـێ دەکـرێ، چییـان لـێ دێ؟ ﴿ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَـدَدًا ﴾، بـە دڵنیایـی دەزانـن کـێ پشـتیوانەکەی بێهێزتـرەو، کێـش ژمارەکـەی کەمـترە، لـەوێ حاڵـی دەبـن، ئێسـتا کـە بـە قەڕەباڵغـی دەوروبـەری خۆیـان دەخـوڕن و، بـە زۆری ژمارەیـان دەخـوڕن، بـەڵام لـەوێ لێیـان حاڵـی دەبـێ، کـێ پشـتیوانەکەی بێهێزتـرەو ژمارەکەشـی کەمـترە!

هەمیشـە بێبڕوایـەکان پێغەمبـەری خوایـان ﷺ هەڵدەپێچـاو، تەنگەتاویـان دەکـرد، بێنـە ئـەوەی خـوا هەڕەشـەی پـێ لێکردوویـن، بۆمـان بێنـە، کـوا؟ چـی لێهـات؟ بۆیـە خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ و، بـۆ جـاری چـوارەم لـەو نـۆ ئایەتـە موبارەکـەدا وشـەی بڵـێ (**قُـل**) بەکارهاتـوە: ﴿ قُلْ إِنْ أَدْرِىٓ ﴾، بڵـێ: نازانـم، لێرەدا (**إِنْ**) بـە مانـای (**مـا**)ی لابەرەیـە، ﴿ أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ أَمَـدًا ﴾، ئایا ئـەوەی بەڵێنتـان پـێ دەدرێ، نیزیکـە، یاخـود پـەروەردگارم ماوەیەکـی بـۆ دادەنـێ، یاخـود: (**تُوعَـدون**) بـە مانـای هەڕەشـەتان پـێ لـێ دەکـرێ، ئـەوەی هەڕەشـەتان پـێ لـێ دەکـرێ، نازانـم ئایـا نزیکـە، یاخـود پـەروەردگارم ماوەیەکـی دیارییکـراوی بـۆ دادەنـێ؟

﴿ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ ﴾، خـوا زانـای پەنهانـە بـە ڕەهایـی، زانـای نهێنییەکانـە، ﴿ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴾، هیچکـەس لـە نهێنیـی و پەنهانـی خـۆی ئـاگادار ناکاتـەوە، (**غَيْـب**) واتـە: پەنهـان، یـان: شـتێکی نابەرهەسـت، خـوا هیـچ کـەس لـە پەنهانـی خـۆی، پەنهانـی تایبـەت بـە خـۆی، ئـاگادار ناکاتـەوە، نەیفەرمـووە: (**فَلَا يُظْهِرُ عَلى الغَيْـبِ أَحَـدَاً**)، هیچکـەس لـە پەنهـان ئـاگادار ناکاتـەوە، فەرموویەتـی: لـە پەنهانـی خـۆی (**غَيْبِـهِ**) چونکـە هەندێـك لـە شـتە پەنهانەکانـی دیکـە هـەن، خـوا ﷻ توانـای

داوە بە مرۆڤ پەییان پێ ببات، بۆ وێنە: دیاردەکانی کەشناسیی، باران کەی دەبارێ؟ هەروەها بەفرو تەرزە؟ کەشی ساڵ چۆن دەبێ؟ هەروەها خۆرگیران و مانگگیران، فلان ئەستێرە ئاوا جووڵە دەکات، فلان خڕۆکە ئاوا، ئەوانەش بە نسبەت کاتی خۆیەوە پەنهان بوون، بەڵام ئێستا خوا توانایەکی داوە بە مرۆڤ کە ئەو پەنهانانە بزانێ، بەڵام پەنهانێکی تایبەت بە خوا، تەنیا خوا دەیزانێ، ئنجا ئەگەر ئەو پەنهانە بریتی بێ لە ڕۆژی دوایی، ئەوە دیارە تەنانەت جیبریلیش نەیزانیوە، وەك لە فەرمایشتەکەی ناسراو بە: (**حديث جبريل**)دا هاتوە، هەروەها لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ١٨٧﴾، جگە لە خۆی هیچکەس بۆ کاتەکەی نایدرەوشێنێتەوەو دەری ناخات، یاخود مەبەست پێی هەموو ئەو پەنهانانە بێ، کە تەنیا لەڕێی وەحییەوە دەزانرێن، ئەوە خوا ﷻ هیچکەس لە پەنهانی تایبەتیی خۆی ئاگادار ناکاتەوە.

﴿إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ﴾، مەگەر کەسێك پەسندی بکات لە نێردراوێك، ئنجا ئەو نێردراوە، چ فریشتە بێ، چ مرۆڤ بێت و پێغەمبەر بێ، واتە: (**رَسُول**) لێرەدا مەرج نیە تەنیا پێغەمبەر بێ، بەڵکو دەگونجێ مەبەست پێی فریشتەیەکی نێردراو بێ، کە خوا کاروبارەکانیان پێ دەسپێرێ، بە تایبەت وەحیی هێنان بۆ پێغەمبەران، کە هەموویان لە ڕێی جیبریلەوە بوون، ئەویش کۆمەڵێك فریشتەی زۆری لەگەڵدان، مەگەر نێردراوێك کە خوا پەسندی دەکات، لە هەندێك لە پەنهانی خۆی ئاگاداری بکاتەوە، ئەویش بە شێوەیەکی سنووردار، ئەوەی پێویستە ئەو نێردراوە لێی ئاگادار بێ، ﴿فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا﴾، ئەویش (ئەو نێردراوەش) خوا ﷻ هەم لە پێش دوو دەستەکەیەوە، هەم لە دوایەوە چاودێران دادەنێ، (**رَصَد**) بە مانای ئێشکچیی و چاودێر دێ، واتە: لێرەدا بەس ئەو واتایە هەڵدەگرێ، ئەگەرنا (**رَصَد**) بە مانای (**مَرْصُود**)یش دێ، چ تاکی (**مَرْصُود**) چ کۆیەکەی، (**مَرْصُود**)، واتە: بۆسە بۆدانراو چاودێرییکراو، بەڵام لێرە تەنیا مەبەست پێی چاودێرییکارەو، کەسێکە لە بۆسەدایە بۆ شتێك،

واتـە: ئـەو نێـردراوەش کـە خـوا پەسـندی دەکات و، لـە هەندێـك لـە پەنهانـی خـۆی ئـاگاداری دەکاتـەوە، ئەویـش هـەم لـە پێـش دوو دەسـتیەوە هـەم لەدوایـەوە - واتـە: لـە هـەر چـوار دەوری - ئێشـکچییان دادەنـێ، پاسـەوانان دادەنـێ، کـە مەبەسـت پێـی فریشـتەکانن، تاکـو ئـەو نهێنیـی و پەنهانـە لـەلای ئـەو نێردراوەیـە، دزە نـەکات و شـەیتانەکان نەتوانـن پـەی پـێ ببـەن.

ئنجـا ئایـا بۆچـی خـوای بـەرز بـەو شـێوەیە دەکات؟ ﴿لِّيَعۡلَمَ أَن قَدۡ أَبۡلَغُواْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾:

أ- تاکو (خوا) بزانێ (فریشتەکان) پەیامەکانی پەروەردگاری خۆیانیان گەیاندوون، واتە: تاکو لەسەر ئەرزی واقیع بزانرێ، ئەگەرنا خوا هەر دەزانێ، واتە: بۆ ئەوەی زانینەکەی خوا ﷻ لە دنیای واقیعدا بەرجەستە ببێ.

ب- یاخود: تاکو ئەو کەسە کە پێغەمبەری کۆتاییە ﷺ، بزانێ فریشتەکان بە تەواویی پەیامەکانی پەروەردگاریان پێ گەیاندوون، وەك هەموو پێغەمبەران، هەرگیز شەیتانەکان زەفەریان نەبردوە، بەو پەنهانەی لە لای فریشتەکانە.

﴿وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيۡهِمۡ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا دەوری ئـەوەی داوە کـە لەلایانـە، واتـە: لـە لای فریشـتەکانەو لـە ژێـر چاودێریـی خـوادان و، زانیاریـی خـوا ﷻ دەوری هەمـوو شـتێکیانی داوەو، هەمـوو شـتێکیان لـە بـارەوە دەزانـێ، ﴿وَأَحۡصَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ عَدَدَۢا﴾، ژمـارەی هەمـوو شتێکیشـی زانیـوە، واتـە: هەمـوو شـتێکی لـە ڕووی ژمـارەوە سـەرژمێر کـردوەو، ئەنـدازەی ژمـارەی هەمـوو شـتێك دەزانـێ.

ئەمانـە ئایەتەکانـی کۆتایـی سـووڕەتی (**الجـن**)ن، کـە وەك پێشـتریش گوتمـان: خـوا ﷻ وەك چەنـد ڕێنماییـەك بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ ڕادەگەیەنـێ و، چەنـد ڕاسـتییەکی زۆر گـەورەو مەزنیـش دەخاتـەڕوو، کـە ئێمـە بـە کورتیـی قسـەمان لـێ کـردن و، دواتـر لـە مەسـەلە گرنگـەکان دا وردتـر شـییان دەکەینـەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی و ڕێنماییکردنی، کە تەنیا خوا پەرستنی خۆی و هاوبەش دانەنانی و، بەدەست نەبوونی زیان دوورخستنەوەو، سوود گەیاندن و، بە جگە لە خواو، پەنا نەبردنی خۆی و، کورتکردنەوەی ئەرکی خۆی لە گەیاندنی پەیامی خوادا، بە خەڵك ڕابگەیەنێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْاْ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُواْ رَبِّي ﴾، بڵێ: تەنیا لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (**قَالَ إِنَّمَا أَدْعُوا رَبِّي**)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: من تەنیا لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە، ئەگەر بە (**قُلْ**)یش بخوێندرێتەوە، واتە: خوا فەرمانی پێ دەکات، ئەی موحەممەد ﷺ! بڵێ: من تەنیا لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە، دیارە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە فەرموویەتی: {**الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَة**}، (**أخرجه أحمد: ١٨٤١٥، وابن أبي شيبة: ٢٩١٦٧، والبخاري في الأدب المفرد: ٧١٤، وأبو داود: ١٤٧٩، والترمذي: ٢٩٦٩، وقال: حسن صحيح**)، واتە: لە خوا پاڕانەوە، بریتیە لە خوا پەرستیی.

٢)- ﴿ وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا ﴾، هیچ کەسێك ناکەمە هاوبەشی، هیچ کەسێك لە دروستکراوان، نە لە مرۆڤ و، نە لە جندو، نە لە فریشتان، کە دەفەرموێ: هیچ کەسێك ناکەمە

هاوبەشی، واتە: چ لە بەدیهێنەرایەتییدا، چ لە پەروەردگارێتیی و لە خاوەندارێتییدا، چ لە پەرستراوێتییداو، چ لە یەکێك لە ناوو سیفەتەکانی دا، ئەمەش دوو شتان دەگرێتە خۆی:

یەکەم: ڕاگەیاندنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئایینەکەی و ڕێبازەکەی کە لەسەری دەڕوا، کە ئەوە ڕێبازی منە: تەنیا خوا دەپەرستم و، هیچ کەسێك ناکەمە هاوبەشی خوا.

دووەم: تاکو بێبڕوایەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، نائومێد و تەما بڕاوبن، لەوەدا کە نەرمکێشییان بۆ بکات، یاخود بەلایانەوە بچێ و، لە مەسەلەی هاوبەش بۆ خوا دانەناندا خاتریان بگرێ، کە هیچ بوارێکی تێدا نیە.

٣)- ﴿قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا﴾، بلێ: بە دڵنیایی هیچ زیان و سەر ڕاستییەکتانم بە دەست نیە، ئەمیش دیسان دەگونجێ بە (قَالَ)ش بخوێندرێتەوە، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی من زیان و سەر ڕاستیی و بەئامانج گەیشتنی ئێوەم بەدەست نیە، (**أي: لَا أَمْلِكُ لَكُمْ دَفْعَ ضَرّ عَنْكُمْ دِنْيَوِيّاً وَأُخْرَوِيّاً، وَلَا أَمْلِكُ لَكُمْ رَشَداً، الرَّشَدُ: مَصْدَرٌ، وَالرُّشدُ: اسْمٌ، وَالرُّشْدُ معْرِفَة الصَّوَابِ،أقول:[1] بَل الصَّحِيْح الرُّشْدُ نَيلُ المَطْلُوبِ وَبُلُوغُ الهَدَفِ**)، واتە: من زیان دوور خستنەوەی ئێوەم بەدەست نیە، نە لە دنیاو نە لە دواڕۆژداو، هەروەها بە ئامانج گەیاندنی ئێوەشم بەدەست نیە، چونکە (**رَشَدْ**) چاوگە، بەڵام (**رُشد**) ناوە، (**رُشد**)یش بریتیە لە ناسینی ڕاستیی و سەر ڕاستیی، دەڵێم: بەڵکو باشتر وایە بڵێین (**الرُشد**) بریتیە لە بە ئامانج گەیشتن و بە مراد گەیشتن.

٤)- ﴿قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ﴾، بلێ: من هەرگیز هیچ کەسێك لە (سزای) خوا پەنام نادات، ئەمیش دیسان دەگونجێ بە (قَالَ) بخوێنرێتەوە، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێك لە (سزای) خوا پەنام نادات، (**أَجَارَهُ يُجِيْرُهُ: حَمَاهُ وَحَفِظَه وَرَعَاه**)، واتە: پاراستی و لە پەنا خۆی گرت و چاودێریی کرد، (**الطبري**) ئاوای لێکداوەتەوە دەڵێ: (**قُلْ لَهُمْ يَا مُحَمَد! إِنِّي لَنْ يَمْنَعَنِي مِنَ الله أَحَدٌ مِنْ خَلْقِهِ، إِنْ أَرَادَ بِي أَمْرَاً، وَلَا يَنْصُرنِي مِنْهُ**

---

(١) ئەمە قسەی خۆمە.

نَاصِرٌ)، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! پێیان بڵێ: هیچ کام لە دروستکراوەکانی خوا، ئەگەر خوا کارێکی بۆ من مەبەست بێ، نامپارێزێ لە (سزای) خوا و لە بەرانبەر خواداو، هیچ سەرخەرێك سەرم ناخات.

٥)- ﴿ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴾، هەرگیز من جگە لە خوا پەناگەیەکی دیکە، شك نابەم و دەستم ناکەوێ، (الطبري) ئاوای لێکداوەتەوە: (وَلَنْ أَجِدَ مِنْ دُوْنِ اللهِ مَلْجَأً أَلْجَأُ إِلَيْهِ)، (أخرجه: الطبري: ٣٥٢٤٣، عن سفيان)، جگە لە خوا پەناگەیەکی دیکەم نیە، پەنای پێ بەرم، (ملتَحَد)ی بە (مَلْجَأ وَنَصِيْر)، (أخرجه: الطبري: ٣٥٢٤٤ عن قتادة) لێکداوەتەوە، واتە: پەناگەو پشتیوان.

٦)- ﴿ إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ﴾، جگە لە گەیاندنێك لەلایەن خواوەو، ڕوونکردنەوەی نامەکانی و پەیامەکانی.

ئەم ڕستەیە چوار واتای بۆ کراون: (الطبري) ئەمەی بە دوو واتایان هێناوە:

١- (يَقُولُ: إِلَّا أَنْ أُبَلِّغَكُمْ مِنَ اللَّهِ مَا أَمَرَنِي بِتَبْلِيغِكُمْ إِيَّاهُ، وَإِلَّا رِسَالَاتِهِ الَّتِي أَرْسَلَنِي بِهَا إِلَيْكُمْ؛ فَأَمَّا الرَّشَدُ وَالْخِذْلَانُ، فَبِيَدِ اللَّهِ، هُوَ مَالِكُهُ)، واتە: من هیچ شتێکم بۆ ئێوە بەدەست نیە، مەگەر ئەوەی خوا فەرمانی پێکردووم، پێتان بگەیەنم و، ئەو نامەو پەیامانەی پێیدا ناردووم بۆ لای ئێوە پێتان بگەیەنم، بەڵام بە ئامانج گەیاندن، یاخود زەبوون کردن و پشت بەردان، تەنیا بەدەست خوایەو خوا خاوەنیەتی.

٢- (الطبري) واتایەکی دیکەشی هێناوە بۆ ئەم ڕستەیە: (وَقَدْ يَحْتَمِلُ ذَلِكَ مَعْنًى آخَرَ، وَهُوَ أَنْ تَكُونَ إِلَّا حَرْفَيْنِ، وَتَكُونَ (لَا) مُنْقَطِعَةً مِنْ (إِنْ) فَيَكُونَ مَعْنَى الْكَلَامِ: قُلْ إِنِّي لَنْ يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ، إِنْ لَمْ أُبَلِّغْ رِسَالَاتِهِ؛ وَيَكُونَ نَصْبُ الْبَلَاغِ مِنْ إِضْمَارِ فِعْلٍ مِنَ الْجَزَاءِ، كَقَوْلِ الْقَائِلِ: إِنْ لَا قِيَامًا فَقُعُودًا، وَإِنْ لَا إِعْطَاءً، فَرَدًّا جَمِيلًا، بِمَعْنَى: إِنْ لَا تَفْعَلِ الْإِعْطَاءَ، فَرَدًّا جَمِيلًا).

واتە: ئەمە لێرەدا واتایەکی دیکەش هەڵدەگرێ، ئەویش ئەوەیە کە دەفەرموێ: (إِلَّا)، (إلاّ) لە دوو پیتان پێکهاتبێ: (إِنْ) و (لاَ)، بەڵام (إن) لەگەڵ (لَا) دا دەغم کرابێ، مانای فەرمایشتەکە ئاوای لێ دێ، بڵێ: من هیچکەس لە خوا

نامپارێـزێ لـە بەرانبـەر (سـزای) خـوادا، ئەگـەر پەیامەکانـی خـوا نەگەیەنـم، ئنجـا وشـەی (بَلَاغِ) بەهـۆی فیعلێکـەوە کـە مانـای جـەزای گرتۆتە خـۆی، مەنصـووب بووە، وەك کەسـێك دەڵـێ: (إِنْ لَا قِيَامًـا فَقُعُـودًا)، ئەگـەر بـە پێـوە نەبـێ، بـە دانیشـتنەوە، یـان یەکێـك دەڵـێ: (إِنْ لَا إِعْطَـاءً، فَـرَدًّا جَمِيـلًا)، یـان بەخشـین، یـان وەڵامدانەوەیەکـی جـوان، واتـە: ئەگـەر بەخشـین ئەنجـام نـادەی، لانـی کـەم وەڵامێکـی جـوان و پـۆزش هێنانەوەیـەك ئەنجـام بـدە.

٣- (**مقاتل**)یش ئەو ڕستەیەی ئاوا لێکداوەتەوە: (**ذَلِكَ الَّذِي يُجِيرُنِي مِنْ عَذَابِهِ**)، واتە: {ئەوە کە من پەیام لە لایەن خواوە بگەیەنم و نامەکانی خوا بگەیەنم}، ئا ئەوە من لە ئازارو سزای خوا پەنا دەدات.

٤- هەندێکی دیکەش ئاوایان لێکداوەتەوە: (**لَسْتُ مُكَلَّفاً إِلاَّ بِتَبْلِيْغ رِسَالَاتِ اللهِ إِلَيْكُم**)، من ئەرکدار نەکراوم، مەگەر بە گەیاندنی پەیامەکانی خوا بە ئێوە.

٧)- ﴿ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، هەر کەسێکیش سەرپێچیی لە خواو لە پێغەمبەرەکەی بکات.

٨)- ﴿ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾، ئەوە بە دڵنیایی ئاگری دۆزەخی بۆ دانراوە، کە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، وشەی: (**أَبَدَاً: تَأْكِيْدٌ للخُلُود إلى النِّهَايَة**)، (**أبداً**) بۆ جەختکردنەوەی زۆر مانەوەیە تاکو کۆتایی، چونکە (**خُلُوْد**) یانی: زۆر مانەوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾، واتە: بە بێ کۆتایی تێدا دەمێننەوە.

لێـرەدا مەبەسـت لـە سـەرپێچیی لـە خـواو پێغەمبەرەکـەی، سـەرپێچییەکی بەشـیی نیـە لـە شـتێك و دوو شـتاندا، بۆیـە (**الطبري**) وای لێکداوەتـەوە دەڵـێ: (**وَمَنْ يَعْصِ اللَّـهَ فِيمَا أَمَـرَهُ وَنَهَاهُ، وَيُكَـذِّبُ بِـهِ وَرَسُـولِهِ، فَجَحَـدَ رِسَـالَاتِهِ، فَإِنَّ لَـهُ نَـارَ جَهَنَّـمَ** ﴿ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾)، هـەر کەسـێ سـەرپێچیی لـە خـوا ﷻ بـکات، لـەوەدا کـە فەرمانـی پێکـردوەو لێـی قەدەغـە کـردوەو، خـوا ﷻو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بـە درۆ دابنـێ و، نکوولیـی بـکات لـە پەیامەکانـی، ئـا ئـەوە جێـگای دۆزەخـە.

٩)- ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْاْ مَا يُوعَدُونَ﴾، هەتا کاتێك ئەوەی گفتیان پێ دەدرا بینییان، یاخود ئەوەی هەڕەشەیان پێ لێ دەکرا، بینییان، وەك (**الطبري**) دەڵێ: (**حَتَى إِذَا عَايَنُوا مَا يَعدِهم ربُّهم مِنَ العَذَابِ وَقِيَامِ السَّاعَةِ**)، هەتا کاتێك لەگەڵ ئەوەدا ڕووبەڕوو بوونەوە کە پەروەردگاریان گفتیان پێ دەدا، لە ئازارو هاتنی ئاخیر زەمان.

١٠)- ﴿فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا﴾، ئەو کاتە دەزانن کێ پشتیوانەکەی بێهێزترەو ژمارەکەشی کەمترە، واتە: دەزانن کێ لە ڕووی سەربازانەوەو، لە ڕووی ئەوانەوە کە هاوکاری دەبن، بێهێزترەو، کێش ژمارەی کەمترە، بە دڵنیایی لێرەدا خوای پەروەردگار بەپێی عەقڵی ئەوان دەیاندوێنێ، ئەگەرنا بۆ سزادانی ئەوان پێویست بە قەڕەباڵغیی زۆریش ناکات، بەڵام خوای کاربەجێ بەپێی عەقڵی خۆیان دەیاندوێنێ و، بەپێی قسەی خۆشیان وەڵامیان دەداتەوە، کە ئەوان هەڕەشەیان دەکردو دەیانگوت: ئێمە ژمارەمان زۆرەو، کەس پێمان ناوێرێ و، ئێمە دەسەڵاتمان زۆرەو قەڕەباڵغییمان بە دەورەوە هەیە، بۆیە خوا بەپێی عەقڵی خۆیان دەیاندوێنێ.

## مەسەلەی دووەم و کۆتایی:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی کە ڕایبگەیەنێ، نازانێ کات و ژوانگەی ئەو سزایەی گفتیان پێ دەدرێ، کەیە؟ چونکە بەس خوا پەنهانی تایبەت بە خۆی دەزانێ و، جگە لە نێردراوێکی پەسندیش، هیچ کەسی لێ ئاگادار ناکاتەوە، ئەویش پاسەوانانی فریشتە لە چوار دەوری دادەنێ، تاکو بزانێ پەیامەکانی خوایان گەیاندوون، خواش ﷻ هەموو شتێکی ئەوانی لە لا زانراو و ژمێردراوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِنْ رَسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِيَعْلَمَ أَنْ قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَا تُوعَدُونَ ﴾، {خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:} (ئەی موحەممەد ﷺ!) بڵێ: من نازانم ئایا ئەوەی گفتتان پێ دەدرێ، نیزیکە، واتە: کاتەکەی نیزیکەو زوو دێ.

٢)- ﴿ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَدًا ﴾، یاخود پەروەردگارم کاتێکی دیاریکراوی بۆ دادەنێ، ئەمە وەك پێشتریش گوتمان، وەڵامی ئەو هەموو هەڵپێچان و داواکردن و داکۆکییکردنەی بێبڕوایانە، کە هەمیشە پێغەمبەری خوایان ﷺ هەڵدەپێچا، هەروەك چۆن کۆمەڵگایەکانی دیکەش پێغەمبەرانی خوایان هەڵپێچاون و، سەغڵەت و تەنگەتاویان کردوون، کە بۆچی سزامان بۆ نایەت؟ ئێوە ڕاست ناکەن، یان: ئەگەر ڕاست دەکەن، با سزا بێ، ئنجا کە لە ئایەتەکانی پێشێدا خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ فەرموو، پێیان ڕابگەیەنێ کە ئەو تەنیا پەروەردگاری دەپەرستێ و کەس ناکاتە هاوبەشی و، پێشیان ڕابگەیەنێ کە هیچ زیان دوورخستنەوەیەکی ئەوان، یاخود بە ئامانج گەیشتنێکی ئەوانی بەدەست

نیە، هەروەها نەك زیان و سوودی ئەوانی بەدەست نیە، بەڵکو بۆ خۆشی هیچکەس لە بەرانبەر سزای خوادا - ئەگەر سەرپێچیی بکات - پەنای نادات و ناپارێزێ، ئەو جگە لە خوا پەناگەیەکی دیکە، شك نابات، تەنیا شتێك کە ئەو بۆ خەڵکی بەدەستە، ئەوەیە هەرچی خوا پێیدا ناردوە، بیگەیەنێ و پەیامەکانی خوایان لێ حاڵیی بکات و ڕوون بکاتەوە.

هەروەها ئەوەشی پێڕاگەیاندن: هەر کەسێك سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەرەکەی بکات، سەرپێچیی یەکجارەکیی و گشتیی، بە دڵنیایی ئاگری دۆزەخی بۆ دانراوەو، تەنیا خاوەندارێتیی ئاگری دۆزەخ دەکات لە ڕۆژی دواییدا، کە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

ئنجا وەك ترساندنیان کە وا مەزانن ئەوە بەس هەڕەشەیە، یەکسەر خوا ﷻ دیمەنێکی قیامەتی هێنایە پێش و فەرمووی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ ﴾، تاکو کاتێك ئەوەیان بینی کە بەڵێنیان پێ دەدرا، یان: هەڕەشەیان پێ لێدەکرا: ﴿ فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ أَضۡعَفُ نَاصِرٗا وَأَقَلُّ عَدَدٗا ﴾، ئەو کاتە زۆر چاك دەزانن کێ پشتیوانەکەی بێهێزترەو ژمارەکەشی کەمترە، چونکە ئەوانە بەوە دەیاننازی کە: ئێمە قەڕەباڵغین و زۆرین، تواناما‌ن هەیەو دەسەڵاتمان هەیەو، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانیشی کەم بوون، بەوە خۆیان بەسەردا هەڵدەکێشان، ڕاستیش بوو هاوەڵان کەمیش بوون و بە زۆریی هەژارو نەدارو ڕەش و ڕووت بوون، بۆیە کافرەکان دەیانگوت: ئێمە ژمارەشمان زیاترەو ماڵ و سامانیشمان زۆرترە، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: کاتێك ئەوەی هەڕەشەیان پێ لێ دەکرێ، یاخود: بەڵێنیان پێ دەدرێ، دەیبینن، ئەو کاتە دەزانن کێ پشتیوانەکەی بێهێزترەو ژمارەکەی کەمترە!

دوای ئەوەی خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە، بەوە هەڕەشەیان لێ بکات، ئنجا پێی دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنۡ أَدۡرِيٓ أَقَرِيبٞ مَّا تُوعَدُونَ ﴾، بەڵێ، دەشگونجێ (قَالَ) بێ، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ**

**مَـا تُوعَـدُون**)، نازانـم ئایـا زوویـە ئـەوەی بەڵێنتـان پـێ دەدرێ، (**قَرِيْـب**) بـۆ شـوێن بەکاردەهێـنرێ، بـەڵام مەبەسـت پێـی زوویـە، وەك چـۆن (**بَعِيْـد**) بـۆ شـوێن بەکاردەهێـنرێ، واتـە: دوور، بـەڵام لـە ڕووی کاتـەوە، یـانی: درەنـگ، واتـە: ئـەوەی بەڵێنتـان پـێ دەدرێ و هەڕەشـەتان پێـی لـێ دەکـرێ، ئایا زوویـە، یـان درەنگـە؟ مـن ئـەوە نازانـم! ﴿ أَمۡ يَجۡعَلُ لَهُۥ رَبِّيٓ أَمَدًا ﴾، یـان پـەروەردگارم کاتێکـی بـۆ دادەنـێ، ماوەیەکـی بـۆ دادەنـێ.

(أمـد): وەك پێشـتر گوتمـان لەگـەڵ کات (**زمـن**)دا یـەك واتایـان هەیـە، بـەڵام (**زَمَـن**): ئەوەیـە کـە سـنوورێکی نەبـێ، کۆتاییەکـی دیارییکـراوی نەبـێ، بـەڵام (**أمَـد**) ئەوەیـە کۆتاییەکـی زانـراوی هەبـێ، ئنجـا زوو بـێ یـان درەنـگ.

وشەـی (**رَبِّـي**) خـــوێندراویشەتەوە: (**ربِّـيَ**): ﴿ أَمۡ يَجۡعَلُ لَهُۥ رَبِّيٓ أَمَدًا ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (**أَمْ يَجْعَـلُ لَـهُ رَبِّيَ أَمَـدا**).

٣)- ﴿ عَـٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴾، زانای پەنهانە، {خوا ﷻ زانای هەموو پەنهانێکە و هەرچی نهێنییە دەیزانێ}، هیچکەس لە پەنهانی خۆی ئاگادار ناکاتەوە، (**فَلَا يُظْهِرُ أي: فَلَا يُطْلِعُ، لَا يُطْلِعُ أحَداً مِن الخَلْقِ عَلَى الغَيْب الَّذي يَعْلَمهُ هُوَ**)، هیچ کام لە دروستکراوەکان، لە فریشتەو لە مرۆڤ و لە جند، لەو پەنهانەی خۆی کە تەنیا خۆی دەیزانێ و تایبەتە بە خۆی، کەس ئاگادار ناکاتەوەو بە هیچکەسی نازانێنێ، چونکە (**ظَهَرَ**) بە مانای دەرکەوت، (**أَظْهَرَهُ**) واتە: دەریخست، بەڵام دیسان بە مانای (**أَطْلَعَهُ**)ش دێ، وای کرد بیزانێ، کە ئەگەر بمانەوێ بە کوردیی بیڵێین دەبێ بڵێین: پێی بزانێنێ، وا بکات بیزانێ.

دوایـی خـوا ﷻ کەسـانێك هەڵداوێـرێ لـەو حوکمـە، کـە خـوا هیچکـەس لـە پەنهانـی خـۆی ئـاگادار ناکاتـەوەو ئـەوان جیـا دەکاتـەوە:

٤)- ﴿ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ ﴾، مەگەر نێرراوێك پەسندی بکات، نێردراوێك کە خوا پەسندی دەکات، واتە: لە لای خوای پەروەردگار قبووڵ و پەسند کراوبێ.

لێرەدا (رسول) دەگونجێ پێغەمبەرێك بێ، پێغەمبەرێکی بەشەرو، دەشگونجێ لێرەدا نێرراوێکی فریشتە بێ، خوا ﷻ وشەی (**رَسُول**)ی هەم بۆ جیبریل بەکارهێناوە، کە پەیامی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێناوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿١٩﴾ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ﴿٢١﴾﴾**التكوير**، بێگومان ئەمە مەبەست پێی جیبریلە، چونکە جیبریل خوا ناردوویەتی و ڕەوانی کردوە، هەروەها موحەممەدیش ﷺ یەکێکە لە ڕەوانەکراوانی خوا لە مرۆڤەکان: ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِ﴾الفتح (٢٩).

کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ﴾، (**أي إلاَّ مَن اصْطَفَاهُ مِنَ رَّسُولٍ لإطْلَاعِه وَإظْهَارِه عَلَى بَعْض غَيْبِه**)، یانی: مەگەر ئەوەی خوا لە پێغەمبەرەکانی هەڵیبژاردوە، بۆ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوەو هەندێك لە پەنهانی خۆی پێ بزانێنێ.

٥)- ﴿فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا﴾، بە دڵنیایی (خوا) هەم لە پێش دوو دەستەکانیەوە، هەم لە دوایەوە پاسەوان و ئێشکچییان دادەنێ، [(**الرازي**) لە (**مختار الصَّحاح**)دا هاتوە دەڵێ: (**الرَّصَدُ: الْقَوْمُ يَرْصُدُونَ كَالحَرَسِ، يَسْتَوِي فِيهِ الوَاحِدُ وَالجَمْعُ وَالمُذَكَّرُ وَالمُؤَنَّثُ وَرُبَّمَا قَالُوا أَرْصَادًا، وَالرَّاصِدُ لِلشَّيْءِ الرَّاقِبُ لَهُ**)، واتە: (**رَصَد**): بریتیە لە کۆمەڵە خەڵکێك کە چاودێریی دەکەن، وەك (**حَرَس**)، {کە کۆی (**حَارِس**)ەو (**رَصَد**)یش کۆی (**راصِد**)ە، (**حَرَس**) واتە: پاسەوانەکان ئێشکچییەکان، (**رَصَد**)یش واتە: ئەوانەی لە بۆسەدان و چاودێریی دەکەن}، وشەی (**رَصَد**) تاك و کۆو مێینەو نێرینەی تێدا یەکسانن و بۆ هەموویان بەکاردێ، دەگوترێ: (**هُوَ رصدٌ، هما رصد، هُمْ رَصَدٌ، هُنَّ رَصَدٌ، هِيَ رَصَدٌ**)، (**رَصَدُ**)ی شتێك واتە: چاودێرکاری ئەو شتە، کە چاودێریی دەکات و ئاگاداری دەبێ] هەندێک جاریش گوتوویانە: (**أرصاد**)، (**راصد**)یش بۆ شتێک چاودێرکارییەتی.

کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا﴾، لە پێش دوو دەستەکانیەوەو لە دوایەوە پاسەوانان دادەنێن، وشەی (**يَسْلُكُ**): (**سَلَكَهُ يَسْلُكُهُ أي: أَدْخَلَهُ يُدْخِلُهُ**)، واتە: خستیە نێو دەیخاتە نێو، (**أي: يَجْعَلُ وَيَضَعُ عَلَى مَا

**حَوْلَهُ، وَذِكْرُ الأَمَامُ وَالخَلْفُ، لأَنَّهُمَا جِهَتَانِ أَكْثَرُ مَأتِيّاً**)، واتە: پاسەوانانی لە دەورە دادەنێ، بەڵام بۆیە پێشەوەو دواوەی باسکردوون، چونکە ئەو دوو لایە زیاتر شوێنی لێوە هاتنن، ئەگەرنا مەبەست ئەوەیە لە هەر چواردەورەیەوە، بەڵکو لە هەر شەش لایەکەیەوە ئێشکچییان دادەنێ، واتە: ڕاست و چەپ، پێش و دوا، سەرو خوار.

ئنجا ئایا دانانی ئەو ئێشکچیی و پاسەوانانە بۆ چییە؟ هەڵبەتە بۆ پاراستنیەتی، واتە: پاراستنی ئەو پەنهانەی خوا بەو نێردراوەدا ناردوویەتی، بۆ ئەوەی پارێزراو بێ، مەگەر کەسێك ئەو نێردراوە پێی ڕابگەیەنێ، ئەگەرنا دزە ناکات بۆ هیچکەس و شوێنێکی دی.

٦)- ﴿لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّهِمْ﴾، (ئەمە بە سێ واتایان لێکدراوەتەوە):

١- بۆ ئەوەی ئەو پەنهانەی نێردراوە، پارێزراو و سەلامەت بێ و دەستکاریی نەکرێ، تاکو (خوا ﷻ) بزانێ کە نێردراوەکان (ئەگەر فریشتەن، ئەگەر پێغەمبەرانن)، پەیامەکانی پەروەردگاریان گەیاندوون.

یەکێك بۆی هەیە بڵێ: بە دڵنیایی بەر لەوەی فریشتەکان پەیامەکان بگەیەنن بە پێغەمبەران، یان پێغەمبەران پەیامەکان بگەیەنن بە خەڵك، خوا هەر دەزانێ؟! دەڵێین: ئەو تەعبیرە لە زۆر شوێنی قوڕئان دا هاتوە، (لِيَعْلَمَ) واتە: بۆ ئەوەی خوا ﷻ دوای ئەوەی زانیویەتی، ئەو زانینەی لەسەر ئەرزی واقیع بەرجەستە ببێ و لە واقیعدا بێتە دی.

٢- واتایەکی دیکەی (لِيَعْلَمَ) ئەوەیە: (**لِيَعْلَمَ الرَّسُولَ أَنَّ الرُّسُلَ قَبْلَهُ قَدْ بَلَّغُوا**)، بۆ ئەوەی پێغەمبەری کۆتایی بزانێ {ئەگەر (لِيَعْلَمَ) ڕاناوەکەی بۆ (**رسُول**) بچێتەوەو (**رسُول**) یش مەبەست پێی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بێ}، کە پێغەمبەرانی پێش ویش پەیامی خوایان بۆ هاتوەو بە سەلامەتیی بە پارێزراویی گەیاندوویانەو، شەیتانەکان دەستکارییان نەکردوە، کەواتە: ئەگەر گۆڕان و لادانێك لە کتێبە پێشووەکان داو لە پەیامی پێغەمبەرانی

پێشوودا ڕوویداوە، ئەوە لە ڕاستییدا مرۆڤەکان دەستکارییان کردوە، نەك شەیتانەکان دەستیان گەیبێتێ و دەستکارییان کردبێ، خوای پەروەردگار وەحیی و پەیام و سروشی خۆی بۆ هەر کام لە پێغەمبەران ناردوە، پاسەوان و ئێشکچیی لە فریشتان بە دەورەوە داناون، تاکو بە سەلامەتیی بگات.

٣- واتایەکی دیکەی (لِيَعْلَمَ) ئەوەیە: (لِيَعْلَمَ الكُفَّار...) تاکو بێبڕوایەکان بزانن کە پێغەمبەران پەیامەکانی پەروەردگاریان گەیاندوە، یانی: بێبڕوایەکان بزانن کە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگەیەنێ، ڕێك پەیامی خوای پەروەردگارەو، گومانی ئەوەی پێ نەبەن کە ڕەنگە شەیتانەکان دەستکارییان کردبێ، وەك هەمیشە ئەو تۆمەتە لە لایەن بێبڕوایەکانەوە ئاڕاستەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکرا، دەیانگوت: موحەممەد ﷺ (**سَاحِرٌ أو مَجْنُون**)، جادووگەرە یان شێتە، یان دەیانگوت: شاعیرە، یان دەیانگوت: کاهینە، یان دەیانگوت: جندەکان دەستیان لێ وەشاندوە، ئەو تۆمەتانەیان بۆ هەڵدەبەستن، بۆیە خوا ﷻ ئەوەی فەرمووە، تاکو بێبڕوایەکان بزانن و دڵنیابن ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ پێیان ڕادەگەیەنێ، ڕێك فەرمایشتی خوای پەروەردگارە بێ کەم و زیاد.

٧)- ﴿وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ﴾، ئەو (خوا ﷻ) هەر چی لەلایانە، (فریشتەکانی لەلایانە، یان پێغەمبەران کە خوا پەیامی خۆییان پێڕادەگەیەنێ)، دەوری داون، واتە: خوا هەموو شتێکیان لە بارەوە دەزانێ، (**أي أحَاطَ بِمَا عِنْد الرَّصَد مِن المَلاَئِكَة أو بِمَا عِنْد الرُّسُلِ المُبَلِّغِيْن**)، خوا ﷻ دەوری ئەوەی داوە لە لای ئەو فریشتانەیە، کە خوا بە پاسەوان ناردوونی، ئاگاداری هەموو شتێکیانە، یاخود: ئاگادارەو دەورەی هەموو ئەوەی داوە، لە لای ئەو پێغەمبەرانەیە، کە پەیامی خوایان پێ ڕاگەیەنراوە.

٨)- ﴿وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا﴾، خوا ﷻ ژمارەی هەموو شتێکی سەرژمێر کردوە، وشەی (عَدَدُ): (**وَالْعَدَدُ: بِالْفَكِّ اسْمٌ لِمَعْدُودٍ، وَبِالْإِدْغَامِ مَصْدَرُ عَدَّ، وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ مَعْدُودًا**)، وشەی (عَدَد) ئەگەر دوو دال (د)ەکە لێك بکرێنەوە، ناوی ئەو شتەیە کە دەژمێردرێ، دەگوترێ: (**ما عَدَدُ الكُتُبِ**) ژمارەی کتێبەکان چەندە؟ (**عَدَد**) ناوە بۆ ژمێردراو، بەڵام (**عَدّ**) چاوگی (**عَدَّ**)یە (**عَدّه يَعُدّهُ عَدّاً**)، ژماردی، دەیژمێرێ، ژماردن، کەواتە: (**عَدّ**) واتە: ژماردن،

بەڵام (عَدَد) واتە: ژمارە، یاخود ژمێردراو، کە دەفەرمویٚ: ﴿وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًا﴾، واتە: ژمارەی هەموو شتێك ژمێردراوەكەی چەندە، خوای پەروەردگار هەمووی سەرژمێر كردوەو، هەمووی دەزانێ.

شایانی باسە: لێرەدا كە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا﴾، زانای پەنهانە، هەڵبەتە (عَالِمِ الغَيْب) خوێندراوەتەوەش: (عَالِمُ الغَيْب)، واتە: ئنجا ئەگەر (عَالِمِ الغَيْب) بێ، با دەدرێتەوەو دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر (رَبِّي): ﴿أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ﴾، بەڵام ئەگەر (عَالِمُ الغَيْب) بێ، ئەوە ڕستەیەكی دیكە دەست پێدەكات و دەسپێبكەوە (إسْتِئْنَافية)یە.

## کورتە باسێک لە بارەی
## پەنهان (غیب) و سنووری پەیپێبردنیەوە

لێرەدا زانایان زۆر قسەیان کردوە، ئایا مەبەست لەو پەنهان (**غَیْب**)ە چییە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا﴾، ئایا هیچ جۆرە پەنهانێک نازانرێ؟

وەڵامەکەی ئاوایە:

پێشێ خوا دەفەرموێ: ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ﴾، (خوا) زانای هەموو پەنهانێکە، (**غَیْب**) ئەلیف و لامی ناساندنی لەسەرەو جینسی غەیب دەگرێتەوە، واتە: هەرچی پەنهانە خوا دەیزانێ، بەڵام بۆ هی دوایە کە دەفەرموێ: هیچ کەسێکی ئاگادار ناکاتەوە لە پەنهانی خۆی، (**غَیْب**)ی بە (**نَكِرَة**) هێناوە، ﴿فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا﴾، هیچکەس ئاگادار ناکاتەوە لە پەنهانی خۆی، نەك لە هەرچی پەنهانە، بەڵکو پەنهانێك کە تایبەتە بە خۆیەوە، هیچکەسی لێ ئاگادار ناکاتەوە، مەگەر رەوانەکراوێك کە پەسندی بکات، کە مەبەست پێی فریشتەکانن کە پەیامی خۆییان پێدا دەنێرێ، یاخود پێغەمبەران کە خوا پەیامی خۆییان بۆ دەنێرێ.

بەڵێ، خوا ﷻ نەیفەرموە: هیچکەس لە هیچ پەنهانێك ئاگادار ناکاتەوە، بۆیە ئەگەر مرۆڤەکان توانییان هەندێك لە پەنهان بزانن، هەندێك لەو شتانەی شێردراوەن، بزانن، پەییان پێ ببەن.

أ- چ لە رێی زانستەوە، زانستی ئەزموونکاریی (**العلم التجربي**)، بۆ وێنە:

**١-** بە مەزەندە دەڵێن: خۆر پێنج ملیار ساڵ لە تەمەنی تێپەڕیوەو، دەوری پێنج ملیار ساڵی دیکەش دەگونجێ وزەمان پێ بدات، تاکو دەکوژێتەوە.

٢- هەروەها بە مەزەندە دەڵێن: زەوی چوار ملیارو ئەوەندەساڵ تەمەنیەتی، هەروەها مانگ ئەوەندە ساڵە تەمەنیەتی.

هەڵبەتە ئەوەش هەمووی بە نیزیکخراوەیی و بە مەزەندەیە.

٣- هەروەها گەردووناسان دەڵێن: خۆر فڵان ڕۆژە، لە فڵان ساڵەدا دەگیرێ، لە فڵان شوێنی سەر زەوی، یان لەسەر زەوی هەمووی دادەگیرێ، یان مانگ لە فڵان کاتەدا دەگیرێ.

٤- لە ڕووی کەشناسییەوەش دەڵێن: فڵان کاتە باران دەبێ، یان نابێ، پلەی گەرمیی بەرز دەبێ یان نزم دەبێ، بای دێ یان بای نایەت، ئەوانەش هەموویان جارێ نەهاتوون، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوانە، وشەی (پەنهانەکەی) (غَیْبه) نایگرێتەوە، چونکە خوا دەفەرمویّ: پەنهانی خۆی، یانی: پەنهانێك کە تایبەتە بە خواوەو، خواش بە ڕەهایی نەیفەرمووە هیچ پەنهانێك خەڵك نایزانێ.

کەواتە: دەگونجێ لە ڕووی زانیارییەوە مرۆڤ بگاتە دەرککردنی هەندێك لە پەنهانەکان و شتە شێردراوەکان، وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، وێنەی خۆرگیران و مانگ گیران و حاڵەتەکانی کەشناسیی و...هتد، چونکە خوا ﷻ ئەو توانایەی داوە بە مرۆڤ، هەندێك شت بزانێ کە پەیوەندیی بە داهاتووەوە هەیە، یان پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە، بۆ وێنە: زانایان گوتوویانە: لە چاخی کامبەرییدا یەك لێشاو دروستکراوی ژیاندار پەیدا بوون، ئەوەندە ملیۆن ساڵە، لەمەو پێش، هەروەها گوتوویانە: ژیان لەسەر زەوی مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەندە ملیۆن ساڵ لەمەوبەرو، سەرەتای دروستکرانی مرۆڤ لەسەر زەوی دەگەڕێتەوە بۆ (١٠٠٠٠- ٣٠٠٠٠٠ ) ساڵ لەمەوبەر[١]،ئنجا هەرچەندە ئەوە مەزەندەیە، بەڵام گریمان ئەگەر زانیاریی پتر بەرەو پێشچوو و توانی کاتێکی

---

(١) sapiens: A Briet History of Humankind(کورتەیەک لە مێژووی مرۆڤایەتی).

وردیش دیاریی بکات، ئایا لەگەڵ ئەو فەرمایشتەی خوادا دژ دەوەستێ؟ بە دڵنیاییی نەخێر!

چونکە خوا دەفەرموێ: خوا هیچ کەسێك لە پەنهانی خۆی ئاگادار ناکات، نەیفەرمووە لە پەنهان بە گشتیی، بۆیە دەگونجێ لە ڕووی زانستەوە، مرۆڤ بگاتە زانینی هەندێك لە پەنهانەکان.

ب- هەروەها لە ڕێی وەحییەوەش - جگە لە قورئان کە خوای پەنهانزان فەرموویەتی: ﴿فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ﴾ - پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ هەندێك شتی لە بارەی داهاتووی ئۆممەتەکەیەوە فەرمووە، کە ئەوە دەبێ و، ئەوە دەبێ و، ئاوا ڕوودەدا، ئەوانەش هەموویان پەنهانن، بەڵام لە ڕێی وەحییەوە خوای پەروەردگار پێغەمبەری خاتەمی ئاگادار کردوەتەوە.

ج- دیسان جگە لە ڕێی وەحیی لە ڕێی ئیلهامیشەوە، واتە: خرانە نێو دڵ و خورپە، دیسان دەگونجێ هەندێك شتی پەنهان و شێرراوە بزانرێ، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {**إِنَّ فِي هَـٰذِهِ الأُمَّـةِ مُحَدَّثِيْنَ وَإِنَّ مِنْهُم عُمَـر**} (**أخرجه البخاري: ٣٦٨٩، مسلم: ١٨٦٤**)، واتە: لەم ئۆممەتەدا (ئۆممەتی پێغەمبەری خاتەم ﷺ)، قسە بۆ کراو، {خورپە بۆ کراو} هەن، کە عومەر یەکێکیانە.

عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) پیاوێکی زۆر دڵڕۆشن بووە، لە هەموو تەفسیرەکاندا باس دەکرێ، لە چەند هەڵوێستێکدا پێشنیاری کردوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئاوا نەکەین؟ با ئاوا بکەین باشە! دوایی ئایەت بەپێی قسەکەی ئەو هاتوەتە خوارێ.

١- بۆ وێنە: بە دەوری کەعبەدا تەوافیان کردوە، بەر لەوەی دوو ڕکات نوێژەکەی لای مەقامی ئیبراهیم، پێغەمبەری خوا ﷺ دابینێ، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوتم:

ئەی پێغەمبەری خوا! **(ألَا نتّخِذُ مَقَام إبْرَاهِيْمَ مُصَلّى)**، {مەقامی ئیبراهیم و شوێنی ئیبراهیم لێی وەستاوەو، دیواری کەعبەی لەسەر بنیات ناوە، بەردێکی گەورەیە}، ئایا مەقامی ئیبراهیم نەکەینە نوێژگە، دوو ڕکات نوێژی لێ نەکەین؟ دوایی خوا ئایەتی ناردۆتە خوار: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ ﴾ **البقرة**، ئەو شوێنەی ئیبراهیم لێی وەستاوە بیکەنە نوێژگە، واتە: دوو ڕکات نوێژی لێ بکەن.

**٢-** هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) - وەك لە تەفسیری سوورەتی **(التحريم)**دا هێنامان - لە خاتوو حەفصەی کچی و خاتوو عائیشە خوا لێیان ڕازی بێ توورە بووە، کە لە بەینی خۆیان دا ڕێککەوتوون و شتێکیان کردوە مایەی نیگەرانیی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، گوتوویەتی: **(عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدله أزواجاً خَيْراً مِنْكُنَّ)**، واتە: نیزیکە ئەگەر پێغەمبەر تەڵاقتان بدات پەروەردگاری ئافرەتانی دیکەی بە نسیب بکات، دوایی خوای پەروەردگار ئایەتی ناردۆتە خوار: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ ﴾ **التحريم**.

**٣-** هەروەها لە کاتێکدا پێغەمبەری خاتەم ﷺ نوێژی لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول کرد، کە سەرۆکی مونافیقەکانی مەدینە بوو، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) چووە پێشی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەو کابرایە ئەو کەسە بوو کە ئاوای گوت و، ئاوای کردو ئاوای کرد، هەڵوێستەکانی و قسە خراپەکانی کە لە ژیانیدا کردوونی بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیسلام و مسوڵمانان، وەبیری هێنانەوە، پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنەی دەکرد هەتا عومەر لێ بۆوە، فەرمووی: عومەر! خۆت لابدە، خوا سەرپشکی کردووم و نوێژی لەسەر دەکەم، دوایی خوا ئایەتی نارده خوار: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ ﴾ **التوبة**، لەمەودوا هەر کامێك لەوانە - کە دەزانی مونافیقە - ئەگەر مرد نوێژی لەسەر مەکەو، لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە.

هەروەها هەندێ حاڵەتی دیکەش لە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕرێنەوە کە پێشنیاری کردوەو، دوایی ئایەتی خوای زاناو شارەزا وەك پێشنیارەکەی ئەو هاتۆتە خوار، ئەمەش مانای وایە مرۆڤ دەگونجێ خوا دڵڕوونییەکی پێ بدات و

هەندێ شتی بخاتە دڵ کە پەیوەندییان بە داهاتووەوە هەیە، یان جاری وا هەیە پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە، یان پەیوەندیی بە شتێکی نەزانراوەوە هەیە.

کەواتە: ئیلهامیش یەکی دیکەیە لەو ڕێیانەی مرۆڤ هەندێك لە شتە پەنهانەکانی پێ بزانێ[١].

بەڕاستیی دەبێ لەو ڕووەوە مسوڵمانان زۆر وریا بن، مادام خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی لێرە خۆی بە زانای پەنهان (**عالم الغیب**) ناساندوە، لە سوورەتی (**هود**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، لە سوورەتی (**النّمل**)یش دا فەرموویەتی: ﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾**النّمل**، بڵێ پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی جگە لە خوا کەس نایزانێ و هەستیش ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە، یانی: ئەو پەنهانەی مرۆڤ دەستی نایگاتێ و لە ڕێی زانستیشەوە هەر نایزانن، هەروەها لە چەند شوێنێکی دیکەدا خوای پەروەردگار لە قورئان دا زانینی پەنهانی تایبەت کردوە بە خۆیەوە.

ئنجا ئەگەر مرۆڤەکان بەپێی ئەو توانایەی خوا پێیداون، هەندێك لە پەنهانی ئاسمانەکان و زەوییان زانی، ئەوە دژ ناوەستێ لەگەڵ ئەوەدا کە خوا فەرموویەتی، چونکە خوا هەموو پەنهانەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، بەڵام جاری وا هەیە مرۆڤەکان لە ڕێی ئەو توانایانەوەی خوا پێیداون، چ توانای زانستیی و ئەزموونیی، چ توانای ئیلهام و خورپە خرانە نێو دڵ، دەگونجێ هەندێك لە پەنهان بزانن پەنهانێکی بەشیی (**جزئي**) بزانن.

بەڵام دەبێ وریا بین! هەموو ئەوانەی لافی ئەوە لێ دەدەن پەنهان دەزانن، وەك: کاهین و عەڕڕاف و، فاڵچیی و، ئەستێرەوان و، قاوە گرەوەو،

---

(١) ئێمە لە بارەی پەنهان (غیب)ەوە، لە کۆتایی تەفسیری سوورەتی (هود)دا کورتە باسێکمان کردوە.

دەست خوێنەرەوەو، لەسەر لم نووسەر، هەموو ئەو جۆرە کارانە بۆ زانینی نادیار (غیب)، لە ئەفسانەو کڵاو لەسەری خەڵك نان و فریودانیان بەو لاوە، هیچی دیکە نین، بە تایبەت لەم ڕۆژگارەدا ئەستێرەناسیی و بورجەکان: ئەگەر فڵان ئەستێرە لە فڵانە بورجە دابێ، فڵان شتە دەبێ، هەمووی درۆو دەلەسەو ئەفسانەیە، نكووڵیی لەوە ناكەین، كە لەڕێی زانیاریی ئەزموونییەوە، مرۆڤ هەندێ شتی بۆ دەركەوێ، بەڵام ئەوە كە فڵان ئەستێرە ئەگەر بچێتە فڵان كەلوو (برج)ەوەوە، پەیوەندیی هەیە بە فڵانكەسەوەو وادەبێ و وا دەچێ، هیچ بنەمایەكی نیەو، مسوڵمانان نابێ بەدوای ئەو شتانە بكەون.

یان ئافرەتێك كە قاوە دەگرێتەوە، یان یەكێكی دیكە كە بە حیساب دەست دەخوێنێتەوە، یان یەكێكی دیكە بە هۆی لمەوە شت دەزانێ! ئەوانە هەموویان پێچەوانەی ئەو ئایەتە موبارەكانەن كە خوا ﷻ دەفەرموێ: تەنیا خوا پەنهان دەزانێ، ئنجا زانینی هەندێك لە نهێنییەكانیش، بەشێوەیەكی جوزئی لە ڕێی ئەو ئامرازانەوە كە خوا بۆ مرۆڤی ڕەخساندوون، مادام ئامرازی زانستیی بن و جێی دڵنیایی بن، ئەوە لەگەڵ ئایەتەكەدا تێك ناگیرێ، پێغەمبەریش ﷺ هەڕەشەی كردوە لە كەسانێك كە دەچن بۆ لای كەسانی فاڵچیی و، قاوە گرەوە، بۆ زانینی بەخت و شانس، وەك لەو كورتە باسەدا كە لە كۆتایی سوورەتی (**هود**) كردوومانە، بە تەفصیل باسمان كردوە.

یەكێك لە فەرمایشتەكان پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەیە كە دەفەرموێ: {**مَنْ أَتَى عَرَّافاً فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ فَصَدَّقَهُ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ يَوْماً**}، (**أخرجه البخاري: ٢٢٣٠**)، واتە: هەر كەسێك بچێتە لای فاڵچییەك و ئەوەی دەیڵێ، بەڕاستی بزانێ، نوێژی چل ڕۆژی لێ وەرناگیرێ.

چونكە گوناهو هەڵەیەكی كردوە زۆر قورسەو كردەوە چاكەكانی بەهۆیەوە هەڵدەوەشێنەوە.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی لـە وردەکارییەکانـی فەرمایشـتی پـڕ لـە نهێنیـی بـێ سـنوری خـۆی، زیاتـر ئاگادارمـان بـکات و، دڵڕۆشـنیی زیاترمـان پـێ بـدات، کاتێـك لـە فەرمایشـتی خـواوە ڕادەمێنیـن، کـە دەیخوێنینـەوە، یـان گوێـی بـۆ دەگریـن، تەوفیقـمان بـدات، ئـەوەی بـۆ دنیـاو دواڕۆژمـان پێویسـتە، بـە شـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت لێـی تێبگەیـن، دواییـش بـە پێـی ئـەو تێگەیشـتنە ڕاسـت و دروسـتە، کاری پێبکەیـن، چ لـە خـودی خۆمانـدا، چ لـە چوارچێـوەو دەوروبـەری خۆمانـدا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێـــــزان

ئەمـڕۆ کـە (١٨)ی شـەووالی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٦/١٠) ی زایینـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الْمُزَّمِّـلُ)، وەك عادەتـی خۆشـمان سـەرەتا پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە مـوبارەکە، لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (المزمل) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیـا نـاوی (**سـورة الْمُزَّمِّـلُ**)ی لێنراوەو هـەر بـەو نـاوە نـاسراوە، (**الْمُزَّمِّلُ**)یـش -وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن - سـیفەتی پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ واتـە: پۆشـەرو پێخـەف لـە خـۆوە پێـچ، یاخـود: خـۆ لـە نوێـن و پێخەفـەوە پێـچ، کـە دیـارە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لـە کاتێکـدا خـوا ﷻ ئـەم سـوورەتە موبارەکـەی بـۆ دابەزانـدوە، لـە حاڵـەتی خەوتـن و پشـوودان و نوێـن لـە خـۆوە پێچـان و خـۆ لـە پێخەفـەوە پێچـان دا بـووە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

أ- ئەم سوورەتە بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری نیزیك بە یەکدەنگیی زانایان، سوورەتێکی مەککەییە، جگە لە ئایەتی کۆتایی، ئایەتی ژمارە (٢٠): ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ ... ﴾، کە دەڵێن: ئەوە مەدینەییە، زۆربەی هەرە زۆری زانایان وادەڵێن.

**ب-** ڕایەکیش هەیە کە ئایەتی ژمارە (٢٠)یش ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**الْمُزَّمِّلُ**)یش، هەر لە مەککە دابەزیوە، بەڵام دوای ساڵێك، وەك سووككردنی حوكمی شەو نوێژ لەسەر پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی، یاخود تەنیا لەسەر هاوەڵانی بەڕێزی، لە فەرزەوە بۆ پەسند (**مِنَ الْوُجوبِ إِلَى النَّدب**)، وەك لەم دەقانەوە دیارە:

**١-** دەقی یەكەم: {**عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما**، قَالَ: أَوَّلُ مَا نَزَلَ أَوَّلُ الْمُزَّمِّلِ كَانُوا يَقُومُونَ نَحْوًا مِنْ قِيَامِهِمْ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، وَكَانَ بَيْنَ أَوَّلِهَا وَآخِرِهَا قَرِيبٌ مِنْ سَنَةٍ**} (**جامع البيان: ٣٥٢٦٦**).

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: یەكەمین شت كە دابەزی سەرەتای سوورەتی (**الْمُزَّمِّلِ**) دابەزی، هاوەڵان عادەتیان وابوو بە ئەندازەی شەو نوێژێك (تەڕاویحێك) كە لە مانگی ڕەمەزاندا دەكرێ، شەونوێژیان دەكرد، (بەڵام نەك هەر لە مانگێكدا بەڵكو لە هەموو ساڵەكەدا)و، ماوەی نێوان دابەزینی سەرەتای ئەم سوورەتەو كۆتاییەكەی (ئایەتی كۆتایی) نیزیكەی ساڵێك بوو، {یازدە مانگان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) هەموو شەوەكان شەونوێژیان كردوە، بەڵام دوای ساڵێك خوا سبحانه وتعالى لەسەری سووككردن و ئایەتی ژمارە (٢٠)ی كۆتایی دابەزی، كە سووككردنی ئەو حوكمەی تێدایە}.

**٢-** دەقی دووەم: {**عَنْ قَتَادَةَ رحمه الله، قَالَ: قَامُوا حَوْلًا أَوْ حَوْلَيْنِ حَتَّى انْتَفَخَتْ سُوقُهُمْ وَأَقْدَامُهُمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَخْفِيفًا بَعْدُ فِي آخِرِ السُّورَةِ**} (جامع البيان: **٣٥٢٧٣**).

قەتادە كە یەكێكە لە زانایانی شوێنكەوتووان، ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموو لایەكیان بێ، دەڵێ: ماوەی ساڵێك یان دوو ساڵان، هاوەڵان كە لە خزمەت پێغەمبەردا بوون ﷺ شەو نوێژیان كرد، هەتا لاقیان و پێیەكانیان هەڵاوسان (بەو واتایەی زۆر ماندوو بوون)، دوایی خوا سبحانه وتعالى سووككردنی ئەو حوكمەی لە سوورەتەكەدا دابەزاند.

**٣-** دەقی سێیەم: {**عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ﴾**، قَامَ الْمُسْلِمُونَ حَوْلًا، فَمِنْهُمْ مَنْ أَطَاقَهُ، وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُطِقْهُ، حَتَّى نَزَلَتِ الرُّخْصَةُ**} (جامع البيان:٣٥٢٧٦)،

حەسەنی بەصڕاییش کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووان (ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ) دەڵێ: کاتێك ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ﴾، دابەزی، مسوڵمانان ماوەی ساڵێك جێبەجێیان کرد (شەو نوێژیان کرد زۆر بە خەستیی)، ئنجا هەیانبوو لە توانایدا هەبوو، هەشیانبوو لە توانایدا نەبوو، تاکو دوایی مۆڵەت دابەزی.

(**مَـن أَطَاقَـهُ**)، واتـە: لەگـەڵ خـۆ ئەزیەتدانیشـدا پێیـان کـراوە، بـەڵام هەبـووە لەگـەڵ خـۆ مانـدوو کردنیشـدا، بـاش بـۆی ئەنجام نـەدراوە، بۆیـە خـوا ﷻ لەسـەری سـووککردن.

٤- دەقی چوارەم: کە (حاکم) هێناویەتی: {**قَوْلُهُ تَعَالَى**: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ﴾، **نَزَلَ بَعْدَ نُزُولِ صَدْرِ السُّورَةِ بِسَنَةٍ، وذَلِكَ حِينَ فُرِضَ قِيامُ اللَّيْلِ فِي أَوَّلِ الإِسْلامِ قَبْلَ فَرْضِ الصَّلَواتِ الخَمْسِ**}(جامع البيان: ٣٥٢٧٦)، واتە: قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ﴾، ئەمە لە دوای سەرەتای سووڕەتەکە بە ساڵێك دابەزی (هەروەك ڕیوایەتەکانی دیکەش دەڵێن)، ئەویش دوای ئەوەی شەو نوێژ پێویست کرا لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا، بەر لەوەی پێنج فەڕزەکان فەڕز بکرێن (دوای ئەوەی پێنج نوێژە فەڕزەکان پێویست کران، پێویستبوونی شەونوێژ لە پێویستییەوە گۆڕا بۆ پەسندیی).

ج- بۆچوونێکی دیکەش هەیە هەندێك گوتوویانە: ئەم ئایەتەی ژمارە (٢٠)ی کۆتایی دوای دە(١٠) ساڵان دابەزیوە، کە ئەوەش دیسان هەر مانای وانیە لە مەدینەدا دابەزیوە، چونکە مادام ئەم سووڕەتە لە سەرەتاوە دابەزیبێ، هەر لە سەرەتای ساڵی یەکەمدا، چونکە ئەمە دووەمین سووڕەتە بە ڕای زۆربەی زانایان و بەڕای بەندەش کە دابەزیوە، هەشبووە گوتوویەتی: (**المدثر**) یەکەمین سووڕەتە، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، ئەم سووڕەتە دووەمین سووڕەتەو، دوای پێنج ئایەتەکەی سووڕەتی (**العلق**) دابەزیوە.

ئنجا ئەگەر دوای دە ساڵانیش ئایەتی بیستەم دابەزیبێ، مانای وایە هەر لە قۆناغی مەککەدا بووە، چونکە قۆناغی مەککە سێزدە ساڵ بووەو، ئەگەر (المزمل) لە ساڵی دەیەمدا دابەزیبێ، مانای وایە سێ ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**الْمُزَّمِّلُ**)یش دابەزیوە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەكانی ئەم سوورەتە:

ژمێرەران سێ ژمارەیان بۆ ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە داناون:

١- (**أهل المدینة**) گوتوویانە: هەژدە ئایەتە.

٢- (**أهل البصرة**) گوتوویانە: نۆزدە ئایەتە.

٣- بەڵام زۆربەیان زانایانی کووفەو ئەوانی دیکەش گوتوویانە: بیست ئایەتەو زۆربەی موصحەفەکانی لەبەر دەستی ئێمەدان، ژمارەی بیستیان تەبەننیی کردوە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە دابەزین و لە موصحەفدا:

لە بارەی ڕیزبەندیی لە دابەزینەوەدا ڕاجیایی هەیە، بەڵام ئەوەی بەڕاست دێتە بەر چاوی بەندە، ئەوەیە کە ئەم سوورەتە دوای سەرەتای سوورەتی (العلق) دابەزیبێ، واتە: دوای ئەم پێنج ئایەتە موبارەکە:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾﴾العلق، ئەم پێنج ئایەتە یەکەمین ئایەتانێك بوون کە دابەزینە سەر دڵی موبارەکی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، بەڵام سوورەتی (العلق) هەمووی بە دڵنیایی لەو سەرەتایەوە دانەبەزیوە، چونکە دوایی خوا پشتیوان بێ کە دەیگەیەنێ باسیدەکەین کە ئەوە ناگونجێ چونکە، ئایەتەکانی دوایی کە بەمجۆرەن: ﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَىٰ ﴿٩﴾

﴿عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ١٠ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ١١ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ١٢ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ١٣ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ١٤﴾ العلق، ئەمانە هەموویان لە سالانی دواتردا دابەزیون، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی تۆزێك بڵاوكردۆتەوەو نەیارو دوژمنی بۆ پەیدابوون، ئەو ئایەتانەش زۆربەی زانایان دەڵێن: لە بارەی ئەبوو جەهلەوە هاتوون، ئەگەرنا لەو سەرەتایەوە نە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازەكەی بەو شێوەیە ئاشكرا كردوەو تەشەنەی سەندوەو، نە دوژمنان و ناحەزانیشی دژایەتییان كردوە، ئنجا دوای ئەو پێنج ئایەتە موبارەكە، پێموایە سوورەتی (المزمل) دابەزیوە، كە پێغەمبەر ﷺ گەڕاوەتەوە ماڵ و فەرموویەتی: (**زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي**)، داپۆشن، داپۆشن، دوای ئەوەی لە ئەشكەوتی حیڕادا جیبریلی بینیوەو سێ جاران بەخۆیەوە گوشیوە - وەك دوایی دەقەكە دێنین - جیبریل ئەم پێنج ئایەتەی بۆ خوێندوونەوەو پێغەمبەریش ﷺ ترساوەو نارەحەت بووەو، مەترسیی هەبووە دەستی لێوەشێنرابێ و، ئەو كەسەی دیتوویەتی شەیتانێك بێ! كە گەڕاوەتەوە بە خەدیجەی خێزانی خوا لێی ڕازی بێ گوتوە: داپۆشن، ئنجا دوای ئەوەی پشوویەكی داوە، جارێ هەر لە نێو نوێن و پێخەفەكەیدا بووە كە خوا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾، ئەی ئەو كەسەی بە نوێن خۆت داپۆشیوە! پێخەفت لەخۆوەت پێچاوە، خۆت لە پێخەفەوە پێچاوە! ﴿قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾، شەو نوێژ بكە جگە لە كەمێكی... ئەم ئایەتانە هەموویان تاكو ئایەتی ژمارە نۆزدە، دابەزیون، ئایەتی ژمارە بیستیش ساڵێك دوای ئەوە، یاخود ڕیوایەتەكەی دیكە دەڵێ: دە ساڵ دوای ئەوە دابەزیوەو، هەردووكیان گونجاون، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو سوورەتە هەمووی لە مەككە دابەزیوە، ئەو نۆزدە ئایەتە یەكەمین ئایەتانێك بوون لە دوای پێنج ئایەتەكەی سەرەتای سوورەتی (العلق) كە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیون، ئنجا پێموایە لە دوای سوورەتی (المزمل)، ئنجا سوورەتی (**المدثر**)و، دوایی سوورەتی (القلم): ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ ...١﴾، دابەزیوە، وەك كاتی خۆشی باسمان كرد، ئەوە بە نسبەت ڕیزبەندییەوە لە دابەزین دا.

ڕیزبەندییشی لە موصحەفدا ژمارە حەفتاو سێ (٧٣)یە، لە سوورەتی (الفاتحة) ەوە کە دێین لە نۆرەی حەفتاو سێدا، ئەم سوورەتە موبارەکە هەیە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە خوای بە بەزەیی عزوجل، بە میهرەبانانە دواندنی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەستی پێدەکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴾، کە ئەمە وەکە زانایان دەڵێن: بریتیە لە: (**مُلاطَفَة**)، واتە: میهرەبانانە دواندن، دوای ئەوە خوا فەرمانی پێدەکات کە شەو نوێژو شەو بێداریی بکات، ئەویش خوا تعالى سێ حاڵەتانی بۆ دیاریی دەکات، بە سێ جۆر: أ- نیوەی زیاتری شەو شەونوێژ بکات، کە دەکات دوو لەسەر سێی، وەك لە ئایەتی (٢٠)دا ئەم نیوە زیاترە ڕوونکراوەتەوە، چونکە لە ئایەتی یەکەمدا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ٢ ﴾، شەوگارەکە هەمووی هەڵسەوە، جگە لە کەمێکی، کەواتە: لە نیوە زیاتری و تاکو دوو لەسەر سێی (٣/٢)، ئەو کاتەش ئەوەی لە دوو لەسەر سێیەکە دەمێنێتەوە، کەمێکی شەوگارە، ﴿ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴾ ب- نیوەی شەو هەڵسە، ج-یاخود کەمێکیش لە نیوەکەی کەم بکەوە، واتە: یەك لەسەر سێی، مانای وایە دەکات سێ حاڵەت:

**أ-** یان لە نیوەی زیاتری شەو هەڵسە بۆ شەو نوێژ.

**ب-** یاخود نیوەی.

**ج-** یاخود لە نیوەی کەمتری.

دواییش فەرمانی پێدەکات کە قورئان بە چاکیی و بە ڕێکیی بخوێنێتەوەو هەواڵیشی پێ دەدات کە فەرمایشتێکی گرانی دادەبەزێنێتە سەرو، فەرمانیشی پێدەکات بە یادی خوا کردن و، خۆ بەلای خوادا دابڕین و خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ یادی خواو پەرستشی خواو، پشت بە خوا بەستن و، خۆڕاگریی جوان لە بەرانبەر قسەی بێبڕوایان دا، دواتر هەڕەشە کردن لە بێبڕوایان بە

سزای سەختی ڕۆژی دوایی باسکراوەو، ئاماژەیەکیش بە سەرەنجامی زیانبارانەی فیرعەون کراوەو، کە خوا مووسای (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بۆ لا ناردوە لەگەڵ هاڕوونی برای (عَلَيْهِ السَّلام)دا، بەڵام ئەو لاملیی کردوەو سەرەنجام سەری خۆی و شوێنکەوتووانی بە فەتارەت چووە، دواتر باسی سەختیی ڕۆژی دوایی کراوە، بە ئاخیر زەمان و قیامەتەوە، هەردوو قۆناغەکەی و ئەوەش هەمووی بە بیرخەرەوە (تَذكِرَة) دانراوە.

لە ئایەتی کۆتایی ژمارە (٢٠)دا، خوای میهرەبان حوکمی فەڕز بوونی شەو بێداریی (شەونوێژی) لەسەر پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ سووك کردوە، کە پێشتر لە حاڵەتی ئاسایی دا فەڕز بووە، دوایی لە نیوەو دوو لەسەر سێ و سێیەکی شەوگارەوە کە تێیدا شەو بێداریی بکەن، خوای میهرەبان ﷻ لەسەری سووك کردوون، هەروەها لە حاڵەتی نائاسایی دا، حاڵەتی نەخۆشیی و، سەفەرو بازرگانیی، جەنگ و جیهاد، بۆی سووك کردوون، بە لابردنی یەکجاریی، مەگەر کەسێك خۆی بیەوێ، واتە: کە پێشێ خوا ﷻ لە هەموو حاڵەتاندا شەونوێژی لەسەر فەڕز کردوون، دوایی خوا ﷻ لە حاڵەتی نائاسایی دا فەڕزی شەونوێژی لەسەر لابردوون، حاڵەتە نائاساییەکەش سێ شتی لێ باس کردوون:

أ- حاڵەتی نەخۆشیی.

ب- حاڵەتی سەفەرو بازرگانیی و مامەڵە.

ج- حاڵەتی دەرچوون بۆ جەنگ و جیهاد.

ئنجا دوایی خوای بە بەزەیی لە کۆی حاڵەتەکانی دیکەشدا، بە ڕای زۆربەی زانایان لە فەڕزەوە گۆڕیویەتی بۆ پەسندیی، واتە: لە حاڵەتی نائاسایی دا هەر لەسەری لابردوون، بەڵام لە حاڵەتی ئاسایی دا بۆی گۆڕیون لە فەرزەوە بۆ سوننەت، واتە: هەر کەسێك بیەوێ، بیکات، مانای وایە حوکمەکەی یەکجاریی لانەچووە، تاکو وەك هەندێك لە زانایان دەڵێن: نەسخی بەسەردا هاتبێ،

چونکە حوکمەکە هەر لەجێی خۆیەتی، بەڵام خوا ﷻ کە پێشێ هاوەڵان وای لێ حاڵی بوون، ئەگەر نەخۆشیش بن و، لە سەفەریش بن بۆ بازرگانیی و، لە جەنگ و جیهادیشدا بن، هەر دەبێ شەو نوێژ بکەن، خوای پەروەردگار بۆی ڕوونکردنەوە کە نەخێر لەو حاڵەتە نائاساییانەدا لەسەرتان واجب نیە، لە حاڵەتی دیکەشدا خوا ﷻ بەڕای زۆربەی زانایان کردوویەتی بە شتێکی پەسندو، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: شەونوێژ ئێستاش کەم و زۆر هەر فەڕزە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

پێنج تایبەتمەندییم لەم سووڕەتەدا کەوتوونە بەر چاو:

**یەکەم:** فەڕزکردنی شەو بێداریی لەسەر پێغەمبەرو ﷺ و دیارییکردنی ئەندازەکەی بە سێ جۆرو، دواتر سووککردنی ئەو حوکمە لە حاڵەتی ئاسایی داو، لابردنی پێویستبوون (وجوب)ی لە حاڵەتە نائاساییەکانداو، گواستنەوەی بۆ حاڵەتی پەسند (**نَدب**)، کە ئەمە لە ئایەتەکانی (١ و ٢ و ٣) و ئایەتی ژمارە (٢٠)دا، هاتوە.

**دووەم:** ناوبردنی قورئان بە: ﴿ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴾، واتە: فەرمایشتێکی قورس، گران، ئەمیش لە ئایەتی ژمارە (٥)دا هاتوە.

**سێیەم:** فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بە خوێندنی قورئان، بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و بەڕێ و جێ: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾، لە ئایەتی ژمارە (٤)دا، کە دوایی ئێمە کورتە باسێك لە بارەی چۆنیەتیی قورئان خوێندنەوەو، مامەڵە کردن لەگەڵ قورئاندا دەکەین.

**چوارەم:** وەسفکردنی ڕۆژی دوایی بە سەر سپییکەری منداڵان: ﴿ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴾، لە ئایەتی ژمارە (١٧)دا، ئەو ڕۆژەی سەری منداڵان سپی دەکات، لە حەژمەتان و لە ترسان و لە سامناکییان.

**پێنجەم:** پێکەوە بەراوردکردنی بازرگانیی و کاسبیی کردن، لەگەڵ جەنگ و تێکۆشان لە پێناوی خوادا، تەنیا لەم سووڕەتە موبارەکەدا ئەوە هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٢٠)دا.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە کۆی بیست ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە، دەکەینە یەك دەرس، چونکە وەك باسمان کرد هەر بیست ئایەتەکە لە بارەی یەك بابەتەوە دەدوێن، کە فەرمان پێکردنی پێغەمبەرە ﷺ بە زیاتر لە خوا نیزیك بوونەوە، بەهۆی شەونوێژو، یادی خواو، خۆ بەلای خوادا دابڕین و، خۆڕاگرییەوە، لە بەرانبەر قسەو قاڵی ناحەزانیدا، هاو کات باسی هەندێك بابەتی دیکەش هەن، کە کراون بە نێواخنی ئەو بابەتە سەرەکییە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

كاتێك سەرنجی ئەو بیست (٢٠) ئایەتە موبارەكە دەدەین، دەبینین لە ئایەتەكانی: (١ - ١١)دا، خوا ﷻ دە (١٠) فەرمانان بە پێغەمبەرەكەی ﷺ دەكات.

دووەم: لە ئایەتەكانی: (١١ - ١٩)دا، خوا ﷻ چەند هەڕەشەیەكی سەخت لە بێبڕوایان دەكات و، پێنج بابەتیان لەگەڵدا تێكهەڵكێش و نێواخن دەكات.

سێیەم: لە ئایەتی ژمارە (٢٠)دا، یازدە حوكم و ڕاستیی گرنگ خراونە ڕوو.

ئنجا با سەرەتا سەرنجێكی گشتیی ئایەتەكان بدەین، بەر لەوەی ئایەتەكان بخوێنین و، دواتر مانای گشتیی و مەسەلە گرنگەكانیان بخەینە ڕوو.

خوا ﷻ دوای ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، ڕوو دەكاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بە میهرەبانانە دەیدوێنێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾، ئەی ئەو كەسەی خۆت لە نوێنیوە پێچاوە! یان پێخەفت لەخۆتەوە پێچاوە! ئنجا فەرمانی پێدەكات بە شەونوێژ كردن، شەو هەڵسانەوەو شەو بێداریی، جگە لە كەمێكی، ئنجا ئەو كەمەش بە نیوەی تەفسیر دەكات، واتە: شەوەكە هەمووی بێداربە، جگە لە كەمێكی، كەمەكەش بریتیە: لە نیوەی، یاخود لە نیوەشی كەم بكەوەو لە نیوەشی زیاتر شەونوێژ بكە، یاخود لەو نیوەیەی پشووی تێدا دەدەی، زیاد بكە، واتە: كەمتر لەنیوەی شەونوێژ بكەو، قورئان بەڕێكیی بخوێنە.

ئایا لەبەرچی خوا ﷻ ئاوا فەرمانی پێدەكات؟ دەفەرمویَ: ئێمە لەمەودوا قسەیەكی قورس و گرانت دادەبەزێنینە سەر، ئنجا حیكمەتی شەو نوێژی بۆ ڕوون دەكاتەوە، كە ئەو نوێژەی لە شەودا دەكرێ، زۆر كاریگەریی زیاترەو بێژەكانیشی یانی: ئەو قسانەی دەكرێن و ئەو ئایەتانەی دەخوێنرێن، ڕێكترو ڕاستتر مرۆڤ بۆی دەگوترێن، چونكە دنیا كش و مات و بێ هەست و خوست و دەنگە.

دوایی خوا ﷻ حیکمەتێکی دیکەی شەونوێژ دەخاتە ڕوو و دەفەرموێ: تۆ لە ڕۆژێدا بواری هاتن و چوونێکی دوورو درێژت هەیە، کەواتە: شەوەکە تەرخان بکە بۆ زیاتر لە خوا نیزیك بوونەوە.

دوایی فەرمانی پێدەکات بە ناوی پەروەردگاری هێنانی و، خۆ بەلای خوادا دابڕینی، ئنجا خوا ﷻ خۆی وەسف دەکات بە پەروەردگاری ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، کە جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، بۆیە دەبێ ئەی پێغەمبەری خاتەم! بەس ئەو بە پشتیوانی خۆت بگری.

ئنجا بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ بێبڕوایەکانیشدا، فەرمانی پێدەکات بە خۆڕاگریی لەسەر ئەوەی دەیلێن، کە بەشێوەیەکی جوان دووریيان لێ بکات.

ئنجا ئایا ئەوانە لە بەرانبەر کوفرو ملهوڕیی و خراپەکارییاندا، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن؟ نەخێر، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: لە من و لەو بە درۆ دانەرانە بگەڕێ، بە درۆ دانەرە خۆشگوزەرانەکان، کەمێك مۆڵەتیان بدە، کەمەکەش یان هەر لە دنیادا، کە دوایی جەنگی بەدرو جەنگەکانی دیکە هاتنە پێش و خوا ﷻ سزای دان ئەو ملهوڕانەی خەڵك و جەماوەرەکەیان چەواشە کردبوو، یاخود مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، ئنجا خوا ﷻ هەڕەشە دەکات لەو بەدرۆدانەرە خۆشگوزەرانانە لەسەر حیسابی خەڵکی ڕەش و ڕووت، وەك عادەتی هەمیشەیی حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆشگوزەرانەکان، بەوە هەڕەشەیان لێ دەکات، کە ئێمە لە ڕۆژی دوایی دا کۆت و پێوەندو، ئاگری بڵێسەدارو، خواردنێکی گەروو گیرو، ئازارێکی بە ئێشمان لە لایە، لە ڕۆژی دوایی دا ئەوە چاوەڕێیان دەکات لە دۆزەخدا، ئنجا خوا ﷻ ئاماژەیەکیش دەکات بە ئاخیر زەمان و، ئەو ڕووداوانەی لە ئاخیر زەماندا ڕوو دەدەن، ئەوانیش لە لەرزینەوەی زەویی و، هەژانی چیایەکان و، وەك لمێکی زۆر وردی ئارد ئاسایی لێهاتنیاندا دەخاتەڕوو.

ئنجا خوا ﷻ یەکسەر ئاوڕ دەداتەوە لە بێبڕوایەکان و ڕوویان تێدەکات دەفەرموێ: ئێمە پێغەمبەرێکمان ناردۆتە لاتان، شایەدو چاودێرە بەسەرتانەوە،

هـەر وەك چـۆن كاتی خـۆشی پێغەمبـەرو ڕەوانەكراوێكـمان بـۆ لای فیرعـەون نـارد، بـەڵام فیرعـەون سـەرپێچیی كـرد لـە پێغەمبەرەكـە، كـە مووسـا و هـاڕوونی بـرای بوون (عَلَيْهِما السَّلام)، ئێمـەش بـە گرتنێـكی تونـدو بـە ئێـش و ئـازار گرتمـان و سـزاماندا.

ئنجـا دووبـارە دەیانهێنێتـەوە لای ڕۆژی دوایـی و، سـەرنجیان ڕادەكێشـێتەوە بۆ لای قیامـەت و دەفەرمـوێ: ئایـا ئەگـەر بێبـڕوا بـن، چـۆن لـەو ڕۆژەدا خۆتـان دەپارێـزن لـە سـزای خـوا، كـە سـەری منـداڵانی گچكـە سـپیی دەكات، منداڵـی شیرە خـۆرە لـە حەژمەتـان، لـە ترسـان سـەری سـپیی دەبـێ و، لـەو ڕۆژەدا ئاسـمان شـەق و پـەق و بـەش بـەش و پارچـە پارچـە دەبـێ و، بەڵێنێـك كـە خـوا داویـەتی، ئەنجامـدراو دەبـێ، دوایـی خـوا ئەمـە بـە بیرخـەرەوەو ئامۆژگاریـی نـاو دەبـات و، دەفەرمـوێ: هـەر كەسـێك بیـەوێ، بـەرەو پـەروەردگاری ڕێ دەگرێتـە بـەر.

لـە كۆتایـی ئـەم سـوورەتەدا خـوا ﷻ ئـەو حوكمـەی پێشـێ بـۆ پێغەمبەرەكـەی ﷺو هـاوەڵانی بەڕێـزی دایـنـا، كـە بریتـی بـوو لـە پێویسـت بـوونی شـەو بێداریـی، خـوا ﷻ وەك مۆڵەتێـك و سـووككردنێك دەفەرمـوێ: پـەروەردگارت دەزانـێ كـە تـۆو كۆمەڵێـك لـە بـڕواداران كـە لەگەڵتـدان، كەمتر لـە دوو سـێیەكی شـەوو نیـوەی شـەوو سـێیەكی شـەو، هەڵدەسـتن شـەو بێداریـی دەكـەن، هـەر خـواش ئەندازەگیریـی شـەوو ڕۆژان دەكات و، زانیویـەتی كـە ئێـوە بۆتـان سـەرژمێر ناكـرێ، ئـەو كاتیـش وەك ئێسـتا سـەعات و ئامێـری كۆنتڕۆڵكـردنی كات نەبـوون، سـەعات ئەوەنـدە هەڵبسـتن، بەڵكـو بـە مەزەنـدەی خۆیـان تەماشـای خـۆرو مانـگ و ئەسـتێرانیان كـردووە، جـاری واش بـووە هـەورو بـاران بـووەو ئاسـمانیش دیـار نەبـووە، هـەر بـە مەزەنـدە دایاننـاوە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ئێسـتا خـوا ﷻ گەڕایـەوە سـەرتان بـە بەزەیـی، ئنجـا ئەوەنـدەی بۆتـان ئاسـان دەبـێ لـە قوڕئـان بیخوێنـن، واتـە: لـە شـەو نوێـژدا، هەروەهـا خـوا زانی كـە ئێـوە خەڵكتـان لـێ نەخـۆش دەبـێ، نەخۆشـتان دەبـن و، كەسـانێكی دیكـە بـە زەویـدا دێـن و دەچـن بـۆ بازرگانیـی و مامەڵـەو، كەسـانێكی دیكـە جەنـگ لـە پێنـاوی خـوادا دەكـەن، - ئەمـە یەكێكـە لـە هەواڵـە ئیعجازییـەكانی قوڕئـان بـۆ

داهاتوو - بۆیە ئەوەندەی بۆتان ئاسان دەبێ لێی بخوێنن، لە قورئان، یانی: لە شەونوێژداو، نوێژ بکەن و زەکات بدەن و، قەرزی باش لە خزمەت خوادا بکەن و، ئەوەی پێشیدەخەن بۆ خۆتان، ئا ئەوە باشترەو پاداشتی مەزنترە، داوای لێبوردنیش لە خوا بکەن، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٢﴾ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ﴿٧﴾ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا ﴿٩﴾ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا ﴿١٠﴾ وَذَرۡنِي وَٱلۡمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ وَمَهِّلۡهُمۡ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا ﴿١٢﴾ وَطَعَامٗا ذَا غُصَّةٖ وَعَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٣﴾ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلۡجِبَالُ كَثِيبٗا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ رَسُولٗا شَٰهِدًا عَلَيۡكُمۡ كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولٗا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرۡعَوۡنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذۡنَٰهُ أَخۡذٗا وَبِيلٗا ﴿١٦﴾ فَكَيۡفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرۡتُمۡ يَوۡمٗا يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرُۢ بِهِۦۚ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَفۡعُولًا ﴿١٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾ ۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿٢٠﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەی خۆ لە پێخەفەوە پێچ! (١) شەوگار هەڵسە (بۆ شەونوێژ) جگە لە کەمێکی (٢) نیوەی (شەو بخەوە)، یان هەندێکی لێ کەم بکەوە (و کەمتر لە نیوەی شەو بخەوە) (٣) یان لێی زیاد بکە (زیاتر لە نیوەی شەو بخەوە)و قورئانیش بە ڕێك و پێکیی (و تێوەڕامانەوە) بخوێنەوە (٤) (چونکە) ئێمە لەمەودوا قسە (و ئەرك)ێکی قورست دەخەینە سەر (شان) (٥) بە دڵنیایی (خواپەرستیی) پێگەیشتووی شەوگار (لەسەر دڵ) کاریگەرترو، بێژرانەکەی تیرو تەواوترە (٦) بێگومان (ئەی پێغەمبەر!) لە ڕۆژێدا (بواری) هاتن و چوون (و جم و جۆڵێکی زۆرو) دوورو درێژت هەیە (٧) ناوی پەروەردگاریشت بێنەو، بە یەکلایی بوونەوە خۆتی بەلادا دابڕە (٨) پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك (ی شایستەی پەرستران) نیەو، تەنیا ئەو بەکار پێ سپێردراو بگرە (٩) لە بەرانبەر ئەوەشدا کە (بێبڕوایان) دەیڵێن، خۆت ڕابگرەو بە واز لێهێنانێکی جوان وازیان لێبێنەو دووریان لێبگرە (١٠) لە من و لە بە درۆ دانەرە خاوەن نازو نیعمەتە (خۆشگوزەرانە)کان گەڕێ و، کەمێك مۆڵەتیان بدە (١١) بە دڵنیایی ئێمە (لە ڕۆژی دوایی دا) کۆت و زنجیرەکان و، کڵپە (ی ئاگر)مان لە لایە (١٢) هەروەها خۆراکێکی گەروو گرو ئازارێکی بە ئێش (١٣) (ئەوەش) لە ڕۆژێکدا کە زەویی و چیایەکان دەهەژێن (و دەلەرزنەوە) چیایەکان (هێندە وردو خاش دەبن) دەبنە لمی وردی هەڵڕژاو (١٤) (ئەی بێبڕوایەکان!) ئێمە نێردراوێکمان بۆ لاتان ناردوە بەسەرتانەوە چاودێرە، وەك چۆن نێردراوێکمان ناردە لای فیرعەون (١٥) ئنجا فیرعەون سەرپێچیی لە پێغەمبەرەکە (مووسا) کرد، ئێمەش بە گرتنێکی قورس گرتمان (سزایەکی سەختمان دا) (١٦) (ئەی بێبڕوایەکان!) ئەگەر بێبڕوا بوون چۆن خۆتان لە سزای ڕۆژێك

دەپارێـزن، کـە منـداڵان پیـرو سـەر سـپیی دەکات ﴿١٧﴾ ئاسـمان بەهۆیـەوە شـەق و پـەق دەبـێ، بەڵێنـی وی (گفتـی خـوا) جێبەجـێ کـراوە ﴿١٨﴾ بەڕاسـتیی ئەمـە بیرخەرەوەیـە، ئنجـا هـەر کـەس ویسـتی بـەرەو پـەروەردگاری ڕێـی گرتەبـەر ﴿١٩﴾ بێگومـان پـەروەردگارت دەزانـێ کـە تـۆ (ئـەی موحەممـەد!) و کۆمەڵێـك لەوانـەی لەگەڵـتن، کەمـتر لـە دوو سـێیەکی شـەوگارو، نیـوەی و، سـێیەکی هەڵدەسـتن بـۆ شـەونوێژ خـواش ئەندازەگیریـی شـەوو ڕۆژ دەکات، دەزانـێ کـە مسـۆگەر کاتەکەتـان بـۆ سـەرژمێر ناکـرێ، بۆیـە بـە چاوپۆشـیی گەڕایـەوە سـەرتان، ئنجـا ئێسـتا ئەوەنـدەی بۆتـان سـێنایە لـە قورئـان، لـە شـەونوێژدا بیخوێنـن، خـوا ﷻ زانیـی لـە مـەودوا نەخۆشـتان دەبـن و، کەسـانی دیکـە بـە زەویـدا دەڕۆن بـۆ بازرگانیـی لـە بەخشـشی خـوا دەخـوازن و، کەسـانی دیکـەش لـە ڕێـی خـوادا دەجەنگـن (و شـەونوێژتان بـۆ ناکـرێ)، ئنجـا ئەوەنـدەی بۆتـان ئاسـانە لێـی بخوێنـن (لـە قورئـان لـە شـەونوێژدا) و نوێـژ بەرپـا بکـەن و، زەکات بـدەن و، بـە قـەرزدانی بـاش قـەرز بـە خـوا بـدەن و، هەرچییەکیـش لـە چاکـە بـۆ خۆتـانی پێشـبخەن، لـە لای خـوا بـە باشـترو پاداشـتی مەزنـتر دەیبیننـەوەو، داوای لێبوردنیـش لـە خـوا بکـەن، بێگومـان خـوا لێبـوردەی بـە بەزەییـە ﴿٢٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**ٱلْمُزَّمِّلُ**): (**زَمَّلَهُ: أَخْفَاهُ، زَمَّلَهُ بِثَوبِهِ وَفِي ثَوبِهِ: لَفَّهُ، وَازَّمَّلَ وَتَزَمَّلَ: تَلَفَّفَ وَتَغَطَّى، وَهُوَ مُزَّمِّلٌ أَي مُتَلَفِّفٌ**)، (**زَمَّلَهُ**)، واتە: پەنهانی کرد، (**زَمَّلَهُ بِثَوبِهِ وَفِي ثَوبِهِ**)، واتە: لە پۆشاکەکەیەوە پێچا، هەروەها (**إِزَّمَّلَ**) و (**تَزَمَّلَ**) هەردووکیان یانی: خۆی تێوەپێچا، خۆی پێ داپۆشی، (**وَهُوَ مُزَّمِّلٌ أَي مُتَلَفِّفٌ**)، واتە: خۆی لە نوێنەوە پێچاوە، یان نوێنەکەی لە خۆی وەرگرتوە، دەشگونجێ مەبەست پۆشاك بێ، بەڵام زیاتر بۆ پێخەف و نوێن بەکاردێ.

(**تَرْتِيلًا**): (**رَتِلَ، يَرتَلُ، رَتَلاً، أَي: اسْتَوَى وَانتَظَمَ، وَحَسُنَ تَألِيفُهُ، وَرَتِلَ الثَّغرُ أَوِ الأَسنَانُ: انتظم، وَرَتَّلَ الكَلامَ أَي: جَوَّدَ تِلاوَتَهُ**)، (**رَتِلَ، يَرتَلُ، رَتَلاً**)، واتە: ڕێك بوو، ڕێك و پێك بوو، پێکهاتەکەی چاك بوو، دەگوترێ: (**رَتِلَ الثَّغرُ أَوِ الأَسنَانُ**)، واتە: دەم و ددانەکە زارو ددانەکە ڕێك و پێك بوو، (**وَرَتَّلَ الكَلامَ**) واتە: قسەکەی چاك کرد، جوانی کرد، بە ڕەوانیی و ڕێك و پێکیی کردی.

(**نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ**): (**نَاشِئَةَ اللَّيل**)، واتە: پێگەیشتووی شەو، (**ما تَنْشَأُ فِي اللَّيل**)، ئەوەی لە شەودا پێدەگات، (**الإِستِيقَاظ مِنَ النَّومِ وَالقِيَامُ لِلصَّلاَة**)، هەڵسان و بێداربوونەوە لە خەوو هەڵسان بۆ نوێژ، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، هەندێکیش (**نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ**)یان بە کاتەکانی شەو داناوە، هەندێکیش بەو کەسەی کە لە شەودا بێدار دەبێتەوەو هەڵدەستێ بۆ خواپەرستیی، هەندێکیش (**نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ**) یان ئاوا لێکداوەتەوە: (**القِيَامُ والإِنتِصَابُ لِلصَّلاة**)، هەڵسان و ڕاوەستان بۆ نوێژ.

(**وَطْـًٔا**): (**وَطِئَتُهُ بِرجلِي أَطَؤُهُ، وَالمُواطَئَةُ: المُوافَقَةُ وَوَطِئَهُ: دَاسَهُ**)، واتە: بەلاقم پێم لێنا، پێی لێ دەنێم، شێلام، (**مُواطَئَةُ**) بە مانای (**موافقة**) دێ، واتە: لەگەڵدا پێکەڵپێك بوون، ڕێکبوون، دەگوترێ: (**وَطِئَهُ أَي داسَهُ**)، واتە: پێی لێنا.

(سَبۡحًا): (السَّبحُ: الـمَرُّ السَّرِيـعُ فِي المَـاءِ أَوِ الهَـواء)، (سَـبح): ڕۆیشـتنی خێرایـە لـە نێـو ئـاودا، (مەلەوانیـی)، یاخـود لـە نێـو هـەوادا (فڕیـن)، وەك دوایـی بـاس دەكەیـن (سَـبخاً)یش خوێندراوەتـەوە، (سَـبخاً: السَّبخُ: السَّعَةُ فِي التَّـصَرُّف)، فراوانیـی لـە هەڵـس و كـەوت دا.

(وَتَبَتَّلۡ): (تَبَتَّـل: أَي انقَطِـعْ فِي العِبـادَةِ وَالإِخْـلَاصِ انقِطاعـاً يَختَصُّ بِهِ)، لە خواپەرسـتیی و لـە خـۆ سـاغكردنەوە بـۆ خـوادا خـۆت دابـڕە، خـۆ دابڕینێـك تایبـەت بـێ بـەو خـۆ سـاغكردنەوەوە، (البَتُّـول: المُنقَطِعَـةُ عَـنِ النِّكَاح)، (بَتُّـول): سـیفەتی ئافرەتێكـە كـە خـۆی دابڕیـوەو دوور گرتـوە لـە هاوسـەرگیریی.

(هَجۡرًا جَمِيلًا): (الهَجرُ وَالهِجْـرَانُ: مُفارَقَـةُ الإنْسَـانِ غَـيرَهُ بِالقَلـبِ وَاللِّسـانِ)، (هَجـرُ) و (هِجـران)، هەردووكیـان چاوگـن، یـانی: دووریـی گرتنـی ئینسـان و لێجیابوونـەوەی لـە جگـە لـە خـۆی بـە دڵ یاخـود بـە زمـان.

(أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ): (أُولِي: يَعنِـي أَصْحَـاب، النَّعْمَـة، يَعنـى: التَّنَعُّـم)، واتـە: خاوەنـانی نـازو نیعمـەت، خۆشـگوزەرانیی.

(وَمَهِّلۡهُمۡ): (المَهـلُ: التُّوئَـدَةُ وَالسُّـكُونُ)، (مَهـل): بریتیـە لـە بـە كاوەخۆیـی و ئارامیـی، كەواتـە: (مَهِّلهُـم) واتـە: مۆڵەتیـان بـدە، لێیـان بگـەڕێ، (مَهَّلْتُـهُ: قُلْـتُ لَـهُ مَهْـلاً، أَمَهَلْتـهُ: رَفَقْـتُ بِـهِ)، (مَهَّلتُـهُ) واتـە: پێمگـوت (مَهـلاً) واتـە: ڕاوەسـتێ، یـان لەسـەرەخۆبە، (وَأَمهَلتُـهُ) واتـە: لەگەڵیـدا میهرەبـان و نـەرم بـووم.

(وَذَرۡنِي): (ذَرنِي: أَي دَعنِي وَاترُكنِي)، لێمگەڕێ و وازم لێبێنە.

(أَنكَالًا): (أَنـكَال: جَمـعُ نِـكل، وَهُـوَ قَيـدُ الدَّابَّـةِ وَحَدِيـدَةُ اللِّجـامِ، لِكَونِهـما مانِعَـين)، (أَنـكَال) كـۆی (نِـكل)ە، (نِـكل) بریتیـە لـە زنجیرێـك، یـان كۆتێـك كـە وڵاخـی پـێ دەبەسـترێ، هەروەهـا لغاوێـك كـە لـە زاری ئـاژەڵ، (بـە تایبـەت ئەسـپ و مایـن) دەكـرێ، تاكـو لـەوەڕ نەخـوات، بۆیـە زنجیـرو كۆتێـك كـە لەپێـی ئـاژەڵ دەكـرێ،

هەروەهـا لغاوێـك كـە لـە زاری دەكـرێ، پێیـان گوتـراوە: (نِـكْل)، لەبـەر ئـەوەی هەردووكیـان ڕێگـرن، یەكیـان ڕێگـرە لـەوەی ئاژەڵەكـە بجووڵـێ، ئـەوی دیكـە ڕێگـرە لـەوەی لـەوەڕ بخـوات.

(ذَا غُصَّةٍ): واتـە: خـاوەن (غُصَّـة)، (غُصَّـة: الشَّـجَاتُ[1] الَّتـي يُغَـصُّ بِهَـا الحَلْـقُ)، (غُصَّـة): بریتیـە لـەوەی لـە قـوڕگ دەگیـرێ و ناچێتـە خـوار، (ذَا غُصَّةٍ): واتـە: خواردنێـكی گەرووگیـر، كـە بـە قوڕگـدا ڕۆ ناچـێ.

(تَرْجُفُ): (الرَّجْـفُ: الإضْطِـرابُ الشَّـدِيد)، (رَجْـف): بریتیـە لـە جووڵاندنەوەیـەكی تونـد، بـە كوردیـی: هـەژان و لەرزینـی بـۆ بەكاردێـن.

(كَثِيبًا مَّهِيلًا): (رَمْلاً مُتَرَاكِماً، جَمْعُهُ أَكْثِبَة وَكُثُب وَكُثْبان)، (كَثِيبًا مَّهِيلًا)، بـە لمێـكی كەڵەكـە بـوو لەسـەر یـەك دەگوتـرێ، (كَثِيـب) بـە (أَكْثِبَـة) و (كُثُـب) و (كُثْبـان) بـە هـەر سـێكیان كـۆ دەكرێتـەوە، واتـە: كۆمەڵـە لم، (مَهِيـل) واتـە: هەڵـڕژاو، یـانی: لمێكـە ئەگـەر دەسـتی بدەیـە، هێنـدە وردە لـە نێـوان پەنجەكانتـدا هەڵـدەڕژێ.

(وَبِيلًا): (طَعـامٌ وَبِيـل، وَكَلأٌ وَبِيـل: يُخـافُ وَبالُـهُ مِـنَ الوَبـلِ وَالوابِـلِ، وَهُـوَ المَطَـرُ الثَّقِيـلُ القِطَـار)، دەگوتـرێ: خواردنێـكی (وَبِيـل) و لەوەڕێـكی (وَبِيـل)، واتـە: مەترسـیی لـە سـەرەنجامەكەی دەكـرێ، (وَبِيـل)، لـە (وَبـال) و (وَبـل)ەوە هاتـوە، هەروەهـا لـە (وابِـل)ەوە، (وَبـل)و (وَبـال)، هەردووكیـان بـە مانـای بـارانی دڵۆپـە قـورس، دێـن.

(شِيبًا): (شَـابَ يَشِـيبُ شَـيْبَاً وَشَـيبَةً: ابيَـضَّ شَـعرُهُ، شَـابَ الـرَّأسُ وَشَـابَ الشَّـعرُ، وَالشَّـيْبُ بَيـاضُ الشَّـعرِ، وَالشِّـيبُ جَمْعُـهُ أَشْـيَب): (شَـابَ يَشِـيبُ شَـيباً وَشَـيْبَةً) واتـە: سـپیی بـوو، یـان پیـر بـوو، پیـر دەبـێ، پیـر بـوون، (إبيَـضَّ شَـعرُهُ)، مـووەكانی سـپیی بـوون، (شَـابَ الـرَّأسُ وَشَـابَ الشَّـعرُ)، واتـە: سـەری سـپیی بـوو، مـووەكانی سـپیی بـوون، (الشَّـيبُ بَيـاضُ الشَّـعرِ)، (شـيب) چاوگـەو بریتیـە لـە مـووی سـپیی، یـان سـەری

---

(١) ما اعترض ونشب في الحلق من عظم ونحوه، المعجم الوسيط، ص٤٧٤.

سپیی، کـۆی (شـیب) (أَشـیَب)ە، (شَـیب) و (شَـیبَة) هەردووکیـان چاوگـن، (شِـیب) کۆیـە، کـۆی (أَشـیَب)ە، (أَشـیَب) واتـە: کەسـێك کـە سـەری سـپیی بـووە، کۆیەکـەی (شِـیب)ە، کەواتـە: ﴿ يَوۡمٗا يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا ﴾، (وِلـدان) کۆیـەو (شـیب)یش کۆیـە، واتـە: ڕۆژێکـە منـداڵان پیـر دەکات، سـەریان سـپیی دەکات.

(مُنفَطِرُۢ بِهِۦ): (فَطَـرَ يَفْطُـرُ فَطـراً: شَـقَّ اللَّحـمَ، أَو شَـقَّ الشَّـئَ)، واتـە: گۆشـتەکەی بـڕی، دەیبـڕی، بڕیـن، یـان شـتەکەی قڵیشـاند، بـڕی، (انفَطَـرَ: أَي انشَـقَّ)، (انفَطَـرَ) کـە (مُطـاوِع)ی (فَطَرَ)یـە، (فَطَـرَهُ يَفطُـرُهُ فَانفَطَـرَ)، واتـە: پچڕانـدی، یـان قڵیشـاندی لـەتی کـرد، ئەویـش لـەت بـوو.

(تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ)، (قَـامَ بِاللَّيـلِ أي: صَـلَّى بِاللَّيـل)، شـەوێ هەڵسـایەوە، شـەو نوێـژی کـرد واتـە: کەمـتر لـە دوو سـێیەکی شـەو هەڵدەسـتی (بـۆ شـەونوێژ).

(لَّن تُحۡصُوهُ): بۆتـان سـەرژمێر ناکـرێ، (الإِحْصَـاءُ: التَحصِيـلُ بِالعَدَد)، (إحصـاء) ئەوەیە ژمارەکـەی بزانـرێ، سـەرژمێر، (وَذَلِـكَ مِـن لَفـظِ الحَـصَى)، ئەویـش لـە بێـژەی (حـصى) وەیـە، کاتێ خـۆی شـتیان بـە دەنکـە چـەوان ژمـاردوە، بـە وردە بـەردان، کـە (حَـصَى) ی پـێ دەڵێـن، وشـەی (إِحْصَـاء)، لـەوەوە هاتـوە، واتـە: (العَـدُّ بِالحَـصَى)، ژمـاردن بـە دەنکـە چـەو یـان وردە بـەرد.

(يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ): لـە بەخشـشی خـوا دەخوازنـن، (الإِبْتِغَـاءُ: الإجتِهَـادُ فِي الطَّلَـب)، (إِبتِغَـاء) لەسـەر کێـشی (إِفتِعـال)ە، واتـە: تێکۆشـان لـە داوا کردنـدا لـە هەوڵدانـدا بـۆ بژیـو، کـە خـوا نـاوی لێنـاوە بەخشـشی خـوا.

(وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا): واتـە: قـەرزی بـاش بـە خـوا بـدەن، (القَـرْضُ: ضَرْبٌ مِـنَ القَطْـعِ)، (قَـرض): جۆرێکـە لـە بڕیـن، (مِقـرَاض): بۆیـە وای پێدەگوتـرێ، نینـۆك بـڕ لەبـەر ئـەوەی نینـۆکی پـێ دەبـڕدرێ یـان شـتی پـێ دەبـڕدرێ، (وَسُـمِّيَ مـا يُدْفَـعُ إِلَى الإِنْسَـانِ بِـشَرْطِ رَدِّ بَدَلِـهِ: قَرْضَـاً)، ئـەو ماڵـەی دەدرێ بـە کەسـێك بـە مەرجـی ئـەوەی دوایـی هاوتایەکـەی بگێڕدرێتـەوە، پێـی دەگوتـرێ: قـەرز.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

لـە بـارەی هاتنـە خـواری کـۆی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، هـەر لـە سـەرەتاوە تاکـو ئایەتـەکانی دوایـی و ئایـەتی بیسـتەم و کۆتایـی، ئێمـە لـەو بـارەوە چەنـد دەقێـك دێنیـن:

**١- {عَن عَائِشَة رضي الله عنها، قَالَتْ: لمَا نَزَلَتْ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٢﴾ قَامُوا سَنَةً، حَتَّى وَرَمَت أَقْدَامُهُم، فَأُنْزِلَت: ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ﴾} (أخرجه الحاكم في المستدرك: ج٢، ص٥٠٤، وقال: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه، وضعفه الذهبي، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٤٢٨).**

واتـە: دایكـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: كاتێـك ئـەم ئایەتانـە دابەزیـن (بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٢﴾، مـاوەی سـاڵێك شـەو نوێژیـان كـرد هەتـا پێیەكانیـان ئاوسـان (زۆر مانـدوو بـوون)، دوایـی ئایـەتی كۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەكـە دابـەزی، {وەك پێشـتریش باسـمان كـرد، لـە پێناسـەكردنی ئـەم سـوورەتە موبارەكـەدا}.

٢- هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین كە تا ڕاددەیەك درێژە، بەڵام وێڕای ئەوەی تیشكمان بۆ دەخاتە سەر چەمك و واتای ئەو ئایەتە موبارەكانە، هەندێك شتی دیكەشی تێدان، زانینیان پێویستە:

**{عَـن قَتَـادَة، عَـنْ زُرَارَة، أَنَّ سَـعْدَ بـنَ هِشَـامِ بـنِ عَامِـرٍ أَرَادَ أَنْ يَغْـزُوَ فِي سَـبِيلِ اللـهِ، فَقَـدِمَ المَدِينَـةَ، فَـأَرَادَ أَنْ يَبِيـعَ عَقَـارًا لَـهُ بهَـا، فَيَجْعَلَـهُ في السِّـلَاحِ وَالْكُـرَاعِ، وَيُجَاهِـدَ الـرُّومَ حتَّـى يَمُـوتَ، فَلَـمَّا قَـدِمَ المَدِينَـةَ لَقِـيَ أُنَاسًـا مِـن أَهْـلِ المَدِينَـةِ، فَنَهَـوْهُ عـن ذلـكَ، وَأَخْـبَرُوهُ أَنَّ رَهْطًـا سِـتَّةً أَرَادُوا ذَلِـكَ فِي حَيَـاةِ نَبِـيِّ اللـهِ ﷺ، فَنَهَاهُـمْ نَبِـيُّ اللـهِ ﷺ، وَقَـالَ: أَلَيْـسَ لَكُـمْ فِيَّ أُسْـوَةٌ؟! فَلَـمَّا حَدَّثُـوهُ بذَلِـكَ رَاجَـعَ امْرَأَتَـهُ، وَقَـدْ كَانَ طَلَّقَهَـا وَأَشْـهَدَ عـلَى رَجْعَتِهَـا،**

فَأَتَى ابْنَ عَبَّاسٍ، فَسَأَلَهُ عن وِتْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقالَ ابنُ عَبَّاسٍ: أَلَا أَدُلُّكَ على أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ بوِتْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ قالَ: مَنْ؟ قالَ: عَائِشَةُ، فَأْتِهَا، فَاسْأَلْهَا، ثُمَّ ائْتِنِي فَأَخْبِرْنِي برَدِّهَا عَلَيْكَ، قال: فَانْطَلَقْتُ إِلَيْهَا، فَأَتَيْتُ عَلَى حَكِيمِ بنِ أَفْلَحَ، فَاسْتَلْحَقْتُهُ إِلَيْهَا، فَقالَ: ما أَنَا بقَارِبِهَا؛ لأَنِّي نَهَيْتُهَا أَنْ تَقُولَ في هَاتَيْنِ الشِّيعَتَيْنِ شيئًا، فأبَتْ فِيهِما إلَّا مُضِيًّا، قالَ: فَأَقْسَمْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ، فَانْطَلَقْنَا إلى عَائِشَةَ، فَاسْتَأْذَنَّا عَلَيْهَا، فأذِنَتْ لَنَا، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا، فَقالَتْ: أَحَكِيمٌ؟ فَعَرَفَتْهُ، فَقالَ: نَعَمْ، فَقالَتْ: مَنْ مَعَكَ؟ قالَ: سَعْدُ بنُ هِشَامٍ، قالَتْ: مَن هِشَامٌ؟ قالَ: ابنُ عَامِرٍ، فَتَرَحَّمَتْ عليه، وَقالَتْ خَيْرًا «قالَ قَتَادَةُ: وَكَانَ أُصِيبَ يَومَ أُحُدٍ»، فَقُلتُ: يا أُمَّ المُؤْمِنِينَ! أَنْبِئِينِي عن خُلُقِ رَسولِ اللهِ ﷺ ، قالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ القُرْآنَ؟ قُلتُ: بَلَى، قالَتْ: فإنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللهِ ﷺ كانَ القُرْآنَ. قالَ: فَهَمَمْتُ أَنْ أَقُومَ وَلَا أَسْأَلَ أَحَدًا عَنْ شيءٍ حتَّى أَمُوتَ، ثُمَّ بَدَا لِي، فَقُلتُ: أَنْبِئِينِي عن قِيَامِ رَسولِ اللهِ ﷺ ، فَقالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ {يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ}؟ قُلتُ: بَلَى، قالَتْ: فإنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ قِيَامَ اللَّيْلِ في أَوَّلِ هذِه السُّورَةِ، فَقَامَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ حَوْلًا، وَأَمْسَكَ اللَّهُ خَاتِمَتَهَا اثْنَيْ عَشَرَ شَهْرًا في السَّمَاءِ، حتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ في آخِرِ هذِهِ السُّورَةِ التَّخْفِيفَ، فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعاً بَعْدَ فَرِيضَةٍ، قالَ: قُلتُ: يا أُمَّ المُؤْمِنِينَ، أَنْبِئِينِي عَنْ وِتْرِ رَسولِ اللهِ ﷺ، فَقالَتْ: كُنَّا نُعِدُّ لَهُ سِوَاكَهُ وَطَهُورَهُ، فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ ما شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ، وَيَتَوَضَّأُ، وَيُصَلِّي تِسْعَ رَكَعَاتٍ لا يَجْلِسُ فِيهَا إلَّا في الثَّامِنَةِ، فَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُوهُ، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُومُ فيُصَلِّي التَّاسِعَةَ، ثُمَّ يَقْعُدُ فَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُوهُ، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ ما يُسَلِّمُ وَهو قَاعِدٌ، فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يا بُنَيَّ، فَلَمَّا أَسَنَّ نَبِيُّ اللهِ ﷺ، وَأَخَذَهُ اللَّحْمُ، أَوْتَرَ بسَبْعٍ، وَصَنَعَ في الرَّكْعَتَيْنِ مِثْلَ صَنِيعِهِ الأوَّلِ، فَتِلْكَ تِسْعٌ يا بُنَيَّ، وَكانَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ إذَا صَلَّى صَلَاةً أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهَا، وَكانَ إذَا غَلَبَهُ نَوْمٌ، أَوْ وَجَعٌ عن قِيَامِ اللَّيْلِ، صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، وَلَا أَعْلَمُ نَبِيَّ اللهِ ﷺ قَرَأَ القُرْآنَ كُلَّهُ في لَيْلَةٍ، وَلَا صَلَّى لَيْلَةً إلى الصُّبْحِ، وَلَا صَامَ شَهْرًا كَامِلًا غيرَ رَمَضَانَ. قالَ: فَانْطَلَقْتُ إلى ابْنِ عَبَّاسٍ فَحَدَّثْتُهُ بحَدِيثِهَا، فَقالَ: صَدَقَتْ، لو كُنْتُ أَقْرَبُهَا، أَوْ أَدْخُلُ

**عَلَيْهَا لأَتَيْتُهَا حتَّى تُشَافِهَنِي بِهِ، قَالَ: قُلْتُ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ لا تَدْخُلُ عَلَيْهَا مَا حَدَّثْتُكَ حَدِيثَهَا}، (أخرجه مسلم، ٧٤٦ ، وأبو داود: ٣٤٢).**

ئەم دەقەم بۆیە بە تەواوی هێنا، چونکە وێڕای ئەوەی باسی شەونوێژی پێغەمبەری تێدایە ﷺ، هەندێك شتی دیكەی زۆر گرنگیشی تێدایە.

قەتادە لە زوڕارەوە گێڕاویەتەوە کە سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامیر ویستوویەتی بچێتە جەنگ لە پێناوی خواداو هاتۆتە مەدینە، زەوییەکی لەوێ هەبووە ویستوویەتی بیفرۆشێ و، پارەکەی بە چەك و بە وڵاخێ کە بۆ جەنگ و جیهاد بەکاری دێنێ، بدات و دژی ڕۆمەکان بجەنگێ، تاکو دەمرێ، کاتێك هاتۆتە مەدینە گەیشتۆتە کۆمەڵێك لە خەڵکی مەدینە، کە زانیویانە نیەتی ئاوای هێناوە، لەوە قەدەغەیان کردووەو هەواڵیشیان پێداوە، کە کاتی خۆی شەش کەس لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ شتێکی ئاوایان ویست، {وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا، باسمان کرد لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾المائدة، لەوێ لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، کە کۆمەڵێك بەلای مێرگ و ئاوێکدا تێپەڕیون، ویستوویانە لەوێ بمێننەوەو واز لە ژیان و خێزان و ماڵ و حاڵ بێنن، بەڵکو هەندێکیان گوتوویانە: با خۆشمان بخەسێنین، دوایی گوتوویانە: بابچینەوە پرس بە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین ئەگەر مۆڵەتی داین، ئەوجار دێینەوە، کاتێك گەڕاونەوەو هەواڵیان پێداوە، خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئەوەی لێ قەدەغە کردن}.

ئەویش لێی قەدەغە کردن و فەرمووی: ئایا بەس نیە من سەر مەشقتان بم؟ کاتێك ئەوەیان گێڕایەوە بۆ سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامیر، گەڕایەوە بۆ لای ژنەکەی، ژنەکەی تەلاق دابوو، (دیارە یەك تەلاقی داوە)، شایەدیشی

لەسەر گرتن -کە ئەوە گێڕامەوە- دوایی چوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) لە بارەی نوێژی وەتری پێغەمبەری خواوە ﷺ پرسیاری لێکرد، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش گوتی: ئایا زاناترین خەڵکی سەر زەوی بە نوێژی وەتری پێغەمبەری خوات ﷺ پێشانبدەم؟ گوتی: کێ؟ گوتی: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، بچۆ لێی بپرسەو دوایی وەرەوە بۆ لام، هەواڵم پێ بدە داخۆ وەڵامەکەی چی بووە بۆ تۆ، (سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامیر)، دەڵێ: چووم بۆ لای حەکیمی کوڕی ئەفلەح، داوام لێکرد لەگەڵم بێ بۆ لای دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەویش گوتی: من لێی نیزیك ناکەومەوە، چونکە من لێم قەدەغە کرد لە بارەی ئەو دوو کۆمەڵەوە قسە بکات، {واتە: کۆمەڵەکەی عەلی رضي الله عنه و، کۆمەڵەکەی **طەڵحە**و زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە دوایی شەڕی جەمەلیان لە بەیندا قەوما، بە دەستی ناحەزان و خەڵکی موخەننەت، کە عەلی خەلیفەی مسوڵمانان بووو، **طەڵحە**و زوبەیریش کاتی خۆی بەیعەتیان پێدابوو، بەڵام دوایی داوایان لێکرد کە بکوژەکانی عوسمان رضي الله عنه تەسلیم بکات، ئەویش نکووڵیی لەوە نەدەکرد، بەڵام دەیگوت: پێویستە جارێ دۆخەکە سەقامگیر بێ، ئەوەش بەسەرهاتێکی دوورو درێژە، ئنجا حەکیمی کوڕی ئەفلەح دیارە کاتی خۆی بە دایکمان عائیشەی گوتوە: قسە لە بارەی ئەو دوو کۆمەڵەوە مەکەو مەچۆ نێو ئەو ئاڵۆزییەوە، بەڵام بە قسەی نەکردوە، دیارە دایکمان عائیشەش خۆی بە بەرپرسیار زانیوە، چونکە بۆ صوڵح و ئاشتەوایی لە مەدینەوە چوون بۆ بەصرا، بەڵام دوایی ئەو شەڕەی لێ پەیدا بووە، کە دوایش دایکمان عائیشە زۆر پەشێمان بووەو زۆریش ناڕەحەت بووە}، دوایی من سوێندم لێ خواردو ئەویش هات (واتە: سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامیر، سوێندی خواردوە لە حەکیمی کوڕی ئەفلەح کە هەر دەبێ لەگەڵم بێی، کە دەبێ حەکیمی کوڕی ئەفلەح نیزیکایەتیی و خزمایەتییەکی تایبەتی لەگەڵ دایکمان عائیشەدا بووبێ خوا لێیان ڕازی بێ)، کاتێك مۆڵەتمان لێ وەرگرت و

چووینە لای، دایكمان عائیشە گوتی: ئەوە حەكیمە؟ (دیارە گوێی لە دەنگی بووە) و، ناسیی، گوتی: بەڵێ، گوتی: كێت لەگەڵدایە؟ گوتی: سەعدی كوڕی هیشام، گوتی: هیشام كێیە؟ گوتی: هیشامی كوڕی عامیر، ئەویش داوای كرد خوا لێی خۆش بێ و قسەی باشی كرد، «قەتادە دەڵێ: هیشامی كوڕی عامیر ئەوە بووە كە لە جەنگی ئوحوددا شەهید بووە، واتە: بابی سەعد»، منیش پێمگوت: ئەی دایكی بڕواداران! هەواڵم پێ بدە لە بارەی ڕەوشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەویش گوتی: قورئانێ ناخوێنی؟ گوتم: با، گوتی: ڕەوەشتی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان بوو (قورئان چی دەفەرموێ: ئەو وای دەكرد)، ویستم هەڵسم و لە بارەی هیچ شتێكی دیكەوە لە كەس نەپرسم، هەتا دەمرم، دوایی بۆم دەركەوت و هاتە دڵم گوتم: هەواڵم پێ بدە لە بارەی شەونوێژی (شەو بێداریی) پێغەمبەری خواوە ﷺ دیسان گوتی: ئایا ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾ت، نەخوێندوە؟ گوتم: با، گوتی: خوا عزوجل شەو نوێژی لە سەرەتای ئەم سووڕەتەوە فەڕز كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ماوەی ساڵێك شەو نوێژیان كرد، بەو شێوەیەی خوا ﷻ دیاریی كردوە، (دوو لەسەر سێی، یان نیوەی، یان سێیەكی) و كۆتایی ئەم سووڕەتەی دوازدە مانگان لە ئاسمانێ هێشتەوە، (ئایەتی بیستەم و كۆتایی)، هەتا دوایی لە كۆتایی ئەم سووڕەتەدا، خوا ﷻ سووككردنی ئەو حوكمەی دابەزاندو، شەونوێژ لە فەڕزەوە بوو بە سوننەت و پەسند.

ئنجا گوتم: ئەی دایكی بڕواداران! هەواڵم پێ بدە، دەربارەی سوننەتی وەتری پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەویش (دایكمان عائیشە) گوتی: ئێمە سیواك و ئاوی دەست نوێژمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنا، خوا عزوجل لە شەوێدا هەڵیدەستاند بێداری دەكردەوە، ئەوەندەی خوا بیەوێ، ئیدی سیواكی دەكردو دەستنوێژی دەگرت، نۆ ڕكات نوێژی دەكردن، تەنیا لە هەشتەمیاندا تەحییاتی دەخوێندو دادەنیشت، یادی خوای دەكردو، ستایشی خوای دەكردو لێی دەپاڕایەوە، دوایی هەڵدەستاو سڵاوی نەدەدایەوە، دوایی هەڵدەستا ڕكاتی

نۆیەمیشی دەکرد، ئنجا دووبارە دادەنیشتەوە، (واتە: تەحییاتی دەخوێند)، یادی خوای دەکردو ستایشی دەکردو لێی دەپاڕایەوە، دوایی سڵاوێکی دەدایەوە کە بە ئێمەی دەبیستاند، دوایی هەڵدەستایەوە دوو ڕکاتی دەکردن، دوای ئەوەی سڵاوی دەدایەوە، بە دانیشتنەوە دوو ڕکاتی دەکردن، ئەمە یازدە ڕەکات ئەی کوڕە شیرینەکەم! ئنجا دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە تەمەنەوەو گۆشتی گرت، (واتە: کێشی قورس بوو بە حوکمی ئەوەوەی کەوتە تەمەنەوە)، وەترەکەی لە نۆوە کرد بە حەوت، لە دوو ڕکاتەکاندا هەروەك پێشێی دەکرد، ئەمە نۆ ڕکات، (واتە: لە یازدەوە کردنی بە نۆ)، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژێکی دەکرد، حەزی دەکرد لەسەری بەردەوام بێ.

ئنجا ئەگەر شەوێك خەوی بەسەردا زاڵ ببووایە، یاخود نەخۆشیی و ئازارێکی ببووایەو نەیتوانیبایە شەونوێژ بکات، بە ڕۆژێ دوازدە ڕەکاتی دەکردن (دوایی دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ:) نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو قورئانی لە هیچ شەوێکدا خوێند بێ و، نەشمزانیوە هیچ شەوێك تاکو بەیانیی شەو نوێژی کردبێ، هەروەها نەشمزانیوە هیچ مانگێك هەمووی بە ڕۆژوو بووبێ (ڕۆژووی سوننەت) جگە لە مانگی ڕەمەزان (کە فەڕزە).

سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامیر دەڵێ: منیش ڕۆیشتم بۆ لای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، قسەکانی عائیشەم بۆ گێڕانەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: ڕاست دەکات، ئەگەر لێی نیزیك بووبامەوەو چووبامە لای، (واتە: لەوانە بام کە بەبێ پەردە ببینم)، دەچووم بۆ لای تاکو بە زارەکیی قسەکەی لێ ببیستم و چاوم لە دەمی بێ کە قسەکەم بۆ دەگێڕێتەوە، سەعدی کوڕی هیشام[1] دەڵێ گوتم: ئەگەر زانیبامە تۆ لەوانە نی بچی بۆ لای، قسەکەیم بۆت نەدەگێڕایەوە.

---

(١) کەواتە: سەعدی کوڕی هیشام مەحرەمی دایکی بڕواداران عائیشە بووە.

**٣- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: أَوَّلُ مَا نَزَلَ أَوَّلُ الْمُزَّمِّلِ كَانُوا يَقُومُونَ نَحْوًا مِنْ قِيَامِهِمْ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، وَكَانَ بَيْنَ أَوَّلِهَا وَآخِرِهَا قَرِيبٌ مِنْ سَنَةٍ} (أخرجه أبو داود ١٣٠٥، والحاكم: ٣٨٦٤، هذا حديث صحيح الإسناد، ولم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما، دەڵێ کاتێك سەرەتای سوورەتی (**الْمُزَّمِّلِ**) دابەزی، هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ شەونوێژیان دەکرد، وەك چۆن لە مانگی ڕەمەزاندا بە ئەندازەی ئەوە، هەتا کۆتایی سوورەتی (**الْمُزَّمِّلِ**) دابەزیی و لە نێوان سەرەتاو کۆتاییەکەیدا، ماوەی ساڵێك بوو.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

هەرچەندە ئەم سوورەتە پێشتریش لە پێناسەکەیدا، تاڕاددەیەکی باش تیشکمان خستە سەر، بەڵام لێرەش دا دووبارە تیشکی دەخەینەوە سەر: خوای پەروەردگار لەم سوورەتە موبارەکەدا، کە پێشتر باسمان کردو، تایبەتمەندییەکانیمان خستنە ڕوو، سەرەتا دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، وەك هەمیشە گوتوومانەو دووبارەی دەکەینەوە، چونکە مادام ئەم ڕستە موبارەکە کە ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ە، لە سەرەتای (١١٣) لە سوورەتەکاندا هاتووەو، لە سوورەتی (النمل)یشدا، جگە لە سەرەتایەکەی لە نێو قەدێشیدا هاتووە، لە سەرەتای ئەو نامەیەدا کە سولەیمان (**عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) بۆ شاژنی سەبەئی دەنێرێ، ئنجا مادام خوا سەدو چواردە (١١٤) جار ئەم ڕستە موبارەکەی دووبارە کردۆتەوە، ئێمەش هەمیشە واتایەکەی و ئەوەی پێوستە کە لە کاتی گوتنی ئەو ڕستەیەدا، لە عەقڵ و دڵدا ئامادە بکرێ، دووبارەی دەکەینەوە، کە دەڵێی: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێكردنم بە ناوی خوایە، كە ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١- ئەم كارە تەنیا بۆ خوا دەكەم.

٢- ئەم كارە بە پێی شەرعی خوا دەكەم.

٣- ئەم كارە بە تواناو یارمەتیی خوای باڵادەست دەكەم.

٤- ئەم كارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴾، ئەی ئەو كەسەی خۆت لە نوێن و پێخەفەوە پێچاوە! هەندێكیش گوتوویانە: (**المُتَزَمِّلُ بِثِيابِهِ**)، ئەی ئەو كەسەی پۆشاكی خۆتت لە خۆتەوە پێچاوە! بەڵام لەڕاستییدا پۆشاك هەر لەبەر مرۆڤەو، كاتێك كە مرۆڤ دەخەوێ، عادەت وایە شتێكی دیكە بەخۆیدا دەدات، بۆیە: ﴿ ٱلْمُزَّمِّلُ ﴾، گەیەنەری ئەوەیە كە شتێكی زیادە لە بەرگ و پۆشاك لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر خۆیدا دابێ و خۆی تێوە پێچابێ، بۆیە (**مُزَّمِّل**) واتە: پێخەف لە خۆوە پێچ، یان خۆ لە پێخەف و نوێنەوە پێچ، ئەمەش جۆرێكە لە لاواندنەوەو میهرەبانانە دواندنی خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ.

﴿ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، شەو هەڵسەوە جگە لە كەمێكی، واتە: جگە لە كەمێكی شەو، ئەوی دیكەی هەمووی بێداربەو تێیدا هەڵسە، بۆ قوڕئانخوێندن و شەونوێژ كردن و بەندایەتیی بۆ خوا كردن، ﴿ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴾، تەنیا نیوەی هەڵمەستەوە، یاخود لەو نیوەیەش كە هەڵناستیەوە، كەم بكەوە ﴿ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ ﴾، یاخود لە نیوەكەش زیاد بكە، واتە: هەموو شەو بێداربە، جگە لە كەمێكی، دوایی خوا كەمەكەش بە نیوە مانا دەكات، واتە: نیوەی شەو شەونوێژ بكەو نیوەشی بخەوە، یاخود لەو نیوەیەی دەخەوی، كەمێكی دیكەشی لێ كەم بكەوە، واتە: لە نیوەشی زیاتردا شەونوێژ بكە، ﴿ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ ﴾، یاخود ئەو نیوەیەی لە شەودا ئیسڕاحەتی تێدا دەكەی و، دەخەوی، لێی زیاد بكە، واتە: زیاتر لە نیوەی بخەوە، كەواتە: یەك لەسەر سێی، یاخود ئەو دەوروبەرە شەونوێژ بكە،

﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾، قورئانیش بخوێنە بە شێوەیەكی ڕێك و پێك، چونكە (**الثَّغْرُ المُرَتَّل**)، واتە: زارو ددانێكی ڕێك و پێك، كەواتە: (**تَرتِيل**) ڕێك و پێك.

﴿ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە لەمەودوا قسەیەكی قورس و گرانت دەخەینە سەر، یانی: فەرمایشتێك كە كۆمەڵێك ئەركی گران و قورس دەگرێتە نێو خۆی، لەبەر ئەوەی لەمەودوا ئەركێكی قورس دەخەینە سەر شانی تۆ، دەبێ باش خۆتی بۆ ئامادە بكەی، بەهۆی لە خوا نیزیكیی و بەندایەتیی بۆ خواوە، ئنجا ئایا شەونوێژ، چ ڕۆڵێك لەوەدا دەبینێ؟ ﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ ﴾، بە دڵنیایی ئەو عیبادەت و خوا پەرستییەی لە شەودا دەكرێ و پێ دەگات، یاخود ئەو نەفسەی لە شەودا هەڵدەستێتەوە، چونكە (**نَشَأ**) بە مانای هەڵسا (**نَهَض**) ش دێ، یاخود ئەو كاتانەی لە شەودان (كاتەكانی شەو)، هەرسێ واتایەكەی هاتوون، ﴿ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴾، ئەو خواپەرستییەی لە شەودا دەكرێ و، ئەو نەفسەی بەشەو هەڵدەستێتەوەو، ئەو كاتانەی بە شەوێ خواپەرستییان تێدا دەكرێ، ﴿ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا ﴾، یانی: كاریگەریی توندترە، (**وَطأ**) بە مانای پێ لێنانی شتێكە، بەڵام لێرەدا یانی: (**أَشَدُّ تَأْثِيراً**)، كاریگەریی زیاترە، ﴿ وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴾، گوترانەكەشی ڕێكترە.

﴿ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴾، بە دڵنیایی تۆ لە ڕۆژێدا دەرفەتێكی دوور و درێژت بۆ هەیە، بۆ كارو كاسبیی و هەڵسان و دانیشتن و جم و جۆڵ، بۆیە شەوەكە تەرخان بكە بۆ خوا پەرستیی، ﴿ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴾، ناوی پەروەردگاریشت بێنەو، بەخۆدابڕین خۆت بەلای خوادا دابڕە، واتە: خۆتی بۆ یەكلایی بكەوە.

﴿ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴾، پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە، جگە لەو هیچ پەرستراوێكی شایستەی پەرستران نیە، ئنجا بەس ئەو بە كار پێسپێردراو بگرە، (**وَكِيل**) لەسەر كێشی (**فَعِيل**)ە، بەڵام بە مانای (**مَفعُول**)

ە، واتـە: (مَوكُول)، (مَوكُولٌ إِلَيهِ)، كار پێسـپێردراو، بـا بـەس خـوا كار سـپێردراوت بـێ و پشـتت هـەر بـەو قايـم بـێ، ﴿ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ ﴾، خۆڕاگريـش بـە لەسـەر ئـەوەی دەيڵێـن، يـانی: ئـەوەی بێبڕوايـەكان دەيڵێـن، كـە پێغەمبەريـان ﷺ تۆمەتبـار دەكـرد بـەوەی جادووگـەرە، يـان شـێتە، يـان شـاعيرە، يـان كاهينـە، قورئانيشـيان تۆمەتبـار دەكـرد بـەوەی بـە نـاوی خـواوە هەڵبەسـتراوە، يـان شـيعرە، يـان قسـەی كاهينانـە، يـان قسـەی جادووگەرانـە، يـان قسـەی شـێتانە، ئنجـا لەسـەر ئـەوەی دەيڵێـن، خۆڕاگـرو پشـوو درێـژو بـە حەوسـەڵە بـە، ﴿ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴾، بـە شـێوەيەكی جوانيـش دووريـان لـێ بگـرە، (هجـر) بريتيـە: لـە واز لـێ هێنـان، هەڵبەتـە مەبەسـت ئـەوە نيـە لەگەڵيانـدا بانگـەواز نـەكات و، بـە هيدايەتدانيانـەوە خەريـك نەبـێ، بـەڵام يـانی: واز لـەو قسـەو قاڵانەيـان بێنـەو، زۆر خـۆت بـەوەوە سـەرقاڵ مەكـەو سـەرگەرمی كاری خـۆت بـە.

﴿ وَذَرْنِي وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعْمَةِ ﴾، لـە مـن و لـەو بـەدرۆ دانـەرە خـاوەن نيعمەتانـەش بگـەڕێ، لـە مـن و كـە بەدرۆدانـەرە خۆشـگوزەرانەكان بگـەڕێ، واتـە: بـۆ منيـان لێگـەڕێ ﴿ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴾، ماوەيـەكی كـەم مۆڵەتيـان بـدە:

أ- يانی: ماوەيەكی كەم لە دنيادا مۆڵەتيان بدە، هەتا دوايی جەنگ و جيهاد دێتە پێشێ و بە سزای خۆيان دەگەن.

ب- ياخود: هەموو ژيانی دنيا ماوەيەكی كەمەو مۆڵەتيان بدە، لە ڕۆژی دوايی دا بە سزای خۆيان دەگەن، ﴿ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ ﴾، بە دڵنيايی ئێمە كۆت و پێوەندەكانمان لە لان (أَنكال) كۆی (نِكل)ە، كە لە بنەڕەت دا بريتيە لەو كۆت و پێوەند و ئاسنەی وڵاخی پێ دەبەسترێتەوە، بەڵام دوايی بە مانای كۆت و زنجير بە گشتيی بەكارهاتوە، يانی: ئێمە كۆت و زنجيرەكانمان لەلان، ﴿ وَجَحِيمًا ﴾، هەروەها ئاگری بڵێسەدارمان لەلايە، ﴿ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ ﴾، ديسان خواردنێكی خاوەن گير، گەرووگير، خواردنێك كە لە گەروو دەگيرێ، ﴿ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴾، هەروەها ئازارێكی بە ئێشيشمان لە لايە.

﴿ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ ﴾، ئـەو ڕۆژەی زەویـی و چیایـەکان دەلەرزنـەوە، دەهەژێـن، ﴿ وَكَانَتِ ٱلۡجِبَالُ كَثِيبٗا مَّهِيلًا ﴾، چیایەکانیـش دەبنـە گردۆلکەی لمی هەڵڕژاو، یـان: لمێـکی زۆر وردو نـەرم، کـە ئەگـەر دەسـتی تێهەڵبـدەی، بـە نێـوان پەنجەکانتـدا بێتـە خـوار، ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ رَسُولٗا شَٰهِدًا عَلَيۡكُمۡ ﴾، ئنجـا خـوا ﷻ ڕوو دەکاتـەوە بێبڕوایـەکان و دەفەرمـوێ: بـە دڵنیایـی ئێمـە نوێنەرێکـمان ڕەوانەکراوێکـمان بـۆ لای ئێـوە نـاردوە، بەسـەرتانەوە چاودێـرە، (کـە موحەممـەدە ﷺ)، ﴿ كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولٗا ﴾، وەك چـۆن کاتی خـۆشی ڕەوانەکراوێکـمان بـۆ لای فیرعـەون نـارد، ﴿ فَعَصَىٰ فِرۡعَوۡنُ ٱلرَّسُولَ ﴾، ئنجـا فیرعـەون سـەرپێچیی لـە پێغەمبەرەکـە کـرد، کـە مووسا بـوو و، هـاڕوونی بـراشی (**عَلَيْهِـما الصَّلاةُ وَ السَّلام**) وەزیـرو هـاوکارو پشـتیوانی بـوو، ﴿ فَأَخَذۡنَٰهُ أَخۡذٗا وَبِيلٗا ﴾، ئێمـەش فیرعەونمـان بـە گرتنێـکی تونـد گـرت و، بـە سـزادانێکی تونـدو بـە ئێش سـزادا.

﴿ فَكَيۡفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرۡتُمۡ يَوۡمٗا يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا ١٧ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرُۢ بِهِۦ ﴾، ئـەی بێبڕوایـەکان! ئەگـەر بێبڕوابـن ئـەو ڕۆژەی منـداڵان سـەر سـپیی دەکات، منـداڵان پیـر دەکات، چـۆن خۆتـان دەپارێـزن؟ (لـە سـزای ئـەو ڕۆژە)، ﴿ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرُۢ بِهِۦ ﴾، بەهـۆی ئـەو ڕۆژەوە، یـان لـەو ڕۆژەدا، ئاسـمان شـەق و پـەق و لـەت دەبـێ، گـەردوون ئـەو سیسـتم و ڕێـك و پێکییـەی ئێسـتای نامێنـێ، ﴿ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَفۡعُولًا ﴾، بەڵێنـی خـواش جێبەجـێ کـراوەو، هیـچ گومانتـان نەبـێ، ئـەوە هـەر دێتـە دی، ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞ ﴾، ئەمـە بیرخەرەوەیـە، واتـە: هەرچـی کـە باسـکرا، هەمـووی بیرخەرەوەیـەو ئامۆژگاریـی و پەنـدە، ﴿ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴾، ئنجـا هـەر کەسـێك ویسـتی بـەرەو پـەروەردگاری ڕێـی گرتـە بـەر، هـەر کەسـێك ویسـتی ڕێـی گرتـە بـەر لـە ڕابـردوودا، یاخـود هـەر کەسـێك دەیـەوێ با ڕێ بگرێتـە بـەر لـە داهاتـوودا.

لـە کۆتایـی دا خـوا ﷻ ئـەو حوکمـەی لـە ئایەتـەکانی پێشـێدا هـات، کـە بـە پلـەی یەکـەم ڕووی لـە پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ بـەڵام پێغەمبـەری خـوا سەرمەشـقی

مسـولْمانان و هـاوەڵانی بەڕێـزی بـووە، بـە پلـەی یەكـەم، ئنجـا دوایـی هەمـوو ئۆممـەتی، بۆیـە هەرچـی ئـەو كردوویـەتی، هاوەڵانیـش و بڕودارانیـش ئەنجامیـان داوە، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ﴾، بێگومـان پـەروەردگارت دەزانـێ كـە تـۆو كۆمەڵێـك لەوانـەی لەگـەڵ تـۆ دان (لـە هاوەڵانـت)، كەمـتر لـە دوو سـێیەكی شـەوێ هەڵدەسـتن، هەروەهـا نیـوەی و یـەك لەسـەر سـێشی هەڵدەسـتن، واتـە: بـە سـێ جـۆر شـەو نوێـژ دەكـەن خـۆت و هاوەڵانـت:

أ- یان دوو لەسەر سێی تۆزێك كەمتری.

ب- یاخود نیوەی.

ج- یاخود یەك لەسەر سێی، ﴿ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴾، خواش ئەندازەگیریی شەوو ڕۆژان دەكات، ﴿ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ ﴾، زانی كە ئێوە ناتوانن سەرژمێری بكەن، كاتەكەی كۆنترۆڵ بكەن، ﴿ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ﴾، بۆیە گەڕایەوە سەرتان و ئەو حوكمەی ئێوەی پێوە پابەند كردبوو، بۆی سووك كردن، ﴿ فَٱقْرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ﴾، ئێستا ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لە قورئان بیخوێنن، واتە: لە شەونوێژدا بیخوێنن، چونكە ئامانجی سەرەكیی شەونوێژ، بریتیە لە خوێندنی قورئان تێیدا، خوا ﷻ زانی كە بۆتان سەرژمێرو كۆنترۆڵ ناكرێ، یاخود لە تواناتاندا نیە بەوە شێوەیە لەسەری بەردەوام بن، بۆیە ئێستا چەندەی بۆتان ئاسانە بیكەن، حوكمەكە لانەچووە، بەڵكو سووككردنی هاتۆتە سەر، كەواتە: هۆكارێكی ئەوەیە كە ناتوانن كۆنترۆڵی بكەن و سەرژمێری بكەن، هۆكارێكی دیكەی سووككردنی ئەو حوكمە: ﴿ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ﴾، خوا زانی ئێوە لەمەودوا نەخۆشتان تێدا دەبن، ﴿ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾، هەروەها كەسانێكی دیكە كە بە زەویدا دەڕۆن، پێ بە زەویدا دەكوتن و سەفەر دەكەن، لە بەخششی خوا دەخوازن، واتە: بازرگانیی و كارو كاسبیی دەكەن، كشتوكاڵ دەكەن، ئاژەڵداریی دەكەن و بە زەویدا دەڕۆن، ﴿ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، هەروەها هەندێكی دیكەشتان

لە پێناوی خوادا جەنگ دەکەن، یانی: کاتێك دێ جەنگ و جیهاد دێتە پێش، ﴿ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ ﴾، {دووبارەی دەکاتەوە}، کەواتە: ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لێی (لە قورئان) بیخوێنن لە شەونوێژدا، واتە: ئەوەندەی بۆتان دەگونجێ شەونوێژ بکەن، چ لەگەڵ ئەو عوزرانەدا، چ بەبێ ئەو عوزرانە، هەردووکیان دەگرێتەوە، ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، نوێژیش بەرپا بکەن، واتە: پێنج نوێژە فەرزەکان بکەن، ﴿ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، زەکاتیش بدەن، ﴿ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ ﴾، هەروەها قەرزێکی باشیش بە خوا بدەن، قەرزی باشیش پێشتر باسمان کردوە لە تەفسیری سوورەتی (**الحديد**)داو، لەو بارەوە کورتە باسێکمان کردوە.

﴿ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ ﴾، ئەوەش کە بۆ خۆتانی پێش دەخەن لە چاکە، دوایی لە لای خوا دەیبیننەوەو، ئەوە باشترە بۆ ئێوە، پاداشتەکەشی مەزنترە، ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ ﴾، داوای لێبوردنیش لە خوا بکەن، لە کەم و کورییەکانتان، هیچ مرۆڤێك لە کەم و کوریی و لە کرچ و کاڵیی بەدەر نابێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە، ئێمەش دەڵێین: (**نَستَغفِرُ اللهَ العظيم وَنَتُوبُ إِلَيه**).

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، بە شەونوێژو شەوبێداریی، چ نیوەی، چ زیاتری، چ کەمتری و، خوێندنەوەی قورئان بە شێنەیی و ڕێك و پێك و، هەواڵپێدانی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، کە لەمەودوا قسەیەکی گرانی دەخرێتە سەرو، قورئان خوێندنی شەویش لە شەونوێژدا، کاریگەریی لەسەر دڵ و دەروون زیاترەو، بێژرانیشی ڕێکترەو، لە ڕۆژیشدا بواری جم و جۆڵی زۆری هەیە، هەروەها فەرمان پێکردنی بە یادی خوا کردن و، خۆ بۆ یەکلا کردنەوەی و پشت پێ بەستنی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ٤ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ٥ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ٦ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ٧ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ٨ رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا ٩﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ و، دوای: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، دەفەرمووێ:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾، ئەی نوێن لەخۆو پێچ! (الطبری) لە تەفسیرکەیدا دەڵێ: (يا أَيُّهَا لمُتَزَمِّلُ وهُوَ الْمُلْتَفّ بِثِيَابِهِ)، ئەی (مُتَزَمِّل)! کە ئەویش بریتیە لە لەخۆوە پێچی پۆشاکەکەی، کەسێك پۆشاکەکەی لەخۆوە پێچابێ.

پێشتریش گوتم: من زیاتر وای تێدەگەم کە مەبەست پێی نوێن و پێخەف لە خۆوە پێچان بێ، واتە: پێغەمبەری خاتەم ﷺ کاتێك گەڕاوەتەوە لە ئەشکەوتی (حیراء) دوای ئەوەی پێنج ئایەتی سەرەتای سوورەتی (العلق)ی بۆ دابەزین، کە بریتین لە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥﴾ العلق.

ئەم پێنج ئایەتە یەکەمین ئایەتانێك بوون، کە دابەزینە سەر دڵی موبارەکی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ لە یەکەم دیداری لەگەڵ جیبریلدا، کە بەسەرهاتەکەی لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم و سیرەی ئیبنو هیشام و سەرچاوەکاندا هاتوە، خوا پشتیوان بێ دوایی کە دەگەینە سوورەتی (العلق)، لەوێ، درێژەی ئەو بەسەرهاتە باس دەکەین[1]، ئنجا دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕێتەوە، وەك پێشتریش فەرموودەکەمان هێنا، دەفەرموێ: دامپۆشن، بە خەدیجەی هاوسەری دەڵێ، خوا لێی ڕازی بێ، چونکە جۆرێك لە لەرزو ترس و حاڵەتی شڵەژانێك دایدەگرێ و، لە خۆی دەترسێ، تاکو دەفەرموێ: لە خۆم ترسام، دایکمان خەدیجەش (خوا لێی ڕازی بێ) دڵنیای دەکاتەوە، کە شەیتان هەرگیز زەفەر بە تۆ نابات، لەبەر ئەوەی تۆ پیاوێکی چاکەکاری، ئیدی کۆمەڵێك ئاکاری بەرزو جوانی لێ دەژمێرێ، دوایی لەگەڵ خۆی دا دەیبات بۆ لای کورە پوورەکەی (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)، کە پیاوێکی بەتەمەن بووەو، بۆتە نەصرانیی، لەسەر ئایینی نەصرانیی بووە، پێغەمبەریش ﷺ بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوەو، ئەویش دڵنیای دەکاتەوە کە جندو شەیتان دەستیان لێ نەوەشاندوە، بەڵکو ئومێد دەکات پێغەمبەری ئەو خەڵك و کۆمەڵگایەو دوا پێغەمبەری خوا بێ، کە هەموو دنیا چاوەڕێیان دەکرد.

---

(١) لە کتێبی: (ژیاننامەی پێغەمبەری خوا)دا بە درێژیی باسمان کردوە، بڕوانە بەرگی یەکەم لە چاپی چوارەم.

ئنجا ئـەم: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴾ە، کاتێـك بـووە کـە پێغەمبـەری خوا ﷺ لە ئەشـکەوتی حیـڕاء ڕاسـتەوخۆ گەڕاوەتـەوە، بـەڵام: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴾، ڕەنگـە مەبەسـت پێـی: بـە پۆشـاکی خـۆ خـۆ داپۆشـەر بـێ، وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن، هەڵبەتـە دەشـگونجێ - وەك هەندێـك لـە توێـژەران و ڕوونکـەرەوانی قورئـان گوتوویانـە - ئەمەیـان مەبەسـت پێـی ئـەوە بـێ کـە بـە پۆشـاکی خـۆی خـۆی داپۆشـیوەو، ئەویدیکەیـان مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ کـە بـە نوێـن و پێخـەف داپـۆشراوە، بـەڵام بۆیـە دەڵێـم: ئەمەیـان مەبەسـت پێـی خـۆ داپۆشـینی پێغەمبـەرە ﷺ بـە نوێـن و پێخـەف، چونکـە کـە لـە ئەشـکەوتی حیـڕاء گەڕاوەتـەوە، فەرموویـەتی: (زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي)، داميۆشـن! داميۆشـن!، ئنجا کەسێك دادەپـۆشرێ کـە پێخەفێـکی بەسـەردا بـدرێ، بـەڵام ئەویدیکـە **(المدثـر)** دەگونجـێ ئینسـان بـە پۆشـاکی خـۆی، کراسـێك شـتێکی خـۆی بەسـەر دەم و چـاوی خۆیـدا، بـدات و، بیـەوێ پشـوویەك بـدات.

ئەو وشەیەش دوو واتای هەن:

أ- یەکیان ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا خوا ئاوا دواندوویەتی و، ئەوە جۆرێکیشە لە لاواندنەوەو، بە میهرەبانیی دواندن، بە عەرەبیی پێی دەڵێن: **(مُلاطَفَة)**، کە هەر ئەو حاڵەتەی مرۆڤی لەسەرە، بۆی بکرێتە پێناس، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە، جارێك کە عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب رضي الله عنه، لەگەڵ فاتیمەی هاوسەری دا، کە کچی پێغەمبەرە ﷺ (خوا لێی ڕازی بێ)، نیگەرانییەکیان دەبێ، عەلی دەچێتە مزگەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ دەچێ بۆ لای فاتیمەو دەفەرموێ: کوا ئامۆزات؟ کوا عەلی رضي الله عنه؟ دەڵێ: بە توورەیی چووە دەر، ئەویش دەچێ و دەبینێ لەسەر خۆڵەکەی مزگەوتێ ڕاکشاوەو خۆڵی بە کەلەکەیەوە نووساوە، ئیدی پێی دەفەرموێ: {قُمْ يَا أَبَا تُرَابٍ[1]}، هەڵسە ئەی بابی گڵ! ئنجا عەرەب دەڵێن: کەسێك کە لە حاڵەتێك دایەو ئەو حاڵەتەی بۆ دەکرێتە پێناس، ئەمە جۆرێکە لە **(مُلاطَفَة)** میهرەبانیی لەگەڵ نواندن و پێشاندانی ئەوە کە خۆشیدەوێ و نازی هەڵدەگرێ و لێی توورە نیە.

---

(١) رواه البخاري: ٦٢١٨

ب- زانایان واتایەکی دیکەشیان لێگرتوە، لە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾، کە (طبري) ئەویشی هێناوەو دەڵێ: (وَصَفَهُ بِأَنَّهُ مُتَزَمِّلُ النُّبُوَّةِ وَالرِّسالَة)، خوا وەسف و پێناسەی کردوە بەوەی پێغەمبەرایەتیی و ڕەوانەکراوێتیی هەڵگرتوەو لەخۆوە پێچاوە، بەڵام دوایی ڕای یەکەم زاڵ دەکات و دەڵێ: (أَولَى القَولَينِ بِالصَّوابِ الأَوَّلُ)، لە پێشترین قسە لەڕاستییەوە، قسەی یەکەمە.

ئنجا کە خوای پەروەردگار ئاوا پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ، با بزانین چی پێ دەسپێرێ؟

٢)- ﴿قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾، شەو هەڵسەوە، جگە لە کەمێك، (قُم) کرداری فەرمانەو لە (قَامَ)ەوە هاتوە، (قَامَ، يَقُومُ، قُم)، هەڵسا، هەڵدەستێ، هەڵسە، چاوگەکەی (قِيَام)ە، کەواتە: ﴿قُمِ ٱلَّيۡلَ﴾، شەو هەڵسەوە، بەڵام بۆچی شەو هەڵسێتەوە؟ ئەمە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، هەروەها دواییش دێ، مەبەست ئەوە نیە، بەس شەو هەڵسێ و هیچی دی، بەڵکو شەو هەڵسەوە، زاراوەیەکە لە قورئاندا بەکار هاتوەو هەڵسانەوەی شەو، هەڵسانەوەیە بۆ شەونوێژ، شەونوێژ کردن و شەوبێداریی، ﴿قُمِ ٱلَّيۡلَ﴾، شەوگار هەمووی هەڵسەوە، ﴿إِلَّا قَلِيلٗا﴾، مەگەر کەمێکی.

دوایی خوا ﷻ ئەو کەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

٣)- ﴿نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا﴾، تەنیا کەمێکی هەڵمەستەوە، یان کەمێکیشی لێ کەم بکەوە، یانی: هەموو شەوەکە بێداربە، جگە لە نیوەی، نیوەی شەو بێداربەو نیوەشی بخەوەو پشوو بدە، ﴿أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا﴾، یان ئەو نیوەیەش کە هەڵاوێردراوە لە هەڵسانەوە، واتە: ئەو نیوەش کە مۆڵەتدراوی پشووی تێدا بدەی و تێیدا بخەوی، ئەویش کەمێکی لێ کەم بکەوەو، بیخە سەر نیوەکەی دیکە کە تێیدا بێدار دەبی، واتە: لە نیوەی زیاتر بێداربەو شەونوێژی تێدا بکە.

٤)- ﴿أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا﴾، یاخود ئەو نیوەیە (کە هەڵداوێردرێ لە شەو بێداریی)، زیادەشی بخە سەرێ و، بە ڕێك و پێکییش قورئان بخوێنە، واتە: زیادە لە نیوەی شەویش پشوو بدەو بخەوە، مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە:

کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ سەرپشـك کـراوە لـە نێـوان چەنـد حاڵەتێـك داو، ئـەو حیکمـەت و دووربینیـی و وردبینیـی و لێزانییـە، بـەس لـە خـوای پـەروەردگار دەوەشـێتەوە، کـە لـە دوو سـێ ڕسـتەی کورتـدا خـوای بـەرزو مـەزن، هـەم پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەلاوێنێتـەوەو میهرەبانانـە دەیدوێنـێ، هـەم فەرمانی پـێ دەکات بـە شـەو بێداریـی، هـەم بـۆی دیاریـی دەکات شـەو بێدارییەکـەی چەنـد بـێ، هـەم بـۆی دیاریـی دەکات کاتی پشـوودان و خەوتـن و ئیسـڕاحەتیشی چەنـد بـێ و، سـێ حاڵـەت و ئەگـەری دەخاتـە بـەردەم:

حاڵەتی یەکەم: نیوەی شەو بێداربەو نیوەشی بخەوە.

حاڵـەتی دووەم: زیاتـر لـە نیـوەی شـەو بێداربـە، تاکـو نیزیکیـی دوو لەسـەر سـێی شـەو، وەك خـوا لـە ئایـەتی کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ﴾، کەواتـە: حاڵـەتی دووەم بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەوەیـە کـە دوو لەسـەر سـێی شـەو، یـان زیاتـر لـە نیـوەی شـەو تاکـو دەوری دوو لەسـەر سـێ بێداربـێ و، یـەك لەسـەر سـێی، یاخـود تۆزیـك لـە یـەك لەسـەر سـێی شـەوگار زیاتـر بخـەوێ.

حاڵـەتی سـێیەم: ئەوەیـە کـە ئـەو نیوەیـەی هەڵیـواردوە لـەوەی تێیـدا بێـدار بـێ، ئـەو نیوەیـەی پشـووی تێـدا دەدات و تێیـدا دەخـەوێ، هەندێـکی دیکـەشی بـۆ زیـاد بـکات، واتـە: زیاتـر لـە نیـوەی شـەو پشـوو بـدات و بخـەوێ.

کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ بژاردەی خراونە بەردەم بۆ شەونوێژ:

**یەکەم:** نیوەی شەو.

**دووەم:** زیاتر لە نیوەی شەو، هەتا دوو لەسەر سێی.

**سێیەم:** یەك لەسەر سێی شەوگار.واتە: یان نیوەی شەو بێدار بێ و شەونوێژ بکات و نیوەشی بخەوێ، یان زیاتر لە نیوەی هەتا دەوری دوو لەسەر سێی بێدار بێ و، یەك

لەسەر سێی بخەوێ، یاخود یەك لەسەر سێی شەو شەونوێژ بكات و بێدار بێ و، دوو لەسەر سێی شەو شتێك كەمتر یان زیاتر بخەوێ و پشوو بدات.

﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾، قورئانیش بە ڕێكیی بخوێنەوە، وشەی (رَتْل) پێشتریش باسمان كرد، لە شیكردنەوەی وشەكاندا: (رَتِلَ، يَرتَلُ، رَتَلاً، أَي: **اسْتَوَى وَانتَظَمَ وَحَسُنَ تَأْلِيفُهُ، وَرَتِلَ الثَّغرُ أَو الأَسنانُ، فَهُوَ مُرَتَّلٌ، وَرَتَّلَ الكَلامَ أَي جَوَّدَ تِلاوَتَهُ**)، (**رَتِلَ، يَرتَلُ، رَتَلاً**)، واتە: ڕێك بوو، ناڕێكیی تێدا نەبوو، ڕێك و پێك و چاك بوو، دەگوترێ: (**رَتِلَ الثَّغرُ أَوِ الأَسنانُ**)، زار یاخود ددانەكان ڕێك و پێك بوون و پاش و پێش و بەرزیی و نزمییان نەبوو، دەگوترێ: (**ثَغرٌ مُرَتَّل**)، یان زارێكی ڕێك، یاخود زارو ددانێكی ڕێك، هەروەها دەگوترێ: (**رَتَّلَ الكَلامَ أَي جَوَّدَ تِلاوَتَهُ**)، واتە: جوانی خوێند، قسەكەی جوان كردو بە ڕێكیی كردی، كەواتە: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾، واتە: قورئان بە ڕێك و پێكیی بخوێنەوە، بابزانین زانایان چۆنیان ئەم ڕستە موبارەكە ڕوون كردۆتەوە؟:

١- (**الطبري**) دەڵێ: (**بَيِّنِ القُرآنَ إِذَا قَرَأتَهُ تَبييناً، وَتَرَسَّلْ فِيهِ تَرَسُّلاً**)، كاتێك قورئانت خوێند بە چاكیی ڕوونی بكەوەو، بەشێنەیی و بە كاوەخۆ بیخوێنە، بە پەلە پرووزە نا.

٢- دیسان (**الطبري**) لە حەسەنی بەسرِاییەوە بە ژمارە (٣٥٢٧٨) لە تەفسیرەكەی خۆیدا دەڵێ: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾، (**إقرَأْهُ قِراءَةً بَيِّنَةً**)، بیخوێنەوە بە خوێندنەوەیەكی ڕوون {كە پیت و وشەكان هەر كامیان مافی خۆی پێ بدرێ}.

٣- هەروەها (**الطبري**) لە موجاهیدەوە ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ، بە ژمارە (٣٥٢٨٠) هێناویەتی: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾، (**بَيِّنِ القُرآنَ تَبييناً بَعضَهُ عَلَى أَثَرِ بَعضٍ تُؤَدَةً**)، واتە: قورئانێ ڕوون بكەوە هەندێكی بە دوای هەندێكیدا بە شێنەیی و بە كاوەخۆ، نەك بە پەلە پەل.

شایانی باسە: ئێمە دوایی كورتە باسێكی باش لە بارەی قورئان خوێندنەوە دەكەین.

ئنجا خوا ﷻ حیكمەتی ئەوە كە بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ نیوەی، یان دوو لەسەر سێی، یاخود یەك لەسەر سێی شەو بێدار بێ و قورئان بە ڕێكیی بخوێنێ؟ ڕووندەكاتەوە:

٥)- ﴿ إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴾، ئێمە لەمەودوا قسەیەكی قورس دەخەینە سەر تۆ، **(الطبري)** لە قەتادەوە بە ژمارە **(٣٥٢٨٨)** لە ڕوونكردنەوەی ﴿ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴾ قسەیەكی قورسدا، دەڵێ: (**ثَقِيلٌ: وَاللهِ فَرَائِضُهُ وَحُدُودُهُ**)، سوێند بە خوا فەڕزەكانی خواو سنوورەكانی خوا قورسن.

هەندێكـی دیكـە گوتوویانـە: قورسـیی فەرمایشـتی خـوا، مەبەسـت پێـی مانـا ڕواڵەتەكەشیەتی، وێڕای ئـەوەی لـە ڕووی نێـوەڕۆك و مەعنەوییـەوە قورسـە، هـەر لـە كاتی دابەزینیـشی دا قـورس بـووە، بـۆ سـەر پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ وەك لـەو كورتـە باسـەدا كـە لـە سـوورەتی یونـوس دا لـە بـارەی وەحییـەوە كردمـان، كـە ئەویـش لـە ئەسـڵدا لـە مەوسـووعەی: **(الإسـلامُ كـما يَتَجَـلَّى في كِتـاب اللـه)** لـە بەرگـی شەشـەمی وەرمانگرتبـوو و لـە تەفسـیری سـوورەتی (یونـس)دا پوختـمان كردبـۆوە، كۆمەڵێـك فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و، كۆمەڵێـك دەقـی سـوونەتمان هێنـاون، بۆمـان وێنـا دەكـەن، كـە كاتێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەحیـی بـۆ هاتـوە، چەنـدە قـوڕس بـووە لەسـەری! یەكێـك لەوانـە دایكـمان عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: - وەك لـە **(صحيـح البخـاري و صحيـح مسـلم)**دا هاتـوە - پێغەمبـەری خـوام دەبینـی لـە ڕۆژی سـاردی زسـتاندا، كاتێـك وەحیـی بـۆ دادەبـەزی، زەنگـوڵ زەنگـوڵ ئارەقـەی بـە دەم و چـاودا دەهـات، وەك گەوهـەرو مرواریـی بـوون، ئـەو دڵۆپـە ئارەقانـەی پێیدا دەهاتـن.

هەروەهـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ كـە پرسـیاری لێكـراوە چـۆن وەحییـت بـۆ دێ؟ فەرموویـەتی[1]: جـاری وا هەیـە فریشـتەكە بـۆم دەچێتـە سـەر شـێوەی پیاوێـك و وەحییـم بـۆ دەنێـرێ، جـاری واش هەیـە لـە شـێوەی دەنگـی زەنگوڵـەدا بـۆم دێ، {ئـەو فریشـتەیە دەنگـە دەنگێـكی دێتـە گوێـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەك دەنگـی

---

(١) {أَحْيَانًـا يَأْتِينِـي مِثْـلَ صَلْصَلَـةِ الجَـرَسِ، وَهُـوَ أَشَـدُّهُ عَـلَيَّ، فَيُفْصَـمُ عَنِّـي وَقَـدْ وَعَيْـتُ عَنْـهُ مَـا قَـالَ، وَأَحْيَانًـا يَتَمَثَّـلُ لِي المَلَـكُ رَجُـلاً فَيُكَلِّمُنِـي فَأَعِـي مَـا يَقُـولُ، قَالَـتْ عَائِشَـةُ: وَلَقَـدْ رَأَيْتُـهُ يَنْـزِلُ عَلَيْـهِ الْوَحْـيُ فِي الْيَـوْمِ الشَّـدِيدِ الْـبَرْدِ فَيَفْصِـمُ عَنْـهُ، وَإِنَّ جَبِينَـهُ لَيَتَفَصَّـدُ عَرَقًـا} (أخرجه مالـك: ٤٧٥، وأحمـد: ٢٥٢٩١، والبخـاري: ٣٠٤٣، ومسـلم: ٢٣٣٣).

زەنگوڵـە، یـان دەنگـی زەردەواڵـە، یـان دەنگـی هەنـگ}، دوایـی کۆتایـی دێ و مـن دەزانـم چـی گوتـراوە، {واتـە: خـوای پـەروەردگار لـە ڕێـی ئـەوەوە دەیخاتـە نێـو دڵـی}، ئـەو جۆرەیـان قورسـترینیەتی، جـاری واشـە فریشـتەکە بـۆم دەچێتـە سـەر شـێوەی پیاوێـك و تێدەگـەم چـی دەڵـێ، عائیشـە گوتوویـەتی: لـە ڕۆژی زۆر ساردد‌ا بینیومـە وەحیـی بـۆ هاتـوە، نێوچـەوانی ئارەقـەی دەرداوە.

هەروەهـا لـە دەقـی دیکـەی سـوننەتدا هاتـوە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر سـواری حوشـتر بووبـێ جـاری وابـووە، حوشـترەکە یەکسـەر یـەخ بـووە، لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ لـەو حاڵەتـەدا زۆر قـورس بـووە، حوشـترەکەی یـەخ بـووەو سـینگی داداوەتـە سـەر زەوی.

لـە دەقێـکی دیکـەدا هاتـوە - لـە (**صحیح البخاري**)دا - زەیـد کـوڕی سـابیت خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێڕێتـەوە، کـە جارێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەحیـی بـۆ هـات و ڕانی لەسـەر ڕانـم بـوو، گوتـم ئێسـتا ڕانـم ورد دەبـێ، ئەوەنـدە قـورس بـوو.

کـە دیـارە ئەمـە قورسـیی ڕواڵەتییـە کاتێـك وەحییەکـە دابەزیـوە، قورسـیی مەعنەوییـشی ئەوەیـە، کـە پەیامەکـە بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ هاتـوە، جێبەجێکردنی فـەرزەکانی و سـنوورەکانی و ئەرکـەکانی، پێویسـتییان بـە مانـدوو بـوون دەکات، پێویسـتییان بـە خوێـن و ئارەقـە دەکات، بـە کـۆچ و کۆچبـار دەکات، بـە قسـە پێگوتـران دەکات، بـە ناڕەحەتیـی تەحەممـول کـردن دەکات، کەواتـە: حیکمەتێـکی ئـەوە کـە خـوا ﷻ فەرمـانی بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ کـردوە شـەوبێداربێ و شـەونوێژ بـکات و قورئـان بـە ڕێکیـی بخوێنـێ، ئەوەیـە کـە ئامـادە بـێ بـۆ وەرگرتنـی ئـەو فەرمایشـتە قورسـەی دەخرێتـە سـەر شـانی و، ئـەو ئەرکـە قورسـەی پێـی دەسـپێردرێ، چونکـە کەسـێك بیـەوێ کۆڵێـکی قـورس بخاتـە سـەر شـانی خـۆی، دەبـێ بـاش خـۆی بـۆ ئامـادە بـکات و مەشـق و پرۆڤـەی بـاش بـکات، بـۆ ئـەوەی جەسـتەی بەهێـز بـێ و بـۆی هەڵبگیـرێ.

ئنجا خوا ﷻ حیکمەتی ئەنجامدانی شەونوێژ ڕووندەکاتەوەو دەفەرموێ:

٦)- ﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ﴾، بە دڵنیایی خواپەرستییەك كە لە شەودا ئەنجام دەدرێ، كاریگەریی زیاترە (لەسەر دڵ و دەروون) و بێژرانەكەی ڕێكترە.

وشەی ﴿ نَاشِئَةَ ﴾، زانایان بە سێ واتا لێكیان داوەتەوە:

یەكەم: ئەو خوا پەرستییەی بە شەو ئەنجام دەدرێ.

دووەم: كاتەكانی شەو كە خواپەرستییان تێدا دەكرێ.

سێیەم: ئەو كەسەی بە شەو هەڵدەستێتەوەو جێگایەكەی بەجێ دەهێڵێ.

بەڵام واپێدەچێ مانای یەكەمیان گونجاوتر بێ، ئەگەرنا هەر سێ مانایەكە لە خودی خۆیاندا ڕاستن، بەڵام ئەوەی یەكەمیان زیاتر لەگەڵ ئەوەدا كە دوایی دێ، دەگونجێ كە دەفەرموێ: ﴿ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ﴾، واتە: ئەو خوا پەرستییەی لەشەودا دەكرێ، هەم كاریگەریی زیاترەو، هەم ئەو قسانەش كە تێیدا دەكرێن، وشەكان كە تێیدا دەگوترێن، ئایەتەكان كە دەخوێندرێنەوە، ڕێكترو ڕاستتر دیارن.

بەڵام ئەوەش هەر گونجاوە كە بگوترێ: ﴿ نَاشِئَةَ ﴾، مەبەست پێی كاتەكانە، واتە: كاتەكانی شەو، ئەو خوا پەرستییەی تێیاندا دەكرێ، كاریگەریی زیاترەو، ئەو قوڕئانەی تێیاندا دەخوێنرێ و بێژرانەكەی ڕێكترە.

هەروەها ئەگەر بشگوترێ: ﴿ نَاشِئَةَ ﴾، واتە: (**النَّفسُ الَّتي تَنهَضُ فِي اللَّيْلَ**)، ئەو كەسەی بە شەو هەڵدەستێ خوا پەرستیی دەكات، خوا پەرستییەكەی و قوڕئان خوێندنەكەی، كاریگەریی لەسەر دڵی زیاترەو قوڕئانەكەش كە دەیخوێنێ ڕێكترە، هەر گونجاون.

وشەی ﴿ وَطۡـٔٗا ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**وِطاءً**) بە هەردوو جۆر خوێندراوەتەوە، ﴿ وَطۡـٔٗا ﴾، لە (**وَطِأَ، يَطَأُ**)، واتە: پێی لەسەر دانا، پێی لەسەر دادەنێ، دوایی

(وَطْء) بۆ كاریگەریی دانان لەسەر هەر شتێك بەكارهاتوە، (وَطْأً أَي: ثِقَلاً)، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێكدا دەفەرموێ: {**اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ**}، (**أخرجه البخاري: ٧٧١، ومسلم: ٦٧٥**)، واتە: ئەی خوایە! زەبری خۆت لەسەر موزەڕ (قوڕەیش) توند بكە.

بەڵام (**وِطاءً: يَعني مُوَافَقَةً**)، واتە: ئەو قسەیەی بە زار دەگوترێ، زیاتر لەگەڵ دڵدا دێتەوەو پێكەڵپێك دەبن و پێكەوە گونجاو دەبن لە شەودا، كە دنیا بێ هەست و كش و ماتە.

لە بارەی ﴿ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ ﴾ەوە، (**الطبري**) بە ژمارە (٣٥٢٩٩) لە موجاهیدەوە هێناویەتی، دەڵێ: (**كُلُّ شَيء بَعدَ العِشاءِ فهُوَ ناشِئَةٌ**)، هەر شتێك لە دوای نوێژی خەوتنان پێی دەگوترێ: (**ناشِئَةٌ**)، هەم نەفسی مرۆڤەكە كە هەڵدەستێتەوە، هەم كاتەكە، هەم خواپەرستییەكەی تێیدا ئەنجام دەدرێ.

هەر (**الطبري**) لە ئیبنو زەیدەوە بە ژمارە (٣٥٣٠٠) هێناویەتی، لە بارەی (**ناشِئَةٌ**)ەوە دەڵێ: (**أَيُّ ساعَةٍ مِنَ اللَّيْلَ قامَ، فَقَد نَشَأَ**)، هەر كاتێك لە شەودا هەڵسێتەوە، پێی دەگوترێ: (**نَشَأ**).

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ أَشَدُّ وَطۡـًٔا ﴾، ئەگەر (**وَطْأً**) بێ، واتە: (**أَشَدُّ ثِقَلاً**) قورسترە، یان (**تَأْثِيراً**) كاریگەرترە، بەڵام ئەگەر (**وِطاءً**) بێ، یانی: (**مُوَافَقَةً**) یانی: گونجاوترە، ئەو خوا پەرستییەی بەشەو دەكرێ، گونجاوترە بۆ نێوان ڕووح و جەستەو پێكەوە گونجاوییان.

﴿ وَأَقۡوَمُ قِيلًا ﴾، بێژرانەكەشی ڕێكترە، یەكێك لە زانایان دەڵێ: (**أَثْبَتُ في القَلبِ وَأَصوَبُ قِراءَةً**)، لە دڵدا چەسپاوترەو لە خوێندنەوەشدا ڕاسترو ڕێكترە، موجاهید كە (**الطبری**) بە ژمارە (٣٥٣٢١)ەوە، لێی هێناوە، دەڵێ: (**أَجدَرُ أَن تُواطِئَ سَمعَكَ وَقَلبَكَ**)، واتە: (ئەو شەونوێژەی لە شەودا دەكرێ و، ئەو قورئانەی لە شەودا دەخوێنرێ و، ئەو خواپەرستییەی لە شەودا دەكرێ)، شایستەترە بەوەی دڵ و

گوێـت یـەك بـن، یـانی: ئـەو قسـەیەی دەکـرێ هـەم گوێـت چـاك وەری بگـرێ، هـەم لـە دڵیشـتدا بـاش بچەسـپێ.

٧)- ﴿ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ﴾، بە دڵنیایی بۆ تۆ لە ڕۆژدا هەیە، جم و جۆڵێکی درێژ، (سَبح) لە ئەسڵدا بە مانای ڕۆیشتنە بەنێو هەوادا، یان بەنێو ئاودا، بەنێو ئاودا پێی دەگوترێ: مەلەو، بەنێو هەوادا پێی دەگوترێ: فڕین، بەڵام دوایی بۆ هەر جۆرە جم و جۆڵێك بەکارهێنراوە، بۆیە زانایان گوتوویانە: ﴿ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ﴾، **(أي فَراغاً طَويلاً تَتَقَلَّبُ فِيهِ)**، بۆشایی و کاتێکی زۆرت هەیە کە تێیدا هەڵس و کەوت بکەی، وشەی ﴿ سَبۡحٗا ﴾، خوێنراویشەتەوە: (سَبْخاً)، **(أي: سَعَةً لِقَضَاءِ حَوائِجِكَ)**، فراوانیی بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانت، کەواتە: (سَبْخ) بە مانای فراوانیی دێ و، (سَبْح) بە مانای هاتن و چوون دێ، واتە: لە ڕۆژگاردا فراوانیی بۆ تۆ هەیە، ئەگەر بە (سَبخاً) بخوێندرێتەوە، یانی: مەوداو دەرفەتێکی درێژت بۆ هاتن و چوون و کردنی، کاروبارەکانت و هەڵسوکەوتی نێو خەڵك هەیە، ئەگەر (سَبْحاً)ش بێ، واتە: لە ڕۆژێدا بۆشاییەکی زۆرت هەیە، هاتن و چوونێکی باش هەیە، کە بێی و بچی و، شەوەکە تەرخان بکەی بۆ خواپەرستیی.

دوایی خوا ﷻ ئەرکێکی دیکەی زۆر گەورەو گرنگ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەسپێرێ:

٨)- ﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴾، ناوی پەروەردگاریشت بێنە (باس بکە) و بە خۆ دابڕینێکی باش خۆت بۆ لای خوا دابڕە، **(أَي: انقَطِع إلَيهِ انقطاعاً)**، خۆت دابڕە بە لای خوادا بۆ خواپەرستیی و خۆی بۆ یەکلایی بکەوە، بە یەکلایی کردنەوەیەکی باش، وەك بە دایکمان مەریەم دایکی عیسا خوا لێی ڕازی بێ و سەلامی خوا لەسەر عیسا بێ، گوتراوە: **(مَريَمُ البَتُّول، البَتُّولُ: المُنقَطِعَةُ إِلَى الله)**، ئافرەتێك کە خۆی دابڕیوە بۆ لای خوا، وازی لە هاوسەرگیریی و خۆشییەکانی ژیانی دنیا هێناوە (یانی: خۆشییە جەستەییەکان).

قەتـادە وەك **(الطـبري)** بـە ژمـارە **(٣٥٣٤٧)** لێیـەوە وەرگرتـوە، ﴿ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴾ی ئـاوا لێکداوەتـەوە: **(أَخْلِـص لَـهُ العِبَادَةَ وَالدَّعـوَة)**، هـەم پەرسـتنت، هـەم بانگـەوازت بـۆ خـوا سـاغ بکـەوەو بـەشی کەسـی پێـوە مەهێڵـە.

٩)- ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ﴾، پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، خوێندراوەتەوەش: (**رَبِّ المَشرِقِ وَالمَغرِبِ**)، واتە: پەروەردگاری خودی ڕۆژهەڵات و خودی ڕۆژئاوا، یاخود: پەروەردگاری خەڵكێك كە لە ڕۆژهەڵاتی زەویین و، خەڵكێك كە لە ڕۆژئاوای زەویین.

١٠)- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، هیچ پەرستراوێك كە شایستەی پەرستران بێ نیە، ئەگەرنا پەرستراوی پووچ و ساختە زۆرن.

١١)- ﴿فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا﴾، كەواتە: تەنیا ئەو بەكار پێ سپێردراو بگرە، تەنیا خوا ﷻ بە كارپێسپێردراوی خۆت و سەرپەرشتیاری خۆت بگرەو، كاروباری خۆت هەمووی بەو بسپێرەو، بەس پشت بەو ببەستە.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمانکردن بە پێغەمبەر ﷺ کە لەسەر قسەو قاڵی بێبڕوایان خۆڕاگر بێ و، دووریيان لێ بگرێ بە شێوەیەکی جوان و، بە درۆ دانەرانی خۆشگوزەران بۆ خوا لێبگەڕێ و کەمێك مۆڵەتیان بدات و، دڵنیا بێ کە خوا کۆت و زنجیرو ئاگری بڵێسەدراو خواردنی گەرووگیرو ئازاری بە ئێش و ژانی لەلایەو، ڕۆژی دواییش زەویی و چیایەکان دەهەژێن و چیایەکان دەبنە لمی هەڵڕژاو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾، خۆشت ڕابگرە لەسەر ئەوەی دەیڵێن، یەکێکی دیکە لەو ئەرکانەی خوا بە پێغەمبەریان دەسپێرێ، ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾، لەسەر ئەوەی دەیڵێن خۆڕاگربە، بەدڵنیایی ڕاناوی شێرراوەی: ﴿يَقُولُونَ﴾، بۆ بێبڕوایان و ناحەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتەوە، واتە: ئەوەی ناحەزانت دەیڵێن، خۆڕاگربە لە بەرانبەریداو پاشەکشە مەکە لە ڕێبازی خۆت، لە گەیاندنی پەیامی خوای پەروەردگار.

٢)- ﴿وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا﴾، بەشێوەیەکی جوانیش دووریيان لێبگرە، **(هجر)** بریتیە لە دووریی گرتن، کۆچکردن و دوور کەوتنەوە لە شتێك، کە پێشتر لێی نیزیك بووە، کەواتە: ﴿وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا﴾، واتە: دووریيان لێبگرە، بەدڵنیایی مەبەست لە دووریی گرتن لێرەدا، دووریی گرتنی جەستەیی نیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێنەکراوە کە هەر لە سەرەتاوە لە مەککە کۆچ بکات، بەڵکو مەبەست دووریی گرتنی مەعنەوییە، واتە: زۆر لەگەڵیان پێوە مەچۆ، هەروەها مەبەست لە واز لێهێنانێکی جوان

(**هجراً جميلاً**)، دیسان ئەوە نیە كە بانگیان نەكات بۆ لای خواو، پەیامی خوایان پێ نەگەیەنێ و، وتووێژیان لەگەڵدا نەكات، بەڵكو یانی: شەڕە قسەیان لەگەڵدا مەككەو، وەك شێوازی بێ نەزاكەت و ناشیرینی ئەوان لە خۆت مەوەشێنەوەو، واز لە تەعبیرو وشە نارێكەكانیان، بهێنە، كە هەر شایستەی خۆیانن و وەك ئەوان مەكە.

لێرەدا (**الطبري**) لە قەتادەوە بە ژمارە (**٣٥٣٥١**) دەقێك دێنێ، بە چاكم زانی ئاماژەیەكی پێ بكەم، قەتادە ڕەحمەتی خوای لێبێ گوتوویەتی:

(**بَرَاءَة نَسَخَت ما ها هُنا وأُمِرَ بِقِتالِهِم، حَتَّى يَشهَدُوا أَنْ لا إِلَهَ إلاَّ الله، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله، لا يُقبَلُ مِنهُم غَيرُهَا**)، واتە: سووڕەتی بەڕائە ئەمەی نەسخ كردۆتەوەو، فەرمانی پێكراوە (لە سووڕەتی بەڕائەدا) بە جەنگان لە دژیان هەتا شایەتمان دێنن، بەوەی جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیەو، بەوەش كە موحەممەد ڕەوانەكراوی خوایە، جگە لەوەیان لێ وەرناگیرێ.

دەڵێم: ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی بەڕائە (**التوبة**)دا باسمان كرد، كە زۆرێك لە زانایان بۆ لابەر (**ناسخ**) ئاماژە دەكەن بە ئایەتی ژمارە پێنجی سووڕەتی (**التوبة**) لەوێ كورتە باسێكمان لەو بارەوە كردوە، كە بە ناهەق ناویان لەو ئایەتە ناوە: ئایەتی شمشێر (**آيَةُ السَّيف**) لە كاتێكدا وشەی (**سَيف**) لە قوڕئاندا هەر نەهاتوە، وشەی (**أَسلِحَة**) هاتوە، بەڵام وشەی (**سَيف**) لە قوڕئاندا نەهاتوە، ئایەتی ژمارە پێنجیش لەوێ قسەمان لێكردوە، كە لەڕاستییدا هیچ پەیوەندیی نیە بە نەسخكردنەوەو لابردنی ئەم ئایەتەو هەموو ئەو ئایەتانەی دیكەوە، كە باسی چاوپۆشییكردن و لێبوردن و واز لێ هێنان و مۆڵەت دان، ئەوانە دەكەن! چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەردەوام بووە، لە مەككەش و لە مەدینەش لەسەر واز لێهێنانی قسەی نارێك و ڕووبەڕوو نەبوونەوە، لەگەڵ خەڵكدا بە شێوازێك كە شایستەی پێغەمبەری خاتەم نیە ﷺ، بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دەغەڵ و مونافیقەكان و، لەگەڵ جوولەكەو نەصرانییەكان و، لەگەڵ هاوبەش

بۆ خوا دانەران و، لەگەڵ مسوڵمانانی لاریشدا، هەر بەو شێوەیە مامەڵەی کردوە: بەردەوام چاوپۆشیی کردوەو، بە سینگ فراوانیی و ڕەوشتبەرزیی هەڵس و کەوتی کردوە، کەواتە: ماقووڵ نیە بگوترێ: ئایەتی ژمارە پێنجی سوورەتی (التوبة) هەرچی ئایەتەکانی دیکە، کە فەرمان دەکەن بە ڕەوشت جوانیی و، لێبوردەیی و، سنگ فراوانیی و، ڕەحم و بەزەیی و، نەرم و نیانیی، هەموویانی نەسخ کردوونەوە، چونکە ئەوە شتێکی ڕیشەدارە لە پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ و، لە هەر مسوڵمانێکدا کە شوێنی ئەو دەکەوێ، کە هەر دەبێ ڕازاوە بێ بە ڕەوشتی جوان و، سینگ فراوانیی و میهرەبانیی و لێبوردەیی و چاوپۆشیی[1].

٣)- ﴿ وَذَرۡنِي وَٱلۡمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ ﴾، لە منیش و لە بە درۆ دانەرە خاوەن نازو نیعمەتەکان بگەڕێ.

٤)- ﴿ وَمَهِّلۡهُمۡ قَلِيلًا ﴾، کەمێك مۆڵەتیان بدە، لە من و لەوان بگەڕێ، یانی: ئەوان بۆ من لێگەڕێ، ئەوان بۆ من واز لێ بێنە، ﴿ وَٱلۡمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ ﴾، بە درۆ دانەرە خاوەن نازو نیعمەتەکان، (**نِعمة**)، یانی: چاکە، بەڵام (**نَعمَة**) و (**تَنَعُّم**) یانی: خۆشگوزەرانیی و خۆشڕابواردن، بۆیە زانایان گوتوویانە: ﴿ أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ ﴾، یانی: (**أَهْلُ التَّنَعُّمِ**)، ئەوانەی خۆش ڕادەبوێرن و خۆشگوزەرانن، هەڵبەتە بە زۆریی ئەوانە بە ماڵی حەڕام لەسەر حیسابی خەڵك خۆش ڕادەبوێرن و خۆشگوزەرانن، ﴿ وَمَهِّلۡهُمۡ قَلِيلًا ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- کەمێك دوایان بخە بۆ ئەو سزاو ئازارەی بۆم ئامادە کردوون، هەتا دەگەنە کاتی خۆی، واتە: لێیانگەڕێ تاکو ڕۆژی دوایی، یان تاکو مەرگیان دێ و لە قۆناغی بەرزەخدا دەکەونە نێو سزاو مەینەتیی و ئازارو ئەشکەنجەوە..

---

(١) لە پێشەکی گشتیی ئەم تەفسیرەدا، کە لە چاپی دوەمیدا لە بەرگی یەکەم دا دەڵی و، بە جیاش لە کتێبی (قورئانی مەزن) و لە کتێبی: [هیچ ئایەتێکی مەنسووخی لە قورئاندا نییە] دا بەدرێژیی باسی نەبوونی هیچ ئایەتێکی مەنسوخم لەقورئاندا کردووە.

ب- کەمێك مۆڵەتیان بدە، هەتا ئەم قۆناغی مەککە بەسەر دەچێ و قۆناغێکی دیکە، کە گواستنەوەو کۆچ کردنە لە مەککەوە بۆ مەدینە، دێتە پێشێ و ئیسلام قەوارەی سیاسیی پەیدادەبێ و، فەرمان بە مسوڵمانان دەکات بەرگریی لەو قەوارەیەی خۆیان بکەن بە هێزو چەك، ئەو کاتە ئەو زلە زلانەی تۆ ئەزیەت دەدەن و ناڕەحەتت دەکەن، بە سزای خۆیان دەگەن، لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەهلی ئیمان لەگەڵ ئەهلی کوفردا، وەك لە جەنگی بەدردا ڕوویدا.

٥)- ﴿ إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە کۆت و پێوەندەکان و بڵێسەی ئاگرمان لەلایە، ﴿ أَنكَالٗا ﴾، (**أَنكال**) کۆی (**نِكل**)ە، کە بە مانای کۆت و زنجیرە، ئەوەی لە پێی ئاژەڵ دەکرێ، (**نِكل**) بەوە دەگوترێ، ئەو زنجیرو کۆت و پێوەندەی لە پێی ئاژەڵ دەکرێ، بۆ ئەوەی تەکان نەدات و نەجووڵێ و نەڕوات، (**جَحِيم**) واتە: بڵێسە سەوزەکەی ئاگر، بڵێسەی ئاگرمان لەلایە.

٦)- ﴿ وَطَعَامٗا ذَا غُصَّةٖ ﴾، خواردنێکی خاوەنگیر، (**يَعنِي طَعاماً يُغَصُّ بِهِ أَكِلُهُ**)، خواردنێك بخۆرەکەی لە قوڕگی دەگیرێ و گەرووگیرە، ئیبنو عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، وەك (**الطبرى**) بە ژمارە (٣٥٣٦٦) لێوەی هێناوە، دەڵێ: (**شَوكٌ يأْخُذُ بِالحَلقِ فَلا يَدخُلُ وَلا يَخرُج**)، دڕکێکە لە قوڕگ دەگیرێ، نە دەچێتە خوارو نە دێتەوە دەرێش، واتە: ئێمە کۆت و پێوەندەکانمان لە لان و، بڵێسەی ئاگرمان لە لایەو، خواردنێکی گەرووگیرمان لە لایە.

٧)- ﴿ وَعَذَابًا أَلِيمٗا ﴾، هەروەها ئازارێکی بە ئێش و ژانیشمان لە لایە، کەواتە: هەڵیانگرە بۆ ئەو کات و ئەو کاتە تووشی دەردی خۆیان دێن.

ئنجا ئایا ئەو زارو ئازارە، ئەو کۆت و زنجیرو بڵێسەی ئاگرو خواردنی گەرووگیرو ئازارە بە ئێشە کەنگێیە؟.

٨)- ﴿ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ ﴾، ئەو ڕۆژە (واتە: لە دوای ئەو ڕۆژەوە) دێ، کە زەویی و چیایەکان دەلەرزنەوە، دەهەژێن.

٩)- ﴿وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا﴾، چیایەكانیش دەبن بە كۆ لمی هەڵڕژاو، (**كثيباً: رملاً سائِلاً مُتَناثِراً**)، لمێكی شلی ڕژاو، لم ئەگەر زۆر ورد بێ، كە چەنگی تێهەڵدەدەی لەنێو پەنجەكانت دێتە خوارێ، یاخود ئەگەر هەندێكی لێبگری، ئەوەی دیكە بەدوایدا دێ، (**مَهِيل**) لەوەوە هاتوە، كە ئەگەر هەندێكی لێوەربگری، ئەوی دیكە بەدوایدا دێ، چونكە خۆی ناگرێ: (**عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما **(الكَثِيبُ المَهِيل): اللَّيِّنُ الَّذي إذا مَسِستَهُ تَتَابَعَ وَيَنْهَالُ**)، واتە: (**الكَثِيبُ المَهِيل**) یانی: كۆمەڵە لمێكی نەرمی وا كاتێك تۆ دەستی بگەیەنیە، بە دوای یەكدا دێ، (**يَنهال**) واتە: بە دوای یەكدا دەڕووخێ و دەڕمێ، چیایەكانیش ئاوایان لێ دێ، كە ئەوەش یەكێكە لە دیمەنەكانی ڕۆژی ئاخیر زەمان، واتە: قۆناغی یەكەمی ڕۆژی دوایی، كە لە دوای فووی یەكەم كردن بە كەڕەنادا دێتە دی، دواییش فووی دووەمی پێدا دەكرێ و قیامەت دێ، ئنجا ئەو سزاو ئازارانە لەوێ هەن، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ كە ڕۆژی دوایی ئەوەی تێدا دەقەومێ، بەڵام ئەوانە هەر لەگەڵ مردن، لە قۆناغی بەرزەخ دا ئەو سزاو ئازارانەیان هەن.

## کورتە باسێک لە بارەی

## ئەدەبەکانی قورئانخوێندن و، پێناسە و حوکم و گرنگی و پلەکان و چۆنییەتی قورئان خوێندنەوە و ئەدەبەکانی قورئان خوێندنەوە

### تەوەرەی یەکەم:

### بڕگەی یەکەم: نیەتی خۆ ساغکردنەوە:

یەکێك لە ئەدەبەکانی قورئانخوێندن، بریتیە لە ساغکردنەوەی نیازو مەبەست لە کاتی قورئانخوێندن دا، کە مرۆڤ تەنیا وەك پەرستشێك بۆ خوا ئەنجامی بدات.

بەڵێ: یەکەمین و بناغەی ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەکانی قورئانخوێندن، ئەوەیە کە مرۆڤ دڵی خۆی ساغ و صاف بکاتەوەو، هیچ هاندەرو پاڵنەرێکی نەبێ بۆ ئەو قورئانخوێندنە، ئەوە نەبێ کە خوا لێی ڕازی بێ، کە ئەوە فەرمایشتی خوایە دایبەزاندوە، هەر خودی خوێندنەوەکەی، خوا پەرستییەو چاوەڕێی پاداشتی لە بەرانبەردا دەکرێ.

لەوبارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین: {**عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ المسْجِدَ، فإذا فِيهِ قَومٌ يَقرَؤون القُرآنَ، قَالَ: اقْرَؤوا القُرآنَ، وابْتَغوا بِه اللهَ، مِنْ قَبلِ أنْ يَأتِيَ قَومٌ يُقِيمُونَه إقَامَةَ القِدْحِ، يتَعَجَّلونَه، وَلاَ يَتَأَجَّلُونَهُ**}، (**أخرجه أحمد: ١٤٨٥٥، وأبو يعلى: ٢١٩٧، والبيهقي في شعب الإيمان: ٢٦٤٣، ٢٦٤٤**)، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك چووە مزگەوت، کۆمەڵێك

قورئانیـان دەخوێنـد، فەرمـووی: قورئـان بخوێنـن و خـوا (عَـزَّ وَجَـلّ)ی پـێ بخـوازن، {ڕەزامەندیـی خـواو پاداشـتی خـوای پـێ بخـوازن}، بـەر لـەوەی کۆمەڵێـك بێـن وەك پەلیـك ڕاسـتی دەکـەن، بـەڵام پەلـەی پێدەکـەن و، چاوەڕێـی پاداشـتەکەی لـە ڕۆژی دوایـی دا ناکـەن.

## بڕگەی دووەم: خوێندنی بە تێوەڕامان و تێگەیشتنەوە:

ئەدەبێـکی دیکـەی قورئانخوێنـدن، ئەوەیە کە بابـای قورئانخوێن بە تێگەیشـتنەوەو بـە تێڕامانـەوە بیخوێنێتـەوە، بـۆ ئەوەی لـە یەك کاتـدا دوو بەهـرەی لێوەربگرێ:

**أ-** لێتێگەیشتنی قورئان، کە ئەوە گەورەترین ئامانج و مەبەستە لە ژیانی دنیاداو هۆکاری کارپێکردن و جێبەجێکردنی قورئانیشە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست.

**ب-** پاداشت وەرگرتنەوە لە ڕۆژی دوایی دا، کەواتە: مەسەلە بەس خوێندنی قورئان نیە، بەڵکو دەبێ بە ڕێکیی و بە شێنەیی و بە تێوەڕامان و بیرکردنەوەوە بیخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو دوو ئامانجە بپێکێ: هەم لێی تێبگات و لێی بەهرەمەند بێ، کە لە ڕاستییدا قورئان بۆ لێتێگەیشتن و لێ بەهرەمەند بوون، دابەزێنراوە: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩ ﴾ص، هەروەها بۆ ئەوەی پاداشتەکەشی دەستبکەوێ، چونکە بە ئەندازەی ئەوەی مرۆڤ لە قورئان بەهرەمەند دەبێ و، لێی تێدەگات و چاکی دەخوێنێ بە خشووعەوەو بە ئەدەبەوە، پاداشتیشی دەبێ، لەو بارەوەش چەند دەقێك دێنین:

**١)-** {**جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللهِ بنِ مَسْعُودٍ** ﷺ، **فَقَالَ: إِنِّي لأَقْرَأُ المُفَصَّلَ فِي رَكْعَةٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ! إِنَّ أَقْوَامًا يَقْرَؤُونَ القُرْآنَ لا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، وَلَكِنْ إِذَا وَقَعَ فِي القَلْبِ فَرَسَخَ فيه، نَفَعَ**}، (**قَالَ عبدالله بن يوسف الجديع: أَثَرٌ صَحِيحٌ، أخرجه: البخاري ومسلم، والترمذي: ٦٠٢، والنسائي: ١٠٠٤**).

واتـە: پیاوێـك هاتـە لای عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود ﷺ گـوتی: مـن هەمـوو موفەسسـەڵ لـە ڕکاتێکـدا دەخوێنـم (ئـەو سـوورەتانەی زوو زوو نێوانیـان دەکەوێتـێ،

کـە لـە سـووڕەتی (ق)ەوە دەسـت پێدەکـەن، تاکـو سـووڕەتی (النـاس))، عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود پێـی گـوت: گوتنێـك وەك گوتنـی شـیعر؟ کەسـانێك قوڕئـان دەخوێنـن لـە گەروویـان ئەودیـو نابـێ، {واتـە: تێکـەڵ بـە دڵ و دەروونیـان نابـێ، یاخـود تێکـەڵ بـە عەقـڵ و هۆشـیان نابـێ}، بـەڵام قوڕئـان ئەگـەر کەوتـە نێـو دڵ و چەسـپی، ئنجـا سـوود بـە خاوەنەکـەی (بـە خوێنەرەکـەی) دەگەیەنـێ.

**٢)- {قَالَ أَبُو جَمْرة: قُلْتُ لابْن عَبَّاسٍ: «إِنِّي رَجُلٌ سَرِيْعُ القِرَاءَةِ، وَرُبَّمَا قَرَأْتُ القُرْآنَ فِي لَيْلَةً مَرَةً أو مَرَتَيْنِ»، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: «لأن أَقْرَأَ بِسُورَةٍ وَاحِدَةٍ أعْجَبَ إلَيّ مِنْ أنْ أَفْعَلَ ذَلِكَ الَّذِي تَفْعَلُ، فَإِن كُنْتَ فَاعِلاً وَلَا بُدَّ، فَاقْرَأْ قِرَاءَةً تُسْمِعُ أُذُنَيْكَ، وَيَعْيَهُ قَلْبُكَ} (أثر صحيح، أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٢١٥٩).**

واتـە: ئەبـوو جەمـرە - یەکێـك بـووە لـە زانایـان - دەڵـێ: بـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـم گـوت (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، مـن پیاوێکـم زۆر بـە خێرایـی دەخوێنـم، جـاری واهەیـە هەمـوو قوڕئـان لـە شـەوێکدا دەخوێنـم، بەڵکـو جـاری واهەیـە دوو جـارانی دەخوێنـم! عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ، گـوتی: ئەگـەر سـووڕەتێك بخوێنـم بـە شـێنەیی پێـم باشـترە لـەوەی وەك تـۆ بکـەم، ئەگـەر هـەر واشـدەکەی بـە جۆرێـك قوڕئـان بخوێنـە کـە گوێیەکانـت بیبیسـتن و دڵیشـت تێـی بـگات.

**٣)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرو بنِ العَاص رَضِيَ الله عَنْهُمَا: أَنَّهُ كَانَ يَخْتِمُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ فَقَالَ لَهُ النَّبِيّ ﷺ: «اقْرَأ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ شَهْرٍ، قَالَ: قُلْت: يَا نَبِيَّ اللَّهِ! إِنِّي أُطِيق أَفْضَلَ مِنْ ذلِكَ؟ قَالَ: فَاقْرَأه فِي كُلِّ عِشرِينَ قُلْت: يَا نبيَّ اللَّهِ! إِنِّي أُطِيق أَفْضَل مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: فَاقْرَأْهُ فِي كُلِّ عَشْر، قُلْت: يَا نَبِيَّ اللَّهِ! إِنِّي أُطِيق أَفْضَلَ مِنْ ذلِكَ؟ قَالَ: فَاقْرَأْه فِي كُلِّ سَبْعٍ، وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذَلِكَ} (أخرجه البخاري: ٤٠٦٦، ٤٠٧٦٧، ومسلم: ١٠٥٩).**

واتـە: لـە عەبدوڵڵای کـوڕی عەمـڕی کـوڕی عاصـەوە (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ) گێڕدراوەتـەوە، کـە لـە هەمـوو شـەواندا قوڕئانی خەتـم کـردوە، (هەمـوو قوڕئـانی

خوێنـدوه)، پێغەمبەریـش ﷺ پێـی فەرمـوو: قورئـان هەمـووی لـە مـاوەی مانگێکـدا بخوێنـن، گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـەوە باشـترم لـە توانـادا هەیـە، فەرمـووی: لـە هـەر بیسـت شـەوێکدا (بیسـت ڕۆژ)دا هەمـوو قورئـان بخوێنـە، (واتـە: هـەر ڕۆژێ یـان شـەوێ جوزئـو نیوێـك)، گوتـم ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـەوە باشـترم لـە توانـادا هەیـە، فەرمـووی: لـە هـەر دە شـەودا قورئـان خەتـم بکـە، (واتـە: هـەر شـەوو ڕۆژێ دە (١٠) جـوزء)، گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـەوە زیاتـرم لـە توانـادا هەیـە، فەرمـووی: لـە حـەوت ڕۆژانـدا هەمـوو قورئـان بخوێنـەو لـەوە زیـاد مەکـە.

واتـە: لـەوە زیاتـر مەخوێنـە کـە لـە مـاوەی حەفتەیەکـدا تـەواوی بکـەی، واتـە: هـەر ڕۆژەی چـوار جوزئـو شـتێك.

هـەر لـەو بـارەوە ئـەم دەقـەش دێنیـن، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە عەبدوڵڵای کـوڕی عەمـڕی کـوڕی عـاصی هـەر لـەو بەسـەرهاتەی پێشـوودا فەرمـوو: (**لا یفقـه القـران مَـن قـرأه فـی أقـلَّ مـن ثـلاث**) هـەر کەسێك لـە مـاوەی سـێ شـەو کەمتردا هەمـوو قورئـان بخوێنـێ، لێـی تێنـاگات.

کەواتـە: نابـێ هەمـوو قورئـان لـە مـاوەی سـێ شـەو کەمـتردا بخوێـنرێ، واتـە: شـەوو ڕۆژی دە(١٠) جـوزء، لـەوە زیاتـر نابـێ بخوێـنرێ، چونکە پێغەمبـەر دەفەرموێ ﷺ کەسـێك لـە شـەوێك دا دە جوزئـان زیاتـر بخوێنـێ، لێـی تێنـاگات، کـە لێـی تێنەگەیشـتی مانـای وایـە گەورەتریـن ئامانجـی قورئـان کـە لێتێگەیشـتنە، نایەتـە دی.

## بڕگەی سێیەم: دەبێ قورئان لە شوێنێکی بێدەنگ بخوێنرێ:

دەبـێ شـوێنی قورئـان تێـدا خوێنـدن، شـوێنێك بـێ ئـارام بـێ و هێمنیـی تێدابـێ و، ئـەو شـوێنانەی دەنگیـان تێـدا بـەرز دەکرێتـەوەو دەنگـە دەنـگ و گاڵـە گاڵ دێ، قورئـان نـە خوێـنرێ، لـەو بارەشـەوە ئـەم دەقـە دێنیـن:

{**عَـن عَبْـدِ اللـهِ بْـنِ عُمَـرَ رَضِيَ اللـه عَنْهُـمَا: أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ اعْتَكَـفَ وَخَطَـبَ النَّـاسَ فَقَـالَ: أَمَـا إِنَّ أَحَدَكُـمْ إِذَا قَـامَ فِي الصَّـلاَةِ ، فَإِنَّـهُ يُنَاجِـي رَبَّـهُ ، فَلْيَعْلَـمْ أَحَدُكُـمْ مَـا يُنَاجِـي**

**رَبَّـهُ، وَلاَ يَجْهَـرْ بَعْضُكُـمْ عَـلَى بَعْـضٍ بِالْقِـرَاءَةِ فِي الصَّـلاَةِ)، (حديـث صحيـح، أخرجـه: أحمـد: ٤٠٢٨، والطـبراني في الكبـير: ٣٥٧٢).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ) گێڕاویەتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ چۆتـە ئیعتیکافـەوە، دوایـی وتـاری بـۆ خەڵـك داوەو فەرموویـەتی: بزانـن! یەکێـك لـە ئێـوە کـە هەڵدەسـتێ بـۆ نوێـژێ، پـەروەردگاری دەدوێنـێ، ئنجـا بـا یەکێـك لـە ئێـوە بزانـێ ئـەوەی پـەروەردگاری پـێ دەدوێنـێ، چییـە، (واتـە: بـا هـۆش و گـۆش و دڵ ئامادەیـی هەبـێ، نـەك هـەر قسـان ڕیـز بـکات)، بـا هیـچ کامێکتـان بەسـەر ئـەوی دیکەتـان لـە کاتی قوڕئـان خوێنـدن و، لـە کاتی نوێـژدا دەنـگ بـەرز نەکاتـەوە، کەواتـە: قوڕئـان دەبـێ لـە کـەش و هەوایـەکی هێمـن و ئـارام و کـش و ماتـدا بخوێـنرێ، نـەك لـە شـوێنێکدا کـە دەنگـە دەنـگ و قەرەباڵغیـی لێبـێ، مەگـەر بـە ناچاریـی بـێ.

## بڕگـەی چـوارەم: دەبـێ مـرۆڤ بـەر لـەوەی دەسـت بـە قوڕئانخوێنـدن بـکات، خـۆی بـۆ ئامـادە بـکات:

ئەدەبێـکی دیکـەی قوڕئانخوێنـدن، ئەوەیـە کـە مـرۆڤ دڵـی بێداربـێ و عەقڵـی هۆشـیار بـێ و، هیـچ شـتێکی نەبـێ کـە دڵ بێداریـی و عەقـڵ هۆشـیارییەکەی لـێ تێکبـدات، وەك سـەغڵەتیی بەهـۆی میـزو پیسـاییەوە، یـان کـە خـواردن دانرابـێ و چاوەڕێـی بکـەن، یاخـود هـەر کارێـکی دیکـە کـە سـەرقاڵ و مەشـغووڵی بـکات، وا باشـە کارەکـەی بـکات و دوایـی بێتـە سـەر نوێژەکـەی و سـەر قوڕئانخوێندنەکـەی، بۆیـەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: {**لَا صَـلاةَ بِحَـضْرَةِ الطَّعَـامِ، وَلَا هُـوَ يُدَافِعُـهُ الأَخْبَثَـانِ**}، (**أخرجـه مسـلم: ٥٨٩**) کـە مەبەسـت لـە (**الأَخبَثـان**) میـزو پیسـایین، واتـە: نوێـژ نابـێ بکـرێ لـە کاتێکـدا کـە خـواردن ئامادەیـە، هەروەهـا لـە کاتێکیشـدا کـە دوو شـتە پیسـەکان سـەغڵەتی دەکـەن.

**بڕگەی پێنجەم: پێویستە قوڕئانخوێندنەکەی دەست پێبکات بە پەنا بە خوا گرتن، لە شەیتانی دوور خراوە لە بەزەیی خوا:**

ئەوەش خوا ﷻ بە ڕوون و ڕاشکاویی لە سووڕەتی (النحل)، لە ئایەتی ژمارە (٩٨)دا دەفەرمووێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾النحل، هەر کاتێك قوڕئانت خوێند، پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی دوورخراوە لە بەزەیی خوا.

ئنجا ئێمە لە دوو کورتە خاڵدا، باسی (**إستِعاذَة**)، دەکەین:

یەکەم: حوکمی (**إستِعاذَة**)، واتە گوتنی: (**أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم**)، دووەم: چۆنیەتیی و شێوازەکەی چۆنە؟.

خاڵی یەکەم: حوکمی گوتنی (**إستِعاذَة**)، لە لای زۆربەی هەرە زۆری زانایان شتێکی پەسندە، کە لە کاتی هەر قوڕئان خوێندنێك دا، چ لە نێو نوێژدا، چ لە دەرەوەی نوێژدا، (**إستِعاذَة**) بگوترێ: (**أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجِيم**)، چونکە هەم خوای بەرز فەرمانی پێکردووە، هەم لەبەر ئەوەش کە چەسپاوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لەوەی قوڕئان لە نوێژێدا بخوێنێ (**أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجِيم**) ی فەرمووە، ئەوەش کۆمەڵێك لە هاوەڵان لێیان گێڕدراوەتەوە، لەوانە: (**أَبو سَعِيد الخُدري و عَبدُ الله ابنُ مَسعُود و جُبَيرُ بن مُطعِم و أَبُو أُمَامَةُ الباهِلي**)و جگە لەوانەش، کە (**إستعاذة**) کردن شتێکی پەسندە.

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە گوتنی: (**أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجِيم**) لە سەرەتای قوڕئانخوێندنەوە، فەرزە، بەڵام زۆربەی زانایان بە شتێکی پەسندیان داناوە.

خاڵی دووەم: چۆنیەتیی و شێوازی (**إستعاذة**) چۆنە؟

دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین: (**الإستِعاذَةُ جائِزَةٌ بِكُلِّ ما تَحقَّقَ بِهِ امتِثالُ الأَمْر**[1])، پەنا بە خوا گرتن لە سەرەتای قوڕئان خوێندندا، بە هەر شێوەیەك

---

(١) ئەمە قسەی نوسەری کتێبەکەیە.

کە فەرمانەکەی پێ جێبەجێ بکرێ، دروستە، بەڵام ئەوەی تێکڕای قورئانخوێنان لەسەری ڕێککەوتوون، لە ڕووی ڕیوایەتەوە، ئەوەیە کە بگوترێ: (**أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجِيم**)، پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی دوور خراوە، زۆربەی هەرە زۆری شەرعزانانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن.

بەڵام ئایا (**أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجِيم**) بە دەنگی بەرز بگوترێ، یان بە دەنگی نزم؟ هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر قورئانخوێندنەکە بە دەنگی بەرزبێ، دەبێ ئەویش بەدەنگی بەرزبێ، واتە: ئەگەر قورئانخوێندنەکە کە لە نوێژدایە بە دەنگی بەرزە، یان لە دەرەوەی نوێژ بە دەنگی بەرزە، ئەویش بە دەنگی بەرز بێ و، ئەگەر بە دەنگی پەنهان بێ، ئەویش بە دەنگی پەنهان بێ.

## بڕگەی شەشەم: دەبێ بابای قورئانخوێن لە کاتی قورئان خوێندنەکەیدا دەنگی خۆی خۆش و جوان بکات:

قورئانخوێن دەبێ ئەوەندەی بتوانێ، دەنگی خۆی خۆش بکات بەڵام بەبێ زۆر لە خۆ کردن، لەو بارەوەش ئێمە سێ دەقان دێنین:

**١)- {عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ** ﵁، **قَالَ: قَالَ: رَسُوُل الله: زَيِّنوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ، فَإِنَّ الصَّوْتَ الْحَسَنَ يَزِيدُ الْقُرْآنَ حُسْنًا}، (أخرجه أحمد: ج٤، ص٢٨٥،٢٨٣، والبخاري في أفعال العباد: ٢٥٠، ٢٥٤، ٢٥٦، وأبو داود: ١٤٦٦)** واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قورئان بە دەنگەکانتان جوان بکەن، {لە بێژەیەکی دیکەدا هاتوە قورئان بە دەنگەکانتان چاك بکەن}، چونکە دەنگی چاك و خۆش، جوانیی قورئان زیاد دەکات.

**٢)- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** ﵁، **أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ** ﷺ: **لَمْ يَأْذَنِ اللهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِيِّ أَنْ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ} (أخرجه البخاري: ٤٧٣٥، ٤٧٣٦، ٧٠٤٤)** واتە: ئەبوو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی خوا ﷻ گوێی نەگرتوە (گوێبیست نەبووە) بۆ هیچ شتێك وەك گوێبیستی پێغەمبەر ﷺ دەبێ کاتێك دەنگی بە قورئان دەلارێنێتەوەو بە دەنگی خۆش دەیخوێنێ.

٣)- {عَن أَبِي مُوسَى ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا أَسْتَمِعُ قِرَاءَتَكَ الْبَارِحَةَ، لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ}، (أخرجه البخاري: ٥٠٤٨، ومسلم: ٧٩٣ )، واته: ئەبوو مووسا ﵁ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ئەگەر دەتبینیم دوێنێ شەو گوێم بۆ قورئانخوێندنەکەت گرتبوو، تۆ ئاوازێك لە ئاوازەکانی داوودت پێدراوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی ئەبوو مووسای ئەشعەریی کە قورئانی خوێندوە، بە دەنگی خۆشی داوودی چواندوە، کاتێك کە میزمارەکانی خوێندوون، کاتێك زەبووری خوێندوە.

**برگەی حەوتەم: دەبێ کەسێك کە قورئان دەخوێنێ، بە ملکەچانە بیخوێنێ، بەڵکو ئەگەر بگونجێ لەگەڵیشیدا بگری، بەڵام بەبێ زۆر لە خۆکردن و ڕوودەربایسیی:**

ئایا بەڵگە لەسەر ئەوە چییە؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ٢٣﴾الزمر، واتە: خوا باشترین فەرمایشتی دابەزاندوە، کتێبێکە وێکچوویە، دووبارەکراوەیە، ئەوانەی ترس و سامی پەروەردگاریان هەیە، پێستیان مووچڕکەی پێدادێ، دوایی پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بۆ لای یادی خوا، ئەوە ئەو ڕێنماییەی خوایە، کە هەر کەسێکی بیەوێ پێی ڕاستە ڕێ دەکات و، هەر کەسێك خوا گومڕای بکات (لەبەر ئەوەی شایستەی گومڕاییە)، هیچ ڕێپیشاندەرو بە ئامانج گەیەنەرێکی نابێ.

هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (الحدید)دا، دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ ...١٦﴾الحدید، واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە ئەوانەی بڕوادارن، دڵیان بۆ یادی خواو ئەو هەقەی دایبەزاندوە نەرم بێ و ترس و لەرزی تێدابێ و، ﴿وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ

عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾الحديد، وەك ئەوانە نەبن کە کتێبیان پێ درابوو، ماوەیەکی درێژیان بەسەردا چوو، دڵیان ڕەق بوو، زۆریشیان لاڕێ بوون؟

هەروەها لەو بارەوە با چەند دەقێکی سوننەتیش بێنین:

دەقی یەکەم: {**عَـنْ عَبْـد اللـه بـن مَسْـعُوْد** ﵁، **قَـالَ: قَـالَ لِي النَّبِـي** ﷺ: «**اقْـرَأْ عَـلَيَّ، قُلْـتُ: أَقْـرَأُ عَلَيْـكَ، وَعَلَيْـكَ أُنـزِلَ؟ قَـالَ: فَـإِنِّي أُحِـبُّ أَنْ أَسْـمَعَهُ مِـنْ غـيري، فَقَـرَأْتُ عَلَيْـهِ سُـورَةَ النِّسَـاءَ حَتـى بَلَغْـتُ قَوْلَـه تَعـالَى:** ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴿٤١﴾ ﴾النساء، **قَـالَ: أَمْسِـكْ، فَـإذا عَيْنَـاهُ تَذْرِفَـانِ**} (**أخرجـه البخـاري: ٤٥٠٦، وغـيره**) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: قورئانم بەسەردا بخوێنە (بۆم بخوێنە)! گوتم: قورئان بەسەرە تۆدا بخوێنم لە کاتێکدا بەسەر تۆدا دابەزێنراوە؟ فەرمووی: حەز دەکەم لە جگە لە خۆم بیبیستم، منیش لە سوورەتی (**النساء**)م بەسەردا خوێند، هەتا گەیشتمە ئەو شوێنەی دەفەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴿٤١﴾ ﴾النساء، چی دەبێ کاتێك لە هەر کۆمەڵێك شایەدێکمان هێناو تۆشمان وەك شایەد بەسەر ئەم ئوممەتەوە هێنا! ئنجا فەرمووی: بەسە، کە تەماشام کرد چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دەهات، لە بێژەیەکدا دەڵێ: سەرم بەرز کردەوە تەماشام کرد فرمێسکەکانی دەهاتنە خوارێ.

دەقی دووەم: {**عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِيَ اللـهُ عَنْهَـا، قَالَـتْ: إِنَّ أَبَـا بَكْـرٍ رَجُـلٌ رَقِيْـقٌ، إِذَا قَـرَأَ غَلَبَـهُ الْبُـكَاء**} (**أخرجـه البخـاري: ٦٥٠، وهـو فِي الصحيحـين بمعنـاه عـن عائشـة نفسـها**)، واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: بێگومان ئەبوو بەکر پیاوێکی دڵنەرمە، ئەگەر قورئان بخوێنێ، گریان بەسەریدا زاڵ دەبێ، واتە: خۆی ڕاناگرێ دەگریەت و فرمێسکی دێ.

دەقی سێیەم: {وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْن شَدَّادٍ: سَمِعْتُ نَشِيجَ عُمَرَ بنِ الخطَّابِ رضي الله عنه وَأَنَا فِي آخِرِ الصُّفُوفِ فِي صَلاَةِ الفَجْرِ، يَقْرَأُ: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾﴾ يوسف}، (أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٥٦٥)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەدداد دەڵێ: گوێم لە گریانی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه بوو، من لە کۆتایی ڕیزەکان بووم لە نوێژی بەیانییدا (سوورەتی یوسفی دەخوێند، گەیشتە ئەو شوێنەی کە دەفەرموێ:) ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾﴾ يوسف، گوتی: من سکاڵای خەم و پەژارەی خۆم تەنیا بۆ لای خوا دەبەم و، شتێکیش لە لایەن خواوە دەزانم کە ئێوە نایزانن.

ئەوەش قسەی یەعقووبە (عَلَيْه الصَّلاةُ وَالسَّلام) کە بە کوڕەکانی خۆی فەرموو.

## بڕگەی هەشتەم: پێویستە مرۆڤ کاتێك قورئان دەخوێنێ، بزانێ ئەوەی دەیخوێنێ، خۆیشی پێی دوێنراوە:

بۆ وێنە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، بزانە کە خوا لەگەڵ تۆشیەتی، چونکە تۆش یەکێکی لە بڕواداران، لەو بارەوەش با تەماشای ئەم شەش دەقە بکەین:

دەقی یەکەم: {عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه، قَالَ صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، قَالَ: فَافْتَتَحَ الْبَقَرَةَ فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ رَأْسَ الْمِائَةِ، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ، ثُمَّ مَضَى حَتَّى بَلَغَ الْمِائَتَيْنِ، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ، ثُمَّ مَضَى حَتَّى خَتَمَهَا، قَالَ فَقُلْتُ يَرْكَعُ، قَالَ: ثُمَّ افْتَتَحَ سُورَةَ آلِ عِمْرَانَ حَتَّى خَتَمَهَا، قَالَ فَقُلْتُ: يَرْكَعُ، قَالَ: ثُمَّ افْتَتَحَ سُورَةَ النِّسَاءِ فَقَرَأَهَا، قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ، قَالَ: فَقَالَ فِي رُكُوعِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، قَالَ: وَكَانَ رُكُوعُهُ بِمَنْزِلَةِ قِيَامِهِ، ثُمَّ سَجَدَ، فَكَانَ سُجُودُهُ مِثْلَ رُكُوعِهِ، وَقَالَ فِي سُجُودِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى، قَالَ: وَكَانَ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ سَأَلَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا عَذَابٌ تَعَوَّذَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَنْزِيهٌ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ سَبَّحَ}، (أخرجه أحمد: ٢٣٣٠٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم رجاله ثقات).

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ شەوێك نوێژم کرد، سوورەتی (**البقرة**)ی دەستپێکرد، خوێندی هەتا گەیشتە ئایەتی سەدەم، گوتم: ڕەنگە لە کۆتایی ئایەتی سەدەمدا بچێتە ڕکووع، دوایی ڕۆیشت هەتا دوو سەدی تەواو کرد، گوتم: ڕەنگە ئەوجارە بچێتە ڕکووع، دوایی ڕۆیی هەتا سوورەتی (**البقرة**)ی تەواو کرد، (کە (٢٨٦) ئایەتە)، گوتم: ڕەنگە لە کۆتایی سوورەتی (**البقرة**)دا بچێتە ڕکووع، بەڵام دەستی بە سوورەتی (آل عمران) کرد (هەر لەو ڕکاتەدا) هەتا سوورەتی (**آل عمران**)یشی تەواو کرد، گوتم: ڕەنگە دوای سوورەتی (**آل عمران**) بچێتە ڕکووع، دوایی سوورەتی (**النساء**)شی دەست پێکردو، ئەویشی تەواو کرد، ئنجا چووە ڕکووع، لە ڕکووعەکەشیدا دەیفەرموو: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ العَظِيم**) پاکیی بۆ پەروەردگاری مەزنم و، ڕکووعەکەی بە ئەندازەی ڕاوەستانەکەی بوو، (کە ئەو سێ سوورەتە موبارەکەی خوێندوون)، دوایی کڕنووشی برد، کڕنووشەکەشی بە ئەندازەی ڕکووعەکەی بوو، لە کڕنووشەکەیدا دەیفەرموو: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعلَى**) پاکیی بۆ پەروەردگاری بەرزم، (حوزەیفە) دەڵێ: دوایی کە بە لای ئایەتێکدا تێدەپەڕی کە باسی بەزەیی خوای دەکرد، داوای بەزەیی خوای دەکردو، کاتێك بە لای ئایەتێکدا دەڕۆیی باسی سزای خوای دەکرد، پەنای بە خوا دەگرت و، کاتێك بە لای ئایەتێکدا دەڕۆیی، بە پاك گرتنی خوای تێدابوو، خوای بە پاك دەگرت، واتە: کارلێکی لەگەڵ ئایەتەکاندا دەکرد، بەس ئەوە نەبوو بیانخوێنێ.

دەقی دووەم: (**عَنِ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللّه عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيّ كَانَ إِذَا قَرَأَ سَبّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى، قَالَ: سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلَى**)، (**أخرجه أحمد: ٢٠٦٦، وأبو داود: ٨٨٣، والطبراني في الكبير: ٥٣٣٣**)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك سوورەتی (**سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى**)ی دەخوێند دەیفەرموو: (**سُبحانَ رَبِّيَ الأَعلَى**)، پاکیی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرز.

دەقی سێیەم: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ الله عَنْهُمَا، إِذَا قَرَأَ: أحدكم: سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى فَلْيَقُلْ: سُبحانَ رَبِّيَ الأَعلَى، وَإِذَا قرأ: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١﴾ [سورة القيامة:١] فَأَتَى عَلَى آخِرِهَا: ﴿أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ ٤٠﴾ القيامة يَقُولُ: سُبْحَانَكَ وَبَلَى}، (أثر صحيح، أخرجه ابن الضريس في فضائل القرآن: ١٣، والبيهقي في شعب الإيمان: ٢١٠٠، قلت: إسناده صحيح).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەگەر یەکێکتان (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)ی خوێند، با بڵێ: (سُبحانَ رَبِّيَ الأَعلَى)و، کاتێك (لا أقسم بيوم القيامة)ی خوێندو گەیشتە کۆتاییەکەی: ﴿أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ ٤٠﴾ القيامة، با بڵێ: پاکیی بۆ تۆ و با، یانی: پاکیی بۆ پەروەردگارم، با، ئەو خوایەی مرۆڤی دروستکردوە دەتوانێ زیندووشی بکاتەوە.

دەقی چوارەم: {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ السَّائِبِ رضي الله عنه، قَالَ: أَخَّرَ عُمَرُ كَرَّمَ اللهُ وَجْهَهُ العِشَاء الآخِرَة، فَصَلَّيْتُ، وَدَخَلَ فَكَانَ فِي ظَهْرِي، فَقَرَأْتُ: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ١﴾ الذاريات، حَتَّى أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِهِ: ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ٢٢﴾ الذاريات فَرَفَعَ صَوْتَهُ حَتَّى مَلأَ المَسْجِدَ: «أَشْهَدُ»}، (أثر حسن، أخرجه أبو عبيد في فضائل القرآن ص١٤٩، قلت: وهذا إسناد حسن).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب رضي الله عنه دەڵێ: عومەر خوا ڕێز لە ڕووی بگرێ، نوێژی خەوتنانی دواخست، منیش نوێژم کرد، لە کاتێکدا ئەو هات لە پشتمەوە بوو، من سوورەتی: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ١﴾م دەخوێند، هەتا گەیشتمە قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ٢٢﴾ الذاريات، لە ئاسمان بژیوی ئێوە هەیەو ئەوەی بەڵێنتان پێدەدرێ، عومەر رضي الله عنه بە دەنگی بەرز کە مزگەوتی پڕ کرد، فەرمووی: (أشهد) شایەدیی دەدەم (بژیوی ئێمە لە ئاسمانەو، ئەوەی بەڵێنیشمان پێدەدرێ لە ئاسمانە).

دەقی پێنجەم: {عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّهَا قَرَأَتْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾الطور، فَقَالَتْ: أَللَّهُمَّ مُنَّ عَلَيْنَا وَقِنَا عَذَابَ السَّمُومِ}، (أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٢٩٠٢، وابن أبي شيبة: ٦٠٣٥، وإسناده صحيح).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لێی گێردراوەتەوە کاتێك ئەو ئایەتەی دەخوێند: ﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾الطور، خوا چاکەی لەگەڵ کردین و لە ئازاری گڕە با ئێمەی پاراست، دەیگوت: ئەی خوایە! چاکەم لەگەڵ بکەو، لە ئازاری گڕەبا چەپاڵەم بدە.

دەقی شەشەم: زانایان گوتوویانە: لە کاتێکدا دەگاتە: ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾الأعراف، هەروەها سووڕەتی (المرسلات) ئایەتی (٥٠): ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾، با بڵێ: (آمَنْتُ بِاللهِ وَكِتابِهِ)، بڕوام بە خواو بە کتێبەکەی هێنا.

هەروەها کاتێك کە دەگاتە فەرمایشتی خوای بەرز: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾ ﴾التين، بڵێ: (بَلَى، وَأَنا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِين)، با منیش لەسەر ئەوە لە شایەدانم.

هەروەها کاتێك دەگاتە فەرمایشتی خوا: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾الرحمن، کە (٣١) جار دووبارە بۆتەوە، بڵێ: (وَلا بِشَيءٍ مِن نِعمَةِ رَبِّنا نُكَذِّب)، هیچ کام لە چاکەکانی پەروەردگارمان بە درۆ دانانێین، کە لەو بارەوە (عبدالله بن یوسف الجديع) دەڵێ: (فيها حَدِيثٌ مَرفُوعٌ حَسَنٌ).

هەروەها کە ئەو ئایەتانە دەخوێنێ: ﴿ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾الواقعة، هەروەها: ﴿ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾الواقعة، هەروەها: ﴿ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾الواقعة، هەروەها: ﴿ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ ﴾الواقعة، لە هەموو ئەوانەدا بڵێ: (بَل أَنْتَ يا رَبّ)، بەڵکو تۆ ئەی پەروەردگار!

لێرەدا (**عبدالله بن یوسف الجُدیع**) قسەیەکی گرنگ دەکات، دەڵێ: مەرجیش نیە ئەو قسانەی لە کاتی خوێندنی ئەو ئایەتانەدا دەکرێن، تەوقیفیی بن، واتە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێمان گەیبن، بەڵکو دەگونجێ مرۆڤ بە کۆشش و بیر کردنەوەی خۆی، لە چوارچێوەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ وشەیەك بڵێ، هەر ئەوەش لەو شتانە دەفامرێتەوە کە لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێ و، لە عائیشەوەو لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازیی بێ) گێڕدراونەوە، لە نوێژو لە جگە لە نوێژدا، بەڵام ئەوەندە هەیە نابێ بە شێوەیەك بێ، ببێتە جۆرێك لە غەڵبە غەڵب لە قورئان خوێندنەکەداو، بەسەر قورئان خوێندنەکەدا زاڵ ببێ، هەموو ئەو تەعبیرانەش بۆ ئەوەن کە مرۆڤ زیاتر کارلێك لەگەڵ ئایەتەکان دا بکات و، ئاگای لێیان بێ، نەك هەر بخوێنێ و نەزانێ چی خوێندوە!.

## بڕگەی نۆیەم: خۆپاراستن لە هەر شتێك کە دژو ناکۆکە لەگەڵ قورئانخوێندنەکەدا، بگرە هەر قسەو ڕەفتارێك جگە لە قورئانخوێندنەکە:

وەك قسە کردن لەگەڵ خەڵکی دیکەداو، کە یەکێك سڵاو دەکات، وەڵامدانەوەی، یاخود یەکێك کە دەپژمێ تەشمیتی بکات، خۆی بڵێ: (**الحمد لله**) ئەویش بڵێ: (**یرحمك الله**)، هەرچەندە هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەوانە هەڵاوێردراون، لە قسە کردن لەگەڵ مرۆڤاندا، چونکە کە سڵاوی لێکرا، پێویستە وەڵام بداتەوە، هەروەها کە کەسێك لە پەنای پژمیی و ستایشی خوای کرد، دەبێ بڵێ: (**یرحمك الله**)، وەڵامی سڵاو هەندێك دەڵێن: فەڕزەو هەندێك دەڵێن: سوننەتە، هەڵبەتە لە حاڵەتی ئاسایی دا فەڕزە وەڵامی سڵاو بدرێتەوە، بەڵام لە حاڵەتی قورئان خوێندندا، سڵاو کردنەکە هەر سوننەت نیە، تاکو وەڵامەکەشی فەڕز بێ[1]!.

---

(١) ئەو سەرچاوەیەی من لێم وەرگرتوە، دەڵێ: بە فەرمانی شەرع پابەندەو دەبێ وەڵامی سڵاو بداتەوەو بابای پژمیو تەشمیت بکات، {واتە: بڵێ: (یرحمك الله)، ئەگەر ئەو گوتی: (الحمد لله)}، بەڵام من پێم وایە سڵاو کردنەکە لە بابای قورئانخوێن سوننەت نیە، تاکو وەڵامەکەی پێویست بێ.

با لەو بارەوە سەرنجی ئەم دوو دەقە بدەین:

یەکەمیـان: (**عَـنْ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ عَـوْنٍ قَـالَ: كَانَ مُحَمَّـدُ بْـنُ سِـيرِينَ، يَكْـرَهُ أَنْ يَقْـرَأَ الرجـلُ الْقُـرْآنَ إِلاَّ كَـمَا أُنْـزِلَ، يَكْـرَهُ أَنْ يَقْـرَأَهُ، ثُـمَّ يَتَكَلَّـمَ، ثُـمَّ يَعُـودَ فَيَقْـرَأَ**)، (**أثـر صحيح، أخرجـه أبـو عُبيـد في فضائـل القـرآن ص١٩٠، بإسـناد صحيـح**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عـەون ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ، دەڵـێ: ئیبنـو سـیرین پێـی ناخـۆش بـوو پیاوێـك، (هەڵبەتـە ئـەم حوکمـە بـۆ پیـاوو ئافـرەت یەکسـانە، بـەڵام سـیاقەکە وا هاتـوە)، قوڕئـان بخوێنـێ، مەگـەر بـەو شـێوەیەی دابەزێـنراوە، پێـی ناخـۆش بـوو قوڕئـان بخوێنـێ، دوایـی قسـە بـکات و، دوایـی بگەڕێتـەوەو قوڕئـان بخوێنێتـەوە، واتـە: نابـێ قسـەی دیکـە تێکـەڵ و نێواخنـی قوڕئـان خوێندنەکـە بکـرێ.

بـەڵام بێگومـان ئەگـەر قسـەیەك لـە میـانی قوڕئانخوێندنەکـەدا بکـرێ، کـە لـە بابەتەکـە نەچێتـە دەر، وەك پێشـتر لـە ئـەدەبی هەشـتەمدا باسـمان کـرد، وەك بـە پاکگرتنـی خـوا ﷻ و، ستایشـکردنی خـواو، پاڕانـەوە لـە خـواو، داواکـردنی بەزەیـی خـواو، پەنـا بـە خـوا بـردن لـە تووڕەیـی خـوا، یـان لـە سـزاو ئـازاری ڕۆژی دوایـی، یاخـود ئایەتێـك بەشـێوەی پرسـیار هاتـوەو پێویسـتیی بـە وەڵام هەیـە، وەك:

أ- ﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ۝٨ ﴾التين، دەگوترێ: (**بَلَى وَأَنَا على ذَلِكَ مَعَ الشَّاهِدِين**).

ب- ﴿ أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ ۝٤٠ ﴾القيامة، دەگوترێ: (**سُبْحَانَكَ وَبَلَى**)، یان (**سُبْحَانَكَ بَلَى وَأَنَا مَعَ الشَّاهِدِين**)، ئەوە بە خراپ دانانرێ، بەڵکو شتێکی باشەو یەکێکە لە ئەدەبەکانی باش قوڕئانخوێندن، چونکە ئەوە مایەی کارلێککردنە لەگەڵ قوڕئانداو، مانای باش لێ تێگەیشتنی قوڕئانە.

دەقـی دووەم: (**عَـنْ نَافِـعٍ قَـالَ كَانَ ابْـنُ عُمَـرَ رَضِيَ اللـه عَنْهُـمَا إِذَا قَـرَأَ الْقُـرْآنَ، لَـمْ يَتَكَلَّـمْ حَتَّـى يَفْـرُغَ مِنْـهُ، فَأَخَـذْتُ عَلَيْـهِ يَوْمـاً، فَقَـرَأَ سُـورَةَ الْبَقَـرَةِ حَتَّـى انْتَهـى إِلَى مَـكَانٍ، قَـالَ تَـدْرِي فِيـمَا أُنْزِلَـتْ؟ قُلْـتُ: لَا، قَـالَ: أُنْزِلَـتْ فِي كَـذَا وَكَـذَا ثُـمَّ مَـضَى**)، (**أخرجـه البخـاري: ٤٢٥٣، والبيهقـي في شـعب الإيمـان: ٢١٣٣**).

نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، کە قورئانی دەخوێند قسەی نەدەکرد تاکو لێدەبۆوەو تەواوی دەکرد، ڕۆژێك ئەوەم لێ بەدی کرد، سووڕەتی (البقرة)ی خوێند، تاکو گەیشتە شوێنێك، دوایی ئاوڕی لێدامەوەو گوتی: دەزانی لە بارەی چییەوە هاتۆتە خوار ئەو ئایەتە؟ گوتم: نەخێر، گوتی: لە بارەی فڵان شت و فڵان شتەوە هاتە خوار، {ئەوەی گوت وەك ڕوونکردنەوە بۆ من}، دوایی ڕۆیشت و لەسەر قورئانخوێندنەکە بەردەوام بوو.

ئنجا (**أَبُو عُبَيد الهَرَوي**) لە بارەی ئەو قسە کردنەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، گوتوویەتی: (**إِنَّمَا رَخَصَ ابْنُ عُمَر فِي هَذَا؛ لأنَ الَّذِي تَكَلَّمَ بِه، مِنْ تَأْوِيل القُرْآن وَسَبَبِه، وَلَوْ كَانَ الكَلَامُ مِنْ أَحَادِيْث النَّاسِ وَأَخْبَارِهِم، كَانَ عِنْدِي مَكْرُوْهَاً، أنْ تُقْطَعَ القِرَاءَةُ بِه**)[1]، واتە: ئەبوو عوبەیدی هەرەویی گوتوویەتی: بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ئەوەی وەك مۆڵەت وەرگرتوە لەو بارەوە، چونکە ئەوەی پێی دواوە هەر لە ماناکردنی قورئان و لە هۆی هاتنە خواری قورئانەوە، ئەگەر قسەیەکی دیکە بووایە لە قسەی خەڵك و هەواڵەکانی خەڵك، بە لای منەوە شتێکی ناپەسند بوو قورئانخوێندن بۆ ئەوە ببڕدرێ.

## بڕگەی دەیەم: کاتێك مرۆڤ قورئان دەخوێنێ، ئەگەر باویشکی هات، دەبێ ئەوەندەی دەتوانێ، باویشکەکەی بەرپەرچ بداتەوە:

لەو بارەشەوە ئەم دەقە دێنین:

{**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** رضي الله عنه، **عَنِ النَّبِيِّ** ﷺ **قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، فَحَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يُشَمِّتَهُ، وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ، فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِذَا قَالَ: هَا، ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ**}، (**أخرجه البخاري: ٣١١٥، ومسلم: ٢٢٩٤، واللفظ للبخاري**)، واتە: ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: بێگومان خوا پژمینی

---

(١) فضائل القرآن، ص١٩١.

خۆشـدەوێ و باویشـكی دەدزێ، (حـەزی لـە باویشـك نیـە)، ئنجـا هـەر كات یەكێـك لـە ئێـوە پژمیـی و سـتایشی خـوای كـرد، پێویسـتە لەسـەر هـەر مسـوڵمانێك كـە گوێبیسـتی دەبـێ، پێـی بڵـێ: (**يَرحَمُكَ الله**)، خـوا لێـت خـۆش بـێ، بـەڵام باویشـكدان لـە شـەیتانەوەیە، هـەر كات یەكێـك لەئێـوە باویشـكی هاتـێ، با ئەوەنـدی دەتوانـێ بیگێڕێتـەوە، چونكـە كاتێـك یەكێكتـان دەڵـێ: هـا، شـەیتان پێـی پێدەكەنـێ.

## بڕگەی یازدەیەم: ڕەچاوكردنی شوێنەكانی وەستان و دەستپێكردن:

یـەكی دیكـە لـە ئەدەبـەكانی چـاك قوڕئانخوێنـدن و جـوان قوڕئانخوێنـدن و بـە ڕێكیـی خوێنـدنی، كـە خـوا فەرمـانی پێكـردوە: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾، ئەوەیـە كـە ڕەچـاوی شـوێن و حوكمـەكانی وەسـتان و دەسـتپێكردن بـكات، لـە كاتی قوڕئـان خوێندنـدا، واتـە: دەبـێ وریـا بـێ: لـە كـوێ دەوەسـتێ و لـە كوێـش دەسـت پێدەكاتـەوە، بـا چەنـد وێنەیـەك بێنینـەوە لـەو بـارەوە، بـۆ شـوێنێك كـە دروسـت نیـە تێیـدا بوەسـتی:

أ- ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ﴾**الماعون**، وەستان لەوێ حەڕامە، چونكە خوا نەیفەرمووە: سزای سەخت بۆ نوێژكەران، بەڵكو فەرموویەتی: سزای سەخت بۆ نوێژكەرانێك كە لە نوێژەكانیان بێ ئاگان، ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾**الماعون**، بۆیە حەڕامە لەوێ بوەستی، با سەرە ئایەتیش بێ.

ب- هەروەها ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ ... ﴿٤٣﴾ ﴾**النساء**، حەڕامە لەسەر ﴿ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، بوەستی، چونكە خوای پەروەردگار نەیویستوە بفەرموێ: ئەی بڕوادارینە! توخنی نوێژێ مەكەون، بەڵكو فەرموویەتی: بڕوادارینە! بە سەرخۆشیی توخنی نوێژێ مەكەون.

مەیمـوونی كـوڕی میهـڕان ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ قسـەیەكی هەیـە، دەقەكـەی بـە عەرەبیـی دێنیـن: (**إنِّي لأقْشَعِرُ مِن قِرَاءَةِ أقْوَامٍ يَرَى أحَدُهُـمْ حَتْمَاً عَلَيْهِ أنْ لَا يَقْصُرَ عَنِ العَشْر، إنَّمَا كَانَتِ القُرَّاءُ تَقْرَأُ القَّصَصَ إنْ طَالَتْ أو قَصُرَت، يَقْرَأُ أحَدُهم اليَوْم:**

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ ﴾البقرة،: قَالَ ويَقُومُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، فَيَقْرأُ: ﴿ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ ... ﴿١٢﴾ ﴾البقرة)، (أخرجه: الداني، ص ١٣٥) واتە: من مچوڕکم پێدادێ لە قوڕئان خوێندنی کۆمەڵانێك، یەکێکیان پێی وایە کە پێویستە دەبێ دە (١٠) ئایەتان هەر بخوێنێ، ئنجا کە دە (١٠) ئایەتەکەی تەواو کردن، دەوەستێ، ئەویدیکە هەڵدەگرێ بۆ ڕکاتێکی دیکە!، بەڵام قوڕئانخوێنەکان عادەتیان وابوو (ئەوانەی سەرمەشقی ئێمەن)، بەسەرهاتێك، یاخود کۆمەڵە ئایەتێکیان دەخوێندن، درێژ بان یان کورت بان، هەتا دەگەیشتە کۆتایی مەبەستەکە، بەڵام یەکێکیان لەم ڕۆژگارەدا ئەوەندە دەخوێنێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ ﴾البقرة، ئەگەر پێیان بگوترێ: تێکدان لە زەوییدا مەکەن، دەڵێن: ئێمە تەنیا چاکسازییکارین، لەوێ دەوەستێ، لەبەر ئەوەی کۆتایی ئایەتی ژمارە (١١)یە، دوایی لە ڕکاتی دووەمدا دەخوێنێ: ﴿ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ ... ﴿١٢﴾ ﴾البقرة، ئاگاداربن! هەر ئەوانن تێکدەر، ئەمەش شتێکی نەگونجاوە، چونکە ئەوە تەواوکەری ئایەتەکەی پێشییە.

### بڕگەی دوازدەیەم: خۆڕازاندنەوە بە ئەدەب و ڕەوشتەکانی قوڕئان:

هەروەها پێویستە بابای قوڕئانخوێن خۆی بە ڕەوشت و ئەدەبەکانی قوڕئان بڕازێنێتەوە، چونکە بێگومان قوڕئان هەموو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەکانی تێدان، ئەوانەی مرۆڤ پێیان لە خوا نیزیك دەبێتەوە، چ لە ڕووی پەرستن و مامەڵەوە لەگەڵ خوادا ﷻ، چ لە ڕووی مامەڵەوە لەگەڵ خەڵکی خواداو، چۆنیەتیی هەڵسوکەوتی لەگەڵیاندا، بێگومان بابای قوڕئانخوێن لە خەڵکی دیکەی زیاتر لێی چاوەڕێ دەکرێ، واتە: بابای شارەزای قوڕئان، دەبێ ڕازاوەبێ بە ڕەوشت و ئەدەبە بەرزەکانی کە قوڕئان فەرمانیان پێدەکات، هەروەك لەم دەقەدا کە پێشتریش هێنامان، زۆر جوان و درەوشاوەیە:

{عَنْ سَعد بن هِشَام، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ! أَنْبِئِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَتِ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّ خُلُقِ

**رَسُولِ اللَّـهِ** ﷺ **كَانَ الْقُـرْآنَ**}، (**أخرجـه أحمـد: ٥٣، ومسـلم: ٧٤٦**)، کـە ئێمـە پێشـتر بەسەرهاتەکەیشـیمان باسـکردوە.

واتـە: سـەعدی کـوڕی هیشـام لـە دایکـمان عائیشـەی (خـوا لێـی ڕازی بێ) پرسـیوە ئـەی دایکی بـڕواداران! لـە بـارەی ڕەوشـتی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ هەواڵـم پـێ بـدە، دایکـمان عائیشـەش (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گوتوویـەتی: ئایـا قوڕئـان ناخوێنـی؟ واتـە: شـارەزای قوڕئـان نـی؟ گوتـم: بـا، گـوتی: ڕەوشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ قوڕئـان بـوو.

بـە دڵنیاییـش ئێمـە بـۆ شـارەزایی لـە ڕەوشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، وێـڕای ئەوەی تەماشـای قوڕئـان دەکەیـن، دەبـێ تەماشـای سـیرەو ژیاننامـەی پێغەمبـەری خـواش ﷺ بکەیـن، کـە هەرچـی قوڕئـان فەرموویـەتی، پێغەمبـەری خـوا ﷺ کردوویـەتی و لەخۆیـدا بەرجەسـتەی کـردوە.

## تەوەری دووەم: پێناسەو حوکم و گرنگیی و پلەکان و چۆنیەتیی قوڕئانخوێندن:

١- چاك قوڕئانخوێندن (**تجويد القُرآن**):

ئەم بڕگەیەش لە دوو بەندا دەخەینەڕوو:

**أ)-** پێناسەی تەجوید: (**التَّجوِيدُ: مَصدَرٌ مِن جَوَّدَ تَجوِيداً، وَالإِسمُ مِنهُ الجَودَةُ ضِدُّ الرَّدائَة، يُقالُ: جَوَّدَ فُلانٌ فِي كَذَا، إِذَا فَعَلَ ذَلِكَ جَيِّداً، فَهُوَ عِنْدَهُم عِبَارَةٌ عَنِ الإِتْيَانِ بِالقِرَاءَةِ مُجَوَّدَةَ الأَلْفَاظِ، بِرِيئَةً مِنَ الرَّدَائَةِ فِي النُّطْقِ، وَمَعنَاهُ انتِهاءُ الغايَةِ فِي التَّصحِيحِ وَبُلُوغُ النِّهايَةِ فِي التَّحسِينِ**)[١].

واتـە: تەجویـد چاوگـە لـە (**جَـوَّدَهُ تَجوِيـداً**) واتـە: چـاکی کـرد بـە چاککـردن، نـاوی ئـەو کـردارەش بریتیـە لـە (**جَـودَة**)، واتـە: باشـیی، دژی (**رَدائة**)یـە بـە مانـای خراپیـی، دەگوتـرێ: (**جَـوَّدَ فُـلانٌ فِي كَـذَا، إِذَا فَعَـلَ ذلِـكَ جَيِّـداً**)، ئەگـەر کەسـێك کارێـکی بـاشی کـرد، دەگوتـرێ: (**جَـوَّدَ فُـلانٌ فِي كَـذَا**)، فڵانکـەس لـە فـڵان بـوارەوە بـاشی کـرد، زانیـاری تەجویدیـش لـە لای شـارەزایان و پسـپۆڕانی قوڕئانخوێنـدن، بریتیـە لـەوەی

---

(١) (النَّشر فـي القِراءَات العَشر) ج١، ص٢١٠.

ئـەو قورئانخوێندنـە بـاش ئەنجام بـدرێ، بێـژەكانی بـە چاكیـی بگوترێـن و دوور بـن لـە خراپیـی لـە گـۆ كردنـداو، مەبەسـتیش لـە زانیـاری تەجویـد ئەوەیـە كـە قورئـان بەوپـەڕی ڕاسـت و دروسـتی بخوێـنرێ، بگەیەنرێتـە ئەوپـەڕی چـاك قورئانخوێنـدن.

هەر (**ابن الجزري**) لە سەرچاوەی ئاماژە پێكراودا[1]، دەڵێ:

**(وَهـيَ حِليَـةُ التِّـلاوَةِ وَزِينَـةُ القِرائَـةِ، وَهُـوَ إِعْطَـاءُ الحُـرُوفِ حُقُوقَهَـا، وَتَرتِيبُهـا مَراتِيبَهـا، وَرَدُّ الحَـرفِ إِلَى مَخرَجِـهِ وَأَصلِـهِ، وَإِلحاقُـهُ بِنَظِـيرِهِ، وَتَصحِيحُ لَفظِـهِ، وَتَلْطِيْـف النُّطـقِ عَـلَى حـالِ صِيغَتِـهِ، وَكَـمالِ هَيئَتِـهِ، مِـن غَـيرِ إِسرافٍ وَلا تَعسُّـفٍ وَلا إِفْـراطٍ وَلا تَكَلُّـف)**.

واتـە: زانیاریـی تەجویـد بریتیـە لـە جوانیـی و خشـڵی قورئانخوێنـدن و، ڕازاوەیـی قورئـان خوێنـدن، ئەویـش بریتیـە لـەوەی پیتـەكان مـافی خۆیـان پـێ بـدرێ و، بـە شـێوەی خۆیـان لـە پێگـەی خۆیانـدا ڕیـز بكرێـن و، هـەر پیتێـك كـە گـۆ دەكـرێ، بگێڕدرێتـەوە بـۆ بنچینەكـەی، لـە چۆنیەتیـی گـۆ كردنـداو، پەیوەسـتكردنی بـە هاوشـێوەكەیەوەو، بێژەكـەی بـە چاكیـی ڕاسـت بكـرێ و، بـە ڕێكیـی بگوتـرێ و، لەوپـەڕی حاڵـەتی تەواوییـدا، بەبـێ تێپەڕانـدن و زێدەڕۆیـی، هەروەهـا بەبـێ لـێ تێپەڕانـدن و سـنوور بەزێنیـی، هەروەهـا بەبـێ زۆر لـە خـۆ كـردن.

واتـە: پیتـەكان و وشـەكان چۆنـن، بـەو شـێوەیە، نـە كەمتەرخەمیـی لـە گوتنیانـدا بـكات و نەزێدەڕۆییـش بـكات، بـۆ وێنـە: پیتێـك گیـره (شَـدَّة)ی هەیـە، یەكێـك نابـێ شـەددەكە لـە بیـر بـكات، وەك: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ ﴿الفاتحة﴾، وشـەی (**رَبّ**) گیـره (**شَـدَّة**)ی هەیـە، ناگونجـێ بڵـێ: (**الحَمـدُ لِلّـهِ رَب العَالَمِين**)، بەڵكـو دەبـێ شـەددەكە گـۆ بـكات، بـەڵام نابـێ زێدەڕۆییـشی تێـدا بـكات و گیرەكـە بكاتـە دوو سـێ گیـره، بـۆ وێنـە: (**الحَمـدُ لِلّـهِ رَبِّّ العَالَمِين**)، ئـەوەش هـەر هەڵەیـە، بێگومانیـش زانیاریـی بـاش قورئانخوێنـدن (علـم التجویـد) زانایـانی ئیسـلام زۆر گرنگییـان پێـداوە.

---

(١) إِبنُ الجَزَرِي فـي (النَّشرِ فـي القِراءَاتِ العَشر) ج١، ص٢١٢.

چونکـە لـە بنچینـەدا زانیاریـی بـاش قورئانخوێنـدن، دەچێتـەوە نێـو خوێندنـەوەی قورئـان بـە ئیعرابـەوە، چونکـە وشـەی ئیعـراب لـە ئەسـڵدا بـە مانـای ڕوونکردنەوەیە، ئنجـا بێگومـان کاتێـك ڕسـتەیەك بـە گشـتیی و، وشـەکانی کـە پێکهاتەکاننـی، هەروەهـا ئـەو پیتانـەش کـە وشـەکانیان لـێ پێکدێـن، بـە ڕێکیـی خوێندرانـەوە، هـەم ڕسـتەکە بـە ڕێکیـی خوێندرایـەوە، هـەم وشـەکانی، هـەم پیتـەکانی، مانـای وایـە ئـەو ڕسـتەیە بـە ئیعرابـەوە گوتـراوە، واتـە: بـە ڕوونکردنـەوەوە.

**ب-** جۆرەکانی بەهەڵەداچوون لە قورئانخوێندن دا:

بە هەڵەداچوون لە قورئانخوێندندا، بە گشتیی دەگونجێ بۆ سێ جۆران دابەش بێ:

**یەك:** چاك گۆ نەکردنی پیتەکان: بۆیە زانیاریی تەجوید واتە: باش قورئانخوێندن بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە دانراوە کە پیتەکان چاك گۆ بکرێن و، بەو شێوەیە ببێژرێن کە لە زمانی عەرەبییدا هەن و ڕێزمانی عەرەبیی گوتوویەتی.

**دوو:** بواری دووەمی بە هەڵەدا چوون لە قورئانخوێندن دا، ئەوەیە کە وشەکان بە هەڵە گۆ بکرێن، زانایانیش زانیاریی (**صَرْف**)یان – یانی: زانیاریی گۆڕینی وشەکان لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك - بۆ ئەو مەبەستە داناوە، هەروەها زانیاریی (نحو)شیان داناوە، بۆ زانینی پێگەی وشەکە لە ڕستەدا، واتە: وشەکە لە زاتی خۆیدا، زانیاریی (صرف) لێی دەکۆڵێتەوەو، پێگەی وشەکەش لە نێو ڕستەدا، زانیاریی (نحو) کە ڕێزمانیشی پێ دەڵێن، لەوە دەکۆڵێتەوە.

**سێ:** بواری سێیەمی بەهەڵەداچوون لە قورئانخوێندندا، ئەوەیە کە ڕستەکە بەگشتیی، لە کوێ بوەستی و لە کوێ دەست پێ بکەی؟ بۆیە زانایان زانیارییەکی دیکەیان بۆ ئەوە داناوە پێی دەگوترێ: (**عِلمُ الوَقفِ وَالإبتِدَاء**)، زانیاریی وەستان و دەستپێك، کە جاری وا هەیە پیتەکانیش شوێنی دەرچوونیان چاك ڕەچاو کراوە، واتە: (**مخارج الحروف**)، هەروەها وشەکەش بە باشیی بێژراوەو شوێنی لە ڕستەکەشدا چاك ڕەچاو کراوە، بەڵام لە شوێنی خۆیدا وەستان ناکرێ، یاخود لە شوێنێکدا دەوەستێ، کە جێگای خۆی نیە.

**٢)-** حوکمی چاك قورئانخوێندن:

خـوا ﷻ فەرمـانی کـردوە کـە لـە قورئـان ورد بینـەوەو تێـوەی ڕامێنیـن و، لێـی تێبگەیـن، هەروەهـا پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ هـانی مسـوڵمانانی داوە کـە قورئـان زۆر بخوێنـن و، چـاك تێـوەی ڕامێنـن، ئنجـا بێگومـان چـاك قورئانخوێنـدن هـۆکارە بـۆ لـێ تێگەیشـتنی و، هـاوکارە بـۆ تێوەڕامـانی و پەنـد لێوەرگرتنـی، بـۆ وێنـە خـوا ﷻ لــە ســوورەتی (**الشُّـعَراء**)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾﴾**الشعراء**، واتە: بـە دڵنیایـی ئـەم قورئانـە دابەزێـنراوی پـەروەردگاری جیهانییانـە، گیـانی ئەمینـدار دایبەزانـدوە، بـۆ سـەر دڵـی تـۆ، تاکـو لـە ترسـێنەران و وریاکـەرەوان بـی (بـۆ هەمـوو خەڵـکی)، بـە زمانێـکی عەرەبیـی ڕۆشـن.

بـە دڵنیاییـش چـاك قورئانخوێنـدن (**تجویـد**) هـۆکاری ڕۆشـن دەرخسـتنی بێـژەکانی قورئانـە، چونکـە خـوا قورئـانی بـە زمانێـکی عەرەبیـی ڕۆشـن دابەزاندوەو، ڕۆشـنیی ئەو زمانـە عەرەبییـەش لـە کاتێکدایـە کـە پیتەکانـی و وشـەکانی و ڕسـتەکانی، هەروەهـا شـوێنی وەسـتان و دەسـتپێکردنی، بـەو شـێوەیە بـێ کـە لەگـەڵ مانـاو مەبەسـتەکانی قورئانـدا بێتـەوەو، ئـەوەش ئـەرکی تەجویـدەو، لێـرەش دوو دەق لـە زانایانـەوە دێنین، لـە بـارەی حوکمـی چـاك قورئانخوێندنـەوە:

**یەکەمیان:** (**قَالَ الإمام أَبو مُحَمَّدُ البَغَوي: إِنَّ النَّاسَ كَمَا أَنَّهُمْ مُتَعَبَّدُون بِاتِّبَاع أَحْكَامِ القُرآن وَحِفْظ حُدُودِهِ، فَهُمْ مُتَعَبَّدُونَ بِتِلَاوَتِهِ وَحِفْظِ حُرُوفِهِ، عَلَى سَنَنِ خَطِّ المُصْحَفِ الإِمَامِ الَّذِي اتَّفَقَتِ الصَّحَابَة عَلَيْه رَضِيَ اللهُ عَنْهُم، وَأَنْ لَا يُجَاوِزُوا فِيْمَا وَافَقَ الخَطَّ عَمَّا قَرَأَ بِهِ القُرَّاء المَعْرُوفُونَ، الَّذِيْن خَلَفُوُا الصَّحَابَة وَالتَّابِعِين، وَاتَّفَقَتِ الأُمَّة عَلَى اخْتِيَارِهم**)[1].

واتـە: پێشـەوا ئەبـوو موحەممـەدی بەغەویـی گوتوویـەتی: خەڵـك وەك چـۆن پابەنـد (مولـزەم) کـراون بـە پەرستشـەوە (پەرسـتنی خـوای پـەروەردگار)، بەهـۆی شـوێنکەوتنی حوکمـەکانی قورئانـەوەو، پاراسـتنی سـنوورەکانی، بەهەمـان شـێوەش

---

(١) تفسير البغوي: ج١، ص٣٧.

خواپەرست کراون بەوەی بیخوێننەوەو، پیتەکانی بپارێزن، لەسەر ئەو ڕێ و شوێنەی موصحەفی پێشەوا، (کە لەسەردەمی عوسماندا ﷺ)، بە یەکدەنگیی هاوەڵان بەو شێوەیە لە دوو توێی دوو بەرگدا کۆکرایەوەو هاوەڵان لەسەری یەکدەنگ بوون، هەروەها کەسانێك کە قورئان دەخوێنن لەسەریان پێویستکراوە، لەو شێوە نووسینە تێنەپەڕێنن کە قورئانخوێنە ناسراوەکان پێیان خوێندوە، کە جێی هاوەڵان و تابیعینیان گرتۆتەوەو، ئۆممەتی ئیسلام لەسەر هەڵبژاردنیان یەکدەنگ بووە، شایانی باسە: هەندێك لە زانایان بۆ پێویست بوونی چاك قورئانخوێندن، ئەو فەرمایشتەی خوایان بە بەڵگە هێناوەتەوە: ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾﴾ المزمل، واتە: بە ڕێك و پێکیی قورئان بخوێنە.

**دووەم:** (قَالَ أَبُو جَعْفر النَّحّاس: وَالقِرَاءَة بِالتَّرْتِيل وَالمُكْثِ وَاجِبَة بِنَص القُرْآنِ، وَالتَّرْتِيْلُ: التَّبْيِيْنُ، قَالَ فَمِنَ التَّبْيِيْنُ تَفْصِيْل الحُرُوف وَالوَقْفُ عَلَى مَا تَمَّ مَعْنَاهُ مِنْها، وَثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ حَثَّ أَنْ يُقْرَأَ القُرْآنُ كَمَا أنْزِل، كَمَا فِي حَدِيْث صَحِيْح فِي فَضْل عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيّ ﷺ سَمِعَهُ يَقْرَأُ فقَالَ: مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَقْرَأَ الْقُرْآنَ غَضًّا كَمَا أُنْزِلَ، فَلْيَقْرَأْهُ عَلَى حَرْفِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ)[1].

واتە: ئەبوو جەعفەری نەحماس (کە یەکێکە لە شارەزایان و ڕوونکەرەوانی قورئان) دەڵێ: خوێندنی قورئان بە ڕێك و پێکیی و بە شێنەیی (بەبێ پەلە کردن)، فەرزە بە دەقی قورئان [ئاماژە دەکات، بە دەقی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾﴾ الإسراء، واتە: قورئانێکە ڕوونمان کردۆتەوە تاکو بە شێنەیی بەسەر خەڵکیدا بخوێنیەوەو پلە پلە وردە وردە دامانبەزاندوە]، (**ترتيل**)یش بریتیە لە ڕوونکردنەوە، لە ڕوونکردنەوەی قورئانیشە کە پیتەکان لێك بپچڕێنرێن (هەر پیتە مافی خۆی پێ بدرێ)و، لەو شوێنەش وەستان بکرێ کە مانایەکەی تەواو ببێ، لە پێغەمبەریشەوە ﷺ چەسپاوە کە

---

(١) القطع والإئتناف للنحاس: ص٧٣، ٧٤.

فەرمانی کـردوە، قوڕئـان بـەو شـێوەیەی دابەزێـنراوە بخوێـنرێ، وەك لـەو فەرمـوودە صەحیحـەدا لـە بـارەی پایـە بەرزیـی عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوودەوە ﵁ هاتـوە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوێـی لێبـووە قوڕئـانی خوێنـدوەو فەرموویـەتی: {مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَقْرَأَ الْقُرْآنَ غَضًّا كَمَا أُنْزِلَ، فَلْيَقْرَأْهُ عَلَى حَرْفِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ} **(أخرجه أحمد: ٣٥، وابن ماجة ١٣٨، قلت: وإسناده جيد، وله طرق عدة)**، واتـە: هـەر کەسـێك حـەز دەکات قوڕئـان بخوێنـێ بـە تـەڕو تازەیـی وەك دابەزێـنراوە، بـا بەشـێوەی خوێنـدنی **(ابـنِ أُمِّ عَبْـد)** {ئەمـە کونیـەو نازنـاوی عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود بـووە}، بیخوێنـێ.

ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی قوڕئانخوێنـدن بـەو شـێوەیەی دابەزێـنراوە، فـەڕزە، ئـەو شـێوەیەش پێـی دابەزێـنراوە، ئەوەیـە کـە شـارەزایان و پسـپۆڕانی ئـەو بـوارە باسـیان کـردوە.

٣)- چۆنیەتیی زەبتکردنی چاك قوڕئانخوێندن:

هـەر لـە بـارەی چـاك قوڕئانخوێنـدن **(تجویـد)**ەوە پرسـیار دەکـرێ: ئایـا ئـەوە چـۆن زەبـت دەکـرێ؟ ئـەو سـەرچاوەیەی ئـەم کورتـە باسـەی لێـوە دێنیـن، چەنـد قسـەیەکی لـێ نەقـڵ دەکەیـن، کـە لـەو بـارەوە کـردووی:

(چـاك قوڕئانخوێنـدن بـە ڕەچـاو کـردنی بنەمایـەکانی کـە لـە لایـەن پێشـەوایانی قوڕئانخوێنـەوە، دانـراون و دەسـتەبەر دەبـێ، وێـڕای پشتبەسـتن بـە وەرگرتنـی چۆنیەتیـی قوڕئانخوێنـدن، لـە کەسـێك کـە شـارەزاو پسـپۆڕ بـێ لـە قوڕئانخوێنـەکانی کـە چـاك قوڕئـان دەخوێنـن، بەپێـی ئـەو بنەمایانـە کـە باسـکران و، دروسـت نیـە، مسـوڵمان کەمتەرخەمیـی بـکات لـەوەدا کـە ئەوەنـدەی لـە توانایـدا هەیـە، ئەگـەر ئـەوەی بـۆ نەگونجـا کـە لـە زاری بابایـەکی چـاك قوڕئانخوێنـەوە ڕاسـتەوخۆ لێـی وەربگـرێ، بەپێـی توانـا هـەوڵ بـدات گـوێ بگـرێ لـە قوڕئـان خوێنێـکی بـاش بگـرێ، بەهـۆی هـۆکارە ئامـڕازەکانی کـە ئێسـتا ڕەخسـاون، «مەبەسـتی تۆمارکـەر **(مُسجِّلة)** و ئـەو ئامێرانەیـە کـە بەکاردەهێنرێـن»، یاخـود بەهـۆی وەرگرتنـی لـەو کتێـب و نامیلکانـەوە کـە لـەو بـارەوە دانـراون).

ئێستاش با ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێنین، کە ئەگەر مرۆڤ نەیتوانی بە تەواوییش قورئانخوێندن لە خەڵکی پسپۆری خۆیەوە وەربگرێ، بەپێی توانا هەر لەسەری پێویستە هەوڵبدات: {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: **الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الكِرَامِ البَرَرَة، وَالَّذِي يَقْرَأُ القُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ، لَهُ أَجْرَانِ**} (**أخرجه البخاري: ٤٤٥٣، ومسلم: ٧٧٩٨**) واتە: بابای شارەزا لە قورئان (کە چاك دەزانێ بیخوێنێ و چاکی لێ تێدەگات)، لەگەڵ نوێنەرە بەڕێزە چاکەکارەکانە (فریشتەکان)، بەڵام کەسێك قورئان دەخوێنێ و زمانی تێیدا هەڵدەنگوێ (تەتەڵە دەکات) و لەسەریشی قورسە، دوو پاداشتی هەن (پاداشتی خوێندنەکەی و پاداشتی زەحمەت پێوە کێشانەکەشی).

کەواتە: ئەویش هەرچۆن بێ خاوەنی پاداشتەو، نابێ کەسێك لەبەر ئەوەی نازانێ چاك قورئان بخوێنێ، هەر نەیخوێنێ، چونکە ئەگەر هەر نەیخوێنێ، لەبەر ئەوەی هەڵەی تێدا دەکات، بێگومان ئەگەر هەڵەی تێدا نەکات و بە هەڵەوە نەیخوێنێ، فێری ڕاستەکەش نابێ، زانایانیش گوتوویانە: (**مَا لَا يُدْرَكُ كُلُّهُ لَا يُتْرَكُ بَعْضُهُ**)، ئەوەی مرۆڤ فریای هەمووشی ناکەوێ، هەندێکیشی واز لێ ناهێنرێ، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ...﴾ ﴿٢٨٦﴾ البقرة، خوا هیچ کەس ئەرکدار ناکات، مەگەر بەوەی لە توانایدا هەیە.

**٤)**- پلەکانی چاك قورئانخوێندن:

زانایان گوتوویانە قورئان بە چوار پلە دەخوێنرێ، بەڵام وەك نووسەری ئەو کتێبەش گوتوویەتی: هەر دەبنەوە سێ پلە:

پلەی یەکەم: کە باشترین پلەیەتی، پێی دەگوترێ: (**التَّحقِيق**) ئەویش بریتییە لەوەی هەر پیتە مافی خۆی پێ بدرێ، لە درێژ کردنەوەو دەرخستنی و، بەجێهێنانی جووڵەکانی: ژێرو بۆرو زەنەو سەرو، گرتنەکان (تشديدات)، هەروەها

دەنگ پێ لاراندنەوە (غُنَّة)كان و، پیتەكان لێك بپچڕێنرێن و، بەو شێوەیەی ئەو زانیارییە تایبەتە دەڵێ ئاوا گۆ بكرێن[1].

پلەی دووەم: پێی دەگوترێ: (الحَدْر): (وَهُوَ عِبارَةٌ عَن عَن إدراجِ القِراءَة وَسُرعَتِها وَتَخفِيفِهَا بِالقَصرِ والتَّسْكِيْنِ وَالإِخْتِلَاسِ وَالبَدَلِ وَالإِدغامِ الكَبِيرِ وَتَّخفِيفِ الهَمزِ وَنَحوِ ذَلِك)، (الحدر): بریتیە لەوە كە قورئانەكە بە مەیلەو خێرایی و بە سووكیی بخوێنرێ، لە ڕووی كورتكردنەو زەنەداركردن و تێكدا جۆشكردن و سووككردنی هەمزەو وێنەی ئەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ مافی خۆ بدرێ، بەس مەرج نیە مەددەكان بگەیەنرێنە ئەوپەڕیان، هەروەها حاڵەتەكانی دیكەی قورئان خوێندن، بەڵام هەر دەبێ لای كەمی مافی خۆیان پێ بدرێ.

پلەی سێیەم: پێی دەگوترێ: (التَّدوِير): (هُوَ مَرتَبَةُ التَّوَسُّطِ بَينَ التَّحقِيقِ وَالحَدْر)، ئەویش پلەیەكی میانجییە لە نێوان تەحقیق و حەدردا، (ابنُ الجَزَرِي)، گوتوویەتی: (وَهُوَ المُختارُ عِندَ أكثَرِ أهلِ الأَداء)، هەر ئەوەش بژاردەیە لەلای زۆربەی قورئانخوێنان (كە میانجیی بێ، نە وابێ مافی پیت و وشەكان بدرێ بە زیادەوە، نە واش بێ بەلای كەمیشدابێ، بەڵكو میانجیی).

پلەی چوارەم: دەڵێ: (التَّرتِيلُ: وَهُوَ القِراءَةُ المُبَيَّنَةُ المُفَسَّرَةُ المُستَوعِبَةُ لِأَحكامِ التِّلاوَةِ، وَهِيَ قِرَاءَةُ التَّدَبُّرِ الَّتِي نَزَلَ القُرءَانُ بِالأمرِ بِهَا)، (تَرتِيل): بریتیە لە خوێندنەوەی قورئان بە شێوەیەكی ڕوونكراوەو ئاشكراكراو، كە حوكمەكانی قورئانخوێندن هەموویان وەخۆ بگرێ، كە بریتیە لە قورئانخوێندن بەشێوەی تێوەڕامان، بەو شێوەیەی قورئان پێی دابەزیوەو فەرمانی پێ داوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ ﴾المزمل، دوایی: نووسەری كتێبەكە دەڵێ: (وَالَّذِي أَمِيلُ إِلَيهِ أَنَّ التَّحقِيقَ وَالتَّدوِيرَ جَمِيعاً مِن جُملَةِ التَّرتِيلِ)، واتە: ئەوەی بەلایدا دەچم ئەوەیە كە هەر كام لە تەحقیق و تەدویر هەر بریتین لە تەڕتیل،

---

(١) (النَّشر في القِرَاءَاتِ العَشر)ی (ابن الجزري) ج١، ص: ٢٠٥ .

واتـە: کـە خـوا دەفەرمـوێ: قورئـان بـە تەرتیـل بخوێنـە، چ بەشـێوەی تەحقیـق بـێ، چ بەشێوەی تەدویـر بـێ، کـە تەدویـر حاڵەتێـکی میانجییـە لـە نێـوان حـەدرو تەحقیقدا، هـەر دەبنـەوە بـە تەرتیـل.

٥-بڕگەی پێنجەم و کۆتایی: چۆنیەتیی خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ قورئان:

لەو بارەوەش بە هێنانەوەی دوو دەقان ئیکتیفا دەکەین:

یەکەمیـان: {**عَـنْ أُمُّ المُؤمنـين حَفْصَـةُ رَضِي اللـهُ عَنْهـا قَالَـتْ: مـا رَأَيْـتُ رَسـولَ اللـهِ ﷺ صَلَّى فِي سُبْحَتِهِ قَاعِـدًا، حتَّـى كَانَ قَبْـلَ وَفَاتِـهِ بعَـامٍ، فَـكَانَ يُصَـلِّي فِي سُبْحَتِهِ قَاعِـدًا، وَكَانَ يَقْـرَأُ بالسُّـورَةِ فيُرَتِّلُهَـا حَتَّـى تَكُـونَ أَطْـوَلَ مِـن أَطْـوَلَ منهـا**} (**أخرجـه مالـك: ٣٠٣، ومسـلم: ٧٣٠، والترمـذي: ٣٧٣، والنسـائي: ١٦٥٨**)، واتـە: دایـکی بـڕواداران حەفصـە کچـی عومـەری کـوڕی خەتتـاب خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ، گوتوویـەتی: پێغەمبـەری خـوام ﷺ نەدیـوە نوێـژی سـوننەتی بـە دانیشـتنەوە کردبـێ، هەتـا ساڵێك پێـش کۆچی دوایـی، ئـەو کاتـە نوێـژە سـوننەتەکەی بـە دانیشـتنەوە دەکـردو، سـوورەتێکی کـە دەخوێنـد بـە چاکیـی دەیخوێنـد، بـە شـێوەیەك کـە درێژتـر دەبـوو لـە سـوورەتێکی لـە خـۆی درێژتـر، واتـە: ئەگـەر کەسـێکی دیکـە سـوورەتێکی درێژتـر لـەو سـوورەتەی پێغەمبـەری خـوای ﷺ خوێندبایـە، ئـەو سـوورەتەی ئـەو دەیخوێنـد، لەبـەر ئـەوەی مـافی خـۆی چـاك پێـدەدا، لـە سـوورەتە لـە هـی خـۆی درێژترەکـە، دیارتـر دەبـوو.

دەقـی دووەم: {**عَـنْ أُمِّ المُؤْمِنِيْن أُمّ سَـلَمَة رَضِيَ اللـهُ عَنْهَـا: كَانَـت تَصِـفُ قِـرَاءَةَ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ، قِـرَاءَةً مُفَـسَّرَةً حَرْفَـاً حَرْفَـاً، وسُـئِلَ أنَـسٌ: كيـفَ كَانَـتْ قِـرَاءَةُ النَّبـيِّ ﷺ؟ فَقَـالَ: كَانَـتْ مَـدًّا، ثُـمَّ قَـرَأَ: «بِسْـمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـنِ الرَّحِيـمِ»، يَمُـدُّ بـبِسْمِ اللَّـهِ»، ويَمُـدُّ بـالرَّحْمَنِ»، ويَمُـدُّ بـالرَّحِيمِ»**} (**أخرجـه أحمـد: ١٢٢٩٨، والبخـاري في أفعـال العبـاد: ٤٧٥٨، وأبـو داود: ١٦٦٥، والنسـائي: ١٠١٤، وابـن ماجـه: ١٣٥٣**)، واتـە: ئوممـو سـەلەمە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، کـە وەسـفی قورئـان خوێنـدنی پێغەمبـەری ﷺ دەکـرد، دەیگـوت پێغەمبـەری خـوا ﷺ قورئانخوێندنەکـەی ڕوون بـوو، پیـت پیـت، ئەنـەسی کـوڕی مالیکیـش

پرسـیاری لێکـراوە دەربـارەی چۆنیەتیـی قورئانخوێنـدنی پێغەمبـەر ﷺ، گوتوویـەتی: (پێغەمبـەری خـوا ﷺ) کـە قورئـانی دەخوێنـد، دەنگـی پـێ درێـژ دەکـردەوە، (مـافی خۆیـانی بـە پیتـەکان دەدا)، دوایـی ئەنـەسی کـوڕی مالیـك ئـەوە ڕوون دەکاتـەوەو دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە قورئـانی دەخوێنـد بـۆ وێنـە: (**بِسـمِ اللـهِ الرَّحـمان الرَّحِيـم**)ی خوێنـدوە، (**بِسـمِ اللـهِ**)ی درێـژ دەکـردەوە، دوایـی (**الرَّحـمان**)ی درێـژ دەکـردەوە، دوایـی (**الرَّحِيـم**)ی درێـژ دەکـردەوە، واتـە: نـەك بەسـەر یەکـەوەو وشـەکان تێـك بپەسـتێ.

ئەمیش بوخاریی بە ژمارە (٤٥٥٩) هێناویەتی.

ئەمە کورتەیەك بوو لە ئەدەبەکانی قورئانخوێندن.

لە کۆتایی دا دوو سەرنج دەخەمە ڕوو:

سـەرنجی یەکـەم: بـە دڵنیایـی ئـەدەب و ڕێـزو ویقـاری بابـای قورئانخوێـن لـە کاتی قورئـان خوێندنەکەیـدا، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەنـدازەی ئیمانەکـەی، بۆیـە هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ لێیـان گێردراوەتـەوە گوتوویانـە: ئێمـە ئیمانمـان پـێ دەدرا، پێـش ئـەوەی لـە قورئـان شـارەزا بیـن و قورئـان بخوێنیـن[1]، بۆیـەش لێـرەوە ئامۆژگاریـی هەمـوو بـراو خوشـکانی مسـوڵمانم دەکـەم، کـە ئەگـەر دەتانـەوێ وەك پێویسـت ڕێـزو هەیبـەت و ویقـاری فەرمایشـتی خـوا، لـە دڵ و دەرونتانـدا هەبـێ و لێـی بەهرەمەنـد بـن و، چـاك لێـی تێبگـەن، هەوڵبـدەن: ئیمانەکەتـان مەحکەمتربـێ و، خـوا ناسـییەکەتان باشـتر بـێ و، خۆشەویسـتییتان بـۆ خـواو، پشـت بەسـتنتان بـە خـواو، سـام و هەیبەتتـان بەرانبـەر بـە خـواو، مـل کەچییتـان بـۆ خـوا ﷻ زیاتـر بـێ، چونکـە بێگومـان هەتـا ئیـمان مەحکەمـترو ڕۆچووتـر بـێ، هـەم تێگەیشـتنی مـرۆڤ

---

(١) {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَلا أَجِدُ قَلْبِي يَعْقِلُ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ قَلْبَكَ حُشِيَ الإِيمَانَ، وَإِنَّ الإِيمَانَ يُعْطَى الْعَبْدَ قَبْلَ الْقُرْآنِ} أخرجه أحمد: ٦٦٠٤.

بـۆ فەرمایشـتی خـواو، هـەم ڕێـزو هەیبـەت و حورمـەتی بـۆ فەرمایشـتی خـوا، لـە دڵ و عەقڵیـدا زیاتـر دەبـێ.

سـەرنجی دووەم: زانایـان وەك بنچینەیـەك دایاننـاوە: (**كُلُّ شَيءٍ جَاوَزَ حَدَّهُ انقَلَبَ ضِدَّهُ**)، ئـەم بنچینەیـەش لـە زۆربـەی حاڵەتانـدا ڕاسـتە، هـەر شـتێك لـە سـنووری خـۆی تێپـەڕی، پێچەوانـە دەبێتـەوە، بۆیـە پسـپۆڕو زانایـان لـە بـارەی چـاك قوڕئانخوێندنـەوەش گوتوویانـە: زێدەڕۆییكـردن لـە هـەق پێدانی پیتـەكان و وشـەكان و بڕگـەكانی قوڕئانخوێندنـدا، خراپـە، هـەروەك چـۆن كەمتەرخەمیـی خراپـە.

ئنجـا لێـرەدا ئامۆژگاریـی هـەر بـراو خوشـكێكی مسـوڵمان دەكـەم و دەڵێـم: هەتـا بۆتـان دەكـرێ چـاك قوڕئـان بخوێنـن، بـەڵام بزانـن كـە چـاك قوڕئانخوێنـدن، هەنگاوێكـە لـە هەنـگاوەكانی مامەڵـەی ڕاسـت و دروسـتكردن لەگـەڵ قوڕئانـدا، پێشـێ دەبـێ چـاكی بخوێنـی، بـەڵام چـاك خوێندنەكـەی بـۆ چـاك لـێ تێگەیشـتنیەتی و، چـاك لـێ تێگەیشـتنەكەشی بـۆ چـاك كار پێكردنیـەتی، ئەویـش بـۆ ئەوەیـە كـە ڕەزامەندیـی خـوای پـێ وەدەسـت بێنیـن، هـەم لـە دنیـادا خۆمـان بـەو قوڕئانـە چـاك و پـاك بكەیـن و هـەم دەوروبەرمـان و، سـەرەنجامیش لـە ڕۆژی دوایـی دا، پاداشـتی خـوای لەسـەر وەربگرینـەوە، كەواتـە: دەبـێ وریابیـن، زێدەڕۆیـی نەكەیـن و هەمـوو ژیـان و تەمەنمان خـەرج بكەیـن بـۆ چـاك قوڕئانخوێنـدن، ئـەدی كەنگـێ لێـی تێدەگـەی؟ كەنگـێ كاری پێدەكـەی؟ كەنگـێ كۆمەڵـگاو دەوروبـەری خـۆتی پـێ پـاك و چـاك دەكـەی؟ وەك لـە كتێبـی: (بـا لـە خزمـەت قوڕئاندابیـن)دا بـە تەفصیـڵ بـاسی ئـەوەم كـردوە، كەواتـە: بـا بەشـێك لـە تەمـەن و كات تەرخـان بكەیـن، چـاك قوڕئـان بخوێنیـن، بـەڵام بـا نەچین لە هەمـوو تەمەنمانـدا هـەر خەریـكی چـاك قوڕئانخوێنـدن بیـن، چونكـە ئەگەر بـە هەموو تەمەنـت خەریـكی چـاك قوڕئانخوێنـدن بـووی، مانـای وایـە بـەس خەریـكی بەشـێك و مافێـك لـە مافـەكانی قوڕئـان بـووی لەسـەرت، كـە بریتیـە لـەوەی چـاكی بخوێنـی، بـەڵام بێگومـان چـاك خوێندنەكـەی قوڕئـان، ئامـڕازە بـۆ چـاك لـێ تێگەیشـتنی و، چـاك لـێ تێگەیشـتنیشی هـۆكارە بـۆ چـاك كار پـێ كـردنی و جـێ بـە جێكـردنی.

### مەسەلەی سێیەم:

**دواندنی خوا ﷻ بۆ خەڵك، كە نێردراوێكی بۆ ناردوون بەسەریانەوە شایەدە، لە ڕۆژی دوایی دا، وەك چۆن نێردراوێكی نارده لای فیرعەون - كە مووسا بوو عَلَيْه السَّلام - بەڵام فیرعەون یاخیی بوو، بۆیە خواش بە توندیی سزای دا، ئنجا هۆشداریی پێدانیان بە بێڕوایانی كۆمەڵگای پێغەمبەری خوا ﷺ، كە ئەگەر بێبڕوا بن، چۆن خۆیان بۆ لە سزای ئەو ڕۆژە دەپارێزن كە لە حەژمەت و بیمناكیی ئەو ڕۆژە، سەری منداڵان سپی دەبێ، ئەوەش پەندو بیرخەرەوەیە، بۆ هەر كەس كە بیەوێ بەرەو پەروەردگاری ڕێ بگرێتە بەر:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ۚ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

خوا ﷻ ڕوو دەكاتە خەڵكی ڕۆژگاری پێغەمبەری كۆتایی ﷺ و لە پشت ئەوانیشەوە، هەموو كۆمەڵگایەكانی بەشەرو دەفەرمووێ:

١)- ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە نێردراوێكمان نارده لای ئێوە، بەسەرتانەوە شاهێدە، بەسەرتانەوە چاودێرو بەڵگەیە، ڕوونكەرەوانی قورئان هەندێكیان گوتوویانە: لێرەدا ڕووی دواندن لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، بەڵام هەندێكیان گوتوویانە: ڕووی دواندن لە كۆمەڵگای پێغەمبەرە ﷺ بە گشتیی بە بڕوادارو بێبڕواوە.

بەڵام پێم وایە هەرچەندە دەگونجێ بڵێین: لێرەدا ڕووی دواندن لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانەو، دەشگونجێ بڵێین: تەنیا لە كۆمەڵگای پێغەمبەری كۆتاییە

ﷺ، بەڵام دەشگونجێ بڵێین: ڕووی دواندن لە کۆی مرۆڤایەتییە، چ کۆمەڵگای ڕۆژگاری پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کە لە نێویاندا ژیاوە، چ کۆمەڵگایەکانی دیکە لە ڕۆژگاری خۆیدا، چ کۆمەڵگایەکانی دیکە، تاکو ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی بەردەوام بێ، ﴿شَٰهِدًا عَلَيۡكُمۡ﴾، واتە: شایەدو بەڵگەیە، چاودێرە بەسەرتانەوە، چاودێرو بەڵگەی ئەوە کە هەرچی خوا ویستوویەتی بە ئێوە بگات لە پەیامەکەی، پێی گەیاندوون.

٢)- ﴿كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولٗا﴾، وەك چۆن نێردراوێکمان نارده لای فیرعەون، ئەمە وێنە هێنانەوەیەکە بۆ بێبڕوایەکان، لەبەر ئەوەی بەسەرهاتی مووسا (**عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) لەگەڵ فیرعەوندا زۆر زانراوو باو بووە، بۆیە خواش ﷻ بە کورتیی ئاماژەی پێ کردوە، کە کاتی خۆی ئێمە ڕەوانەکراوێکمان نارده لای فیرعەون و، ئەی کۆمەڵگایەکەی ئێستاش! ئەوە نێردراوو ڕەوانەکراوێکمان - کە موحەممەدە ﷺ --- نارده لای ئێوەش، ئنجا ئەوەی فیرعەون کردی لەگەڵ نێردراوی خوادا، کە بریتی بوو لەسەر پێچپیکردنی و یاخیی بوونی، کە سەرەنجام تووشی سزای سەختی خوا بوو، ئێوە ئاوا مامەڵە مەکەن لەگەڵ نێردراوو ڕەوانەکراوی خوادا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولٗا﴾، وەك چۆن نێردراومان نارده لای فیرعەون، دیارە (**رَسُول**) لێرەدا بە نەناسراو (**نكرة**) هاتوەو (أل)ی ناساندنی لەسەر نیە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوە کە عیبرەت و پەندەکە لە ناردنی پێغەمبەرو ڕەوانکراودایە، نەك لە ناسرانی، هەر کەسێك لەلایەن خواوە ڕەوانە بکرێ، با زۆر ناسراویش نەبێ، مادام نوێنەرو نێردراوی خوایە، دەبێ بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ کە شایستەیە، لەگەڵ نوێنەرو نێردراوی خوادا بکرێ، کەواتە: ئێوە کە دەڵێن: موحەممەد ﷺ چۆن دەبێ خوا ﷻ بیکاتە ڕەوانەکراوی خۆی، لە حاڵێکدا خەڵکی دیکەی زلە زلەو ناسراو هەن؟! ئەو قسەیەتان پووچەو، هەر کەسێك خوا بیکاتە نێردراوی خۆی و پێغەمبەری خۆی، عیبرەت بەوەیە کێ نوێنەری خوایە، نەك خوا کێی کردۆتە نوێنەری خۆی، کێ نوێنەری خوایە، کێ ڕەوانەکراوی خوایە، هەر کەسێك خوا بە شایستەی ئەوەی بزانێ بیکاتە نوێنەرو نێردراوی خۆی، دەبێ بەو

شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، كە لەگەڵ ڕەوانەكراوی خوادا دەكرێ، وەك لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ... ﴿١٢٤﴾ ﴾الأنعام، واتە: خوا زاناترە پەیامی خۆی لە كوێدا دادەنێ، هەر كەسێك خوا پەیامی خۆی پێ سپاردو، كردی بە نوێنەری خۆی، بەڕەوانەكراوی خۆی، دیارە شایستەیە، چونكە خوا كاری نابەجێ ناكات، پاكیی بۆ خوا.

٣)- ﴿ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ ﴾، فیرعەون سەرپێچیی لە نێرراوو پێغەمبەرەكە كرد، لێرەدا ئەلیف و لامی سەر ﴿ ٱلرَّسُولَ ﴾، بۆ ناساندنە، بەڵام ناساندنی عەهدیی، واتە: فیرعەون سەرپێچیی لە پێغەمبەرەكە كرد، وەك زۆر جار گوتوومە: (أل)ی (عهد) لە بەرانبەری (كە)ی كوردیی دایە، (پێغەمبەرەكە)، ﴿ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ ﴾.

٤)- ﴿ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴾، ئێمەش گرتمان بە گرتنێكی توند و سەخت.

(**وَالْوَبِيلُ: فَعِيلٌ صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ مِنْ وَبُلَ الْمَكَانُ، إِذَا وَخِمَ هَوَاؤُهُ أَوْ الْمَرْعَى كَلَوءُهُ**)، وشەی (**وَبِيل**) سیفەتی چوێنراوە بە كردارەوەو لە (**وَبُلَ**)ەوە هاتوە، (**وَبُلَ الْمَكَانُ**) واتە: شوێنەكە دەردەدار بوو، یان ئاوو هەوایەكەی تێكچوو، یاخود (**وَبُلَ المَرعَى**) واتە: لەوەڕگایەكە تێكچوو، بە جۆرێك كە هەر ئاژەڵێك لێی بخوات، سەرەنجامی باش نابێ و پێی ناتەندروست دەبێ.

كەواتە: لە ئەصڵدا (**وَبِيل**) لە (**وَبُلَ**)ەوە هاتوە، هەروەك (**وَابِل**)یش بە بارانی دڵۆپە قورس دەگوترێ، ئەویش هەر لەبەر قورسیی و سەختیی، بەكورتیی خوا دەفەرموێ: فیرعەون كە سەرپێچیی لە پێغەمبەرەكە كرد (پێغەمبەرەكەش مووسا (**عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) بوو، هاڕوونی براشی لەگەڵیدا بووە، وەزیرو هاوكاری بوو)، ئێمە بە گرتنێكی توندو سەخت گرتمان و سزاماندا، كەواتە: ئێوەش پەند لە فیرعەون وەربگرن، سەرپێچیی لە پێغەمبەرو ڕەوانەكراوی خواوە مەكەن، كە موحەممەدە ﷺ.

ئنجا دوای ئەوەی سەرنجی ڕاكێشان بۆ مێژوو بۆ بەسەرهاتی مووسا (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام)و، ڕەوانەكرانی بۆ لای فیرعەون و، سەرپێچییكردنی لە مووساو، سزادرانی فیرعەون و گەلەكەی لە لایەن خوای دادگەرەوە، ئەمجارە سەرنجیان ڕادەكێشێ بۆ ڕۆژی دوایی و دەفەرمویٚ:

٥)- ﴿ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَانَ شِيبًا ﴾، ئایا ئێوە ئەگەر بێبڕوا بوون (ئەی خەڵكینە!) چۆن لە (سزای) ڕۆژێك خۆتان دەپارێزن كە منداڵان پیر دەكات، سەری منداڵان سپیی دەكات؟.

(وِلدَان) كۆی (وَلَد)و كۆی (مَولُود)ە، واتە: منداڵان، ڕۆڵەكان، (شیب)یش كۆی (أَشيَب)ە، واتە: مرۆڤی سەر سپیی، یان پیر، (الشَيبُ: كِنايَةٌ عَن هَوْلِ يَومِ القِيامَةِ)، (شِيْب) واتە: پیریی، كینایەیە بۆ سامناكیی ڕۆژی دوایی دا، لێرەدا كە دەفەرمویٚ: ﴿ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا ﴾، پرسیار كردنەكە بۆ دەستەوسان كردن و سەرزەنشتكردن (للتعجيز والتوبيخ)ەو، وشەی ﴿ يَوْمًا ﴾، دەبێتە بەركار (مَفْعُول بِه) بۆ ﴿ تَتَّقُونَ ﴾، (كَيف تَتَّقُونَ يَوماً)، چۆن خۆتان لە ڕۆژێك دەپارێزن؟ دیارە خۆ پاراستن لە ڕۆژەكەش، خۆ پاراستنە لەو شتانەی لەو ڕۆژەدا ڕوو دەدەن، واتە: (كَيف تَتَّقُونَ عقاب وعَذَابَ يَومٍ)، چۆن خۆتان لە سزاو ئازاری ڕۆژێك دەپارێزن؟ كە ئەو ڕۆژە چۆنە؟ ﴿ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَانَ شِيبًا ﴾، منداڵان سەر سپی دەكات.

٦)- ﴿ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ﴾، لەو ڕۆژەدا (یان بە هۆی ئەو ڕۆژەوە) ئاسمان شەق و پەق دەبێ، (الإنفِطارُ: الإنشِقاقُ)، شەق و پەق بوون، لەت و پەت بوون، لێرەدا﴿ بِهِۦ ﴾، أ-یان بە مانای (فِيهِ)ە، واتە: لەو ڕۆژەدا ئاسمان، گەردوون شەق و پەق دەبێ، یاخود ﴿ بِهِۦ ﴾، (ب) بۆ هۆكارە، واتە: بە هۆی ئەو ڕۆژەوە ئاسمان شەق و پەق و لەت و پەت دەبێ، ج-یاخود (ب) بە مانای (ل)ە، (أَي مُنفَطِرٌ لَهُ)، واتە: لە ئەنجامی ئەو ڕۆژەدا، ئاسمان شەق و پەق دەبێ، وشەی (سماء) هەرچەندە مێینەی مەجازیی (المؤنث المجازي)یە، بەڵام فەرموویەتی: ﴿ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ﴾ و نەیفەرمووە: (مُنفَطِرَةٌ بِهِ)، چونكە:

**أ-** وشەی ئاسمان مێینەی مەجازییەو، مێینەی مەجازییش جاری وا هەیە دەگونجێ ڕەچاو نەکرێ، بە پێچەوانەی مێینەی ڕاستەقینەوە.

**ب-** بەڵام هەندێك لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: (**سماء**) هەم بە نێرینە (**مذكّر**) دێ و هەم بە مێینە (**مؤنث**)ش.

**ج-** یاخود لەبەر ئەوەی وشەی (**سَماء**) مانا کراوە بە سەربان (سقف) و سەقفیش نێرینەی مەجازییە.

٧)- ﴿كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا﴾، بەڵێنی خواش ئەنجام دراوە، (**وَعدُ اللهِ بِمَجيِئ الحِساب كَائِنٌ لا مُحالَةَ، أَو وَعدُ اللهِ بِنَصر اللهِ لِلمُسلِمينَ عَلَى الكُفَّارِ، مَنَفَّذٌ**)، بەڵێنی خوا بە هاتنی سزاو پاداشت هیچ بواری تێدانیە، دێ، یاخود: بەڵێنی خوا بە سەرخستنی مسوڵمانان بەسەر نامسوڵماناندا، شتێکی مسۆگەرە.

٨)- ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ﴾، بە دڵنیایی ئەمە (ئەم سوورەتە)، کۆی ئەم ئایەتانە بیرخەرەوەو ئامۆژگارییە.

٩)- ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾، ئنجا کەسێك بیەوێ بەرەو پەروەردگاری، ڕێی گرتە بەر، هەر کەس ڕێ بگرێتە بەر بەرەو پەروەردگاری لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتانەدا، ئەوە ویست و خواستی خۆیەتی، هەر کەسێك بیەوێ ڕێ لەبەردەمیدا ئاچووغ و تەختەو، دەتوانێ ڕێ بەرەو پەروەردگاری بگرێتە بەرو، بەندایەتییەکی ڕاست و دروست بۆ خوا بکات، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایی دا سەرفراز بێ.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

هەواڵدانی خوا ﷻ کە ئاگاداری شەو بێداریی پێغەمبەرەکەی ﷺ و کۆمەڵێك لە هاوەڵانیەتی (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە: دوو لەسەر سێ و، نیوەو، سێیەك (٣/٢ و ٢/١ و ٣/١)ی شەو هەڵدەستنەوەو، دەشزانێ کە بە وردیی بۆیان حیساب ناکرێ، هەروەها خوا دەشزانێ کە لەمەودوا نەخۆشیی و بازرگانیی و جەنگیش دێنە پێشێ، بۆیە بۆی ئاسان و سووك کردوون، کە ئەوەندەی بۆیان دەکرێ لە قورئان، لە شەو نوێژدا بیخوێنن، بەڵام لە هەموو حاڵاندا بە پێنج نوێژەکان و بە زەکاتدان و سامان بەخشینەوە پابەندبن و، با دڵنیاش بن ئەوەی پێشی دەخەن چاکترە بۆیان، لەلای خواو، با داوای لێبوردنیش لە خوا بکەن، بۆ هەڵەو پەڵەکانیان:

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿٢٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە حەڤدە بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت دەزانێ تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ!) کەمتر لە دوو سێیەکی شەوو، نیوەی شەو و، سێیەکی شەو هەڵدەستیەوە، واتە: هەڵدەستیەوە بۆ شەونوێژ، ئەمە ڕوونکردنەوەی فەرمایشتی خوایە کە لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا

﴿٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ﴾، کە لەوێ بە تەعبیرێك هێناویەتی و، لێرەش بە تەعبیرێکی دیکە هێناویەتی، هی ئێرە دەتوانین بڵێین: ڕوونکردنەوەی زیاتری تێدایە، خوا دەفەرموێ: پەروەردگارت دەزانێ کە تۆ کەمتر لە دوو سێیەکی شەو هەڵدەستیەوەو، نیوەشی و، یەك لەسەر سێشی، واتە: جاری وایە دوو لەسەر سێی، یان کەمتری و، جاری وا هەیە نیوەی و، جاری واش هەیە یەك لەسەر سێی، چونکە ئەو کاتە وەك ئێستا ئەو ئامڕازانە نەبوون کە بە وردیی کاتیان پێ کۆنترۆڵ دەکرێ.

٢)- ﴿وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ﴾، کۆمەڵێکیش لەوانەی لەگەڵتدان، یانی: هاوەڵانیش بە گشتیی (خوا لێیان ڕازی بێ)، نەیانتوانیوە بەو شێوەیە شەونوێژ بکەن، کە دوو لەسەر سێی شەو، یان کەمترو، نیوەی، یاخود سێیەکی، بەڵام دیارە کۆمەڵێکیان لە پیاوان و ئافرەتان پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچی کردوە، موو بە موو لە خزمەتیدا بوون و شوێنی کەوتوون.

ئـەم سـێ وشـەیە: ﴿ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ﴾، بـەو جـۆرەش خوێندراونـەوە: **(أَدنَى مِـن ثُلُثَـي اللَّيْـلِ وَنِصفِـهِ وَثُلُثِـهِ)** و **(الطَّبَري)** دەڵـێ: **(قِراءَتـانِ مَعرُوفَتـانِ صَحِيحَتـا المَعنَـى)**، ئنجـا ئەگـەر ئـاوا بخوێندرێتـەوە: ﴿تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ﴾، واتـە: لـە دوو لەسـەر سـێی شـەو کەمـترو، نیـوەی و، سـێیەکی.

بـەڵام ئەگـەر ئـاوا بخوێندرێتـەوە: **(أَدنَى مِـنْ ثُلُثَـي اللَّيْـلِ وَنِصفِـهِ وَثُلُثِـهِ)**، واتـە: کەمـتر لـە دوو لەسـەر سـێی شـەو و، کەمـتر لـە نیـوەی و، کەمـتر لـە یـەك لەسـەر سـێی، چونکـە ئـەو کاتـە مانـای وایـە: **(نِصفِـهِ وَثُلُثِـهِ)**، بادەدرێنـەوە سـەر: ﴿ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ﴾ و ئـەو کاتـە ﴿مِن﴾، بەسەروانیشـدا دێتـەوە، واتـە: کەمـتر لـە نیـوەی شـەو و، کەمـتر لـە یـەك لەسـەر سـێی شـەو.

٣)- ﴿وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ﴾، خواش ئەندازەگیریی شەو و ڕۆژان دەکات، واتە: **(يَعْلَمُ مَقادِيرَ اللَّيْلِ وَالنَّهارِ عَلَى حَقائِقِهَا، وَأَنتُم تَعلَمُونَ بَالتَّحَرِّي وَالإِجتِهاد)**، خوا ئەندازەی شەو و ڕۆژان وەك چییەتیان دەزانێ، بەڵام ئێوە بەهۆی پشکنین و هەوڵدان و تێکۆشان (بەهۆی نیشانەکانی ئاسمانەوە ئەوە دەزانن).

٤)- ﴿عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ﴾، خوا زانی شەو بێدارییتان بۆ کۆنترۆڵ ناکرێ، لە نێوان ئەو سێ کاتانەدا، حەسەنی بەصڕایی کە (الطَّبَري) بە ژمارە (٣٥٣٩٣) لێی خواستۆتەوە، گوتوویەتی: (عَلِمَ أَن لَن تُطِيقُوهُ)، خوا زانی لە تواناتاندا نیە، کە سەرژمێرو ئەندازەگیریی ئەو کاتانە بکەن، کە بۆ شەونوێژ تێیان دا بێدار دەبنەوەو هەڵدەستنەوە.

٥)- ﴿فَتَابَ عَلَيۡكُمۡ﴾، ئنجا (خوا) گەڕایەوە سەرتان، (عادَ عَلَيكُم بِالعَفوِ)، خوا گەڕایەوە سەرتان بە لێبوردن، خوا گەڕایەوە سەرتان لە قورسکردنەوە بۆ سووککردن و، لە زەحمەتەوە بۆ ئاسانیی.

٦)- ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ﴾، ئێستا ئەوەی بۆتان ئاسانە لە قوڕئان بیخوێنن.

ئنجا ئایا ئەمە مەبەست پێی خودی قوڕئانخوێندنەکەیە، یاخود مەبەست پێی شەو نوێژەکەیە، کە قوڕئانی تێدا دەخوێنرێ؟ هەردووکیان دەگونجێن.

لێرەدا خوا ﷻ قوڕئانخوێندنی بە نوێژ داناوەو، لە سووڕەتی (الإسراء)یش نوێژی بەیانیی بە قوڕئانخوێندن داناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ٧٨﴾الإسراء، کە مەبەست پێی نوێژی بەیانییە، واتە: ئەو نوێژی بەیانییەی قوڕئانی تێدا دەخوێنرێ، لەبەر ئەوەی پایەی هەرە گەورەی نوێژ، بریتیە لە قوڕئان تێدا خوێندنی، ئەوەندی بۆتان ئاسانە لە قوڕئان بیخوێنن، واتە: لە شەونوێژدا، زانایان هەندێکیان گوتوویانە: (نُسِخَ التَّقْدِيرُ بِمِقْدَارٍ، وَبَقِيَ أَصْلُ الْوُجُوبِ)، ئەوە کە ئەندازەگیریی بکرێ (بە دوو لەسەر سێ، یان بە نیوە، یان بە یەك لەسەر سێ)، لابرا، بەڵام ئەصڵی شەوبێدارییەکە کە پێویستە، هەر مایەوە، ئەوەش جۆرێکە لە سووککردن و دەستکارییکردن نەك نەسخ بە واتا باوەکەی، بەڵکو شتێك کە بە موتڵەقیی باسکراوە، ئێستا بەنددار (تَقِييدٌ) کراوە، کە ئەوەش هەندێك لە زانایان زاراوەی وشەی نەسخیان بۆ بەکارهێناوە، بەڵام لە ڕاستییدا وشەی نەسخ بەپێی واتای باوی کە ئێستا بەکاردەهێنرێ، ئەوە ناگرێتەوە،

چونكـە حوكمەكـە هـەر لەجێـی خۆیـەتی، بـەڵام لەجیـاتی ئـەوەی سـێ ئەگەریـان بخرێنـە بـەر دەم، دوو لەسـەر سـێی شـەو، و نیـوەی و، یـەك لەسـەر سـێی، ئـەو سـێ ئەنـدازەو، ئـەو سـێ سـنوورەیان بـۆ لابـراون، لەبـەر ئـەوەی خـوا زانیویـەتی بۆیـان ناكـرێ، هەڵبەتـە پێشـتریش هـەر زانیویـەتی كـە لەسـەری پێویسـت كـردوون، بـەڵام پێشـتر پێویسـت بـووە زۆر زیاتـر خۆیـان مانـدوو بكـەن، بـەڵام دوایـی خـوا ﷻ لەسـەری سـووك كـردوون، هـەم لەبـەر ئـەوەی لـە توانایـان دا نابـێ، هـەم لەبـەر سـێ پاسـاوی دیكـەش، كـە دوایـی باسـیان دەكات.

٧)- ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ﴾، خوا زانی كە لەنێو ئێوەدا كەسانی نەخۆش دەبن.

٨)- ﴿وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ﴾، هەروەها كەسانێكی دیكەش پێ بە زەویدا دەكوتن، (سەفەر دەكەن و دێن و دەچن بە زەویدا) لە بەخششی خوا دەخوازن.

ئـەوەی بینیومـەو سـەرەنجمداوە لـە هەمـوو تەفسـیرەكاندا دەڵێن: لێرەدا مەبەسـت پێـی مامەڵـەو بازرگانییـە، بـەڵام پێـم وایـە: لـەم سیاقەدا بـە زەوییـدا ڕۆیشـتن و داوا كـردن لـە بەخشـشی خـوا تایبـەت نیـە بـە بازرگانیـی و مامەڵـەوە، بەڵكـو:

أ- ئاژەڵداریی دەگرێتەوە، شوان و گاوان ئاژەڵەكانیان و، وشترەوان وشترەكانیان دەبەنە دەشت و كێوو، پێ بە زەوییدا دەكوتن و لە بەخششی خواش داوا دەكەن، بەهۆی بەخێو كردنی ئەو ئاژەڵانەوە كە خوا بژێویان پێ بدات.

ب- هەروەها كەسێك كە بۆ كشت و كاڵ دەردەچێ لە ماڵ، كشت و كاڵ بكات، كشت و كاڵەكەش چ دەغڵ و دان و دانەوێڵەیە، چ باخ و ڕەزە، چ تەڕەكارە، هەرچی هەیە، هەمووی دەگرێتەوە.

ج- دیسان هەر جۆرە بە زەوییدا ڕۆیشتنێكی دیكەش، وەك دەرهێنانی كانزایەكان و، دار هێنان و، هەر دەرچوونێكی دیكە، هەمووی دەگرێتەوە.

٩)- ﴿ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، (هەروەها خوا زانی کە) کۆمەڵێکی دیکەشتان لە پێناوی خوادا دەجەنگن.

واتە: خوا زانیی لەمەودوا سێ حاڵەتتان بۆ دێنە پێش:

**یەکەم:** هەندێکتان نەخۆش دەبن، بابای نەخۆش فەڕزەکانیشی بە زەحمەت بۆ دەکرێن، چ جای شەونوێژی بۆ بکرێ.

**دووەم:** هەندێکی دیکەتان دەردەچن و بە زەوییدا دەڕۆن لە بەخششی خوا دەخوازن، کارو کاسبیی دەکەن، ئنجا بازرگانییە، کشت و کاڵە، ئاژەڵدارییە، هەرچی هەیە.

**سێیەم:** هەندێکی دیکەشتان لە پێناوی خوادا دەجەنگن، جەنگکردن لە پێناوی خواشدا جاری وایە پێویست دەکات بە شەوو ڕۆژ سەرقاڵ بی و، لە بەرانبەر دوژمندا سەنگەر بگری و، لە بۆسەدابی و، ناتپەڕژێتە سەر ئەوەی فەڕزەکانیش بەو شێوەیەی لە حاڵەتی ئاسایی دا دەکرێن، ئەنجام بدەی، چ جای شەو نوێژ، بۆیە خوا لەسەری سووککردن، (الطَّبَرِي) دەڵێ: (**وَهَذَا تَخْفِيفٌ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَنْ عِبَادِهِ، فَرْضَهُ الَّذِي كَانَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ**)، واتە: ئەمە سووککردنە لە خواوە لەسەر بەندەکانی، ئەو پێویستەی لەسەری پێویست کردبوون، لەسەری سووک کردن.

١١)- ﴿ فَٱقْرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ﴾، کەواتە: ئەوەی ئاسانە لێی بخوێنن، ئەم (ف)یە: (**فُرِّعَ عَلَى الحالاتِ الثَّلاث**)، بۆ لق لێکردنەوەیە لەسەر سێ حاڵەتی پێشێ، واتە: خوا زانیی: کە نەخۆشتان لە نێودا دەبن و، کەسانێك بە زەویدا دەڕۆن و لە بەخششی خوا داوا دەکەن و، کەسانێك لە پێناوی خوادا دەجەنگن، بۆیە: ﴿ فَٱقْرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ﴾، لێی بخوێنن ئەوەندەی بۆتان ئاسان دەبێ، کەواتە: نوێژی شەو هەر بەردەوامە، بەڵام سووککراوە بەپێی حاڵ و مەقام، لە حاڵەتی ئاسایی دا بە شێوەی ئاسایی دەکرێ و، لە حاڵەتی نائاسایی دا، ئەوەندەی گونجاوو ئاسانە، با ئەنجام بدرێ.

١٢)- ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، نوێژە (فەڕزە)کەش، بەرپا بکەن، ﴿ٱلصَّلَوٰةَ﴾، (أل)ی ناساندنی لەسەرە، واتە: (أَقِيمُوا الصَّلاةَ المَفْرُوضَةَ)، نوێژی پێویست ئەنجام بدەن، واتە: پێنج نوێژە فەڕزەکان.

١٣)- ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، هەروەها زەکاتە (زانراوە)کەش بدەن، (أل)ی ﴿ٱلزَّكَوٰةَ﴾یش، (أل)ی ناساندنەو بۆ (عهد)ە، واتە: زەکاتەکە، زەکاتی زانراوی شەرعیی بدەن.

١٤)- ﴿وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾، هەروەها قەرزێکی باش بە خوا بدەن، واتە: ماڵ و سامانی جگە لە ماڵ بەخشینی فەڕزیش کە زەکاتە، هەر ببەخشن.

١٥)- ﴿وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا﴾، هەر چاکەیەکیش بۆ خۆتان پێش بخەن لە لای خوا دەیبیننەوە، ئەو چاکترەو پاداشتی مەزنترە.

وشەی ﴿مِّنْ خَيْرٍ﴾، (خَير) لێرەدا بە پلەی یەکەم مانای چاکەو ماڵ و سامان بەخشینە، بەڵام هەر چاکەیەکی دیکەش دەگرێتەوە، بەڵام ئەوی دیکە: ﴿هُوَ خَيْرًا﴾، ﴿خَيْرًا﴾، لێرەدا ناوی هەڵبژاردن (إِسم تَفضِيل)ە، وەك چۆن ﴿وَأَعْظَمَ أَجْرًا﴾، بۆ هەڵبژاردنە، واتە: ئەوەی پێش خۆتانی دەخەن لە دنیاداو ئەنجامی دەدەن و، ئەوەی بەڕێی دەکەن بۆ قیامەت لە چاکە، ماڵ بەخشینە هەرچی هەیە ﴿تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ﴾، لەلای خوا دەیبیننەوە، ﴿هُوَ خَيْرًا﴾، ئەوە باشترە لەوەی لە دنیادا بەهرەی لێ وەردەگرن، ﴿وَأَعْظَمَ أَجْرًا﴾، پاداشتیشی مەزنترە، لێرەدا مەبەست پێی بەراوردکردن نیە لەگەڵ جگە لە خۆیدا، بەڵکو یانی: بە ڕەهایی ئەوە باشترەو، پاداشتێکی مەزنی هەیە.

١٦)- ﴿وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ﴾، داوای لێبوردنیش لە خوا بکەن، (بۆ کەم و کوڕییەکانتان).

١٧)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

## كورتە باسێك لە حەوت سەرنج دا

بەڕێـــــزان!

كۆتایی ئەو دەرسەشمان: تەفسیر كردن و لێكدانەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە، بە كورتە باسێك دێنین، لە حەوت سەرنجی خێرادا:

**سەرنجی یەكەم:**

لێرەدا كە خوا فەرمان دەكات بە شەونوێژ، فەرمانەكە هەر لەجێی خۆی دایەو، لانەبراوە و نەسخ نەبۆتەوە، بەڵام فەرمانەكە بۆ بە پەسند دانان (**إستحباب**)ەو، هەر لە سەرەتاوەش وابووەو، ئەوەش ڕای ژمارەیەك لە زانایانە كە دەڵێن: شەونوێژ لەسەر پێغەمبەری خواش ﷺ فەرز نەبووەو، لەسەر هاوەڵانیشی فەرز نەبووە، بەڵكو خوا وەك شتێكی پەسندو چاك فەرمانی پێكردوە، هەندێكیش دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری فەرز بووە، بەڵام بۆ هاوەڵانی و بۆ مسوڵمانانی دیكەش، شتێكی پەسندو چاكە، گرنگ ئەوەیە فەرمانەكە هەر لەجێی خۆیەتی، بەڵام وەك دوایی باس دەكەین، ئاسانكاریی و سووككاریی تێدا كراوەو ئەم ئایەتەی كۆتایی خوا ﷻ میهرەبانیی و بەزەیی و چاوپۆشیی لەو فەرمانەدا بەكارهێناوە، وەك پێشتر لەهۆی هاتنە خوارەوەیدا باسمان كرد، ئەویش دوای ساڵێك، دوای ئەوەی ساڵێك پێغەمبەری خوا ﷺ و بەشێك لە هاوەڵانی كە لە خزمەتیدا بوون، بەو شێوەیەی خوا فەرمانی پێ كردبوون، ئەو شەو نوێژەیان كردو، بەو شێوەیە قورئانیان تێدا خوێند، خوای پەروەردگار لەسەری سووككردن، هەم لەبەر ئەو سێ حاڵەتە نائاساییەی كە بۆیان دێنە پێش، هەم لەبەر ئەوەش كە زانی باش بۆیان كۆنتڕۆڵ ناكرێ.

### سەرنجی دووەم:

کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ ﴾، ئەوەی بۆتان ئاسانە لە قورئان بیخوێنن، ئەمە تەعبیر کردنە لە نوێژ کردن، بە قورئانخوێندن، وەك لە سوورەتی (الإسراء)یشدا هاتوە: ﴿ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا ...﴿١١٠﴾ ﴾الإسراء، دەنگت زۆر بەرز مەکەوە بە نوێژەکەت و دەنگیش زۆر نزم مەکەوە، (صَلاة) لەوێدا بە مانای قورئان خوێندنە، لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ ﴾، واتە: ئەوەندەی بۆتان ئاسان دەبێ شەونوێژ بکەن، ئەو شەونوێژەی قورئانی تێدا دەخوێنن.

### سەرنجی سێیەم:

کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەمە لە بەڵگەو موعجیزەکانی پێغەمبەرایەتییەو هەواڵدانە لە نادیار (غیب)، چونکە لە مەککەدا جەنگ نەبووە، ڕای بەهێزتریش ئەوەیە کە ئەم سوورەتە هەمووی مەککەییە، ئەوەندە هەیە ئەم ئایەتی بیستەم و کۆتاییە ساڵێك، دوای نۆزدە ئایەتەکەی دیکە دابەزیوە، ئەم سوورەتی (المزمل)ەش وەك باسمان کرد، سەرەتای دابەزینی قورئانە، جگە لە پێنج ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتی (العلق)، کەواتە: هەر لە ساڵی یەکەمدا خوا هەواڵی بە مسوڵمانان داوە، کاتێك دێ جەنگ و جیهادتان بۆ دێتە پێش و، ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرەنگارییتان لەگەڵ ئەهلی کوفردا، دەبێ، ئەوەش هەواڵدانە بە نادیار، چونکە تەنیا خوا ﷻ زانیویەتی، ئەو پێغەمبەرەی ﷺ ناردوویەتی و بەردەوام لە شاری مەککەدا هاوەڵانی ئەشکەنجە دراون و کوژراون، کاتێك دێ - ئەو پێغەمبەرەی ﷺ بانگەوازەکەی ئەو کاتە لە نێو شاخەکان و شیوەکانی مەککەدا قەتیس کراوە - قەوارەی سیاسیشی بۆ دروست دەبێ و، جەنگ و جیهادیشیان لەسەر پێویست دەبێ، بۆیەش ئەوە بە ئیعجازێکی مێژوویی لە قەڵەم دەدرێ.

## سەرنجی چوارەم:

دەرچـوون لـە مـاڵ، بـە مەبەسـتی دابیـن کـردن و دەسـتەبەر کـردنی بژیـو، چ بەهـۆی مامەڵـەو بازرگانییـەوە بـێ، چ بـە هـۆی کشـت و کاڵـەوە بـێ، چ بەهـۆی ڕەزداریـی و باخدارییـەوە بـێ، چ بەهـۆی ئاژەڵدارییـەوە بـێ، شـتێکی زۆر گرنگـە، چونکـە خـوا ﷻ لەگـەڵ (جەنـگ لـە پێنـاوی خـوادا) خسـتوونیە تەرازووییەکـەوە، یـانی: چ بچـی ڕزق و بژیـو پەیـدا بکـەی، چ بچـی لـە پێنـاوی خـوادا فیداکاریـی و جەنـگ و خەبـات بکـەی، لـە ئاسـت و ڕیزێـك دان و هاوکووفـن.

## سەرنجی پێنجەم:

ئەبـوو حەنیفـە ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ، ئـەم ڕسـتەیەی بـە بەڵگـە هێناوەتـەوە لەسـەر ئـەوەی خوێنـدنی سـوورەتی فاتیحـە، مـەرج نیـە لـە نوێـژدا، بـەڵام زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان دەڵێـن: خوێنـدنی سـوورەتی فاتیحـە لـە هەمـوو ڕکاتـەکانی نوێـژدا فـەڕزەو مەرجـە، ئەبـوو حەنیفـە دەڵـێ: خـوا فەرموویـەتی: ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ﴾، ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُ﴾، بـەڵام زۆربـەی زانیـان دەڵێـن: لێـرەدا خـوا فەرمانێـکی گشـتیی کـردوە، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەوەی ڕوونکردۆتـەوە وەك لـە صەحیحـی بوخاریـی و موسـلیمدا هاتـوە: {**لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ**} (**أخرجه البخاري: ٧٢٣، ومسلم: ٣٩٤**)، واتـە: هـەر کـەس (**فَاتِحَةِ الْكِتَابِ**)، نەخوێنـێ، واتـە: سـوورەتی فاتیحـە لـە هـەر ڕکاتێـکی نوێژەکـەی دا، نوێژەکـەی بەرناکـەوێ، بـە دڵنیاییـش ڕای زۆربـەی زانایـان ڕاسـتەو، ئەبـوو حەنیفـەش نەیگوتـوە باش نیـە فاتیحە بخوێـنرێ، بەڵکـو گوتوویـەتی مـەرج نیـە، واتـە: نوێژکـەر ئەگـەر سـوورەتی فاتیحـە نەشـخوێنێ، بەڵکـو بـە ئەنـدازەی چەنـد ئایەتێـك بخوێنـێ، ئـەو پایـەی نوێژەکـەی هاتۆتـە دی، بـەڵام ڕای زۆربـەی زانایـان ڕاسـتە.

## سەرنجی شەشەم:

شەونوێژ - وەك پێشتر لە كاتی تەفسیركردنی سووڕەتی سەجدەدا، كورتە باسێكمان لە بارەوە كرد - پلەو پایەیەكی زۆر گەورەو گرنگی هەیە لە ئیسلامداو، گرنگە مرۆڤی مسوڵمان، كەم یان زۆر شەو بێدار بێ، تەنانەت زانایان گوتوویانە: ئەگەر دوو ڕكاتیش بێ، هەرچەندێكی بۆی بگونجێ، واباشە شەو بێداریی هەبێ، كە من پێموایە شەو بێدارییەكە مەرجیش نیە، تەنیا بە نوێژ بێ، ئەگەر تەنیا قوڕئانیش بخوێنێ، یان یادی خواش بكات، چونكە جاری وایە شوێنەكەی وایە، یان حاڵەكەی وایە، ناتوانێ نوێژ بكات، ئەگەر هەر یادی خوا بكات، یان بپاڕێتەوە، یان سەرگەرمی زانستیش بێ، ئەوە هەر بە شەوبێداریی بۆی لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام بە دڵنیایی شەونوێژ كردن حاڵەتە ئەسڵییەكەیە.

## سەرنجی حەوتەم و كۆتایی:

هەرچەندە زانایان ڕاجیاییان هەیە لەوەدا: ئایا شەونوێژ لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەڕز بووە، یان سوننەت بووە؟ بەڵام بەپێی ئایەتەكەی سووڕەتی **(الإسراء)** كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ٧٩ ﴾**الإسراء**، لە شەوێشدا هەڵسەوە و واز لە خەو بێنە، (یاخود: خۆت ئەزیەت بدەو شەونوێژ بكە)، ﴿ نَافِلَةٗ لَّكَ ﴾، ئەمە زیادەیەكە بۆ تۆ، هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە ئەصڵدا شەونوێژ لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ پێویست نەبووە، بەڵام خۆی پێوە پابەند كردوە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ پێگە بەرزەكەی وای خواستوە، كە ئەو شتانەی خەڵكی دیكە وەك سوننەت تەماشایان دەكات، ئەو وەك فەڕز لەسەر خۆیان پێویست بكات، هەڵبەتە وشەی: ﴿ نَافِلَةٗ ﴾، وەك چۆن دەگونجێ بە مانای زیادە لە فەڕزبێ، دەشگونجێ بە مانای زیادە بێ، بۆ تۆ لەوەی لەسەر خەڵك فەڕز كراوە، لەسەر ئۆممەتەكەت، دانراوە، تۆ ئەو زیادەیەشت لەسەر

فـەرز كـراوە، واتـە: وشـەی ﴿ نَافِلَةً ﴾، مـەرج نیـە تەنیـا مەبەسـت پێـی پەسـند (مندوب) بـێ، کـە لـە بەرانبـەر فـەرز دایـە.

بـەڵام بێگومـان دەشـگونجێ ئـەو وشـەیە بـە بەڵگـەی ئـەوەش بهێنرێتـەوە کـە پێغەمبـەری خاتەمیـش ﷺ شـەونوێژی لەسـەر فـەرز نەبووە، بـەڵام خوای پـەروەردگار بـۆی پەسـند کـردوە، ئەویـش خـۆی بـەو پەسـندەوە مولـزەم و پابەنـد کـردوە، گرنـگ ئەوەیـە ئـەوەی لـەم ئایەتـە موبارەکـەدا هاتـوە، مەسـەلەی لابـردن (نسـخ)ی هـەر تێـدا نیـە.

بەڵکـو مانـای ئـەو ئایەتـە موبارەکـەو کـۆی حوکمی شـەونوێژ کـە لێـی وەردەگیرێ چەنـد ئەگەرێـکی هەن:

١- خوای کاربەجێ هەر لەسەرەتاوە وەك پەسند (مندوب) فەرمانی پێکردوون شەونوێژ بکەن، نەك وەك ئەرکێکی پێویست.

٢- خوای میهرەبان هەر لە بەراییەوە بۆ کاتێکی دیارییکراو، ئەو ئەرکەی پێ سپاردوون، بە پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵانی و، تەنیا لەو سەرەتایەوەش پێویست بووەو، دوایی خوا حوکمەکەی سووك کردوەو کردوویەتی بە پەسند، بە تایبەت لە حاڵەتە تایبەتەکانی وەك: نەخۆشیی و سەفەرو جەنگ و جیهاددا.

٣- هەر لەسەرەتاوەش شەونوێژ سوننەت و پەسند بووەو، دوایی خوای بە بەزەیی ئەو کە پەسندەشی لەسەر سووك و ئاسان کردوون، کە بەپێی تواناو بۆ لوانیان پێی هەڵسن، هەم بەهۆی نەتوانینی کۆنترۆڵکردن (ضبط)ی کاتەکەو، هەم بەهۆی هاتنەپێشی: نەخۆشیی و، سەفەری داواکردنی بژیوو بەخششی خواو، جەنگ و جیهادەوە.

ئێمـە لێـرەدا کۆتایـی بـە تەفسـیری سـوورەتی (المزمـل) دێنیـن و لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە، کـە بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات و دەڵێیـن: خوایـە! بـە نـاوە هـەرە چاکەکانـت و سـیفەتە هـەرە بـەرزو پەسـندەکانت،

لێت دەپاڕێینەوە کە هەرچی فەرمانت پێکردوە لە فەرمایشتی خۆتداو، هەرچی پێغەمبەری خاتەم ﷺ جێبەجێی کردوە، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا، تەوفیقمان بدەی ئێمەش بەو شێوەیە تێبگەین کە خۆت فەرمانت پێکردوەو، بەو شێوەیەش بیکەین کە پێغەمبەرەکەت ﷺ کردوویەتی و ئەنجامی داوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢١)ی شـەووالی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٦/١٣) ی زایینـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الْمُدَّثِّـرُ**)، سـەرەتاش لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا، پێناسـەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەکەیـن و نێوەڕۆکەکـەی دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (المدثر) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیـا بـە نـاوی (**سُـورَةُ الْمُدَّثِّـرُ**) نـاسراوە، کـە بـە مانـای (خـۆ لـە پۆشـاکەوە پێـچ)ەوە، دێ، مەبەسـتیش پێـی پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەدە ﷺ.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بـە یەکدەنگیـی زانایـان ئـەم سـوورەتە مەککەییـەو لـە شـاری مەککـە دابەزیـوە، لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە دێنیـن:

**{عَـنْ عَبْـدِ اللـهِ بْـن عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ الْمُدَّثِّـرُ فِي مَكَّـة} (أخرجـه ابـن الضريـس والنحـاس وابـن مردويـه والبيهقـي، وأخـرج ابـن مردويـه عـن إبـن الزبـير مثلـه، الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب: ج٣، ص١٧٣، وفتـح القديـر للشـوكاني: ج٥، ص٣٩١).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﭫ گوتوویەتی: سووڕەتی (**الْمُدَّثِّرُ**) لە مەککە دابەزیوە، ئنجا (**إبن مردویە**) هەمان قسەی لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریشەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕاوەتەوە، هەر کام لە (**ابن عباس و ابن الزّبیر و ابن عُمَر وابن عَمْرو**)و لە پێش هەمووشیانەوە (**إبن مسعود**) هەر پێنجیان ناویان عەبدوڵڵاییەو، بە عەبادیلە ناسراون، هەمووشیان زۆر زاناو شارەزا بوون، بە تایبەت (**إبن مسعود**) و لە دوای ئەو (**إبن عباس**)، ئنجا دوایی (**ابن الزبیر وابن عُمَر وَابْنُ عَمْرو**) (خوا لێیان ڕازی بێ).

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی بە لای زانایانی (**أهل المدینة**)ەوە، لە ژماردنی دووەمیانداو، بە لای زانایانی (**أهل الشام**)ەوە پەنجاو پێنج (٥٥)ە، بەڵام زانایانی: (**أهل البصرة وأهل الكوفة و أهل المدينة**)ش لە ژماردنی یەکەمیاندا - دیارە دوو جاران ئایەتەکانیان سەرژمێر کردوون - بە پەنجاو شەش (٥٦)یان داناوەو، ئەو موصحەفانەی لەبەر دەستی ئێمەن، ژمارەی دووەمیان تەبەننیی کردوون کە پەنجاو شەش (٥٦)ە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

لە موصحەف دا ڕیزبەندییەکەی حەفتاو چوار (٧٤)ەو، لە دابەزینیشدا ڕاجیایی هەیە لە بارەی ڕیزبەندییەکەیەوەو، ئەوەش پێویستیی بە توێژینەوەیەکی ورد دەکات، کە هەوڵدەدەین لە چەند خاڵێکدا کورت و پوختی بکەینەوەو، لەو بارەوە سێ ڕا هەن:

١- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: سووڕەتی (**الْمُدَّثِّر**) یەکەمین سووڕەتە دابەزیبێ، تەنانەت پێش (**العلق**)یش و، لەو بارەوە ئەم دەقە هەیە:

{عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَوَّلِ مَا نَزَلَ مِنَ الْقُرْآنِ؟ فَقَالَ: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢﴾ قُلْتُ: يَقُولُونَ: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝١﴾؟ فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ ذَلِكَ، وَقُلْتُ لَهُ مِثْلَ مَا قُلْتَ لِي، فَقَالَ جَابِرٌ: لَا أُحَدِّثُكَ إِلَّا مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ، فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي، هَبَطْتُ فَنُودِيتُ فَنَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ عَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ أَمَامِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ خَلْفِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فرأيتُ الْمَلَكَ الَّذِي جاءني بِحِرَاءٍ قَاعِدٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، فَجَئِثْتُ مِنْهُ حَتَّى هَوَيتُ إِلَى الْأَرْضِ، فَجِئْتُ إِلَى أَهْلِي، فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي، فَزَمَّلُونِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢﴾} (أخرجه البخاري: ٤٦٣٨، ومسلم: ١٦١، وأحمد: ١٤٣٢٦).

واتە: یەحیای کوڕی ئەبی کەسیر دەڵێ: لە ئەبوو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانم پرسی لە بارەی یەکەمین شتێکەوە کە لە قورئان دابەزیوە؟ ئەویش گوتی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ۝١﴾ە، گوتم: دەڵێن: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝١﴾ [واتە: سەرەتای سووڕەتی (العلق)، ئەو چەند ئایەتە دابەزیون یەکەمجار}، ئەبوو سەلەمە گوتی: لەو بارەوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵام پرسی؟ وەك تۆ ئێستا دەڵێی، منیش وامگوت، بەڵام جابیر گوتی: بۆت باس ناکەم، جگە لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردووم، فەرمووی: چوومە ئیعتیکافەوە لە نێو ئەشکەوتی (حِرَاءٍ)دا، دوای ئەوەی خەڵوەو ئیعتیکافەکەم تەواو بوو، {(جِوَار) لە ئەسڵدا بە مانای دراوسێیەتیی کردنە، بەڵام مەبەست پێی چوونە ئیعتیکاف و خەڵوەو ڕامان و بیرکردنەوەو جۆرێك لە پەرستشی خوای پەروەردگارە}، دابەزیم بانگکرام تەماشای لای ڕاستم کرد، هیچم نەدی و، تەماشای لای چەپم کرد، هیچم نەدی و، تەماشای دواوەی خۆم کرد، هیچم نەدی و، سەرم بەرز کردەوە بینیم ئەو فریشتەیەی کە لە (حِرَاءٍ) هاتبوو، لەسەر کورسییەك بوو لە نێوان ئاسمان و زەوی، منیش لە ترس و حەژمەتانی بە چۆکدا کەوتم، گەڕامەوە بە

ماڵەوەم گوت: دامپۆشن دامپۆشن، دایانپۆشیم، ئنجا ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ١ قُمْ فَأَنذِرْ ٢﴾، دابەزی.

**٢-** دایکمان عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: یەکەمین شت کە دابەزیوە، پێنج ئایەتی سەرەتای سوورەتی (**العلق**)ن، ئنجا دوایی سوورەتی (**المُدَّثِّر**) دابەزیوە، دیارە مەبەستیش لە پێنج ئایەتی سەرەتای سوورەتی (**العلق**)، ئەم پێنج ئایەتەیە: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ٣ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ٥﴾.

**٣-** سوورەتی (**العلق**) واتە: پێنج ئایەتی سەرەتای سوورەتی (**العلق**) دابەزیون، ئنجا (**المزمل**) دابەزیوە، ئنجا (**المُدَّثِّر**) دابەزیوە، کە وەك دوایی باسی دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە، ئەم ڕایە ڕاستەو، دواتر چۆنیەتیی پێکەوە گونجانی ئەو دەقانەی سوننەتیش ڕوون دەکەینەوە.

لێرەدا دەپرسین:

ئایا بۆچی ئەم ڕایەی سێیەم هەڵدەبژێرین و، چۆن ئەم دەقانە پێکەوە دەگونجێنین؟

دەڵێین:

**أ-** ڕای ڕاست و لەگەڵ عەقڵ و واتاو سرووشتی ئایەتەکان دا گونجاو، ئەوەیە کە ڕیزبەندیی دابەزینی سوورەتەکانی سەرەتای قوڕئان، بەم جۆرە بووبێ:

**١-** سوورەتی (**العلق**)، پێنج ئایەتی سەرەتای کە خوێندمانەوە.

**٢-** سوورەتی (**المزمّل**)، ئایەتەکانی: (١ - ١٩) دوای ساڵێکیش ئایەتی ژمارە: (٢٠).

**٣-** سوورەتی (**المُدَّثِّر**)، ئایەتەکانی: (١ - ١٠) لە سەرەتاوە، دواتر ئایەتەکانی: (١١ ٥٦).

**٤-** سوورەتی (**القلم**)، ئایەتەکانی: (١ - ٥٢).

**ب-** بۆ چۆنیەتیی پێکەوە گونجانی ئەم دەقانەش، **(السیوطي)** لە کتێبە ناودارەکەی خۆی **(الإتقان في علوم القرآن)**دا، پێنج ئەگەری هێناون، پێنج ڕێی تەئویل کردن و پێکەوە گونجاندنی ئەو سێ ڕا جیاوازەی پێکەوە هێناون:

**{١- السؤالُ في حَدِيْث جَابِرَ كَانَ عَنْ نُزُولِ سُورَةٍ كَامِلَةٍ، فَبَيَّنَ أن المُدَّثِّرُ نَزَلَتْ بِكَمَالِهَا قَبْلَ تَمَامِ سُورَة (إقْرَأ)، فَإِنَّ أوَّلَ مَا نَزَلَ مِنْهَا صَدْرُهَا.**

**٢- أَنَّ مُرَادَ جَابِر بَالأوَّلِية، أوَّليةٌ مَخْصُوصَةٌ بِمَا بَعْدَ فَتْرَةِ الوَحِي، لَا أوَّلِية مُطْلَقَة.**

**٣- أنَّ المُرَادَ أوَّليةٌ مَخْصُوصَة بِالأمْرِ بِالإنْذَار، وَعَبَّرَ بَعْضُهُمْ عَنْ هَذَا بِقَوْلِه: أوَّلُ مَا نَزَلَ للنبوةِ : ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ①﴾، وَأوّلُ مَا نَزَلَ للرِّسَالَةِ: ﴿ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ①﴾.**

**٤- أنَّ المُرَادَ أوَّلُ مَا نَزَل بِسَبَبٍ مُتَقَدّم، وَهُوَ مَا وَقَعَ مِنَ التَّدَثُّرِ الناشِيء عَنِ الرُّعْبِ، وَأمّا إقْرَأ فَنَزَلَت ابْتِدَاءً بَغَيْرِ سَبَبٍ مُتَقَدّم.**

**٥- أنَّ جَابِرَ اسْتَخْرَجَ ذَلِكَ بِاجْتِهَادِه، وَلَيْسَ هُوَ مِنْ رِوَايَتِه فَيُقَدَّمُ عَلَيْهِ مَا رَوَتْهُ عَائِشَة رَضِيَ الله عَنْهُما، ثُمَّ قَال: وَأَحْسَنُ الأجْوَبَة: الأوَّلُ وَالأخِيْر}**[1].

واتە: بۆ چۆنیەتیی پێکەوە گونجاندنی ئەو دەقانە، ئەو پێنج ڕێیەمان لە پێشن:

**١-** ئەو پرسیارەی لە جابیر کراوە، وەك لێرەدا جابیر هێناویەتی، لە بارەی دابەزینی یەکەمین سوورەت بووە، بە تەواویی، جابیریش (خوا لێیان ڕازی بێ)، ڕوونی کردۆتەوە کە سوورەتی **(المُدَّثِّرُ)** بە تەواویی دابەزیوە، بەر لەوەی سوورەتی **(العلق)** بە تەواویی دابەزێ، واتە: دوای ئەوەی پێنج ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتی **(العلق)** دابەزیون، ئنجا سوورەتی **(المُدَّثِّرُ)** دابەزیوە بە تەواویی، دواتریش لە ئایەتی شەشەم هەتا کۆتایی سوورەتی **(إقرأ)** دابەزیوە.

---

(١) الإتقان في علوم القرآن، کە (الآلوسي)، خاوەنی: (روح المعاني) بەرگی (١٥)، جوزئي (٢٩)، لاپەڕە: ١٦٥،١٦٦، لێی وەرگرتوە.

٢- مەبەستی جابیر لە یەکەمین شتێك کە لە قورئان دابەزیوە، یەکەمین بوونێکی تایبەتە، ئەویش بریتیە لە یەکەمین ئایەتانێك کە لە دوای پچڕان و وەستانی وەحیی، دابەزیون، نەك یەکەمین دابەزین بەڕەهایی.

٣- مەبەست لە یەکەم بوونی دابەزینی قورئان بە لای جابیرەوە، یەکەم بوونێکی تایبەتە، بە: دوای ترساندن و ئاگادار کردنەوە، ئنجا هەندێکیان ئاوا تەعبیریان لەوە کردوە، گوتوویانە: یەکەمین شتێك کە دابەزی بۆ ناساندنی موحەممەد ﷺ پێغەمبەرو فەرمان پێکردنی، سووڕەتی (**إقرأ**) بوو، ئەو پێنج ئایەتەی سەرەتای سووڕەتی (**العلق**) بوون، بەڵام یەکەمین شتێك کە دابەزی وەك ڕەوانەکراو، هەروەها گەیەنەری پەیامی خوا، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ ﴾بوو.

٤- جابیر کە گوتوویەتی: یەکەمین شتێك کە لە قورئان دابەزیوە، مەبەستی یەکەمین شتێك بووە کە لە قورئان دابەزیوە، بەهۆی هۆکارێکی پێشووەوە، ئەویش بریتی بووە لەوەی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بە پۆشاکەکەی یاخود بە نوێنەکەی خۆی داپۆشیبوو، نوێنەکەی لە خۆیەوە پێچابوو، بەڵام سووڕەتی (**إقرأ**) پێنج ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (**العلق**) بەبێ هۆکارێك ڕابردبێ، دابەزیوە، بەڵام ئەوەی بە هۆکارێکی پێشووەوە دابەزیوە، سووڕەتی (**المُدَّثِّر**) بووە، هۆکارەکەش ئەوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی ترساوەو، گەڕاوەتەوە بۆماڵەوەو گوتوویەتی: دامپۆشن، خۆی لە نوێنەوە یاخود خۆی لە پۆشاکەکەیەوە پێچاوە، خوای پەروەردگار سووڕەتی (**المُدَّثِّر**)ی بۆ دابەزاندوە، کە: لە نوێنێ وەرە دەرێ! یاخود لەنێو پۆشاکەکەت کە خۆت تێ پێچاوە، وەرە دەر!.

٥- جابیر (خوا لێی ڕازی بێ) بە کۆششی خۆی ئەوەی هەڵهێنجاوەو ئەوە لە گێڕدرانەوەی وی نیە، بۆیە ئەوەی عائیشە گێڕاویەتەوە خوا لێی ڕازی بێ، پێش ئەوە دەخرێ کە جابیر بە تێگەیشتنی خۆی هەڵیهێنجاوە، (**السیوطي**)یش خۆی گوتوویەتی: باشترین وەڵام هی یەکەم و کۆتایین.

منیش هەر کام لەو پێنج وەڵامەم پێ چاکن، بەڵام دیسان دەشگونجێ کۆشش بکرێ: ئایا یەکەمیان باشترە، یاخود دووەمیان، یان سێیەمیان، یان چوارەمیان، یاخود پێنجەمیان؟.

ئەوەی ماوەتەوە لەو بارەوە بیڵێم ئەوەیە: (**السيوطي**) باسی ئەوەی نەکردوە کە لە دوای سوورەتی (**العلق**)، سوورەتی (**المزمل**) دابەزیوە، بەڵام پێشتریش باسم کردو ئێستاش دووبارەی دەکەمەوە، ناگونجێ سوورەتی (**المُدَّثِّر**) پێش سوورەتی (**المزمل**) کەوتبێ، لەبەر دوو هۆکاران:

١- لە فەرمایشتەکاندا زیاتر ئەوە هاتوە: (**زمِّلوني، زمِّلوني**)، کەواتە: پێش ئەوەی سوورەتی (**المُدَّثِّر**) دابەزێ، سوورەتی (**المزمل**) دابەزیوە، پێشتریش گوتمان (**تزمُّل**) ئەوەیە کە پۆشاك و پێخەف بەخۆ دابدرێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (**زمِّلوني**)، کەواتە: کەسێک جگە لە خۆی پۆشاکێکی پێداداوە، لێفەیەك جاجمێك ئەوەی ئەو کاتە هەبووەو خەڵك وەك نوێن و پێخەف بەکاریهێناوە.

٢- لە دوای ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ١ ﴾ خوا ﷻ هەر فەرمان بە خودی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات، کە خوا پەرستیی بکات، شەونوێژ بکات و شەو بێداریی بکات و، فەرمانی پێ دەکات بە کۆمەڵێ شت کە زیاتر پەیوەستن بە خودی خۆیەوەو، جارێ ئێستا فەرمانی پێنەکراوە ئەو پەیامەی خوا بگەیەنێ بە خەڵك، بەڵام دوایی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ١ قُمْ فَأَنذِرْ ٢ ﴾، مرۆڤیش بەر لەوەی دەست بە چالاکیی نێو خەڵك بکات، دەبێ خۆی قایم و مەحکەم بکات، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ٢ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ٣ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ٤ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ٥ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ٦ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ٧ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ٨ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ٩ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ١٠ ﴾،

لە حاڵێك دا جارێ پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەركدار نەكراوە بە گەیاندنی پەیام، ئەو پەیامەی خوا پێیدا ناردوە بیگەیەنێ بە خەڵك، بەڵكو ئەوانە هەموویان ئامۆژگاریی و ڕێنماییین بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ كە پەیوەندیی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا مەحكەمتر بكات، بە شەو نوێژو قورئانخوێندن بە ڕێكیی و یادی خوا كردن و پشت بە خوا بەستن و خۆڕاگریی، دوایی لە قۆناغێكی دیكەدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢﴾، ئەی ئەو كەسەی پۆشاكت لە خۆتەوە پێچاوە، یان خۆت لە پێخەف و پۆشاكەوە پێچاوە! هەڵسەو بترسێنەو ئاگادر بكەوە، بێگومانیش خۆ پەروەردە كردن و خۆ ڕاهێنان و خۆ مەحكەم كردن، لە پێش كار لەسەر خەڵك كردن و، دەستكردنە بە جموجۆڵی نێو خەڵك و كۆمەڵگا.

## پێنجەم: نێوەڕۆكی ئەم سوورەتە:

ئێمە لە شەش خاڵدا باسی نێوەڕۆكی ئەم سوورەتە دەكەین:

١- لە حەوت ئایەتەكانی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ۝٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ۝٤ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ۝٥ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ۝٦ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ۝٧﴾دا، حەوت ئەرك خراونە سەر شانی پێغەمبەری خاتەم كە بریتین لە:

١- ﴿قُمۡ﴾، هەڵسە،

٢- ﴿فَأَنذِرۡ﴾، (خەڵك) بترسێنەو وریا بكەوە.

٣- ﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ﴾، پەروەردگارت بە گەورە بگرە، بە مەزن بگرە،

٤- ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ﴾، پۆشاكت پاك بكەوە،

٥- ﴿وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ﴾، واز لە پیسیی و خراپە بهێنە،

٦- ﴿ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ﴾، کاتێك دەبەخشی، مەبەخشە کە بەخشینەکەت بە زۆر بزانی، یاخود کە فەرمانبەریی بۆ خوا ئەنجام دەدەی، بە زۆری مەزانە.

٧- ﴿ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ﴾، خۆڕاگریش بە بۆ پەروەردگارت.

٢- لە سێ ئایەتەکانی: (٨ - ١٠)دا، باسی ڕۆژی قیامەت کراوە: ﴿ فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ﴿١٠﴾ ﴾.

٣- لە بیست ئایەتەکانی: ﴿ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴿١١﴾ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودٗا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطۡمَعُ أَنۡ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ﴿١٦﴾ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾دا، باسی یەکێك لە کافرە ملهوڕەکان، کراوە، کە خوا چوار جۆرە چاکەی ناوازەی پێداون، کەچی ئەو بێبڕوا بووە بە ئایەتەکانی خوا، پاشان خوا سُبۡحَانَهُۥ وَتَعَالَىٰ نۆ قسەو هەڵوێستی خراپی لێ دەگێڕێتەوە، دوایی هەڕەشەی لێ دەکات بە دۆزەخ، کە بە سێ وەسف پێناسەی دەکات.

٤- لە حەوت ئایەتەکانی کۆتایی: ﴿ وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗۙ وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗاۙ وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا وَٱلۡقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذۡ أَدۡبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَآ أَسۡفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرٗا لِّلۡبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ ﴾دا، چەند بابەتێکی جۆراو جۆر باسکراون.

٥- لە یازدە ئایەتەکانی: ﴿ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمۡ

نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾دا، باسی سەرەنجامی بێبڕوایانی تاوانبار کراوەو، هۆکاری چوونە نێو دۆزەخیان بە چوار شتان باسکراوە.

٦- لە هەشت ئایەتەکانی: ﴿ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾ ﴾دا، بە سەرزەنشتکردنەوە، باسی هۆکاری دوورکەوتنەوەو سڵەمینەوەی بێبڕوایان لە قورئان و، هەندێك لە بڕو بیانووەکانیان کراوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

ئێمە بۆ ئەم سوورەتە پێنج (٥) تایبەتمەندییمان خستوونەڕوو:

١- تەنیا لەم سوورەتەدا، لە دوو توێی حەوت ئایەت دا، حەوت فەرمانی گەورەو گرنگ بە پێغەمبەری خوا ﷺ کراون: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾ ﴾.

٢- تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی ئەوە کراوە، کە نۆزدە (١٩) فریشتە دۆزەخ بەڕێوە دەبەن و سەرپەرشتیی دەکەن: ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

٣- تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی ئەوە کراوە، کە دانانی ژمارەی فریشتە دۆزەخەوانەکان بە نۆزدە (١٩)، حەوت جۆرە کاریگەریی و دەرهاویشتەی جۆراوجۆری هەن: ﴿ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ ﴾.

٤- تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی دانپێداهێنانی تاوانباران، بە چوار هۆکارەکانی چوونە دۆزەخیان کراوە، لەم ئایەتانەدا: ﴿ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ ﴾.

٥- تەنیا لەم سووڕەتەدا، بێبڕوایانی ڕوو وەرگێڕ لە یادی خوا ﷻ، چوێنراون بە کەرە کێوییە سڵەمیوەوەکان لە شێر، یان ڕاوچییان: ﴿ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ ﴾دا.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە:

ئێمە کۆی پەنجا و شەش (٥٦) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە بۆ دوو دەرسان دابەش دەکەین:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٣٧)، کە پێنج بابەتی سەرەکیی دەگرنە خۆیان:

١- حەوت فەرمانکردن بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو توێی حەوت ئایەت دا.

٢- باسی قیامەت و دژواریی ڕۆژی دوایی.

٣- باسی بابایەکی ملهوڕی خۆ بەزلگر لە بەرانبەر خواو پەیامەکەی دا، کە ئەو بابا ملهوڕە نۆ سیفەت و هەڵوێستی خراپی لێ خراونەڕوو، لە حاڵێکدا خوا ﷻ ئەوی نوقمی چاکەو نیعمەتەکانی خۆی کردوە.

٤- باسی حیکمەتی نۆزدە (١٩) بوونی ژمارەی فریشتە دۆزەخەوانەکان، کە خوا ﷻ حەوت دەرهاویشتەی دانانی سەرپەرشتیارەکانی دۆزەخی لە فریشتان بە نۆزدە، خستوونەڕوو.

٥- خواردنی سێ سوێند لەسەر ئەوەی ئاگری دۆزەخ، گەورەترین و سامناکترین شتە، یاخود تاکە شتی یەکجار بێڕەزاو گەورەو ترسناکە.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی: (٣٨ - ٥٦)، کە چوار بابەتی سەرەکیی گرتوونە خۆی:

١- هەر کەسە لە دۆزەخ دا بارمتەی کردەوەکانیەتی، جگە لە هاوەڵانی دەستە ڕاست کە لە بەهەشتەکانی خوادان، لە باخە ڕازاوەو نەبڕاوەکاندان.

٢- هۆكارەكانی چوونە نێو دۆزەخی تاوانباران، چوار هۆكاری سەرەكیین، كە بریتین لە: أ-نوێژ نەكردن، ب- خواردن نەدان بە هەژارو نەدار، ج- تێرژانە نێو قسە پووچ و بە تاڵ، لەگەڵ ئەهلی كوفرو شیركدا، د- بێبڕوایی بە ڕۆژی سزاو پاداشت.

٣- چواندنی بێبڕوایانی پشتهەڵكەر لە بەرنامەی خوا، بە كەرە كێویانی سڵەمیوەوە لە شێر یان ڕاوچییان، كە وەك گوتم: تەنیا لێرەدا بێبڕوایانێك كە لە یادی خوا دەسڵەمنەوە، لە بەرنامەی خوا دەسڵەمنەوەو لێی دوور دەكەونەوە، چوێندراون بەو كەرە كێویانەی كاتێك شێر دەبینن دەسڵەمنەوەو ڕادەكەن، یاخود كاتێك ڕاوچییان دەبینن، چونكە (**قسورة**) هەم بە مانای شێر هاتوەو، هەم بە مانای كۆمەڵێك تیر هاوێژو ڕاوچییش هاتوە.

٤- بڕو بیانووی كافران لەسەر بڕوا نەهێنانیان و، ڕوونكردنەوەی هۆكاری ڕاستەقینەی بێبڕواییان، واتە: ئەوان بیانوو دەهێننەوە كە ئێمە لەبەر فڵان شت و فڵان شت بڕوا ناهێنین، بەڵام خوا ﷻ چییەت و نێوەڕۆكی هۆكاری بێبڕواییەكەیان دەخاتەڕوو، تاكو ئەو بڕو بیانووانەی دەیانهێننەوە بە ڕواڵەت، خوای پەنهانزان لەوەدا بە درۆیان بخاتەوە، كە هۆكاری بێبڕواییتان ئەوە نیە كە دەڵێن، بەڵكو هۆكارە ڕاستەقینەكەتان ئەوەیە: ﴿بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ٥٣﴾، بەڵكو ئەوانە بڕوایان بە دیداری خواو بە مەنزڵگای كۆتایی نیەو، حیسابیان نەكردوە بۆ ئەو ڕۆژە كە بە خزمەت خوای پەروەردگار دەگەنەوەو بە دیداری دەگەن، ئەوەیە وایان لێ دەكات بیر لە پەیامی خواو لە فەرمایشتی خوا، نەكەنەوە، كە بە پێغەمبەری كۆتایی خۆیدا ناردوویەتی، ئەگەرنا ئەگەر دڵنیابان و زانیبایان، كاتێك دێ دەچنەوە خزمەت خوا، ئێستا كە خوا دەفەرموێ: پێغەمبەرێكم ناردوەو كۆتا پەیام و بەرنامەی خۆمم پێدا ناردوە، تەماشای ئەو پەیام و بەرنامەیان دەكرد، كە ئەگەر هەر تێوەی ڕاهابان و تەماشایان كردبایە، تەماشاكردنێكی بە دڵ و، بە مەبەستی ئەوە كە پێی ئاشنا بن و لێی شارەزا بن، ئەو كاتە ئەو هەڵوێستە نەرێنییەیان نەدەبوو، كە لێی بسڵەمنەوە، وەك چۆن كەرە كێوی كاتێك شێر دەبینێ، دەسڵەمێتەوەو لێی ڕادەكات!!

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە سی و حـەوت (٣٧) ئایـەت پێکـدێ و، پێنـج بابـەتی سـەرەکیی دەگرنـە خۆیـان کـە بـە خێرایـی چاویـان پێـدا دەخشـێنینەوە:

١- حەوت فەرمانکردن بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لە حەوت ئایەتی یەکەمدا.

٢- لە سێ ئایەتی دوای ئەواندا، ئایەتەکانی: (٨، ٩، ١٠) باسی قیامەت و دژوارییەکەی و، قورسیی و زەحمەتییەکەی بۆ بێبڕوایان کراوە.

٣- لە بیست ئایەتەکانی: (١١ - ٣٠)دا، باسی بابایەکی ملهوڕی خۆ بەزلگر لە بەرانبەر خواو پەیامەکەیدا کراوە، کە زۆربەی هەرە زۆری ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست پێی (**ولید بن المغیرة**)یە و، دواییش هەر بە بێبڕوایی مردوە.

٤- باسی حیکمەتی نۆزدە (١٩)بوونی ژمارەی فریشتە دۆزەخەوانەکان، لە ئایەتی ژمارە (٣١)دا.

٥- لە شەش ئایەتەکانی: (٣٢ - ٣٧)دا، خواردنی سێ سوێند لەسەر ئەوەی ئاگری دۆزەخ گەورەترین و سامناکترین شتە، کە یەخەی بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوا دانەران دەگرێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ٧ فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ٨ فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ٩ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ١٠ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ١١ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ١٢ وَبَنِينَ شُهُودٗا ١٣ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا ١٤ ثُمَّ يَطۡمَعُ أَنۡ أَزِيدَ ١٥ كَلَّآۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ١٦ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ١٧ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ١٨ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ١٩ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ

﴿ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا وَٱلْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەی خۆ لە پۆشاكەوە پێچ! ﴿١﴾ هەڵسە (خەڵك) بترسێنەو وریا بكەوە ﴿٢﴾ پەروەردگاریشت (بە دڵ و زمان و كردەوە) بە گەورە بگرە ﴿٣﴾ پۆشاكیشت پاك بكەوە ﴿٤﴾ هەروەها لە پیسیی و خراپە دووربە ﴿٥﴾ منەتیش مەكە پێت زۆر بێ (كە دەبەخشی، یان فەرمانبەریی بۆ خوا دەكەی) ﴿٦﴾ بۆ پەروەردگاریشت خۆ ڕابگرە ﴿٧﴾ هەر كات فوو بە كەڕەنادا كرا (بۆ جاری دووەم و قیامەت هات) ﴿٨﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێكی سەختە ﴿٩﴾ بۆ بێبڕوایان ئاسان نیە ﴿١٠﴾ لە من و ئەو كەسە بگەڕێ كە بە تاك دروستم كردوە ﴿١١﴾ سامانێكی زۆرو فراوانیشم پێداوە ﴿١٢﴾ هەروەها كوڕانێكی هەمیشە ئامادە (لە لای لە كۆڕو مەجلیسیدا) ﴿١٣﴾ بە ئامادەكردنێكی تەواویش (هەموو هۆكارەكانی ژیان و گوزەرانم) بۆ ساز كردوون ﴿١٤﴾ ئنجا (وێڕای بێبڕوایی) بە تەمایە بۆیشی زیاد بكەم! ﴿١٥﴾ نەخێر (با واز لەو خەیاڵپڵاوە بهێنێ)، چونكە ئەو ناحەزو

سەرپێچییكاری ئایەتەكانمە ﴿١٦﴾ لەمەودوا وەهەوراز(ی سزا)ی سەختی هەڵدەگێڕم ﴿١٧﴾ چونكە ئەو بیری كردەوە (چ تۆمەتێك بۆ ئایەتەكانم هەڵبەستێ!) و تەگبیر (وقسە)یەكی سازكرد ﴿١٨﴾ بە كوشتبچێ چۆنی ساز كرد! ﴿١٩﴾ ئنجا (دووبارە) بە كوشتبچێ چۆنی ساز كرد ﴿٢٠﴾ دوایی تێراما (چی بڵێ لە دژی قورئان؟) ﴿٢١﴾ دوایی (ڕووی) خۆی گرژ كردو خۆی مۆنكرد ﴿٢٢﴾ ئنجا پشتی هەڵكردو خۆی بە زلگرت ﴿٢٣﴾ گوتی: ئەم (قورئان)ە تەنیا جادوویە دەگێڕرێتەوەو دەگوازرێتەوە ﴿٢٤﴾ ئەم (قورئان)ە بەس قسەی مرۆڤە ﴿٢٥﴾ لەمەودوا دەیخەمە سەقەر (ئاگری دۆزەخ)ەوە ﴿٢٦﴾ چ شتێك پێی زانینیوی سەقەر چییە! ﴿٢٧﴾ (ئاگرێكە هیچ ئەندامێك) ناهێڵێ (نەیسووتێنێ) و (هیچكەسیش) وازلێ ناهێنێ (سزای نەدات) ﴿٢٨﴾ زۆر (سووتێنەرو) پێست ڕەشهەڵگێڕەرە ﴿٢٩﴾ نۆزدە (فریشتە)ی بەسەرەوەن (و سەرپەرشتییكارنی) ﴿٣٠﴾ هاوەڵانی ئاگر(ی دۆزەخ)یشمان تەنیا لە فریشتان داناون، ژمارەكەشیان تەنیا بۆ تاقیكردنەوەی ئەوانەی بێبڕوا بوون، داناوە، تاكو ئەوانەی كتێبیان پێدراوە دڵنیابن (كە قورئانیش وەك كتێبەكانیان لە خواوەیە)، بڕوادارانیش بڕوای زێدە بێتە سەر بڕوایەكەیان و، ئەوانەی كتێبیان پێدراوەو بڕوادارانیش دوو دڵ نەبن (بەرانبەر بە قورئان)و، تاكو ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایەو، بێبڕوایانیش بڵێن: خوا مەبەستی لەم وێنەیە چییە؟ بەو شێوەیە خوا هەر كەسێكی بوێ گومڕای دەكات و، هەر كەسێكیشی بوێ ڕاستە ڕێی دەكات و، سەربازەكانی پەروەردگاریشت تەنیا خۆی دەیانزانێ و ئەو (ژمارەی)ەش (نۆزدە) بەس بیرخەرەوەیە بۆ بەشەر ﴿٣١﴾ بێگومان وانیە (كە بێبڕوایان دەڵێن) سوێند بە مانگ ﴿٣٢﴾ هەروەها سوێند بە شەوگار كە ڕادەبرێ ﴿٣٣﴾ دیسان سوێند بە بەرەبەیان كە ڕووناك دادێ ﴿٣٤﴾ ئەو (دۆزەخ)ە تاكی (شتە) گەورەو بێڕەزایەكانە ﴿٣٥﴾ ترسێنەرو ورياكەرەوەی بەشەرە ﴿٣٦﴾ بۆ هەر كام لە ئێوە كە بیەوێ پێشبكەوێ، یان دوابكەوێ ﴿٣٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْمُدَّثِّرُ): (أَصْلُهُ المُتَدَثِّر، وَهُوَ المُتَدَرِّعُ دِثَارَهُ، الدِّثارُ ما يُتَدَثَّرُ بِهِ، الدِّثَارُ: مَا يُلْبَسُ فَوْقَ الشِّعَار)، (مُدَّثِرُ) لە بنچینەدا (مُتَدَثِّر) [(ت)یەکە لە (د)ەکەدا دەغم کراوەو، بۆتە (مُدَّثِّر)] ئەویش کەسێکە پۆشاکەکەی خۆی لە خۆوەی پێچاوە، (دِثَارُ)یش ئەوەیە کە خۆی پێدا دەپۆشرێ، (دِثَارُ) ئەوەیە لە سەرووی (شِعَار)ەوە خۆی پێدا دەپۆشرێ، [(شِعَار) ئەوەیە لەسەر پێست دەپۆشرێ] بەڵام (دِثَار) ئەوەیە لەسەر ئەو بێ، واتە: پۆشاکی دەرەوە.

٢- (قُمْ): هەڵسە، (القِيَامُ للشَّيء: المُرَاعَاةُ للشَّيءِ وَالحِفْظُ لَهُ، وَالعَزْمُ عَلَى الشَّيء)، کە دەفەرموێ: (قُمْ) واتە: هەڵسە، هەڵسان بۆ شتێك بریتیە لە ڕەچاوکردنی ئەو شتەو پاراستنی ئەو شتە، هەروەها هەڵسان بۆ شتێك بریتیە لە دڵی خۆساغکردنەوە لەسەر ئەنجامدانی شتێك.

(فَأَنذِرْ): (الإِنْذَارُ: إِخْبَارٌ فِيْهِ تَخْوِيْفٌ)، (إِنْذَار): هەواڵ پێدانێکە ترساندنی تێدا بێ، (كَمَا أَنَّ التَّبْشِيْر إِخْبَارٌ فِيْه سُرُور)، هەروەك وشەی (تَبْشِيْر) هەواڵ پێدانێکە مایەی دڵخۆشیی بێ.

(وَٱلرُّجْزَ): (الرُّجْزُ: الصَّنَمُ والذَّنبُ وَالخُبْثُ، وَالعَذَابُ وَالشِّرْك)، وشەی (رُجز): هەندێکیان بە (رِجز)یان هێناوە، بە مانای بت و گوناهو پیسیی و سزا و هاوبەش بۆ خوا دانانیش دێ.

(فَٱهْجُرْ): (هَجَرَ يَهْجُر هَجْراً، تَبَاعَدَ)، کەواتە: (فاهْجُر) لێی دووربکەوەوە، چونکە (هَجَرَ يَهْجُر هَجْراً) واتە: لێی دوورکەوتەوە لێی، دوور دەکەوێتەوە، دوور کەوتنەوە.

(وَلَا تَمْنُن): واتـە: منـەت مەكـە، (مَـنَّ عَلَيْـه يَمُـنُّ منًّـاً: أنْعَـمَ عَلَيْـه نِعْمَـةً طَيِّبَـةً، وَمـنَّ عَلَيْـه مَنًّـاً: فَخَـرَ بِنِعْمَتِـه حَتَّـى كَدَّرَهَـا)، (مَـنَّ عَلَيْـه) بـە دوو واتايـان دێ، (مَـنَّ عَلَيْـه يَمُـنُّ منًّـاً: أنْعَـمَ عَلَيْـه نِعْمَـةً طَيِّبَـةً) واتـە: چاكەيەكـى باشـى لەگەڵـدا كـرد، شـتێكى باشـى پێـدا، بـەڵام وێـڕاى ئـەوەش (مَـنَّ عَلَيْـه) واتـە: شـانازيى كـرد بـەو چاكەيـەى لەگەڵيـدا كـرد بـوو، پێشـينان گوتوويانـە: منەتـى لەسـەر كـرد، بەچاويـدا دايـەوە.

(ٱلنَّاقُورِ): (الصُّـور، نَقَـرَ بِفُـلاَنٍ: دَعَـاهُ مِـن بَيْنِ القَـوْمِ، ونَقَـرَ بِلِسَـانِهِ: صَـوَّتَ)، (نَاقُـور) بـە مانـاى (صـور) دێ، واتـە: بووقيـى يـان كەڕەنـا، دەگوتـرێ: (نَقَـرَ بفـلانٍ) واتـە: لـە نێـو خەڵكەكـەدا بانگـى كـرد، هـاوارى لێكـرد، دەگوتـرێ: (نَقَـرَ بِلِسَـانِهِ: صَـوَّتَ) واتـە: دەنگـى لـە زمانـى هێنـا، وەك فيكـە كێشـان.

(عَسِيرٌ): (صَعْـب وشَـدِيْد)، (عَسِـير): بـە مانـاى قـورس و زەحمـەت دێ، پێچەوانەكەى (يَسِـيْر)ە، واتە: ئاسـان و سـێنا.

(وَحِيدًا): (الوَحِيْـدُ: المُنْفَـرِدُ)، ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ ﴾المُدَّثِّـر، واتـە: لـە مـن و لـەو كەسـە گـەڕێ كـە بـە تـاك دروسـتم كـردوە، لەنێـو خەڵكيـدا تاكـە، دەگوتـرێ: (وَحَّـدْ و وَحِيْـدْ و أَوْحَـد) بـۆ پياوێكـى تـاك، (وَحْـدَاء) بـۆ ئافـرەت، ئەگـەر گوتمـان (فُلاَنَـةُ وَحْـدَاء بَيْنَ النِسَـاء)، فـڵان ئافرەتـە لەنێـو ئافرەتانـدا تاكـە، بـەڵام بـۆ پيـاوان دەگوتـرێ: (أَوْحَـد) و (وَحَّـد) و (وَحِيـد)، واتـە: تـاك.

(مَّمْدُودًا): (المَـادَّةُ: الزِّيَـادَةُ المُتَّصِلَـة، مَـدَّ اللـه فِي عُمُـرِهِ، أي: أَطَالَـهُ)، (مَـادَّة): بريتيـە لـە زيادبوونێكـى پەيوەسـت، دەگوتـرێ: (مَـدَّ اللـه فِي عُمُـرِهِ) واتـە: تەمەنـى زيـاد كـرد، (المَمْـدُودُ: المَبْسُـوط) واتـە: فراوانكـراو، درێژكـراو، (المَـدُّ: الجَـرُّ) بـە مانـاى ڕاكێشـانى شـتێك دێ.

(شُهُودًا): (حُضُـوراً، شَـهِدَ: حَـضَرَ، شَـاهِد: حَـاضِر)، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴾، واتـە: كوڕانێـك هەميشـە لـە كـۆڕو مەجليسـەكەيدا ئامـادەن، (شَـهِدَ) بـە مانـاى (حَـضَرَ) واتـە: ئامادەبـوو، (شَـاهِد) بـە مانـاى (حَـاضِر) واتـە: ئامـادە.

(وَمَهَّدتُّ): (أي: سَوَّيْتُ وَهيَّأْتُ)، ﴿ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا ﴾، بـه سـازکردنێکی بـاش هـەل و مەرجەکانـم بـۆ سـازکردن، هۆکارەکانـم بـۆ ڕەخسـاندن.

(عَنِيدًا): (العَنِيْـدُ: المُعْجَـب بِمَـا عِنْـدَهُ)، (عَنِيـد): کەسـێك بـەوەی لەلایەتـی زۆر سەرسـام بـێ، (المُعَانِـدُ: المُباهـي بِمَا عِنْدَهُ)، کەسـێك خـۆی بـەو شـتەوە هەڵکێشـێ کـە لـە لایەتـی، دەسـەڵاتە، سـامانە، هـەر شـتێك هەیـە، (العَنُـوْد: الَّـذِي يُعْنِـدُ عَـنِ القَصْـدِ) کەسـێك کـە لـە مەبەسـت لادەدا، (العَنِيْـدُ: العَـادِلُ عَـنِ الطَّرِيْـق)، (عنيـد) کەسـێك کـە لـە ڕێ لادەدا، کەواتـە: (العَنُـود وَالعَنِيْـد) واتایـان زۆر لێـك نیزیکـە، (العَنِيْـد) کەسـێکە کـە لـە ڕێ لادەدا، بـەڵام (العَنُـوْد) کەسـێکە لـە ئامانـج لادەدا.

(سَأُرۡهِقُهُۥ): بـە بەرزایـی هەڵدەگێـرم، (رَهِقَـهُ الأَمْـرُ: غَشِـيْهُ بِقَهْـرٍ)، (رَهِقَـهُ الأَمْـرُ) واتـە: (عَـلَاهُ وَغَطَّـاهُ)، لـە ڕووی دەسـەڵات بەسـەردا فـەرز کردنـەوە، دایپۆشـی.

(صَعُودًا): (عَقَبَـةً شَـاقَّةً)، واتـە: دەروویەکـی سـەخت، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ﴾، واتـە: بـە هەورازێکـی سـەخت و دەروویەکـی سـەختی هەڵدەگێـرم لـە دۆزەخـدا.

(فَكَّرَ): (التَّفَكُّـرُ: جَـولَانُ الفِكْـرَة بِحَسَـبِ نَظَـر العَقْـل)، (فَكَّـر) واتـە: بیـری کـردەوە، ئنجـا بیرکردنـەوە بریتیـە لـە جووڵـەی بیـر بـە هـۆی سـەرنجدانی عەقڵـەوە، عەقـڵ تەماشـای شـتێك بـکات و چـاوی پێـدا بگێـڕێ و بیـری لێبکاتـەوەو ڕامێنـێ.

(وَقَدَّرَ): (القَـدَرُ وَالتَّقدِيْـرُ: تَبِيـيْن كَمِيَّـة الـشَّيء، وَقَدَرتُـهُ وَقَدَّرتُـهُ)، (قَـدَر) و (تَقْدِيْـر) بریتیـە لـە ڕوونکردنـەوەی ئەنـدازەی شـتێك، دەگوتـرێ: (قَدَرتُـهُ وَقَدَّرتُـهُ)، واتـە: هـەم بـە گیـرەو، هـەم بەبـێ گیـرە (شَـدَّة)، هەردووکیـان بـە مانـای ئەنـدازەی شـتەکەم دیارییکـرد، (وَالتَّقْدِيـرُ: التَّفَكُّـرُ فِي الأَمْـرِ بِحَسَـب نَظَـر العَقْـل، وَبِنَـاء الأَمْـرِ عَلَيْـهِ)، (تقديـر): بریتیـە لـە بیرکردنـەوە لـە شـتێك بەهـۆی سـەرنجدانی عەقڵـەوەو، دواییـش شـتێك لەسـەر ئەنجامـی ئـەو بیرکردنەوەیـە بنیـات بـنرێ.

(نَظَرَ): (النَّظَـرُ: تَقْلِيْـبُ البَـصَرِ، وَالبَصِـيْرَة لِإِدْرَاكِ الـشَّيء وَرُؤْيَتِـه)، (نَظَـر): بريتيـە لـە چاوپێـدا گێـڕان، یاخـود دڵ پێـدا گێـڕان بـۆ زانینـی شـتێك و بینینـی شـتێك.

(عَبَسَ): (العُبُـوسُ: القُطُـوبُ)، (عَبَـسَ) بـە مانـای: ڕووی گرژکـرد، دێ، (وَقَـدْ يُـرَادُ بِـه التَّأَمُّـل وَالفَحْـص)، جـاری واش هەیـە مەبەسـت لـەو ڕوو گرژکردنـە، ڕامـان و پشـکنینی شـتێکە، ئنجـا (العُبُـوسُ: قُطُـوبُ الوَجْـهِ مِـنْ ضِيْـق الصَّـدْرِ)، (عُبُـوس): بریتیـە لـە ڕوو گرژکـردن لـە ئەنجامـی سینەو دڵتەنـگ بـوون دا، لـە حاڵێـك دا کەسـێك لـە بەرانبـەر شـتێکدا دامـاوەو وەسـتاوە.

(وَبَسَرَ): (البَـسْرُ: الإِسْـتِعْجَالُ بَالـشَّيء قَبْـلَ أَوَانِـهِ)، (بـسر): بریتیـە لـە پەلەکـردن لـە شـتێك پێـش ئـەوەی کاتـی خـۆی بـێ.

(أَدْبَرَ): (دَبَـرَ فُـلَانٌ القَـوْمَ: صَـارَ خَلْفهُـم) واتـە: فڵانکـەس کەوتـە دوای خەڵکەکـە، بـەڵام (أَدْبَـرَ: أَي أَعْـرَضَ وَولَّى دُبُـرَهُ)، واتـە: پشـتی هەڵکـردو پاشـی تێکـرد.

(سِحْرٌ): (الخِـدَاعُ، وَتَخِيْيـلاتٌ لَا حَقِيْقَـة لَهَـا، وَالسِّـحْرُ: إِسْـتِجْلَابُ مُعَاوَنَـةِ الشَّـيْطَان)، وشـەی (سِـحْر) بـە مانـای فێـڵ و، بـە مانـای خەیاڵێـك خسـتنە بەرچـاوی کەسـێك، ئـەو خەیاڵـە ڕاسـتیی نەبـێ، هەروەهـا (سِـحْر) بریتیـە لـە هەوڵـدان بـۆ پەیداکردنـی هاوکاریـی شـەیتانەکان، ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (البقـرة)دا، لـە لێکدانـەوەی ئـەو ئایەتـە موبارەکـەدا کـە باسـی هـاڕووت و ماڕووت دەکات، کورتـە باسـێکمان لـە بـارەی جـادووەوە کـردوە.

(يُؤْثَرُ): (المَاثِـرُ: مَـا يُـرْوَى مِـنْ مَـكَارِمِ الإِنْسَـان، وَيُؤْثَـر أَي: يُـرْوَى)، (يُؤْثَـر) بـە مانـای (يُـرْوَى) دەگێڕدرێتـەوە، (مَثَاثِـر): کـۆی (مَأْثَرة)یـە، ئەوەیـە کـە لـە ڕەوشـتە بەرزەکانـی مرۆڤێـك و چاکەکانـی دەگێڕدرێتـەوە.

(سَقَرَ): (سَـقَرَتْهُ الشَّـمْسُ، صَقَرَتْـهُ: لَوَّحَتْـهُ وَأَذَابَتْـهُ، وَسَـقَر: عَلَـمٌ لِجَهَنَّـم)، لـە زمانـی عەرەبییـدا دەگوتـرێ: (سَـقَرَتْهُ الشَّـمْسُ وصَقَرَتْـهُ)، بـە (سـین و صـاد) (أَي: لَوَّحَتـهُ

**وأَذَابَتْـهُ**)، واتـە: ڕەشـی هەڵگێـڕاو تواندیـەوە، وشـەی (**سَـقَر**) ناوێکـی ناسـینە بـۆ دۆزەخ، یەکێـك لـە ناوەکانیەتـی.

(عِدَّتَهُمۡ): (**العِدَّةُ: الشَّيءُ المَعْدُود**)، (**عِدَّة**): بریتیە لە شتێکی ژمێردراو.

(فِتۡنَةً): (**إِخْتِبَـار وَعَـذَاب**)، (**فِتْنَـة**) بـە مانـای تاقیکردنـەوەو، بـە مانـای سـزاو ئـازار دێ، واتـە: کردوومانـە بـە مایـەی سـزاو ئـازار، یاخـود کردوومانـە بـە مایـەی تاقیکردنـەوە، تاقیکردنـەوەش زیاتـر لەگـەڵ ئـەو سـیاقەدا دەگونجـێ.

(أَسۡفَرَ): (**السَّـفْرُ: كَشْـفُ الغِطَـاء، أَسْـفَر: أَشْرَقَ لَوْنُـهُ، أَسْـفَرْتُ: دَخَلْـتُ فِي الصبـاح أي: أَصْبَحْـتُ**)، وشـەی (**سَـفْر**) بـە مانـای لابردنـی پۆشـاك لەسـەر شـتێك، دێ، (**أَسْـفَرَ: أَشْرَقَ لَوْنُـهُ**) واتـە: ڕەنگەکـەی ڕوون بـوو، (**أَسْـفَرْتُ: دَخَلْـتُ فِي الصَّبَاح وَأَصبحْـتُ**)، (**أَسْـفَرْتُ**) بـە مانـای کەوتمـە کاتـی ڕووناکیـی بەرەبەیـان و، کەوتمـە بەرەبەیـان، (**إِسْـفَار**) لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە. (**أَسْـفِروا بالصلاة**) واتـە: نوێـژ بکـەن لـە کاتێکـدا دنیـا تۆزێـك ڕوونـاك دادێ، (**الإِسْـفارُ بِصَّلَاة الصُّبْحِ**)، ئەبـوو حەنیفـە ڕای وایـە: دەبـێ نوێـژی بەیانـی کاتێـك بکـرێ دنیـا ڕوونـاك داهاتبـێ، هەندێکـی دیکـە لـە زانایـان دەڵێـن: واتـە: وا باشـە نوێـژی بەیانـی کاتێـك بکـرێ، دنیـا ڕوونـاك دانەهاتبـێ، واتـە: لـە سـەرەتای کاتەکەیـەوە بکـرێ.

(ٱلۡكُبَرِ): (**جَمْـعُ الكُـبْرَى، مِثْـلُ أُوَل جَمْـع أُولَى**)، (**كُـبَر**) کـۆی (**كُبْرَى**)یـە، (**كُـبَر**) واتـە گەورەترینـەکان، (**كُـبْرَى**) واتـە: گەورەتـر، بـۆ مێینەیـە، مێینـەی مەجازیـی، وەك (**أُوَل**) کـۆی (**أُولَى**)یـە، (**أُولَى**) واتـە: باشـتر، (**أُوَل**) واتـە: باشـترینەکان.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

**یەکەم:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢﴾، کە پێشتریش هێنامان، بەڵام لێرەشدا بە بۆنەی هۆی هاتنە خوارەوەوە، جارێکی دیکە ئەو ڕیوایەتە دێنین:

**{عَنْ جَابِرِ بنِ عبد الله رضي الله عنهما: أُحَدِّثُكُمْ مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: جَاوَرْتُ بِحِرَاءَ شَهْرًا، فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي نَزَلْتُ فَاسْتَبْطَنْتُ بَطْنَ الْوَادِي، فَنُودِيتُ فَنَظَرْتُ أَمَامِي وَخَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شمالي، فَلَم أَر أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ فَنَظَرْتُ فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا هُوَ عَلَى الْعَرْشِ فِي الْهَوَاءِ -يَعْنِي جِبْرِيلَ ﷺ- فَأَخَذَتْنِي رَجْفَةٌ شَدِيدَةٌ، فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ: دَثِّرُونِي، فَدَثَّرُونِي فَصَبُّوا عَلَيَّ مَاءً، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢﴾}، (أخرجه البخاري: ٤، ٣٢٣٨، ٤٩٢٢، ٤٩٢٤، ٤٩٢٥، ٤٩٢٦، ٤٩٥٤، ٦٢١٤، ومسلم: ١٦١، ٢٥٥، ٢٥٦، ٢٥٧، ٢٥٨).**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەوەتان بۆ باس دەکەم، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باسکردین، فەرمووی: مانگێك لە ئەشکەوتی (حِرَاءَ)دا بووم بۆ ئیعتیکاف و پەرستش، (بەو شێوەیەی زانیویەتی)، کاتێك مانگەکەم تەواو کرد، دابەزیم، کە کەوتمە نێو قووڵایی شیوەکە بانگکرام، تەماشای پێشەوەی خۆم و، دواوەی خۆم و، لای ڕاست و لای چەپم کرد، کەسم نەبینی، دووبارە بانگکرام دیسان سەرنجم دا کەسم نەبینی، دووبارە بانگکرام سەرم بەرز کردەوە، تەماشام کرد لەسەر تەختێکە لە هەوادا، واتە: جیبریل ﷺ لەرزینەوەیەکی سەخت گرتمی، هاتمەوە لای خەدیجە، گوتم: داپمپۆشن، دایان پۆشیم و ئاویان بەسەردا کردم {بۆ ئەوەی حاڵەتەکەم نەمێنێ، دیارە دوایی چۆتە نێو نوێنەوە] ئنجا خوا (عَزَّ وَجَلَّ) ئەو ئایەتە موبارەکانەی دابەزاندن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢﴾، ئەی ئەو کەسەی خۆت لە نوێنەوە پێچاوە، خۆت داپۆشیوە! هەستە خەڵك بترسێنە و وریا بکەوە.

**دووەم:** بە نسبەت ئەو بیست ئایەتانەی لە بارەی کافرێکی ملهوڕەوە دابەزیون: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا .... عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾، لەو بارەوە چەند دەقێك هاتوون، ئێمە چواریان لێ دێنین، کە لە ڕووی سەنەدەوە، ڕەنگە تۆزێك باشتر بن لەوانی دیکە:

١-{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: إِنَّ الوَلِيدَ بْنَ المُغِيرَةِ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَرَأَ عَلَيْهِ الْقُرْآنَ، فَكَأَنَّهُ رَقَّ لَهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ أَبَا جَهْلٍ فَأَتَاهُ، فَقَالَ: يَا عَمُّ! إِنَّ قَوْمَكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَجْمَعُوا لَكَ مَالًا لِيُعْطُوكَهُ، فَإِنَّكَ أَتَيْتَ مُحَمَّدًا لِتَعْرِضَ لِمَا قِبَلَهُ، قَالَ: قَدْ عَلِمَتْ قُرَيْشٌ أَنِّي مِنْ أَكْثَرِهَا مَالًا، قَالَ: فَقُلْ فِيهِ قَوْلًا يَبْلُغُ قَوْمَكَ أَنَّكَ مُنْكِرٌ لَهُ، قَالَ: وَمَاذَا أَقُولُ؟ فَوَاللهِ مَا فِيكُمْ رَجُلٌ أَعْلَمُ بِالشِّعْرِ مِنِّي، لَا بِرَجَزِهِ وَلَا بِقَصِيدِهِ مِنِّي، وَلَا بِأَشْعَارِ الْجِنِّ، وَاللهِ مَا يُشْبِهُ هَذَا الَّذِي يَقُولُ شَيْئًا مِنْ هَذَا، وَوَاللهِ إِنَّ لِقَوْلِهِ الَّذِي يَقُولُ لَحَلَاوَةً، وَإِنَّ عَلَيْهِ لِطَلَاوَةً، وَإِنَّهُ لَمُثْمِرٌ أَعْلَاهُ مُغْدِقٌ أَسْفَلَهُ، وَإِنَّهُ لَيَعْلُو وَمَا يُعْلَى، وَإِنَّهُ لَيُحَطِّمُ مَا تَحْتَهُ، قَالَ: وَاللهِ مَا يَرْضَى قَوْمُكَ حَتَّى تَقُولَ فِيهِ، قَالَ: فَدَعْنِي أُفَكِّرْ، فَلَمَّا فَكَّرَ، قَالَ: هَذَا سِحْرٌ يُؤْثَرُ، يَأْثُرُهُ عَنْ غَيْرِهِ، فَنَزَلَتْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا .... عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾} **(أخرجه: الواحدي في أسباب النزول: ص٢٩٥، والحاكم في المستدرك: ج٢، ص٥٠٧،٥٠٦، وعنه البيهقي في شُعَبِ الإيمان: ص١٣٣، ودلائل النبوة: ج٢، ص١٩٩، قال مؤلِّفا الإستيعاب في بيان الأسباب: وهذا سندٌ ضعيفٌ، قال: الحاكم: هذا حديث صحيح على شرط البخاري ومسلم ولم يخرجاه ووافقه الذهبي)**، کەواتە: ڕاجیایی هەیە لە ڕووی سەنەدەکەیەوە.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە، کە وەلیدی کوڕی موغیرە هاتوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەویش قورئانی بەسەردا خوێندۆتەوەو ئەویش دڵی بۆی نەرم بووە، ئەوەش بە ئەبوو جەهل گەیشتۆتەوەو هاتوە بۆ لای و گوتوویەتی: ئەی مامە! خەڵکەکەت پێیان وایە پارەت بۆ کۆ بکەنەوەو بتدەنێ، چونکە تۆ چوویە لای موحەممەد و تەماعت لەوەدایە کە لەلایەتی، (واتە: لێی بەهرەمەند بی لە ڕووی ماددییەوە)، وەلیدی کوڕی موغیرەش

گوتوویـەتی: قوڕەیـش دەزانـن کـە مـن لـە هەموویـان مـاڵ و سـامانم زیاتـرە! ئەویـش گوتـی: کەواتـە قسـەیەکی وا لـە بـارەی موحەممـەدو قورئانـەوە بکـە، کـە بگاتـەوە خەڵکەکـەت و بزانـن تـۆ نکووڵیـی لـێ دەکـەی، (نکووڵییکـەری، وی و ڕقـت لێیەتـی)، ئەویـش گوتـی: سـوێند بەخـوا هیـچ پیاوێکتـان تێـدا نیـە لـە مـن لـە شـیعر شـارەزاتر بـێ و، هیـچ کامێکتـان تێـدا نیـە لـە مـن لـە ڕەجـەزو قەصیـد (کـە دوو جـۆری شـیعرن)، شـارەزاتر بـێ و، لـە مـن شـارەزاتر بـێ لـە شـیعرەکانی جنـد، بـە خـوا ئـەوەی دەیڵـێ وەك هیـچ کام لەوانـە ناچـێ و، سـوێند بـە خـوا ئـەوەی دەیڵـێ، زۆر شـیرینەو، زۆر ڕازاوەیـە، وەك درەختێـك وایـە کـە سـەرەکەی زۆر بەردارەو، خوارێشـی زۆر بەرهەمـدارەو، ئـەو قسـەیەی ئـەو دەیڵـێ بـەرز دەبێتـەوەو سـەر دەکـەوێ و، هیـچ قسـەیەك بەسـەریدا سـەرناکەوێ و، هـەر قسـەیەك بکەوێتـە بەرانبـەری تێکـی دەشـکێنێ، ئەبـوو جەهلیـش دەڵـێ: ئاخـر خەڵکەکـەت ڕازی نابـن، هـەر دەبـێ قسـەیەکی لـە دژ بکـەی، ئەویـش دەڵـێ: لێـم گـەڕێ بـا بیـر بکەمـەوە، کاتێـك بیـر دەکاتـەوە دەڵـێ: ئەمـە جادوویـەو لـە جگـە لـە خۆیـەوە دەیگێڕێتـەوە، ئیـدی لـەو بـارەوە ئـەو ئایەتـە موبارەکانـە دابەزیـن: ﴿ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴿١١﴾ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودٗا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا .... عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

**٢-** هەر لەو بارەوە ئەم ڕیوایەتەش دێنین: {**عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما، **قَالَ: ثُمَّ إِنَّ الوَلِيدَ بْنَ الْمُغِيرَةِ اجتَمَعَ إِلَيْهِ نَفَرٌ مِن قُرَيْشٍ، وَكَانَ ذَا سِنٍّ فِيهِم، وَقَدْ حَضَرَ المَوْسِمَ فَقَالَ لَهُمْ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، إِنَّهُ قَدْ حَضَرَ هَذَا المَوْسِمُ، وَإِنَّ وُفُودَ العَرَبِ سَتَقْدَمُ عَلَيْكُمْ فِيهِ، وَقَدْ سَمِعُوا بِأَمْرِ صَاحِبِكُمْ هَذَا، فَأَجْمِعُوا فِيهِ رَأْيًا وَاحِدًا، وَلَا تَخْتَلِفُوا فَيُكَذِّبَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا، وَيَرُدَّ قَوْلُكُمْ بَعْضُهُ بَعْضًا، فقَالُوا: فَأَنْتَ يَا أَبَا عَبْدِ شَمْسٍ، فَقُلْ وَأَقِمْ لَنَا رَأْيًا نَقُولُ بِهِ، فقَالَ: بَل أَنْتُمْ فَقُولُوا أَسْمَعْ، فقَالُوا: نَقُولُ كَاهِنٌ، فقَالَ: لَا وَاللَّهِ مَا هُوَ بِكَاهِنٍ، لَقَدْ رَأَيْنَا الْكُهَّانَ فَمَا هُوَ بِزَمْزَمَةِ الْكَاهِنِ وَلَا سَجْعِهِ، فقَالُوا: فَنَقُولُ: مَجْنُونٌ، قَالَ: مَا هُوَ بِمَجْنُونٍ، لَقَدْ رَأَيْنَا الْجُنُونَ وَعَرَفْنَاهُ، فَمَا هُوَ بِخَنْقِهِ، وَلَا تَخَالُجِهِ، وَلَا وَسْوَسَتِهِ، فقَالُوا: فَنَقُولُ: شَاعِرٌ، قَالَ: مَا هُوَ بِشَاعِرٍ، لَقَدْ عَرَفْنَا الشِّعْرَ كُلَّهُ رَجَزَهُ وَهَزَجَهُ وَقَرِيضَهُ وَمَقْبُوضَهُ وَمَبْسُوطَهُ، فَمَا هُوَ بِالشِّعْرِ، قَالُوا: فَنَقُولُ: سَاحِرٌ، قَالَ:**

مَا هُوَ بِسَاحِرٍ، لَقَدْ رَأَيْنَا السُّحَّارَ وَسِحْرَهُمْ، فَمَا هُوَ بِنَفْثِهِمْ وَلَا عَقْدِهِمْ ، قَالُوا: فَمَا نَقُولُ يَا أَبَا عَبْدِ شَمْسٍ؟ قَالَ: وَاللَّهِ إِنَّ لِقَوْلِهِ لَحَلَاوَةً، وَإِنَّ أَصْلَهُ لَعَذِقٌ، وَإِنَّ فَرْعَهُ لَجُنَاةٌ (قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: وَيُقَالُ لَغَدِقٌ)، وَمَا أَنْتُمْ بِقَائِلِينَ مِنْ هَذَا شَيْئًا إِلَّا عُرِفَ أَنَّهُ بَاطِلٌ، وَإِنَّ أَقْرَبَ الْقَوْلِ فِيهِ لَأَنْ تَقُولُوا سَاحِرٌ، جَاءَ بِقَوْلٍ هُوَ سِحْرٌ يُفَرِّقُ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَأَبِيهِ، وَبَيْنَ الْمَرْءِ وَأَخِيهِ، وَبَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجَتِهِ، وَبَيْنَ الْمَرْءِ وَعَشِيرَتِهِ، فَتَفَرَّقُوا عَنْهُ بِذَلِكَ، فَجَعَلُوا يَجْلِسُونَ بِسُبُلِ النَّاسِ حِينَ قَدِمُوا الموسِمَ، لَا يَمُرُّ بِهِمْ أَحَدٌ إِلَّا حَذَّرُوهُ إِيَّاهُ، وَذَكَرُوا لَهُمْ أَمْرَهُ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِي الْوَلِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ وَفِي ذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِ: ﴿ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴾، وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِي النَّفَرِ الَّذِينَ كَانُوا مَعَهُ يُصَنِّفُونَ الْقَوْلَ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَفِيمَا جَاءَ بِهِ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى: (كَما أَنْزَلْنا عَلَى الْمُقْتَسِمِينَ: ﴿ (٩٠) ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلۡقُرۡءَانَ عِضِينَ (٩١) فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ (٩٢) ﴾حجر، فَجَعَلَ أُولَئِكَ النَّفَرُ يَقُولُونَ ذَلِكَ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِمَن لَقُوا مِن النَّاسِ، وَصَدَرَتْ الْعَرَبُ مِن ذَلِكَ الموْسِمِ بِأَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَانْتَشَرَ ذِكْرُهُ فِي بِلَادِ الْعَرَبِ كُلِّهَا} (قلنا وهذا سندٌ ضعيف شيخ بن إسحاق مجهول وهو عند الطبري في جامع البيان: ج٢٩، ص٣٦).

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس ﷺ گێڕاویەتـەوە کـە وەلیـدی کـوڕی موغیـرە، لەگـەڵ کۆمەڵێـك لـە زلـە زلانـی قوڕەیـش، کـە ئـەو لـە هەموویـان بەتەمەنـترو خـاوەن پێگەتـر بـوو، دانیشـت، لـە کاتێکـدا کاتـی حـەج و عومـرە هاتبـوە پێشـێ، بەپێـی عـادەت و نەرێتـی سـەردەمی نەفامیـی هـۆزی قوڕەیـش و عەرەبـەکان، وەلیـدی کـوڕی موغیـرە گوتـی: شـاندەکانی عـەرەب دێـن بـۆ لاتـان و هەواڵـی ئـەو هاوەڵەشـتانیان بیسـتوە، (واتـە: موحەممـەد ﷺ)، بۆیـە لەسـەر یـەك ڕا کۆببنـەوەو، باڕاجیاییتـان نەبـێ، هەندێکتـان هەندێکتـان بـە درۆ دابنێـن و، هەندێکتـان قسـەی هەندێکتـان هەڵبوەشـێننەوە، گوتیـان: ئـەی بابـی عەبـدو شەشـەمس تـۆ ڕایەکـمان پـێ بڵـێ، تاکـو ئێمـەش تەبەنیـی بکەیـن و پێـی هەڵسـین، ئەویـش گوتـی: ئێـوە بیڵێـن: منیـش گوێتـان بـۆ دەگـرم، داخـۆ ڕاتـان چییـە؟

گوتیـان: دەڵێیـن: کاهینـە (فاڵچییـە)، گوتـی: کاهیـن نیـە، ئێمـە کاهینەکانـمان بینیـون، ئـەوە قسـەکردن و زەمزەمـەو دەنگـە دەنگـی کاهینـان نیـە.

گوتیـان: دەڵێیـن: شـێتە، گوتـی: شـێت نیـە، شـێتی مـان بینیـوەو دەزانیـن، ئـەو وەك شـێتان حاڵەتـی تەنگەنەفەسـیی و، حاڵەتـی وەسوەسـە کـردن و هاوسـەنگی تێکچـوونی نیـە.

گوتیـان: دەڵێیـن: شـاعیرە، گوتـی: شـاعیریش نیـە، شـیعر دەزانیـن بـە هەمـوو جۆرەکانـی شـیعرەوە، (**رجـز**)ی و (**هـزج**)ی و (**قَرِیـض**)ی و (**مَقْبُـوض**)ی و (**مَبْسُـوط**) ی، (ئەمانـە جۆرەکانـی شـیعرن بـە عەرەبیـی)، ئـەو قسـەیەی ئـەو دەیڵـێ شـیعر نیـە.

گوتیـان: دەڵێیـن: جادووگـەرە، گـوتی: جادووگەریـش نیـە، جادووگەرانمـان بینیـون، جادووەکەیانمـان بینیـوە، فووکردنیـان و گـرێ لـە شـت دانیشـیانمان بینیـوە.

گوتیان: ئەی ئەبوو عەبدو شەمس تۆ چی دەڵێی؟

گوتـی: سـوێند بـە خـوا ئـەو قسـەیەی دەیڵـێ، (واتـە: قورئـان) زۆر شـیرینە، بنکەکـەی زۆر بەرهەمـدارەو، بـەرو میوەکەشـی نیزیکـەو، ئێـوە هیـچ کام لـەو قسـانە لـە بارەیـەوە ناکـەن، مەگـەر دەزانـرێ کـە قسـەیەکی بـێ بنەمایە، بـەڵام نیزیکتریـن قسـە کـە لـە بارەیـەوە بکـەن، ئەوەیـە بڵێـن: جادووگـەرە، چونکـە کـوڕو بابـان لێـك دەکات، بـراو بـرا لێـك دەکات، پیـاوو ژنـان لێـك دەکات، پیـاوو خزمانـی لێـك دەکات، ئیـدی بڵاوبـوون و ئـەو قسـەیان تەبەنیـی کـردو، کاتێـك کاتـی حـەج و عومـرە هـات، بـە لای هـەر کەسـێکدا تێپەڕیبـوان، دەیانترسـاندو، ئەوەیـان بـۆ باسـدەکرد کـە ئـەوە جادووگـەرە، ئنجـا خـوا ﷻ لـە بـارەی وەلیـدی کـوڕی موغیـرەوە، ئـەو ئایەتانـەی ناردنـە خـوار: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ ﴾، لـە بـارەی ئەوانەشـەوە کـە لەگەڵـی بـوون، لـە بـارەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و لـە بـارەی قورئانـەوە، قسـەکانی خۆیانیـان پۆلێـن دەکـردن، ئـەم سـێ ئایەتـەی سـوورەتی (**الحجـر**) هاتنـە خـوار: ﴿ كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلۡقُرۡءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٢﴾ ﴾، واتـە: وەك دامانبەزانـدە سـەر دابەشـکەران، ئەوانـەی قورئانیـان بـەش بـەش کـرد، سـوێند بـە پـەروەردگارت لـە هەموویـان دەپرسـینەوە،

واتــە: پۆلێنیــان دەکــرد: جادوویــە، کاهینــە، شــیعرە، ئنجــا ئەوانــە هــەر کاتێــك دەگەیشــتنە خەڵــك، ئــەو قســەیان دەکــردو، لــە دوای ئــەو مەوســیمەی ئــەو ســاڵەوە، نــاوو ناوبانگــی پێغەمبــەری خــوا ﷺ بڵاوبــۆوە، (هەڵبەتــە زیاتــر بــە لایەنــی خراپــەو نەرێنیــی دا).

٣- ڕیوایەتێکی دیکەش لە بارەی ئەم ڕستە موبارەکەوە: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾، دێنین، لە قەتادەوە، دەڵێ:

**(زَعَمُـوا أَنَّـهُ قَـالَ: وَاللَّـهِ لَقَـدْ نَظَـرْتُ فِـيمَا قَـالَ الرَّجُـلُ، فَـإِذَا هُـوَ لَيْـسَ بِشِـعْرٍ، وَإِنَّ لَـهُ لَحَـلَاوَةً، وَإِنَّ عَلَيْـهِ لَطَـلَاوَةً، وَإِنَّـهُ لَيَعْلُـوُ وَمَـا يُعْـلَى، وَمَـا أَشُـكُّ أَنَّـهُ سِـحْرٌ، فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ فيـه: ﴿فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ٢٠ ثُمَّ نَظَرَ ٢١ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾، قَبَـضَ مَـا بَـيْنَ عَيْنَيْـهِ وَكَلَـحَ)**[1].

قەتــادە گوتوویەتــی: پێیــان وابــووە خــوا لــەو بــارەوە فەرموویەتــی: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾، کــە وەلیــدی کــوڕی موغیــرە گوتوویەتــی: ســەرنجی ئــەو قســەیەم داوە کــە ئــەو پیــاوە دەیڵــێ، تەماشــام کــرد شــیعر نیــەو، تەماشــام کــردوە شــیرینایەتیی هەیــەو، جوانیــی و ڕەونەقــی هەیــەو، ســەردەکەوێ و هەرگیــز ژێــر ناکــەوێ، بــەڵام دوو دڵییش نیــم کــە جادوویــە، ئیــدی لــەو بــارەوە خــوا ئــەوەی نــاردە خــوار: ﴿فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ٢٠ ثُمَّ نَظَرَ ٢١ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾، واتــە: نێوچەوانــی گــرژ کــرد.

٤- هەر لەو بارەوە ئەو دەقەش دێنین: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ١١﴾، لە من و ئەو کەسە بگەڕێ کە بە تەنیا دروستم کردوە، یاخود: بە تاك دروستم کردوە، هەردووك واتایەکەی هەن: **(عَنْ مُجَاهِدٍ رَحِمَهُ الله قَالَ: نَزَلَتْ فِي الْوَلِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ، وَكَذَلِكَ فـي الخَلْق كُلِّهِمْ: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ١١﴾)**[2].

---

(١) جامـع البيـان: ج٢٢، ص٩٨، قلنـا: وهـذا مرسـل صحيـح الإسـناد، الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب: ج٣، ص ٤٩٧ -٤٩٩.

(٢) جامـع البيـان: ج٢٩،، ص: ٩٦، قلنـا: وهـذا مرسـل صحيـح الإسـناد، وذكـره السـيوطي في الـدر المنثـور: ج: ، ص: ٣٢٩، وزاد نسـبته لعبـد بـن حميـد وابـن المنـذر وابـن أبي حاتـم.

واتـە: موجاهیـد گوتوویەتـی: ئـەوە لـە بـارەی وەلیـدی کـوڕی موغیـرەو لـە بـارەی تێکـڕای خەڵکـەوە، هاتۆتـە خـوارێ، واتـە: وەلیـدی کـوڕی موغیـرەو جگـە لـە ئەویـش دەگرێتـەوە، چونکـە خـوا هەموویانـی بـە تـاك دروسـتکردوون، بـەو واتایـە کـە دروسـتی کـردوون، تەنیـا بـووە، بـەڵام ئەگـەر مانـای ئەوەبـێ: کـە خـوا دروسـتیکردوە لـە نێـو خەڵکـدا، تاکـەو، کۆمەڵێـك شـتی پێـداوە لەنێـو خەڵکەکەیـدا تـاك بۆتـەوە، دیـارە هـەر وەلیـد دەگرێتـەوەو، هەروەهـا کەسـێکی دیکـەی وەك وەلیدیـش بـێ دەیگرێتـەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، کـە ئـەوەش مەبەسـتی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای توانادار دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾، خـوا ﷻ بانگـی پێغەمبـەری ﷺ خاتـەم دەکات و بـە: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾، دەیدوێنـێ، لـە سـوورەتی پێشـوودا بـە (**يا أيها المُزَّمـل**)، دوانـدی، هەندێـك لـە زانایـان (**المُزَّمـل والمُدَّثِر**)یـان بەیـەك واتـا هێنـاون، واتـە: کەسـێك کـە خـۆی بـە پۆشـاکەکەی داپۆشـیوە، بـەڵام وەك پێشـتریش گوتـم: وای تێدەگـەم، کـە (**تَزَمُّـل**) خـۆ بـە نوێـن و پێخـەف داپۆشـین بـێ و، (**المُزَّمِّل**)یـش ئەسـڵەکەی (**المُتَزَمِّـل**)ە، واتـە: کەسـێك کـە خـۆی داپۆشـیوە بـە نوێـن و پێخـەف، بـەڵام (**تَدَثُّـر**) خـۆ بـە پۆشـاکی

خۆ داپۆشینه، واته: پۆشاکی سەرەوەی کە لەسەر جلان لەبەر دەکرێ، چونکە لە (**دِثار**)ەوە هاتوه، (**شِعار**)یش ئەو پۆشاکەیە کە لەسەر پێست لەبەر دەکرێ، (**ما يلي الشَّعْرَ**)، لەسەر پێست و مووەکان، بەڵام (**دِثار**) ئەوەیە کە بەسەر دیوی دەرەوەی جەستەدا دەدرێ، بەسەر پۆشاکدا دەدرێ.

بە هەرحاڵ خوا پێغەمبەری خاتەم ﷺ لێرەدا دەدوێنێ، بەپێی ئەو حاڵەتەی لەسەری بووە کە بریتی بووە لە: خۆ داپۆشینی بە پۆشاکێك، یاخود: پۆشاك لە خۆوە پێچانێکی، ئنجا ئەمە جۆرێك لە لاواندنەوەو دڵخۆشکردن و میهرەبانیی لەگەڵ نواندنی تێدایە، بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (**مُلاَطَفَة**) واتە: لوتف و میهرەبانیی لەگەڵ نواندن.

وەك گێڕراوەتەوە:

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك دەچێ بۆ ماڵی فاتیمەی کچی، کە هاوسەرەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی ئامۆزای بووە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەپرسێ عەلیی لە کوێیە؟ فاتیمەش هەواڵی پێدەدا کە یەکدییان تووڕە کردوەو زویر بووەو، چۆتە مزگەوت، کە دەچێ تەماشا دەکات عەلی لەسەر زەوی مزگەوتەکە پاڵکەوتوەو ڕاکشاوە، گڵ و خۆڵ بە تەنیشتیەوە نووساوە، پێی دەفەرموێ: (**قُمْ يَا أَبَا تُرَاب**)، هەڵسە هەی بابی گڵ، واتە: گڵت پێوە نووساوە، کە ئەمە جۆرێك لە (**مُلاطفة**)و لاواندنەوەو، دڵخۆشکردن و میهرەبانیی لەگەڵ نواندنە، ئنجا دوای ئەو جۆرە بانگکردنە، لێرەدا خوا ﷻ حەوت ئەرك و فەرمان ئاراستەی پێغەمبەرەکەی دەکات:

١- ﴿ قُمْ ﴾، فەرمانی یەکەم: هەڵسە، هەڵسان دەگونجێ مەبەست پێی مانا ڕواڵەتییەکەی بێ، واتە: هەڵسەو لە جێگا وەرە دەرێ و ڕامەکشێ، دەشگونجێ مەبەست پێی مانا مەعنەوییەکەی بێ، واتە: خۆت گورج و گۆڵ بکەو بڕیار بدە، ئیرادەی خۆت بخەگەڕ.

٢- ﴿ فَأَنذِرۡ ﴾، فەرمانی دووەم: یەکسەر دوای هەڵسان و بڕیاردانت، و خۆ گورج و گۆڵ کردنت، وریا بکەوە و بترسێنە نەیفەرمووە کێ بترسێنێ، واتە: خەڵك بە گشتیی بترسێنە، وریایان بکەوە کە سەرەنجامێك چاوەڕێیان دەکات، بەپێی جۆری گوزەراندنی ژیانی دنیایان، خەڵك وریا بکەوەو بترسێنە، لێیان حاڵیی بکە، کە مرۆڤ، وەك ئاژەڵ و دروستکراوەکانی دیکە، تەنیا بۆ ئەم قۆناغەی ژیان دروست نەکراوە، بەڵکو لێرە دانراوە بۆ تاقیکردنەوە، بەڵام دوایی قۆناغی دیکە چاوەڕێی دەکەن، کە قۆناغی بەرزەخە، پاشان قیامەتە، دوایی نیشتەجێ بوونە، ئەگەر بڕوادارو چاکەکار بووبێ لە بەهەشت داو، ئەگەر بێبڕوا خراپەکار بووبێ، یاخود بڕواشی هەبووبێ، بەڵام زۆر خراپەکار، لە گوناهەکانی پاك نەبووبێتەوە، لە دۆزەخدا، تاکو پاك دەبێتەوە.

٣- ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ﴾، فەرمانی سێیەم: پەروەردگاریشت بە گەورە بگرە، بە گەورە گرتنی پەروەردگار واتە: بە دڵ خوای پەروەردگارت بە ڕەهایی بە گەورە بزانە و، بە زمان تەعبیر لەوە بکە، کە لە دڵ و عەقڵ و هۆشتدا جێگیر بووەو، بە کردەوەش لە دنیای واقیعدا گەورەیی و مەزنیی ڕەهای خوا، لە ژیانی خۆتدا بەرجەستە بکە، کەواتە: ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ﴾، پەروەردگارت بە گەورە بگرە، واتە: بە دڵ و بە زمان و بە کردەوە، هەڵبەتە کە دەفەرموێ: بە گەورە بگرە، بێگومان خوا هەر گەورەیە، بەڵام یانی: تۆ دەرکی گەورەیی خوا بکە، هەم بە عەقڵ و دڵ، هەم بە زمان دەری ببڕە، هەم بە کردەوەش ئەوە لە خۆتدا بەرجەستە بکە.

٤- ﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ﴾، فەرمانی چوارەم: پۆشاکەکەشت پاك بکەوە، پۆشاك پاککردنەوە، هەم مانای ڕواڵەتیی هەیە، کە بەرگ و پۆشاکت خاوێن بێ، هەم مانای مەعنەوییشی هەیە، وەك لە هەموو زمانان دا هەیە، لە کوردییدا دەڵێ: فڵانکەس دامێنی پاکە، پەرێزی پاکە، فڵانکەس پۆشاك پاکە، مەبەستیان پۆشاکی ڕواڵەتیی نیە، واتە: کردارو ڕەفتارو ئاکاری پاك و چاکە، لێرەش هەردوو واتایەکە دەگرێتە خۆی، هەڵبەتە پاك و خاوێنی ڕواڵەتیی، پەیوەستیشە بە پاك و خاوێنیی دەروونیی و مەعنەوییەوە، هەر کەسێك لە ناخیدا پاك بێ، ناخەکەی پاڵی پێوە دەنێ، ڕواڵەتی خۆشی پاك ڕابگرێ.

وەك زانایانـی دەروونناس و كۆمەڵناس دەڵێـن: ئـەوە ڕاسـتییەكی زانستییە، ئـەو كەسـەی ناخـی پیـس بـێ، دەربەسـت نیـە، ڕواڵەتیشـی پیـس بـێ، بەڵـێ جـاری وا هەیە كەسـێك بـە ڕواڵـەت خـۆی پـاك و خاوێـن ڕادەگـرێ، بـەڵام ناخیشـی پیسـە، بـەڵام ئـەوە هـەر شـتێكی كاتییـە، ئەگەرنـا كەسـێك دەتوانـێ بـەردەوام بـێ لەسـەر پـاك و خاوێـن ڕاگرتنـی ڕواڵەتـی، كـە ناخیشـی پـاك بـێ، ناخیشـی بـە چـی پـاك دەبـێ؟ بـە ئیـمان و تەقـواو لـە خـوا نزیكیـی، هـەروەك بـە كوفـرو سـتەم و سـیفەتە خراپـەكان، ناخـی مـرۆڤ پیـس دەبـێ و، ئـەو كاتـە دەربەسـت نابـێ ڕواڵەتەكەشـی پیـس بـێ.

زۆر كـەس وادەزانـێ كـە خەڵكـی ڕۆژئـاواو ڕۆژهـەڵات، ئەوانـەی ئەهلـی كوفـرن، زۆر پـاك و خاوێنـن، بـەڵام كەسـێك لەگەڵیـان تێكـەڵ بـێ لـە نزیكـەوە، ئنجـا دەزانـێ كـە بۆنـی ناخۆشـیان لـێ دێ و ڕواڵەتێكـی زۆر ڕووكەشـی خۆیـان پـاك ڕادەگـرن، بـەڵام زۆریـان هـەر بـە ئـاو تـارەت ناگـرن و لـە ئەنجامـی ئـەوەدا چـاك خاوێـن نابنـەوە، هەروەهـا پیـاوەكان خۆیـان سـوننەت ناكـەن و گەلێـك شـتی دیكـەش، بـۆ وێنـە: خۆیـان ناپارێـزن لـە خواردنـەوەو خواردنـە پیسـەكان: لـە شـەڕاب و گۆشـتی بـەرازو جۆرەكانـی جـڕو جانـەوەر، ڤایرۆسـی كۆڕۆنـا، زۆر لـە شـارەزایان دەڵێـن: لـە خواردنـی گۆشـتی شەمشـەمە كوێـرە (**الخفـاش**)، (لـە هەنـدێ شـوێن چەكچەكیلـەی پـێ دەڵێـن)، لـەوەوەدا كەوتـوە، هەروەهـا لـە خواردنـی قالۆنچـەو مـارو دووپشـك ئـەو شـتە پیسـانەوە، بـەڵام ئینسـانی مسـوڵمان و بـڕوادار هـەر لـە ڕێـوە هەمـوو شـتێكی پیسـی لـێ قەدەغەیـە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ ﴿١٥٧﴾﴾ **الأعـراف**، واتـە: پێغەمبـەری خـوا شـتە پـاك و چاكەكانیـان بـۆ حـەڵاڵ دەكات و، شـتە پیـس و زیانبەخشـەكانیان لـێ قەدەغـە دەكات.

٥- ﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾، فەرمانی پێنجەم: واز لە (**رُجْز**) بێنە، (**الرُّجز**) أ- بە مانای گوناهو دێ، ب- بە مانای هاوبەش بۆ خوا دانان دێ، ج- بە مانای بت و سەنەم پەرستیی دێ، د- بە مانای هەموو جۆرەكانی پیسییش دێ، كە دەفەرموێ: ﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾، یانی: هەرچی جۆری پیسییە، یاخود گوناح و تاوانە، یان شیرك و بتپەرستییە لێی دووربكەوەوە.

٦- ﴿ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴾، فەرمانی شەشەم: منەت مەکە، چونکە ئەو شتەی بەخشیوتە بە زۆری دەزانی، ئەوە ڕێکترین و ڕاسترین واتایە، ئەگەرنا چەند واتایەکی دیکەشی هەن، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسیان دەکەین، ﴿ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴾، (مَنَّ عَلَيْه) واتە: چاکەیەك کە لەگەڵیدا کرد بووی، بەچاویدا دایەوەو باسیکرد، ﴿ تَسْتَكْثِرُ ﴾، (كَثِيْر) بە مانای زۆر، (إسْتِكْثَار) واتە: بە زۆر دانان، واتە: لەبەر ئەوەی بە شتێك هاوکاریی کەسێکت کردوە، ماڵێکت پێ بەخشیوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بە زۆری دەزانی، منەتی لەسەر مەکە، هەڵبەتە هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴾، واتە: ئەو چاکەو فەرمانبەرییەی بۆ خوا ئەنجامی دەدەی، پێت زۆر نەبێ، ئنجا لە دڵی خۆتدا جۆرێك لە منەتت لە دڵدا پەیدا ببێ، بەڵام من پێم وایە مانای یەکەمیان گونجاوترە.

٧- ﴿ وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴾، ئەمەش ئەرك و فەرمانی حەوتەمە، واتە: خۆڕاگر بە بۆ پەروەردگارت، واتە: لەبەر بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگارت خۆڕاگرو پشوو درێژ بە، کەم حەوصەڵە مەبەو چیکڵدانەت گچکە نەبێ.

ئنجا خوا ﷻ لە سێ ئایەتەکانی: (٨ - ١٠)دا، باسێکی ڕۆژی دوایی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ ﴾، (النَّاقور): بریتییە لە هەر شتێك دەنگی لێ بێ، (نَقَرَ) واتە: پەنجەی لە شتێکداو زرینگەی لێ هات، (نَقْر) بریتییە لە پەنجەدان لە شتێك، یاخود شتێکی ڕەق لە شتێك ڕابکێشی، (النَّاقور) بریتییە لەو کەڕەنایەی فریشتەیەك کە خوا ﷻ بۆی تەرخان کردوە، فووی پێدا دەکات و، دەنگ و هاڕژنێکی زۆر گەورەی لێ دێ.

لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحاقة، (الصور) بریتییە لە کەڕەنا، بە عەرەبیی (بوق)ی پێ دەڵێن، ئنجا ئایا چ شێوەیەکی هەیە؟ هەندێ گوتوویانە: بە شێوەی قۆچی حەیوانە، گرنگ ئەوەیە ئامێرێکە خوا فریشتەیەکی بۆ تەرخانکردوەو دوو جاران فوو بە کەڕەنادا دەکات، جاری یەکەم دوای فووی یەکەم، ئاخیر زەمان دەقەومێ و، دوای جاری دووەم ئەم

گەردوونە دەپێچرێتەوەو نامێنێ، یان بە جۆرێکی دیکە دروست دەبێتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ٦٨﴾ **الزمر**، فوو بە صووڕدا كرا، (واتە: بۆ جاری یەكەم) هەر كەس لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە مرد، جگە لەوەی خوا بیەوێ، دوایی بۆ جارێكی دیكە فوویەكی دیكەی پێدا كرا، هەموویان هەڵسانەوەو تەماشایان دەكرد.

لە دوای فووی دووەم قیامەت دەقەومێ، وەك چۆن لە دوای فووی یەكەم ئاخیر زەمان و كۆتایی هاتنی ئەم ژیانە ئەم گەردوونە، ڕوودەدا.

ئنجا دەفەرموێ: هەر كاتێك فوو بە كەڕەنادا كرا: ﴿فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ﴾، ئەوە لەو ڕۆژەدایەو، ڕۆژێكی سەخت و زەحمەتە، ﴿عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ﴾، ڕۆژێكی سەخت و زەحمەتە لەسەر بێبڕوایان، ﴿غَيۡرُ يَسِيرٖ﴾، نا ئاسانە، ئەمە هەر جەختكردنەوەی قورسیی و زەحمەتیی ئەو ڕۆژەیە لەسەر بێبڕوایان.

ئنجا خوا ﷻ لە بیست ئایەتەكانی: (١١ - ٣٠)دا، باسی یەكێك لە بێبڕوا سەركێش و كەللەڕەق و نەسەلمێن و خۆبەزلگرەكانمان بۆ دەكات، كە زۆربەی هەر زۆری ڕوونكەرەوانی قورئان گوتوویانە: **(الولید بن المغیرة)**یە.

خوا ﷻ كۆمەڵێك لە چاكەكانی خۆی كە لەگەڵیدا كردوون، باس دەكات و دەخاتەڕوو، دوایی هەڵوێستی زۆر كەللەڕەقانەو، نەسەلمێنانەو خۆبەزلگرانەی ئەو لە بەرانبەر قورئاندا دەخاتەڕوو، دواییش خوا ﷻ باسی سزای خۆی دەكات كە بۆ ئەو كافرە ملهوڕو نەسەلمێن و خۆ بەزلگرەی داناوە، كە لەگەڵ ئەوەشدا زانیویەتی قورئان فەرمایشتی خوایەو دوورە لە قسەی مرۆڤەوە، كەچی بڕواشی پێ نەهێناوە، بەڵكو زۆری بیركردۆتەوەو ڕاماوە، چ شتێك، چ تۆمەتێك پاڵ بداتە لای قورئان و پێغەمبەری خوا ﷺ، كە خەڵكە سادە لەوح و فامكاڵەكە، كڵاو لەسەر بنێ و، چاوپێچكیان بخاتە سەرچاوو، قەناعەتیان پێ بهێنێ بڕوا

بـەوە نەهێنـن، کـە قورئـان فەرمایشـتی خوایـەو، پەیامێکـە خـوای پـەروەردگار بـە پێغەمبـەری کۆتایـی خـۆی موحەممـەد ﷺ دا ناردوویەتـی بـۆ تێکـڕای مرۆڤایەتیـی.

دەفەرمـوێ: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴾، لـە مـن و لـەو کەسـە گـەڕێ کـە بـە تەنیـا دروسـتم کـردوە، ئنجـا ئـەم بـە تەنیـا دروسـتکردنە، واتـە:

أ- تەنیا خۆم دروستمکردوە، هیچکەس دەستی لە هێنانە دی دا نەبووە، کە ئەگەر ئەو واتایە بێ، ئەوە بۆ هەموو مرۆڤەکانی دیکەش هەر وایە، هەموو مرۆڤەکان هەر خوا خوڵقاندوونی و هێناونیە دی، ئەوە ئەگەر (**وحیداً**) پەیوەست ببێتەوە بە بکەر (**فاعل**) ەوە کە خوای پەروەردگارە.

ب- بەڵام ئەگەر (**وحیداً**) پەیوەست بێتەوە بە بەرکار(**مفعول**)ەوە، واتە: ئەو کەسەی دروستمکردوە، بە شێوەیەکی تاك دروستم کردوەو، ئەو شێوەیەکی تاکی هەیە لە نێو خەڵکدا.

ئنجا شێوە تاکییەکەی چی بووە؟:

١- پیاوێکـی زۆر زمانـزان و شـارەزا بووە، وەك پێشـتر لە هۆی هاتنـە خوارەوەکەیدا باسـمان کرد.

٢- زۆر شارەزای شیعر بووە.

٣- زۆر ساماندار بووە.

٤- زۆر خاوەن ڕۆڵەو وەچە بووە، هەندێك دەڵێن: دوازدە کوڕی بوون، هەندێك دەڵێن: یازدە بوون، هەندێك دەڵێن: سێزدە بوون.

٥- پیاوێکی قسە ڕۆیشتوو بووەو خەڵك چاك گوێی بۆ گرتوە.

٦- پیاوێکی بلیمەت بووە، بە بەڵگەی ئەوەی کاتێك لە قەومەکەی خۆی دەپرسێ؟ ئێوە چۆن تەماشای قورئان دەکەن؟ ئەوانیش دەڵێن: جادوویە، دەڵێ: نەخێر، بە قسەی

جادووگەران ناچێ، دەڵێن: کاهینە، دەڵێ: نەخێر من شارەزای کاهینانم، ئەو قسەیە بە هی کاهینان ناچێ، دەڵێن: شیعرە دەڵێ: لە قسەی شاعیرانیش ناچێ، دەڵێن: قسەی شێتانە، دەڵێ: نەخێر وەك قسەی شێتان ناچێ.

دوایی ئەوان دەڵێن: ئەدی چییە؟ دەڵێ هیچ کام لەوانە نیە، بەڵام بۆ چەواشەکردنی خەڵکی، وا باشە بڵێین: جادوویە، ئەوەش مانای وایە پیاوێکی بلیمەت و شارەزاو سەرناس و حەقیقەتزان بووە، بەڵام بەداخەوە زانینی بۆ ڕاستییەکان نەبۆتە هۆی ئەوەی ڕێی خوا بگرێتە بەر، بۆچی؟ چونکە زانیارییەکانی تەنیا زانیارییەك بوون لە عەقڵیدا بوون و تێکەڵ بە دڵ و دەروونی نەبوون و، نەبوونە قەناعەتێکی نێو دڵی، بۆیەش نەبوونە هۆی ئەوەی دڵەکەی ڕادەستی خوا بێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴾، لە من و لەو کەسە گەڕێ کە بە تەنیا، بە تاك دروستمکردوە، ﴿ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ﴾، ماڵ و سامانێکی دوورو درێژو فراوانم بۆ ڕەخساندوە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەست ئەوەیە زەویی و زارێکی زۆری بووەو پانتاییەکی زۆری هەبووە، هەندێکیش دەڵێن: مەبەست ئەوە بووە ماڵ و سامانێك بووە، بەردەوام بەرهەمی بۆ هاتۆتەوە، ﴿ وَبَنِينَ شُهُودٗا ﴾، هەروەها کوڕانێکی ئامادە، کوڕانێك هەمیشە لە کۆڕو مەجلیسەکەیدا ئامادە بوون، لەبەر ئەوەی بابیان سەروەت و سامانی زۆر بووە، پێویستیی بەوە نەدەکرد بڕۆن بۆ سەفەرو بازرگانیی و مامەڵەو کاسبیی، (**شُهُود**) کۆی (**شَاهد**)ە، بە مانای (**حَاضِر**) واتە: هەمیشە ئامادەبوون لە کۆڕو مەجلیسەکەیدا.

﴿ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا ﴾، ئامادەسازییم بۆ کرد، بە ئامادەسازییەکی باش، واتە: زەمینەم بۆ خۆشکرد زەمینەی سەروەتمەندیی، زەمینەی دەوڵەمەندیی، زەمینەی قسەڕۆیشتوویی و، خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بوون لەنێو

کۆمەڵگاکـەی خۆیـدا، ﴿ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴾، دواییـش تەماعـی ئـەوەی هەیـە، هـەر بـۆی زیـاد بکـەم، ﴿ كَلَّآ إِنَّهُۥ كَانَ لِـَٔايَٰتِنَا عَنِيدًا ﴾، بـا واز بێنـێ (لـەو جـۆرە بیرکردنەوەو خەیاڵپـڵاوە)، چونکـە ئـەو نەسـەلەمێن بـوو بەرانبـەر بـە ئایەتەکانـی ئێمـە، (عَنِيْد) واتـە: دوژمنـکار، واتـە: ناحـەزو دوژمنـکار بـووە بەرانبـەر بـە ئایەتەکانـی ئێمـە.

﴿ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴾، لەمـەودوا بـە هـەورازی هەڵدەگێـڕم، (إِرْهَـاق) بریتیـە لـەوەی کەسێك حاڵەتێك لەسـەر کەسێك پێویسـت بـکات و ناچـاری بـکات، ئەویـش لـە بـن ئـەو حاڵەتـەدا زۆر نارەحـەت بـێ، (رَهَـقْ) بـە مانـای (غَشَـيان) و داپۆشـینی بەڵایـەك، گرفتێـك، دێ بـۆ کەسێك، (إِرْهَـاق) لەسـەر کێشـی (إِفْعَـال) واتـە: کەسێك ئـەوەی پـێ بـکات، (صَعُود)یـش واتـە: دەروویيەکـی سـەخت، یاخـود هەورازێکـی بـەرز، کـە هەندێـك لـە زانایـان و ڕوونکەرەوانـی قورئـان دەڵێـن: خـوا لـە دۆزەخـدا سـزایەکی بـۆ دانـاوە، بریتیـە لـەوەی بـە شـاخێکی بـەرز هەڵدەگـەڕێ تاکـو دەگاتـە سـەرێ، دوایـی لەسـەر ڕا خلـۆر دەبێتـەوەو، جارێکـی دیکـە دەبـێ تێهەڵچێتـەوەو بـەو شـێوەیە بـەردەوام بـێ.

یاخـود: ﴿ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴾، واتـە: لەمـەودوا تووشـی سـزاو ئازارێکـی سـەختی دەکـەم، وێنـەی بـە شـاخ و بـە هـەورازی سـەخت هەڵگـەڕان، بۆچـی؟ ﴿ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴾، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە ئـەو بیـری کـردەوەو ئەندازەگیریـی کـرد، ﴿ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴾، بـە کوشـت بچـێ چۆنـی ئەندازەگیریـی کـرد! ﴿ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴾، ئنجا بەکوشـت بچـێ چۆنـی ئەندازەگیریـی کـرد! دیـارە بیرکردنـەوەو ئەندازەگیریـی کردنەکـەی هەمـوو لـە بەرانبـەر قورئانـدا بـووە، ئایا چ قسـەیەك لـە بـارەی قورئانەوە بڵـێ، کـە خەڵکـە سـادەو لاسـاییکەرەوەکەی کۆمەڵـگای خـۆی پـێ هەڵخەڵەتێنـێ و چەواشـەیان بـکات!!.

وەك لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکـەی دا باسـمان کـرد، هەندێـك لـە زلـە زلانـی قورەیـش لێـی کۆدەبنـەوە - لـە وەلیـدی کـوڕی موغیـرە - دەڵێـن: ئـەی ئەبـوو عەبدو

ششـەمس! تـۆ لـە هەمووومـان بـە تواناتـری، چۆنـی تێدەگـەی و چـی بڵێیـن؟ ئەویـش دەڵـێ: ئێـوە چۆنـی تێدەگـەن؟ ئەوانیـش وەك پێشـتر ئامـاژەم پێـدا باسـی شـیعرو جـادوو و قسـەی شـێت و قسـەی کاهینـان دەکـەن، ئەویـش ئەوانـە هەموویـان ڕەت دەکاتـەوەو دەڵـێ: قورئـان هیـچ کام لەوانـە نیـەو، قورئـان قسـەیەکی زۆر سەرسـوڕهێنەرە، وەك قسـەی بەشـەران نیـەو، هیـچ قسـەیەك لـە بەرانبەریـدا خـۆی ناگـرێ، دەڵێـن: ئاخـر دەبـێ شـتێك هـەر بڵێیـن لـە دژی قورئـان، دەڵـێ: ئنجـا ئەگـەر شـتێك هـەر بگوتـرێ، نیزیکتریـن شـت ئەوەیـە بگوتـرێ: جادوویـە، چونکـە موحەممـەد بەهـۆی ئـەو قسـەیەوە، بـراو برایـان لێـك دەکات، بـاب و کـوڕان لێـك دەکات، ژن و مێـردان لێـك دەکات، پیـاوو عەشـیرەت و خزمـی لێـك دەکات، بڵێـن جادوویـە لـە هەموویـان نیزیکـترە، واتـە: بـۆ چەواشـەکردنی خەڵکـی ئـەو قسـەیە زیاتـر دەچێتـە عەقڵـی خەڵکـەوە، ئەگەرنـا زانیویەتـی جـادوو نیـە.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ نَظَرَ﴾، دوایـی سـەرنجی داو ڕامـا، ﴿ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾، ئنجـا ڕووی خـۆی گـرژ کـردو مـۆن بـوو، ڕەنگـی خـۆی تـرش و تـاڵ کـرد، وەك کەسـێك کـە دەیـەوێ گرفتێـك چارەسـەر بـکات و بـۆی چارەسـەر نابـێ، ئەویـش هـەر تەماشـای قورئانـی دەکـرد، هیـچ شـوێنی تانـە لێدانـی تێـدا نەبـوو، بۆیـە ڕووی خـۆی گـرژو تـاڵ کـردو، هـەر خەریکـی بیرکردنـەوە بـوو، ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ﴾، دوایـی پشـتی کـردە قورئـان و ئیسـلام و ئیمان، خـۆی بـە زلگـرت، ﴿فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾، گوتـی: ئـەم قورئانـە تەنهـا جادوویەکـە دەگێڕدرێتـەوە، ﴿يُؤْثَرُ﴾ واتـە: (**يُحـكى، يُـروى**)، دەگێڕدرێتـەوە دەمـاو دەم، ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ﴾، ئـەم قورئانـە تەنیـا قسـەی مرۆڤانـە، خۆشـی سـەدا سـەد دڵنیا بـووە قسـەی مرۆڤـان نیـە، چونکـە خـۆی پێشـتر وای بـەو بڕیـار بەدەسـت و قسـە بەدەسـتانەی قورەیـش گـوت، کـە لـە دەوری کۆبووبوونـەوە.

بۆیـەش خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾، لەمـەودوا دەیخەمـە نێـو ﴿سَقَرَ﴾ەوە، ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ﴾، چ شـتێك بـە تـۆی زانانـدوە ﴿سَقَرَ﴾ چییـە؟،

واتـە: چ شـتێك وای لـە تـۆ كـردوە بزانـی ﴿سَقَرَ﴾ چییـە؟، ﴿سَقَرَ﴾ یەكێكـە لـە ناوەكانـی دۆزەخ، تەعبیـری: (**سَـقَرَتْهُ الشَّـمْسُ، وصقَرَتْـهُ**)، واتـە: (**أحرَقَتـهُ**) سـووتاندی، (**سـقر**)یش ئاگرێكـی سـووتێنەرە، بـەڵام لێـرەدا یەكێكـە لـە ناوەكانـی دۆزەخ، كـە خـوا ئـاوا پێناسـەی دەكات و دەفەرمـوێ: ﴿لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ﴾، نـە هیـچ شـتێك دهێڵـێ، نـە هیـچ شـتێك واز لێدێنـێ، واتـە: هـەر شـتێكی بیخرێتـە نێـو، هیـچ شـوێنێكی لـێ ناهێڵـێ كـە نەیسـووتێنێ، ﴿وَلَا تَذَرُ﴾، هیـچ كەسـێكیش كـە دەیخرێتـە نێـو، دەسـتبەرداری نابـێ و لێـی ناگـەڕێ كـە سـزای نـەداو نەیسـووتێنێ، واتـە: هـەر كەسـێكی بخرێتـە نێـوی، هەمـوو شـوێنێكی دەسـووتێنێ و هیـچ كەسـێكیش جـەب نـادات.

﴿لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ﴾، (**بَـشَر**) واتـە: پێسـتی ڕووی مـرۆڤ یـان پێسـتی دەرەوەی، یـانی: پێسـتی دەرەوەی جەسـتەی مرۆڤ ڕەش هەڵدەگێڕێ، دەیسـووتێنێ و ڕەشیهەڵدەگێڕێ لـە قۆناغـی یەكەمـدا، دوایـی زیاتـر دەیسـووتێنێ، هەندێكیش گوتوویانـە: ﴿لَوَّاحَةٌ﴾، واتــە (**مُحرِقَـةٌ**) دەیسـووتێنێ، پێسـتی ڕوو و دەرەوەی مـرۆڤ دەسـووتێنێ، ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾، نـۆزدەی لەسـەرن، واتـە: نـۆزدە فریشـتە، یاخـود نـۆزدە جـۆرە فریشـتە، یاخـود نـۆزدە كۆمەڵـە فریشـتە، هـەر سـێ واتایـەكان گونجـاون، دەگونجـێ نـۆزدە فریشـتە بەسـەر هەمـوو دۆزەخـەوە بـن، سەرپەرشـتیی بكـەن، وەك سەرپەرشـتیاران، دەگونجـێ نـۆزدە جـۆرە فریشـتە بـن، دەشـگونجێ نـۆزدە كۆمەڵـە فریشـتە بـن.

ئنجـا لێـرەدا - وەك دواییـش باسـی دەكەیـن - ئەبـوو جەهـل گوتوویەتـی: موحەممـەد هەڕەشـەمان لێـدەكات دەڵـێ: دۆزەخ نـۆزدە فریشـتەی بەسـەرەوەن، ئێـوەش خەڵكێكـی زۆرن، ئایـا هـەر بـە دە نەفـەران بـە یەكێكیـان ناوێـرن! گوایـە یەكێكیـان گوتوویەتـی: ئەگـەر هـەر نـۆزدە بـن، مـن بـەو شـانەم نۆیـان بـەولادا دەخـەم، بـەو شـانەش نۆیـان بـەو لادا دەخـەم، یـەك دەمێنێتـەوە، ئایـا ئێـوەش بەهەمووتـان بـە یەكێـك ناوێـرن؟ وایانزانیـوە فریشـتەش وەك مرۆڤانـن.

گوایە یەکێکی دیکەیان گوتوویەتی: ئەگەر هەر نۆزدە بن، بۆ منیان لێگەڕێن.

یەکێکی دیکەیان گوتوویەتی: هەژدەیان بۆ من لێگەڕێن و هەمووشتان بە یەکێکی هەر دەوێرن، بێگومان وەك گاڵتە پێکردن ئەو قسانەیان کردوون.

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً﴾، ئێمە هاوەڵانی ئاگرمان تەنیا بە فریشتە داناون، یانی: وامەزانن وەك مرۆڤانن، فریشتەکانیش هێزو توانایەکیان هەیە، بەس خوا دەزانێ چەندە! بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا ﷺ جیبریلی بینیوە، دووجاران بینیویەتی، جارێك لەسەر زەوی و جارێك لە ئاسمان، فەرموویەتی: کە بینیم ئاسۆی پڕکرد بوو، شەشسەد باڵی هەبوو، هەروەها لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتوە، کە شارەکانی گەلی (لوط) خوای باڵادەست جیبریل یان فریشتەیەك، یان چەند فریشتەیەکی ناردن، باڵیان خستە ژێر شارەکەیانەوە، باڵیان لەبەر ڕا کردن، شارەکەیانیان بە هەموو شتێکەوە بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان، ئنجا سەرنخوونیان کردەوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ٥٣﴾ **النَّجم**، (خوا) شارە هەڵگێڕدراوەکانی بەرداونەوە، (**المؤتَفِكات**) واتە: (**المنقلِبات**) (**أهوى**) واتە: (**أسقَط**)، کەواتە: بەرزکرانەوەو دوایی بەرداونەوە، هێزی فریشتان بەس خوا دەزانێ سنوورەکەی چەندە؟.

بۆیە خوا دەفەرموێ: ئێمە هاوەڵانی ئاگرمان تەنیا لە فریشتان داناون، ﴿وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، ژمارەکەشیانمان تەنیا، وەك تاقیکردنەوە داناوە بۆ ئەوانەی بێبڕوان، تاکو بۆیان ببێتە تاقیکردنەوە، ئایا بڕوا دێنن، یان بڕوا ناهێنن؟، یاخود: بۆ ئەوە زیاتر تووشی ئازارو سزاو مەینەتیی بن، بەهۆی بە درۆ دانان و گاڵتەپێکردنیانەوە بە ژمارەکەیان، ﴿لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾، بۆ ئەوەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، دڵنیاییان زیاتر بێ، چونکە لە کتێبەکانی خۆشیاندا هەیە، کە نۆزدە فریشتە سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن، ﴿وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا﴾، ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە ئیمانیان زیاد بێ، چونکە هەتا ئایەتێك بێتە خوارو ڕاستییەك باسبکرێ، لەو ڕاستییانەی پەنهان و نادیارن و

ئەوانیش بڕوای پێ بهێنن، مانای وایە بڕوایان بە شتێکی دیکەی زیاتر هێناو، بڕوایەکەیان پتەوتر دەبێ.

﴿وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾، هەروەها تاكو ئەوانەی كتێبیان پێدراوەو، بڕوادارانیش دوو دڵ نەبن، بزانن فەرمایشتی خوا كە كاتی خۆی بۆ مووسای ناردوەو، بۆ داوودی ناردوەو، بۆ عیسای ناردوەو پێشتریش بۆ ئیبراهیم و، لە كۆتاییدا بۆ موحەممەد هەر كامیان كاتی خۆی فەرموویەتی: فریشتە دۆزەخەوانەكان نۆزدە فریشتەن، لە پەیمانی كۆندا هاتوەو، لە پەیمانی نوێدا هاتوە، كاتی خۆی وای فەرمووە، ئێستاش لە دوا فەرمایشتی خۆیدا كە قورئانە هەر وا دەفەرموێ، چونكە ڕاستییەكان گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

﴿وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗا﴾، هەروەها تاكو ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایەو بێبڕوایەكانیش بڵێن: خوا چی ویستوە، بەم وێنەیە، چی ویستوە بەم وێنە هێنانەوەیە، كە نۆزدە فریشتە سەرپەرشتیی دۆزەخ دەكەن؟ كەواتە: ئەوە كە خوا ژمارەی دۆزەخەوانەكانی لە فریشتان بە نۆزدە داناون، ڕاگەیاندنی ئەم ڕاستییە حەوت دەرهاویشتەی هەن:

١- ئەوانەی بێبڕوان زیاتر بۆیان دەبێتە مایەی تاقیكردنەوە، یان مایەی سزاو ئازار.

٢- ئەوانەی كتێبیان پێدراوە، دڵنیاییان بۆ پەیدادەبێ، ئەم قورئانەش هەر لەو سەرچاوەیەوە هاتوە، كە كتێبەكانی دیكەی لێوە هاتوون، كە خوای پەروەردگارە.

٣- ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بڕوایان زیاد دەبێ، كاتێك دەبینن ئەوەی لە كتێبی ئەواندا هاتوە، لە هەموو كتێبەكانی پێشووشدا هاتوە، پاشان بەهۆی ئەوەوە كە ڕاستییەكی دیكەش دادەبەزێ و، ئەوان بڕوای پێ دێنن و نادیارو پەنهانیشە، ئەوەش دەبێتە هۆی زیادبوونی ئیمانیان، كەواتە: هەم بەهۆی ئەوەی كتێبەكەیان ئەوەی لە كتێبە پێشووەكاندا هاتوە، بەڕاستی دادەنێ و، بەهۆی ئەوەوەش كە بڕوا بە شتێكی دیكەی نادیارو پەنهان دێنن، لە هەردوو ڕووەوە ئیمانیان زیاد دەبێ.

**٤و٥-** ئەوانەی کتێبیان پێدراوەو، بڕوادارانیش دوو دڵ نابن، هیچ دوو دڵییەکیان نابێ، کە ئەم قورئانەش هەر فەرمایشتی خوایە ﷻ، کتێبەکانی دیکەش فەرمایشتی خوا بوون، خوا ﷻ کتێبەکانی دیکەی بۆ قۆناغە جۆراو جۆرەکانی بەشەر ناردوون، ئەم قورئانەشی بۆ مرۆڤایەتیی ناردوە، بە درێژایی و زەمان و بە پانایی زەمین.

**٦و٧-** دەرهاویشتەی شەشەم و حەوتەم، تاکو ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، هەروەها بێبڕوایەکانیش، واتە: هەم مونافیقەکان کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، مەرجیش نیە مونافیقیش بن، بەڵکو هەر کەسێك گومان و دوو دڵیی لە دڵدا هەبێ، ئەویش هەر نەخۆشییە، هەروەها بێبڕوایەکانیش ڕەخنەبگرن و بڵێن: ﴿مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا﴾، خوا چ مەبەستێکی بووە لە هێنانەوەی ئەم وێنەیەدا؟.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ﴾، ئاوا بەو شێوەیە خوا ﷻ هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای دەکات و، هەر کەسێکی بیەوێ ڕاستە ڕێی دەکات، هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای دەکات، واتە: دوای ئەوەی بەرنامەی خواو هیدایەتی خوا ڕەفز دەکات، گومڕا دەبێ، بەڵام بۆچی خوا گومڕا کردنەکەی پاڵداوەتە لای خۆی؟ چونکە بە ویستی ڕەهاو گشتگیری خوایە، پاشان ئەو گومڕابوونە بەپێی سیستم و یاسایەك کە خوا لە ژیانی بەشەردا دایناوە، هاتۆتە دی.

خوا ﷻ وای داناوە هەر کەسێك ئەو هیدایەتەی دایدەبەزێنێ و بە پێغەمبەردا ﷺ دەینێرێ، هەر کەسێك قبووڵی بکات، ڕاستە ڕێی دەکات و هەر کەسێك ڕەفزی بکات، گومڕا دەبێ، خواش هەر کام لە ڕاستە ڕێ بوونەکەو، گومڕا بوونەکەی پاڵداونە لای خۆی، چونکە بەپێی سیستم (نظام)ێك کە خوا لە ژیانی بەشەردا دایناوە، دێنە دی، ئەگەرنا خوا بە زۆر ملی کەس ناگرێ، بفەرموێ: وەرە نابێ بە ڕێی ڕاست دا بڕۆی!، ئەو هەموو پێغەمبەرانەی ناردوون، خەڵك ڕێی ڕاست بگرێ، کەواتە: مەبەست لە گومڕاکردنەکە ئەوەیە کە بەپێی ویستی

خـوا دێتـە دی، بەپێـی سیسـتمێك كـە خـوا لـە ژیانـی بەشـەردا دایناوە، دێتـە دی، بـەڵام مرۆڤـە گومڕایـەكان خۆیـان ڕێـی گومڕایـی دەگـرن، هـەروەك مرۆڤـە بـە مـراد گەیشـتوو و ڕێ ڕاسـت گرتـووەكان، خۆیـان هیدایەتـی خـوا هەڵدەبژێـرن، ئـەوەش دەبێتـە هـۆی ئـەوەی بـە ئامانـج بگـەن و ڕاسـتە ڕێ بگرنـە بـەر.

﴿ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ﴾، ئـەو نـۆزدە فریشـتانەش بـەس سەرپەرشـتیی دۆزەخ دەكـەن، بـەڵام بـا پێیـان وانەبـێ، سـەربازەكانی پـەروەردگارت بـەس ئـەو نۆزدەیـەن، بەڵكـو: سـەربازەكانی پـەروەدگارت تەنیـا خـۆی ژمارەیـان دەزانـێ، ﴿ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴾، ئـەم ئاگـری دۆزەخـەش كـە بـاس دەكـرێ (سَـقَر)، یاخـود: ئـەو ژمـارە نۆزدەیـەی فریشـتەكانیش كـە بـاس دەكـرێ، تەنیـا بیرخـەرەوەیـەو پەنـدو ئامۆژگارییە بـۆ مرۆڤـەكان.

﴿ كَلَّا وَالْقَمَرِ ﴾، نەخێـر واز بێنـن، یاخـود: ئـەوەی دەیڵێـن، وانیە، سـوێند بە مانگ، ﴿ وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴾، سـوێند بـە شـەوگاریش، كـە پشـت دەكاتـەوەو دەڕواو كۆتایـی دێ، ﴿ وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ ﴾، سـوێند بـە بەرەبەیـان، كـە ڕوونـاك دادێ و ڕۆشـن دەبێتـەوە، ﴿ إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ ﴾، ئـەو ئاگـرەی خـوا ئێـوەی پـێ دەترسـێنێ، گەورەتریـن و بێزەزاترینـی شـتەكانە، ﴿ الْكُبَرِ ﴾، كـۆی (**كُبْرَى**)یـە، واتـە: هـەرە گـەورە، بـەڵام بـە بـاری مێینـەدا، ئەگەرنـا بـە بـاری نێرینـەدا (**أكـبَر**)، (**أكـبَر وكُـبْرَى**) لـە بەرانبـەری یەكـن، ئنجـا خـوا كـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ ﴾، ئـەم ﴿ إِنَّهَا ﴾یـە دەشـگونجێ بچێتـەوە بـۆ ژمـارەی نـۆزدەی فریشـتەكان كـە بەسـەر دۆزەخ ڕادەگـەن، دەشـگونجێ بچێتـەوە بـۆ ئاگـری دۆزەخ، یاخـود بچێتـەوە بـۆ باسـی قیامـەت و ڕۆژی دوایـی، ﴿ إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ ﴾، واتـە: گەورەترینـی شـتە گەورەكانـە، یاخـود تاكـە شـتی هـەرە گەورەیـە، ﴿ نَذِيرًا لِلْبَشَرِ ﴾، ترسـێنەرەو ورياكەرەوەيـە بـۆ مرۆڤـەكان.

بـۆ كـێ؟ كـێ لـەو ترسـاندن و ئاگاداركردنەوەیـە بەهرەمەنـد دەبـێ؟ ﴿ لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴾ بـۆ هـەر كامێـك لـە ئێـوە بیـەوێ بـەرەو پێشـەوە بچـێ، یـان

بـەرەو دواوە بچـێ، بـەرەو پێشـەوە بچـێ لـە ئیـمان و چاکەکارییـدا، یاخـود بەهـۆی کوفـرو تاوانـەوە بـەرەو دواوە بگەڕێتـەوە، یـان هـەر بـە گشـتیی بـەرەو پێشـەوە بچـێ، یاخـود بـەرەو دوا بچـێ، هەندێکیـش گوتوویانـە: بـەرەو پێشـەوە بچـێ لـە تاعەتـداو، دوا بکـەوێ لـە گوناهـو تـاوان، بـۆ هـەر کامێـك لـە ئێـوە لـە تاعـەت و چاکـەدا بـەرەو پێشـەوە بچـێ، بـەڵام لـە گوناهـو تاوانـدا بـەرەو دواوە بچـێ، واتـە: گوناهـو تـاوان نـەکات، یاخـود: لـە تاعـەت و فەرمانبەرییـدا بـەرەو پێشـەوە بچـێ، یـان بیـەوێ بـەرەو دواوە بچێـت و فەرمانبەریـی بـۆ خـوا نـەکات، بـۆ هـەر کامێـك لـەوان ئەمـە ترسـێنەرو وریاکەرەوەیـە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی (موحەممەد ﷺ)، کە هەڵسێ و خەڵکی بترسێنێ و پەروەردگاری (بە عەقڵ و دڵ و زمان و کردەوە) بە گەورە بگرێ و، پۆشاکی پاك بکات و لە خراپەو پیسیی دوور بێ و، بەهۆی بە زۆر دانانی بەخشین یان چاکەکەیەوە، منەت نەکات و، بۆ پەروەردگاری خۆڕاگر بێ و، باسی قیامەت کە لە دوای فووکردنی دووەم بە کەڕەنادا دێ و، لەسەر کافرانی قورس و سەخت دەبێ:

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ﴾، ئەی ئەو کەسەی خۆت لە پۆشاکەوە پێچاوە، یان بە پۆشاکەکەت خۆت داپۆشیوە! تەبەری لە ئیبراهیمەوە هێناویەتی - کە یەکێکە لە ڕاوییەکان - گوتوویەتی: (كَانَ مُتَدَثِّرًا فِي قَطِيفَةٍ)[١] لەو کاتەدا کە خوا ﷻ پێغەمبەری ﷺ ئاوا دواندوە، خۆی داپۆشیوە بە قەتیفەیەك، قەتیفە جۆرە قوماشێکە، یانی: قوماشێکی بەسەر خۆیدا داوە، وەك بەتانیی و لێفەیەك، ئەمە مانای ڕواڵەتی ڕستە موبارەکەکەیە، واتە: (يَا أَيُّهَا النَّائِم) ئەی ئەو کەسەی نوستووی! دیارە بە زۆریی وایە مرۆڤ کە نووست، خۆی بە شتێك دادەپۆشێ.

---

(١) جامع البيان: ٣٥٤٠٧.

واتایەکی دیکەشی هەیە: (يَا أَيُّهَا الْمُتَدَّثِرُ النُّبُوَّةَ وَأَثْقَالَهَا)، ئەی ئەو کەسەی پێغەمبەرایەتیی و ئەرکە قورسەکانی پێغەمبەرایەتییت لە ئەستۆ گرتوون، بە فەرمانی خوا!

٢)- ﴿ قُمْ فَأَنذِرْ ﴾، هەڵسەو وریا بکەوە، هەڵسەو بترسێنە، (**إِنْذَارٌ: إِخْبَارٌ مَعَ تَخْوِيفٍ**) هەواڵ پێدانێکە لەگەڵ ترساندندا، هەندێکیش گوتوویانە: (**إِعْلَامٌ مَعَ تَخْوِيف**) واتە: ئاگادارکردنەوەیە لەگەڵ ترساندندا، لە قەتادەوە هاتوە کە ئەم ڕستەیەی: ﴿ قُمْ فَأَنذِرْ ﴾ ئاوای مانا کردوە: (**قُمْ مِنْ نَوْمِكَ فَأَنْذِرْ عَذَابَ اللَّهِ قَوْمَكَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا بِاللَّهِ، وَعَبَدُوا غَيْرَهُ**)[1] واتە: لە خەوەکەت هەڵسەو، خەڵکەکەت لە سزاو ئازاری خوا بترسێنە، ئەو خەڵکەی هاوبەشیان بۆ خوا داناوەو جگە لە خوایان پەرستوە.

٣)- ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴾، پەروەردگاریشت بە گەورە بگرە، (**أَي: صِفْهُ بِصِفَاتِ التَّعْظِيم**)، وەصفی بکە بە سیفەتەکانی بە مەزنگرتن، مەبەست لە بە گەورەگرتن و بە گەورەزانینی خوا، کە خوا هەر خۆی گەورەیە، بە گەورەیی ڕەهاو بێ سنوورو، مەزنە بە مەزنیی ڕەهاو بێ سنوورو، بەرزە بە بەرزیی ڕەهاو بێ سنوورو، پاکە و چاکە بە ڕەهایی و بێ سنوور، بەڵام مەبەست ئەوەیە تۆ ئەو ڕاستییە دەرك بکەو لە عەقڵ و دڵی خۆتدا جێگای بکەوە، بۆیە زانایان گوتوویانە: ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴾ (**أَي: كَبِّرْ رَبَّكَ اعْتِقَاداً وَقَوْلاً وَعَمَلاً بَاطِناً وَظَاهِراً**)، پەروەردگارت لەلا بەرزو گەورەو مەزن بێ، بە بڕوا پێبوون و، بە قسەو دەربڕین و، بە کردەوەو، بە پەنهانیی و بە ڕواڵەت.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴾، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (**كَبِّرْ رَبَّكَ**)، لێرەدا بەرکار (**مَفْعُول بِهِ**)ەکە پێشخراوە، بۆچی؟ (**قُدِّمَ عَلى عامِلِهِ لِإِفادَةِ الِاخْتِصاصِ، أَيْ: لا تُكَبِّرْ غَيْرَهُ، وهو قَصْرُ إِفْرادٍ، أَيْ: دُونَ الأَصْنامِ**) واتە: تەنیا پەروەردگارت بە گەورە بگرە، بە عەقڵ و دڵ و بە کردەوەکان، جگە لەو بە گەورە مەگرە، کە مەبەست پێی بت و صەنەمەکان و پەرستراوەکانی دیکەن.

---

(١) جامع البيان: ٣٥٤١٦.

ئایا وشەی ﴿فَكَبِّرْ﴾ بۆچی پیتی (ف)ی خراوەتە سەر؟ **(ودَخَلَتِ الفاءُ عَلى (كَبِّرْ) إيذانًا بِشَرْطٍ مَحْذُوفٍ يَكُونُ (كَبِّرْ) جَوابَهُ، فالتَّقْدِيرُ: مَهْما يَكُنْ شَيْءٌ فَكَبِّرْ رَبَّكَ)**، واتە: وشەی (ف) بۆیە چۆتە سەر (كَبِّرْ)، بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەوە، کە ئەمە وەڵامی مەرجێکی قرتێنراوە، (كَبِّرْ) دەبێتە وەڵامی ئەو مەرجە قرتێنراوەو ئاوای لێدێتەوە: هەر شتێك ببێ، تۆ هەر تەنیا پەروەردگارت بە گەورە بگرە.

٤)- ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾، پۆشاکەکەشت پاك بکەوە، **(ثِيَاب)** واتە: بەرگ و پۆشاك، ئەمیش دوو واتایان دەگەیەنێ:

**یەکەم:** مەبەست لە پۆشاك خود **(ذات)**ە، واتە: خودی خۆت پاك بکەوە، ناخی خۆت پاك بکەوە، بژاری بکە لە هەرچی سیفەتی خراپ و نەگونجاوە.

**دووەم:** یاخود مەبەست لە **(ثِيَاب)** پۆشاکی ڕواڵەتییەو، مەبەست پێی پاك و خاوێن ڕاگرتنی پۆشاکە، ئنجا ئەگەر مرۆڤ پابەند بکرێ، پۆشاکەکەی پاك و خاوێن ڕابگرێ، بێگومان جەستەی زیاتر لێی داوا دەکرێ پاکی ڕابگرێ، کەسێکیش لێی داوا بکرێ جەستەی پاك ڕابگرێ، دڵ و دەروونی و ناخی زیاتر لێی داوا دەکرێ پاکی ڕابگرێ.

پێشتریش باسم کرد، کە پاك و خاوێنی ڕووح و جەستە، یاخود دەروون و دەر، یان پەنهان و ئاشکرا، دوو شتی پێکەوە پەیوەستن و، مەگەر چۆن ئەگەرنا هەر کەسێك ناخەکەی و ڕووحەکەی پاك بێ، ئەو ناخ پاکیی و ڕووح پاکییە، پاڵی پێوە دەنێ، ڕواڵەتی خۆشی پاك ڕابگرێ، هەم جەستەی، هەم پۆشاکی، هەم خانووبەرەی، هەم ژینگەی، هەم شوێنی تێدا ژیانی، تەسکی یاخود فراوانی.

بۆیە لە ڕاستییدا پیس و پۆخەڵیی و پشتگوێخستنی پاك و خاوێنیی، چ پاك و خاوێنیی جەستە، چ بەرگ و پۆشاك، چ بەرو پێش دەرگاو ماڵ، پێچەوانەی پاکیی و خاوێنیی ناخ و دڵ و دەروونی مرۆڤە، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**إنَّ اللە جَمِيلٌ يُحِبُّ الجَمَال**} **(أخرجه مسلم: ١٤٧)**، واتە: خوا جوانەو جوانی خۆش دەوێ.

٥)- ﴿وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ﴾، واتە: واز لە پیسیی بهێنە، وشەی (**الرُّجز**)، هەروەها (**الرِّجز**) کە لە لای زۆربەی زانایان بە هەردووکیان خوێندراوەتەوە: (**الرُّجز**) و (**الرِّجز**) مانایەکەیان یەکە، هەندێکیش گوتوویانە: (**الرِّجز**) بە ژێر (**کسرة**)، (**العَذَابُ وَالنَّجَاسَةُ وَالمَعْصِيَة**) یانی: ئازارو پیسیی و سەرپێچیی، بەڵام (**رُجز**) بریتیە لە بت و صەنەم، هەندێکیش گوتوویانە: بەڵکو (**الرُّجز**) و (**الرِّجز**) هەردووکیان بە مانای ئازار و پیسیی و سەرپێچی و بت و صەنەمیش دێن.

کە دەفەرموێ: ﴿فَٱهۡجُرۡ﴾ (**والهَجْرُ: تَرْكُ المُخالَطَةِ وعَدَمُ الإِقْتِرابِ مِنَ الشَّيْءِ. والهَجْرُ هُنا كِنايَةٌ عَنْ تَرْكِ التَّلَبُّسِ بِالأَحْوالِ الخاصَّةِ بِأَنْواعِ الرُّجْزِ**)، (**هَجْر**): بریتیە لە وازهێنانی تێکەڵیی و نیزیك نەبوونەوە لە شتێك، لێرەش مەبەست پێی وازهێنانە لە تێکەڵیی و نیزیکیی لەو حاڵەتە تایبەتانەی، دەلالەت لەسەر پیسیی و گوناهو تاوان و ناڕێکیی دەکەن.

٦)- ﴿وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ﴾، ئەم ڕستەیە بە سێ جۆر مانا کراوە:

أ- منەتیش مەکە، ئەوەی دەیبەخشی بە زۆری بزانی.

ب- منەت مەکە، ئەوەی ئەنجامی دەدەی بۆ خوای پەروەردگار پێت زۆربێ.

ج- چاکە لەگەڵ خەڵکدا مەکە، شتێکیان پێبدەی، بۆ ئەوەی چاکتر لە شتەکەی پێت داون، وەری بگرێ، کە بە دڵنیایی ئەوە ڕەوشتێکی ناڕێکە، هەرگیز لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوەشێتەوە، مەگەر ئەوە بۆیە بەو گوترابێ، واتە: ئەی خەڵکی دیکە! وا مەکەن، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ٤﴾**القلم**، واتە: تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی، ئەوەش کە تۆ شتێك بدەی بە کەسێك، بەڵام بۆیە بیدەیە شتێکی چاکترت لە بەرانبەردا بداتێ، ئەوە هەڵسوکەوتێکە هەرگیز لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەوەشاوەتەوە، کە ئەگەری ئەوە دابنرێ، پێغەمبەر ﷺ شتێکی وای کردبێ و، خوای کاربەجێش پێی بفەرموێ: وامەکە.

هەروەها ئەوانی دیکەش هەروا: خوا فەرمانی پێکردوە، هەڵسێ و خەڵك وریا بکاتەوەو بترسێنێ و، تەنیا پەروەردگاری بە گەورە بگرێ، بە دڵ و بە زمان و بە کردەوەو، بەرگ و پۆشاکی خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێ و، واز لە پیسیی و سەرپێچیی و بت و صەنەم و بێنێ، مەرج نیە ئەوانەی بووبن بەڵکو واتە: خۆتیان لێ دوور بگرە، ئەوی دیکەش: ﴿وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ﴾، واتە: کە چاکەت لەگەڵ کەسێکدا کرد، بەهۆی بەزۆر دانانی ئەو چاکەیەوە، ئنجا چاکەکە ماددیی بوو و شتێکت پێ بەخشیبوو، یان مەعنەویی بوو و هاوکارییەکت کرد بوو، بەهۆی ئەوەوەی ئەو چاکەیەت کردوە لەگەڵ جگە لە خۆتداو بە زۆری دەزانی، منەت مەکە.

ئایا منەت بریتیە لە چی؟ (**الـمَنُّ: تَذْكِيرُ الْمُنْعِمِ الْمُنْعَمَ عَلَيْهِ بِإِنْعامِهِ**)، منەت بریتیە لە بیرخستنەوەی بابای چاکەکار بۆ چاکە لەگەڵدا کراو بە چاکەکەی.

ئەوەش شتێکی خراپە، بۆیە عەرەب گوتوویانە: (**الْمِنَّـةُ تَهْدِمُ الصَّنِيْعَـة**)، منەتکردن چاکە هەڵدەوەشێنێتەوە، کەواتە: کە چاکەت لەگەڵ کەسێکدا کرد باسی مەکەو، بە چاوی دا دامەدەوە، بگرە لەملاو لەولاش باسی مەکە، چونکە ئەگەر پێی بگاتەوە، پێی ناخۆش دەبێ، ئەوەش وەك ئەوە وایە هەر چاکەت لەگەڵدا نەکردبێ، بەڵکو ڕەنگە ئەو کەسەی چاکەت لەگەڵدا کردوە، سەد خۆزگە بخوازێ، ئەو چاکەیەت هەر لەگەڵ نەکردبایە.

کە دەفەرموێ: ﴿تَسۡتَكۡثِرُ﴾: (**الإِسْتِكْثارُ: عَدُّ الشَّيْءِ كَثِيراً**)، (**إستكثار**): بریتیە لەوەی تۆ شتێك بە زۆر بزانی و پێت زۆر بێ.

بۆ ئەم ڕستەیەش سێ واتا دانراون:

أ- واتایەکیان ئەوەیە: تۆ منەت لەسەر خەڵك مەکە، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو هیدایەتەی خوایان پێ دەگەیەنی، پێت زۆربێ، بێگومان هیدایەتەکە زۆرە، بەڵام گەیاندنەکەی خۆتت بۆ ئەوان و زەحمەتیی و نارەحەتییەکەی خۆتت بۆ ئەوان، پێ زۆر نەبێ و، بەهۆی ئەوەوە منەتیان لەسەر بکەی!.

**ب-** واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە بە هۆی ئەو پێغەمبەرایەتییەوەی خوا بەتۆی بەخشیوە، منەت لەسەر خەڵکی مەکە، پاداشتیان لێوەربگری.

**ج-** هەندێکیش لە زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: (**لَا تَعُدَّ مَا أَعْطَيْتَهُ كَثِيْراً، فَتُمْسِكَ عَن الإِزْدِيادِ فِيهِ**) ئەوەی بەخشیوتە پێت زۆر نەبێ، تاکو دوایی واز لە بەخشین بێنی و بڵێی زۆرم بەخشیوە، با چیدیکە نەبەخشم.

ئـەو واتایانـە هەموویـان هـەن، بـەڵام وەك گوتـم ئـەوەی زیاتـر دێتـە زەینـەوە، ئەوەیـە: بەهـۆی ئـەوەوە، بـە زۆری دەزانـی منـەت مەکـە، ئنجـا ئـەو شـتەی بەخشـیوتە، چ بەخشـینی ماددیـی بـێ، چ بەخشـینی مەعنەویـی بـێ.

٧)- ﴿ وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴾، تەنیاش بۆ پەروەردگارت خۆڕاگر بە، واتە: کە خۆت ڕادەگری، با خۆڕاگرتنەکەت تەنیا لەبەر پەروەردگارت بێ و، چاوەڕێی پاداشتی ئەو بە.

٨)- ﴿ فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ ﴾، ئنجا هەر کات فوو بە (**نَاقُور**)دا کرا، (**النَّاقُورُ: مَا يُنْقَرُ فِيْهِ**) ناقوور شتێکە فووی پێدا دەکرێ و دەنگ و زرینگەی لێ دێ، لە شوێنی دیکەش دا خوا فەرموویەتی: (**صور**) کەڕەنا.

٩)- ﴿ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴾، ئەوە لەو ڕۆژەدایە کە ڕۆژێکی سەختە.

١٠)- ﴿ عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴾، لەسەر بێبڕوایەکان ئاسان نیە، ﴿ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴾، واتە: ئاسان نیە، ئەوەش هەر جەختکردنەوەی مانای (**عَسِيْر**)ە، واتە: سەخت و قورسە و ئاسان نیە، ئەمەش وەك فەرمایشتی خوایە کە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ﴾**الأنعام**، گومڕا بوون و ڕێی ڕاستگرتوو نەبوون، کە ئەوەی دوایە جەختکردنەوەی مانای ئەوەی پێشەوەیە.

بـۆ زیاتـر تیشـك خسـتنە سـەر چەمـك و واتـای ئـەم دە ئایەتـە موبارەکـە، دەقێکی سـوننەت دێنیـن، کـە پێشـتریش هێنامان:

{عَـنْ جَابِـرِ رَضِيَ اللـهُ عَنـهُ، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ، وَهُـوَ يُحَـدِّثُ عَـنْ فَـتْرَةِ الوَحِـي، بَيْنَـا أَنَـا أَمْـشِي سَـمِعْتُ صَوْتـاً مِـنَ السَّـمَاءِ، فَرَفَعْـتُ رَأسي، فَـإِذَا المَلَـكُ الَّـذِي جَـاءَنِي بِحِـرَاءٍ جَالِـسٌ عَـلَى كُـرْسِيٍّ بَـيْنَ السَّـمَاءِ وَالْأَرْضِ، فَجُئثْـتُ مِنْـهُ فَرَقًـا، حَتَّـى هَوَيـت إِلَى الأَرْضِ، فَجِئْـتُ أَهْـلِي فَقُلْـتُ لَهُـمْ: زَمِّلُـونِي زَمِّلُـونِي، فَزَمَّلُـونِي، فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥﴾، قَـالَ: ثُـمَّ تَتَابَـعَ الْوَحْـيُ} (أخرجـه البخـاري: ٤، ومسـلم: ١٦١، والطـبري: ٣٥٤٠٨).

واتـە: جابیر (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە باسـی ماوەیەك پچڕانـی وەحیـی بـۆ کرانـی دەکـرد، فەرمـووی: لـە کاتێکـدا دەڕۆیشـتم گوێـم لـە دەنگێـك بـوو لـە سـەرێوە، سـەرم بـەرز کـردەوە، ئـەو فریشـتەیەی لـە ئەشـکەوتی (حِـرَاء)دا هاتبـوو بـۆ لام ئـەو بـوو، لەسـەر کورسـییەك دانیشـتبوو لـە نێـوان ئاسـمان و زەوی دا، [پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی] بەهـۆی ترسـان لـەوەوە دانیشـتم و، هاتمـەوە بـۆ لای خێزانـم، گوتـم داملپۆشـن داملپۆشـن، ئیـدی دایانپۆشـیم، خـواش ئـەوەی دابەزانـد: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢﴾، واتـە: ئـەی ئـەو کەسـەی خـۆت لـە پۆشـاکەوە پێچـاوە! هەڵسـەو (خەڵـك) وریـا بکـەوە، تاکـو دەگاتـە ئـەو شـوێنە: ﴿وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥﴾، دواییـش وەحیـی بـەردەوام بـوو.

دەربـارەی ئـەو ڕسـتە موبارەکـە، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤﴾، پێشـتریش باسـمان کـرد، کـە جـاری وا هەیـە پاکیـی پۆشـاك، وەك تەعبیرێکـی ڕەمزیی بەکاردەهێـنرێ بـۆ پاکیـی ئـەو کەسـە، دەگوتـرێ: (فُـلانٌ نَقِـيٌّ الثِّيَـاب)، فلانکـەس پۆشـاکی پاکـە، (طَاهِـرُ الذيـلِ) ئەنگوچکـی (دامێنـی) پاکـە، کـە مەبەسـت پاکیـی و چاکیـی خـودی خۆیەتـی، ئـەم ئایەتـە موبارەکـە: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤﴾، بەپێـی مانـا ڕواڵەتییەکـەی بـێ: پۆشـاکی خـۆت پـاك بکـەوە، تاکـە ئایەتێکـە لـە هەمـوو قورئانـدا لـە بـارەی پاکیـی بـەرگ و پۆشـاکەوە، خـوای پـەروەردگار زۆر باسـی پاکـی کـردوە، بـەڵام پاکیـی بـەرگ و پۆشـاك، تەنیـا لـەم ئایەتـە موبارەکـەدا هاتـوە.

هەروەها لە بارەی ئەو ئایەتە موبارەکەوە کە دەفەرمووێ: ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ﴾، ئەم فەرموودەیە هاتووە:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَيْفَ أَنْعَمُ وَصَاحِبُ الْقَرْنِ قَدِ الْتَقَمَ الْقَرْنَ وَحَنَى جَبْهَتَهُ، يَنْتَظِرُ مَتَى يُؤْمَرُ فَيَنْفُخُ؟» فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «قُولُوا: حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ، عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا} (أخرجه الترمذي: ٢٦٣٩ عن أبي سعيد الخدري، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي، ورواه الطبري: ٣٥٤٧٦).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چۆن چێژ وەربگرم، لە حاڵێکدا خاوەنی کەڕەنا، کەڕەنایەکەی بەدەمەوە گرتووە، (ئەو کەڕەنایەی دووجاران فووی پێدا دەکرێ) و، نێوچەوانیشی بەسەردا نوشتاندۆتەوە، گوێی هەڵخستووە کەی فەرمانی پێدەکرێ، فووی پێدا بکات! هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ گوتیان: فەرمانمان بە چی پێدەکەی؟ فەرمووی بڵێن: (**حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ**)، خوامان بەسەو باشترین کارپێسپێردراو ئەوە، (**عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا**) پشتمان تەنیا بە خوا بەستوە.

### مەسەلەی دووەم:

**باسی کافرێکی ملهوڕ کە خوا چاکەی زۆری لەگەڵدا کردوەو، لە سامان و کوڕانی زۆری پێداوە، کەچی لە حاڵێك دا دژایەتیی ئایەتەکانی خوای کردوە، بەهیواش بووە خوا هەر بۆی زیاد بکات!، هەروەها زۆری بیرکردۆتەوەو ڕاماوەو خۆی گرژو مۆن و مرچ کردوە، کە شتێك لە بارەی قوڕئانەوە بڵێ، بۆ چەواشەکاریی خەڵك و سەرەنجام گوتوویەتی: قوڕئان جادوویەو قسەی بەشەرە، خواش هەڕەشەی لێکردوە بە هاویشتنە دۆزەخەوە، کە ئەوپەڕی بەهێزو سووتێنەرەو، نۆزدە فریشتەی بەسەرەوەن وەك سەرپەرشتیار:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّا ۖ إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست بڕگەدا:

١)- ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴾، لە من و لەو کەسە بگەڕێن کە بە تاك دروستم کردوە، ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ ﴾، واتە: (دَعْنِي وَإِيَّاهُ)، لەمن و لەو گەڕێن.

وشەی (وَحِيْداً):

أ- دەگونجێ بگەڕێتەوە بۆ خوای پەروەردگار، واتە: تەنیا خۆم دروستمکردوە، ئەو کاتەش بۆ وەلیدی کوڕی موغیرە، کە ئەم ئایەتانەی لە بارە هاتوونە خوارو، بۆ جگە لە ئەویش وەك یەکن، هەموو کەس تەنیا خوا دروستیکردوە.

**ب-** دەشگونجێ (**وَحِيْداً**) بگەڕێتەوە بۆ بابای دروستکراو، (**أي: الوَحِيدُ المُنْفَرِدُ عَن غَيْرِهِ فِي مَكَانٍ أَوْ حَالٍ أَوْ شُهْرَةٍ أَوْ قِصَّةٍ،**)، لە حاڵێکدا تاك بووەوەیە، تاکە لە ڕووی کاتەوە، لە ڕووی شوێنەوە، لە ڕووی حاڵەوە، لە ڕووی ناوبانگەوە، لە ڕووی بەسەرهاتەوە.

یانی: دەگونجێ (**وحیداً**) پەیوەست بێ بە بکەر (**فاعل**)ەوەو، دەشگونجێ پەیوەست بێ بە بەرکار (**مفعول**)ەوە.

**٢)-** ﴿وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا﴾، ماڵ و سامانێکی فراوانم پێداوە، (**الْمَمْدُودُ: اسْمُ مَفْعُولٍ مِنْ مَدَّ الَّذِي بِمَعْنَى: أَطَالَ، أو زَادَ**)، (**ممدود**) ناوی بەرکارە لە: (**مَدَّ**) بە مانای درێژی کردەوە، یان زیادی کرد.

(**مَمْدُود**):

**أ-** هەندێك گوتوویانە: (**مَبْسُوْط**) ماڵ و سامانێکی فراوان.

**ب-** هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پانتایی ئەو زەوی و زارانەیە کە هەیبوون، زەوی و زاری زۆری هەبوون، لە مەککەوە تاکو دەگاتەوە تائیف.

**ج-** هەندێکیش گوتوویانە: (**مَمْدُودٌ**) یانی: ماڵ و سامانێك کە بەردەوام دێتە سەری، واتە: وەبەرهێنانی هەبووەو بەردەوام بەرهەمی بۆ هاتۆتەوە.

**٣)-** ﴿وَبَنِينَ شُهُودًا﴾، کوڕانێکیشم بۆ ڕەخساندوون ئامادەن، (**شُهُود جَمْعُ شَاهِد أي: حَاضِر، أي: لَا يُفَارِقُونَهُ**)، واتە: کوڕانێکی ئامادە کە هەمیشە ئامادەن لە کۆڕو مەجلیسیدا، لێی جیانابنەوە، هەندێك گوتوویانە: دە کوڕی هەبوون، هەندێکیش گوتوویانە: سێزدە کوڕی هەبوون.

ئەم ئایەتانە کە دوایی تەواویان دەکەین، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشدا باسمان کرد، زۆربەی هەرە زۆری ڕوونکەرەوان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە لە بارەی وەلیدی کوڕی موغیرەوە هاتوونە خوار.

لەو بارەوە (الطبري) لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) هێناویەتی (قَالَ: أَنْزَلَ اللهُ فِي الوَلِيْدِ بنِ المُغِيْرَة، قَوْلَهُ: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴾)، (جامع البيان: ٣٥٤٩١)، گوتوویەتی: خوا لە بارەی وەلیدی كوڕی موغیرەوە ئەو فەرمایشتەی خۆی دابەزاندوە.

(الطبري) لە تەفسیری ئەو ئایەتە موبارەكەدا: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴾، گوتوویەتی: (كِلْ يَا مُحَمَّدُ أَمْرَ الَّذِي خَلَقْتُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ وَحِيدًا، لَا شَيْءَ لَهُ مِنْ مَالٍ وَلَا وَلَدٍ إِلَيَّ. وَذُكِرَ أَنَّهُ عُنِيَ بِذَلِكَ: الوَلِيدُ بْنُ المُغِيرَةِ المَخْزُومِيُّ)، (الطبري: ٣٥٤٩١) واتە: ئەی موحەممەد ﷺ ئەو كەسەی لە زگی دایكیدا بە تەنیا دروستمكردوەو، هیچ شتێكی نەبوو لە ماڵ و سامان و ڕۆڵە، كارەكەی بە من بسپێرەو، باسكراوە ئەو كەسە مەبەست پێی وەلیدی كوڕی موغیرەی ئەلمەخزوومییە.

٤)- ﴿ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴾، ژیان و گوزەرانم بۆ فراوانكردوەو هەموو ئامادەسازییەكم بۆی كردوە، (أَي: بَسَطْت لَهُ فِي العَيْش بَسْطاً، وَالتَّمْهِيدُ: هُنَا مُسْتَعَارٌ لِتَيْسِيرِ أُمُورِهِ وَنَفَاذِ كَلِمَتِهِ فِي قَوْمِهِ، بِحَيْثُ لَا يَعْسُرُ عَلَيْهِ مَطْلَبٌ)، واتە: ژیان و گوزەرانم بۆ فراوانكردوە، هەموو ئامادەسازییەكم بۆ كردوە، (تمهيد)یش خوازراوەتەوە بۆ كاروبار ئاسان بوونی و قسە ڕۆیشتوویی لە نێو خەڵكەكەیدا، بەشێوەیەك هیچ شتێكی پێ زەحمەت نەبووە ئەنجامی بدات، هەم سەروەت و سامانی هەبووە، هەم خەڵكەكە ڕێزی گرتووەو، بە قسەیان كردوە، كوڕانی زۆریش بوون و، پشت و قوەتی چاكیشی بووە.

٥)- ﴿ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴾، دواییش بە تەمابووە بۆی زیاد بكەم! (ثُمَّ: لِلتَّرْتِيْب الرُّتبِيِّ)، (ثم) بۆ ڕیزبەندیی پلەپلەییە، واتە: دوای هەموو ئەو شتانەش، ئنجا تەماحی وایە بۆی زیاد بكەم، (الطَّمَعُ: طَلَبُ الشَّيْءِ الْعَظِيمِ)، (طَمَع): بریتیە لە داواكردنی شتێكی مەزن، كە (الطبري) ئاوای مانا لێكداوەتەوە: (ثُمَّ يَرْجُو أَنْ أَزِيدَهُ مِنَ الْمَالِ وَالْوَلَدِ عَلَى مَا أَعْطَيْتُهُ) دوایی بە هیوایەو ئومێدەوارە، لە ماڵ و سامانێك كە پێمداوەو لە ڕۆڵەنێك كە پێمداون، وێڕای ئەوە هی دیكەشی بدەمێ و بۆی زیاد بكەم.

٦)- ﴿ كَلَّآ إِنَّهُۥ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ﴾، نەخێر، چونکە ئەو بۆ ئایەتەکانمان دژو سەرپێچییکار بووە، (**كَلَّا**)، (**كَلِمَةُ رَدْعٍ وَزَجْر**)، (**كَلَّا**) وشەیەکە بۆ بەرپەرچدانەوەو تێخوڕین بەکاردێ، هەروەها جاری واش هەیە بۆ هەڵوەشانەوە (**إِبْطَال**) بەکاردێ، لێرەدا (**الطبري**) دەڵێ: (**كَلَّا يَقُولُ: لَيْسَ ذَلِكَ كَمَا يَأْمَلُ وَيَرْجُو مِنْ أَنْ أَزِيدَهُ مَالًا وَوَلَدًا، وَتَمْهِيدًا فِي الدُّنْيَا**)، ئەوە ڕاست نیە کە بە هیوایەو ئومێدەوارە بۆی زیاد بکەم لە ماڵ و سامان لە ڕۆڵان و، لە زەمینە بۆ خۆشکردن لە ژیانی دنیادا (ئەوە خەیاڵپڵاوە).

﴿ إِنَّهُۥ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ﴾، (**إِنَّ**): هەرچەندە بۆ جەختکردنەوەیە، بەڵام لێرەدا بۆ هۆکاردۆزیی (**تعليل**)ە، واتە: بۆیە با بە تەمای ئەوە نەبێ، چونکە ئەو لە بەرانبەر ئایەتەکانی ئێمەدا کەللەڕەق (**عَنِيْد**) بووە، (**العَنِيْدُ: الشَّدِيدُ العِنَاد، وَالعِنَادُ مُخَالَفَةُ للصَّوَاب**)، (**عنيد**) یانی: خاوەنی کەللەڕەقیی سەخت، عینادیش واتە: زۆر سەرپێچییکارە بۆ شتێکە کە ڕاستە، دژی ڕاستیی و حەقە، هەندێکیش گوتوویانە: (**عَنِيدًا: مُعَانِدًا لِلحَقِّ مُجَانِبًا لَهُ، كَالبَعِيرِ العَنُود**)، (**جامع البيان: ٣٥٥١١**)، واتە: (**عَنِيدً**) یانی: ناحەزی هەق و دوور لە هەق، وەك حوشتری عەنوود، کە بە حوشترێك دەگوترێ: عەنوود، جەنە بگرێ و مل نەدا بۆ بارو سواریی.

٧)- ﴿ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ﴾، لەمەودوا بە هەورازی هەڵدەگێرم، یاخود: تووشی کارێکی زەحمەتی دەکەم، یاخود: تووشی سزایەکی ماندووکەرو سەختی دەکەم، (**سَأُكَلِّفُهُ مَشَقَّةً مِنَ الْعَذَابِ، لَا رَاحَةَ لَهُ مِنْهَا**)، واتە: زەحمەتییەك لە سزادانی دەخەمە سەری، لێی ئاسوودە نابێ.

(**الإِرْهَاق: الإِتْعَابُ وَتَحْمِيل مَا لَا يُطَاق**)، (**إرهاق**) بە مانای ماندووکردنە و شتێك بخەیە سەر شانی کەسێك نەتوانێ.

(**الصَّعُودُ: جَبَلٌ مِنْ نَارٍ يُصْعَدُ فِيهِ سَبْعِينَ خَرِيفًا، ثُمَّ يَهْوِي كَذَلِكَ مِنْهُ أَبَداً**)، (**صَعُود**) چیایەکە لە ئاگر، ئەو کەسە حەفتا پایز (واتە: حەفتا ساڵ)، خەریکی سەرکەوتن دەبێ، ئنجا دوای سەرکەوتنە سەری، لە سەرێڕا بەردەبێتەوەو دووبارە تێهەڵدەچێتەوە، بەو شێوەیە هەر خەریکی پێهەڵگەڕان و کەوتنە خوارەوە دەبێ.

٨)- ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾، بە دڵنیایی ئەو بیری کردەوەو ئەندازەگیریی کرد، (**فَكَّرَ: أَعْمَلَ فِكْرَهُ وَكَرَّرَ نَظَرَ رَأْيِهِ، لِيَبْتَكِرَ عُذْرًا يُمَوِّهُهُ وَيُرَوِّجُهُ عَلَى الدَّهْمَاءِ فِي وَصْفِ الْقُرْآنِ، بِوَصْفِ كَلَامِ النَّاسِ، لِيُزِيلَ مِنْهُمُ اعْتِقَادَ أَنَّهُ وَحْيٌ أُوحِيَ بِهِ إِلَى النَّبِي ﷺ**)، واتە: عەقڵی خۆی بەکارهێناو تێفکریی، تاکو لە لای خۆیەوە پۆزشێك بهێنێتەوەو، خەڵکی سادەی پێ چەواشە بکات و کڵاویان لەسەر بنێ، چاوپێچکیان بخاتە سەرچاو، بە جۆرێك قورئان وەسف بکات، گوایە: قسەی خەڵکە، تاکو ئەوە کە بڕوایان وابێ وەحیی خوایە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺلە دڵیاندا لاببەرێ.

٩)- ﴿فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾، بە کوشت بچێ چۆنی ئەندازەگیریی کرد! چۆن ئاوا تێوە ڕاماو ئەندازەگیریی کرد، (**قَدَّرَ: أي جَعَلَ قَدراً لما يَخْطُرُ**) ئەندازەی دانا بۆ ئەوەی بە مێشکی دادێ.

١٠)- ﴿ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾، جارێکی دیکەش دووبارە بە کوشت بچێ، چۆن ئەندازەگیریی کرد، (**قُتِلَ: دُعَاءٌ عَلَيْه بِأَنْ يَقْتُلَهُ قَاتِلٌ**)، (**قُتِل**) نزاکردنە لە دژی کە بکوژێك بیکوژێ، کە مەبەست پێی ئەوەیە زوو لە بەین بچێ و بمرێ، (**وَهَذَا الدُّعَاء مُسْتَعْمَلٌ فِي التَّعْجِيْب**)، ئەم نزایە وەك چۆن بە مانای بە کوشت بچێ، زوو بە هیلاك بچێ، دێ، بە مانای ئەوەش دێ: کەسێك شتێکی کردبێ، جێی سەرسوڕمان بێ، واتە: سەرتان لێی سوڕ بمێنێ، چۆن بیری کردەوەو ئاوا ڕاما، قسەیەك ساز بکات لە دژی قورئان، کە خەڵکێك بچێتە عەقڵیەوە.

١١)- ﴿ثُمَّ نَظَرَ﴾، دوایی جارێکی دیکە سەرنجیدا، ئەمە لێرەدا وا پێدەچێ مەبەست پێی سەرنجدانی چاو (**نَظَرُ العَيْن**) بێ، تاکو ئەوە زیادە بێ لەسەر ئەوەی ڕابرد، پێشێ هەمووی باسی بیرکردنەوەو عەقڵی خۆ بەکارهێنان و ئەندازەگیریی کردن و ڕامان بوو، بەڵام ئەمەیان سەرنجدانی چاوو تێفکرینە، هەندێکیش گوتوویانە: (**نَظَر**) واتە: دووبارە سەرنجی دایەوە بە عەقڵ.

١٢)- ﴿ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾، دوایی ڕووی خۆی گرژ کردو خۆی مۆن و ترش و تاڵ کرد، (**عَبَسَ: قَطَّبَ وَجْهَهُ لَمَّا اسْتَعْصَى عَلَيْهِ مَا يَصِفُ بِهِ الْقُرْآنَ**)، ڕووی خۆی گرژ کرد لەبەر

ئەوەی بۆی زەحمەت بوو، نەیزانی قورئان بە چی وەسف بکات، خەڵکی پێ ئیقناع بکات، کە قورئان وەحیی خوا نیە.

(**بَسَرَ: مَعْنَاهُ كَلَحَ وَجْهُهُ وَتَغَيَّرَ لَوْنُهُ، خَوْفًا وَكَمَدًا، حِينَ لَمْ يَجِدْ مَا يَشْفِي غَلِيلَهُ مِنْ مَطْعَنٍ فِي الْقُرْآنِ**)، واتە: ڕووی گرژو تاڵ و مۆن بوو، ڕەنگی گۆڕا لە ترسان و لە خەفەتان کاتێك شتێکی نەبینی، ئاوی دڵی بدات، لەوەدا کە تانەیەك لە قورئان دا، بدۆزێتەوە.

**١٣)-** ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ﴾، دوایی پشتی هەڵکردو خۆی بە زلگرت، ﴿أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ﴾، (**أَدْبَرَ عَنْ إِيْجَادِ مَطْعَنٍ فِي الْقُرْآنِ إِلى العِنَادِ وَالإِسْتِكْبَار**)، واتە: وازی لەوە هێنا کە شوێنێکی تانەدان لە قورئاندا بدۆزێتەوە، وازی لەوە هێناو گواستیەوە بۆ کەللەڕەقیی و خۆ بەزلگریی، پێشێ ویستوویەتی تانەیەك لە قورئاندا بدۆزێتەوە، عەیب و ڕەخنەیەك کە خەڵکی پێ ئیقناع بکات، ئنجا کە ئەوەی نەدۆزیوەتەوە، داویەتە ملهوڕیی و خۆ بەزلگریی.

کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ﴾، خوازراوەتەوە بۆ وێناکردنی ئەو کەسە، لە زیاتر پشتهەڵکردنی لە بڕوا پێ هێنان و بەڕاست دانانی پێغەمبەری خوادا ﷺ، وەك لە شوێنی دیکەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾﴾**النازعات**، دوایی پشتی هەڵکردو هەوڵی دا، کە لە بارەی فیرعەونەوەیە لە دژی مووسا ؑ موعجیزەکانی.

**١٤)-** ﴿فَقَالَ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾، گوتی: ئەمە بەس جادوویەکە دەگێڕدرێتەوە، واتە: (**سِحْرٌ يُرْوى وَيُحْكى**) هەر جادوویەکە دەماو دەم نەقڵ بووە، جادوویەکی گێڕدراوەیەو لە پێشینانەوە نەقڵ کراوەو، ئەم جادووە خەڵك فێری بووە، کە دەفەرموێ: ﴿فَقَالَ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾، ئەم (**ف**)ە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو قسەیەی بە دڵدا هاتوە، یەکسەر کردوویەتی، بەبێ ئەوەی زمانی لێی گیر بکات و، زمانی لێ هەڵبنگوێ.

**١٥)-** ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ﴾، ئەمە تەنیا قسەی مرۆڤە، دیارە ئەمە جەختکردنەوەو داکۆکییکردنە لەسەر قسەکەی پێشێ، بۆیە پێویستیی بە بادانەوەو گێڕانەوە نەکردوە بە (و)ی بادانەوە (**عَطف**).

١٦)- ﴿ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴾، (خوا ﷻ دەفەرمویٚ:) لەمەودوا دەیخەمە (سَقَر)ەوە، (**سَقَر: عَلَمٌ لجَهَنَّم إذْ لَمْ يَنْصَرِف**)، (سَقَر)، ناوی ناسرانە بۆ دۆزەخ، بۆیە بە نەگۆڕاو (**غير منصرف**) هاتوە، چونکە هەم ناوی (**عَلَم**)ە، هەم بە مێینەی مەجازییش لە قەڵەم دەدریٚ.

١٧)- ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴾، چی بە تۆی زانادوە (سَقَر) چییە؟ ئەوەش پیٚشاندنی مەزنیی ئەو دۆزەخەیە کە نازناوی (سَقَر)ە، (**تَهْوِيْل لِشَأنَهَا بأنَّها لَا يُحِيْط بِهَا وَصفٌ**)، زۆر زەبەلاح و بیٚڕەزایەو، هیچ وەسفیٚك ناتوانیٚ دەوری بدات.

١٨)- ﴿ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ﴾، ناهیٚڵیٚ و لیٚش ناگەڕیٚ، (**لَا تُبْقِي أَحَداً مِنْهُم إلاَّ أَحْرَقَتْه، وَلَا تَتْرُكُ مِنْ أحَدٍ مَكَاناً إلَا نَالَتْهُ**)، هیچ کامیان ناهیٚڵیٚ نەیسووتیٚنیٚ و، شویٚنی هیچ یەکیٚکیشیان ناهیٚڵیٚ، مەگەر دەیگاتیٚ، کەواتە: هەمووان دەسووتیٚنیٚ و، هەموو ئەندامەکانی جەستەشیان دەسووتیٚنیٚ.

١٩)- ﴿ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ﴾، سووتیٚنەری پیٚستە، ڕەشهەڵگیٚڕەری ڕوو و پیٚستیانە، (**مُغَيِّرَةٌ للجُلُود حَتَّى تُسَوِّدَهَا**)، پیٚستەکان دەگۆڕیٚ هەتا ڕەشهەڵدەگەڕیٚن، یاخود: سووتیٚنەرە بۆ پیٚستیان، دەگوتریٚ: (**لَوَّحَتْهُ الشَّمْس وَلَاحَقْتُه أي: غَيَّرتهُ وَأحْرَقَتهُ**)، خۆرەکە گۆڕی و سووتاندی.

٢٠)- ﴿ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴾، نۆزدەی بەسەرەوەن، یانی: نۆزدە فریشتەی بەسەرەوەن، سەرپەرشتیی دەکەن، یاخود: نۆزدە کۆمەڵ لە فریشتە، یاخود: نۆزدە جۆر لە فریشتەکان.

کۆتایی ئەم مەسەلەش بە دەقە دەهیٚنین، کە (**الطبري**) هیٚناویەتی و پیٚشتریش هیٚنامان:

(**عَنْ عِكْرِمَةَ أَنَّ الْوَلِيدَ بْنَ الْمُغِيرَةِ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَرَأَ عَلَيْهِ الْقُرْآنَ، فَكَأَنَّهُ رَقَّ لَهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ أَبَا جَهْلٍ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: يَا عَمُّ إِنَّ قَوْمَكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَجْمَعُوا لَكَ مَالًا لِيُعْطُوكَهُ، فَإِنَّكَ أَتَيْتَ مُحَمَّدًا لِتَعْرِضَ لِمَا قِبَلَهُ، قَالَ: قَدْ عَلِمَتْ قُرَيْشٌ أَنِّي مِنْ أَكْثَرِهَا مَالًا، قَالَ: فَقُلْ فِيهِ قَوْلًا يَبْلُغُ قَوْمَكَ أَنَّكَ مُنْكِرٌ لَهُ، وَأَنَّكَ كَارِهٌ لَهُ، قَالَ: وَمَاذَا أَقُولُ؟ فَوَاللهِ مَا فِيكُمْ رَجُلٌ أَعْلَمَ بِالشِّعْرِ مِنِّي، لَا بِرَجَزِهِ، وَلَا بِقَصِيدِهِ، وَلَا بِأَشْعَارِ**

الْجِنِّ، وَاللَّهِ مَا يُشْبِهُ هَذَا الَّذِي يَقُولُ شَيْئًا مِنْ هذا، وَاللهِ إِنَّ لِقَوْلِهِ الَّذِي يَقُولُ لَحَلَاوَةً، وَإِنَّ عَلَيْهِ لَطَلَاوَةً، وَإِنَّهُ لَمُثْمِرٌ أَعْلَاهُ، مُغْدِقٌ أَسْفَلُهُ، وَإِنَّهُ لَيَعْلُو وَمَا يُعْلَى، وَإِنَّهُ لَيَحْطِمُ مَا تَحْتَهُ قَالَ: وَاللَّهِ لَا يَرْضَى قَوْمُكَ حَتَّى تَقُولَ فِيهِ، قَالَ: فَدَعْنِي حَتَّى أُفَكِّرَ، فَلَمَّا فَكَّرَ قَالَ: هَذَا سِحْرٌ يُؤْثِرُ، يَأْثُرُهُ عَنْ غَيْرِهِ، فَنَزَلَتْ: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴾)[١].

واتە: عیکریمە دەڵێ: وەلیدی کوڕی موغیرە چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش قورئانی بەسەردا خوێندەوە، وەك دڵی نەرم بوو بێ، ئەوە بە ئەبوو جەهل گەیشتەوەو هات بۆ لای وەلیدی کوڕی موغیرە گوتی: مامە! خەڵکەکەت دەیانەوێ ماڵ و سامانت بۆ کۆ بکەنەوەو بتدەنێ، گوتی: بۆچی؟ گوتی: چونکە تۆ بۆیە دەچی بۆ لای موحەممەد ﷺ تەماعت لەو ماڵ و سامانەی دایە کە هەیەتی، ئەویش گوتی: قورەیش دەزانن کە من لە هەموویان دەوڵەمەندترم، گوتی: قسەیەك بکە لە دژی قورئان خەڵکەکەت بزانن تۆ نکووڵیی لەوە دەکەی کە موحەممەد گوتوویەتی و ڕقت لێیەتی، ئەویش گوتی: ئنجا چی بڵێم؟ سوێند بە خوا هیچ پیاوێکتان نیە لە من زاناتر بێ لە شیعر، لە جۆری ڕەجەزی شیعر لە جۆری قەصیدی، هەروەها لە شیعری جند، بە خوا ئەوەی دەیڵێ: وەك هیچ کام لەوە ناچێ، بە خوا ئەو قسەیەی دەیڵێ شیرینیایەتیی و تام و چێژی هەیەو ڕەونەقی هەیە، سەرەوەی بەردارەو خوارەوەی بەرهەمدارە، هەر شتێك لەگەڵی ڕووبەڕوو بێتەوە، دەیخاتە ژێر خۆی و دەیشکێنێ و، هەمیشە بەرز دەبێ و، هیچ شتێك بەسەریدا سەرناکەوێ، ئەبوو جەهل گوتی: خەڵکەکەت ڕازی نابن، هەتا قسەیەکی لە دژ نەکەی (لە دژی ئەوەی موحەممەد دەیڵێ)، ئەویش گوتی: لێمگەڕێ با بیری لێبکەمەوە، کاتێ بیری کردەوە، گوتی: جادوویە لە جگە لە خۆیەوە فێری بووە، ئیدی لەو بارەوە خوا ﷻ ئەو ئایەتانەی ناردنە خوار.

---

(١) جامع البيان: ٣٥٥٢١، وقال المحقق: إسناده مرسل.

## مەسەلەی سێیەم:

**بە نۆزدە(١٩) دانانی ژمارەی فریشتە دۆزەخەوانەکان، چەندان حیکمەت و ئامانجی تێدان: تاقیکردنەوەی بێبڕوایان، دڵنیاکردنی خاوەن کتێبان و، زیادکردنی ئیمانی بڕواداران و، دوو دڵ نەبوونی کتێب پێدراوان و بڕواداران و، گوتنی دڵنەخۆش و بێبڕوایان: خوا مەبەستی لەو وێنەیە چی بووە؟ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییەش کە گومڕاکردن و ڕاستە ڕێ کردن تەنیا بە دەست خوایەو، جگە لە خۆیشی هیچکەس ژمارەی سەربازەکانی نازانێ و، ئاگری دۆزەخیش گەورەترین بیرخەرەوەیە بۆ بەشەر:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً﴾، ئێمە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخمان تەنیا فریشتەکان داناون، ئەمە ڕاستییەکە خوا ڕایدەگەیەنێ و، ئەوانەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن، کە خوا بە هاوەڵانی ئاگر (**أصحابُ النَّار**) ناویان دەبات، واتە: هاوەڵانی ئاگر بەو واتایەی سەرپەرشتیی ئاگری دۆزەخ دەکەن، مشووری سزادراوان لە دۆزەخ دا دەخۆن و کاروباریان هەڵدەسووڕێنن، تەنیا فریشتەن و هیچ جۆرە دروستکراوێکی دیکەی خوا نین، ئەمە هەم ڕاستییەکە ڕادەگەیەنرێ و، وێڕای ئەوەش وەڵام و بەرپەرچدانەوەی قسەی هەندێك لە بێبڕوایەکانە، بۆ وێنە: **طەبەریی** لە قەتادەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووان هێناویەتی، کە گوتوویەتی:

(ذُكِرَ لَنَا أَنَّ أَبَا جَهْلٍ حِينَ أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ قَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ! مَا يَسْتَطِيعُ كُلُّ عَشْرَةٍ مِنْكُمْ أَنْ يَغْلِبُوا وَاحِدًا مِنْ خَزَنَةِ النَّارِ وَأَنْتُمُ الدَّهْمُ؟ فَصَاحِبُكُمْ يُخْبِرُكُمْ أَنَّ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ). (جامع البيان: ٣٥٥٤٣، إسناده مرسل).

واتە بۆمان باسکراوە کە ئەبوو جەهل کاتێك ئەم ئایەتە موبارەکە دابەزیوە، گوتوویەتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش! ئایا هەر دە (١٠)کەستان بەسەر یەکێك لە دۆزەخەوانەکان دا زاڵ نابن، {هەر دە (١٠) کەستان بە یەکێك لە فریشتە دۆزەخەوانەکان ناوێرن}، لە حاڵێکدا ئێوە ژمارەیەکی زۆرن؟ چونکە هاوەڵەکەتان {مەبەستی پێغەمبەرە ﷺ}، هەواڵتان پێدەدا کە (دۆزەخ) نۆزدە فریشتەی بەسەرەوەن.

واتە: هەر دە (١٠) کەستان بۆ یەکێك لە فریشتەکان بچن، ئێوە ژمارەیەکی زۆرن، هەموو ئەو نۆزدە فریشتانە، ئەگەر هەر بە دە نەفەران بە یەکێکی بوێرن، نەوەد (٩٠) کەستان دەوێ و زۆریشتان دەمێنننەوە! بۆیە خوا دەفەرموێ: ئێمە سەرپەرشتیارانی ئاگری دۆزەخمان تەنیا فریشتە داناون، هێزی فریشتانیش لەگەڵ هێزی جگە لە خۆیان دا بەراورد ناکرێ.

٢)- ﴿وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا﴾، ژمارەکەشیانمان - کە نۆزدەیە - تەنیا وەك تاقیکردنەوە داناوە، بۆ ئەوانەی بێبڕوان، واتە: باسکردنی ژمارەی فریشتە دۆزەخەوانەکانمان وەك تاقیکردنەوە، یان وەك مایەی سزا بەوجۆرە داناوە، چونکە (فِتنة) بە مانای جەڕباندن و ئیمتیحان دێ و، بە مانای ئازارو سزاش دێ، بەڵکو لە هەندێ سیاقی دیکەدا مانای دیکەش دەگەیەنێ، بەڵام لێرەدا ئەو دوو واتایە هەڵدەگرێ.

یانی: ئێمە ئەم ژمارەیەمان کە باسکردوە، بۆ ئەوە بووە بێبڕوایەکانی پێ تاقی بکەینەوە، یاخود: بێبڕوایەکانی پێ تووشی سزاو ئازار بکەین، چونکە ئەوان نکووڵیی لێ دەکەن، یان گاڵتەی پێ دەکەن و سەرەنجام شایستەی سزادران دەبن، ئنجا یەکێك لە حیکمەتەکانی ئەو ژمارەی نۆزدەیە، بریتیە لە تاقیکرانەوەی ئەوانەی پێی بێبڕوان،

٣)- ﴿ لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، تاكو ئەوانەی كتێبیان پێدراوە، مسۆگەرو دڵنیابن، **(وَالإِسْتِيقَانُ مِنْ شَأْنِهِ أَنْ يَعْقُبَهُ الْإِيمَانُ إِذَا صَادَفَ قَلْباً بَرِيْئاً)** دڵنیابوون لە شتێك لە بارانی دا هەیە، ئیمان پەلكێش بكات و ئیمانی بەدوادا بێ، ئەگەر ئەو دڵنیابوونە لە دڵ و دەروونێكی پاك و بێگەرددا بێ.

قسەكەی جوانە ئەگەرنا جاری وا هەیە، كەسێك لە شتێكیش دڵنیایە، بەڵام نكووڵیی لێدەكات، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی **(النَّمل)**دا لە بارەی **(آل فرعون)**ەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ ﴿١٤﴾ ﴾، نكووڵییان لە موعجیزەكانی مووسا عليه السلام كرد {فیرعەون و شوێنكەوتووانی}، هەرچەندە لە دڵی خۆشیاندا مسۆگەریان كردبوو و لێیان دڵنیا بوون (كە لەلایەن خواوەن)، بەڵام بەهۆی ستەم و خۆسەپاندن و خۆ بەرزكردنەوەوە بەسەر خەڵكدا بە ناهەق، ئامادە نەبوون مل بدەن بۆ پەیامەكەی مووسا، ئەگەرنا دەیانزانی موعجیزەو بەڵگەكانی هەق و ڕاستن.

كەواتە: مەرج نیە هەر كاتێك دڵنیایی **(يقين)** پەیدا بوو، ئیمان پەیدا ببێ، ئەگەر دڵ و دەروونێكی پاك یەقینی بچێتێ، لە بارەی شتێكەوە، ئیمانیش بەدوای خۆیدا دێنێ، بەڵام ئەگەر دڵ و دەروونەكە موخەننەت و پیس بێ، هەیە خۆر بە نیوەڕاستی ئاسمانەوە دەبینێ، بەڵام نكووڵیی لێدەكات، لەبەر ئەوەی دڵەكەی موخەننەت و پیسە.

كەواتە: حیكمەتی دووەمی باسكرانی ژمارەی نۆزدەی ئەو فریشتانەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەكەن، ئەوەیە كە ئەوانەی كتێبیان پێدراوە، دڵنیا بن، دڵنیاییەكەش بەهۆی ئەوەیە تەماشا دەكەن، لە كتێبەكانی خۆشیاندا هەر ئەو ڕاستییە باسكراوە: **(أي: لِيَسْتَيْقِنَوا صِدْقَ الرَّسُولِ فِيْمَا يَقُولُ عَنِ اللهِ لِمَوَافَقَتِهِ لِكُتُبِهِمْ)**، تاكو ئەوانەی كتێبیان پێدراوە دڵنیابن، دڵنیایی لە دڵیاندا پەیدابێ، لە بارەی ئەوەوەی پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد ﷺ)، لەلایەن خواوەو بە ناوی ویەوە ڕایدەگەیەنێ، چونكە لەگەڵ ئەوەی لە كتێبەكانیان دا هەیە، ڕێك دێتەوە،

وشـەی یـانی: دڵنیایـی، بـەڵام (إِسْتَيْقَان) کـە (س و ت)ی لـێ زیـاد کـراون، (يَقِـنَ) واتـە: دڵنیابـوو، (يَقِـنَ) لەسـەر کێـشی (فَـرِحَ)، بـەڵام (إِسـتَيقَنَ) کـە (سـين وتـاء) چوونـە سـەر (يَقِيْن)، بـۆ بەهێزکردنـی واتاکەیەتـی و زێدەڕۆییکردنـە تێیـدا، بنچینەیەکـی ڕێزمانییـە (زِيَـادَةُ المَبْنَـى تَـدَلُّ عَـلَى زِيَـادَةِ المَعْنَـى)، (إِسـتيقَنَ) واتـە: دڵنیایـی داواکـرد بـۆی بـێ، کـە مەبەسـت پێـی هێـزی دڵنیاییەکەیـە.

ئنجـا خـوا حیکمـەت و دەرهاویشـتەی سـێیەمی ڕاگەیاندنـی ئـەو ڕاسـتییە، کـە فریشـتە دۆزەخەوانـەکان نـۆزدەن، دەخاتـەڕوو:

٤)- ﴿وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنًا﴾، هەروەها ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە، ئیمانی دیکە بخەنە گەڵ ئیمانەکەیان، ئەمە واتایەکەی ئاوایە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە خوای پەروەردگار، پاشان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بە قورئان و، بە هەرچی کە پێغەمبەری خوا ﷺ و قورئان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دەیهێنن، ئەوە ئەسڵی ئیمانەکەیان هەیە، هەر شتێکی دیکەش کە دێ و، قورئان هەواڵی پێدەداو، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایدەگەیەنێ، ئیمانی پێ دێنن، کەواتە: ئەسڵی ئیمانەکەیان هەیەو، دوایی کە ئیمان بە شتێکی دیکەش دێنن، دەبێتە هۆی زیادبوونی ئیمانیان، بە تایبەتیی ئیمان بۆ شتی پەنهان بەکاردەهێنرێ، ئەگەرنا کەس ناڵێ: ئیمانم بە بوونی ڕۆژێ هەیە، یان ئیمانم بەو گڵۆپ و بلاجکتۆرە هەیە، ئیمان بە بوونی شتێکە کە نادیارە، ئیمان یانی: دانپێداهێنانی بوونی شتێك کە نادیارو پەنهانە، ئنجا خوا پەنهانە، فریشتەکان پەنهانن، جند پەنهانن، ڕۆژی دوایی پەنهانە، بەهەشت پەنهانە، دۆزەخ پەنهانە، هەروەك پێغەمبەرایەتیی موحەممەدیش ﷺ هەرچەندە لە قورئانداو لە سیرەکەیدا بەرجەستە بووە، بەڵام چۆنیەتیی دابەزینی جیبریل بۆ سەر موحەممەد ﷺ و وەحیی بۆ هێنانی، ئەویش پەنهانە.

ئنجا حیکمەتی چوارەم و پێنجەم دەخاتەڕوو:

٥)- ﴿وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوەو بڕوادارانیش دوو دڵ نەبن، (إرتياب) دژی ئیمان و دڵنیاییە، واتە: دوو دڵیی و

دڵ لە دڵدان، کەواتە: حیکمەتی چوارەم و پێنجەمی ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، ئەوەیە کە ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، هەروەها بڕوادارانیش واتە: مسوڵمانان، تووشی دوو دڵیی نەبن، خاوەن کتێبەکان لەبەر ئەوەی ئەو ڕاستییە لە کتێبەکانیان دا هاتوە، بڕوادارانیش لەبەر ئەوەی ئەو مەسەلەیە لە کتێبە پێشووەکاندا باسکراوە، بەڵام ئەگەر خوا ﷻ ژمارەیەکی دیکەی باسکردبایە، دەبووایە یان بڵێن: ئەوەی لە کتێبە پێشووەکاندا هاتوە، ڕاست نیە، یان لەوەی خۆیان دەکەوتنە دوو دڵیی، بەڵام ئێستا کە ئەوەی لە کتێبە پێشووەکاندا بەیان کراوە، هەر ئەوەش لە قورئاندا بەیان کراوە، نەك تەنیا ئەوە، بەڵکو زۆر ڕاستیی دیکەش هەن بەو شێوەیەن، بە تایبەتیی لە بارەی بەسەرهاتی هەندێك لە پێغەمبەرانەوە **علیهم السلام** ئەو کاتە ئەوە دەبێتە هۆی لاچوونی دوو دڵیی و دڵ لە دڵدان.

ئنجا دوو حیکمەتی دیکەی شەشەم و حەوتەمیش دەخاتە ڕوو:

٦)- ﴿ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، هەروەها تاکو ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایەو بێبڕوایانیش بڵێن، ئەوانەی پێشێ جگە لە یەکەمیان، سەرجەم دەرهاویشتەی باش بوون، کە بریتی بوون لە: زیاتر گەیشتنە دڵنیایی ئەوانەی کتێبیان پێدراوەو، زیادکردنی ئیمانی ئیمانداران و، دوو دڵ نەبوونی کتێب پێدراوان و، بڕواداران، بەڵام وێڕای ئەو پێنجە، دوو دەرهاویشتەی دیکەشی هەن، بەباری نەرێنیی دا، کە بریتیە لەوەی دڵنەخۆش و بێبڕوایان بڵێن:

٧)- ﴿ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ﴾، خوا مەبەستی چی بووە لەو وێنەیە؟ پیتی (ل) لە وشەی: ﴿ وَلِيَقُولَ ﴾دا (**لَام العِلّة**)یە، لامی هۆکارە، بەڵام مانای سەرەنجام دەگەیەنێ، هەروەك لە سووڕەتی (**القصص**)دا لە بارەی هەڵگرتنەوەی مووسا ﵇ لە صندووقەکەدا، وەك مەلۆتکەیەك لەلایەن ماڵی فیرعەونەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ﴿٨﴾ ﴾**القصص**، واتە: شوێنکەوتووانی فیرعەون، دارو دەستەی فیرعەون هەڵیانگرتەوە، بۆ ئەوەی سەرەنجام بۆیان ببێ بە دوژمن و بەمایەی

دڵتەنگیی، هەڵبەتە ئەوان بۆ ئەوەیان هەڵنەگرتەوە وابێ، هیچکەس شتێك ناكات، زیانی بۆ وی ببێ، بەڵام لەبەر ئەوەی سەرەنجامەكەی وابوو، وایفەرمووە، واتە: (ل)ی (**لیقول**) لە شێوەی (ل)ی هۆكار دایە، بەڵام مانای سەرەنجام دەگەیەنێ.

وشـەی (**مـاذا**) لـە ﴿ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ ﴾دا، لـە دوو پیـت پێكهاتـوە: (**مـا**) و (**ذا**)، واتـە: (**مَـا الْأَمْـرُ الَّـذِي أَرَادَهُ اللَّـهُ بِهَـذَا الـكَلَامِ، فِي حَـالِ أَنَّـهُ مَثَـلٌ**)؟: ﴿ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ﴾، خـوا ﷻ چـی ویسـتوە بـەم قسـەیە لـە حاڵێكـدا وێنەیەكـە هێنراوەتـەوە؟ (**مَثَل**)یـش بـە مانـای وێنـە هێنانـەوە دێ و، بـە مانـای وەسـفیش دێ، واتـە: (**مَـا الَّـذِي أَفَـادَهُ هَـذَا المَثَـل الَّـذِي هُـوَ عِبَـارَةٌ عَـن عـدد تِسْـعَة عَـشر؟**)، ئـەو وێنەیـە كـە بریتیـە لـە ژمـارەی نـۆزدە، چـی گـەیانـد، چ سـوودێكی گـەیانـدو خـوا چ مەبەسـتێكی هەیـە لـە پشـتیەوە؟ واتـە: ئەوانـەی دڵییـان نەخۆشـیی تێدایـەو، بێبڕوایـان لـە هەمـوو شـتێكی خـوا لـە گومانـدان، ئەگەرنـا ئـەوەی خـوا ﷻ دەیفەرمـوێ، ئەگـەر مـرۆڤ پێشـتر خـوای ناسـیبێ، ئـەو كاتـە دەزانـێ خـوا ﷻ خاوەنـی ئـەو پـەڕی زانیاریـی و حیكمـەت و میهرەبانیـی و پەنهانزانییـەو، هەرچـی بیفەرمـوێ، لـە سـەدا سـەد (١٠٠/١٠٠)وایـە.

بـەڵام ئـەوان چونكـە خوایـان نەناسـیوەو، لـە پشـت پـەردەوە تەماشـای خـوای پەروەردگاریـان كـردوە، بۆیـە گوتوویانـە: ئەگـەر ڕاسـت بـێ، خـوا فەرمووبێتـی، ئایـا مەبەسـتی پێـی چییـە؟! هەڵبەتـە ئـەوان مەبەسـتیان ئـەوە بـووە، ئـەو قسـەیە قسـەیەكی نـا لۆژیكییـەو قسـەیەكی سـەیرە، بۆیـە ناگونجـێ خـوا فەرمووبێتـی، یانی: مەبەسـتیان بـە هەڵەدانانـی قسـەكەو، لـە پشتیشـیەوە بـە درۆدانانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـووەو، بـە موخەننەتیـی قسـەیان كـردوە، بـەڵام بـە حیسـابی خۆیـان، بەپێـی عەقڵـی مسـوڵمانان دواون، واتـە: گریـمان خـواش ئـەوەی فەرمووبـێ، بـەڵام وەرن بزانـن مەبەسـتی ئـەو وێنەیـە چییـەو خـوا ﷻ چـی مەبەسـت بـووە؟ یـانی: هیـچ حیكمەتێكـی تێـدا نیـە، هیـچ سـوودو ئامانجێـك ناهێنێتـە دی، خـواش ناگونجـێ قسـەی بـێ حیكمـەت كـە ئامانجێـك نەهێنێتـە دی، بـكات، كەواتـە: ئـەوە قسـەو فەرمایشـتی خـوا نیـە، مەبەسـتیان ئـەوە بـووە.

بۆیە خوا ﷻ پێشێ حیکمەتەکانی خستەڕوو، پێنج حیکمەتی خستەڕوو، دوایی دەفەرموێ: هەروەها ئێمە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخمان لە فریشتان داناون، تاکو ئەو دەرهاویشتەیەشی هەبێ، کە دڵنەخۆش و بێبڕوایان بڵێن: ئەو وێنەیە هیچ سوودو حیکمەتێکی نیە! ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، مەرج نیە تەنیا مونافیقەکان بن، هەر کەسێك گومان و دوو دڵییەکی لە دڵدا هەیە، نەخۆشیی ئارەزوو و گومانانی لە دڵدا هەیەو، دڵ و دەروونەکەی، سیفەتە خراپەکان پڕیان کردوە، کەسانی ئاواش عەوداڵ و شەیدای هەق نین، چونکە ئەو هەقە ئەگەر بێت و بچەسپێ، ئەوان ئەو ڕاوەیان لێ تێکدەچێ، [ڕاوچیی خراپ لە ئاوی لێڵدا ڕاو دەکات] و، ئەوان دزن و بازاڕەکەیان بە ئاڵۆزیی دەوێ، بازاڕێك هێمن و ئارام بێ، ناتوانن دزیی تێدا بکەن، [دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ]، بۆیە دژی ئەو حەقەن، لەبەر ئەوەی نیەتیان خراپەو دڵیان نەخۆشیی تێدایە، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایەو بێبڕوایان، هەرچەند تەماشای فەرمایشتی خوا بکەن، هیچ حیکمەت و واتایەکی چاکی تێدا نابینن، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای هەر شتێك بکەی، بە ڕەشی دەبینی.

٨)- ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾، وەك ئەو گومڕاکردنەو ڕاستە ڕێکردنە سەرسوڕهێنەرانەیە، گومڕاکردن و ڕاستە ڕێ کردنی خوا ئاوایە، خوا هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای دەکات و، هەر کەسێکی بیەوێ ڕاستە ڕێی دەکات.

گومڕا کردنی خواش بۆ خەڵك، ئەوە نیە خوا ﷻ خەڵك ناچار بکات، ڕێی هەڵە بگرن، چونکە خوا ﷻ ئەو هەموو پێغەمبەرانەی ناردوون و، ئەو کتێبانەی دابەزاندوون و، هێندە هەڕەشەی کردوە لە خەڵك کە ڕێی هەڵە مەگرن و، هێندە دڵخۆشی کردوون بە بەهەشت و ترساندوونی بە دۆزەخ، مانای وایە خوا زۆری مەبەستە خەڵك ڕێی ڕاست بگرێ، گومان لەوەدا نیە، ئەدی یانی چی: ئاوا خوا هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای دەکات و، هەر کەسێکی بیەوێ ڕاستە ڕێی دەکات؟ واتە: بەپێی سیستم (**نظام**)ێك کە خوا لە ژیانی بەشەردا دایناوە،

کاتێ خوا هیدایەت دەنێرێ، هەر کەسێ هیدایەتەکەی خوا ڕەفز بکات، مانای وایە گومڕا دەبێ، بۆیەش گومڕابوونەکەی پاڵداوەتە لای خۆی، لەبەر ئەوەی بەپێی سیستمی خوایەو بەپێی ویستی خوایە، چونکە لە ژیانی بەشەردا ویست و سیستمی خوای پەروەردگار گشتگیرە بۆ هەموو شتێك، بەڵام کە سیستم و ویستی خوا گشتگیرە بۆ هەموو شتێك، خوا ویستێکی جوزئییشی بە مرۆڤەکان داوە، بایی ئەوەندەی کردەوەی چاکی پێ بکەن، تاکو پاداشتیان هەبێ و، کردەوەی خراپی پێ بکەن و لەسەری سزا بدرێن.

ئنجا کە دەفەرموێ: خوا هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای دەکات، واتە: بەپێی یاسای خوا، هەر کەسێك هیدایەت قبووڵ نەکات، خوا گومڕای دەکات، وەك چۆن کەسێك ژەهر بخواتەوە، لە ئەنجامی ژەهر خواردنەکەدا دەمرێ، ئنجا تۆ بۆت هەیە بڵێی: ئاوا ژەهر خەڵکی دەمرێنێ! کە ژەهرەکە نەیمراندوەو، مرۆڤەکە ژەهرەکەی خواردۆتەوەو، دەرهاویشتەکەی ئەوە بووە کە پێی مردوە، بەهەمان شێوەش کە بابای بێبڕوا هیدایەتی خوای بۆ دێ و، ڕەفزی دەکات، سەرەنجام گومڕا دەبێ، وەك خوا لە سوورەتی (**فُصِّلَت**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾، گەلی (**ثمود**)مان ڕێنمایی کردبوو، لێرەدا ﴿ فَهَدَيْنَٰهُمْ ﴾، واتە: ڕێنماییمان کردبوون، ڕێی ڕاستمان پێشان دابوون، ﴿ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾، کەچی کوێرییان بەسەر بەرچاوڕوونییدا هەڵبژارد.

﴿ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾، ئایا هیدایەت دەدات، لێرەدا یانی چی؟ یانی: ڕاستە ڕێ دەکات، نەك بە مانای ڕێنمایی دەکات و ڕێیان پێ نیشان دەدا، چونکە خوا ڕێی پێشانی کافران و مسوڵمانان داوە، ڕێی پێشانی ئەوانە داوە کە ڕاستە ڕێ بوون و، ئەوانەش کە گومڕابوون، ڕێپێشاندانەکە بۆ هەموانە، بەڵام لێرەدا: ﴿ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾، واتە: دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ و، بە ئامانج دەگەیەنێ و، ڕاستە ڕێ دەکات، خوا کێ ڕاستە ڕێ دەکات؟ کەسێك کە هیدایەتی خوا قبووڵ بکات، پەیام و

بەرنامەی خوا قبووڵ بکات، خوا لە پاداشتی ئەوەدا ڕاستە ڕێی دەکات، کەسێك کە پێی دەگوترێ: ئەوە ڕێی ڕاستەو، ڕێیە ڕاستەکەی گرت، بەرهەمی دەست دەکەوێ و پێی دەگاتە ئامانج، بەڵام کەسێك پێی بگوترێ: ئەوە ڕێی ڕاستە، کەچی بچێ ڕێی لار بگرێ، تووشی زیان دەبێ، لەبەر ئەوەی ڕێیە ڕاستەکەی پێشان دراوەو، وەری نەگرتوەو پەیڕەویی لێ نەکردوە.

کەواتە: وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، پاڵدانی هەر کام لە: گومڕایی و ڕاستە ڕێ کردن، بۆ لای خوا ﷻ، مەبەست پێی ئەوەیە، لە ڕێ لادانی مرۆڤەکان و ڕاستە ڕێ بوونیان، بە ویستی گشتیی خوای پەروەدگارە، بە پێی سیستم (**نظام**)ێك کە خوا لە ژیانی بەشەردا داینـاوە، کە بریتیە لەوەی هەر کەسێك هیدایەتی خوا وەربگرێ، ڕاستە ڕێ دەبێ و، هەر کەسێ هیدایەتی خوا ڕەفز بکات، گومڕا دەبێ.

٩)- ﴿وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾، سەربازەکانی پەروەردگاریشت تەنیا خۆی دەیانزانێ، لێرەدا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین کە دەفەرموێ: {**أَطَّتِ السَّمَاءُ وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ، مَا فِيهَا مَوْضِعُ أَرْبَعِ أَصَابِعَ، إِلَّا عَلَيْهِ مَلَكٌ سَاجِدٌ**} (**أخرجه أحمد: ٢١٥١٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره، والترمذي ٢:٢٣١، وحسَّنه الألباني**)، واتە: ئاسمان جیڕەو، نەقەی لێهات و شایستەشیەتی نەقەو جیڕەی لێبێ، چونکە شوێن چوار پەنجەی لێ نیە، مەگەر فریشتەیەك کڕنووشی تێدا بردوە، یانی: ئاسمان پڕە لە فریشتەکانی خوا، وەك فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگەیەنێ.

١٠)- ﴿وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡبَشَرِ﴾، ئەمە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ مرۆڤ.

بۆ (**هي**) ڕوونکەرەوانی قورئانشەش واتایان بۆ لێکداوەتەوە:

أ- بەڵام وا پێدەچێ لە هەموویان نیزیکتر ئەوە بێ کە (**هِيَ**)، ڕاناوێك بێ بگەڕێتەوە بۆ (**سَقَر**)، (**أي: وَمَا سَقَر وَصِفَتُهَا إلاَّ تَذْكِرَة للنَّاس**)، یانی: (**سَقَر**) و وەسفی (**سَقَر**) کە خوا باسی کرد، تەنیا بیرخەرەوەو پەندو ئامۆژگارییە بۆ خەڵك.

**ب-** هەندێکیش گوتوویانە: **(هِيَ)** دەچێتەوە بۆ **(عِدَّتهُم)** واتە: ژمارەی فریشتەکانی دۆزەخەوان کە نۆزدەیە، تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ مرۆڤ.

**ج-** هەندێکیش گوتوویانە: **(هِيَ)** دەچێتەوە بۆ سەربازەکانی خوا، واتە: سەربازەکانی خوا کە بەس خۆی ژمارەیان دەزانێ، تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ مرۆڤ، خوا باسی دەکات.

**د-** هەندێکیش گوتوویانە: **(هِيَ)** دەچێتەوە بۆ ئاگری دنیا، هەندێك لە زانایان وایانگوتوە، واتە: ئاگری دنیا تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ مرۆڤ، تاکو بزانن کە ئاگری دۆزەخ لەوەش بەهێزترو بەتینترەو تەحەممولی ناکەن، کەواتە: با بەهۆی ئیمان و تەقواوە خۆیانی لێ بپارێزن.

**هـ-** هەندێکیش گوتوویانە: **(هِيَ)** دەگەڕێتەوە بۆ کۆی قسەی ڕابردوو، بە تەئویلی بەسەرهات **(قصة)** یاخود سیفەت، واتە: ئەوەی ڕابرد، ئەو بەسەرهاتە، یان کۆی ئەو قسەیە بیرخەرەوەیە بۆ مرۆڤ.

**و-** هەندێکیش گوتوویانە: **(وَمَا هِيَ إلاّ ذكرى للبشر)** واتە: ئەو ئایەتە قوڕئانییانە تەنیا بیرخەرەوەن بۆ خەڵك.

بەڵام ئەوەی زیاتر گونجاوە لەگەڵ ڕەوت **(سياق)**ەکەدا، ئەوەیە کە: ئەوەی باسکرا لە بارەی **(سَقَر)**ەوە - کە یەکێکە لە ناوەکانی دۆزەخ - هەروەها سیفەتەکەی تەنیا بیرخەرەوەو ئامۆژگارییە بۆ مرۆڤەکان، تاکو خۆیانی لێ بپارێزن.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**بەرپەرچدانەوەی خوا بۆیان و، سوێند خواردنی بە مانگ و شەوگاری ڕۆیشتوو و سپێدەی ڕوون، کە ئەوە گەورەترین شتەو ترسێنەری بەشەرە، بۆ هەر کەسێکیان حەز بکات پێشبکەوێ، یان دوابکەوێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا وَالْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿كَلَّا وَالْقَمَرِ﴾، نەخێر، سوێند بە مانگ، زۆرجار گوتوومانە: (**كَلَّا: حَرْفُ رَدْعٍ وَإِبْطَالٍ لِكَلَامٍ سَابِقٍ أو لِكَلَامٍ لَاحِقٍ**)، (كَلَّا): پیتێکە بەکاردێ بۆ بەرپەرچدانەوەو هەڵوەشاندنەوەی قسەیەکی پێشتر، یان قسەیەك كە دێ، لێرەدا (كَلَّا) واتە: ئەوەی ئێوە نکوولّیی لێ دەکەن، لە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ، یاخود ڕاستیەتیی قورئان، یاخود هاتنی ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت، یاخود سزادرانی ئێوە بە ئاگری دۆزەخ (سَقَر) - کە ئەوانەش و جگە لە ئەوانەش دەگرێتەوە - وانیە وەك ئێوە دەڵێن، یاخود (كَلَّا) بە مانای وازبێنن لەوەی تاکو ئێستا کردووتانە، (**وَالقَمَر**) سوێند بە مانگ.

٢)- ﴿وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ﴾، سوێندیش بە شەوگار کاتێك دەڕواو پشت دەکاتەوە، خوێندراویشتەوە: (**واللَّيْلِ إذا دَبَر**)، هەردووکیان بە مانای پشتی هەڵکردو کۆتایی هات.

٣)- ﴿وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ﴾، سوێندیش بە بەرەبەیان کاتێك ڕووناك دەکاتەوە، یان ڕووناك دەبێتەوە.

٤)- ﴿إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ﴾، بە دڵنیایی ئەوە هەرە گەورەترینە، خوێندراویشەتەوە: (**لَاحْدَى الكُبَر**)، هەردوو خوێندنەوەکە هاتوون، (**مَعْنَى إِحْدَى أَنَّهَا الْمُتَوَحِّدَةُ الْمُتَمَيِّزَةُ مِنْ بَيْنِ الْكُبَرِ فِي الْعِظَمِ، لَا نَظِيرَ لَهَا، كَمَا يُقَالُ: هُوَ أَحَدُ الرِّجَالِ، لَا يُرَادُ: أَنَّهُ وَاحِدٌ مِنْهُمْ، بَلْ يُرَادُ: أَنَّهُ مُتَوَحِّدٌ فِيهِمْ بَارِزٌ ظَاهِرٌ**).

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهَا لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ﴾، کە دوایی باسی دەکەین ڕاناوەکەی بۆ چی دەچێتەوە؟ واتە: ئەو شتە لەنێو شتە گەورەکاندا، تاکە (**إِنَّهَا الْمُتَوَحِّدَةُ الْمُتَمَيِّزَةُ مِنْ بَيْنِ الْكُبَرِ**)، (**كُبَر**) کۆی (**كُبرى**)یە، (**كُبْرى**) واتە: گەورەترین، بەڵام بە باری مێینەدا، ﴿ لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ﴾، واتە: تاك بووەوەیەك و جیابووەوەیەکە لە نێو گەورەکاندا لە مەزنییدا و وێنەی نیە، هەروەك دەگوترێ: (**هُوَ أَحَدُ الرِّجَالِ**) ئەو تاکی پیاوانە، مەبەست ئەوە نیە یەکێکە لە پیاوان، بەڵکو مەبەست ئەوەیە لە نێویاندا تاکەو ئاشکرایەو وێنەی نیە، پێشینانی خۆشمان دەڵێن: فڵانکەس تاکە یان تاکی نیە، واتە: کەسێکی دیکە هاوکووف و وێنەی نیە.

٥)- ﴿ نَذِيرٗا لِّلۡبَشَرِ ﴾، ترسێنەرو ورياکەرەوەیە بۆ مرۆڤان.

٦)- ﴿ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ﴾، بۆ هەر کامێك لە ئێوە کە بیەوێ بەرەو پێشەوە بچێ، یان بەرەو دواوە بگەڕێتەوە.

لێرەدا خوا ﷻ سوێندی خواردوە بە سێ شتان:

١- سوێندی خواردوە بە مانگ.

٢- سوێندی خواردوە بە شەوگار، کاتێك پشت هەڵدەکات و دەڕوا.

٣- سوێندیشی خواردوە بە بەرەبەیان، کاتێك ڕووناك دەبێتەوە، (**إِسْفَار: إِضَاءَة**) ڕوونکردنەوە، (**إِذَا أَسْفَرَ**) کاتێك ڕوون دەبێتەوەو شەبەق دەدا.

سوێندی بەو سێ شتانە خواردوە، بێگومان خوا، یەك سوێندیش بخوات لەسەر شتێك، هەر گەورەیە، چ جای سێ سوێندان بخوات، ئنجا لێرەدا سێ سوێندی خواردوون، دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهَا لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ﴾، ئا ئەوەی باسکرا، لە نێو شتە گەورەکاندا گەورەترینە، یان تاکەو وێنەی نیەو، ترسێنەرە بۆ مرۆڤەکان، بۆ هەر کامێك لە ئێوە بیەوێ بەرەو پێشەوە بێ، یاخود بەرەو دواوە بگەڕێتەوە.

ئنجا ئایا ئەو (إحْدى الكُبَر)ە، چییەو (إنَّها) ڕاناوەكەی بۆچی دەچێتەوە؟ زانایان زۆر قسەیان لێكردوە:

أ- بەڵام وا پێدەچێ ئەویش هەر بچێتەوە بۆ (سَقَر) ئەو ئاگری دۆزەخەی ناوی (سَقَر) ی لێندراوە (سَقَرَتْه الشَّمسُ: أحرَقَته وسوَّدته) یانی: خۆرەكە سووتاندی و ڕەشی كرد، یانی: ئەو ئاگری دۆزەخە، لە نێو شتە گەورەكاندا تاكەو لە هەموویان گەورەترە.

ب- ئەگەری دووەم ئەوەیە كە ڕاناوی (إنها) بچێتەوە بۆ ژمارەی نۆزدە، كە خوا ﷻ بۆ دۆزەخەوانەكانی داناوە، خوا ﷻ نۆزدە فریشتەی بەسەر دۆزەخەوە داناون.

ج- یاخود دەچێتەوە بۆ سەربازەكانی خوا.

د- یاخود دەچێتەوە بۆ ئاگری دنیا.

هـ- یاخود دەچێتەوە بۆ ئایەتەكان.

و- یان دەچێتەوە بۆ بەڵگەو بوڕهانەكان، كە خوا ﷻ دەیانهێنێتەوە.

بەڵام ئەوەی لە هەموویان زیاتر پێدەچێ، ئەوەیە كە ڕاناوەكە بچێتەوە بۆ (سَقَر)، واتە: ئەو ئاگری دۆزەخ و (سَقَر)ە، كە خوا بەشەری پێ دەترسێنێ و دەیكاتە پەندێك، گەورەترینی نێو شتە گەورەكانە، كە تاكی نیەو وێنەی نیە، واتە: مانایەكەی ئاوای لێدێتەوە: (إنَّها لَعُظْمى العَظائِمِ في حالِ إنْذارِها لِلْبَشَرِ)، ئەو شتە مەزنترینی مەزنەكانە، گەورەترینی گەورەكانە، بێڕەزاترینی شتە گەورەكانە، لە حاڵێكیشدا كە ترسێنەرو ورياكەرەوەیە بۆ مرۆڤان.

كە دەفەرموێ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ﴾، بۆ هەر كامێك لە ئێوە بیەوێ بەرەو پێشەوە بچێ، یان بەرەو دواوە بگەڕێتەوە، زانایان چەند واتایەكیان بۆ لێكداونەوە:

١- بۆ هەر كەسێك لە ئێوە بیەوێ بەرەو ئاگری دۆزەخ بچێ، بەهۆی ئەو كردەوە خراپانەوەی ئەنجامیان دەدا، ئەو كردەوە خراپانەی بەرەو دۆزەخی دەبەن، یاخود لە

دۆزەخ دوور بکەوێتەوە بەهۆی خۆ دوورگرتنیەوە لەو کردەوانەی، لە دۆزەخی دوور دەخەنەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {**حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ**} (**أخرجه مسلم: ٢٨٢٢، وابن حبان: ٧١٦**)، واتە: بەهەشت بە ناڕەحەتییان، دەورە دراوە و ئاگر(ی دۆزەخ)یش بە ئارەزووان ئابڵۆقەدراوە کەسێك بیەوێ بەرەو بەهەشتێ بچێ، دەبێ ناڕەحەتییان تەحەممول بکات، بەڵام کەسێك بە دوای ئارەزووان بکەوێ، دیارە بەرەو دۆزەخ دەچێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ**} (**أخرجه البخاري: ١٣٥١، ومسلم: ١٠١٦**)، واتە: خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، ئەگەر بە لەتکە خورمایەکیش بێ، کەواتە: بەخشین کەم و زۆری دەبێتە هۆی دوور خستنەوەی مرۆڤ لە ئاگری دۆزەخ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللهِ بَعَّدَ اللهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا**}[1] واتە: کەسێك ڕۆژێك لەبەر خوا بە ڕۆژوو بێ، خوا حەفتا ساڵ دەم و چاوی لە ئاگر دوور دەخاتەوە، کەواتە: بە ڕۆژوو بوون، هەروەها هەموو تاعەت و پەرستشەکان، مایەی لە خوا نزیکبوونەوەی مرۆڤن، کەسێکیش لە خوا نزیك بێ بێگومان لە بەهەشتی خوا نزیك دەبێ و، شایستەی چوونە بەهەشت دەبێ، لە دۆزەخ و تووڕەیی خوا دوور دەبێ.

٢- بۆ هەر کەسێك لە ئێوە کە بیەوێ لە فەرمانبەرییدا پێش بکەوێتەوە، یاخود بیەوێ دوا بکەوێ، (**جامع البيان: ٣٥٥٧٣، عن ابن عباس** رضي الله عنهما).

٣- (**الطبري**) ڕایەکی دیکەی سێیەمیشی هێناوە: (**التَقَدُّمُ في الطَّاعَة وَالتَّأخر عَنِ المَعْصِيَة**)، واتە: چوونە پێش لە فەرمانبەرییداو، هاتنەدوا لە گوناهو سەرپێچییدا، واتە: بۆ هەر کەسێك لە ئێوە کە بیەوێ لە تاعەت و فەرمانبەرییدا بەرەو پێشەوە بچێ و، خۆی لە گوناهان دوابخات و دووربگرێ.

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٦٨٥، ومسلم: ١١٥٣، والترمذي: ١٦٢٣، والنسائي: ٢٢٤٥.

٤- دەشگونجێ بڵێین: خوا ﷻ لێرەدا بە گشتیی دەفەرموێ: بۆ هەر کەسێك لە ئێوە بیەوێ بەرەو پێشەوە بچێ، ئەوە ڕێی لەبەردەمدا ئاچووغەو، ئەو ئاگری دۆزەخە پەندو ئامۆژگارییەو بیرخەرەوەو ترسێنەرە بۆی و، هاندەرە بۆ بەرەو چاکە چوون و بەرەو تاعەت چوونی، هەروەها هەر کەسێکیش بیەوێ بەرەو دواوە بچێ، بەرەو دواوە بگەڕێتەوەو لە خوا دووربکەوێتەوە، ئەویش خوای پەروەردگار ئازادی کردوە، بەڵێ ترساندووشیەتی بە دۆزەخ، بەڵام دیسان ناچاری نەکردوە کە بەبێ ویستی ئازادانەی خۆی، لە خوا پەرستیی و چاکەکاریی دوابکەوێ.

ئەگەرنا ئەو کاتە ئازایەتیی نەدەبوو، ئەگەر خوا ﷻ مرۆڤی بەبێ ویستی ئازادانەی خۆی و بە ناچاریی بەرەو بەهەشت هێناباو، لە دۆزەخێ دوورخستبایەوە، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: خەتابارو گوناهبار نەدەبوو ئەگەر خوا ڕێی پێشکەوتن بەرەو بەهەشتی لێگرتبایەو، ناچاری کردبایە لە کردەوەی باش و بەرەو بەهەشت هاتن دواکەوتبایە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە نـۆزدە ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (المُدَّثِر) پێـك دێ، ئایەتەکانـی: (٣٨ - ٥٦)، کـە چـوار بابەتـی سـەرەکییان گرتوونـە خۆیـان:

١- بارمتەی کردەوەی خۆبوونی هەر مرۆڤێك لە دۆزەخ داو، دەربازبوونی هاوەڵانی دەستە ڕاست.

٢- خستنەڕووی چوار هۆکاری سەرەکیی بۆ چوونە دۆزەخ، لە لایەن تاوانبارانەوە:

أ- نوێژنەکردن.

ب- خواردن نەدان بە نەدار.

ج- ڕژانە نێو قسەی پووچ و بۆش.

د- بێبڕوایی بە ڕۆژی دوایی.

٣- ڕاکردنی بێبڕوایان لە قورئان، وەك سڵەمینەوەی کەرەکێوییان لە شێرو ڕاوچیی و، داواکردنی نامەی تایبەت بۆ هاتن لە خواوە، تاکو بڕوا بێنن!

٤- پێناسەکردنی قورئان بە بیرخەرەوەو ئامۆژگاریی.

﴿كُلُّ نَفْسِۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا

﴿يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەموو کەس (لە دۆزەخ دا) بارمتەی ئەوەیە کە کردوویەتی ﴿٣٨﴾ جگە لە هاوەڵانی ڕاستە ﴿٣٩﴾ لە باخانێك(ی ناوازە)دان لە نێو خۆیاندا دەپرسن ﴿٤٠﴾ لە بارەی تاوانبارانەوە (پێیان دەڵێن:) ﴿٤١﴾ چی ئێوەی خستە سەقەرەوە؟ ﴿٤٢﴾ (تاوانبارەکان) گوتیان: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین ﴿٤٣﴾ خواردنیشمان نەدەدا بە نەدار ﴿٤٤﴾ لەگەڵ تێڕژاوان(یش لە قسەی خراپ و پووچ)دا تێدەڕژاین (و بەشداریان دەبووین) ﴿٤٥﴾ ڕۆژی سزاو پاداشتیشمان بە درۆ دادەنا ﴿٤٦﴾ هەتا مردن(ی جێی دڵنیایی)مان بۆ هات ﴿٤٧﴾ ئنجا تکای تکاکاران سوودیان پێ ناگەیەنێ ﴿٤٨﴾ ئایا (بێبڕوایان) چییانە ڕوو وەرگێڕن لە (قوڕئانی) بیرخەرەوە؟ ﴿٤٩﴾ وەك کەرەکێوییانی سڵەمیوەوەن ﴿٥٠﴾ کە لە شێر ڕایکردوە ﴿٥١﴾ بەڵکو هەر کەسێك لەوان، دەیەوێ لاپەڕە کراوەکانی پێ بدرێن ﴿٥٢﴾ نەخێر (ڕاست ناکەن) بەڵکو لە مەنزڵگای کۆتایی ناترسن ﴿٥٣﴾ نەخێر (ڕاست ناکەن) بە دڵنیایی ئەو (قوڕئان)ە بیرخەرەوەیە ﴿٥٤﴾ ئنجا هەر کەس ویستی بیری دەکەوێتەوە ﴿٥٥﴾ مەگەر خواش بیەوێ ئەگەرنا بیریان ناکەوێتەوە، بەس ئەو شایستەی پارێزلێکرانەو شایستەی لێبوردنە ﴿٥٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(رَهِينَةٌ): (الرَّهْنُ: مَا يُوضَعُ وَثِيْقَةً للدَّيْنِ، وَالرِّهَانُ مِثْلُهُ لَكِنْ يَخْتَصُّ بِمَا يُوضَعُ فِي الخِطَارِ، وَجَمْعُ الرَّهْنِ: رُهُنٌ، ورُهُون، وَرِهَان)، (رَهِيْنَة) واتە: بارمتە کە لە وشەی (رَهْن)ەوە هاتوە، (رَهْن) بریتیە لە شتێك کە لە بەرانبەر قەرزێکدا دادەنرێ، خانوویە، زەوییە، هەر شتێکە، (رِهَان)یش هەر هەمان واتای هەیە، بەڵام (رِهَان): بۆ شتێك دادەنرێ کە گرەوی لەسەر کرابێ، یاخود پێشبڕکێی لەسەر کرابێ، وشەی (رَهن) بە (رُهُن و رُهُون و رِهَان) کۆ دەکرێتەوە.

(يَتَسَآءَلُونَ): (السُّؤَالُ: إسْتِدْعَاءُ مَعْرِفَةٍ، أو مَا يُؤَدِّي إلى المَعْرِفَة)، (سؤال): بریتیە لە خواستنی زانست، یاخود شتێك کە ببێتە هۆی پەیدابوونی زانست، (السُّؤَالُ: طَلَبُ المَالِ)، هەروەها (سؤال) بە داواکردنی ماڵ و سامانیش دەگوترێ، بۆیە کوردەواریی خۆمان هەر (سَائِل)ی عەرەبییە، بە: سواڵکەر، سوئالکەر، داواکەر، داوای هاوکاریی لە خەڵککەر، مانایان کردوە.

(نَخُوضُ ): (الخَوْضُ: الشُّرُوعُ فِي المَاءِ وَالمُرُورُ فِيْهِ، وَيُسْتَعَارُ فِي الأُمُورِ وَأَكْثَرُ مَا وَرَد فِي القُرْآنِ، فِيْمَا يُذَمُّ الشُّروعُ فِيْهِ)، (خَوْض): لە بنچینەدا بریتیە لە دەستپێکردنی چوونە نێو ئاوو، بە نێو ئاوو باتلاغ دا ڕۆیشتن، دوایی خوازراوەتەوە بۆ چوونە نێو کاروبار، بەڵام بە زۆریی لە قورئاندا وشەی (خَوْض) بەکارهێنراوە، بۆ ئەو شتانەی خراپە مرۆڤ بچێتە نێویان.

(ٱلْيَقِينُ): (اليَقِيْنُ: مِنْ صِفَةِ العِلْمِ فَوْقَ المَعْرِفَةِ وَالدِّرَايَة، وَاليَقِيْنُ: سُكُونُ الفَهْمِ مَعَ ثَبَاتِ الحُكْمِ، وَاسْتُعِيرَ هُنَا للمَوْت)، (يَقِيْن): لە سیفەتی زانیارییە، لە سەرووی زانست و زانینەوەیە، یەقین بریتیە لە چەسپانی تێگەیشتن لەگەڵ چەسپاویی بڕیاردا کە دەدرێ، بەڵام لێرە خوازراوەتەوە بۆ مردن، لەبەر ئەوەی مردن

شتێكی مسۆگەرەو جێی دڵنیاییەو كەس تێیدا دوو دڵ نیە، كە هەر دەمرێ، بەس كاتەكەی نازانێ.

(ٱلشَّٰفِعِينَ): (الشَّفْعُ: ضَمُّ الشَّيءِ إلى مِثْلِهِ، وَالشَّفَاعَةُ: الإنْضِمَامُ إلى آخَرَ نَاصِراً لَهُ وَسَائِلاً عَنْهُ)، وشەی (شَفْع): بریتیە لەوەی شتێك لەگەڵ هاووێنەی خۆیدا جووت بكرێ، (شَفْع) واتە: دووان، ﴿وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ۝٣﴾ الفجر، واتە: سوێند بە جووت و بە تاك، (شَفَاعَة): بریتیە لەوەی كەسێك بچێتە پاڵ كەسێك سەری بخات و داواو تكای بۆ بكات.

(حُمُرٌ): (جَمعُ حِمَار، وَيُجْمِعُ بـ(حَمِيْر وَأحْمِرة)، وَالمَقْصُودُ هُنَا الحُمرُ الوَحْشِيَّة)، (حُمُر) كۆی (حِمَار)ە واتە: كەر، بە كەری كێویی و بە كەری ماڵیی دەگوترێ، (الحُمُرُ الوَحْشِيَّة وَالحُمُرُ الأهْلِيّة)، كەرە كێوییەكان و كەرە ماڵییەكان، ئنجا وەك چۆن (حِمَار) بە (حُمُر) كۆ دەكرێتەوە، بە (حَمِيْر)یش كۆ دەكرێتەوە، ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ۝١٩﴾ لقمان، هەروەها بە (أحْمِرَة)ش كۆ دەكرێتەوە، بەڵام لە قورئان دا (أحمِرة) نەهاتوەو تەنیا (حُمُرُ وَحَمِيْر) هاتوون، لێرەدا مەبەست لە (حُمُر) كەرە كێوییەكانن، ئەوانەی بەڵەكن و خەت خەتن.

شایانی باسە: خواردنی گۆشتی كەرە كێویی ڕەوایە، كە هەر گژوگیا دەخوات لە دەشت و كێو، بەڵام گۆشتی كەری ماڵیی كە جگە لە گژوگیا، شتی دیكەش دەخوات و سرووشتی جیایە، خواردنی گۆشتی كەری ماڵیی خراپە، بۆیە شەریعەت قەدەغەی كردوە، لەبەر ئەوەی زیانی هەیە، بێگومان شەریعەت هیچ شتێك قەدەغە ناكات، ئەگەر زیانی نەبێ و، هیچ شتێك ڕەوا ناكات كە سوودی نەبێ و باش نەبێ.

(مُّسْتَنفِرَةٌ): (جَمْعُ نَافِر: نَافَرَ وَاسْتَنْفَرَ ونَفَرَ مِثْل عَجِبَ وَاسْتَعْجَبَ، وَبِالْفَتْحِ مُسْتَنفَرَة أي: مُنَفَّرة مَذْعُوْرَة)، (نَافَرَ وَاسْتَنْفَرَ ونَفَرَ) واتە: سڵەمیەوە، وەك (عَجِبَ وَاسْتَعْجَبَ) سەری سوڕما، هەردووكیان بە مانای (سەری سوڕما)ن، بەڵام

(**مُسْتَنْفِرَة**) یانی: سڵەمیوەوەو ئەگەر فەرمووباشی: (**نَافِرَة**) یانی: سڵەمیوەوەو دوورکەوتووەوەو ڕاکردوو، هەر دەگونجا، بەڵام (**مُسْتَنْفِرَة**) واتە: زۆر بە توندیی دەسڵەمنەوەو ڕادەکەن و هەڵدێن، بۆیەش بە کۆ هێناویەتی، لەبەر ئەوەی ئەوی دیکەش کۆیە (**كأنَّهم**)، (**حُمُر**)، وەك کەرانی سڵەمیوەوەو ڕاکردوو وان، هەروەها (**مُسْتَنْفَرة**)ش خوێندراوەتەوە، واتە: سڵەمێنراوەو دەرکراو ترسێندراوو، ناچارکراو بە ڕاکردن.

(قَسْوَرَةٍ): بە مانای شێر (**الأَسَد**) دێ، هەروەها بە مانای تیرهاوێژانیش دێ، ئەو کاتەش: (**قَسْوَرة: جَمْعُ قَسْوُر: الرَّامِي**)، تیرهاوێژ، (**قَسْوَرة**) کۆیەکەیانە، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵام لێرەدا (**قسورة**) یان زیاتر بە شێر لێکداوەتەوە.

(صُحُفًا مُّنَشَّرَةً): (**صُحُف: جَمْعُ صَحِيْفَة**)، واتە: لاپەڕە، پەڕ، (**مُنَشَّرَة**) واتە: (**مَفْتُوحَة أو مَقْرُوءَة**) کراوە، یان خوێندراوە، هەر کامێکیان داوا دەکات کە نامەیەکی کراوەی بۆ بێ، ئنجا هی هەموویان، دەبنە نامەکان، نامەکراوەکانیش کە کۆ دەبنەوە، دەبنە (**مُنَشَّرَة**) نامە کراوەکان.

(ذَكَرَهُۥ): (**أي ذَكَرَ الله**)، ڕاناوی (ه) بۆ خوا دەچێتەوە، واتە: یادی خوا دەکاتەوە، یاخود: (**ذَكَرَ القرآن**) قورئان دێنێتەوە یادی خۆی و پەندی لێوەردەگرێ.

(أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ): (**أَهْلُ الشَّيء مُسْتَحِقُّهُ**)، ئەهلی شتێك بریتیە لە هەر کەسێك پێی شایستە بێ بەو شتە، (**وَأَصْلُهُ أَنَّهُ مُلَازم الشَّيء وخَاصَّتُهُ وَقَرَابَتُهُ**)، لە بنچینەدا ئەهل بریتیە لە شتێك کە بەردەوام لەگەڵ شتێکدا بێ و، تایبەت بێ پێیەوەو لێی نزیك بێ، کە دەفەرموێ: (أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ) واتە: (**حَقِيْقٌ بِأن يُتَّقَى، وَأَهْلُ المَغْفِرَة: حَقِيْقٌ بِأن يَغْفِرَ**)، خوا شایستەیە بەوەی پارێزی لێ بکرێ و، شایستەشە بەوەی ببووڕێ و چاوپۆشیی بکات لە بەندەکانی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لـە کۆتایـی ئـەم سـووڕەتەدا، خـوای بـەرز چـوار بابەتـی گـەورەو گرنـگ دەخاتـەڕوو، کـە یەکەمیـان ئەوەیـە:

﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾، هەمـوو کەسێك بـە هـۆی ئـەوەوەی کردوویەتـی، بارمتەیـە، حەپسـەو هێشـتراوەیە، لـە کـوێ؟ باسـی نەکـردوە بـەڵام بێگومـان لـە دۆزەخـدا هێشـتراوەیە، بـە بەڵگـەی ئـەوەی دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ﴾، ﴿فِي جَنَّٰتٍ﴾، جگـە لـە هاوەڵانـی ڕاسـتە، لـە نێـو باخـەکان دان، ئنجـا مـادام هاوەڵانـی ڕاسـتە لـە نێـو باخەکانـدان و جیاکراونـەوە، لـەو ڕەهـن کرانـە، بەهـۆی کـردەوە خراپەکانیانـەوە، کەواتـە: ئـەوان (هـاوەڵانی چەپـە) بارمتـەو ڕەهنـی کـردەوە خراپەکانـی خۆیانـن لـە دۆزەخـدا، بۆیـەش خـوا ﷻ نەیفەرمـووە: (**كُلُّ نَفَـسٍ بِمَـا كَسَـبَت مِـنَ الأَعْـمَال السَّـيِّئَة رَهِينَـةٌ فِي نَـارِ جَهَنَّـم**)، هـەر کەسـە بـە هـۆی کـردەوە خراپـەکانی کـە وەدەسـتی هێنـاون، لـە ئاگـری دۆزەخ دا بارمتەیـە، چونکـە دواییەکـەی ئـەوە دەگەیەنـێ، بارمتەیـە (**رهينـة**)، واتـە: بارمتەیـە لـە دۆزەخـدا.

ئـەوەش کـە کردوویەتـی، (**كَسَـبَت**) هـەم بـۆ چاکیـش بـەکاردێ، هـەم بـۆ خراپیش، بـەڵام بەپێـی سـیاق دەزانیـن کـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی وەدەسـتهێنانی کـردەوەی خراپـە.

﴿إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ﴾، جگـە لـە هاوەڵانـی ڕاسـتە، ئەوانـەی بـە دەسـتی ڕاسـتیان لیسـتی کردەوەکانیـان دەدرێتـەوە، یاخـود ئەوانـەی دەخرێنـە لای ڕاسـت.

﴿فِي جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾، ئـەوان لـە چەنـد باخێکـی نـاوازەدان، (**يَتَسـائَلونَ**) وشـەی (**تَسـائُل**) لەسـەر کێشـی (**تَفاعُـل**) یـانی: لـە یەکـدی دەپرسـن، پێشـێ لـە یەکـدی دەپرسـن، ئنجـا ڕووی پرسـیار لـە تاوانبـاران دەکـەن، یاخـود: لـە

بارەی تاوانبارانەوە لە یەکدی دەپرسن، لەبەینی خۆیاندا لەیەکدی دەپرسن، لە بارەی تاوانبارانەوە، ئنجا ڕوو لە تاوانباران دەکەن و دەڵێن:

﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ﴾، چ شتێك ئێوەی خستە نێو ئاگری دۆزەخەوە؟ هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (يَتَسَائَلون)، هەرچەندە لەسەر كێشی (تَفاعُل)ەو بۆ هاوبەشیی و بەشدارییە، بەڵام هەر مەبەست پێی پرسیارکردنە، واتە: (يَسْئَلُوْن عَن الْمُجْرِمِيْن)، لە تاوانبارەکان دەپرسن: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ﴾، چ شتێك ئێوەی خستە نێو سەقەرەوە؟.

ئنجا دێتە سەر بابەتی دووەم:

﴿قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، تاوانباران چوار کردەوەی خراپی سەرەکیی خۆیان باس دەکەن و دەڵێن: بەهۆی ئەو چوار کردەوەوە خراینە دۆزەخەوە:

﴿قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾، گوتیان: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین، واتە: هۆکاری یەکەمی چوونە نێو دۆزەخمان ئەوەیە، ئێمە بەندایەتییمان بۆ خوا ئەنجام نەدەدا، کە دەفەرموێ: ﴿لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾، بە دڵنیاییی دینداریی و مسوڵمانەتیی لە نوێژەوە دەست پێناکات، بەڵکو لە بووناسییەوەو لە تێڕوانینی ڕاست و دروست و، دوایی لە ئیمان و عەقیدەوە، دەست پێدەکات ئیمان بە خوا ﷻ و، ئیمان بە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ و، ئیمان بە پێغەمبەران و، بە فریشتەکانی خواو، بە کتێبەکانی و، بە ڕۆژی دوایی، ئنجا دوایی نۆرە دێتە سەر پەرستشەکان، کە لە هەموویان گرنگتر نوێژە، بەڵام بۆچی ئەوان دەڵێن: ﴿لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾، ئێمە لە نوێژکەران نەبووین؟ چونکە نوێژکەرەکان تێڕوانین و بووناسییەکی ڕاستیان هەیە، ئیمان و عەقیدەیان هەیە، پەرستشەکانیان هەن و بەندایەتییان بۆ خوا هەیە، هەموو ئەو شتانەیان هەن.

﴿ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ﴾، هەروەها ئێمە لەوانە نەبووین خواردن بدەین بە نەدار.

﴿ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ﴾، دوای ئـەوەی وازلێهێنانـی دوو کـردەوەی هەرەچـاك دەخەنـەڕوو، کـە بریتیـن لـە: نوێژکـردن و خـواردن دان بـە نـەدار، واتـە: فەوتاندنـی مافی خـواو مافی خەڵـك، واتـە: نەبوونـی خواپەرسـتیی و خەڵـك دۆسـتیی، ئنجـا دوو خراپـەی دیکـەش بـاس دەکـەن، کـە ئەگـەر دووەکانی پێشـێ چواندنـی دوو ئەرکـی گـەورەو گرنـگ بـوون، ئـەو دووانـەی دیکـەش، ئەنجامدانـی دوو خراپـەی زۆر پیـس و بێـڕەزان:

یەکەمیـان: ﴿ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ﴾، ئێمـە عادەتمـان وابـوو لەگـەڵ تێڕژاوانـدا تێدەڕژایـن، واتـە: هـەر کـۆڕو مەجلیسـێك قسـەی خراپـی تێدا کرابایـە، وەك گاڵتەپێکـردن و تانـەدان لـە قورئـان و لـە پێغەمبـەرو لـە ئیسـلام و هـەر قسـەیەکی دیکـەی خـراپ کرابایـە، ئێمـە لەگـەڵ تێڕژاوانـدا تێدەڕژایـن، پێشـتریش گوتمـان: (**خـوض**) لـە ئەسـڵدا بریتیـە لـە چوونـە نێـو ئـاو، یـان چوونـە نێو باتڵاغ و شـتێکی شـل، بـەڵام دوایـی خوازراوەتـەوە بـۆ چوونـە نێـو قسـەی خـراپ، واتـە: لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە تێدەڕژانـە نێـو قسـەی خـراپ، ئێمـەش تێدەڕژایـن و سـەرمان بـۆ دەلەقانـدن.

دووەمیـان لـە کـردەوەی خـراپ کـە ئەنجامـمان دەدا: ﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾، ئێمـە بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت بێبـڕوا بوویـن و بـە درۆمـان دادەنـا، کەواتـە: ئـەوە چـوار گوناهەکـە:

١- نوێژ نەکردن.

٢- خواردن نەدان بە نەدار.

٣- قسەی خراپ کردن لەگەڵ قسەی خراپ کەرانداو، بێبڕوایی لەگەڵ بێبڕوایاینداو دژایەتیی کردنی ئیسلام لەگەڵ دژایەتیی کەراندا.

٤- بڕواپێ نەبوون و بە درۆ دانانی سزاو پاداشت.

﴿ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴾، (**يقين**) یانی: دڵنیایی، بەڵام لێرەدا بە مانای مردن (موت)ە، چونكە مردن هەمووكەسێك لێی دڵنیایە، بۆیە ئەو وشەیەی بۆ بەكارهاتوە، وەك لە سوورەتی (**الحِجر**)یشدا دەفەرموێ: ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ٩٩ ﴾، واتە: پەروەردگاری خۆت بپەرستە تاكو یەقینت بۆ دێ، ئنجا ئەگەر یەقین بە مانای مردن بێت، مردن بۆ مرۆڤ دێ، بەڵام دەشگونجێ بە مانای دڵنیایی بێ، واتە تاكو دڵنیاییت بۆ دێ، بەو واتایەی دڵنیا دەبی كە بەرەو مەرگ دەچی، لێرەش ﴿ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴾، تاكو ئێمە دڵنیا بووین و دڵنیاییمان بۆ هات كە تازە ژیانی دنیا بەجێ دێڵین، هەتا ئەو كاتە، ئێمە هەر لەسەر ئەو چوار كردەوە خراپە بەردەوام بووین.

﴿ فَمَا تَنفَعُهُمۡ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴾، ئەم (**ف**)یە دەگونجێ (**فاء التفريع**) بێ، واتە: بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد، تكای تكاكاران سوودیان پێناگەیەنێ، یاخود لێرەدا (**ما**) بۆ لابردن (**نفي**) نیە، بەڵكو (**ما الإستفهامية**)یە: ﴿ فَمَا تَنفَعُهُمۡ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴾، ئایا تكای تكاكاران چ سوودێكیان پێ دەگەیەنێ؟ واتە: هیچ سوودێكیان پێ ناگەیەنێ، بۆیەش تكاكاران تكایان بۆ ناكەن، چونكە دەزانن تكاكردن سوودیان پێناگەیەنێ و بێ سوودە، ئەوانەش كە تكا دەكەن: فریشتەكانن و پێغەمبەرانن و شەهیدانن و زانایانن، قسەی بێ جێ ناكەن، یانی: قسەیەك ناكەن جێ نەگرێ و تكایەك ناكەن وەرنەگیرێ.

ئنجا بابەتی سێیەم خراوەتە ڕوو.

كە بریتیە لە هەڵوێستی خراپ و نەرێنییانەی بێبڕوایەكان لە بەرانبەر قورئانداو دەفەرموێ: ﴿ فَمَا لَهُمۡ عَنِ ٱلتَّذۡكِرَةِ مُعۡرِضِينَ ﴾، ئەوە چییانە پشت هەڵكردوون، ڕوو وەچەرخێنن لە بیرخەرەوە، واتە: ڕوو وەچەرخێنن لە قورئانی بیرخەرەوە.

﴿ كَأَنَّهُمۡ حُمُرٞ مُّسۡتَنفِرَةٞ ٥٠ فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ ﴾، وەك كەرانی سڵەمیوەوەن كە لە شێر ڕادەكەن، یاخود لە ڕاوچییان ڕادەكەن، یانی: بێبڕوایان وەك كەرە كێوییانیی

سـڵەمیوەوەن کـە شـێرێك دەبینـن، ڕادەکـەن، یاخـود: ڕاوچییـان دەبینـن، لێیـان ڕادەکـەن، تاکـو ڕاویـان نەکـەن، بێبڕوایانیـش لـە قورئـان دووردەکەونـەوە، قورئانێـك کـە ڕاسـتییەکانیان دەخاتـەوە بیـرو، پەنـدو ئامۆژگارییـە بۆیـان، کەچـی ئـاوا لێـی ڕادەکـەن!.

﴿ بَلۡ يُرِيدُ كُلُّ ٱمۡرِيٍٕ مِّنۡهُمۡ أَن يُؤۡتَىٰ صُحُفٗا مُّنَشَّرَةٗ ﴾، بەڵکـو - زیـاد لـەوەش - هـەر مرۆڤێـك لـەوان، دەیـەوێ لاپـەڕە کراوەکانـی بـۆ بێـن، لاپـەڕە کراوەکانـی پـێ بدرێـن، واتـە: دەیانـەوێ نامـەی کراوەیـان بـۆ بـێ، وەك دوایـی بـاس دەکەیـن، دەیانگـوت: دەبـێ نامەیەکـمان بـۆ بـێ: لـە خـوای پـەروەردگارەوە، بـۆ فڵانکەسـی کـوڕی فڵانکـەس! موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری منـەو بـڕوای پـێ بێنـە!.

﴿ كَلَّاۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴾، خـوا دەفەرمـوێ: بـا وازبێنـن، یاخـود: ئـەو داوایـەی دەیکـەن داوایەکـی بـێ جێیـەو پووچـە، ﴿ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴾، بەڵکو هـۆی بـڕوا نەهێنانیـان بـە قورئـان، بـە پێغەمبـەر، بـە ئیسـلام، ئەوەیـە کـە ترسـی ڕۆژی دواییـان نیـە، ترسـی مەنزڵـگای کۆتاییـان نیـە.

ئنجا بابەتی چوارەم باس دەکات.

لـە سـێ ئایەتـی کۆتاییـدا و دەفەرمـوێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذۡكِرَةٞ ﴾، جارێکـی دیکـەش بـا وازبێنـن، لـەو قسـانە، یـان وازبێنـن لـە کوفـرو بێبڕوایـی، ﴿ إِنَّهُۥ تَذۡكِرَةٞ ﴾ بەدڵنیایـی ئـەو (قورئـان)ە بیرخەرەوەیـە، ئامۆژگاریـی و پەنـدە.

﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾، ئنجـا هـەر کەسـێك بیـەوێ دەکەوێتـەوە یـادی، چـی دەکەوێتـەوە یـاد؟ خـوای دەکەوێتـەوە یـاد، یاخـود: ﴿ ذَكَرَهُۥ ﴾، هـەر کەسـێك بیـەوێ قورئانـی دەکەوێتـەوە یـاد.

﴿ وَمَا يَذۡكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، ناشـکەوێتەوە یادیـان، خـوا ﷻ یـان قورئـان، مەگـەر خـوا بیـەوێ، ﴿ هُوَ أَهۡلُ ٱلتَّقۡوَىٰ وَأَهۡلُ ٱلۡمَغۡفِرَةِ ﴾، ئـەو (خـوا) شایسـتەی پارێزلێکرانـەو شایسـتەی لێبوردنیشـە.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾، ناکەوێتـەوە یادیـان و بیریـان ناکەوێتـەوە، یاخـود پەنـدی لێوەرناگـرن، مەگـەر خـوا بیـەوێ، بـۆ ئەوەیـە کـە مرۆڤـەکان بزانـن هیـچ شـتێك لـە ویسـتی ڕەهـای خـوای پـەروەردگار بـەدەر نیـەو، مرۆڤـەکان ناتوانـن هیـچ هەنگاوێـك بنێـن، لـە ژێـر چەتـری ویسـتی ڕەهـای خـوای پـەروەردگاردا نەبـێ، بـەڵام خـوا بـە ویسـتی ڕەهـای خـۆی، ویسـتێکی بەشـیی (**جزئي**) یشـی بـە مرۆڤـەکان داوە، بایـی ئەوەنـدەی چاکـەی پێبکـەن، یـان خراپـەی پێبکەن و، شایسـتەی سـزاو پاداشـت بـن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

جگە لە هاوەڵانی ڕاستە، هەموو کەس بارمتەی کردەوە خراپەکانیەتی (لە دۆزەخدا)، بەڵام ئەوان لە باخاندا لە یەکدی دەپرسن لە بارەی تاوانبارانەوە: (پێیان دەڵێن:) چی ئێوەی خستە دۆزەخەوە؟ ئەوانیش چوار هۆکاران دەخەنەڕوو: نوێژنەکردن و، هاوکاریی نەکردنی نەدار لە خواردن پێدانداو، قسەی خراپ کردن لەگەڵ قسەی خراپکەرانداو، بەدرۆ دانانی ڕۆژی سزاو پاداشت، هەتا مردنیان بۆ هاتووەو، سەرەنجام لە فریانەهاتنی تکای تکاکاران بۆیان:

خوا دەفەرمووێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾، هەموو کەسێك بەوەی کردوویەتی بارمتەیە، (**الرَّهْنُ: الوَثَاقُ وَالْحَبْسُ، وَمِنْهُ الرَّهْنُ فِي الدَّيْنِ، وهذا مِنَ العَامِّ المُرَادِ بِهِ الخُصُوصُ، بِالقَرِينَةِ وَالبَاءُ لِلمُصَاحَبَةِ لَا لِلسَّبَبِيَّةِ**)، (**رَهْن**): بە مانای بەستنەوەو حەپس کردن دێ، لەویشەوەیە بارمتەی قەرز، کەسێك قەرزی لەسەر کەسێکە، بابای قەرزدار دەڵێ: با ئەم وڵاخەم لە لای تۆ بێ، یان ئەو فەڕشەم لە لای تۆ بێ، یان ئەو زەوییەم بەدەست تۆوە بێ، تاکو قەرزەکەت دەدەمەوە.

ئنجا لێرەدا: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾، بە گشتیی هاتوە، بەڵام مەبەست پێی تایبەتە، بە هۆی بەڵگەو نیشانەیەکەوە کە ناچارمان دەکات، واتە: هەرچەندە دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ﴾، هەموو کەسێك بارمتەی کردەوەکانی خۆیەتی، کە مەبەست پێی نێو دۆزەخە، بەڵام بە دڵنیایی هەموو مرۆڤەکان ناچنە دۆزەخ و، بەڵگەو نیشانەمان هەیەو بەڵگەکەش ئەوەیە، کە دوایی خوا (**أَصْحَابُ الْيَمِيْنِ**) جیا دەکاتەوە لەو حوکمە.

کە دەشفەرموێ: ﴿بِمَا كَسَبَتْ﴾، (**ب**) لێرەدا بۆ هۆکاریی نیە، بەڵکو بۆ هاوەڵێتیی و لەگەڵدا بوونە.

واتە: هەموو کەسێك لە جوغزی حوکمی کردەوەکەی خۆیدا بارمتەیە، (**الطبري**) ئاوای مانا لێکداوەتەوە دەڵێ: (**كُلُّ نَفْسٍ مَأْمُوْرَةٍ مَنْهِيَّةٍ، بِمَا عَمِلَ مِنْ مَعْصِيَةِ اللهِ فِي الدُّنْيَا، رَهِيْنَةٌ فِي جَهَنَّمَ**)، هەموو کەسێکی کە فەرمان پێکراوەو قەدەغە لێ کراوە، بەهۆی ئەوەوەی لە دنیادا سەرپێچیی لە خوا کردوە، لە دۆزەخدا بارمتەیەو حەپس کراوە.

(**الطبري**) لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) بە ژمارە (٣٥٥٧٥) هێناویەتی، لە تەفسیری: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾دا، دەڵێ: (**مَأْخُوذَةٌ بِعَمَلِهَا**)، هەموو کەسێك بە کردەوەکەی خۆی گیراوە، واتە: سزا دەدرێ و لە دۆزەخدا دەهێڵدرێتەوە.

دەشگونجێ بگوترێ: هەموو کەسێك بارمتەی کردەوەکانی خۆیەتی، ئەگەر چاکن، ئەگەر خراپ، هەموو کەسێك لە گرەوی کردەوەکانی خۆیدایەو، چارەنووسی بەستراوەتەوە بە کردەوەکانیەوە، ئەگەر کردەوەکانی چاك بن دەیبەنە بەهەشت و، ئەگەر خراپ بن دەیبەنە دۆزەخ، دەشگونجێ ئەو مانایەشی لێ بدرێ و لە ڕووی ڕێزمانییەوە ئەو مانایەش دەگەیەنێ، بەڵام ڕەوت (سیاق)ەکە ئەو مانایە زیاتر ساغ دەکاتەوە، کە مەبەست پێی هەموو کەسێکی تاوانبارە، کە بارمتەو

حەپسە بەهۆی کردەوە خراپەکانیەوە، لە دۆزەخدا، بە نیشانەو بەڵگەی ئەوەی دوایی خوا هاوەڵانی ڕاستە جیا دەکاتەوە لەوان.

### شیکردنەوەیەکی وشەی (رَهِينَةٌ):

(رَهِينَةٌ: **مَصْدَرٌ بِوَزْنِ فَعَيْلَةٍ كَالشَّتِيمَةِ، فَهُوَ مِنَ الْمَصَادِرِ الْمُقْتَرِنَةِ بِهَاءٍ كَهَاءِ التَّأْنِيثِ، مِثْلَ الفُعُولَةِ وَالفَعَّالَةِ، وَلَيْسَ هُوَ مِن بَابِ فَعِيلٍ الَّذِي هُوَ وَصْفٌ بِمَعْنى الْمَفْعُول، مثيل قَتِيلَةٍ، إِذْ لَوْ قَصَدَ الوَصْف، لَقِيل رَهِيْن، لِأَنَّ فَعَيْلًا بِمَعْنَى مَفْعُولٍ، يَسْتَوِي فِيهِ الْمُذَكَّرُ وَالْمُؤَنَّثُ، إِذَا جَرَى عَلَى مَوْصُوفِهِ**)، واتە: وشەی (**رَهِينَةٌ**) چاوگە لەسەر کێشی (**فَعَيْلَةٍ**)، وەك (**شَتِيمَةِ**)، {بە مانای جنێو (**شتم**)}، ئنجا وشەی (**رَهِينَةٌ**) لەو چاوگانەیە، کە (**هاء**)ێکی لەگەڵدایە وەك (**هاء**)ی مێینە، وەك (**فعولة وفعّالة**) ئەوانیش بەهەمان شێوە هەر چاوگن، لێرەدا (**رَهِينَةٌ**) لە جۆری (**فَعِيْل**) ێك نیە کە وەسف بێ بە مانای (**مَفْعُول**)، وەك (**قَتِيْلَة**)، چونکە ئەگەر مەبەست وەسف بووایە، دەگوترا: (**رَهِيْن**): (**كُلُ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِيْن**)، چونکە (**فعيل**) کە بە مانای (**مفعول**) بێ، نێرینەو مێینەی تێدا یەکسانن، کاتێ دەبێتە وەسف بۆ وەسفکراوەکەی.

واتە: کە دەفەرموێ: (**كُلُ نفسٍ**) هەرچەندە (**نفس**) مێینەی مەجازییە، بەڵام بۆیە نەگوتراوە: (**رَهِينَةٌ**)، چونکە وشەی (**رَهِيْن**) لەسەر کێشی (**فعيل**) ئەگەر بە مانای بەرکار (**مفعول**) بێ، بۆ مێینەو نێرینە وەك یەکە: (**إمْرَأَةٌ رَهِيْن، وَرَجُلٌ رَهِيْن**)، بەڵام لێرەدا (**رهينة**) بە مانای چاوگە، واتە: (**كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهْنٌ**)، هەموو کەسێك بەوەی کردوویەتی، بارمتەیە یان بارمتەکراوە.

**٣)**- ﴿إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ﴾، جگە لە هاوەڵانی ڕاستە، هاوەڵانی ڕاستەش ئەوانەن، بە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، ئەو واتایە لە قورئان دا هاتوە: ﴿فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ١٩﴾ **الحاقة**، هەندێکیش گوتوویانە: (**أصحاب اليمين**) ئەوانەن لە لای ڕاست ڕادەگیرێن، بەڵام مادام خوا لە قورئاندا ڕوونی کردۆتەوە، کەواتە:

نامەدرانەوە بە دەستی ڕاست، نیشانەی چوونە بەهەشتەو، بە دەستی چەپ، نیشانەی چوونە دۆزەخە.

ئنجا **(الطبري)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە (خوا لێی ڕازی بێ) بە ژمارە (٣٥٥٨١) هێناویەتی، گوتوویەتی: **(أَصْحَابُ اليَمِيْن هُمُ الوِلْدَان أولاد المُسْلِمِيْن)** هاوەڵانی ڕاستە بریتین لە منداڵەکان، منداڵانی مسوڵمانان، ئەوانەی نەباڵغن لە کوڕو کچ، هەر **(الطبري)** لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) بە ژمارە (٣٥٥٨٥) هێناویەتی، گوتوویەتی: **(أَصْحَابُ اليَمِيْن هُمُ المَلَائِكَة)**، هاوەڵانی ڕاستە، بریتین لە فریشتەکان، بۆیەش **(الطبري)** ئەو دوو ڕایانە دێنێ، دەڵێ: **(لأَنَّهُمْ لَمْ يَقْتَرِفُوْا ذُنُوبَاً، وَلَمْ يَعْرِفُوْهَا، وَلَوْ عَرَفُوْهَا لَمْ يَكُونُوا لِيَسْألوهُم)**، واتە: هاوەڵانی ڕاستە (چ منداڵەکان بن، منداڵی نەباڵغیی مسوڵمانان، چ فریشتەکان بن)، لەبەر ئەوەی گوناهیان نەکردوون، بۆیە نازانن گوناح چییە؟ ئەگەر زانیبایان، لە تاوانبارانیان نەدەپرسی (بۆچی چوونە دۆزەخ؟)، چونکە دەیانزانی گوناهیان کردوون و، شارەزای گوناهان دەبوون و پێویستی نەدەکرد بپرسن.

بەڵام پێم وایە **(أَصْحَابُ اليَمِيْن)** هەر ئەوانەن، کە بە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان دراوەتەوە، لە قورئاندا خوا ﷻ **(أَصْحَابُ اليَمِيْن)** هەر بەو واتایە بەکارهێناوە، بەڵێ ئەو دوو واتایەش، کە **(الطبري)** هێناونی لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی ڕازی بێ) و، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ڕێیان تێدەچێ، بەڵام مادام خوا ﷻ لە قورئاندا **(أَصْحَابُ اليَمِيْن)**ی لە چەند شوێنان پێناسە کردوون، کە ئەو بڕوادارانەن بەدەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، هەر بەوە تەفسیر بکرێ باشە.

**٣)-** ﴿ فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴾، ئەوانە لە چەند باخێکدان، لە تاوانباران دەپرسن، چ شتێك خستنیە نێو سەقەڕەوە؟ ﴿ يَتَسَآءَلُونَ ﴾ لەسەر کێشی **(تَفَاعُل)**ە، واتە: لە یەکدی دەپرسن، ﴿ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴾، چ شتێك ئێوەی خستە

نێو سەقەرەوە (**أي: مَا أَدْخَلَكُمْ فِي سَقَر؟**)، چ شتێك ئێوەی ئاخنیە نێو ئاگری دۆزەخەوە، بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿يَتَسَآءَلُونَ﴾ لێرەدا هەر بە مانای پرسیار دەكەن (**يَسْئَلُوْن**)ە، (**يَسْئَلُون عَنِ المُجْرِمِيْن**)، هەندێكیش گوتوویانە: ﴿يَتَسَآءَلُونَ﴾، واتە: لە نێو خۆیاندا دەپرسن و مشت و مڕ دەكەن لە بارەی تاوانبارەكانەوەو دوایی ڕوویان تێدەكەن: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ﴾، چ شتێك ئێوەی خستە نێو سەقەرەوە؟ هەردوو واتایەكە هاتوون:

**یەكەم:** هـــاوەڵانی دەستە ڕاســت هەندێكیان لە هەندێكیان دەپرسن، لە بارەی تاوانبارەكانەوە.

**دووەم:** ئەوەیە لێرەدا ڕێژگەی (**تَفَاعُل**) كە بۆ هاوبەشییە، بەكارهێنراوە بۆ مانای دووبارەكردنەوەی كردارێك، واتە: زۆر لە یەكدی دەپرسن، هەر كامێكیان زۆر لەوی دیكە دەپرسێ، ئنجا هەر كردارێك زۆر دووبارە ببێتەوە، دەیخەنە سەر كێشی (**تَفَاعُل**).

كاتێك ئەوان لێیان دەپرسن: چ شتێك ئێوە خستە نێو سەقەرەوە؟

ئەوانیش ئاوا وەڵام دەدەنەوەو چوار هۆكاران دەخەنەڕوو:

هۆكاری یەكەم:

٤)- ﴿قَالُواْ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾، گوتیان: ئێمە لە نوێژكەران نەبووین.

هۆكاری دووەم:

٥)- ﴿وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ﴾، ئێمە عادەتمان وانەبوو خواردن بدەین بە نەدار.

هۆكاری سێیەم:

٦)- ﴿وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ﴾، ئێمە لەگەڵ تێڕژاواندا تێدەڕژاین، واتە: هەر كەسێك قسەی خراپی كردبایە، ئێمەش بەشدارییمان دەكرد، بە تایبەت دژایەتیی ئیسلام و گاڵتەكردن بە قورئان، توانج و پلار گرتن لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

هۆکاری چوارەم:

٧)- ﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾، ئێمە عادەتمان وابوو ڕۆژی سزاو پاداشتمان بە درۆ دادەنا.

٨)- ﴿ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴾، تاکو یەقینمان بۆ هات، (**الْيَقِينُ: اسْمُ مَصْدَرِ يَقِنَ كَفَرِحَ، إِذَا عَلِمَ عِلْمَاً لَا شَكَّ مَعَهُ وَلَا تَرَدُّدَ**)، (**يَقِينُ**) ناوی چاوگە لەسەر کێشی (**فَرِحَ**)، ئەگەر زانیارییەکی زانیی هیچ دوو دڵیی تێدا نەبێ، کەواتە: ﴿ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴾، هەتا زانیارییەکی جێی دڵنیاییمان بۆ هات، کە تازە ئەوە ژیانی دنیا بەجێ دێڵین، ئنجا دەستبەرداری ئەو کردەوە خراپانە بووین، ئەویش بە ناچاریی و بۆیان نەدەکرا، یاخود وشەی (**يَقِينْ**) بە مانای دڵنیاییە، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ مردن، چونکە هەموو کەس لە مردن دڵنیایە، هەموو کەس دەزانێ دەمرێ، بۆیە وشەی (**يَقِينُ**) بۆ مردن بەکارهێنراوە.

٩)- ﴿ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴾، ئنجا تکای تکاکاران هیچ سوودیان پێناگەیەنێ، تکاکارانیش پێغەمبەرانن و فریشتەکانن و زانایانن و شەهیدانن، دەشگونجێ لێرەدا (**ما**) بۆ پرسیارکردن (**مَا الإِسْتِفْهَامِيَة**) بێ، واتە: (**فَأَيُّ نَفْعٍ تَنْفَعُهُمْ شَفَاعَة الشَّافِعِيْن!**)، ئایا چ سوودێکیان پێدەگەیەنێ، تکای تکاکاران؟ کەواتە: تکاکاران تکایان بۆ ناکەن، چونکە ئەگەر پێغەمبەرانن، ئەگەر فریشتەکانن، ئەگەر شەهیدانن، ئەگەر زانایانن، پێشوەخت دەزانن ئایا خوا ﷻ مۆڵەتی لەسەر کێیە تکای بۆ بکرێ؟ بۆیە قسەیەك ناکەن جێ نەگرێ و، لەوێ قسەی بێ جێ ناکەن.

(**الزمخشري**) لە تەفسیرکردنی ئەو ڕستەیەدا، کە لە سەرەتای سووڕەتی (**النساء**)دا هاتوە: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ﴿١﴾ ﴾، دەڵێ: (**هُوَ كَقَوْل (تَدَاعَيْنَا) إِذَا كَانَ المُتَكَلِّم مُفْرَداً يُقَالُ دَعَوْتُ وَإِذَا كَانَ مُتَعَدِّداً يُقَالُ تَدَاعَيْنَا، ونَظِيْرُهُ: رَمَيْتُهُ وَتَرَامَيْنَا، وَرَأَيْتُ الهِلَال وَتَرَأَيْنَاهُ، وَلَا يَكُوْن هَذَا التَفَاعُل مِنَ الجَانِبَيْن، أي: هُو فِعْل وَاحِدٌ مِنْ جَانِبٍ وَاحِد فِي العَدَد الكَثِيْر، وَعَلَى هَذَا يَكُونُ مَفْعُول يَتَسَاءَلُون مَحْذُوفاً، يَدُلُّ عَلَيْه قَوْلُهُ: (عَنِ المُجْرِمِين)، وَالتَقْدِيْر: يَتَسَاءَلونَ المُجْرِمِيْن عَنْهُم، أي عَن سَبَبِ حُصُولِهِم فِي سَقَر**).

(**الزَّمخشري**) زانایەكی زۆر زەبر دەست بووە، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبیی و ڕووی ڕەوانبێژییەوە، خوا پاداشتی بداتەوەو ڕەحمەتی خوای لێ بێ، هەندێك لە زانایان هەستیارییەكی زێدە لە پێویستیان هەیە بەرانبەری، بەهۆی ئەوەوە كە لە پەیڕەوانی قوتابخانەی موعتەزیلە بووە، بەڵام وەك لە كتێبی سێیەمی مەوسووعەی: (بیركردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا)، لە باسی موعتەزیلەدا، باسمان كردوە، لە ڕاستییدا هەموو ئەوانەی پێیان گوتراوە: (**أهلُ الحديث و أشاعِرة و ماتريدية و معتزلة و جبرية و قدرية و شيعة**)، ئەوانە هەموویان هەندێ بیرو بۆچوونیان هەبوون جیاواز بوون و، مەرج نیە هیچ كامیان تەواو لەسەر هەق بووبێ.

بەڵێ زۆرینەی مسوڵمانان ئەوانەبوون كە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ و چوار جێنشینە سەر ڕاستەكانی (**أبـو بكـر وعمـر وعثـمان وعلي**) و، هاوەڵانی بە گشتیی (خوا لێیان ڕازی بێ) و خزمان و بنەماڵەی بە گشتیی (خوا لێیان ڕازی بێ) ڕۆیشتوون، بەڵام هەر كەسێ گوترا: موعتەزیلە بووە، هیچ خێری پێوە نەبێ و، هەر كەسێ گوترا: ئەهلی حەدیس بووە، هەموو شتێكی خێر بێ، وانیە، دەبێ هەر كەسە وەك خۆی تەماشا بكرێ، لە نێو ئەهلی حەدیسدا ئەوانەی بانگەشەی ئەوەیان كردوە، زۆر بە دوای ڕێبازی پێغەمبەری خوا دەكەون، كەسانی بە كەڵك نەهاتووش هەن و، كەسانی زۆر چاكیش هەن، وەك ئەحمەدی كوڕی حەنبەل و زانایانی دیكەی بەرجەستە، بەڵام كەسانی دیكەش هەبوون كە ڕەشایی بوون و بە گەڵ كەوتوون.

هەروەها لە نێو موعتەزیلەش دا كەسانێك هەبوون، وەك (**الزمخشري**) كە قورئانی بۆ تەفسیر كردووین و (**الكشاف**) تەفسیرێكی زۆر نایابەو، شتی زۆر باشی خستۆتەڕوو، لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، بەڵام دیارە هەڵەو پەڵەش هەبووە لە هەموو لایەكەوە، قوتابخانەی موعتەزیلەش بە گشتیی تێپەڕاندنی هەبووە لە پشت بەستن بە عەقڵدا، لەسەر حیسابی وەحیی و نەقڵ، خاڵە بێهێزە

گەورەکەیـان ئەوەیـە، بـەو هۆیەشـەوەیە کـە هەندێـك هەڵـەی دیکەشـیان بـوون، بـەڵام وێـڕای ئـەوە، هەندێـك چاکەشـیان بـوون، لـە بەرانبـەر هەندێـك هەڵـەو پەڵـەی ئەوانـەدا، کـە خۆیـان بـە شـوێنکەوتەی ڕێبـاز و حەدیـس زانیـوە.

**(الزمخشري)** لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەی سـووڕەتی **(النسـاء)**دا دەڵـێ: ئەمـە وەك ئەوەیـە بڵێـی: **(تَداعَيْنَـا)** بانگـمان کـرد، ئەگـەر بابـای قسـەکەر، یـەك بـێ دەڵـێ: **(دَعـوتُ)** بانگـم کـرد، بـەڵام ئەگـەر زۆر بـن، دەڵـێ: **(تَداعَيْنَـا)** مانایەکـەی ئـەوە نیـە: یەکدییـمان بانگکـرد، بەڵکـو یـانی: هەمووـمـان بانگـمان کـرد، هەروەهـا **(رميتُـهُ)** واتـە: هاویشـتم، بـەڵام **(ترامَيْنَـا)** واتـە: هەمووـمـان هاویشـتمان (نـەك بەیەکدییمانـەوە نـا)، هەروەهـا **(رأيـتُ الهـلال)** مانگـی یـەك شـەوەم بینـی، **(وترأيْنـاهُ)** واتـە: هەمووـمـان بینیـمان، ئەمـەش مەبەسـت پێـی ئـەوە نیـە **(تفاعُـل)** بـێ لـە دوو لایەنـەوە، بەڵکـو کردارێکـە لەیـەك لاوە، بـەڵام ژمارەیەکـی زۆر ئـەو کردەوەیـە ئەنجـام دەدەن، بۆیـە بـەرکاری **(يتسـاءَلون)** لێـرەدا قرتێنـدراوە، چـی دەیگەیەنـێ؟ وشـەی **(عَـنِ المُجْرِمِـيْنَ)**: **(يَتَسَـاءَلُوْن عَـنِ المُجْرِمِـيْن)**، واتـە: هەموویـان دەپرسـن، نـەك لـە یەکـدی دەپرسـن، بەڵکـو هەموویـان دەپرسـن لـە تاوانبـاران، دەپرسـن لـە تاوانبـاران لـە بـارەی خۆیانـەوە، **(أي: عَـنْ سَـبَبِ حُصُولِهِـمْ فِي سَـقَر)**، لـە بـارەی هـۆکاری ئامادەبوونیانـەوە لـە سـەقەڕدا.

لـە کۆتایـی ئـەم دەرسـەدا ئـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ دێنین، کـە دەفەرموێ: **{يَمُـوتُ الْمَـرْءِ عَـلَى مَـا عَـاشَ عَلَيْـهِ، وَيُبْعَـثُ عَـلَى مَـا مَـاتَ عَلَيْـهِ}** **(أخرجـه مسـلم: ٨٣)**، واتـە: هـەر مرۆڤێـك لەسـەر ئـەوە دەمـرێ کـە لەسـەری ژیـاوەو، لەسـەر ئـەوەش زینـدوو دەکرێتـەوە کـە لەسـەری مـردوە، کەواتـە: مـرۆڤ لەسـەر چـی بـژی لەسـەر ئـەوەش دەمـرێ و، لەسـەر چیـش بمـرێ، هـەر لەسـەر ئـەوەش زینـدوو دەکرێتـەوە، بۆیـە مـرۆڤ دەبـێ وریـا بـێ، کردەوەکانـی دەبنـە پێناسـەی و دەبنـە هـۆکاری ئەوەی بـۆ کـوێ بچـێ؟.

لە ڕاستیدا مرۆڤ ئەگەر شەیتان فێڵی لێ نەکات و كڵاوی لەسەر نەنێ، نابێ بێجگە لە ئیمان و كردەوەی چاكی خۆی، پشت بە هیچ شتێكی دیكە ببەستێ، وەك: ئەگەر خوا بۆی نووسیبێم دەچمە بەهەشتێ، هەر دەچم! چونكە ڕەنگە خوا بۆی نووسیبی دەچیە بەهەشت، بەڵام بەهۆی ئیمان و كردەوەی باشی خۆتەوەو، ئەگەر ئیمانت هەبێ و كردەوەی باشت هەبێ، خوا بەهەشتی بۆ نووسیوی و، كەسێك بێ ئیمان و كردەوە خراپ بێ، خوا دۆزەخی بۆ نووسیوە، كەواتە: ئیمان و كردەوەی باشمان، ئاوێنەیەكە، سەرەنجام و چارەنووسی خۆمان لەوێدا دەبینین، چونكە قەدەری خوا پەنهانە، بەڵام ئیمان و كردەوەی خۆمان، دیارەو ئاشكرایە.

### مەسەلەی دووەم:

**سەرسوڕمان لە هۆکاری ڕوو وەرگێڕانی بێبڕوایان لە قورئانی بیرخەرەوە، کە وەك کەرەکێوییانی سڵەمیوەوە، کە لە ترسی شێر ڕادەکەن، هەڵدێن و، هەر کامێکیان داوای نامەیەکی کراوە دەکات! لە خوای بێ وێنەوە بۆی بێ، ئنجا بڕوا دێنێ، بەڵام هۆکار نەترسانیانە لە ڕۆژی دوایی، نەك نەبوونی بەڵگەی ئیقناعکەر:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴾، ئەوە چییانە ڕوو وەرگێڕن لە بیرخەرەوە، پیتی (ف) لێرەدا: (**الْفَاءُ لِتَرْتِيبِ إِنْكَارِ إِعْرَاضِهِمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ عَلَى مَا قَبْلَهُ، مِنْ مُوجِبَاتِ الْإِقْبَالِ عَلَيْهَا**)، (ف) بۆ بنیاتنانی نکوولّییکردنە لە پشت هەڵکردنیان لە قورئانی بیرخەرەوە، لەسەر ئەوەی ڕابردوە، لە داخوازیی و هاندەرەکانی ڕوو تێکردنی، واتە: لە حاڵێکدا کۆمەڵێك هاندەرو پاڵنەر هەن، بۆ ئەوەی ڕوو لە قورئانی بیرخەرەوە بکەن و بڕوای پێ بێنن، لە باوەشی بگرن و پێشوازیی لێ بکەن، ئایا ئەوان چییانە کە ڕووی لێوەردەگێڕن و پشتی تێدەکەن؟!.

واتایەکەی ئاوای لێدێتەوە: (**أَيُّ شَيْءٍ حَصَلَ لَهُمْ حَالَ كَوْنِهِمْ مُعْرِضِينَ عَنِ الْقُرْآنِ الَّذِي هُوَ مُشْتَمِلٌ عَلَى التَّذْكِرَةِ الكُبْرَى**)، چ شتێك بۆیان پەیدا بووە لە حاڵێکدا ئەوان ڕوو وەرگێڕن، لەو قورئانەی بیرخستنەوەی هەرە مەزن و گەورەی گرتۆتە خۆی؟

ئنجا خوا ﷻ حاڵەتی ڕوو وەرگێڕان و ڕوو وەچەرخاندنیان لە قورئان، وێنا دەکات لە دیمەنێکدا، کە ئەوان لە ژیانی ئاسایی خۆیاندا زۆریان بینیوەو، ئێستاش ئێمە کەسێك لە دارستان و جەنگەڵەکانیشدا نەژی و ئەو دیمەنە نەبینێ، بەڵام لە فیلم و تەلەفزیۆندا زۆر دەبینرێ، ئەویش بریتیە لە ڕاکردن و سڵەمینەوەی کەرەکێوییان لە شێر کە پەلاماریان دەدا.

٢)- ﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ﴾، دەڵێ کەرەکێوییەکانی سڵەمیوەوەن، (**حُمُر**) کۆی (**حِمار**)ە، (**مُسْتَنْفِرَةٌ**)ش سیفەتی (**حُمُر**)ە، (**مُسْتَنْفِرَةٌ**) کە خوێندراویشەتەوە: (**مُستَنفَرة**)، (**مُسْتَنْفِرَةٌ**) ناوی بکەر (**إسم فاعل**)ە، واتە: سڵەمیوەوەو ڕاکردوو، (**نافِرةٌ، منجَفِلة**) سڵەمیوەتەوەو ڕایکردوە، (**مُستَنفَرة**)ش ناوی بەرکار (**إسم مفعول**)ە، واتە: (**مُنَفَّرةٌ مذعورة**)، سڵەمێندراوەتەوەو ترسێندراوەو دوورخراوەتەوە.

٣)- ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾، لە شێر ڕایانکردوەو هەڵاتوون، ئنجا مادام دوایی دەفەرموێ: لە شێر ڕایانکردوە ئەو کەرەکێوییانە، کەواتە: خوێندنەوەی: (**مُسْتَنْفِرَة**) ڕاسترەو لەگەڵ ڕستەی دوایی دا باشتر دێتەوە، چونکە کەرەکان خۆیان سڵەمیونەوەو ڕایانکردوە لە شێر.

خاوەنی تەفسیری (**الكَشَّاف**) دەڵێ: (**المُسْتَنْفِرَةُ: الشَّدِيدَةُ النِّفَارِ، كَأَنَّهَا تَطْلُبُ النِّفَارَ مِنْ نُفُوسِهَا فِي جَمْعِهَا لَهُ، وَحَمْلِهَا عَلَيْهِ**)، واتە: زۆر دوورکەوتووەوەو زۆر سڵەمیوەوە، وەك سڵەمینەوە لە خۆیان داوا بکەن، لە خۆ بۆ کۆ کردنەوەی خۆ بۆ تاودانی دا، واتە: زۆر لە خۆیان دەکەن بسڵەمنەوە، ئەگەر (**مُستَنفَرة**)ش بێ، واتە: سڵەمێندراوەو ترسێندراو.

وشەی (**قَسْوَرَةٌ**)ش بە دوو واتایان هاتوە:

أ- بە مانای شێر هاتوە، (**لأنّ الأسَد يَقْسِرُ الحَيَوَانَات**)، چونکە شێر ئاژەڵەکانی دیکە ناچار دەکات و بەسەریان دا زاڵ دەبێ و ڕاویان دەکات.

ب- هەروەها (**قَسْوَرَة**) دەشگونجێ کۆی (**قَسْور**) بێ، بە مانای (**الرَّامِي**) تیرهاوێژ، ڕاوچیی، واتە: کۆمەڵێکی تیر ئەنداز لە ڕاوچییان، (**الطبري**) بە ژمارە (٣٥٦١٠) لە ئەبی

حەمزەوە هێناویەتی، کە گوتوویەتی: (**سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنِ الْقَسْوَرَةِ؟ فَقَالَ: مَا أَعْلَمُهُ بِلُغَةِ أَحَدٍ مِنَ الْعَرَبِ: الْأَسَد، هِيَ عِصَبُ الرِّجَالِ**)، واتە: پرسیارم کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) لە بارەی (**قَسْوَرَة**)ەوە، ئەویش گوتی: نەمزانیوە لە زمانی هیچ کام لە عەڕەباندا (**قَسْوَرَة**) بە مانای شێر هاتبێ، بەڵکو مەبەست کۆمەڵێکە لە پیاوان، واتە: لە تیرئەندازو ڕاوچییان.

بەڵام هەر (**الطبري**) بە ژمارە (٣٥٦١١) دیسان هێناویەتی: (**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما: **أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ قَوْلِهِ:** ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾، **قَالَ:** « **هُوَ بِالْعَرَبِيَّةِ: الْأَسَدُ، وَبِالْفَارِسِيَّةِ: شَارْ، وَبِالنَّبَطِيَّةِ: أَرَيَا، وَبِالْحَبَشِيَّةِ: قَسْوَرَةٌ**)، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما پرسراوە لە بارەی: ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾، واتە: ئەو کەرەکێوییانەی لە (**قَسْوَرَة**) ڕایانکردوە؟ ئەویش گوتوویەتی: (**قَسْوَرَةٌ**) بە عەڕەبیی پێی دەگوترێ: (**الأَسَدُ**) و، بە فارسیی پێی دەگوترێ: شار، (شار هەر مەبەست شێرە بە کوردیی و بە فارسیی، بەڵام لەبەرئەوەی پیتی (ی) لە عەڕەبییدا نیە، واتە: (**يَاء الإمَالَة**)، دەگونجێ بڵێی: شارو دەگونجێ بڵێی: شێر)، بە زمانی (**نَبْطِي**)یش شێر ئاریای پێدەڵێن و، بە حەبەشەییش قەسوەرەی پێدەڵێن.

کورتەی واتای ئەم ئایەتە موبارەکانەش ئەوەیە، کە خوا تعالى بێبڕوایەکان دەچوێنێ بە کەرەکێوییانەوە، کاتێ کە شێر دەبینن و، شێر پەلاماریان دەدات و ڕادەکەن، یان کاتێ کەرەکێویی ڕاوچییان دەبینن، کاتی خۆی بە تیروکەوانەوە بۆیان دانیشتوون و ئێستاش بە تفەنگەوە، ڕادەکەن و دەسڵەمنەوە، واتە: ئەوانیش ئاوا لە قورئان دەسڵەمنەوەو دووردەکەونەوە، وەك چۆن کەرەکێویی لە ترسی شێر ڕادەکەن، لە حاڵێکدا کە شێر دەیەوێ کەرەکێوییان ڕاو بکات و بیانخوات، بەڵام ئەم قورئانە دەیەوێ هیدایەتیان بدات!!.

ئنجا خوا سبحانه وتعالى لەو وێچواندنە، پێهەڵاتر دەچێ و دەفەرموێ:

٤)- ﴿ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴾، واتە: {کافرەکان نەك هەر وەك کەرەکێوییان کە لە شێر ڕادەکەن، لە قورئان دەسڵەمنەوە}، بەڵکو هەر مرۆڤێك لەوان دەیەوێ نامە کراوەکانی پێ بدرێن، خوێندراویشەتەوە: (**صُحْفاً**)، (**مُنَشَّرة**)ش خوێندراوەتەوە: (**مُنْشَرة**)، لێرەدا (**صُحُف**) یان (**صُحْف**) بە بۆر (**ضَمَّة**) یان بە زەنە (**سكون**): (**جَمْعُ صَحِيْفَة، وَالصَّحِيْفَةُ: الكِتَاب**) هەردووکیان کۆی (**صَحِيْفَة**)ن و ئەویش بە مانای نووسراو دێ، واتە: لاپەڕەیەك، یان پەڕەیەك کە نووسرابێ.

٥)- ﴿ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾، نەخێر، بەڵکو لە دوامەنزڵگا ناترسن، (**كَلَّا**): (**كَلِمَة الرَّدعِ وَالإِبْطَال**)، (**كَلَّا**) وشەی بەرپەرچدانەوەو پووچەڵکردنەوەی داواکارییەکەیانە، واتە: ئەوەی دەیڵێن، با وازی لێ بێنن، چونکە ئەوە داوایەکی بێ جێیە، کە هەر کامێکیان نامەیەکی لە خوای بەرزەوە بۆ بێ، ئەوانە دیارە لە کەوڵی خۆیان دەرچوون و، ئەگەر لە ئیمان هێنان بگەڕێن، پەکیان لەسەر ئەوە نەکەوتوە خوا نامەیان بۆ بنێرێ، خوا نامەیەکی گشتیی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی ناردوە، کە قورئانەو، نێردراوێکی گشتییشی ناردوە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، کە موحەممەدە ﷺ و کۆتا نێردراوو پێغەمبەری خوایە، وەك چۆن قورئانیش کۆتا فەرمایشت و کتێبی خوایە، ئەگەر لە ئیمان بگەڕێن، ئەوە هەم نوێنەری خواو، هەم فەرمایشتی خوا، هەن، ئەگەر لە بەهانەش بگەڕێن، وەڵامی ئەو بەهانەشیان بدرێتەوە، بەهانەیەکی دیکە دەگرن.

بۆیە خوا دەفەرموێ: (**كَلَّا**) یانی: با وازبێنن، ﴿ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾، بەڵکو لە مەنزڵگای کۆتایی ناترسێن، (**الأخِرَة صِفَة مَوْصُوف مَحْذُوف: الدَّارُ الأخِرَة، أو المَنْزِلَةُ الأخِرَة**)، (**الآخِرَة**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە: مەنزڵگای کۆتایی و پێگەی کۆتایی، یانی: لە ڕۆژی دوایی ناترسێن و، ئەوەیە وای لێکردوون و جورئەتی پێداون، بڕوا بە پەیامی خوا نەکەن و، بڕوا بە پێغەمبەری خوا نەهێنن.

لە بارەی ئەوەوە کە داوایان کردوە نامەیان بۆ بێ، (**الطبري**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا بە ژمارە: (٣٥٦٢٢) لە قەتادەوە ئەم دەقەی هێناوە: (**قَالَ: قَدْ قَالَ قَائِلُونَ**

**مِـنَ النَّـاسِ: يَـا مُحَمَّـدُ ﷺ! إِنْ سَرَّكَ أَنْ نَتَّبِعَـكَ، فَأْتِنَـا بِكِتَـابٍ خَـاصٍّ، إِلَى فُـلَانٍ وَفُـلَانٍ، نُؤْمَـرُ فِيـهِ بِاتِّبَاعِـكَ، قَـالَ قَتَـادَةُ: يُرِيـدُونَ أَنْ يُؤْتُـوا بَـرَاءَةً بِغَـيْرِ عَمَـلٍ**)، قەتـادە ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ گێڕاویەتـەوە: بێژەرانێـك لـە خەڵـك گوتیـان: ئـەی موحەممـەد ﷺ! ئەگـەر دڵخـۆش دەبـی بـەوەی شـوێنت بکەویـن، نووسراوێکـمان بـە تایبـەت بـۆ بێنە، بـۆ فلانکـەس و فلانکـەس {واتـە: لـە خـوای پـەروەردگارەوە بـۆ فلانکـەس} فەرمانمـان پـێ بکـرێ لـەو نـووسراوەدا بـە شـوێنکەوتنی تـۆ، قەتـادە گوتوویەتـی: ویسـتوویانە ئەسـتۆپاکییان لـە سـزا بـۆ دەربـبـڕدرێ، بـێ ئـەوەی کـردەوەی بـاش بکـەن، بـێ ئـەوەی ئیـمان بێنـن و پابەنـد بـن!!.

لـە سـوورەتی (**الإسراء**)یشـدا هاتـوە کـە یەکێـك لـە بیانووەکانیـان ئـەوە بـووە، گوتوویانـە: ﴿وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ﴿٩٣﴾﴾، ئەگـەر بەرزیـش ببیـەوە لەبەرچـاوی ئێمـە بـۆ ئاسـمان، هەرگیـز بـڕوات پـێ ناهێنیـن، هەتـا نووسراوێکـمان بـۆ نەهێنـی بیخوێنینـەوە.

لەوێـدا ڕوونکەرەوانـی قورئـان گوتوویانـە: کافـرەکان گوتوویانـە: دەبـێ نامەیەکـمان بـۆ بـێ: (**مِـن ربِّ العَالَمِـيْنَ إلى فُـلَانِ بـن فُـلَان إنَّ مُحَمَّـداً رَسُـولِي فآمِـن بِـه**)، لـە پـەروەردگاری جیهانییانـەوە بـۆ فلانکەسـی کـوڕی فلانکـەس! موحەممـەد ڕەوانەکـراوی منـە، بـڕوای پـێ بێنـە! بۆیـە خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: بـا واز بێنـن لـەو داوایـەو لـەو قسـانە، بەڵکـو هـۆکاری بـڕوا نەهێنانیـان ئەوەیـە، کـە ترسـی ڕۆژی دوایـیـان نیـە، ترسـی مەنزڵـگای کۆتاییـان نیـە.

هـەر (**الطبري**) بـە ژمـارە (٣٥٦٢٤) لـە قەتـادەوە ئەمەشـی هێنـاوە: (**إِنَّمَا أَفْسَـدَهُمْ أَنَّهُـمْ كَانُـوا لَا يُصَدِّقُـونَ بِالْآخِـرَةِ، وَلَا يَخَافُونَهَـا، هُـوَ الَّـذِي أَفْسَـدَهُمْ**)، واتـە: ئـەوەی ئـەو بێبڕوایانـەی تێکـدا بـوو، ئەوەبـوو کـە مەنزڵـگای کۆتاییـان بەڕاسـت نەدەزانـی و، ترسـیان لێـی نەبـوو، ئـەوە بـوو تێکیدابـوون و جورئەتـی پێدابـوون بـەدەم بانگـەوازی خـواوە نەچـن.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**بە دڵنیایی قورئان بیرخەرەوەو ئامۆژگارییەو، هەر کەس بیەوێ یادی دەکات و پەندی لێوەردەگرێ و، پەندیشی لێوەرناگرن ئەی مرۆڤەکان! مەگەر خوا بیەوێ، هەر ئەویش شایستەی پارێزلێکران و لێبوردنە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴾، نەخێر (با وازبێنن) بە دڵنیایی ئەو (قورئان)ە، بیرخەرەوەو ئامۆژگارییە، (**رَدْعٌ ثَانٍ لاقْتِرَاحِهِمْ نُزُول كِتَاب سَمَاوِيٍّ لِكُلِ امْرِئٍ مِنْهُم ، وَالمَعْنى: لَا نُنَزِلُ كِتَابَاً، ذَلِك أن القُرآن تَذْكِرَة وَمَوْعِظَةٌ نَعِظُهُم بِه**)، ئەمە بەرپەرچدانەوەو هەڵوەشانەوەی دووەمەو، پەیوەستە بە پێشنیارکردنیان بە دابەزینی نووسراوێکی ئاسمانیی بۆ هەر کامێك، واتە: ئێمە هیچ نووسراوێك دانابەزێنین، چونکە قورئان بیرخەرەوەو ئامۆژگارییە ئامۆژگاریی ئەوانی پێ دەکەین.

یانی: ئەگەر بە دوای هەق و ڕاستییدا بگەڕێن، ئەوە قورئان وەڵامیانەو، ئەگەر لە بیانووش بگەڕێن، ڕێی بیانوو گرتن ناگیرێ، وەك گوتراوە: (ئەگەر دز دز بێ، تاریکە شەو زۆرە)، هەروەها گوتراوە: (کەسێك بە تۆبزیی بنێری بۆ مازوو چنین، لە دارێ هەر هەڵناڕوانێ)، واتە: تەماشای درەختەکان ناکات، داخۆ مازوویان پێوەن، یان نا؟ کەسێك لە بیانوو گرتن بگەڕێ، ڕێی بیانوو گرتن ناگیرێ.

کەواتە: وشەی (كَلَّا) وەك گوتراوە: (**رَدْعٌ وَزَجرٌ وَإِبْطَالٌ لِكَلَامٍ سَابِق**)، بەرپەرچدانەوەو تێخوڕین و هەڵوەشانەوەی قسەیەکی پێشوویە، کە ئەوە بوو پێشنیاریان کرد بوو: نامەی تایبەتییان لە خواوە بۆ بێ.

﴿ إِنَّهُۥ تَذۡكِرَةٞ ﴾، ڕاناوی سەر (إِنَّه)، بە دڵنیایی هەر دەگەڕێتەوە بۆ قوڕئان، واتە: نەخێر با وازبێنن، بە دڵنیایی ئەو، (قوڕئان) بیرخەرەوەیە.

٢)- ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾، هەر کەسێك بیەوێ بیری دێتەوەو دێتەوە یادی، یاخود هەر کەسێك بیەوێ پەندی لێوەردەگرێ، چی بیر دەکەوێتەوە؟ خوای بیر دەکەوێتەوەو ڕاستییەکانی بیردەکەونەوە بە گشتیی.

٣)- ﴿ وَمَا يَذۡكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ ﴾، بیریشیان ناکەوێتەوە مەگەر خوا بیەوێ.

ئەگەر یەکێك بڵێ: خوا فەرموویەتی: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذۡكِرَةٞ ﴾، بەڵام دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾، ﴿ تَذۡكِرَةٞ ﴾ش مێینەی مەجازییە، ئەدی بۆچی خوا فەرموویەتی: ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾؟ بە ڕاناوی نێرینە هێناویەتی؟ زانایان دەڵێن: ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ قوڕئان، (**فَمَن شَاءَ ذَكَرَ القُرآنَ**)، هەر کەس بیەوێ پەند لە قوڕئان وەردەگرێ، یاخود: ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾، ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ خوا ﷻ، واتە: قوڕئان بیرخەرەوەیە بۆ مرۆڤەکان کە خوایان لەیاد بێ، ئنجا هەر کەسێك بیەوێ خوای دەکەوێتەوە یاد.

﴿ وَمَا يَذۡكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ ﴾، یادی خواش ناکەنەوە، خوایان ناکەوێتەوە بیر، یاخود پەند وەرناگرن لە قوڕئان مەگەر خوا بیەوێ.

دوایی ئەمە زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

٤)- ﴿ هُوَ أَهۡلُ ٱلتَّقۡوَىٰ ﴾، بەس ئەو (خوا) شایستەی پارێزلێکرانە، (**هُوَ أهلٌ أن يُتَّقَى**) ئەو شایستەی ئەوەیە پارێزی لێ بکرێ.

٥)- ﴿ وَأَهۡلُ ٱلۡمَغۡفِرَةِ ﴾، بەس ئەویش شایستەی لێبوردنە، (**وَهُوَ أهْلٌ لأَنْ يَغْفِرَ لِمَن اتَّقَى**)، هەر ئەویش شایستەی ئەوەیە لە کەسێك ببوورێ کە پارێزی لێ بکات.

## کورتە باسێکئازادیی مرۆڤ لە نێوان ویستی ڕەهای خواو ویستی جوزئی خۆیدا

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، نایەتەوە یادیان، یاخود: پەندی لێوەرناگرن مەگەر خوا بیەوێ، دوای ئەوەی فەرموویەتی: ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾، هەر کەسێك بیەوێ خوای دەکەوێتەوە یاد، یاخود: پەند لە قورئان وەردەگرێ، یان: ڕاستییەکانی قورئانی دێنەوە یاد، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، یادیشی ناکەنەوەو نایەتەوە بیریان، یان: پەندی لێوەرناگرن مەگەر خوا بیەوێ، بە ڕواڵەت جۆرێك لە تێکگیرانیان لە نێوان دا هەیە!.

ئنجا زانایان زۆریان قسە لەو بارەوە کردوە، کە ئایا ویستی خوا ﷻ، پەیوەندیی لەگەڵ ویستی مرۆڤدا چۆنە؟ ئایا هەر کات مرۆڤ ویستی کارێك بکات، دەبێ لەو کاتەدا خوا بیەوێ ئەو کارە بکات، ئنجا بۆی دەکرێ، یاخود ئەمە چ واتایەکی دیکەی هەیە؟ چونکە ئەگەر وابێ و کاتێ مرۆڤ بیەوێ کارێ بکات، لەو کاتەدا خوا بیەوێ و، ئەگەر لەو کاتەدا خوا نەیەوێ، کارەکەی بۆ نەکرێ، لە ڕاستییدا بەوە حاڵەتی جەبر ڕوودەدا، چونکە لە بەرانبەر ویستی خوادا، ویستی مرۆڤ هیچ نیە!! دەڵێین: نەخێر، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئێوە نایەتەوە یادتان و پەند وەرناگرن، مەگەر خوا بیەوێ، واتە: خوا بیەوێ کە ئێوە بتوانن بێتەوە یادتان و، بشتوانن نەیەتەوە یادتان، یان بتانەوێ پەند وەربگرن، پەندی لێ وەربگرن و، نەتانەوێ پەند وەرنەگرن، پەند وەرنەگرن، واتە: خوا ﷻ بە ویستی ڕەهای خۆی، ئەو ویستەی بە ئێوە داوە، کە بتوانن چاکەو خراپەی پێ هەڵبژێرن.

لەو بارەوە بە باشم زانی ئەم عیبارەتەی (محمد حسین طباطبائي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، بێنم، دەڵێ: (هذا دَفْعٌ لِمَا يُمْكِن أن يَتوهَّمُوه من قَوْله تَعالَى: ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾ أنَّ الأمْرَ إليْهِم، وَأنَّهَمْ مُسْتَقِلُّون فـي إرَادَتِهِمْ وَمَا يَتَرَتَّبُ عَلَيْهَا مِنْ أَفْعَالِهِمْ، فَإنْ لَمْ يَشَاءوُا الذِّكْرَ، وَلَمْ يَذْكروا، غَلَبُوهُ تَعالَى فِيمَا أَرَاد، وَأعْجَزُوُه فِيمَا شَاءَ مِنْ ذِكرِهِم.

وَالمُحَصَّلُ مِنَ الدفْعِ أنَّ حُكْمَ القَدَرِ جَاء فـي أفْعَالِهِمْ كَغَيْرِهَا مِنَ الحَوَادِث، وَتَذَكُّرهُم إنْ تَذَكَّروا، وَإنْ كَانَ فِعْلًا اخْتِيْارِيّاً صَادِرَاً عَنْهَم بِاخْتِيَارِهِم مِنْ غَيْرِ إكْرَاه، فَالْمَشِيْئَةُ الإلَهِيَّةُ مُتَعَلِّقَة بِه بِمَا هُوَ اخْتِيَارِيٌّ، بِمَعْنَى أنَّ الله تَعَالَى يُرِيْد بِإرَادَةٍ تَكْوِيْنِية أنْ يَفْعَل الإنْسَانَ الفِعْلَ الفُلَانِّي بِإرَادَتِه وَاخْتِيَارِه، فَالْفِعْلُ الإخْتِيَارِيُّ مُمْكِنٌ بِالنِّسْبَة إلى الإنْسَان، وَهُوَ بَعَيْنِه مُتَعَلِّقٌ الإرَادَة الإلَهِية، ضَرُورِيُّ التَّحَقُّقِ بِالنِّسْبَة إليْهَا، وَلَوْلَاها لَمْ يَتَحَقَّقْ).

واتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، {لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ﴿٣٠﴾ ﴾الإنسان}، ئەمە بۆ پاڵپێوەنان و دوورخستنەوەی ئەوەیە، کە ڕەنگە بە خەیاڵیان دا بێ کاتێ خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾، هەر کەسێ بیەوێ پەند وەردەگرێ (لە قورئان، یان خوای دەکەوێتەوە یاد)، بۆ ئەوەی وا نەچێتە خەیاڵیانەوە کارەکە تەنها بەدەست ئەوانەو، ئەوان سەربەخۆن لە ویستنیانداو، لەوەدا کە لەسەر ویستنەکەیان بنیات دەنرێ، هەر کات ویستیان خوایان دەکەوێتەوە یاد، یان پەند لە قورئان وەردەگرن و، بەسەر ویستی خوای بەرزدا زاڵ دەبن، لەوەدا کە ویستوویەتی و خوا دەستەوستان دەکەن، {یانی: ئەگەر نەیانویست، یاد ناکەنەوەو پەند وەرناگرن و بەسەر خوادا زاڵ دەبن، کە ویستوویەتی یاد بکەنەوە، بە پێچەوانەشەوە: ئەگەر خوا ﷻ نەشیویستبێ یاد بکەنەوە، ئەوان ئەگەر بیانەوێ، هەر یاد بکەنەوە، یان هەر پەند وەربگرن}.

---

(١ ) الميزان: ج:٢٠، ص: (١٠٠ ، ١٠١).

پوختەی ئەوەش کە لەو بەرپەرچدانەوەیە دێتە دەست، ئەوەیە کە قەدەری خوا ﷻ لە کردەوەکانیاندا، وەك قەدەری خوایە لە هەموو ڕووداوەکانی دیکەدا، بۆیە پەند وەرگرتنیان، ئەگەر پەند وەربگرن، هەرچەندە کارێکی ئازادانەی خۆیانە ئەنجامی دەدەن و، بە ویستی ئازادانەی خۆیانە بەبێ ناچارکران، بەڵام ویستی خوا ﷻ پەیوەستە بەو کردەوانەوەی مرۆڤ بە ویستی ئازادانەی خۆی ئەنجامیان دەدا، واتە: خوای بەرز بە ویستی تەکوینیی خۆی، ویستوویەتی: مرۆڤ فڵان کارە بە ویستی خۆی و بە هەڵبژاردنی خۆی بکات.

کەواتە: کارە هەڵبژێردراوەکە کە مرۆڤ ئەنجامی داوە، بە نسبەت مرۆڤەوە، کارێکی گونجاو (ممکن)ەو دەگونجا ببێ و، دەگونجا نەبێ، بەڵام هەر ئەوەیە کە ویستی خوای پەروەردگاریش پێوەی پەیوەستە، ئنجا ئەگەر ویستی خوای عزوجل نەبووایە، کە لە ئەزەلدا ویستوویەتی مرۆڤ بە هەڵبژاردنی خۆی کارەکان بکات، ئەو کاتە ئەو کارەی مرۆڤ نەدەبوو. (چ چاك بێ، چ خراپ بێ).

دەڵێم بە کورتیی: خوا ﷻ لە ئەزەلدا ویستوویەتی مرۆڤەکان بە ویستی ئازادانەی خۆیان بڕوا بێنن، یان بڕوا نەهێنن، ئنجا کە بڕوایان هێنا، چاکە بکەن بەپێی بڕوایەکەیان، یاخود گوناح بکەن، کە بڕواشیان نەهێنا، بەهەمان شێوەو، بڕوا نەهێنان هەر خراپەکاریی پەلکێش دەکات، ئنجا ئەو ویستنەی خوای پەروەردگار کە لە ئەزەلدا ویستوویەتی مرۆڤ ئازاد بێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾، واتە ئێوە ناتوانن پەند وەربگرن و یادی خوا بکەن، مەگەر خوا بیەوێ، بەڵام خوا لە ئەزەلدا ویستوویەتی کە مرۆڤەکان بتوانن بە ویستی ئازادانەی خۆیان، یادی خوا بکەن، یان یادی نەکەن.

کەواتە: ئەگەر یادی خواتان کرد، ئەوە بە ویستێکی بەشیی **(جزئي)** ئەو یادی خوایەتان کردوە، یاخود ئەو پەندو عیبرەتەتان لە قورئان وەرگرتوە، خواش ئەو ویستە جوزئییەی بۆ ڕەخساندوون، بە ویستی گشتیی خۆی، ئەگەر

یادی خواشتان نەکرد، بە ویستی ئازادانەی خۆتان، یان پەندتان لە قورئان وەرنەگرت، بەو ویستە جوزئییەی خوا پێی داون و، بەو هەڵبژاردنە جوزئییەی خوا پێیداون بۆ تاقیکردنەوەتان، ئێوە ئەو پەندەتان وەرنەگرتووەو ئەو یادی خوایەتان نەکردوە.

کەواتە: لە هەردوو حاڵاندا ویستی گشتیی و ڕەهای خوا لە ئارادایە، بەڵام ویستی خوا، نەك بۆ تاك تاكی کردەوەکان، لەو کاتەدا کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدا، بەڵکو خوا ﷻ مرۆڤی وا خوڵقاندوە ویستێکی پێداوە، بەو ویستە دەتوانێ چاکە بکات و خراپە بکات.

ئەم وێنەیە تەنیا بۆ نیزیکخستنەوەیە لە عەقڵ:

مامۆستایەك قوتابییەکی خۆی فێری زانیاریی بکات، هەموو جۆرەکانی زانیاریی و، بینێرێ بۆ شوێنێك کە هەموو ئەو پرسیارانەی لێی دەکرێن، بتوانێ وەڵامیان بداتەوە، وەڵامەکانیانی فێر بکات، ئنجا بینێرێ، کەواتە: لە کاتێکدا هەر پرسیارێکی لێ دەکرێ، ئەو وەڵام دەداتەوە، بەپێی ئەو زانیارییەی مامۆستایەکەی فێری کردوە، وەڵام دەداتەوە، بەڵام مامۆستایەکەی لەوێ نیە، بەردەوام پێی بڵێ: ئاوا بڵێ، بەڵکو یەکجار فێری کردوەو ئەویش وەڵام دەداتەوە، خواش ﷻ لە ئەزەلدا کە مرۆڤی خوڵقاندوە، ویستێکی پێداوە، بتوانێ بەو ویستەو، بەو هەڵبژاردنەی خۆی چاکە بکات، یان خراپە بکات، بۆیە هەر چاکەیەك و، هەر خراپەیەك بکات، بەپێی ئەو ویستەیە کە خوا پێیداوە، کەواتە: ویستە جوزئییەکەی مرۆڤ، لە ژێر ڕکێفی ویستە گشتییەکەی خوای پەروەردگار دایە، هەرچەندە کاراو سەربەخۆو ئازادیشە!.

دیارە مەسەلەی قەدەر یەکجار وردو ئاڵۆزەو پێم وایە بە یەك وشە ئەو مەتەڵە حەل دەبێ، ئەویش ئەوەیە کە بگوترێ: خوا لە ئەزەلدا دەزانێ کە مرۆڤ چی دەکات و، بە ویستی خوا دەیکات، بەڵام مرۆڤ هەرچی دەیکات یان

نایكات، بـە ویسـتی ئازادانـەی خۆیەتـی و خـوای پـەروەردگار ویسـتێكی جوزئیـی بـە مـرۆڤ داوەو، بـەو ویسـتە جوزئییـە دەتوانـێ چـاك بـكات و خراپـە بـكات، دەتوانـێ ڕاسـت بـڕواو چـەوت بـڕوا.

لـە كۆتایـی ئـەم دەرسـەدا ئـەم دەقـە دێنیـن: {**عَنِ أَنَسٍ رضي الله عنه، «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ٥٦﴾، فَقَالَ: قَدْ قَالَ رَبُّكُم أَنَا أَهْلٌ أَنَّ أُتَّقَى فَلا يُجْعَلَ مَعِي إِلَهًا، فَمَنِ اتَّقَانِي فَلَمْ يَجْعَلْ مَعِي إِلَهًا، فَأَنَا أَهْلٌ أَنْ أَغْفِرَ لَهُ**} (**أخرجه الترمذي ٣٣٢٨، والنسائي ٦٥٠، وابن ماجه ٤٢٩٩، وأبو يعلى ٣٣١٧، وصححه الحاكم، وسكت عنه الذهبي، وقال الترمذيُ: حسن غريبٌ، وقال مُخَرِّجُ أحاديث تفسير فتح القدير للشوكاني ج٥ ص٤٠٤: ضعيفٌ**).

واتـە: ئەنەسـی كـوڕی مالیـك (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ٥٦﴾، دوایـی فەرمـووی: پەروەردگارتـان فەرموویەتـی: مـن شایسـتەی ئـەوەم پارێـزم لـێ بكـرێ، هیـچ پەرسـتراوێك لەگـەڵ منـدا دانەنـرێ، ئنجا هـەر كەسـێك پارێـزی لـە مـن كـردو هیـچ پەرسـتراوی لەگـەڵ منـدا دانەنـان، مـن شایسـتەی ئـەوەم لێـی ببـوورم.

هەڵبەتـە خـوا ﷻ یەكێـك لـە سیفەتەكانی ئەوەیـە كـە كاربەجێیـەو كارزانـە، هەر كەسـە بەپێـی خـۆی مامەڵـەی لەگەڵـدا دەكات، بەڵـێ خـوا ﷻ هەمـوو سیفەتەكانی بـێ سـنوورن، لێبوردنـی خـوا سـنووری نیـە، بەزەیـی خـوا سـنووری نیـە، هەروەهـا هەمـوو سـیفەتەكانی دیكەشـی ڕەهـاو بـێ سـنوورن، بـەڵام خـوا ﷻ هـەر كەسـە بەپێـی خـۆی مامەڵـەی لەگەڵـدا دەكات، وەك دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ٥٦﴾ **الأعراف**، واتـە: بـە دڵنیایـی بەزەیـی خـوا لـە چاكەكارانـەوە نیزیكـە، واتـە: كەسـێك بیـەوێ بەزەیـی خـوای لـێ نیزیـك بـێ، دەبـێ چاكـەكار بـێ، بـەڵام كەسـێك خراپـەكار بـێ، خـوا وەك چـۆن ڕەحمەتـی هەیـە، تووڕەیـی و غەزەبیشـی هەیـە، وەك چـۆن پاداشـتی هەیـە، سزاشـی هەیـە، هـەر بۆیـە هەمـوو

ئەوانـەی دڵـی خۆیـان بـەوە خۆشـدەكەن كـە خـوا بەزەیـی زۆرە، لێبوردنـی زۆرە، چاوپۆشـیی زۆرە، میهرەبانیـی زۆرە، كـە بـە دڵنیایـی وایـە، بـەڵام هەمـوو ئەوانـەی بـەوە خۆیـان هەڵخەڵەتانـدوە، كـە مـادام خـوا بەزەیـی زۆرە، بـا ئێمـەش شایسـتەی بەزەیـی خـوا نەبیـن، خـوا بەزەیـی هـەر پێـمان دادێ!! لـە ڕاسـتییدا شـەیتان كڵاوی لەسـەرناون، چونكـە بێگومـان خـوا كاری نابەجـێ نـاكات، وەك پیرەمێـردی شـاعیر دەڵـێ:

كاكە خوا كاری نابەجێ ناكا     تا كێو نەبینێ بەفری تێ ناكا

دەبـێ شایسـتەی بەزەیـی خـوا بـی، ئنجـا خـوا بەزەیـی پێتـدا دێ، بـەڵام ئەگـەر كارێك بكـەی شایسـتەی تووڕەیـی و جەزرەبـەو سـزای خـوا بـێ و پێشـت وابـێ: خـوا چاكـەت لەگەڵـدا دەكات، بەهەڵەداچـووی، چونكـە پێچەوانـەی حیكمەتـی خوایـە، بـەو جـۆرە مامەڵـە بـكات.

بـە نسـبەت مەسـەلەی قەدەریشـەوە كـە شـتێكمان لـێ باسـكرد، دووبـارەی دەكەمـەوە: مەسـەلەی قـەدەر، وەك لـە عەقیـدەی (**الطحاوي**)یـش دا هاتـوە، نهێنیـی خوایـە لـە دروسـتكراوەكانیداو، تواناكانـی مـرۆڤ سـنووردارن و عەقڵـی مـرۆڤ ناتوانـێ سیفەتە بـێ سنوورەكانی خـوا لـە خۆیـدا جـێ بكاتـەوەو وەخۆییـان بگـرێ، قەدەریـش لـە لایەكـەوە پەیوەسـتە بـە زانیاریـی ئەزەلیـی و بـێ سـنوورو بـێ كۆتایـی خـواوە، هەروەهـا پەیوەسـتە بـە حیكمەتـی بـێ سـنووری خـواو، بـە ویسـتی بـێ سـنوورو ڕەهـای خـواو، دەسـەڵاتی بـێ سـنوورو ڕەهـای خـوای پـەروەردگارەوە، بـەڵام ئـەوەی ئێمـە لـە ئایەتەكانـی قورئـان و فەرمایشـتەكانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دا بۆمـان دەردەكـەوێ، وەك لـە كتێبـی پێنجـی مەوسـووعەی (ئیـمان و عەقیـدەی ئیسـلامیی)دا باسـم كـردوە، ئیـمان بـە قـەدەر، پوختەكـەی ئەوەیـە كـە تـۆ دڵنیابـی و، لـە سـەدا سـەد (١٠٠/١٠٠) بزانـی كـە: خـوا هیـچ شـتێك نەبـووە نەیزانـێ و، ویسـتی خـوا ﷻ دەوری هەمـوو شـتێكی داوەو، خـوا هەمـوو شـتێك دەتوانـێ، بـەڵام وێـڕای ئـەوەش خـوا خاوەنـی ئەوپـەڕی حیكمـەت و لێزانییـەو، خـوا ﷻ كـە

ویستەكەی ڕەهایەو هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نابێ، ئەو ویستە ڕەهایەی خوا، ویستوویەتی مرۆڤێك بخوڵقێنێ، هەروەها جندیش، كە خاوەنی ویستێك بن، بەو ویستەیان بتوانن چاكە بكەن و خراپە بكەن: ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾﴾ **الكهف**، وەك چۆن خوا ویستێكی ڕەهای هەیە، مرۆڤیش ویستێكی جوزئیی هەیە، بایی ئەوەی شایستەی پاداشت و سزا بێ.

ئنجا كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ﴿٣٠﴾﴾ **الإنسان**، یان لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾، ناتانەوێ تاكو خوا نەیەوێ، بیرتان ناكەوێتەوە تاكو خوا نەیەوێ، مەبەست پێی ئەوەیە كە خوا لە ئەزەلدا وایداناوە تۆ بتوانێ بتەوێ چاكە بكەی و، بتوانی بێتەوە یادت و پەند وەربگری، یان بە پێچەوانەوە: بتوانی نەتەوێ چاكەی بكەی و بتەوێ خراپە بكەی.

ئنجا كە دەگوترێ: ئایا خوا لە ئەزەلدا نەیزانیوە، كە فلانكەس بێبڕوا دەبێ و خراپە دەكات و دەچێتە دۆزەخ، ئنجا ئایا ئەو مرۆڤە چی بۆ دەمێنێتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: خوا لە ئەزەلدا زانیویەتی مرۆڤ بە ویستی ئازادانەی خۆی، ئەو ویستەی خوا پێی داوەو ئازادەو، هیچ كۆت و بەندێكی لەسەر نیە، دەتوانێ بەو ویستەی ئیمان بێنێ، دەشتوانێ كوفر بكات: ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾﴾ **الكهف**، كەواتە: ئەو ویست و خواستە جوزئییەی بە مرۆڤ دراوە، گونجاوە بۆ هەردووك بارەكان، چ بۆ باری ئیمان پێهێنان، چ بۆ باری كوفر كردن، هەروەها بۆ باری ڕاست ڕۆیشتن یان چەوت ڕۆیشتن، كەواتە: كە خوا دەفەرموێ: ناتانەوێ تاكو خوا نەیەوێ، بە دڵنیایی خوا لە ئەزەلدا ویستوویەتی، كە ئێمە بتوانین بمانەوێ چاكە بكەین، یان بمانەوێ خراپە بكەین.

لێرەدا دێینە كۆتایی ئەم دەرسەمان و كۆتایی تەفسیركردنی ئەم سوورەتەش و، سوپاسی بێ پایان و ستایشی شایستەی خوای بەرزی مەزن دەكەین، كە تەوفیقی داین تاكو ئێستا لەسەر ڕوونكردنەوەو چەمك و واتای ئایەتە بەرزو بە پێزەكانی

سـووڕەتە موبارەکەکانـی کۆتـا فەرمایشـتی خـۆی بەردەوامـمان بـکات و، لێشـی داوا دەکەیـن کـە هەتـا کۆتایـی تەفسـیرکردنی قورئـان، لـەو بەخشـش و لوتـف و بەزەییـە بێسـنوورەی خـۆی پێـمان ببەخشـێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە ڕۆژی (٢٤)ی شـەووالی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر: (٢٠٢٠/٦/١٦)ی زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا ﷻ پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (القِيَامَـة)، وەك عادەتـی خۆمـان سـەرەتا دێینـە سـەر پێناسـە و خسـتنەڕووی نێوەڕۆکـی سـوورەتی (القِيَامَـة) و، لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا پێناسـەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەکەیـن:

## پێناسەی سوورەتی (القيامة) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیـا بـە نـاوی سـوورەتی (القِيَامَـة) نـاسراوە، لەبـەر ئـەوەی لـە سـەرەتاکەیەوە، وشـەی (القِيَامَـة) هاتـوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بـە یەکدەنگیـی زانایـان ئـەم سـوورەتە مەککەییـەو، واش پێدەچـێ لـە سـوورەتەکانی سـەرەتای قورئـان بـێ، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە خـوا لـە نێـو ئـەم سـوورەتەدا، بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾، ئـەم ئایەتـە موبارەکانـەش، لێیـان دەفامرێتـەوە، کـە لـە سـەرەتای سرووش بـۆ کرانیـەوە

پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ خوا بەو شێوەیە ڕێنمایی کردوە و، ئامۆژگاریی کردوە، چۆن مامەڵە بکات لەگەڵ دابەزێنرانی وەحییدا، هەروەها ڕیزبەندیی دابەزینیشی ئەوە دەگەیەنێ.

بەڵام ئەو ژمارەیەی دانراوە بۆ ڕیزبەندییەکەی، وا پێدەچێ زۆرتر بێ و، پێم وایە ئەم سووڕەتە زووتر دابەزیوە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

زۆربەی ژمێرەرانی ئایەتەکان قورئان، ژمارەی ئایەتەکانی بە سی و نۆ (٣٩) دادەنێن، بەڵام هەندێکیش کە ئەهلی کوفەیان لە نێودان بە چل (٤٠)یان داناوە و، زیاتریش ژمارە چل (٤٠) تەبەنیی کراوە، لەو موصحەفانەدا کە لەبەر دەستی ئێمەدان.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە دابەزین و لە موصحەف دا:

لە دابەزین دا ژمارەی سی و یەك (٣١)یان بۆ داناوە، واتە: پێش سووڕەتی (**الهُمَزة**)و، دوای سووڕەتی (**القارعة**)، لە موصحەفیشدا ژمارە پەنجاو حەوت (٧٥)، هەڵبەتە ڕیزبەندیی سووڕەتەکان لە دابەزین داو بەو شێوەیە ڕیزکردنیان، شتێکی ئیجتیهادییە، واتە: تەوفیقییە تەوقیفیی نیە، بۆیە دەگونجێ قسەی تێدا بکرێ و زانایان زۆریان قسە، لەو بارەوە کردوە، منیش ڕام وایە ڕیزبەندیی دابەزینی ئەم سووڕەتە، دەبێ لە سی و یەك (٣١) کەمتر بێ و پێم وایە ئەم سووڕەتە لە سووڕەتە سەرەتایەکانە کە دابەزێندراون.

چونکە هەر لە سەرەتاوە خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ فێر کردوە، چۆن مامەڵە بکات لەگەڵ دابەزێنرانی وەحییداو، چۆن ئارام بگرێ،

تاکو جیبریل ئایەتەکانی بۆ دەخوێنێتەوە و، پەلە نەکات لە دەم و زار پێ جووڵاندنیان و، مەترسیی ئەوەی نەبێت نەتوانێت چاك وشەکان، کۆنترۆڵ بکات و، لەبەریان بکات، دوایی لە بیری بچنەوە، خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا ئەم دڵنیاییەی پێداوە، وەك و دوایی باسی دەکەین، بۆیە من پێم وایە کە دەگونجێ، ڕیزبەندییەکەی زۆر لەوە کەمتر بێت، بۆ وێنە: لە هەشت نۆ دە سوورەتەکەی سەرەتا بێت.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە ناوو نێوەڕۆکی زۆر پێکەوە جووتن، تەوەری سەرەکیی ئەم سوورەتە، بریتیە لە باسی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەتەوە، ئاماژەیەکیش بە حاڵەتی مردن و سەرەمەرگی مردنی بابای بێبڕوا کراوە، کە ئەویش قۆناغێکە بەرەو ژیانی بەرزەخ و ڕۆژی دوایی.

شایانی باسە لە میانی ئەو باس و خواسەدا، ئامۆژگاریی پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە بۆ گوێگرتن لە وەحیی و، وەرگرتنی لە جیبریل، لە کاتێکدا بەسەریدا دەخوێنێتەوە، لە کۆتاییشدا خوای پەروەردگار، بە سەرزەنشتکردنەوە ڕەخنەی لە بابای کافر گرتوە، کە چۆن پێیوایە پشتگوێ دەخرێ و سزاو پاداشتی نابێ، لە حاڵێکدا لە تۆویلکەیەکەوە هاتوە، بۆتە خوێن پارە، پاشان نێرو مێ، ئایا خوایەك ﷻ، پەروەردگارێك کە بەو هەموو قۆناغانەدا هێناویەتی، ناتوانێ زیندووی بکاتەوە؟ بیژیەنێتەوە؟ بێگومان، با.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە شەش (٦) تایبەتمەندیی ئەم سوورەتەمان کەوتوونە بەرچاو:

١- سوێند خواردن بە (**النَّفْس اللَّوَّامَة**): ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ۝٢﴾، واتە: خودێکی سەرکۆنەکەر و ڕەخنەگر، کە لە هەموو قورئان دا تەنها لێرەدا هاتوە.

٢- باسی ڕێکخستنەوەی سەرەپەنجەکان: ﴿بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ۝٤﴾، هەرچەندە هەندێکیشیان گوتوویانە: (**بَنان**) کۆی (**بَنَانَة**)یە، بە مانای پەنجە هەمووی دێ، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: بە مانای (**أنامل**) دێ، واتە: سەرە پەنجەکان (**رؤوس الأصابع**).

٣- باسی کۆکرانەوەی خۆرو مانگ لە ئاخیر زەماندا: ﴿وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ۝٩﴾.

٤- هۆشداریدان بە پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە کاتی وەرگرتنی قورئاندا پەلە نەکات: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ۝١٦﴾، هەڵبەتە لە سوورەتی (**طه**)شدا خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥ ۝١١٤﴾، پەلە مەکە لە قورئان، بەرلەوەی سرووشەکەی بۆ لای تۆ تەواو بێ، بەڵام لێرەدا وردەکاریی زیاتری لەو بارەوە گوتوە، لەوێ بەشێکی لە ئایەتێك بۆ تەرخانکراوە، لە سوورەتی (**طه**)دا، بەڵام لێرەدا لە دوو توێی چوار ئایەتدا، خوا ﷻ ئەوەی باسکردوە، وا پێدەچێ ئەوەی سوورەتی (**طه**)، دوایی هەر جەختکردنەوەی ئەوە بێ، کە لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە، وەك بیرخستنەوەی پێغەمبەری خاتەم بێ، بۆ ئەوەی پەلە نەکات.

٥- باسی تەماشاکردنی بڕواداران بۆ خوا، لە ڕۆژی قیامەتدا، واتە: بینینیان بۆ خوا ﷻ بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، بەو شێوەیە نا کە ئێستا بۆ ئێمە زانراوەو، بەو توانا سنووردارانەی ئێمە نا، بەو توانا جەستەییە خاکییانە، ئەویش لە ئایەتی: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ۝٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ۝٢٣﴾، لەو ڕۆژەدا چەند ڕوویەك درەوشاوەو پڕشنگدارن، تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەکەن.

٦- چەند وتەعبیرێکی ناوازە، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون، بەپێی ئەوەی ئێستا لە یادمە: یازدە دانەن:

١- ﴿ بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴾، بە (بَرَقَ)ش خوێنراوەتەوە: (بَرِقَ البَصَر)، (بَرِق) واتە: سەرسام بوو، یان چاو ئەبڵەق بوو، بەڵام (بَرَقَ) بە مانای تیشکی دا، بریقەی دا.

٢- ﴿ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴾، مانگ خەفە بوو، شەوقی نەما.

٣- ﴿ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴾، نەخێر هیچ پەنایەك نیە، هیچ شوێنێك و پەناگەیەك نیە مرۆڤ خۆی تێدا پەنا بدات.

٤- ﴿ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾، هەرچەندە بیانووەکانی خۆشی بهاوێ، فڕێ بدات.

٥- ﴿ نَّاضِرَةٌ ﴾. درەوشاوە.

٦- ﴿ بَاسِرَةٌ ﴾. گرژو مۆن.

٧- ﴿ فَاقِرَةٌ ﴾، بەڵایەکی بێ ڕەزا، پشت شکێن، کەمەر شکێن.

٨- ﴿ ٱلتَّرَاقِىَ ﴾، کۆی (تَرقوة)یە، هەموو مرۆڤێك دوو (تَرقوة)ی هەن، بە کوردیی چۆڵەمەی پێدەڵێن، ئەو دوو ئێسقانەی لە دەوری قوڕگن.

٩- ﴿ مَنْ رَاقٍ ﴾، کێ چارەسەری دەکات، کێ دوعای بۆ دەکات، یاخود کێ بەرزی دەکاتەوە ڕووحەکەی.

١٠- ﴿ وَٱلْتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴾، لاق لە لاق ئاڵا، ئەو کاتەی کە مرۆڤ دەکەوێتە حاڵەتی گیانەڵا، لاقەکانی تێك دەئاڵقێن.

١١- ﴿ يَتَمَطَّىٰٓ ﴾، (**يتبختر**) ئەوەیە کە بە فیزو کەشخەوە و بە خۆ ڕاوشاندنەوە بڕوا، وشەی (**مَطى**) بە مانای پشت دێ، ﴿ يَتَمَطَّىٰٓ ﴾، پشتی خۆی بادەداو فیزو کەشخە دەکات.

١٢- ﴿ سُدًى ﴾، (**مُهْمَل**) پشتگوێ خراو، وێڵکراو.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان:

ئێمە كۆی چل ئایەتەكە دەكەین بە یەك دەرس، چونكە هەمووی یەك بابەتی پێكەوە پەیوەستە و باسی ڕۆژی دواییە، بە هەردوو قۆناغی كۆتایی هاتنی ژیانی دنیاو، هەڵسێنرانەوەو زیندووكرانەوەی مردووانەوە، واتە: ئاخیر زەمان و قیامەت، هەروەها بە پێشەكییەكەشیانەوە كە بریتیە، لە كەوتنە حاڵەتی گیانەلاو سەرەمەرگی مرۆڤ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

وەك پێشتر گوتمان: کۆی چل (٤٠) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە دەکەینە یەك دەرس، کە دوازدە (١٢) بابەتی یەك لە دوای یەك دەگرنە خۆیان:

١- باسی مسۆگەربوونی زیندووکرانەوە لە ئایەتەکانی: (١ - ٤) دا.

٢- هۆکاری نکوولّییکردنی بێبڕوایان لە قیامەت بریتیە لە تاوانباریی گوناهبارییان، لە ئایەتەکانی: (٥ و٦)دا ئەم ڕاستییە خراوەتە ڕوو.

٣- هەندێك لە ڕووداوەکانی ئاخیر زەمان و، بێ دەرەتانیی مرۆڤی بێبڕوا، لە ئایەتەکانی: (٧ - ١٢)دا.

٤- هەواڵپێدرانی مرۆڤی کافر بە کردەوەکانی و، بێ سوود بوونی پۆزش و بیانووەکانی، لە ئایەتەکانی: (١٣ - ١٥)دا.

٥- ڕێنمایی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە وەرگرتنی وەحیی دا پەلە نەکات و، زار بە وشەکان نەجووڵێنێ، لە ترسی ئەوەی چاك فەرمایشتەکەی خوا وەرنەگرێ و، دڵنیایی پێدانی لەوە کە خوا قوڕئان لەعەقڵ و دڵیدا کۆدەکاتەوە و بۆشی ڕووندەکاتەوە، لە ئایەتەکانی: (١٦ - ١٩)دا.

٦- حەزکردن و پێخۆشبوونی مرۆڤان لە دنیاو، پشتگوێ خستنی قیامەت، ئەمیش لە ئایەتەکانی: (٢٠ و٢١)دا.

٧- ڕووگەش بوونی بڕواداران و تەماشاکردنیان بۆ خوای پەروەردگاریان، لە ڕۆژی دواییداو لە بەهەشتدا، لە ئایەتەکانی: (٢٢ و٢٣)دا.

٨- نائومێد بوونی بێبڕوایان و، دڵ پڕ بوونیان لە سام و هەژمەت و ترس و لەرز، لە ئایەتەکانی: (٢٤ و ٢٥)دا.

**٩-** باسی سەرە مەرگی بابای بێبڕوا، لە ئایەتەکانی: (٢٦ - ٣٠) و ئەوەی لێی ڕوودەدا لە حاڵەتی سەرەمەرگ و گیانەڵادا.

**١٠-** خستنەڕووی خراپترین کردەوەکانی بابای بێبڕوا، کە چوار کردەوەی سەرەکین، لە ئایەتەکانی: (٣١ - ٣٣)دا.

**١١-** نکووڵییکردن لە بێبڕوایی کافران، بە زیندووکردنەوەو سزاو پاداشت، واتە: ڕەخنەگرتن و نکووڵییکردن لە بێبڕوایی کافرەکان، بەرانبەر بە زیندووکرانەوەو هەبوونی سزاو پاداشت، لە ئایەتی ژمارە (٣٦)دا.

**١٢-** بەڵگەهێنانەوە لەسەر زیندوو کرانەوە لە ئایەتەکانی: (٣٧ - ٤٠)دا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ٣ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ٤ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ٥ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ٦ فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ٧ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ٨ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ٩ يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ ١٠ كَلَّا لَا وَزَرَ ١١ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمُسۡتَقَرُّ ١٢ يُنَبَّؤُاْ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ١٣ بَلِ ٱلۡإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ بَصِيرَةٞ ١٤ وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ١٥ لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ١٧ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ١٨ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ ١٩ كَلَّا بَلۡ تُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ ٢٠ وَتَذَرُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ٢١ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ٢٣ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذِۭ بَاسِرَةٞ ٢٤ تَظُنُّ أَن يُفۡعَلَ بِهَا فَاقِرَةٞ ٢٥ كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ٢٦ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ٢٧ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ ٢٨ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ٢٩ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ٣٠ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ٣١ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ٣٢ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ٣٣ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰ ٣٤ ثُمَّ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰٓ ٣٥ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ٣٦ أَلَمۡ

يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، نەخێـر (ئـەوەی بێبڕوایـان دەیڵێـن، کـە زینـدوو ناکرێنـەوە ڕاسـت نیـە)، سـوێند دەخـۆم بـە ڕۆژی هەڵسـانەوە ﴿١﴾ هەروەهـا وانیـە (کـە دەڵێـن) سـوێند دەخـۆم بـە نەفسـی زۆر سـەرکۆنەکار (زینـدوو دەکرێنـەوە) ﴿٢﴾ ئایـا مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) پێـی وایـە ئێسـکەکانی کۆناکەینـەوە! ﴿٣﴾ بـا، بـە توانایـن سـەرە پەنجەکانیشـی ڕێکبخەینـەوە ﴿٤﴾ بەڵکـو مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) دەیـەوێ، لـەو (تەمـەن)ەدا کە لـە پێشـیەتی، تاوانباریی بـکات (و لەسـەر خراپەکاریی بـەردەوام بـێ) ﴿٥﴾ (بۆیـە بـە نکووڵییکردنـەوە) دەپرسـێ: ڕۆژی هەڵسـانەوە کەیـە؟ ﴿٦﴾ هـەر کات چـاو ئەبڵـەق بـوو ﴿٧﴾ مانگیـش خەفـەو بـێ شـۆق بـوو ﴿٨﴾ خـۆرو مانگیـش کۆبوونـەوە (ئـەو ڕۆژە مەزنـە دێ) ﴿٩﴾ (لـەو ڕۆژەدا) مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) دەڵـێ: کـوا هەڵاتـن؟ ﴿١٠﴾ بـا وازبێنـێ (ڕێـی هەڵاتـن نیـە و) هیـچ پەنایـەك نیـە ﴿١١﴾ لـەو ڕۆژەدا سـەقامگیربوون (و گیرسـانەوە)، تەنیـا بـەرەو لای پەروەردگارتـە ﴿١٢﴾ لـەو ڕۆژەدا مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) هەواڵـی پێـدەدرێ، بـەوەی پێشیخسـتوەو دوای خسـتوە ﴿١٣﴾ بەڵکـو مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) بەسـەرخۆیەوە چاودێـرو شـایەدە ﴿١٤﴾ هەرچەنـدە پـۆزش و بیانووەکانیشـی بـاوێ (و بخاتـەڕوو) ﴿١٥﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ! لـە کاتـی سروش بـۆ کرانـت دا)، زمانتـی پـێ مەجووڵێنـە، تاکـو پەلـەی لـێ بکـەی ﴿١٦﴾ بـە دڵنیایـی کۆکردنـەوەی (قوڕئـان لـە عەقڵ و دڵـت دا)و خوێندنـەوەی لەسـەر ئێمەیـە ﴿١٧﴾ ئنجـا هـەر کات خوێندمانـەوە، شـوێن خوێندنەوەکـەی بکـەوە ﴿١٨﴾ دواییـش بـە دڵنیایـی ڕوونکردنەوەکـەی لەسـەر ئێمەیـە ﴿١٩﴾ وازبێنـن (ئـەی بێبڕوایـەکان!)، بەڵکـو

(هـۆی بێبڕواییتـان ئەوەیـە کـە) ژیانـی پەلـەو زوو تێپـەڕ(ی دنیا)تـان خۆشـدەوێ ﴿٢٠﴾ (ژیانـی) مەنزڵـگای کۆتاییـش واز لـێ دێنـن ﴿٢١﴾ لـەو ڕۆژەدا ڕووانێـك گـەش و درەوشـاوەن ﴿٢٢﴾ تەماشـاکەری پەروەردگاریانـن ﴿٢٣﴾ ڕووانێکیـش هـەن گـرژو مۆنـن ﴿٢٤﴾ (خاوەنەکانیـان) پێیـان وایـە (بەڵایەکـی) کەمـەر شـکێنیان بەسـەر دێ ﴿٢٥﴾ بـا واز بێنـن هـەر کات (یەکیـان) ڕووحیـی گەیشـتە چۆڵەمـە (ئێسـقانە)کانی (سـەروو سینە) ﴿٢٦﴾ گوتـراش: کـێ نوشـتەی (چارەسـەری) بـۆ دەکات؟ ﴿٢٧﴾ ئەویـش پێی وابوو ئـەوە (حاڵەتـی) جیابوونەوەیـە ﴿٢٨﴾ هەروەهـا لاقیـش لـە لاق ئـاڵا ﴿٢٩﴾ لـەو ڕۆژەدا بـردن و ئامادەکـردن تەنیـا بـۆ لای پەروەردگارتـە ﴿٣٠﴾ ئنجـا ئـەو کەسـە (بێبڕوایـە) نـە (بـڕوای بـە پێغەمبـەر هێنـاوەو) بـە ڕاسـتیی دانـاوەو نـە نوێـژی کـردوە ﴿٣١﴾ بەڵکـو (پێغەمبـەرو پەیامەکـەی) بـە درۆ دانـاوەو پشـتی هەڵکـردوە ﴿٣٢﴾ دواییـش بـە فیـزو خۆبادانـەوە چۆتـە لای خێـزان و کـەس و کاری ﴿٣٣﴾ سـزای سـەخت و هـاوار بـۆ تـۆ، سـزای سـەخت و هـاوار ﴿٣٤﴾ ئنجـا سـزای سـەخت و هـاوار بـۆ تـۆ، سـزای سـەخت و هـاوار ﴿٣٥﴾ ئایـا مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) پێـی وایـە، بـە پشـتگوێ خراویـی وازی لـێ دەهێـنرێ؟ ﴿٣٦﴾ ئایـا (سـەرەتای دروسـتبوونی) تۆویلکەیـەك نەبـوو لـە تۆوێـك کـە دەڕێـژرێ؟ ﴿٣٧﴾ دوایـی خوێنپارەیـەك بـوو (خـوا) دروسـتیکردو ڕێکیخسـت! ﴿٣٨﴾ ئنجـا دوو جووتـی نێـرو مێـی لـێ پەیـدا کـردن ﴿٣٩﴾ ئنجـا ئایـا ئـەو (بەدیهێنـەرە مـەزن)ە، بـە توانـا نیـە کـە مـردووان بژیەنێتـەوە؟ (ئێمـەش دەڵێیـن: بـا، لەسـەر ئـەوە لـە شـایەدانین) ﴿٤٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱللَّوَّامَةِ): ڕێژگەی زێدەڕۆییە، لە (لائِم)ەوە هاتوە، (لائِم): لۆمەکەر، ڕەخنەگر، سەرکۆنەکەر، **(اللَّومُ: عَذْلُ الإنْسَانِ بِنِسْبَتِهِ إلى مَا فِيْه لَوْمٌ، يُقَالُ لُمتُهُ فَهُوَ مَلُومٌ، وألَامَ فَهُوَ مُليْمٌ، أي إسْتَحَقَّ اللَّوْمَ، وَاللَّوَّامَةُ صِيْغَةُ المُبَالَغَةِ مِنْ لائِم)**، (لَوْمُ): بریتیە لە ڕەخنەگرتن لە مرۆڤ، بە هۆی پاڵدانی بۆ شتێك، کە جێی ڕەخنەو گلەییە، **(لُمْتُهُ فَهُوَ مَلُومٌ)** بە کوردییش ئێمە هەر بەکاری دێنین، دەڵێین: لۆمەم کرد، واتە: گلەییەم لێ کرد، ئەو گلەیی لێکراوە، بەڵام کە دەگوترێ: **(أَلَامَ فَهُوَ مُليْمٌ)**، واتە: کارێکی کرد کە ڕەخنەی لێ بگیرێ، لۆمە بکرێ، شایستەی گلەیی و لۆمە لێکردن بێ، وشەی **(اللَّوَّامَة)** وەك گوتمان: ڕێژگەی زێدەڕۆییە لە **(لاَئِم)** واتە: ڕەخنەگر، سەرکۆنەکەر، **(لَوَّامَة)** زۆر ڕەخنەگر.

(بَنَانَهُۥ): **(بَنَانَ: جَمْعُ: بَنَانَة، بَنَانَة أي: أَطْرَافُ الأَصَابِع)**، سەری پەنجەکان، سەرە پەنجەکان پێیان دەگوترێ: **(بَنَانَة)**، بە یەکێکیان **(بَنَانَة)** دەگوترێ و بە کۆ **(بَنَان)**.

(لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ): بۆئەوەی تاوان بکات لەوەی لە پێشیەوەیەتی، **(ظَرْفٌ بِمَعْنَى قُدَّام، وَيُسْتَعْمَلُ اسْمَ فِعْلٍ بِمَعْنَى إحْذَر وَتَبَصَّر: أَمَامَك، وَفَجَرَ يَفْجُرُ فُجُوراً، انْبَعَثَ فِي المَعَاصِي غَيْر مُكتَرِثٍ، وَفَجَرَ أَمْرُ القَوْمِ أي: فَسَدَ، وفَجَرَ فِي يَمِنِهِ أي: كَذَبَ)**، وشەی **(أَمَام)** زەڕفە بە مانای پێشەوە دێ، وەك **(قُدَّام)**، بەکاریش دەهێنرێ، وەك ناوی کردار، ئەگەر بگوترێ: **(أَمَامَكَ)** واتە: وریا بە، ئاگات لە خۆت بێ، وشەی **(فُجُور)**، **(فَجَرَ يَفجُرُ فُجُوَراً)**، چووە نێو گوناهانانەوە، بەبێ ئەوەی گوێی پێ بدات، دەگوترێ: **(فَجَرَ أَمْرُ القَوْم أي: فَسَدَ)**، کاری خەڵکەکە تێکچوو، **(وفَجَرَ فِي يَمِنِه أي: كَذَبَ)**، واتە: لە سوێندەکەیدا درۆی کرد.

(أَيَّانَ): **(عِبَارَةٌ عَن وَقْتِ الشَّيءِ وَيُقَارِبُ مَعْنَى: مَتَى، أَصْلُهُ: أَيُّ أَوَانٍ أي: أيّ وَقْتٍ،** ﴿أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾، ڕۆژی هەڵسانەوە کەنگێیە، دەڵێ: **(أَيَّانَ)**: بریتیە لە کاتی

شـتێك، مانایەكـەی لـە (مَتَـى)وە نزیكـە، ئەصلـی (أَيَّـانَ): (أيُّ أوَانٍ، أوَان أي: الوَقْـت)، چ كاتێـك، كـەی، كەنگـێ.

(بَرِقَ ٱلْبَصَرُ): (الـبَرْقُ: لَمعـانُ السَّـحَابِ)، (بَـرْق): بریتیـە لـە برووسـكەی هـەور، كـە لـە نێـو هـەور دێتـە دەر، (يُقَـالُ بَـرِقَ وَأَبْـرَقَ)، هـەم (بَـرِقَ)ی بـۆ بـەكاردێ، واتـە: هـەم بـە (ثُـلَاثِي)، هـەم بـە (رُبَاعِـي)، (أَبـرَقَ)، واتـە: برووسـكەی دا، ئەمـە ئەگـەر (برِق) بـێ، بەڵام (بَـرَقَ أي: لَمَـعَ)، واتـە: بریسـكایەوە، ئـەوەی دیكـە واتـە: تیشـكی دایـەوە، (بَرِقَ ٱلْبَصَرُ) (أي: اضْطَرَبَـتِ العَـيْنُ)، چاوەكـە ئەبڵـەق بـوو، یاخـود سـووڕا، بـەڵام (بَـرَقَ البَـصَرُ)، واتـە: چاوەكـە ئەوەنـدە زەق بـوو، بریسـكەی دا.

(وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ): مانگەكـە خەفـە بـوو، بـێ شـوق بـوو، (الخُسُـوفُ للقَمَـر، وَالكُسُـوفُ للشَـمْس)، هەندێـك گوتوویانـە: وشـەی (خُسُـوف) بـۆ مانگـە، بـەڵام (كُسُـوف) بـۆ خـۆرە، هەندێكیـش گوتوویانـە: (كُسُـوف) بـۆ هەردووكیانـە، هەندێكیـش گوتوویانـە: (كُسُـوف) بـۆ هەردووكیانـە، ئەگـەر شـۆقیان نەمـا، بـەڵام (خُسُـوف) بـۆ كاتێكـە، كـە كەمێـك لـە تیشـكەكەیان نەمێنـێ و خەفـە بـبن.

(ٱلْمَفَرُّ): (مَوْضِـعُ الفِـرَار، وَالفِـرَارُ نَفْسُـهُ وَوقْتُـهُ)، ﴿أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ﴾، (لِلثَّلَاثَـة)، (مَفَـرّ) هـەم بـە شـوێنی ڕاكـردن دەگوتـرێ، هـەم بـە خـودی ڕاكـردن، هـەم بـە كاتـی ڕاكـردن، كەواتـە: ﴿أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ﴾، واتـە: ڕاكـردن لـە كوێیـە؟ یاخـود شـوێنی ڕاكـردن، یاخـود كاتـی ڕاكـردن نیـە، نـە كاتـی هەیـە، ڕاكـردن لـەو ڕۆژەدا، نـە شـوێنی هەیـە، نـە خۆشیشـی هەیـە.

(لَا وَزَرَ): (الـوَزَرُ: المَلْجَـأُ الَّـذِي يُلْتَجَـأُ إلَيْـهِ مِـنَ الجَبَـل)، (وَزَر): ئـەو پەناگەیـە كـە لـە چیـا پەنـای پـێ دەبـردرێ، ئەشـكەوت و پەنـاو بنهۆڵێـك، (الـوِزْرُ: الثِّقْـلُ، تَشْـبِيْهاً بـوِزْرِ الجَبَـلِ)، (وِزْر) بـە مانـای قورسـییە، چوێـنراوە بـە قورسـایی چیـاوە.

(ٱلْمُسْتَقَرُّ): (القَـرَارُ وَالثُّبُـوتُ، لِـكُلِّ نَبَـإٍ مُسْـتَقَرٌّ أي: غَايَـةٌ وَنِهايَـة، وَالمَقَـرُّ جَمْـعُ: المَقَـار، مَـكَانُ الإسـتِقْرَار)، (مُسْـتَقَرّ): بـە مانـای چەسـپان، واتـە: لێـرەدا چاوگـە، بـە مانـای چەسـپاویی و سـەقامگیر بـوون، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ ﴾الأنعام، بۆ هـەر هەواڵێـك وەسـتانێك هەیـە، نشـینگەیەك هەیـە، مەبەسـت پێـی ئامانجەكەیـەو شـوێنەكەیە كـە دەیگاتـێ، (مَقَر)یـش كـە بـە (مَقَـار) كـۆ دەكرێتـەوە، شـوێنی تێـدا نیشـتەجێ بوونـە، (مَقَـرّ) لەگـەڵ (مُسْـتَقَرّ) ماناكەیـان یەكـە، بـەڵام (مَقَـر) پیتەكانـی كەمـترن لـە (مُسْـتَقَر)، یاخـود (مُسْـتَقَر) بـە مانـای خـودی سـەقامگیر بـوون و لـێ وەسـتان، بـەڵام (مَقَـر) بـە مانـای شـوێنی تێـدا سـەقامگیر بـوون و تێـدا وەسـتان.

(بَصِيرَةٌ): (البَصِـيْرَةُ: قُـوَّةُ الإِدْرَاكِ وَالفِطْنَـة، وَالعِلْـمُ وَالخُـبْرَة، وَالحُجَّـةُ، وَالرَّقِيْـبُ، وَالعِبْرَة) (بصـيرة): هـەم بـە مانـای هێـزی زانیـن و پـەی پێـبردن دێ، هـەم بـە مانـای زانیاریـی و شـارەزایی دێ، هـەم بـە مانـای بەڵگـە دێ، بـە مانـای چاودێـر دێ، هەروەهـا بـە مانـای پەنـد و عیبرەتیـش دێ.

(مَعَاذِيرَهُۥ): (عَـذَرَ فُلَانـاً فِيْـمَا فَعَلَـهُ عُـذْراً وَمَعْـذِرَةً: رَفَـعَ عَنْـهُ اللَّـومَ فِيْـه)، دەگوتـرێ: (عَـذَرَ فُلَانـاً فِيْـمَا فَعَلَـهُ عُـذْراً وَمَعْـذِرَةً) واتـە: ڕەخنـەی لـێ نەگـرت و گلەیـی لەسـەر لابـرد، (مَعَاذِيْـر: اسْـمُ جَمْـعِ مَعْـذِرة) (مَعَاذِيْـر) نـاوی كـۆی (مَعْذِرة)یـە، (وَجَمْـعُ مَعْذِرة: مَعَاذِيْـر)، بـەڵام كـۆی (مَعْـذِرة) (مَعَـاذِرة)ە بەبـێ (يـاء)، بـەڵام (مَعَاذِيْـر) نـاوی كـۆی (مَعْذِيْرة)یـە، كـە بـە مانـای پـۆزش و پاسـاو هێنانەوەیـە.

(قُرْءَانَهُۥ): (قِرَاءَتَـهُ)، خوێندنەوەكـەی (قُـرْآن: كِتَـابُ اللـه المنَـزَّلِ عَـلَى مُحَمَّـدٍ ﷺ)، قفەرمایشـتی دابەزێنـدراوی خوایـە بـۆ سـەر موحەممـەد، بـەڵام كـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴾، (أي قِرَاءَتَـهُ)، هـەركات خوێندمانـەوە شـوێن خوێندنەوەكەی بكـەوە.

(نَّاضِرَةٌ): (النَّـضْرَةُ: الحُسْـنُ كَالنَّضَـارَةِ، وَنَـضْرَةُ النَّعِيـم: رَوْنَقُـهُ، وَنَـضَّرَ اللـهُ وَجْهـه أي: حَسَّـنَهُ، وَأَخْـضِرُ نَـاضِرٌ أي: غَـضٌّ حَسَـنٌ) (نَـاضِرَةٌ) یانـی: جوانیـی و چاكیـی وەك (نَضَارَة)،

(نَـضْرَةُ النَّعِيْـم) ڕەونـەق و درەوشـاوەیی، نـازو نیعمـەت، (نَـضَّرَ اللـهُ وَجْهَـهُ) واتـە: خـوا ڕووی ڕەش بـكات، دەگوتـرێ: (أَخْـضَرُ نَّـاضِرً ) سـەوزێكی دڵخۆشـكەر، یـان جـوان و بـە ڕەونـەق.

(بَاسِرَةٌ): (البَـسْرُ: اسْـتِعْجَالُ بِالـشَّيءِ قَبْـلَ أَوَانِـهِ)، (بَـسْر): بريتيـە لـە پەلەكـردن لـە شـتێك پێـش كاتـی خـۆی، هەروەهـا (بَاسِرَةٌ) بـە مانـای (كَالِحَـة)، ڕووە گـرژو مۆنـەكان دێ ﴿ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴾ (بَـسَرَ يَبْـسُرُ بَـسْراً وَبُسُـوراً، أَظْهَـرَ العُبُـوسَ)، واتـە: گـرژی و مۆنـی دەرخسـت.

(فَاقِرَةٌ): (الجَمْـعُ: فَوَاقِـر، الدَّاهِيَـة، الفَقَـارَةُ: وَاحِـدَةٌ مِـنَ عِظَـامِ السِّلْسِـلَةِ العَظْمِيَّـة الظَّهْرِيَـة المُمْتَـدَّةِ مِـنَ الـرَّأْسِ إِلَى العُصْعُـصْ، وَمَجْمُوعُهَـا ثَـلاَثٌ وَثَلاَثُـونَ فِقَـارَة)، (فَاقِـرَة) بـە (فَوَاقِـر) كۆدەكرێتـەوە، واتـە: بـەڵا، بەڵايەكـی بێـڕەزا، لـە چییـەوە هاتـوە؟ (فَقَـارَة) كـە (فَقْرَة)شـی بـۆ بەكاردێنـن، يەكێكـە لـە ئاڵقەكانـی زنجيـرە ئێسـكی پشـت، كـە لـە سـەرەوە تاكـو كلێنجـە درێـژ دەبێتـەوەو، سـی و سـێ بڕگەيـە، كـۆی (فَقَـارَة)ش (فقـارات)ە، دواتريـش زياتـر باسـی دەكەيـن.

(التَّرَاقِيَ): (جَمْـعُ الترْقُـوة، مُقَـدَّم الحَلْـقِ فِي أَعْـلَى الصَّـدْر)، بـە كورديـی چۆڵەمـەی پـێ دەڵێـن، ئێسـكی چۆڵەمـە، ئـەو دوو ئێسـقانەی لەمـلاو لـەولای قوڕگـن، هەمـوو مرۆڤێـك دوو (تَرْقُـوَة)ی هـەن، دوو چۆڵەمـەی هـەن، بـەڵام بۆيـە كـۆ كراوەتـەوە، چونكـە دوانـە (مُثَنَّى)كـەی قوڕسـە بڵێـی: (تَرْقُوَتَـان)، بۆيـە بـە كـۆ هاتـوە، وەك لـە سـوورەتی (التحريـم) هاتـوە، ﴿ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴾، چونكـە (مثنَّى)يـە كەی قورسـە بڵێـی: (فَقَـد صَغَـتَ قَلْبَاكُـمَا).

(رَاقٍ): (رَقِيْـتُ فِي الـدَّرَجِ وَالسُّـلَّمِ، أَرْقَـى رَقِيَـاً وَارْتَقَيْـتُ أَي: صَعَـدْتُ)، كـە بـە پەيـژە يـان قاندرمـە كەسـێك سـەركەوێ، دەگوتـرێ: (رَقِيْـتُ فِي الـدَّرَج)، بـە قاندرمەكـەدا، (وَالسُّـلَم) بـە پەيژەكـەدا، (أَرْقَـى رُقِيَـاً وَارْتَقَيْـتُ)، واتـە: سـەركەوتن، بـەڵام (رَقَيْـتُ مِـنَ الرُّقْيَـةِ)، (رَقَيْـتُ) يانـی: دووعـام بـۆ كـرد، (يُقَـالُ كَيْـف رَقِيُـكَ وَرُقِيَتُـكَ، فَـالأَوَّلُ مَصْدَرُ،

**وَالثَّانِي اسْمٌ**)، هـی یەکەمیـان (**رَقِيْك**)چاوگـە، ئـەوەی دووەمیـان نـاوە.

(**وَٱلۡتَفَّتِ**): (**لَفَـتَ الـشَّيءَ، يَلْفِـتُ لَفْتـاً: لَـوَّاهُ عَـلَى غَـيْرِ وَجْهِـهِ**)، (**لَفَـتَ الـشَّيءَ، يَلْفِـتُ لَفْتـاً**) شـتەکەی بـادا، تێکـی ئاڵانـد، لەسـەر جگـە لـە ڕووی خـۆی سـووڕاندیی، ﴿ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴾، لاقـەکان تێکـەوە پێچـران، تێـك بـا هەڵـدران، لاق لـە لاق ئـاڵا.

(**ٱلۡمَسَاقُ**): (**مَصْدَرٌ مِيمِـيٌّ، أي: السَّوْقُ، أن تَسِـيرُ مَـاشٍ أَمَـامَ مُسَـيِّرِهِ إلى حَيْـثُ يُرِيْـدُ مُسَـيِّرُه**)، (**مَسَـاق**): چاوگێکـی میمییـە، بـە مانـای لێخوڕیـن، یـان بـردن، (**سَـوْق**): بریتیە لـەوەی بابایەکـی پێـڕۆ، بـڕوا لـە پێـش کەسـێکەوە کـە لێـی دەخـوڕێ، یاخـود پێـش خـۆی داوە، بـەرەو ئـەو شـوێنەی بابـای پێشـخۆدەر دەیـەوێ.

(**يَتَمَطَّىٰٓ**): (**يَمُـدُّ مَطَـاهُ أي: ظَهْـرَهُ**)، (**مطـى**) بـە مانـای پشـت دێ، (**يَتَمَطَّـى**)، واتـە: پشـتی خـۆی درێـژ دەکاتـەوە، (**الْمَطِيَّـةُ: مَـا يُرْكَـبُ مَطَـاهُ مِـنَ البَعِـيْر، وَامْتَطَيْتُـهُ: رَكِبْـتُ مَطَـاهُ، وَالْمَطْـو: الصَّاحِـبُ الْمُعْتَمَـدُ عَلَيْـهِ**)، (**مَطِيَـة**): هـەر شـتێکە کـە مـرۆڤ سـواری پشـتی ببـێ، لـە حوشـترو جگـە لـە حوشـتریش، (**إمْتَطَيْتُـهُ**) واتـە: سـواری پشـتی بـوو، (**مَطْـو**)، ئـەو هاوەڵەیـە پشـتی پـێ دەبەسـترێ و نهێنیـی لا دادەنـرێ.

(**أَوۡلَىٰ لَكَ**): (**الوَيْـلُ: القُبْـحُ، وَقَـدْ يُسْـتَعْمَلُ فـي التَّحَـسُّر**) (**وَيْـل**): یانـی: خراپیـی و ناخۆشـیی، بەکاریـش دەهێـنرێ بـۆ خەفـەت و دڵنارەحەتـی و پەشـێمانیی، (**الأَوْلَى: أَفْعَـلُ تَفْضِيْـلٍ أي: الأَحَـقّ وَالأَجْـدَرُ وَالأَقْـرَب**)، (**أَوْلَى**) کـرداری هەڵبژاردنـە، واتـە: شایسـتەتر، لێوەشـاوەترو، نزیکـتر، واتـە: سـزا لـە تـۆ نزیکـتر بـێ.

(**سُدًى**): (**أَسْـدَى الـشَّيءَ أَهْمَلَـهُ، السُّـدى: الْمُهْمَـلُ للوَاحِـد وَالجَمْـع**)، (**أَسْـدَى الـشَّيءَ**) شـتەکەی پشـتگوێ خسـت و وێـڵ کـرد، (**سُـدَى**) پشـتگوێخراو، هـەم بـۆ تـاك و هـەم بـۆ کـۆش بەکاردەهێـنرێ.

(نُطْفَةً): (المَاءُ الصَّافِي، وَالجَمْعُ: نِطَاف، وَالنُّطْفَةُ: القَطْرَة، وَالنُّطْفَةُ المَنِيُّ، وَالجَمْعُ: نُطَف)، بە ئاوێکی صاف دەگوترێ، ئەو کاتە بە (نِطَاف) کۆدەکرێتەوە، واتە: ئاوە سافەکان، هەروەها بە دڵۆپە ئاویش دەگوترێ، بە تۆویش دەگوترێ، ئەو کاتە ئەگەر بە تۆو بگوترێ، بە (نُطَف) کۆ دەکرێتەوە.

(يُمْنَىٰ): (أَمْنَى الحَاجُّ: أَتَى مِنىً، وأَمْنَى: أي أَنْزَلَ المَنِيَّ وَالنُّطْفَة)، (أَمْنَى الحَاجُّ) واتە: حاجیەکان چوون بۆ مینا، کە شوێنێکە لە نزیك مەککە، هەروەها (أَمْنَى) واتە: تۆوی ڕشت، بەو واتایەش دێ.

(عَلَقَةً): (الجَمْعُ: عَلَق، طَورٌ مِنْ أَطْوَارِ الجَنِيْنِ، وَهِيَ قطعة الدَّمِ الَّتِي يَتَكَوَّنُ مِنْهَا)، (عَلَقَة) بە (عَلَق) کۆدەکرێتەوە، قۆناغێکە لە قۆناغەکانی پێگەیشتنی کۆرپەلە، کە بریتیە لە پارچە خوێنێکی وشك، یان پارچە خوێنێك کە پێکەوەیە، دوایی دەبێتە (مُضْغَة)، دوایی قۆناغەکانی دیکە دەبڕێ، تاکو دەبێتە کۆرپەلەو لە دایك دەبێ.

(فَخَلَقَ): (أي: قَدَّرَ، أو أَوْجَدَ وَأَبْدع)، (خَلَقَ): هەم بە مانای ئەندازەگیری کرد، هەم بە مانای پەیدای کردو دایهێنا.

(فَسَوَّىٰ): (سَوَّى الشَّيءَ: قَوَّمَهُ وَعَدَّلَهُ وَجَعَلَهُ سَوِيّاً)، (سَوَّى الشَّيءَ) واتە: ئەو شتەی ڕێکخست و، چاکی کردو، ڕێك و پێکی کرد.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١- لە بارەی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتە موبارەکانەوە: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ١٧﴾، ئەم دەقە دێنین:

{عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: فِي قَوْلِه عَزَّ وَجَلَّ: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦﴾، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم إِذَا نَزَلَ جِبْرِيلُ بِالوَحيِ وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ بِهِ لِسَانَهُ وَشَفَتَيْهِ فَيَشْتَدُّ عَلَيْهِ، وَكَانَ ذَلِكَ يُعْرَفُ مِنْهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦﴾، أَخذَهُ، ﴿إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ١٧﴾، قَالَ: عَلَيْنَا أَنْ نَجْمَعَهُ فِي صَدْرِكَ، وَقُرْآنَهُ، ﴿فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ﴾، فَإِذَا أَنْزَلْنَاهُ فَاسْتَمِعْ لَهُ، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ﴾، عَلَيْنَا أَنْ نُبَيِّنَهُ بِلِسَانِكَ، قَالَ: فَكَانَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ أَطْرَقَ، فَإِذَا ذَهَبَ، قَرَأَهُ كَمَا وَعَدَهُ اللهُ}، (أخرجه البخاري: ٤٩٢٧، ٤٩٢٨، ٤٩٢٩، ٥٠٤٤، ٧٥٢٤، مسلم: ٤٤٨).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەو ئایەتە موبارەکە، لەو بارەوە هاتە خوار، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ جیبریل وەحیی بۆ دەهێنا، [لەکاتێکدا ئەو قورئانەکەی پێ دەفەرموو]، زمان و لێوەکانی خۆی پێ دەجووڵاندن و، ئەوەش لەسەری قورس دەبوو، واتە: گۆڕێ دەکرد، ئنجا ئەوەی لێ دەزانرا، بۆیە (تلفظ) ی خوای بەرز ئەوەی ناردە خوار، فەرمووی: زمانتی پێ مەجووڵێنە، تاکو پەلەی لێ بکەی، (لە وەرگرتنەوەی) بە دڵنیایی کۆ کردنەوەی و، خوێندنەوەی لەسەر ئێمەیە، دڵنیابە ئێمە لە سینەی تۆدا کۆی دەکەینەوەو، خوێندنەوەکەشی ئنجا کاتێ خوێندمانەوە تۆش شوێن خوێندنەوەی بکەوە، کاتێك دامانبەزاند گوێی بۆ بگرە، لەسەرمانە بە زمانی خۆت ڕوونی بکەینەوە، گوتی: لەوەودوا کاتێ جیبریل دەهات، (پێغەمبەر ﷺ )گوێی دەگرت، کاتێ جیبریل دەڕۆیشت، وەك خوا بەڵێنی پێدابوو، ئاوا دەیخوێندەوە، (نەك لەو کاتەدا دەمی پێ بجووڵێنێ).

**٢-** له بارەی هاتنه خوارەوەی ئەم دووه ئایەتەوە: ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٥﴾ ﴾، ئەم دەقه دێنین:

**{عَـنْ سَـعِيْدِ بْـنِ جُبَـيْرٍ قَـالَ: قُلْـتُ لابـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا: ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ﴾، هَـلْ قَالَـهُ رَسُـول اللـهِ ﷺ وَأَنْزَلَـهُ اللـهُ عَزَّوَجَـلَّ؟ قَـالَ: قَالَـهُ رَسُـولُ اللـهِ ثُـمَّ أَنْزَلَـه اللـه} (أخرجـه النَّسـائي فِي تفسـيره: ٦٥٨، والطـبراني فِي الكبـير: ١٢٢٩٨، والحاكـم فِي المسـتدرك: ج٢ ص٥١٠، الواحـدي في الوسـيط: ج٤ ص٣٩٤، قـال الحاكـم هـذا حديـثٌ صحيـح الإسـناد، ووافقـه الذهبـي)**[1].

واتـه: سـەعیدی کـوڕی جوبەیـر دەڵـێ: لـه عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباسـم (خـوا لێیان ڕازی بـێ)، پرسـی، کـه خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ﴾، ئایـا پێغەمبـەری خـوا ئـەوەی فەرمـوو، دوایـی خـوا دایبەزانـد؟ گوتـی: بەڵـێ پێغەمبـەری خـوا فەرمـووی، دواییـش خـوا ئـەوەی دابەزانـد.

واتـه: پێغەمبـەری خـوا ئـەوەی بـەو بێبڕوایـه فەرمـووە، کـه زۆریـان گوتوویانـه: ئەبـوو جەهلـه، وەکـو دوایـی باسـی دەکەیـن، دواییـش خـوای پـەروەردگار، ئـەوەی پێغەمبەرەکـەی ﷺ پێـی فەرمـووە، کردوویەتـی بـه ئایـەت و دایبەزاندۆتـه سـەرێ و، لـه زمانـی پێغەمبـەرەوە ﷺ گێڕاویەتـەوە.

---

(١) الإستيعاب فِي بيان الأسباب: ج٣ ص٤٨٢ - ٤٨٤.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا پشـتیوان بـێ، لـە کۆتایـی تەفسـیری ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، کورتـە باسـێکی تـا ڕادەیـەك تێـرو تەسـەل، لـە بـارەی ڕۆژی دواییـەوە دەکەیـن، واتـە: ڕۆژی دوایـی بـە گشـتی، هـەم پێشـەکی ڕۆژی دوایـی، هـەم قۆناغـی یەکەمـی ڕۆژی دوایی، کـە تێکچوونـی ئـەم گەردوونەیـە ئاخیـر زەمـان، هـەم قۆناغـی دووەمـی ڕۆژی دوایی، کـە زینـدوو بوونەوەیـەو، هاتنـە پێشـی سـزاو پاداشـتە، ئنجـا سـەرەنجام قۆناغـی سـێیەمی ڕۆژی دوایـی، کـە نیشـتەجێ بوونـی هـەر کام لـە بڕوادارانـی چاکـەکارو، بێبڕوایانـی خراپـەکارە، یەکەمیـان لـە بەهەشـتدا، دووەمیشـیان لـە دۆزەخـدا.

بۆیـە ئێمـە ئێسـتا بـە خێرایـی بـە تەفسـیرو ڕوونکردنـەوەی ئـەم ئایەتـە موبارەکانـەدا دەڕۆیـن، بایـی ئەوەنـدەی چەمـك و واتـای گشـتیی ئایەتـە موبارەکەکان ڕۆشـن بێتـەوە، بـەڵام لەبـەردەم ڕۆژی دواییـدا، کـە ئـەم سـوورەتە وەکـو پێشـتر گوتمـان، هەمـووی لـەو بارەوەیـەوە بـە گشـتیی، زۆر هەڵوەسـتە ناکەیـن و، حەواڵـەی ئـەو کورتـە باسـەی دەکەیـن.

خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەسپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەمکارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.٣ - بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیکەم.

٣- ئەم کارە بە توانا و یارمەتی خوای زانا و توانا دەکەم

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾، لـە بـارەی (لا) کـە لێـرەدا هـەم لـە پێـش: ﴿ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾دا، هاتـوە، هـەم لـە پێـش: ﴿ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾دا هاتـوە، وەك دواییـش لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا، زیاتـر دەچینـە نێـو وردەکارییەکەیـەوە، زانایـان ڕاجیاییـان هەیـە، بـەڵام زۆربەیـان ڕایـان وایـە، ئـەم (لا)یـە بـۆ لابردنـی سـوێند نیـە، هەرچەنـد بـە ڕواڵـەت وا دێتـە بەرچـاو، بـەڵام هیـچ زانایەکـی موعتەبـەر نەیگوتـوە ئـەم (لا)یـە بـۆ لابردنـی سـوێندە، (لَا: لَيْسَـت لِنَفْـيِ القَسَـم)، ئێمـە لـەو بـارەوە لـە سـوورەتی (**الواقعـة**)دا، لـەو شـوێنەی دەفەرمـوێ: ﴿ فَـلَآ أُقْسِـمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَـٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾، لـە کاتـی تەفسـیرکردنی ئـەو ئایەتـە موبارەکانـەدا، لـەو بـارەوە کورتـە باسـێکمان کـرد، لـە بـارەی هەمـوو ئـەو (لَا)یانـەوە، کـە لـە پێـش ئـەو سـوێندانەدا هاتـوون و، گوتمـان: هیـچ کام لەوانـە مەبەسـت پێـی لابردنـی سـوێندەکە نیـە، بـە تایبـەت، بـە بەڵگـەی ئایەتەکـەی سـوورەتی (**الواقعـة**)، کـە لـەوێ زۆر ڕوونـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَـلَآ أُقْسِـمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾، کەواتـە: سـوێندەو خـوا خواردوویەتـی، دەفەرمـوێ: سـوێندێکی مەزنیشـە، کەواتـە: (لَا) مەبەسـت پێـی شـتێکی دیکەیـە و، زانایـان لـەو بـارەوە ڕاجیاییـان هەیـە:

ا- هەندێکیان گوتوویانە: (لَا) بۆ لابردنی قسەیەکی دیکەیە بگوترێ: بڵێی بە نسبەت ئەوە، کە لە سوورەتەکانی پێشتردا باسکراوە، هەڵبەتە دەبێ بگوترێ: ئەو قسەیە، خوا ﷻ بەرپەچی دەداتەوەو لای دەبات، قسەیەکی هەڵەی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە بەپێی سیاق لێرەدا، یانی: وانیە وەك ئێوە دەڵێن: ئەی بێبڕوایەکان کە زیندوو نابنەوەو، ژیانی دنیا تاکە دەرفەتێکی ژیانەو، دوایی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نیە، وانیە وەك ئێوە دەڵێن: ﴿ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت، جارێکی دیکەش

دووبارەی دەكەمەو، وانیە كە ئێوە دەیڵێن: ﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾، سوێند دەخۆم بە نەفسی، یان خودی زۆر ڕەخنەگر، یان زۆر گلەییكەر، واتە: گلەییكەر لە خۆی.

ب- هەندێكیش گوتوویانە: (لَا) لێرەدا هەر لامی سوێندە، بەڵام فەتحەكەی تێر (**إشباع**) كراوە، لە بنچینەدا (**لَأُقْسِمُ**) بوە، (**لَأُقسِمُ بِيومِ القيامة**)، فەتحەكە شێوەی ئەلیف (ا) ی وەرگرتوە.

ج- هەندێكیش گوتوویانە: ئەمە بۆ لابردنی سوێندەكەیە، بەڵام بەو واتایەی ئەو بابەتە هەندە ڕوونە، یاخود ڕۆژی قیامەت هێندە گەورەیە، پێویست ناكات سوێندی پێ بخۆم.

بەڵام وەك گوتم ئەو ڕایە ڕایەكی بێهێزە، دواییش لەو بارەوە زیاتر وردەكاریی باس دەكەین.

خوا دەفەرموێ: وانیە وەك ئێوە دەڵێن، سوێند دەخۆم بە ڕۆژی هەڵسانەوە، (**القِيَامَة**) واتە: هەڵسانەوە، (**قَامَ يَقومُ قِيَامَاً**)، ئنجا (**قيامة**) ناوە و، (**قِيَام**) چاوگە، ئەم قیامەتە ناوە بۆ ئەو ڕۆژە، كە خەڵك تێیدا هەڵدەستنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦ ﴾**المطففين**، ئەو ڕۆژەی خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانییان هەڵدەستێنرێ، ڕاست دەبنەوە.

﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾، وانیە وەك ئێوە دەڵێن، سوێند دەخۆم بە خودێكی، زۆر گلەییكەر، زۆر ڕەخنەگر، واتە: زۆر ڕەخنە لە خۆی دەگرێ، زۆر لۆمەی خۆی دەكات، گلەیی لە خۆی دەكات، ئەوەش دوایی قسەی ڕوونكەرەوانی قورئانی لە بارەوە دێنین، كە ئایا مەبەست پێی نەفسێكی تایبەتە، كە گلەیی لە خۆی دەكات، لەبەر ئەوەی كەمتەرخەمیی كردوە، لە فەرمانبەری بۆ خوادا، یاخود مەبەست پێی هەموو جۆرە نەفسەكانە، كەسێك كە چاكەكاریش بووە، گلەیی لە خۆی دەكات بۆچی چاكەی زیاتری نەكرد؟ ئەوەی خراپەكاریش بووە، گلەیی لە خۆی دەكات، بۆچی خراپەشی كرد، ئەوەی چاكەو خراپەی تێكەڵ كردوون، گلەیی لە خۆی دەكات، بۆچی خراپەی تێكەڵ بە چاكە كردوە؟ گرنگ ئەوەیە

خـوا ﷻ سـوێند دەخـوات بـە نەفسـێکی ڕەخنەگـر و، گلەییەکـەر واتـە: لـە خـۆی، وەڵامـی سـوێندەکە (**مُقْسَـمٌ عَلَيْـهِ**) سـوێند لەسـەر خوراوەکـەش دیـار نیـە، بـەڵام ئایەتەکانـی دوایـی دەیگەیەنـن.

﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴾، ئایـا مـرۆڤ پێـی وایە ئێسـکەکانی کۆناکەینەوە، کەواتـە: سـوێند لەسـەر خوراوەکـە بریتیـە لـە زیندووتـان دەکەینـەوە، واتـە: ﴿ لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾، (**لَتُبعَـثُنَّ**) بـە دڵنیایـی زینـدوو دەکرێنـەوە، هەڵدەسـتێنرێنەوە، ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴾، ئایـا مـرۆڤ پێـی وایـە ئێسـکەکانی کـۆ ناکەینـەوە؟

شـایانی باسـە لـەم سـوورەتە موبارەکەدا، شـەش جـاران وشـەی (**الإنسـان**) دووبارە بۆتـەوە و، لـە هـەر شـەش سیاقەکەدا وشـەی (**الإنسـان**) ناگونجـێ مەبەسـت پێـی ئینسـانی بـڕوادار بـێ، بەڵکـو مەبەسـت پێـی ئینسـانی بێبڕوایـە، چونکـە ئینسـانی بێبـڕوا پێـی وایـە، خـوا ئێسـکەکانی کۆناکاتـەوە و، زینـدووی ناکاتـەوە، بـەڵام ئینسـانی بـڕوادار ئـەوە لـە لای روونـە وەک ئەلیـف و بێیـە، کـە خوایـەك بتوانـێ ئـەو هەمـوو کـەون و کائیناتـە بخوڵقێنـێ، مرۆڤێـك کـە خـۆی دروسـتی کـردوە، دەشـتوانێ دروسـتی بکاتـەوە.

(**سُـبْحَانَ اللـه**) کـە مـرۆڤ دایـە نەفامیـی، هیـچ مەخلووقێـك لـە مـرۆڤ نەفامـتر نابێـت، هـەروەك چـۆن ئەگـەر ڕووی لـە چاکـە کـرد، هیـچ مەخلووقێـك لـە مـرۆڤ چاکـتر نابێـت، فریشـتەکانیش ڕێـزی دەگـرن و سـڵاوی لـێ دەکـەن، بە پێچەوانەشـەوە کـە دایـە وە لـە نەفامیـی و کەودەنیـی، هیـچ شـتێك پێـش مـرۆڤ ناکەوێتـە نەفامیـی و کەودەنیـی نەزانییـدا، ئەگەرنـا خوایـەك توانیبێتـی ئـەو هەمـوو کـەون و کائیناتـە دروسـت بـکات، هەروەهـا خـودی مرۆڤیـش دروسـت بـکات، ئایـا دروسـتکردن بـە زەحمەتـترە، یاخـود دروسـتکردنەوە؟ وەك جـاری دیکـە باسـمان کـردوە، بابـای سـەنعەتکار کـە شـتێك دروسـت دەکات، بـۆ وێنـە: گۆزەکەرێـك، گـۆزە دروسـت

دەكات، یان كەسێك كە ئامێرێك دروست دەكات، كۆمپیوتەرێك دروست دەكات، هەر شتێك لەو شتانەی هەن، تەلەفزیۆنێك دروست دەكات، كورسیی و مێزێك دروست دەكات، ئایا دوای ئەوەی ئەو ئامێرە ئەو كەلوپەلە تێكدەچێ، یاخود كۆن دەبێ، ناتوانێ چاكتر لە خۆی دروستی بكاتەوە؟ بێگومان با.

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴾، ئایا ئینسان، واتە: ئینسانی بێبڕوا، ئەلیف و لامە كە بۆ ناساندنە، بەڵام بۆ ناساندنی عەهدیی، ئایا مرۆڤەكە واتە: مرۆڤە بێبڕوایەكە، كە مەبەست پێی كۆی مرۆڤانی بێبڕوایە، پێی وایە كە ئێسكەكانی كۆناكەینەوە، بۆچی باسی ئێسكان دەكات؟ چونكە پەیكەری ئێسقان، قاڵبی جەستەی مرۆڤە، ئێسكەكان پتەوترن، ئەگەر ئێسكەكان دوای ئەوەی دەڕزن، پرتوكاو دەبن، خوا بتوانێ زیندوویان بكاتەوە، گۆشت و دەمارو ئەوانی دیكە، ئاسانترن و لە پێشترن بۆ ئەوە كە خوا بتوانێ دروستیان بكاتەوە.

بۆیە دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴾، (**بَلَى**) بە مانای (با) دێ لە زمانی كوردییدا، نەك بە مانای بەڵێ، با (**بَلَى**)ش بریتیە لە چەسپاندنی شتێكی لابراو لە ڕابردوودا، كە بریتیە لە: ﴿ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴾ كە ئێسكەكانی كۆدەكەینەوە، (**بَلَى**) با كۆیان دەكەینەوە، ﴿ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴾، ئێمە توانادارین سەرە پەنجەكانیشی ڕێك بخەینەوە، ئنجا (**بَنَانَة**) كۆی (**بَنَانَة**)یە، واتە: تاكەكەی (**بَنَان**) یە، یانی: سەرە پەنجە، هەندێكیان بە پەنجە (**أُصبُع**)یان لێكداوەتەوە، بەڵام لە ئەسڵدا بە مانای سەری پەنجە دێ، ﴿ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴾، با ئێسكەكانی كۆدەكەینەوەو، توانادارین سەرە پەنجەكانیشی ڕێك بخەینەوە، بۆ سەرە پەنجەكان فەرموویەتی ڕێكیان بخەینەوە، چونكە وردەكارییەكی زۆر لەسەرە پەنجەكانی مرۆڤدا هەیە، كە ئێستا دوای ئەوەی زانیاریی بەرەو پێشەوە چووە پێیگەیشتوە، پێشتر وایان دەزانی تەنها (**إبهام**) پەنجە گەورە، واتە: بەڵام ئێستا بۆیان دەركەوتووە، هەموو پەنجەكان، نەك هەر هی دەست، پەنجەكانی پێش،

هەموو سەرە پەنجەیەک، کە پێی دەگوترێ: (بَصْمَة)، مۆرێك و خەتمێکی هەیە، کە هیچکەس لە هی هیچکەس ناچێ، وەك دوایی لەو بارەوە زیاتر قسە دەکەین.

ئەوە ئیعجازێکی عیلمییە، بۆچی خوا نەیفەرمووە: با دەتوانین چاو دروست بکەینەوە، کە چاو وردەکاریی زیاتری تێدایە بە ڕواڵەت، یان نەیفەرمووە: گوێ، یان دڵ، یان گورچیلە، یان مێشك؟ لەبەر ئەوەی بە سەرە پەنجەکانەوە خەڵك دەناسرێتەوە، واتە: دەتوانین سەرە پەنجەکانیشیان ڕێك بخەینەوە، کە بە سەرە پەنجەکانیان دەیانناسینەوە.

﴿ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ﴾، بەڵکو مرۆڤ واتە: مرۆڤی بێبڕوا، دەیەوێ تاوانباریی بکات لە پێشیەوە، (أَمَام: ظَرف لِزمَن المُسْتَقْبل)، (أمام) زەرفە بۆ کاتی داهاتوو، واتە: دەیەوێ هەر بە گوناح و تاوان بیداتە بەر، وەك چۆن لە ڕابردوودا خراپەی کردوە، لە داهاتووشدا هەر خراپە بکات.

﴿ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، بۆیە دەپرسێ ڕۆژی هەڵسانەوە کەنگێیە؟ (أَيَّانَ: أيُّ آنٍ)، لەوەوە هاتوە مانایەکەی لە (مَتَى)وە نیزیکە، چ کاتێك ڕۆژی هەڵسانەوە دێ؟ چونکە دەیەوێ بە خراپەو تاوان بیداتە بەر، بۆیە نکوولیی دەکات لە ڕۆژی دوایی، هەڵبەتە لێرەدا: ﴿ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکوولیلێکردنە (الإسْتِفْهامُ الإنْكَارِي)، یەکێك بە یەکێك دەڵێت: کەی تۆ زانای؟ واتە: تۆ زانا نی، یان یەکێك لە یەکێك تووڕە دەبێ، دەڵێ کەی تۆ بەشەری؟ واتە: تۆ بەشەر نی لەو سیفەتەتدا، لێرە ئەو پرسیارە پرسیارکردنی نکوولیلێکردنە، واتە: ڕۆژی هەستانەوە نایەت.

ئنجا خوا وەڵام دەداتەوە: ﴿ فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ۝٧ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ۝٨ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ۝٩ يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ ﴾، خوا ﷻ نافەرموێ: فلان ڕۆژە دێ ڕۆژی دوایی، لە هیچ شوێنێکی قورئان خوا وای نەفەرمووە، چونکە تەنیا خۆی دەزانێت کەنگێ

دێ، بەڵام هەندێك لە نیشانەكانی باس دەكات دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴾، هەر كاتێك چاو ئەبڵەق بوو، (برِقَ) لە (بَرْق)ەوە هاتووە، واتە: برووسكەی هەور، بەڵام (بَرِقَ) واتە: (إندَهَشَ وَتَحَيَّرَ)، ئەبڵەق و سەراسیمە بوو، ئەوە خوێندەوەیەكە، خوێندراویشەتەوە: (فَإِذَا بَرَقَ البَصَر)، (بَرَقَ) واتە: (لَمَعَ)، تیشكی دا، ئەگەر مرۆڤ چاو زۆر بكاتەوە، چاوی بریسكەی دێ.

﴿ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴾، كاتێك مانگ خەفە بوو، شۆقی كەم بوو، زانایان گوتوویانە: (خُسُوف) بۆ مانگ بەكاردێ، (كُسُوف) بۆ خۆر، هەندێكیش گوتوویانە: (كُسُوف) بۆ مانگ و خۆر بەكاردێ، ئەگەر شۆقەكەیان یەكجاریی نەما، بەڵام (خُسُوف) بۆ حاڵەتێكە شۆقیان كەم بێتەوە.

﴿ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴾، هەر كاتێك خۆرو مانگ كۆبوونەوە پێكەوە، ئەمە لە نیشانەكانی هاتنی ئاخیر زەمانە، كە قۆناغی یەكەمی ڕۆژی دواییە.

﴿ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴾، لەو ڕۆژەدا دیسان مرۆڤ، مرۆڤی بێبڕوا، مرۆڤە بێبڕوایەكە دەڵێ: ﴿ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴾، هەڵاتن لە كوێیە؟ لێرەدا یەكسەر خوا ﷻ لە ئاخیر زەمانەوە، لە قۆناغی یەكەمی ڕۆژی دواییەوە، دەیبات بۆ قۆناغی دووەم واتە: قیامەت و هەڵسانەوە، چونكە لەوێ مرۆڤ دەڵێ: بۆ كوێ بچم، هەڵاتن و شوێنی بۆ لاهەڵاتن؟ ﴿ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴾، ﴿ ٱلْمَفَرُّ ﴾، هەم بە مانای (فِرَار) هاتووە، كە چاوگە، واتە: هەڵاتن لە كوێیە؟ هەم بە مانای شوێنی بۆ هەڵاتن (مَكَانُ الفِرَار) و، هەم بە مانای كاتی تێدا هەڵاتن (وقتُ الفِرار)، كە لە ڕاستییدا لەو ڕۆژەش دا نە هەڵاتن هەیە، نە شوێنی بۆ هەڵاتن هەیە، نە كاتی تێدا هەڵاتن هەیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴾، واتە: نەخێر، (كَلَّا: كَلِمَةُ رَدْعٍ وَزَجْرٍ، وَإِبْطَال)، وشەیەكە بۆ تێوەخوڕین و بەرپەرچدانەوەو هەڵوەشاندنەوە، واتە: نەخێر بە هیچ جۆرێك ﴿ لَا وَزَرَ ﴾، واتە: (لَا مَلْجَأ)، (وَزَر)، بە مانای پەناگە دێ، هیچ پەناگەیەك نیە، هیچ شوێنێكی خۆ تێگرتن نیە.

﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴾، نیشـینگەو نیشـتەجێ بـوون لـەو ڕۆژەدا بـۆ لای پەروەردگارتـە، واتـە: تەنیـا لـەو شـوێنەو، بـە بڕیـاری پـەروەردگار سـەقامگیریی هەیـەو، خەڵـك لـەو شـوێنە كـۆ دەبێتـەوەو نیشـتەجێ دەبێـت، دەگیرسـێتەوە كـە پـەروەردگار ویسـتی لەسـەر بـێ.

﴿ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴾، لـەو ڕۆژەدا مـرۆڤ (مرۆڤـی بێبـڕوا، ئەمـە جـاری پێنجەمـە باسـی مـرۆڤ بكـرێ، لـەم سـووڕەتە موبارەكـەدا)، هەواڵـی پێـدەدرێ، ﴿ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴾، بـەوەی پێشـی خسـتوەو ئـەوەی دوای خسـتوە، بـەوەی پێشیخسـتوە لـە چاكـە، یاخـود دوای خسـتوە لـە چاكـە نەیكـردوە، یاخـود بـەوەی پێشیخسـتوە لـە چاكـە، لـە سـەردەمی ژیانـی خۆیـدا ئەنجامـی داوەو، بـەوەی كـە دوایخسـتوە لـە شـوێنەواری چاكـە و كـە كارێكـی باشـی كـردوە لـە دوای بەجـێ دەمێنـێ وەك شـوێنەوار، یاخـود: ﴿ بِمَا قَدَّمَ ﴾، لـەوەی پێشـی خسـتوە لـە چاكـەو لـە خراپـەو، ﴿ وَأَخَّرَ ﴾، لـەوەی دوایخسـتوە لـە چاكـەو لـە خراپـە، جـاری وا مـرۆڤ چاكەیـەك دەكات، یـان جـاری وایـە لـە چاكەیەكـدا كەمتەرخەمـی دەكات، جـاری وایـە گوناهێـك دەكات، یـان جـاری وایـە لـە گوناهێـك دەپرینگێتـەوە، مـرۆڤ هەواڵی پێـدەدرێ بـە هەمـوو هەڵسـوكەوت و جموجۆڵەكانیـی.

﴿ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴾، بەڵكـو مـرۆڤ چاودێـرەو، بەڵگـەو شـایەدە بەسـەر خۆیەوە.

﴿ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾، هەرچەنـدە بیانووەكانـی پاسـاوەكانی، فڕێبـداو بیانخاتـە گـۆڕێ، بـەڵام سـەرەنجام بـۆ خـۆی شـایەدیی لەسـەر خـۆی دەدات.

ئنجـا خـوا ﷻ لـەم چـوار ئایەتـەدا، ئایەتەكانـی: (١٦ - ١٩) باسـێك نێواخنـی ئـەم باسـە دەكات، دیـارە لـەو كاتـەدا كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ خوا ئەمـەی بـۆ سرووش كـردوە، دەبـێ ئـەو پەلـەی كـرد بـێ و، زمانـی پـێ جووڵانـد بـێ، وشـەكان كـە جیبریـل بـۆی وەحیـی كـردوون، ئەویـش، گـۆی پێكـردوون بـۆ ئـەوەی كـە بزانـێ

ئایا بە ڕەوانیی وەری گرتووون، یان نا؟ بۆیە خوا ﷻ ڕێنمایی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات و دەفەرموێ:

﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾، زمانتی پێ مەجووڵێنە بەو قورئانەی بۆت دێ، تاکو پەلەی لێ بکەی، ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾، بە دڵنیایی کۆکردنەوەی قورئان لە عەقڵ و دڵتداو، خوێندنەوەکەشی لەسەر ئێمەیە، ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾، ئنجا ئەگەر خوێندمانەوە تۆش شوێن خوێندنەوەکەی بکەوە.

﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾، دواییش ڕوونکردنەوەکەی لە عەقڵ و دڵتداو، لێ تێگەیشتنت بۆی، لەسەر ئێمەیە.

هەڵبەتە هەندێك لە زانایان وایان لێکداوەتەوە، کە ئەمە هەر مەبەست پێ بابای بێبڕوایە، کە لە ڕۆژی دواییدا خوا پێی دەفەرموێ: دانپێدانانی هەڵە و کەم و کوڕییەکانت، یان قسە کردن لە بارەی گوناهو تاوانەکانتەوە، زمانتی پێ مەجووڵێنەو پەلەی لێمەکە، لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی کردەوەکانت، و بەسەردا خوێندنەوەی کردەوەکانت، ئنجا هەر کاتێك ئێمە بۆمان خوێندیەوە، تۆش شوێن خوێندنەوەکەی بکەوە، دواییش ڕوونکردنەوەی گوناهو تاوانەکانت لەسەر ئێمەیە، ئەم مانایەشیان لێکداوەتەوە، بە حیساب بۆ ئەوەی ئەم چوار ئایەتە موبارەکە، لەگەڵ ئەو سیاقەدا کە تێیدا هاتوون، نەبنە نێواخنێکی نەگونجاو، بەڵام لە ڕاستییدا ئەو مانا لێکدانەوەیە ڕاست نیە، وەك دوایی باسی دەکەین، چونکە لە سووڕەتی (طه)شدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾، پەلە مەکە لە کاتێکدا، کە قورئانت بۆ دەخوێندرێتەوە پێش ئەوەی بۆت سرووش بکرێ و، بڵێ پەروەردگارم زانیاریم بۆ زیاد بکە، بەڵام وا پێدەچێ لە سەرەتای دابەزینی وەحییەوە بووبێ، بۆیە پێم وایە کە ئەم سووڕەتە، وەك پێشتر باسم کرد لە هەشت، نۆ، دە، سووڕەتی یەکەمە و، هەر لە سەرەتاوە خوا ﷻ ڕێنمایی پێغەمبەری کردوە و، ئامۆژگاریی

کـردوه چـۆن لەگـەڵ بـۆ دابەزێنرانـی وەحییـدا مامەڵـە بـکات، نـەك وەك هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: ئـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی سـی و ئەوەندەمیـن بـێ.

﴿ كَلَّا بَلۡ تُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ ﴾، واز بێنـن ئـەی مرۆڤـە بێبڕوایـەکان، بەڵکـو ئێـوە ژیانـی زوو تێپـەڕی دنیاتـان خـۆش دەوێ.

﴿ وَتَذَرُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴾، مەنزڵـگای کۆتایـی وازدێنـن و وێـڵ دەکـەن، لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە، کـە ئەگـەر مـرۆڤ ژیانـی دنیـای خۆشـبوێ، لـە بەرانبەریـدا دواڕۆژ وێـڵ بـکات، ئـەوە خراپـە، ئەگەرنـا دونیاشـت بـە ئەنـدازەی ئـەوەی دەیهێنـێ خۆشـت بـوێ، گرنگیـی و بایەخـی پـێ بـدەی، بـەڵام لەسـەر حیسـابی ڕۆژی دوایـی نەبـێ، وەك دوایـی باسـی دەکەیـن، ئـەوە خـراپ نیـە، چونکـە خـوا ﷻ مەدحـی هەندێـك لـە بەندەکانـی خـۆی کـردوە، کـە دەڵێـن: ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّمَّا كَسَبُواْۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾ ﴾البقرة، هەندێـك لـە بەندەکانـی خـوا هـەن، دەڵێـن: پەروەردگارمـان! لـە دنیـادا چاکەمـان پـێ ببەخشـەو، لـە دواڕۆژیشـدا چاکەمـان پـێ ببەخشـە و، لـە سـزای ئاگـر بمانپارێـزە، ئەوانـە پشـك و بەشـیان هەیـە لـەوەدا، کـە بـە دەسـتیان هێنـاوە.

ئنجـا خـوا ﷻ باسـی ڕۆژی دوایـی دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ﴾، ڕووانێـك هـەن گـەش و درەوشـاوەن، واتـە: کەسـانێك هـەن ڕووەکانیـان گـەش و درەوشـاوەن.

﴿ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ﴾، واتـە: تەماشـاکەرن بـەرەو پەروەردگاریـآن، واتـە: تەماشـای پەروەردگاریـان دەکـەن، بـۆ پەروەردگاریـان دەڕوانـن، کـە ئەمـەش یەکێکـە لـەو بەڵگانـەی، زۆرینـەی زانایانـی ئیسـلام بـە بەڵگەیـان دێننـەوە، لەسـەر ئـەوە کـە لـە ڕۆژی دواییـدا ئەهلـی ئیـمان، لـە بەهەشـت دا خـوای پـەروەردگار دەبینـن، بـەڵام بـەو شـێوەو چۆنیەتییـە خـوا دەزانـێ، نـەك پێکهاتـەی جەسـتەی ئێمـە وەک هـی

ئێستا وابێ، وەك دوایی باسی دەكەین، ئنجا بەو قەیدە، ئەو كاتە ئەوەی كە موعتەزیلە گوتوویانە و شیعەش شوێنیان كەوتوون، هەروەها هەندێكی دیكە لە زانایانی هاوچەرخی دیكە دەڵێن: كە مرۆڤ ناتوانێ خوا ببینێ، بەڵێ مرۆڤ بەم پێكهاتەی ئێستای ناتوانێ خوا ببینێ، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا پێكهاتەی جەستەیی مرۆڤ دەگۆڕێ.

﴿ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴾، ڕووانێك هەن لەو ڕۆژەدا گرژو تاڵن، مۆرو ڕەش و برشن، ﴿ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴾، پێیان وایە بەڵای كەمەرشكێنیان لەگەڵدا ئەنجام بدرێ، بەڵای پشت شكێن، ﴿ فَاقِرَةٌ ﴾، بە (**فَوَاقِر**) كۆدەكرێتەوە، واتە: بەڵایەك زۆر بێڕەزا بێ و، مرۆڤ بكەوێنێ و پشتی بشكێنێ.

﴿ كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴾، ئنجا خوا ﷻ یەكسەر دەیانگوازێتەوە بۆ قۆناغی سەرە مەرگ، سەرە مەرگی هەر كەسێك و، دەفەرموێ: (**كَلَّا**) با واز بێنن، یان واز بێنن، یان ئێوە ڕاست ناكەن كە زیندوونابنەوە، ﴿ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴾، هەر كاتێك گەیشتە چۆڵەمەكان، (**بَلَغَت**) ئەم ڕاناوی مێینەیە، ئەو (**تَاء التَّأْنِيث**)ە دەچێتەوە بۆ دروستكراوێكی مێینە بە مەجازیی، كە بریتیە لە نەفس یان ڕووح گەیشتە چۆڵەمەكان (**التَّرَاقِي**)، كۆی (**تَرقوة**)یە، بە كوردیی دەڵێین: چۆڵەمە، ئەو دوو ئێسكەی بەرانبەر یەكدین و، دەوری قوڕقوڕاگەیان گرتوە، هەموو مرۆڤێك دوو تەرقوەی هەن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەگەر تەرقوە بە (**مُثَنَّى**) بگوترێ قورسە (**إِذَا بَلَغَتِ التَّرقوَتَان**)، ئەگەر ڕووح گەیشتە دوو چۆڵەمەكان، لەبەر ئەوەی قورسە، بۆیە بە كۆ هێنراوە، هەروەك لە سوورەتی (**التحريم**)یشدا خوای كارزان بە دوو هاوسەرەكەی پێغەمبەرەكەی ﷺ، حەفصەو عائیشە دەفەرموێ: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾ ﴾، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بێگومان دڵەكانتان لایانداوە، ئەگەرنا لە بنچینەدا (**قَلبَاكُما**) یە، بەڵام لەبەر ئەوەی (**مُثنى**) قورسە، بۆیە عەرەب ئەو وشانەی قورسن لەسەر زمان، بە (**مُثَنىً**) نایانهێنن بەڵكو كۆیان دەكەنەوە.

﴿ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ﴾، گوتـراش: کـێ چارەسـەر دەکات، کـێ هەیـە دوعـا بخوێنـێ چارەسـەر بـکات، دەواو دەرمانێکـی پێیـە؟ ئـەوە واتایەکـی، یاخـود: ﴿ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ﴾، (**مَـن يَرفَـعُ هـذه النَّفـس؟**)، کـێ ئـەم نەفسـە دەکاتـەوە و دەیبـات بـەرەو شـوێنی خـۆی؟

﴿ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ ﴾، پێـی وابـوو کـە ئـەوە تـرازان و جیابوونەوەیـە، (**ظَـنّ**) دەگونجـێ بـە مانـای: پـێ وابـوون و گومـان بـێ، دەشـگونجێ بە مانـای زانیاریـی و جێـی دڵنیایی بـێ، واتـە: دڵنیـا بـوو تـازە جیادەبێتـەوە لـە کـەس و کاری، لـەم ژیانـە دنیاییـە جیادەبێتـەوە، یاخـود: زانـی ڕووحیـی لـە جەسـتەی جیـا دەبێتـەوە.

ئەگـەر (**ظَـن**) هـەر بـە مانـای گومـان بـێ، مـرۆڤ لەبـەر ئـەوەی کـە تاکـو دەمرێ تەمایەکـی بـە ژیـان هـەر هەیە.

﴿ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴾، لاق لـە لاق ئـاڵا، لـە سـەرە مەرگـدا مـرۆڤ لاقەکانـی پێکـەوە دەژەنـێ، یاخـود: دوای ئـەوەی کـە دەمـرێ، لاقەکانـی لـە کفنـدا پێکـەوە دەپێچرێـن.

﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ﴾، لـەو ڕۆژەدا بـردران بـەرەو پەروەردگارتانـە، (**مَسَـاق**) چاوگێکـی میمییـە، بـە مانـای (**سَـوق**)، لێخـوڕدران، بەڕێکـران، بـردران، لـەو ڕۆژەدا بـەرەو پەروەردگارتـان، یاخـود (**مَسَـاق**) دەگونجـێ بـە مانـای نـاوی شـوێن بـێ، ئـەو شـوێنەی خەڵکـی بـۆ (**سـوق**) دەکـرێ و بـەڕێ دەکـرێ و بـۆ دەبـردرێ لای پەروەردگارتانـە، یانـی: ئـەو شـوێنەیە پـەروەردگارت دیـاری کـردوە.

ئنجـا خـوا ﷻ دێتـە سـەر هـۆی سـەرەنجام خراپـی بابـای بێبـڕوا، کـە چـوار گوناهانـی لەسـەر تۆمـار دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا صَدَّقَ ﴾، ئـەو کەسـە ئـەو بێبڕوایـە بەڕاسـتی نەزانـی، لێـرەدا بەرکارەکـەی قرتێنراوە، بۆچـی؟ ئەگـەر فەرمووبای: (**فَـلاَ صَـدَّق الرَّسُـول**)، تەنیـا ئـەوەی دەگرتـەوە، واتـە: پێغەمبـەری بەڕاسـت نەزانـی، ئەگـەر فەرمووبـای: (**فَـلاَ صَـدَّقَ القُـرآنَ**) تەنیـا قوڕئانـی دەگرتـەوە، قوڕئانـی بەڕاسـت

نەزانـی، ئەگـەر فەرمووبـای: (فَـلاَ صَـدَّقَ القِيَامـة)، ڕۆژی هەڵسـانەوەی بەڕاسـت نەزانـی، بـەڵام لێـرە: ﴿ فَلَاصَدَّقَ ﴾، واتـە: بەڕاسـتی نەزانـی، هـەم خـوای بـە ڕاسـت نەزانـی، هـەم پێغەمبـەری خـوا ﷺ، هـەم کتێبـی، خـوا، هـەم دیـداری خـوا، هیـچ کام لەوانـەی کـە پێویسـت بـوو بەڕاسـتیان بزانـێ، ئیمانـی پێیـان هەبـێ، هیچیانـی بەڕاسـت نەزانـی و، ئیمانـی پێیـان نەبـوو.

﴿ وَلَا صَلَّىٰ ﴾، نوێژیشـی نەکـرد، هەمیشـە نوێـژ کردنـی مـرۆڤ و، بەندایەتـی مرۆڤ بـۆ خـوا، زادەو بەرهەمـی بڕوایەتـی بـە خـوا، بۆیـە کەسـێك کـە نوێـژ نـاکات، دەبـی پێشـێ سـەرنجی بێبڕواییەکـەی بـدەی، دیـارە بەڕاسـت نەزانینـی هەیـە، بۆیـە نوێـژی نیـە، لـە دڵ و دەروونیـدا بێبڕوایـی هەیـە، بۆیـە ناپابەندیـی هەیـە لـە ڕواڵـەت و جەسـتەیدا.

﴿ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴾، بەڵکـو بێبـڕوا بـوو بـە درۆی دانـاو، پشتیشـی هەڵکـرد، واتـە: لـە جیاتـی ئـەوەی تەصدیقـی هەبـێ و بەڕاسـت بزانـێ، (تَكذِيـب) بـە درۆ دانانـی هەبـوو، لـە بەرانبـەر نوێـژ کـردن دا، لـە جیاتـی نوێـژ کـردن و بەندایەتـی بـۆ خـوا هەبـێ، پشـت هەڵکـردن و ڕوو وەرچەرخاندنـی هەبـوو.

﴿ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰ ﴾، دواییـش چـۆوە بـۆ لای خێـزان و کـەس و کاری، بـە فیـزو کەشـخەوە و بـە پشـت بادانـەوە، (مَطـى) بـە مانـای (ظَهَـر)ە، (يَتَمَطَّـى) واتـە: (يُمَـدِّدُ ظَهْـرَهُ)، پشـتی درێـژ دەکـردەوەو خـۆی ڕادەوەشـاند بـە فیـزو کەشـخەوە، ئەمـە دەگونجـێ بـە سـیفەتی خراپـی پێنجەمـی و، بـە تاوانـی پێنجەمـی دابنـرێ، دەشـگونجێ بگوترێ: ئـەوە هـەر عادەتـی بـوو، پێـش ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ پەیامـی خـوای بـۆ بێنـێ، پێـش ئـەوەش کـە خـوا لـە میانـی کۆتـا فەرمایشـتی خۆیـدا بیدوێنـێ، ئـەو سـیفەتە خراپـەو، سیفەتە خراپەکانـی دیکـەش، هـەر عادەتـی بـوون، بۆیـە لـە ڕیـزی تاوانەکانـی دا دانـرێ، ئـەو تاوانانـەی، لـە دوای دوێنرانـی لەلایـەن پێغەمبـەرەوە ﷺ لەسـەری تۆمـار کـراون.

بۆیەش وا دەڵێین: چونکە خوا ﷻ دوایی چوار جاران وشەی [سزای سەخت بۆ تۆ بێ] دووبارە دەکاتەوە، لە بەرانبەر ئەو چوار تاوانەیدا و، دەفەرمووێ: ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ ﴾، (**أَوْلَى**) صیغەی هەڵبژاردن (**تَفْضِيل**)ە لە (**وَيْل**)، واتە: سزای سەختتر بۆ تۆ سزای سەختتر، دوایی سزای سەختتر بۆ تۆ، سزای سەختتر، دەشگونجێ (**أولى**) لە (**ويل**)ەوە نەهاتبێ و، صیغەی (**تَفْضِيل**) ی (**وَيْل**) نەبێ، بەڵکو (**أَوْلَى**) بە مانای (**أَقْرَب**)، واتە: (**أَقْرَبُ لَكَ فأقرَب، ثُمَّ أَقْرَبُ لَكَ فأَقْرَب**)، چی لێی نیزیکتر بێ، دیارە سزای خوای دادگەر، واتە: سزاو جەزرەبەی خوا لە تۆ نیزیکتر بێ، جارێکی دیکەش سزاو جەزرەبەی خوا لە تۆ نیزیکتر بێ، ئنجا سزاو جەزرەبەی خوا لە تۆ نزیکتر بێ، جارێکی دیکەش سزاو جەزرەبەی خوا لە تۆ نیزیکتر، ئەوە چواران، لە بەرانبەر ئەو چوار تاوانەیدا، خوا ﷻ چوار جار هەڕەشەی سزای سەختتر، یاخود لێ نیزیکتر بوونی سزای سەختی خوای لێ دەکات.

﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَـٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴾، ئەمە جاری شەشەمە کە وشەی مرۆڤ لێرە دێ: ئایا مرۆڤ پێی وایە بە وێڵکراویی وازی لێ بهێنرێ؟ ﴿ سُدًى ﴾، واتە: (**مُهمَل**)، تاك و بۆ کۆ نێرینەو مێینە و، بۆ دووان، بۆ هەمووی بەکاردەهێنرێ، دەگوترێ: (**رَجلٌ سُدى، إمرأةٌ سُدى، ناقةٌ سُدى، بعيرٌ سُدى، إبلٌ سُدَى**)، ئایا مرۆڤ پێی وایە بە وێڵکراویی وازی لێ بهێنرێ و کەس نەڵێ لە کوێ بووی و چیت کرد و چۆنت کرد و چۆن ژیای؟

﴿ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِىٍّ يُمْنَىٰ ﴾، ئایا تۆویلکەیەك نەبوو لە تۆوێك کە دەڕژێنرێ، ﴿ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴾، دوایی بوو بە خوێنپارەیەك، خوا دروستی کردو ڕێکی خست، قۆناغ قۆناغ.

﴿ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴾، هەر لەو تۆوەی دەڕژێندرێتە نێو منداڵدانەوە، لەگەڵ هێلکۆڵەی ئافرەتدا یەکدەگرن، لەوە جووتی نێرو مێیانی لێ دروست کرد،

(**نُطْفَة**) مەبەست پێی ئاوی پیاو بێ، واتە: (**حَيمَن**) زیندەوەری تۆویی، چونکە وەك دوایی باس دەکەین، پێشتریش باسمان کردوە، هۆی نێربوون و مێبوونی، کۆرپەلە ئاوی پیاوە، کە وەك زانایانی شارەزا دەڵێن: ئاوی پیاو (**حَيمَن**)ەکانی دوو جۆرن، کە بە (XY) یان (XX) ڕەمزەکەیانە، بەڵام هی ئافرەت هەمووی هەر (XX)ە، ئنجا ئەگەر هی پیاو (XY) بێ، لەگەڵ (XX)ی ئافرەتدا دەبێتە نێر، بەڵام ئەگەر هی پیاو (XX) بێ، لەگەڵ (XX)ی ئافرەتدا مێینە دروست دەبێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَجَعَلَ مِنْهُ ﴾، واتە: لەو مەنییە لە تۆوی پیاو، جووتی دروست کرد، ﴿ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴾، نێرو مێ.

﴿ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، ئایا ئەوە [واتە: خوایەك ﷻ کە ئەوە حاڵ و سیفەتیەتی]، توانادار نیە کە مردووان بژێنێتەوە؟ دواییش باسی دەکەین، وا باشە لێرەدا بگوترێ: (**سُبْحَانَكَ بَلى**) پاکیی بۆ تۆ با، یان: (**سُبْحَانَكَ بَلى وَأَنَا عَلَى ذَلِكَ مَعَ الشَّاهِدِيْن**)، پاکیی بۆ تۆ، با، من لەسەر ئەوە لە شایەدانم، شایەدیی دەدەم کە خوا ﷻ مرۆڤی بە هەموو ئەو قۆناغانەدا هێنابێت، دوای ئەوەی دەشمرێ، ئەو مردووانەی بەو شێوەیە دروستیکردوون، زیندوویان بکاتەوەو جارێکی دیکە ژیانیان پێ ببەخشێتەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە ڕۆژی قیامەت و بە نەفسی سەرکۆنەکار (کە ڕۆژی دوایی دێ) و، هەڵوەشاندنەوەی گومانی مرۆڤی بێبڕوا، کە خوا پێی زیندوو ناکرێتەوەو، ئێسکەکانی پێ کۆناکرێنەوە! لە حاڵێك دا خوا توانایە سەرە پەنجەکانیشی ڕێك بخاتەوە، بەڵام بابای بێبڕوا چونکە هەر چاوی لە تاوانبارییە، بۆیە نکووڵیی لە ڕۆژی قیامەت و سزاو پاداشت و لێپرسانەوە دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ۝٢ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ۝٣ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ۝٤ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ۝٥ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝٦﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگە:

١)- ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، وەك پێشتر باسمان کرد، زانایان لە بارەی (لَا) کە لە پێش: ﴿أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ و لە پێش: ﴿أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾دا هاتوە، لێرەدا هەروەها لە شوێنەکانی دیکەش لە قوڕئان دا، مشتومڕیان زۆر کردوە: أ- هەندێکیان گوتویانە: (لا) بۆ لابردنی سوێندە، سوێند ناخۆم بە ڕۆژی قیامەت و، سوێند ناخۆم بە نەفسی سەرکۆنەکار، بەڵام پێشتر گوتمان: ئەو ڕایە ڕاست نییە و، لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکانی سووڕەتی (**الواقِعة**)دا، کە ئەو ئایەتە موبارەکانەمان بەوجۆرە تەفسیر کردیە: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ۝٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ۝٧٦﴾، وانیە وەك ئێوە دەڵێن، سوێند دەخۆم بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەکان و، ئەگەر بزانن ئەوە سوێندێکی مەزنە، کەواتە: خوا سوێندەکەی خواردوەو بڕاوەتەوە، بۆیە ئەو ڕایە هەڵەیە، کە دەڵێ ئەم (لَا)یە بۆ لابردنی سوێندەکەیە.

ئنجا کە وایان گوتوە، گوتوویانە: لەبەر ئەوەی ئەو شتە ئەوەندە ڕوونە، بۆیە خوا سوێندی لەسەر ناخوات، یاخود سوێند پێخوراوەکە هێندە گەورەیە، بۆیە خوا لەوە گەورەتری دەزانێ، بەڵام ئەو دوو پاساوە ڕاست نین و، لە ڕاستیدا ئەمە سوێندەو خوراوە، ئەی (لَا)یەکە مەبەست پێی چییە؟

**ب-** بەشێک گوتوویانە: (**لَا زَائِدة للتَّأْكِيد مِثْلُ لِئَلَّا يَعلَمَ**)، وەك پێشتر باسمان کرد لە کۆتایی سوورەتی (**الحديد**)دا واتە: (**لِيَعلَمَ**)، واتە: (لَا)یەکە زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە، یەکێك لە عادەتەکان لە زمانی عەرەبییدا، ئەوەیە جاری وایە (لَا) زیاد دەکەن، بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەو شتە، کەواتە: ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾ یانی: زۆر بە جەختکردنەوە وە سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت.

**ج-** ڕایەکی دیکە لە بارەی (لا)وە، دەڵێ: (**رَدٌّ لِكَلَامٍ سابق**)، ئەمە بەرپەرچدانەوەی قسەیەکی پێشترە، کە لە ڕاستیدا من ئەو ڕایەم، نەك هەر لێرەدا بەڵکو لە ئایەتەکەی سوورەتی (**الواقِعة**)داو، لە هەموو شوێنەکانی دیکەشدا کە دێنێ، بۆ نموونە: ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ۝١ ﴾**البلد**، لە هەموو شوێنەکاندا (لَا) مەبەست پێی بەرپەرچدانەوەی قسەیەکی پێشترە، کە کراوە یاخود بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ و، گونجاوە لەگەڵ ئەو سیاقەدا، بۆ وێنە لێرە: ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، وانیە وەك ئێوە دەیڵێن کە زیندوو ناکرێنەوە، سوێند دەخۆم بە ڕۆژی هەڵسانەوەو، وانیە وەك ئێوە دەیڵێن، سوێند دەخۆم بە نەفسی سەرکۆنەکار، کە ڕەخنە لە خۆی دەگرێ.

**د-** ڕایەکی دیکەش هەیە کە (**لاَ أُقسِمُ**)، ئەلیف (ا) ەکە هەر فەتحەیە، بەڵام تێر کراوە، واتە: (**لأُقسِمُ بِيَومِ القِيَامَة**)، سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت، گرنگ ئەوەیە من تەنها ئەو ڕایە پێم هەڵەیە، کە دەڵێ: (لا) بۆ لابردنی سوێندەکەیە، وەك گوتم ڕوونترین بەڵگەش لەو بارەوە، ئایەتەکەی سوورەتی (**الواقِعة**)یە، کە لەوێ خوا ﷻ دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ۝٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ۝٧٦ ﴾، نەخێر سوێند دەخۆم بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەکان و، ئەگەر بشزانن ئەمە

سوێندێکی مەزنە، ئنجا سوێندی مەزن خوا ﷻ دەیخوات، هەروەها سوێند خواردن بە ڕۆژی دوایی، ڕۆژی دوایی ئەوە دێنێ سوێندی پێ بخۆی، لە شوێنی دیکەشدا خوا سوێندی پێ خواردوە، هەروەها نەفسێك كە ڕەخنە لە خۆی، لە خاوەنەكەی دەگرێ شایستەی ئەوەیە سوێندی پێ بخورێ.

٢)- ﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾، وانیە (وەك ئێوە دەڵێن)، سوێند دەخۆم بە نەفسێك كە زۆر ڕەخنە گرە، زۆر لۆمەكارە، زۆر گلەییكەرە، لە كێ؟ هەڵبەتە لە خۆی، لێرەدا زانایان پرسیویانە: ئایا سوێند لەسەر خوراوەكە چییە؟ سوێند پێ خوراوەكە دیارە، ڕۆژی قیامەتە، دووەمیش نەفسی گلەییكارو ڕەخنەگرە، بەڵام ئایا سوێند لەسەر خوراوەكە (**مُقْسَمٌ عَلَيْه**) چییە؟ ئەوەی سوێندی لەسەر خوراوە، یان سوێندی بۆ خوراوە، زانایان گوتوویانە: ئەوشتەی بە سیاق دەزانرێ، وەك: (**لَتُبْعَثُنَّ أو لَنَجْمَعَنَّ عِظَامَ الإنْسَان**) بە دڵنیایی زیندوو دەكرێنەوە، یاخود ئێسكەكانی مرۆڤ كۆدەكەینەوە، چونكە دوایی دەفەرموێ:

٣)- ﴿ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ﴾، ئایا مرۆڤ، (مرۆڤی بێبڕوا) پێی وایە ئێسكەكانی كۆ نەكەینەوە؟ بێگومان لە ئەسڵدا ئاوایە: (**أَنْ لَنْ نَجْمَعَ عِظَامَه**)، بەڵام نوون (ن) ە لە لام (ل) ەكە دا دەكرێ، (**لَنْ**) یش بۆ جەختكردنەوەی لابردنە، هەڵبەتە بەپێی بیرو بڕوایی مرۆڤی كافر، ئایا ئەو بەدڵنیایی پێی وایە ئێمە ئێسكەكانی كۆناكەینەوە؟! واتە: بابای بێبڕوا پێی وایە بە تەئكید خوا ئێسكەكانی كۆ ناكاتەوە، یانی: (**لَنْ**) بەپێی ئیعتیقادو بۆ چوونی بای بێبڕوایە، ئنجا ئایا لێرەدا مەبەست پێ لە (**الإنْسَان**) چییە؟ (**أل**)ی ناساندنی لەسەرە، ئایا ئەو (**أل**)ە بۆ ڕەگەز (جنس) ە، واتە: كۆی مرۆڤان پێیان وایە، یاخود (**أل**)ی ناساندنە و بۆ (عهد)ە، واتە: مرۆڤە بێبڕوایەكان پێیان وایە.

هەڵبەتە ئەگەر بشگوترێ: مەبەست كۆی مرۆڤانە لەو ڕۆژگارەدا، یاخود لەو كۆمەڵگایەدا، ek خەڵكەكە زۆرینەی هەرە زۆری ڕایان وابووە، تۆزێ ڕێی تێدەچێ، بەڵام ڕای ڕاستر ئەوەیە (**أل**)ە كە بۆ ناساندنە و، ناساندنی عەهدییە واتە: مرۆڤە

بێبڕوایەکە، مرۆڤە بێبڕوایەکان پێیان وایە ئێسکەکانیان کۆ ناکەینەوە، چونکە تەنانەت لە کۆمەڵگای پێغەمبەریش دا، کەسانێك هەبوون بڕوایان بە زیندوو بوونەوەو بە سزا و پاداشت هەبووەو، لە سەرتاسەری دنیاشداو، لەو ڕۆژگارەشدا هەمیشە خاوەن کتێبەکان و، کەسانێك کە خواناس بوون و بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەبووە، هەر هەبوون.

٤)- ﴿ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴾، با ئێمە تواناداریین سەرەپەنجەکانیشی ڕێك بخەینەوە.

زانایان باسیان کردوە، کە بۆچی خوا ﷻ باسی ئێسکەکان دەکات، (**عِظَام**) کۆی (**عَظْم**) ە، واتە: ئێسك، بۆچی باسی ئەندامەکانی دیکە ناکات؟ لەبەر ئەوەی پەیکەری ئێسکی قالبی مرۆڤە و، پتەوترین شت لە مرۆڤیشدا ئێسکەکانن، ئنجا ئێسکەکان دوای ئەوەی دەڕزن و دەپڕتووکێن، خوا بتوانێ کۆیان بکاتەوە، مانای وایە ئەندامەکانی دیکە: گۆشت و ڕەگ و دەمارو چەوریی و ئەوانە، ئاسانتر جارێکی دیکە پەیدا دەکرێنەوە.

وشەی (بلى) ش: (**حَرْفُ إِبْطَالٍ للنَّفِي الَّذِي دَلَّ عَلَيْه، لَنْ نَجْمَعَ عِظَامَه**)، ئەوان گوتوویانە: خوا ئێسکەکانمان کۆناکاتەوە ئەوەش لابردنی (**نفي**) ە، ئنجا (**بَلَى**) پیتێکە بۆ پووچەڵکردنەوەی لابردنە، هەروەک بۆ پێناسەی (**بَلَى**) گوتراوە: (**حَرْفٌ إِثْبَاتٍ فِي جَوَابِ النَّفِي**)، پیتێکە بۆ چەسپاندن لە وەڵامی لابردندا، ئەوان پێیان وابووە ئێسکەکانیان کۆناکرێنەوە، خواش دەفەرموێ: با، بەڵکو زیاد لەوەش تواناداریین، کە سەرە پەنجەکانیشیان ڕێك بخەینەوە.

وشەی (**بَنَان**) کۆیە تاکەکەی (**بَنَانَة**)یە، واتە: یەك سەرە پەنجە، (**بَنَان**) سەرە پەنجەکان، ئایا بۆچی خوا ﷻ وشەی (**تَسْوِيَة**)ی بەکارهێناوە. ﴿ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴾؟ چونکە: (**التَّسْوِيَة: تَقْوِيمُ الشَّيءِ وَإِتْقَانُ الخَلْقِ**)، (**تَسْوِيَة**): بریتیە لە ڕێک و ڕاستکردنی شتێك و ورد دروستکردنی، ئنجا (**بَنَان**) کە ناوی کۆی (**بَنَانَة**) یە، ئایا بە مانای پەنجە دێ، یان بە مانای سەرە پەنجە (أَنْمُلَة) بەدڵنیاییی مانای دووەمیان ڕاسترە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ﴾، بـا ئێمـە تواناداریـن سـەرە پەنجەکانـی ڕێـك بخەینـەوە، هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: (**أَنْ نَجْعَـلَ أَصَابِعَهُـم مُلتَحِمَـةً مُنْدَمِجَـةً بَعْضُها بِبَعْـضٍ مِثْـلُ الحَافِـرِ**)، واتـە: دەتوانیـن پەنجەکانیـان پێکـەوە بلکێیـن و، هەندێکیـان لەگـەڵ هەندێکیانـدا دەمـج بکەیـن و، پێکیانـەوە جۆشـدەین، وەك سـمی وڵاخ! بـەڵام لـە ڕاستییدا بێگومـان (**نُسَـوِيَّ بَنَانـة**)، یانـی: سـەرە پەنجەکانی دروسـت بکەینـەوە، دوای ئـەوەی لـە بەیـن چـوو بـوون.

یەکێـك بـۆی هەیـە، بپرسـێ: بۆچـی خـوا ﷻ لـەو هەمـوو ئەندامـە سەرسوڕهێنەرانەی جەسـتەی مرۆڤـدا، باسـی سـەرە پەنجەکانـی کـردوە؟ وا پێدەچـێ یەکێـك لـە حیکمەتەکانـی باسـی ڕێکخسـتنەوەی سـەرە پەنجـەکان، ئـەوە بـێ کـە ئێسـتا زانسـت دەریخسـتوە، سـەرە پەنجـەی هیـچ کەسـێك کـە بەعەرەبـی پێـی دەگوتـرێ: (**بَصْمَـة**) بەکوردیـی: پەنجەمـۆر، کەهـی هیـچ کەسـێك لـە پەنجەمـۆری کەسـێکی دیکـە ناچـێ.

لـەو بـارەوە (**د. محمـد راتـب النابلسي**) لـە تەفسـیری (**النابلسي**)[1]دا، دەڵـێ: (**البَنَانُ هِـيَ الأَصَابِـعُ الإبْهَـام لَـهُ شَـكْلٌ وَلَـهُ خُطُـوطٌ فِيْهَـا دَوَائِـرُ وَمُلْحَنَيَـاتٌ وَجُـزرٌ وَنُتُوئَـاتٌ وَفُـرُوْعٌ، وَلَيْسَ فِي الأَرْضِ إِنْسَـانٌ يُشْـبِه إِبْهَامُـهُ إِبْهَـامَ إِنْسَـانِ أخَـر، صَـوّرُوا الإِبْهَـام وَكَـبَّروهُ بِحَجْـم مِـتْرٍ مُرَبَـعٍ، وَعَرَضُـوُا عَلَيْـه مِلْيُـونَ صُـوُرَة، فَـمَا اتَفَقَـتْ صُـورَةٌ مَـعَ الصُّـورَةِ الأُوْلَى، حَتَّـى إنَ بَعْـضَ المُجْرِمِـيْنَ فِي أَمْرِيْـكَا قَطَـع أَجْـزَاء مِـنْ أَجْزَائِهِـمْ الأخْـرَى، وَجَعَلُوْهَـا عَـلَى إبْهَامِهِـمْ، لَكـن بعـد أرْبَعـة أشْـهُرٍ ظَهَـرت الخُطُـوط نَفْسُـها عَـلَى الأجْـزَاء الجَدِيْـدَة**).

واتـە: (**بَنَـان**) بریتیـن لـە پەنجـەکان، [لـە ڕاسـتییدا بریتیـن لـە سـەری پەنجـەکان، چونکـە (**أَصَابِیـع**) پەنجەکانـە]، دوایـی دەڵـێ: (**إبْهَـام**) واتـە: سـەری پەنجـە، وێنەیەکی هەیـە، هەندێـك هێڵـی تێـدان و، هەندێـك بازنـەی تێـدان و هەندێـك قـۆرت و پێچـی تێـدان و، هەندێـك دوورگـەی تێـدان و، هە[illegible]

(1) ج١٠، ص١٨٠.

پۆپی تێدان، لە هەموو سەر زەوی مرۆڤێك نیە، سەرە پەنجەکەی لە هی مرۆڤێکی دیکە بچێ.

زانایان وێنەی سەرە پەنجەیەکیان گرت و، بە ئەندازەی مەتر چوار گۆشەیەك(م٢) گەورەیان کرد، دوایی یەك ملیۆن وێنەی سەرە پەنجەی خەڵکی دیکەیان هێنا، لەگەڵیان دا بەراورد کرد، لەو یەك ملیۆنە هیچیان لەوەی یەکەم نەچوون، [هەڵبەتە ئەوە بەس بۆ ئەزموون بووە، ئەگەرنا ئێستا دەرکەوتوە لە هەموو سەر زەویدا، سەرە پەنجەی هیچکەس وەك هی یەک دیکە ناچێ، نەك هەر لە ملیۆنێك بەڵکو لەو حەوت هەشت ملیارەی کە لەسەر زەوین] هەتا هەندێك لە تاوانباران ئەوانەی کەتن و تاوان دەکەن لە ئەمریکا، هەندێك بەشیان لە ئەندامەکانی دیکەی خۆیانیان برین و، لەسەر سەرە پەنجەکانیان دانان، پێیانەوە لکاندن، بەڵام دوای چوار مانگان هێڵ و هەمان شێوەی کە لەسەر پەنجەکان خوا دروستی کردوون، لەو ۆارچە ئازادانەشدا کە پێانەوە لکاندوون، دەرکەوتنەوە.

کەواتە: حیکمەتەکە ئەوەیە، یان حیکمەتێکی ئەوەیە کە ئەو وردەکارییەی لەو سەرە پەنجانەدا هەیە و زانست تازە دەریخستوە و ئیعجازێکی عیلمییە، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێك پێمان بڵێ: ئەو گۆشت و ئێسقانانە هەموویان تێکەڵ دەبن و، هەیە هەر هەمووی دەبێتەوە خاك و خۆڵ، ئایا خوای زانا و شارەزا یەک بەیەک دەیانناسێتەوە و لەیەکیان جیادەکاتەوە؟ دەگوترێ: دنیادا بەهۆی سەرە پەنجەکانیانەوە لێك دەکرێنەوە، لەوێشدا بە هەمان شێوە.

٥)- ﴿ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ﴾، بەڵکو مرۆڤ (مرۆڤی بێبڕوا)، دەیەوێ: لە ڕۆژگاری پێشەوەیدا هەر تاوانکاریی بکات. ﴿ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ﴾، بە دوو شێوە مانایان کردوە.

١- (أي: **يُكَذِّبَ بِمَا هَو قُدَّامَهُ مِنَ اليَوْمِ الأخِرِ**)، وشەی (**لِيَفجُرَ**)یان بە (**يُكَذِّبَ**) لێکداوەتەوە، ئەوەی لە پێشیەوەیەتی (لە ڕۆژی دوایی) بە درۆی دابنێ.

٢- (**يُرِيدُ أَنْ يَفْجُرَ فِي المُسْتَقْبَل مِنَ الزَّمَن**)، کە ئەمە [ئەم مانایە زیاتر دەچێتە عەقڵ و دڵەوە]، بەڵکو مرۆڤی بێبڕوا دەیەوێ لە ڕۆژگاری داهاتوویدا، وەکو ڕابردووی هەر بەردەوام بێ لەسەر گوناح، ( لیفجر **أَمَامَهُ**) واتە: ئەو ڕۆژگارەی لە پێشیەوەیەتی هەر بە گوناح بیداتە بەر.

٦)- ﴿ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، بۆیە دەپرسێ ڕۆژی هەڵسانەوە کەنگێیە؟

لێرەدا با تۆزێك تیشکی بخەینە سەر ئەو سێ وشەیە:

## أ- (الفُجُـــوُر):

(**فِعْـلُ السُّـوءِ الشَّـدِيْدِ ويُطْـلـقُ عَـلَى الكَـذِبَ، لِـذَا وصِفَـت اليَمِـيْنُ الكَاذِبـةُ بَالفَاجِـرَة، وَكَـذَّبَ: فَجَـرَ**)، (**فجـور**): بریتیـە لـە کردەوەیەکـی زۆر خـراپ و بـۆ درۆش بەکاردەهێنرێ، هـەر بۆیـە سـوێندی درۆ بـە (**اليَمِـيْنُ الفَاجِـرة**) سـوێندی فاجیـر وەصـف کـراوە، (**وَكَـذَّبَ أي: فَجَـرَ**)، درۆی کـرد یانـی: فجـووری کـرد.

## ب- (أَمَـــام):

(**أَمَـامَ: أَصْلُـهُ اسْـمُ قُبَالَـةِ مَـنْ أُضِيْـفَ إِلَيْـهِ**) (**أمَـام**): ڕیشـەکەی بریتیـە لـە نـاو، نـاوە بـۆ پێـش ئـەو کەسـەی پاڵدراوەتـە لای، (**أمَـام فُـلَانٍ**) واتـە: ئـەوەی لـە پێـش ویەوەیە، (**وَهُـوَ ضِـدُّ الخَلْـفِ وَيُطْلَـقُ عَـلَى الزَّمَـانِ المُسْـتَقْبل مَجَـازاً**)، (**أمَـام**) پێشـەوە پێچەوانـەی (**خَلْـفَ**)ە، دوایـی وشـەی (**أمـام**) بەکاردەهێـنرێ بـۆ کاتـێ کـە دادێ، هـەروەك چـۆن (**خَلْـف**) بەکاردەهێـنرێ بـە مەجـاز بـۆ کاتـێ تێپەڕیبـێ بـۆ ڕابـردوو، لەبەرئـەوەی مـرۆڤ کـە بـە شـوێنێکدا دەڕوات، ئـەو شـوێنەی لێـی تێدەپـەڕێ، دەکەوێتـە پشـتی، بـەڵام ئـەو شـوێنەی بـۆی دەچـێ دەکەوێتـە پێشـی، ئنجـا ئـەو دووە لـە ئەسـڵدا نـاوی شـوێنن، (**أمَـام**) شـوێنێکە لـە پێشـەوەیە و، (**خَلْـف**) شـوێنێکە لـە پشـتەوەیە، بـەڵام دوایـی (**أمَـام وخَلْـف**) بەکارهێـنراون، [(**أمَـام**) و (**قُـدَام**)، (**خَلْـف**) و (**وَرَاء**)]، لـە نـاوی شـوێنەوە خوازراونـەوە بـۆ نـاوی کات، (**أمَـام**) بـۆ کاتێکـە لـە پێشـتەوەیەو پێـی

نەگەیشتووی و، (وَرَاء) یاخود (خَلْف)یش بۆ کاتێکە لێی تێپەڕیوی و بەجێتهێشتوە.

کە دەفەرموێ: (أَمَامَه) ڕاناوەکەی دەچێتە بۆ مرۆڤ، واتە: ئەوەی لە داهاتووی ئەو مرۆڤە دایە، ئەوەی ماوە لە تەمەنی، (فَيُمْضِي قُدُماً رَاكِبَاً رَأْسَهُ لَا يُقْلِعُ عَمَّا هُوَ فِيْه)، ملی لێناوە بابای تاوانبار، سواری سەری خۆی بووەو، واز تاوانە ناهێنێ، کە لە پێشیەوەیەتی، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ﴾، واتە: بۆ ئەوەی تاوان بکات لەو کاتەدا کە لە پێشیەوەیەتی و ماوە و لە داهاتووشدا بەردەوام بێت، یاخود: مەبەست پێی بەدرۆ دانانە، واتە: ئەوەی لە داهاتوویە بە درۆی دابنێ کە ڕۆژی دواییە.

## ج- (أيَّـــــان):

وەك پێشتر گوتوومانە دەڵێ: (أيَّان: اسْمُ إِسْتِفْهامٍ عَنِ الزَّمَان البَعِيد، أَيْنَ آنُ كَذَا، أو أيُّ آنٍ، وَهُوَ لِطَلَبِ تَعِيْين أجل حُلُولِ يَوْمِ القِيَامَة)، (أيَّان) ناوی پرسیارکردنە لە کات کاتی دوور، (أَيَّانَ) لە چیەوە هاتوە؟ (أَيْنَ آنُ كَذَا) کاتی فلانە شتە کەنگێیە؟ یاخود (أيُّ آنٍ) چ وەختێك؟ لە ئەسڵدا بۆ داواکردنی دیاریکردنی کاتی هاتنی ڕۆژی دواییە، ﴿أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، واتە: ڕۆژی هەڵسانەوە کاتەکەی کەنگێیە، ئنجا خوا دەفەرموێ: بابای بێبڕوا دەیەوێ بە گوناح و تاوان بیداتە بەر لە داهاتوودا، بۆیە دەپرسێ؛ کاتی هاتنی ڕۆژی هەڵسانەوە کەنگێیە نکوولیی لێ دەکات، بۆ ئەوەی هەر لەسەر گوناح و تاوان بچێ و بەردەوام بێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**کاتێـک دوایـی دێ، چـاو ئەبڵـەق دەبـێ و، مانـگ خەفـە دەبـێ و، خـۆرو مانـگ پێکـەوە کـۆ دەکرێنـەوە، ئنجـا لەو کاتـەدا مرۆڤی بێبـڕوا دەڵێ: کـوا ڕاکردن؟ یان شـوێنی بـۆ لاڕاکـردن؟ واتـە: دەرفـەت نیـە، پێـی دەگوتـرێ: هیـچ پەناگەیـەك نیـەو سـەقامگیر بـوون هـەر لـە لای پەروەردگارتـەو، مرۆڤیـش هەواڵـی چاکـەو خراپـەی پێـدەدرێ و، هەرچەنـدە پـۆزش و بیانـوو بهێنێتـەوە، بـەڵام خـۆی بەسـەر خۆیـەوە چاودێـرە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

**١)-** ﴿ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴾، وەڵام دەداتەوە: کە لە ئایەتی پێشوودا بابای بێبڕوا دەپرسێ: ڕۆژی هەڵسانەوە کەیە؟ لێرەدا خوا هەر کاتێك چاو ئەبڵەق بوو، (**بَرِقَ أي: دَهِشَ وَتَحَيَّرَ**)، واتە: سەرسام بوو، ئەبڵەق بوو، وشەی (**بَرِقَ**) خوێندراویشەتەوە (**بَرَقَ**)، (**بَرَقَ أي: لَمَعَ، لَمَعَ مِنْ شِدَّةِ شُخُوصِهِ**)، چاو لە ئەنجامی زۆر کرانەوەی و ئەبڵەق بووندا، بریسکەی دێ، کاتێك چاو سەرسام و، ئەبڵەق بوو، یاخود بریسکەی هات، وشەی (**البَصَر**)یش (**أل**)ی ناساندنی لەسەرەو بۆ جینسە، واتە: هەموو چاوەکان، چاوی هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا ئەبڵەق دەبێ، یاخود سەرسام دەبێ، یان هێندە دەکرێتەوە، بریسکەی دێ.

**٢)-** ﴿ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴾، مانگیش ڕووناکییەکەی خەفە بوو، کەم بوو و کوژایەوە، وەك پێشتر گوتمان: (**الخُسُوفُ للقَمَرِ وَالكُسُوف للشَّمْسو أَوِ الكُسُوف لِكلَيْهِمَا**)، (**الخسُوف**) واتە: ڕووناکیی کەم بوون، یان ڕووناکیی نەمان، بۆ مانگە، بەڵام (**الكُسُوف**) بۆ خۆرە، خۆرەکە ڕووناکیی نەماو، هەروەها هەندێك گوتوویانە: بۆ هەردووکیانە.

٣)- ﴿ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ﴾، کاتێك مانگ و خۆر پێکەوە کۆ کرانەوە، لە ئایا چییدا پێکەوە کۆ کرانەوە و چۆن؟ هەندێك گوتوویانە: لە نەمانی شەوق و ڕووناکییان دا پێکەوە کۆ کرانەوە، یانی: مانگ ڕووناکییەکەی نەماو، خۆریش تیشکەکەی نەما، ئەوە، ب- ﴿ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ﴾، خۆرو مانگ پێکەوە کۆ کرانەوە، لە کاتێکدا خوا ﷻ بیەوێ کۆتایی بەم ژیانە دنیایە بێنێ، بەم گەردوونە بێنێ، لە ئەسڵدا کۆمەڵەی خۆر لە خۆر جیابوونەوە، بۆیە بە دەوریدا دەخولێنەوە، مانگ لە زەوی جیابۆتەوە، بۆیە بە دەوریدا دەخولێتەوە، ئنجا لە ڕۆژی دواییدا خوا ﷻ -وەك ئایەتەکەی سوورەتی **(الأنبياء)** ئاماژەی پێدەکات- وا پێدەچێ ئەم گەردوونە بچێتەوە نێو یەك بە جۆرێك لە جۆرەکان، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ١٠٤ ﴾، ئەو ڕۆژەی ئاسمانەکان، وەك چۆن تۆماری نووسراوەکان دەپێچرێتەوە ئاوا دەپێچرێنەوە، وەکو چۆن یەکەمجار دروستمان کردوون دەیگێڕینەوە، ئەمە بەڵێنێکە لەسەر ئێمە، بە دڵنیایی ئێمە ئەنجامدەرینی.

ئنجا ئایا یەکەم جار گەردوونە چۆن دروست بوو؟ لە کتێبەکانی خۆمدا، لە مەوسووعە [ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی داو، وە لە کتێبی: [خواناسیی ئاین، ئیمان] داو، دواجار زۆر بە ڕوونیی، لە مەوسوعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر تیشکی ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا) باسمان کردوە، نوێترین بیرۆدزە لەوبارەوە ئەوەیە کە ئەم گەردوونە، لە یەکەیەکی بچووکی یەکجار بچووکەوە، یەکجار گەرم، کە سینگۆلارتی(sinularity)ی پێ دەڵێن، واتە: تاکی گەردوونیی، یان هێلکەی گەردوونیی، یان تۆوی گەردوونیی، ئەو سینگۆلاریتییە تەقیوەتەوەو، لە ئەنجامدا ئەو گەردوونە بەم شێوەیە دروست بووە، واتە: گەردوون لە نەبوونەوە هاتوە، چونکە ئەم سینگۆلارتییە کە دەڵێن هێندە بچووك، بووە نەك لە گەردیلە بچووکتر، بەڵکو لە ئەلیکترۆن بچووکتر، کە تا ئێستا خەڵك نەك هەر ئەلیکترۆنی نەبینیوە، گەردیلەشی نەبینیوە، بەڵکو

گـەرد (molcule) یشـی نەدیـوە کـە لـە ملیۆنـان گەردیلـە پێـك دێ، کەچـی ئـەو سـینگۆلارتیە لـە ئەلیکترۆنیـش بچوکـتر بـووە.

خـوا ﷻ ئامـاژە بـەوەش دەکات، لە سـووڕەتی (**الأنبياء**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾، ئایـا ئەوانـەی بێبـڕوان نابینـن و نازانـن، کـە ئاسـمانەکان و زەوی جۆشـدراو بـوون، لێکـمان جیـا کردنـەوەو، هەمـوو ژیاندارێکیشـمان لـە ئـاو دروسـت کـرد، ئایـا هـەر بـڕوا ناهێنـن؟ کـە لـە یـەك ئایەتـدا خـوا ﷻ باسـی سـەرەتای دروسـتبوونی گـەردوون و، سـەرەتای دروسـتبوونی ژیـان دەکات، ئنجـا دەگونجـێ دوایـی خـۆر و کۆمەڵەکـەی خـۆی هەموویـان، جارێکـی دیکـە بچنـەوە نێـو خـۆر، ئـەو کاتـەش زەوی و مانـگ کۆدەبنـەوەو، خـۆر کۆمەڵەکـەی خـۆی بـە خۆیـەوە دەلکێنـێ، بـە پێـی ئـەو ئایەتـە موبارەکـە.

٤)- ﴿ يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ ﴾، مرۆڤ لەو ڕۆژەدا دەڵێ: پەناگەی ڕاکردن لە کوێیە؟ لە هەموو ئەم سووڕەتەدا، وشەی (**الإنسان**) وەك پێشتر گوتمان مەبەستی ئینسانی بێبڕوایە، چونکە بە سیاقەکان دا ئەوە دیار و ڕوونە: سەرەتا کە دەفەرمووێ: ﴿ أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُ ﴾، هەر دیارە ئینسانی بێبڕوا پێی وایە، خوا ئێسکەکانی کۆ ناکاتەوە، ﴿ بَلْ يُرِيدُ الْإِنسَانُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ ﴾، بەڵکو ئینسان دەیەوێ لە پێشیەوە، هەر بەرەو لە گوناح و تاوان مل بنێ.

ج- هەروەها لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿ يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ ﴾، بەدڵنیایی ئەوە ئینسانی بێبڕوایە، کە دەڵێ: ڕاکردن لە کوێیە، ئەگەرنا ئینسانی بڕوادار لەو ڕۆژەدا، بە ئاواتی خۆی دەگات و، شادەمان و، دڵخۆشە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ ﴾**عبس**، واتە: لەو ڕۆژەدا ڕووانێکی ڕوون و گەشاوە هەن، دەم بە پێکەنین و دڵخۆشن، بەڵام ئەوە ئینسانی بێبڕوایە کە دەڵێ: ﴿ أَيْنَ الْمَفَرُّ ﴾، ڕاکردن لە کوێیە؟ وشەی (**مَفَرّ**)یش چاوگە بە مانای ڕاکردن (**فِرار**)، (**أَيْنَ الفِرار**) ڕاکردن لە کوێیە؟

حەسەنی بەصڕایی خوێندویەتەوە: (أينَ المِفر، المِفَر: اسْم مَكَانٍ وَمَصْدرٌ)، ناوی شوێنەو چاوگیشە، بەڵام زۆربەیان بە (مَفَر)یان خوێندۆتەوە.

٥)- ﴿كَلَّا لَا وَزَرَ﴾، نەخێر [وازبێنە لە گەڕان بە دوای ڕاکردندا]، هیچ پەناگەیەک نییە، **(لَا وَزَر، الوَزَر: المَكَان الَّذِي يُلْجَأ إليْهِ للتَوَقِي مِنْ إصَابَة مَكْرُوه مِثْل الجِبَال وَالحُصُون)**، **(وزرة)** ئەو شوێنەیە کە پەنای پێ دەبردرێ بۆ خۆپاراستن، لە شتێکی خراپ و ناخۆش، وەك چیایەکان و قەڵایەکان، واتە: هیچ پەنایەك نیە، وەزیریش بۆیە پێی دەگوترێ: وەزیر، چونکە حوکمڕان بەهێز دەکات، حوکمڕان پەنای پێدەبات بۆ ڕاوێژکردن و بەهرە وەرگرتن لە عەقڵ و ڕاوبۆ چوونی، واتە: نەخێر هیچ شوێنی ڕاکردن و پەنا پێبردن و خۆ تێگرتن نیە، لێرەدا پێویستە بزانرێ کە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەت پێکەوە دەمج کراون، چونکە ئەو ڕووداوانەی ڕوو دەدەن: چاو ئەبڵەق دەبێ، مانگ خەفە دەبێ، خۆرو مانگ پێکەوە کۆدەبنەوە، هەموویان لە ڕۆژی دواییدا دەبن، هەڵبەتە چاو ئەبڵەق بوونەکە، دەشگونجێ لە قیامەتیشدا ببێ، بەڵام بێگومان مانگ خەفە بوون و، شۆق نەمانی و، پێکەوە کۆبوونەوەی خۆرو مانگ، لە ئاخیر زەماندایە، لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدایە، بەڵام کە مرۆڤ دوایی دەڵێ: ﴿أَيْنَ الْمَفَرُّ﴾، ڕاکردن لە کوێیە؟ ئەوە لە قۆناغی قیامەت و هەڵسانەوەدایە، یانی: لێرەدا وەك و لە هەندێك شوێنی دیکەش دا ئەوە هەر هەیە، خوای موتەعال هەردوو قۆناغەکەی ئاخیر زەمان و قیامەت پێکەوە باس دەکات، پێکەوەیان ئاوێتە دەکات، چونکە ئەوانەی دیکە کە دێن، هەموویان مەبەست پێیان، ئەو ڕووداوانەن کە  لە قیامەتدا دەقەومن.

٦)- ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ﴾، لەو ڕۆژەدا نشینگە و سەقامگیر بوون و، گیرسانەوە بۆ لای پەروەردگارتە، ئەمە ڕێمان لێدەگرێ  بڵێین: ﴿يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ﴾، مرۆڤ دەڵێ: ڕاکردن لە کوێیە، کە لەگەڵ ئاخیر زەمانیشدا دەگونجێ، هەروەها: ﴿كَلَّا لَا وَزَرَ﴾،نەخێر هیچ پەناگەیەک نییە، کە ئەمەش لەگەڵ ئاخیر زەماندا هەر دەگونجێ، بەڵام کە دوایی دەفەرموێ: ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ﴾، نیشتەجێ بوون و گیرسانەوە تەنیا بۆ لای پەروەردگارتە، هەروەها دوایی کە دەفەرموێ: ﴿يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾،

لەو ڕۆژەدا ئینسان هەواڵی پێدەدرێ، بەوەی کە پێشیخستوەو دوایخستوە،دوایی دەفەرمووێ: ﴿ بَلِ ٱلْإِنسَـٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴾، بەڵکو مرۆڤ بەسەرخۆیەوە چاودێرەو شایەدە، هەرچەندە بیانووەکانی بخاتەڕوو، ئەمانە هەموویان بەدڵنیایی بە تەئکید لە قۆناغی ڕۆژی قیامەتدا دێنە دی.

(**الْمُسْتَقَر: مَصْدرٌ مِيمِيٌّ مِن اسْتَقرَّ إذَا قَرَّ فِي المَكَان وَلَمْ يَنْتَقل**)، (**مُستقر**) چاوگی میمییە و لە (**استقرَّ**)ەوە هاتوە، (**إسْتَقَر أي: قَرَّ**)، لە شوێنەکە چەسپا و لانەچوو، کەواتە: ﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴾، واتە: گیرسانەوەو نیشتەجێ بوون لەو ڕۆژەدا بۆ لای پەروەردگارتە، (**مَوْضِعُ قَرَارِهِمْ مِن جَنَّة أو نَارٍ مُفَوضٌ إلى مَشِيَئَة الله سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى**)، نیشتەجێ بوونیان لە لای پەروەردگاریانە، یاخود: شوێنی نیشتەجێ بوونیان، لە بەهەشتدا، یاخود لە ئاگردا، عایدی ویستی خوای پاک و بەرزە.

٧)- ﴿ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَـٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴾، مرۆڤ هەواڵی پێدەدرێ، بەوەی پێشیخستوەو بەوەی دوایخستوە:

هەڵبەتە لێرەدا دەگونجێ مەبەست پێی مرۆڤ بێ بە گشتیی، چونکە مرۆڤەکان هەموویان بە چاك و خراپەوە هەواڵیان پێدەدرێ و، لە ڕاستییدا چاك و خراپەکانیان دەخرێنەوە بەرچاویان، بەڵام بەپێی سیاق دەڵێین، لێرەدا مەبەست پێی ئینسانی بێبڕوایە، واتە: ئینسانە بێبڕوایەکان، لەو ڕۆژەدا هەواڵیان پێدەدرێ بەوەی پێشیانخستوە لە خراپان، لە تاوان و سەرپێچیەکان و، دوایان خستوە لە فەرمانبەریی و چاکەکان، ئەگەر مەبەست پێی ئینسانی بێبڕوا بێ، دەبێ ئاوا تەفسیر بکرێ، ئەوەی کە پێشیخستوە لە گوناهو تاوان، ئەوەی دوای خستوە لە فەرمانبەریی و لە گوێڕایەڵی بۆ خوا ﷻ و بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

٨)- ﴿ بَلِ ٱلْإِنسَـٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴾، **بەڵک و مرۆڤ بەسەر خۆیەوە چاودێرە**، ئەمە گواستنەوەیەکە بۆ بەرزبوونەوە لە نێوەڕۆکی ئەوەی کە فەرمووی: ﴿ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَـٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴾، لەو ڕۆژەدا مرۆڤ، (مرۆڤی بێبڕوا) هەواڵی پێدەدرێ بەوەی کە پێشی

خستوەو دوایخستوە، بەڵكو زیاتر لەوەش، ﴿ بَلِ ٱلْإِنسَـٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴾، هەواڵی پێدەدرێ هیچ، بەڵكو زیاد لەوەش.

أ- مرۆڤ خۆی بەسەر خۆیەوە چاودێرە، (**بَصِيْرَة**) یانی: (**بَصِيرٌ بنَفْسِه**) بە خۆی بۆ خۆی شارەزاو ئاگادارە، بۆچی فەرموویەتی: (**عَلَى نَفْسِه**)، بە (**عَلَى**) بەرکاری خواستوە؟ (**لِتَضْمِيْنِ مَعْنَى المُرَاقَبَة، مِثْل:** ﴿ ٱقْرَأْ كِتَـٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾**الإسراء**، (**أَي: شَاهِدٌ بِمَا صَدَرَ عَنْهُ مِنَ الأَعْمَالِ السَّيِّئَةِ وَالتَاءُ للمبَالَغَة مِثْل العَلاَّمَة**)، واتە: لەو ڕۆژەدا مرۆڤ چاودێرە بەسەر خۆیەوە و بۆیە بە (**عَلَى**) بەرکاری خواستوە، تاکو مانای چاودێریکردنی بخرێتە نێو، واتە: چاودێرە بەسەر خۆیەوە، بەڵگەیە بەسەر خۆی و چاودێریشە، وەك: ﴿ ٱقْرَأْ كِتَـٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾**الإسراء**، واتە: ئەمڕۆ تۆ بەسی لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتدا بکەی، واتە: لەو ڕۆژەدا مرۆڤ شایەدیی لەسەر خۆی دەدات، لە کردەوە خراپەکانیی، (**بَصِيْرَة**)ش (تاء)ی خراوەتە سەر، بۆ زێدەڕۆییە، وەك (**عَلاَّمَة**) زۆر زانا.

ب- واتایەکی دیکەی: مرۆڤ لەو ڕۆژەدا بەڵگەیە لەسەر خۆی، (**بَصِيْرَة**) بە مانای (**حُجَّة**) دێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ ﴿١٠٤﴾ ﴾**الأنعام**، لە پەروەردگارتانەوە بەڵگە ڕۆشنەکانتان بۆ هاتوونز

ج- ڕایەکی دیکەش هەیە: (**هُنَاكَ مَنْ هو عَلَيْه بَصِيْرَةٌ وَهم المَلاَئِكَة**)، کەسانێك هەن بەڵگەن بەسەریەوە، کە مەبەست پێ فریشتەکانن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ بَلِ ٱلْإِنسَـٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

١- خوارِسكێك كە خوا مرۆڤ لەسەر خولقاندوە، لە زاتی خۆیدا ئەوە دەزانێ، كە لە خوای نزیك دەخاتەوەو، هەروەها ئەوەش كە لە خوای دوور دەخاتەوە.

**٢**- مەبەست لە مرۆڤ ئەندامەکانی کە شایەدیی لێدەدەن، وەك لە سووڕەتی (**فُصلت**) دا خوای پەروەردگار باسی کردوە، ﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾**يس**.

٩)- ﴿ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾، هەرچەندە (مرۆڤ) پاساوەکانی و بیانووەکانیشی فڕێبدات، وشەی (**مَعَاذِيْرة**) کۆیەو بەهۆی پاڵدرانە لاوە کراوە بە ناسراو، (**يَعْنِي جَمْعٌ مُعَرَّفٌ بالإِضَافَةِ**)، ئەمە مانای گشتیی دەگەیەنێ، واتە: هەرچەندە مرۆڤ تێکڕای بیانوو و پاساوەکانی خۆی فڕێبدات، بەڵام دواجار خۆی بەسەر خۆیەوە شایەدە، ئەمە لێرەدا هەمووی دەبێتە حاڵ، بۆ ڕاناوێک کە لە نێو (**بَصِيْرَة**)دا شێردراوەتەوە، یاخود لە (**يُنَبأ**)دا شێردراوەتەوە، لە حاڵێکدا کە بەڵگەکانی فڕێ دەدا، بیانووەکانی دێنێتەوە ئەو مرۆڤە، بەڵام بۆ خۆی بەسەر خۆیەوە شایەدە.

وشـەی (**مَعَاذِيـر**) دەڵـێ: (**اسْـمُ جَمْـع للمَعْـذِرَة، كَالْمَنَاكِـر اسْـمُ جَمْـع للمُنْكَـر، لَا جَمْـعٌ، لأنَّ الجَمْـعَ مَعَـاذِر، وَقِيْـلَ مَعَاذِيْـر جَمْـعُ مِعْـذَار، وَهُـوَ سَـتْرٌ أي: وَلَـوْ أرْخَـى سُـتُورَهُ**)، (**مَعَاذِيْـر**) یـان نـاوی کـۆی (**مَعْذِ**)یـە، واتـە: پۆزشـەکان، وەك چـۆن (**مَنَاكِـر**) نـاوی کـۆی (**منكـر**)ە واتـە: خراپـەکان، نـەك کـۆ بـێ بەڵکـو نـاوی کۆیـە، چونکـە کـۆی (**مَعْـذِ**) (**معـاذر**)ە، بـە ژێـر (**كَسر**)، هەندێکیـش گوتوویانـە: (**مَعَاذِيْـر**) کـۆی (**مِعْـذار**)ە، (**مِعْذار**)یـش بـە مانـای پـەردە دێ، واتـە: هەرچەنـد مـرۆڤ پەردەکانـی دابداتـەوە لـە کاتـی گوناهـو تاوانـدا، بـەڵام خـۆی بەسـەر خۆیـەوە شـایەدە .

دەشـگونجێ: ﴿ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾، حـاڵ نەبێـت لـە (**بَصِـيْرة**) لـە (**يُنَبَّأُ**)، بەڵکـو ڕسـتەیەکی دەسـت پێکـردن بـێ، (**أي: ولَـوْ أَلْقَـى مَعَاذِيْـرَهُ مَـا قُبِلَـتْ مِنْـهُ**)، هەرچەنـدە پۆزشـەکانی خـۆی فڕێبـدات و بیانخاتـەڕوو، بـەڵام لێـی وەرناگیرێـن، چونکـە ئەندامەکانـی خـۆی بەسـەریەوە بەڵگـەو شـایەدن.

شـایانی باسـە شـەش جـاران وشـەی (**الإنسـان**) لـەم سـووڕەتە موبارەکـەدا هاتـوە، لـە ئایەتەکانـی (٣،٥،١٠،١٣،١٤،٣٦،) دا و لـە هەموویانـدا یـان مەبەسـت پێـی مرۆڤـی

بێبڕوایە، یان بابایەکە دەستی هیدایەتی خوای پێ نەگەیشتوە، یان لەبەر ئەوەی ئەو کاتە مرۆڤەکان هەموویان لەو جۆرە بوون، ئەم سێ ئەگەرە هەن، بەڵام ئەگەری یەکەمیان لە هەموویان بەهێزترە، کە مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوایە.

(**إبن العربي**) لەم دوو ئایەتە موبارەکە: ﴿ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾ ﴾، چەند حوكمێكی وەرگرتوون، من چواریانم هێنان[1]:

**١-** دەڵێ: ئەم ئایەتە موبارەکە بەڵگەی تێدایە، لەسەر ئەوەی کەسێك، بۆ خۆی دانپێدا بێنێ، لەسەری بە بەڵگە حیسابە، چونكە دانپێداهێنانی مرۆڤ وەك گوتراوە: (**الإقْرارُ سيد الأدِلَّة**)، دانپێداهێنان گەورەی هەموو بەڵگەکانە و، ئەوە شایەدیی دانە لەسەر خۆ.

**٢-** هەروەها لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ، کە دانپێداهێنان تەنیا هی کەسێك کە ئەرکدار(**مكلَّف**) کرابێ، واتە: عاقڵ و باڵغ بێ وەردەگیرێ، وەك بەڵگە، ئەویش بە مەرجێك ڕێلێگرتن (**حَجْر**) نەخرابێتە سەر، واتە: تەصەڕووف کردن و هەڵسوکەوت کردنی لێ قەدەغە نەکرابێ.

**٣-** هەروەها بەڵگەی تێدایە، لەسەر ئەوەی مرۆڤ ئەگەر دانیشی بە شتێکدا هێنابێ، بە تایبەت لەو سنوورو سزایانەدا، کە پەیوەندییان بە نێوان خۆی و خواوە هەیە، دەتوانێ لێی پاشگەز بێتەوە، هەروەك و لەو فەرمایشتەدا، کە صەحیحی بوخاریی و موسلیم دا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماعیز کە دێت و دان بە زینادا دێنێ، چوار جاران ڕەتی دەکاتەوە، دوای ئەوەی چوار جار دان پێدا دێنێ، دەپرسێ: ئایا شێتی؟ دەڵێ: نەخێر، دەفەرمووێ: ئایا هاوسەرداری؟ دەڵێ: بەڵێ، دواییش کە لەژێر سزادرانەکەدا ڕادەکات، وەك لە (**سنن أبي داود**) دا هاتوە، هاوەڵان شوێنی دەکەون، لە کاتی بەرد باران کردنەکەدا ڕادەکات، کردنەکەدا، یەکێکیان شەویلاگەی حوشترێکی پێدادەداو دەیخات، دوایی تەواوی دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**هَلَّا تَرَكْتُمُوهُ لَعَلَّهُ أَنْ يَتُوبَ فيَتُوبَ الله عَلَيهْ**}واتە: بۆ چی وازتان لێنەدەهێنا، بەڵكو دەگەڕایەوە (بۆ لای خوای

---

(١) أحكام القرآن: ج٤، ص١٨٧٨ - ١٨٨٢.

به‌به‌زه‌یی) و، خواش تۆبه‌ی لێوه‌رده‌گرت، که‌واته‌: ئه‌گه‌ر مرۆڤ له‌ دانپێداهێنانی خۆی په‌شێمان بێته‌وه‌، سزای له‌سه‌ر لاده‌چێ، ئه‌مه‌ ڕای زۆربه‌ی زانایانه‌.

٤- له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا پۆزش هێنانه‌وه‌ سوودی نیه‌، وه‌ك له‌ سووره‌تی (**الروم**) ئایه‌تی (٥٧)دا، خوا زۆر به‌ ڕوونیی ده‌فه‌رموێ: ﴿فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَعۡذِرَتُهُمۡ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ٥٧﴾، واته‌: له‌و ڕۆژه‌دا پۆزش هێنانه‌وه‌ سوود ناگه‌یه‌نێ به‌ سته‌مکاران، ئه‌وانه‌ی سته‌میان له‌ خۆیان کردوه‌، هه‌روه‌ها داواشیان لێ ناکرێ، گله‌یی خوا له‌سه‌ر خۆیان لابه‌رن.

### مەسەلەی سێیەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە پەلە نەکات و زمان نەجووڵێنێ لە کاتی وەرگرتنی قورئان لە جیبریل دا، بەڵکو پاش خوێندنەوەی جیبریل بۆ قورئان، ئەویش شوێنی بکەوێ بە دوایداو، دڵنیاش بێ خوا لە عەقڵ و سینەی دا کۆی دەکاتەوەو ڕوونیشی دەکاتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾، زمانتی پێ مەجووڵێنە، تاکو پەلەی لێ بکەی، ئەم چوار ئایەتە موبارەکە، باسی بابەتێك دەکەن کە جیایە، لە باسی سەرەکیی ئەم سوورەتە موبارەکە، کە باسی ڕۆژی دوایی و قیامەتە، خوا ﷻ ئەم مەسەلەیەی نێواخنی ئەم بابەتە کردوە، دیارە لەو کاتەدا، کە جیبریل ئەم ئایەتە موبارەکانەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندوونەوە، پێغەمبەر ﷺ لەبەر سوور بوونی و، زیادە گرنگیی و بایەخدانی بەوەی ڕێك وەك و جیبریل ئایەتەکان بڵێتەوە، لەگەڵیدا گۆی کردون، بێژتوونی، خوا ﷻ ڕێنمایی کردوە، کە زمانی پێ نەجووڵێنێ، ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ﴾، ڕاناوەکە بۆ قورئان دەچێتەوە، بەڵێ پێشتر باسی قورئان نەکراوە، بەڵام هەر دیارە، ئەوەی بەسەریدا خوێندراوەتەوە، هەر قورئان بووە و ئەوەش لە قورئاندا زۆرە، جاری وایە خوا ﷻ باسی شتێکی نەکردوە، یەکسەر ڕاناوێکی بۆ لا دەگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ.

یەکێك لە زانایان ئاوای مانا لێکداوەتەوە: (**لَا تُحَرِّكْ بِالْقُرْآنِ لِسَانَكَ، عِنْدَ إِلْقَاءِ الوَحِي مِنْ قَبْلِ أَنْ يُقْضَى إِلَيْكَ وَحِيُه، لِتَأْخُذَهُ عَلَى عَجَلَة مَخَافَة أَنْ يَنْفَلت مِنْكَ، أو**

لِمَزِيْـد حُبِّـكَ وحِرصِـكَ عَـلَى أَدَاءِ الرِّسَـالَة)، واتـە: زمانـت بـە قورئـان مەجووڵێنـە، لـە کاتێکـدا وەحییـت بـۆ دەنێـردرێ، بـەر لـەوەی سرووشـکرانەکە تـەواو بـێ، زمانتـی پـێ مەجووڵێنـە، تاکـو بەپەلـە وەریبگـری، لـە ترسـی ئـەوەی وشـەیەکت لـە دەسـت بچـێ، یـان لەبـەر زێـدە سـوور بوونـت و، گرنگیـی و بایەخدانـت بـەوەی، پەیامـی خـوا ﷻ وەربگـری و دوایـی بیگەیەنـی.

٢)- ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴾، بە دڵنیایی کۆکردنەوەی و خوێندنەوەی لەسەر ئێمەیە، واتە: کۆکردنەوەی لە دڵ و سینەی تۆداو، لە عەقڵ و دڵی تۆدا، هەروەها خوێندنەوەشی بە زمانی تۆ لەسەر ئێمەیە.

٣)- ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴾، ئنجا کە خوێندمانەوە، تۆش شوێن خوێندنەوەکەی بکەوە.

٤)- ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴾،ینجا بەدڵنیاییەوە ڕوونکردنەوەشی لەسەر ئێمەیە ئەمە دوو واتای هەن:

١- واتە: ڕوونکردنەوەی واتایەکانی بۆ تۆ لەسەر ئێمەیە، خوا دەفەرموێ: ئەوە کاری منە، کە مانایەکانی بۆ تۆ ڕوون بکەمەوە و تێتبگەیەنم.

٢- واتە: گەیاندن و ڕوونکردنەوەی بۆ خەڵك بە زمانی تۆ، لەسەر زمانی تۆ، بە خەڵکی بگەیەنین، ئەوەش لەسەر ئێمەیە.

## مانای لێکدانەوەیەکی دیکە و هەڵوەشاندنەوەی

لێـرەدا هەندێـك لـە زانایـان، بـە جۆرێکـی دیکـە ئـەم ئایەتانەیـان مانـا کـردوون، وەك لـە مانـا گشتییەکەشـیدا هـەر باسـمان کـرد، گوتوویانـە: لێـرەدا ڕووی دوانـدن لـە مرۆڤـی گوناهـکارە، ئنجـا ئەگـەر ڕووی دوانـدن لـە مرۆڤـی گوناهکاربـێ و، دواندنەکـەی لـە قیامـەت دا بـێ، ئـەو کاتـە ئـەم چـوار ئایەتـە نابنـە شـتێکی نامـۆ

و، نابنە مەسەلەیەکی دیکەی جیا، لە بابەتە سەرەکییەکەی ئەم سوورەتەو، لەگەڵی دا نێواخن و ئاوێتە کرابن، ئاوایان لێکدەدەنەوە: ئەی مرۆڤی تاوانبار! کە لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێ، زمانتی پێ مەجووڵێنە، بە خوێندنەوەی لیستی کردەوەکانت، تاکو پەلە بکەی، چونکە لەسەر ئێمەیە لیستی کردەوەکانت، کە گوناهەکانتی تێدا کۆکراونەوە، کۆکردنەوەی گوناهەکان لەسەر ئێمە بووە لەو لیستەداو، خوێندەوەشیان بەسەرتدا لەسەر ئێمەیە، ئنجا هەر کاتێك ئێمە بەسەرماندا خوێندیەوە، تۆش شوێن خوێندنەوەکەی بکەوە، دواییش لەسەر ئێمەیە بۆت ڕوون بکەینەوە، چییت کردوەو چییت نەکردوە!

هەڵبەتە ناڵێم: ئەم مانا لێکدانەوەیەش لە ڕووی ڕێزمانیی و ڕواڵەتی ئایەتەکەوە، بەڵام بە پێی سەرنجدانی نێوەڕۆکی ئایەتەکان و سیاقی ئایەتەکان، هەروەها هاتنە خواریشی، کە پێشتر باسمان کردو، دواییش ئەو ئایەتەی دیکەی سوورەتی (طه)، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾، کاتێك قورئانت بۆ دادەبەزێنرێ، پەلەی لێمەکە، پێش ئەوەی سروشکرانەکەی تەواو بێ، تۆ بڵێ پەروەردگارم زانیارییم بۆ زیاد بکە.

ئەوانە هەموویان ڕێگرن لەوەی ئەو مانایە لێك بدرێتەوە و، هیچ پێویستیش بەو جۆرە مانا لێکدانەوەیە ناکات، ئەوە زیاتر لە کاردانەوەی تۆمەتیی و گومانە دەستکاریکرانی قورئاندا گوتراوە، وەك (**الألوسي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] هێناویەتی، دەڵێ: (**وَقَدْ انْدَفَع بِه اعْتِرَاضُ بَعْضِ الزَّنَادِقَةِ وَشرذمة مِنْ قُدَمَاء الرَّافِضَة وَالطَّعْنِ فِي القُرْآن**)، واتە: بەو شێوە مانا لێکدانەوەیە، ڕەخنەگرتنی هەندێك لە زەندایقەکان و، کۆمەڵێکی کەم لە پێشینەکانی ڕافیزە [واتە: شیعە] و تانەدانیان لە قورئان بەو جۆرە مانا لێکدانەوەیە، بەرپەرچ دەدرێتەوە.

---

(١) (روح المعاني): ج١٥، ص٢٠٣.

کە گوتوویانە: (**أَنَّهُ لَا وَجْه لِوُقُوْع:** ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴾، **فِي أَثْنَاء أُمُوْر الْأَخِرَة، وَلَا رَبْطَ فِي ذَلِكَ بِوَجه مِنَ الوُجُوه، وَجَعَلُوْا ذَلِكَ دَلِيْلًا لِمَا زَعَمُوْه مَن أن الْقُرْآنَ قَدْ غُيِّرَ وَبُدِّلَ وَزِيدَ فِيهِ وَنُقِصَ مِنْهُ**)، واتە: هیچ ڕوویەکی لۆژیکی نیە، کە ئەم ئایەتە موبارەکانە: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴾ تاکو کۆتایی، بخزێنرێنە نێو بابەتێك کە باسی ڕۆژی دوایی دەکات و، هیچ پێکەوە پەیوستیەکیان نیەو، ئەوەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەوەی گومانیان بردوە، کە قورئان گۆڕاوەو دەستکارییکراوەو، لێی زیاد و کەم کراوە.

دەڵێن: بەڵکو ئەمە قسەیەکە خوا نێواخنی کردوە، لەسەر شێوەی ئاوڕدانەوەو، میهرەبانیی نواندن لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا ﷺ.

هەر ئەو مەسەلەیە (**فخر الدين الرازي**)ش لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، ئاماژەی پێداوە و دەڵێ: (**زَعَمَ قَوْمٌ مِنْ قُدَمَاءِ الرَّوَافِضِ أَنَّ هَذَا الْقُرْآنَ قَدْ غُيِّرَ وَبُدِّلَ وَزِيدَ فِيهِ وَنُقِصَ عَنْهُ، وَاحْتَجُّوا عَلَيْهِ بِأَنَّهُ لَا مُنَاسَبَةَ بَيْنَ هَذِهِ الْآيَةِ وَبَيْنَ مَا قَبْلَهَا، وَلَوْ كَانَ هَذَا التَّرْتِيبُ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى، لَمَا كَانَ الْأَمْرُ كَذَلِكَ**).

واتە: کۆمەڵێك لە ڕافیزەکانی پێشوو، پێیان وا بووە قورئان گۆڕدراوەو دەستکاریی کراوەو، لێی زیاد و کەم کراوە، ئەوەشیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، کە ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتەکانی پێشووی دا، هیچ پێکەوە گونجاو نین و، ئەگەر ئەو ڕیزبەندیی ئایەتانەو، ئەو فەرمایشتە لەلایەن خوای بەرزەوە بووایە، بەو شێوەیە نەدەبوو، [بەڵام دیارە ئایەتەکان دەستکاری کراون و پاش و پێش کراون، یاخود گۆڕدراون].

دوایی (**الرازي**) شەش بەڵگان دێنێتەوە لەسەر پێکەوە گونجاویی ئایەتەکان، کە بە پێویستم نەزانی ئاماژەیان پێ بدەم، گرنگ ئەوەیە -ئەو قسەیە کە

---

(١) ج١٥، ص٢٠٧، ٢٠٨.

ڕیزبەندیـی ئایەتـەکان بەوجـۆرەک هـەن، بەڵگـەی دەسـتکاتیکرانی قوڕئانـە- قسـەیەکی پووچـە و، لـە ڕاسـتییدا خـوا ﷻ جـاری وا هەیـە، لـە نێـو چەقـی بابەتێکدا ئامـاژە بـە بابەتێکـی دیکـە دەکات، یاخـود بابەتێکـی دیکـەی لەگـەڵ نێواخـن دەکات، ئـەوەش نـەك هـەر ناکرێتـە بیانـوو بەڵگـەو دەسـتچیلەی لـە قوڕئـان کەوتنـە گومـان، بەڵکـو ئـەوە زیاتـر دەرخـەری ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ بـەو شـێوەیەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە واقیعـی ژیانـی خۆیـدا ژیـاوە، بـەو شـێوەیە دواندوویەتـی، لـەو کاتـەدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە جیبریـل قوڕئانەکـەی بـۆ دابەزانـدوە، پەلـەی کـردوەو، ویسـتوویەتی یەکسـەر بەپەلـە بیڵێتـەوە، ئیـدی خـواش ﷻ هۆشـداریی پێـداوەو ڕێنمایـی کـردوە، چـۆن لەگـەڵ دابەزێندرانـی قوڕئانـدا مامەڵـە بـکات!

سەرنجی ئەو سێ تەفسیرانەشم دا، کە هی شیعانن و لە لا من:

**١-** تەفسیری (**الميزان**): هی (**محمد حسين الطباطبائي**)

**٢-** تەفسیری (**كاشف**): هی (**محمد جواد مغنية**)

**٣-** تەفسیری (**نمونه**): هی (**ناصر مكارم شيرازي**)و چەند زانایەکی دیکە.

بـە باشـم زانـی ئـەو دوو سـێ دێـڕە، لـە تەفسـیری (نمونـە)[1] بگوازمـەوە دەڵـێ: (**إن آيات درزصمـن بيانگر أصالـت قـرآن وحفـظ آن أزهـر كونـه تحريـف ودگرگوني أست، چـرا كـه خداونـد وعـده جمـع تـلاوت وبيـان آن را داده أسـت**)، واتـە: ئـەم ئایەتانـە ئەوە دەگەیەنـن و، ڕوونکـەرەوەی، ڕەسـەنایەتی قوڕئانـن و پاراسـتنی قوڕئـان، لـە هـەر جـۆرە گـۆڕان و دەسـتکاریی کردنێـك، چونکـە خـوا، گفتـی خوێندنـەوەو کۆکردنـەوەی قوڕئانـی بـە پێغەمبـەر ﷺ داوە، کەواتـە: ئـەم کۆکردنـەوەی لـە دڵ و سینەیدا، هـەم خوێندنـەوەی و، هـەم ڕوونکردنـەوەی و هـەم پاراسـتنی قوڕئـان دەگەیەنـێ.

---

(١) ج٢٥، ص٢٩٩.

لە پێشەکی گشتی ئەم تەفسیرەشدا کورتە باسێکی چڕو پڕمان لە بارەی قورئانەوە کردوە: مانای قورئان و، کۆکرانەوەی قورئان، پارێزرانی قورئان و، کۆمەڵێك مەسەلەی دیکەی پەیوەست بە قورئا[1]

---

لەچاپی دووەمی ئەم تەفسیرەدا ئەو بابەتە کەوتۆتە بەرگی یەکەمەوە، بەجیاش بە ناونیشانی: [قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا] چاپ و بڵاوکراوەتەوە

**مەسەلەی چوارەم:**

**سەرزەرنشتکردنی بێبڕوایان، کە تەنیا ژیانی زوو تێپەڕی دنیایان خۆشدەوێ و دوارۆژ وێڵ دەکەن، لەو ڕۆژەش دا خەڵك دەبنە دوو بەش: کەسانێکی شادمان و ڕووگەش و تەماشاکەری خوا ﷻ و، کەسانێکی ڕەنگ و ڕوو تاڵخ و مەینەتبارو، چاوەڕێی بەڵای کەمەرشکێنکەر:**

خوا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)** - ﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ﴾، نەخێر بەڵکو ژیانی زوو تێپەڕی دنیاتان خۆشدەوێ. (كَلَّا) وەك زۆرجار گوتوومانە: (**كَلِمَةُ رَدْعٍ وَزَجْرٍ وَإِبْطَال**)، وشەیەکە بۆ تێوەخوڕین و بەرپەرچدانەوە، و هەڵوەشاندنەوەی قسەیەك، کە لەو ڕەوتە دەفامرێتەوە، بەکاردەهێنرێ، (كَلَّا) واتە: وانیە وەك ئێوە گومان دەبەن و خەیاڵ دەکەن، یاخود وازبێنن لەوەی ئێوە خەریکنی کە باوەشتان بە دونیادا کردوە، ﴿بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ﴾، بەڵکو ئێوە ژیانی زوو تێپەڕی دنیاتان خۆشدەوێ.

کە ئەوە لێرەدا وا پێدەچێ ئاماژە بێ بەوەی ئەو قوڕئانە وانیە وەك ئێوە گومانی پێ دەبەن، بەڵام ئێوە ژیانی زوو تێپەڕی دونیاتان خۆشدەوێ و، ئەوەش کە چەشمەند سازی لێڵ کردوون. ئان وانییە کە قیبلە لە ئارادا نەبێ، بەڵام ئێوە بۆیە نکوولیی لێ دەکەن، چونکە تەنیا ژیانی دونیاتان خۆشدەوێ و، باوەشکردنتان بە دنیادا، وای لێکردوون نکوولیی لە ڕۆژی دوایی بکەن، بۆ ئەوەی ئەو چێژ وەرگرتنەی بە حەڕامیی لە دنیادا بۆتان ڕەخساوە، دەستبەرداری نەبن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ﴾، خوێنراویشـەتەوە: (**كَلاَّ بَـلْ يُحِبُّـونَ العَاجِلَـةَ**)، ئەگـەر (**تُحِبُّـونَ**) بـێ، واتـە: ڕووی دوانـدن لەبێبڕوایانـە بەشـێوەی دوێـنراو، بـەڵام ئەگـەر (**يُحِبُّونَ**) بـێ، مەبەسـت هـەر بێبڕوایانـن و بەشـێوەی نادیـار قسـەیان لەبـارە کـراوە. (**العاجلـة**)ش سـیفەتی وەسـفکراوێکی قرتێـنراوە: واتـە: (**الحَيَـاة العَاجِلـة**)، ﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ﴾، واتـە: ژیانـی زوو تێپـەڕی دنیـاو بەپەلەتـان خۆشـدەوێ.

٢)- ﴿وَتَذَرُونَ ٱلْآخِرَةَ﴾، مەنزڵگای کۆتاییش وێڵ دەکەن، خوێندراویشەتەوە (**يَذَرُونَ**)، (**تَذَرُون**) واتە: ژیانی مەنزڵگای کۆتایی وێڵ دەکەن، ئەگەر (**يَذَرونَ**) بێ واتە: ئەوان، مەنزڵگای کۆتایی وێڵ دەکەن و پشتگوێ دەخەن، (**الآخِرة**)ش دیسان سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، واتە: (**الحَيَاةَ الآخِرة**) یان (**المَرْحَلَةَ الآخِرَة، المَنْزِلَةَ الآخِرة**)، قۆناغی دوایی، پێگەی کۆتایی وێڵ دەکەن.

شـایانی باسـە: لێـرەدا وەك زانایـان گوتوویانـە: ئـەوەی سەرزەنشـتکردنەکەی پێـوە پەیوەسـتە، بریتیـە لـە خۆشویسـتنی دنیـاو، وێڵکردنـی ڕۆژی دوایـی، ئەگەرنـا کۆکردنـەوەی هەردووکیـان، بـە شـێوەیەکی هاوسـەنگ، نـەك هـەر سەرزەنشـتکراو نیـەو، مرۆڤـی لەسـەر سەرزەنشـت ناکـرێ و ڕەخنـەی لێناگیـرێ، بەڵکـو شـتێکی ویسـتراوو پێویستیشـە، وەك خـوا ﷻ لـە سـووڕەتی (**البقـرة**)دا، مەدحـی کۆمەڵێـك لـە بەنـدە چاکەکانـی خـۆی دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾﴾، هەروەهـا لـە مرۆڤـەکان هـەن، کەسـانێك دەڵێـن: پەروەردگارمـان! لـە دنیـادا چاکەمـان پـێ بـدەو، لـە ڕۆژی دواییشـدا چاکەمـان پـێ بـدە و، لـە ئـازاری ئاگـر بمانپارێـزە، [دوایـی دەفەرمـوێ:] ئـا ئەوانـە پشـك و بەشـیان هەیـە، لـەوەدا کـە بەدەسـتیان هێنـاوەو، خـواش لێپرسـینەوەی خێرایـە.

هەروەهـا لـە سـووڕەتی (**القصـص**)دا، کـە (**بنـو إسرائيـل**) ئامۆژگاریـی قـاڕوون دەکـەن، قاڕوونیـش هـەر لـە گەلـی مووسـا ﵇ بـووە و، لێیـان گەڵگەڕاوەتـەوە

و ستەمی لێکردوون: ﴿إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوۡمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيۡهِمۡۖ ﴿٧٦﴾﴾، لێیان هەڵگەڕاوەتەوە بەهۆی سەروەت و سامانی حەرامەوە، کە وەسەریەکی ناوە لە پەنای حوکمڕانێتی، خۆسەپێنانەی فیرعەون دا، وەك هەموو ئەو دەوڵەمەندانەی بە درێژایی مێژوو و، ئێستاش لە واقیعی ئێستاماندا، وەك گەنەو قڕنوو، زیندەوەرە مشەخۆرەکان لەسەر خوێنی خەڵکی دیکە دەژین و، لە پەنای دەسەڵاتدارانی خۆسەپێن و دەسەڵات و هەموو شت بۆ خۆ قۆرخکەردا، لەگەڵیان دەبنە شەریکە دزو سەروەت و سامانی حەرام وەسەریەك دەنێن، قاڕوونیش یەکێك بووە لەوانە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا قاڕوون لە گەلی مووسا ﷺ بووە و، لە وەچەی ئیسرائیل بووە، بەڵام لێیان هەڵگەڕاوەتەوە: ﴿إِذۡ قَالَ لَهُۥ قَوۡمُهُۥ لَا تَفۡرَحۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٧٧﴾﴾ **البقرة**، کاتێك خەڵکەکەی پێیان گوت: زۆر دڵخۆش مەبە، تێمەپەڕێنە لە دڵخۆشیدا (بە ژیانی دنیا)، چونکە خوا زۆر دڵخۆشانی بە ژیانی دنیاو، خۆشناوێن و، لەوەشدا کە خوا پێیداوی مەنزڵگای کۆتایی داوا بکە، واتە: سەروەت و سامانەکەت بکە بە ئامڕازێك و هۆکارێك بۆ وەدەستهێنانی ژیانی هەتا هەتایی لە ڕۆژی دواییدا، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە سەروەت و سامانەکەت لە پێناوی خوادا، بە خەڵکی موستەحەق و شایستە ببەخشی، خزمەتی خەڵکی پێ بکەی، دوایی پێی دەڵێن: ﴿وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ ﴿٧٧﴾﴾ **البقرة**، بە هۆی ماڵ و سامانەکەتەوە خراپەو تێکدان لە زەویدا داوا مەکە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٧٧﴾﴾ **البقرة**، بێگومان خوا تێکدەرانی خۆشناوێن.

کەواتە: پشت لە دنیا کردن شتێکی پەسند نیە، بەڵام لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا بَلۡ تُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴿٢١﴾﴾، ئەوە ئەگەر هەردووکیان بن: خۆشویستنی دنیا و وێڵکردنی ڕۆژی دوایی ئەگەرنا ئینسان ئەگەر ژیانی دنیای خۆشبوێ، بەڵام لەسەر حیسابی ڕۆژی دوایی نەبێ، خراپ نیە، بەڵکو

خـوای پـەروەردگار مەدحـی ئـەو بەندانـە دەكات، داوا لـە خـوا دەكـەن، چاكـەی دنیاشـیان پـێ ببەخشـێ و، هـی ڕۆژی دواییـش، چاكـەی دنیـا بێگومـان هەمـوو شـتێكی چـاك و سـوود بەخـش لـە دنیـادا دەگرێتـەوە؛ لـە سـەروەت و سـامانی حـەڵاڵ، مـاڵ و منداڵـی بـاش، جێگـەو ڕێگـەی چـاك، بـەرگ و پۆشـاك، لـە خـواردن و خواردنـەوەی بـە سـوود، هەمـوو ئـەو نیعمەتانـەی ژیانـی دنیـای مـرۆڤ پێویسـتیی پێیانـە، هـەروەك شـتە مەعنەوییەكانیـش دەگرێتـەوە؛ ئیـمان و تەقـوا و تاعـەت و چاكـەو ڕەوشـتی بـەرزو جـوان و...هتـد.

٣)- ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾، لەو ڕۆژەدا ڕووانێك هەن، واتە: كەسانێك هەن ڕووەكانیان گەش و خۆشن.

دەڵێ: (**تَنْكِير وُجُوه للتَّنْوِيْع وَالتَّقسِيْم**) لێرەدا كە (**وُجُوه**) بە (**نَكِرة**) هاتوە، واتە: نەناسراو و نەزانراو، ئەمە بۆ جۆراو جۆركردن و دوایی دابەش كردنە، چونكە دەفەرموێ: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ﴾، هەروەها ڕووانێك لەو ڕۆژەدا گرژ و مۆن و تڵخن.

٤)- ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾، سەرنجی پەروەردگاریان دەدەن، (**النَّضْرَةُ: حُسْنُ الوَجْهِ مِنْ أَثَرِ النِّعْمَةِ، وفِعْلُهُ كَكَرُمَ وَفَرِحَ وَنَصَرَ، وَكُنِّيَ بِنَفرَةِ الوَجِه عَنْ فَرَحِ أَصْحَابِهَا وَنَعِيْمِهم**)، (**نَضرَة**): بریتیە لە ڕووی گەش و جوان، لە ئەنجامی نازو نیعمەتدا، كرداری ڕابردووی (**نَضْرَة**) بە سێ جۆر هاتوە:

١- (**نَضُرَ: كَظُمَ**)

٢- (**نَضِرَ: فَرِحَ**)

٣- (**نَضَرَ: نَصَرَ**)

مەبەسـت لـە (**نَـضْرَة الوَجـه**) ڕووی گـەش و جـوان، دڵخۆشـیی خاوەنـی ئـەو ڕووانەیـە، مـرۆڤ كـە دڵـی خـۆش بـوو، ڕووشـی گـەش و جـوان و درەوشـاوە دەبـێ، كـە دەفەرمـوێ: ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾، واتـە: ئـەو ڕەوانـە تەماشـای پەروەردگاریـان دەكەن ئـەو ڕووانـە، كـە ئەمـە دوایـی زیاتـر قسـەی لەسـەر دەكەیـن.

٥)- ﴿ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴾، هەروەها ڕووانێك هەن لەو ڕۆژەدا، گرژو مۆن و تاریك و تاڵخن، بۆچی؟

٦)- ﴿ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴾، دڵنیان كە (بەڵایەكی) كەمەر شكێنیان لەگەڵدا بكرێ. (**تَظُنُّ**) لێرەدا بە مانای (**تَسْتَيْقِنُ، تَعْلَمُ**) دڵنیاییە، ئەو ڕووانە دڵنیان و دەزانن، ﴿ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴾، كە بەڵایەكی كەمەرشكێن و پشت شكێنیان بەسەر بێ و، ئازارو ئەشكەنجەیەكی پشت شكێن بدرێن، (**فَاقِرة**) كە بە (**فواقِر**) كۆدەكرێتەوە، یانی: پشتشكێن، بڕگە شكێن.

كە دەفەرموێ: (**تَظُنُّ**) زۆربەی هەر زۆری زانایان، (**تَظُنُّ**)یان لێرەدا بە مانای (**تَسْتَيْقِنُ، تَعْلَمُ**) دڵنیان دەزانن، لێكداوەتەوە، یانی: دڵنیان شتێكیان لەگەڵدا دەكرێ پشت شكێنە، كە مەبەست پێی ئازاردران و ئەشكەنجەدرانە لە دۆزەخدا.

(**المعجم الوسيط**)[1] ئاوا باسی (فاقِرة) دەكات: (**الفَاقِرة: الدَّاهِيَةُ وَالجَمْعُ فَوَاقِر، وَالفَقَارَةُ وَاحِدَةٌ مِنْ عِظَامِ السِلْسِلَة العَظْمِيَّةِ الظَّهْرِيَة مُمْتَدَّة مِنَ الرَّأسِ إلى العُصْعُصِ، وَعِدَّتُهَا فِي الإنسَان ثَلاَثٌ وَثَلاَثُون فَقَارَة: سَبْعٌ فِي العُنُق، وَاثْنَتَا عَشْرَةَ فِي الظَّهْر بَيْنَ الأَضْلَاع، وَخَمْسٌ فِي البَطْن، وَخَمْسٌ فِي العَجُز، وأَربَع فِي العُصْعُص، وَالجَمْع: ثلاث و ثلاثون فَقَارةٌ**)، دەڵێ: (**فاقِرة**) بەڵایەكە، بەڵایەكی مەزن، بە (**فواقِر**) كۆ دەكرێتەوە، واتە: بەڵایەكان، ئازارە كەمەر شكێنەكان، واتە: دەترسێ بەڵایەكی كەمەرشكێنی بەسەر بێ، (**فاقِرة**) لە (**فقارة**)ەوە هاتوە، كە یەكێكە لە ئێسكەكانی زنجیرە ئێسكی پشت، كە لە سەرەوە تاكو كلێنجە درێژ دەبێتەوە، لە مرۆڤدا ژمارەی ئەو ئێسكانە، ( بە كوردیی بڕبڕەیان پێ دەڵێین)، سی و سێ، دانەن: حەوتیان لە گەردندا، (ملی ئینسان، ئنجا ئەو كەسە چ ملی درێژ بێ و، چ كورت بێ، هەمووی حەوت بڕگەی تێدایە)، دوازدەیان لە پشتدان لە نێوان پەراسووەكان دا، پێنج بڕگەشیان دەكەونە ئاقاری سك، [لە خوار پەراسووەكانەوە، ناوچەی سك] پێنجیشیان دەكەونە لای، كلۆمت (لەگەن)، چواریشیان دەكەونە كلێنجە، سەرجەمیان دەكەنە سی و سێ.

---

(١) ص٦٩٧.

## كورتە باسێك:

## بینینی بڕواداران بۆ خوای بەرز وبێ وێنە لەبەهەشت دا

خـوای عـز وجـل فەرموویەتـی: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾، [واتـە: کەسـانێك لـەو ڕۆژەدا ڕوویـان گـەش و خۆشـە] تەماشـای پەروەردگاریـان دەکـەن، دەڕواننـە پەروەردگاریـان، شـایانی باسـە ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الأنعام**)، لـە کاتـی تەفسـیرکردنی ئایەتـی ژمـارە (٣): ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾، کورتـە باسـێکمان لـە بـارەی بینینـی خـواوە، لـە دنیـاو دواڕۆژدا کـردوە، کـە دواتـر کـراوە بـە نامیلکەیەکیـش، لەوێـدا ئـەوەی بـە پێویسـتمان زانیـوە لـەو بـارەوە باسـمان کـردوە، هەروەهـا لـە تەفسـیری سـوورەتی (**یونـس**) یـش لـە کاتـی تەفسـیرکردنی ئایەتـی ژمـارە (٢٦)دا: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾، لەوێـش دیسـان لـە بـارەی بینینـی خـوای بـەرزو بـێ وێنـەوە، کورتـە باسـێکمان کردوە، قسـەی کۆتایـی خۆمـان لـەو بـارەوە کـردوە، بۆیـە لێـرە بـە پێویسـتی نازانیـن جارێکـی دیکـە لەوبـارەوە بدوێینـەوە.

بـەڵام ئەوەنـدە دەڵێیـن: کـە هەندێـك لـە زانایـان، کـە زیاتـر سـەر بـە قوتابخانـەی موعتەزیلـەن، ڕایـان وایـە کـە خـوا ﷻ لـە ڕۆژی دواییشـدا نابیـنرێ، بڕوادارانیـش لـە بەهەشـتدا نایبینـن و، ئـەم ئایەتـەو ئایەتەکانـی دیکـەو فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بـە جۆرێـك تەئویـل و مانـا دەکـەن، کـە ئـەوە نەگەیەنـن ئەهلـی ئیمـان لـە بەهەشتیشـدا خـوای بـەرزی مـەزن بـە چـاوی سـەر دەبینـن.

شـیعەش کـە لـە ڕاسـتییدا لـە زۆر ڕووی فیکرییەوە، لە ژێـر کاریگەریـی موعتەزیلە دان، ئەوانیـش هـەر ڕایـان وایـە، بۆیـە لـە تەفسـیرە شـیعییەکاندا، بـە توانـج و پلارەوە باسـی زۆرینـەی مسـوڵمانان دەکـەن، کـە بـە ئەهلـی سـوننەو جەماعـەت نـاوزەد

کراون، کە ئەوەش ناوێکی مێژووییە، ئەگەرنا لە قورئان و سوننەت و زۆرینەی مسوڵمانان هەر بە مسوڵمانان ناوزەد کراون و ناسێنراون وەك لە بەرگی دووەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا)، بە تەفصیل لەو بارەوە قسەم کردوە، شیعەش پێیان وایە خوا ﷻ لە بەهەشتیشدا نابینرێ، بەڵام ئێمە دەڵێین: یەکەم: ئایەتەکان لەوبارەوە زۆر ڕوونن،

بۆ وێنە: ئەو ئایەتەی دەفەرمووێ: ﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾، لەو ڕۆژەدا ڕووانێك هەن گەش و خۆشن، سەرنجی پەروەردگاریان دەدەن، بۆ پەروەردگاریان دەڕوانن. ئەمەش دەقێکی ڕوون و ڕاشکاوە لەوبارەوە هیچ مشت و مڕ هەڵناگرێ.

دووەم: فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ کە ئێمە دوایی ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین، لەو بارەوە کەم نین و زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن و، لەو دوو کورتە باسەدا کە لە سوورەتی (**الأنعام**) و سوورەتی (**يونس**)دا هێناومن، لەوبارەوە فەرمایشتەکانیشم هێناون، دواییش بۆ زیاتر جەختکردنەوە، سەرنجی چوار لەو فەرمایشتانە دووبارە دەدەینەوە، بەڵام پێویستە لێرەدا لە شتێك وریا بین، کە من پێم وایە ئەوە دەبێتە کلیلی کردنەوەی ئەو ئیشکالەی نێوان ئەوانەی نکووڵیی دەکەن لەوەی خوا لە بەهەشتیشدا ببینرێ، وەك چۆن لە دنیادا نابینرێ و ئەوانەی دەڵێن: خوا لە بەهەشتدا دەبینرێ، ئەویش ئەوەیە: کە هیچ گومانی تێدانیە ئەگەر ئێمەی مرۆڤ، ئێستا چۆنین، لە قیامەت و ڕۆژی دواییشدا هەر وابین، بە دڵنیایی وەك چۆن لێرە تەحەممولی بینینی خوای پەروەردگار ناکەین، وەک مووسا ﵇ خۆی ڕانەگرت بۆ دەرکەوتنی خوا، کە لە سوورەتی (**الأعراف**)دا هاتوو: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ

﴿إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٤٣﴾، کە ئێمە لەو کورتە باسانەدا کە ئاماژەمان پێدان، بە تایبەتی لە کورتە باسی سوورەتی (**الأنعام**)دا، بە تەفصیڵ قسەمان لەسەر ئەو ئایەتە موبارەکە کردووە، لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (**الأعراف**) یشدا دووبارە قسەمان لێکردۆتەوە، کە دەقی واتایەکەی ئاوایە:

کاتێك مووسا عليه السلام هات بۆ ژوانگەی ئێمەو پەروەردگاری دواندیی، گوتی پەروەردگارم خۆتم پێشان بدە با تەماشات بکەم، فەرمووی هەرگیز ناتوانی مبینی، بەڵام تەماشای چیایەکە بکە، ئنجا ئەگەر خۆی ڕاگرت تۆش دەتوانی مبینی، کاتێك پەروەردگاری بۆ چیایەکە دەرکەوت، سووتاندی وردو خاشی کرد، مووساش بێهۆش کەوت، کاتێك هاتەوە هۆش خۆی گوتی: پەروەردگارم! بۆ لای تۆ گەڕامەوەو من یەکەمینی بڕوادارانم، (واتە: یەکەمینی بڕوادارانم کە تۆ بە چاوی سەر لە دنیادا نابینرێی).

ئنجا ئەگەر مرۆڤ ئێستا چۆنە لە ڕۆژی دواییشدا هەر وابێ، هەر بەو پێکهاتە جەستییەوە بێ، کە ئێستا ئێمە نەك هەر تەحەممولی بینینی خوای پەروەردگار ناکەین، وەك مووسا عليه السلام نەیکردوە، بەڵکو تەحەممولی بینینی هەندێك لە جۆرەکانی تیشك ناکەین، هەندێك جۆرە تیشك هەیە، ئەگەر مرۆڤ تەماشای بکات کوێری دەکات، هەروەها هیچکەس ناتوانێ خولەکێك یان چەند خولەکێك لە خۆرەوە ڕامێنێ، لە کاتێکدا کە خۆر پەردەی لەبەر نیەو تەم ومژ نیە، کەواتە: هەندێك لە دروستکراوەکانیش ئێمە بەم پێکهاتەی جەستەییەی ئێستامان ناتوانین چاك بیانبینین و، خۆمان ڕابگرین بۆ تیشك و ڕەونەق و شەبەقیان، چ جای خوا سبحانه وتعالى، هەڵبەتە خوا (**لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيء**) هیچ شتێك وەك خوا نیە، بەڵام ئێمە لە ڕۆژی دواییدا بە جۆرێکی دیکە دروست دەکرێینەوە، وەك خوای کاربەجێ لە سوورەتی (**الواقعة**)دا کە پێشتر قسەمان لێکرد، فەرموویەتی: ﴿وَنُنشِئَكُمۡ فِي مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٦١﴾، بە جۆرێك دروستتان دەکەینەوە کە نایزانن.

کەواتـە: ئێمـە بـە جۆرێکـی دیکـە دروسـت دەکرێینـەوە و، ئـەم جـۆرە دروسـتکرانەوەیەی دیکـە تەحەممولـی ئـەوە دەکات، کـە خـوای بـێ وێنـە ببینـێ، ئنجـا ئەوانـەی گوتوویانـە: خـوای پـەروەردگار مـرۆڤ ناتوانـێ ببینـێ بـە چاوی سـەر، ئەگـەر هـەر وەك ئێسـتا بیـن ڕاسـتە، ئەوانـەش کـە گوتوویانـە: مـرۆڤ دەتوانـێ خـوا ببینـێ، دەبـێ بگوتـرێ: لـە حاڵێکـدا خـوا ﷻ مـرۆڤ بـە جۆرێکـی دیکـە دروسـت دەکاتـەوە کـە خـۆی فەرموویەتـی، لەگـەڵ ژیانـی بـەردەوام و بـێ کۆتایـی بەهەشـتدا بگونجـێ، لـەو کاتـەدا مـرۆڤ بـەو پێکهاتـە جەسـتەیی و ڕووحییـەو تازەیـەوە، کـە خـوای پـەروەردگار لـە بەهەشـتداو بـۆ ژیانێکـی هەمیشـەیی دەیخولقێنـێ، دەتوانـێ تەحەممولـی بینینـی خـوا ﷻ بـکات.

**ئێسـاش بـا چـوار فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە بـارەی بینینـی خـوای پـەروەردگارەوە، لـە لایـەن بڕوادارانـەوە لـە بەهەشـتدا بخەمـەڕوو:**

**فەرمـوودەی یەکـەم:** {عَـنْ أَبِي بَكـرِ بـنِ عَبْـدِ اللَّـهِ بـنِ قَيْـسٍ عَـن أَبِيـهِ عَـنِ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: جَنَّتَـانِ مِـن فِضَّـةٍ آنِيَتُهُـمَا وَمَا فِيهِـمَا، وَجَنَّتَـانِ مِنْ ذَهَـبٍ آنِيَتُهُـمَا وَمَا فِيهِـمَا، وَمَـا بَيْنَ الْقَـوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُـرُوا إِلَى رَبِّهِـمْ عـز وجـل إِلَّا رِدَاءُ الكِبرِيَـاءِ عَـلَى وَجْهِـهِ فِي جَنَّـةِ عَـدْنٍ}، **(أخرجـه البخـاري: ٤٨٧٨، في كتـاب التفسـير بـاب ومـن دونهـما جنتـان، مسـلم: ١٨٠، في كتـاب الإيمـان بـاب إثبـات الرؤيـة في الآخـرة ربهـم، والنسـائي في الكـبرى: ٧٧٦٥ و ابـن ماجـه: ١٨٦ في المقدمـة بـاب في مـا أنكـرهُ الجهميـة، وأحمـد: ج ٤، ص: ٤٢٢ في مسـند، ابـن حبـان: ٧٣٨٦و أبـو يعـلى: ٧٣٣١، والطيالـسي: ٥٢٩)**، واتـە: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: دوو بـاخ لـە زیـون قـاپ و قاپاغەکەیـان و هەرچـی تێیانـدا هەیـەو، دوو بـاخ قـاپ و قاپـاغ و هەرچـی تێیانـدا هەیـە لـە زێـڕن و، لـە نێـوان خەڵکەکـە، [واتـە: ئەوانـەی لـەو باخانـەدا] و، ئـەوە کـە تەماشـای پەروەردگاریـان (جـل وعـز) بکـەن، تەنیا پۆشـاکی مەزنایەتـی خـوای پـەروەردگارە لەسـەر ڕووی لـە بەهەشـتی عـەدن دا.

**فەرمـوودەی دووەم:** {عَـنْ جَرِيـرِ بْـنِ عَبْـدِ اللَّـهِ رضي اللـه عنـه، قَـالَ: كُنَّـا عِنْـدَ رَسُـولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ جُلُوسَـاً، فَنَظَـرَ إِلَى القَمَـرِ لَيْلَـةَ البَـدرِ فَقَـالَ: إِنَّكُـم سَـتَرَوْنَ

رَبَّكُمْ عِيَانًا، كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لَا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَلَّا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾﴾ق} (أخرجه البخاري: ٥٥٤، مسلم: ٦٣٣، أبو داود: ٤٧٢٩، والترمذي: ٢٥٥١، والنسائي في الكبرى: ٧٧٦١، ابن ماجه: ١٧٧و وإبن حبان: ٧٤٤٢و ٧٤٤٣و ٧٤٤٤، والحميدي: ٧٩٩)، واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، لە شەوی بەدردا [شەوی چواردەو پازدەدا] تەماشای مانگی کرد فەرمووی: ئێوە پەروەردگارتان بە ئاشکرا دەبینن، وەك چۆن ئەم مانگە دەبینن، تووشی زیان نابن، بەهۆی بینینیەوە، [یاخود تووشی نوقسانی نابن]، ئنجا ئەگەر توانیتان پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆرئاوا بوون نوێژ بکەن، بیکەن. [واتە: ئەوە دەبێتە زەمینە خۆشکەر بۆ ئەوەی بچنە بەهەشت]، دوایی ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾﴾ق، بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاك بگرە، پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆرئاوا بوون.

**فەرموودەی سێیەم:** {عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَكُلُّنَا يَرَى رَبَّهُ؟ قَالَ ابْنُ مُعَاذٍ: مُخْلِيًا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ يَا أَبَا رَزِينٍ، قَالَ: وَمَا آيَةُ ذَلِكَ فِي خَلْقِهِ؟ قَالَ: يَا أَبَا رَزِينٍ أَلَيْسَ كُلُّكُمْ يَرَى الْقَمَرَ، قَالَ ابْنُ مُعَاذٍ: لَيْلَةَ الْبَدْرِ مُخْلِيًا بِهِ. قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: فَاللَّهُ أَعْظَمُ، قَالَ ابْنُ مُعَاذٍ قَالَ: فَإِنَّمَا هُوَ خَلْقٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ يَعْنِي الْقَمَرَ، فَاللَّهُ أَجَلُّ وَأَعْظَمُ}، (أخرجه أحمد: ١٦٢٣١، وأبو داود: ٤٧٣١، وابن ماجه: ١٨٠، والحاكم: ٨٦٨٢، وقال: صحيح الإسناد، والطيالسي: ١٠٩٤، وعبد الله بن أحمد في السنة: ٤٥١).

ئەبوو ڕەزینی عوقەیلیی دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هەر کامێکمان پەروەردگاری دەبینێ، {(ابْنُ مُعَاذ) کە یەکێکە لە ڕاوییەکان، ئەوەندەشی لێ زیاد کردوە گوتوویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا بە تەنیا خوا دەبینێ بە تایبەت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەی ئەبا ڕەزین، ئەبوو ڕەزین

گوتـی: ئنجا نیشـانەی ئـەوە چییـە لـە دروسـتکراوەکانی خـوادا، [بەڵگـە چیـە کـە ئێمـە دەتوانیـن خـوا ببینیـن]، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ئـەی ئەبـا ڕەزیـن ئایـا هەمووتـان مانـگ نابینـن؟ {(ابْـنُ مُعَـاذٍ) کـە یەکێکـە لـە ڕاوییـەکان ئەوەندەشـی بـۆ زیـاد کـردوە گوتوویەتـی: لـە شـەوی چـواردەو پـازدەدا بـە تایبـەت هـەر کامێکتـان بـە تایبـەت مانـگ نابینـێ؟] گوتمـان: بـا، فەرمـووی: خـوا مەزنـترە لـەوە، (ابْـنُ مُعَـاذٍ) دەڵـێ: فەرمـووی: مانـگ دروسـتکراوێکە لـە دروسـتکراوەکانی خـوا، خـوا مەزنـترو بەرزتـرە.

**فەرمـوودەی چـوارەم:** {عَـنْ صُهَيْـبٍ قَـالَ: فَيُكْشَـفُ الحِجَـابُ فَيَنْظُـرونَ إِلَيْـهِ، فَوَاللهِ مَـا أَعْطَاهُـمُ اللَّـهُ شَـيْئاً أَحَـبَّ إِلَيْهِـمْ مِـنَ النَّظَـرِ، وَلاَ أَقَرَّ لِأَعْيُنِهِـمْ}، **(أخرجـه مسـلم: ١٨١، والترمـذي: ٢٥٥٢، ٣١٠٥، والنسـائي في الكـبرى: ٧٧٦٦، وابـن ماجه: ١٨٧، وابـن حبان ٧٤٤١)**، واتـە: صوهەیبـی ڕۆمیـی (خـوا لێـی ڕازی بـێ) لـە درێـژەی فەرمایشـتێکدا دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: پـەردە لا دەدرێ بـڕواداران تەماشـای دەکـەن، تەماشـای خـوای پـەروەردگار دەکـەن، سـوێند بـە خـوا، خـوا هیـچ شـتێکی پـێ نـەداون لـە لایـان خۆشەویسـتتر بـێ و، بـۆ ئـەوان زیاتـر جێـی شـادمانیی و دڵخۆشـیی بـێ لـە تەماشـاکردن و بینینـی خـوا ﷻ.

ئەمـە ئـەم چـوار فەرموودەیـە هـەر کامێکیـان چ جـای هـەر چواریـان پێکـەوە، کـە فەرمـوودەی دیکـەش لـەو بـارەوە هـەن و، پێشـتر هێناومانـن هەموویـان بەڵگـەن لەسـەر ئـەوە کـە بـڕواداران لـە بەهەشـتدا خـوا ﷻ دەبینـن، بـەڵام بـەو شـێوەیەی بـۆ خـوا شایسـتەیە، نـەك بـەو شـێوەیەی ئێسـتا، کـە هەمـوو ئەوانـەی نکووڵییـان کـردوە لـەوەی خـوا لـە بەهەشـتدا ببینـرێ، پێیـان وابـووە وەک چـۆن ئێسـتا ئێمـە لـە دنیـادا، بـەو هەسـتەوەرانەمان شـت دەبینیـن، لەوێـش بـەو شـێوەیە و لـەو کات و شـوێنەدا کـە لەسـەر زەوی بۆمـان ڕەخسـێنراوە، هـەروا دەبـێ، بـەڵام نەخێـر لـە بەهەشـتدا هەمـوو شـتەکان جیـا دەبـن؛ کات جیـا دەبـێ، شـوێن جیـا دەبـێ و پێکهاتـەی ئێمـەش جیـا دەبـێ.

## مەسەلەی پێنجەم:

**باسی کەوتنە حاڵەتی گیانەڵای بابای بێبڕواو، هەوڵدان بۆ چارەسەری بێ هوودەو دڵنیابوونی لە ماڵئاوایی لە ژیانی دنیاو، لاق لێک ئاڵانی و بەرەو لای پەروەردگاری بەڕێکرانی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ﴿٣٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ﴾، نەخێر هەرکات (ڕووح) گەیشتە چۆڵەمەکان (**كَلَّا**) وشەیەکە بۆ بەرپەرچدانەوە، هەڵوەشانەوە، واتە: وازبێنن یاخود: وانیە وەك ئێوە دەڵێن، ﴿إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ﴾، کاتێك گەیشتە چۆڵەمەکان (**التَّرْقُوَة**) دوو ئێسکن لەملاولای سینە و قوڕقوڕاگە بەنێویاندا دەڕواو، هەموو مرۆڤێك دوو تەرقوەی هەن، پێشتریش گوتمان بۆیە لێرە خوا ﷻ بە کۆ هێناونی، چونکە هێنانیان بە شێوەی (**مُثَنَّى**) قوڕسە، (**كَلَّا إِذَا بَلَغَتِ التَّرْقُوَتَان**)، هەر کاتێك ڕوح گەیشتە هەردوو چەڵەمەکان، لێرەدا دیارە ڕاناوی (**ت**) ی (**بَلَغَت**) بۆ شتێکی مێینەی مەجازییە، پێشتر باس نەکراوە پێشتر، بەڵام بە سیاق و بە سەلیقە دەزانین کە مەبەست پێ ڕووحە، چونکە بابەتەکە باسی گیانەڵاو ڕووح کێشانە، کەواتە: ڕاناوەکە بۆ ڕووح دەچێتەوە، هەروەك لە سووڕەتی (**الواقعة**)شدا خوا ﷻ بێ ئەوەی پێشتر باسی نەفس یان ڕووح بکات، ڕاناوەکە بۆ لا گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێ: ﴿فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ﴿٨٣﴾﴾، دەبووایە کاتێك گەیشتە قوڕقوڕاگە، لێرە دەفەرموێ: ﴿بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ﴾، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحُلۡقُومَ﴾، دیارە ئەو ئێسکەی چەڵەمەش دەوری قوڕگ (**حُلْقُوم**) دەدەن.

**٢)-** ﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ﴾، گوترا کێ چارەسەر دەکات؟ واتە: (**مَنْ مُعَالِجٌ لَهُ**)، کێ چارەسەری دەکات؟ ئێمە پێشێ تەفسیرکردنە خێرایەکە تەواو دەکەین، دوایی دێینە سەر وردەکارییەکان.

٣)- ﴿ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ ﴾، گومانیشی برد کە جیابوونەوەیە، واتە: جیابوونەوەی ڕووحی لە جەستەی و بەجێهێشتنی ئەوە بۆ دنیا، یاخود یەقینی وا بووە، **(ظَنَّ)** لێرەدا بە مانای گومان دەگونجێ تەفسیر بکرێ و، دەشگونجێ بە مانای دڵنیابوون و زانیارییش تەفسیر بکرێ، هەردوو واتاکە دەگونجێن، ئەگەر بگوترێ: مەبەست لە **(ظَن)** لێرەدا یەقینە، واتە: لەو کاتەدا مرۆڤ کە دەکەوێتە حاڵی خۆی، لەوە دڵنیا دەبێ کە تازە کۆتاییەتی، بەڵام ئەگەر مەبەست لە (ظن) گومان بێ، ئەوە پێش ئەوەیە دڵنیابێ کە دەمرێ، چونکە حاڵەتی گیانکێشان و کەوتنە گیانەڵا یەك شت نیە بە یەك چرکە، بەڵکو هی وا هەیە چەند ڕۆژێك بە ڕووح کێشانەوە دەبێ و، هی وا هەیە چەند سەعاتێك پێوەی دەبێ، ئنجا لە سەعاتەکانی یەکەمدا لە کاتەکانی یەکەمدا گومانی هەیە، بەڵام دوایی وردە وردە ئەم گومانەی دەبێتە زانیاریی، دوایی دەبێتە یەقین و دڵنیایی.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ ﴾، ڕاناوی **(أَنَّـهُ)** ڕاناوی حاڵـە **(ضَمِـيْرُ الشَّـأْن أي: الأَمْـرُ العَظِيْـم: فِـرَاقُ الحَيَـاة)**، واتـە: کارە مەزنەکـە و ڕووداوەکـەی لێـی دەقەومـێ بریتیـە لـە جیابوونـەوە لـە ژیانـی دنیـا، بەجێهێشـتنی دنیـا.

٤)- ﴿ وَٱلْتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴾، لاقیش لە لاق ئاڵا، لاق هەمووی **(رِجل)**ی پێ دەڵێن، لە ئەژنۆ بەرەو لای خوار پێی دەگوترێ: لوولاق **(سَاق)**، لە ئەژنۆ بەرەو سەر پێی دەگوترێ: ڕان **(فَخِذْ)**، بە هەمووشی دەگوترێ: **(رِجل)**، بە خوارێشی دەگوترێ: **(قَدَم)** واتە: پێ، کەواتە: ئنجا لێرەدا مەبەست پێی لە ئەژنۆ بەرەو ژێرە، کە بە کوردیی پێی دەڵێین: لاق یان لوولاك، کاتێك لوولاك لە لوولاك ئاڵقا، **(الزمخشري)** ئاوای مانا لێك داوەتەوە دەڵێ: **(وَالْتَّفَتْ سَاقُه بِساقِهِ وَالْتَوَتْ عَلَيْهَا عِنْدَ عَلْزِ المَوْت)** واتە: لاقی لە لاقی ئاڵقاوە، وە پێکەوە تێك باهەڵدران، لە کاتی هەڵ لەرزینی مردندا، **(عَلْز: الرَّعْدَةُ تَأْخُذُ المَرْيْض)**، ئەو لەرزینەیە کە تووشی بابای نەخۆش دێ، دەلەرزێ و دەهەژێ و دەکەوێتە حاڵەتی گیاندان.

٥)- ﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمَسَاقُ ﴾، لێخوڕدران، یاخود بردران، یاخود بەڕێکران لەو ڕۆژەدا بەرەو پەروەردگارتە، **(المَسَاق: السَّوْق)**، **(المَسَاق)** لێرەدا چاوگی میمییە، واتە: بردران

یاخود بەڕێکران، یان لێخوڕدران، لەو ڕۆژەدا بەرەو لای پەروەردگارتاتە، (أل)ی سەر (المَسَاق) بۆ ناساندنە و جینسە، واتە: لێخوڕان و بەڕێکرانی هەموو مرۆڤەکان بۆ لای پەروەردگارە، هیچ کەس بە هیچ لایەکی دیکەدا ناچێ.

لە بارەی ﴿وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٍ﴾، واتە: کێ چارەسەر دەکات، کێ نوشتە دەکات، کێ دوعا دەکات؟ (الطبري) لە (أبو قلابة)ەوە بە ژمارە: (٣٥٧٨٢) هێناویەتی:﴿مَنْۜ رَاقٍ﴾، **قَالَ هَلْ مِنْ طَبِيْبٍ شَافٍ**) ئایا هیچ پزیشکێکی چارەسەرکەر هەیە.

هەروەها لە (**إبن زيد**)ەوە بە ژمارە (٣٥٧٨٠)، هێناویەتی دەڵێ: (**وَقَالَ أَهْلُهُ: مَنْ ذَا يَرْقِيهِ لِيَشْفِيَهُ مِمَّا قَدْ نَزَلَ بِهِ، وَطَلَبُوا لَهُ الأَطِبَّاءَ وَالْمُدَاوِينَ، فَلَمْ يُغْنُوا عَنْهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ الَّذِي قَدْ نَزَلَ بِهِ شَيْئَاً**)، واتە: کێ دوعای بۆ دەکات تاکو چارەسەری بکات لەوەی دابەزیوەتە سەری، پزیشکان و چارەسەرکەرانیان بۆ خواستن، بەڵام، لە بەرانبەر کاری خوادا کە دابەزیوەتە سەری هیچ سوودیان پێ نەگەیاند.

ئەمە واتایەکی: ﴿مَنْۜ رَاقٍ﴾، واتە: (**مَنْ يرْقِه**) کێ دووعای بۆ دەکات، (**مَنْ يُعَالِجه**) کێ چارەسەری دەکات؟ (**راق**) لە (**رقية**)ەوە هاتوە، کە دوعایان خوێندوە بۆ کەسێك لە ڕووی مەعنەوییەوە، ئنجا دوایی بۆ هەموو جۆرە چارەسەرێك ئەو وشەیە بەکارهاتوە.

هەندێکی دیکەش گوتوویانە: ﴿مَنْۜ رَاقٍ﴾، واتە: (**مَنْ يَصْعَدُ بِرُوحِه**)، کێ ڕووحەکەی بەرز دەکاتەوە؟ هەر (الطبري) بە ژمارە (٣٥٧٨٩) هێناویەتی دەڵێ: (**قَالَتِ المَلَائِكَة مَنْ يَصْعَدُ بِهَا مَلَائِكَة الرَّحْمَة أو مَلَائِكَةُ العَذَاب؟**)، کێ ڕووحەکەی بەرز دەکاتەوە، فریشتەکانی بەزەیی یان فریشتەکانی سزاو ئازار؟

بە نسبەت وشەی (التراقي) یەوە: (**التَّرَاقِيَ: جَمْعُ تَرْقُوَةٍ وَهِيَ ثُغْرَةُ النَّحْرِ، وَلِكُلِّ إِنْسَانٍ تَرْقُوَتَانِ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ، والجمع لِقَصْدِ تَخْفِيفِ اللَّفْظِ مثل: ﴿فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ۝٤﴾التحريم، وَاللَّامُ فِي التَّرَاقِي مِثْلُ اللَّامِ فِي الْمَسَاقُ فَيُقَالُ: هِيَ عِوَضٌ عَنِ الإِضَافَة**).

(**تَرَاقِـي**) كـۆی (**تَرْقُوَة**)یـە كـە بریتیـە لـە ئێسـقانی سـینگ، هەمـوو مرۆڤێـك دوو ئێسـقانی سـینگی هـەن، بـە كوردیـی پێیـان دەگوتـرێ: چۆڵەمـە، لـە لای ڕاسـت و لای چەپـی، بۆیـەش گوتـراوە: (**تَرَاقِـي**) بـۆ ئـەوەی، بێژەكـە لەسـەر زمـان سـووك بـێ، وەك چـۆن خـوا ﷻ لـە سـووڕەتی (**التحريـم**)دا دەفەرمـوێ: ﴿فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا ٤﴾، لـە جیاتـی (**قَلبَاكُـما**)، دوو دڵەكانتـان، دەفەرمـوێ: (**قُلوبُكُـما**) دڵەكانتـان، چونكـە ئـەوە لەسـەر زمـان سـووكترە، (**أل**)ی سـەر (**تَرَاقِي**)یـش وەك (**أل**)ی سـەر (**المَسَـاق**) ئەمـە (**عِـوَضٌ عَـنِ الإضَافَـة**)، بـۆ ناسـاندنەو، قەرەبـووی پاڵوێـدان دەكاتـەوە، لـە جیاتـی بفەرمـوێ: (**إذَا بَلَغَـت تَرَاقِيَهُـم**)، فەرموويەتـی: ﴿إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ﴾، (**أل**)ەكـە بـۆ ناسـاندنەو قەرەبـووی پاڵوێـدراو (**مُضَـاف إليْـه**) دەكاتـەوە.

**مەسەلەی شەشەم:**

**هۆكارەكانی مەینەتباریی بابای كافر: بەڕاست دانەنانی پێغەمبەر ﷺ و نوێژ نەكردن و بەدرۆ دانان و، پشت هەڵكردن و، بە فیزو خۆبادانەوە، بەرەو لای خێزان و كەس و كاری، بوون، سزای سەختیش شایستەیەتی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰ ﴿٣٣﴾ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٥﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴾، ئنجا بەڕاستی داناو نەنوێژی كرد. دوای ئەوەی كە خوا ﷻ باسی حاڵەتی دژوارو سەختی گیانەڵای بابای بێبڕوای كرد، ئنجا یەكێك لەو بێبڕوایانە بە نموونە وەردەگرێ، كە بۆچی تووشی ئەو سزایە بووە و، بۆچی تووشی ئەو حاڵەتە دەبێ، لەكاتی ڕووح كێشران و دواییش تووشی ئازاری سەخت دەبێ هۆكارەكان دەخاتەڕوو دەفەرموێ: ﴿ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴾، ئەم (ف)ە: (تَفْرِيعٌ عَلَى: ﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمَسَاقُ ﴾، **أي: فَارَقَ الحَيَاةَ وَسِيقَ إِلَى لِقَاءِ اللَّهِ خَالِيًا مِنَ الْعُدَّةِ لِذَلِكَ اللِّقَاءِ**) واتە: ژیانی دنیای بەجێ هێشت و بەڕێكرا بەرەو دیداری خوا، لە حاڵێكدا هیچ شتێكی پێ نیە لە خۆ ئامادەكردن بۆ ئەو دیدارە، ﴿ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴾، حاڵی وا بووە كە دنیای بەجێهێشتوە، نە بەڕاستیی زانیوە چی بەڕاستی نەزانیوە؟ خوا بەركارەكەی قرتاندوە، نەیفەرموە: (**فَلَا صَدَّقَ القُرْآن**) یان (**فَلَا صَدَّقَ الرَّسُولَ**) یان (**فَلَا صَدَّقَ القِيَامَة**)، قرتاندوویەتی بۆ ئەوەی هەموویان و زیاتریش بگرێتەوە، چونكە ئەو كەسە نە پێغەمبەری بەڕاست زانیوە، نە قورئانی بەڕاست زانیوە كە فەرمایشتی خوایە، نە دیداری خوای بەڕاست زانیوە كە دەچێتەوە خزمەت خوا، ئنجا ئەگەر دیاریی كردبایە هەر یەكێكیان دەبوو، بەڵام ئێستا كە بەركارەكە قرتێنراوە، هەموو ئەوانە دەگرێتەوەو جگە لە ئەوانەش دەگرێتەوە.

﴿ وَلَا صَلَّىٰ ﴾، نوێژیشی، لێرەدا گرنگیی و پێگەی نوێژمان بۆ دەردەکەوێ، کە لە دوای ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: هۆکاری ئەوەی ئەو مرۆڤە تووشی ئەو حاڵەتە بووە، ئەوەیە کە ئەهلی تەصدیق نەبووە، ئەهلی بەڕاست زانین نەبووە، نە بۆ خواو، نە بۆ پێغەمبەری خوا، نە بۆ کتێبی خواو، نە بۆ ڕۆژی دوایی، یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ وَلَا صَلَّىٰ ﴾، نوێژیشی نەکردوە.

٢)- ﴿ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴾، بەڵکو [لە بری بەڕاست زانینو نوێژکردن] بە درۆ دانان و پشت هەڵکرن هەبووە بۆ خواو، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو، بۆ فەرمایشتی خواو، بۆ دیداری خوا، ﴿ وَتَوَلَّىٰ ﴾، هەروەها لە جیاتی نوێژ کردنیش پشت هەڵکردن و ڕوو وەچەرخاندن و ڕوو وەرگێڕانی هەبووە، (**كَذَّبَ: أي كَذَّبَ بِكُلِّ مَا يَجب التَّصْدِيْق به**)، هەرچی کە پێویست بوە بە ڕاستیی بزانێ، ئەو بە درۆی زانیوە بە درۆی داناوە، (**تَوَلَّى: التَوَلِّي الإعْرَاضُ**) پشت هەڵکردن و ڕوو وەرگێڕان و پشتکردنەوەیە.

٣)- ﴿ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ﴾، دواییش چۆتە لای کەس و کاری بە خۆباداں و فیزو خۆ کەشخەکردنەوە، واتە: کە لە کۆڕو مەجلیسی قەومەکەی هەڵساوە و چۆتەوە لای ماڵ و خێان و خزمی، بە فیزو کەشخەوە ڕۆیوە، وەك شتێکی زۆر گرنگی کرد بێ، کە لەو کۆڕو مەجلیسەی خۆیاندا کوفر و، بێبڕوایی کردوە، ناحەزایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمایشتی خواو ئایین و بەرنامەی خوای کردوە و، بە فیزو کەشخەوە، ڕۆیوە، وەک ڕۆڵێکی گرنگی گێڕابێ و، کارێکی گەورەی ئەنجام دابێ.

(**ويَتَمَطَّى: يَمْشِي الْمُطَيْطَاءَ وَهِيَ التَّبَخْتُرُ، وَأَصْلُ يَتَمَطَّى: يَتَمَطَّطُ، أَيْ يَتَمَدَّدُ لِأَنَّ الْمُتَبَخْتِرَ يَمُدُّ خُطَاهُ**)، وشەی (**مَطَى**) بە مانای (**ظَهْر**) پشت، دێ، کەواتە: (**يَمْشِي الْمُطَيْطَاءَ**) بە پشت ڕاکێشانەوە دەڕوا کە بریتیە لە فیزو کەشخە، وشەی (**يَتَمَطَّى**) لە ئەسڵدا (**يَتَمَطَّطُ**)ە، (**تَمَطَّط**) پشتی خۆی درێژ کردو ڕاکێشا، چونکە بابای فیزو کەشخەکردن، کە هەنگاوەکانی بەرین دەکات و بە فیزو کەشخەوە خۆ با دەدات.

کەواتە: ئەو کەسە چوار گوناهی هەبوون:

**یەکەم:** نەبوونی بەڕاست دانان.

**دووەم:** نەبوونی نوێژ.

**سێیەم:** بە درۆ دانان.

**چوارەم:** پشت هەڵکردن و ڕوو وەرگێڕان.

خـواش ﷻ چـوار جـاران باسـی سـزای سـەختی بـۆ دەکات، لـە بەرانبـەر ئـەو چوار کـردەوە خراپەیـدا، کـە دووایيـان بریتیـن لـە وازهێنانـی ئەرکـەکان و، دووانیشـیان بریتیـن لـە شـکاندنی قەدەغـەکان، واتـە: ئـەو کەسـە بـە هـەردوو بـاری چواندنـی ئەرکـەکان و شـکاندنی قەدەغـەکان دا هـەر تاوانبـار بـووە، هەروەهـا بـە هـەردوو بـاری لـە ڕووی تیۆریـەوەو لـە ڕووی کردەییـەوە، لـە ڕووی فکریـی تیۆرییـەوەو بـە ڕاسـت زانینـی نەبـووە، بەڵکـو بـە پێچەوانـەوە بـە درۆ دانانـی هەبـووە، لـە ڕووی کردەییـەوەش نوێـژی نەبـووە، بەڵکـو بـە پێچەوانـەوە پشـت هەڵکردنـی هەبـووە، بۆیـە خـواش ﷻ چـوار جـاران وشـەی (أَولى)ی بـۆ بەکاردێنـێ، واتـە: سـزای هـەرە سـەخت.

٤)- ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٥﴾ ﴾، سزای هەرە سەخت بۆتۆ، ئنجا سزی هەرە سەخت بۆتۆ سزای هەرە سەخت. لەبارەی ﴿ أَوْلَىٰ ﴾وە زانایان جەند واتاتیەکیان داناون: یەکەم: (**وَهِيَ كَلِمَةُ تَوَعُّدٍ تَجْرِي مَجْرَى الْمَثَلِ اسْمُ تَفْضِيلٍ مِنْ وَلِيَ، وَفَاعِلُهُ ضَمِيرٌ مَحْذُوفٌ عَائِدٌ عَلَى مُقَدَّرٍ مَعْلُومٍ فِي الْعُرْفِ، فَيُقَدِّرُهُ كُلُّ سَامِعٍ بِمَا يَدُلُّ عَلَى الْمَكْرُوهِ، مِثْل: قَارَبَكَ مَا تَكْرَهُ**)، ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴾، واتە: ئەمە وشەی هەڕەشەیە وەك پەند (**مَثَل**) وایە و لە ئەسڵدا ناوی هەڵبژاردنە لە (**وَلِي**)ەوە هاتوە، (**وليَ**) واتە: (**قَرُبَ**)، نزیک کەوتووم، بکەرەکەی بریتیە لە ڕاناوێکی قرتێنراو، دەگەڕێتەوە بۆ شتێکی ئەندازەگیریی کراوی زانراو، بەپێی عورف و باو، هەر بیسەرێك بۆ خۆی ئەندازەگیریی دەکات و دایدەنێ، بەخۆرێک ناخۆشیی و ناڕەحەتی بگەیەنێ، وەك (**قَارَبَكَ مَا تَكْرَهُ**) ئەوەی پێت ناخۆشە

لێت نزیك بێ، دووەم: هەندێكی دیكە ئاوایان لێكداوەتەوە: (**أَوْلَى لَكَ: أي وَلِيَكَ الوَيْلُ**)، وەیل و سزای سەخت لە تۆ نزیك بێ، سێیەم: هەندێكی دیكە ئاوایان لێكداوەتەوە، (**أَوْلاكَ الله مَا تَكْرَهُ**)، خوا لێتەوە نیزیك بخات، ئەوەی ئەتۆ پێت ناخۆشە.

چوارەم: ئەبوو عەلی فارسیی گوتوویەتی: ( **إنَّ أَوْلى عَلَمٌ لِمَعْنَى (الْوَيْلِ لَكَ) وَهُوَ الْهَلَاكُ، فَأَصْلُ تَصْرِيفِهِ أَوْيَلُ لَكَ، أَيْ أَشَدُّ هَلَاكًا لَكَ فَوَقَعَ فِيهِ الْقَلْبُ (لِطَلَبِ التَّخْفِيفِ) وَالْكَافُ خِطَابٌ لِلإِنسَانِ الْمُصَرحِ بِهِ غَيْرَ مَرَّةٍ فِي الْآيَاتِ السَّابِقَةِ**)،واتە: (**أَوْلى**) كراوەتە بە ناو بۆ مانای (**وَيْل**) واتە: [سزای سەخت بۆتۆ]، (**أَوْلى**) لە ئەسڵدا (**أَوْيَلُ**)یە، واتە: وەیلتر و سزای سەختتر و، خراپترین فەوتاندن بۆ تۆ، بەڵام دوایی (**أَوْيَلُ**) قەلب و گێڕانەوەی تێدا ڕوویداوە، بۆ ئەوەی سووك بێ، كراوەتە (**أَوْلى**)، ئنجا (**أَوْيَلُ**) كە كراوەتە بە (**أَوْلى**)، (**ك**)ەكەش بۆ دواندنی مرۆڤە، ئەو مرۆڤەی لە ئایەتە پێشووەكاندا باسكراوە.

كە دەفەرمووێ: ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴾، ئەم (**ف**)ە جەختـ كردنەوەیە بۆ (**أَوْلى**)ی یەكەم، واتە: سزای هەرە سەخت بۆ تۆ سزای هەرە سەخت، بۆیەش بە (**ف**) هاتوە (**ف**)ی بەدوا داهاتن، تاكو ئەوە بگەیەنێ كە ئەوەی دوعای لێ دەكرێ، خراپە لە دوای خراپە بەسەریدا بێ، چوار جاریش دووبارە كراوەتەوە.

زانایان لە بارەی حیكمەتی ئەوە كە بۆچی چوار جاران وشەی (**أَولى**) دووبارە كراوەتەوە، دوو جاریان بە (**ف**):

أ- هەندێكیان گوتوویانە: (**الوَيْلُ لَكَ فِي الحَيَاةِ وَفِي المَمَاتِ، وَعِنْدَ البَعْثِ، وَعِنْدَ دُخُولِ النَّار**)، سزای سەخت بۆ تۆ، یان سزای سەختتر بۆ تۆ لە ژیانی دنیادا و، لە كاتی مردنتداو، لە كاتی هەڵسێنرانەوەو زیندوو كرانەوەداو، لە كاتی چوونە نێو ئاگرتدا.

ب- هەندێكیش گوتوویانە: حیكمەتی ئەو كارە ئەوەیە، ئەو كەسە بە چوار خەسڵەتی زۆر خراپ پێناسە كراوە: ﴿ فَلَاصَدَّقَ ﴾، ﴿ وَلَاصَلَّىٰ ﴾، ﴿ وَلَٰكِن كَذَّبَ ﴾، ﴿ وَتَوَلَّىٰ ﴾، ئنجا هەڕەشەكەشی چوار جاران هاتوە، هەر هەڕەشەیەك و، هەر سزایەكی سەخت

لە بەرانبەر خەسڵەت و کردەوەیەکی خراپیدا، بۆیەش بە فیز ڕۆیشتنەکەی حیساب نەکراوە، چونکە پێش ئەوەی پێغەمبەری خواش ﷺ بانگی بکات بۆ لای خوا، هەر عادەتی دا بووە، واتە: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا- ﷺ بانگی کردوە بۆ لای خوا، ئەو سیفەتەی تێدا زیاد نەبووە ئەو کردەوە خراپە، تاکو ئەویش سزایەکی لە بەرانبەردا دابنرێ، بەڵکو ئەو سیفەتەی هەر هەبووە.

**{عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ قوله: ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾﴾ أَشَيْءٌ قَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَبِي جَهْلٍ مِن قِبَلِ نَفْسِهِ، أَمْ أَمَرَهُ اللَّهُ بِهِ؟ قَالَ: بَلْ قَالَهُ مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ، ثُمَّ أَنْزَلَهُ اللَّهِ}، (أخرجه النسائي في التفسير: ٦٥٨، والحاكم في المستدرك: ج ٥، ص:٥١٠، والطبراني في الكبير: ١٢٩٩٨، وإسناده صحيح على شرط البخاري ومسلم)**، سەعیدی کوڕی جوبەیر خوا لێی ڕازی بێ، کە زانایەکی گەورەی جیلی شوێنکەوتووانە، دەڵێ: لە کوڕی عەبباسم پرسی (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە بارەی فەرمایشتی خواوە کە دەفەرموێ: ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٥﴾﴾، ئایا ئەمە شتێکە پێغەمبەری خوا بە ئەبوو جەهلی گوتوە، لەلایەن خۆیەوە، یان خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە بیڵێ؟ ئەویش گوتی: بەڵکو بۆ خۆی گوتوویەتی، دوایش خوا ﷻ دایبەزاندوە.

کەواتە: ئەم ئایەتانە، لە بارەی ئەبوو جەهلەوە هاتوونە خوار و ڕووی دواندن لەوە، بەڵام دیارە لە پشت ئەویشەوە، هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە وەك دین.

لەو بارەوە ئەم دوو دەقەش دێنین:

**١- {عَنِ إبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ رَسُوْلُ الله ﷺ قَالَ: إِذَا مَشَتْ أُمَّتِي الْمُطَيْطَاءَ، وَخَدَمَتْهُمْ فَارِسُ وَالرُّومُ، كَانَ بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ} (أخرجه الترمذي: ٢٠١٦١، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي)**، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کاتێك ئوممەتی من بە خۆبادانەوە ڕۆیشت و،

فارس و ڕۆم خزمەتیان، ئەوە شەڕو کێشەو دووبەرەکیی دەکەوێتە نێوان خۆیان، واتە: هەر کاتێك وایان لێهات بە فیزو کەشخە بە زەویدا بڕۆن، کەسێك بە فیزو کەشخەو خۆبادانەوە بە زەویدا دەڕوا، کە سەر بەرز نەکاتەوە بۆ لای خوا، ئەگەر مرۆڤ خوا ببینێ خۆی دەناسێ، هەرکەسیش خوا بناسێ، خۆی دەناسێ و، فیزو کەشخەو خۆ ڕاوەشاندن لە خۆی ناوەشێنێتەوە.

هەروەها ئەم دەقە ئاماژەشە بەوە کاتێك دێ، دەوڵەتی موسڵمانان فراوان دەبێ و، مسوڵمانان دەسەڵاتیان دەبێ و، فارس و ڕۆم کە ئەو کاتە دوو دەوڵەتی هەرە ناودار بوون، دوو دەوڵەتی زلهێزی ئەو ڕۆژگارەیان بوون، پێغەمبەر ﷺ هەواڵیداوە و موژدەی داوە، کاتێك دێ ئەوانە خزمەتیان دەکەن، بەڵام دوایی موسڵمانان وایان لێ دێ، بوغڕا دەبن و لە کەوڵی خۆیان دەردەچن، ئنجا کێشەو شەڕ دەکەوێتە نێوان خۆیان، ڕێك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی وا هاتۆتە دی.

**٢- {قَالَ قَتَادَةُ: فَأَخَذَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ فَقَالَ: ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٥﴾﴾، فَقَالَ يَا مُحَمَّد مَا تَسْتَطِيعُ أَنْتَ وَلَا رَبُّكَ لِي شَيْئًا، إِنِّي لَأَعَزُّ مَنْ بَيْنَ جَبَلَيْهَا. فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ أَشْرَفَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ: لَا يُعْبَدُ اللَّهُ بَعْدَ هَذَا الْيَوْمِ أَبَدًا. فَضَرَبَ اللَّهُ عُنُقَهُ، وَقَتَلَهُ شَرَّ قِتْلَةٍ} (أخرجه الطبري ٣٥٨٣٩، وإسناده مرسل ورواه عبدالرزاق في تفسيره ٣٦١٩ عن قتادة مرسلاً).**

قەتادە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووان، بۆیەش ئەوەی کە هێناویەتی بە (**مُرسل**) لە قەڵەم دەدرێ، (**مُرسل**) ئەوەیە پاڵ نەدرابێتەلای یەکێك لە هاوەڵان، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ئەبو جەهلی گرت، (ڕۆژێك دیارە لە مەککە دەستی گرتوە)، پێی فەرموو: سزای هەرە سەخت بۆ تۆ، دوایی سزای هەرە سەخت بۆ تۆ، سزای هەرە سەخت بۆ تۆ، پاشان سزای هەرە سەخت بۆ تۆ، ئەویش گوتی: ئەی موحەممەد! نە تۆ و نە پەروەردگارت لە بارەی منەوە هیچتان پێ ناکرێ، من باڵا دەسترین کەسم کە لە نێوان دوو چیایەکان دا دەڕوات، [واتە: لە مەککە،] کاتێك ڕۆژی بەدر جەنگی بەدر هات، ئەبوو جەهل ڕووی کردە

خەڵكەكە (ئەوانەی هێنابوونی بۆ شەڕ لە دژی ئیسلام)، گوتی: لەمڕۆ بەدواوە خوا هەرگیز ناپەرستریٚ، [ئەو خەیاڵ پڵاوەی كرد] بۆیەش خوا لە گەردەنی دا [واتە: بەهۆی هاوەڵانەوە]و، بەخراپترین جۆری كوشتن لە بەینی برد.

## مەسەلەی حەوتەم و كۆتایی:

**پرسیاركردنی نكووڵیلێكەرانە لە مرۆڤی بێبڕوا، كە پێی وایە وێڵ دەكرێ و لێی ناپرسرێتەوە، لە حاڵێك دا خوا لە تۆویلكەیەكی نێو تۆو دروستی كردوە، كە دەڕژێندرێتە نێو منداڵدانەوە، كە كردوویەتی بە خوێنپارەو ڕێكیخستوەو، دوو جووتی نێرو مێی لێ هێناونە دی، بێگومان خوای بەدیهێنەری بەو جۆرە وەسف كراویش، مردووانی پێ دەژیێنرێنەوە:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِىٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴾، ئایا مرۆڤ پێی وایە وێڵ بكریٚ و بە وێڵكراوی وازی لیٚ بهێنریٚ؟ پرسیاركردنەكە پرسیاركردنی نكووڵیلێكەرانەیە، (تَرك) بریتیە لە وازلێهێنانی شتێك بە ویستی خۆ، بە ویستی بابای واز لێهێنەر، بەڵام دوایی بەكاردەهێنریٚ بۆ پشتگوێخستن و وێڵكردن و گرنگیی پیٚ نەدان، وشەی (**سُدى: اسْمٌ بِمَعْنَى الْمُهْمِلِ**) ناوە بە مانای وێڵكراو، (**وَيُقَالُ سُدَى وَسَدَى وَالضَّمُّ أَكْثَرُ، وَهُوَ اسْمٌ يَسْتَوِي فِيهِ الْمُفْرَدُ وَالْجَمْعُ يُقَالُ: إِبِلٌ سُدى، وَجَمَلٌ سُدًّى وَيُشْتَقُّ مِنْهُ فِعْلٌ فَيُقَالُ: أَسْدَيْتُ إِبِلِي**)، وشەی (**سُدى**) ناوە بە مانای (**الْمُهْمَلِ**)، وێڵكراو پشتگوێخراو، بە بۆر (**ضَمّ**) هاتوەو، (**سُدى**) هەم بەسەر (فەتح) یش (**سَدى**)، بەڵام زیاتر بە بۆر (**سُدى**) بەكاردیٚ، ئەویش ناوێكە تاك و كۆو، نێرو میٚ

تێیدا یەکسانن، بۆ هەموویان هەر وشەی (**سُدى**) بەکاردەهێنرێ، دەگوترێ: (**إِبِلٌ سُدَى، وَجَمَلٌ سُدَى**)، حوشترانێك كە وێڵكراون و حوشترێك كە وێڵكراوە، وشەی (**أَسْدَيْتُ**) واتە: (**أَهْمَلْتُ**) لەو وەرگیراوە، (**أَسْدَيْتُ إِبِلِي**) وشترەکانم وێڵکردن.

کەواتە: لێرەدا وشەی (**الإنسان**) وەك هەر پێنج جارەکەی ڕابردوو و، ئەمجارەش کە جاری شەشەمە کۆتاییە لەم سوورەتەدا هاتوە، واتە: مرۆڤی بێبڕوا، مرۆڤی دوور لە خوا، ئایا مرۆڤی بێبڕوا پێی وایە بە وێڵکراویی و وازی لێ بهێنرێ و، پشتگوێ بخرێ، کەس پێی نەڵێ چیت کردو چۆنت کرد، سزاو پاداشت ڕووی تێنەکات؟ ئەمە وەك ئەو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (**المؤمنون**) ە کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾، ئایا پێتان وایە ئێوەمان بە هەوەنتە هێناوەتە دی و، بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە؟

٢)- ﴿ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴾، ئایا ئەو مرۆڤە تۆویلکەیەك نەبوو لە تۆوێك کە دەڕژێنرێ، دەڕژێندرێتە نێو منداڵدانەوە؟ (**نُطْفَة**) بە ئاوی کەم دەگوترێ و بەوە دەگوترێ کە لە ئەنجامی یەکگرتنی (**حَيْمَن**)ی پیاو و هێلکۆڵەی ئافرەتدا پێك دێ، زیندەوەرێك پێك دێ کە (**نُطفة**)یە، دوایی ئەو زیندەوەرە دەچێتە نێو منداڵدانی ئافرەتەوە، بۆیە دەفەرموێ: (**يُمنى**) واتە: (**يُقذف**) هەروەها بە (**تُمنى**)ش خوێندراوەتەوە واتە: (**تُقذف**)، فڕێ دەدرێتە نێو منداڵدانەوە.

٣)- ﴿ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴾، دوایی خوێنپارەیەك بوو، خوا هێنایە دی و ڕێکیخست، یاخود: (**خَلَقَ**) واتە: (**قَدَّرَ**) ئەندازەگیریی کرد، (**فَسَوَّى**) ڕێکیخست، هەڵبەتە بەرکاری هەر کام لە (**خَلَقَ وسَوَّى**) قرتێندراون، واتە: (**فَخَلَقَهُ فَسَوَّاهُ**) ئەوەی ئەندازەگیری کرد و ڕێکیخست.

٤)- ﴿ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴾، ئنجا لەو (لەو نوتفەیە) جووتی نێرو مێی هێنانە دی.

٥)- ﴿ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، ئایا ئەوە، توانادار نییە کە مردووان بژیەنێتەوە؟ (**أَلَيْسَ ذَلِكَ الَّذِي أَنْشَأَ خَلْقَ البَدِيْعِ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحِيَ الموتَى؟**)، ئایا ئەو زاتەی ئەو دروستکراوە سەرسوڕهێنەرەی هێناوەتە دی، ناتوانێ مردووان بژیێنێتەوە؟

کە دەفەرمـوێ: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴾، (**الطبري**) لـە موجاهیـدەوە بـە ژمـارە: (٤٥٨٤٤) هێناویەتـی؛ (**قَـالَ: لَا يُؤْمَـرُ وَلَا يُنْهَـى**) واتـە: نـە فەرمانـی پـێ بکـرێ و نـە شـتی لـێ قەدەغـە بکـرێ، پێـی وایـە وا دەبـێ، (**عَلَقَـة**) بـە کوردیـی دەڵێیـن: خوێنپـارە، (**القِطْعَـةُ الصَغِيْرَةُ مِـنَ الـدَّمِ المُتَعَقِّـد**)، پارچەیەکـی گچکەیـە لـە خوێنێکـی پەیوەسـت، کـە یەکێکـە لـە قۆناغەکانـی دروسـت بوونـی کۆرپەلـە.

کـە دەفەرمـوێ: (**فَسَوّى: التَّسْـوِيَة جَعْـلُ الـشَّيْءِ سَـوَاءً أَي: مُعَـدَّلاً مُقَوَّمـاً**)، بریتیـە لـە شـتێك ڕێکبخەیـی و هاوسـەنگی بکـەی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، (**الطبري**) بـە ژمـارە: (٣٥٨٤٦) هێناویەتـی لـە قەتـادەوە، لـە وەڵامـی ئـەوەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، گوتویەتـی: {**ذُكِـرَ لَنَـا أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ كَانَ إِذَا قَرَأَهَـا قَـالَ: سُـبْحَانَكَ وَبَـلَى**}، (**إسـناده مرسـلٌ وذكـره الألبـاني في صفـة صـلاة النبـي ﷺ وعـزاه لأبي داود ٨٨٤. وَقَـالَ سَـنَدُهُ صَحِيـحٌ**)، واتـە: بۆمـان گێڕدراوەتـەوە و باسـکراوە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کاتێـك ئـەوەی دەخوێنـد، دەیفەرمـوو: پاکیـی بـۆ تـۆ و بـا.

ئـەو زاتـەی ئـەوەی هێناوەتـە دی، دەشـتوانێ مـردووان بژیێنێتـەوە، واتـە: سـوونەتە کاتێـك مـرۆڤ ئـەو سـوڕەتە دەخوێنێتـەوەو دەگاتـە ئـەم ئایەتـە موبارەکـە: ﴿ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، بڵـێ (**سُـبْحَانَكَ وَبَـلَا**)، پاکیـی بـۆ تـۆ و بـا، یاخـود بڵـێ: (**سُـبْحَانَكَ وَبَلَـى، وَأَنَـا عَـلَى ذَلِـكَ مِـنَ الشَـاهِدِيْن**)، واتـە: پاکیـی بۆتـۆو بـا، منیـش لەسـەر ئـەوە سـایەدمانم. زانایـان گوتوویانـە: مـەرج نیـە هـەر ئـەو دەقـە بگوترێ، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ دەقـی دیکەشـی فەرمـوون، بـە پێـی گونجـاوی لەگـەڵ ئایەتەکانـدا، گرنـگ ئەوەیـە لـە وەڵامـی ئـەوەدا کـە خـوا دەپرسـێ، دەبـێ وەڵامێك بدەیـەوە لەگـەڵ پرسـیارەکەدا پـڕ بـە پێسـت و گونجـاو بـێ.

## کورتە باسێک لە بارەی ڕۆژی دواییەوە[(١)]

خوا پشتیوان بێت ئەو کورتە باسە لە شەش تەوەردا دەخەینە ڕوو:

**تەوەری یەکەم:** مانای بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی.

**تەوەری دووەم:** گرنگیی و پێگەی بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی.

**تەوەری سێیەم:** بەڵگەکانی ڕاستیی هاتنی ڕۆژی دوایی، کە حەوت بەڵگە دێنینەوە.

**تەوەری چوارەم:** پێشەکیی و قۆناغەکانی ڕۆژی دوایی، لە سێ بڕگەدا.

**١-** مردن و بەرزەخ وەك پێشەكیی.

**٢-** قۆناغی یەکەم دوای فووی یەکەم، دیارە ئەویش لە دوو خاڵدا:

**أ-** ناوەکانی قۆناغی یەکەم ئاخیرزەمان **(الساعة)**.

**ب-** ڕووداوەکانی قۆناغی یەکەم ئاخیرزەمان.

**٣-** قۆناغی دووەم دوای فووی دووەم کە قیامەتە، ئەویش لە دوو خاڵدا:

**أ-** ناوەکانی قیامەت.

**ب-** ڕووداوەکانی قیامەت.

**تەوەری پێنجەم:** حەوت مەسەلەی گرنگی پەیوەست بە قیامەتەوە.

**تەوەری شەشەم و کۆتایی:** قۆناغی سێیەمی ڕۆژی دوایی، کە بەڕێکرانی هەر کام لە ئیماندارانی چاکەکارە بۆ بەهەشت و، بێبڕوایانی خراپەکارە بۆ دۆزەخ.

---

(١) ئەو کورتە باسە، ڕاستەوخۆ، بەڵام بە کورتکراوەیی و گوشراویی لە مەوسووعەی (الإسلام کما یتجلی في کتاب الله) هێناومە، کە کاتی خۆی لە زیندانی ئەمریکایەکاندا نووسیومە، لە کتێبی هەشتەم (الکتاب الثامن): (الایمان بالله و الیوم الإخر والحث مختصر حول القدر) (الطبعة الثانیة، دار الحکمة، لندن، ٢٠١٨ز).

## تەوەری یەکەم: مانای بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی:

دەگونجێ لەو بارەوە زۆر شت بگوترێ، بەڵام پوختەو گوشراوەکەی ئەوەیە: بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی، بریتیە لە بەڕاست زانین و، قەناعەت هەبوون لە دڵەوەو، بەڕاست زانینی بە زار، بەوە کە ڕۆژێك دێ، ئەم ژیانە دنیاییەی ئێستامان تێیداین، کۆتایی پێ دێ و لاپەڕەی ژیانی دنیا دەپێچرێتەوە و، لاپەڕەی ژیانێکی دیکە کە ژیانی مەنزڵگای کۆتاییە دەکرێتەوە، کە مرۆڤ هەروەها جندیش لەوێدا بە سزا و، یان پاداشتی کردەوەکانی خۆی دەگات، ئنجا کردەوەکان ئەگەر خراپ بووبن سزا، ئەگەر چاك بووبن پاداشت، بەڵام دەبێ بەڕاست زانینێك و قەناعەت پێ هێنانێك بێ، خاوەنەکەی وا لێ بکات، کارلێك بکات لەگەڵ ئەو ڕۆژە مەزنەداو، ئەو ڕووداوانەی تێیدا ڕوودەدەن، بە شێوەیەك هەموو جموجۆڵێکی خۆی ئاگا لێ بێ، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئیمان هەبوونە بە ڕۆژی دوایی و بە دیداری خوادا، جموجۆڵ و هەڵسوکەوتەکانی بکات، ئنجا جموجۆڵ و هەڵسوکەوت و کردەوەکانی چ ئەو بیرو خولیایانەی لە مێشکیدا دێن و دەچن، چ ئەو نیازو مەبەستانەی بە دڵیدا دێن، چ ئەو وشانەی بەسەر زمانیدا دێن، یاخود بە پەنجەی دەیاننووسێ، یاخود بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی نووسین، چ تێکڕای کردەوەو هەڵسوکەوتەکانی کە بە ئەندامەکانی و، وە جەستەی ئەنجامیان دەدات، هەروەها بڕواهێنانێك و بەڕاست زانینێك، کە مرۆڤ حیسابێکی زۆر ورد بکات بۆ هەموو کاتەکانی تەمەنی، بەڵکو هەموو تاوەکانی تەمەنی، کە تاکە دەستمایەینی لەم ژیانە دنیاییە کورتە، بەڵام زۆر گەورەو گرنگەدا.

هەڵبەتە وشەی ڕۆژ (يَوْم)، لە زمانی عەرەبییدا -وەك زۆرجار باسمان کردوە- واتە: ماوەیەك لە کات، ئنجا چ درێژ بێ و، چ کورت بێ، هەموو فەرهەنگەکانی زمان وا دەڵێن، (يَوْم) جاری وا هەیە لە بەرانبەریدا شەو هەیە، ئەو کاتە

(یَوْم) بـە مانـای (النَّهَـار) دێ، شـەویش (اللَّيْـل)، جـاری واش هەیـە وشـەی (یَـوْم) بـۆ هـەردوو دیـوی شـەوو ڕۆژ بـەکاردێ، کـە دیـارە بـۆ ئێمـەی خەڵکـی سـەر زەوی شـەوو ڕۆژ ماوەکەیـان (٢٤) سـەعاتە، دوازدە بـە دوازدە بـە شـێوەی هاوکۆیـی دابەش دەبـن، کـورت و درێژیشـیان دەبـێ، بـەڵام لـە ئەسـڵی زمانـی عەرەبیـدا (یَـوْم) واتـە: ماوەیـەك لـە کات، هـەر بۆیـە لـە قورئانـدا خـوای پـەروەردگار ڕۆژی خـۆی بـە هـەزار سـاڵ (أَلـف سَـنة) دانـاوە وەک لـە سـووڕەتی (الحـج)دا هاتـووە: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾، هەروەهـا لـە سـووڕەتی (السجدة)شـدا: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾﴾، واتـە: ڕۆژێـك لـەلای پـەروەردگارت بـە ئەنـدازەی هـەزار سـاڵە، لـەوەی ئێـوە دەیژمێـرن، هەروەهـا لـە سـووڕەتی (السجدة)شـدا هـەر ئـەوە دووبـارە بۆتـەوە، بەڵکـو لـە سـووڕەتی (المعـارج) لـە ئایەتـی ژمـارە (٤) خـوای زانـا و دانـا ڕۆژێکـی لای خـۆی، یـان ڕۆژێـك کـە فریشـتەکان و جیبریـل تێیـدا بەرزدەبنـەوە، بـە پەنجـا هـەزار سـاڵی وەك ئێمـەی دانـاوە: ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾.

کەواتـە: (یَـوْم) واتـە: ماوەیـەك لـە کات، (اليَـوْم الآخِـر) ڕۆژی دوایـی، واتـە: ئـەو کاتـەی ئـەو ڕووداوانـەی تێـدا دێتـە دی، کـە دابـەش دەبـێ بـۆ دوو قۆنـاغ: قۆناغـی ئاخیـر زەمـان (السَّـاعة) و، قۆناغـی هەڵسـانەوە و سـزاو پاداشـت و لێپرسـانـەوە (القِيَامـة).

## تەوەری دووەم: گرنگی و پێگەی بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی:

بڕواهێنـان بـە ڕۆژی دوایـی یەکجـار گرنگیـی و بایەخێکـی گـەورەی پێـدراوە، بەڵکو لـە قورئانـدا هەمیشـە بڕواهێنـان بـە خـوا یەکـەم هاتـوە، دوای ئـەو بڕواهێنان بـە ڕۆژی دوایـی (**يُؤْمِنُـون بِاللـه وَاليَـوْم الأخِـر**)، (**آمَـنَ بِاللـه وَاليَـوْم الأخِـر**)، ئەمـە لـە قورئانـدا زۆر دووبـارە بۆتـەوە، دەتوانیـن بڵێیـن: گرنگیـی و پێگـەی ڕۆژی دوایـی لـە چەنـد شـتێکدا بەرجەسـتە دەبـێ:

١- خوا ﷻ زۆر باسی ڕۆژی دوایی کردوە و، باسی ئەو ڕووداوانەی تێیدا ڕوودەدەن و، ئەو کارەساتانەی دەقەومن، وەك دوایی ئاماژەیان پێ دەکەین، هەر شتێکیش خوا ﷻ لە کتێبی خۆیدا زۆر باسی کرد بێ، مانای وایە بە ئەندازەی زۆر باسکرانی، پێگەو گرنگیی و بایەخی هەیە.

٢- هەمیشە خوا ﷻ ئیمان بە ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئیمان بە خوادا پێکەوە باس دەکات، پێشتریش ئاماژەم پێدا، هەمیشە لە دوای بڕوا بە خوا هێنان، باسی بڕوا بە ڕۆژی دواییە، (**يُؤْمِنُون بِالله وَاليَوْم الأخِر**)، کە ئەمە لە قورئاندا زۆر دووبارە بۆتەوە.

٣- ڕۆژی دوایی ناوی زۆر بۆ بەکارهاتوون، زیاتر لە بیست (٢٠) ناو، وەك دوایی باسیان دەکەین، هەڵبەتە هەردوو قۆناغەکە (**السَّاعَة وَالقِيَامة**) ناوەکانیان زیاتریشن، بەڵام وشەی (**اليوم الأخِر**) بۆ هەردوو قۆناغەکە بەکاردێ، زیاتر لە بیست (٢٠) ناوی بۆ بەکارهاتوون.

٤- خوا ﷻ ئەوەندە باسی ڕۆژی دوایی کردوە، کە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، ژمارەیەك لەو سیفەت و ناوانەی خوا بۆ ئەو ڕۆژە بەکاریهێناون، کردوویانن بە ناوصنیشان بۆ هەندێك لە سووڕەتەکان، وەك (**الزُّمَر، الجاثية، الواقعة، التغابن، الحاقة، القيامة، النبأ، التكوير، الإنفطار، الإنشقاق، الغاشية، الزلزلة، القارعة**)، هەڵبەتە گرنگیی و بایەخی بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی لە ژیانی مرۆڤدا، لە دوای بڕواهێنانە بە خوا و،

بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی لە هەموو پایەكانی دیكەی ئیمان، بەشەكانی دیكەی ئیمان كاریگەری زیاتر لە ژیانی مرۆڤدا، چونكە بڕواهێنان بە خوا، بناغەو سەرچاوەی ئیمانە، ئنجا ئەگەر بڕوا بە خوا هێنان سەرەتایەو دەستپێكە، بڕوا بە ڕۆژی دوایی هێنانیش مەصیرو سەرەنجامە، بگرە بڕوا بە رۆژی دوایی هێنانیش هەر بڕوا بە خوا هێنانە، خوا دەفەرمویّ: ئێوەم بۆ تاقیكردنەوە لێرە داناوە، دواییش دەفەرمویّ: ڕۆژێك دیّ بە دیداری من دەگەنەوەو، لەگەڵ سزاو پاداشتی كردەوەكانی خۆتاندا ڕووبەڕوو دەبنەوە.

هەر بۆیەش خوا ﷻ لە قورئاندا زۆر گرنگیی داوە بە ڕۆژی دوایی و پەیوەست بوونی بە ژیانی مرۆڤەوە، بۆ وێنە: زۆر باسی ئەو ڕووداوە سامناكانەی كردوە، كە لە ڕۆژی دواییدا دەقەومن، بە جۆرێك كە موچركە بە پێستی مرۆڤدا دێنن، هەروەها خوا زۆر هۆشداریی داوە بە مرۆڤەكان كە زۆر ئاگایان لەو ڕۆژە بێ، خۆیانی بۆ ساز بكەن، دیسان خوا هۆشداریی داوە بە مرۆڤەكان، كە ئەو ڕۆژەیان لە بیر نەچێت و وێڵی نەكەن و نەخافڵێن، دیسان خوا ﷻ زۆر باسی سەرەنجامی مرۆڤەكانی كردوە لەو ڕۆژەدا، كە ئەگەر چاكەكار بن لە بەهەشتدا نیشتەجێ دەبن و، خراپەكار بن تووشی دۆزەخ دەبن، لە زۆرێك لە ئایەتەكانی قورئاندا، خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییانەی خستوونە ڕوو، بۆ وێنە:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ۗ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴿١٧﴾ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِى ٱلسَّاعَةِ لَفِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾ ﴾ **الشورى**.

هەروەها لە سوورەتی (**الشورى**) ئایەتی (٤٧)دا: ﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۚ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ ﴾.

هەروەها لە سوورەتی (**الدُّخان**)دا ئایەتەكانی (٤٠ - ٤٢): ﴿ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ ﴾.

دیسان لە گەلێك لە سوورەتەكانی دیكەدا، خوای موتەعال باسی ڕۆژی دوایی و گەورەیی و گرنگیی و كاریگەریی ڕۆژی دوایی كردوە.

## تەوەری سێیەم: بەڵگەكانی بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی:

لە قورئاندا خوای باڵادەست و مەزن زۆر بەڵگەی هێناونەوە، كە ئێمە حەوتیانمان لێ گوڵبژێر كردوون و، بە كورتیی بەسەریاندا دەڕۆین:

١- خوا ﷻ ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە، بە هەق و حیكمەت دروستیكردوون و، ئەمەش خوازیاری ئەوەیە ڕۆژی دوایی هەبێ، تاكو ئەو هەق و حیكمەتەی خوا ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی نێوانیانی بۆ دروست كردووە، كە بریتییە لەوەی ئەو مرۆڤەی تێیاندا كراوە بە جێنشینی خوا، بە سزاو پاداشتی خۆی بگات، خوا دەفەرموێ: ﴿ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ ﴾ **الأحقاف**، ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە حەق و بۆ كاتێكی دیاریكراو نەبێ نەهێناونە دی، ئەوانەش كە بێبڕوان لەوەی پێی ترسێنراون و ورياكراونەوە پشت هەڵكردوون.

لە گەلێك ئایەتی دیكەدا خوای میهرەبان ئەم ڕاستییەی بەیان كردوە، كە دروستكرانی ئاسمانەكان و زەوی بە حەق و بە حیكمەت، خوازیاری ئەوەیە دەبێ ڕۆژی دوایی هەبێ.

٢- هاتنە دی دادگەریی خوای بەرز و، نەبوونی زوڵم لە خوای پاكی بێ وێنەدا، خوازیاری ئەوەیە كە دەبێ ڕۆژی دوایی بێت، واتە: بەبێ هاتنی ڕۆژی دوایی دادگەریی خوا ناچەسپێ و، ئەو زوڵمەشی كە لە خوای دادگەردا نیەو، خوا هەمیشە داكۆكیی لەسەر ئەوە دەكات، كە خوا ستەم لە بەندەكانی ناكات، ئنجا بە هۆی هاتنە دی ڕۆژی دواییەوە، ئەو ستەمەش نایەتە بەرچاو، ئەگەرنا ئەگەر بێت و ڕۆژی دوایی نەبێ، ئەوانەی چاكەیان كردوە، نەك هەر لە دنیادا پاداشتی خۆیان وەرناگرنەوە، بەڵكو تووشی ئازارو سزاو ئەشكەنجەو

جەزرەبەش دێن، هەروەها ئەوانەش کە خراپەو ستەم و تاوانیان کردوە، نەك هەرکەس سزایان نادات، بەڵکو زۆرجار خەڵات و شاباشیش دەکرێن، ئەوەش زوڵمە، و لایەقی خوای کاربەجێ نیە، بۆیە دەبێ ڕۆژێك هەبێ دادگەری خوای تێدا بچەسپێ و، زوڵمیشی تێدا لابچێ، بۆیەش خوا ﷻ لە سووڕەتی (ص)دا ئایەتی (٢٨)دا دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾﴾، یان ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناو کردەوە باشەکانیان ئەنجام دان، وەك تێکدەران لە زەوی دا تەماشا دەکەین، یان ئایا پارێزکاران وەك تاوانباران تەماشا دەکەین؟

هەروەها لە سووڕەتی **(القلم)** دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾﴾، واتە: بەدڵنیایی پارێزکاران لە لای پەروەردگاریان باخە پڕ نازو نیعمەتەکانیان هەن، ئایا بۆ خوا ملکەچان وەك تاوانباران تەماشا دەکەین، چیتانە چۆن بڕیار دەدەن؟

هەورەها لە سووڕەتی **(الجاثية)** خوا دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾، واتە: یان ئایا ئەوانەی خراپەکانیان ئەنجام داون، پێیان وایە وەك ئەوانەیان دادەنێین، کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، ژیان و مردنیان وەك یەك دەبێ! ئەوە خراپترین شتە کە ئەوان بڕیار دەدەن، خوا ئاسمانەکان و زەوی بە حەق هێناونە دی، بۆ ئەوەش کە هەر کەسە بەپێی ئەوەی کردوویەتی سزاو پاداشت بدرێتەوە.

**٣**- هاتنە دی بەڵێنی خوای بەرز، خوازیاری ئەوەیە کە ڕۆژی دوایی بێ، خوا ﷻ فەرمانی بە ئێمەی مرۆڤ کردوە پابەند بین بە بەڵێنەکانمانەوە، کە گفتمان دا بیهێنینە دی، بۆ وێنە: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا ﴿٣٤﴾﴾**الإسراء**، هەروەها لە سووڕەتی **(النَّحل)**: ﴿وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا ﴿٩١﴾﴾.

ئنجا خـوا ﷻ بێگومـان هەمـوو سـیفەتە بـەرزو باشـەكانی هـەن و، دووره لـه هەرچـی كـەم و كوڕیـی و لەكـەو هەڵـەو پەڵەیـە، یەكێـك لـە سـیفەتە باشـەكانیش بریتیـە لـە هێنانـە دی بەڵێـن و پەیـمان، كـە خـوا فەرمانـی بـە بەندەكانـی كـردوه وابـن، جـا بـۆ خـۆی چـۆن وا نابـێ؟ وەك و خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۝١١١﴾ التوبة، واتـە: كـێ لـە خـوا وەفادارتـره بـە بەڵێـن و پەیمانـی خـۆی!

هەروەهـا لـە سـوورەتی (الزُّمَـر)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ ۝٢٠﴾، ئـەوە بەڵێنـی خوایـە، خـوا بەڵێنـی خـۆی دواناخـات.

لـە سـوورەتی (الزُّمَر)یـش دا هاتـووە بەهەشـتیەكان كـە دەچنـە بەهەشـت دەڵێن: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ۝٧٤﴾، سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی بەڵێنەكـەی خـۆی لەگەڵـدا ڕاسـت بردینـە سـەرو، سـەرزەمینی بەهەشـتی پێدایـن، لـە هـەر شـوێنێك بمانـەوێ نیشـتەجێ دەبیـن، باشـترین پاداشـت پاداشـتی ئەوانەیـە كـە كـردەوەی چاكیـان كـردوون، كەواتـە: ناگونجـێ بەڵێنـی خـوا ڕاسـت دەرنەچـێ و، خـواش بەڵێنـی داوە، مرۆڤـەكان زینـدوو بكاتـەوەو، سـزاو پاداشـتیان هەبـێ، بۆیـە بـۆ ئـەوەی ئـەو بەڵێنـەی خـوا ﷻ بێتـە دی، دەبـێ ڕۆژی دوایـی هەبـێ.

٤- له لەیەك جیاكردنەوەی ئەهلی هەق و ئەهلی باتیڵ، ئەوانەی هەقرەو بوون، ئەوانەی كەچەوترەو بوون و، ڕوونكردنەوەی ئەو شتانەی تێیاندا كەوتوونە كێشەو مشتومڕەوەو، حاڵیی بوونی بێبڕوایان كە درۆیان دەكرد، كاتێک نكووڵییان دەكرد له ڕۆژی دوایی، هەموو ئەوانە، خوازیاری هەبوونی ڕۆژی دوایین، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝٣٨ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰذِبِينَ ۝٣٩﴾ النَّحل، بێبڕوایەكان زۆر بە سەختیی و بە خەستیی

سوێندیان خوارد بە خوا، کە هەر کەسێ بمرێ خوا زیندووی ناکاتەوە، [خوا دەفەرموێ:] با بەڵێنە لەسەری و هەقەو چەسپاوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، تاکو ئەوەی تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی بۆیان ڕوون بکاتەوە، بۆ ئەوەی بێبڕوایەکانیش بزانن کە درۆیان دەکرد، [کە دەیانگوت: سزاو پاداشت و لێپرسینەوە نیە].

لە سوورەتی (**الزُّمَر**)یشدا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ عَٰلِمَ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحۡكُمُ بَيۡنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: بڵێ ئەی خوایە پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و ئاشکرا، تۆ لە نێوان بەندەکانت دا دادوەریی دەکەی، لەوەدا کەتێیدا کەوتوونە ڕاجیایی و کێشەو مشت و مڕەوە.

هەروەها خوا ﷻ ئەو ڕۆژەی ناوناوە بە (**يَومُ الفَصل**) ڕۆژی لێك جیاکردنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ يَوۡمَ ٱلۡفَصۡلِ مِيقَٰتُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾**الدُّخَان**، واتە: ڕۆژی لێك هەڵاواردن، ژوانگەی هەموویان تێکڕایانە.

٥- تاقیکردنەوەی خوا بۆ مرۆڤ و بۆ جند، لەو ژیانە دنیاییەدا، خوازیاری هەبوونی ڕۆژی دواییە، تاکو بە سزاو پاداشتی پڕ بە پێستی کردەوەکانیان بگەنەوە، ئەوەش کە خوا ئێمەی لێرە داناوە بۆ تاقیکردنەوە ئەوە دیارە، وەك خوا لە سوورەتی (**الكهف**) و-٧- لە سوورەتی (**هود**)، هەم لە سوورەتی (**المُلك**) -٢- دا ئەو حەقیقەتەی بەیان کردوە.

بۆ وێنە لە سوورەتی (**المُلك**)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: (خوا) ئەو زاتەیە مردن و ژیانی ڕەخساندوون، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترە.

ئنجا مادام ئێمە بۆ تاقیکردنەوە لێرە داندرابین، دەبێ شوێنێك هەبێ ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوەیەی تێدا وەربگرینەوە.

٦- عەودالّیی و تینوێتی مرۆڤ لە قووڵایی زگماکیەوە، بۆ دیداری خوا ﷻ و بۆ ژیانێکی نەبڕاوەی هەمیشەیی، ئەو دووانەش هەردووکیان خوازیاری ئەوەن کە دەبێ ڕۆژی

دوایی هەبێت، واتە: مرۆڤ هەم لە دەروونیەوە تینوویە بۆ دیداری خوا ﷻ، ئەمە لە زگماك و خۆڕسكی دا چەسپێنراوە، هەم تینوویە بۆ ژیانێكی هەمیشەیی و نەبڕاوە، ئەمەشیان كە لە دنیادا دەستی ناكەوێ، دەبێ شوێنێكی دیكە هەبێ، كە ئەویش كە دیارە ڕۆژی دواییە، هەروەها مرۆڤ عەوداڵ و تینوویە بۆ ئەوە موڵكێكی فراوانی هەبێ، ژیانێكی پڕ نازو نیعمەت و خۆشیی و، دوور لە گرفتی هەبێ، ئەوەشی لە دنیادا دەست ناكەوێ و لە ڕۆژی دواییدایە.

بە نسبەت ئەوەوە كە مرۆڤ بۆ دیداری خوای پەروەردگار عەوداڵەو تینوویە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَءَاتٍ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٥﴾﴾ **العنكبوت**، واتە: هەر كەسێك بە ئومێدی دیداری خوایە، كاتێك خوا دیاری كردوە بۆ دیداری خۆی دێ و، خوا بیسەری زانایە.

هەروەها خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾﴾ **یونس**، ئەوانەی بە ئومێدی دیداری ئێمە نین و ژیانی دنیایان پەسند كردوەو دڵیان پێوە بەستراوەو پێ ئارام گرتوو بوە، ئەوانە لە نیشانەكانی ئێمە بێ ئاگان، ئەوانە جێگەو ڕێگەیان ئاگر(ی دۆزەخ)ە نەهۆی ئەوەوە كە دەیانكرد.

بە نسبەت ئەوەوەش كە مرۆڤ پێی خۆشە بە دیداری خوای بەرز و مەزن بگات، بە دیدار گەیشتنی خواش بریتیە لە دیتنی خوای بەرزی مەزن، بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، هەر بۆیەش مووسا ﵇ كاتێك گفتوگۆ لەگەڵ خوای تاك و پاكدا دەكات، داوا دەكات ببینێ، بەڵام خوا پێی دەفەرموێ: (**لَنْ تَرَانِي**)، واتە: لەم ژیانە دنیاییەدا بە پێكهاتە جەستەییە خاكییەوە ناتوانی ببینی، بەڵام بێگومان ئەو ئاواتەی مووسا ﵇ و هەموو بەندە بۆ خوا صوڵحاوەكان لە بەهەشتدا دێتە دی، هەر بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾ **القیامة**، لەو ڕۆژەدا ڕووانێك هەن، گەش و درەوشاوەن، بۆ

پەروەردگاریـان دەڕوانـن، ئـەوە بـە نسـبەت ئیماندارانـەوە لـە بەهەشـتدا، بـەڵام بـە نسـبەت بێبڕوایانـەوە دەفەرمـوێ: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ۝١٥ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ۝١٦﴾ **المطففين**، بـا واز بێنـن ئـەوان لـەو ڕۆژەدا پەردەپـۆش دەکرێـن لـە پەروەردگاریـان، بێبـەش دەکرێـن لـە دیـداری پەروەردگاریـان، ئنجـا ئـەوان دەخرێنـە نێـو دۆزەخـەوە، واتـە: بێبـەش کرانیـان لـە دیـداری پـەروەردگار ئازارەکـەی زیاتـرە، لـە خرانـە نێـو دۆزەخـەوە.

ئـەوەس کـە مـرۆڤ حـەز لـە ژیانـی هەتـا هەتایـی دەکات، دیسـان زۆر ئاشـکرایە هـەر کەسـێك لـە خـۆی ورد بێتـەوە، ئیبلیـس هـەر لـەو ڕێیـەوە زەفـەری بـە ئـادەم و حـەووا بـرد، کـە پێیگوتـن: ﴿مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ۝٢٠﴾ **الأعـراف**، پەروەردگارتـان لێـی قەدەغـە نەکـردوون، لـەم درەختـە بخـۆن، مەگـەر نەبـادا ببنـە دوو فریشـتە، یاخـود ببنـە هـەر مـاو، واتـە: ژیانـی هەمیشـەییتان دەسـت بکـەوێ، کـە ڕێـك ئـەوەی ئیبلیـس پێـی گوتـن بـە پێچەوانـەوە بـوو و، ئەگـەر لێیـان نەخواردبایـە وەك فریشـتە دەژیـان و، ژیانـی هەمیشـەییان دەبـوو، خـوا ﷻ ئەمـەش لـە دنیـادا دەسـت ناکـەوێ و دنیـا شـوێنی تاقیکردنەوەیـە، بـەڵام لـە بەهەشـت دا خـوا دەفەرمـوێ: (**خَالِدِيْنَ فِيْهَا أَبَداً**)، دەفەرمـوێ: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ۖ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝٧١﴾ **الزخـرف**، ئـەوەش تەنیـا لـەوێ دەسـت دەکـەوێ و، مسـۆگەر ئەوانـەش هەموویـان خوازیـاری ئـەوەن دەبـێ، ڕۆژی دوایـی هەبـێ.

٧- کەواتە بەڵگە لەسەر هەبوونی ڕۆژی دوایی، ئەو هەموو هاندەرو خوازیارو پاڵنەرانەن، ئنجا هیچ پەرچێکیش نیە لەبەردەم هاتنی ڕۆژی دواییدا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ ۝١ لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ ۝٢ مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ۝٣﴾ **المعارج**، داواکەرێك داوای ئازارێکی داکەوتووی کرد، بۆ بێبڕوایەکان بەرپەرچدەرەوەیەکی نیە، (هیچ ڕێگرێکی لەبەردەمدا نیە)، لەلایەن خوای خاوەن پایە بەرزەکانەوەیە، هەروەها لە سووڕەتی (**الطور**)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ ۝٧ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ ۝٨﴾،

بە دڵنیایی ئازارو سزای پەروەردگارت داکەوتوتوە دێ، هیچ بەرپەرچ دەرەوەیەکی نیە، هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ۝١ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ۝٢﴾ **الواقعة**، هەر کاتێك ڕووداوەکە ڕوویدا، هیچ کەسێك نابێ لەو کاتەدا بڕوا بە ڕوودانەکەی نەکات، یاخود بە درۆی دابنێ، یاخود درۆ بکات ك بڵێ ڕوونادات.

## تەوەری چوارەم: قۆناغەکانی ڕۆژی دوایی و پێشەکییەکەی:

هەڵبەتە ئێمە وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، مردن و قۆناغی بەرزەخ وەك و پێشەکیی ڕۆژی دوایی وایە، ئنجا قۆناغەکانی دیکەشی سێ قۆناغن:

١- قۆناغی یەکەم لە دوای فووی یەکەم دێتە دی، کە ئاخیر زەمان ڕوو دەدات.

٢- قۆناغی دووەم لە دوای فووی دووەم دێتە دی، کە قیامەت و هەڵسانەوە ڕوو دەدات.

٣- قۆناغی سێیەمیش دوای سزاو پاداشت و لێپرسانەوە ڕوو دەدات، کە بریتیە لە نیشتەجێ بوونی بڕواداران لە بەهەشتداو، بێبڕوایان و خراپەکاران لە دۆزەخ دا.

کەواتە: ئێمە ئەم تەوەرەی چوارەمە، لە سێ بڕگەدا بە گشتیی پێشکەش دەکەین:

### یەکەم: پێشەکی ڕۆژی دوایی:

پێشەکی ڕۆژی دوایی سەرەتا بریتیە لە مردن، (**مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامت قِيَامَتُه**)، واتە: کەسێك مرد قیامەتی ئەو هاتوە، پاشان بریتیە لە ژیانی بەرزەخ، دوای مردن قۆناغی بەرزەخ دەست پێدەکات، خوای پەروەردگار ئەو دووەی، واتە: هەم مردن، هەم قۆناغی بەرزەخی لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا بەیان کردوون دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ۝٩٩ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ۝١٠٠﴾، هەتا کاتێ یەکێکیان مردنی بۆ هات، گوتی: پەروەردگارم بمگێڕنەوە، بەڵکو کردەوەی باش

بکەم، لەوەدا کە بەجێمهێشتوە، واتە: لەو ژیانە دنیاییەدا کە بەجێمهێشتوە، بمگێڕنەوە بۆ ئەوێ بۆ ئەوەی باش بم، بەڵام وەڵامی دەدرێتەوە (**كَلَّا**) وازبێنە لەو قسەیە، لەو داواکارییە، ئەوە قسەیەکە خۆی بێژەریەتی، واتە: کەس گوێی لێ ناگرێ، قسەیەکی بەلاشە دەیکات ص، لە پشتیانەوە پەردەیەك هەیە، تاکو ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەکرێنەوە.

ئێمە لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا کورتە باسێکمان لە بارەی بەرزەخ و ژیانی بەرزەخەوە کردوە، وشەی بەرزەخ (**الحائل والحاجز بين شيئين**)، بریتیە لە نێوان و پەردەیەك لە نێوان دوو شتاندا، ژیانی بەرزەخیش بۆیە پێی گوتراوە: بەرزەخ، چونکە دەکەوێتە نێوان ژیانی دنیاو ژیانی ڕۆژی دواییەوە بەڵگەش لەسەر ئەوە کە مردن و ژیانی بەرزەخ، پێشەکی و ڕێخۆشکەرە بۆ ڕۆژی دوایی، ئەوەیە کە خوا ﷻ یەکسەر لە دوای مردن و ژیانی بەرزەخ، باسی ڕۆژی دوایی دەکات، بۆ وێنە:

هەر لەو ئایەتانەی سوورەتی (**المؤمنون**)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾، یەکسەر باسی فوو تێکرانی کەڕەنا دەکات، کە دووجاران فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، جارێکیان ئاخیر زەمان، واتە: تێکچوونی گەردوون بەدواییدا دێ، جاری دووەمیش قیامەت و هەڵسانەوەو زیندوو کرانەوە، دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾**المؤمنون**، هەرکاتێك فوو بە کەڕەنادا کرا، لەو ڕۆژەدا نە ڕەچەڵەکیان لە نێواندا هەیە، نە کەس لە کەس دەپرسێ، کەس داواکاری لە کەس ناکات، چونکە دەڵێ سوودی نیە، ﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾**المؤمنون**،

ئنجا هەر کەس کردەوەکانی قورس بن، یان کێشراوەکانی تای تەرازووەکانی قورس بن، ئەوانە سەرفرازن و، هەر کەسێك کێشراوەکانی یان تای تەرازووەکانی سووك بن، ئەوانە کەسانێکن خۆیان لە دەستداوەو لە دۆزەخدا دەمێننەوە.

## دووەم: قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی:

فووی یەکەم بە کەڕەناداو، پێچرانەوەی لاپەڕەی ژیانی دنیا، ڕۆژی دوایی بە گشتیی دەبێتە ئەو دوو قۆناغە: (السَّاعَة) و (القِيَامة)، (السَّاعة) واتە: ئاخیر زەمان، کۆتایی پێکهاتنی ئەم گەردوون و ژیانە دنیاییە، ئەمە لە دوای فووی یەکەم دێتە دی، قۆناغی دووەم واتە: هەڵسانەوەو زیندووکرانەوەو لێپرسرانەوە (**القيامة**) دوای فووی دووەم دێتە دی، خوا ﷻ لە سووڕەتی (**الزُّمَر**)دا زۆر بە ڕوونیی باسی ئەو دوو فووە دەکات: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾، واتە: فوو بە کەڕەنادا کرا هەر کەس لە ئاسمانەکان و هەر کەس لە زەویدا هەیە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ ئەگەرنا هەموویان مردن، ئەمەی یەکەمیان ئاخیر زەمانە (**الساعة**)، دوایی فوویەکی دیکەی پێداکرا، واتە: بە کەڕەنادا، ئەمە فووی دووەمە: ﴿فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾، یەکسەر هەموویان هەڵسابوونە پێ دەیانڕوانی، کەواتە: ئەوە قیامەتە هەڵسانەوە، لە سووڕەتی (**النَّازعات**)یشدا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾﴾، ئەو ڕۆژەی ئەو لەرزینەوە تایبەتە دەقەومێ، واتە: ئەم زەوییە دەلەرزێتەوەو هەرچی مەخلوقاتی لەسەری دەژی دەفەوتێ، وەك دەفەرموێ: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾﴾**الرحمن**، ئنجا فووی دووەم: ﴿تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾﴾**النَّازعات**، شوێنکەوتووشی بەدوادا دێ، کە مەبەست پێی فووی دووەمە.

ئنجا قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی، خوا ﷻ ناوی زۆری بۆ بەکارهێناون، کە من سێزدەم کەوتوونە بەرچاو:

١- الواقعة.

٢- الخافضة الرافعة.

٣- القارعة.

٤- الحاقة.

٥- الطامة الكبرى.

٦- الصاخة.

٧- الزلزلة.

٨- يوم الأزفة.

٩- الساعة.

١٠- النبأ العظيم.

١١- الوعد الحق.

١٢- يوم الوعيد.

١٣- الفزع الأكبر.

هەموو ئەوانە لە ئایەتەکانی قورئاندا هاتوون.

شتێکی دیکە کە پێویستە باسی بکەین، بریتییە لە ئەو ڕووداوانەی لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدا ڕوو دەدەن و، ڕووداوی زۆر گەورەی تێدا ڕوو دەدەن، کە دەتوانین لە حەڤدە خاڵدا سەر ژمێریان بکەین بەخێرایی:

١- فوو کردن بە کەڕەنادا، بۆ جاری یەکەم کە پێشتر باسمان کرد.

٢- شەق و پەق بوونی ئاسمان و لێکبوونەوەی و، ڕاوەستانی فریشتەکان لەلا تەنیشتەکانی، وەك لە سووڕەتی (**الحاقة**)دا هاتوە.

٣- پێچرانەوەی ئاسمان وەك چۆن تۆمارێك کە شتی تێدا نووسراوە دەپێچرێتەوە، وەك لە سووڕەتی (**الأنبياء**)دا هاتوە.

٤- پچڕانی ڕست و دەزووی نێوان ئەستێرەكان و خڕۆكەكان، نەمانی شەوق و تیشكیان، كە لە سووڕەتی (**التكوير والإنفطار**)دا هاتوە.

٥- كوژانەوەی خۆرو نەمانی تیشكەكەی و، پێچرانەوەی وەك چۆن مێزەرێك دەپێچرێتەوە، وەك لە سووڕەتی (**التكوير**)دا هاتوە.

٦- خەفە بوونی مانگ و پەلكێشكرانی بەرەو خۆر، كۆبوونەوەی لەگەڵ خۆردا، وەك لە سووڕەتی (**القيامة**)دا هاتوە.

٧- لەرزینەوە زەوی بە شێوەیەك كە زۆر سەرسووڕهێنەرەو، دەرهاویشترانی هەرچی تێیدایە، وەك لە سووڕەتی (**الزلزال**)دا هاتوە.

٨- بەرزكرانەوەی ئاسمان و زەوی و چیایەكان و پێكدادانیان، وردو خاش بوونیان، وەك لە سووڕەتی (**الحاقة**)دا هاتوە.

٩- پان ڕاخرانی زەوی و هەڵخرانی چیایەكان و، تەخت بوونیان لەگەڵ زەوی و بوونە تۆزو غوباریان، وەك لە سووڕەتەكانی (**الإنشقاق و التكوير و الوقعة** ...)دا هاتوە.

١٠- تەقینەوەی دەریایەكان و گڕگرتنیان، وەك لە سووڕەتی (**الإنفطار**)دا هاتوە.

١١- مردنی هەر كەسێك كە لە ئاسمان و زەویدا هەیە، جگە لەوەی خوا هەڵیواردوون، وەك لە سووڕەتی (**الزمر**) ئایەتی (٦٨)دا هاتوە.

١٢- كۆبوونەوەی ژیاندارانی كێوی هەموویان پێكەوە، دیارە لە سام و دەهشەتی ئەو ڕۆژە، وەك لە سووڕەتی (**التكوير**)دا هاتوە.

١٣- وێڵكردنی خەڵك بۆ بەنرخترین جۆری ماڵ و سامانیان، وەك لە سووڕەتی (**التكوير**) دا هاتوە.

١٤- دانانی هەر مێینەیەك بۆ حەملەكەی وەك مرۆڤ و جند و ئاژەڵ، وەك لە سووڕەتی (**الحج**)دا هاتوەو، لە سووڕەتی (**المزمل**)یشدا ئاماژەی پێكراوە.

**١٥-** بڵاوبوونەوەی خەڵك وەك پەپوولەی پەرش و بڵاو، وەك لە سوورەتی (**القارعة**)دا هاتوە.

**١٦-** چاو ئەبڵەق بوونی بێبڕوایان و دانهێنانیان بە هەڵەو کەم و کوڕیی خۆیاندا، کە ئاگایان لەو ڕۆژە نەبوو، وەك لە ئایەتی ژمارە: (٩٧) سوورەتی (**الأنبياء**) و ئایەتی ژمارە: (٧) لە سوورەتی (**القيامة**)دا هاتوە.

**١٧-** هەڵگیرانی عەرش و بارەگای خوا لەو ڕۆژەدا، لەلایەنی هەشت لە فریشتەکان یان هەشت لە جۆرە فریشتەکانەوە، وەك لە سوورەتی (**الحاقة**)دا هاتوە.

دەتوانین بڵێین: ئەمانە ڕووداوە سەرەکییەکانی قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایین، کە بریتیە لە قۆناغی ئاخیر زەمان.

## سێیەم: قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی:

بریتیە لە فوو پێداکردنی دووەم بە کەڕەناداو، هەڵسێنرانەوەو بڵاوکرانەوەو کۆکرانەوەو لێپرسرانەوە، لە مرۆڤ و، پێشتر ئاماژەمان پێدا کە خوا ﷻ لە سوورەتی (**الزمر**) ئایەتی (٦٨)دا، باسی هەردوو قۆناغەکە دەکات و دەفەرمووێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ٦٨﴾......ئنجا بۆ جارێکی دیکە فووی پێداکرا، یەکسەر هەموویان هەڵسابوون، تەماشایان دەکرد، لە سوورەتی (**القيامة**)دا خوا دەفەرمووێ: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١﴾، نەخێر وانیە سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت، واتە: ڕۆژی هەڵساندنەوە، ڕۆژی سزاو پاداشت چەسپێنران بەسەر مرۆڤ و جند دا، خوای پەروەردگار زۆر باسی ئەو قۆناغەی دووەمی ڕۆژی دوایی کردوە، کە بریتیە لە قیامەت و سزاو پاداشت، سەپێنران سزا بەسەر تاوانباران و خراپەکارانداو، درانەوەی پاداشت بە چاکەکاران، ئەو ناوانەش کە خوا ﷻ لە قورئان دا بەکاریهێناون، بۆ ئەو قۆناغەی دووەمی ڕۆژی دوایی، واتە: قۆناغی قیامەت، بیست و چوار (٢٤) ناوم لێ هەڵبژاردوون، کە ئەمانەن:

١- يوم القيامة.

٢- يوم عظيم.

٣- يوم يقوم الناس لرب العالمين.

٤- الساعة.

٥- يوم البعث.

٦- يوم التلاق.

٧- يوم تبلى السرائر.

٨- الغاشية.

٩- يوم التناد.

١٠- يوم الجمع.

١١- يوم التغابن.

١٢- يوم النشور.

١٣- يوم الوعيد.

١٤- يوم  الخلود.

١٥- الوعد الحق.

١٦- يوم الخروج.

١٧- يوم الحشر.

١٨- يوم الدين.

١٩- يوم الفصل.

٢٠- يوم الكبير.

٢١- يوم الفتح.

٢٢- الفزع الأكبر.

٢٣- يوم الحساب.

٢٤- يوم الحسرة.

هەندێك لە ناوەكانیش، خوا ﷻ بۆ هەردوو قۆناغەكە بەكاریهێناون، ئەمە چونكە وەسفەكە هەردووك قۆناغەكە دەگرێتەوە.

ئەو ڕووداوانەی لە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییدا ڕوو دەدەن، واتە: قۆناغی قیامەت و هەڵسێنرانەوەو سزاو پاداشت، دەتوانین لە پازدە خاڵدا بیانخەینە ڕوو، كە هەروەك و سەرژمێر سەرژمێریان دەكەم و بەسەریاندا دەڕۆم:

١- فوو كردن كەڕەنادا بۆ جاری دووەم لە لایەن ئیسڕافیلەوە، وەك و لە ئایەتی (٦٨)ی (**الزمر**)دا هاتوە: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ۝٦٨﴾، هەروەها لە ئایەتی (٤٩) لە سوورەتی (**يس**) و، ئایەتی (١٩) لە سوورەتی (**الصافات**) و، ئایەتی (١٣) لە سوورەتی (**النازعات**)،یش دا هاتوە ئەم فووی دووەمە لە هەر كام لە سوورەتەكانی: (**الصافات و النازعات**)دا (**زَجرةٌ واحدة**) هاتوە، یەك تێخوڕین و، لە سوورەتی (**يس**) دا بە (**صيحةٌ واحدة**) ئەک هاڕژن هاتوە و، هەر كامیان ناون بۆ ئەو دەنگ و هاڕژنە بێڕەزایەی، بەهۆی فووپێداكردنی كەڕەنادا لەلایەن ئیسڕافیلەوە دێتە دی.

٢- گۆڕانی ئاسمانەكان و زەوی و دووبارە دروست بوونەوەیان بە شێوەیەكی دیكە، وەكو لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا ئاماژەی پێكراوە: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ ۖ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ۝٤٨﴾، كە كاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**إبراهيم**) بە تەفصیڵ قسەمان لێكردوە.

٣- زیندوو كردنەوەی خوا بۆ جندو مرۆڤ تێكڕایان و هەڵسێنرانەوەیان، سەرسووڕمانی بێبڕوایانێك كە ئەگەریان دانەنابوو ڕۆژی دوایی بێ، وەك لە ئایەتەكانی: (١٩- ٢٢) لە سوورەتی (**الصافات**) و ئایەتی (٦٩) لە سوورەتی (**الزمر**)دا، وە جگە لە ئەوانیش دا هاتوە.

٤- هاتنەدەر لە گۆڕەكان و بە خێرایی كۆبوونەوە لە شوێنی دیارییكراو دا، بۆ خڕكردنەوەی خەڵك و لێپرسرانەوەیان و، ئامادەبوونی هەر كامێكیان لە كورتترین ماوەدا، وەك لە ئایەتەكانی: (٤١ - ٤٤) لە سوورەتی (ق)و، ئایەتی (٤٣) لە سوورەتی (**المعارج**)دا هاتوە.

٥- سوێند خواردنی بێبڕوا تاوانبارەكان كە لە دنیادا تەنیا سەعاتێك ماونەوە، ماوەیەكی كەم و،، ڕاستكردنەوەی ئەوانەی زانیاریی و ئیمانیان هەیە، بۆیان كە ئەو بۆچوونەتان هەڵەیە،

بەڵكو مانەوەتان لە دنیاداو لە قۆناغی بەرزەخ دا، هەتا پێش قیامەت بووە (**إلى يَوْم البَعث**) وەك لە ئایەتەكانی (٥٥ و ٥٦) سوورەتی (**الروم**)دا هاتوە.

**٦-** دەركەوتنی نهێنییەكان و شتە پەنهانەكان هەموویان و ڕوونبوونەوەی ڕاستییەكان بۆ خەڵك، وەك و خۆیان كە هەن، واتە: بۆ مرۆڤ و بۆ جند، وەك لە ئایەتی (٩) لە سوورەتی (**الطارق**) و ئایەتی (١٦) لە سوورەتی (**غافر**) و، ئایەتی (١٨) لە سوورەتی (**الحاقة**)دا هاتوە.

**٧-** ڕۆشن بوونەوەی سەر زەمینی لێپرسرانەوەو تێدا كۆكرانەوەی خەڵك، بە ڕووناكی خوا كە هیچ شتێك وەك خوا (**تبارك وتعالى**) نییە، وەك و لە ئایەتی (٦٩)ی (**الزمر**)دا هاتوە، ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾.

**٨-** دانرانی تۆماری كردەوەكانی مرۆڤ و جند، هێنرانی پێغەمبەران و شەهیدان، یاخود شایەدەكان بۆ شایەدییدان، وەك و لە ئایەتی (٦٩)ی سوورەتی (**الزمر**) و، ئایەتی (٤٩) ی سوورەتی (**الكهف**)دا هاتوە.

**٩-** لێپرسرانەوەی مرۆڤ و جند تێكڕایان، هەروەها ئەو پێغەمبەرانەی بۆیان ڕەوانە كراون، كە لە ئایەتەكانی: (٦ و ٧)ی سوورەتی (**الأعراف**)دا هاتوە.

**١٠-** كێشرانی كردەوەی مرۆڤەكان بە تەرازووە دادگەرەكانی خوا، كە تەنانەت دەنكە خەرتەلەش حیساب دەكات، بەڵكو هەر شتێك بە ئەندازەی گەردێك قورس بووبێ لە چاك و خراپ، حیسابی دەكات، وەك لە ئایەتی (٤٧)ی سوورەتی (**الأنبياء**)و، ئایەتەكانی: (٦ - ٨)ی سوورەتی (**الزلزلة**)دا هاتوە.

**١١-** دیارییكردنی سەرەنجامی بەندەكان، ئەڕێنیی بێ یان نەرێنیی، بەپێی قورسایی، یاخود سووكیی تەرازووەكانیان، وەك و لە دوو ئایەتی (٨ و ٩) سوورەتی (**الأعراف**) و ،ئایەتەكانی: (٦ - ٩)ی سوورەتی (**القارعة**)دا هاتوە.

**١٢-** دادوەریی کردن و حوکمدان بەسەر بەندەکاندا بەشێوەیەکی دادگەرانە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، بە پێی کردەوە تۆمارکراوەکانیان و شایەدیی لەسەر درانیان، وەك لە ئایەتی (١٧)ی سووڕەتی (**غافر**) و، ئایەتی (٥٤)ی (**يس**) و، ئایەتی (٤٧)ی (**الأنبياء**) و ئایەتی (٦٩)ی سووڕەتی (**الزمر**) دا هاتوە.

**١٣-** دابەشکرانی نامەی کردەوەکان و تۆمارەکان، کە کردەوەکانیان تێدا تۆمارکراون، بۆ هەر کەسەو تۆمارو نووسراوێکی تایبەت بەخۆی، وەك و لە ئایەتی (١٠)ی سووڕەتی (**التكوير**)و دوو ئایەتی (١٤و١٣)ی سووڕەتی (**الإسراء**)دا هاتوە.

**١٤-** پێدرانی ئەهلی ئیمان، یە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان و، وێدرانی تاوانباران و بێبڕوایان نامەی کردەوەکانیان بە دەستی چەپیان، یاخود لەلای پشتەوەیان ڕا، وەك لە ئایەتەکانی: (١٩ - ٢٥) لە سووڕەتی (**الحاقة**)داو، ئایەتەکانی: (٦ - ١٥) لە سووڕەتی (**الإنشقاق**)دا هاتوە.

**١٥-** ڕۆشنبوونی ڕووی بڕوادارانی سەرکەوتوو و، پێکەنینیان و دڵخۆش بوونیان و گەڕانەوەیان بۆ لای کەس وکاریان، کە چاوەڕێیان دەکەن بە دڵخۆشییەوە، بە پێچەوانەوەش، ڕەش و تڵخ هەڵگەڕانی ڕووی بێبڕوایانی زیانبارو، باری تەمی خەم لێ نیشتن لەسەر دەم و چاویان، بەهۆی زانینیان کە چ سەرەنجامێکی دژوارو سەختیان هەیەو، چۆن ژیانی دنیایان بە شێوەیەك گوزەراندوە، کە ئێستا جگە لە پەشێمانیی و بەدبەختیی هیچی دیکە نەچننەوە.

## تەوەری پێنجەم: حەوت مەسەلەی گرنگی پەیوەست بە قیامەتەوە:

**١-** تاوانباران لەو ڕۆژەدا زۆر ترس و دڵەڕاوکێیان تووش دەبێ، کاتێك لیست و نامەی کردەوەکان و تەرازووەکان دادەنرێن، زۆر سەریان سووڕ دەمێنێ کە چۆن تەرازووی دادگەری خوا، تەنانەت شتی وردیش دەخوێنێتەوە، وەك لە سووڕەتی (**الكهف**) ئایەتی (٤٩)دا دەفەرموێ: ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا

مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾﴾.

واتــە: كتێــب دانــدرا، ( لیســتی كــردەوان دانــدرا)، تاوانبــاران دەبینــی زۆر تــرس و لەرزیــان هەیــە لــەوەی تێیدایــە، دەڵێــن: ئــەی هــاوار بــۆ ئێمــە ئەو نــووسراوە چییــە، هیچ گچكەیــەك و گەورەیــەك بەجــێ ناهێڵــێ مەگــەر ســەر ژمێری كــردووە، ئــەوەی كردبوویان بــە ئامادەكراویــی و بــە ئامادەیــی بینیــان و پەروەردگاریشــت ســتەم لــە كــەس نــاكات.

پێشــتریش باســمان كــردوە، كــە مەســەلەی ئامادەكرانــی كــردەوەكان لەلایــان، ئێســتا دوای ئــەوەی زانیاریــی تەكنۆلۆجیا بــەرەو پێشــچووە، زیاتــر لێــی تێدەگەیــن، لــە چەمك و واتــای ئــەوە كــە هــەر خــودی كردەوەكــە بــە دەنــگ و وێنــەوە ئامــادە دەكــرێ، كــە هــەم لێــرە ئامــاژەی پــێ دەكات و، هــەم لــە ســوورەتی (**الجاثيــة**)دا: ﴿إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾، هەروەهــا لــە ســوورەتی (**الزلزلــة**)دا كــە دەفەرمــوێ: ﴿لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٦﴾﴾، تاكــو كردەوەكانیــان پێشــان بدرێــن، خــودی كــردەوەكان.

**٢**- بەرجەستە بوونی كردەوەكان و ئامادەكرانیان، كە پێشتریش ئاماژەمان پێدا ژمارەیەك لە ئایەتەكانی قورئان ئەمە دەگەیەنن، أ- ئەم ئایەتەی سوورەتی (**الكهف**): ﴿وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾﴾، ئەوەی كە كردبوویان بە ئامادەكراوی بینیان. ب- بە ئامادەیی بینییان، لە سوورەتی (**الجاثية**) دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾، ئەمە نووسراوەكەی ئێمەیە بە هەق و ڕاستیی قسەتان لەسەر دەكات، ئێمە ئەوەی دەتانكرد نوسخەمان لەبەر دەگرتەوە، كۆپیمان دەكرد. ج- هەروەها لە سوورەتی (**الزلزلة**)شدا دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٦﴾ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ﴿٨﴾﴾، لەو ڕۆژەدا خەڵك دەردەچن بەپرژو بڵاویی تاكو كردەوەكانیان پێشان بدرێن، هەر كەسێك بە قورسایی گەردیلەیەك چاكەی كردبێ، دەیبینێتەوە، (خودی كردەوەكە دەبینێتەوە) و، هەر كەسێك بە قورسایی گەردیلەیەك خراپەی كرد بێ، خودی كردەوەكە دەبینێتەوە.

٣- لێپرسینەوەی خوا ﷻ بۆ بەندەکانی زۆر خێرایە، زۆرێک لە ئایەتەکان ئەو ڕاستیەیان ڕوونکردۆتەوە، بۆ وێنە: أ- لە سووڕەتی (**الأنعام**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾﴾، واتە: دوایی گێڕدرانەوە بۆ لای خوا، سەرپەرشتیاری هەقیان، ئاگادار بن حوکم و بڕیار هەر هی ئەوە و، ئەویش لە هەموو لێپرسەرەوان خێراترە، ب- هەروەها لە سووڕەتی (**غافر**)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٧﴾﴾، واتە: ئەمڕۆ هەر کەسە بەپێی ئەوەی کردوویەتی سزاو پاداشت دەدرێتەوە، ئەمڕۆ ستەم نیە، بە دڵنیایی خوا زۆر لێپرسینەوەی خێرایە.

کەمتر بینیومە لە تەفسیرەکاندا باسی حیکمەتی ئەوە کرابێ، بۆچی خوا هێندە باسی خێرایی لێپرسینەوەی خۆی دەکات، بەڵام ئێمە ئێستا ڕەنگە باشتر دەرکی ئەو حیکمەتە بکەین، کە ژمارەی بەشەر هێندە زۆر بووە، ئێستا[1] نزیکەی هەشت ملیار مرۆڤ لەسەر زەویە، هەر خوا دەزانێ چەند ملیار بەشەر بەڕێکراون، چەند ملیاری دیکەش دێن، تا خوا ژیانی دنیای مرۆڤ دەپێچێتەوە، ئەو هەموو ملیار ملیارانە، بێگومان ئەگەر خوا زۆر بە خێرایی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا نەکات، دەبێ چەند درێژ بێ ڕۆژی سزاو پاداشت و لێپرسینەوە.

٤- شایەدیی دانی جەستەی مرۆڤی بێبڕوا، یاخود تاوانبار و لەسەری و، مۆرکرانی زاریی، ئەویش لە چەند ئایەتێك لە قورئاندا بەیان کراوە، کە خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا جەستەی مرۆڤ و ئەندامەکانی لەسەر مرۆڤ دەکاتە شایەد، بە تایبەت مرۆڤی بێبڕوا، یاخود مرۆڤی تاوانبارو خەتابار، با بڕواداریش بێ و، مۆریش بەسەر زاریەوە دەنرێ و، زمانی دەگیرێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾﴾، ئەمڕۆ مۆر بەسەر زاریانەوە دەنێین و، دەستەکانیان دەماندوێنن و، پێیەکانیان شایەدیی دەدەن بەوەی وە بەدەستیان دەهێنا.

لە سووڕەتی (**فصلت**)دا ڕوونتر ئەمە باس دەکات و دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم

---

(١)١٧/ ربيع الأول/١٤٤٥- ٢/١٠/٢٠٢٣

﴿بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ۝٢٠ وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٢١﴾، ئەو ڕۆژەی دوژمنانی خوا بەرەو ئاگر کۆدەکرێنەوە، هی پێشیان ڕادەگیرێ، تاکو هی دوایان، پێیان دەگەنەوە [خڕ دەکرێنەوە سەر یەك]، هەتا کاتێك گەیشتنە لای، واتە: [لای ئاگری دۆزەخ]، بیستنیان و چاوەکانیان و پێستەکانیان شایەدییان لەسەر دان بەوەی کە دەیانکردو، بە پێستەکانیانیان گوت: بۆچی شایەدیمیان لەسەر دەدەن؟ گوتیان: ئەو خوایە ئێمەی هێناوەتە گۆ، کە هەموو شتێك دێنێتە گۆو، هەر ئەویش یەکەمجار دروستی کردن و، بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

٥- بەرگرییکردنی هەر کەسێك لە خۆی و، مشت و مڕ کردنی و، پەنا پێبردنی بێبڕوایان و دەغەڵەکان بە سوێندی بە درۆو نکووڵییکردن، ئەمیش لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا خوا ﷻ خستویەتیە ڕوو، بۆ وێنە لە سوورەتی (**النحل**)دا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَٰدِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ۝١١١﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە هەر کەسێك دێ، بەرگریی لە خۆی دەکات، شەڕە قسە لەسەر خۆی دەکات، هەر کەسە بەپێی ئەوە کە کردوویەتی پڕ بە پێست، سزاو پاداشت دەدرێتەوەو ستەمیان لێ ناکرێ.

ب- لە سوورەتی (**الأنعام**)یش دا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ۝٢٢ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ۝٢٣ ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ۝٢٤﴾، ئەو ڕۆژەی تێکڕایان خڕ دەکەینەوە، دوایی بەوانەی هاوبەشیان داناوە دەڵێین، کوا ئەو هاوبەشانەتان کە پێتان وابوو هاوبەشن؟ دوایی بەڵایەکەیان هەر ئەوە بوو گوتیان: سوێند بە خوا پەروەردگارمان! ئێمە هاوبەش دانەر نەبووین، (خوا دەفەرموێ:) سەرنج بدە، چۆن درۆ لەسەر خۆیان دەکەن. ج-ئەوەی هەڵیان دەبەست لێیان ون بوو، کە بریتی بوو لە ئەوانە کە بە هاوبەشیان دانابوو، هەروەها لە سوورەتی (**المجادلة**)دا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ۝١٨﴾، واتە: خوا تێکڕایان کۆدەکاتەوە، ئنجا سوێندی بۆ دەخۆن، وەك و چوێند سوێند بۆ ئێوە دەخۆن (سوێندی بە درۆ)و، پێیان وایە لەسەر شتێکن، ئاگاداربن ئەوانن درۆزنی ڕاستەقینە.

لێرەدا قسە لەسەر مونافیقەکانە.

٦- ڕاکردنی مرۆڤ لەو ڕۆژەدا لە برا ئەوڕۆژەی و لە دایکیی و لە بابی، لە هاوسەری و لە ڕۆڵەکانی، وەك و لە سووڕەتی (عبس)دا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾، لەو ڕۆژەدا مرۆڤ لە دەست برای ڕادەکات، [نەوەك داوای شتێکی لێ بکات، یان ئەگەر داوای لێ بکات، لێی ڕادەکات،] و لە دەست دایکی ڕادەکات و، لە دەست بابی ڕادەکات و، لە هاوسەرەکەی ڕادەکات و لە ڕۆڵەکانی ڕادەکات، [بە کوڕو کچەوە،] بۆ هەر کامێك لەوان حاڵێك هەیە، بێ ئاگا و، سەرقاڵی دەکات لەوەی بپەڕژێتە سەر جگە لەخۆی.

٧- بابای تاوانبار لەو ڕۆژەدا خۆزگە دەخوازێ کە نیزیکترین کەسانی خۆی بکاتە بەلاگێڕی خۆی، ڕۆڵەکانی، هاوسەرەکەی، برایەکەی، خزم و عەشیرەتەکەی، کە پاڵ دەدرێتە لای و، هەر کەسێك کە لە زەویدا هەیە و، تێکڕای خەڵکی سەر زەوی، وەك لە سووڕەتی (المعارج)دا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاءُ كَالْمُهْلِ ﴿٨﴾ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾ يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّا ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە ئاسمان، وەك کانزای تواوەی لێ دێ و، چیایەکان وەك خوریی شکنراوەیان لێ دێ و، هیچ نیزیکێك و دڵسۆزێك لە هیچ نیزیکێك و دڵسۆزێکی دیکەی هیچ شتێك داوا ناکات، [چونکە داواکایەکی بێ سوودە،] پێشانیان دەدرێن [وەنەبێ نایانبینن،] تاوانبار لەو ڕۆژەدا خۆزگە دەخوازێ کە لە سزاو ئازاری ئەو ڕۆژە کوڕەکانی بکاتە بەلاگێڕ، [هەڵبەتە ئەگەر کوڕەکان بکاتێ کچەکان زیاتر دەکاتێ، بەپێی عورف و بیرکردنەوەی هەموو کۆمەڵگا بێبڕوایەکان، کە فەرق دەکەن لە نێوان کوڕو کچ دا،] هەروەها هاوسەرەکەی و برایەکەشی بکاتە بەلاگێڕو، ئەو عەشیرەت و هۆزەی گرتوویەتە خۆی کاتی خۆی، [ئەوانیش هەموویان بکاتە بەلاگێڕی خۆی،] هەموو ئەوانەی لە زەویدا هەن، بیانکاتە بەلاگێڕی خۆی، دواییش ئەوە دەربازی بکات، نەخێر، [لەو ڕۆژەدا کەس ناکرێتە بەلاگێڕی کەس، قەرەبوو فدیە لە کەس وەرناگیرێ].

## تەوەری شەشەم و کۆتایی: قۆناغی سێیەمی ڕۆژی دوایی:

لێخوڕدران و بەڕێکرانی بێبڕوایان بەرەو دۆزەخ و، بە حورمەتەوە بەڕێکرانی پارێزکاران بەرەو بەهەشت و، نیشتەجێبوونی هەر کام لە بێبڕوایانی خراپەکار لە دۆزەخدا، لە شوێنی خۆیاندا، بڕوادارانی پارێزکاریش هەر کەسەو لە مەقام و پێگەو شوێنی خۆیدا، لە زۆر شوێنی قورئاندا خوای پەروەردگار ئەم ڕاستییانەی بەیان کردوون و، ئێمە ئیکتیفا دەکەین بەو ئایەتانەی لە سوورەتی **(الزمر)**دا هاتوون، ئەویش هەر دەیانخوێنینەوە چونکە کاتی خۆی بە تەفصیل قسەمان لەسەر کردوون، کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾ قِيلَ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾.

ئێمە هەروا بە کورتیی ڕاستە مانایەکەیان دەکەین:

[دوای کۆکرانەوەی خەڵك،] سەر زەوی ڕۆشن بۆوە بە ڕووناکیی پەروەردگارت و، کتێب داندرا، (لیستەکانی کردەوان داندران) و، پێغەمبەران و شاهیدەکان هێنران و، بە حەق دادوەرییژان لە نێوان داکرا، بێ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ

و، هەر کەسەو بە پێی ئەوەی کردوویەتی، پڕبە پێستی کردەوەکانی خۆی سزا یان پاداشتی درایەوە، خواش زاناترە بەوەی دەیانکرد . ئەوانەی بێبڕوان بەرەو دۆزەخ کۆمەڵ کۆمەڵ بەڕێکران، هەتا کاتێك گەیشتنە لای دۆزەخ دەرگاکانی کتوپڕ کرانەوەو، دۆزەخەوانەکان لێیان پرسین: ئایا پێغەمبەرانێك لە خۆتان نەهاتنە لاتان، ئایەتەکانی پەروەردگارتانیان بەسەردا دەخوێندنەوەو، لە دیداری ئەمڕۆتان وریایان دەکردنەوەو دەیانترساندن؟ گوتیان: با، بەڵام وشەی سزا، [بڕیاری سزا] لەسەر بێبڕوایان پێویست بووە، گوترا: بچنە نێو دەروازەکانی دۆزەخەوە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، خراپترین جێگەو شوێنی تێدا مانەوەی خۆ بەزلگرانە.

هەروەها ئەوانەی پارێزیان لە پەروەردگاریان کردبوو، بەرەو بەهەشت کۆمەڵ کۆمەڵ بەڕێکران، هەتا کاتێك گەیشتنە لای بەهەشت، پێش گەیشتنیان دەروازەکانی بەهەشتیان بۆ کرابوونەوەو، بەهەشتەوانەکان (سەرپەرشتیارانی بەهەشت) گوتیان: سەلامتان لێ بێ ئێوە پاك و چاكن، بە هەمیشەیی بچنە نێو بەهەشتەکانەوە، ئەوانیش گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی بەڵێنی لەگەڵ ڕاست بردینە سەرو، سەر زەمینی بەهەشتی پێداین، لە هەر شوێنێك کە بمانەوێ تێیدا نیشتەجێ دەبین، وە باشترین پاداشت پاداشتی کارکردنە بۆ خواو، تۆ فریشتەکان دەبینی دەوری عەرشی خوایان داوە، بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و، بە هەق دادوەرییان لە نێواندا کراو، گوترا: ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

هەڵبەتە لێرەدا خوای پەروەردگار بۆ هەردووکیان وشەی (**سيق**)ی بەکارهێناوە واتە: بەڕێکران، بەڵام لە سوورەتی (**مريم**)دا بۆمان دەردەکەوێ، بەڕێکرانی تاوانکاران بۆ دۆزەخ جیایە، لە بەڕێکرانی پارێزکاران بۆ بەهەشت، دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾﴾، ئەو ڕۆژەی پارێزکاران، بەرەو (خوای) خاوەن بەزەیی وەك و شاند بەڕێ دەکەین بە ڕێزو حورمەتەوە، تاوانبارانیش بەرەو دۆزەخ لێدەخورین بە تینوویەتYی،

کەواتە: ئەوەی لە سوورەتی (**الزمر**)دا بە گشتیی هاتوە، لە سوورەتی (**مریم**)دا ڕوونکراوەتەوە کە ئەو دوو بەڕێکرانە لە یەك جیان.

ئنجا ڕووداوەکانی قۆناغی سێیەم، واتە: بەڕێکرانی پارێزکاران بۆ بەهەشت و، تاوانکاران بۆ دۆزەخ، کۆمەڵێك ڕووداوی تێدا دەبن، کە من هەروا بە خێرایی لە چوارده خاڵدا ئاماژەیان پێدەکەم:

**١-** کۆتایی پێهاتنی لێپرسرانەوەو دابەشکرانی لیستی کردەوەکان، ئەوەش سەرەتای بەڕێکرانە بەرەو بەهەشت و دۆزەخ، وەك لە سوورەتی (**الزمر**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾.

**٢-** بەڕێکرانی هەر کام لە مرۆڤەکان بەرەو بەهەشت و دۆزەخ بە گشتیی، کە دیارە هەر کامیان کۆمەڵ کۆمەڵ بە ڕێ دەکرێن، وەك و لە ئایەتەکانی سوورەتی (**الزمر**)دا هاتووە، کە پێشتر خوێندمانەوە، ئایەتەکانی: (٧١ - ٧٣)، ئەویش دیارە بەهۆی ئەوەوەیە کە مرۆڤەکان لە دنیادا شوێن کێ کەوتن، چ بەرنامەیەك، چ سەرکردەیەك و، چ کەسێك بکەنە پێشڕەوی چاوساغی خۆیان، لە قیامەتدا لەگەڵ ئەو دەبن، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ**} (**أخرجه البخاري: ٥٨١٩، ومسلم: ٦٨٨٨**)، واتە: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشیدەوێ، واتە: لە دنیادا، هەورەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُم مَنْ يُخَالِل**} (**أخرجه أحمد: ٨٣٩٨، وحسَّنهُ الألباني**)، واتە: مرۆڤ بەپێی دینی دۆست و خۆشەویستەکەی خۆی دەبێ، [لە ڕۆژی دوایی دا] هەر کامێکتان با باش سەرنج بدات لەگەڵ کێ دا دەبێ!

**٣-** چۆنیەتی بەڕێکرانی بێبڕوا خۆ پێ گەورەکان بەرەو دۆزەخ، جیایە لە چۆنیەتیی بەڕێکرانی پارێزکاران بەرەو بەهەشت، کە پێشتریش ئاماژەمان پێدا: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾﴾**مریم**، وشەی (**وَفْد**) کۆی (**وَافِد**)ە و بە (**وُفُود**)یش کۆدەکرێتەوە، ناوە بۆ کەسانێك کە سواری وڵاخ

بوون، بەرەو لای حوكمڕان و پادشایەك دەچن بەڕێزو حورمەتەوە، بەڵام (وِرد) ناوە بۆ كۆمەڵێكی تینوو كە دەبرێنە سەر ئاو، زیاتر بۆ ئاژەڵیش بەكاردەهێنرێ.

٤- ئەهلی ئیمانی پارێزكار لەلایەن فریشتەكانەوە پێشوازیان لێ دەكرێ، بەڵام بێبڕوایانی تاوانبار سەرزەنشت دەكرێن و ڕووی ڕەخنەو گلەییان تێدەكرێ، كە لە ئایەتەكانی سوورەتی (**الزمر**)دا خوای پەروەردگار بە نسبەت بێبڕوایانەوە فەرمووی: ﴿ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾، بەڵام بە نسبەت پارێزكارانەوە: ﴿ وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾**الزمر**.

٥- دۆزەخ لە بێبڕوایەكان زۆر توووڕە دەبێ و خەریكە بپچڕێ لە داخ و خەفەتان، بەڵام بەهەشت بۆ پارێزكاران نیزیك دەخرێتەوەو، دەڕازێندرێتەوە تاك لە دوورەوە پێ دڵخۆش بن، وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ﴿٨﴾ ﴾**الملك**.

بە نسبەت بڕوادارانیشەوە: ﴿ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ غَيۡرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ ﴾**ق**، ﴿ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴿١٣﴾ ﴾**التكوير**، (**أُزلِفَت**) یانی: نیزیك خرایەوە، هەندێكیش گوتوویانە: ڕازێنرایەوە.

٦- خوا ﷻ سڵاو دەكات لە بەهەشتییەكان و پیرۆزباییان لێ دەكات، بەڵام ئەهلی ئاگری دۆزەخ، خوا نە تەماشاین دەكات و، نە دەیاندوێنێ، بەڵكو توووڕەیی و غەزەبی خوا لەسەریان دادەبەزێ، وەك و خوا ﷻ لە بارەی ئیماندارانەوە دەفەرموێ: ﴿ تَحِيَّتُهُمۡ يَوۡمَ يَلۡقَوۡنَهُۥ سَلَٰمٞۚ وَأَعَدَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَرِيمٗا ﴿٤٤﴾ ﴾**الأحزاب**، هەروەها لە سوورەتی (**یس**)دا دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾ ﴾.

بەڵام بە نسبەت بێبڕوایانەوە: ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾ ﴾**یس**.

٧- بێبڕوایانی جند، واتە: (شەیتانەکان) و، کافرەکانی مرۆڤ هەموویان پێکەوەر بەرەو دۆزەخ بەڕێ دەکرێن، وەکو دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحۡشُرَنَّهُمۡ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ لَنُحۡضِرَنَّهُمۡ حَوۡلَ جَهَنَّمَ جِثِيّٗا ٦٨﴾ **مريم**، سوێند بە پەروەردگارت بێبڕوایەکان و شەیتانەکان پێکەوە بەڕێ دەکەین، دوایی لەسەر چۆکان لە دەوری دۆزەخ ئامادەیان دەکەین، لە سوورەتی (**الشعراء**)یشدا خوای پەروەردگار دیسان باسی هەردووکیان دەکات: ﴿فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ٩٤﴾، واتە: هەموویان لەپەوڕو دەخرێنە نێو دۆزەخەوە.

٨- بێبڕوایان بە پێی ڕیزبەندیی خراپیی کردەوەکانیان و، سەختیی کوفرو بێبڕواییەکەیان، دیارە دەخرێنە دۆزەخەوە، وەك لە سوورەتی (**مريم**)دا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمۡ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ عِتِيّٗا ٦٩ ثُمَّ لَنَحۡنُ أَعۡلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمۡ أَوۡلَىٰ بِهَا صِلِيّٗا ٧٠﴾، ئێمە لە هەر کۆمەڵێك کامەیان پتر لە (خوای) بەبەزەیی یاخیی بووبێ، دەری دەکێشین، دوایی ئێمە زاناترین بەکەسانێک کە دەبێ پێشتر بخرێنە نێو ئاگری دۆزەخەوە، کەواتە: هەر کامێکیان بەپێی کردەوەی خۆی زووتر دەخرێتە دۆزەخ، [یاخود سزایەکەی قورستر دەبێ].

٩- مرۆڤ و جند دەچنە سوێی دۆزەخ، بەڵام دوایی خوا پارێزکاران دەرباز دەکات، بێبڕوایانی ستەمکار لەوێدا بەجێدێڵێ: ﴿وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا ٧١ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيّٗا ٧٢﴾ **مريم**، واتە: هیچ کامێك لە ئێوە نیە، مەگەر دەچێتە سوێی دۆزەخ، ئەوە بڕیاری پەروەردگارتەو بڕاوەتەوە، دوایی ئەوانەی پارێزگاریان کردوە دەربازی دەکەین و ستەمکارانیش لەسەر چۆکان بە لەپەو ڕوو کەوتوویی لەوێدا بەجێدێڵین.

١٠- بێبڕوایان هەر کە دەچنە نێو ئاگر، دەست دەکەن بە نەفرین لە یەکدی کردن و، حاشا لە یەکدی کردن، ئەمیش لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَا ٣٨﴾ **الأعراف**، واتە: .... هەر کاتێك کۆمەڵێك دەچن نەفرین لە کۆمەڵەکەی پێشیان دەکەن، هەروەها لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەفەرمووێ: ﴿إِذۡ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ

مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ ﴿١٦٦﴾ ﴾، واتە: كاتێك ئەوانەی پەیڕەوییان لێكرابوو، دووریيان كرد لەوانەی كە شوێنیان كەوتوون و، ئازارو سزای خۆیان بینی، پەیوەندیەكانیان لە نێوان دا پچڕان.

**١١-** داواكردنی بێهێزە هەڵخەڵەتێنراوەكان و بەكرێگیراوەكان، لەسەركردە و گەورەكانیان كە سوودێكیان پێ بگەیەنن، ئەگەر كەمیش بێ، وەك و ئەوەی سزایان لەسەر سووك بكەن، بەڵام وەڵامدرانەوەیان بە وەڵامێكی ساردو سڕ، ئەمیش لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعٗا فَقَالَ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ قَالُواْ لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡۖ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: هەموویان تێكڕا كەوتنە گۆڕێ بۆ خوا ﷻ، بێهێزەكان بەوانەی خۆیان بە زلگرت بوو گوتیان: ئێمە لە دنیادا شوێنكەوتووی ئێوە بووین، ئایا هیچ لە سزای خوامان لە كۆڵ دەكەنەوە؟ گوتیان: ئەگەر خوا ئێمەی ڕاستە ڕێ كردبایە، ئێمەش ئێوەمان ڕاستە ڕێ دەكرد، یەكسانە نارەحەتیی دەربڕین، یان خۆمان ڕابگرین، هیچ ڕێی دەرباز بوونمان نیە.

**١٢-** دووریی كردنی ئیبلیس لە شوێنكەوتووەكانی و، ڕاگەیاندنی بۆ چەند ڕاستییەكی زۆر تاڵ و سەرزەنشتكردنی بۆیان، وەك لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا هاتوە، ئیبلیس دەڵێ: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّۖ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٢﴾ ﴾.

**١٣-** ئەهلی ئیمان و تەقوا ستایشی خوا بەرز دەكەن، كەمڕاستە ڕێی كردوون، خواش دڵ و دەروونیان پاك دەكاتەوە، لە كینەو بوغز بەرانبەر یەكدیی و، برایەتیەكەیان بەردەوام دەبێ و خۆشەویستیشیان بەردەوام دەبێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا

وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ وَنُودُوٓا۟ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾الأعراف، هەروەها لە سوورەتی (**الزخرف**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی لە دنیادا پێکەوە دۆست و نیزیکی یەکدی بوون، هەموو لێك دەبنە دوژمن جگە لە پارێزکاران.

١٤- هاتنی خوا ﷻو فریشتەکانی، بەرەو ئەو شوێنەی کە پاك و پیسانی لێ دەبێ و، خەفەت خواردنی بابای بێبڕوا لەسەر ئەوە کە لە دەستی چووەو، موژدە دانی خوا ﷻ بە ئەهلی ئیمان، بەوە کە لێیان ڕازیەو دەیانخاتە بەهەشتەکەی خۆیەوە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِا۟ىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى قَدَّمْتُ لِحَيَاتِى ﴿٢٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾**الفجر**، واتە: ئەوە پەروەردگارت هات و فریشتەکانیش ڕیز ڕیز، ئەو ڕۆژە دۆزەخ دەهێنرێ، ئینسان (واتە: ئینسانی بێبڕوا)، بیری دێتەوە پەند وەردەگرێ، بەڵام پەند وەرگرتن و وەبیرهاتنەوە هیچ سوودێکی نیە، دەڵێ: خۆزگە شتێکی باشم بۆ ئەم ژیانەی ئێستا پێش خستبایە، لەو ڕۆژەدا هیچ کەسێك ئەو سزا نادات، وەك کە خوا سزای ئەویدا، هیچ کەسێك سزا نادات، هیچ کەسێك وەك ئەو کەلەپچە دەکرێ ئاوا کەلەپچە ناکات، بەڵام ئەی نەفسی ئارامگرتوو بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، تۆش ڕازی ئەویش لە تۆ ڕازی، بچۆ نێو بەندەکان، بچۆ نێو باخ و گوڵ و گوڵزارو بەهەشتەکەمەوە کە بۆم ئامادە کردووی.

ئەمە کورتەیەك بوو لە باسی ڕۆژی دوایی، وەك گوتم لەبەر ڕۆشنایی ئەو کتێبەدا، کە کتێبی هەشتەمی مەوسووعەی (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**)، هەڵبەتە من زۆر بە خولاصەیی بە گوشراوی هێناومە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢٨)ی شـەووالی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٦/٢٠) ی زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیری سـوورەتی (الإنسـان)، سـەرەتاش وەك عادەتـی خۆمـان، پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتی موبارەکـە لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الإنسان) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە چەنـد ناوێـکی هـەن، وەك هەندێـك لـە سـوورەتەکانی دیکـەی قورئـان، نـاوی هـەرە باویـان بریتیـە لـە: (**سـورَةُ الإِنسـانِ**)، بـەڵام چەنـد ناوێـکی دیکـەشی بـۆ بـەکار هێـنراون: ١- (**سُـورَة هَـل أَتَى عَـلَى الإِنسـانِ**)، ٢- (**سُـورَةُ الدَّهـر**)، ٣- (**سـورَةُ الأَمْشَـاج**)، ٤- (**سـورَةُ الأَبْـرَار**)، هەموویـان دەبنـە پێنـج نـاو، بـەڵام نـاوی زانراوتـری (**سـورَةُ الإِنْسـانِ**)ە، لـەو بـارەوەش دوو دەق دێنیـن:

دەقـی یەکەمیـان: {**عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ** ﵁: **أَنَّ النَّبِـيَّ** ﷺ **كَانَ يَقْـرَأُ فِي صَلاةِ الصُّبْحِ يَـوْمَ الْجُمُعَـةِ:** ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ **السـجدة فِي الرَّكَعَـةِ الأُولَى، وفِي الثَّانِيَـةِ:** ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ ۝١﴾ **الإنسـان**} (**أخرجـه البخـاري: ٨٩١، ١٠٦٨، ومسـلم: ٢٠٣٢، والنسـائي: ٩٥٤**).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﵁ گێڕاویەتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە نوێـژی بەیانیـانی ڕۆژی جومعـە لـە ڕکاتی یەکـەم دا (لـە دوای فاتیحـە) سـووڕتی: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ

﴿ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ی خوێندوەو، لە ڕكاتی دووەمدا (دوای سوورەتی فاتیحە) سوورەتی: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ ...۝١﴾ی خوێندوە.

دەقی دووەم: {عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ ...۝١﴾الإنسان، حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي أَرَى مَا لَا تَرَوْنَ، وَأَسْمَعُ مَا لَا تَسْمَعُونَ، أَطَّتِ السَّمَاءُ وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ، مَا فِيهَا مَوْضِعُ أَرْبَعِ أَصَابِعَ إِلَّا وَمَلَكٌ وَاضِعٌ جَبْهَتَهُ سَاجِداً لِلَّهِ، وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً، وَمَا تَلَذَّذْتُمْ بِالنِّسَاءِ عَلَى الْفُرُشِ، وَلَخَرَجْتُمْ إِلَى الصَّعِدَاتِ تَجْأَرُونَ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»} (أخرجه أحمد: ج٥، ص١٧٣، والترمذي: ٢٣١٢، وابن ماجه: ٤١٩٠، وَصَحَّحَهُ الألباني في صحيح سنن ابن ماجه: ٣٣٧٨).

واتە: ئەبوو زەڕ رضي الله عنه دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم سوورەتەی خوێندۆتەوە: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ ۝١﴾الإنسان، تاكو تەواوی كردوە، دوایی فەرموویەتی: ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن و، ئەوەی من دەیبیستم ئێوە نایبیستن، ئاسمان جیڕەی هات (یان نقەی هات)، شایستەی ئەوەشە جیڕەی بێ، چونكە هیچ شوێنی چوار پەنجەیەك نیە لە ئاسمان دا، مەگەر فریشتەیەك نێو چاوانی بۆ خوا خستۆتە سەر زەوی و كڕنووشی بردوە، سوێند بە خوا ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە زانیباتان، زۆر بە كەمی پێدەكەنین و زۆریش دەگریان و، لەگەڵ ئافرەتاندا لەسەر جێگا نەدەخەوتن و چێژتان لێ وەرنەدەگرتن و، وەدەشت و كێوان دەكەوتن (دەچوونە بەرزاییان) و لە خوا (عَزَّ وَجَلّ) دەپاڕانەوەو لەبەری دەكوڕووزانەوە.

كە دەفەرموێ: (أَطَّتِ السَّمَاءُ، أَطَّ يَئِطُّ أَطًّا وأَطِيطاً: صوَّتَ، قَالُوا: شَجانِي أَطِيط الرِّكَاب، وَأَطَّ الظَّهرُ: صوَّت مِنْ ثِقَل الحِمْل)، وشەی (أَطَّ يَئِطُّ)، ئنجا (أَطّاً وأَطِيطاً)، هەردووكیان چاوگن، واتە: (صوَّتَ)، دەنگی لێهات، عەرەب گوتوویانە: (شَجَانِي

**أَطِيْـط الـرِّكَاب**)، واتــە: غوربەتیــی بـۆ هێنـام، سـۆزی جوولانـدم جیـڕەی بـارەکان (نقـەی بـارەکان)، (**وَأَطَّ الظَّهْـرُ: صـوَّت مِـنْ ثِقَـل الحِمْـل**)، پشـتی وڵاخەکـە جیـڕەی هـات، ئەگـەر بارێـکی قـورسی بخرێتـە سـەر، نقـەی دێ، جیـڕەی دێ و پێـی دەگوتـرێ: (**أَطِيْـط**).

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

لەبـارەی شـوێنی دابەزینـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەوە، مشـتومڕی زۆر لـە نێـو زانایانـدا بـووە، مشـتومڕە زۆرەکـەش لـە هەندێـك گێڕدراوانـەوە سـەری هەڵـداوە، ئەگەرنـا بـە بۆچـوونی بەنـدە، هـەر کەسـێك سـەیری نێـوەڕۆکی سـوورەتەکە بـکات، دڵنیـا دەبـێ ئـەم سـوورەتەش سـوورەتێکی مەککەییـە، چونکـە هـەم شـێوازەکەی هـەم نێوەڕۆکەکـەی، پێکەڵپێکـە لەگـەڵ شـێواز (شـێوازی دەربڕیـن)و، نێـوەڕۆکی واتـاو مەبەسـتەکانی قورئـانی مەککەیـی.

ئنجـا جێـی سـەرنج ئەوەیـە کـە هـەر کام لـە لایەنگـرانی دوو ڕایـەکان واتـە: ئەوانـەی گوتوویانـە: مەککەییـەو، ئەوانـەش کـە گوتوویانـە: مەدینەییـە، گوتوویانـە: ئـەو ڕایـە ڕای زۆرینەیـە، بـەڵام زۆربەیـان ڕایـان وایـە کـە ئـەم سـوورەتە مەککەییە.

زۆریـش پێـم سـەیر بـوو کـە (**القرطبـي**) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا دەڵـێ: ئـەم سـوورەتە مەدینەییـە بـەڕای زۆرینـە، کـە وەك دوایـی بـاسی دەکـەم شیعە ئەوەیـان کردۆتـە بیانـوو و دەسـتەچیلەی بـە مەدینەیـی لـە قەڵـەم دانی ئـەو سـوورەتە، هەڵبەتـە لەبـەر مەبەسـتێك کـە دوایـی ڕوونی دەکەمـەوە، بـەڵام شـێوازو نێـوەڕۆکی ئـەم سـوورەتە بـە ئاشـکرا پێـمان دەڵێـن: ئـەم سـوورەتە مەککەییـە، ئنجـا وەك (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا گوتوویەتـی: ڕەنگـە هانـدەری بـە مەدینەیـی دانـانی ئـەم سـوورەتە، ئـەو گێڕراوانەبـن کـە دەڵێـن: ﴿ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ ﴾،

لەبارەی خواردن پێدانی عەلی و فاتیمەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) بە نەدارو هەتیوو دیل، هاتۆتە خوارێ، بەڵام زانایانی فەرموودەناس، تێکڕای ئەو ڕیوایەتانەیان بە درۆو هەڵبەستراو داناون.

کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو گێڕانەوەی دەڵێن: ئەو ئایەتانە لە بارەی عەلیی و فاتیمەوە (**رضي الله عنهما**) هاتوونە خوارێ:

سەرەتا سەرنج ڕادەکێشم بۆ قسەیەکی (**الشوكاني**) لە (**فتح القدير**)دا کە ئەویش ئەو ڕیوایەتانە دێ، بەڵام لە دوایی دەرهێنەر (**مُخرِّج**)ی دەقەکانی تەفسیری (**فتح القدير**)[1] گوتوویەتی: (**أخرجه ابن الجوزي في الموضوعات: ج١، ص٢٩٠**)، واتە: ئەم دەقە (**ابن الجوزي**) لە (**الموضوعات**)دا هێناویەتی.[2]

هەروەها لە پەراوێزی تەفسیری (**الكشاف**)یشدا، بە تەخریجی (**الحافظ ابن الحجر العسقلاني**)[3]، بەژمارە: ١٢٥٨ بەهەمان شێوە هاتوە.

دیسان لە پەراوێزی (**تفسير القرطبي**)یش دا ئاماژە بەوە کراوە کە ئەم دەقە هەڵبەستراوە.

لێرەدا دەمەوێ تۆزێك وردەکاریی ئەوە باس بکەم کە بۆچی هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم سوورەتە مەدینەییە، کە لەڕاستییدا هیچی وەك قورئانی مەدینەیی ناچێ، نە نێوەڕۆکی، نە شێوازەکەی، ئنجا ئەوە دەبێ عیبرەت و پەندێکی گەورەی لێ وەربگیرێ و، هەر لە خۆوە هەرچی لە کتێبان دا هات، یەکسەر وەرنەگیرێ بەبێ ڕامان و لێوردبوونەوە، چونکە ئەو گێڕراوەیە تەفسیری (**الكشاف**) هێناویەتی و ئاشکراشە، زەمەخشەریی فەرموودەناس (**محدِّث**) نەبووە، بۆیە بۆ سەنەدی فەرموودەکان پشتی پێ نابەسترێ و هەندێك، گێڕراوەی

---

(١) لە بەرگی (٥)ی تەفسیرەکەیدا لاپەڕە (٤٢٣)، لە دەقی ژمارە: (٢٨٠٦)دا.

(٢) (الموضوعات) ناوی کتێبێکە (إبن الجوزي) نووسیویەتی لە بارەی ئەو دەقانەوەی بەزاری پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵبەستراون.

(٣) ج٤، ص٦٧٠.

دیکەش دێنێ کە پێەوانەی عەقڵ و مەنطیقن و، پێچەوانەی ڕووحی قورئان و سوننەتن، وێڕای ئەوەی لەڕووی سەنەدیشەوە هیچ پشت ڕاستکراوە نین، بەڵام جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە (**القرطبي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**الجامع لأحكام القرآن**)دا[1] ئەو گێڕاوەیەی بە دوورو درێژی هێناوەو، دواییش لەسەر زمانی (**الترمذي الحكيم أبو عبد الله**) لە کتێبی (**نوادر الأصول**)دا، ڕەخنەی ئەو دەقە دەکات، بەڵام مادام ڕەخنەی دەکات، بۆچی هەمووی بە دوورو درێژیی هێناوە؟!

(**القرطبي**) دەڵێ: (**وَقَدْ ذَكَرَ النَّقَّاشُ وَالثَّعْلَبِيُّ وَالْقُشَيْرِيُّ وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الْمُفَسِّرِينَ فِي قِصَّةِ عَلِيٍّ وَفَاطِمَةَ وَجَارِيَتِهِمَا، حَدِيثًا لَا يَصِحُّ وَلَا يَثْبُتُ، رَوَاهُ لَيْثٌ عَنْ مُجَاهِدٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ**)[2] واتە: هەرکام لە (**نقّاش**) و (**ثعلبي**) و (**قُشيري**) و ژمارەیەك لە ڕوونکەرەوانی دیکەش لە بەسەرهاتەکەی (**علي وفاطمة**) و کەنیزەکەکەیان دا، قسەیەکیان هێناوە کە ڕاست و چەسپاو نیە، (**ليث**) لە (**مجاهد**) لە (**ابن عباس**)ەوە هێناویەتی.

ئنجا ئەوە جێی دەستخۆشییە کە لەسەرەتاوە گوتوویەتی: ڕاست و چەسپاو نیە، بەڵام بۆچی لە تەفسیرەکەیدا سێ لاپەڕو نیوی پێ گرتوون؟! بەسەرهاتەکەش بەگشتیی بەمجۆرەیە گوایە: ئەم دوو ئایەتە موبارەکە: ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ۝٧ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ۝٨﴾، بەو بۆنەوە هاتوونە خوار:

کە ڕۆژێك حەسەن و حوسەین (خوا لێیان ڕازی بێ) نەخۆش دەکەون، پێغەمبەری خواش ﷺ سەردانیان دەکات و، خەڵکی عەرەب بە گشتیی سەردانیان دەکەن، عەلی بابی حەسەن و حوسەین خوا لە هەموویان ڕازی بێ دەدوێنن، (**جابر الجعفي**) لە (**قنبر**) خزمەتکاری عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ)، ڕیوایەتەکە ئاوا دێنێ، دەڵێ: حەسەن و حوسەین نەخۆش بوون تاکو هاوەڵانی پێغەمبەر

---

(١) ج١٩، ص ٩٩-١٠٢.

(٢) الجامع لأحكام القرآن: برقم: ٦٢٠٨.

ﷺ سەردانی حەسەن و حوسەینیان کرد، ئەبوو بەکر (خوا لیی ڕازی بێ) گوتی: ئەی بابی حەسەن! ئەگەر شتێکت لەخۆت گرتبایە (نەزرێکت کردبایەو) هەر لەخۆ گرتنێك کە جێبەجێ نەکرێ هیچ نیە، شتێك لەخۆت بگرە بۆ ئەوەی حەسەن و حوسەین چاك بنەوە، عەلییش رضي الله عنه دەڵێ: ئەگەر ئەم دوو کوڕەم چاك بوونەوە، لە خۆمی دەگرم: سێ ڕۆژان وەك سوپاسگوزاریی بۆ خوا بەڕۆژوو بم، کەنیزەکێکی نەوبییشیان دەبێ (واتە: هی لای حەبەشە) ئەویش دەڵێ: ئەگەر ئەو دوو گەورەیەم چاکبوونەوە، منیش سێ ڕۆژان وەك سوپاسکردن بۆ خوا بە ڕۆژوو دەبم، فاتیمەش (خوا لێی ڕازی بێ) ئەویش بەهەمان شێوە دەڵێ: ئەگەر ئەم دوو کوڕەم چاك بوونەوە، سێ ڕۆژان بەڕۆژوو دەبم، دوای ئەوەی چاك دەبنەوە، لە ماڵی عەلییدا رضي الله عنه، هیچ شتێکیان نابێ، عەلی دەچێ بۆ لای شەمعوونی کوڕی حاریەی خەیبەریی (کە جوولەکەیەك بووە) سێ ڕبە جۆی لێ قەرز دەکات و، دەیانهێنێتەوە لە لایەکی ماڵییان دادەنێ.

فاتیمەش هەڵدەستێ یەکێك لەو سێ ڕبەیە دەهاڕێ و دەیکاتە نان، ئنجا عەلی نوێژ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەکات و دێتەوە ماڵێ، خواردنەکەی لەپێش دادەنێن، (لە گێڕراوەیەکی دیکەدا هاتوە کە کەنیزەکەکە ئەو ڕبە جۆیەی کردۆتە پێنج نان، پێنج خوولکە) و لە پێشیان دادەنرێن (بە حیساب دوویان بۆ عەلی و فاتیمە، دووشیان بۆ حەسەن و حوسەین، یەکیشیان بۆ کەنیزەکەکەیان، ئەوە پێنج) بەڵام نەدارێك دێ دەڵێ: ئەی بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هیچ شتێکمان نیەو، من یەکێکم لە نەدارەکانی ئۆممەتی موحەممەد ﷺ زۆریشم برسییە، خواردنم بدەنێ خوا خواردنتان پێ بدات لە سفرەکانی بەهەشت، ئنجا عەلی رضي الله عنه شیعرێکی هەشت نۆ دە بەیتی، دەڵێ و بانگی فاتیمە دەکات و مەدحی دەکات و دەڵێ: ئەو خواردنە بێنە، فاتیمەش بەهەمان شێوەو خواردنەکە دەدەن بەوو، ئەو شەوو ڕۆژە هیچیان نابێ بیخۆن.

ڕۆژی دووەمیش ڕبەی دووەمی جۆیەکە دەکەنە پێنج کولێرەو دایاندەنێن و، دوای ئەوەی عەلی ﷺ لە مزگەوت دەگەڕێتەوە کە بەڕۆژووش بوون، هەتیوێك دێ داوای خوارد دەکات، دیسان عەلی چەند شیعرێك دەڵێ و، فاتیمەش لە وەڵامیدا چەند شیعرێك دەڵێ و، ئەوجارەش کولێرەکان دەدەن بە هەتیوەکە.

ڕۆژی سێیەمیش دیلێك دێ، کە ئەوە ڕۆژی سێیەمەو بە ڕۆژوون و هیچیشیان نەخواردوەو، بۆ بەربانگ دایاننـاوەو ڕبەی سێیەمی جۆیەکەیان کردۆتە کولێرەو دیلەکە داوای خواردنیان لێ دەکات، عەلی ﷺ چەند شیعرێك دەڵێ، وەك هاندانی فاتیمەو فاتیمەش (خوا لێی ڕازی بێ) لە وەڵامیدا چەند شیعرێك دەڵێ، ئیدی سێ شەوو سێ ڕۆژان بە برسیەتیی دەمێننەوەو بە ڕۆژووش بوون، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەچێ تەماشا دەکات حەسەن و حوسەین کە تازەش لە نەخۆشیی چاك بوونەوەو سکیان بە پشتیانەوە نووساوە، عەلی و فاطیمەش بەهەمان شێوە سکیان بە پشتیانەوە نووساوەو زۆر زۆر برسیین، ئەویش ﷺ بۆیان دەگریاو زۆر ناڕەحەت دەبێ و دەفەرموێ: بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە برسان دەمرن! ئنجا جیبریل دادەبەزێ و سووڕەتی: ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ ﴿١﴾ ﴾، دەخوێنێتەوەو، دەڵێ: ئەی موحەممەد! پیرۆزباییت لێبێ ئەم سووڕەتە بگرە، ئەوە بە بۆنەی ئەو هەڵوێستەی عەلی و فاتیمەی هاوسەری (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەردوو کوڕەکەیان حەسەن و حوسەین و کەنیزەکەکەیانەوە دابەزیوە!

شایانی باسیشە: من سێ تەفسیری شیعەکانم لەلان: ١- (**تفسير الميزان**)و ٢- (**تفسير الكاشف**)و ٣- تەفسیری (نموونە).

**١-** تەفسیری (**الميزان**) کە هی موحەممەد حوسێن تەباتەبائییە[1]، ئەو ڕیوایەتە دێنێ، بێ ئەوەی قسەی لەسەر بکات بەڵکو دەڵێ: ئەوە لە سەرچاوەکانی ئەهلی سوننەتدا هاتوە.

---

(١) ج٢ ص ٣٣٢.

**٢-** تەفسیری (نمونه)[1]ش، بەهەمان شێوە ئەو ڕیوایەتە دێنێ و سێ چوار لاپەڕەشی لەسەر دەڕواو، قسەی لەبارەوە دەكات، دوایی دەڵێ: (راستی عجیب أست هرجای آیه و ریوایتی منتهی به فضائل علی و أهل بیت میشود، گروهی دادو فریاد بلند میکنندو حساسیت فوق العادةً نیشان میدهند: گوئی إسلام به خطر أفتاده است!).

واتە: بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە! لەهەر شوێنێك ئایەتێك، یاخود گێڕدراوەیەك ببێتە مایەی باسكردنی سیفەتە باشەكانی عەلیی و ئەهلی بەیت، (واتە: خزمانی پێغەمبەر ﷺ) هەندێك هاواریان لێ بەرزدەبێتەوەو هەستیاریی زیاد لە پێویست پیشان دەدەن، وەك بڵێی ئیسلام كەوتبێتە مەترسییەوە!

ئەوە قسەی تەفسیری نموونەیە.

**٣-** تەفسیری **(كاشف)**یش[2] كە هی موحەممەد جەواد موغنییەیە، دەڵێ: (**وَفِي كَثِيرٍ مِنْ التَفَاسِيْرِ أن هَذِه الأيَات نَزَلَتْ فِي حَق الإمَام عَلِي بِن أبِي طَالِب ونُثْبِتُ عِبارَة الرازِي بِنَصِّهَا**)، واتە: لەزۆر لە تەفسیرەكاندا هاتوە كە ئەم ئایەتانە لە بارەی ئیمام عەلی كوڕی ئەبی تاڵیبەوە رضي الله عنه دابەزیون و، ئێمە عیبارەتەكەی فەخرەددینی ڕازی دەقەكەی دێنین، (دوایی دەققەكەی دێنێ كە ئەوە لەوبارەوە هاتۆتە خوار).

لێرەدا من پێشێ چەند قسەیەكی **(الترمذي الحكيم)** دێنم، نەك **(إمام الترمذي)** خاوەن **(سنن الترمذي)**.

**(الترمذي الحكيم)** كتێبێكی هەیە بەناوی: **(نوادر الأصول)**، سێ تێبینیی لەسەر ئەو دەقە دەخاتە ڕوو، سەرەتاش دەڵێ:

دەڵێ: (**فَهَذَا حَدِيثٌ مُزَوَّقٌ مُزَيَّفٌ، قَدْ تَطَرَّفَ فِيهِ صَاحِبُهُ حَتَّى تَشَبَّهَ عَلَى الْمُسْتَمِعِينَ، فَالْجَاهِلُ بِهَذَا الحَدِيثِ يَعَضُّ شَفَتَيْهِ تَلَهُّفًا أَلَّا يَكُونَ بِهَذِهِ الصِّفَةِ، وَلَا يَعْلَمُ**

---

(١) ج٥ ص ٣٢٨ - ٣٣٠.

(٢) ج٧، ص٢٨٣.

أَنَّ صَاحِبَ هَـذَا الْفِعْـلِ مَذْمُـومٌ)، واتـە: ئەمـە قسـەیەکی ڕازێـنراوەی پووچـە، خاوەنەکـەی کـە هەڵیبەسـتوە زۆر زێدەڕۆیـی تێـدا کـردوە، بـە جۆرێـك ئەوانـەی ببیسـتن کەسـێك نەشـارەزا بـێ، ڕەنگـە لێـوی خـۆی بگـەزێ و بڵـێ: بریـا منیـش خـاوەنی ئـەو سـیفەتانە بوومایـە، نازانـێ کەسـێك وابـکات (ئـەوەی لـەو گێڕدراوەیەدا هاتوە) سـەرزە نشـتکراوە.

ئنجـا لەوبـارەوە سـێ بەڵـگان دێنـێ، منیـش جگـە لـە دەقـەکان کـە بەبەڵگەیـان دێنێتـەوە یەکسـەر تەرجومـەی کوردیـی دەکـەم:

١- خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿...وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ... ﴿٢١٩﴾﴾البقرة، لێت دەپرسن: چی ببەخشن؟ بڵێ: ئەوەی زیادەو ئاسان بەدەستتانەوە دێ، دەڵێ: (وَهُوَ الْفَضْلُ الَّذِي يَفْضُلُ عَنْ نَفْسِكَ وَعِيَالِكَ)، ئەویش ئەوەیە کە لە خۆت و لە ماڵ و خێزانت زیادە (ئەوە ببخشە). بەڵام ئەوەی خۆت پێویستییت پێیەتی، ببەخشی و خێزان و منداڵت برسیی و ئاتاج بکەی، ئەوە شتێکی چاکت نەکردووەو، لەوبارەوەش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوە کە فەرموویەتی: {خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنَىً} (أخرجه البخاري: ١٣٦٠، وأبو داود: ١٦٧٦، والنسائي: ٢٥٤٤)، باشترین خێر کردن ئەوەیە کە لە حاڵەتی هەبووندا بێت، یانی: هەتبێت و بە دەستتەوە بێ و لە خۆت و خێزانت زیاد بێ.

هەر لەوبارەوە حەدیسێکی دیکەی پێغەمبەریش ﷺ هاتوە دەفەرموێ: {ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ فَلأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَيْءٌ فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَيْءٌ فَهَكَذَا وَهَكَذَا} (الحديث فيه قصة ذكرها البخاري دون المتن: ٢٠٣٤، ومسلم: ٩٩٧، وابن حبان: ٣٣٣٩)، یانی: ئەگەر ماڵ و سامانێکت هەبوو خەرجی بکەی، پێشێ بۆ مەسرەفی خۆتی بەکاربێنە، ئنجا ئەگەر شتێک زیاد بوو با بۆ خێزانت بێ کە ژیاندن و، بەڕێوەبردنی لەسەر تۆیە، منداڵ و خێزانت بێ، ئنجا ئەگەر لە خێزانت شتێک زێدە بوو بابۆ خزمانت بێ، ئنجا ئەگەر لەخزمانیشت شتێک زێدە بوو، بەولاولادا ببەخشە.

خوای پەروەردگاریش لەسەر هاوسەرەکان و مێردەکانی فەرز کردوە نەفەقەی خێزان و منداڵەکانیان بکێشن، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ

يَقُوتُ} (أخرجه أحمد: ٦٤٩٥، وأبو داود: ١٦٩٢، والحاكم: ١٥١٥، والبزار: ٢٤١٥، وابن حبان: ٤٢٤٠، والنسائي في الكبرى: ٩١٧٧)، واته: مرۆڤ ئەوەندە گوناحەی بەسە، كە ئەوەی دەبێ بیژیەنێ و نەفەقەی بكێشێ، زایەی بكات و پشتگوێی بخا.

كەواتە: بە پێی ئایەتەكان و بەپێی فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە شتێكی پەسند و ستایشكراو نیە تاكو مەدح بێ بۆ عەلی و فاطیمە خوا لێیان ڕازی بێ.

**٢-** ئایا هیچ عاقڵێك پێی وایە عەلی ﷺ هێندەی نەزانیبێ بچێ دوو كوڕی پێنج شەش ساڵەی خۆی، سێ شەوو ڕۆژان برسیی بكات كە تازە لە نەخۆشیی هەڵساونەوە، هەتا سكیان بە پشتیانەوە بنووسێتەوەو چاویان قووڵ بن و، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان بگری؟! ئنجا باشە ئەوە عەلی ﷺ ئەو كارەی كرد و خەڵكی بەسەر خۆیدا هەڵبژارد: ڕۆژێك نەدارێك و، ڕۆژێك هەتیوێك و، ڕۆژێك دیلێك، بەڵام ئایا بۆی هەیە خێزانیشی ئەركدار بكات بەوە؟ ئنجا ئەوە خێزانیشی لەگەڵیدا هاوكار بوو كە فاتیمەیە ﷺ، ئایا بۆیان هەیە دوو منداڵی نەباڵقیی پێنج شەش ساڵە، سێ شەوو سێ ڕۆژان برسیی بكەن، ئەوە چییە، خێر دەكەن؟ بەڕاستیی گێڕدراوەی وا هەر خەڵكی كەودەن و نەزان ڕەواجی لەلای هەیەو عەلی و فاتیمە (خوا لێیان ڕازی بێ) لێیان ناوەشێتەوەو، گومانی وایان پێ نابەین كە كاری وایان پاڵ بدرێتە لا.

**٣-** ئایا كێ ئەو هەموو شیعرانەی لەبەر كردن؟ كە نزیكەی سی چل بەیتە شیعرە، كێ لەوێ بوو ئەو هەموو شیعرانە لەبەر بكات؟ هی عەلی ﷺ كە فەرمان بە فاتیمە دەكاو مەدحی دەكاو هانی دەدات، كە ئەو ڕۆژە ئەو خێرە بكەن، فاتیمەش هەر بەشیعر وەڵامی دەداتەوەو هەرسێ ڕۆژەكان، هەم عەلی شیعر دەڵێ و، هەم فاتیمە شیعر دەڵێ، بەو حاڵەتی برسییەتییەش.

منیش ڕەخنەكانیم زۆر پێ بەجێن و ئەو قسەیەشیم پێ بەجێیە، كە دەڵێ: ئەم جۆرە ڕیوایەتانە واپێدەچێ كەسانێك كە سجن كراون و ساڵانی زۆر لە سجنی زاڵمەكاندا

ماونەوەو هیچ ئیشیان نەبووە، دانیشتوون ئەو حیکایەتانەیان هەڵبەستوون و، پاڵیانداونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

لە کۆتایی دا دەڵێم:

تەفسیری (**القرطبي**) هەر باشە کە بەسەرهاتەکەی هێناوە باسی سەنەدەکەی کردوە، کە هیچ نیەو ڕاست نیە، بەڵام تەفسیری (**الكَشَّاف**) هێناویەتی بێ ئەوەی قسە لە سەر سەنەدەکەی بکات، هەروەها فەخرەددینی ڕازیی هێناویەتی و گەلێك لە تەفسیرەکانی دیکەش هێناویانە، ئنجا شیعەکانیش هێنانی لە تەفسیرەکانی زانایانی دیکەی ئیسلام دا جگەلە شیعە[1]، ئەوە دەکەنە بیانوو و دەستەچیلەی ئەوەی ئەو گێڕراوانە ڕاستن، چونکە ئەها نەیارەکانی خۆشمان هێناویانن!

ئنجا بەڕاستی ئەو قسەیەی تەفسیری (نمونە) کە لەزۆر جێی دیکەش دا ئەو جۆرە قسانە دەکات، بە دڵڕەشییەك و گومانی خراپ پێ بردنێکی زۆرەوە، بە لە پشت پەردەیەکی ڕەش تەماشاکردنێکی زۆرەوە، باسی زۆربەی زانایانی ئیسلام و زۆربەی مسوڵمانان دەکات، ئەگەرنا کەی وایە، هەرکاتێك مەدحی عەلی کرابێ و مەدحی فاتیمە کرابێ (خوا لێیان ڕازی بێ) زانایانی دیکەی ئیسلام

---

(١) من ئەگەر ناچار نەبم وشەی ئەهلی سوننە بەکارناهێنم، چونکە شیعە ئەوە شیعەیە، شیعەو خەواریج و مورجیئەو موعتەزیلەو قەدەرییە، بەڵام زۆرینەی مسوڵمانان پێویست ناکات وەك کۆمەڵێك و تائیفەیەك لە بەرانبەر تائیفەو کۆمەڵەکانی دیکەدا باس بکرێن، بەڵکو دەبێ بڵێین: مسوڵمانان بە گشتیی، وەك من لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا) لە بەرگی دووەمدا، باسم کردوە، کە لە ڕاستییدا زۆرینەی مسوڵمانان ستەمیان لێ دەکرێ، ئەگەر ناوێکیان بۆ هەڵبدرێ وەك (أهل السنة) یان (أهل السنة والجماعة)، چونکە ئەوە ناوێکی مێژووییەو نابێ زۆرینەی مسوڵمانانی تێدا قەتیس بکرێن و، مەرجیش نیە هەرکەس ئەو ناوە مێژووییەی هەڵگرتوە، لەگەڵیدا گونجاوو پڕ بەپێست بێ، بۆیە سەلامەتر وایە هەر ئەو ناوە بەکاربێنین کە خوا بۆ مسوڵمانانی بەکارهێناوە: ﴿...هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ ...﴾ ﴿٧٨﴾ الحج.

بە حەسادەت و هەستیاریی وەریانگرتوە؟ ئەوە درۆو دەلەسەیەکی زۆر گەورەیە، چەندان فەرمووده هەن لە هەردووك صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا لە دایکمان عائیشەوە ﵂، لە ئەبوو هورەیرە ﵁ کە شیعە زرۆیان ڕق لێیە، بەڵکو لە ئەبوو بەکرەوەو لە عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێ، چەندان فەرمووده هەن کە مەدحی عەلی و فاتیمەو خزمان و بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن، بۆیە ئەوە هەمووی لە هەمبانەی خۆدا گوێز ژماردنەو گومانی خراپ پێ بردنە.

بەڕێـــزان!

ویستم ئەو ڕوونکردنەوانە بدەم لە بارەی بڕگەی دووەمی پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتەوە، کە شوێنی دابەزینی ئەم سووڕەتەیە، کە بەدڵنیاییی ئەم سووڕەتە سووڕەتێکی مەککەییەو، بە مەدینەیی لە قەڵەمدانی هەر بەهۆی ئەو ڕیوایەتەوەیە کە باسمان کردو، ئەو ڕیوایەتەش ئەسڵ و ئەساسی نیەو، لەگەڵ پێگەو پلەی عەلی ﵁ و تێگەیشتنی لە دین، هەروەها پێگەی فاتیمەی کچی پێغەمبەردا (خوا لێی ڕازی بێ)، ناگونجێ و، لە جیاتی ئەوەی مەدح بێ بۆ عەلی و فاتیمە خوا لێیان ڕازی بێ، زەم و کەم و کوڕییەکی گەورەیە، کەسێك دوو منداڵی نەباڵغیی خۆی کە تازە لە نەخۆشیی چاك بوونەوە، سێ شەوو سێ ڕۆژان برسی بکات و هیچیان نەداتێ، ئنجا ئایا ئەو کۆمەڵگایە کەسی تێدا نەبووە بەزەیی بەو منداڵانەدا بێ کە لە برسان نەمرن؟! کەواتە: جگە لەوەی ئەو گێڕدراوەیە هیچ سەنەدێکی نیە، لەگەڵ عەقڵ و زگماك و لۆژیك و، لەگەڵ ئایەتەکانی قوڕئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ دا ناگونجێ.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمێرەرانی ئایەتەکانی قوڕئان، لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە، سی و یەك (٣١)ەو، هیچ مشتومڕیان لەو بارەوە نیە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ئـەم سـووڕەتە لـە موصحەفـدا ڕیزبەندییەکـەی حەفتاو شـەش (٧٦)ە، لە سـووڕەتی فاتیحـەوە کـە دێـی، ئـەم سـووڕەتە حەفتـاو شـەش (٧٦)مینـە، لـە دابەزینیشـدا وا پێدەچـێ ژمارەکـەی سـی (٣٠) یـان سـی و یـەك (٣١) بـێ، کەواتـە: جابیـری کـوڕی زەیـد کـە دەڵـێ: ژمارەکـەی نـەوەد و هەشـت (٩٨)ە، ڕاسـت نیـەو، بۆیـە ئـەو ژمارەیـەی دانـاوە، چونکـە بـە مەدینەیـی ئەژمـاری کـردوە، کـە واش نیـە وەك باسـمان کـرد، شـایانی باسیشـە: (ابـن مسـعود ﷺ) لـە ڕیزبەندیـی موصحەفەکەیـدا، لـە سـووڕەتە مەککەییـە لـە پێشـەکانی ئەژمـار کـردوە و، ڕەنگـە ژمـارەی ڕیزبەندییەکـەی لـە سـی (٣٠)یـش کەمـتر بـێ.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە سێ تەوەری گرتوونە خۆی:

تـەوەری یەکـەم: خسـتنە ڕووی ئەو ڕاسـتییە کە مـرۆڤ لە دوای نەبـوون هێنراوەتە دی، بەمەبەسـتی تاقیکرانـەوەو لـە نوتفەیـەکی تێکـەڵ خـوا دروسـتیکردوەو، بیسـەرو بینـەری کـردوەو، ڕێـی ڕاسـتیشی پێشـان داوە، چ سوپاسـگوزار بـێ، چ ناسـوپاس، لـە ئایەتـەکانی: ١ و ٢ و ٣ دا.

تـەوەری دووەم: بـە کورتیـی باسـکردنی سـزای بێبڕوایـان و، بـە درێژیـی باسـکردنی پاداشـتی بـڕواداران و بەشـێك لـە کـردەوە باشـەکانیان، ئەمـە زۆربـەی سـووڕەتەکەی گرتۆتـەوە، لـە ئایەتـەکانی: ٤ - ٢٢ دا.

تـەوەری سـێیەم: چەنـد ڕێنماییـەك بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە سـەرجەم پێنـج ڕێنماییـن و، ڕوونکردنـەوەی چەنـد ڕاسـتییەکیش ئەمیـش لـە نـۆ ئایەتـەکانی کۆتاییـ: ٢٣ - ٣١ دا هاتـوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە دوو تایبەتمەندیی سەرەکیی هەن:

١- بەرچاوترین تایبەتمەندیی ئەم سووڕەتە، بریتیە لە باسکردنی نازو نیعمەتەکانی بەهەشت، بەشێوازی تێکهەڵکێش، بە شێوازی لێککێشانەوە (**إطناب**) کە سەرجەم بیست و یەك (٢١) جۆرە نازو نیعمەتی بەهەشت بۆ چاکەکاران باسکراون، وەك دوایی سەرژمێریان دەکەین.

٢- دووەمین تایبەتمەندیی ئەوەیە کە چەند وشەیەك لەم سووڕەتەدا هاتوون، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون:

١/ ﴿ نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ﴾، لە ئایەتی (٢)دا.

٢/ ﴿ كَافُورًا ﴾، لە ئایەتی (٥)دا.

٣/ ﴿ مُسْتَطِيرًا ﴾، لە ئایەتی (٧)دا.

٤/ ﴿ قَمْطَرِيرًا ﴾، لە ئایەتی (١٠)دا.

٥/ ﴿ زَمْهَرِيرًا ﴾ ، لە ئایەتی (١٣)دا.

٦/ ﴿ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ ﴾، لە ئایەتی (١٦)دا.

٧/ ﴿ زَنجَبِيلًا ﴾، لە ئایەتی (١٧)دا.

٨/ ﴿ سَلْسَبِيلًا ﴾، لە ئایەتی (١٨)دا.

٩/ ﴿ وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴾، لە ئایەتی (٢٠)دا.

١٠/ ﴿ شَرَابًا طَهُورًا ﴾، لە ئایەتی (٢١)دا.

١١/ ﴿ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ﴾، لە ئایەتی (٢٨)دا.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی بۆ دوو دەرس:

ئێمـە كـۆی سی و یـەك (٣١) ئایەتـەكانی ئـەم سـووڕەتە موبارەكـە، بـۆ دوو دەرسـان دابــەش دەكەین:

دەرسی یەكـەم: ئایەتـەكانی: (١ - ٢٢)، كـە هـەردوو بابـەتی یەكـەم و دووەم دەگرنـە خۆیـان و، كـە پێشـتر باسـمان كـردن.

دەرسی دووەم: لـە نـۆ (٩) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٢٣ - ٣١)، كـە بابـەتی سـێیەم دەگرێتـە خـۆی، كـە بریتیـە لـە ڕوونكردنـەوەی چەنـد ڕاسـتییەكی مـەزن بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ و، پێنـج ڕێنمایـی و ئامۆژگاریـی، وێـڕای سـەرەنجامی كۆتایـی بـۆ هـەركام لـە بـڕواداران و بێبڕوایـان، ئەمـە پوختـەی پێناسـەو نێـوەڕۆكی ئـەم سـووڕەتە بـوو.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دوو بابەتی گەورەو گرنگی گرتوونە خۆی، لە دووتوێی بیست و دوو ئایەتدا.

بابەتی یەکەمیان: کە لە سێ ئایەتی یەکەم دایە، خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە ماوەیەك تێپەڕیوە بەسەر مرۆڤدا، باسکراو نەبووە، واتە: لە دونیای واقیعدا بوونی نەبووە، دوایی خوا ﷻ لە نوتفەیەکی تێکەڵ دروستی کردوە، بە مەبەستی تاقیکردنەوە، بۆیە توانای بیستن و بینیی پێداوە، دوایی ڕاستەڕێی کردوە هەم لە ڕووی زگماکییەوە، هەم لەڕووی عەقڵەوە، هەم لە ڕووی وەحیی بۆ ناردنیشەوە، بە هۆی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) کە سەرەنجام مرۆڤ یان سوپاسگوزار دەبێ، یان سپڵەو بێ ئەمەگ.

بابەتی دووەم: کە ئەم دەرسەمان گرتوویەتە خۆی، لە نۆزدە ئایەتی دوایی ئایەتەکانی: (٤ - ٢٢)، پێکدێ، خوا ﷻ لەو نۆزدە ئایەتەدا بە کورتیی باسی سزای بێبڕوایان دەکات، کە زنجیرو کۆت و پێوەندو ئاگری بە کڵپەی بۆ داناون. دوایی خوا ﷻ بە درێژیی دێتە سەر باسی پاداشتی چاکەکاران، کە کەمتر وایە لە قورئاندا هێندە باسی نازو نیعمەتەکان کرابێ بۆ چاکەکاران، کە وەك پێشتر گوتمان: خوا سەرجەم بیست و یەك (٢١) نازو نیعمەتی لەو نۆزدە ئایەتەدا خستوونەڕوو، وەك پاداشت بۆ چاکەکاران لە بەهەشتدا، سەرەتا باسی ئەو خواردنەوانەی دەیانخۆنەوە، پاشان وەك نێواخنێك بۆ ئەو نازو نیعمەتانە، خوا باسی سێ لە کردەوە باشەکانیان دەکات:

١- شتێکیان کە لەسەر خۆیان پێویست کردوەو لە خۆیانیان گرتوە، پێی وەفاداربوون.

٢- خواردن و خۆراكێك كە حەزیان لێكردوە، یان پێویستییان پێی بووە، بەخشیویانە بە نەدارو هەتیوو دیل و، لە دڵی خۆشیاندا گوتوویانە: كە ئەمە تەنیا لەبەر ڕەزامەندیی خواو لەبەر دیداری خوا پێتان دەدەین و، هیچ چاوەڕوانییەكمان لێتان نیە.

٣- باسی ترسی خۆیان كردوە لە ڕۆژێكی گرژو ناهەموار و سەخت و دژوار، خواش ﷻ لە بەرانبەر ئەوەدا لە خراپەی ئەو ڕۆژە چەپاڵەی داون و پاراستوونی و، وای لێكردوون تووشی ڕوو گەشیی و دڵخۆشیی بن.

ئنجا دووبارە دێتەوە سەر باسی ئەو نازو نیعمەتانەی پێیان دەدات لە بەهەشتدا، كە هەم باخیان پێدەدات، هەم پۆشاكی ئاوریشم و، پاڵدەدەنەوە لەسەر تەختەكان، كە لەوێدا نە خۆر دەبینن، نە سەرما دەبینن، لق و پۆپی درەختەكان بەسەریاندا شۆڕ بوونەوەو سێبەرەكەیان نزیكەو، میوەكەیان بە ئاسانیی دەچنرێ و، لاوانێكی تازە پێگەیشتوو بەسەریانەوە دەگەڕێن، بە قاپی زیوین و بە پەرداخی بلوورینەوەو، ئەو خواردنەوەیە تێیاندایە ئەندازەگیریی كراوە بەپێی ئارەزوویان، لەوێدا لە شەڕابێك دەخۆنەوە زەنجەبیلی لەگەڵ تێكەڵكراوە، كە لە سەرچاوەیەكە ئەو سەرچاوەیە پێی دەگوترێ: سەلسەبیل، لاوانێكی هەمیشە لاو بەسەرسەریانەوە دەگەڕێن، ئەگەر تۆ بیانبینی وا دەزانی گەوهەرو مروارییەن پرژو بڵاو كراونەوە، ئەگەر تۆ ئەوێ، ببینی موڵك و قەڵەمڕەوێكی زۆر فراوان دەبینی، پۆشاكێك كە لەسەرەوە لەبەریان كردوە، هەم ئاوریشمی تەنكە، هەم ئاوریشمی ئەستووری سەوزەو، بە بازنەی زێڕ ڕازێنراونەوە، پەروەردگاریشیان خواردنەوەیەكی پاك و پاككەرەوەیان پێدەدات، پێشیان دەگوترێ: ئەمە پاداشتێكە دراوتانەتەوە، هەوڵ و كۆششی ئێوە نرخێنراو و سوپاسكراوە، ئەمە نێوەڕۆكی دەرسی یەكەمە كە لە بیست و دوو ئایەتەكانی: (١ - ٢٢) پێكدێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَا وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە. ئایـا ماوەیـەك لـە كات بەسـەر مرۆڤـدا تێپـەڕ بـووە کـە شـتێکی باسـکراو نەبـوو؟ (١) ئێمـە مرۆڤـمان لـە تۆویلکەیـەکی ئاوێتـە دروسـتکرد، تاقیدەکەینـەوە (بۆیـە) بـە بیسـەرو بینەرمـان گێـڕا (٢) ئێمـە ڕێ (ی ڕاسـت)مان پێشـان داوە، ئنجـا یـان سوپاسـگوزار دەبـێ یـان سـپڵەو ناسـوپاس؟

(٣) ئێمە لە ڕۆژی دوایی دا بۆ (سزادانی) بێبڕوایان زنجیرو کۆت و پێوەندەکان و بڵێسە (ی ئاگر)مان ساز کردوە (٤) بە دڵنیایی چاکەکارانیش (لە بەهەشتدا) لە پێکێك (ی مەی) دەخۆنەوە کافووری ئاوێتەیە (٥) کانییەکە بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوەو، پێی تێراو دەبن، بە هەڵقوڵاندنێکی سەرسوڕهێنەر لە هەر جێیەکیان بوێ، هەڵیدەقوڵێنن (٦) (ئەوانە لە دنیادا عادەتیان وابوو) لە خۆگیراویان جێبەجێ دەکردو، لە ڕۆژێك دەترسان کە زیان ( و مەترسیی)ەکەی بەربڵاوو گشتگیر بوو (بۆ سزاباران) (٧) خواردنێکیش کە خۆشیان دەویست دەرخواردی نەدارو هەتیوو دیلیان دەدا (٨) (لەبەر خۆشیانەوە دەیانگوت): تەنیا لەبەر دیداری ڕووی خوا (و ڕەزامەندییەکەی) دەرخواردتان دەدەین (بۆیە) هیچ پاداشت و سوپاسکردنێکمان لێتان ناوێ (٩) ئێمە لە لایەن پەروەردگارمانەوە مەترسیی ڕۆژێکی گرژ (و ترش و تاڵ)ی سەخت و بێڕەزامان هەیە (١٠) ئنجا (بەهۆی ئەوەوە) خوا لە خراپەو زیانی ئەو ڕۆژە پاراستنی و گەشیی و شادمانیی پێدان (١١) لە سۆنگەی خۆڕاگرییشیانەوە باخێك (ی ناوازە) و (پۆشاکی) ئاوریشمی پێدان (١٢) (دەیانبینی) لەسەر تەختان پاڵیانداوەتەوە، لەوێدا (تیشکی) خۆرو سەرماو زوقم نابینن (١٣) سێبەرەکانی (لق و پۆپەکانی نێو باخەکە) لێیانەوە نزیکن ( و بەسەریاندا شۆڕ بوونەوە)و میوەکانیشی بە دەستەمۆ کران، ئاسانکراون (بۆ لێکردنەوە) (١٤) دەفرە زیوینە (پڕ خۆراکە خۆش و بە تامەکان) و پەرداخە بلوورییە (پڕ شەڕابەکان)یان بەسەرەوە دەگێڕدرێن (١٥) پەرداخە بلوورییە زیوەکان خواردنەوەکەیان بەڕێکیی تێدا ئەندازەگیریی کراوە (هەر کەسە بە ئەندازەی ئارەزووی) (١٦) هەروەها پێکێك (ی مەی)یان پێ دەنۆشرێ، زەنجەبیلی ئاوێتە کراوە (١٧) کانییەکی تێدایە پێی دەگوترێ: سەلسەبیل (١٨) لاوانێکی بەلاویی هێشتراوە (بۆ خزمەتکردن) بەسەریانەوە دەگەڕێن، کاتێك دەیانبینی بە گەوهەری پڕژاویان تێدەگەی (١٩) ئەگەر ئەوێش ببنیی، موڵك و قەڵەمڕەوێکی گەورە (و فراوان) دەبینی (٢٠) پۆشاکی ئاوریشمی سەوزی

تەنك و ئەستووریان پۆشیوەو، بە بازنە زیوینەكان ڕازێنراونەوەو، پەروەردگاریان خواردنەوەیەكی پاك و پاككەرەوەی داونێ ﴿٢١﴾ بێگومان (ئەی بڕوادارینە!) ئەمە پاداشتی ئێوەیەو، هەوڵ و كۆششتان (لە ژیانی دنیادا) سوپاسكراوو نرخێنراوە ﴿٢٢﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(حِينٌ ): (هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ )، (**الحِيْنُ: وَقْتُ بلُوغِ الشَّيءِ وَحُصُولِه، وَهُوَ مُبهَمُ المَعنَى وَيَتَخَصَّصُ بالمُضَافِ إلَيهِ**)، (**الحِينُ: الزَّمَانُ المُطْلَق**)، وشەی (**حِين**) كاتی پێگەیشتنی شتێكە، (**حِين**) مانایەكەی نەزانراوە، بەڵام تایبەت دەكرێ بەوەوە كە پاڵ دەدرێتە لای، هەروەها وشەی (**حِين**) بە مانای كاتی ڕەهاش بەكارهاتوە.

(ٱلدَّهۡرِ ): (**الدَّهْر: إسْمٌ لِمُدَّةِ العَالَمِ مِن مَبْدَءِ وجُودِ إلَى انقضائِهِ**)، وشەی (**دَهر**): ناوە بۆ كاتی تەمەنی دنیا لە سەرەتایەوە تاكو كۆتایی دێ، (**ثُمَّ يُعَبَّرُ بِهِ عَنْ كُلِّ مُدَّةٍ كَثِيرة**)، دوایی (**دَهر**)، بەكاردەهێنرێ بۆ هەر ماوەیەكی زۆر.

(أَمۡشَاجٖ ): (**أَخْلاَطٍ مِنَ الدَّم**)، (**أمْشَاج**)، چەند شتێكی تێكەڵ لەخوێن، (**أَمْشَاج**) كۆی (**مَشِيج**)ە، وەك چۆن (**أَخْلاَط**)، كۆی (**خَلِيط**)ە، واتە: چەند شتێكی تێكەڵ و پێكەوە ئاوێتەكراو، لێرەدا دەڵێ: چەند تێكەڵەیەك لە خوێن، ئەوەش یەكێكە لە واتایەكان، ئەگەرنا دەگونجێ مەبەست لە (**أمْشَاج**)، تێكەڵبوونی ئاوی پیاوو ئافرەت بێ، كە بە هەردووكیان نوتفە پێك دێنن و مرۆڤ لەوە دروست دەبێ، لە نێو منداڵدانی ئافرەتدا گەشە دەكات و بە چەند قۆناغێكدا تێدەپەڕێ، دەگوترێ: (**مَشَجَ، يَمْشُجُ، مَشْجاً، أَي: خَلَطَهُ، وَمَشَجَ بَيْنَهُمَا: خَلَطَ**)، (**مَشَجَ، يَمْشُجُ، مَشْجاً، أَي: خَلَطَ، يَخْلُطُ خَلْطاً**)، تێكەڵیكرد، تێكەڵ دەكات، تێكەڵكردن، (**وَمَشَجَ بَينَهُما أَي: خَلَطَ**)، واتە: دوو شتی پێكەوە تێكەڵكردن.

(أَعْتَدْنَا ): (أَعْـدَدْتُ هَـذَا لَـكَ أَي: جَعَلْتُـه بِحَيـثُ تَعُـدُّهُ وَتَتَناوَلُـه بِحَسَـبِ حاجَتِـكَ إِلَيْـهِ، وَأَعْتَدنـا أَي: هَيَّئنـا)، (أَعْتَدْنَـا)، دەگوتـرێ: (أَعـدَدتُ هَـذَا لَـكَ) ئـەو شـتەم دانـاوە بیژمێـری و بەپێـی پێویسـتیی خـۆت دەسـتی بگەیەنیـەو لێـی بەهرەمەنـد بی، بۆیـە (أَعْتَدْنَـا) لەگـەڵ (أَعدَدْنَـا) یـەك واتایـان هەیـە، بەمانـای (هَيَّئنَـا) واتـە: ئامادەمـان کـرد، سـازمان کـردوە.

(مِزَاجُهَا ): (المِـزَاجُ: مـا يُمـزَجُ بِـهِ، مَـزَجَ الـشَّرَابَ، أَي: خَلَطَـهُ) (مِـزاج)، شـتێکە لەگەڵـی تێکـەڵ دەکـرێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾، واتـە: ئـەوەی لەگەڵـی تێکەڵکـراوە (کافـوورە)، شـەڕابەکە هەیـە، بـەڵام ئەندازەیـەك کافـووری لەگەڵـدا تێدەکـرێ، دوایـی لـە شـوێنی دیکـە دەفەرمـوێ: ﴿كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا﴾، یانـی: جارێـك کافـوور تێکـەڵ بـە شـەڕابەکەیان دەکـرێ، جارێـك زەنجەبیـلی تێکـەڵ دەکـرێ، کـە دوایـی بـاسی هـەرکام لـە کافـوورو زەنجەبیـل دەکەیـن و پێناسـەیان دەکەیـن دەگوتـرێ: (مَـزَجَ الـشَّرَابَ أَي خَلَطَـهُ)، واتـە: تێکەڵـی خواردنەوەکـەی کـرد.

(كَافُورًا ): (الكَافُـورُ: أَكْمَامُ الثَّمَـرَةِ أَي: الَّتِـي تُكفِـرُهُ، ثَمَـرُ الكافـورَ الَّـذِي هُـوَ مِـن طِيـبٍ)، (كَافُـور): لـە ڕووی زمانەوانییـەوە بـە دوو واتایـان هاتـوە:

أ- بەو گوڵە دەگوترێ کە لە درەخت، پەیدا دەبێ و دوایی دەبێتە میوە، کە گوڵ دەکات، گوڵەکە پێی دەگوترێ: (كَافُورُ).

ب- جۆرێکە لە بۆنی خۆش.

(يُفَجِّرُونَهَا ): ئاوەکـە ڕادەکێشـن، (الفَجـرُ: شَـقُّ الـشَّيءِ شَـقاً واسِـعاً، كَفَجـرِ الإِنسـانِ السِّـكرَ، وَهُـو مـا يُسَـدُّ بِـهِ النَّهـرُ)، (فَجْـر): ئەوەیـە شـتێك لـەت بکـرێ بـە لەتکـردن و لێـك جیاکردنەوەیـەکی فـراوان، وەك ئـەوەی مـرۆڤ ئـەو شـتەی بـەری ئـاوی پـێ دەگـرێ، بیتەقێنـێ و شـەقی بـکات بـۆ ئـەوەی ئاوەکـە بـێ، (سِـكْر) (مـا يُسَـدُّ بِـهِ النَّهـرُ)، (سِـكْر) ئەوەیـە بـەری جۆگەلـەی پـێ دەگیـرێ، ئەوانەی خـاوەن بـاخ و خاوەن کشـتوکاڵن و ئاودێریـی دەکـەن دەزانـن، جـاری وایـە ئـەو ئـاوەی لـە جۆگەلەیەکـەوە

دێ، لە بناوانێ دەبێ شتێکی تێباوێی بۆ ئەوەی بەری بگرێ و ئاوەکە نەیەت، ئەگەر پێویستییت پێی نەبێ، ئنجا کە ویستت ئاوەکە بەردەیەوە ئەو پەرچە لادەبەی، یاخود شەقی دەکەی، ئەوە پێی دەگوترێ: (سِكر)، ئەو پەرچەی ئاوەکەی پێ دەبەسترێ، (فَجر)یش ئەوەیە کە ئەوەی ئاوەکەی پێ بەستراوەو بەری پێ گیراوە، لایبەری، یان شەقی بکەی.

(يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ): واتە: ئەوەی لەخۆیان گرتوە، جێ بەجێی دەکەن، (الوَافِي: الَّذِي بَلَغَ التَّمَام)، (وَافِي): ئەوەیە گەیشتبێتە حاڵەتی تەواو بوون، دوایی ئێمە پێناسەی (نَذر) دەکەین لەڕووی زاراوەی شەرعییەوە، هەر لە ڕووی زمانەوانییەوەش: (النَّذرُ: أَنْ تُوجِبَ عَلَى نَفْسِكَ ما لَيسَ بِواجِبٍ لِحُدُوثِ أَمرٍ)، (ئەمە یەکێکە لە پێناسەکان) (نَذر) ئەوەیە شتێك لەسەر خۆت پێویست بکەی لە ئەصڵدا پێویست نیە، بەهۆی ڕوودانی کارێکەوە، تۆ شتێك لەسەر خۆت پێویست دەکەی تاکو خوا ﷻ بەلایەکت لەکۆڵ بکاتەوە، یاخود نیعمەتێکت بۆ بێنێتە پێش.

(مُسْتَطِيرًا): (يُقَالُ فَجرٌ مُستَطِير أَي: فاشٍ، وَغُبارٌ يُستَطارُ أَي: يَنتَشِرُ)، (مُستَطِير) واتە: بڵاوبووەوە، پەرە گرتوو، تەشەنە سەندوو، دەگوترێ: (فَجرٌ مُستَطِير) واتە: سپێدەیەك شەبەق و ڕووناکییەکەی بڵاوبۆتەوە (فاشٍ)، (فَشَى، يَفشُو، فَهُوَ فاشٍ)، واتە: بڵاو بۆوە (وَغُبارٌ يُستَطارُ) تۆزو خۆڵێك یان تۆزو گەردێك کە بڵاودەکرێتەوە.

(عَبُوسًا): (العُبُوسُ: قُطُوبُ الوَجْهِ مِن ضِيقِ الصَّدْرِ)، (عَبُوس) ڕووتاڵ، ڕووگرژ، (عُبوس) بریتیە لە ڕوو گرژ بوون لە ئەنجامی سینە تەنگ بووندا، مرۆڤ کە ڕووی گرژ دەبێ، لەبەر ئەوەیە خەفەتێك و نارەحەتییەکی هەیە.

(قَمْطَرِيرًا): (القَمْطَرِيرُ: الشَّدِيدُ)، (قَمطَرِير) و (قَمَاطِير)، بە مانای توندو سەخت دێ و، بە مانای ئەو پەڕی ڕوو گرژیی دێ.

(وَلَقَّىٰهُمْ): (لَقِيْتُ بِهِ كَذَا استَقبَلتُهُ بِهِ، لَقَّاهُم: أَي أَعْطَاهُم، أَو جَعَلَهُم يَلقَونَ)، (لَقِيْتُ بِهِ كَذَا)، پێشوازییم لێ کرد بەو شتە، (لَقَّاهُم: أَي أَعطاهُم)، پێیدان (لَقَّاهُم: أَي جَعَلَهُم يَلقَونَ)، وای لێکردن تووشی ئەوە بىن، یان ئەو شتە وەدەست بێنن، کەواتە: ﴿ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴾، یانی: خوا وای لێکردن ڕوو گەشیی و دڵخۆشییان بۆ بڕەخسێ.

(نَضْرَةً وَسُرُورًا): (النَّضْرَةُ: الحُسْنُ كَالنَّضارَةِ)، جوانیی و بە ڕەونەقیی، (وَنَضرَةُ النَّعِيم: رَونَقُهُ، وَنَضَرَ وَجهُهُ نَضْرةً، فَهُوَ ناضِرٌ)، (نَضرَةُ النَّعِيم) واتە: جوانیی و بەدەویی کە بەهۆی نازو نیعمەتەوە لە مرۆڤدا ڕەنگ دەداتەوە، دەگوترێ: (نَضَرَ وَجْهُهُ نَضْرَةً فَهُوَ نَاضِرٌ)، ڕووی دروەشایەوەو گەشایەوە، ئەو ڕوو گەش و ڕوو خۆشە، (السُّرُورُ: ما يَنكَتِمُ مِنَ الفَرَح)، (سُرُور): بریتیە لەو شادمانییەی شێردراوەیە لە دەروونی مرۆڤدا.

(مُّتَّكِـِٔينَ): (المُتَّكَأُ: المَكَانُ الَّذِي يُتَّكَأُ عَلَيْهِ)، (مُتَّكَأ): ئەو شوێنەیە شانی لەسەر دادەدرێ، لەسەری پاڵدەدرێتەوە، (إتِّكاءُ: جِلسَةٌ بَينَ الجُلُوسِ وَالإضطِجاعِ يَسْتَنِدُ فِيهِ الجالِسُ عَلَى مِرفَقِهِ وَجَنبِهِ وَيَمُدُّ رِجلَيهِ)، (إتِّكاء): دانیشتنێکە لە نێوان دانیشتن و پاڵکەوتن (ڕاکشان)دا، بابای دانیشتوو سەنگ دەداتە سەر ئانیشکی و سەر تەنیشتی و لاقەکانیشی ڕادەکێشێ، بە کوردیی دەڵێین: شان دادان، یاخود پاڵدانەوە، بەڵام ئەگەر ڕابکشێ، دیارە لەسەر تەنیشت یان لەسەر پشت ڕاکشاوە.

(عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ): (أَرَائِك) كۆی (أَرِيكَة)یە، (أَرِيكَة) پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (الواقعة)دا وردتر پێناسەمان کردوە، (سَرِيرٌ عَلَيهِ وِسَادَةٌ وعليها سِترٌ وَهُوَ حَجَلَتُهُ)، (أَرِيكَة) بریتیە لە تەختێك كە باڵنجێکی لەسەر بێ و، پەردەیەکی بەسەرەوە بێ کە پێی دەگوترێ: (حَجَلَة).

(زَمْهَرِيرًا): (الزَّمهَرِيرُ: البَردُ القَوِّيُّ وَشِدَّةُ البَرد)، (زمهرير) بە سەرمای زۆرو، بە بە زوقم دەگوترێ، سەرمایەکی سەخت، بە کوردیی دەگوترێ: سەرماو زوقم.

(وَدَانِيَةً): (أَي: قَرِيبَـةً)، نیزیکـن، (ظِلَالُهـا) سـێبەرەکان، کـە سـێبەرەکانی لـق و پۆپەکانـن، کەواتـە: لـق و پۆپـەکان نیزیکـن و شـۆڕبوونەوە بەسـەریاندا.

(وَذُلِّلَتْ ): (ذُلِّلَـت: أَي: سُـهِّلَت)، ئاسـانکراون و دەسـتەمۆ کـراون میوەکانیـان بەسـێنایی دەچنرێـن.

(قُطُوفُهَا): (قُطُـوف) کـۆی (قِطـف)ە، ئەویـش ئەوەیـە کـە دەچـنرێ، (قَطْـف) بریتیە لـە پرۆسـەی چنینەکـە، بـەڵام (القِطـف: المَقطُـوف) ئـەوەی دەچـنرێ و لێدەکرێتـەوە لـە میـوە، (قُطُـوف: جَمـعُ قِطـف، مـا يُجنَـى مِـنَ الشَّجَرَة)، (قطـوف) ئەوەیـە کـە لـە درەختەکـە دەچـنرێ و لێدەکرێتـەوە لـە میوەکـەی.

(بِئَانِيَةٍ ): (آنِيَـة: جَمـعُ إِنـاء، مـا يُوضَـعُ فِيـه الـشَّي ءُ، وَجَمـعُ الجَمـعُ أَوانِي)، (آنِيَـة) کـۆی (إِنـاء)ە، (إِنـاء) بـە کوردیـی دەڵێیـن: قـاپ، جـام، دەفـر، هـەر شـتێکە شـتێکی تێبکـرێ، بەزۆریـی بـۆ قـاپ بەکاردەهێـنرێ، کـە شـتێکی خەسـت و تونـدی تێبکـرێ وەك میـوە، یـان خـواردنی دیکـە، بـەڵام کـووپ و پـەرداخ ئەوانـەن شـتی شـلەمەنییان تێبکـرێ، شـەڕابە ئـاوە هەرچـی هەیـە، (إِنـاء) تاکـە، واتـە: قـاپ، دەفـر، جـام، بـە (آنِيَـة) کۆدەکرێتـەوە، بـەڵام (أَوانِي) کـۆی کـۆ: (جَمـعُ الجَمـع)ە.

(وَأَكْوَابٍ): (أَكـوَاب: جَمـعُ الكُـوب قَـدَحٌ لَا عُـروَةَ لَـهُ)، (أَكْـوَاب) کـۆی (كُـوب)ە، کـە بریتیـە لـە جامێـك، یـان پەرداخێـك هەنگڵـی نەبـێ، دەسـتەگیرەی نەبـێ، دەسـتی بگیـرێ.

(قَوَارِيرَاْ): (قَوَارِيـر: جَمـعُ قـارُورة)، (قَوَارِيـر) کـۆی (قارُورَة)یـە، (قـارُورَة) بـە شووشـە دەگوتـرێ، بـە شـتی ڕوون و بلووریـی دەگوتـرێ، (القَـارُورَةُ: وِعَـاءٌ مِـنَ زُجَـاجٍ تُحْفَـظُ فِيـهِ السَّـوَائِلُ وَوِعَـاءُ الطِّيـبِ)، (قـارُورَة) کۆیەکـەی (قَوَارِيـر)ە، دەفرێکـە لـە شووشـە، شـتی شـلەمەنیی تێـدا دەپارێـزرێ، هەروەهـا ئـەوەی بـۆنی خـۆشی تێـدا دەپارێـزرێ: شووشـەی گـوڵاو، شووشـەی میسـك.

(كَأْسًا ): (الـكَأْسُ: القَـدَحُ مَـادَامَ فِيـهِ الخَمْـر)، (كَأس) پەرداخێكـە مـەی تێدابـێ و مێینـەی مەجازییـە، هەروەهـا (كَأس) بـە خـودی مـەی و شـەڕابەكەش دەگوتـرێ.

(زَنجَبِيلًا ): (الزَّنجَبِيـلُ: نَبَـاتٌ مِـنَ الفَصِيلَـةِ الزَّنجْبارِيَّـةِ لَـهُ عُـرُوقٌ غِـلاظٌ تَـضْرِبُ فِي الأَرضِ حرِّيفَـةُ الطَّعـم)، (زَنجبيـل): ڕووەكێكـە لـە جـۆری ڕووەكـە زەنجبارییـەكان (لـە وڵاتی زەنجبـار هـەن) ڕەگـی گـەورەی هـەن بـە زەویـدا دەچنـە خـوار، تامەكـەی تیـژە، (شـێوەی بیبـەر).

(سَلْسَبِيلًا): (السَّلْسَبِيلُ: الـشَّرَابُ السَّـهْلُ المـرور فِي الحَلـقِ لعُذُوبَتِهِ، وَالسَّلسَـبِيلُ: الخَمرُ، وَسَلسَـبِيلُ: إِسـمٌ عَـينٍ فِي الجَنَّـةِ، أَو وَصـف لِـكُلِّ عَـينٍ عَذْبَـةٍ سَرِيعَـة الجـري)، وشـەی (سلسـبيل): زانایـان بەچەنـد واتایەكیـان لێكداوەتـەوە،

**یەكەم:** خواردنەوەیەكە بە ئاسانیی لە گەروو دەچێتە خوار، بەهۆی شیرینی و زوڵاڵییەوە، ئەمە مانا ئەسڵییەكەیەتی، لە (سَلس)ەوە هاتوە.

**دووەم:** سەلسەبیل جۆرێكە لە مەی (شەڕاب).

**سێیەم:** سەرچاوەیەكە لە بەهەشت.

**چوارەم:** ناوە بۆ ئاوی هەر كانیاوێك كە بە خێرایی دەڕوات و شیرن و زوڵاڵە.

(وِلْدَانٌ ): (وِلْـدَان) كـۆی (وَلِيـد)ە، بـە خزمەتـكاری گەنـج ولاو دەگوتـرێ كـە تـازە دەگاتـێ، لەبـەر ئـەوەی تەمەنەكـەی لـە لـە دایـك بوونـەوە نیزیكـە، نـەك تـازە لـە دایـك بووبـێ، كـە بەكەڵـكی خزمەتكـردن نایـەت، بەڵكـو مەبەسـت لاوی تـازە پێگەیشـتوویە.

(مُّخَلَّدُونَ): (مُخَلَّـد) هێڵـدراوە، ئاشكراشـە هەمـوو ئەوانـەی لـە بەهەشـت دان، دەهێڵدرێنـەوە، بـەڵام مەبەسـت ئەوەیـە بـە گەنجیـی و لاویـی دەهێڵدرێنـەوەو ناكەونـە تەمەنـەوە.

(لُؤۡلُؤٗا مَّنثُورٗا ): (اللُّؤْلُؤُ: الدُّرُّ، وَهُوَ يَتَكَوَّنُ فِي الأَصدافِ مِن رَوَاسِبَ أَو جَوَامِدَ صَلبَةٍ لَمَّاعَةٍ مُستَدِيرَةٍ فِي بَعْضِ الحَيْوَانَاتِ الدُّنيَا مِنَ الرَّخَوِيَّات، وَاللُّؤلُؤُ: جَمعٌ والمفرد: لُؤلُؤَة، وَتُجمَعُ اللُّؤلُؤَةُ بِا لَئَالِيء)، لە قورئاندا وشەی (لُؤلُؤ) هاتوە، (لُؤۡلُؤٗا مَّنثُورٗا )، (لُؤلُؤ) بەمانای گەوهەر دێ، لە نێو قۆزاخان دا لە مادده نیشتوو و ڕەقەکان کە بریقەدارن دروست دەبێ، شێوەیەکی خڕ وەردەگرێ، لە هەندێك لە ژیاندارە نەرمەکان دا کە لە دەریاکاندا هەن، پێشتریش باسمان کردوە لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو ژیاندارە مەترسییەکی بۆ دێ، جۆرە ماددەیەك دەڕێژێ لیکێك بۆ خۆ پاراستن و لە ئەنجامدا، ئەو لیکە بە دەوری ئەو تەنە نامۆیەی هاتۆتە نێو جەستەیەوە، قەتماغە دەبەستێ و دەبێتە ئەو گەوهەرە، کە دوایی دەیبینین بە نرخترین شتە لەو شتانەی تاکو ئێستا لە دەستی مرۆڤدا هەن، وشەی (لُؤلُؤ) کۆیەو تاکەکەی (لُؤلُؤَة)یەو، بە (لئَالِيء)یش کۆ دەکرێتەوە.

(عَٰلِيَهُمۡ ): (عَلَى فِي الإِرتِفَاعِ فِي الأَمْكِنَةِ وَالأَجْسَامِ، عَالِيَهُم أَي: فَوْقَهُم)، هەم بە (عَالِيَهُم) هەم (عَالِيهِم) خوێنراوەتەوە، وشەی (على) بە مانای بەرزبوّوە، بۆ شوێنەکان و بۆ جەستەکان بەکاردەهێنرێ، کەواتە: (عَٰلِيَهُمۡ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضۡرٞ وَإِسۡتَبۡرَقٞۖ ) واتە: لەدیوی دەرەوەیان لەسەر پۆشاکیان پۆشاکی ئاوریشمی تەنك و ئەستووری سەوز هەیە.

(سُندُس وَإِستَبرَق): ئاوریشمی تەنك و ئەستوور، تەنکەکە (سندس)ی پێ دەگوترێ و ئەستوورەکە (إِستَبرَق)ی پێ دەگوترێ، کە لە (ستبرك)ی فارسییەوە هاتوەو بە کوردییش دەڵێن: ئەستوور.

(وَحُلُّوٓاْ ): (جُعِلَ لَهُم حُلِيٌّ)، واتە: بۆیان کرا بە خشڵ، (وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٖ ) واتە: ڕازێندرانەوە، بۆیان کرا بە خشڵ، بازنە زیوینەکان.

(أَسَاوِرَ ): کـۆی (أَسـوِرَة)یە، ئەویـش کـۆی (سِـوَار)ە، بـە مانـای بـازن، کەواتـە: (أَسَاوِرَ): کـۆی کۆیـە، خـوا ﷻ لێـرەدا بـۆ پیـاوان و ئافرەتـان ئـەم تەعبیـرە بەکاردێنـێ کـە بـە بـازنی زیوییـن دەڕازێنرێنـەوە، لـە هەندێـك شـوێنی دیکـەدا فەرموویـەتی: بـازنی زێـڕ، یـان بـە گەوهـەر دەڕازێنرێنـەوە، هەندێـك لـە زانایـان وەك پێشـتریش بـاسی ئەوەمـان کـردوە، گوتوویانـە: واتـە: هاوسـەرەکانیان (ژنەکانیـان) دەڕازێنـەوە بـە بـازنی زێـڕو زیـوو بـە گەوهـەر، وایانزانیـوە کـە وەك چـۆن زێـڕو زیـو لـە پیـاوانی ئۆممـەتی پێغەمبـەر ﷺ لـە دنیـادا قەدەغەیـە، بەهەشـتیش وەك دونیایـە! بـەڵام لـە بەهەشـتدا هەرچـی لـە دونیـادا قەدەغـە بـووە لـە نـازو نیعمەتـەکان، هەمـووی ڕەوایـە، یەکێـك لەوانـە شـەڕاب، کـە لـە دونیـادا قەدەغەیـە لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ سـەرخۆش دەکات و سـەر ئێشـە و دەرهاویشـتەی خراپـی هەیـە، بـەڵام شـەڕابی بەهەشـت خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ١٩ ﴾ **الواقعة**، نـە سەرئێشـەی پـێ دەگـرن، نـە عەقڵیـشی پـێ لەدەسـت دەدەن، کەواتـە: لێـرە کـە بـاسی بـازنی زیـو دەکات و، لـە شـوێنی دیکـە بـاسی بـازنی زێـڕ دەکات، بـۆ پیـاوان و ئافرەتانیشـە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ ئـەم سـوورەتە موبارەکـەش وەك تێکـڕای سـوورەتەکانی دیکـەی قورئـان، بـەو ڕسـتە موبارەکـە دەسـت پێـدەکات: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، جگـە لـە سـوورەتی (التوبـة) (البرائـة) کـە ئـەو ڕسـتە موبارەکـەی لەپێشـەوە نیـە:

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بــە نــاوی خــوای بــە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، مەبەسـتیش ئەوەیـە:

١ - ئەم کارە تەنیا بە ناوی خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم

ئنجـا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا﴾، ڕواڵـەتی واتایەکـەی ئاوایـە: ئایا بەسـەر مرۆڤـدا هاتـوە ماوەیـەك لـە کات کـە شـتێکی باسـکراو نەبووبـێ؟ بـەڵام زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن کـە ﴿هَلۡ﴾، هەرچەنـدە ئامـرازی پرسـیار کردنـە (أَداةُ الإسـتِفهام)، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی پرسـیار کردنێـك نیـە کـە لـە بەرانبەریـدا چاوەڕوانیـی وەڵام بکـرێ، بەڵکـو پرسـیار کردنێکـە کـە لایەنـە بەرانبەرەکـە دانی پێـدا بێنـێ. (إسـتِفهامٌ تَقرِيـري)، واتـە: لایـەنی بەرانبـەر ناچـارە دانی پێـدا بێنـێ، (إقـرار) واتـە: دان پێـدا هێنـان، بـەڵام (تَقرِيـر) یـانی: بەرامبەرەکـەت وا لێبکـەی دانی پێـدا بێنـێ. (دانپێپێداهێنـان)، هیـچ کەسـیش نکوولیـی لـەوە نـاکات کـە کاتێـك بـووە مـرۆڤ نەبـووە، چ وەك تـاك تـاکی مرۆڤـان، چ وەك تێکـڕای مرۆڤـان، هەڵبەتـە بـەر لـەوەی زانسـت بـەرەو پێشـەوە بچـێ کاتی خـۆی لـە ڕۆژگارانی زوودا، ئەوانـەی پێیـان گوتـراوە: (الدهریـون) یـان (زنادقـة)، کـە

ئێستا پێیان دەگوترێ: (**الملحدون**)، ئەوانە پێیان وابووە کە مرۆڤ لەسەر زەوی هەر بووەو بێ سەرەتایە، بەڵام زانستی ئێستا گاڵتەی بەو قسەیە دێ، بەڵکو گاڵتەی بەوەش دێ کە بڵێی زەویش هەر بوو (**أزلي**) بووە، زەویش تەمەنێکیان بۆ دیارییکردووەو دەڵێن: زەوی دەوری چوار ملیارو هەشتسەد ملیۆن ساڵ لەوەو پێش لەخۆر جیا بۆتەوە، بەڵکو خۆریش بەهەمان شێوەو دەڵێن: دەوری پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش پەیدابووە، بەڵکو گەردوونیش و دەڵێن: سێزدە ملیارو حەوتسەد هەشتسەد ملیۆن ساڵ لەمەو پێش، لە شتێکی زۆر بچووکەوە بەناوی: تاکی گەردوونیی، هێلکەی گەردوونیی، تۆوی گەردوونیی، بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن: (سینگۆلاریتی **sungolarity**)، تەقیوەتەوەو گەردوونی لێ دروست بووە، ئەوەش پێی دەگوترێ: بیردۆزەی تەقینەوەی مەزن، (**نظرية الإنفجار العظيم**) (**bing bang**) کە نوێترین و پشت پێ بەستراوترین بیردۆزەیە بۆ دروستبوونی گەردوون و سەرەتای گەردوون، کەواتە: ئەم گەردوونە کاتێك بووە هیچی هەر نەبووە، نەك تەنیا خۆر و کۆمەڵەی و خرۆکەی زەوی، چ جای مرۆڤ[1]، ئەوانە هەموویان نەبوون (**عدم**) پێش بوونیان کەوتوە.

بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ هَلْ ﴾، بەمانای (**قَد**)ە، یانی: (**قَد أَتَى عَلَى الإنسانِ حِينٌ مِنَ الدَّهرِ**)، بە دڵنیایی کاتێك بەسەر مرۆڤدا تێپەڕیوە ﴿ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴾، شتێکی باسکراو نەبووە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (ناوی لە کوولەکەی تەڕدا نەبووە)، یانی: بوونی نەبووە، شتێك کە بوونی نەبوو، ناویشی نابێ و باسیش ناکرێ.

﴿ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ ﴾، ئێمە مرۆڤمان لە نوتفەیەکی تێکەڵ (ئاوێتە) دروستکردوە، تاقیدەکەینەوە، ﴿ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾، بۆیە گێڕاومانە بە بیسەر و بینەر، مرۆڤ لە نوتفەوەوە هاتوە (**نطفة**)ش بە: (**مَاءٌ**

---

(١) پێشتیش باسمان کرد، ڕاسترین ڕاو بیردۆزیش لەبارەی پەیدابوونی مرۆڤەوە لەسەر زەوی، ئەوەیە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٣٠٠ ٠٠٠-١٠٠ ٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا.

قَلِيل)، ئاوێكی كەم (تنۆكە ئاوێك)، ماناكراوە، كە ئێستا زانست دەریخستوە مرۆڤ لە هەموو تنۆكە ئاوەكەش دروست نابێت، هەر وەك پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ} (**أخرجه مسلم: ٣٦٢٧**)، لە هەموو ئاوەكە مرۆڤ دروست نابێ، هەركاتێكیش خوا شتێكی ویست هیچ شتێك ڕێی لێ ناگرێ. بەڵكو لە بەشێكی زۆر كەمی، دروست دەبێ زیندەوەرێكی تۆویی (**حَيوانٌ مَنَوي**) و هێلكۆڵەی نێو ئاوی ئافرەت (**بُوَيضَة**)، ئەو دووانە یەكدەگرن و نوتفەیان لێ پێك دێ، ئەو نوتفەیەش دەچێتە نێو منداڵدانەوەو لەوێدا قۆناغەكانی: (**نُطفَة**) و (**علقة**)و (**مُضغَة**) و ... هتد، ئەو قۆناغانە هەموویان دەبڕێ و دوایی دەبێتە كۆرپەلە (**جنين**)و لە دایك دەبێ، وەك لەسەرەتای تەفسیری سوورەتی (**المؤمنون**)دا، باسێكی تا ڕاددەیەك تێرو تەسەلمان لەبارەی چۆنیەتیی دروستبوونی مرۆڤەوە كردوە، هەم ئادەم و حەووا و هەم وەچەكەیان.

﴿ إِنَّا هَدَيْنَـٰهُ ٱلسَّبِيلَ ﴾، ئێمە ڕێیەكەمان پێشان دا، واتە: ڕێی ڕاستمان پێشان داوە ﴿ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾، ﴿ إِمَّا ﴾، بۆ درێژەدان بە قسەو ڕوونكردنەوەی قسە بەكاردەهێنرێ، ﴿ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾، یان سوپاسگوزار دەبێ، یان سپڵەو ناسپاس دەبێ، ئەگەر ئەو ڕاستە ڕێیەی خوا پێشانی داوە، بیگرێتە بەرو هیدایەتی خوا قبووڵكا، ئەوە سوپاسگوزار دەبێ و، ئەگەر هیدایەتەكەش ڕەفز بكات، ئەوە سپڵەو ناسپاس و سەرگەردان و بێ مراد دەبێ.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی سەرەنجامی هەر كام لەوانەی سپاسگوزار دەبن، یان سپڵەو ناسپاس دەبن، بەڵام سپڵەو ناسپاس و بێبڕوایان پێش دەخات و بەیەك ئایەتیش دەیبڕێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ سَلَـٰسِلَا۟ وَأَغْلَـٰلًا وَسَعِيرًا ﴾، ئێمە بۆ بێبڕوایان زنجیرەكان و كۆت و پێوەندەكان و كڵپەی ئاگرمان ئامادە كردوە، خوا ﷻ زۆر بە كورتیی باسی ئەو سزاو جەزرەبەیە دەكات، كە چاوەڕێی بێبڕوایان دەكات، بێبڕوایانێك كە سپڵەو ناسپاس دەبن و هیدایەتی خوا ڕەفز دەكەن

و، ڕاستە ڕێی خوا ناگرنە بەر، سەرەنجام لە تاقیکردنەوەیەك دا کە خوا ئەوانی تێخستوە، دەکەون و دەرناچن و، لەسەر بوونەکەی خۆیان قەرزدار دەبنەوە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی پاداشتی سوپاسگوزاران کە بە (**أبرار**) (چاکەکاران) ناویان دەبات و، لە ئایەتی (٤) هەتا کۆتایی ئایەتی (٢٢)، چەند شتێکی دیکەشی نێواخن کراون، ئەگەرنا ئەو (١٨) ئایەتە هەمووی باسی پاداشتی چاکەکارانە.

﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴾، بە دڵنیایی چاکەکاران لەپێکێك دەخۆنەوە ئاوێتەکانی کافوورە، وشەی ﴿ كَأۡسٖ ﴾، هەم بەو دەفرە دەگوترێ کە شلەمەنییەکی پێ دەخورێتەوە، بەتایبەتی مەی (**خمر**) هەم بە خودی خواردنەوەو شەڕابەکەش دەگوترێ، (**مِزاج**)یش یانی: (**ما يُمْزَجُ بِشَيء**)، ئەوەی لەگەڵ شتێکدا تێکەڵ دەکرێ، واتە: ئەو شەڕابەی دەیخۆنەوە، کافووری لەگەڵ تێکەڵ کراوە، کافووریش وەك دوایی باسی دەکەین ماددەیەکی سپییە، لە جۆرە درەختێك پەیدادەبێ یەکیان سپییەو زۆریش بۆنخۆشە، بێگومان هەموو ئەو شتانەش کە خوا باسیان دەکات، لە بەهەشتدا، جیان لەوەی دنیا، چونکە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: کافوور تامەکەی تاڵە، بەڵام هەرچییەك خوا لەبەهەشتدا باسی دەکات، تەنیا لەناودا لەگەڵ ئەوانەی دونیا یەك دەگرنەوە، وەك عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گوتوویەتی.

خوا ﷻ باسی ئەو شەڕابە دەکات کە ئەوان ئەو پێکەی لێی دەخۆنەوەو کافووری لەگەڵ تێکەڵ کراوە، دەفەرموێ: ﴿ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ ﴾، سەرچاوەیەکە بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوە، بۆچی دەفەرموێ: ﴿ يَشۡرَبُ بِهَا ﴾؟

أ- هەندێك گوتوویانە: ﴿ بِهَا ﴾، یانی (**منها**)، ئەم (**ب**)ە بە مانای (من)ە، چونکە پیتەکان جار جار شوێنی یەکدی دەگرنەوە، (**ب**) لەجیاتی (من) بەکار دێ و (من) جاری وایە لەجیاتی پیتێکی دیکە بەکار دێ، هەندێك لە زانایان وایان لێکداوەتەوە.

**ب-** بەڵام هەندێكیان گوتوویانە: ﴿يَشْرَبُ بِهَا﴾، ﴿يَشْرَبُ﴾، خۆی بە (من) بەركار دەخوازێ، بەڵام لێرەدا بۆیە بە (**ب**) بەركاری خواستوە، تاكو وێڕای مانایەكەی خۆی كە بریتیە لە خواردنەوە، مانایەكی دیكەشی بخرێتە نێوو وە خۆی بگرێ، كە بریتیە لە: تێر ئاو بوون (**إرتواء**)، یانی: (**يَشرَبُ وَيَرتَوِي بِها عِبَادُ الله**)، ئەو سەرچاوەیەی لێی دەخۆنەوەو پێی تێر ئاو دەبن، بەندەكانی خوا، ﴿يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾، خۆیان شەقی دەكەن و ئاوەكە دەبەن، (**تَفجِير**) لە (**فَجر**)ەوە هاتوە، واتە: شەقكردن و لەتكردن، واتە: ئاوەكە دەگوازنەوەو جێگۆڕكێی پێ دەكەن بە جێگۆڕ پێكردنێكی سەرسوڕهێنەر، بۆ هەر شوێنێكی بیانەوێ، دەیبەن.

ئنجا خوا ﷻ باسی چەند كردەوەیەكی باشیان دەكات و، چەند كردەوەیەكی باش نێواخن دەكات لەگەڵ نازو نیعمەتەكانی بەهەشتدا، تاكو بزانرێ خوا لە گۆترە ئەوانە ئاوا پاداشت ناداتەوەو، هەروەها لە گۆترەش بێبڕوایەكان سزا نادات، چونكە كارەكانی خوا هەموویان لەجێی خۆیاندان، دەفەرموێ: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ﴾، ئەوانە لە خۆگرتنیان جێبەجێ دەكەن، (**نذر**) هەر شتێكە ئینسان لەخۆی دەگرێ، (**النَّذرُ: أَن يُوجِبَ الإنسانُ عَلَى نَفسِهِ ما لَيسَ بِواجِبٍ، تَقَرُّباً إلى اللهِ سُبحانَهُ وَتَعَالَى**)، نەزر ئەوەیە ئینسان شتێك لەسەر خۆی پێویست بكات، كە لە ئەسڵدا لەسەری پێویست نیە، تاكو خۆی پێ لە خوا نیزیك بكاتەوە، بە كوردیی دەگوترێ: لە خۆگرتن، ئەوەی لە خۆیانیان گرتوە جێبەجێی دەكەن، ﴿وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾، لە ڕۆژێكیش دەترسێن زەرەرو زیانەكەی زۆر بەربڵاوە، تەشەنە سەندوویە.

﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾، خواردنێك لەگەڵ خۆشویستنیشیدا، (لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەو خواردنەیان خۆشدەوێ) دەرخواردی نەدارو هەتیوو دیلی دەدەن، نەیفەرموە: (**يُؤتُونَ الطَّعام**)، لە قورئاندا بەزۆریی وشەی: (**يُطعِمُونَ**) بەكارهاتوە، واتە: ئەو كەسە دادەنێن و خواردنەكەی دەرخوارد دەدەن، یانی: تەنیا ئەوە نیە خواردنەكەی پێ بدەن، بەڵكو دایدەنێن

بەڕێزو حورمەتەوەو خواردنەکەی دێننە پێشێ، چونکە ئەگەر تەنیا خواردنەکەیان وێبدەن، تەنیا جەستەو گەدەیانیان تێر کردوون، بەڵام ئەگەر بەڕێزو حورمەتەوە دایانبنێن و دوو قسەی خۆشیشیان لەگەڵ بکەن و خواردنەکەشیان پێ بدەن، ڕووحیشیان تێر کردوون، کە نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا ئاماژە بەوە بکرێ: بۆچی خوا ﷻ بەزۆریی وشەی **(إطعام)** بەکاردێنێ، دەرخوارد دان؟ چونکە لە نیزیکەوە دایاندەنێن لە شوێنی خۆیان و خواردنەکەیان بۆ دادەنێن، لەبەر ئەوەی مرۆڤ بەر لەوەی جەستە بێ، ڕووحە، ڕووحەکەشی پێویستیی بە تێر کردن هەیەو، بە ڕێز لێگرتن ڕووحەکە تێر دەبێ، ئنجا خواردنەکەشیان دەدەنێ بۆ جەستەیان.

ئنجا کە ئەو خواردنەشیان پێدەدەن لەبەر خۆیانەوە دەڵێن: ﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ ﴾، ئەم قسەیە زۆربەی هەرە زۆری تەفسیرەکان دەڵێن: لە دڵی خۆیاندا وایان گوتوە، بەڵام خوا دەریخستوە، چونکە کەسێك کە هاوکاریی دەکەی، ئەگەر بڵێی: لەبەر خوا هاوکارییت دەکەم، ڕەنگە لەسەر دڵی قورس بێ، هەرچەندە لەبەر خوایە، بەڵام نابێ وا بگوترێ، بۆیە دەبێ بڵێین: لەبەر خۆیانەوە وایانگوتوە، یان لە دڵی خۆیاندا وایانگوتوە، بەڵام خوا ﷻ ئاشکرای کردوە.

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: بۆیە وادەڵێن تاکو بیکەنە پاساوو بەڵگەی ئەوەی پێیان وانەبێ هیچ چاوەڕوانییەکیان لێیان هەیە، ﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ ﴾، تەنیا لەبەر ڕووی خوا، لەبەر ڕەزامەندیی خوا، یاخود بە مەبەستی بە دیدار گەیشتنی خوا لە بەهەشتدا، ئێمە ئەو خواردنەتان پێ دەدەین ﴿ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴾، نە پاداشتمان لێتان دەوێ نە سوپاسکردن، واتە: نە چاکە دانەوەی ماددیی، نە چاکە دانەوەی مەعنەویی، هیچ کامیانمان لێتان ناوێ.

ئنجا هەرچەندە ئەگەر وەك بەڵگە هێنانەوەی ئەوە گوترابێ، کە هیچ چاوەڕوانییەکیان لێیان نیە، ئەوەش ڕێی تێدەچێ، بەڵام زیاتر ئەو مانایە ڕاستە کە لە دڵی خۆیاندا وایان گوتبێ، یان لەبەر خۆیانەوە وایانگوتبێ.

﴿ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴾، ئێمە ترسی ڕۆژێكی گرژی سەختمان هەیە لە لایەن پەروەردگارمانەوە، واتە: ئەو ڕۆژە ڕوو گرژو سەخت و بێڕەزایەی پەروەردگارمان دەیهێنێتە پێش، ئێمە ترسی ئەو ڕۆژەمان هەیە، بۆیە هەرچی پێمان وابێ لە مەترسیی ئەو ڕۆژەمان دوور دەخاتەوەو، لە سزاو جەزرەبەی خوا دەمانپارێزێ، ئەنجامی دەدەین و، یەكێك لەو كارانەش بریتیە لە خێرو چاكەو هاوكاریی كردنی خەڵك.

﴿ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ ﴾، لە ئەنجامی ئەوەش دا، خوا لە خراپەی ئەو ڕۆژە چەپاڵەی دان و پاراستنی ﴿ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴾، (**لَقَّاهُم: أَي جَعَلَهُم يَلقَونَ**)، وای لێكردن بگەنە ڕوو گەشیی و دڵخۆشیی، ﴿ نَضْرَةً ﴾، واتە: درەوشاوەیی دەم و چاو، گەشیی دەم و چاو، ﴿ وَسُرُورًا ﴾، (**سرور**) (**فَرَحٌ مُنكَتِمٌ فِي القَلب**)، دڵخۆشییەك كە لە دڵدا شێردراوە بێ، هەمیشەش مرۆڤ كە دڵی خۆش بوو، ڕووشی گەش دەبێ، كەسێكیش دڵی پڕ خەفەت و مەینەتیی بوو، دەم و چاویشی تاریك دەبێ و ڕەش دادەگەڕێ و، تەمی خەمی لێ دەنیشێ.

ئنجا خوا ﷻ دێتەوە سەر باسی پاداشتی ئەو چاكەكارانەو دەفەرموێ: ﴿ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴾ بە هۆی خۆڕاگرییانەوەش باخ و ئاوریشمی بە پاداشت دانەوە، ﴿ جَنَّةً ﴾، واتە: باخێكی زۆر ناوازە، چونكە بە نەزانراو (نكرة) هاتووە، واتە: باخێك كە لە وەسف نایەت، هەمیشە خوای بەرز كە هەندێك شت بە نەناسراو دێنێ، بۆ ئەوەیە سەرنجمان بۆ ئەوە ڕابكێشێ كە ئەو شتە وەسف ناكرێ، یانی: باخێكی زۆر ناوازە ﴿ وَحَرِيرًا ﴾، هەروەها ئاوریشمێكی ناوازەش، ئەو ئاوریشمەش بۆ بەرگ و پۆشاكیان، بۆ نوێن و پێخەفیان، بۆ هەموو ئەو كەل و پەلانەی بەكاریان دێنن و قوماشیان پێویستە، ئەوانە سەرتاپایان و سەرلەبەری شتەكانیان ئاوریشمە، ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ﴾، لەوێدا پاڵیان داوەتەوە شانیان داداوە لەسەر تەختان، (**أرائِك**) كۆی (**أَرِيكَة**)یە، واتە: تەختێك كە داندراوە بۆ لەسەر پاڵدانەوەو شان لەسەر دادان، ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ ﴾، كۆی (**مُتَّكِئ**)

ە، ئەویش کەسێکە شانی داداوە، بە کوردیی دەڵێن: شان دادان، یان پاڵدانەوە، کە بریتیە لە حاڵەتێك لە نێوان دانیشتن و ڕاکشاندا، ئەویش ئەوەیە: مرۆڤ سەنگ دەداتە سەر ئانیشکی و سەر تەنیشتی و هەردووك لاقەکانی ڕادەکێشێ، واتە: وانیە کە دابنیشێ چوار مەشقیی، هەروەها واش نیە کە ڕابکشێ لەسەر پشت، یان لەسەر تەنیشت، بەڵکو نیوەی یەکەمی جەستەی بەرز دەبێ و نیوەی دووەمیشی ڕادەکێشێ، ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا ﴾، لەو بەهەشتەدا ﴿ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ ﴾، لەسەر تەختان ﴿ لَا يَرَوۡنَ فِيهَا شَمۡسٗا وَلَا زَمۡهَرِيرٗا ﴾، لەوێدا (بەهەشتدا) نایبینن ڕاناوەکە بۆ بەهەشت دەچێتەوە، بۆ باخەکە ﴿ شَمۡسٗا ﴾، خۆر نابینن ﴿ وَلَا زَمۡهَرِيرٗا ﴾، هەروەها سەرماو زوقمیش نابینن، کەش و هەوای بەهەشت وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووەو لە ئایەتەکانیشدا دەردەکەوێ، نە سەرمایە، مرۆڤ پێویستیی بەوە بێ خۆی لێ بپارێزێ و، نە گەرماشە پێویستیی بە خۆ فێنککردنەوە بێت، لە شوێنەوارێکدا هاتووە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه گوتوویەتی: {الْجَنَّةُ سَجْسَجٌ لاَ قَرَّ فِيهَا ، وَلاَ حَرَّ} **(أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٥١٠٣)**، کەش و هەوای بەهەشت وەك ئەو کاتەیە کە لە کەشێکی خۆشی ساڵدا، لای بەرە بەیان یان لای ئێوارە، شەماڵ و شنەیەکی بای فێنك دێ، نە وایە سەرما بێ و، نە واشە گەرما بێ.

﴿ وَدَانِيَةً عَلَيۡهِمۡ ظِلَٰلُهَا ﴾، سێبەرەکانی (ئەو باخە) لێیان نیزیکن، هەڵبەتە سێبەرەکان هی لق و پۆپەکانن، کەواتە: لق و پۆپەکان شۆڕ بوونەوە بەسەریانداو سێبەریان بەسەردا کردوون، ئەگەرنا بەهەشت گەرمای لێ نیە، تاکو خەڵك پێویستیی بە بەر سێبەر بێ، کەواتە: لێرەدا ﴿ ظِلَٰلُهَا ﴾، مەبەست پێی لق و پۆپەکانی دارو درەختەکانە، وەك لە سوورەتی (الرحمن)دا دەفەرموێ: ﴿ ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ٤٨ ﴾ **الرحمن**، هەردووك باخەکان خاوەن لق و پۆپ و چڵی نەرم و ناسکن. ﴿ وَذُلِّلَتۡ قُطُوفُهَا تَذۡلِيلٗا ﴾، **(قُطُوف)** کۆی **(قِطف)**ە، یانی: چنراو ئەوەی دەچنرێ، یانی: **(جَنَى)**، چنراوو میوەی لێکراوەی ئەو درەختانە، **(ذُلِّلَت)** واتە: **(سُهِّلَت)** ئاسانکراون، شۆڕ بوونەوە بە شۆڕ کردنەوەیەکی نایاب.

﴿ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ ﴾، قاپانێکی لە زێڕیان بەسەرەوە دەگێڕدرێن، (آنِيَة) کۆی (إِناء)ە، قاپ، دەفر، (أَواني)یش کۆی کۆیە، (إِناء) بریتیە لە دەفرێك خواردنی تێدا بێ، ئنجا میوەی تێدایە گۆشتی تێدایە، بە دەفرانی زیوین بەسەریانەوە دەگێڕدرێ، بێگومان دەفرەکانیش خاڵیی نین و شتیان تێدایە، بۆیە بەسەریانەوە دەگەڕێن.

﴿ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴾، (أَکواب) کۆی (کوب)ە، واتە: گۆزە و سوراحیی ئەوەی شلەمەنییەك شەرابێکی تێدایەو لێیەوە دەکرێتە نێو کاسەکانەوە (پەرداخەکانەوە)، هەندێکیش گوتوویانە: (أَکواب) هەر خودی پەرداخەکانن ﴿ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴾، کووپەکانیش لە شووشەن، یاخود لە ماددەیەکی بلوورین ﴿ قَوَارِيرَا۠ مِن فِضَّةٍ ﴾، شووشانێك لە زیو، بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەو شتانەی خوا باسی کردوون لە بەهەشتدا، ئەگەر هەموویان وێنەیان هەبێ لە دنیادا، بەڵام ﴿ قَوَارِيرَا۠ مِن فِضَّةٍ ﴾، وێنەی نیە، چونکە ئێمە شووشەی زیوینمان نەبینیوە، ئەگەر شووشە بێ شووشەیەو، ئەگەر زیو بێ زیوە، ئنجا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: شووشەیە، بەڵام وەك زیو سپییە، چونکە (قَوارِير) کۆی (قارُورَة)یە، ئەویش بریتیە لە شووشەیەك کە بۆنی خۆشی تێ دەکرێ، یاخود شلەمەنییەکی کەم و گرانبەهای تێدا هەڵدەگیرێ، ﴿ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴾، ئەوانە ئەو شتەی تێیان کردوە، ئەو شەرابە، ئەو خواردنەوەیە، ئەندازەگیرییان کردوە بە ئەندازەگیرییەکی ڕێك، واتە: هەر کەسە چەندەی پێ دەخورێتەوە، چەندەی ئارەزوویە، ئەوەندەی بۆ تێکراوە، نەك زیاد بێ و پێی نارەحەت بێ و ناچاربێ بیخواتەوە، یاخود کەم بێ و هی دیکەی پێویست بێ و بڵێ: دووبارە بۆم تێبکەنەوە.

﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴾، هەروەها پێکێکیان شەراب دەدرێتێ، کە زەنجەبیلی لەگەڵ تێکەڵ کراوە، ﴿ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴾ (ئەو پێکە شەرابە خواردنەوەیەی دەیاندرێتێ) لە سەرچاوەیەکە لەوێدا (لە باخەکەدا، لە

بەهەشتدا) پێی دەگوترێ: سەلسەبیل، ئەمیش وەك دواتریش باسی دەکەین واتە: شلەمەنییەك کە بە ئاسانیی لە گەروو بچێتە خوارو، زۆریش خۆش و بە تام و زولاڵ بێ.

﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴾، لاوانێکی هێڵراوە (بە گەنجیی و بە لاویی هێڵراوە) بەسەریانەوە دەگەڕێن، (**وِلدَان**) کۆی (**وَلِيد**)ە، ئەمیش هەرچەندە (فعیل)ی بە مانای (مفعول)ە، یانی: لە دایك بوو، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە کە تەمەنیان هەڵنەکشیوەو لاوو گەنجن و تازە دەگەنێ، ﴿ مُّخَلَّدُونَ ﴾، کۆی (**مُخَلَّد**)ە، ئەمیش هەرچەندە هەندێکیان گوتوویانە: یانی: بازنەیان لە دەست کراوەو، هەندێکیان گوتوویانە: گوارەیان لە گوێ دایە، بەڵام (**مُخَلَّد**) واتە: هێڵراوە، یانی: (**مُبَقَّونَ**)، هێڵراونەوە، واتە: هەر بە گەنجیی دەهێڵرێنەوەو تەمەنیان بەسەردا ڕەت نابێ، هەڵبەتە بەهەشتییەکان هەموویان هەر وان، بەڵام ئەوانەی خزمەت دەکەن، ئینسان وای لە قالب خۆشترە کەسێك کە خزمەتی دەکات، تەمەنی کەم بێ، بۆ ئەوەی پێی سەغڵەت نەبێ، فەرمانی پێ بکات: ئەوەم بۆ بکەو ئەوەم بۆ مەکە! ﴿ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴾، ئەگەر تۆ ئەو لاوانەی خزمەتیان دەکەن، بیانبینی پێت وایە گەوهەری پڕژێندراون، گەوهەری پڕژو بڵاون، گەوهەرو مرواریی کە لە سپیی و سافییان دەدرەوشێتەوە، ئەو گەنج و لاوە خزمەت چییانە، وەك گەوهەری پڕژێنراوو بڵاوکراوە دێنە بەر چاو، ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ ﴾، ئەگەر تۆ ئەوێ ببینی، ﴿ ثَمَّ ﴾، یانی: (**هُنَاكَ**)و زەرفی شوێن (**ظرف مكان**)ە، یانی: (**إِذَا رَأَيتَ هُنَاكَ**)، ئەگەر ئەوێ ببینی ﴿ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴾، نازو نیعمەتێکی زۆرو موڵك و دەستڕۆیشتوویەکی زۆر، دەبینی، لێرەدا (**ملك**) بەمانای دەستڕۆیشتووێتییە، واتە: وەك چۆن حوکمڕانێك، پادشایەك قەڵەمڕەوییەکی زۆر لەبەر دەستی دا هەیە، تۆش بابای بەهەشتیی بەوجۆرە دەبینی، هەڵبەتە ئەوەش بۆ نیزیکخستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە، ئەگەرنا بەهەشت لەگەڵ دونیادا بەراورد ناکرێ.

﴿ عَٰلِيَهُمۡ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضۡرٞ وَإِسۡتَبۡرَقٞۖ ﴾، ﴿ عَٰلِيَهُمۡ ﴾، یانی: (**فوقهُم**)، لەسەرروویانەوە، پۆشاكی ئاوریشمی تەنكی سەوز، هەروەها ئاوریشمی ئەستووری سەوز هەیە، واتە: پۆشاكەكەیان كە لەسەرەوەیانەو بەخۆیانی دادەدەن، ئاوریشمە، چ تەنك، چ ئەستوور، بەڵام بە ڕەنگی سەوز ﴿ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٖ ﴾، ڕازێنراونەوەش بە بازنە زیوییەكان ﴿ وَسَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ شَرَابٗا طَهُورًا ﴾، پەروەردگاریشیان خواردنەوەیەكی زۆر پاك و پاككەرەوەی پێدان.

﴿ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمۡ جَزَآءٗ ﴾، پێیان دەگوترێ: ئەوە پاداشتی ئێوە بوو، لەسەر كردەوەكانی ڕابردووتان ﴿ وَكَانَ سَعۡيُكُم مَّشۡكُورًا ﴾، هەوڵدان و تێكۆشانەكەشتان سوپاسكراو بوو، نرخێندراو بوو، بە هەند گیراو بوو.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**کاتێـکی زۆر پێـش دروسـتکرانی مـرۆڤ تێپەڕیـوە، شـتێکی باسـکراو نەبـووە، دوایـی خـوا پـاش دروسـتکردنی (ئـادەم لـە خـاك و) وەچەکـەی لـە تۆویلکەیـەکی ئاوێتـە بـە مەبەسـتی تاقیکردنـەوە، دروسـتیکردو بـە بیسـەرو بینـەری گێـڕاو، ڕاسـتەڕێی پێشـاندا، چ سوپاسـگوزار بـێ، چ سـپڵەو ناسـپاس:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ ﴾، ئایا ماوەیەك لە کات بەسەر مرۆڤدا تێپەڕیوە؟ ئەم پرسیار کردنە پرسیار کردنی پێپێلێنان، پێ چەسپاندن (**إِسْتِفْهامٌ تَقرِيرِي**) ەو، ئاڕاستەی کەسێکی نادیارییکراو کراوە، مەبەستیش پێی چەسپاندنە، واتە: بە دڵنیایی ماوەیەك لە ڕۆژگار بەسەر مرۆڤدا تێپەڕیوە.

٢)- ﴿ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ﴾، کە شتێکی باسکراو نەبوو، (**أَيْ: كَانَ مَعْدُومًا فِي زَمَنٍ سَبَقَ، والْمَعْدُومُ لاَ يُذْكَرُ**)، واتە: نەبوو بووە لە ماوەی ڕابردوودا پێش ئەوەی دروست ببێ، شتی نەبووش باس ناکرێ و ناوی ناهێندرێ، ﴿ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ﴾، (**شَيْئا**) شتێك (**مَذكُوراً**) یانی: (**الْمُعَيَّنُ الَّذِي هُوَ بِحَيْثُ يُذْكَرُ**)، شتێکی دیارییکراو کە باس بکرێ، کەواتە: ماوەیەکی زۆر کە بەس خوا دەیزانێ، بەسەر تاك تاکی مرۆڤان و تێکڕای مرۆڤاندا تێپەڕیوەو لەپێش واندا ماوەیەکی زۆر تێپەڕیوە، بگرە ماوەیەکی بێکۆتایی، چونکە خوا

ﷻ بوونەکەی بێ سەرەتایە، کەواتە بێ سەرەتا کات (**وقت**) تێپەڕیوە، کە مرۆڤ شتێك نەبووە بوونی ببێ، باس بکرێ و ناوی بهێنرێ، واتە: ئەی مرۆڤ! بەبێ کۆتایی و سنوور کات تێپەڕیوە، تۆ نەبووی، ئێستاش لە ماوەیەکی دیارییکراودا دەبی و بوونێکت پێ دەدرێ، دوایی دووبارە لەڕووی جەستەییەوە نەبوون (**عدم**)ت بەسەردا دێتەوە!

ئنجا ئەی مرۆڤ! خوایەك ﷻ بەبێ سەرەتا کاتی بەسەر تۆدا گوزەراندبێ، دوایی تۆی دروست کردبێ، لە ماوەیەکی کەمی کاتدا دەبی، کە تەمەنە دونیاییەکەتە، ئنجا ئەو تەمەنەت کە دەڕوات و ئەو قۆناغەی دنیات بەسەر دەچێ، ئایا دەگونجێ پێت وابێ زەحمەتە جارێکی دیکە خوا لە قۆناغێکی دیکەدا، بە شێوەیەکی دیکە بوونت پێ بداتەوە؟ بەدڵنیایی نەخێر، بۆیە زانایان لێرەدا گوتوویانە: (**هَل: فِي الاِسْتِفْهَامِ مِثْلُ (قَدْ) فِي الْخَبَرِ**)، ﴿ هَلۡ ﴾، لە پرسیار کردندا وەك (**قَد**) وایە، لە هەواڵدان دا، وەك: (**قَد جَآءَكُم رَسُولٌ مِن رَبِّكُم**)، (**قَد**) بۆ ساغکردنەوەیە دەڵێن: ﴿ هَلۡ ﴾، لە پرسیار کردندا، هەمان مانای (**قَد**) دەگەیەنێ لە هەواڵداندا، کەواتە: بە دڵنیایی کاتێکی زۆر بەسەر مرۆڤدا تێپەڕیوە شتێکی باسکراو نەبووە.

زانایان دەڵێن: (**وَالْمَعْنَى: هَلْ يُقِرُّ كُلُّ إِنْسَانٍ مَوْجُودٍ، أَنَّهُ كَانَ مَعْدُومًا زَمَانًا طَوِيلًا، فَلَمْ يَكُنْ شَيْئًا يُذْكَرُ؟**)، ئایا هەر مرۆڤێك دان دان بەوەدا دێنێ (یانی: پێویستە دانی پێدا بێنێ) کە شتێکی نەبوو بووە لە ماوەیەکی زۆرداو، شایانی باس نەبووەو باسکراو نەبووە؟

(**الدَّهْر: الزَّمَنُ الطَّوِيلُ أَوِ الزَّمَنُ الْمُقَارِنُ لِوُجُودِ الْعَالَمِ الدُّنْيَوِيِّ**)، (**دَهْر**) بریتیە لە ماوەیەکی درێژ، یاخود ئەو کاتەی جووت و بەراورد دەبێتەوە لەگەڵ بوونی ئەم گەردوون و ژیانە دنیاییەدا.

(**وَالْحِينُ: مِقْدَارٌ مُجْمَلٌ مِنَ الزَّمَانِ يُطْلَقُ عَلَى سَاعَةٍ وَعَلَى أَكْثَرَ**)، (**حِيْن**)، ﴿ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ ﴾، ماوەیەکی نەزانراوە لە کات، بۆ ماوەیەکی کەم بەکار دەهێندرێ و، بۆ ماوەیەکی زۆریش.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی چۆنیە دتیی روستکردنی مرۆڤ:

٣- ﴿ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ﴾، ئێمە مرۆڤمان لە نوتفەیەکی تێکەڵ دروستکردوە، ﴿ أَمْشَاجٍ ﴾:

أ- یان کۆی (**مِشْج**)ە، (**مِثْلُ عِدل، أَي ممشُوج**)، (**عِدل**)، واتە: لابار، (**مِشج**)یش بەمانای (**مَمشُوج**) دێ، یانی: تێکەڵ.

ب- یاخود ﴿ أَمْشَاجٍ ﴾، کۆی (**مَشَج**)ە، وەك (**سَبَب**) یانی: هۆکار، کە بە (**أَسباب**) کۆدەکرێتەوە.

ج- یان کۆی (**مَشِج**)ە، وەك (**كَتِف**) یانی: شان کە بە (**أَكتاف**) کۆدەکرێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ﴾، تۆویلکەیەکی تێکەڵ، ئەمە ئەو واتایەش هەڵدەگرێ، کە لە توخمەکانی زەوی تێکەڵە، بەڵام باشتر وایە ئاوا لێك بدرێتەوە: تێکەڵەیەك لە ژیانداری تۆویی و هێلکۆڵەی نێو ئاوی ئافرەت، ئەو دووانە تێکەڵ دەبن، ئەوانیش هەر کامێکیان لە کۆمەڵێکی زۆر لە خانەو گەردو گەردیلەکان، پێکدێن.

٤)- ﴿ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾، تاقیدەکەینەوە ئنجا گێڕاومانە بەبیسەری بینەر، ﴿ نَّبْتَلِيهِ ﴾، لە شوێنی حاڵدا دانیشتوە، یانی: لە حاڵێکدا ئێمە تاقیدەکەینەوە ﴿ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾، ئنجا گێڕامان بە بیسەری بینەر، واتە: توانای بیستنمان پێداو توانای بینینیشمان پێدا، چونکە ئەگەر ئەو توانایانەی نەبن، شت ببیستێ و بزانێ و شت ببینێ، توانای تاقیکرانەوەی نابێ.

ئنجا خوا نەیفەرموە: (**فَجَعَلنَاهُ سَامِعاً مُبْصِرَاً**)، بەڵکو بە صیغەی زێدەڕۆیی هێناویەتی، فەرموویەتی: ﴿ سَمِيعًۢا ﴾، زۆر بیسەر ﴿ بَصِيرًا ﴾، زۆر بینەر، چونکە هەر کام لە هێزی بیستن و دیتن لە مرۆڤدا، زیاتر لە ئەرکێکیان هەیە، ئەوە نیە بەس ببیستن و ببینن بەو دوو هێزەیان، بەڵکو مرۆڤ دەتوانێ چەندان جۆرە شت ببیستێ، چەندان جۆرە دەنگ ببیستێ، هەم وەحیی پەیامی خوا ببیستێ،

هـەم پێکـەوە قسـەی یەکـدی ببیسـتن، دەتـوانی چەنـدان جـۆرە دەنـگ ببیسـتێ و لێیـان تێبـگات، هەروەهـا مـرۆڤ دەتوانـێ چەنـدان جـۆرە ڕەنـگ و قەبـارەو شـێوەو دیمـەن ببینـێ.

٥)- ﴿إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ﴾، ئێمە ڕێی ڕاستمان پێشاندا، لێرەدا هیدایەت بە مانای پێشاندانە، واتە: ئێمە ڕێی ڕاستمان پێشاندا ﴿ٱلسَّبِيلَ﴾، (أل)ی ناساندنی لەسەرە، واتە: ئێمە ڕێیەکەمان پێشاندا، ڕاستە ڕێیەکە، کە ڕاستەڕێی خوایە، لێرەدا ناگونجێ (أل) بۆ تێکڕا (**جنس**)بێ، واتە: هەموو ڕێیەکانمان پێشاندان، نا، بەڵکو یانی: ڕێی ڕاستمان پێشاندا، ڕێیەکەمان پیشاندا، بەرنامەو ڕێبازەکەی خۆمان.

٦)- ﴿إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا﴾، ئنجا یان سوپایگوزار دەبێ، یاخود سپڵەو ناسپاس، یانی: (**أَرشَدناهُ إِلَى الطَّرِيقِ السَّوِيِّ المُوصِل إِلَى الهَدَف، إِن أَرادَ سالِكُهُ الوُصُولَ**)، ئێمە ڕێی ڕاستی بە ئامانج گەیەنەرمان پێشان داوە، ئەگەر بابای پێدا ڕۆیشتووی بیەوێ پێی بگاتە ئامانج و شوێنی مەبەست.

وشـەی ﴿إِمَّا﴾، لـە ﴿إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا﴾دا (**إِمَّـا: حَـرْفُ تَفْصِيـلٍ، بَسِـيط، أَو مُرَكَّـبٌ مـن: إِن وَمـا، (إِن) الشَّرطِيـة و(مـا) النافيـة المتجردتـين مِـنَ العَمَـل**)، ﴿إِمَّا﴾، یـان پیتێکـی سـادەیە هـەر خۆیـەتی، یاخـود پیتێکی لێکـدراوە، لـە (**إِن**)ی شـەرتییە لەگەڵ (ما) ی لابـەرە، بـەڵام لێـرەدا نـە (**إِن**)ەکـە مانـای مـەرج دەگەیەنـێ و، نـە (ما)یەکـە مانـای لابـردن دەگەیەنـێ، بەڵکـو بـە هەردووکیـان مانـای تەفصیـل پێـدان و ڕوونکردنـەوەی شـتێك دەگەیەنـن، کەواتـە: واتایەکـەی ئـاوای لێدێتـەوە: (**إِنَّـا هَدَيْنَـاهُ السَّـبِيلَ فِي حَـالِ أَنَّـهُ مُـتَرَدِّدٌ أَمْـرُهُ بَـيْنَ أَحَـدِ هَـذَيْـنِ الْوَصْفَيْنِ: شَـاكِرٍ أَوكَفُـورٍ**)، ئێمـە ڕێـی ڕاسـتمان پێشـان داوە لەحاڵێکـدا ئـەو کارەکـەی لەنێـو ئـەو دووانـەدا دێ و دەچـێ، لەنێـو ئـەو دوو وەسـفەدا: یـان سوپاسـگوزار دەبـێ، یاخـود نـا سـوپاس، بەدڵنیایـی کەسـێك هیدایـەت و ڕێنمایـی خـوا بگرێتـە بـەر، ڕێـی ڕاسـتگرتو و دەبـێ و سوپاسـگوزارە، کـە سـێکیش هیدایـەت و ڕێنمایـی خـوا ڕەفـز بـکات، گومڕایـەو سـپڵەیە.

## کورتە باسێک لە بارەی چییەتی مرۆڤەوە

ئایا جەوهەرو چییەتی مرۆڤ لەچیدا شێردراوەتەوە؟ ئێمە لە سێ بڕگەدا زۆر بە گوشراویی ئەو باسە دەکەین:

١)- بە پێی ئایەتی: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ **الحجر**، هەروەها سوورەتی (ص)یش ئایەتی (٧٢)، ئەو ڕستە موبارەکە لە هەرکام لەو دوو سوورەتەدا هاتوە، واتە: هەرکاتێك ڕێکمخست و لە ڕووحی خۆم فووم بەبەردا کرد، بۆی بە کڕنووشدا بکەون.

﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ ﴾، ئنجا هەر کاتێك جەستەکەیم ڕێکخست و سازو ئامادە کرد ﴿ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴾، لەڕووحی خۆشم، (لەو ڕووحەی بەس خۆم دەزانم چییە؟ یان: دروستکراوی تایبەتی خۆمە) فووم بەبەردا کرد، ئێوە بۆی بە کڕنووشدا بکەون، ڕووی دواندن لە فریشتەکانە، کەواتە: فریشتەکان فەرمانیان پێکراوە بۆ ئادەم بە کڕنووشدا بکەون، کڕنووشی ڕێز لێ گرتن، دوای ئەوەی خوا ﷻ پاش ڕێکخستنی جەستەکەی ئادەم، ڕووحیشی بەبەردا دەکات.

هەروەها لە سوورەتی سەجدەشدا خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ... ﴿٩﴾ ﴾ **السجدة**، واتە: ئنجا ڕێکیخست و لە ڕووحی خۆی فووی بەبەرداکرد...

بێگومان ئایەتەکانی: (٢٩)ی (**الحجر**) و (٧٢)ی (ص) لە بارەی بابی مرۆڤایەتیی ئادەمەوە (**عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) دەدوێن و، ئایەتی (٩)ی سوورەتی (**السجدة**)ش لە بارەی وەچەی ئادەمەوە دەدوێ کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ... ﴿٩﴾ ﴾ **السجدة**، دوایی خوا جەستەکەی ڕێکخست و لە ڕووحی خۆی (کە تایبەتە بەخۆیەوە، یان دروستکراوێکی تایبەتیی خۆیەتی) فووی بەبەردا کرد.

ئنجا ئێمە لەم ئایەتە موبارەکانە - وێنەی دیکەشیان هەن - ئەو ئەنجامگیرییە دەکەین کە وەك چۆن هەویر بریتیە لە: (ئارد + ئاو = هەویر)، بە هەمان شێوە مرۆڤیش لە: جەستەیەکی خاکیی و ڕووحێکی خوایی پێکهاتوە، هەڵبەتە خاکەکەش و ڕووحەکەش هەر دووکیان دروستکراوی خوان، کە دەزانین خاکەکە چییەو چۆنە، بەڵام نازانین ڕووحەکە چییەو چۆنە؟ بۆیەش خوا ﷻ لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي ... ﴿٨٥﴾ ﴾ **الإسراء**، لە بارەی ڕووحەوە پرسیارت لێ دەکەن؟ بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە، واتە: تەنیا خۆی دەزانێ جەوهەرو چییەتەکەی چۆنە، کاتێك ڕووح و جەستە پێکەوە دەبن، مرۆڤی خاوەنی ژیان و زیندوو هەیە، بەڵام بە جیا بوونەوەیان و بەپێکەوە کۆنەبوونەوەیان و لە یەك دابڕانیان، حاڵەتی مردن ڕوو دەدات و، نە ڕووحەکە بەتەنیا مرۆڤەو نە جەستەکەش، بەڵکو مرۆڤ بریتیە لە کۆی ڕووح و جەستە، ئەوەی بۆ ئێمە زاندراوە لەم ژیانە دونیاییەدا.

٢)- بە پێی ئایەتی: ﴿ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ ﴾ **السجدة**، خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: فریشتەی مەرگ کە پێتان سپێردراوە وەفاتتان پێ دەکات (وەرتان دەگرێ) دوایی بۆ لای پەروەردگارتان دەگێڕدرێنەوە.

لێرەدا ئاوا دەفەرموێ و، لە ئایەتەکەی سووڕەتی (الزمر)یش دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ **الزمر**، خوا نەفسەکان وەردەگرێ لە کاتی مردنیانداو، ئەوەی نەمردبێ لەکاتی خەوتنیاندا، ئنجا ئەوانەی مردنی بۆ بڕیارداون دەیانگرێتەوە، (ئەوانەی لە خەودا ڕووحەکانیان وەردەگرێ، ئەگەر مردنی بۆ بڕیاردابن، ڕووحەکان لە لای خۆی گل دەداتەوە) ئەوانەی دیکەش دەنێرێتەوە تاکو کاتێکی دیارییکراو، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بیر بکەنەوە.

دیسان ئەو ئایەتەش کە خوێندمانەوە: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا﴾، ئایا بەسەر مرۆڤدا کاتێك لە ڕۆژگار تێپەڕیوە (یان بە دڵنیایی کاتێکی زۆر لە پێش مرۆڤ دا تێپەڕیوە) شتێکی باسکراو نەبووە.

ئەمانە هەموویان لێیان وەردەگیرێ کە جەوهەرو چییەتی مرۆڤ و کاکڵ و نێوەڕۆکی مرۆڤ، لە ڕووحەکەیدا شێردراوەتەوەو جەستەکەی زیاتر دەوری توێکڵ و دیکۆرو ڕواڵەت دەبینێ.

**٣)**- ئایەتەکانی: (١٢ و ١٣ و١٤)ی سوورەتی (**المؤمنون**) کە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**المؤمنون**)دا کورتە باسێکمان کرد، لەبەر ڕۆشنایی واندا، لەبارەی دروستبوونی مرۆڤەوە، هەم ئادەم و حەووا سەلامی خوایان لەسەر بێ و، هەم وەچەکەیان، ئەمەش دەقی ئایەتەکانە: ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ١٢ ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ ١٣ ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ١٤﴾**المؤمنون**، واتە: بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان لە خوڵاسەو پوختەیەکی قوڕێ دروست کردوە، دوایی گێڕاومانە بە نوتفە (نطفة)، لە نشینگەیەکی مەحکەم و قایم دا (مەبەست پێی منداڵدانی دایکە) دوایی نوتفەکەمان دروست کرد بە خوێنپارە، ئنجا خوێنپارەکەمان گێڕا بە پارچە گۆشتێکی زارجوو ئاسا، ئنجا پارچە گۆشتەکەی زارجوو ئاسامان گێڕا بە ئێسقانەکان، ئنجا ئێسقانەکانمان بە گۆشت داپۆشین، دوای ئەوەش بە دروستکراوێکی دیکە دروستمان کرد. کە بە ڕای زۆربەی زانایان مەبەست پێی ڕووح بەبەردا کردنیەتی، واتە: پێشێ هەر ژیانی هەبووە، هەر لە قۆناغی (نطفة)ەوە، بەڵکو پێش (نطفة)ش هەر لەوکاتەوەی زیندەوەری تۆویی بووە لە نێو مەنیی بابدا، هەروەها هێلکۆڵە بووە لەنێو مەنیی دایکدا، هەر لەوکاتەوە ژیاندار بووە، ئنجا زیندەوەری تۆویی (**حَیمَن**)، ئەو زیندەوەرەی دەبێتە مرۆڤ، یەکێکە لە: پێنج سەد ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠٠٠) دانە، کە لە هەر ئاو هاتنێکی پیاودا هەن و، قەبارەکەی بە ئەندازەی سانتیمەتر سێجایەکە (١ سم٣)، یەکێك لەوانە لەگەڵ هێلکۆڵەی نێو ئاوی ئافرەتدا، یەك دەگرێ و بە هەردووکیان

(نطفة) پێك دێنن، دوایی ئەو نوتفە (نطفة)یە دەبێتە عەلەقەو، عەلەقە دەبێتە **موضغە**و، **موضغە** دەبێتە ئێسقان و، ئێسقان بە گۆشت دادەپۆشرێ، ﴿ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَ﴾، ئنجا کردمان بە دروستکراوێکی دیکە، بۆچی دەفەرموێ: دروستکراوی دیکە؟ چونکە تاکو ئەو کاتە هەر ژیاندار بووە، بەڵام ئەوجار دەبێتە گیانلەبەر، بۆیەش زۆر جاران لە کتێب و نووسراوەکانی خۆمدا گوتوومە: هەڵەیە - مەگەر وشەی ڕووح بەمانای ژیان (حیاة) بەکار بێ - ئەگەرنا هەڵەیە بۆ جگەلە مرۆڤ بگوترێ: ڕووح لەبەر، چونکە گیانلەبەر تەنیا مرۆڤەو، ئەوانەی دیکە ژیاندارو ژیانلەبەرن، ئەوەی ڕووحدار و ڕووح لەبەر بێ، تەنیا مرۆڤە، خوا وشەی ڕووحی تەنیا بۆ مرۆڤ بەکار هێناوە، ئەوانەی دیکە هەموویان بەس ژیانیان هەیە، هەروەها مرۆڤیش بەر لەوەی ڕووحی بەبەردا بکرێ، کاتێ: نوتفەیە، عەلەقەیە، **موضغە**یە، لە هەموویان دا ژیاندارە، بەڵام دوایی لە قۆناغێکی دیکەدا ڕووحی بەبەردا دەکرێ.

دوایی کە دەفەرموێ: ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ﴾، بەرزیی و بەپێزیی و بەرەکەتداریی بۆ خوای باشترینی بەدیهێنەران، ئەمەش دیسان ئەوە دەگەیەنێ: کە مرۆڤ دوای ئەوەی خوا بەو قۆناغانەدا تێیدەپەڕێنێ، ئنجا جەوهەرو چییەتێکی پەیدا دەبێ کە لە ڕووحەکەیدا پەنهانەو شێردراوەیە.

کەواتە: مرۆڤ لەم ژیانە دنیایەدا لە دوو بەش پێك هاتوە: جەستەیەکی خاکیی و، ڕووحێکی خوایی پەنهانی چییەت نەزانراو، کە بە هەردووکیان مرۆڤ مرۆڤەو، بە جیا بوونەوەی ڕووح لە جەستە، جەستەکە دەبێتەوە بە خاك، خەڵك خوا خوایەتی زوو لە کۆڵ خۆی بکەنەوەو لەبەر چاویان ون بێ، ڕووحەکەش دەچێتە ئەو شوێنەی خوای پەروەردگار بۆی دیاریی کردوە، چ چاکەکار چ خراپەکار بوو بێ، بەڵام ئەوەش مانای ئەوە نیە کە ئەو مرۆڤە کۆتایی پێ هاتوە، چونکە ئەو ڕووحە لە قۆناغی بەرزەخدا بەپێی ئایەتەکان و حەدیسەکانیش، جەستەیەکی دیکە دەپۆشێ، پاشان لە قیامەتیش جەستەیەکی دیکە دەپۆشێ، بەڵێ خوای بالادەست باسی زیندوو کرانەوەی جەستەکان دەکات، بەڵام بەدڵنیایی ئەو

ماددەیەی جەستەی مرۆڤانی لێ پێك دێ لە قیامەتدا، چ هی بڕودارانی چاكەكار، چ هی بێبڕوایانی خراپەكار، واتە: چ بەهەشتییەكان چ دۆزەخییەكان، جەستەكە لە ماددەیەكی دیكە پێك دێ، جگە لەو ماددەیەی ئێستا ئێمە دەیبینین، وەك ئایەتەكەی سوورەتی (**الواقعة**) ئاماژەی پێ دەكات و، كاتی خۆی كورتە باسێمان لەو بارەوە كرد، دەفەرموێ: ﴿...وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾**الواقعة**، بەجۆرێك دروستتان دەكەینەوە، كە ئێوە نایزانن، واتە: ئێستا نازانن ئەوێ چۆنە، ئەو جەستەیەو، پەیوەندیی نێوان جەستەو ڕووح و، ئەو ماددەیەی جەستەتانی لێ دروست دەكرێ، بۆ ژیانێكی نەبڕاوەی هەتا هەتایی، ژیانێك كە تێیداكات تەمەنت بەسەردا ناڕوات، چ لە بەهەشت داو چ دۆزەخ دا.

## كورتە باسێك لە بارەی چەمك و واتای هیدایەتەوە

چەند جارێکی دیکەش هەر باسمان کردوە، بەڵام لێرەش بە کورتیی دەڵێین: وشەی (**هداية**) لە قورئاندا بەلای کەمەوە[1] بە سێ واتایان بەکار هاتوەو، دەبێ زۆر وریا بین، ئەو سێ واتایە ئەگەر بێت و تێکەڵیان بکەین، کە بە مانای گشتیی و، بە مانای تایبەت و، بەمانای تایبەتی تایبەت (**بِمَعنى: عام، بِمَعنى: خاص، بِمَعنَى: أَخَصّ**)، ئەگەر بێت چەمك و واتایەکانیان تێکەڵ بکەین، دەگەینە هەندێك ئەنجامگیریی و هەندێك تێگەیشتن لە ئایەتەکانی قورئان، کە هەڵەیەو مانایەکە هەڵە دەردەچێ.

ئێستاش سەروتیشك دەخەینەسەر ئەو سێ مانایەی هیدایەت:

**١- مانای یەکەمی هیدایەت:** یەکەمین مانایەك کە وشەی هیدایەتی بۆ بەکارهاتوە، مانایەکی گشتییە کە بریتیە لە ڕێنمایی کردنی خوا ﷻ، ڕاستەڕێ کردنی خوا بۆ هەموو دروستکراوەکان، وەك لە سوورەتی (**طه**)دا هاتوە: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە: (موسا) گوتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوەو دواییش ڕێنمایی کردوە، لێرەدا ﴿ هَدَىٰ ﴾، بەمانای: (ڕاستەڕێی کرد) واتە: پابەندی کردوە بەو ڕاستەڕێیەوەی بۆی داناوە، ئەوە بە نسبەت هەموو شتەکانەوە، هەر لە گەردیلەوە تاکو کەهکەشان، خوا سیستمێکی داناوەو، دوای ئەوەی بوونی بە هەر شتێك داوە، خستوویەتە سەر سیستمێکیش، سەر ڕێیەك و پابەندیش کراوە بەو ڕێیەوە،

---

(١) بۆیە دەڵێم: بەلی کەمەوە، چونکە ئەگەر وردتر سەرنج بدەین، وێڕای ئەو سێ واتایە لە قورئاندا وشەی (هدى،هداية) بەدوو واتای دیکەش بەکەرهاتووە: ا- هیدایەتی غەریزەیی، بۆ وێنە خوا فەرموویەتی:

٥- هیدایەتی بەهەشتیان بەرەو جێگاو ڕێگاکانی خۆیان لە بەهەشتدا، وەک خوا فەرموویەتی:

هەر لە[1] گەردیلە وەبگرە هەتا دەگاتە کەهکەشانەکان و گەلە کەهکەشانەکان، یانی: لە بچووکترین شتەوە بگرە تاکو گەورەترین شت، هەمووی خوا سیستمێکی بۆ داناوەو، پابەندیشی کردوە بەو سیستمەوە.

لە سوورەتی (الأعلى)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ١ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ٢ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ٣ ﴾**الأعلى**، واتە: ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، ئەو زاتەی هەموو شتێکی هێناوەتە دی، ئنجا ڕێکیخستوە، ئەوکەسە (هەموو شتێکی) ئەندازەگیریی کردوەو ڕاستەڕێی کردوە.

هیچ شتێك نیە خوا نەیهێنابێتە دی، هەر شتێکیشی هێناوەتە دی، ڕێکیخستوەو هەموو شتێکیشی ئەندازەگیریی کردوە، ئنجا خستووشیەتە سەر سیستم (**نظام**) ێك كە پێوە پابەند کراوە، بەو مانا گشتییە بۆ هیدایەت، جەستەی ئێمەش هەر وایە، هەموو خانەکانی جەستەمان کە بەمەزەندە جەستەی مرۆڤ لە (١٠٠) تریلیۆن ($١٠^{١٢}$) خانە زیاتر پێکهاتوەو، هەر کامێك لەو خانانەش لە: (١٠٠) تریلیۆن گەردیلە زیاتر پێکهاتوە، ئنجا هەموو گەردیلەکان کە خانەکان پێکدێنن و، هەموو خانەکان کە شانەکان پێکدێنن و، هەموو شانەکان کە ئەندامەکان پێکدێنن و، هەموو ئەندامەکان کە کۆئەندامەکان پێکدێنن و، هەموو کۆئەندامەکان کە جەستە پێکدێنن، هەموو ئەوانە خوا عزوجل بێ ئەوەی هەڵبژاردنی خۆمانی تێدابێ، ویستی خۆمانی تێدابێ، ڕێکیخستوون و ئەندازەگیریی کردوون، ئەو هەموو جۆرە خانانەش لە جەستەی مرۆڤدا هەن، خڕۆکە سپییەکان و خڕۆکە سوورەکان، ئنجا کارگەی دروستکردنی خڕۆکە سوورەکان، لەنێو مۆخدا، لەنێو ئێسقاندا، ئەم هەموو کۆئەندامانەی خوا بۆ مرۆڤی خوڵقاندوون، کە هیچ

---

(١) تێکڕای توخمەکان (عناصر) کە ژمارەیان سەدونۆ (١٠٩) زیاترەو، لەگەردیلەکان پێکدێن و، پێکهێنەری سەرجەم شتەکانیشن، مانای وایە گەردیلە (ذرة - atum) یەکەمین خشتی ماددەو سەرجەم دیاردەکانیەتی. بڕوانە: الموسوعة العلمية الشاملة، ص ٢٤ - ٣٢، رئيس التحرير: أحمد شفيق الخطيب.

کامیان بە پێی ویستی مرۆڤ کار ناکات: لێدانی دڵمان، کار کردنی گورچیلەکانمان، کارکردنی گەدەو ڕیخۆڵەکان، کۆئەندامی هەناسەو، هەموو کۆئەندامەکانی دیکەو هەموو ئەو پێکهاتانەی دیکە جەستەی مرۆڤ، هەروەها هی هەموو ژیانداران بە تێکڕا، بەڵکو بێ ژیانانیش هەموویان خوا ﷻ هێناونیە دی، دواییش ڕێکیخستوون و، بەو شێوەیە ڕێك و، پێکی کردوون، هەرشتێك لە تەواوترین حاڵەتی خۆیدایە، پاشان ئەندازەگیریی کردوون، دوایی ڕێنماییشی کردوون و، پابەندیشی کردوون بەو ڕێیەوەی بۆی داناون، ئەوە مانای یەکەمی هیدایەت.

**٢- مانای دووەمی هیدایەت:** بریتیە لە مانایەکی تایبەت بە ئەرکدار کراوان (**خاصٌّ بِالمُكَلَّفِين**)، ئەوانیش مرۆڤ و جندن، وەك لە سوورەتی (**البقرة**) دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾**البقرة**، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بەڵگە ڕۆشنەکان و ڕێنمایی ئێمە دوای ئەوەی ڕوونمان کردۆتەوە لە کتێبدا، دەیشارنەوەو پەنهانی دەکەن، ئائەوانە خواو نەفرینکەران نەفرینیان لێدەکەن.

هەروەها هەر لە سوورەتی (**البقرة**)دا خوا فەرموویەتی: ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ ...﴿١٨٥﴾ ﴾، واتە: مانگی ڕەمەزان کە قورئانی تێدا دابەزێنراوە ڕێنماییە بۆ خەڵك، کەواتە: مانای دووەمی هیدایەت بریتیە لە ڕێ پیشاندانی خوا بۆ مرۆڤ و جند، کە چۆن بژین و ماوەی ژیانی دونیایان چۆن بگوزەرێنن؟ کە بە شێوەیەك بێ لە تاقیکردنەوی خوا دەربچن و، بەشێوەیەك بێ سەربەرزانە ئەم ماوە کورتەی ژیانی دونیا تێپەڕێنن و، شایستەی ئەوە بن خوا لێیان خۆشبێ و لێیان ڕازی بێ و، بیانخاتە بەهەشتەکانی خۆیەوە.

**٣- مانای سێیەمی هیدایەت:** مانایەکی تایبەتترەو ئەویش پەیوەستە بە بڕواداران و پارێزکارانەوە، بۆ وێنە: خوا ﷻ لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ﴾**البقرة**، واتە: ئەو کتێبە هیچ دوو دڵیی تێدانیە، ڕێنماییە بۆ پارێزکاران، واتە: ڕاستەڕێ کەرو بە ئامانج گەیەنەرە بۆ پارێزکاران، لێرەدا وشەی: ﴿ هُدًى ﴾، بە مانای بە ئامانج گەیاندن و ڕاستەڕێ کردن هاتوە، هەروەها لە سوورەتی (موحەممەد)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ۝١٧ ﴾**محمد**، واتە: ئەوانەی هیدایەتی خوایان وەرگرتوە و ڕاستەڕێ بوون، خوا ڕێنماییان بۆ زیاد دەکات بەرچاو ڕوونییان بۆ زیاد دەکات و پارێزکارییشیان پێ دەبەخشێ، هەروەها بەو واتای سێیەم و تایبەتترەیە کە ئێمە لە سوورەتی فاتیحەدا خوا فێری کردووین لێی بپاڕێینەوەو بڵێین: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ ﴾، ﴿ ٱهْدِنَا ﴾، یانی: بەردەوامان بکە لەسەر ڕێی ڕاست، نەك: ڕێی ڕاستمان پیشان بدە، خوا ڕێی ڕاستی پیشان داوین، ﴿ ٱهْدِنَا ﴾، واتە: بمانخە سەر ڕێی ڕاست، ئنجا تۆی بڕوادار لەسەر ڕێی ڕاستی، بەڵام بۆ لەسەر ڕێی ڕاست بوون، لە هەموو تاوەکانی تەمەنداو، لە هەموو هەڵوێستەکانداو، لە هەموو هەڵس و کەوتەکاندا، حەوجێمان بەوە هەیە کە لەسەر ڕێی ڕاست بین، ئەو پاڕانەوەیەمان بەو مەبەستەیە.

## مەسەلەی دووەم:

**خـوای دادگـەر زنجیـرو کـۆت و بڵێسـەی ئاگـری بـۆ بێبڕوایـان سـاز کـردوون و، بـڕوادارانی چاکەکاریـش پێـکی مـەی کافـوور تێکـراو دەخۆنـەوە، کـە لـە کانییـەکی نێـو بەهەشـت دەردێ و، بەویسـتی خۆیـان ئاوەکـەی ڕادەکێشـن و، بـۆ ئـەولاو لای دەبـەن، ئەویـش لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە پابەنـدن بـەوەوەی لەخۆیـان گرتـوەو، تـرسی سـزای ڕۆژی دواییـان هەبـووەو، خواردنێـکی خۆشویسـتراویان بـە: نـەدارو هەتیـوو دیـل داوەو لەبـەر خۆشـیانەوە گوتوویانـە: تەنیا لەبـەر خـوا دەرخواردتـان دەدەیـن و، هیـچ چاوەڕوانییەکـمان لێتـان نیـەو، ئێمـە تـرسی ڕۆژێـکی گـرژو دژوارو بێڕەزامـان هەیـە:**

خـوا فەرموویـەتی: ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفۡجِيرٗا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ﴿٧﴾ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوۡمًا عَبُوسٗا قَمۡطَرِيرٗا ﴿١٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

لـە ئایەتـەکانی پێشـێدا خـوا بـاسی کـرد کـە ماوەیـەکی زۆر تێپەڕیـوەو مـرۆڤ شـتێکی باسـکراو نەبـووە، دوایـی خـوا لـە نوتفەیـەکی تێکـەڵ مرۆڤـی هێناوەتـە دی، بـە مەبەسـتی تاقیکردنـەوەو، گێراویـەتی بـە بیسـەرو بینـەر، ئنجـا ڕێـی ڕاسـتیشی پێشـانداوە، ڕاسـتە ڕێیەکـەی خـۆی، چ سوپاسـگوزار بـێ، چ سـپڵەو ناسـپاس، ئنجـا خـوا ﷻ بـاسی سـەرەنجامی هەردووکیـان دەکات، بـەڵام ناسـپاس و بێبڕوایـەکانی پێشخسـتوون و دەفەرمـوێ:

١- ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا﴾، بە دڵنیایی ئێمە بۆ بێبڕوایەکان زنجیرەکان و کۆت و پێوەندەکان و بڵێسەی ئاگرمان ئامادە کردوە.

(أَعتَدْنا)و (أَعدَدنا)، هەردووکیان یانی: (هَيَّئنا) سازمان کردوە، ئامادەمان کردوە.

(سَلاَسِل) کۆی (سِلسِلة)یە، واتە: زنجیر، (**السَّلاَسِلُ: الْقُيُودُ الْمَصْنُوعَةُ مِنْ حِلَقِ الْحَدِيدِ**)، (سَلاَسِل): ئەو کۆتانەن کە لە ئاڵقەکانی ئاسن، دروستکراون، هەرچەندە وشەی (قَيْد) زیاتر بۆ کۆتێك کە لە دەست و لە گەردن دەکرێ، بەکاردێ.

(**الأَغْلاَلُ: جَمْعُ غُلٍّ بِضَمِّ الْغَيْنِ، وَهُوَ حَلْقَةٌ كَبِيرَةٌ مِنْ حَدِيدٍ تُوضَعُ فِيهِ رَقَبَةِ الْمُقَيَّدِ**)، (أَغلال) کۆی (غُلّ)ە، کە بازنەیەکی ئاسنی گەورەیە (جاری واش هەیە لە چەرم دروست دەکرێ) گەردنی بابای گیراو، یان کۆتکراوی تێدەخرێ، لە گەردنی دەئاڵێ و سەریشی بەرز دەکاتەوە.

لە بارەی سزای بێبڕوایانەوە، خوا ﷻ هەر بە کورتیی براندوویەتەوە، کە ئەوانە خوا زنجیرەکان و کۆت و پێوەندی بۆ ئامادە کردوون و، کڵپەی ئاگریشی بۆ ساز کردوون.

(**السَّعِيرُ: النَّارُ الْمُسَعِرَّةُ، أَي الَّتِي سَعَّرَهَا الْمُوقِدُونَ بِزِيَادَةِ الْوَقُودِ، فَهُوَ فِي الْأَصْلِ وَصْفٌ بِمَعْنَى اسْمِ الْمَفْعُولِ جُعِلَ عَلَمًا عَلَى جَهَنَّمَ**)، (سَعِير) واتە: ئاگرێکی خۆشکراو، ئەوانەی دایانگیرساندوە بەهۆی ئەوەوە کە سووتەمەنییان بۆ زیاد کردوە، خۆشیان کردوە، وشەی (سَعِير) لە ئەصڵدا وەسفەو بە مانای ناوی بەرکار هاتوە، یانی: (مُسَعَّرَة) خۆشکراوو بڵێسەدار کراو، کراوە بە ناوێکی ناسینەوە بۆ دۆزەخ.

ئنجا یەکسەر خوا ﷻ دێتە سەر باسی پاداشتی چاکەکاران و دەفەرموێ:

٢- ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾، بە دڵنیایی چاکەکاران لە پێکێك دەخۆنەوە کافووری لەگەڵ تێکەڵ کراوە، وشەی: ﴿كَانَ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿كَانَ مِزَاجُهَا﴾، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە هەمیشە ئەو کافوورەی لەگەڵ

تێکەڵ دەکرێ و لێی جیانابێتەوە، چونکە عادەتی خەڵك وابووە کە لە دونیادا (لە ژیانی دنیایاندا) لەبەر ئەوەی کافوور گران بووە، یان جاری وایە دەست نەکەوتوە، مەرج نیە هەموو جارێ کافووریان تێکردبێ، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿كَانَ مِزَاجُهَا﴾، یانی: بزانن ئەوەی بەهەشتێ هەمیشە کافووری تێدەکرێ، وەك دنیا نیە دەستنەکەوێ، یان نرخەکەی زۆر گران بێ، تەنیا جار جار تێی بکەن، یان کەمی تێبکەن.

(**الكَأْسُ: الإِنَاءُ الَّذِي فِيهِ الشَّرابُ و إن لَم يَكُن فيه شَرَابُ، لا يُسَمَّى كَأْسَاً**) ئەمە ڕای یەکێك لە زانایانە، (**كَأس**): بریتیە لەو دەفرەی شەڕاب (مەی)ی تێدابێ، ئەگەر مەی تێدا نەبێ، پێی ناگوترێ (**كَأس**).

هەندێکیش لە زانایان دەڵێن: چ شەڕابی تێدابێ چ تێیدانەبێ، هەردووکیشیان بە جیاجیا، هەر پێیان دەگوترێ: (**كَأس**)، واتە: خودی شەڕابەکە کە دەخورێتەوەو، خودی دەفرەکەش کە شەڕابەکەی تێدایە.

زانایان لەسەر کافوور زۆر قسەیان کردوە، بۆ وێنە لە: (**المعجم الوسيط**)دا هاتوە: (**الكافورُ: شَجَرٌ مِنَ الفَصِيلَةِ الغارِيةِ يُتَّخَذُ مِنهُ مادَّةٌ شَفَّافَةٌ بَلُورِيَّةُ الشَّكلِ يَمِيلُ لَونُها إِلَى البَياضِ رائِحَتُه عَطْرِيّة وَطَعمُهَا مُرٌّ، وَهُوَ أَصنافٌ كَثِيرَةٌ، وَالجَمعُ كَوافِير**)[١]، واتە: کافوور درەختێکە لە جۆری غارییە[٢]، کە ماددەیەکی ڕوونی بلووریی لێوەردەگیرێ، ڕەنگەکەی بەلای سپیەتیی دایە، بۆنێکی خۆشی هەیەو، تامەکەی تاڵە، ئەویش زۆر جۆری هەن و، وشەی کافوور بە (**كوافير**) کۆدەکرێتەوە.

(**إبن عاشور**)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا[٣] دەڵێ: (**الكافور: زَيتٌ يُستَخْرَجُ مِنْ شَجَرَةٍ تُشْبِهُ الدِفْلَى تَنْبُتُ فِي بِلَادِ الصِّينِ وَجَاوَةَ، يَتَكَوَّنُ فِيهَا إِذَا طَالَتْ مُدَّتُهَا**

---

(١) المعجم الوسيط: ص٧٩٢.

(٢) (الغار: جَمعُ غِيران، شَجَرٌ يَنبُتُ بَرِّيًّا مِن سَواحِلِ الشَّامِ وَالغُورِ وَالجِبالِ السَّاحِلِيَّةِ دائِمُ الخَضرَةِ) واتە: (غار)بە (غِيران) کۆدەکرێتەوە، لە ناوچەی غوور، لە چیایەکانی کەنار، هەمیشە سەوزە. یانی: کەناری شام و سووریە، مەبەستیش کەناری دەریای سپی نێوەڕاستە.

(٣) التحرير والتنوير: ج١٢، ص٣٨٠.

**نَحْوًا مِنْ مِائَتَيْ سَنَةٍ، فَيُغَلَّى حَطَبُهَا وَيُسْتَخْرَجُ مِنْهُ زَيْتٌ يُسَمَّى الْكَافُورُ، وَالْكَافُورُ أَبْيَضُ اللَّوْنِ ذَكِيُّ الرَّائِحَةِ مُنْعِشٌ**)، واتە: كافوور ڕۆنێكە دەردەهێنرێ لە درەختێك شێوەی دیفلا دەكات (ئەویش جۆرە درەختێكە)، كە لە وڵاتی چین و جاوەدا هەیە، كاتێك ئەو زەیتەش لەو درەختە پەیدادەبێ كە دووسەد (٢٠٠) ساڵ بەسەر تەمەنیدا تێپەڕێ، ئنجا داری ئەو درەختە دەكوڵێنرێ و ئەو ڕۆنەی پێی دەگوترێ: كافوور لێی دەردەهێنرێ، كافوور ڕەنگەكەی سپییەو بۆنێكی خۆشی هەیەو بووژێنەرەوەیە.

كە خوا ﷻ دەفەرموێ: كافووری لەگەڵ تێكەڵ دەكرێ، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: كافوور تامەكەی تاڵە! بەڵام بێگومان هیچ شتێكی بەهەشت وەك هی دنیا نیەو، ئەو شتانەی خوا بۆمان باس دەكات لە بەهەشتدا، سیفەت و لایەنە چاكەكانی كە لە دنیادا هەیانن، تێیدان و، لایەنە خراپەكانیشی تێدانین.

دوایی خوا ﷻ پێناسەی ئەو كانیی و سەرچاوەیەمان بۆ دەكات، كە ئەوان پێكی مەی لێ دەخۆنەوەو دەفەرموێ:

٣- ﴿ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ ﴾، سەرچاوەیەكە بەندەكانی خوا لێی دەخۆنەوە. لەبارەی (**ب**)ی سەر (**بها**) ەوە، زانایان چوار ڕایان هێناون:

أ- هەندێك لە زانایان لە بارەی (ب)ی ﴿ يَشْرَبُ بِهَا ﴾، وە گوتوویانە: زیاد كراوە بۆ جەختكردنەوەو یانی: (**يَشرَبُهَا**).

ب- هەندێكی دیكە گوتوویانە: لێرەدا (**ب**) بە مانای (من)ە، یانی (**يَشرَبُ مِنهَا**) واتە: لەو كانیی و سەرچاوەیە دەخۆنەوە.

ج- زۆریشیان گوتوویانە: (**يَشرَبُ: ضُمِّنَ مَعنَى (يَلتَذُّ) أو (يرتوي) لِذا عُدِّيَ لِلباء**)، (**يَشرَبُ**) واتە: دەیخۆنەوە، مانای: (چێژی لێوەردەگرن)، یاخود (پێی تێر ئاو دەبن)ی خراوەتە نێو، بۆیە بە (ب) بەركاری خواستوە، كەواتە: ﴿ يَشْرَبُ بِهَا ﴾، واتە: (**يَشرَبُونَ أَي: يُجْرُونَهَا حَيثُ شاءُوا فَيَشُقُّونَهَا شَقّاً مِنهَا، وَيَلتَذُّونَ بِها ويرتوون بها**).

**د-** هەندێکیش گوتوویانە: ﴿يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ﴾، (ب)ەکە ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ پەرداخ (**كأس**)ەکە، یانی: بەندەکانی خوا بەو پەرداخە لەو کانییە دەخۆنەوە.

**٤)-** ﴿يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾، دەیتەقێننەوە بە تەقاندنەوە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی تەقاندنەوە نیە، واتە: بۆ هەر شوێنێکیان بوێ (ئەو کانیی و سەرچاوەیە) ئاوەکەی دەبەن، واتە: بەردەوام لەبەر دەستیان دایە، نەك هەمیشە پێویست بکات بچن لە کانییە کە ئاو بێنن، بەڵکو بۆ هەر شوێنێکیان بوێ ئاوەکەی دەگوازنەوە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ئەوەی بۆچی ئەوانە ئەوە پاداشتیانەو، باسی هەندێك لە کردەوەکانیان دەکات و، نێواخنی دەکات لەگەڵ پاداشتەکەیانداو دەفەرموێ:

**٥)-** ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ﴾، ئەوانە عادەتیان وابوو نەزریان جێبەجێ دەکرد، وشەی (**نَذر**) بە مانای پێویست کردنە، بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ﴾، واتە: هەرچی خوا لەسەری پێویست کردوون، جێبەجێی دەکەن، وەك لە قەتادەوە (**الطبري**) بە ژمارە (٣٥٨٨٢) هێناویەتی دەڵێ: (**يُوفُونَ بِطاعَةِ اللهِ وبِالصَّلَاة وبالحَجِّ وَبَالعُمرَة**)، واتە: فەرمانبەریی بۆ خواو نوێژو حەج و عومرە جێبەجێی دەکەن.

بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: (نَذر) مانایەکەی تایبەتەو هێندە گشتیی نیە هەموو شتێك بگرێتەوە، (**القرطبي**) ئاوا پێناسەی (نَذر) دەکات لە تەفسیرەکەی خۆی دا[١]، دەڵێ: (**النَّذْرُ: هُوَ إِيجَابُ الْمُكَلَّفِ عَلَى نَفْسِهِ مِنَ الطَّاعَاتِ مَا لَوْ لَمْ يُوجِبْهُ لَمْ يَلْزَمْهُ**)، (نذر): بریتیە لەوەی بابای ئەرکدار هەندێك لە فەرمانبەرییەکان لەسەر خۆی پێویست بکات، کە ئەگەر لەسەر خۆی پێویست نەکردبان، لەسەری پێویست نەدەبوون، بۆ وێنە کەسێك دەڵێ: خوایە! فلان شتەم بۆ ببێ، یان فلان بەڵایەم لێ دوور بکەوێتەوە، یان فلان خێرەم بەقسمەت بێ، یان فلان کەسەم لەو نەخۆشییە چاك بێتەوە، ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژانم لەسەر

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٩، ص٩٧.

نەزر بێ، یان ئەوەندە پارەیە دەکەمە خێر، یان حەیوانێك سەر دەبڕم، ئەوە پێی دەگوترێ: نەزر، واتە: لەسەرخۆ پێویست کردن.

(**الطبري**)ش ئاوا پێناسەی (نذْر) دەكات، دەڵێ: (**النَّذرُ: هُوَ كُلُّ ما أَوجَبَهُ الإِنسانُ عَلَى نَفسه مِن فِعلٍ**)، نەزر بریتیە لە هەر کردەوەیەك ئینسان لەسەر خۆی پێویستی بکات، گرنگ ئەوەیە ئەوانە: ﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ ﴾، ئەوەی لەخۆیان گرتوە و لەسەر خۆیان پێویست کردوە، پێی وەفادار دەبن، واتە: جێبەجێی دەکەن، چونکە (**یوفون**) بەمانای جێبەجێی دەکەن بە تەواویی.

٦)- ﴿ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ﴾، هەروەها لە ڕۆژێك دەترسێن خراپەو زیانەكەی بەربڵاوە، (**مُستَطِير**)، (**الطبري**) لە قەتادەوە بە ژمارە (٣٥٨٨٤) هێناویەتی دەڵێ: (**إِسْتَطَارَ واللهِ شَرُّ ذَلِكَ اليوم حَتَّى مَلأَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرض**) واتە: سوێند بە خوا زیان و خراپەی ئەو ڕۆژە (بەڵاو گرفتاریی ئەو ڕۆژە) وا بڵاو بۆتەوە ئاسمانەكان و زەوی گرتوونەوە، دەگوترێ: (**اسْتَطَارَ الصَّدْعُ فِي الْقَارُورَةِ وَالزُّجَاجَةِ وَاسْتَطَالَ: إِذَا امْتَدَّ، كانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيراً أَيْ: عَالِياً دَاهِياً فَاشِيًّا**) ئەگەر گۆزەیەك شووشەیەك بشكێ و درزێكی تێبێ و درزەكە بڵاوبێتەوە، دەگوترێ: (**اسْتَطَارَ الصَّدْعُ**)، واتە: شكاوییەكە پەرەی گرت و تەشەنەی كرد لە شووشەكەدا، یاخود لەو دەفرەدا كە شكاوە، واتە: درێژ بۆوە، (**مُستَطِيراً**) واتە: بەرزەو بڵاوەو درێژ بووەوەیە.

٧)- ﴿ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ﴾، هەروەها خواردنێك وێڕای خۆشویستنی دەرخواردی نەدارو هەتیوو دیل دەدەن، (**الطبري**) ئاوای لێكداوەتەوە:: (**كَانَ هَؤلاءِ الأَبرَارُ يُطعِمُونَ الطَّعَامَ عَلى حُبِّهِم إِيَّاهُ وَشَهوَتِهِم لَهُ المسكين واليتيم والأسير**)، واتە: ئا ئەو چاكەكارانە خواردنێك كە خۆشیاندەویست و بۆیشی ئارەزوومەند بوون، دەرخواردی ئەو سێ جۆرە كەسانەیان دەدا: نەدارو، هەتیوو، دیل.

(**للطبري**) بە ژمارە (٣٥٨٨٥) لە موجاهیدەوەی هێناوە كە گوتوویەتی: ﴿ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ﴾، واتە: (**وَهُم يَشتَهُونَهُ**)، لە حاڵێكدا ئارەزوویان دەكرد، هەندێكیش ﴿ عَلَىٰ

﴿ حُبِّهِۦ ﴾، یان ئاوا لێکداوەتەوە: وێڕای خۆشویستنیان بۆ خوا، واتە: بە هاندەری خۆشویستنی خواوە ئەو خواردنەیان دەبەخشی، بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر بە عەقڵەوە دەنووسێ.

(الطبري) دەڵێ: (**المِسكينُ: ذَوِي الحاجَةِ الَّذِينَ أَذَلَّتْهُمُ الحاجَة، وَاليَتِيمُ هُوَ الطِّفلُ الَّذِي قَد مَاتَ أَبُوهُ وَلَا شَيءَ لَهُ**)، (**مِسْكِين**): کەسانێکی خاوەن پێداویستیین کە پێداویستییەکەیان زەبوونی کردوون، (**يتيم**) ئەو منداڵەیە بابی مردووەو هیچ شتێکیشی نیە.

(**أسير**)یش قەتادە (**الطبري**) بە ژمارە (٣٥٨٨٨) لێیەوە هێناوە: (**كَانَ أَسرَاهُم يَومَئِذٍ المُشرِكُون، وَأَخُوكَ المُسلِم أَحَقُّ أَن تُطعِمَهُ**) ئەو کاتە دیلەکانیان خەڵکی موشریك بوون، بەڵام برای مسوڵمانت شایستەترە خواردنی پێ بدەی.

هەروەها (**الطبري**) بە ژمارە (٣٥٨٩١) لە موجاهیدەوە هێناویەتی: (**الأَسِيرُ: المَسجُونُ**)، دیل یانی: حەپسکراو، بەندیی.

بەڵام (**الطبري**) دەڵێ: (**الصَّوابُ أَنَّه عامٌّ لِلفَرِيقَين**)، ڕای ڕاست ئەوەیە کە گشتگیرە بۆ هەردووك کۆمەڵەکە، هەم دیل دەگرێتەوەو هەم بابای گیراوو بەند کراویش دەگرێتەوە.

واتە: ئەو کەسانەی لە کۆمەڵگادا پێویستییان بە هاوکاریی هەیە، خوا ﷻ لێرەدا باسی نەدار (**مِسكين**) کردوەو، لە شوێنی دیکە باسی هەژار (**فقير**) دەکات و، باسی ڕێبوار (**إبن السبيل**) دەکات، بەڵام لێرەدا ئەو سێیەی هێناون، چونکە ئەو کەسانەی ئەوکاتە لەو قۆناغەدا لە کۆمەڵگەدا پێویستییان بە هاوکاریی و دەستگرۆیی هەبووە، ئەو سێ جۆرە کەسە بوون.

٨)- ﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ ﴾، (لە دڵی خۆیاندا دەڵێن، یان لەبەر خۆیانەوە دەڵێن:) ئێمە تەنیا لەبەر ڕووی خوا خواردنتان دەرخوارد دەدەین، (**الطبري**) گوتوویەتی: ﴿ لِوَجْهِ

ٱللَّهِ ﴾، (يَعْنُونَ طَلَبَ رِضَا اللَّهِ، وَالْقُرْبَةَ إِلَيْهِ)، (لوجه الله) مەبەستیان پێی وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خواو لە خوا نزیك كەوتنەوەیە.

(الطبري) لە موجاهیدەوە بە ژمارە (٣٥٨٩٥) هێناویەتی: (قَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ مَا تَكَلَّمُوا بِهِ، وَلَكِنْ عَلِمَهُ اللَّهُ مِنْ قُلُوبِهِمْ، فَأَثْنَى بِهِ عَلَيْهِمْ، لِيَرْغَبَ فِي ذَلِكَ رَاغِبٌ)، گوتوویەتی: ئاگاداربن! كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴾، ئەو قسەیان نەكردوە، بەڵكو لە دڵیاندا بووەو خواش كە لە دڵیاندا بووە دەریخستوەو كردوویەتی بە ستایش بۆیان، تاكو بەهۆی ئەوەوە كەسێك كە ئارەزوومەندە بۆ چاكە، چاكە بكات.

هەروەها (الطبري) لە سەعیدی كوڕی جوبەیریش بە ژمارە (٣٥٨٩٦)، هەمان قسەی هێناوە، كە ئەو قسەیان لە دڵی خۆیاندا كردوە.

دەڵێم: دەگونجێ لەبەر خۆیانەوەش كردبیان، بەدەنگی پەنهان و كەپ.

هەندێكیش لە زانایان گوتوویانە: ئەو قسەیان گوتوە تاكو حاڵییان بكەن كە هیچ چاوەڕوانییەكیان لێیان نیە، ئنجا ئەگەر بەو پاساوە بێ، ڕێی تێدەچێ، بەڵام كە لە دڵی خۆیاندا وایانگوتبێ، یان لەبەر خۆیانەوە وایانگوتبێ، بێ ئەوەی ئەوان گوێبیست بن، ئەو مانایە باشترە.

﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ ﴾، ئێمە تەنیا لەبەر ڕووی خوا، لەبەر ڕەزامەندیی خواو پاداشتی خوا، یاخود بۆ ئەوەی بە دیداری خوا بگەین، بۆیە خواردنتان دەرخوارد دەدەین.

٩)- ﴿ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴾، نە پاداشتمان لێتان دەوێ، نە سوپاسكردن، پاداشت (**جزاء**)ەكە ئەوەیە بە شێوەی ماددیی بێ، سوپاسكردن (**شكور**)یش ئەوەیە بە شێوەی مەعنەویی بێ، یان: پاداشت ئەوەیە ئەوانیش چاوەڕوانییان هەبێ، ڕۆژێك هاوكارییەكی ئاوایان بكەن، (**شكور**)یش ئەوەیە خۆیان بە منەتباریان بزانن و سوپاس و ستایشیان

بکەن، بۆیە دەگێڕنەوە دەڵێن: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کە خێرێکی دەکرد، خواردنێکی بۆ کەسێك دەنارد، هاوکارییەکی دەکرد، بەو کەسەی پێیدا دەنارد دەیگوت: گوێی لێبگرە داخۆ نزامان بۆ دەکات، قسەیەك دەکات؟ ئنجا ئەگەر هاتبایەوەو گوتبای: ئا وای گوت، دایکمان عائیشەش هەمان نزای بۆ دەکردەوەو بۆی دەپاڕایەوە دەیگوت: با لە پاداشتەکەم کەم نەبێتەوە، چونکە ئەگەر سوپاسم بکات، دەبێ منیش سوپاسەکەی بکەمەوەو، ئەگەر دوعام بۆ بکات، هەمان دوعای بۆ دەکەمەوە، بۆ ئەوەی پاداشتەکەم لەجێی خۆی بێ و کەم نەکات.

١٠)- ﴿ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴾، (دەڵێن:) بە دڵنیایی ئێمە لە پەروەردگارمان دەترسین ڕۆژێکی ڕووگرژی سەخت و بێڕەزا. ئنجا ئایا مەبەست ئەوەیە: ڕۆژەکە گرژو سەخت و بێڕەزایە؟ یان مرۆڤ تێیدا ڕوو گرژ دەبێ؟

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) **(الطبري)** بە ژمارە (٣٥٨٩٧) لێیەوە هێناوە دەڵێ: **(يَعبِسُ الكافِرُ يومَئِذٍ حَتَّى يَسِيلَ مِن بَينِ عَينَيهِ عَرَقٌ مِثْلُ القَطْرَانِ)**، لەو ڕۆژەدا بابای بێبڕوا ڕووی گرژ دەبێ، هەتا لەنێو هەردوو چاوانی (لە نێو چەوانی) ئارەقێکی وەك قەترانی ڕەش دێتە خوار (لە ئەنجامی پەستیی و تووڕەیی دا).

وشەی ﴿ قَمْطَرِيرًا ﴾، **(الطبري)** لە **(إبن عباس)**ەوە بە ژمارە: (٣٥٩٠٠) هێناویەتی: **(يُقبِّضُ ما بَينَ العَينَينِ)**، واتە: نێوان دوو چاوان گرژ دەکات.

بەڵام **(إبن زيد)** **(الطبري)** بە ژمارە (٣٥٩٩١) لێیەوە هێناوە: **(الْقَمْطَرِيرُ: هُوَ الشَّدِيدُ)**، **(قمطرير)** واتە: سەخت، هەروەها لە **(إبن عباس)**ەوە هاتوە: **(الْقَمْطَرِيرُ: الطَّوِيل)**، **(قمطرير)** ڕۆژێکی درێژ، کەواتە: دەتوانین بڵێین: ﴿ قَمْطَرِيرًا ﴾، یانی: سەخت و بێڕەزاو توندو بەهێزو، خوا ئەو ڕۆژە دەچوێنێ بە کەسێکەوە کە ڕووی گرژ کردوە، دەشگونجێ بڵێین: بابای کافر تێیدا ڕوو گرژو ناڕەحەت و مەینەتبار دەبێ.

پێشتریش ئاماژەم پێدا لێرەدا کە خوا ﷻ وشەی (**إطعام**)ی بەکارهێناوە: ﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ ﴾، ﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ ﴾، خواردنیان دەرخوارد دەدەن، لە بەر ئەوەیە کە خواردن پێدان (**إعطاء الطَّعام**) ئەوەیە بە کەسێك دا بۆی بنێری، یان پارەیەکی بدەیە خواردنی پێ بکڕێ، بەڵام خواردن دەرخوارد دان (**إطعام**) ئەوەیە ئەوکەسە دابنێی و خواردنەکەی پێ بدەی، بەدڵنیایی ئەو کاتە بەر لە جەستەکەی، ڕووحەکەی تێروپڕ دەکەی بەهۆی ڕێز لێگرتنەوە، بۆیەش خوا ﷻ ئەم تەعبیرەی بەکارهێناوە لێرەو لە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا، تاکو ئەوە بگەیەنێ کە بابای برسیی و ئاتاج، تەنیا ئەوە نیە خواردنەکەی وێبدەی و گەدەو جەستەی تێربکەی، بەڵکو دەبێ ڕێزو حورمەتیشی لێ بنێی و دڵیشی بدەیەوەو لە پەنای خۆتی دابنێی، ئەو کاتەش ڕووحیشی تێر دەبێ، وەك چۆن جەستەی تێر دەبێ.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

پاراستنی خوا ﷻ بۆ چاکەکاران لە خراپەو دژواری ڕۆژی قیامەت و، ڕەخساندنی گەشیی و شادمانیی بۆیان و، پاداشتدانەوەیان بە باخ و ئاوریشم و، پاڵدانەوەیان تێیدا (لەنێو بەهەشتدا) لە سەر تەختان لە جەوێکی نەساردو نەگەرمداو، بۆلا شۆڕبوونەوەی سێبەری لق و پۆپەکانی درەختەکانی ئەو باخەو، ئاسانکرانی چنینی میوەکان و، قاپی زیوینی پڕ لە خۆراك بەسەرەوە گێڕدران و، پەرداخی بلوورینی پڕ شەڕابی ئەندازەگیریی کراوو، پێ نۆشرانی پێکی زەنجەبیل تێکراو، لەسەرچاوەی سەلسەبیل و، لاوانی بە لاویی هێڵدراوە بەسەرەوە گەڕانیان بۆ خزمەت کردن، کە وەك گەوهەرو مرواریی پڕژاو دەیانبینی و، هاتنە بەر نیگای نیعمەت و موڵکێکی فراوان و، پۆشینی بەرگی ئاوریشمی سەوزی تەنك و ئەستوورو، ڕازێنرانەوەیان بە بازنە زیوینەکان و، پێ نۆشینی پەروەردگاریان، خواردنەوەیەکی پاککەرەوەو، گوترانی: ئەمە پاداشتتانەو هەوڵ و تێکۆشانتان سوپاسکراوو نرخێنراوە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۖ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَـٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَـٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ ۖ وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَـٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست بڕگەدا:

بەڕێـــــزان!

خـوا ﷻ لـە ئایەتـەکانی پێشـێدا، بـاسی هەندێـك لـەو نـازو نیعمەتانـەی کـرد بـە بڕوادارانیـان دەبەخشـێ، کـە بـە: ﴿ ٱلۡأَبۡرَارَ ﴾، چاکـەکاران پێناسـەی کـردن، وشـەی (أَبْرَار)یـش کـە خـوای پـەروەردگار کردوویـەتی بـە ناوونیشـانی سـەرەکیی ئـەو بەنـدە چاکانـەو دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴾، (أَبْـرَار) کـۆی (بَـرّ)ەو، (بـارّ) بـە (بَـرَرَة) کۆدەکرێتـەوە، هـەرکام لـە (بَـرّ)ە، (بَـارّ) یـش یـانی: چاکـەکار، خـوا لـە ئایەتـەکانی پێشـێدا بـاسی هێندێـك لـە پاداشـتیانی کـرد، هـی ئـەو چاکەکارانـە، دوایـی هاتـە سـەر خسـتنەڕووی هەندێـك لـە کـردەوەو خەسـڵەتە باشـەکانیان، کـە هۆکارێـك بـوون بـەو پاداشـت و بـەو نـازو نیعمەتـە بگـەن، ئنجـا دووبـارە خـوا ﷻ بـە بۆنـەی ئـەوەوەی ئـەوان گوتیـان: ﴿ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ۝٩ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوۡمًا عَبُوسٗا قَمۡطَرِيرٗا ۝١٠ ﴾، ئێمـە تەنیـا لەبـەر ڕووی خـوا خواردنتـان دەرخـوارد دەدەیـن و، هیـچ پاداشـتیك و هیـچ سوپاسـکردنێکمان لێتـان نـاوێ، ئێمـە مەترسیی ڕۆژێـکی گـرژو ناخـۆش و ناهەمـوار و سـەخت و دژوارمـان هەیـە، لـە لایـەن پەروەردگارمانـەوە کـە مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـە، بـەو بۆنـەوە، خـوا فەرمـووی:

١)- ﴿ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمِ ﴾، ئنجا (بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد) خوا لە خراپەو زیانی ئەو ڕۆژە چەپاڵەی دان، پاراستنی. یانی: کە ئەوان گوتیان: مەترسیی ڕۆژێکی دژوارمان هەیە لە لایەن پەروەردگارمانەوە بۆمان بێتە پێش و، ڕۆژی سزاو جەزرەبەی خراپەکارانە، پێشێ باسی ئەوەیان کرد کە پاڵنەرو هاندەری ئێمە داوا کردنی ڕەزامەندیی خواو دیداری خوایە، دواییش باسی ئەوەیان کرد ئێمە مەترسیی ڕۆژێکی دژوارمان هەیە، کەواتە: ئێمە بە دوو هاندەران ئەوکارە دەکەین: أ- ڕازییکردنی خواو وەدەست هێنانی پاداشتی خواو، نیزیك کەوتنەوە لە خواو، ئەنجامدانی بەندایەتیی بۆ خوا. ب- هاندەری

دووەمیش ئەوەیە کە خوا ﷻ هەڕەشەی کردوە لە خراپەکاران و یەکێك لە خراپەکانیش نەبەخشینی ماڵ و سامانە بۆ کەسانێك کە بۆی ئاتاجن و پێویستییان پێیەتی، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ ﴾، لە ئەنجامی ئەوەدا، خوا لە خراپەی زیان و ناڕەحەتیی و ناهەمواریيەکانی ئەو ڕۆژە، چەپاڵەی دان و پاراستنی.

٢)- ﴿ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴾، ڕووگەشیی و شادمانییشی پێبەخشین، (**لَقَّاهُم**) ڕوونکەرەوانی قورئان بە (**أَعطاهُم**) و (**ءَاتاهُم**) لێکیان داوەتەوە، واتە: پێیدان، پێی بەخشین، ڕووگەشیی و شادمانیی پێ بەخشین، بەڵام ئەوە ڕاست نیەو (**وَلَقَّاهُمْ مَعْنَاهُ: جَعَلَهُمْ يَلْقَوْنَ نَضْرَةً وَسُرُورًا**)، واتە: وایلێکردن تووش بن و وەدەست بێنن، ڕووگەشیی و دڵخۆشیی، ڕووگەشیی و دڵخۆشییش دوو شتی پێکەوە پەیوەستن، وەك چۆن خەم و ناڕەحەتیی و ڕوو گرژیی، یان: خەمباریی و تەمی پەژارە لە دەم و چاو نیشتنیش، دوو شتی پێکەوە پەیوەستن، ئینسان کە دڵی خۆش بوو، ڕووشی گەش دەبێ و، ئەگەر خەم و ناڕەحەتیی لە دڵ و دەروونیدا هەبوو، دەم و چاویشی تاریك و لێڵ دەبێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴾، وای لێکردن هەم ڕووگەشیی و، هەم شادمانیی و دڵخۆشییان بۆ دەستەبەر بێ و پێیان بگەن.

٣)- ﴿ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴾، بەهۆی ئەوەوەش کە خۆیان ڕاگرت (لەسەر جادەی شەریعەت و، خۆیان ڕاگرت بۆ ئەنجامدانی ئەرکە شەرعییەکانیان) پاداشتی دانەوە بە باخ و ئاوریشم.

بێگومان نازو نیعمەتەکانی کە خوا بۆ چاکەکارانی داناون لە بەهەشتدا، لە قەدەر بەخششی بێ سنووری خواو، بەزەیی بێ سنووری خواو، کەڕەمی بێ سنووری خوان، بۆیە بەزۆر جۆرو شێوازی دەربڕین، تەعبیر دەکات لەو نازو نیعمەتە، لێرەدا دەفەرموێ: پاداشتی دانەوە بەهۆی زۆریی خۆڕاگرییەکەیانەوە، بەهۆی ئەوەوەی خۆیان ڕاگرت، کە بەدڵنیایی خۆڕاگرتنەکەیان لەسەر فەرمانبەریی بۆ خواو پابەندیی بە شەریعەتەوە بووەو، لەسەر ڕۆیشتن لەسەر

جادەی شەرع و گوێڕایەڵیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، خوا پاداشتی دانەوە بە باخ و ئاوریشم، باخەکە دیارە جێگاو ڕێگایەکەیەو، ئاوریشمیش بۆ بەرگ و پۆشاکەکەیانە، بەڵام هەر ئەوەندەش نیەو، واپێدەچێ ئاوریشم پێکهاتەی سەرەکیی کەل و پەلەکانیان بێ، بە کوردیی دەڵێین: ئاوریشم و، بە فارسیی دەڵێن: (أبریسم)و لە یەکدییەوە هاتوون، (**الحَرِيرُ: اسْمٌ لِخُيُوطٍ مِن مُفْرَزَاتِ دُودَةٍ القَزِّ**)، (**حرير**) ناوە بۆ ئەو دەزووانەی کرمی ئاوریشم وەك لیك دەریان دەکات، دوایی وەك قۆزاخەیەك بە دەوری خۆیدا دەیچنێ و، سەرەنجام بەخۆی تێیدا دەخنکێ، بەڵام ئەو لیکەی بە دەوری خۆیدا کردوویەتە قۆزاخە، ئەو دەزووە دەبێتە دەزوویەك کە باشترین جۆری پۆشاکی لێ دەچنرێ.

٤)- ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ ﴾، لەوێدا [ڕاناوەکە بۆ بەهەشت دەچێتەوە، یان بۆ باخەکە]، پاڵیانداوەتەوە، لەسەر تەختان.

﴿ مُّتَّكِـِٔينَ ﴾، کۆی (**مُتَّكِئ**)ە، ئەویش ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە، لە (**إِتَّكَأَ، يَتَّكِئُ، إِتِّكَاءً، فَهُوَ مُتَّكِئٌ**)، بە کوردیی ئەم وشەیە بە پاڵدانەوەو، شاندادان، مانای دەکەین، پێشتریش گوتوومانە: (**وَالاِتِّكَاءُ: جِلْسَةٌ بَيْنَ الْجُلُوسِ وَالإِضْطِجَاعِ، يَسْتَنِدُ فِيهَا الجَالِسُ عَلَى مِرْفَقِهِ وَجَنْبِهِ، وَيَمُدُّ رِجْلَيْهِ، وَهِيَ جِلْسَةُ ارْتِيَاحٍ**)، (**إِتِّكاءُ**) بریتییە لە جۆرە دانیشتنێك کە لە نێوان دانیشتنی ئاسایی و ڕاکشاندایە، بابای پاڵداوەوە، سەنگ دەخاتە سەر ئانیشکی و سەر تەنیشتی و لاقەکانیشی ڕادەکێشێ، ئەمەش دانیشتنی پشوودان و ئاسوودەییە.

﴿ ٱلۡأَرَآئِكِ ﴾یش کۆی (**أَرِيكَة**)یە، ئەویش بە قەنەفەو تەخت دەڵێن، کە خەڵك لەسەری دادەنیشێ، ئەوەی ئێستا بۆ ئێمە دیارە، کورسیی و قەنەفەیە، بەڵام کاتی خۆی تەخت هەبووە کە ڕەنگە ئێستا کەمتر بەکاربهێنرێ، تەخت مرۆڤ توانیویەتی لەسەری ڕاکشێ، لەسەری پاڵداتەوەو جێی نەفەرێك یان زیاتریشی لەسەر دەبێتەوە، یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان ئاوا پێناسەی ﴿ ٱلۡأَرَآئِكِ ﴾، دەکات:

(الأَرَائِكِ: جَمْعُ أَرِيكَةٍ بِوَزْنِ سَفِينَةٍ، الأَرِيكَةُ: سَرِيرٌ عَلَيْهِ وِسَادَةٌ مَعَهَا سِتْرٌ وَهُوَ حَجَلَتُهُ، وَهِيَ كِلَّةٌ تُنْصَبُ فَوْقَ السَّرِيرِ لِتَقِيَ الحَرَّ وَالشَّمْسَ، وَلَا يُسَمَّى السَّرِيرُ أَرِيكَةً، إِلَّا إِذَا كَانَ مَعَهُ حَجَلَةٌ).

واتە: ﴿ٱلْأَرَآئِكِ﴾، كۆی (أَرِيكَةٍ)یە، لەسەر كێشی (سَفِينَة)، بریتیە لە تەختێك كە باڵنجێك یان سەرینێكی لەسەرە، پەردەیەكی بەسەردا دراوە، كە پێی دەگوترێ: (حَجَلَة)، ئەویش بە كوردیی پێی دەگوترێ: (پەردە كوللە)[1]، كە پۆشاكێكە بەسەر ئەو تەختەدا دەدرێ، بۆ ئەوەی لە گەرماو لە تیشكی خۆر بیپارێزێ.

(المعجم الوسیط)[2] ئاوا پێناسەی مانای (كِلَّة) دەكات: (الكِلَّةُ: سِتْرٌ رَقِيقٌ مُثَقَّبٌ يُتَوَقَّى بِهِ مِنَ البَعُوضِ وَغَيْرِهِ وَالجَمعُ كِلَل)، (كِلَّة): پۆشاكێكی تەنكی كونكونە (بەڵام كونەكانی زۆر وردن) خۆی پێ دەپارێزرێ لە مێشوولەو جگەلە مێشوولەش، (كِلَّة)ش بە (كِلَل) كۆدەكرێتەوە.

٥)- ﴿لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾، لەو باخەدا (یان لەو بەهەشتەدا) نە خۆری تێدا دەبینن، نە سەرماو زوقم.

ئێمە لە دنیادا پێویستییمان بە خۆرە، خوای پەروەردگار ڕۆژی بۆ داگیرساندووین، هەم تیشكمان دەداتێ هەم ڕووناكیی، لە شەویشدا خوا ﷻ لەبەر ئەوەی شەو كاتی پشوودان و ئیسڕاحەتە، هەم مانگی بۆ داگیرساندووین، بۆی ڕووناك كردووینەوە، هەم ئەستێرەكانیش، مرۆڤیش بە لاسارییكردنەوەی دروستكراوی خوا، لەكاتێكدا بیەوێ شەو ڕووناك بێ، لامپاو لۆكسێك، گلۆپێك هەڵدەكات (لامپاو لۆكس كاتی خۆی هەبوون) بەڵام لەكاتی خەوتندا شتێكی كەم شۆق پێدەكات، مۆمێك، گلۆپێكی سفر، بەڵام لە بەهەشتدا بەدڵنیایی نە پێویستیی بە خۆر هەیە بە ڕۆژێ، نەبە شەو پێویستیی بە مانگ و ئەستێران هەیە، خوا

---

(١) كِلَّة: پۆشاكی سەر تەخت و شوێنی خەوتن و پشوودان.

(٢) ص: ٧٩٦.

ﷻ بـە جۆرێـكی دیكـە جـەوی بەهەشـت ڕووناك دەكاتـەوەو، بەهەشـتییەكانیش خەویـان نیـە، تاكـو پێویسـتییان بـە كاتێـك بـێ، دنیـا تاریـك و كـش و مـات بـێ و تێیـدا بخـەون، چونكـە پرسـیار كـراوە لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەربـارەی خـەو (خەوتـن) لەبەهەشـتدا فەرموویـەتی: بەهەشـت خـەوی تێدا نیـە، چونكـە: {«**النَّوْمُ أَخُو الْمَوْتِ**»} (**أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٤٧٤٥، والديلمي: ٦٩٠٧**)، واتـە: نوسـتن بـرای مردنـە، مرۆڤـەكان لـە دنیـادا بۆیـە پێویسـتییان بـە خـەو هەیـە، تاكـو مانـدوو بـوون و شـەكەتیی جەسـتەیان دەرچـێ و خانەكانیـان تـازە ببنـەوە، بـەڵام لـە بەهەشـتدا ئـەو ماندوویەتیـی و شـەكەتیی و ناڕەحەتییـەی لـێ نیـە، تاكـو مـرۆڤ پێویسـتیی بەسـەر خـەوو پشـوودان هەبێـت بـۆ دەركـردنی ماندوویەتیـی جەسـتەی.

﴿ وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴾، هەروەهـا سەرماشـی تێدا نابینـن، وشـەی (**زَمهَرِير**) هەندێكیـان بـە (**البَرْدُ القارِس**) واتـە: ساردییەكی زۆر، یـان سـەرماو زوقـم و، هەندێكیـان بـە: (**البَرْدُ الشَّدِيد**)، سـەرمایەكی تونـد، مانایـان كـردوە.

٦)- ﴿ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا ﴾، سێبەرەكانی وی (سێبەری درەختەكانی ئەو بەهەشتە) بە سەریانەوە نیزیكن، یەكێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان تەعبیرەكەشیم پێ جوانە، دەڵێ: (**كِنَايَةٌ عَنْ تَدَلِّي الْأَدْوَاحِ الَّتِي مِنْ شَأْنِهَا أَنْ تُظَلِّلَ الْجَنَّاتِ فِي مُعْتَادِ الدُّنْيَا، وَلَكِنَّ الجَنَّةَ لَا شَمْسَ فِيهَا فَيُسْتَظَلُّ مِن حَرِّهَا، وَالمَقصُودُ تَدَلِّي أَفنانِ الجَنَّة**).

واتـە: كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا ﴾، لەحاڵێكـدا كـە سـێبەرەكانی ئـەو باخانـە لێیـان نیزیكـن، مەبەسـت پێـی شـۆڕ بوونـەوەی لـق و پۆپەكانە، لـق و پۆپەكان كاتێـك شـۆڕ دەبنـەوە، سـێبەر لـەوەی لـە ژێریـان دایـە دەكـەن، لـە دونیـادا وایـە، بـەڵام لەبەهەشـتدا لەبـەر ئـەوەی خـۆری تێدانیـە، خەڵـك خـۆی لـە گەرمایەكـەی بپارێـزێ و بچێتـە نیسـێ و سـێبەران، بۆیـە مەبەسـت لـە نیزیكیـی سـێبەرەكانی، شـۆڕبوونەوەو نیزیكیـی لـق و پـۆپ و چڵـەكانی دارو درەختـەكانی بەهەشـتە.

دەشـگونجێ لـق و پۆپـەکان سێبەریشـیان هەبـێ، بـەڵام بـەو واتایـە نـا لەبـەر گەرمـا، بەڵکـو لەبـەر ئـەوەی دیمەنێـکی جوانـە، بێگومـان ئێمـە هەرگیـز ناتوانیـن ئـەو نـازو نیعمەتـەی لـە بەهەشـتدا هەیـە، ئێسـتا وێنـای بکەیـن و بیهێنینـە بـەر چـاوی خۆمـان، چونکـە سیسـتمی بەهەشـت و ڕۆژی دوایـی بـە گشـتیی هەمـووی جیایـە لەهـی ئێـرە، هـەر بۆیـەش خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (**السـجدة**)دا بـە یـەك ڕسـتەی کـورت بـۆ کەسـێك بیـر بکاتـەوە، ئێمـەی لـەو ڕاسـتییە حاڵیـی کـردوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾**السـجدة**، واتـە: هیچکـەس نازانـێ ئـەوەی بـۆی پەنهـان کـراوە، لـەوەی مایـەی شـادمانیی و دڵخۆشـییەتی، مایـەی ئەوەیـە چـاوی فرمێسـکی شـادیی پێـدا بـێ، هیچکـەس چییـەتی ئـەوە نازانـێ، هەروەهـا پێغەمبەریـش ﷺ هـەر لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو فەرمایشـتەی خـوادا، جـوانی بـۆ ڕوونکردووینـەوە کـە دەفەرمـوێ: {**إِنَّ فِي الجَنَّةِ مَـا لا عَـيْنٌ رَأَتْ، وَلا أُذُنٌ سَـمِعَتْ، وَلا خَطَـرَ عَـلَى قَلْـبِ بَـشَرٍ**}، (**أخرجـه أحمـد: ٨١٢٨، والبخـاري: ٣٠٧٢، ومسـلم: ٢٨٢٤، والترمـذي: ٣١٩٧**) واتـە: ئـەوەی لـە بەهەشـتدا هەیـە، نـە هیـچ چاوێـك دیتوویـەتی، نـە هیـچ گوێیـەك بیسـتوویەتی، نـە بەسـەر دڵ و بیـرو خەیاڵـی هیـچ کەسیشـدا هاتـوە.

چونکە هەر شتێك هەبێ:

١- یان مرۆڤ خۆی ڕاستەوخۆ دەیبینێ.

٢- یان ئەگەر نەیبینێ، دەیبیستێ، وەك دەڵێن: جارێك کابرایەك گوتوویەتی: فڵان شتە زۆر خۆشە، گوتوویانە: خواردووتە؟ گوتوویەتی: نەخێر بەڵام کاکم لە شار خواردوویەتی، کەواتە: کاکی بۆی گێڕاوەتەوە!

٣- یان ئەگەر بۆشی نەگێڕنەوە، بە بیرو خەیاڵیدا بێ.

ئنجا ئـەوەی لـە بەهەشـتدا هەیـە، نـە چـاو دیتوویـەتی، نـە گـوێ بیسـتوویەتی، نـە بـە خەیاڵـی هیـچ کەسیشـدا هاتوە!

ئەوەشم بۆیە گوت، تاكو وانەزانین كە بەهەشت تەنیا ئەوشتانەی تێدان خوا بۆی خستووینە ئەو قاڵبە تەعبیریانەوە، كە عەقڵی ئێمە هەر لەوانە تێدەگات، ئەگەرنا خوا ﷻ چۆن ئێمە حاڵیی بكات؟ ئەوەی بۆ ئێمە خۆشە: سێبەرە، ئاوی سازگارەو، تاڤگەیە، باخ و باخاتە، جۆگەو جۆبارە، كۆشكی زێڕ و زیوە، یانی: ئەوەی بۆ ئێمە زانراوەو لێی حاڵیی دەبین ئەو شتانەن، بۆیە خوا ﷻ كە نازو نیعمەتەكانی بەهەشت باس دەكات و وەسف دەكات، هەر دەیانخاتە قاڵب و چوار چێوەی ئەو وشەو دەربڕینانەی كە ئێمە بەكاریان دێنین، بەڵام وێڕای ئەوە بە ئاماژەش پێمان دەفەرموێ: ئەوەی لەوێ هەیە، هیچكەس نایزانێ، واتە: وامەزانن نازو نیعمەتی بەهەشت بەس ئەوەندەیە، كە خوای پەروەردگار بەو وشانە تەعبیری لێ دەكات، وامەزانن نازو نیعمەتەكانی ئەو بەهەشتەی خوای بەخشەرو میهرەبان، داینـاوە بۆ دۆستانی خۆی، بۆ بەندە چاكەكارەكان، هەر وەك ئەوانەی دونیان[1]! عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ)، تەعبیرێكی جوان بەكاردێنێ، كاتێ خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**البقرة**)شدا باسمان كرد[2]، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ﴿...وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَـٰبِهًا...﴿٢٥﴾﴾، نیعمەتەكانی بەهەشتێ، یان خواردن و خواردنەوەكانی بەهەشتییان بۆ هێنران، وێكچوون، یان وەك هی دونیایە دەچوون، عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس

---

(١) شەوێك بێ ئەوەی بەداڵغەو خەیاڵی ئەوەو بخەوم، خەونم بە دوو لە مامۆستایانی دۆست و ناسراوەوە كۆچكردووەوە بینی، لێم پرسین: ئەرێ مامۆستایان! بەهەشت جگە لەوەی خوا لە قورئان و پێغەمبەرەكەی لە سوننەتی باسیان كردوە، هیچی دیكەی تێدایە؟! یەكیان گوتی: هەر ئەوەیە كە باسكراوە، بەڵام ئەوی دیكەیان گوتی: بەڵێ شتی دیكەشی تێدایەو بۆ تۆش باسی زۆر شت دەكرێ.

مامۆستایەكی تەعبیر زان (مُعَبِّر)یش گوتی: هی یەكەمیان زۆر ئاگاداری حاڵ و باڵی بەهەشت نیە، بەڵام هی دووەمیان حاڵی باشە.

(٢) هەروەها لە تەفسیری چەند سوورەتێكی دیكەش دا ئەو مەسەلەیەمان باسكردوە، بەتایبەت سوورەتی (السجدة) و سوورەتی (الواقعة).

دەڵێ: ئەوەی خوا باسی دەکات لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت، لەگەڵ ئەوەی دنیادا، تەنیا لە ناودا یەك دەگرنەوە، تەنیا ناوەکەیان وەك یەکە، بۆ وێنە: خوا باسی ئاو دەکات، بەڵام ئاوی بەهەشت لەگەڵ ئاوی ئێرە، بەس ناوەکەیان ئاوەو لە ناودا یەك دەگرنەوە، یان کە باسی شەراب دەکات، یان باسی میوە دەکات، یان باسی گۆشت دەکات، یان باسی کۆشك و تەلار دەکات، یان باسی دارو درەخت دەکات، تەنیا لە ناوەکەدا لەگەڵ ئەوانەی دنیایە دا یەك دەگرنەوە، بەڵام لە نێوەڕۆکدا جیاوازییان ئاسمان و ڕێسمانە.

٧)- ﴿ وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴾، میوەکانیشی بە دەستەمۆ کران مل پێ کەچکراون، (**قُطُوف**) کۆی (**قِطف**)ە، واتە: چنراو، ئەو میوەیەی دەچنرێ، بەڵام (**قَطْف**) چنینە، کردارەکەیە (**قَطَفَ، يَقطِفُ، قَطْفاً، فَهُوَ قِطفٌ**)، واتە: چنی، دەیچنێ، چنین، ئەو چنراوە، دەفەرموێ: چنراوەکان، میوەکان، مل پێ کەچکراون، بە مل پێ کەچکردنێکی نایاب، یەکێك لە زانایان دەڵێ: (**سُهِّلَتْ لَهُم قَطفُ قُطُوفِ تِلكَ الأَدواح**)، چنینی میوەکانی لقەکانی ئەو درەختانەیان بۆ ئاسانکراون.

٨)- ﴿ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ ﴾، هەروەها قاپە زیوینەکانیان بەسەرەوە دەگێڕدرێن، (**آنِيَة**) کۆی (**إِناء**)ەو (**أَوانِي**)یش کۆی (**آنِيَة**)یە، واتە: کۆی کۆیە، چونکە وشەی (**يُطافُ عليهم**) بەسەریانەوە دەگێڕدرێن، لە (**طَوافُ**)ەوە هاتوە (**الطَّوافُ: مَشيٌ مُكَرَّرٌ على شَيءٍ أَو بَينَ أَشياءَ**)، (**طواف**): لە ڕۆیشتنێکی دووبارە کراوەیە بە دەوری شتێکدا یاخود لە نێوان چەند شتێکدا، (**آنِيَة**)ش وەك گوتمان: (**جَمعُ إِناء، مِثلُ أَكسية جَمعُ كساء، وَهُوَ اسمٌ لِكُلِّ وِعاءٍ يُنتَفَعُ بِهِ**)، (**آنِيَة**) کە کۆی (**إِناء**)ە، [بە کوردیی دەڵێین: دەفر، قاپ، بەپێی جیاوازیی لەهجەکانی زمانی کوردیی ئەو وشانە بەکار دەهێندرێن، بەڵام بە عەرەبیی دەگوترێ: (**إِناء**)] وەك چۆن (**أَكسية**) کۆی (**كِساء**)ە، (**آنِيَة**)ش کۆی (**إِناء**)ە، کە بریتیە لە هەر دەفرێك سوودی لێ ببینرێ، شتی تێبکرێ، بێگومان ئەو قاپ و دەفرانەش کە بەسەریانەوە دەگێڕدرێن، قاپ و دەفری خاڵیی نین، ئنجا یان میوەیان تێدان، یان گۆشتیان تێدایە، یان ئەو خواردنانەیان تێدان کە بەس خوا دەزانێ ﷻ.

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (الزخرف) دا بە جۆرێکی دیکە تەعبیر لەوە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٧١ ﴾، واتە: بەسەریانەوە دەگێڕدرێن بە قاپانی زێڕینەوەو بە گۆزانەوەو لەوێدا هەیە هەرچی نەفسەکان بیخوازن و، چاوەکان چێژی لێوەربگرن و، ئێوە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

کەواتە: لە سوورەتی (**الزخرف**)دا باسی قاپ و دەفری زێڕین دەکات، (**أَكْوَاب**)یش کە دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر (**صِحاف**) وا دیارە ئەوانییش بەهەمان شێوە هەر لە زێڕن.

٩)- ﴿ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ﴾، هەروەها بە گۆزانەوە کە ڕوون و بلوورییین، (**أَكْوَاب**) کۆی (**كُوب**)ە، (**الأَكْوَابَ تُحْمَلُ فِيهَا الخَمْرُ لِإِعَادَةِ مَلْءِ الكُؤُوسِ**)، کووبەکان ئەوانەن کە شەڕابیان تێدا هەڵدەگیرێ، بۆ پڕ کردنەوەی پەرداخەکان، کەواتە: کووب یانی: سوڕاحیی، گۆزە، شەربەی گچکە، ئەو وشانە بەکاردەهێنرێن بۆ ئەو دەفرانەی خواردنەوەیەکیان تێدایە، ئنجا بە نسبەت ئێمەی خەڵکی دنیاوە، ئاوە، ماستاوە، دۆیە، شەربەتە، گرنگ ئەوەیە شلەمەنییەکی خواردنەوەیان تێدایەو، پەرداخەکانیان لێ پڕ دەکرێنەوە، کەواتە: (**كُوب**) کە بە (**أكواب**) کۆدەکرێتەوە، گەورەترە لە (**كَأْس**) کە پەرداخەو لێی پڕ دەکرێ و پێی دەخورێتەوە، ئنجا ئایا ئەو کووبانە لە چ ماددەیەکن؟ ﴿ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ﴾، ﴿ قَوَارِيرَا۠ ﴾، بە (ئەلیف) خوێندراوەتەوە: (**قَوارِيرا**) هەروەها بە تەنوینیش خوێنراوەتەوە: (**كانَتْ قَوارِيراً**)، هەروەها لە هی دواییش دا: (**قَوارِيراً مِنْ فِضَّةٍ**) یان (**قَوارِيرَا مِن فِضَّةٍ**) بە تەنوین و بەبێ تەنوینیش خوێندراونەوە، (**قَوارِير**)یش کۆی (**قَارُورَة**)یە، (**قَارُورَة**) ش بریتیە لە دەفرێك لە شووشە دروستکرابێ، یاخود دەفرێکی ڕوونی بلوورییین، گرنگ ئەوەیە ماددەکەی زۆر ڕوون و درەوشاوەبێ.

١٠)- ﴿ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٖ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا ﴾، ئەو دەفرە بلوورییە شووشە ئاسایانەش لە زیون، بە ئەندازەگیرییەکی ورد ئەندازەگیریی کراون. عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ لێی گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەوەی خوا لە بەهەشتدا باسی کردوە،

هەمووی وێنەکەی لە دنیادا دەزانین، جگەلە: ﴿ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ ﴾، نازانین، چۆن دەفرێك شووشەش بێ و زیویش بێ! ئەوە بەس لەوێ هەیە، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ زیوەکەی هێندە ڕوونە، وەك شووشە وایە، چۆن شووشە شتی تێڕا دیارە، چونکە زیو شتی لەو دیوو ئەو دیو دیار نیەو ڕوون (**شفاف**) نیە، بەڵام سپیی و درەوشاوەیە، ﴿ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴾، واتە: ئەو ئەو خواردنەوەی تێیاندایە، ئەندازەگیرییان کردوە بە ئەندازەگیریی کردن، یانی: خزمەتکارە بەسەرەوە گەڕاوەکان، ئەو خواردنەوە و مەیەی لە گۆزەو دەفرەکاندا هەیە، ئەندازەگیرییان کردوە، پێکەڵپێك لەگەڵ ئارەزووی ئەوانەدا کە بەسەریانەوە دەگەڕێن و پێیان دەدەن، واتە: ڕێك بە ئەندازەی خۆی، چەندەی پێخۆشە، ئەوەندە، نەك لێی زیاد بێ و بە تۆبزیی بیخواتەوە، یان تێیدا بیهێڵێتەوە، یان کەم بێ و پێویست بەوە بکات دووبارە داوا بکات.

١١)- ﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴾، هەروەها پێیان دەنۆشێنرێ پەرداخێك لەوێدا کە بەردەوام تێکەڵکراوەکەی زەنجەبیلە، واتە: شەڕابەکەیان لەگەڵ زەنجەبیلدا ئاوێتە دەکرێ، پێشتریش باسی زەنجەبیلمان کرد، کە یەکێك لە زانایان ئاوای پێناسە دەکات: (**المعجم الوسیط**)[1] دەڵێ: (**الزَّنْجَبِيلُ: نَبَاتٌ مِن الفَصِيْلَةِ الزَّنْجَبارِيَّة، لَه عُرُوق غِلَاظٌ تَضْرب فِي الأَرْض، حرِيْفَةُ الطَّعْم**)، زەنجەبیل ڕووەکێکە لە جۆری ڕووەکە زەنجەبارییەکان، ڕەگی ئەستووری هەن بە زەویدا دەچنە خوارێ، تامەکەی تیژە (شێوەی بیبەر دەکات). ئەو زەنجەبیلەی ئێمە لە دونیادا دەیخۆین، سوودی زۆرن و لە سەرچاوە پزیشکییەکاندا باسکراون[2].

---

(١) ص ٤٠٢.

(٢) بۆ وێنە: (موسوعة: الإعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنة المطهَّرة) لە لاپەڕە: (٨٧٣)دا ژمارەیەکی زۆرێ لە سوودەکانی زەنجەبیل باسکردوون، وەك:

١- گوشراوی ئاوەکەی دەرمانێکی باشە بۆ نەخۆشییەکانی چاو.

٢- هاوکارە بۆ فراوانکردنی ڕەگ و دەمارەکانی خوێن.

٣- ماددەیەکی ئارەقە پێکەرو جەستە گەرمکەرە.

٤- بۆ بووژاندنەوەی دڵ و چالاککردنی هەناسەدان بەکاردێ.

﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا ﴾، لەو بەهەشتەدا پەرداخێکیان دەدرێتێ، پەرداخە مەیێکیان پێ دەنۆشێنرێ، ﴿ كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴾، بەردەوام زەنجەبیلی لەگەڵ تێکەڵکراوە، کرداری (کان)ش بۆ ئەوەیە، کە هەمیشە وایەو بەردەوام زەنجەبیل ئاوێتەی خواردنەوەکەیان دەکرێ، نەك وەك هی دنیا لە بەرکەمیی بەس جاروبار بێ!

١٢)- ﴿ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلًا ﴾، ئەو پەرداخەش لە شەڕابی سەرچاوەیەکە لەوێدا (لە بەهەشتدا) پێی دەگوترێ: سەلسەبیل.

(سَلسَبِيل)یش: (**شراب سَهلُ المُرُورُ في الحَلْقِ لعذوبتە**)، خواردنەوەیە لەبەر سازگاریی و شیرینیی شەڕابەکە، بە ئاسانیی لە گەروو دەچێتە خوار، لەبەر خۆشیی و بە تامییان.

یاخود وشەی (**سَلسَبِيل**)، ناوی سەرچاوەیەکە لە بەهەشتدا.

کە فەرمووی: ﴿ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴾، (**إبن زيد**) وەك (**الطبري**) بە ژمارە: (٣٥٩٤٣) لێیەوە هێناوە، دەڵێ: (**قَدَّرُوها: لِرِيِّهِم عَلَى قَدَرِ شُرْبِهِم أهل الجَنَّة**)، واتە: ئەو شلەمەنییەی تێیانکردوە (ئاوە، شەڕابە، هەرچی هەیە) ئەندازەگیرییان کردوە بە ئەندازەی تێراو بوونی ئەهلی بەهەشت، نە لێیان کەمەو نە لێیان زیاد دەبێ، ڕێك بە ئەندازەی تێراو بوون و تەسەل بوونیانە.

---

٥- بایەکان لە جەستە دەردەکات.
٦- دژی ئێش و ژانی سکەو ئازاری ڕیخۆڵە هێمن دەکاتەوە.
٧- کوڵێنراوەکەی بۆ دەردەکانی سەرماو کۆکە باشە.
٨- موڕەببایەکەی بۆ نەخۆشییەکانی سینە بەسوودە.
٩- دەگونجێ لەگەڵ چای و هەنگوین دا بخورێ و بەگشتیی بەهێزکەرە.
١٠- ئارەزوو پەیداکەر (مُشَهّي)ە و چالاککەرە بۆ گەدەو هەرس.
١١- بۆ خراپ هەرسکردن (سوء الهضم) بەسوودە.
١٢- گەرمیی جەستە هێمن دەکاتەوە و تینوێتیی کەم دەکاتەوە.
١٣- کاریگەریی ژەهر لە سەر جەستە کەم دەکاتەوە.

**١٣)-** ﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴾، لاوانێکی بە لاویی هێڵراوەش بەسەریانەوە دەگەڕێن، (**ولدان**) کۆی (**وَلِيد**)ە، ئەویش (**فَعِيلٌ بِمَعنَى المَفعُولِ وَيُطلَقُ عَلَى الصَّبِيِّ**)، وەك (**المعجم الوَسِيط**)[1] هێناویەتی.

(**وِلـدان**) کـۆی (**وَلِيـد**)ە لەسـەر کێـشی (**فَعِيـل**)و، بەمانـای مەفعوولـە، واتـە: (**مَولُـود**) لـە دایـك بـوو، مەبەسـت پێـی کـوڕی گەنجـی تـازە پێگەیشـتوویە (لاو)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مُّخَلَّدُونَ ﴾، واتـە: هێڵـدراوەن، یـانی: بـە گەنجیـی و بـە لاویـی هێڵـدراوەن، ئەمــەش بـۆ ئەوەیــە خەیـاڵ نەکـرێ دوایـی دەکەونــە تەمەنــەوەو تەمەنیـان هەڵدەچـێ، بەڵکـو هــەر لــەو تەمەنــەدا دەمێننــەوە.

زانایان بۆ (**مُخلَّدون**) سێ واتایان داناون:

**١-** (**الطبري**) دەڵێ: (**مُخَلَّدُون: دائِمٌ شَبَابُهُم لا يَتَغَيَّرُونَ عَنْ تِلْكَ السِّنِّ، وَذُكِرَ عَنِ الْعَرَبِ أَنَّهَا تَقُولُ لِلرَّجُلِ إِذَا كَبِرَ وَثَبَتَ سَوَادُ شَعْرِهِ: إِنَّهُ لَمُخَلَّدٌ؛ أَي ثَابِتُ الْحَالِ**)، (**مُخَلَّدُون**) واتە: لاوێتییەکەیان بەردەوامەو لەو تەمەنە ناگۆڕێن، عەرەب عادەتیان وایە پیاوێك کە دەکەوێتە تەمەنەوە، بەڵام مووەکانی هەر ڕەشن، دەڵێن: (**إِنَّهُ لَمُخَلَّدٌ**)، واتە: حاڵی چەسپاوەو ناگۆڕێ.

**٢-** واتایەکە دیکەی (**مُخَلَّدُون**) بریتییە لە: (**مُسَوَّرُون**)، واتە: بازنیان لە قۆڵ و دەست کراون.

**٣-** واتایەکی دیکەی بریتیە لە: (**مُقَرَّطُون**)، یانی: (**مُحَلَّونَ الخَلَدَة وهي جَمعُ خِلدَة، وَهُوَ القِرْطُ وَجَمعُ القِرطِ: أَقراط**)، واتە: بەگواران ڕازێنراونەوە، (**خَلَدَة**) کۆی (**خِلْدَة**)یە یانی: گوارە. حاڵی بەهەشتیش جیایە لەهی دنیاو ئەوانەی خزمەتی بەهەشتییەکان دەکەن، خوای کاربەجێ بەرگ و پۆشاك و خشڵی جوان و سەرنج ڕاکێشیان پێ دەپۆشێ.

---

(١) ص ٤٤٢.

**١٤)-** ﴿ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴾، ئەگەر تۆ بیانبینی وادەزانی گەوهەری پرژوبڵاون. ئەو لاوانەی بەسەر بەهەشتییەکانەوە دەگەڕێن، هەم بە دەفرو قاپی زیوینەوە کە پڕن لە خۆراك و، هەم بە گۆزەی پڕ لە شەڕابەوەو بە پەرداخە وە، ئەوانەی شەڕابەکەیان تێدەکەن یان ئەو شلەمەنییانەیان تێدەکەن، ئەگەر تۆ بیانبینی: ﴿ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴾، بە گەوهەری پرژ و بڵاویان تێدەگەی، (**لُؤلُؤ**) کۆی (**لُؤلُؤَة**)یە، (**مَنثُوراً، أَي: مُبعثراً**)، واتە: تۆ وادەزانی گەوهەرن پرژێندراون و بڵاوکراونەوە، هێندە جوانن.

**١٥)-** ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴾، ئەگەر ئەوێش ببینی نازونیعمەت و دەستڕۆیشتوویەکی زۆر گەورە دەبینی. ﴿ رَأَيْتَ ثَمَّ ﴾، ئەگەر تەماشای ئەوێ بکەی و، چاو بەوێدابگێڕی. (**ثَمَّ، هُناك**) ئەوێ، ﴿ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴾، نازو نیعمەت و موڵك و قەڵەمڕەوو دەستڕۆیشتوویەکی فراوان و گەورە دەبینی، کرداری ﴿ رَأَيْتَ ﴾، لێرەدا بە (**لازم**) هاتوە نەك بە بەرکارخواز (**مُتَعَدٍّي**) یانی: ئەگەر تەماشا بکەی و سەرنج بدەی بۆ ئەوێ، لەوێ نازو نیعمەت و موڵك و قەڵەمڕەوێکی فراوان دەبینی، (**مِثلَ أَحوالِ المُلكِ الكَبِيرِ المُتَنَعِّمِ صاحِبُهُ**)، لەوێ وەك حاڵی موڵك و قەڵەمڕەوێکی گەورە کە خاوەنەکەی پڕ نازو نیعمەتە (ئاوای دەبینی).

**١٦)-** ﴿ عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ ﴾، لە سەریانەوە (دیوی دەرێیان) پۆشاکی ئاوریشمی تەنك و ئەستووری سەوزە. ﴿ عَالِيَهُمْ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**عَالِيهِم**)، واتە: (**فَوقَهُم**)، لەسەروویانەوە لە دیوی دەرەوەیانەوە ﴿ خُضْرٌ ﴾، بە (**خُضْرٍ**)یش خوێندراوەتەوەو، ئەوکاتەش دەچێتەوە بۆ (**سندسٍ**)،و دەبێتە سیفەتی (**سندسٍ**) واتە: پۆشاکەکە لە ئاوریشمی تەنکی سەوزە.

(**السُّندُسُ: مَا رَقَّ مِنَ الدِّيبَاجِ، وَالإِستَبرَقُ: مَا غَلُظَ مِنَ الدِّيبَاجِ**)، (**سندس**) پۆشاکێکە لە ئاوریشم بەڵام بە تەنکیی (ئەگەر دەزووەکانی باریك بن پۆشاکەکە تەنك دەبێ) (**إستبرق**)یش ئاوریشمی ئەستوورەو قوماش ئەگەر دەزووەکانی ئەستوور بن، بێگومان پۆشاکەکەش ئەستوور دەبێ، ئەوانیش لە هەردوو شێوەکەیان پۆشیوە، ئنجا ئەگەر بە: ﴿ عَالِيَهُمْ ﴾، بخوێنرێتەوە، یانی: (**حالَ کَونِهِم**

**يَعلُوهُم ثِيابٌ**)، لە حاڵێكدا كە لەسەرەوەیان پۆشاك هەیە، پۆشاكی ئاوریشمی تەنك و ئاوریشمی ئەستووری سەوز، بەڵام ئەگەر بە: (**عَالِيهِم**) بخوێنرێتەوە، ئەوكاتە (**عالِيهِم**) دەبێتە گوزارەیەكی پێشكەوتوو ﴿ثِيَابُ﴾یش دەبێتە نیهادێكی دواكەوتوو، واتە: پۆشاكی ئاوریشمی تەنك و ئەستووری سەوز، لەسەریانەوەیە.

١٧)- ﴿وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ﴾، ڕازێندراونەوەش بە بازنی زیویین، (**أسَاوِر**) كۆی (**أَسوِرَة**)یەو كۆی (**سِوار**)ە، یانی: بازن، كە لە (دوستواری) فارسییەوە هاتوە، (**وَهُوَ حُلِيٌّ أُسطوانِيُ الشَكل فَارِغُ الوَسَطِ**)، بازن خشڵێكی شێوە خڕو بازنەییەو نێو قەدەكەی بۆشە، لە دەست و قۆڵ دەكرێ.

لێرەدا خوا ﷻ بۆ هەمووانی فەرمووە بۆ پیاوان و ئافرەتانی بەهەشت، بەڵكو لەم سیاقەدا تەنیا باسی پیاوان كراوە، هەندێك لە توێژەرەوان و لێكۆڵەرەوانی قورئانیش گوتوویانە: مەبەست پێی ئەوەیە ژنان و هاوسەرانیان وان! وایانزانیوە بەهەشتیش وەك دنیا وایە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ: ڕۆژێك زێڕو ئاوریشمی لە تەنیشت خۆی دانان و فەرمووی: ئەم دووانە بۆ مێینەكانی ئۆممەتم حەڵاڵن و بۆ نێرینەكانی حەرامن[1]، وایانزانیوە بەهەشتیش وەك دنیا وایەو لەوێش زێڕو ئاوریشم لە پیاوان قەدەغەن، نا، تەنیا لە دنیادا لێیان قەدەغەن و لە بەهەشت دا، ئەو شتانە هەموویان بۆ هەموو لایەك ڕەوان.

١٨)- ﴿وَسَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ شَرَابٗا طَهُورًا﴾، پەروەردگاریان خواردنەوەیەكی پاك و پاككەرەوەی پێ نۆشین.

ئایا ئەو شەرابە چۆنە؟ بەس خوا دەزانێ و باسی نەكردوە چۆنەو چییە، بەڵام گرنگ ئەوەیە (**طَهُور**): (**الطَّاهِرُ فِي نَفْسِهِ وَالمُطَهِّرُ لِغَيرِهِ**)، لە خودی خۆیدا پاكەو پاككەرەوەشە بۆ جگەلە خۆی.

---

(١) {عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحِلَّ لِإِنَاثِ أُمَّتِي الْحَرِيرُ وَالذَّهَبُ وَحُرِّمَ عَلَى ذُكُورِهَا} أخرجه أحمد: ١٩٥٢٥، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح بشواهده.

١٩)- ﴿ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً ﴾، (پێیان دەگوترێ:) ئا ئەمە پاداشتی ئێوە بوو.

٢٠)- ﴿ وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴾، هەوڵ و كۆششی ئێوەش سوپاسكراوو نرخێندراو بوو، یاخود ﴿ مَّشْكُورًا ﴾، یانی: (**كُنتُم مَشكُورِينَ عَلَيْهِ**)، ئێوە سوپاسكراو بوون لەسەری، خودی كۆششەكە بۆ خۆی دەنرخێنرێ و سوپاس دەكرێ و خاوەن و بكەرەكەیشی، هەردوو واتایەكەش ڕاستن: هەم خودی كۆششەكە بۆ خۆی نرخێنراوەو پێی زانراوە و سوپاس دەكرێ، هەم خاوەنەكەیشی سوپاس و تەقدیر دەكرێ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە نـۆ (٩) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (الإنسـان) پێکهاتـوە، ئایەتـەکانی: (٢٣ - ٣١) کـە تێیانـدا ڕاسـتییەکی یەکجـار مـەزن بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ ڕاگەیەنـراوەو، پێنـج ئـەرکی گرنگیـشی لـەو ئایەتانـەدا پـێ سـپێردراون، لـە چـوار ئایەتـەکانی: (٢٣ و ٢٤ و ٢٥ و ٢٦)دا.

دوایـی لـە سـێ ئایەتـەکانی: (٢٧ و٢٨ و ٢٩)دا، پێنـج ڕاسـتیی لەبـارەی بێبڕوایانـەوە خراونـە ڕوو و، ئامۆژگارییـەکی گـەورەو گرنگیشـیان کـراوە.

لەهـەردوو ئایـەتی: (٣٠ و ٣١)ی کۆتاییشـدا، دوو هەواڵـی یەکجـار مـەزن بـە هەمـوو لایـەك بـە مرۆڤایەتیـی و بـە جندیـش ڕاگەیەنـراون:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴿٢٧﴾ نَّحْنُ خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ۖ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا ﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴿٣١﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بێگومـان (ئـەی موحەممـەد!) ئێمـە پلەپلـە بـە دابەزانـدن (یـێکی سەرسـوڕهێنەر) قوڕئانمـــان دابەزاندۆتـــە ســـەرت ﴿٢٣﴾ دەجـــا بـــۆ حوکـــم و بڕیـــاری پـــەروەردگارت خۆڕاگربـــەو، بـــە قســـەی هیـــچ گوناهبارێـــك، یـــان ســـپڵەیەکیان مەکـــە ﴿٢٤﴾ لـــە بەیانیـــی و ئێوارەشـــدا نـــاوی پـــەروەردگارت بێنـــە ﴿٢٥﴾ لـــە شەوێشـــدا کڕنـــووشی بـــۆ ببـــە (نوێـــژ بـــۆ خـــوا بکـــە)و، بـــە شـــەوگارێکی درێـــژ بەپـــاکی بگـــرە ﴿٢٦﴾ بـــە دڵنیایـــی ئـــەو (بێبڕوای)انـــە، (ژیـــانی دونیـــای) زوو تێپەڕیـــان خۆشـــدەوێ و ڕۆژێـــکی ســـەخت و قـــورس لـــە دوایانـــەوە (کـــە چاوەڕێیانـــە) وێـــڵ دەکـــەن ﴿٢٧﴾ ئێمـــە دروســـتمان کـــردوون و ئەندامەکانیانمـــان مەحکـــەم پێکـــەوە بەســـتوون و، ئەگـــەر بشـــمانەوێ بـــە هاووێنـــەکانی خۆیـــان دەیانگۆڕیـــن ﴿٢٨﴾ بێگومـــان ئەمـــە بیرخەرەوەیـــە، ئنجـــا هـــەر کـــەس ویســـتی بـــەرەو پـــەروەردگاری ڕێـــی (ڕاســـتی) گرتـــە بـــەر ﴿٢٩﴾ ناتانەوێـــش مەگـــەر خـــوا بیـــەوێ، بێگومـــان خـــوا زانـــای کاربەجێیـــە ﴿٣٠﴾ هـــەر کەســـێکی بیـــەوێ دەیخاتـــە نێـــو بەزەییەکەیـــەوەو، ســـتەمکارانیش ســـزاو ئازارێـــکی بـــە ئێـــشی بـــۆ دانـــاون ﴿٣١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(نَزَّلْنَا): (**أَنزَلنـاهُ مُتَدَرِّجـاً مُنَجَّـماً، وَالنُّـزُولُ هُـوَ انحِطـاطٌ مِـن عُلُـوٍّ، وَالتَّنزِيـلُ: يَختَـصُّ بِالمَوضِـعِ الَّـذِي يُشِيرُ إِلَيـهِ إِنزالُـهُ مُفَرَّقـاً، وَمَـرَّةً بَعـدَ أُخـرَى، والإِنْـزَالُ عـامٌ**)، وشـەی (نَزَّلْنَـا) واتـە: پلـە پلـە بـەش بـەش دامانبەزانـدوە، (**نُـزُول**): ئەوەیـە شـتێك لـە شـوێنێکی بـەرزەوە بچـێ بـۆ شـوێنێکی نـزم، بـەڵام (**تَنْزِيـل**) تایبەتـە بـەو شـتەی ئامـاژەی بـۆ دەکـرێ، کـە دابەزاندنەکـە جیاجیـاو جـار لـە دوای جـار بـێ، بـەڵام (**إِنْـزَال**) دابەزاندنی بـە گشـتییە (چ پلـە پلـە دابـەزێ، چ بـە یەکجـار دابـەزێ).

(لِحُكْمِ رَبِّكَ): (الحُكْمُ بِشَيءٍ، أَنْ تَقْضِيَ بِأَنَّهُ كَذَا، أَو لَيسَ بِكَذَا)، حوكم بە شتێك ئەوەیە بڕیار بدەی ئەو شتە وایە، یان بڕیار بدەی وانیە، ئەوە پێی دەگوترێ حوکم، هەروەها (حُكْمُ رَبِّك: أَي شَرعُهُ) بەرنامەی خوا، کەواتە: (حكم) هەم بە مانای بڕیار دێ، هەم بە مانای بەرنامەش.

(ثَقِيلًا): (الثِّقَلُ والخِفَّةُ مُتَقَابِلَانِ)، قورسیی و سووکیی دوو شتی دژی یەکن، (ثَقِيلًا) واتە: قورس و گران، کە لە ئەصڵدا بۆ شتە بەرهەستەکانە، بەڵام دوایی دەخوازرێتەوە بۆ واتایەکی مەعنەوییش، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا﴾ واتە: ڕۆژێکی سەخت و دژوار لە دوای خۆیان وێڵ دەکەن و پشتگوێی دەخەن.

(وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ): (الشَّدُّ: التَّوثِيقُ)، (شَدّ) بریتیە لە گرێدانی شتێك، ئنجا (الأَسْرُ) أَسرُ الشَّدِّ بِالقِدِّ)، (أَسر): بریتیە لە توندکردنی شتێك بە چەرم، (وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ)، (إِشَارَةٌ إِلى حِكمَةِ اللهِ تَعَالَى فِي تَرَاكِيبِ الإنسَانِ)، (وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ) ئاماژەیە بە حیکمەتی خوای بەرز، لە پێکهاتەکانی جەستەی مرۆڤدا، کە بە ژێیەکان و ماسوولکەکان و جومگەکان، ئەندامەکانی جەستە پێکەوە بەستراون.

(بَدَّلْنَآ): (الإِبْدَالُ وَالتَّبْدِيلُ وَالتَبَدُّلُ وَالإِستِبدال: جَعلُ شَيء مَكَانَ آخَر)، ئەم چوار وشەیە: (إِبْدَال) و (تَبْدِيل) و (تَبدُّل) و (اسْتِبْدَال) هەر چواریان واتایان ئەوەیە شتێك لە شوێنی شتێکی دیکە دابنرێ.

(أَمْثَلَهُمْ): (جَمعُ مِثل وَهُوَ الشِّبهُ وَالنَّظِير، وَالمَثَلُ: المِثلُ)، (أَمْثَالهُم) واتە: وێنەکانیان، ئەوان لابەرین و هاووێنەی ئەوان بێنینە شوێنی ئەوان، یاخود ئەوان لابەرین و بەجۆرێکی دیکە لەوێنەی خۆیان دروستیان بکەینەوە، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، (مَثَل)یش یانی: (مِثْل) واتە: وێنە، وەك.

(تَذْكِرَةٌ): (التَّذكِيرُ، التذكرَة ما تُستَذكرُ بِهِ الحاجَة والتَّذكِرَة: ما يَدعُوا إِلَى الذِّكرِ وَالعِبرَة).

(تذكرة) سێ مانای هەن:

١- بیرخستنەوە.

٢- ئەوەیە بەهۆیەوە پێویستییەك بیربێتەوە.

٣- ئەوەیە ببێتە هۆی بیرهاتنەوەو پەندوەرگرتن.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

خوا ﷻ لە كۆتایی سوورەتی (الإنسان)دا، ڕوو دەكاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەیدوێنێ و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ تَنزِيلٗا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە وردە وردە قورئانمان بە شێوەیەكی سەرسوڕهێنەر، بە دابەزاندنێكی سەرسوڕهێنەر دابەزاندۆتە سەرت.

(إنَّـا) لە ئەصڵدا (إِنَّنَا)یە، بە دڵنیایی ئێمە، (نَحۡنُ) واتە: ئێمە، بە دڵنیایی ئێمە قورئانمان پلە پلە دابەزاندۆتە سەرت، (نَزَّلْنَا) (تَنْزِيل): بریتیە لە دابەزینی شتێك، وردە وردەو، پلە پلە، ﴿ تَنزِيلٗا ﴾، واتە: بە دابەزاندنێكی سەرسوڕهێنەر، دابەزاندنێك كە شایستەی خوایە ﷻ ئاوا دایبەزێنێ، بەگوێرەی بۆنەو بەپێی كات و شوێنەكان و ڕووداوەكان.

ئنجا ئەمە:

١- ڕاستییەكە خوا ﷻ دەیخاتە ڕوو بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، كە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا قورئانی دابەزاندۆتە سەر دڵ و سینەی موبارەكی: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ﴿١٩٥﴾ ﴾الشعراء.

٢- لە هەمان كاتدا بەرپەرچدانەوەشە بۆ بێبڕوایەكان كە دەیانگوت: شەیتانەكان یان كەسانی دیكە، قورئان فێری موحەممەد ﷺ دەكەن.

٣- هەروەها بەرچاو ڕوونیی و دڵنیاییشە بۆ بڕواداران، کە بزانن سەرچاوەی لێوە هاتنی قورئان، خوای بەرزی بێ وێنەیە.

﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ ﴾، کەواتە: تۆ بۆ حوکمی پەروەردگارت خۆڕاگربە، ئەوەی پەروەردگارت بڕیاری دەدات ئاوا بێ، یان ئاواو نەبێ، چونکە: (**الحُكْمُ: أَن تَقْضِيَ عَلَى الشَّيء بِأَنَّهُ كَذَا أَو لَيسَ بِكَذَا**)، حوکم - ئەوە یەکێ لە واتا باوەکانیەتی - کە بڕیار بدەی و دادوەریی بکەی ئەو شتە وایە، یان وانیە.

یاخود (**حکم**) یانی: بەرنامەی خوا، شەریعەتی خوا، ئەویش هەر بڕیارەکانی خوای پەروەردگاری تێدان، ئەو شتە حەڵاڵەو ئەو شتە حەڕامە، ئەو شتە چاکەو ئەو شتە خراپە، یانی: بۆ بڕیارو بەرنامەی پەروەردگارت خۆڕاگربە، ﴿ وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورٗا ﴾، گوێڕایەڵیی هیچ گوناهبارێك یان سپڵەیەك لەوان مەکە لە بێبڕواییەکان، دوایی ڕوونی دەکەینەوە بۆچی خوا ﷻ بێبڕوایەکانی بە دوو وشە هێناون و پێناسەی کردوون؟ ﴿ ءَاثِمًا ﴾، واتە: گوناهبار، ﴿ كَفُورٗا ﴾، واتە: سپڵە، یاخود بێبڕوا، (**کفور**) هەردوو واتایەکەی هەن.

﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴾، ناوی پەروەردگاریشت بێنە (ناوی پەروەردگارت باس بکە) بەیانیان و ئێواران، ئنجا ئایا تەنیا مەبەست پێیان بەیانیان و ئێوارانە؟ کە هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێیان نوێژی بەیانیی و نوێژی ئێوارەیە، یاخود مەبەست ئەوەیە لە بەیانی تاکو ئێوارەو، لە ئێوارە تاکو بەیانی، لە یادی پەروەردگارت بێ ئاگا مەبە!

ئەوی دیکەش کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴾، هەروەها لە شەوگاریشدا کڕنووش ببە بۆ پەروەردگارت و، بە درێژایی شەو بەپاکی بگرە.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوە ئاماژەیە بە کاتی پێنج نوێژەکان:

١- ﴿ بُكۡرَةٗ ﴾، واته: نوێژی بەیانی.

٢و٣- ﴿ وَأَصِيلٗا ﴾، واته: نوێژەکانی نیوەڕۆو عەسر.

٤و٥- ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ ﴾، واته: نوێژەکانی شێوان و خەوتنان.

﴿ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴾، ئەمەش ئاماژەیە بە شەونوێژ.

بەڵام من وای تێدەگەم مەبەست ئەوەیە: بەیانیان و ئێواران کە دوو کاتی زۆر سەرەنجڕاکێش و دڵ بزوێنن، زیاتر ناوی پەروەردگارت بێنەو یادی بکە، هەروەها لە شەوێشدا کڕنووشی بۆ ببەو، خواپەرستیی شەویش ئەنجام بدە، چ نوێژی فەرز کە نوێژەکانی شێوان و خەوتنان بگرێتەوە، چ شەونوێژ، ئنجا ئەویش چ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پێویست بوو بێ، وەك ڕایەكی زانایان هەیە، یاخود پەسند و سوننەت، کە پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (**المزمل**)دا قسەمان لەبارەوە کرد.

﴿ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴾، بە درێژایی شەویش، لە شەوێکی درێژدا پەروەردگارت بە پاك بگرە، ئایا بۆچی ئەوە بکات؟ تاکو بتوانێ خۆڕاگر بێ، چونکە ئەوەی وزەو تواناو بڕست دەدات بە مرۆڤی مسوڵمان، لەبەرامبەر دژایەتیی کرانی دا لەلایەن ناحەزانیەوە، دوژمنانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو هێزە مەعنەویی و ڕووحییەیە، کە بەهۆی خواپەرستیی شەوو ڕۆژو، بەهۆی یادی خوا کردن و، پەیوەندیی توندو تۆڵ و گەرم و گوڕ لەگەڵ خوادا، وەدەستی دێنێ.

کەواتە: خوای پەروەردگار لەم چوار ئایەتە موبارەکەدا، ڕاستییەكی زۆر مەزنی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ خستە ڕوو، کە بریتیە لەوەی: ئەوە خوایە کە قورئانی بەش بەش و بە پلەپلە دابەزاندۆتە سەری.

هەروەها پێنج ئەرکیشی پێ سپاردن:

**یەکەم** خۆڕاگرتن بۆ حوکمی پەروەردگاری.

**دووەم:** گوێڕایەڵیی نەکردنی بۆ هەر گوناهبارو سپڵەو ناسپاسێك، یان بێبڕوایەك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان.

**سێیەم:** یادی پەروەردگار کردنی و ناوی پەروەردگاری هێنانی لە بەیانیان و ئێواران دا.

**چوارەم:** بە شەوگار کڕنووش بۆ بردنی، کە مەبەست پێی شەو نوێژە.

**پێنجەم:** بە شەوگارێکی درێژ بەپاککرتن و ستایش کردنی خوا ﷻ.

ئنجا باسی بێبڕوایەکان دەکات و، ئەوانیش پێنج ڕاستییان لە بارەوە دەخاتە ڕوو، ئامۆژگارییەکیشیان دەکات، هی پێغەمبەری خوا ﷺ: ڕاستییەکی بۆ خستە ڕوو، ڕاستییەکی یەکجار مەزن و، پێنج ئەرکیشی خستنە سەر شان، بەڵام هی بێبڕوایەکان: پێنج ڕاستییان لە بارەوە دەخاتە ڕوو و، ئامۆژگارییەکیشیان دەکات:

ڕاستیی یەکەم: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانە ژیانی زوو تێپەڕی دنیایان حەزلێیە، ئەو بێبڕوایانەی ڕۆژگاری تۆ، ئەی موحەممەد و ڕۆژگارەکانی دیکەش، ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەران و پشت لە خوایانە ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴾، (**عاجِلة**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێندراوە (**يُحِبُّونَ الحَياةَ العاجِلَة، أو النِّعمَةَ العاجِلَة**)، ژیانی بە پەلەو زوو تێپەڕی دنیایان خۆشدەوێ و حەزیان لێیە، یان نازو نیعمەتی زوو تێپەڕ.

ڕاستیی دووەم: ﴿ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴾، لە پشتیانەوەش ڕۆژێکی قورس، ڕۆژێکی دژوارو سەخت و بە زەحمەت، وێڵ دەکەن و پشتگوێ دەخەن.

ڕاستیی سێیەم: ﴿ نَّحْنُ خَلَقْنَٰهُمْ ﴾، ئێمە ئەوانمان هێناوەتە دی، لە نەبوونەوە.

ڕاستیی چوارەم: ﴿ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ﴾، (**أَي: وَثَّقْنَا رَبْطَهُم**)، ئێمە ئەندامەکانیانمان پێکەوە بەستوون، مرۆڤ ئەگەر سەرنجی جەستەی خۆی بدات سەری سوڕدەمێنێ: پێکەوە بەسترانی ئەو هەموو ئەندامانەی، جەستەی مرۆڤ لەو

هەمـوو کۆئەنـدام و ئەندامانـە پێکـدێ: کۆئەندامەکانـی: مێشـک و دەمـارەکان، دڵ و خوێـن، هەناسـەدان، هـەرس، بەرگریـی، پێسـت، ئێسـکەکان، بینیـن، بیسـتن، قسـکردن ....هتـد، هەروەهـا ئەندامەکانـی: سـەرو پشـت و سـك و چـوار پەل، هـەرکام لەوانەش لـە چەنـدان بـەش پێـك دێ، هـەر دەسـتێك، هـەر لاقێـك لـە چەنـدان بـەش پێـك دێ، هەروەهـا سـەر لـە چەنـدان ئەنـدام پێـك دێ، پاشـان سـك و هەنـاوو پشـت، کـە بڕگـەکانی پشـت سـی و سـێ (٣٣) بڕگـەن، حەوتیـان لـە گەردنـداو، دوازدەیـان لـە پشـتداو، پێنجیـان لـە ئاسـتی سـك داو، پێنجـی دیکەیـان لـە خوارتـرو، چواریـان لـە کلێنجـەدا، هەموویـان سـی و سـێ بڕگـەن: (٧+١٢+٥+٥+٤=٣٣) هەروەهـا ئـەو هەمـوو ئێسـقانانەی دیکـە، ئنجـا ئـەو هەمـوو ژێ و بەسـتەرو ماسـوولکانە، ئنجـا ئـەو هەمـوو جومگانـە، خـوا ﷻ جەسـتەی مرۆڤـی پێکـەوە بەسـتوە، بـە هـۆی جومگەکانـەوەو، بەهـۆی دەمارەکانـەوەو، بەهـۆی ماسـوولکەکانەوەو، بەهـۆی بەسـتەرو ژێیەکانـەوە.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ﴾، **(أي: قَوَّينا ربطهم، أي: رَبْط أعضائهم)** واتـە: بـە توندیـی بەیەکمانـەوە بەسـتوون، یـانی: پەیوەسـتیی ئەندامەکانیانمـان تونـدو تـۆڵ کـردوە ئەگەرنـا مـرۆڤ ئەگـەر ئـاوا مەحکـەم نەبوایـە هـەروا ڕۆیشـتبایە ئەندامێـکی لـێ کەوتبایـە خـوارێ، پەنجەیـەکی لـەولا لـێ کەتبایـەو، قۆڵێـکی لـەولا لـێ کەوتبایـە، بەکەڵـك نەدەهـات، بـەڵام مـرۆڤ زەبـری زۆر گـەورەشی پێدەکـەوێ، زۆر بـە زەحمـەت ئـەو ئەندامانـەی لێـك هەڵدەوەشـێن، خـوا ﷻ هێنـدە بـە قایمیـی و مەحکەمیـی پێکیـەوە بەسـتوون، ئەگـەر زەبرێکیـشی پـێ بکـەوێ، خـوا جەسـتەی مرۆڤـی وا خوڵقانـدوە، دوایـی خـۆی چـاك دەکاتـەوە و دووبـارە پێکـەوە پەیوەسـت دەبێتـەوە.

ڕاسـتیی پێنجـەم: لـە بـارەی بێبڕواکانـەوە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا ﴾، هـەر کاتـێ ویسـتمان بـە هاووێنـەکانی خۆیـان دەیانگۆڕیـن، ئەمـەش دوو واتـای هـەن:

أ- ئەوان دەبەین و وێنەی ئەوانیان دێنینە جێ، ئەو لابردنەش دیسان دوو حاڵەتی هەن:

١- بە مردنی ئاسایی دەمرن، ئەو جیلە دەڕوات جیلێکی دیکەیان دێنینە جێ.

٢- یاخود بە بەڵایەکی کت و پڕو ناگەهان لە بەینیان دەبەین و کۆمەڵگایەکی دیکە دێنینە شوێنیان.

ب- یان مەبەست پێی دواڕۆژە واتە: ئەگەر بمانەوێ لایان دەبەین لە دنیادا، دوایی لە قۆناغی بەرزەخ و پاشان لە قیامەتدا بە هاووێنەی خۆیان دروستیان دەکەینەوە، بێگومان لە ماددەیەکی دیکەو بە شێوەیەکی دیکە، بەڵام هەر لەو شێوەی خۆیاندا، بەڵام بە پێکهاتەیەکی دیکەو لە ماددەیەکی دیکەی گونجاو لەگەڵ ژیانی بەرزەخ و پاشان قیامەتی نەبڕاوەدا.

ئنجا خوا ئامۆژگارییەکیشیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞ﴾، بە دڵنیایی ئەمە بیرخەرەوەیە، ئامۆژگارییە، پەندە، ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾، ئنجا هەر کەسێك ویستی بەرەو پەروەردگاری ڕێی ڕاستی گرتە بەر، بەهۆی وەرگرتنی ئەو ئامۆژگاریی و بیرخەرەوەیەوە، کە لە دوو توێی کۆتا فەرمایشتی خوادا بەرجەستەیە.

ئنجا خوای بەرز، دوو ڕاستیی مەزن بە هەموو لایەك ڕادەگەیەنێ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا:

یەکەم: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ﴾، ناشتانەوێ ڕێ بەرەو خوا بگرنە بەر، مەگەر خوا بیەوێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾، بە دڵنیایی خوا زانای کارزانە، کەواتە: کاتێك کە ڕێ بەرەو خوا دەگریە بەر، بزانە کە بە ویستی خوایەو، کاتێك پشت لە خوا دەکەی، بزانە هەر بەویستی خوایە، بەڵام دەبێ وریا بین! هەمیشە ڕەزامەندیی خوا ﷻ لەگەڵ بەرنامەکەی دایە، واتە: ئەگەر بەپێی بەرنامەی خوا بڕۆی، خوا لێت ڕازییە، بەڵام ئەگەر پشت لە بەرنامەی خوا بکەی، بە ویستی خوایە، بەڵام خوا لێت تووڕەیە،

وەك دەفەرمویٚ: ﴿ ...وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ... ﴿٧﴾ ﴾ الزمر، خوا بۆ بەندەكانی بێبڕوایی (یان سپڵەیی) پەسند ناكات، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بكەن، بۆتان پەسند دەكات، دەبێ وریا بین! هەموو شتێك بە ویستی خوایە، بەڵام هەمیشە ڕەزامەندیی خوا لەگەڵ ویستی خوادا نیە، ویستی خوا وەك ئاسمان وایە، هەرچی بیكەی، بە ویستی خوایەو لەژێر سێبەری ویستی خوادایە، بەڵام بۆ ئەوەی بزانی ئایا خوا لەو شتە ڕازییە یان ڕازی نیە؟ دەبێ تەماشا بكەی شەریعەتی خوا چی دەڵێ، بەهۆی شەریعەتی خواوەو، لە ئاوێنەی شەریعەتی خوادا، ئێمە ڕەزامەندیی خوا دەبینین، ئەمەش بۆ ئەوەیە: هەموو كەس بزانێ كە هەرچی دەیكا، بە ویستی خوایە، بێبڕوایەكان پێیان وانەبێ كاتێك ڕێ بەرەو خوا ناگرنە بەر، خوایان دەستەوسان و دەستەپاچە كردوەو، شتێكیان كردوە خوایان بێ دەسەڵات كردوە، نا، كەسێك كافریش دەبێ، هەر بە ویستی خوا كافر دەبێ، بەڵام خوا پێی ناخۆشە، ئەگەر ئیمانیش بێنێ، هەر بە ویستی خوا ئیمان دێنێ و خواش پێی خۆشە ﷻ.

**دووەم:** ﴿ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ﴾، هەر كەسێك (خوا) بیەوێ دەیخاتە بەزەیی نێو خۆیەوە، خوا كێی دەوێ بیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە؟ كەسێك بە دوای پێغەمبەرەكەی بكەوێ، كە (**رَحْمَةً لِلعالَمِين**)ەو، كەسێك بە دوای پەندو ئامۆژگارییەكەی بكەوێ، كە (**ذِكرٌ لِلعالَمِين**)ە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴾، ستەمكارانیش سزاو ئازارێكی بەئێشی بۆ داناون. (**ظالِمِین**) كۆی (**ظالِم**)ەو ناوی بكەر (**اسْم فَاعِل**)ە، واتە: ئەوانەی ستەمیان كردوە، ئەوانە خوا ئازار و سزایەكی بە ئێشی بۆ داناون، كەواتە: خوا كەسانێك دەخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، شایستە بن و، ئەوانەش شایستەن كە شوێن بەرنامەكەی دەكەون و، پەیڕەویی لە پێغەمبەرەكەی ﷺ دەكەن و بەرەو خوا دەڕۆن، ئەوانە شایستەی ئەوەن خوا بیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، بەڵام ئەوانەی ستەم دەكەن: ستەم لە خۆشیان دەكەن و، لە بەرنامەی خواش دەكەن و، لە پێغەمبەری خواش دەكەن، ئەوانە خوا ئازارێكی بە ئێشی بۆ داناون، چونكە خوا ﷻ كاربەجێیەو هەر كەسە بەپێی خۆی و پڕ بە پێستی خۆی، مامەڵەی لەگەڵدا دەكات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**جەختکردنەوەی خوا ﷻ لە سەر ئەوە کە قورئانی پلە پلە دابەزاندۆتە سەر پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ و، فەرمان پێکردنی بە خۆڕاگریی بۆ بڕیارو بەرنامەی خواو گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی نەکردنی هیچ گوناهکارو سپڵەو بێبڕوایەك و، یادی خوا کردنی بە بەیانیان و ئێواران و، لە شەوگاردا نوێژکردن و کڕنووش بۆ خوا بردنی، بە درێژایی شەوو بە پاك گرتنی خوا:**

وەك خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ تَنزِيلٗا ﴿٢٣﴾ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورٗا ﴿٢٤﴾ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ تَنزِيلٗا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە خۆمان قورئانمان بە دابەزاندنێك (پلە پلەو پچڕ پچڕ) دابەزاندۆتە سەرت.

(**إِنْزَال**) بریتیە لە دابەزاندن، کە دەگونجێ وردە وردە بێ، یاخود بە یەکجارەکیی بێ، بەڵام (**تَنْزِيل**) (**نَزَّلَ يُنَزِّلُ تنزِيلاً**)، لەسەر کێشی (**تَفعِيل**) ئەوەیە شتێك وردە وردە، یان بەش بەش دابەزێنرێ لەسەرێ بۆ خوارێ، ئنجا ئایا مەبەست لەم تەعبیرە چییە؟ لە وەڵام دا دەڵێین:

**١-** ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییەیە بۆ پتر دڵنیا کردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە پێغەمبەری خوا هەر دڵنیا بووە، بەڵام زیاتر دڵنیا کردنی وەك چۆن ئیبراهیم (**عَلَيْهِم الصَّلَاة وَالسَّلَام**) فەرمووی: ﴿ ... وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي ...﴿٢٦٠﴾ ﴾**البقرة**، بەڵام بۆ ئەوەی

دڵم ئۆقرە بگرێ.. چونکە کاتێك مرۆڤ لەگەڵ پڕوپاگەندەو قسەو قسەڵۆکی ناحەزاندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، عەجایب نیە شەیتان جۆرێك لە خوتخوتەو خەیاڵی خراپی بە دڵدا بێنێ، بۆیە خوا ﷻ لێرەدا ئاوا دەفەرموێ و، لە سوورەتی (یونُس)یش دا دەفەرموێ: ﴿فَإِن كُنتَ فِى شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾﴾ يونس، ﴿فَإِن كُنتَ فِى شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ﴾، وەك کاتی خۆی لە تەفسیر کردنی سوورەتی (یونوس)دا باسمان کرد: یانی: ئەگەر لە دوو دڵیی دای لە بارەی ئەوەوەی دامانبەزاندۆتە سەرت، لەوانە بپرسە کە لە پێش تۆدا کتێبیان دەخوێندەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {لَا أَشُكُّ وَلَا أَسأَل}[1]، نە لە دوو دڵیی دام و نە دەشپرسم، بەڵام بۆچی خوا وایفەرمووە؟ یان بۆ زێدە دڵنیایی کردنی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، یان لە پشت پێغەمبەری خواوەش، مەبەست پێی بڕواداران و شوێنکەوتووانیەتی، واتە: لە دوو دڵییدا مەبن لەوەدا کە دادەبەزێتە سەر پێغەمبەرەکەتان موحەممەد ﷺ.

دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾، بـە دڵنیایـی لـە پەروەردگارتـەوە هەقـت بـۆ هاتـوە، ئنجا لـە دوو دڵان مەبە، ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾، هەروەهـا لەوانـەش مەبـە کـە ئایەتـەکانی خوایـان بـە درۆ دانـان، (بێگومـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەوانـە نەبـووە، بـەڵام واتـە: وەك ئـەو هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـە مەبـە، کـە ئایەتـەکانی خـوا بـە درۆ دادەنێـن) ئەگەرنـا لـە زیانبـاران دەبی (وەك ئـەوان) ئەمـە لەبـەرڕا هاویشـتن (**تعريـف**) ە بـۆ ئـەوان و لـە پەنـاڕا قسـە گوتنـە بـەوان.

---

(١) أخرجه عبدالرزاق: ١٠٢١١ .

دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ ﴾، ئەمـەش دیسـان بـۆ زیاتـر ئۆخـژن و دڵنیایـی خسـتنە دڵـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و بڕوادارانـە، کـە ئایـا ئەوانـە بۆچـێ بـڕوا بـە قورئـان ناهێنـن، هەرچەنـدە هـەق و ڕاسـتە؟ دەفەرمـوێ: بـە دڵنیایـی ئەوانـەی وشـەی پەروەردگارتیـان لەسـەر پێویسـت بـووە، (کـە دەبـێ سـزا بدرێـن، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە هیدایـەتی خوایـان ڕەفـز کـردوەو بڕیـاری خوایـان لەسـەر جێبەجـێ بـووە) ئەوانـە: ﴿ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ ﴾، بـڕوا ناهێنـن هـەر چەنـدە هەرچـی نیشـانەیەو موعجیزەیـە بۆیـان بـێ ﴿ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾، هەتـا ئـازاری بـە ئێـش و ژان نەبینـن کەواتـە: تـۆ بەهـۆی بـڕوا نەهێنـانی وانـەوە، مەکـەوە دوو دڵییـەوە، چ مەبەسـت پێـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بـێ، چ مەبەسـت شـوێنکەوتووانی بـێ.

بـە تایبـەتی لـەم ڕۆژگارەی ئێسـتای ئێمـەدا[1] ئـەو ئیشـکال و دوو دڵییـە زۆرە، چونکـە کەسـێك تەماشـای بارودۆخـی مسـوڵمانان دەکات، دەبینـێ: لـە هەمـوو ڕوویێکـەوە دواکەوتـوون:

١- لە ڕووی سیاسییەوە، پرژو بڵاون و بێ سەرو بەرن، بێ سەرن، بێ سێبەرن.

٢- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، دەبینێ هەزراو یەك ناوو نیشان و لێك دابڕان و لێك ترازانیان هەن.

٣- لە ڕووی فیکرییەوە، تەماشایان بکات، دواکەوتوون و لاساییکردنەوەی کوێرانە زۆرە لەنێویاندا.

---

(١) ئێسـتا ئەمـڕۆ ئێمـە لـە (٢٢)ی مانگـی (٦) واتـە: حوزەیـرانی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زاینیـی دایـن، بەرانبـەر (١)ی مانگـی (ذي القَعدَة)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی.
ئەوە کاتی گوتنەوەو تۆمارکردنی دەرسەکان بووە و، ئێستاش: / ربیع الأول.
١٤٤٥ ك - بەرانبەر: ٢٠٢٣/٩/٥ ز، یە.

٤- لە ڕووی ئابوورییەوە، تەماشایان بکات، هەژاریی و نەداریی، ئەگەر هەبێ بەزۆریی لە وڵاتانی مسوڵماننشین دا هەیە.

٥- لە ڕووی هێزو توانای سەربازییەوە، تەماشایان، بکات هەموو وڵاتیان داگیر کراوە بە بنکە سەربازییەکانی زلهێزان.

٦- لە ڕووی تەکنۆلۆجیاو پیشەسازییەوە تەماشایان بکات، بۆ هەموو شتێك ئاتاج و موحتاجی جگە لە خۆیانن.

٧- لەڕووی زانستییەوە، تەماشایان بکات، هەر زۆر کۆڵەوار و نەشارەزاو دواکەوتوون و ... هتد.

ئنجا کەسێك بڕوایەکی دامەزراوی نەبێ بە قورئان و بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە ئیسلام، ئەگەر لە واقیعی مسوڵمانانەوە تەماشای ئیسلام بکات دەڵێ: دیارە ئیسلام ئایینێکی هەڵەیە، بۆیە واقیعی مسوڵمانان ئاوا دواکەوتوو شل و شێواوەو هێندە بەجێماون، هەروەها کەسێك زۆر لە قورئان و سوونەت شارەزا نەبێ و، ئیمانێکی مەحکەمی نەبێ بە ئیسلام، شارەزاییەکی قووڵ و وردیشی نەبێ بە ژیانی ڕۆژ ئاواییەکان زۆر پێیان سەرسام (**معجَبْ**) دەبێ، وەك بەداخەوە هەندێ کەس بە سەفەر دەچێ بۆ ئەوێ و دوایی کە دێتەوە، دەست و پێی خۆی ناناسێتەوە، وا دەزانێ ئەوان لە هەموو شتێکدا تێرو تەواون! نازانێ، کە ئەوان هەرچەندە لەڕووی شارستانێتیی ماددییەوە بەرەو پێش چوون، لە ڕووی ژیانی دنیاوە بەرەو پێش چوون و، ژیانی ماددیی خۆیان باش ڕێکخستوە، لە ڕووی سیاسیی و، ئیداریی و، ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی و، تەکنۆلۆجییەوە، بەڵام ئەوە مانای وانیە لەهەموو ڕوویەکەوە پێشکەوتوون، ئەوان لەڕووی پەیوەندییان لەگەڵ خوادا ﷻ و، ئەو حیکمەتەی مرۆڤی بۆ لەسەر زەوی دانراوەو، لەو ژیانە کاتییەدا دانراوە، داخۆ چی دەکات و چۆن دەژی و پەیوەندیی لەگەڵ خواو خەڵك دا چۆن دەبێ؟ لەوڕووەوە زۆر دواکەوتوون، هەروەها لەڕووی ئینسانییەوە، کە بە ڕەوشتی بەرز

و سیفەتە بەرزەکان لە نێو خۆداو، لەگەڵ گەلان و کۆمەڵگاکانی دیکەدا، مامەڵە بکرێ، زۆر بەجێماون، دیسان لەڕووی مەعنەوییەوە کە ئاوڕبدەنەوە لە ناخی خۆیان و، بزانن کە مرۆڤ تەنیا جەستەکەی نیەو ژیان بەس تێرکردنی گەدەو داوێن و گیرفان نیە، بەڵکو ڕووح و عەقڵ و هەست و ناخیشە، لەو ڕووانەوە زۆر بەجێماون.

ئنجا ئەگەر کەسێك بە قووڵیی شارەزای دنیا نەبێ و ئیمانێکی مەحکەمیشی نەبێ، هەرکات واقیعی شل و شێواوی مسوڵمانان ببینێ، ئیشکال و گرێ و گۆتاڵی دەرووونی بۆ دروست دەبێ، بۆیە خوا ﷻ لێرەو لە سوورەتی (یونوس) و لە چەند شوێنی دیکەدا، ئەم دڵنیاییە دەداتە ئەهلی ئیمان، کە ئەم قورئانە خوا دایبەزاندوە، لێرەش ئەمە:

أ- دڵنیاکردنەوەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە دابەزێنەری قورئان بۆ سەری، خوای پەروەردگارە، نەك وەك بێبڕوایەکان درۆو دەلەسە دەکەن، گوایە جگەلە خوا قورئانی بۆ موحەممەد ناردوە.

ب- هەروەها بۆ دڵ بەهێز کردنی پێغەمبەریشە ﷺ، بۆ بەرەنگاریی ئەوەی لە داهاتوودا دێتە ڕێی، کە تۆ بزانە ئەوە فەرمایشتی خوایەو بەرنامەی خوایە بۆی لای تۆ دابەزیوە.

بۆیە دەفەرموێ:

٢)- ﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ ﴾، دەجا خۆڕاگربە بۆ بڕیاری پەروەردگارت، وشەی **(حكم)** دوو واتای هەن:

١- **(حكم)** ئەوەیە: بڕیار بدەی ئەو شتە ئاوایە، یان بڕیار بدەی ئەو شتە وانیە، ئەوە حوکمی پێ دەڵێن و بە کوردیی پێی دەگوترێ: بڕیاردان.

٢- هەروەها **(حكم)** بەمانای بەرنامەش هاتوە، یانی: بۆ بڕیاری پەروەردگارت خۆڕاگربەو، بۆ بەرنامەی پەروەردگارت خۆڕاگربەو دەستی لێ شل مەکە، **(إبن عاشور)** وای

لێكداوەتەوە دەڵێ: (**أيْ فاصبِر في كُلِّ ما حَكَمَ بِهِ رَبُّكَ، سَواءٌ كانَ ذَلِكَ تَكْلِيفًا خاصًّا بِكَ مِنَ العِباداتِ والطّاعاتِ، أوْ مُتَعَلِّقاً بِالغَيْرِ، وهو التَّبْلِيغُ وأداءُ الرِّسالَةِ وتَحَمُّلُ المَشاقِّ النّاشِئَةِ مِن ذَلِكَ**)، واتە: خۆڕاگربە بۆ هەر شتێك كە پەروەردگارت بڕیاری لەسەر داوە (یاخود بڕیاری لەسەر دەدات) چ ئەركدار كردنێك بێ بۆ خۆت، لە پەرستشەكان و فەرمانبەرییەكان، یاخود ئەركدار كردنێك بێ پەیوەست بێ بە جگەلە خۆتەوە، كە بریتیە لە گەیاندن و ڕوونكردنەوەی پەیامی خواو، خۆڕاگرتن بۆ ئەو نارەحەتییانەی لەوەوە پەیدا دەبن.

(**الطبري**)یش ئاوای لێكدەداتەوە: (**یَقُولُ: اصْبِرْ لِمَا امْتَحَنَكَ بِهِ رَبُّكَ مِنْ فَرَائِضِهِ، وَتَبْلِيغِ رِسَالَاتِهِ، وَالقِيَامِ بِمَا أَلْزَمَكَ القِيَامَ بِهِ، فِي تَنْزِيلِهِ الَّذِي أَوْحَاهُ إِلَيْكَ**)، واتە: خۆڕاگربە بەوەی پەروەردگارت تۆی پێ تاقیكردۆتەوە لە ئەركەكان كە خستوونیە سەر شانت، لە گەیاندنی پەیامەكانی و، هەڵسان بەوەی پەروەردگارت تۆی پێوە پابەند كردوە، پێی هەڵسی، لەو دابەزێنراوەدا كە بۆ لای تۆی سروش كردوە.

٣)- ﴿ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴾، لەوان (ئەو بێبڕوایانەی دژی تۆن) بە قسەی هیچ گوناهكارێك یان هیچ سپڵەیەكیان مەكە.

(**الطّاعَةُ: امْتِثالُ الطَّلَبِ بِفِعْلِ المَطْلُوبِ، وبِالكَفِّ عَنِ المَنهِيِّ، إذ كانَ الكُفّارُ يَطلُبُونَ مِن النَّبِيِّ ﷺ فِعلَ ما يَرغَبُون، وَالكَفَّ عَمّا لا يُرِيدُون**)، واتە: (**طاعَة**): بریتیە لە جێبەجێكردنی داواكردنی كارێك كە داواكراوەو، دەستبەردار بوونی شتێك كە ڕێگریی لێكراوە، چونكە بێبڕوایەكان ئەوەی ئارەزوویان بوو لە پێغەمبەریان ﷺ داوا دەكرد، دەیانگوت: وابكە، ئەوەش كە حەزیان لێ نەبوو و پێیان ناخۆش بوو دەیانگوت مەیكە.

ئەوەی پێیان خۆشبوو، بتپەرستیی بوو، زوڵم و ستەم و خراپەكاریی بوو، ئەوەش كە پێشیان ناخۆشبوو، خوا بە یەكگرتن و بەندایەتیی كردن بۆ خواو، پابەندیی بە شەریعەتی خواوە بوو، ئنجا خوا ﷻ فەرمانی پێدەكات كە بە قسەی هیچ گوناهكارێكیان یاخود هیچ بێبڕوایەكیان مەكە، لێرەدا یەكێ لە

ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێ: (لِلْإِشَارَةِ بِالوَصْفَيْنِ إِلَى أَنَّ طَاعَتَهُمْ تُفْضِي إِلَى ارْتِكَابِ إِثْمٍ أَوْ كُفْرٍ، لِأَنَّهُمْ بذَلِكَ يَأْمُرُونَهُ وَيَنْهَوْنَهُ غَالِبَاً، فَهُمْ لَا يَأْمُرُونَ إِلاَّ بِمَا يُلَائِمُ صِفَاتِهِمْ)، واتە: ئەو تەعبیرە ئەوە دەگەیەنێ کە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوان، سەر دەکێشێ بۆ گوناهکردن، یاخود سپڵەیی و بێبڕوا بوون، چونکە ئەو شتانەی ئەوان فەرمانیان پێ دەکردن و، ئەو شتانەی لێیان قەدەغە دەکرد، بەپێی سیفەتەکانی خۆیان بوون.

ئەوەی خۆیان پێیان خۆشبوو فەرمانیان پێدەکردو، ئەوەش کە خۆیان حەزیان لێ نەدەکرد، ڕێیان لێ دەگرت.

بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورٗا﴾، هیچ گوناهکارێکیان یاخود هیچ بێبڕوایەکیان، چونکە بێبڕوایەکان لە نێوان ئەو دوو حاڵەدا بوون: یان گوناهکار بوون، یاخود سپڵەو بێبڕوا بوون، واتە: بە قسەی هیچ کامیان مەکە، بێبڕوایەکان هەیانبووە زۆر خەریکی گوناهکردن بووە، هەشیان بووە ڕەنگە تۆزێ خۆی لە گوناهان پاراستبێ، بەڵام سپڵەو ناسپاس بووە.

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: ئەمە مەبەست پێ دوو کەسی تایبەت بوون لە بێبڕواییەکان، کە بریتی بوون لە: أ- (عُتْبَةُ بنُ رَبِيعَة)، ب- ئەوی دیکەشیان (الوَلِيدُ ابنُ المُغِيرَة)، گوتراوە: (عتبَةُ ابنُ رَبِيعَة) پێشنیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە کچێکی هەبووە جوانترین ئافرەتانی عەرەب بووە، گوتوویەتی: خۆم دەیکەمە هاوسەرت و مارەییشم لێت ناوێ، هەر پێشکەشت دەکەم.

وەلیدی کوڕی موغیرەش کەسێکی زۆر ساماندار بووە و گوتوویەتی: ئەی موحەممەد! هەرچی لە ماڵ و سامانی من دەتەوێ، بۆخۆتی ببە، بەڵام هەردووکیان بەو مەرجەی پێغەمبەری خوا دەست هەڵبگرێ لەو پەیام و بەرنامەی خۆی!

کەواتە: دەگونجێ لە ئەسڵ دا مەبەست پێی ئەو دوو کەسە بێ، بەڵام ئەگەر مەبەستیش ئەو دوو کەسە بێ و، هۆی هاتنە خواری هەڵوێستی ئەو

دووانـە بـێ، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە هـەر کەسـێکی دیکـەش وەك خـاوەنی ئـەو دوو سـیفەتانەبێ، هـەر دەیگرێتـەوە.

(الطـبري) لـە (قتـادة) وە بـە ژمـارە: (٣٥٩٧٤) هێناویـەتی، دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴾، (نَـزَلَ فِي عَـدُوِّ اللـهِ أَبِي جَهْـل)، لەبـارەی دوژمنـی خـوا ئەبـوو جەهلـەوە هاتۆتـە خـوار، هەروەهـا (الطـبري) هـەر لـە قەتـادەوە بـە ژمـارە: (٣٥٩٧٥) هێناویـەتی دەڵـێ: (أَنَّـهُ بَلَغَـهُ قـال أَبُـو جَهْـلٍ: لَـئِنْ رَأَيْـتُ مُحَمَّـدًا يُصَـلِّي لَأَطَـأَنَّ عَـلَى عُنُقِـهِ، فَأَنـزَلَ اللـهُ: ﴿ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴾)

واتـە: قەتـادە پێـی گەیشـتوە کـە ئەبـوو جەهـل گوتوویـەتی: ئەگـەر موحەممـەد ببینـم نوێـژێ دەکات، پێ لەسـەر ملی دادەنێـم، خـواش ﷻ ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی نـاردە خـوار، کـە بـە قسـەی هـەر گوناهکارێـك، یاخـود هـەر سـپڵەو ناسپاسـێك و بێبڕوایەکیـان مەکـە.

(الطبري)یـش لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1] دەڵـێ: (يَقُـولُ: وَلَا تُطِعْ فِي مَعْصِيَـةِ اللَّـهِ مِـنْ مُـشْرِكِي قَوْمِـكَ، آثِمًـا يُرِيـدُ بِرُكُوبِـهِ مَعَاصِيـهِ، أَوْ كَفُـورًا: يَعْنِـي جَحُـودًا لِنِعَمِـهِ عِنْـدَهُ، وَآلَائِـهِ قِبَلَـهُ، فَهُـوَ يَكْفُـرُ بِـهِ، وَيَعْبُـدُ غَـيْرَهُ)، واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ! لـە سـەر پێچیـی کـردنی خـوادا، گوێڕایەڵیـی هیـچ گوناهکارێـك لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرانی خەڵکەکـەت مەکـە، کـە دەیـەوێ لەسـەر گوناهـو تـاوان و سـەرپێچیی خـوا بـەردەوام بـێ، یاخـود سـپڵەو ناسپاسـێك کـە چاکـەکانی خـوا نادیـدە دەگـرێ و، ئـەو چاکانـەو نیعمەتانـەی خـوا پێیـداون، لـە بەرانبەریانـدا سـپڵەیە، خـوا چاکـەی لەگـەڵ کـردوە، کەچـی ئـەو جگەلـە خـوا دەپەرسـتێ.

٤)- ﴿ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾، ناوی پەروەردگاریشت بێنە بەیانیان و ئێواران.

٥)- ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ ﴾، هەروەها لە شەوگاریشدا کڕنووشی بۆ ببە، واتە: لە شەوێدا شەو نوێژ بکە.

---

(١) جامع البيان: ج١٤، ص٤٣٦.

٦)- ﴿ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴾، هەروەها شەوگارێکی درێژیش پەروەردگارت بە پاك بگرە، واتە: زیاتر خەریکی کاری خۆت بەو، بەیانیان و ئێواران خوا بە پاك بگرە، هەروەها لە شەوگاردا کڕنووشی بۆ ببەو، شەوێکی درێژیش خوا بە پاك بگرە، زانایان گوتوویانە: **(أُذكُرُ اللهَ بِأَنواعِ االذِّكرِ في كُلِّ أَوقاتِ طَرَفَيهَا الصَّباحِ وَالمَساءِ، أَوِ المَقصُودُ بِهِ الصَّلاة)**، ناوی خوا بێنە بە جۆرەکانی یادکردن، لە ئەمسەرو ئەو سەری بەیانیان و ئێوارانی هەمووکاتەکان دا، یاخود مەبەست پێ نوێژ کردنە.

هەندێکیش گوتوویانە:

أ- **(بُكرَة)** مەبەست پێی نوێژی بەیانییە.

ب- **(أَصِيل)**یش مەبەست پێی نوێژی نیوەڕۆ و ئێوارەیە.

ج- ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ ﴾، مەبەست پێی هەردووك نوێژی شێوان و خەوتنانە.

د- ﴿ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴾، ئەمیش مەبەست پێی شەونوێژە، ئەوە ڕایەکی زانایانە، کە ئەو وشانە ئاماژەن بەو نوێژانە، بەڵام من پێموایە: مەبەست بەگشتیی یادی خوای بەرزە، بە دڵ و بە زمان و بە کردەوەش، یادکردنی خوایەو خوا لەبیر بوونەو، بەپاکگرتنی خوایەو ستایشکردنی خوایەو، ملکەچییە بۆ خوا ﷻ.

وەك دەبینین لەم چوار ئایەتە موبارەکەدا، خوا ڕاستییەك بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ ڕوون دەکاتەوە، کە ئەو زاتەی قورئانی پلە پلە دابەزاندوەتە سەرت و بۆت دادەبەزێنێ، خوای پەروەردگارتە، دوایی پێنج ئەرکی پێ دەسپێرێ:

١- خۆ ڕاگرتن بۆ بڕیارو بەرنامەی خوای پەروەردگار.

٢- گوێڕایەڵیی نەکردنی بۆ هەر گوناهکارو، هەر سپڵەو ناسپاسێکی بێبڕوایەکان.

٣- باسی ناوی پەروەردگار کردنی، بەیانیان و ئێواران.

٤- لە شەوێدا کڕنووش بردنی بۆ خوا.

٥- لە شەوێکی درێژدا بە پاکگرتنی خوا ﷻ.

کەواتە: ئەی موحەممەد! بۆ ئەوەی لە قەدەر ئەو ڕاستییە مەزنە بی کە پێمان ڕاگەیاندی، کە دابەزاندنی پلە پلەیی قورئانە بۆ سەرت، دەبێ ئەو ئەرکانە جێبەجێ بکەی و، ئەو ئەرکانەش زۆربەیان دەچنەوە نێو ئەوەی مرۆڤ زیاتر خۆی ئامادەو بەهێز بکات، لە ڕووی پەیوەندییەوە لەگەڵ خواداو، لە ڕووی ئیمانیی و ڕووحیی و مەعنەوییەوە، هەڵبەتە ئەوە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بۆ شوێنکەوتووانیشی هەر وایەو، ئێمە بە ئەندازەی ئەوە کە لەگەڵ خوادا پەیوەندیی توندو تۆڵ و گەرم و گوڕمان دەبێ و، بەندەی ساغ و پاك و چاك دەبین، خۆڕاگریش دەبین لە بەرامبەر ناحەزاندا، لە بەرانبەر مەینەتیی و ئازارەکاندا کە ناحەزانی ڕێی خوا، بۆمان دێننە پێش، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ بە لوتف و کەرەمی خۆی.

مەسەلەی دووەم:

**بێبڕوایـان پـڕ بـە دڵ حـەز بـە ژیـانی بـە پەلـەو زوو تێپـەڕی دنیایـان دەکـەن و، مەنزڵـگای دوایـی، وێـڵ و فەرامـۆش دەکـەن، خـواش ﷻ خـۆی هێناونیـە دیـی و، ئەندامـەکانی پێکـەوە پەیوەسـت کـردوون، هەرکاتێکیـش بیـەوێ بـە هاووێنـانی خۆیـان دەیانگـۆڕێ، ئـا ئـەوەش بیرخـەرەوەو ئامۆژگارییـەکی مەزنـە، بـۆ هـەر کەسـێك گـەرەکی بـێ بـەرەو پـەروەردگاری ڕێـی ڕاسـت بگرێتـە بـەر:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ٢٧ نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا ٢٨ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ٢٩ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

خـوا ﷻ لـە ئایەتـەکانی پێشـەوەدا - وەك پێشـتریش باسـمان کـرد - ڕاسـتییەکی گـەورەو گرنگـی بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ ڕاگەیانـدو، دوایـی پێنـج ئەرکیـشی خسـتنە سـەر شـانی، لـەم سـێ ئایەتـە موبارەکەشـدا، خـوا ﷻ پێنـج ڕاسـتیی گـەورەو گرنـگ لەبـارەی بێبڕوایانـەوە ڕادەگەیەنـێ، ئامۆژگارییەکیشـیان دەکات، یەکەمـی ئـەو ڕاسـتییانەش ئەوەیـە کـە دەفەرمـوێ:

١)- ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانە (بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ و هەر کەسێکی دیکەی وەك ئەوان بێ) (ژیانی) زوو تێپەڕیان خۆشدەوێ، (ژیانی) بە پەلەیان خۆشدەوێ.

(**عاجِلَـة**) سیفەتی وەسـفکراوێکی قرتێنـدراوە، یـانی: (**يُحِبُّـونَ الحَيـاةَ العَاجِلَـة**)، یـان (**يُحِبُّـونَ الـدَّارَ العاجِلَـة**)، ژیـانی زوو تێپەڕیـان خۆشـدەوێ، یاخـود مەنزڵـگای زوو تێپـەڕو پەلەیـان خۆشـدەوێ، کـە مەبەسـت ژیـانی دنیایـە، ئەمـەش ڕوونکردنـەوەی

ئەوەیە کە بۆچی خوای کارزان بە پێغەمبەری خاتەمی فەرمووﷺ: ﴿وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورًا﴾، گوێڕایەڵیی هیچ گوناهکارێك و هیچ سپڵەو ناسپاسێکیان مەکە.

کە دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ یانی: ئەوانەی ئامادەن، لە عەقڵ و دڵی بابای دوێنراودا، کە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ و بڕوادارانێکن کە لە خزمەتی دابوون کاتی خۆی، دوای وانیش هەر کەسێك کە بەڕێی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ بڕوات و، لەگەڵ کەسانێکدا ڕووبەڕوو بێتەوە کە باوەش بە دنیا دەکەن و، تەنیا حیسابی ژیانی زوو تێپەڕی دنیا دەکەن و، هیچ گرنگیی و بایەخێك بە مەنزڵگای کۆتایی ڕۆژی دوایی نادەن.

یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێ: ﴿يُحِبُّونَ﴾، خۆشیاندەویٚ، پەیوەستە بە شتێکی قرتێنراوەوە وەك: (**يُحِبُّونَ نَعِيمَ العاجِلَة**)، یان (**مَنافِعَ العاجِلَة**)، یان (**شَهَواتُ العاجِلَة**)، نازو نیعمەتی ژیانی زوو تێپەڕی دنیا، یان سوودو کەڵکەکانی ژیانی زوو تێپەڕی دنیا، یان خۆشییەکانی ژیانی زوو تێپەڕی دنیایان خۆشدەویٚ، چونکە خۆشویستن پەیوەست نابێتەوە بە خودی ژیانی دنیاوە، بەڵکو پەیوەست دەبێ بەو شتانەوەی لە ژیانی دنیادا دەبن، لە نازو نیعمەت و، خۆشیی و لەززەت و، ئەو بەرژەوەندییە ماددییانەی دەهێنرێنە دی، لەسەر حیسابی ڕۆژی دوایی، چونکە پێشتریش باسمان کرد کە ئەوەی خراپە، ئەوەیە: خۆشویستنی ژیانی دنیاو گرنگیی و بایەخ پێدانی: یەکەم: زیاد لە پێویست بێ، دووەم: لەسەر حیسابی مەنزڵگای کۆتایی بێ، چونکە دوایی خوا وەك خستنەڕووی ڕاستیی دووەم دەفەرمویٚ: ﴿وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمًا ثَقِيلًا﴾، لە پشتیانەوەش ڕۆژێکی گران و قورس وێڵ دەکەن (گرانیی و قورسیی خوازراوەتەوە بۆ سەختیی و دژواریی، یانی: ڕۆژێکی سەخت و دژوار) لە پشت خۆیانەوە وێڵ دەکەن و پشتگوێ دەخەن (کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە) بە تایبەتی قیامەت و زیندووکرانەوەو لێپرسرانەوە، ئنجا لە جیاتی ئەوەی خوا ﷻ بفەرمویٚ: (**يُحِبُّونَ الدُّنيَا**)، فەرموویەتی: ﴿يُحِبُّونَ

ٱلۡعَاجِلَةَ ﴾، کـە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی ئـەو بێبڕوایانـە نـەزان و نەفامـن، چونکـە هـەر لەبـەر ئـەوەی ژیـانی دنیـاو ڕابواردنـەکانی و خۆشـییەکانی هەڵیدەبژێـرن، کـە بەپەلەیـەو زوویـە، واتـە: ئـەوەی وایکـردوە دنیـا پەرسـتەکان، ژیـانی دنیـا هەڵبژێـن، ئەوەیـە کـە ئێسـتا لەبـەر دەسـتیانەو بـە پەلەیـە، بـەڵام بابـای عاقـڵ شـتێك بـا لـە دواییـش بـێ؛ مـادام چاکـتر بـێ، هەڵیدەبژێـرێ بەسـەر شـتێکدا بـا ئێسـتاش بـێ، بـەڵام ئـەو گرنگیـی و بایەخـەی نەبـێ.

دووبـارەشی دەکەینـەوە: ئـەوەی لێـرەدا شـوێنی ڕەخنـە لێگرتنـە، ئەوەیـە کـە ئـەو ژیانـە دنیاییـە زوو تێپـەڕە، خۆشبویسـترێ و بـاوەشی پێـدا بکـرێ و گرنگیـی و بایەخـی پـێ بـدرێ، لەسـەر حیسـابی ڕۆژی دوایـی، ئەگەرنـا بـە ئەنـدازەی خـۆی گرنگیـی دان بـە ژیـانی دنیـاو بایـەخ پێـدانی، وەك شـوێنی تێـدا تاقیکرانـەوە، خـوا ﷻ لـە چەنـدان ئایەتـدا، هەروەهـا پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لـە چەنـدان فەرمایشـتدا، نـەك هـەر ڕێیـان پێـداوە، بەڵکـو فەرمانیشـیان پێکـردوە، بـۆ وێنـە:

**١-** خوای بەرزی مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّمَّا كَسَبُواْ ...﴿٢٠٢﴾ ﴾**البقرة**، واتە: (لە مرۆڤەکان) هەیانە دەڵێ: پەروەردگارمان! لە دنیادا چاکەمان پێ ببەخشەو لە دواڕۆژیشدا چاکەمان پێ ببەخشەو لە ئازاری ئاگر چەپاڵەمان بدە، ئەوانە لەوەی وەدەستیان هێناوە پشك و بەشیان هەیە...

**٢-** لە سوورەتی (**القصص**)دا هاتوە کە خەڵکەکەی قاڕوون بە قاڕوون دەڵێن: ﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَا ...﴿٧٧﴾ ﴾**القصص**، لەوەدا کە خوا (لە دنیادا) پێیداوی (لە نازو نیعمەتی دونیا)، مەنزڵگای دواڕۆژی پێ داوا بکەو، بەشی خۆشت لە دونیا فەرامۆش مەکە.

**٣-** هەروەها لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە کە مسوڵمان پێویستە گرنگیی بە ژیانی دونیاشی بدات، بە ئەندازەی ئەوەی دەیهێنێ، بۆ وێنە: (**نعم المال الصالح للمرء**

**الصالح**) سامانی باش باشترینە بۆ مرۆڤی چاك، بەڵام ئەوەی هەڵەیە لە مامەڵە لەگەڵ ژیانی دنیادا، ئەوەیە کە مرۆڤ تەنیا دنیا ببینێ و دوارۆژ پشتگوێ بخات، یاخود زیاد لە پێویست و زیاد لە قەبارەو نرخی خۆی، گرنگیی بە ژیانی دنیا بدات، کە بێگومان زیاد لە ئەندازەی خۆی، لەسەر حیسابی ڕۆژی دواییە.

کە دەفەرمووێ: ﴿ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ ﴾، (**يَذَرُونَ**) واتە: (**يَدَعُونَ، يَتْرُكُونَ**) واز دێنن، وێڵ دەکەن لە پشتیانەوە ﴿ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴾، ڕۆژێکی قورس، وشەی (**ثَقِيل**) پێچەوانەی (**خَفِيف**)ەو (**ثَقِيل**) واتە: قورس و گران لە کێشدا، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ سەختیی و دژواریی و نارەحەتیی، ئنجا ئەگەر بگوترێ: (**يَومٌ خَفِيف**) ڕۆژێکی سووك، مەبەست ئەوە نیە کە کێشی کەم بێ، چونکە کات (**زمن**) ناکێشرێ، بەڵکو وشەی سووك (**خفيف**) خوازراوەتەوە بۆ واتایەکی دیکەی گونجاو لەگەڵ ڕەوت (**سياق**)ەکەدا، وەك: ئاسان.

ئنجا کە خوای زاناو کارزان دەفەرمووێ: لە پشتیانەوە (**وراءهم**) هەر چەندە مرۆڤ کە دەڕوا بەرەو داهاتوو دەڕوات و داهاتوو لە پێشیەوەیەتی، بەڵام وشەکانی: (**وَرَاء**) و (**أَمام**) جاری وایە جێگۆڕکەیان پێ دەکرێ، ئایا لێرەدا بۆچی وشەی پشت، دواوە (**وَرَاء**) بەکارهاتووە؟ لەبەر ئەوەی ئەوانە ژیانی دوارۆژیان نەویستوە، ئینسان ئەگەر شتێکی نەویست، نادیدەی دەگرێ و پشتگوێی دەخات، یانی: دەیخاتە پشتەوەو، شتێکیش کە لە پشتیەوە بێ، نایبینێ، بەو واتایەی وەك چۆن شتێك کە فڕێ دەدرێتە پشتەوە، مرۆڤ نایبینێ، ئەوانیش ئاوا ژیانی ڕۆژی دواییان فەرامۆش کردوەو پشتگوێ خستووەو وێڵ کردوە.

ئنجا خوا باسی ڕاستی سێیەم دەکات و دەفەرمووێ:

٣- ﴿ نَّحْنُ خَلَقْنَاهُمْ ﴾، ئێمە ئەوانمان هێناوەتە دی، ئێمە پەیدامان کردوون، وشەی (**خَلْق**):

أ- هەم بە مانای پەیدا کردن لە نەبوونەوە دێ (**الإيجادُ مِنَ العَدَم**).

ب- هەم بە مانای ئەندازەگیریی کردن دێ، واتە: ئێمە لە نەبوون پەیدامان کردوون و ئەندازەگیرییمان کردوون، چ ئەو کاتەی لە منداڵدانی دایکیاندا بوون، چ دوایی بە هەموو شێوەکانی ئەندازەگیریی ئەندازەگیرییمان کردوون.

ئنجا ڕاستیی چوارەم خراوەتەڕوو:

٤)- ﴿وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ﴾، ئێمە پەیوەستیی و تۆکمەییانمان قایم و پتەو کردوە. (**الأَسرُ: الرَّبطُ، وَأُطلِقَ هُنا عَلَى الإِحكامِ وَالإِتقان**) (**أَسر**) بە مانای گرێدان و قایم کردن (**رَبط**)ە، (**ما يُشَدُّ بِا السِّير**)، (**أَسْر**) هەرشتێکە کە بە(**سیر**) ببەسترێ و قایم بکرێ، (**سیر**)یش بریتیە لە زێڵووی چەرم، کە شتیان پێ بەستوەو قاییم بووە، لە جیاتی پەت و بەن، (**أسر**) یش بەمانای قایمکردن (**رَبط**)ە، کەواتە: ﴿وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ﴾، یانی: (**قَوَّينَا رَبْطَهُم**)، پەیوەستبوونیانمان بە هێز کردوەو بە توندیی پێکمانەوە بەستوون، (**شَدّ**) بریتیە لە گرێدان، (**شَدَّهُ يَعنِي: عَقَدَهُ**) گرێیدا، بەستی، قاییمی کرد، ئەمەش ڕاستییەکی زۆر گەورەو گرنگی لایەنی کارئەندامزانیی (**فَسْلجي**) تێدایە!

مرۆڤ ئەگەر تەماشای خۆی بکات، دەزانێ چۆن خوا ﷻ جەستەی لە خانەکان دروستکردوە، زانایان توێکاریی (**تشريع**) بەمەزەندە دەڵێن: جەستەی هەر مرۆڤێك لە زیاتر لە سەد تریلیۆن خانە پێکهاتوە (تریلیۆنێك هەزار ملیارە) واتە: سەد هەزار ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٠^١٤^) خانە پێکهاتوە، هەر خانەیەکیش لە زیاتر لە سەد تریلیۆن گەردیلە پێکهاتوە، ئنجا وەك چۆن گەردیلەکان و گەردەکان، (مۆلکۆلەکان (**molcols**)) خانەکان پێك دێنن، دوایی خانەکانیش شانەکان (**أنسجة**) پێك دێنن، ئنجا شانەکانیش ئەندام (**عضو**) پێکدێنن و، ئەندامەکانیش کۆئەندام (**جهاز**) پێك دێنن، بۆ وێنە: کۆئەندامی چاو، کۆئەندامی هەرس، کۆئەندامی دڵ و سووڕی خوێن و، کۆئەندامی هەناسەدان و، هەتا کۆتایی، ئنجا بە هەموو کۆئەندامەکانیش جەستەی مرۆڤ پێکدێنن، ئەگەر ئینسان سەرنج بدات دەزانێ: هەم خانەکان باش پێکەوە پەیوەستن

و هـەر لێـك جیاناكرێنـەوە، هەروەهـا گـەردەكان (**جُزَيْئـات**) و گەردیلەكانیـش و خانەكانیـش (**الخلايـا**) كـە شـانەكان پێكدێنـن، ئنجـا ئەوانیـش ئەنـدام و دوایـی ئەندامەكانیـش كۆئەندامـەكان و، بەهەمووشیان جەسـتە پێكدێنـن، هـەر كام لەوانـە چـاك پێكـەوە پەیوەسـتكراون و، مـرۆڤ كـە تەماشـای خـۆی دەكات، وا هەسـت نـاكات چەنـد گەردیلەیەكـە لێك بەسـتراون، چجای گـەردەكان و خانـەكان و ئەنـدام و كۆئەندامـەكان، بەڵكـو وا هەسـت دەكات هەمـووی یـەك پارچەیـە، چونكـە خـوا ﷻ ئـاوا پێكیـەوە پەیوەسـت كـردوە، پاشـان ئەنـدام و كۆئەندامـەكان، هەموویـان هاوكاریـی یەكـدی دەكـەن و ئاگایـان لـە یەكـدی هەیـە، بەهـۆی سیسـتم (**نظـام**) ێكـەوە كـە خـوای پـەروەردگار لـە جەسـتەی مرۆڤـدا دایـناوە.

ئنجـا ڕاسـتیی پێنجـەم و كۆتایـی لێـرەدا خـوای پـەروەردگار لەبـارەی بێبڕوایانـەوە بـاسی دەكات و دەفەرمـوێ:

٥)- ﴿ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا ﴾، هەركاتێك ویستیشمان هاوونێنەكانیان دەگۆڕین، واتە: بە هاووێنەكانیان دەیانگۆڕین، ئەوان لادەبەین و هاووێنەكانیان دێنینە شوێنی ئەوان.

لێـرەدا كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا ﴾، (**إذَا: فَإنَّـهُ يُسْـتَعْمَلُ فِيـمَا كَانَ مَعْلُـومَ الوُقُـوعِ، تَقُـولُ: آتِيـكَ إذا طَلَعـتِ الشَّـمْسُ، فَهَهُنـا لَـمّا كانَ اللَّـهُ تَعـالى عالِـمًا بِأنَّـهُ سَـيَجِيءُ وقْـتٌ يُبَـدِّلُ اللَّـهُ فِيـهِ أُولَئِـكَ الكَفَـرَةَ بِأمْثالِهِـمْ فِي الخِلْقَـةِ وأضْدادِهِـمْ فِي الطّاعَـةِ، قـالَ إذا شِـئْنا، وَ(إنْ) يُسـتَعمَلُ فِيـما لا يَكُـونُ مَعلـومَ الوُقُـوعِ عَـلَى:** ﴿ ...إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ ...١٣٣ ﴾**الأنعـام، وَقَولِـهِ:** ﴿ ...وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ٣٨ ﴾**محمـد**).

ئەمە نوكتەیەكی زمانەوانیی و ڕەوانبێژیی گرنگە:

وشـەی (**إذَا**)، بـۆ ئـەو شـتانە بـەكاردێ كـە دڵنیـابی ڕوو دەدەن، وەك یەكێـك دەدوێنـی و دەڵێـی: هـەركات خۆرهـەڵات دێـم بـۆ لات، (دەزانی كـە خـۆر هەڵـدێ

و تـۆش عەزمـت جـەزم کـردوە، ئـەو کاتـە بچـی بـۆ لای) بۆیـە لێـرەش خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا﴾، چونکـە خـوا ﷻ زانیاریـی تـەواوی لەلایـەو، دەزانـێ کاتێـك دێ خـوا ئەوانـە لادەبـات، بۆیـە وشـەی (إِذَا)ی بەکارهێنـاوە، زانیویـەتی ئـەو بێبڕوایانـە لادەبـات و بـە کەسـانێکی دیکـەی کـە هاووێنەیانـن لـە دروسـتکراندا و، پێچەوانەیانـن لـە مامەڵـە لەگـەڵ خـوادا، (دەیانگـۆڕێ ئەوانـە دژو بێبـڕوان و سـەرپێچییکارن لـە خـواو، ئەوانـەش کـە دەیانهێنـێ بـڕوادارن و گوێڕایـەڵ و فەرمانبـەرن بـۆ خـواو بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ) بۆیـە وشـەی (إِذَا)ی بەکارهێنـاوە، بـەڵام (إِنْ) بـۆ شـتێك بـەکاردێ کـە ڕووداوەکـەی زانـراوو مسـۆگەر نەبـێ، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (**الأنعـام**)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿...إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ ...﴿١٣٣﴾﴾، واتـە: ئەگـەر بیـەوێ لاتـان دەبـات... هەروەهـا لـە سـوورەتی (**إبراهيـم**)دا دەفەرمـوێ: ﴿...إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَأۡتِ بِخَلۡقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾﴾، واتـە: ئەگـەر (خـوا) بیـەوێ ئێـوە لادەبـاو دروسـتکراوانێکی تـازە دێنـێ.

بێگومـان خـوای پـەروەردگار زانیاریـی تـەواوی لەلایـە، بـەڵام وای نەهێنـاوە کـە لابردنیـان و جـێ پـڕ کردنەوەیـان بـە دروسـتکراوانێکی تـازە، شـتێکی مسـۆگەر بـێ، بۆیـە بـە: ﴿إِن﴾، هێناویـەتی، یـان کـە دەفەرمـوێ: ﴿... وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾﴾**محمـد**، ئەگـەر ئێـوە پشـت هەڵبکـەن (خـوا) ئێـوە لادەبـات و کۆمەڵێـکی دیکـە دێنـێ بـۆ شـوێنی ئێـوەو، ئەوانیـش وەك ئێـوە نابـن، ئـەوەش دیـارە مسـۆگەر نەبـووەو، ئەگـەر ڕووی دوانـدن لـە هـاوەڵان بـێ خـوا لێیـان ڕازی بـێ، خـوا بڕیـاری نـەداوە کـە بـە مسـۆگەریی ئـەوان لاببـات و کەسـانێکی دیکـە بێنێتـە شـوێنیان، بۆیـە بـە ﴿إِن﴾، هێناویـەتی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ﴾، وشـەی (**أَمْثَـال**) کـۆی (**مِثـل**) ە، (**وَالمِثـلُ: هُـوَ المُماثِـلُ فِي ذاتٍ أَو صِفَـةٍ**)، (**أَمْثَـال**) کـۆی (**مِثـل**)ە، (**مِثل**)یـش بریتیـە لـە وێنـەو هاوتـای شـتێك لـە خـود دا یاخـود لـە سیفەتێك دا، کەواتـە: لێـرەدا کـە

دەفەرمـوێ: ﴿ بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا ﴾، بـە گۆڕینێکی سەرسـوڕهێنەر بـە هاووێنەکانیان دەیانگۆڕیـن، ئەمـەش دوو واتایـان هەڵدەگـرێ:

**یەکەم:** **(أَمثالَهُم فِي أَشكالِ أَجْسَادِهِم وَهُوَ التَّبدِيلُ الَّذي سَيَكُونُ فِي المَعاد)**، دەیانگۆڕین بەشێوەکانی جەستەکانی خۆیان، ئەوەش گۆڕینێکە لە ڕۆژی دوایی دا دەبێ.

واتـە: هـەر کاتێـك بمانـەوێ، ئێـوە دەگۆڕیـن لـەڕووی جەسـتەوە بـە هاووێنـەی جەسـتەکانتان، بـەڵام هەمـان ئـەو جەسـتانە نابـن، چونکـە جەسـتەیەك بـۆ ژیانێـکی زوو تێپـەڕی دنیـا، حەفتـا، هەشـتا، نـەوەد سـاڵێك دروسـت بکـرێ، جیایـە لـە جەسـتەیەك کـە بـۆ ژیانێـکی بـێ کۆتایـی و بـێ بڕانـەوە دروسـت دەکـرێ.

**دووەم:** واتە: ئەی کۆمەڵگای ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ! ئێوە لادەبەین و کۆمەڵانی دیکە دێنینە شوێنی ئێوە.

هـەروەك خـوا ﷻ پێشـتر هەندێـك لـە کۆمەڵـگا نەفامـەکان و یاخییـەکانی فەوتانـدوون بـۆ وێنـە: کۆمەڵـگای نـووح علیـە السـلام، هەروەهـا گـەلی لـووط و، گـەلی (عـاد) کـە پێغەمبەرەکەیـان هـوود بـوو و، گـەلی سـەموود کـە پێغەمبەرەکەیـان ساڵیـح بـوو و، گـەلی مەدیـەن کـە پێغەمبەرەکەیـان شـوعەیب بوو، صەڵات و سـەلامی خـوا لەسـەر هەمـوو پێغەمبـەران بـێ. ئەمانـە ئـەو پێنـج ڕاسـتییە بـوون، کـە خـوا ﷻ لـە بـارەی ئـەو بێبڕوایانـەوە خسـتنیە ڕوو.

ئنجـا لـە کۆتایـی دا ئامۆژگارییـەکی زۆر یەکجـار گـەورەو گرنگیـان ئاڕاسـتە دەکات و دەفەرمـوێ:

٦)- ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ﴾، بە دڵنیایی ئا ئەمە بیرخەرەوەیە، ئەمە **(هذه)** ئاماژەیە بەم ئایەتانە، یان بەم سوورەتە موبارەکە، یان بەو ڕاستییانەی لەم سوورەتەدا هەن، **(تَذْكِرَة: مَصْدَرُ ذَكَرَهُ مِثْلُ التَّزكِيَة إِذَا زَكَّاهُ)**، **(تَذكِرَة)** چاوگی **(ذَكَرَهُ)**یە، یانی: هاتەوە یادی، یاخود باسی کرد، وەك **(تزكية)** پاك و چاككردن، **(تَذكِرَة)**ش یانی: بیرخستنەوە، بە مانای پەندو ئامۆژگارییش هاتوە.

٧)- ﴿ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴾، ئنجا هەر کەسێك ویستی بەرەو پەروەردگاری ڕێی ڕاستی گرتە بەر، (**إتِّخاذُ السَّبِيل أَي سلُوكُ السَّبِيل**)، واتە: گرتنە بەری ڕێیەکە، (**إتِّخاذ: إفتِعالُ الأَخذ**)، (**أَخَذَ**) یانی گرتی، (**إتِّخاذ**)یش (**إفتِعال**)ە، لە (**أخذ**) واتە: بە توندیی گرتی، یان: بە ئارەزووەوە گرتی، یاخود: بە هەڵبژاردنەوە گرتی، واتە: هەر کەسێك بیەوێ بۆ لای پەروەردگاری ڕێ دەگرێتە بەر، بەڵام بە ڕابردوو هێناویەتی، واتە: هەر کەسێك ویستی لەڕابردوودا، ڕێی گرتەبەر بەرەو لای پەروەردگاری و، ئێوەش هەروا بکەن و بتانەوێ ڕێ بگرنە بەر بەرەو لای پەروەردگارتان.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**مرۆڤەکان نایانەوێ کارێك بکەن مەگەر خوا بیەوێ، خواش زانای کارزانەو هەر کەسێك بیەوێ دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، ستەمکارانیش سزاو ئازارێکی بە ئێش و ژانی بۆ ئامادە کردوون:**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴿٣١﴾﴾

خوا لە ئایەتی ڕابردوودا فەرمووی: ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ کەسێك ویستی بەرەو پەروەردگاری ڕێی گرتە بەر، واتە: ڕێی ڕاستی گرتە بەر، ڕێی ڕاستی بەرەو لای خوا چوون واتە: شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و لێتێگەیشتنی قورئان و دەست پێوەگرتنی کۆتا فەرمایشتی خوا ﷻو، سەرەنجام بەندایەتیی کردنێکی ساغ و ڕاست و بێ خلتە، بۆ خوا، ئنجا خوا دەفەرموێ: مرۆڤەکان نایانەوێ کارێك بکەن، مەگەر خوا بیەوێ، خواش زانای کارزانەو هەر کەسێك بیەوێ دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوەو، ستەمکارانیش خوا سزاو ئازارێکی بە ئێش و ژانی بۆ ئامادە کردوون، ئنجا بۆ ئەوەی ئەو وەهم و خەیاڵە نەچێتە مێشکی هیچ کەسێکەوە: پێی وابێ خوا بیەوێ و نەیەوێ، دەتوانێ ڕێ بەرەو لای خوا بگرێتە بەر، یان خوا بیەوێ و نەیەوێ دەتوانێ پشتی تێبکات، بەڵکو هەرچی بیکەن بە ویستی خوایە.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾، ناشتانەوێ مەگەر خوا بیەوێ، چ ویستنەکەتان بەرەو بەندایەتییکردن بۆ خواو ڕێ گرتنەبەر بەرەو خوا بێ، چ بریتی بێ لە بەردەوام بوون لەسەر بێبڕوایی و پشت لە خوا کردن، لە هەردوو حاڵاندا هەر بە ویستی خوایە، ئەگەر ئیمان بێنن بە ویستی خوا ئیمان دێنن و، بێبڕواش بن بە ویستی خوا بێبڕوا

دەبن، فەرمانبەریی بۆ خوا بکەن بە ویستی خوایەو، سەرپێچییش لە خوا بکەن، هەر بە ویستی خوایە، دوایی زیاتر ئەوە ڕوون دەکەینەوە.

٢)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾، بە دڵنیایی خوا زانای کارزانە.

ئەمەش ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەی لە ئایەتی دوایی دا دێ:

٣)- ﴿يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦ﴾، (خوا) هەر کەسێك بیەوێ دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، لێرەدا زانایان دەڵێن: (**مَفعُولُ يَشَاءُ مَحذُوفٌ: مَن يَشاءُ دُخُولَهُ فِي رَحمَتِهِ**)، بەرکاری (**يشاء**) بیەوێ، قرتێنراوە، یانی: هەر کەسێك خوا بیەوێ بیخاتە نێو بەزەیی خۆی، دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە.

٤)- ﴿وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا﴾، ستەمکارانیش (خوا) ئازارێکی بە ئێش و ژانی بۆ ئامادە کردوون.

(**الظَّالِمِين**)، یانی: (**الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنفُسَهُم بِاستِعْمَالِ مَشِيئَتِهِم فِي الإِتِّجَاهِ الخَطَأ**)، ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووەو بەهۆی بەکارهێنانی ویستەکەیانەوە، بە ڕێیەکی هەڵەداو بۆ ئامانجێکی هەڵە.

دەڵێم: بەداخەوە کاتێك مرۆڤ تەماشای تەفسیرەکان دەکات دەبینێ زانایان ڕەحمەتی خوایان لێبێ، زۆر جار کەوتوونە ژێر کاریگەریی قوتابخانە فیکرییەکان و ڕێڕەوو تەوژمە فیکریی و سیاسییەکان و، ئایەتە موبارەکەکانی قورئانیان وەرسووڕاندوون و مل پێ کەچ کردوون، بۆ ئەو چەمك و واتایانەی قوتابخانەیەکی فیکریی و تەوژمێکی عەقیدەیی یان سیاسیی دیارییکراو تەبەننیی کردوون، لێرەدا لەسەر ئەو ئایەتە موبارەکەو لەسەر وێنەی ئەو ئایەتانە، کێشەو مشت و مڕو بێنەو بەردەیەکی زۆر لە نێوان: موعتەزیلەو جەبرییەو قەدەرییە و، ماتۆریدییەو ئەشاعیرەدا بووەو، هەر کامێکیان ویستوویەتی ئایەتەکان لەگەڵ بیرۆکەکانی خۆیدا بگونجێنێ، لە جیاتی ئەوەی تەماشای ئایەتەکان بکەن و،

لـە کاتێکـدا عەقـڵ و دڵـی خۆیـان خاڵیـی کردۆتـەوە، لـە هەمـوو ئـەو چەمـك و واتایانـەی قوتابخانەیـەکی دیارییکـراو مەزهەبێـکی دیارییکـراو، تەوژمێـکی فیکریـی و سیاسی دیارییکـراو، تەبەننیـی کـردوون، تەماشـای ئایەتـەکان بکـەن چـی دەگەیەنـن، قبووڵـی بکـەن، دەبـێ خـۆت بـە دەم ئایەتەکانـەوە بـدەی و بـۆ کوێیـان بـردی، بـۆ ئـەوێ بچـی، نـەك ئایەتـەکان مـل پـێ بسـووڕێنی بـەرەو ئـەو چەمـك و واتایانـەی پێشـتر لـە عەقـڵ و دڵـی خۆتـدا داتنـاون و تەبەننییـت کـردوون، ئایەتـەکان بـەو شـێوەیە تەئویـل بکـەی و مـل پـێ بسـووڕێنی بـەرەو ئـەو لایـەی دەتـەوێ!! لەڕاسـتییدا ئـەوە پێچەوانـەی بەندایەتییـە بـۆ خـواو، پێچەوانـەی ڕاسـت و دروسـت تێگەیشـتنە لـە فەرمایشـتی خـواو، پێچەوانـەی ئـەدەب و ڕێـزی تـەواو گرتنیشـە لـە فەرمایشـتی خـوا، لێرەدا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، واتـە: ناشـتانەوێ مەگـەر خـوا بیـەوێ، واتـە: (**لَـم تَكُونُـوا لتشـاءُوا فِعـلَ شَيء لَـو لَـم يَشَـأِ اللهُ إعطاءكـم المَشِيئَة**)، واتـە: ئێـوە نەتاندەتـوانی بتانـەوێ هیـچ کردەوەیـەك ئەنجام بـدەن، ئەگـەر خـوا ﷻ نەیویسـتبایە، ئـەو ویسـتنەتان (ئـەو توانـای ویسـتنەتان) پـێ بـدات. ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا زانـای کارزانـە، واتـە: کارەکانی خـوا بەوپـەڕی وردەکاریـی ئەنجـام دەدرێـن، لەسـەر بناغـەی زانیارییـەکی ئـەو پـەڕی ڕوون و بـێ چەنـد و چـوون بنیاتـنراون، کـە هـەر شایسـتەی خوایـە، کارەکانی خـوا ئەوپـەڕی حیکمـەت و لێزانیـی و کارامەییـان تێدایـە، ئنجـا یەکێـك لـەو شـتانەی زانیاریـی بـێ سـنوورو حیکمـەت و کارزانیـی بـێ سـنووری خـوا دەیخـوازن، ئەوەیـە هـەر کەسـێکی بیـەوێ دەیخاتـە نێـو بەزەیـی خۆیـەوە، سـتەمکارانیش ئازارێـکی بـە ئێـش و ژانی بـۆ دانـاون، ئنجـا ئایـا خـوا دەیـەوێ کـێ بخاتـە نێـو بەزەیـی خۆیـەوە؟ خـوا ڕوونی کردۆتـەوە لـە شـوێنی دیکـە: ﴿ ...إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾**الأعـراف**، واتـە: بـە دڵنیایـی بەزەیـی خـوا لـە چاکەکارانـەوە نزیکـە، کەواتـە: ئەوانـەی چاکـەکار بـن، چـاك بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن، چـاك پەیڕەویـی لـە بەرنامـەی خـوا بکـەن، ئەوانـە شایسـتەی ئـەوە دەبـن خـوا لـە دنیـاو

دوارۆژدا بیانخاتە ژێر سایەی بەزەیی خۆیەوە، بەڵام ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردبێ، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو ویستە بەشییەی خوا پێیداون، بە مەبەستی پێ تاقیکرانەوە، ئەگەر ئەو ویست و خواستەی خۆیان بەرەو ئامانجێکی هەڵە ئاڕاستە بکەن، ئەو کاتە دیارە ستەمیان لەخۆیان کردوە و، شایستەی ئەوە دەبن خوا ئازارێکی بە ئێشیان بۆ دابنێ.

## کورته باسێك: پەیوەندیی نێوان ویستی خواو ویستی مرۆڤ

لێرەدا بە باشی دەزانم قسەیەك له (**محمد حسين الطباطبائي**) خاوەنی تەفسیری (**الميزان**)[1] بێنم، دەڵێ:

**(الإسْتِثْنَاء مِن النَّفِي يُفِيْدُ أَنَّ مَشِيئة العَبْدِ مُتَوقِّفَةٌ فِي وُجُودِهَا عَلَى مَشِيْئته تَعَالَى، فَلِمَشِيئة الله تَعَالَى تَأْثِيْر فِي فِعْل العَبْدِ مِنْ طَرِيْق تَعَلُّقِهَا بِمَشِيئة العَبْد، وَلَيْسَتْ مُتَعَلِّقَةً بِفِعْل العَبْدِ مُسْتَقِلًا وَبِلَا وَاسِطَة، حَتَّى تَسْتَلْزِم بُطْلَانَ تَأْثِيْر إِرَادَة العَبْدِ وَكَوْن الفِعْلِ جَبْرِيّاً، وَلاَ أَنَّ العَبْدَ مُسْتَقِلٌّ فِي إِرَادَتِهِ، يَفْعَل مَا يَشَاؤهُ شَاءالله أَو لَمْ يَشَأ، فَالْفِعْلُ اخْتِيَارِيٌّ لاسْتِنَادِهِ إلى اخْتِيَار العَبْد، وَأَمَّا اخْتِيار العَبْدِ، فَلَيْسَ مُسْتَنِداً إلى اخْتِيَارٍ آخَر).**

ئەمە بە بۆچوونی من تێگەیشتنێکی زۆر قووڵ و وردە، لە مەسەلەی ویستی خواو، پەیوەندیی لەگەڵ ویستی مرۆڤدا، چونکە خوا ﷻ وێڕای خۆی بۆ مرۆڤەکانیش وشەی: ویست (مشيئة)ی بەکارهێناوە: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، کەواتە مرۆڤەکانیش ویستنیان هەیەو خواستن (إرادة) شیان هەیە، چونکە خوای پەروەردگار (إرادة)شی بۆ مرۆڤەکان بەکار هێناوە، وەك چۆن بۆخۆشی بەکاری هێناوە، کەواتە: هەم خوا ویستن و خواستنی هەیە، هەم خواستن و ویستنیشی بە مرۆڤەکان داوە.

(**الطباطبائي**) دەڵێ:

هەڵاواردنەکە لە لا بردن ئەوە دەگەیەنێ، کە ویستی بەندە لە بوونیدا لەسەر ویستی خوای بەرز، وەستاوە، واتە: خوا ویستوویەتی مرۆڤ ئەو ویستن و توانایەی هەبێ، کە شتی بوێ، بۆیە ویستنی خوای بەرز کاریگەریی

---

(١) ج٢٠، ص(١٤٢، ١٤٣).

لـە کـردەوەکانی بەنـدەدا هەیـە لەڕێـی پەیوەسـت بـوونی بـە ویسـتنی بەنـدەوە، بـەڵام ویسـتنی خـوا ﷻ پەیوەسـت نیـە بـە کـردەوەکانی بەنـدەوە، بـە شـێوەیەکی سـەربەخۆ و بەبـێ هـۆکار، چونکـە ئەگـەر ویسـتی خـوا ڕاسـتەوخۆ پەیوەسـت بووایە بـە کـردەوەکانی مرۆڤـەوە، ئـەو کاتـە خوازیـاری ئـەوە بـوو، کاریگەریـی ویسـتی بەنـدە هەڵبوەشـێتەوەو کـردەوەکانی دەبـوون بـە ناچاریـی، (ئـەوە لـە لایەکـەوە) دیسـان بەنـدەش لـە ویستنەکەیدا سـەربەخۆ نیـە کـە هەرچـی بیـەوێ بیکات، خـوا بیـەوێ یـان نەیـەوێ، بەڵکـو کـردەوەی مـرۆڤ ئازادانەیـە، لەبـەر ئـەوەی پاڵدەداتـە لای ویسـتێکی ئازادانـە کـە بـە مـرۆڤ دراوە، بـەڵام جارێـکی دیکـە هەڵبـژاردنی مـرۆڤ، پاڵنادرێتـە لای ویسـتنێکی دیکـە (کـە ویسـتی ڕەهـای خـوای پـەروەردگارە).

ئێستا بائەو بیرۆکەیە ڕوونتر بکەینەوە:

خـوا ﷻ لـە ئەزەلـدا وەك چـۆن فریشـتەکانی خوڵقانـدوون، کـە ویسـتەکەیان ڕاسـتەوخۆ پەیوەسـتە بـە ویسـتی خـوای پـەروەردگارەوە، بـەو واتایـەی هەرچـی دەیکـەن، خـوای پـەروەردگار ڕاسـتەوخۆ پێیـان دەکات و، ناتوانـن شـتێك بکـەن ڕەزامەندیـی خـوای لەسـەر نەبـێ: ﴿...لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۝٦﴾ **التحريم**، ویسـتوویەتی مرۆڤیـش بخوڵقێنـێ، هەڵبەتـە جنـدی پێشـێ خوڵقانـدوون: ﴿وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ۝٢٧﴾ **الحجر**، بـەڵام ویسـتوویەتی مرۆڤیـش بخوڵقێنـێ، کـە هـەر کام لـە جنـدو مـرۆڤ خـاوەنی ویسـتێکی ئـازادن، خـوا ﷻ ویسـتێکی ئـازادی بـە مـرۆڤ داوە، هەروەهـا بـە جندیـش، کـە بـەو ویسـتە دەتوانـن کـردەوان ئەنجـام بـدەن، چ هـی چـاك، چ هـی خـراپ، کەواتـە: کـە خـوا دەفەرمـوێ: ناتانـەوێ مەگـەر خـوا بیـەوێ، واتـە: خـوا ویسـتوویەتی تـۆ بتـوانی بتـەوێ و، ویستنەکەی خـوا ﷻ ئەوەیـە کـە ویسـتوویەتی مـرۆڤ دەسـتکراوەو ئـازاد بـێ و، بتوانـێ. کـردەوەکانی خـۆی بـۆ خـۆی هەڵبژێـرێ و بێنێتـەدی، خـوا ئـەو ویسـتەی بـە مـرۆڤ داوەو، ئنجـا لێـی گـەڕاوە، ئـەو ویسـتە لـە چاکـەدا بـەکار دێنـێ، تاکـو پاداشـتی هەبـێ، یـان لـە خراپـەدا بـەکاری دێنـێ، تاکـو سـزای هەبـێ، نـەك بـەو

شێوەی: هەر کاتێك مرۆڤ کردەوەیەکی ئەنجام دا، خواش بیەوێ ئەوجار ئەنجامی بدا، نا، چونکە خوا توانای داوە بە مرۆڤ، توانا جەستەییەکانی پێداون و توانا مەعنەوییەکانیشی پێداون، یانی: کاتێك ئێمە شتێك دەبینین، یان شتێك دەبیستین ئەو بینینەی ئێمەو، ئەو بیستنەی ئێمە، یان ئەو قسە کردنەی ئێمە، پەی لەسەر ئەوە نەکەوتوە خوا بیەوێ، ئەوجار ئەنجامی بدەین، وەک ئەشعەرییەکان هەموویان یان بەشێکیان گوتوویانە چونکە خوای پەروەردگار هەر لە سەرەتاوە ئەو تواناییانەی بە مرۆڤ داون و، مرۆڤی ئازاد کردوەو دەستی کردۆتەوە، لە چاکەدا ئەو توانا جەستەیی و مەعنەوییانەی خۆی بەکاردێنێ، یاخود لە خراپەدا، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ناتانەوێ تاکو خوا نەیەوێ، واتە: خوا ویستوویەتی ئێوە بتوانن بتانەوێ، بۆیە دەتوانن بتانەوێ. ئەمە چۆنیەتیی پەیوەستبوونەوەی ویستی مرۆڤە، بە ویستی ڕەهاو بێ سنووری خوای پەروەردگارەوە.

لە کۆتایی ئەم بابەتەشدا دەڵێم:

سوپاس و ستایش بۆ خوا، یەکێك لەو دەرەنجامانەی من لە زیندانی ئەمریکاییەکاندا پێیان گەیشتم، لە ئەنجامی تێوەڕامانی قورئاندا، کە ماوەیەکی باشم لە خزمەت قورئاندا بردە سەر، وەك لە شوێنی دیکەدا باسم کردوە، زیاتر لە سەدو چل (١٤٠) جار هەموو قورئانم خوێندەوە لە نوێژەکانداو لە جگەلە لەو نێژەکانیش دا، یەکێك لەو دەرەنجامانەی پێی گەیشتووم، بریتیە لە چارەسەری کێشەی جەبرو قەدەر، کە ئەو چارەسەرەشم لە کتێبی دووەمی مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**)دا باس کردوە، کە باسی ئیمانە، هەروەها لە ڕوونکردنەوەی عەقیدەی (**طحاوي**)یشدا باسم کردوەو لە: (مەوسووعەی ئیمان و ئیلحاد)یشدا، باسم کردوەو، لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا)ش دا، باسم کردوە، ئەویش پوختەو گوشراوەکەی ئاوایە:

موعتەزیلە و قەدەرییە گوتوویانە: مرۆڤ بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی، (**الإنسانُ خالِقُ أَفعالِهِ**).

جەبرییەش گوتوویانە: خوا بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤە.

ئەشاعیرەش گوتوویانە: خوا بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤە، بەڵام مرۆڤیش کردەوەکانی وەدەست دێنێ و کەسب دەکات.

ئنجا گەیشتوومە ئەو ڕاستییە، کە هیچ کام لەوانە نەیانپێکاوە! هەڵبەتە ئەوە دەعوایەکی گەورەشە، بەڵام پێم وایە توانیومە بیسەلمێنم:

**یەکەم:** موعتەزیلە نەیانپێکاوە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ توانای پەیداکردن و بەدیهێنانی نیە، خوا دەفەرموێ: ﴿...ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٍ...﴾ **الرعد**، واتە: هەر خوا بەدیهێنەرە، یانی: هەر شتێك بەدیهێنراو بێ، خوا بەدیهێناوە.

هەروەها خوای بەدیهێنەر لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿...لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ...﴾ **الفرقان**، ئەوان هیچ شتێك بەدی ناهێنن و خۆشیان بەدی دەهێنرێن، کەواتە: ئەوە شتێکە لێی بووینەوە، کە مرۆڤ ناتوانێ شت وەدی بهێنێ و پەیدا بکات لە نەبوونەوەو، ئەوە تەنیا هی خوای بەدیهێنەرە.

**دووەم:** بەڵام ئایا جەبرییەکان ڕاست دەکەن، هەروەها ئەشعەرییەکانیش کە دەڵێن: خوا وەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤە، ئنجا جەبرییە دەڵێن: مرۆڤ هیچ کارەیە، بەڵام ئەشاعیرەو ماتۆریدییە دەڵێن: مرۆڤ کردەوەکانی خۆی وەدەست دێنێ؟

دەڵێین: جەبرییەش ڕاست ناکەن، هەروەها ئەشعەریی و ماتوریدییەکانیش چونکە ئەگەر خوا کردەوەکانی مرۆڤ وەدیبێنێ ڕاستەوخۆ، هیچ بۆ مرۆڤ نامێنێتەوەو، ئەو کاتەش وەدەستهێنان (كسب) هیچ مانایەکی نیە، ئەگەر خوا بۆی دروست بکات، تازە دروستی کردوەو بڕاوەتەوە!

**سێیەم:** بۆیە من گەیشتوومە ئەو قەناعەتە کە ڕاستییەکە، ئاوایە:

کردەوەکانی مرۆڤ وەدیهێنراو نین، تاکو پێویستییان بە بەدیهێنەر بێ، ئنجا چ خوای موتەعال بێ، وەك جەبرییە دەڵێن، چ مرۆڤ بێ، وەك موعتەزیلە دەڵێن،

بەڵكو كـردەوەكانی مـرۆڤ شـتی (جَعْل)یـن و (كَسْـب)یین، خـوای پـەروەردگار ئـەو وشـانەی بـۆ كـردەوەكانی مـرۆڤ بەكارهێنـاون: (فعـل)، (عمـل)، (كسـب)، (اقـترف) (اجـترح) كـە هیچیـان ئـەوە ناگەیەنـن مـرۆڤ شـتێك لـە نەبـوون پەیـدا بـكات و وەدی بهێنـێ تاكـو بگوتـرێ: مـرۆڤ بەدیهێنـەری كـردەوەكانی خۆیـەتی، هەروەهـا كـردەوەكانی مـرۆڤ شـتێك نیـن وەدیهێنرابـن لـە نەبوونـەوە، تاكـو حەوجێـی بەدیهێنـەر بـن، بـۆ وێنـە: كەسێك نوێـژ دەكات، ئایـا نوێـژ كـردن بریتیە لەوەی شتێك لـە نەبوونـەوە وەدیهاتبـێ؟ نەخێـر، هـەر ئـەو ئەندامانـەی خـوا بـە ئێمـەی داون، ئەندامـە پەنهـان و ڕواڵەتـەكان، لـە نوێـژ كردەنەكەمـان دا هـەر ئـەوان بەكاردێنیـن: بەعەقـڵ و دڵ ئایەتـەكان تێدەگەیـن، بـە زمـان دەیانخوێنیـن، بـە ئەندامەكانیشـمان هەندێـك جووڵـەو هەڵـس و كـەوت دەكەیـن، كەواتـە: هیـچ شـتێكی پەیـدا نەبـوو، پەیـدا نەكـراوە، بەڵكـو هەموویـان (جعـل)ن، واتـە: مـرۆڤ هـەر ئەندامـەكانی خـۆی دەجووڵێنـێ و هەندێـك چالاكیـی ئەنجـام دەدات و هەندێـك كار دەكات، بـۆ وێنـە: كـە قسـەیەك دەكات، قسـە كردنەكـە بریتیـە لـە جووڵانـدنی زمـان و زارو قوڕقوڕاگـەو سـندووقی دەنـگ و، دواتـر دەرچوانـدنی پیتـەكان و وشـەكان، شـتێك پەیـدا نابـێ كـە نەبووبـێ، بەڵكـو بـەس گۆڕینـی شـتێكە لـە حاڵێكـەوە بـۆ حاڵێـك، هەروەهـا كەسێك كـە قەتـڵ دەكات شـتێكی نەبـوو، پەیـدا نەبـووە، بـەو توانایـەی كـە خـوا بـە مرۆڤـی داوە، بـەو ئەندامانـەی پێیـداون، بـەو ئامرازانـەی بـۆی ڕەخسـاون، دەچـێ كردەوەیـەك ئەنجـام دەدات كـە بریتیـە لـە لەبەیـن بـردنی كەسێك، هەروەهـا چ چاكـەو چ خراپـە، چ شـتی پەنهـان و مەعنەویـی، وەك ئیـمان و كوفـر و، چ شـتی جەسـتەیی، وەك جـووڵانی ئەندامـەكان، ئەوانـە هیچیـان پێناسـەی (خَلْـق) واتـە: پەیـدا كـران لـە نەبوونەوەیـان بەسـەردا ناچەسپێ، تاكـو ناچـار بیـن بڵێیـن: یـان خـوا بەدیهێنـەری كردەوەكانـەو، ئـەو كاتـەش مـرۆڤ هیچـی بـۆ نامێنێتـەوە، یـان مـرۆڤ بەدیهێنـەری كردەوەكانیـەتی، ئـەو كاتـەش لەگـەڵ هەمـوو ئـەو ئایەتانـەدا تێكدەگیرێ كـە خـوا دەفەرمـوێ: خـوا بەدیهێنـەری هەمـوو شـتێكە، بەڵـێ هـەر شـتێك بەدیهێنراو

(**مخلوق**) بێ، خوا بەدیهێنەر (**خالق**)یەتی، بەڵام شتێك بەدەست هێنراو (**مكسوب**) بێ، ئەنجام دراو (**مفعول**) بێ، كراو (**معمول**) بێ، مرۆڤ بكەرو ئەنجامدەرو ڕەخسێنەرەكەیەتی، بەو شێوەیەش ئێمە لەو ئیشكالەی كێشەو مشت و مڕێكی لە مێژینەی مێژوویی لەسەر بووە، لە نێوانی قوتابخانە جۆراوجۆرە فیكرییەكانی مسوڵمانماندا، دەربازمان دەبێ، لێرەشدا كۆتایی بەم دەرسەمان دێنین و، كۆتایی بە تەفسیر كردنی كۆی سوورەتی (**الإنسان**) دێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

# دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢)ی (ذي الحجـة)ی سـاڵی (١٤٤٢)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٣)ی حوزەیـرانی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زایینـی لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**المُرْسَلَات**)، سـەرەتا وەك عادەتـی خۆمـان، پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (المرسلات) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە لـە ڕۆژگاری هاوەڵانـەوە (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) بـە سـوورەتی: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾) نـاسراوە، وەك لـەم دوو دەقـەوە دیـارە:

**أ)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَارٍ بِمِنًى، إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِ: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ وَإِنَّهُ لَيَتْلُوهَا، وَإِنِّي لَأَتَلَقَّاهَا مِنْ فِيهِ، وَإِنَّ فَاهُ لَرَطْبٌ بِهَا، إِذْ وَثَبَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اقْتُلُوهَا فَابْتَدَرْنَاهَا فَذَهَبَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وُقِيَتْ شَرَّكُمْ كَمَا وُقِيتُمْ شَرَّهَا}، (أخرجه البخاري: ٤٩٣٤، ومسلم: ٢٢٣٤، والنسائي في التفسير: ٦٦٢).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود ﷺ دەڵـێ: لـە کاتێکـدا ئێمـە لـە خزمـەت پێغەمبـەردا ﷺ بوویـن، لـە ئەشـکەوتێکدا لـە مینـا - کـە شـوێنێکە لـە نزیـك مەککـەوە - سـوورەتی ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ی بەسـەردا دابـەزی، پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەیخوێنـدەوەو، مـن لـە زاری موبـارەکی وەرم دەگـرت، زاری پێـی تـەڕو پـاراو بـوو،

(واتــە: لــە گەرمــەی خوێندنــی دابــوو)، كــە مارێــك لێــمان دەرپــەڕی، پێغەمبــەر ﷺ فەرمــووی: بیكــوژن، ئێمــەش پەلامارمانــدا، بــەڵام مارەكــە ڕۆیــی، پێغەمبەریــش ﷺ فەرمــووی: ئەویــش لــە زیــانی ئێــوە پارێــزراو بــوو، وەك چــۆن ئێــوە لــە زیــانی وی پارێــزراو بــوون.

**ب)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ أُمَّ الْفَضْلِ سَمِعَتْهُ وَهُوَ يَقْرَأُ: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ! وَاللهِ لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقِرَاءَتِكَ هَذِهِ السُّورَةَ، إِنَّهَا لآخِرُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهَا فِي الْمَغْرِبِ} (أخرجه البخاري: ٤٤٢٩ وغيره).**

واتــە: عەبدوڵــڵای كــوڕی عەببــاس رضي الله عنهما دەڵــێ: ئوممولفــەزڵ (واتــە: دایــكی عەبدوڵــڵای كــوڕی عەببــاس رضي الله عنهما)، گوێــی لێبــوو لــە كاتێكــدا ســوورەتی: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ی دەخوێنــد، {عەبدوڵــڵای كــوڕی دەیخوێنــدو دایكیــشی ئوممــو فــەزڵ گوێــی لێبــوو}، گــوتی: ڕۆڵــە گیــان! بــە خوێندنــەوەی ئــەم ســوورەتەت، ئــەوەت بــە بیرهێنامــەوە، كــە ئــەوە دوا ســوورەت بــوو لــە پێغەمبــەری خــوام ﷺ بیســت لــە نوێــژی شــێواندا دەیخوێنــد.

كەواتــە: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ ناوێــكی لــە مێژینەیــە بــۆ ئــەو ســوورەتەو، تاكــە ناوێكــەو لــە ســەردەمی هاوەڵانــەوە، بــەم نــاوە نــاسراوە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە موبارەكە مەككەییە بە یەكدەنگیی زانایان، وەك لەم دەقەدا دیارە:

**{عَـنْ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ عَبَّـاسٍ رضي الله عنهما، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ الْمُرْسَـلَاتِ بِمَكَّـةَ} (ذكـره السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٨، ص٣٨٠، ونسـبه لآبـن الضريـس والنحـاس وابـن مردويـه والبيهقـي).**

واتــە: عەبدوڵــڵای كــوڕی عەببــاس رضي الله عنهما گوتوویــەتی: ســوورەتی (**الْمُرْسَــلَاتِ**) لــە مەككــە دابەزیــوە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بە یەکدەنگیی ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان، ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (**المُرْسَلاتِ**) پەنجا (٥٠)یە، نە کەس کەمتری گوتووە، نە زیاتر.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

لە موصحەفدا ژمارەکەی حەفتاو حەوت (٧٧)ە، (**جزء عم**)ە، بە تەنیا سی و حەوت (٣٧) سوورەتی کۆتایی قورئان دەگرێتە خۆی، ئەم بیست و نۆ (٢٩) جوزئە بە هەموویان حەفتاو حەوت (٧٧) سوورەت دەگرنە خۆیان: (٧٧) + (٣٧) دەکاتە سەدو چواردە (١١٤).

لە دابەزینیشدا بە پێی ڕای (**جابر بن زید**) ژمارە سی و سێ (٣٣)یە، هەڵبەتە دەبێ وریا بین، هەمیشە لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، کە بە زۆریی جابیری کوڕی زەید پشتی پێ بەستراوەو، ئەویش بە بۆچوون و کۆششی خۆی، ڕیزبەندیی دابەزینی سوورەتەکانی داناوەو، مەرج نیە هەمیشە لە سەدا سەد پێکابێتی.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

تەوەری سەرەکیی ئەم سوورەتە باسی ڕۆژی دواییە، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەتەوە، بە تایبەت قیامەت و ڕۆژی زیندووکرانەوەو هەڵسێنرانەوەو، سزاو پاداشتدانەوەی مرۆڤەکان و جندەکان، هەر بەو بۆنەیەشەوە کۆمەڵێك بابەتی دیکەش باسکراون، وەك بەڵگە لەسەر هەبوون و بگرە پێویست بوونی قیامەت:

**١-** وەك فەوتاندنی گەلە پێشووە لارو لادەرەکان.

**٢-** لە تنۆکە ئاوێکی قێزەون دروستکرانی مرۆڤ.

**٣-** زەوی گێڕان بە شوێنی تێدا حەوێنرانەوەی زیندووان و مردووان.

**٤-** دروستکرانی چیا بەرزەکان و ئاوی سازگار.

دواتریش باسێکی کورتی چەند دیمەنێکی دۆزەخ و قیامەتی بێبڕوایان، پاشان سەرەنجامی خێری پارێزکاران و، لە کۆتاییدا هەڕەشەکردن لە تاوانباران، ئەو باس و خواسانە کراون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

ئێمە سێ تایبەتمەندیی ئەم سوورەتەمان کەوتوونە بەرچاو، کە جیای دەکەنەوە لە سوورەتەکانی دیکە:

**١-** دووبارەبوونەوەی ڕستەی: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ دە (١٠) جاران، بەڵام هەر جارە دوای باسکرانی ڕاستییەك، یان چەند ڕاستییەکی مەزن، کە بە ڕواڵەت دووبارە بوونەوەیە، ئەگەرنا هەر جارێك ئەو ڕستە موبارەکە هاتوە، پڕ بە پێستی ئەو شوێنەیە کە تێیدا هاتوەو، دەبووایە ئەو ڕستەیە بێ، هەروەك سی و یەك (٣١) جار دووبارەبوونەوەی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾﴾ **الرحمن**، لە سوورەتی (**الرحمن**)داو، لە سوورەتی (**القمر**)دا، چوار جاران هاتنی: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾، هەروەها ڕستەیەکی دیکەش هەر لە سوورەتی (**القمر**)دا، چوار جاران دووبارەبۆتەوە، کە بریتیە لە: ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٢١﴾﴾، کە بێگومان ئەو دووبارە بوونەوانە، هەموویان خوای کاربەجێ و شارەزا، بێ حیکمەت هیچ شتێکی لە قورئاندا دووبارە نەکردۆتەوە.

**٢-** زۆر بە خێرایی و بە توندیی، بە دوای یەکدا هاتنی بابەت و مەسەلە زۆرو جۆراو جۆرەکان، وەك چۆن کەسێك بە چەکوشێك دادەگژێتە[1] شتێك بە بێ پشوودان، لێی

---

(١) داگژایە شتێك: بە خێرایی و بە توندیی پەلاماری داو لێیدا.

دەدات، ئەم سوورەتە موبارەکە ئایەتەکانی زۆر بە خێرایی و زۆر بە توندیی بە دوای یەکدا دێن و ئاواز (**نغمة**)ی بێژەکانیشی هەر توندە، وەك (**سید قطب**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆی (**في ظلال القرآن**)دا ئاماژەی پێکردوە، ئەوەش شتێکی ئاشکرایە، بەڵام (**سید قطب**) ڕەحمەتی خوای لێبێ بە دارشتنە ئەدەبییە جوان و ڕەونەقدارەکەی خۆی، زۆر باش ئەو حاڵەتەی لەم سوورەتە موبارەکەدا بەرجەستە کردوە.

٣- چەند وشەیەك تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

١)- (وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا).

٢)- (فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا).

٣)- (فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا).

٤)- (فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا).

٥)- (عُذْرًا أَوْ نُذْرًا).

٦)- (وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتْ).

٧)- (وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ).

٨)- (لِأَىِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ).

٩)- (أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا).

١٠)- (ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ شُعَبٍ).

١١)- (إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ).

١٢)- (كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ).

ئەم وشەو تەعبیرانە، تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوون.

هەڵبەتـە هەندێـك لـە پێكهاتـەی ئـەو تەعبیرانـە لـە شـوێنی دیكـەدا هاتـوون، بـۆ وێنـە: (**رسـل**) هاتـوەو، (**وَقـت**) هاتـوەو، (**جَعـل**) هاتـوەو، (**أَرْض**) هاتـوە، بـەڵام بـەو تەعبیرانـەی ئایەتـەكان كـە هێنامـن - بەپێـی ئـەوەی مـن لـە یادمـە - تەنیـا لـەم سـووڕەتە موبارەكـەدا هاتـوون.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكانی:

كـۆی پەنجـا ئایەتەكـەی ئـەم سـووڕەتە موبارەكـە، بـۆ دوو دەرسـان دابـەش دەكەیـن:

دەرسـی یەكـەم: ئایەتـەكانی: (١ - ٢٨) دەگرێتـە خـۆی، كـە دوای سـوێند خـواردن بـە پێنـج شـتان، لەسـەر ڕاسـتیی بەڵێنـی خـوا بـە هاتنـی ڕۆژی دوایـی، بـاسی چـوار بابەتـان كـراوەو، لـە دوای هـەر بابەتێكیـش هەڕەشـەی توند لـە بـە درۆ دانـەرانی پەیامـی خـوا، یـان دیـداری خـوا، یاخـود پێغەمبـەری خـوا ﷺ، كـراوە: ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾.

دەرسـی دووەم: كـە بیسـت و دوو ئایـەتی كۆتایـی سـووڕەتەكە دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەكانی: (٢٩ - ٥٠)، ئـەو بیسـت و دوو ئایەتـەش بـاسی ڕۆژی دواییـن، بـە تایبـەت بـاسی سـزای سـەختی دۆزەخ بـۆ بێبڕوایـان و، نـازو نیعمـەتی بەهەشـت بـۆ بـڕوادارانی پارێـزكارو، چەنـد ڕاسـتییەكی دیكـەش، نێواخنـی ئـەو دوو بابـەت و مەبەسـتە گـەورەو گرنگـە كـراون.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە بیسـت و هەشـت (٢٨) ئایـەتی نیـوەی یەکەمـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە پێـك دێ، ئایەتـەکانی: (١ - ٢٨)و، لـەو (٢٨) ئایەتـەدا ئەم بابەتانە باسـکراون:

**١-** لە حەوت ئایەتەکانی: (١ - ٧)دا، باسی سوێند خواردن بە پێنج شتان، لەسەر ڕاستیی هاتنی بەڵێنی خوا، بە هاتنی ڕۆژی دوایی.

**٢-** لە هەشت ئایەتەکانی: (٨ - ١٥)دا، چەند ڕووداوێکی **(ساعة)** و **(قیامة)** واتە: ئاخیر زەمان و زیندووکرانەوەو هەڵسێنرانەوە، خراونەڕوو.

**٣-** لە چوار ئایەتەکانی: (١٦ - ١٩)دا، باسی فەوتێنرانی گەلە یاخییە پێشووەکان کراوە.

**٤-** لە پێنج ئایەتەکانی: (٢٠ - ٢٤)دا، باسی دروستکرانی مرۆڤ و، دانرانی لە نشینگەیەکی مەحکەم و پارێزراوداو، ئەندازەگیرییکرانی بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر کە هەر شایستەی خوایە، کراوە.

**٥-** لە چوار ئایەتەکانی: (٢٥ - ٢٨)دا، باسی ڕەخسێنرانی زەوی بە: ڕاکێشەری مرۆڤەکان بۆ لای خۆی، بە مردوو و زیندووەوەو، دانانی چیا بڵندو سەرکەشەکان و، هەڵقوڵاندنی ئاوی زوڵاڵ و سازگار، کراوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴿١١﴾ لِأَىِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴿١٢﴾ لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ﴿١٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ

﴿ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ الْآخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾ أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، سوێند بە (بایە) بە دوای یەکدا نێردراوەکان ﴿١﴾ ئنجا سوێند بە (بایە) توند هەڵکردووەکان بە هەڵکردن (یێکی سەرسوڕهێنەر) ﴿٢﴾ هەروەها سوێند بە (فریشتە)، (باڵ) بڵاوکەرەوەکان بە بڵاوکردنەوە (یەکی ناوازە) ﴿٣﴾ ئنجا سوێند بە (فریشتە) لە یەك جیاکەرەوەکان بە لێك جیاکردنەوە (یەکی سەرسوڕهێنەر) ﴿٤﴾ ئنجا سوێند بە (فریشتە) بیرخەرەوە هاوێژەکان (بۆ پێغەمبەران) ﴿٥﴾ بۆ بیانوو برین و ترساندن (و ورياکردنەوەی خەڵك) ﴿٦﴾ (سوێند بەوانە) بە دڵنیایی ئەو بەڵێنەی دەدرێ هاتووە دییە ﴿٧﴾ ئنجا هەر کات ئەستێرەکان کوژێنرانەوە (تاریك داهێنران) ﴿٨﴾ هەروەها هەر کات ئاسمان لێککرایەوە (شەق و پەق کرا) ﴿٩﴾ دیسان هەر کات چیایەکان هەڵکەنران و وردو خاش کران ﴿١٠﴾ هەروەها هەر کات پێغەمبەران ژوانگەیان بۆ دانرا ﴿١١﴾ ئایا بۆ چ ڕۆژێك دواخراون؟ ﴿١٢﴾ بۆ ڕۆژی لێك هەڵاواردن ﴿١٣﴾ ئایا چی پێی زانینیوی ڕۆژی لێك جیاکردنەوە چییە؟ ﴿١٤﴾ لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران (ی هاتنی ڕۆژی دوایی) ﴿١٥﴾ ئایا ئێمە (کۆمەڵگا) پێشووەکانمان نەفەوتاندن! ﴿١٦﴾ دوایی ئەوانی دیکەشمان وەدواخستن (و لە بەینمان بردن بەهۆی تاوان و لادانیانەوە) ﴿١٧﴾ بەو شێوە (فەوتاندنەی باسکرا) لە تاوانباران دەکەین (و سزایان دەدەین) ﴿١٨﴾ لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بە

درۆدانەران (ی پەیامەکانی خوا) ﴿١٩﴾ (ئەی خەڵکینە!) ئایا لە (تنۆکە) ئاوێکی بێهێز دروستمان نەکردوون؟ ﴿٢٠﴾ ئنجا لە نشینگەیەکی مەحکەمماندا دانا ﴿٢١﴾ هەتا ئەندازەیەك (کات)ی زانراو ﴿٢٢﴾ ئنجا ئەندازەگیریی (هەموو شتێکی)مان کرد (ئێمەش) چاکترین توانابووین (لەسەر ئەندازەگیریی کردن) ﴿٢٣﴾ لەو ڕۆژەدا سزای بێڕەزا بۆ بە درۆدانەران (ی پێغەمبەران) ﴿٢٤﴾ ئایا زەویمان نەگێڕاوە بە ڕاکێشەر (و بە خۆوە نوسێنەری مرۆڤان)؟ ﴿٢٥﴾ (بۆ) زیندووان و مردووان؟ ﴿٢٦﴾ هەروەها (چیایە) چەسپاوە سەرکەشەکانمان تێدان داناون و، ئاوێکی شیرین و سازگارمان پێتان نۆشکردوە ﴿٢٧﴾ سزای سەخت و دژوار بۆ بە درۆ دانەران (ی دیداری خوا) ﴿٢٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(عُرْفًا): (عُرْفُ الفَرَسِ وَالدِّيْكِ مَعْرُوفٌ، جَاءَ القَطَا عُرْفَاً: مُتَتَابِعَةً)، (عُرْفُ الفَرَسِ وَالدِّيْكِ مَعْرُوفٌ) مووەکانی سەر پشتە ملی ئەسپ و ماین و وڵاخە بەرزە و پۆپڕەی کەڵەباب زانراون، (عرف) بۆ مووەکانی گێزەی ئەسپ و پۆپڕی کەڵەشێر بەکاردێ، (پشتە ملی ئاژەڵ پێی دەگوترێ: گێزەکە)، ئنجا بە کوردیی (یاڵ) بەکاردەهێنرێ بۆ ئەو مووانەی سەر پشتی ملی وڵاخە بەرزە، هەروەها (بژ)یش بەکاردەهێنرێ، هی کەڵەشێریش بە کوردیی پێی دەگوترێ: پۆپڕە، لەبەر ئەوەی ئەویش چەند پارچە گۆشتێکی یەك لە دوای یەکن، بەرزیی و نزمییان تێدایەو، بە دوای یەکدا دێن، لە زمانی عەرەبییدا گوتراوە: (جَاءَ القَطَا عُرْفَاً: مُتَتَابِعَةً)، {(قَطَا) جۆرە باڵندەیەکە، پۆڕ یان شێوەی پۆڕە}، واتە: پۆڕەکان بە دوای یەك دا هاتن کاتێك بە دوای یەك دەکەون.

(عَصْفًا): (العَصْفُ وَالعَصِيْفَةُ: الَّذِي يُعْصَفُ مِنَ الزَّرْعِ، وُيُقَالُ الحُطَامُ: النَّبْتُ المُتَكَسِّرُ)، (عَصْفُ وَعَصِيْفَة): بریتیە لەو ڕووەکەی دەبێتە پووش، پێشی دەگوترێ:

(**حُطَام**) پـووشی تێکشـکێنراو، واتـە: ڕووەکێـك کـە وشـك بـووەو دوایـی تێکشـکاوە، هەڵبەتـە (**عَصْف**)، بـە پـووش و پـەڵاش و بـە (کا)ش دەگوتـرێ، (**رِيْحٌ عَاصِفٌ وَعَاصِفَةٌ مُعْصِفَـة: تَكْسِرُ الـشَّيءَ فَتَجْعَلُـهُ كَعَصْـفٍ، وَعَصَفَـت بِهِـمُ الرِّيْحُ**)، دەگوتـرێ: (**رِيْحٌ عَاصِفٌ وَعَاصِفَـةٌ مُعْصِفَـة**) هـەر سێکیان یـانی: (بـا) یـەك کـە شـت تێـك دەشـکێنێ و، دەیکاتـە پـووش و پـەڵاش، یاخـود دەیکاتـە گیـای تێکشـکاو، دەگوتـرێ: (**عَصَفَـت بِهِـمُ الرِّيْحُ**) بایەکـە تێکیشـکاندن، یاخـود: ڕایماڵیـن.

(**نَشْرًا**): (**النُّشْرُ: نَـشْرُ الثَّـوْبِ: بَسْـطُهُا، وَالنُّـشْرُ: الرِّيَـاحُ الَّتِـي تَنْـشُرُ السَّـحَابَ**)، دەگوتـرێ: (**نَـشْرُ الثَّـوْبِ:**) بڵاوکردنـەوەی پۆشـاك، پـان ڕاخـرانی، دەگوتـرێ: (**النُّشْرُ: الرِّيَـاحُ الَّتِـي تَنْـشُرُ السَّـحَابَ**)، (**نُـشْرُ**) بایـەکان کـە هـەورەکان بڵاودەکەنـەوەو پـرژو بڵاویـان دەکـەن.

(**فَرْقًا**): (**الفَـرْقُ: يُقَـارِب الفَلْـقَ**) وشـەی (**فَـرْق**) مانایەکـەی لـە (**فَلْق**)ەوە نیزیکـە، {بـەڵام (**فَلْـق**) بـۆ شـتێکە لـەت ببـێ و دەنگێـکی لێبـێ و، (**فَـرْق**) مـەرج نیـە دەنگـی لێبـێ}، (**فَرَقْـتُ بَـيْنَ الشَّـيْئَيِن: فَصَلْـتُ بَيْنَهُـمَا**)، دوو شـت کـە لێـك جیـا دەکرێنـەوە دەگونجـێ بڵێـی: (**فَرَقْـتُ بَـيْنَ الشَّـيْئَين**)، دەشـگونجێ بڵێـی: (**فَصَلْـتُ بَـيْنَ الشَّـيْئَيْنِ**).

(**عُذْرًا** ): (**العُـذْرُ: تَحَـرِّي الإنْسَـان مَـا يَمْحُـو بِـهِ ذَنْبَـهُ**)، (**عُـذْر**): بـە کوردیـی دەڵێیـن: پـۆزش، یـان داوای لێبـوردن کـردن، بریتیـە لـە خەفتـانی مـرۆڤ لـە شـتێك کـە گوناهەکـەی خـۆی پـێ پاسـاو بداتـەوەو بسـڕێتەوە، دەگوتـرێ: (**أَعْـذَرَ مَـنْ أَنْـذَرَ: أَتَى بِمَـا صَـارَ بـِهِ مَعْـذُوراً**)، (**أَعْـذَرَ مَـنْ أَنْـذَرَ**) هـەر کەسـێك بەرانبەرەکـەی بترسـێنێ و وریـای بکاتـەوە، پـۆزشی هێناوەتـەوە، (**أَتَى بِمَـا صَـارَ بـِهِ مَعْـذُوراً**) واتـە: شـتێکی کـردوە دوایـی پـۆزشی هەبـێ و بڵـێ: تـۆم سـزادا بـەڵام پێشـتر ئـاگادارم کـردی، یاخـود (**أَعْـذَرَ**) بـە مانـای پـۆزشی بـە بەرانبەرەکـەی نەهێشـتوە، (**أَذْهَـبَ بِعُـذْرِهِ**) هـەردوو واتایەکـەی هـەن: (**أَتَى بِالْعُـذْرِ**) و (**أَذْهَـبَ عُـذْرَ مُقَابِلـه**)، (**أَعْـذَرَ**) واتـە: پـۆزشی هێناوەتـەوە، (**مَـنْ أَنْـذَر**) کەسـێك بەرانبەرەکـەی ترسـاندوەو وریـای کردۆتـەوە، وەك بگوتـرێ: وانەکـەی

ئەگەرنا تووشی سزا دەبێ! یاخود: (أَعْـذَر) یانی: پۆزش و بیانووی بە دەست بەرامبەرەکەیەوە نەهێشتوە (أَذْهَبَ بِعُـذْرِهِ).

(أَوْ نُذْرًا): (أي: إِنْـذَارًا، الإِنْـذَارُ: إِخْبَارٌ مَـعَ تَخْوِيـفٍ)، (إِنْـذَار): بریتیە لە هەواڵ پێدان لەگەڵ ترساندندا.

(طُمِسَتْ): (الطَّمْسُ: إِزَالَةُ الأَثَرِ بالمحْوِ)، (طَمْس): بریتیە لە لابردنی شوێنەوار بە سڕینەوە، (طُمِسَـت: أُزِيلَـت صُورَتُها وَضَوءُهَا)، وێنەکەیان و تیشکەکەیان نەهێڵراوە، کە مەبەست پێی ئەستێرەکانە.

(فُرِجَتْ): (الفَـرْجُ وَالفُرْجَـةُ: الشَّـقُّ بَـيْنَ الشَّـيْئَيْنِ كَفُرْجَـةِ الحَائِـطِ)، وشەی (فَـرْجْ وَفُرْجَـة) هەردووکیان بە کەلێن و درزی نێوان دوو شتان دەگوترێ، وەك درزو تیکی دیوار، دەگوترێ: (فُرِجَـت أي: انْشَـقَّت)، شەق بوو، لەت بوو.

(نُسِفَتْ): (نَسَـفَتِ الرِّيْحُ الشَّيءَ: اقْتَلَعْتـه وَأَزَالَتْـهُ)، بایەکە شتەکەی نەسف کرد، واتە: هەڵیقەندو، لایبرد، (النِّسْـفَةُ: حِجَـارَةٌ يُنْسَـفُ بِهَـا الوَسْـخُ عَـنِ القَـدَم)، (نِسْفَة): بەردێکە چڵکی پێیانی پێ دەکرێنرێ، (نَسْـف): وێڕای ئەوە، بە مانای وردو خاشکردن و هاڕینیش دێ.

(أُقِّتَتْ): (وَقَّتُّ وَقَّتُّ كَـذَا: جَعَلْـتُ لَـهُ وَقْتًـا)، دەگوترێ: (وَقَّـتُّ كَـذَا) کاتم دیارییکرد بۆ فلان شتە، (المِيْقَـاتُ: الوَقْـتُ المَـضْرُوب لِلـشَّيءِ)، (مَيْقَـات) بریتیە لە کاتێکی دانراو بۆ شتێك بە کوردیی دەگوترێ: ژوانگە.

(أُجِّلَتْ): (أَجَّلْتُـهُ: جَعَلْـتُ لَـهُ أَجَـلًا)، کاتم بۆ دانا، (الأَجَـلُ: المُـدَّةُ المَضْرُوبَـةُ لِلـشَّيء) (أجل)ماوەیەکی دانراوە بۆ شتێك، پێی دەگوترێ: (أَجَـل)، هەروەها (أَجَّلْتُـهُ) بە مانای (أَخَّرْتُـهُ)ش دێ واتە: کاتەکەیم دواخست، (وَاسْـتِيْفَاءُ الأَجَـلِ: مُـدَّةُ الحَيَـاة)، (إِسْـتِيْفَاءُ الأَجَـل) تەواوبوونی ماوەی ژیانەکەی یانی: ئەو کاتە هاتوە کە دەبێ کۆتایی بە ژیانی بێ.

(ٱلْفَصْلِ): (إِبَانَـةُ أَحَـدِ الشَّـيْئَيْنِ مِـنَ الأَخَـرِ، حَتَّـى يَكُـوْنَ بَيْنَهُـمَا فُرْجَـة)، (فَصْـل): بریتیە لـە لێـك جیاکردنـەوەی دوو شـتان بـە جۆرێـك نێوانێکیـان هەبـێ، (يَـوْمُ الفَصْـل) ڕۆژی لێـك جیاکردنـەوەو لێکهـەڵاواردن، {لێـك هـەڵاواردنی بـڕوادارو بێبڕوایـان، چاکـەکارو خراپەکاران}.

(مَّهِينٍ): (مَهُـنَ: ضَعُـفَ، وَأَمْهَنَـهُ: أَضْعَفَـهُ وَاسْـتَخْدَمَهُ، وَامْتَهَـنَ: اتَّخَـذَ مِهْنَـةً، وَامْتَهَـنَ الـشَّيءَ: ابْتَذَلَـه)، (مَهُـنَ) بـە مانـای (ضَعُـفَ) بـێ هێـز بـوو، (وَأَمْهَنَـهُ: أَضْعَفَـهُ) بـێ هێـزی کـرد، هەروەهـا بـە مانـای (اسْـتَخْدَمَهُ) بەکاریهێنـا، (وَامْتَهَـنَ: اتَّخَـذَ مِهْنَـةً)، پیشـەو کارو کەسـبێکی ڕەچـاو کـرد، هەروەهـا (وَامْتَهَـنَ الـشَّيءَ: ابْتَذَلَـه) واتـە: شـتەکەی بـێ نمـوود کـردو، سـووکی کـرد، لێـرەدا (مَهِـيْن) لـە (مَهُـنَ)ەوە هاتـوە، نـەك لـە (هَـانَ)وە، تاکـو (مَهِـيْن) بـە مانـای سـووکیی و بـێ بایەخیـی و قێزەونیـی بـێ، کـە وەك هەندێـك لـە توێـژەرەوان وایـان لێکداوەتـەوە، ئەوەیـان لـە (هَـانَ)ەوە دێ، (هَـانَ، يَهِـيْن، هَوْنَـاً، فَهُـو مُهـانٌ) واتـە: بـێ ڕێـزە، بـێ بایەخـە، بـەڵام خـوا لێـرەدا وای نەفەرمـووە، دەفەرمـوێ: (مَـاءٍ مَّهِـيْن) ئاوێـکی بـێ هێـز، چونکـە (مَهُـنَ)ە واتـە: (ضَعُـف)، (أَمْهَنـه) واتـە: (أَضْعَفَـه). بێهێـزی کـرد.

(قَرَارٍ مَّكِينٍ): (القَـرَارُ: المَكَانُ المنْخَفِـض يَجْتَمِـعُ فِيْـهِ المَـاءُ)، (قَـرَار): بـە شـوێنێکی نـزم دەگوتـرێ ئـاوی تێـدا کـۆ دەبێتـەوە، واتـە: (يَقِـرُّ فِيْـهِ المَـاءُ)، ئـاو لـە وێـدا دەچەسـپێ، (مَكُـنَ فُـلَانٌ عِنْـدَ النَّـاس يَمْكُـنُ مَكَانَـةً أي: عظـم عندهـم ) فڵانکـەس لـە نێـو خەڵـك دا ڕێـزو پێگـەی پەیدابـوو، یانـی: لەلایـان مـەزن بـووە (فَهُـوَ مَكِـيْن) ئـەو خـاوەن پێگەیە(وَالجَمْـعُ مُكَنَـاء) کـۆی (مَكِـيْن) (مُكَنَـاء)ە، هەڵبەتـە لێـرە کـە دەفەرمـوێ: (قَـرَارٍ مَكِـيْن) یـانی: نشـینگەیەکی خـاوەن پێگـە، یاخـود: مەحکـەم و قاییـم، کە مەبەسـت پێی منداڵـدانی دایکـە، (قَـرَارٍ مَكِـيْن) واتـە: نشـینگەیەکی مەحکـەم و چەسـپاو تونـدو تـۆڵ و قاییـم، ك مـرۆڤ ئەگـەر تەماشـای منداڵـدانی ئافـرەت بـکات، ڕێـك لـە نێوەڕاسـتی جەسـتەی دایـەو، لـە سـەروویەوە سـینگ و قەفـەزی سـینگەو لـە پشـتیەوە بڕبڕاگـەی

پشـت و، لـەو لاو لایـەوە ئێسـقانەکانن و، لـە خواریـوە ئێسـقانی حـەوزەو، شـوێنێکی زۆر مەحکـەم و قاییمـە.

(**قَدَرٍ**): (قَـدَرَ يَقْـدِرُ قَـدَارَةً: تَمَكَّـنَ مِنْـهُ، وَقَـدَرَ الـشَّيء قَـدَراً: بَـيَّنَ مِقْـدَارَهُ، وَقَـدَرَ فُلَانَـاً: عَظَّمَـهُ)، (**قَدَرَ يَقْـدِرُ قَـدَارَةً: تَمَكَّـنَ مِنْـهُ**)، واتـە: لەوێـدا دەسترۆیشـتوو و، بـاڵا دەسـت بـوو، (**وَقَـدَرَ الـشَّيء قَـدَراً: بَـيَّنَ مِقْـدَارَهُ**) ئەندازەکـەی دیارییکـرد، (**وَقَدَر فُلَانَـاً**)، هەروەهـا بـە (**قَـدَّر**)ش هـەر هاتـوە، واتـە: (**عَظَّمَـهُ**) بـە مـەزن و گـەورەی گـرت.

(**كِفَاتًا**): (كَفَـتَ الـشَّيءَ يَكْفِـتُ كَفْتَـاً: تَقَلَّـب ظَهْـراً لبَطـنٍ وَبَطناً لِظَهـرٍ)، (**كَفَـتَ الـشَّيءَ يَكْفِـتُ كَفْتَـاً**) ئەوەیـە لای پشـتی بێتـە لای سـکی و لای سـکی بێتـە لای پشـتی، واتـە: هەڵگێـڕو وەرگێـڕ بکـرێ، سـەرو بـن بکـرێ و هەڵگێڕدرێتـەوە، (**وَكَفَـتَ إِلَيْـهِ الـشَّيءَ: ضَمَّـهُ إِلى نَفْسِـه**) واتـە: بـە خۆیـەوە چەسـپاندو بـە خۆیـەوە نووسـاند، (**وَكَفَـتَ المَتَـاعَ: جَمَعَـهُ وَضَـمَّ بَعْضَـهُ إِلى بَعْـضٍ**) کـەل و پەلەکـەی کۆکـردەوەو، هەندێـکی خسـتەوە سـەر هەندێـکی، (**الكِفَـاتُ: جَامِعَـة للأحْيَـاء وَالأَمْـوَات، مَوْضِـعُ كِفَـاتٍ: يُضَـمُّ فِيْـهِ الـشَّيء وَيُجْمَـعُ**)، (**كِفَـات**) کۆکـەرەوە، یـان بـە خـۆوە چەسـپێنەر بۆ زینـدووان و بۆ مـردووان، (**مَوْضِـع كِفَـاتٍ**)، شـوێنی کۆکرانـەوەو خرانـەوە سـەریەك.

(**رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ**): (**رَوَاسِي**) کـۆی (**رَاسِيَ**)ە، (**رَسَى الـشَّيءُ: ثَبَـتَ، وَالـرَّاسِي جَمْعُـهُ رَوَاسِي**)، (**رَاسِي**) چەسـپاو، (**رَوَاسِي**) کۆیەکەیـەتی، چەسـپاوەکان، هەڵبەتـە (**رَوَاسِي**) واتـە: (**جِبَـالاً رَوَاسِي**) چیایـە چەسـپاوەکان، واتـە: (**رَوَاسِي**) سـیفەتی وەسـفکراوێکی قرتێنـدراوە، (**شَـامِخَات**) واتـە: (**عَالِيَـات، مُرْتَفِعَـات**)، بـەرزو بڵنـدەکان، (**شَمَخَ: ارْتَفَـع: شَـوَامِخ وَشُـمَّخ**)، (**شَـامِخَات**) کـۆی (**شَـامِخَة**)یە، (**شَـمَخَ**)ە واتـە: (**ارْتَفَـع**)ە: بـەرز بـۆوە، ئنجـا وەك چـۆن چیایـەکان بـە (**شَـامِخَات**) کـۆ دەکرێنـەوە، بـە (**شَـوامِخ**)یش کۆدەکرێنـەوەو، بـە (**شُـمَّخ**)یش کـۆ دەکرێنـەوە.

(**فُرَاتًا**): (فَـرُتَ المَـاءُ: اشْـتَدَّت عُذُوبَتُـهُ فَهُـوَ فُـرَاتٌ)، (**فُـرَات**) دەگوتـرێ: (**فَـرُتَ المَـاءُ**) ئاوەکـە زۆر شـیرین و زوڵاڵ و خۆشـە، (**فُـرَات**) بـە ئاوێـك دەگوتـرێ هێنـدە شـیرین

و زوڵاڵ بێ، بە ئاسانیی لە قوڕگ و گەروو بچێتە خوار، بە پێچەوانەی ئاوێکەوە گرفتی هەبێ، تفت بێ و لە قوڕگ بگیرێ وو بە ئاسانیی لە قوڕگ نەچێتە خوار.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەویش مەبەستی ئەوەیە:

**١** - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

**٢** – ئەم کارە بە پێی شەرعی خوای زانا دەکەم.

**٣** – ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای باڵادەست دەکەم.

**٤** – ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ی میهرەبان ئەنجام دەدەم. خوا ﷻ لێرەدا پێنج سوێندان دەخوات، کە دوایی دێینە سەر نێوەڕۆکی سوێند پێخوراوەکان، سەرەتا دەفەرموێ: ﴿وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا﴾، (**مُرْسَلات**) بە مانای نێردراوەکانە، سوێند بە نێردراوەکان بە دوای یەکدا (**عُرْفاً**) واتە: ئەوانەی بە دوای یەك دەکەون (**عرف**) هەم پۆپڕەی کەڵەشێر، کەڵەبابە، پۆپڕەکەی چەند قیتکەو بەرزاییەکی هەن، بە دوای یەك دا دێن، بە زنجیرە، هەروەها (**عرف**) بەو مووانەی سەر گێزەکەی[1] وڵاخە بەرزە دەگوترێ، کە (بژ) و (یاڵ)یشی پێ دەڵێن، ئەو مووانەی دەکەونە سەر پشتی مل و گێزەکەی وڵاخە بەرزە، ئەسپە، ماینە، ئێسترە، یانی: سوێند بە نێردراوەکان بە دوای یەکدا.

﴿فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا﴾، سوێند بە هەڵکردووەکان، بە هەڵکردنێکی بەهێز.

---

(١) گێزەکە: پشتی مل، پشتە مل.

﴿ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴾، سوێند بە بڵاوکەرەوەکان، بە بڵاوکردنەوەیەکی سەرسوڕهێنەر.

﴿ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴾، سوێند بە جیاکەرەوەکان، بە جیاکردنەوەیەکی نایاب، یان بە جیاکردنەوەیەك کە پێناسەی جیاکردنەوەی بە تەواویی بەسەردا دەچەسپێ.

﴿ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴾، سوێند بە فڕێدەرەکانی، یان هاویشتەرەکانی بیرخەرەوە.

﴿ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴾، بۆ ئەوەی خەڵك بیانووی نەمێنێ و، بۆ ئەوە هۆشیار بکرێنەوەو بترسێنرێن، یاخود بۆ نەهێشتنی بیانوو و پاساو، لەلایەن مرۆڤەکانەوەو، بۆ ترساندن و وریاکردنەوەیان.

هەڵبەتە دوایی لە کاتی خستنەڕووی مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر دەچینە نێو وردەکاریی ئەو پێنج شتەوە، کە خوا ﷻ لێرەدا سوێندی پێ خواردوون و بریتین لە: ﴿ وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ﴾، بەڵام وەك شتێكی سەرەتایی و بناغەیی دەڵێین: زانایان سێ ڕایان هەن لە بارەی ئەو پێنج شتانەوە بە گشتیی و، زۆریان قسە لەسەر کردوون، بەڵام قسەکانیان هەموویان دەبنەوە بە سێ ڕا:

### ڕای یەکەم: ئەمانیش دوو بۆچوونن:

أ- دەڵێن: ئەو پێنج شتانە هەر پێنجیان یەك شتن، بەڵام سیفەتەکانیان جیان، ئنجا هەندێکیان دەڵێن:

١- لێرەدا (**المرسلات**) مەبەست پێی: بایەکانە، ئەو بایانەی دەنێردرێن بە دوای یەکدا.

٢- ﴿ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴾، ئەو بایانەی بە توندیی هەڵدەکەن بە هەڵکردن.

٣- ﴿ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴾، ئەو بایانەی بڵاو دەکەنەوە، بە بڵاوکردنەوە، واتە: هەورەکان بڵاو دەکەنەوە، گڵ و خۆڵ بڵاو دەکەنەوە، تۆوی گیاو گوڵەکان بڵاو دەکەنەوە.

٤- ﴿ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴾، ئەو بایانەی لێك جیادەكەنەوە بە لێك جیاكردنەوە، هەورەكان دابەش دەكەن، یاخود تۆوەكان دابەش دەكەن، یان تۆزو خۆڵەكان دابەش دەكەن.

٥- ﴿ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴾، ئەوانەی بیرخەرەوە دەهاوێن، واتە: ئەو بایانە كاتێك ئەو كارانە ئەنجام دەدەن، ئەوە وەك فڕێدانی بیرخستنەوەو پەندو ئامۆژگارییە بۆ خەڵك.

ب- دەڵێن: ئەوانە هەموویان مەبەست پێیان فریشتەكانن، واتە: ١- (**والمرسلات**) سوێند بەو فریشتانەی دەنێردرێن بە دوای یەكدا.

٢- ﴿ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴾، بە خێرایی دەڕۆن وەك بایەكی بەهێز.

٣- ﴿ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴾، ئەو فریشتانەی بڵاو دەكەنەوە، بە بڵاوكردنەوە، چی بڵاو دەكەنەوە؟ باڵەكانیان بڵاودەكەنەوە، یاخود هەورەكان بڵاودەكەنەوە، یان بژیوەكان بڵاودەكەنەوە.

٤- ﴿ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴾، جیاكەرەوەكان بە لێكجیاكردنەوە، هەورەكان لێك جیادەكەنەوە، بژیوەكان لێك جیادەكەنەوە، یاخود بڕواداران و بێبڕوایان لێكجیادەكەنەوە، هەر كامێكیان ڕووحەكانیان دەكێشن و بۆ شوێنی خۆیانیان بە ڕێ دەكەن.

٥- ﴿ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴾، ئەو فریشتانەی بیرخەرەوە دەهاوێن، بیرخەرەوە دەنێرن بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمَ**)، كە مەبەست پێی وەحیی خوای پەروەردگارو بەرنامەكانی خوایە.

### ڕای دووەم:

ئەوەیە كە دووانی یەكەمیان: ﴿ وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴾، یەك شتن، كە بایەكانن، بە بەڵگەی ئەوی (و) بۆ سوێند خواردن (**واو القسم**)ە واتە: سوێند بە نێردراوەكان بە دوای یەكدا، ﴿ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴾، ئەم (**ف**)یە هی بە دوای یەكدا هاتن (**فاء التعقيب**)ە، دوای ئەوەی دەنێردرێن، زۆر بە خێرایی دەڕۆن.

هەروەها سییەکەی دیکەش مەبەست پێیان یەک شتە، چونکە هەر یەکەمیان بە (و)ی سوێند دەست پێدەکات: ﴿ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴾، سوێند بە بڵاوکەرەوەکان بە بڵاوکردنەوە، ﴿ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴾، ئەویش دیسان بە (ف) بە دوای دادێ، کە لە ئەنجامی بڵاوکردنەوەدا، ئەمجارە جیادەکەنەوە بە جیاکردنەوە، ﴿ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴾، ئنجا ئەوانەی بیرخەرەوە دەهاوێن و فڕێدەدەن و دەهێنن بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، دەڵێن: ئەو سێیەش مەبەست پێیان: فریشتەکانن، ئەوەش ڕای دووەم کە پێنج شتەکە دابەش دەبن بۆ دوو بە سێ: أ- دووەکان مەبەست پێیان بایەکانەو، ب-سێیەکان مەبەست پێیان فریشتەکانە.

**ڕای سێیەم:**

دەڵێ: ئەوانە هەموویان دابەش دەبن، نەك تەنیا بۆ دوو جۆر، بەڵکو بۆ سێ جۆر:

١- ﴿ وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا ﴾، مەبەست پێی بایەکانە، ﴿ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴾، ئەویش بە هەمان شێوە.

٢- بەڵام: ﴿ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴾، ئەو فریشتانەی بڵاو دەکەنەوە، ﴿ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴾، کە جیادەکەنەوە بە جیاکردنەوە.

٣- ئنجا: ﴿ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴾، مەبەست پێی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بە هەر حاڵ ئەو ڕایانە هەن و، دواتریش زیاتر تیشکیان دەخەینە سەر.

﴿ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴾، واتە: (للإِعْـذَار وَالإِنْـذَار)، (إِعْـذَار): بریتییە لە نەهێشتنی بیانوو بە دەست لایەنی بەرانبەرەوە، (أَعْـذَر: قَـدْ أَعْـذَرَ مَـنْ أَنْـذَر)، واتە: کەسێك خەڵکی ترساندوە، بیانوو بڕی کردوون، بیانوویان نەماوە، چونکە پێشتر هۆشداریی پێداون، (إِعْذَار) واتە: (إِعْـدَام العُـذْر) نەهێشتنی پاساو بە دەست لایەنی بەرانبەرەوە، (إِنْذَار)یش، (إِنْـذَار: إِخْبَـارٌ مَـعَ التَّخْوِيْـف)، هەواڵ پێدانە لەگەڵ

ترساندندا، کە بە دڵنیایی ئەمەیان زیاتر وا پێدەچێ بگەڕێتەوە بۆ: ﴿ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴾، فریشتەکان کە ئەو بیرخەرەوەیە، داوێن، هەڵیدەدەن، دەیهێنن بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە مەبەستی ئەوەی خەڵك بیانووی نەمێنێ و، وریا بکرێتەوەو بترسێنرێ و هۆشیار ببێتەوە.

ڕای خۆم وایە - وەك دواییش باسی دەکەم - کە یەکەم و دووەم مەبەست پێیان بایەکانن و، سێیەم و چوارەم و پێنجەم مەبەست پێیان فریشتەکانن، ئنجا سوێند بەو پێنجانە.

﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، داکەوتوە، هاتوە، (إنَّمَا) لێرەدا (أَدَاة الحَصرِ وَالإِثْبَات) نیە، هەرچەندە لە ڕێنووسی قورئان (مصحف)دا پێکەوە لکاوە، بەڵام لە ئەسڵدا دوو وشەن: (إنَّ) و (مَا)، (إنَّ) ئامرازی جەختکردنەوە (تأكيد)یەو (مَا)ش (مَا المَوْصُولة)یە، یانی: بێگومان ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، داکەوتوەو هاتوە.

﴿ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ ﴾، ئنجا هەر کات ئەستێرەکان کوژانەوە، شۆقیان نەما، تاریك داهاتن و سڕانەوە.

﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتْ ﴾، هەروەها هەر کات ئاسمان شەق بوو، لەت بوو، کرایەوە.

﴿ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴾، هەروەها هەر کات چیایەکان هەڵکەندران، هاڕدران، کرانە تۆزو خۆڵ.

﴿ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴾، هەروەها هەر کات پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کاتیان بۆ دیاریکرا، ژوانگەیان بۆ دانرا، (أُقِّتَتْ) خوێندراویشەتەوە: (وُقِّتَت)، (تَوْقِيت) دانانی کات و ژوانگەیە بۆ شتێك.

﴿ لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴾، ئەو ڕووداوە بۆ چ کاتێك دواخراوە؟

﴿ لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ ﴾، بۆ ڕۆژی لێك جیاکردنەوە.

ئنجا ئایا ئەوەی دواخراوە چییە؟!

**١-** دەگونجێ مەبەست پێی هێنرانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) شایەدییدانیان بێ، واتە: شایەدییدانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دواخراوە، بۆ چ ڕۆژێك؟ ﴿لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ﴾، بۆ ڕۆژی لێك جیاكردنەوە.

**٢-** یاخود: ﴿لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ﴾، (ت)ەیەكە ڕاناوەكەی بۆ مێینەیەک دەچێتەوە كە شتێك لە سیاقەكە دەفامرێتەوەو، مەرج نیە یەكسەر بگەڕێتەوە بۆ نیزیكترین باسكراو، كە دانانی ژوانگەیە بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەرچەندە ئەو ڕایە بەهێزترە، بەڵام دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ كۆی ئەوەی لەو ئایەتانە دەفامرێتەوە، كە بریتیە لە: چەسپێنرانی سزا بەسەر بێبڕوایان و بە درۆدانەرانی پەیامەكانی خوادا، ئا ئەوە بۆ ڕۆژی لێكجیاكردنەوە، دواخراوە، ئەو تەسفیەی حیساب و لێك جیاكردنەوەیە.

﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ﴾، چـی بـە تـۆی زانانـدوە، چـی وایكـردوە تـۆ بـزانی، ڕۆژی لێـك جیاكردنـەوە چییـە؟! (**وَمَا أعلمـك مَـا يَـوم الفَصـل**) چ شـتێك وایكـردوە تـۆ بـزانی ڕۆژی لێـك جیاكردنـەوە چییـە!

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەرانە.

﴿أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ﴾، ئایـا پێشـووەكانمان نەفەوتانـدوون! یـانی: ئایـا دوای ئـەوەی لادان و تاوانیـان كـرد، كۆمەڵـگا پێشـووە سـەرپێچییكارەكانمان نەفەوتانـدوون؟

﴿ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلْءَاخِرِينَ﴾، ئنجـا ئەوانـەی دیكەشـمان وەدواخسـتوون، بـە دوای وانـدا ئەوانیشـمان فەوتانـدوون، (**أَوَّلِيْن**) كۆمەڵـگا پێشـووەكان وەك كۆمەڵـگای نـووح و، كۆمەڵـگای هـوود، كـە گـەلی عـاد بـوون و، كۆمەڵـگای صاڵـح كـە گـەلی سـەموود بـوون و، كۆمەڵـگای مەدیـەن، كـە گـەلی شـوعەیب بـوون، هەروەهـا كۆمەڵـگای لـووط، ﴿ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلْءَاخِرِينَ﴾، دوایــی ئەوانــەی دیكەشــمان بــە دوای وانــدا فەوتانــدن، ئەوانـەی بـە دوایـان دا هاتـن، وەك گـەلی فیرعـەون و گەلـەكانی دیكـە.

﴿ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، هەر بەو شێوەیە بە تاوانباران دەكەین، ئاوا سزایان دەدەین، واتە: ئێوەش ئەی تاوانبارو لادەرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم و، دوای ئەویش، بزانن كە ئەمە یاساو سیستمێكی گشتیی خوایە: هەموو ئەوانەی پیشەیان بە درۆ دانان و لادان و تاوان بووە، سزاو جەزرەبەی خوا بۆیان لە بۆسەدایە، ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و هاوار بۆ بەدرۆدانەرانە.

ئنجا دوای سەرنجڕاكێشانیان بۆ مێژوو، سەرنجیان ڕادەكێشێ بۆ خودی خۆیان و دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ﴾، هەرچەندە نووسراوە: ﴿ أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم ﴾، بەڵام دەخوێندرێتەوە: (**أَلَمْ نَخْلُكُّم**)، (ق) لە (ك)دا دەغم دەكرێ، یانی: ئایا لە ئاوێكی بێهێز ئێوەمان نەهێناوەتە دی؟ (**مَهِيْن**) واتە: بێهێز (**ضَعِيْف**)، (**مَهُنَ**) واتە: (**ضَعُفَ**)، (**أمْهَنَهُ: أَضْعَفَه**) ئەمە لە (**هَان يَهُون**)ەوە نەهاتوە، بەڵكو لە (**مَهُنَ**)ەوە هاتوە، واتە: بێهێزبوو، ئایا لە ئاوێكی بێهێزی كەم، ئێوەمان نەهێناوەتە دی؟

﴿ فَجَعَلۡنَٰهُ فِي قَرَارٖ مَّكِينٍ ﴾، ئنجا لە نشینگەیەكی قاییم و مەحكەمدا داماننا، واتە: ئەو تۆویلكە و، نوتفەیەی لە ئەنجامی پێكگەیشتنی زیندەوەری تۆویی (**الحيوان المنوي**) كە لە نێو ئاوی پیاودایە، لەگەڵ هێلكۆڵە (**بويضة**) كە لە نێو ئاوی ئافرەت دایە، لە ئەنجامی پێكگەیشتنی ئەو دوو زیندەوەرە بچووكەدا، زیندەوەرێكی دیكە پێكدێ پێی دەگوترێ: نوتفەو، دەچێتە نێو منداڵدانی ئافرەتەوە، خواش ناوی لە منداڵدانی ئافرەت ناوەو وەسفی كردوە بە: (**قَرَار مكين**)، واتە: نشینگەی قایم، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونی قایم و مەحكەم، (**مَكِيْن**) لە بنچینەدا بە مانای خاوەن پێگەو هێزو دەسترۆیشتوویە، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر شوێنێكی پتەوو مەحكەم، ﴿ إِلَىٰ قَدَرٖ مَّعۡلُومٖ ﴾، هەتا ئەندازەیەكی زاندراو، ﴿ فَقَدَرۡنَا فَنِعۡمَ ٱلۡقَٰدِرُونَ ﴾، ئێمە توانامان بەسەر ئەوەدا شكاو باشترین تواناداریش بووین، یاخود (**قَدَرْنَا**) وەك چۆن بە مانای: (توانیمان) دێ، بە مانای: (ئەندازەگیرییمان كرد)یش دێ، كە خوێندراویشەتەوە: (**فَقَدَّرْنَا**)

واتـە: ئەندازەگیرییـمان کـرد، یاخـود تواناماـن بەسـەردا شـکا، ئـەو نوتفەیـە، بـەو قۆناغانـەدا تێپەڕێنیـن لـە نێـو ئـەو نشـینگە مەحکەمـەدا، کـە منداڵـدانی ئافرەتـە، ﴿ فَنِعۡمَ ٱلۡقَٰدِرُونَ ﴾، باشـترین ئەندازەگیرییـکار، یـان باشـترین توانـادار، ئێمـە بوویـن، ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لـەو ڕۆژەدا سـزای سـەخت بـۆ بەدرۆدانـەران، کـە بـەو جـۆرە دروسـت بـوون، کەچـی بڕواشـیان بـە دیـداری خـوا نیـەو، بـە سـزاو پاداشـت و زیندووکرانـەوەو لێپرسرانـەوە نیـە!!.

ئنجـا خـوا سـەرنجیان ڕادەکێشـێ بـۆ زەوی: ﴿ أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا ﴾، ئایـا زەویـمان نەکـردوە بـە بەخـۆوە نووسـێنەر، (**كَفَـتَ، يَكْفُـتُ: ضَـمَّ، يَضُـمُّ**)، ئایا زەویـمان نەکـردوە بـە بـە خـۆوە گوشـەر، ﴿ أَحۡيَآءٗ وَأَمۡوَٰتٗا ﴾، زینـدووان و مردووان، واتـە: زەوی زینـدووان و مـردووان بەخۆیـەوە دەنووسـێنێ، ئەمـەش ئاماژەیـە بـە هێـزی ڕاکێشـان (**جاذبیـة**)ی زەوی، ﴿ وَجَعَلۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ شَٰمِخَٰتٖ ﴾، هەروەهـا لـە نێـو ئـەو زەوییـەدا، شـاخە بـەرزو سەرکەشـەکانمان دانـاون، وشـەی (**رَوَاسي**) کـۆی (**رَاسِي**)ە، بـە مانـای چەسـپاو، (**رَوَاسي**)یـش سـیفەتی وەسـفکراوێکی قرتێـنراوە، واتـە: (**جِبَـالًا رَوَاسي**) چیایـە چەسـپاوەکان، یـانی: چیایـە چەسـپاوەکانمان لـە زەویـدا دانـان، ﴿ شَٰمِخَٰتٖ ﴾، واتـە: (**مُرْتَفِعَـات أو عَالِيَـات**) بـەرزو هەڵچـووەکان، لـە زمـانی عەرەبییـدا دەگوتـرێ: (**فُـلَانٌ شَـمَخَ بِأَنْفِـه**) فڵانکـەس لـووتی بـەرز کـرد، یاخـود: سـەری بەرزکـردەوە، ﴿ وَأَسۡقَيۡنَٰكُم مَّآءٗ فُرَاتٗا ﴾، هەروەهـا ئاوێـکی شـیرین و زوڵاڵـمان بـە ئێـوە نۆشـاندوە، بـاسی ئاوێـکی شـیرین و زەڵاڵ دەکات لەگـەڵ بـاسی چیایەکانـداو، لـە زۆر شـوێنی قوڕئانـدا، ئـەو دووە پێکـەوە هاتـوون، لەبـەر ئـەوەی سـەرچاوەی هـەرە گرنـگ و سـەرەکیی ئـاوی شـیرین چیایەکانـن، چونکـە زۆرتریـن ڕێـژەی بەفـرو تـەرزەو بـاران لـە چیایـەکان دەبـارێ و، لەوێـدا کـۆ دەکرێتـەوەو عەمبـار دەکـرێ، دوایـی بەشـێوەی کانیـی و سـەرچاوە دێتـەدەرو، دەبێتـە جۆگەلـەو دوایـی جۆگەلـەکان، ڕووبـار پێـك دێنـن و ئـاوی شـیرین پێـك دێ، هەمـوو ئـەو ڕووبارانـەی لـە دنیـادا هـەن، سـەرچاوەکانیان دەگەڕێنـەوە بـۆ چیایـەکان، ڕووبـاری ئەمازۆنـە، نیلـە، دیجلەیـە، فوڕاتـە، سـەیحوونە،

جەیحوونە..، هەمـوو ئـەو ڕووبـارە گەورانـە، ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لـەو ڕۆژەدا سـزای سـەخت بـۆ بەدرۆدانـەران، واتـە: خوایـەك كـە ئـەو هەمـوو نیعمەتانـەی بـۆ ڕەخسـاندوون، كەچـی ئـەوان دیـداری ئـەو خوایـە بـە درۆ دادەنێـن، یاخـود: پێغەمبـەری ئـەو خوایـە بـە درۆ دادەنێـن، یاخـود: بـە پەیامـی خـوای پـەروەردگار بێبـڕوا دەبـن و بـە درۆی دادەنێـن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوا بە بایە بە دوای یەکدا نێردراوەکان، وەك بژو یاڵی وڵاخە بەرزە، کە بە توندیی هەڵدەکەن، هەروەها بە فریشتە باڵ بڵاوکەرەوەکان، کە هەق و ناهەق لە یەك هەڵداوێرن، ئنجا بیرخەرەوە بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەهاوێن، بۆ بیانوو بڕکردن و ترساندنی خەڵك، کە ئەوەی خوا بەڵێنی پێداون - لە هاتنی ڕۆژی دوایی - ڕاستەو دێتە دی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ ﴾.

بەر لەوەی بچینە سەر شیکردنەوەی بڕگەکانی ئەم حەوت ئایەتە موبارەکە، چاوێکی گشتییان پێدا دەگێڕین، هەرچەندە لە مانای گشتییەکەش دا ئەوەی پێویست بوو، بە کورتیی و پوختیی گوتمان، زانایان دەڵێن: ئەو پێنج شتە سوێند پێ خوراوانە: ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ﴾، سێ ئەگەریان هەن:

ئەگەری یەکەم: ئەوەیە کە هەر پێنجیان یەك شت بن، ئەویش دەبێتەوە بە دوو لق:

لقی یەکەم: مەبەست بەو پێنج شتە بایەکانن، ئەو کاتەش مانایەکەیان ئاوای لێ دێتەوە: سوێند بە بایە نێردراوەکان بە دوای یەکدا، کە بە توندیی هەڵدەکەن و، سوێند بە بڵاوکەرەوەکان، کە بڵاودەکەنەوە، (بایەکان هەورەکان بڵاودەکەنەوەو، تۆوەکان بڵاودەکەنەوەو، گڵ و خۆڵ بڵاودەکەنەوە)، و سوێند بە جیاکەرەوەکان، کە جیادەکەنەوە، (بایەکان هەورەکان لێك جیا دەکەنەوە، هەریەکەیان بۆ لایەك دەبەن و، تۆوی گوڵ و گیایەکان جیادەکەنەوەو، تۆزو

خـۆڵ و ئـەو شـتانەی هەڵیاندەگـرن، جیایـان دەکەنـەوە)، ﴿ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴾، فرێـدەرانی بیرخـەرەوە (ئـەو بایانـە لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە خـوا ئـەو هەمـوو کارانەیـان پێـدەکات، بیرخـەرەوەو پەنـدو ئامۆژگاریـی بـۆ خەڵـك فرێـدەدەن).

لقـی دووەم: ئەوەیـە کـە مەبەسـت پێیـان فریشـتەکانن، ئـەو کاتـەش ئـاوا مانایـان لێکدەدرێتـەوە: سـوێند بـە فریشـتە بـە دوای یەکـدا نێـردراوەکان و، سـوێند بـە فریشـتەکان کـە بـە خێرایـی دەڕۆن، وەك بـای تونـدو، سـوێند بـە فریشـتەکان کـە باڵەکانیـان بڵاودەکەنـەوەو، سوێند بـە فریشـتەکان کـە لێـك جیادەکەنـەوە، (خەڵـکی بەهەشـت و دۆزەخ لێـك جیادەکەنـەوە، کاتێـك ڕووحیـان دەکێشـن)و، سـوێند بـە فریشـتەکان کـە بیرخـەرەوە فرێـدەدەن و دەنێـرن بـۆ پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّـلاَم)، ﴿ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴾، بـۆ نەهێشـتنی بیانـوو و بـۆ وریاکردنـەوەو ترسـاندن، ئنجـا وەڵامـی سـوێندەکە: ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوەی بەڵێنتـان پێـدەدرێ، داکەوتوویـە، دێ و ڕوودەدات.

ئەگـەری دووەم: ئەوەیـە کـە ئـەو پێنـج سـوێند پێخـوراوە مەبەسـت پێیـان دوو جـۆرە شـتن:

یەکـەم و دووەم: بایەکانـن، سـێیەم و چـوارەم و پێنجـەم: فریشـتەکانن، بـە بەڵگـەی ئـەوە دوای ئـەوەی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ﴾، یەکسـەر دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴾، سـوێند بـە بایـە نێـردراوەکان بـە دوای یەکـدا، ئنجـا: ﴿ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴾، ئـەو بایانـەی بـە توندیـی هەڵدەکـەن، بـە هەڵکـردن، ئنجا مـادام بـە (ف) بادراوەتـەوەو گێڕدراوەتـەوە سـەر ئـەوەی پێشـێ، کەواتـە: ئـەو دووانـە یـەك شـتن.

سـێیەکەی دیکـەش: ﴿ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴾، سـوێند بـە فریشـتەکان کـە بڵاودەکەنەوە، باڵەکانیـان بـڵاو دەکەنەوە، یاخـود هـەورەکان بڵاودەکەنـەوە، ﴿ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ﴾، ئنجا فریشـتە جیاکـەرەوەکان بـە جیاکردنـەوە، هـەورەکان لێـك جیادەکەنـەوە، یاخـود

ڕووحی چاکەکاران و خراپەکاران لێك جیا دەکەنەوەو هەر کامێکیان بۆ شوێنی خۆی بەڕێدەکەن، ﴿ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴾، ئنجا سوێند بە فریشتەکان کە بیرخەرەوە فڕێدەدەن و دەهاوێن، بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، ﴿ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴾، هەم بۆ بیانوو نەهێشتن و، بیانوو بڕاو کردن، هەم بۆ ئاگادارکردن و ترساندن، ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، ڕاستەو دێتە دی.

ئەگەری سێیەم: ئەوەیە کە سوێند پێخوراوەکان سێ شت بن: یەکەم و دووەم: بایەکان بن، سێیەم و چوارەم: فریشتەکان بن، پێنجەمیش: مەبەست پێی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بن.

ئەوەی منیش بەڕاستری دەزانم ئەوەیە:

کە یەکەم و دووەم: مەبەست پێیان بایەکانن، سێیەم و چوارەم و پێنجەمیش: مەبەست پێیان فریشتەکانن، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئانیش ئەو ڕایەیان هەڵبژاردوە، وەك: **(الشيخ حسن محمد مخلوف)** لە کتێبی **(صفوة البيان لمعاني القرآن)**[1]، هەروەها **(إبن عاشور)**یش هەر ئەو ڕایەی هەڵبژاردوەو، بەڵگەشیان بەوە هێناوەتەوە:

کە دووەم بادراوەتەوە سەر یەکەم بە (ف) ی یەکسەر بە دوای یەکداهاتن **(فاء التعقيب)**، هەروەها چوارەم و پێنجەمیش گێڕدراونەوەو بادراونەوە بۆ سەر سێیەم، ئەوانیش هەر بە **(فاء التعقيب)**، بەڵام بێگومان ڕایەکانی دیکەش کەم و زۆر دەگونجێ بەڵگەیان بۆ بهێنرێتەوە.

---

(١) ص ٧٧١.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾، سوێند بە نێرراوە بە دوای یەكدا هاتووەكان، (**مُرْسَلات**) كۆی (**مُرْسَلَة**)یە، واتە: نێردراو، ڕەوانەكراو، (**عُرْف**) واتە: بەڕیز، بە دوای یەكداهاتوو، (**العُرْفُ: أَي الشَّعْرُ الَّذِي عَلَى رَقَبَةِ الْفَرَسِ وَنَصْبُهُ عَلَى الْحَالِ، أَيْ كَالْعُرْفِ فِي تَتَابُعِ البَعْضِ لِبَعْضٍ، أو عُرْفاً مَصْدَرٌ بِمَعْنَى المَفْعُولِ، أَيْ مَعْرُوفٌ «ضِدّ الْمُنْكَرِ»، وَأَنَّ نَصْبَهُ عَلَى الْمَفْعُولِ لِأَجْلِهِ، أَيْ لِأَجْلِ الإِرْشَادِ وَالصَّلَاحِ**)، (**مُرْسَلَات**) واتە: نێردراوەكان، (**عُرْف**)یش بەو مووانە دەگوترێ كە لەسەر گێزەكەی وڵاخە بەرزەن: ئەسپ و مایین و ئێستر، كە پێشیان دەگوترێ: بژ، یاڵ ، ئنجا ئەمە لە ڕووی ڕێزمانییەوە شوێنی لە ئیعراب دا حاڵە واتە: لە حاڵێكدا ئەو نێردراوانە وەك یاڵ و بژی وڵاخە بەرزە، بە دوای یەك دا ڕیز بوون، یاخود: وەك پۆپڕەی كەڵەشێر بە دوای یەك دا ڕیز بوون، ئەو قیتكانەی[1] پۆپڕەی كەڵەشێر پێك دێنن، یاخود (**عُرْفاً**) لێرەدا چاوگە، بەڵام بە مانای بەركار (**مفعول بە**)ەو، جۆرەكەشی بەركاری پێناو (**الْمَفْعُولِ لِأَجْلِهِ**) یە، واتە: ئەو نێردراوانەی بە مەبەستی ڕێنماییكردن و چاككردن دەنێردرێن، ئنجا ئەگەر فریشتەكان بن، ئەوە دیارەو، ئەگەر بایەكانیش بن واتە: بە مەبەستی چاككردن و بۆ چاكەو پەسندیی دەنێردرێن و بەرژەوەندیی خەڵك دابین دەكەن.

لێرەدا (**الشیخ حسن محمد مخلوف**) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە تەفسیرەكەی خۆیدا (**صفوة البیان لمعاني القرآن**) دەڵێ: (**يُقَالُ وَطَارَ القَطَا عُرْفاً عُرْفاً: بَعْضُها خَلْفَ بعضٍ وَالمَعْنَى عَلَى التَشْبِيْه أي: حَالَ كَوْنِهَا فِي تَتَابُعِهَا وَتَلَاحُقِهَا كَعُرْفِ الفَرَسِ وَنَحْوِهَا وَهُوَ مَنْبَتُ الشَّعْرِ مِنَ العُنُقِ**)[2]، واتە: لە عەرەبییدا دەگوترێ: (**قَطَا**) {یان پۆرە یان باڵندەیەكە وەك پۆڕ}، بە دوای یەك دا فڕین، ئەگەر هەندێكیان بە دوای هەندێكیان كەوتن، (قازو مراویی و قەلیش بە دوای یەك دەكەون)،

---

(١) قیتكان: كۆی (قیتكە)یە بەو پارچە گوشتە بە دوای یەكدا ڕیزبووەكانی پۆپڕەی كەڵەشێر، كەڵەباب، دەگوترێ.

(٢) ص ٧٧١.

لێرەدا مەبەست پێی وێچواندنە، واتە: لە حاڵێكدا ئەو نێردراوانە، لە بە دوای یەكدا هاتن و بەیەكەوە پەیوەست بوونیان، وەك یاڵ و بژی ولاخە بەرزەو وێنەی ئەوەن، {یان پۆپڕەی كەڵەشێر}، مەبەست لە (عُرْف)یش ئەو شوێنەیە لە مل كە مووەكانی لێ دەڕوێن، (بە كوردیی دەگوترێ: گێزەكە، یان پشتە مل).

٢)- ﴿ فَٱلْعَـٰصِفَـٰتِ عَصْفًا ﴾، لە حاڵێك دا زۆر بە توندیی هەڵدەكەن، مادام بە پیتی (ف) بادراوەتەوە، سەر (مُرْسَلَاتِ) كەواتە: (عاصفات)یش پەیوەندیی بەوەوە هەیە، یاخود سیفەتی (مُرْسَلَات)ە، ئەو نێردراوانەی بە دوای یەك دا دەنێردرێن ﴿ فَٱلْعَـٰصِفَـٰتِ عَصْفًا ﴾، لە حاڵێكدا بە توندیی هەڵدەكەن، كە بایەكانن، ﴿ فَٱلْعَـٰصِفَـٰتِ عَصْفًا ﴾، (تَفْرِيْعٌ عَلى «المُرْسَلَاتِ» أي: تُرْسَلُ فَتَعْصف)، لق لێكردنەوەیە لە (مرسلات)، یانی: ئەو بایانە دەنێررێن ، ئنجا بە توندیی هەڵدەكەن، (عَصْف) بە مانای: كاو پوش و پەڵاش دێ، ئنجا با كە بە قووەت هەڵبكات، پووش و پەڵاش و كا لەگەڵ خۆی ڕادەدات.

٣)- ﴿ وَٱلنَّـٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴾، سوێند بە بڵاوكەرەوەكان بە بڵاوكردنەوە، بە پێی ئەو ڕایەی ئێمە هەڵمانبژارد، دووەكەی پێشێ بایەكان بوون، سێیەكەی دواییش مەبەست پێیان فریشتەكانن، یانی: هەروەها سوێند بە فریشتەكانی كە بڵاودەكەنەوە، بە بڵاوكردنەوە، چی بڵاو دەكەنەوە؟ (والنَّاشِرَات أَجْنِحَتُهُنَّ نَشْراً)، باڵەكانیان بڵاودەكەنەوە لە كاتی فڕین دا، یاخود ﴿ وَٱلنَّـٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴾، واتە: هەورەكان بڵاودەكەنەوە، یان تۆوەكان بڵاودەكەنەوە هی گیاو گوڵ و ڕووەكەكان، یان تۆزو خۆڵەكان بڵاودەكەنەوە، (نَشْراً) بە بڵاوكردنەوە.

٤)- ﴿ فَٱلْفَـٰرِقَـٰتِ فَرْقًا ﴾، ئنجا لە حاڵێكدا كە بڵاو دەكەنەوە، جیاش دەكەنەوە بە جیاكردنەوە، (ف)ی ﴿ فَٱلْفَـٰرِقَـٰتِ فَرْقًا ﴾، دیسان پەیوەست دەبێتەوە بە: ﴿ وَٱلنَّـٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴾ەوە، جیاش دەكەنەوە بە جیاكردنەوە، واتە: ئەهلی بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ لێك جیادەكەنەوە، یان ئەوانەی سەلامەت دەبن، سزا نادرێن و، ئەوانەی سزا دەدرێن، لێكیان جیا دەكەنەوە، كاتێ ڕووحەكانیان دەكێشن و بەرەو قۆناغی بەرزەخ بەڕێدەكرێن، یاخود: ﴿ فَٱلْفَـٰرِقَـٰتِ فَرْقًا ﴾، ئەو فریشتانەی هەورەكان، یاخود بژیوەكان بڵاودەكەنەوە بە شوێنەكان دا لەسەر زەوی.

٥)- ﴿ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴾، هەروەها فڕێدەرەكانی بیرخەرەوە، ئەو فریشتانەی بیرخەرەوە فڕێدەدەن، وشەی (فڕێدان)یش لەبەرئەوەیە كە لە سەرێوە لە خوای پەروەردگارەوە وەحیی دێنن بۆ پێغەمبەران، (**الإِلْقَاءُ مُسْتَعَارٌ لِتَبْلِيغِ الذِّكْرِ مِن الْعَالَمِ الْعُلْوِيِّ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، أو الرِّيَاحِ مِن خَلاَل إِنْزَال المَاءِ مِنْ السَّمَاء تُلْقِي الذِّكْرَ وَالذِّكْرَى فِي قُلُوبِ النَّاسِ وَعُقُولِهِم**)، (**إِلقَاء**): لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ گەیاندنی بیرخەرەوە لە جیهانی سەرێوە (جیهانی فریشتەكانەوە) بۆ خەڵكی سەر زەوی، (ئەگەر فریشتەكان مەبەست بن، لەسەر ئەو ڕایەش كە دەڵێ: مەبەست بایەكانە)،یان ئەو بایانەی لە كاتێكدا ئاو لەسەرێوە دادەبەزێنن، لەو میانەدا بیرخەرەوەو پەند فڕێدەدەنە نێو عەقڵ و دڵی خەڵك.

یانی: خوا ئەو بایانەی ناردوون، ئەو هەموو ئەرك و كارە گەورەو گرنگانەی ژیانی بە شەرو ئاژەڵ و ڕووەك هەمووی بەوانەوە پەیوەستە، ئەو هەموو كارە گرنگانە ئەنجام دەدەن، ئەگەر بایەكان نەبن، ئەو هەڵمەی لەسەر زەریاو ئۆقیانووسەكان بەرز دەبێتەوە، كە بە تیشكی خۆر پەیدا دەبێ، بە چی دەگاتە وشكانیی و بە تایبەت شوێنە بەرزەكان، كە دوایی دەبێتە هەوری متوربەكراوو دواتریش باران و بەفرو تەرزەو دادەبەزێتە خوار، دوایی ئاوی شیرین بە زەویدا بڵاوبێتەوە، كە هەموو ژیانداران و ڕووەك و لە نێویان دا مرۆڤیش ژیانی پەیوەستە بەو ئاوە شیرین و زوڵاڵەوە؟!.

٦)- ﴿ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴾، بۆ لابردنی بیانوو و بۆ ترساندنیش، (**عُذْرًا**) خوێندراویشەتەوە: (**عُذُرًا**)، هەروەها (**نُذْرًا**)یش خوێنراوەتەوە: (**نُذُرا**)، هەردووك شێوە خوێندنەوەكان هاتوون، (**عُذْرًا: لِلإِعْذَارِ بِمَعْنَى إِزَالَةِ أَعْذَارِ الخَلْقِ، عَلَى حَدِّ قَوْلِهِ تَعَالَى:** ﴿ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ ﴿١٦٥﴾ ﴾**النساء**، (**وَنُذْرًا: لِلإِنْذَارِ وَالتَّخْوِيف من العِقَاب عِنْدَ العِصْيَان**)، (**عُذْرًا**) بۆ (**إِعْذَار**)، یانی: لابردنی بیانووەكانی خەڵك، وەك فەرمایشتی خوای بەرز [كە لە ئایەتی (١٦٥) سوورەتی (**النساء**)دا، دوای ئەوەی ناوی دوازدە لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) دێنێ، دەفەرموێ:] ﴿ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾ ﴾**النساء**،

واتە: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەرن، تاکو لە دوای پێغەمبەران خەڵك بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا، لێرەش (**عذراً**) واتە: بۆ ئەوەی خەڵك بیانووی نەبێ، بۆیە فریشتەکان وەحیی دێنن و فڕێدەدەن بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) پەیامی خوا دێنن بۆ ئەوەی خەڵك بیانوو بڕاو بکەن و، بەڵگەو پاساویان نەمێنێ، دوایی بڵێن: ئەی خوایە! نەمانزانی چۆنت بپەرستین، چۆن بەندایەتیی بۆ تۆ بکەین و، ژیانی دنیا بە شێوەیەك بگوزەرێنین شایستەی مرۆڤ بێ و، جێگای پەسەندیی و ڕەزامەندیی تۆ بێ!

(**نُذْرًا**) واتە: بۆ ترساندن و وریاکردنەوە لە سزاو تۆڵەی خوا، لە کاتی سەرپێچیی و لادان و تاوان دا.

(**الطبري**) ئاوا ئەو دوو وشەیەی دوایی، مانا دەکات: (**فَالْمُلْقِيَات ذِكْرًا إِلَى الرُّسُل إِعْذَارًا مِنَ اللهِ إلى خَلْقِهِ وَإِنْذَاراً مِنْهُ لَهُمْ**)، واتە: فڕێدەرانی بیرخەرەوە بۆ لای پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، (کە فریشتەکانن) بۆ ئەوەی لەلایەن خواوە، خەڵك بیانوو بڕاو بکرێ و، لە لایەن ئەوەوە بترسێنرێن و هۆشیار بکرێنەوە، ئەوە ئامانجی فڕێدان و ناردنی بیرخەرەوە (**ذِكر**)ە لەلایەن فریشتەکانەوە، کە خوا بە فریشتەکاندا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) ئامانجەکە ئەوەیە: خەڵك بیانوو بڕاو بکرێ و بترسێنرێ و وریا بکرێنەوە، لەو سەرەنجامەی چاوەڕێیان دەکات.

ئنجا ئایا وەڵامی سوێندەکە واتە: سوێند لەسەر خوراوەکە (**مُقْسَم عَلَيْه**) بریتیە لە چی؟

٧)- ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ هاتووە دی و ڕاستە، (**إِنَّمَا**) هەرچەندە لە ڕێنووسی (مصحف)دا بەیەکەوە لکێندراوەو، ئەگەر کەسێك شارەزا نەبێ، وادەزانێ (**إِنَّمَا**) لێرەدا ئامرازی کورتهەڵێنان و چەسپاندن (**أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَات**)ە، وەك: (**إِنَّمَا الرَّجُل مُحَمَّد**) تەنیا موحەممەد پیاوە، بەڵام لێرەدا ئەم (**إِنَّمَا**)یە دوو پیتە: (**إِنَّ**)ە، لەگەڵ (**مَا**)، (**إِنَّ**)ە پیتی جەختکردنەوەیە، (**مَا**)ش (**مَا الموصولة**)یە واتە: (**إِنَّ الَّذِي**

**تُوَعَدُون)** بە دڵنیایی ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، **(لَوَاقِع)**، **(وَقَع)** واتە: **(سَقَط وَحَدَث)** ڕوویدا، کەوت، **(لَوَاقِع)** واتە: دێتە دی، هاتووەدییە، ئەمە وەڵامی سوێندەکەیە.

ئنجا (الطبري) دەڵێ: **(إِنَّ الَّذِي تُوعَدُونَ أَيُّهَا النَّاسُ! مِنَ الأُمُورِ لَوَاقِعٌ، وَهُوَ كَائِنٌ لَا مَحَالَةَ، يَعْنِي بِذَلِكَ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَمَا ذَكَرَ اللَّهُ أَنَّهُ أَعَدَّ لِخَلْقِهِ يَوْمَئِذٍ مِنَ الثَّوَابِ وَالْعَذَابِ)**، واتە: ئەی خەڵکینە! ئەوەی بەڵێنتان پێدەدرێ، لە کارەکان، دێتەدی، هیچ بواری (نەهاتنە دی) تێدانیە، ڕۆژی قیامەت دێتە دی، ئەوەی خوا باسی کردوە کە بۆ خەڵکی ئامادە کردوە لەو ڕۆژەدا، لە پاداشت و لە سزا. (دڵنیابن دێتە دی، سوێند بەو شتانە).

خوا پشتیوان بێ لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی **(النازعات)**دا کە پێی دەگەین، باسێك لە بارەی سوێندەکانی کە لە قورئاندا هاتوون، دەکەین، باسێکی تێرو تەسەل، ئەو سوێندانەی خوا ﷻ لە قورئان دا خواردوونی، لێرەدا خوا سوێندی بە پێنج شتان خواردوە، یان بە دوو جۆرە شتان کە پێنج سیفەتیان هەن، سوێند خواردنیش بۆ دڵنیاکردنەوەی لایەنی بەرانبەرە، چونکە کە سوێند لەسەر شتێك دەخورێ واتە: ئەی لایەنی بەرانبەر! دڵنیابە ئەو شتە ئاوایە، لێرەش دا سوێند لەسەر خوراوەکە بریتیە لەوە: خەڵکینە! ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ و گفتتان پێ دەدرێ، هاتۆتەدی، دێتە دی و چەسپاوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**چەند ڕووداوێك كە لە ڕۆژی دواییدا دەقەومێن: كوژانەوەی ئەستێران و، شەقبوونی ئاسمان و، هەڵكەندران و هاڕدرانی چیایەكان و، كات دیارییكران بۆ ئامادەبوونی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) كە بۆ ڕۆژی لێك جیاكردنەوە دواخراون، لەو ڕۆژەشدا هاوارو سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەرانی دیداری خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ ﴿١٢﴾ لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٤﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە لە هەشت بڕگەدا:

**١)-** ﴿ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴾، هەر كاتێك ئەستێرەكان سڕانەوە، (**طَمْس**) بە مانای سڕینەوەو لابردنی شتێك دێ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی كتێبیان پێدراوە! بڕوا بێنن بەوەی دامانبەزاندوە (بۆ سەر پێغەمبەرەكەمان) بە ڕاستدانەری كتێبەكانی گەڵ ئێوەشە، بەرلەوەی دەم و چاوانێك بسڕینەوە، ئنجا هەڵیانگێڕینەوە بۆ پشتەوە، (لە جیاتی ڕوویان لە پێشەوە بێ، ڕوویان لە دواوە دەبێ)، (**الطَّمْسُ: الإِزَالَة**)، ﴿ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴾، (**طَمْس**) واتە: لابردن، (**الطبري**) دەڵێ: (**أَي: ذَهَبَ ضِيَاؤُهَا فَلَمْ يَكُنْ لَهَا نُورٌ وَلَا ضَوْءٌ**) واتە: ڕۆشناییەكەی نەما، نە ڕووناكیی ماو، نە تیشكی.

**٢)-** ﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ﴾، هەروەها كاتێك ئاسمان كرایەوە، ئاسمان لەت و پەت بوو، (**الفُرْجَةُ: الفَتْحَةُ فِي الجِدْارِ وَنَحْوِه**)، (**فُرْجَة**) بە درزێك كەلێنێك دەگوترێ، كە لە دیوارو جگە لە دیواریش دا دەبێ.

(الطبري)ی (فُرِجَت)ی ئاوا لێکداوەتەوە: (شُقِّقَت، صُدِعَت)، لەت و پەت بوو، قڵیشا.

٣)- ﴿ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴾، هەروەها کاتێك چیایەکان هەڵکەندران، (الطبري) گوتوویەتی: (نُسِفَت مِنْ أَصْلِهَا فَكَانَتْ هَبَاءً مُنْبَثًّا)، لەسەر بناغەکەیان هەڵقەندران، بوونە تۆزو گەرد، (وَالنَّسْفُ: قَلْعُ أَجْزَاءِ الشَّيْءِ بَعْضِهَا عَنْ بَعْضٍ وَتَفْرِيقُهَا وَنَسْفُ الجِبَالِ: دَكُّهَا)، (نَسْف): بریتیە لەوەی بەشەکانی شتێك لێك جیابکرێنەوەو هەڵبقەندرێن و بڵاوبکرێنەوە، (وَنَسْفُ الجِبَال: دَكُّهَا)، مەبەست لە: (نَسْف الجبَال) وردوخاشکرانیانە.

٤)- ﴿ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴾، هەروەها کاتێك پێغەمبەران کاتیان بۆ دیارییکرا، (أُقِّتت) بە دوو جۆری دیکەش خوێندراوەتەوە: (وقِّتَت) و (وقِتَتْ)، (الزمخشري) ئاوای لێکداوەتەوە: (أي بَلَغَت مِيْقَاتَهَا)، واتە: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) گەیشتنە ژوانگەی خۆیان، ئەو کاتەی بۆیان دیارییکراوە، هەندێکیش (أُقِّتَت)یان ئاوا لێکداوەتەوە: (وقِتَت وَعُيِّنَ لَهُم الوَقْت الَّذِي يَحْضُرُونَ لِلشَّهَادَة عَلَى أُمَمِهِمْ)، واتە: ژوانگەیان بۆ داندراو ئەو کاتەیان بۆ دیارییکرا، کە ئامادە دەبن بۆ شایەدییدان لەسەر کۆمەڵەکانی خۆیان.

٥)- ﴿ لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴾، بۆ چ ڕۆژێك پێغەمبەران دواخراون؟ (أُجِّلَت: أُخِّرَت) دواخراون، (وُقِّتَت) ژوانگەیان بۆ داندراوە، (أُجِّلَت) واتە: (أُحْضِرَتْ فِي الوَقْتِ المُعَيَّن) لە کاتی دیارییکراودا ئامادە کران، (أُجِّلَت) واتە: (جُمِعَت لِوَقْتِهَا) کۆکرانەوە لە کاتی دیارییکراودا، کە دەشفەرموێ: ﴿ لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴾، ئەمە بۆ سەرسوڕماندن و زەبەلاح و ترسناك و دژوار پێشاندانی ئەو ڕۆژەیە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴾، ئەمە بەڕواڵەت پرسیارکردنە، بەڵام مەبەست پێی سەرسوڕماندن و سامناك پێشاندانە.

٦)- ﴿ لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ ﴾، بۆ ڕۆژی لێك هەڵاواردن (ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دواخراون و ژوانگەیان بۆ داندراوە)، (أُجِّلَت) سێ مانای هەن: أ- دواخستن، ب- ژوانگە بۆ دانران. ج- مۆڵەت دران. وشەی (أُجِّلَت) لە (أجَل)ەوە هاتوە، (الأَجَل: المُدَّةُ المَضْرُوبَةُ للشَّيء)، (أَجَلْ)کاتێکی دانراوە بۆ شتێك.

٧)- ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴾، چ شتێك بە تۆی زاناندوە ڕۆژی لێكجیاكردنەوە چییە! یان: چ شتێك وایكردوە بزانی ڕۆژی جیاكردنەوە چییە؟

٨)- ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت (یان هاوار) بۆ بەدرۆدانەرانە، واتە: بەدرۆدانەرانی ڕۆژی دوایی و، پێغەمبەرانی خوا (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) و فەرمایشتی خوا.

ئەگەر تەماشای كۆی ئەو ڕووداوانە بكەین:

١- كوژاندنەوەی ئەستێرەكان و خەفەبوون و ون بوون و تاریك داهاتنیان.

٢- كرانەوەی ئاسمان و لەت و پەت بوونی.

٣- هەڵقەندرانی چیایەكان و هاڕدران و وردو خاش بوونیان.

٤- ژوانگە داندران بۆ پێغەمبەران، (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)و كات بۆ دیارییكرانیان، ئەم چوار ڕووداوە، دابەش دەبن بە سەر كۆی ڕۆژی دواییدا، بە هەردووك قۆناغی (**ساعة**) و (**قيامة**)وە، (**سَّاعَة**) واتە: ئاخیر زەمان، ئەو ڕۆژەی ئەم گەردوونەی تێدا دەپێچرێتەوەو كۆتایی دێ و، ژیانی دنیا تەواو دەبێ، (**قِيَامَة**) واتە: ئەو ڕۆژەی ژیانێكی دیكەو قۆناغێكی دیكەی ژیان دەست پێ دەكات، كە بریتیە لە هەڵسێندرانەوەی مردووان و، زیندووكرانەوەیان و ئامادەكرانیان بۆ سزاو پاداشت، چونكە:

أ- كوژێنرانەوەی ئەستێرەكان و شۆق نەمانیان و تاریك داهاتنیان.

ب- هەروەها كرانەوەی ئاسمان و لەت و پەت بوونی و، هەڵقەندرانی چیایەكان، ئەوانە هەموویان لە قۆناغی یەكەم دان كە بریتیە لە (**سَاعَة**).

بەڵام دووەكەی دیكە: أ- ژوانگە دانان بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)و، ب- ئامادەكرانیان بۆ ڕۆژی لێكهەڵاواردن، دەكەونە (**قِيَامَة**) واتە: قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییەوە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴾، (**الطبري**) ئاوای لێكداوەتەوە:

(**وأيّ شيء أَدْرَاك يَا مُحَمَّد ﷺ! مَا يَوْم الْفَصْلِ، مُعَظِّماً بِذَلِكَ أَمْره، وَشِدَّة هَوْله**)، ئەی موحەممەد ﷺ! چ شتێك بە تۆی زانادووە تۆ بزانی ڕۆژی لێکجیاکردنەوە چییە؟! (خوا وایفەرمووەو ئەم پرسیارەی کردوە) بۆ بە مەزنگرتنی حاڵی ئەو ڕۆژەو، سەخت پێشاندانی ترسناکییەکەی.

﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران، واتایەکە ئاوای لێدێتەوە: (**إِذَا حَصَلَ كَذَا وَكَذَا، حَلَّ الوَيْلُ لِلمُكَذِّبِينَ**)، ئەگەر فلان شتەو فلان شتە ڕوویدا، لەو ڕۆژەدا، سزای سەخت دێتە سەر بەدرۆدانەران.

(**قتادة**)ش دەڵێ: پرسیارکردنەکە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانادووە، ڕۆژی لێکجیاکردنەوە چییە؟ وەك (**الطبري**) بە ژمارە (٣٦٠٤٩) لێوەی هێناوە: (**تَعْظِيْماً لِذَلِكَ اليَوْم**) بۆ بە مەزنگرتن و بە مەزن پێشاندانی ئەو ڕۆژەیە (ئەو پرسیارکردنە)، یان: بۆ سەرسوڕماندنە لە ترسناکیی و مەزنیی ئەو ڕۆژە.

دیارە وشەی (**وَيْل**) کە لەم سوورەتە موبارەکەدا دە جاران دووبارە بۆتەوە، لەو ڕستە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، کە دە (١٠) جاران لەم سوورەتە موبارەکەدا دووبارەبۆتەوە، (**وَالْوَيْلُ: أَشَدُّ السُّوءِ وَالشَّرِّ**)، (ویل) یانی: خراپترین زیان و، خراپترین شتی ناخۆش، هەروەها (**وَيْل**) بە مانای (**الهَلَاك**) فەوتان و لە بەین چوون، دێ.

(**الطبري**) دەڵێ: (**وَالْوَيْلُ: الْوَادِي الَّذِي يَسِيلُ فِي جَهَنَّم مِنْ صَدِيدِ أَهْلِهَا، لِلْمُكَذِّبِينَ بِيَوْمِ الْفَصْلِ، يَوْم الْفَصْل**)، واتە: (وَيْل): دۆڵێکە شیوێکە زووخاوی خەڵکی دۆزەخی پێدا دێتە خوار، ئنجا ئەو سزایە بۆ بەدرۆدانەرانی ڕۆژی لێك جیاکردنەوەیە، لە ڕۆژی لێك جیاکردنەوەدا.

حیکمەتی دووبارەبوونەوەی ڕستەی: ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾:

زانایان لەو بارەوە کە ئایا حیکمەتی چییە، خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا دە جاران ئەو ڕستەیەی دووبارە کردۆتەوە: ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا (وَیْل) بۆ بەدرۆدانەران؟ (وَیْل) چ بە مانای سەختترین سزا بێ، چ بە مانای فەوتان بێ، چ بە مانای دۆڵ و شیوێك بێ لە دۆزەخدا کە جەڕاحەت و کێم و زووخاوی جەستەی دۆزەخییەکانی پێدادێ، چ بە مانای هاوار بێ، هاوار بۆ فڵانکەس، واتە: دەردێکی بەسەر بێ هاوار بکات، زانایان زۆر قسەیان لەو بارەوە کردوە، ئایا حیکمەتی چییە ئەو ڕستەیە دە (١٠) جاران دووبارە بۆتەوە؟

أ)- هەندێکیان گوتوویانە: تەنیا بۆ جەختکردنەوەیە، واتە: خوا ﷻ ئەو ڕستەیەی دە جاران دووبارە کردۆتەوە بۆ جەختکردنەوەی ئەوە، کە لەو ڕۆژەدا ئەوانەی پەیامەکانی خوا، دیداری خوا، پێغەمبەرانی خوا، بە درۆ دادەنێن، سزای سەختیان بۆ هەیە.

هەڵبەتە دووبارە کردنەوەش بۆ داکۆکییکردن و تۆخکردنەوە، عادەتێکی نەك هەر زمانی عەرەبییە، بەڵکو هەموو زمانەکانە، وەك پێشتریش لە سوورەتی (القِيَامَة)دا هێنامان: ﴿ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰ ٣٤ ثُمَّ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰٓ ٣٥ ﴾القيامة.

ب)- ئەم ڕستەیە کە دووبارەبۆتەوە: ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، مەبەست پێی سزای تازەیە لەسەر هەر کام لە تاوانی بە درۆدانانی ڕاستییەکان، چونکە ئەو دە (١٠) جارە کە هاتوە، هەر دە جارەکان لە دوای خستنە ڕووی ڕاستییەکە:

جاری یەکەم: خوا ﷻ دەفەرموێ: کاتێك ڕۆژی دوایی هات بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەتەوە، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەرانە، بەدرۆدانەرانی ئەو ڕۆژە.

جاری دووەم: باسی فەوتاندنی گەلە پێشووەکانە، ئنجا بەدواخستنی گەلە دوایینەکانە، کە لە ئەنجامی یاخیبوون و سەرپێچییکردنیاندا لە خوا، سزای دان و فەوتاندوونی.

جاری سێیەم: لە دوای ئەوەیە کە خوا سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێ: چۆنی دروستکردوون؟ ئنجا مادام خوا ﷻ ئاوای دروست کردوون، سزای سەخت بۆ ئەوانەی دیداری خوا بە درۆ دادەنێن، خوایەك بەو هەموو قۆناغانەدا تۆی تێپەڕاندبێ، دەشتوانێ زیندووت بکاتەوە.

جاری چوارەم: لە دوای سەرنج ڕاکێشانی مرۆڤەکانە بۆ زەوی، کە چۆن خوا وایلێکردوە بەخۆیانەوە بگووشێ بە زیندوویی و بە مردوویی، پاشان چیا سەرکەشەکان و، دوایی ئاوی شیرین و زوڵاڵ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾، واتە: سزای سەخت بۆ ئەو بەدرۆدانەرانەی لەگەڵ ئەوەش دا خوا ﷻ ئەو هەموو نیعمەت و چاکانەی پێداون، کەچی دیداری خواو بەڵێنی خوا بە درۆ دادەنێن.

هەروەها شەش (٦) جارەکەی دیکەش بە هەمان شێوە، وەك دوایی پێیان دەگەین.

منیش ئەو ڕایەی دووەمم زیاتر بە دڵەوە دەنووسێ، چونکە هەر جارێك خوا ﷻ ئەو وشەیەی دووبارە کردۆتەوە، شتێکی تازە باسکراوە، ئەوەش دەخوازێ کە هەر کەس دیداری خوا، یان پەیامی خوا، یان پێغەمبەرانی خوا، یان ڕۆژی دوایی، بەدرۆ دابنێ، شایستەی سزای سەخت بێ.

(الشوكاني) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (**وَكَرَّرَ هَـذِهِ الْآيَـةَ فِي هَـذِهِ السُّـورَةِ لِأَنَّـهُ قَسَّـمَ الْوَيْـلَ بَيْنَهُـمْ عَـلَى قَـدْرِ تَكْذِيبِهِـمْ، فَـإِنَّ لِـكُلِّ مُكَـذِّبٍ بِـشَيْءٍ عَذَابـاً سِـوَى تَكْذِيبِـهِ بِـشَيْءٍ آخَـرَ، وَرُبَّ شَيْءٍ كَـذَّبَ بِـهِ هُـوَ أَعْظَـمُ جُرْمًـا مِـنَ التَّكْذِيـبِ بِغَيْرِهِ، فَيُقْسَـمُ لَـهُ مِـنَ الْوَيْـلِ عَـلَى قَـدْرِ ذَلِـكَ التَّكْذِيـبِ**)، واتە: بۆیە لەم سوورەتە موبارەکەدا ئەم ئایەتە موبارەکە دووبارەبۆتەوە (دە جاران) چونکە خوا سزای سەختی بە

---

(١) (فتح القدير): ج٥، ص٤٣٢.

ئەنـدازەی بـە درۆدانانیـان بـۆ ڕاسـتییەکان بەسـەردا دابـەش کـردوون، چونکـە هـەر کەسـێك شـتێك بـە درۆ دابنـێ، لەوانـەی خـوا هەواڵیـان پـێ دەدات، بەشـێك لـە سـزای بـۆ هەیـە، جیـا لـەو بەشـە سـزایەی لـە بەرانبـەر بـە درۆ دانـانی شـتێکی دیکـەدا بـۆی دانـراوەو، جـاری وا هەیـە کەسـێك شـتێك بـە درۆ دادەنـێ، ئـەو بـەدرۆ دانانـەی تاوانەکـەی مەزنـترە لـە بـەدرۆ دانـانی شـتێکی دیکـە، بۆیـە بـۆ هـەر کام لـە بـەدرۆ دانانـەکانی بەشـێك لـە سـزای بـۆ دادەنـرێ، بـە ئەنـدازەی خـۆی.

شـایانی باسـە: سـێ سـوورەت لـە قورئانـدا بـە تایبـەت ئـەو دووبـارە بوونەوەیـان تێدایـە:

**یەکەم:** سوورەتی **(الرحمن)** کە سی و یەك (٣١) جار ڕستەی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، تێیدا دووبارە بۆتەوە، واتە: ئەی جندو مرۆڤ! بە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بێبڕوان؟ یاخود: کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بە درۆ دادەنێن!.

**دووەم:** لە سوورەتی **(القمر)**دا کە هەر کام لە ڕستەی: ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾**القمر**، هەروەها ڕستەی: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾**القمر**، یەکی چوار جاران هاتوون.

**سێیەم:** سوورەتی **(المرسلات)**یش کە دە جاران ئەو ڕستە موبارەکەی تێدا دووبارەبۆتەوە: ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾ ﴾**المرسلات**.

مەسەلەی سێیەم:

**لـە بەیـنـبردنی خـوا بـۆ کۆمەڵـگا پێشـووە تاوانبـارەکان و، شوێنخسـتنی ئـەوانی دیکەیـان، واتـە: سـزادانی کۆمەڵگایـەکانی دیکـەی دوای وانیـش، یاسـایەکی بەردەوامـی خـوای دادگـەرە لـە سـزادانی تاوانبـارو بەدرۆدانـەرانی پەیـام و دیـداری خـوادا:**

خـــوا دەفەرمــوێ: ﴿ أَلَمْ نُهْلِكِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ الْآخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿ أَلَمْ نُهْلِكِ الْأَوَّلِينَ ﴾، ئایا پێشووەکانمان نەفەوتاندوون؟ لێرەدا پرسیار کردن بۆ پێچەسپاندن (**الإِسْتِفْهَام التَّقْرِيْرِي**)ە، واتە: پرسیارکردنەکە بۆ ئەوە نیە چاوەڕێی وەڵام بکرێ و، پرسیار کردنی نکووڵییلێکەرانەش نیە، هەرچەندە دەشگونجێ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەش بێ، بەڵام بۆیە دەڵێین (**تَقْرِيْرِي**)ە، واتە: پێچەسپاندن، کە بەرانبەرەکەی وا لێ بکات دانی پێدا بێنێ، چونکە دان پێداهێنان بەوەدا کە گەلە پێشووەکان فەوتاون، هیچ کەس نکووڵیی لێ ناکات، (**الأَوَّلِيْن**)یش (أل)ی چۆتە سەرو بۆ ناساندنە، بەڵام بۆ ناساندنی عەهدە، واتە: ئایا میللەت و کۆمەڵگا پێشووەکانمان نەفەوتاندوون، کە مەبەست پێی تێکڕای ئەو کۆمەڵگایانەیە ئەهلی شیرك و کوفر بوون و خوا لە بەینی بردوون، وشەی (**نُهْلِك**) لە ﴿ أَلَمْ نُهْلِكِ الْأَوَّلِينَ ﴾دا، (**الإِهْلَاك: الإِعْدَام وَالإِمَاتَة**) بریتیە لە فەوتاندن و لە بەینبردن و مراندن.

**٢)-** ﴿ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ الْآخِرِينَ ﴾، دوایی پاشینەکانیشمان شوێنخستن، (**ثُمَّ**): (**لِلتَّرْتِيْب وَالتَّرَاخِي الرُّتْبِي**) (ثم) بۆ ڕیزبەندییە، ڕیزبەندییەك کە بە کاوەخۆ بێ و لە دوای وی بێ، واتە: لە دوای کۆمەڵگا پێشووەکان کە فەوتاندمانن، ئنجا ئەوانەی دوای وانیشمان، وەدواخستن و لە فەوتاندن و لە بەینبردن دا، بە دوای ئەوانی دیکەمان خستن.

٣)- ﴿كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ﴾، بەو شێوەیە لە تاوانباران دەکەین، (أي: مِثْلَ ذَلِكَ الفِعْلِ نَفْعَلُ) وەك ئەو کردەوەی کردمان بەوان، چیمان بەوان کرد، ئاواش لە تاوانباران دەکەین، وشەی (مُجْرِمِين) لە نازناوەکان و ناوونیشانەکانی بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوادانەرانە لە قورئانداو، ئەمە هۆشدارییدانە بە تاوانبارەکان و بە بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ و دوای ویش، کە ئەگەر ئێوەش لەسەر تاوان و خراپەو لادان بەردەوام بن، ئەو یاسایەی خوا بۆ ئێوەش لە بۆسەدایەو، دەبێ چاوەڕێ بکەن، ئەو سزایە بەسەر ئێوەش دا بچەسپێ.

٤)- ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾، لەو ڕۆژەشدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران، واتە: بۆ ئەو بەدرۆ دانەرانەی پێیان وایە: خوا ﷻ تاوانباران سزا نادات، یان ئەو بەدرۆدانەرانەی پێیان وایە دنیا تاکە دەرفەتی ژیانەو، شاری بێ خاوەنەو، خوا ﷻ خەڵك زیندوو ناکاتەوە بۆ سزاو پاداشت و لێپرسینەوە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلْآخِرِينَ ﴿١٧﴾﴾، بێگومان ئەو فەوتاندنەی خوا بۆ کۆمەڵگا پێشووەکان و بۆ ئەوانەی دوای وانیش، کە کۆمەڵگا پێشووەکان زۆربەی زانایان دەڵێن: پێش هەموویان گەلی نووحە، کۆمەڵگایەکەی نووحە (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە لە هەموو ئایەتەکانی قورئاندا خوای پەروەردگار نووح و گەلەکەی لە پێشەوە باس دەکات، دوای ئەو گەلی عادە، کە پێغەمبەرەکەیان هوود بووە، دوای ئەو گەلی سەموودە کە پێغەمبەرەکەیان صاڵیح بووە، دوای ئەوان گەلی مەدیەنە، کە پێغەمبەرەکەیان شوعەیب بووە، ئنجا دوایی گەلی لووتە، کە پێغەمبەرەکەیان لووط بووە (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، ئەوانە لە گەلە پێشووەکانن، ئەوانی دوای وانیش کۆمەڵگایەکانن دیکەن، وەك: گەلێك کە مووسا بۆیان ڕەوانەکرا، کە فیرعەون و دارو دەستەکەی و گەلەکەی بوون لە میسر، هەروەها ئەوانی دیکەش.

ئنجا ئەو فەوتاندنەش دوو حاڵەتی هەن:

١)- حاڵەتێکی ئاسایی کە بە مردنی خۆیان مردبن، ئەویش ئەوەیە کە خوا سیستمی خۆی بۆ ژیانی مرۆڤ وادااناوە، دوای تێپەڕینی ماوەیەك لە تەمەن، ئەو جیلە ببڕێتەوەو ئەو سەدەیە کۆتایی بێ و، بە مردنی ئاسایی خۆیان بمرن.

٢)- حاڵەتێکی نائاسایی کە بریتیە لەوەی خوا سزایەکی بنبڕکەریان بۆ بنێرێ، واش پێدەچێ کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، مەبەست پێی مانای دووەم بێ، واتە: مردنێکی نا ئاسایی، چونکە:

١- گەلی نووح بە مردنی ئاسایی خۆیان نەمردوون، بەڵکو بە تۆفان، لە تۆفان دا نغرۆ بوون.

٢- هەروەها گەلی عاد بە بایەکی بەهێز.

٣- گەلی سەموود بە بڵێسەیەکی گەورە.

٤- گەلی مەدیەن بە دەنگێکی گەورەو بە لەرزینەوەی زەویی.

٥- هەروەها گەلی لووت بە بەرد بارانکران و ژێرو ژوورکران.

٦- گەلی فیرعەون کە خوا لە دەریای سووردا نغرۆی کردن.

٧- گەلەکانی دیکەش هەر کامێکیان توند سزا دراون و بەڵای ناگەهان گرتوونی.

## مەسەلەی چوارەم:

**سەرنجڕاكێشانی مرۆڤ بۆ ئەوەی كە لە ئاوێكی بێهێزو كەم دروستكراوەو، خراوەتە نشینگەیەكی مەحكەمەوە، تاكو كاتێكی دیارییكراوو، خوا زۆر باش ئەندازەگیریی كردوەو توانای بەسەریدا شكاوە، بۆیە بەدرۆ دانەرانی ڕۆژی دوایی و پەیامی خوا، شایستەی سزای سەختن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾، ئایا لە ئاوێكی بێهێز دروستمان نەكردوون؟ پێشتریش گوتمان: نووسراوە: (**أَلَمْ نَخْلُقكُم**)، بەڵام لە ڕووی زانستیی باشخوێندنەوە (**علم التجويد**) ەوە پیتی (ق) لە (ك)دا دەغم دەكرێ و دەبێتە: (**أَلَمْ نَخْلُكُّم**) ئاوا لەسەر زمان خۆشترە، زانستی باش خوێندنەوەی قورئانیش هەر بۆ ئەوەیە ئاسانتر پیت و دەنگەكان و وشەكان ببێژرێن و، جوانیی و ڕەونەقییەكی زیاتریش بە خوێندنەكە دەدەن، لەبەر ئەوەی دەرچەی (ق) و (ك) لێك نزیكن، بۆیە ئەگەر پێكەوە دەغم بكرێن، خۆشتر دێ ئایا ئێوەمان دروست نەكردوە لە ئاوێكی بێهێز، (**مَهِيْن**) لە (**مَهُن**)وە هاتوە، (**مَهُنَ أي: ضَعُف**)، (**وَأَمْهَنَهُ أي: أَضْعَفَهُ**)، ئەمە پێویستە باش لەبەرچاومان بێ، چونكە زۆرێك لە ڕوونكەرەوانی مانایەكانی قورئان، پێیان وابووە (**مَهِيْن**) لە (**هَان**)ەوە هاتوە، (**هَانَ، يَهُونُ، فَهُوَ مُهَان**)، (**مُهَان**) واتە: قێزەون، كەم بایەخ، بە سووك تەماشاكراو، بەڵام بێگومان (**مَهِيْن**) لە (**مَهُنَ**)ەوە هاتوە، (**مَهُنَ: ضَعُفَ، أَمْهَنَهُ: أَضْعَفَهُ، امْتَهَنَهُ: إبْتَذَلَهُ، امْتَهَنَ فُلَانٌ: اكْتَسَبَ مِهْنَة**) پیشەیەكی ڕەچاو كرد، كەواتە: (**مَهُنَ**): (**ضَعُفَ**)، (**مَهِيْن**) یانی: (**ضَعِيْف**) بێهێز، ئاوێكی بێهێز، كەم.

بەڵام (**مُهان**) بێڕێز، کەم بایەخ، لە: (**هان یهون فهو مهان**) هاتووە، لێرەدا پرسیارکردنەکە دیسان پرسیارکردنی دان پێپێداهێنانە، واتە: بەرانبەرەکەت وا لێبکەی دانی پێدابێنێ و بیسەلمێنێ، چونکە هیچ چاری نیە، نەك پرسیارکردنی نکووڵییلێکردن بێ، هەروەها پرسیارکردنی ئاساییش هەر نیە، چاوەڕێی وەڵام بێ، بۆیەش پرسیارکردنی نکووڵییلێکردن نیە، چونکە کەس نکووڵیی لەوە ناکات کە لە ئاوێکی کەم و بێهێز دروست بووە، بۆیە ئەمە پرسیارکردنی پێپێلێنانە، یان دانپێپێداهێنانە، واتە: بەرانبەرەکەت والێکردوە دانی پێدابێنێ، بەڵام ئەو جۆرە پرسیارکردنە سەردەکێشێ بۆ سەرزەنشتکردنیان لەسەر نکووڵییکردنیان لە زیندووبوونەوەو هەڵسێنرانەوە، دوای ئەوەی خوا مرۆڤی بەو شێوەیە خوڵقاندوەو، لەو ئاوە بێهێزەو دوایی بۆتە ئەو مرۆڤە، ئەگەر نکووڵیی لەوە بکەی ئەو خوایەی تۆی لەو شتە بێهێزەوە هێناوەتە سەر، ئەو حاڵەتەی ئێستات، نکووڵییلێکردنەت، جێگای سەرزەنشتکردن و گلەییە.

کە دەفەرموێ: ﴿مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾، ئاوێکی بێهێز، هەندێك لە زانایان بۆ وێنە: (**إبن عاشور**) و (**القرطبي**) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، گوتوویانە: مەبەست لێرەدا ئاوی پیاوە، بەڵام لە ڕاستییدا نەیانپێکاوە، چونکە مرۆڤ لە ئاوی ژن و مێرد هەردووکیان پێك دێ، وەك پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (**النجم**)دا گوتمان، خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەخاتە ڕوو، کە مرۆڤ لە ئاوی هەر کام لە پیاو و ئافرەت پێك دێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾﴾**النجم**، واتە: خوا هەردووك جووتی نێرو مێی لە نوتفەیەك دروست کردوون، کاتێك دەخرێتە نێو منداڵدانەوە[1]، هەندێك لەو زانایانە وایانزانیوە کە دەفەرموێ: (**تُمْنى**) دەهاوێژرێ، ئەوە هەر ئاوی پیاوە دەچێتە نێو منداڵدانەوە، نەیانزانیوە - وەك ئێستا زانستیی کۆرپەلە ناسیی دەریخستوە - دوای ئەوەی ژن و مێرد پێکەوە جووت دەبن، ئاوی پیاو یەکسەر ناچێتە نێو منداڵدانەوە،

---

(١) تُمْنى: تُرْمَى، تُقذف: فڕێ دەدرێتە، دەهاوێژرێتە.

بەڵكو دوای ئەوەی یەكێك لە زیندەوەرە بچووكەكانی نێو ئاوی پیاو، كە پێیان دەگوترێ: زیندەوەرانی تۆویی (**الحَيْوَانات المَنَوِيَّة**) و تاكەكەی ژیانداری تۆویی (**الحَيوان المَنَوِيّ**)ەو بە (**حَيمَنْ**) كورت دەكرێتەوە، یەكێك لەو زیندەوەرە گچكانە لەگەڵ هێلكۆڵە (**بويضة**)ی نێو ئاوی ئافرەتدا یەكدەگرن، ئنجا بە هەردووكیان نوتفە پێك دێنن، ئەو نوتفەیە دادەبەزێتە نێو منداڵدانەوەو، ئەوەی دادەبەزێتە نێو منداڵدان، ئەو نوتفەیەو دوایی دەبێتە كۆرپەلە، وەك پێشتریش لە تەفسیری سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**المؤمنون**)دا، لە بارەی دروستكردنی مرۆڤەوە، باسێكی -لەقەدەر ئەم تەفسیرە- تێرو تەسەلمان كردوە.

ئنجا كە خوا دەفەرمووێ: ﴿مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾، فەرمایشتێكی پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێ: (**ما من كلِّ الماءِ يكون الوَلَدُ**)[1]، واتە: (لە هەموو ئاوەكە منداڵ دروست نابێ)، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن خەڵك تێبگەیەنێ كە مرۆڤ چۆن دروست دەبێ؟ فەرموویەتی: لە هەموو ئاوەكە منداڵەكە دروست نابێ، تاكو وانەزانرێ كە ئەو چەند دڵۆپە مەنییەی پیاو، لەگەڵ ئاوی ئافرەت دا، لە هەموویان كۆرپەلەكە دروست دەبێ!.

ئێستا زانست - زانیاریی كۆرپەلە ناسیی - دەریخستوە، كاتێك پیاو لەگەڵ ئافرەت دا جووت دەبێ، قەبارەی ئاوەكەی نیزیكەی سانتیمەتر سێجایەك (١سم٣) دەبێ و، پێنجسەد ملیۆن (٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) زیندەوەری گچكەی تێدایەو، هەر ئاوەكە خۆی بریتیە لەو زیندەوەرە گچكانە كە پێیان دەگوترێ: (**الحَيْوَانات المَنَويّة**)، زیندەوەرە تۆوییەكان، بە مەزەندە ژمارەیان ئەوەندە كەمتریان زیاتر دەبێ، ئنجا یەكێك لەو زیندەوەرە گچكانە، یەكێك لەو (**حيمن**)انە لەگەڵ زیندەوەرێكدا كە لە نێو ئاوی ئافرەت دایەو، پێی دەگوترێ: هێلكۆڵە (**بويْضَة**) یەكدەگرێ و، ئەوەیە

---

(١) {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ سَمِعَهُ يَقُولُ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْعَزْلِ، فَقَالَ: «مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ»} أخرجه الطيالسي: ٢١٧٥، وأحمد: ١١٩٠٢، ومسلم: ١٤٣٨، وأبو يعلى: ١١٥٣.

کـە دوایـی دەبێتـە نوتفـەو سـەرەتای دروسـتبوونی کۆرپەلـە، دوایـی ئـەو نوتفـە (نُطْفَة) یـە دەگـۆڕێ بـۆ (عَلَقَـة) خوێنپـارەو، ئەویـش دەگـۆڕێ بـۆ زارجـوو (مُضْغَـة)، ئەویـش دەگـۆڕێ بـۆ ئێسـقان و، ئێسـقانەکانیش بـە گۆشـت دادەپۆشرێـن، دوایـی خـوا پـاش چـوار مانـگ و دە شـەو، ڕووحـی بـە بـەردا دەکات، وەك دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ١٤﴾ **المؤمنـون**، واتـە: دوایـی کردمـان بـە دروسـتکراوێکی دیکـە، کـە مەبەسـت پێـی ڕووح بـە بەرداکردنیـەتی، پێشـێ هـەر ژیـان (**حیاة**)ی لـە بەردایـە، کـە نوتفەیـە ژیـانی لەبەردایـە، بەڵکـو هـەر ژیانـداری تۆوییەکەی پیـاوو هێلکۆڵەکـەی ئافـرەت، هەردووکیـان دوو زینـدەوەری زینـدوون، ژیانیـان هەیـە، دوایـی بـە هەردووکیـان ژیاندارێـکی دیکـە پێکدێنـن، کەواتـە: هـەر لـە سـەرەتاوە ژیـانی هەیـە، بـەڵام ڕووحـی تێدانیـە، تاکـو ئـەو کاتـەی دەبێتـە کۆرپەلەیـەك و هەمـوو ئەندامـەکانی بـۆ دروسـت دەبـن، بـەڵام بـە گچکەیـی، ئنجـا دوای ئـەوەی دەبێتـە مرۆڤ و شـێوەی مـرۆڤ وەردەگـرێ، خـوا ڕووحـی بـە بـەردا دەکات.

**٢)**- ﴿فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾، ئنجا ئێمە ئەو (ئاوە بێهێزە) ە مان نیشتەجێ کردوە، گێراومانە لە نشینگەیەکی مەحکەمدا، (**قَرَار**): (**مَحَلُّ القُرُورِ وَالمُكْثِ**)، شوێنی نیشتەجێ بوون و مانەوە، (**مَكِيْن: الحَالُّ وَالمُسْتَقِرُّ فِيْهِ هُوَ المتَمْكِّن**)، (**مَكِيْن**) لە ئەسڵدا بە مانای خاوەن پێگەیە، دیارە ئەو ئاوەی لەوێدا لەو نشینگەیەدا نیشتەجێ دەبێ، ئەو خاوەن پێگەکەیە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ (**مَكِيْن**)ی کردوە بە سیفەت بۆ نشینگەکە، نشینگەیەکی مەحکەم و خاوەن پێگە.

**٣)**- ﴿إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾، تاکو ئەندازەیەکی زانراو، ئەمە مەبەست پێی کاتی کۆتایی هاتنی تۆڵداری (**حمل**)ی ئافرەتە.

**٤)**- ﴿فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ﴾، ئنجـا ئەندازەگیریمـان کرد، ئێمـەش باشترین ئەندازەگیرییکارین، (**فَقَدَرْنا**) خوێندراویشەتەوە: (**فَقَدَّرْنَا**) هەردووکیان بە مانای ئەندازەگیرییمان کرد، ﴿فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ﴾، باشترین ئەندازەگیرییکەرین، (**القَادِرُوْن: إسْمُ فَاعِلٍ مِنْ قَدَرَ اللازم إذَا كَانَ ذَا قُدْرَة**)، واتە: (**قَادِرُوْن**) ناوی بکەرە لە (**قَدَرَ**)ی لازیمەوە

هاتوە، [(قَدَرَ) واتە: توانای بەسەردا شكا] (إذَا كَانَ ذَا قُدْرَة) ئەگەر خاوەن توانا بێ، (قَدَرَ فَهُوَ قَادِر) توانای بەسەردا شكا، ئەو توانادارە، بەڵام ئەگەر بە (قَدَّرَ) بخوێنرێتەوە كە واش خوێندراوەتەوە: (فَقَدَّرْنَا) واتە: ئەندازەگیرییمان كرد، ئەو كاتە ناوی بكەر (إسم فاعل) ەكەی دەبێتە (مُقَدِّر) واتە: (جَعَل الشَّيءَ ذَا مِقْدَارٍ مناسِب لما جَعَله)، واتە: شتەكەی كردە خاوەن ئەندازەیەكی گونجاو لەگەڵ ئەو ئامانجەدا كە بۆی دروستكراوە، (أي قَدَرْنَا الخَلْقَ إذ القَدْر: المِقْدَار المُعَيَّنُ المضْبُوط)، (قَدْر) بریتیە لە ئەندازەیەكی دیارییكراوی كۆنترۆڵكراو، ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ فَنِعۡمَ ٱلۡقَٰدِرُونَ ﴾، ئەگەر (قَدَرْنَا) بە مانای (توانیمان) بێ، یان بە مانای (ئەندازەگیرییمان كرد) بێ، بەڵام: ﴿ فَنِعۡمَ ٱلۡقَٰدِرُونَ ﴾، لە هەردوو حاڵەتدا، هەر بە مانای ئەوەیە: ئێمە باشترین توانادارین، چونكە لێرەدا (قَادِرُوْن) ناوی بكەرە لە (قَدَرَ)ی (لازِم)ەوە هاتوە، ئەگەرنا (قَدَر) حاڵەتی تێپەڕكەریشی هەیە: (قَدَرَ الشَّيءَ) واتە: شتەكەی ئەندازەگیریی كرد، بەڵام ئەگەر (قَدَرَ)ی تێپەڕكەر (مُتَعَدِّي) بووایە، تێپەڕ بۆ بەركار، ئەو كاتە دەیفەرموو: (فَنِعْمَ المقدِّرون)، بەڵام (قَادِر) بە مانای توانادارو خاوەن توانایە.

٥)- ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەرانە، واتە: بەدرۆدانەرانی دیداری خوا، بەدرۆدانەرانی توانای خوا لەسەر زیندوو كردنەوە، ئەوە لەگەڵ ئەم سیاقەدا گونجاوە، سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ بەدرۆدانەرانی ئەوەی خوا ﷻ بتوانێ زیندوویان بكاتەوە، ئەوانەی ئەوە بەدرۆ دادەنێن، سزای سەخت بۆیان هەیە، خوایەك مرۆڤی بەو هەموو قۆناغانەدا تێپەڕاندبێ، چۆن ناتوانێ زیندووی بكاتەوە؟ ئەو ڕاستییەش كە خوا ئێمەی چۆن خوڵقاندوە؟ لە زۆر شوێنی قورئان دا هاتوە، بەڵام لەسەرەتای سوورەتی (المؤمنون)دا لە هەمووی بە تەفسیلتر هاتوە، حەوت قۆناغەكان هاتوون، هەروەها لە سوورەتی (الحج)دا هاتوەو، لێرەش دا هاتوەو، لە سوورەتی (الطارق)یش دا هاتوە: ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ٥ خُلِقَ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ ٦ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ٧ ﴾**الطارق**، هەروەها لە سوورەتی (الذاريات)دا: ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ ﴾**الذاريات**، چونكە بەڕاستیی دروستبوونی مرۆڤ بەو قۆناغانەدا، یەكجار شتێكی مەزن و سەرسوڕهێنەرەو، نەك هەر موعجیزەیە، بەڵكو چەندان موعجیزەی تێدان.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**خوا زەوی کردوە بە بە خۆوەنووسێنەری مرۆڤان، بە زیندوویی و بە مردوویی، هەروەها چیا سەرکەشەکانی تێدا داناون و، ئاوێکی زوڵاڵیشی پێ نۆشکردوون، بۆیە بەدرۆدانەرانی پەیام و دیداری خوا، شایستەی سزای سەخت و دژوارن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحۡيَآءً وَأَمۡوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ شَٰمِخَٰتٍ وَأَسۡقَيۡنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيۡلٌ يَوۡمَئِذٍ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج برگەدا:

**١)-** ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا﴾، ئایا زەویمان نەکردوە بە بەخۆوە نووسێنەر؟ واتە: (**أَلَمْ نَجْعَل الْأَرْض ضَامَّةً**)، یانی: ئایا زەویمان وا لێ نەکردوە بەخۆیتانەوە بنووسێنێ و، بەلای خۆیدا کێشتان بکات؟.

**٢)-** ﴿أَحۡيَآءً وَأَمۡوَٰتًا﴾، زیندووان و مردووان، یانی: هەم زیندووانتان بەخۆوەی دەنووسێنێ و، بەخۆیتانەوە شەتەك دەدا، وەك لە باوەشتان بگرێ، ڕاتان دەکێشێ بۆ لای خۆی، (**وَأمْوَاتًا**) هەروەها مردووەکانیش کە دەخرێنە نێوی، (**الطبري**) دەڵێ: (**أَلَمْ نَجْعَل الْأَرْض كِفَات أَحْيَائِكُمْ وَأَمْوَاتكُمْ ، تَكْفِت أَحْيَاءَكُمْ فِي الْمَسَاكِن وَالْمَنَازِل، فَتَضُمّهُمْ فِيهَا وَتَجْمَعهُمْ، وَأَمْوَاتكُمْ فِي بُطُونهَا فِي الْقُبُور، فَيُدْفَنُونَ فِيهَا**).

بەڕاستیی جوانی مانا کردوە!

واتە: ئایا زەویمان نەکردوە بە بەخۆوە نووسێنەری زیندووەکان و مردووەکانتان، زیندووەکانتان لە خانووبەرەکان و جێگاو ڕێگەیەکانی خۆیان دا، ڕادەکێشێ و بەخۆیانەوە دەنووسێنێ و کۆیان دەکاتەوە، مردووەکانیشتان لە سکی و نێو هەناوی دا، هەڵدەگرێ و، لە گۆڕەکاندا کە تێیاندا دەشاردرێنەوە.

٣)- ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ﴾، هەروەها لە زەویدا چەسپاوە سەرکەشەکانمان داناون، (رَوَاسِي) وەك پێشتریش گوترا: سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێندراوە، واتە: (جِبَالًا رَوَاسِي) چیایە چەسپاوەکان، چونکە (رَوَاسِي) کۆی (رَاسِي)یە، واتە: چەسپاو (ثَابِت)، کە سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێندراوە، کە دەزانرێ، چەسپێندراوەکان لە زەوی دا، کە بەرز هەڵچوون، هەموو کەس دەزانێ مەبەست پێی چیایەکانن، (**شَامِخَات: مُشْرِفَات أو بَازِغَات** أو **شَاهِقَات**) واتە: ئەو چیایانەی بەسەردا دەڕوانن، یان ئەو چیایانەی بەرز هەڵچوون، یان سەرکەشن.

٤)- ﴿وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاءً فُرَاتًا﴾، هەروەها ئاوێکی شیرین و زوڵاڵمان پێتان نۆشکردوە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ بە ژمارە: (٣٦٠٦٦)، (**الطبري**) لێیەوە هێناوە گوتوویەتی: (**فُرَاتاً: عَذْباً**)، ئاوێکی زوڵاڵ، شیرین، کە لە گەروو گیرنابێ.

٥)- ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران، (**الطبري**) دەڵێ: (**وَيْلٌ لِلْمُكَذِّبِينَ بِهَذِهِ النِّعَم الَّتِي أَنْعَمْتهَا عَلَيْكُمْ، مِنْ خَلْقِي الكَافِرِيْنَ بِهَا**)، واتە: سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەرانی ئەو چاکانەی من لەگەڵ ئێوەم دا کردوون، لە دروستکراوەکانم، ئەوانەی پێیان سپڵەن، پێیان بێبڕوان.

# چوار کورتە سەرنج

**سەرنجی یەکەم:** (**كَفَتَ يَكْفُتُ كَفْتاً: ضَمَّ يَضُم ضَمّاً، وَجَذَبَ يَجْذُبُ جَذْباً، وَجَمَعَ يَجْمَعُ جَمْعَاً**)، کە دەفەرمویّ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا﴾، (**كِفَات**) یانی: بەخۆیەوە نووساند، بەخۆیەوە دەنووسێنێ، بە خۆوە نووساندن، دیسان: ڕایکێشا، ڕایدەکێشێ، ڕاکێشان، هەروەها: کۆیکردەوە، کۆیدەکاتەوە، کۆکردنەوە، هەر سێ واتایەکەی هەن، کەواتە: ئەمە ئاماژەیەکی زۆر ئاشکرایە بۆ هێزی ڕاکێشان (**قوة الجاذبية**)ی کە لە زەوی دا هەیەو، ئەندازەی ڕاکێشانی زەوی، بریتیە لە یەك کیلۆگرام بۆ هەر سانتیمەتر دووجایەك، واتە: پانتایی یەك سانتیمەتر دووجا، قورسایی یەك کیلۆگرامی لەسەرە، بۆ وێنە: مانگ هێزی ڕاکێشانی بریتیە لە هی یەك لەسەر پێنج (٥/١)ی زەوی واتە: شتێك لەسەر زەوی پێنج کیلۆ بێ لەسەر مانگ یەك کیلۆیە، یان کەمتریشە، بۆیەش ئەو ئەندازە ڕاکێشانەی زەوی بۆ شتەکانی کە لەسەرنی، ئێمە هەستی پێ ناکەین، بەڵام کە شتێك هەڵدەدەی یەکسەر دەکەوێتەوە خوارو دیارە زەوی ڕایدەکێشێ، (ئیسحاق نیوتن)یش کاتی خۆی سێوێکی بینی لە درەختێك کەوتۆتە خوارێ و کەوتۆتە نێو کانییەکە، لەوەوە پرسیاری بۆ دروست بوو: ئەم سێوە بۆچی ناچێتە سەرو دێتە خوار؟ لەوەوە پەی بە هێزی ڕاکێشان برد، دواییش دەرکەوت: هێزی ڕاکێشان نەك هەر لە زەوی دا هەیە، بەڵکو هەموو گەردوونی بەیەکەوە بەستۆتەوەو، سووڕانەوەی مانگ بە دەوری زەویداو، زەوی بە دەوری خۆرداو، خۆر بە دەوری شتێکی دیکەدا، هەمووی بە هۆی هێزی ڕاکێشانەوەیە، ئنجا ڕاکێشانەکەش ئەگەر بەس ڕاکێشان بووایە، هەموویانی پێکەوە دەنووساند، بەڵام لەگەڵ ڕاکێشاندا، پاڵپێوەنان (**دَفْع**)یش هەیە، بۆ وێنە: کە زەوی مانگ ڕادەکێشێ، مانگیش زەوی پاڵ پێوەدەنێ، ئنجا لە ئەنجامی ڕاکێشانی زەوی بۆ مانگ و، پاڵپێوەنانی مانگدا

بـۆ زەوی، خولانـەوەی مانـگ بـە دەوری زەویـدا پەیـدا دەبـێ، هەروەهـا زەوی و خۆریـش بـە هەمـان شـێوەو، خـۆرو ئەوانـەی دیکـەش بـە هەمـان شـێوە.

ئەمـەش ئیعجازێـکی عیلمییـە، خـوا ﷻ ئامـاژەی پێکـردوە کـە ئێـوەی مـرۆڤ، چ لـە ژیـان دابـن چ مردووبـن، زەوی بـە خۆیتانـەوە دەگووشـێ و بـەلای خۆیتـان دا ڕادەکێشـێ.

**سـەرنجی دووەم:** چیایـە بـەرزەکان خـوا ناوی لێنـاون: (**رَوَاسِي**) واتە: چەسـپاوەکان، چونکـە زانایـانی زەویناسـیی بۆیـان دەرکەوتـوە، بـە مەزەنـدە - مەزەندەکانیـش جیاجیـان - لـە هەنـدێ سـەرچاوان دا دەڵـێ: هـەر چیایـەك چەنـدەی بە دەرەوەیە، چەنـد هێنـدەی لـە زەوی دایـە، سـێ چـوار هێنـدەی لـە زەوی دایـە، بەڵام لـە هەندێ سـەرچاوەی دیکـەدا بینیومـە کـە: دە تاکـو پـازدە (١٠ - ١٥) هێنـدەی لـە زەوی دایـە، بـۆ وێنـە: بەرزتریـن چیـا لـە دنیـادا، چیـای هیمالایایـەو بەرزتریـن لووتکـەی ئـەو چیایـەش لووتکـەی ئیڤریسـتە، کـە هەشـت هـەزارو هەشتسـەدو شەسـت و چـوار (٨٨٦٤) مەتـر بـەرزە، واتـە: دەوری نـۆ کیلۆمەتـر لـە ئاسـتی دەریـاوە، ئنجـا ئەگـەر نـۆ کیلۆمەتـر بـەرز بـێ، نـۆ جـارانی دە، یـان جـارانی پـازدە بکـە (٩×١٠ = ٩٠کلـم) یـان: (٩ × ١٥= ١٣٥کلـم)، هێنـدەشی لـە زەوی دایـە، بۆیـە خـوا نـاوی لـە چیایـەکان نـاوە: (**رَوَاسِي**) چەسـپاوەکان.

**سـەرنجی سـێیەم:** کانیـی و سـەرچاوەو ڕووبـارەکانی ئـاوی شـیرین، یەکسـەر پەیوەسـتن بـە چیایەکانـەوە، هەمیشـە لـە قورئانـدا خـوا کـە بـاسی چیایـەکانی کردبـێ، بـاسی ئـاوی شـیرین و زوڵاڵ و جۆگـەو جۆبـارو کانیـی و سـەرچاوەکانیشی کـردوە، لێـرەش دوای ئـەوەی دەفەرمـوێ: ﴿ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ ﴾، یەکسـەر دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاءً فُرَاتًا ﴾، ئاوێـکی شـیرین و زوڵاڵیشـمان پێتـان نۆشـکردوە، چونکـە پێشـتر باسـمان کـرد ئـاوی شـیرینمان چـۆن دەسـت دەکـەوێ؟ لـە ئەسـڵدا ئـاو هەمـووی سـوێرە، ئـاوی زەریایـەکان هەمـووی سـوێرەو ئەندازەیـەکی کـەم ئـاوی

شیرین هەیە، ئەو ئاوە شیرینەش لە ئەنجامی ئەوەدا پەیدادەبێ کە تیشکی خۆر لە ئاوی ئۆقیانووس و زەریایەکان دەدات و هەڵم پەیدادەبێ، هەڵمەکەش با دەیهێنێ بۆ شوێنە ساردەکان و هەور دروست دەبن، ئینجا ئەگەر هەورەکانئنجا ئەگەر متوربە بوون، بەشێوەی بەفرو باران و تەرزە ئەو ئاوە دێتەخوارو، ماددە سوێرو تفت و تاڵەکەی لە دەریاو زەریاکەدا بەجێهێشتوە، ئەوەی کراوە بە هەڵم، ئاوە شیرین و زوڵاڵەکەیەو، ئێمە ئاوی شیرینمان لە ئەنجامی ئەوەدا دەست دەکەوێ، سەرچاوەی ئاوی شیرینیش چیایە بەرزو سەرکەشەکانن، تاکو بەرزتر بن، شوێنی ساردتریان هەیەو، بەفرو باران و تەرزەیان زیاتر لێ دەبارێ، ئەو بەفرو باران و تەرزەیەش کۆدەبێتەوە لە عەمبارەکانی ئەو چیایانەداو، دوایی بە شێوەی کانیی و سەرچاوە، یاخود بیرو کارێز سەر دەردێنێتەوە، کەواتە: ئاوی شیرین لەگەڵ چیایەکاندا، هەمیشە پێکەوە پەیوەستن.

سەرنجی چوارەم:

تیرە (**قطر**)ی زەوی[١] (١٢،٧٤٢) کیلۆ مەترەو نیوە تیرەکەی: (٦٧٢٢) کیلۆمەترەو، بەرزترین لووتکەی چیا کە (ئیڤریست)ە لە چیای (هیمالایا) بڵیندییەکەی: (٨٨٦٤) مەترە، واتە: نیزیکەی نۆ (٩) کیلۆمەترەو قووڵترین ئۆقیانووسیش دەوری یازدە کیلۆمەتر (١١،٠٠٠) مەتر قووڵەو، بەرزیی ئیڤریست و قووڵی ئۆقیانووسەکە دەکاتە: دەوری بیست (٢٠) کیلۆمەتر، ئنجا ئەو بیست کیلۆمەترەش دەکاتە: (٠،٣٪) کۆی تیرەی زەوی کەواتە:

ئەستووریی توێکڵی زەویی بە قووڵایی ئۆقیانووس و بەرزیی چیایەکانەوە بریتیە لە: ٣/١٠٠٠ی کۆی تیرەی زەوی و توێکڵەکە هەمووی بیست (٢٠) کیلۆمەترەو تیرەی زەویش جگە لەو بیست کیلۆمەترە، بریتیە لە: ١٢٧٤٢ کلم - ٢٠ کلم= ١٢٧٢٢ کلم!

(١) بڕوانە: (الأرض في القرآن الكريم) الدكتور زغلول راغب محمد النجار، ص٢٢٥ – ٢٢٦، ط الثانية: ٢٠٠٦م.

کەواتـە: قەبـارەی زەوی یەکجـار گەورەیـە بـە بـەراورد لەگەڵ قووڵتریـن ئۆقیانووس و بەرزتریـن چیاش!

کێشی زەوییش بە: ٦,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ ($٦^{١٨}$) تەن مەزەننە کراوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە (٢٢) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (**المرسـلات**) پێـك دێ، کـە هەموویـان بـاسی ڕۆژی دوایـی بـە گشـتیی و، سـزای بـەدرۆ دانـەرانی ڕۆژی دوایـی و، پەروەردگارێتیـی و، تەنیـا پەرسـتراوێتیی خـواو، پێغەمبەرایەتیـی پێغەمبـەران (**علیهـم السـلام**) و، پاداشـتی چاکـەکارانی بـڕوادار لەلایـەکی دیکـەوەو، سـزاو جەزرەبـەی بەدرۆدانـەران و خراپـەکاران، دەکـەن، لـە چەنـد دیمەنێـکی دڵبزوێـن دا، تیشـکێکی بـاش خراوەتـە سـەر هـەر کامیـان، هـەم سـزاو جەزرەبـەی بێبـڕواو بەدرۆدانـەران و، هـەم پاداشـتی چاکـەکاران و پارێـزکاران و بـڕواداران.

لـە کۆتاییشـدا سەرزەنشـتێکی بـاشی تاوانبـاران کـراوە، لەسـەر ملکـەچ نەبوونیـان بـۆ خـواو، بـڕوا نەهێنانیـان بـە کۆتـا فەرمایشـتی خـوا کـە قوڕئانـە.

﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٖ وَلَا يُغۡنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرۡمِي بِشَرَرٖ كَٱلۡقَصۡرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٞ صُفۡرٞ ﴿٣٣﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾ هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِۖ جَمَعۡنَٰكُمۡ وَٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمۡ كَيۡدٞ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجۡرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرۡكَعُواْ لَا يَرۡكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(لەو ڕۆژەدا بە بێبڕواو تاوانبارەکان دەگوترێ:) دەرپەڕن بەخێرایی بچن بەرەو لای ئەو (سزای)ەی بە درۆتان دادەنا ﴿٢٩﴾ بەرەو لای سێبەرێکی (دووکەڵی) خاوەن سێ لا، دەرپەڕن ﴿٣٠﴾ نە سێبەراوییەو نە (مرۆڤ) لە گڕو کڵپە (ی ئاگر) دەپارێزێ ﴿٣١﴾ ئەو (ئاگری دۆزەخ)ە، بڵێسە (ئاگر)ان فڕێ دەدات هێندەی کۆشکانن ﴿٣٢﴾ (بڵێسەکان) وەك ڕەوە حوشتری زەردن ﴿٣٣﴾ سزای سەخت و دژوار لەو ڕۆژەدا بۆ بەدرۆدانەران (ی سزای خوا) ﴿٣٤﴾ ئەوە ڕۆژێکە (بێبڕوایان) تێیدا نادوێن ﴿٣٥﴾ مۆڵەتیشیان نادرێ پۆزش بهێننەوە ﴿٣٦﴾ لەو ڕۆژەدا سزای بێڕەزا بۆ بەدرۆدانەران (ی ڕۆژی قیامەت) ﴿٣٧﴾ ئەمە ڕۆژی لێك هەڵاواردنە (ئەی بێبڕواینە!) ئێوەو (کۆمەڵگا بێبڕوا) پێشووەکانمان کۆکردوونەوە ﴿٣٨﴾ ئنجا ئەگەر پیلانێکتان هەیە (و شتێکتان لە دژم لە دەست دێ) پیلانم لە دژ بگێڕن ﴿٣٩﴾ سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ بەدرۆدانەران (ی سزاو پاداشتی خوا) ﴿٤٠﴾ بێگومان پارێزکاران لە نێو سێبەران و کانیی و سەرچاوان دان ﴿٤١﴾ هەروەها میوە (جۆراوجۆرە)کان لەوەی ئارەزووی دەکەن ﴿٤٢﴾ (پێیان دەگوترێ:) بخۆن و بخۆنەوە بە ئاسوودەیی و بێ گرفت، بەهۆی ئەوەوە کە (لە ژیانی دنیادا) دەتانکرد (لە کردەوەی باش) ﴿٤٣﴾ ئێمە بەو جۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿٤٤﴾ لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و بێڕەزا بۆ بەدرۆدانەران (ی سزای خوا) ﴿٤٥﴾ (ئەی بێبڕواینە!) بخۆن و ڕابوێرن بەڕاستیی ئێوە تاوانبارن (و سزاو جەزرەبەتان چاوەڕێیە) ﴿٤٦﴾ لەو ڕۆژەدا سزای دژوارو گران بۆ بەدرۆدانەران (ی سزاو تۆڵەی خوا) ﴿٤٧﴾ ئەگەر پێشیان بگوترێ: ڕکووع ببەن (بۆ خوا ملکەچ بن) ڕکووع نابەن (گەردنکەچ نابن) ﴿٤٨﴾ لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و بێڕەزا بۆ بەدرۆدانەران (ی پەیامی خوا) ﴿٤٩﴾ ئنجا ئایا (ئەگەر بڕوا بەم قورئانە نەهێنن) دوای وی بڕوا بە چ فەرمایشتێك دێنن؟! ﴿٥٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱنطَلِقُوٓاْ): بەخێرایی بچن، (إنْطَلَقَ: انْحَلَّ، ذَهَبَ، مَرَّ سَرِيْعَاً لَا يَلْوِي عَلَى شَيءٍ)، (إنْطَلَق) واتە: ئازادبووو، بەرهەڵدابوو، ڕۆیشت، بەخێرایی ڕۆیی، بە جۆرێك ڕۆیی ئاوڕ لە هیچ شتێك نەداوەتەوە، بۆیە (إنْطَلِقُوا) کە فەرمانە لە (إنْطَلَق)ەوە هاتوە، بە (دەرپەڕن) مانام لێکداوەتەوە، چونکە (إنْطِلَاق) ئەوەیە شتێك حەپس کرابێ و ڕاگیرابێ، دوایی ڕێی درابێ و بەخێرایی بڕوا، کە لە کوردییدا ئەوە دەرپەڕینی پێ دەڵێن، یانی: بە شێوەیەك کە ڕێك لە شوێنی خۆیەوە بە خێرایی بڕوا.

(شُعَبٍ): (إسْمُ جَمْعِ شُعْبَة: الفَرِيْقُ مِنَ الشَّيءِ وَالطَّائِفَةُ مِنْهُ، ذِي ثَلَاثِ شُعَب: ذِي ثَلَاثِ طَوَائِف)، (شُعَب): ناوی کۆی (شُعْبَة)یە، (شُعْبَة) یانی: بەشێك لە شتێك، کۆمەڵێك لە شتێك، کەواتە کە دەفەرموێ: ﴿ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ﴾، واتە: سێبەرێکی خاوەن سێ بەش و، سێ لقی لێبوونەوە.

(ظَلِيلٖ): (القَوِيُّ فِي ظِلَالِه، اشْتُقَّ لَهُ وَصْفٌ مِنْ اسْمِهِ، لإفَادَةِ كَمَالِهِ فِيْمَا يُرَادُ مِنْهُ، مِثْلُ: لَيْلٌ أَلْيَل، وَشِعْرٌ شَاعِر)، (ظَلِيْل) ئەوەیە سێبەرەکەی زۆر بەهێز بێ، وەسفێکی لە ناوەکەی خۆی بۆ داتاشراوە، تاکو مانای تەواوی ئەوەی لێی ویستراوە، بیگەیەنێ، وەك دەگوترێ: (لَيْلٌ أَلْيَل)، شەوێکی شەو، (وَشِعْرٌ شَاعِر) شعرێکی شیعر، لە زمانی کوردییش دا ئەوە هەر هەیە، دەگوترێ: سارده بەڵام سارد، یان گەرمە بەڵام گەرم، یان پیاوێکی پیاو.

(وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ): بڵێسە دوورناخاتەوە، یان لە بڵێسە سوودیان پێ ناگەیەنێ، (الإغْنَاء: جَعْلُ الغَيْرِ غَنِيَّاً أي: غَيْرُ مُحْتَاج فِي ذَلِكَ الغَرَض)، (إغْنَاء): ئەوەیە ئەوی دیکە بێ نیاز بکرێ، واتە: وای لێبکەی لەو مەبەستەدا ئاتاج نەبێ،

(اللَّهَب: مَا يَرْتَفِعُ مِنَ النَّارِ كَأَنَّهُ لِسَان) ئەوەی لە ئاگر بەرزدەبێتەوە، بە کوردیی دەڵێن: زمانەی ئاگر، بڵێسە، (النَّار المتَوَهِّجَة) ئاگرێکی کڵپە سەندوو، کە لێرەدا دەفەرموێ: (وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ) واتە: ئەو سێبەرە لەو ئاگرە کڵپە سەندوویە، سوودیان پێناگەیەنێ، چونکە سێبەرەکە هی دووکەڵە.

(بِشَرَرٍ): (الشَّرَرُ: اسْمُ جَمْعِ شَرَرَة: القِطْعَةُ المُشْتَعِلَة يَدْفَعُهَا لَهَبُ النَّارِ فِي الهَوَاء)، (شَرَر): ناوی کۆی (شَرَرَة)یە، (شَرَرة) پارچە ئاگرێکی داگیرساوە، بڵێسەی ئاگر فڕێی دەدات بە هەوادا، ئاگر ئەگەر زۆر بێڕەزاو گەورە بێ، بڵێسە ئاگر فڕێ دەدات، هەر لە ئەنجامی ئەوەش دا، ئاگر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگوازرێتەوە، چونکە ئاگرەکە کە زۆر بەهێزە و پارچە فڕێ دەدات،سەرەنجام بڵێسە ئاگر لە شوێنێکەوە دەڕوا بۆ شوێنێکی دیکەو، ئاگرەکە بەو شێوەیە تەشەنە دەکات و دەتەنێتەوە.

(كَٱلْقَصْرِ): (القَصْرُ: البِنَاءُ العَالِي، وَالقَصْرُ: القُصُور)، (قَصْر): بە کۆشك و خانووی بەرز دەگوترێ، ئنجا مادام (أل)ی ناساندنی لەسەرە، مەبەست پێی جینسە واتە: کۆشکەکان.

(جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ): بە (جِمَالَات)یش خوێندراوەتەوە، (جِمَالات: جَمْعُ جِمَالَة، وَهِيَ اسْمُ جَمْعِ طَائِفَةٍ مِنَ الجِمَال)، (جِمَالَاتٌ صُفْر) کۆی (جِمَالَة)یەو، ئەویش ناوی کۆیە بۆ کۆمەڵێك لە حوشتران، (جَمَل) واتە: حوشترو (جِمَال) کۆیەکەیەتی، (جِمَالَة)ش کۆی کۆیە، (جِمَالَات)یش دەبێتە کۆی کۆی کۆ.

بێگومان: (جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ) دەبێتە سیفەت بۆ ئەو ئاگرە، وەك ڕەوە حوشترێکی زەرد، یان ڕەوە حوشترێکی ڕەش، کە دەڕۆن ئەو ئاگرە ئاوا بڵێسە دەستێنێ، (صُفْرٌ) یش کۆی (أصْفَر)ە واتە: زەرد، مادام (جِمَال) کۆیە دەبێ سیفەتەکەشی کۆ بێ (جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ) واتە: حوشترانی زەرد.

(**هَنِيٓـًٔا**): (**هَنَأَ الطَّعَامُ الرَّجُلَ: سَاغَ وَلَذَّ لَهُ، وَهَنَأَ لَهُ الطَّعَام: سَاغَ وَلَذَّ لَهُ**)، (**هَنَأَ الطَّعَامُ الرَّجُلَ**) پیاوەکە خواردنەکەی، وەگیانی کەوت، یان لەززەتی لێکرد، پێی خۆشبوو، بە ئاسانیی لە گەرووی چۆتەخوار، (**وَهَنَأَ لَهُ الطَّعَامَ**) دیسان هەمان مانای هەیە واتە: خواردنەکەی پێخۆش بوو، بە ئاسانیی لە گەرووی چووە خوار، لە کوردەواریی دا دەڵێن: نۆشی گیانت بێ، (**هَنِيْئاً لَكَ**) واتە: ئەو خواردنە بە ئاسانیی لە گەرووت بچێتە خوارو، دواییش دەرهاویشتەی خراپی نەبێ، کە پێی نەخۆش و نەساغ بێ.

(**وَتَمَتَّعُواْ**): (**المَتَاعُ: كُلُّ مَا يُنْتَفَعُ بِهِ، تَمَتَّعَ بِكَذَا: دَامَ لَهُ مَا يَسْتَمِدُّهُ مِنْهُ**)، (**مَتَاع**): هەر شتێکە بەهرەی لێ وەربگیرێ، (**تَمَتَّع بِكَذَا**) واتە: بەهرە وەرگرتنی لەو شتەی بۆ بەردەوام بوو، کەواتە: (**تَمَتَّعُوْا**) واتە: بەهرە وەربگرن، ڕابوێرن، چێژ وەربگرن.

(**ٱرْكَعُواْ**): بچنە ڕکووع، (**رَكَعَ: انْحَنَى، سَوَاءٌ مَسَّتْ رُكْبَتَاهُ الأَرْضَ أَمْ لاَ**)، (**رَكَعَ**): یانی: چەمایەوە، ئنجا چ ئەژنۆیەکانی بگەنە زەوی، چ نەگەنە زەوی، ئەگەر بگەنە زەوی پێی دەگوترێ: (**سُجُود**): کڕنووش، ئەگەر نەشگەنە زەوی، هەر چەمانەوەی پێ دەڵێن، کەواتە: (**رُكُوع**) بە مانای (**سَجْدَة**)ش دێ، (**رُكُوع**) واتە: چەمانەوە بێ ئەوەی ئەژنۆیەکانی بگەنە زەوی، ئەگەر ئەژنۆیەکانیش بگەنە زەوی هەر وشەی (**رُكُوع**)ی بۆ بەکاردەهێنرێ، بەڵام (**سُجُود**) لە زاراوەی شەرعییدا تەنیا حاڵەتێکە مرۆڤ نێو چاوان و هەردوو لەپی دەست و هەردوو ئەژنۆی هەردوو پێیەکانی واتە: هەر حەوت ئەندامەکەی لەسەر زەوی بن، ئەگەرنا (**سُجُود**)یش لە ڕووی زمانەوانییەوە بە مانای چەمینەوەو نوشتانەوەو، بە مانای سڵاو لێکردنیش دێ، (**ارْكَعُوا**) وەك چۆن ئەو مانا ڕواڵەتییەی هەیە، مانای مەعنەوییشی هەیە، واتە: ملکەچ بوو، خۆی بە کەم گرت، هەروەك (**رُكُوع**) بە مانای ڕکووعی نێو نوێژیش بەکاردێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

خـوا پـەروەردگار لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، ڕوو دەکاتـە بێبـڕوا بـە درۆدانـەرەکان، ئایـا چییـان بـە درۆ دانـاوە؟ ڕۆژی دوایـی بـە تایبـەت، چونکـە ئـەم سـوورەتە بـە زۆریـی بـاسی ڕۆژی دواییـە، بـە هـەردوو قۆناغـی ئاخیـر زەمـان و، زیندووکرانـەوەو سـزاو پاداشـت دانـەوەوە.

هەروەهـا پێغەمبـەری خوایـان بـە درۆ دانـاوەو، فەرمایشـتی خوایـان بـە درۆ

دانـاوەو، پەیامـی خوایـان بـە گشـتیی بـە درۆ دانـاوە، دەفەرمـوێ: ﴿ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾ دەرپـەڕن بـڕۆن بـەرەو ئـەوەی بـە درۆتـان دادەنـا، ﴿ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٍ ﴾، دەرپـەڕن بـە خێرایـی بـڕۆن بـەرەو سـێبەرێکی خـاوەن سـێ لا، (**شُـعَب**) کـۆی (**شُـعْبَة**)یەو، بـە بەشـێك لـە شـتێك، یـان لقێـك لـە شـتێك، یـان کۆمەڵێـك لـە شـتێك، دەگوتـرێ، واتـە: ئـەو سـێبەرە هێنـدە گەورەیـە، بۆتـە سـێ بـەش، کـە سـێبەرەکەش هـی دووکەڵـە، وەك لـە سـوورەتی (**الواقعـة**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتـە: سـێبەرێك لـە دووکـەڵ، ئنجـا هـەر دووکەڵێکیـش نـا، بەڵکـو دووکەڵێـکی ڕەش، دووکـەڵ هەیـە ڕەنگـە مەیلـەو بـۆر بـێ، بـەڵام ئـەو دووکەڵـەی لـە سـوورەتی (**الواقعـة**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ ﴾**الواقعـة**، واتـە: (**مِـنْ دُخَـانٍ أَسْـوَد**) لـە دووکەڵێـکی ڕەش.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: بەخێرایـی بچـن، دەرپـەڕن بـەرەو سـێبەرێکی خـاوەن سـێ بـەش، سـێ لا، ﴿ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ﴾، ئـەو سـێبەرە نـە فێنکایەتیـی تێدایـە، نـە سـوود دەگەیەنـێ لـە بڵێسـەی ئاگـر، واتـە: ئـەوە نیـە فێنکایەتیـی تێدابـێ و مـرۆڤ لـە ژێریـدا بتوانـێ پشـوو بـدات، یاخـود گەرمایـی بڵێسـەی ئاگـر لـە مـرۆڤ دوور بخاتـەوە.

﴿ إِنَّهَا تَرۡمِي بِشَرَرٖ كَٱلۡقَصۡرِ ﴾، ئـەو ئاگـرەی دۆزەخ، پارچـە ئاگـران، بڵێسـان فـڕێ دەدات، (**كَالْقَصْر**) وەك کۆشـكان وان، وەك خانـووی بـەرز وان، ﴿ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٞ صُفۡرٞ ﴾، ئـەو پارچانـەی فڕێیـان دەدات، بـە دوای یـەك دا دێـن و وەك ڕەوە حوشـتری زەرد وان، هەندێکیـش گوتوویانـە: (**صُفْرٌ**) هەرچەنـدە کـۆی (**أصْفَـر**)ە‌و بـە ڕواڵـەت یـانی: حوشـترە زەردەکان، کۆمەڵێـك حوشـتری زەرد، بـەڵام عـەرەب وشـەی (**صُفْرٌ**)یـان بەکارهێنـاوە بـە مانـای (**سـود**) کـە (**صُفْـر**) کـۆی (**أصفـر**) و (**سـود**)یش کـۆی (**أسـود**)ە، واتـە: حوشـترە ڕەشـەکان.

وشـەی (**جِمَالَـة**) خوێندراویشـەتەوە: (**جِـمَالَات**)، (**جِـمَالَات**) کـۆی (**جِمَالَة**)یـەو، ئەویـش کـۆی (**جِـمَال**)ە، واتـە: حوشـترەکان، کـە کـۆی (**جَمَـلْ**)ە، (**جِمَالَـة**) واتـە: کۆمەڵێـك حوشـتر، ئەگـەر (**جِمَالَات**)یـش بـێ، دەبێتـە کـۆی کـۆی کـۆ.

﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لـەو ڕۆژەدا سـزای سـەخت بـۆ درۆدانـەران، واتـە: بەدرۆدانـەرانی سـزاو پاداشـتێك کـە خـوا دایـناون بـۆ بێبڕوایـانی خراپـەکارو، بـڕوادارانی چاکـەکار.

﴿ هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ ﴾، ئەمـڕۆ ڕۆژێکـە تێیـدا نادوێـن، قسـە ناکـەن، ﴿ وَلَا يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ ﴾، مۆڵەتیشـیان نـادرێ، پـۆزش بێننـەوە، ئنجا لێـرەدا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ ﴾، ئەمـڕۆ ڕۆژێکـە گـۆ ناکـەن، قسـە ناکـەن، نابێـژن، نادوێـن، ئـەدی چـۆن خـوا ﷻ لـە شـوێنی دیکـە قسـەکردنیان لـێ دەگێڕێتـەوە لـە بێبڕوایـەکان؟ دوایـی باسـی دەکەیـن کـە ڕۆژی دوایـی، قۆنـاغ قۆناغـە، لـە قۆناغێکـدا نادوێـن و لـە قۆناغێکـدا دەدوێـن، لـە قۆناغێکـدا پرسـیار ناکـەن و، لـە قۆناغێکـدا پرسـیار دەکـەن، خـوا ﷻ کـە بـە تەعبیـری جـۆراو جـۆر بـاسی ئـەو ڕۆژە دەکات، لەبـەر ئەوەیـە کـە دیمـەنی جـۆراو جـۆرو حاڵـەت و قۆناغـی جۆراوجـۆری تێـدان و، یـەك شـت نیـە، تاکـو بـە یـەك وەسـف، پێناسـە بکـرێ، بەڵکـو ڕۆژێکـە ڕووداوی زۆری تێـدان و، قۆناغـی زۆری تێـدان، وەك عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ) کاتێـك لـەو بـارەوە پرسـیاری لێکـراوە، ئـاوای گوتـوە.

هەروەها کە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴾، مۆڵەتیشیان نادرێ پۆزش بێننەوە، ئەمیش دیسان لە هەندێك مەقامدا خوای پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوە: ﴿ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ﴾ **غافر**، واتە: دانمان نا بە گوناحەکانی خۆمان دا، ئایا هیچ ڕێ هەیە بۆ دەرچوون؟ لەوێ دان بە هەڵەی خۆیاندا دێنن و، ئەوەش جۆرێکە لە پۆزش هێنانەوە، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، ئەوان لە دۆزەخ دا، دان بە هەڵەی خۆیاندا دێنن!

لێرەش خوا دەفەرمووێ: مۆڵەت نادرێن لە کاتی سزاو پاداشت دانەوەدا، پۆزش بێننەوە، یاخود: مۆڵەت نادرێن پۆزشێك بهێننەوە، کە ببێتە هۆی دەربازبوونیان، ئەوەش پۆزشێکە دوای ئەوەی چوونە نێو دۆزەخەوە، پۆزش دێننەوەو دەپاڕێنەوەو داوا دەکەن، ئەوەش بایی فلسێکەو، پۆزشێك نیە بەهرەی لێوەربگرن و، دادێکیان بداو سوودێکیان پێ بگەیەنێ.

﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و بێڕەزا بۆ بەدرۆدانەران، واتە: بەدرۆدانەرانی ڕۆژی دوایی، بەدرۆدانەرانی پەیامی خواو، پێغەمبەری خوا ﷺ.

﴿ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ۖ جَمَعْنَٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ ﴾، ئەمڕۆ ڕۆژی لێکهەڵاواردن و لێك جیاکردنەوەیە، ئێوەو پێشووەکانمان هەمووتان پێکەوە کۆکردوونەوە، لێرەدا ڕووی دواندن لە بێبڕوایەکانی ئۆممەتی پێغەمبەرە ﷺ واتە: ئەوانەی لەسەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ حیسابن! بەڵام بێبڕوان، چونکە مرۆڤایەتیی دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، هەمووی لەسەر میلاکی ویە، واتە: هەموو مرۆڤایەتیی بە ئۆممەتی موحەممەد ﷺ دادەنرێ، و ئەویش دوو جۆرە:

أ- ئۆممەتی وەڵامدەرەوە، کە بڕوادارانن و وەڵامی پێغەمبەریان ﷺ داوەتەوەو بە دەم بانگەوازەکەیەوە هاتوون و بڕوایان پێهێناوە.

ب- ئۆممەتی وەڵام نەدەرەوە، کە بریتین لە هەموو ئەوانەی پەیامی پێغەمبەری خاتەمیان ﷺ پێگەیشتوە، بەڵام وەڵامیان نەداوەتەوەو بڕوایان پێنەهێناوە، ئنجا لێرە

کە دەفەرمویٚ: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ ۖ جَمَعْنَاكُمْ ﴾، ڕاناوی ئێوە (کُم) دەچێتەوە بۆ تێکڕای مرۆڤە دوێنراوەکان بە هەردووك جۆرەکەیانەوە، هەموو ئەوانەی کەوتوونە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، ﴿ وَالْأَوَّلِينَ ﴾، پێشووەکانیش، یانی: بێبڕوایانی ئۆممەتانی پێشوومان، هەمووتان پێکەوە کۆ کردوونەوە، ﴿ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴾، ئنجا ئەگەر پیلانێك و فێڵێکتان هەیە، تەگبیرێکتان لە دەست دێ، پیلانم لە دژ بگێڕن، نەخشەیەك لە دژی من دا بنێن، ئایا هیچتان لە دەست دێ؟ ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و بێڕەزا بۆ بەدرۆدانەران (ی پەیامی خواو، پێغەمبەرانی خواو، دیداری خوا)، ئەمە باسی سزای بێبڕوایان بوو، ئەو ئازارو سزایەی چاوەڕێیان دەکات، لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی دواییە، تووشی چ نەهامەتیی و مەینەتییەك دێن!!.

ئنجا دێتە سەر باسی پاداشتی پارێزکاران، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ ﴾، بە دڵنیایی پارێزکاران، ئەوانەی لە دنیادا خۆیان پاراستوە لە شیرك و کوفرو نیفاق، هەروەها خۆیان پاراستوە لە گوناهە گەورەکان، خۆپارێزەران (**متقین**) هەمووی دەگرێتەوە.

وەك دوایی باسی دەکەم کە هەندێك لە زانایانی ئەشعەریی مەشرەب و، زانایانی دیکەی ئیعتیزال مەشرەب، لەو بارەوە کێشەو مشت و مڕیان بووە:

(**مُعْتَزِلة**) گوتوویانە: (**المتقین**) واتە: ئەوانەی خۆیان لە هەموو جۆرە گوناهێك دەپارێزن، واتە: هەر کەسێك خۆی لە هەموو گوناهان نەپارێزێ، ناچێتە بەهەشت، مەبەستیان ئەوە بووە.

(**أَشاعرة**)ش گوتوویانە: مەبەست لە (**متقین**) لێرەدا خۆپارێزەران لە شیرك و کوفرو نیفاقە، واتە: دەگونجێ مرۆڤ گوناهی گەورەشی هەبن و بچێتە بەهەشت، دوایی ئێمە لەو بارەوە قسەی خۆمان دەکەین و، لە ڕاستییدا ئەم دوو ڕایە هەردووکیان هەڵەن و، یەکیان تێپەڕاندن (**إِخراط**)ی تێدایە، کە ڕای (**مُعْتَزِلة**)یەو دەڵێن: دەبێ مرۆڤ خۆی لە هەموو گوناحێك بپارێزێ، ئنجا دەچێتە بەهەشت، بەڵام ئەوە مەرج نیە.

هەروەها (**أشاعرة**)ش كە دەڵێن: هەر كەسێ خۆی لە كوفرو شیرك و نیفاق بپارێزێ، بە پارێزكار لە قەڵەم دەدرێ و دەچێتە بەهەشت، ئەمەش كەمتەرخەمیی (**تغريط**) و كەم و كورتییە، یانی: دوو ڕایەكان یەكیان تێپەڕاندن و، یەكیان بە زایەدانی هەیە، دوایی لەو بارەوە وردتر قسە دەكەین، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: خۆپارێزەران، یانی: ئەوانەی لە دنیادا خۆیان پاراستوە، خۆیان پاراستوە لە هەر شتێك كە خوا پێی ناخۆشە، ئنجا خوا وەك چۆن كوفرو شیرك و نیفاق و ئیلحادی پێ ناخۆشە، بە هەمان شێوە: پێشی ناخۆشە ئەركەكانیشی بچوێنرێن و قەدەغەكانیشی بشكێنرێن، كەواتە: دەبێ خۆیان لەوانیش پاراستبێ، بەڵام ئایا وایە: هەر كەسێ یەك گوناحی كرد، ئیمانی هەڵبوەشێنێتەوەو، پێناسەی كوفری بەسەردابێ و، سەرەنجام شایستەی چوونە دۆزەخ بێ، وەك (**معتزلة و قدرية**) گوتوویانە؟، بە دڵنیایی نەخێر، بەڵام ئایا واشە كە گوناح و تاوان و لادان و خراپە، زیان بە ئیمان نەگەیەنن، وەك (**مرجئة**) گوتوویانەو، هەندێك لە ئەشعەرییەكانیش بەلای بیرۆكەی (**إرجاء**)دا شكاونەوە؟ بە دڵنیایی ئەویش وانیە، گوناح زیان بە ئیمان دەگەیەنێ، بەڵام ئیمان بە هەموو گوناحێك هەڵناوەشێتەوە، بەڵام گوناهێك كە لە زاتی خۆی دا كوفرو شیرك و نیفاق بێ، ئیمانی پێ هەڵدەوەشێتەوە، كەواتە: ئەو بیرۆكەیەی ئێستا دەیڵێم لەوەوە سەرچاوەی گرتوە، لە چۆنیەتیی پێناسەو سەرنجدانی گوناهان، ئایا گوناهو تاوان چییەو، دەرهاویشتەكەی چییە؟ لەوێوەش ئەو بیرۆكەیە سەرچاوە دەگرێ، كە ئایا پارێزكاران كێن؟

ئنجا خوا دەفەرموێ: بە دڵنیایی پارێزكاران ئەوانەی خۆیان پاراستوە لە دنیادا لە هەر شتێك خوا پێی ناخۆشە، ﴿فِي ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ﴾، لە سێبەرەكان دان و لە سەرچاوەكاندان، واتە: لە شوێنێك دان و لەو باخانەدان كە هەمووی سێبەرەو، هەموویشی كانیی و سەرچاوەو جۆگەو جۆبارە، ﴿وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾، هەروەها لە نێو میوەجاتێك دان لەوەی ئارەزووی دەكەن، (**فَوَاكِه**) كۆی (**فَاكِهة**)

یـە، ئەویـش واتـە: میـوە، (**فَوَاكِه**)یـش میـوەكان، هەمـوو جـۆرەكانی میـوە، بـەڵام لـەوەی خۆیـان ئـارەزووی دەكـەن، هـەر میوەیـەك ئـارەزووی بكـەن، لێیـەتی، وەك لـە سـوورەتی (**الزخـرف**)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾﴾، واتـە: لـەو بەهەشـتەدا هەیـە، هـەر شـتێك نەفسـەكان ئـارەزووی بكـەن و، چـاوەكان چێـژی لێوەربگـرن و، ئێـوەش بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوە.

﴿كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ هَنِيٓـًٔا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، (پێیـان دەگوتـرێ:) بخـۆن و بخۆنـەوە بـە ئاسـوودەیی و بەبـێ گرفـت، بەهـۆی ئـەوەوە كـە دەتانكـرد.

(**هَنِيْئَاً**):

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ كە خواردنەكە بە ئاسانیی بخورێ و چێژی لێوەربگیرێ، بە سێنایی لە گەروو بچێتە خوار.

ب- واتایەكی دیكەی ئەویە لە: ئەو خواردن و خواردنەوەیەی بەهرەی لێوەردەگرن، دوایی هیچ شوێنەواری خراپی نابێ، خواردنێك نابێ دوایی دەرهاویشتەی خراپی بێ.

ج- مەبەست پێی نەبوونی نارەحەتیی دانانی میزو پاشەڕۆكە، ئەو واتایەشی هەر لێوەردەگیرێ، كەواتە: پێیان دەگوترێ: بخۆن و بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێ، بەهۆی ئەوەوە كە دەتانكرد.

﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، ئێمـە بـەو شـێوەیە پاداشـتی چاكـەكاران دەدەینەوە، واتـە: بـەو شـێوە پاداشـتدانەوەیەی باسـمانكرد، ئـاوا پاداشـتی چاكـەكاران دەدەینەوە، چاكەكاریش كەسـێكە:

١- لەزاتی خۆی دا چاك بێ.

٢- پاشان پەیوەندییەكی باشی لەگەڵ خوادا هەبێ.

**٣-** دوایی مامەڵەیەکی باشی لەگەڵ خەڵك دا هەبێ، بەڵێ چاکەکار (**مُحْسن**) کە بە (**مُحْسِنِيْن**) کۆدەکرێتەوە، ئەوەیە لە زاتی خۆی دا چاك بێ، ئەگەر لە خودی خۆیدا چاك نەبێ، پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ خوادا نابێ و، بەندایەتییەکی باش بۆ خوا ناکات: (**الإِحْسَانُ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ**)، (**أخرجه البخاري: ٥٠، ومسلم: ٩**)، دەبێ مرۆڤ لە زاتی خۆیدا خاوەنی تێڕوانین و بوونناسییەکی ڕاست بێ، خاوەنی ئیمان و عەقیدەیەکی ساغ، ئنجا دەتوانێ کە لەگەڵ خوادا مامەڵەیەکی ڕاست و دروستی بێ، بەندایەتییەکی باش بۆ خوا بکات، دوای ئەوەش کە بەندایەتییەکی باش بۆ خوا دەکات، ئنجا دەتوانێ مامەڵەیەکی چاك لەگەڵ بەندەکانی خوا و لەگەڵ دەوروبەری دا بکات، کەواتە: ئێمە ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، یانی: ئەوانەی لە خودی خۆیاندا چاکن و پەیوەندییان لەگەڵ خوادا باشەو، بەندایەتییەکی باش و چاك و ساغ بۆ خوا دەکەن، لەگەڵ خەڵکیشدا مامەڵەیەکی ڕاست و دروست و شەرعییانە دەکەن، ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و بێڕەزا بۆ بەدرۆدانەران، ئنجا ئەگەر مرۆڤ بەراورد بکات لە نێوان سزای کافرەکان دا، کە هەمووی ئاگرو دووکەڵەو بڵێسەیەو، پاداشتی بڕواداراندا کە هەمووی سایەو سێبەرو کانیی و کانیاو میوەو خۆشییە، جیاوازییەکی زۆر گەورە دەبینێ.

﴿ كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴾، لە کۆتاییدا خوا ﷻ ڕوو لە بێبڕوایەکان و تاوانبارەکان دەکات و دەفەرموێ: کەمێك بخۆن و ڕابوێرن بە دڵنیایی ئێوە تاوانبارن، واتە: لەو ژیانە کورتە دنیاییەدا، خواردنەکەتان و ڕابواردن و چێژ وەرگرتنەکەتان، ماوەیەکی کەمەو، خوا ﷻ بۆ تاقیکردنەوە بواری پێداون، ﴿ إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە تاوانبارن، کەواتە: دڵنیابن! وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرناچن و، سزای ئەو تاوانبارییەتان وەردەگرنەوە، بەڵام ئێستا خوا دەرفەت و مەودای داون، بە کەیفی خۆتان چی دەخۆن، بخۆن، پاك و پیس، حەڵاڵ و حەرام، ﴿ وَتَمَتَّعُوا ﴾، هەروەها ڕابوێرن، چۆن ڕادەبوێرن بە حەڵاڵیی یان بە حەرامیی، چۆن چێژ وەردەگرن، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەمووی کەمە، هەم خواردنەکەو هەم ڕابواردنەکەش کەمەو، لە ماوەیەکی کەم دایە.

﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و بێڕەزا بۆ بەدرۆدانەران (ی سزای خوا، پاداشتی خوا، دیداری خوا، ڕۆژی دوایی).

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرۡكَعُواْ لَا يَرۡكَعُونَ ﴾، هەر کاتیش پێیان بگوترێ: ڕکووع ببەن، ڕکووع نابەن، وشەی (ڕکوع) هەرچەندە ئێمە کە لە زمانی کوردیی دا بەکاری دێنین، هەر ئەو ڕکووعەیە کە لە نوێژدایە، بەڵام لە ئەسڵی زمانی عەرەبیی دا، وشەی (**رُكُوع**) چەمینەوە یەکێك لە واتایەکانیەتی، چەمانەوە (**إنحناء**)یش لە نوێژدا یەکێکە لە پایەکانی نوێژو، هیچ نوێژێك بەبێ ڕکووع وەبەرناکەوێ، وەك چۆن بەبێ کڕنووش (**سُجُود**) بە بەرناکەوێ و، بەبێ ڕاوەستان و خوێندنی قورئان بەپێوە، وەبەرناکەوێ و، بەبێ خوێندنی تەحییات وەبەرناکەوێ، ئەوانە هەموویان پایەی نوێژن، (**رُكُوع**) لە زمانی کوردیی دا واتە: چەمینەوە (**إنحناء**) ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ لە نێوەڕاستی دا بچەمێتەوە، بەڵام نێوچاوانی و دەستی و ئەژنۆی نەگەنە زەوی، ئەگەرنا پێی دەگوترێ: کڕنووش (**سُجُود**)، بەڵام لە زمانی عەرەبیی دا، وەك چۆن ئەو پایەیەی نوێژ دەگرێتەوە، کە بریتیە لە چەمینەوە، بە هەمان شێوە مانای سەجدەش دەگرێتەوە، هەروەها مانای ملکەچییش دەگرێتەوە، هەرچەندە لە کوردییش دا وشەی (چەمینەوە) بە مانای ملکەچییش بەکاردێ، دەگوترێ: فڵانکەس ناچەمێتەوە، واتە: مل نەوی ناکات، تەسلیم نابێ، زەبوونیی دەرنابڕێ، بەڵام وشەی (**رُكُوع**) ئەگەر هەر بێژە عەرەبییەکەی بەکاربهێنرێ، خەڵك بەو واتایە لێی تێدەگات کە پایەیەکە لە پایەکانی نوێژ، بەڵام وشەی (**رُكُوع**) لە زمانی عەرەبییدا گرنگە ئێمە بزانین: وێڕای واتا ڕواڵەتییەکەی، واتایەکی مەعنەوییشی هەیە، بەڵکو جارێ وایە واتا مەعنەوییەکەی بەهێزترە لە واتا ڕواڵەتییەکەی، لێرەش دا بە دڵنیایی مانا مەعنەوییەکەی مەبەستە، واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: ملکەچ بن بۆ خوا، بچەمێنەوە بۆ خوا، لە بەردەم خوادا خۆتان بە کەم بگرن، خۆیان بە کەم ناگرن و ملکەچ نابن بۆ خوا، بە پلەی یەکەم مەبەست پێی ئەوەیە، ئنجا لە نێو مانای ملکەچ بوون و چەمینەوەدا بۆ خوا،

ڕکووعیش هەیەو، یەکێك لە پایەکانی نوێژیش بریتیە لە ڕکووع بردن، یانی: ڕکووع بردن، بەشێکە لە واتای گشتیی وشەی (ركوع) کە لێرەدا بەکارهاتوە.

﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران، بەدرۆدانەرانی سزاو پاداشتی خوا، بەدرۆدانەرانی ڕۆژی دوایی، بەدرۆدانەرانی پەیامی خوا، هەمووی دەگرێتەوە.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثِۢ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ﴾، لە دوای وی (لە دوای قورئان، مسۆگەر ڕاناوەکە بۆ قورئان دەچێتەوە هەرچەندە باسی نەکراوە)، بڕوا بە چ فەرمایشتێك دێنن؟ واتە: ئەگەر بڕوا بە قورئان نەهێنن، کە تاکە موعجیزەی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتییەکەی، وەك پێشتر باسمانکردوەو ئەو دوو ئایەتەی سوورەتی (**العنكبوت**) زۆر بە ئاشکرا دەیگەیەنن، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: گوتیان: دەبووایە نیشانەکانی لە پەروەردگاریەوە بۆ دابەزن (واتە: موعجیزەکانی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو، خوا دەفەرموێ: ئەی موحەممەد ﷺ!)، بڵێ: نیشانەو موعجیزەکان تەنیا لەلایەن خواوەن و، من تەنیا ترسێنەرێکی ڕوون و ئاشکرام، ئایا بۆ ئەوان بەس نیە کە ئێمە کتێبێکمان دابەزاندۆتە سەرت بەسەریان دا دەخوێندرێتەوە، بە دڵنیایی لەوەدا (لەو کتێبەدا کە بەسەریان دا دەخوێندرێتەوە) بەزەیی (خوا) و بیرخەرەوە هەیە، بۆ کۆمەڵێك بڕوابێنن.

کۆمەڵێك بیانەوێ بڕوابێنن، قورئان بەسە بەڵگەو موعجیزەی ڕاستیی موحەممەد ﷺ بێ و، کەسانێکیش لە ئیمان هێنان نەخەفتێنن و نەیانەوێ ئیمان بێنن، ئەگەر دنیا پڕ بێ لە بەڵگەو موعجیزە، هەر ئیمان ناهێنن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثِۢ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ﴾، لە دوای قورئان بە چ فەرمایشتێك

بڕوا دێنن؟ واتە: ئەم قورئانە بەرزو مەزنە، دوا دواندن و فەرمایشتی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی، ئەم قورئانە پڕە لە نهێنییەکانی کە لە گەردوون دا هەن و، مرۆڤ پێویستیی پێیان هەیە بیانزانێ، وەك دەفەرمویّ: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾**الفرقان**، واتە: بڵێ ئەو کەسە دایبەزاندوە کە نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، بێگومان ئەو لێبوردەی بەبەزەییە، ئەم قورئانە پڕە لە نوورو خێرو بەرەکەت، ئەگەر بڕوا بەم قورئان و بەم فەرمایشتە نەهێنن، لە دوای وی، لەسەر بناغەی چ فەرمایشتێك بڕوادێنن؟ خوا لە دوای قورئان، هیچ فەرمایشتی دیکە لەگەڵ مرۆڤایەتیی ناکات، قورئان دوا فەرمایشتی خوا بووە لەگەڵ مرۆڤایەتیی دا کردوویەتی، کەواتە: ئەگەر لەسەر بناغەی ئەم قورئانە بڕوانەهێنن، مانای وایە هەر نایانەوێ بڕوابێنن و، لە بڕوا هێنان ناخەفتێن و مەبەستیان نیە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە لەسەر بناغەی ئەم فەرمایشتەی خوا، ئەم کۆتا فەرمایشتەی خوا، باشترین و قووڵترین و ڕاسترین و چاکترین ئیمان بێنین، تاکو هەم لە دنیادا سەر بەرزو سەرفراز بین و، هەم لە دوارۆژیش دا بەختەوەربین و بە دیداری خوای پەروەردگار شاد بین.

# مەسەلە گرنگەكان

## مەسەلەی یەكەم:

لە قیامەتدا بە بێبڕوایان دەگوترێ: بە خێرایی بەرەو ئەو سزایە بچن، دەرپەڕن، كە بە درۆتان دادەنا، دووكەڵێك كە سێبەرێكی سێ لقیی هەیە، نە فێنكایی تێدایەو نە گڕو گڵپەی ئاگر دەگێڕێتەوە، پارچە بڵێسەی وەك كۆشكان فڕێ دەدا، كە شێوەی ڕەوە حوشتری زەرد دەكەن، بۆیە سزای سەخت و دژوار بۆ بەدرۆدانەرانی قیامەت:

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾، ڕاكەن و دەرپەڕن بەرەو لای ئەوەی بە درۆتان دادەنا، (طَلْقٌ طَلَاق)، بە مانای بەرهەڵداكردن و بەربەست لەبەردەمدا لابردنە، وشەی (طَلَاق) واتە: بەرهەڵداكردن، لە ئەسڵدا بۆ بەرهەڵداكردنی ئاژەڵ بەكاریان هێناوە.

(انْطَلِقُوا) لەسەر كێشی (إنفعال)ە، لە (إنْطَلَاق)ەوە دێ، كە لە (طلق)ەوە هاتووە، (إنْطَلِقُوا) واتە: بەخێرایی بچن، ئەگەر بمانەوێ بە كوردییەكی پەتیی بیڵێین: ڕاكەن، دەرپەڕن، ﴿إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾، بەرەو لای ئەوەی بە درۆتان دادەنا، لێرەدا: ﴿إِلَىٰ مَا﴾، (مَا) (موصولة)یە، یانی: (إلى الَّذِي كُنْتم بِه تُكَذِّبُون)، دەرپەڕن بە خێرایی بچن بەرەو لای ئەوەی ئێوە بەدرۆتان دادەنا، كە بریتیە

لە دۆزەخ، لەو سزایەی چاوەڕێی بێبڕوایان دەكات، واتە: بەرەو لای دۆزەخێك كە بە درۆتان دادەناو، پێتان وابوو ڕاست نیەو ئەفسانەیە، بڕۆن بەخێرایی!.

٣)- ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ﴾، بڕۆن بەخێرایی، دەرپەڕن بەرەو لای سێبەرێك كە خاوەنی سێ لقە، سێ بەشە، ئەگەر بە: (انْطَلِقُوْا) بخوێنرێتەوە، پسپۆڕانی زمان و ڕەوانبێژیی گوتوویانە: دووبارەكردنەوە كە بۆ سەرزەنشتكردن، یاخود بۆ بە كەم دانان و بۆ پاڵپێوەنان و بەڕێكردنە، بەڵام خوێندراویشەتەوە: (انْطَلَقُوْا) دەرچوون، یانی: دوای ئەوەی پێیان گوترا: (إِنْطَلِقُوْا) دەرپەڕن، یەكسەر دەرپەڕین و ڕۆیشتن بەرەو سێبەرێكی خاوەن سێ لق، سێ بەش، وشەی (شُعَب) كۆی (شُعْبَة)یە، (الشُّعْبَةُ: الفَرِيْقُ وَالطَّائِفَةُ وَالقِطْعَةُ مِنَ الشَّيء)، (شعبة) بەشێك و كۆمەڵێك و پارچەیەكە لە شتێك.

**(الطبري)** لە **(مجاهد)**ەوە بە ژمارە (٣٦٠٧٠) هێناویەتی دەڵێ: ﴿ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ﴾، **(ظِلٌّ وَدُخَانٌ ذِي ثَلَاثِ شُعَب)** واتە: سێبەرێك و دووكەڵێك كە خاوەنی سێ بەشە.

هەروەها **(مجاهد)** گوتوویەتی: **(دُخَانُ جَهَنَّم)** مەبەست پێی دووكەڵی دۆزەخە.

٣)- ﴿لَّا ظَلِيلٖ وَلَا يُغۡنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾، نە سێبەرێكی خەستی هەیەو، نە سوودیشی هەیە بۆ بڵێسە، **(ظَلِيْل: القَوِيُّ فِي ظِلَالِهِ، مِثْل: لَيْلٌ أَلْيَلٌ، وَشِعْرٌ شَاعِرٌ)**، **(ظَلِيْل)** واتە: بەهێز لە سێبەرەكەیدا، سێبەری خەست، وەك: شەوێكی شەو، شیعرێكی شاعیر، خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا ظَلِيلٖ﴾، سێبەرو فێنكایەتییەكی خەستی نیە، ﴿وَلَا يُغۡنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾، نەك هەر سێبەرێكی خەستی نیە، كە مرۆڤ لەسایەی دا پشوو بدات، بگرە بۆ بڵێسەكەش بێ سوودە، نایگێڕێتەوەو لێی ناپارێزێ، چونكە سێبەری خەست كە تیشكەی نەبێ، كەلێنی نەبێ، تیشكی خۆری پێدابێ، مرۆڤ دەتوانێ لە پەناو سایەی ئەو سێبەرەدا، پشوو بدات، بەڵام ئەگەر تیشكەی[1] تێدابن، جاری وایە كەسێك پشوو لە بن ساباتێك دەدات، بەڵام سەرەكەی باش نەگیراوەو چلۆیەكەی و ئەو گیایەی دەخرێتە سەری،

---

(١) پارچەی تیشكی خۆر (تیشكە)ی پێ دەگوترێ، كە لەبۆشایی و كەلێنی درەخت یان كەپرو ساباتەوە دێ.

زۆر نیەو، تیشکەی خۆری لێوە دێن، مرۆڤیش ئەگەر بیەوێ ڕاکشێ، یاخود دابنیشێ و تیشکە لێیبدەن، بێزار دەبێ، ئنجا ئەو سێبەرەش وانیە، سێبەرێکی خەستی وابێ، پشووی لە بن بدەن، ﴿وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ لەو بڵێسەی ئاگری دۆزەخە، (لَهَب) بڵێسە، ئەوەیە کە لە ئاگر بەرزدەبێتەوە، بە کوردیی پێی دەڵێن: بڵێسە، کڵپە، زمانەی ئاگر.

**(الطبري)** ئاوای مانای لێکداوەتەوە دەڵێ: **(لَا هُوَ يُظِلُّهُمْ مِنْ حَرِّهَا، وَلَا يُكِنُّهُمْ مِن لَهَبِهَا)**، ئەو سێبەرە نە ئەوەیە لە گەرمایەکەی سێبەریان لێ بکات و، نە ئەوەیە لە بڵێسەکەشی پەنایان بدات و بیانپارێزێ.

﴿وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾، **(الإِغْنَاءُ: جَعْلُ الغَيْرِ غَنِيّاً)**، **(إِغْنَاء)** واتە: جگە لە خۆی بێ نیازو دەوڵەمەند بکات، لێرەدا مەبەست ئەوەیە: زیانیان لێ دوور ناخاتەوەو سوودیشیان پێ ناگەیەنێ، لێرەدا **(يُغْنِي)** لە: ﴿وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾دا، **(ضُمِّنَ (لَا يُغْنِي) مَعْنَى (لَا يُبْعِدُ) لِذَا عُدِّيَ بـ «مِن»)**، وشەی **(يُغْنِي)** زیاتر بە **(عَنْ)** بەرکار دەخوازێ، **(أَغْنَاهُ عَنْهُ)** واتە: لەوی بێ نیاز کرد، بەڵام لێرەدا بە **(مِنْ)** بەرکاری خواستوەو تێپەڕی کردوە بۆ بەرکار **(مفعول بە)** تاکو مانای دوور دەخاتەوە **(يُبْعِدُ)**ی بخرێتە نێو، کەواتە: ﴿وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾، واتە: **(لَا يَدْفَعُ عَنْهُ اللَّهَب وَلَا يُبْعِدُ عَنْهُ اللَّهَب)**، نە بڵێسەی ئاگری لێ بەرپەرچ داتەوەو نە لێشی دووردەخاتەوە، یان: نە سوودی پێ دەگەیەنێ لە بەرانبەر بڵێسەی ئاگرداو، نە بڵێسەی ئاگریشی لێ دوور دەخاتەوە، چونکە کردارێك کە بە پیتێك بەرکار دەخوازێ، یان بەبێ پیت بەرکار دەخوازێ، ئەگەر ئەو پیتە گۆڕدرا بە پیتێکی دیکە، کە عادەت نەبێ بەرکاری پێ بخوازێ، یاخود پیتێك زیاد کرا بۆ خواستنی بەرکار، کە ئەو کردارە لە ئەسڵدا پێویستیی بەو پیتە نەبوو، ئەو کاتە وێڕای مانا ئەسڵییەکەی خۆی، مانایەکی دیکەشی دەخرێتە نێو، ئەوەش لە زمانی عەرەبیی دا پێی دەگوترێ: **(تَضْمِيْن)** واتە: خستنە نێو، واتە: وێڕای ئەوەی مانای ئەسڵی خۆی هەیە، مانایەکی دیکەشی بۆ زیاد دەبێ.

٤)- ﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ﴾، ئەو ئاگرە بڵیسان فڕێ دەدات، وەك كۆشكان، (**إِنَّهَا**) ڕاناوەكەی بۆ ئاگری دۆزەخ دەچێتەوە، واتە: ئەو ئاگرە، (**تَرْمِي**): (**تَقْذِف**) فڕێ دەدا، دەهاوێ، (**بِشَرَر**)، (**شَرَر**) كۆی (**شَرَرَة**)یە، (**وَهِيَ القِطْعَةُ المُشْتَعِلَةُ يَدْفَعُهَا لَهَبُ النَّارِ والقَصْرُ: البِنَاءُ العَالِي، وَالتَّعْرِيفُ فِيهِ لِلجِنْسِ، أَي كَالقُصُورِ**)، واتە: (**شَرر**) كۆی (**شَرَرة**)یە كە بریتیە لە پارچەی گڕگرتووی بڵێسە، ئاگر دەیهاوێ، (**قَصْر**)یش خانووی بەرزەو ناساندن (**تعريف**) ەكەی بۆ تێكرا (**جنس**)یە، یانی: وەك كۆشكان، واتە: ئەو ئاگرە بڵێسان فڕێ دەدات، وەك كۆشكان، چونكە وشەی (**قَصْر**) واتە: بینای بەرز، خانووی بەرز، كۆشك، (**أل**) ی ناساندنی لەسەرە و، مەبەست پێی جینسە، واتە: هەر یەك كۆشك نا، بەڵكو كۆی كۆشكان، وەك كۆشكان وان، بۆیەش ئێمە وامان مانا كردوە، ئنجا خوا ﷻ وێچواندنێكی دیكەشی تێدا دەكات، دوای ئەوەی ئەو بڵێسەو كڵپانەی ئاگری دۆزەخ فڕێیان دەدا، بە هەوادا، چواندنی بە كۆشكە بەرزەكانەوە، ئنجا دەیانشوبهێنێ بە ڕەوە حوشتری زەردیشەوەو دەفەرموێ:

٥)- ﴿كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ﴾، ئەو (پارچە ئاگرو بڵێسانەی دۆزەخ فڕێیان دەدات)، وەك ڕەوە حوشتری زەرد وان.

(**جِمالة**) كۆی (**جِمَال**)ەو، ئەویش كۆی (**جَمَل**)ە، مانای وایە (**جِمَالَة**) دەبێتە كۆی كۆ، واتە: وەك چەند ڕەوە حوشترێكان وان، خوێندراویشەتەوە: (**جِمَالَات**) ئەو كاتەش (**جِمَالَات**) دەبێتە كۆی (**جِمَالَة**)و، ئەویش كۆی (**جِمَال**)ە، كە كۆی (**جَمَل**)ە، مانا وایە (**جِمَالَات**) دەبێتە كۆی كۆی كۆ (**جَمْعُ جَمْعِ الجَمْعِ**).

بێگومان خوا ﷻ كە ئەو وێچواندنانە دێنێتەوە، تەنیا بۆ گەلی كوردی نەبووەو، بەس بۆ عەرەبی نەبووەو، بۆ توركی نەبووەو، بۆ فارسی نەبووەو، بۆ ڕۆژئاوای نەبووەو، بۆ ڕۆژهەڵاتی نەبووە، بەڵكو بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، هەموو مرۆڤایەتییش كۆشكان دەبینن، ئەگەر شارنشین بن، كۆشكی بەرز، ئنجا با بزانن ئەو بڵێسانەی ئاگری دۆزەخ فڕێیان دەدا، هێندەی كۆشكانن، هەروەها ئەگەر بیابانشین و گوندنشین بن، ڕەوە حوشتران دەبینن، حوشتری زەرد، ئنجا با بزانن

ئـەو بڵێسـە ئاگرانـە، وەك ڕەوە حوشـتران وان، وەك کۆمەڵـە حوشـترێك، کـە پێکـەوە دەڕۆن، ئنجـا (**صُفر**)یـش کـۆی (**أصْفَـر**)ە و، چ مەبەسـت مانـا ئەسـڵییەکەی خـۆی بـێ واتـە: ڕەوە حوشـتری زەرد، چ وەك هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: مەبەسـت ڕەوە حوشـتری ڕەش بـێ، وەك (**الطـبري**) دەڵـێ: (**ويُقصَـدُ بِالْجِـمَالاَتِ الصُّفْـرِ: الْإِبِـلُ السُّـودُ، لِأَنَّ ذَلِـكَ هُـوَ المَعْـرُوفُ مِـنْ كَلَامِ العَـرَبِ، وصُفْـرٌ جَمْـعُ أَصْفَـر، وَسُـود جَمْـعُ أَسْـوَد**)، واتـە: مەبەسـت لـە (**الجِـمَالاَتِ الصُّفْـرِ**)، حوشـترە ڕەشـەکانە، ڕەوە حوشـتری ڕەش، چونکـە ئـەوە زانـدراوە لـە قسـەی عەرەبـان کـە وشـەی (**صفْر**)یـان بـۆ (**سُـود**) بەکارهێنـاوە، (**صُفْر**)یـش کـۆی (**أصْفَـر**)ەو (**سُـود**)یش کـۆی (**أسْـوَد**)ە.

بـەڵام ئەگـەر مەبەسـت پێـی حوشـترە زەردەکانیـش بێ، چونکـە حوشـتری زەردیش هـەن و، حوشـتری ڕەشـیش هـەن، لـە هـەردووك حاڵانـدا وێچوانـدن (**تشـبیه**)ەکە پـڕ بـە پێسـتی حاڵەتەکەیە.

٦)- ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران، واتە: بەدرۆدانەرانی سزایەك کە خوا دایناوە بۆ بێبڕوایانی خراپەکار.

ئنجـا وشـەی (**قَـصْر**) وێـڕای ئـەوەی دەگونجـێ مەبەسـت پێـی جینـسی کۆشـك (**قَـصْر**) بـێ، واتـە: کۆشـکەکان، چونکـە (ألْ)ی ناسـاندنی لەسـەرەو ئەویـش بۆ جینسـە، واتـە: کـۆی کۆشـکان، هەندێـك لـە زانایانیـش وەك (**قتـادة**) کـە (**الطـبري**) بـە ژمـارە (٣٦٠٨١) لێـوەی هێنـاوە دەڵـێ: (**القَـصْرُ: أُصُولُ الشَّـجَرِ وَأُصُـوُلِ النَّخْـلِ**)، (**قـصر**) قـەدو بنـکی درەخـت و قـەدو بنـکی دار خورمایـە (کـە ئەویـش زۆر گەورەیـە).

هەروەهـا (**إبـن عباس**)یـش کـە (**الطـبري**) بـە ژمـارە: (٣٦٠٨٤) لێیـەوە هێنـاوە، گوتوویـەتی: وەك چـۆن بـە: (**جِـمَالَات**) خوێندراوەتـەوە، بـە: (**جُمَالَات**)یـش خوێندراوەتـەوە، (**جُمَالَات**)یـش کـۆی (**جُمَالَة**)یـە، ئەویـش بریتیـە لـە پەتێـکی گـەورە کەشـتیی پـێ قاییـم دەکـرێ، پێـشی دەگوتـرێ: (**القَلْس**)، واتـە: ئـەو بڵێسـە ئاگرانـەی دۆزەخ فڕێیـان دەدا، وەك گـووش و پـەتی گـەورە وان کـە کەشـتییان پێ قاییـم دەکرێ.

بەڵام (الطبري) دەڵێ: (**أَوْلَى القِرَاءَتَيْنِ عِنْدَنَا مَا عَلَيْه قِرَاءة الأمْصَار وَهُوَ سُكُون الصَّادِ، وَأَوْلَى التَّأْوِيْلاَتِ بِه أَنَّهُ القَصْرُ مِنَ القُصُور**)، واتە: باشترین خوێندنەوە لە لای ئێمە ئەوەیە کە خەڵکی شارەکان پێیان خوێندۆتەوە، ئەویش ئەوەیە پیتی (صاد) زەنەدار بێ: (**كَالقَصْر**)، باشترین ماناش بۆ وشەی (**قَصْر**) ئەوەیە کە یەکێکە لە (**قُصُور**).

واتە: (ألْ)ەکەی سەر (**القَصْر**) بۆ جینسی (**قَصْر**)ەو بە مانای کۆشکە، کەواتە: (**الطبري**) ئەو مانایە ڕەت دەکاتەوە کە (**قتادة**) هێنای، کە مەبەست لە (قصر) بنکە دارخورما یان بنکە درەخت بێ و، دەڵێ: مەبەست پێی کۆشکە.

### مەسەلەی دووەم:

لـە قیامەتـدا بێبڕوایـان بـێ قسـە دەبـن و، مۆڵەتیـان نـادرێ پۆزشـیش بهێننەوەو، تەنیـا سـزای سـەختیش شایسـتەی ئـەو بەدرۆدانەرانەیـە، خـواش پێیـان دەفەرمـوێ: ئەمـڕۆ ڕۆژی لێـك هەڵاواردنـە، ئێـوەو تێکـڕای کۆمەڵـگا پێشـووە بێبڕوایەکانمـان خـڕ کردوونـەوە، ئنجـا ئەگـەر پیلانێکتـان هەیـە لـە دژم، کەمتەرخەمیـی مەکـەن و، سـزای سـەخت بـۆ بەدرۆدانـەرانی ڕۆژی لێـك هـەڵاواردنی پـاك و پیسـان:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴾، ئەمە ڕۆژێکە تێیدا نادوێن، لێرەدا (يَوْم) پاڵدراوەتە لای: ﴿ لَا يَنطِقُونَ ﴾، (**إضَافَة «يَوْم» إلى «لَا يَنْطِقُون» تَعْرِيْفٌ لليوم بأنه هُوَ يَوْمٌ يُعْرَفُ بِمَدلُوُل هَذِهِ الجُمْلَة**)، یانی: پاڵدانی (یوم) بۆ لای (لَا يَنْطِقُون) ناساندنی ڕۆژەکەیە بەوەی ئەو ڕۆژە، بەهۆی نێوەڕۆکی ئەو ڕستەیەوە دەزانرێ.

﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴾، یـانی: ئەمـڕۆ ڕۆژی ئەوەیـە بێبڕوایـان قسـەی تێـدا ناکـەن، تێیـدا نادوێـن، هەروەهـا خوێندراویشـەتەوە: (**هَـذَا يَـوْمَ لاَ يَنْطِقُـون**)، یـانی: ئەمـە ڕۆژی تێـدا نـە دوانیانـە، وشـەی (یـوم) بەهـۆی زەرف (**ظـرف**) بوونـەوە، حاڵـەتی (**نَصـب**)ی وەرگرتـوە.

٢)- ﴿ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴾، مۆڵەتیشیان نادرێ پۆزش بێننەوە، داوای لێبووردن بکەن، خوێندراویشەتەوە: (**وَلَا يَأْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُوْن**)، (خوا) مۆڵەتیان نادات، پۆزش بێننەوەو داوای لێبوردن بکەن.

ئنجا بۆچی فەرموویەتی: (**فَيَعْتَـذِرُوْن**) و نەیفەرمووە: (**فَيَعْتَـذِروا**)؟ وەڵام: ئەم ڕستەیە ڕستەیەکی دەستپێکییە (**جملة إستئنافية**)، پسپۆڕێك گوتوویەتی: (**إسْتِئْنَافٌ تَقْدِيْره: فَهُمْ يَعْتَـذِرُوْن**)، ئەمە دەستپێکە مەزەنەکەی: مۆڵەتیان نادرێ، ئنجا ئەوان پۆزش بهێننەوە.

لێرەدا (**فخرالدين الرازي**) پرسیارێك دەوروژێنێ دەڵێ: چۆن خوا ﷻ مۆڵەتی بێبڕوایان نادات داوای لێبوردنی لێبکەن و پۆزش بهێننەوە، کە پۆزش هێنانەوە سیفەتێکی بەرزە وەك گوتراوە: (**العُـذْرُ عِنْـدَ كِـرَامِ النَّـاسِ مَقْبُـوْل**) واتە: پۆزش هێنانەوە لە لای خەڵکی بەڕێز وەردەگیرێ، (**الرازي**) دوو وەڵامان دەداتەوە:

**١)-** مەبەست پێی پۆزش هێنانەوەی بێ کەڵکە، کە بڵێن: داوای لێبوردنمان هەیە، نەمانزانی، ئایا پێغەمبەرانتان بۆ نەهاتن؟ یا، یان: بمانگێڕەوە بۆ دنیا، ئەوانەش هەموویان پۆزش هێنانەوەی بێ کەڵك و بێ سوودن و، بواری ئەو جۆرە پۆزش هێنانەوانەیان نادرێ.

**٢)-** قیامەت شوێنی کاری چاك و فەرمانبەریی بۆ خوا نیە، چونکە پێغەمبەران (**عليهم السلام**) لە دنیادا هاتوون، بۆ ئەوەی بیانوو و پۆزش بە دەست خەڵکەوە نەهێڵن، هاتوون وریایان بکەنەوەو بیانترسێنن، کەواتە: ڕۆژی دوایی شوێنی ئەوە نیە، بۆیە مۆڵەتی ئەوەیان نادرێ و کە پۆزشیش دێننەوە، پۆزشەکەیان لێ وەرناگیرێ، ﴿ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴾، واتە: مۆڵەتیان نادرێ پۆزش بهێننەوە، پۆزشێك سوودی هەبێ، ئەگەرنا بێبڕوایان لەوێدا زۆر هاوار دەکەن و داوای لێبوردن دەکەن، بەڵام بێ سوودە.

بۆیە زانایان دەڵێن: هیچ دژیەکیی (**تناقض**) و تێکگیرانێك لە نێوان ئەو ئایەتە بە پێزەو ئایەتانێکی دیکەدا نیە، کە خوا تێیاندا باسی دان بەهەڵەی خۆدا هێنان و داوای لێبوردن کردنی بێبڕوایان دەکات، بۆ وێنە:

**یەکەم:** خوا ﷻ لە سوورەتی (**الغافر**)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ﴾**غافر**، (بێبڕوایەکان

هاواریان کرد) گوتیان: پەروەردگارمان! دوو جاران مراندتین و، دوو جارانیش ژیاندتین، ئنجا دانمان بە گوناهەکانی خۆماندا هێنا، ئایا هیچ ڕێیەکی دەرچوون هەیە؟ کە وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**غافر**)دا گوتوومانە: دوو جاران مراندتین؟ مردنی یەکەم ئەوەیە کە ژیانیان نەبووەو، خوا ژیانی بە بەرداکردوون.

ب- مردنی دووەمیش ئەو کاتەیە کە ژیانی یەکەمی دنیا بە جێدێڵن، هەروەها کە دەڵێن: دوو جاران ژیاندتین: أ- ژیانی یەکەم ئەوەیە کە ژیانیان نەبووەو خوا ژیانی پێداون.

ب- ژیانی دووەمیش ئەوەیە کە لە ڕۆژی دوایی دا زیندوویان دەکاتەوە، ئنجا ئایا ئەوەی لە سوورەتی (**غافر**)دا هاتوە کە داوای لێبوردن دەکەن و پۆزش دێننەوە، لەگەڵ ئەوەی لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴾، مۆڵەتیان نادرێ پۆزش بهێننەوە، ئایا تێك ناگیرێن؟!.

**دووەم:** هەروەها کە لە سوورەتی (**فاطر**)دا خوای پەنهانزان لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ ﴾**فاطر**، واتە: لەوێدا هاوار دەکەن پەروەردگارمان! دەرمان بێنە کردەوەی چاك دەکەین، جگە لەوەی دەمانکرد، (یانی: بمانبەوە بۆ دنیا، یان جارێکی دیکە تاقیمان بکەوە)...

**سێیەم:** هەروەها کە لە سوورەتی (**الصافات**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾**الصافات**، هەندێکیان ڕوویان لە هەندێکیان کرد، (لە نێوان خۆیان دا) پرسیاریان لە یەکدی دەکرد، کەواتە: لە قیامەت دا قسە دەکەن و پێکەوە دەدوێن! ئنجا ئایا ئەوانە تێکناگیرێن لەگەڵ ئەوەی ئێرە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە نەخێر تێك ناگیرێن، چونکە:

أ- ئەو پۆزش هێنانەوەیەی خوا لایدەبات و دەفەرموێ: پۆزش ناهێننەوە، واتە: پۆزش هێنانەوەیەك سوودیان پێ بگەیەنێ.

**ب-** وەڵامێكی دیكە ئەوەیە: ڕۆژی دوایی قۆناغ قۆناغە، لە قۆناغێكدا بوار نادرێ كەس قسە بكات، یاخود هەر بۆ خۆیان نایانپەڕژێتە سەر پۆزش هێنانەوەو داوای لێبوردن كردن و قسەكردن، بەڵام لە قۆناغی دیكەدا بواریان دەدرێ قسە بكەن و، دەیانپەڕژێتە سەر ئەوەی داوای لێبوردن بكەن.

**ج-** یاخود مۆڵەتیان نادرێ قسە بكەن لە كاتێكدا لە قیامەت دان، واتە: لە كاتێكدا خەریكی سزاو پاداشت درانەوەن، بەڵام دوایی كە دەچنە نێو دۆزەخەوە، لەوێدا ئەوانەی خوای پەروەردگار باسیان دەكات، كە دان بە گوناحی خۆیان دا دێنن و هاوار دەكەن و پێكەوە قسە دەكەن، ئەوە هەمووی لە دۆزەخ دایە، بەڵام لە كاتێكدا لە گەرمەی كۆكرانەوەو سزاو پاداشت دان، ئەوەی خوا ﷻ لایدەبات هی ئەو كات و قۆناغەیە.

٣)- ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران، واتە: بەدرۆدانەرانی ئەو ڕۆژە كە تێیدا بێ دەنگ دەكرێن، یاخود تێیدا قسەیەكیان نابێ بیكەن.

٤)- ﴿ هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ ۖ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ ﴾، ئەمە ڕۆژی لێك هەڵاواردنە ئێوەو پێشووەكانمان هەمووتان كۆ كردوونەوە.

سەرجەم كۆمەڵگاو خەڵكە بێبڕوا پێشووەكانمان لەگەڵ ئێوەدا، ئەی بێبڕوایانی كە لەسەر پێغەمبەری خاتەم حساب دەكرێن! هەمووناخمان پێكەوە خڕ كردوونەوە.

٥)- ﴿ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴾، ئنجا ئەگەر پیلانێكتان هەیە، فێڵێكتان هەیە، نەخشەیەكتان هەیە، لە دژی من بەكاری بێنن، (**الأَمْرُ: للتَعْجِيز وَالشَّرْط للتَّوبِيخ وَالتَّذْكِير بِسُوء صُنعِهم**)، لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴾، فەرمانكردنەكە بۆ دەسەوسانكردنە، (واتە: هیچتان لە دەست نایەت)، وەك كەسێك بە كەسێك كە لە بەرانبەریدا بێ دەسەڵاتە، دەڵێ: چیت پێ دەكرێ بیكە! دەزانێ هیچی پێ ناكرێ، مەرجەكەش كە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَانَ لَكُمْ ﴾، (**إنْ**) مەرجییە (**شَّرْطِيَة**)یە بۆ

سەرزەنشتکردنەو، بۆ بیرخستنەوەی کردەوە خراپەکانیانە، واتە: وەك چۆن لە دنیادا پیلان و فێڵێکتان لە دەست دەهات، ئێستاش ئەگەر پیلان و فێڵێکتان لە دەست دێ، لە دژی من، بیکەن، وەك چۆن کاتی خۆی لە دژی ئایین و بەرنامەی من و پێغەمبەری من، پیلان و فێڵتان دەگێڕا، بەڵام ئایا ئێستا هیچتان لە دەست دێ؟! بە دڵنیایی نەخێر، کەواتە: ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە چاوەڕێتان دەکات.

٦)- ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەشدا سزای سەخت و بێڕەزا بۆ بەدرۆدانەران (ی دیداری خواو، سزاو پاداشتی خوا).

لێرەدا پێم چاکە قسەیەکی (**الطبري**) بێنمەوە کە تیشکی زیاترمان بۆ دەخاتە سەر ئەوەی (**فخرالدين الرازي**) ورووژاندی: لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴾، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴾، بەڵام لە ئایەتی دیکەدا هاتوە، کە پۆزش دێننەوەو داوای لێبوردن دەکەن و قسە دەکەن، ئنجا ئایا ئەوانە چۆن پێکەوە تێکناگیرێن؟ پێشتریش باسمان کرد، بەڵام پێم خۆشە ئەم قسەیەی (**الطبري**) بێنم، لە تەفسیرەکەیەوە و یەکسەر دەقە عەرەبییەکەی دێنم[1]:

دەڵێ: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴾، (**يُخْبِرُ عَنْهُمْ أَنَّهُمْ لَا يَنْطِقُونَ فِي بَعْضِ أَحْوَالِ ذَلِكَ الْيَوْمِ، لَا أَنَّهُمْ لَا يَنطِقُونَ ذَلِكَ الْيَوْمَ كُلَّهُ. فَإِنْ قَالَ: فَهَلْ مِنْ بُرْهَانٍ يُعْلَمُ بِهِ حَقِيقَةُ ذَلِكَ؟ قِيلَ: نَعَمْ، وَذَلِكَ إِضَافَةُ يَوْمٍ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ لَا يَنطِقُونَ ﴾النمل: ٨٥، وَالْعَرَبُ لَا تُضِيفُ الْيَوْمَ إِلَى (فَعَلَ) وَ (يَفْعَلُ)، إِلَّا إِذَا أَرَادَتِ السَّاعَةَ مِنَ الْيَوْمِ وَالْوَقْتِ مِنْهُ، وَذَلِكَ كَقَوْلِهِمْ: آتِيكَ يَوْمَ يَقْدَمُ فُلَانٌ، وَأَتَيْتُكَ يَوْمَ زَارَكَ أَخُوكَ، فَمَعْلُومٌ أَنَّ مَعْنَى ذَلِكَ: أَتَيْتُكَ سَاعَةَ زَارَكَ، أَو آتِيكَ سَاعَةَ يَقْدَمُ، وَأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ إِتْيَانُهُ إِيَّاهُ الْيَوْمَ كُلَّهُ، لِأَنَّ ذَلِكَ لَوْ كَانَ أَخَذَ الْيَوْمَ كُلَّهُ، لَمْ يُضَفِ الْيَوْمُ إِلَى (فَعَلَ) وَ (يَفْعَلُ)، وَلَكِن فِعْلُ ذَلِكَ، إِذَا كَانَ الْيَوْمُ بِمَعْنَى: إِذْ وَإِذَا اللَّتَيْنِ يَطْلُبَانِ الْأَفْعَالَ دُونَ الْأَسْمَاءِ**).

---

(١) جامع البيان: ج١٥، ص٢٥٧.

بە ڕاستیی ئەم عیبارەتەی **(الطبري)** ڕەحمەتی خوای لێ بێ، زۆر وردە بۆ شیکردنەوەی واتاو چەمکی ئەو ئایەتە موبارەکانە!

دەڵێ: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴾، هەواڵیان لە بارەوە دەدا کە لە هەندێك حاڵەکانی ئەو ڕۆژەدا، کە ڕۆژی دواییە، قسە ناکەن، نەك لە هەموو ڕۆژەکەدا قسە ناکەن، بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە کە **(يَوْم)** پاڵدراوەتە لای **(لاَ يَنْطِقُونَ)**، گەلی عەرەبیش لە قسەکردنیاندا، عادەتیان وایە وشەی **(يَوْم)** پاڵنادەنە لای کردەوەیەك کە دەکرێ، مەگەر مەبەستیان کاتێك بێ لەو ڕۆژەو، ماوەیەك بێ لەو ڕۆژەدا، کە کارەکەی تێدا دەکرێ، بۆ وێنە: کە دەڵێن: **(آتِيكَ يَوْمَ يَقْدَمُ فُلَانٌ)** ئەو ڕۆژی دێم بۆ لات کە فڵانکەس دێتەوە، **(وَأَتَيْتُكَ يَوْمَ زَارَكَ أَخُوكَ)** ئەو ڕۆژە هاتمە لات کە برایەکەت سەردانی کردی، مانایەکە ئەوەیە: لەو کاتەدا کە برایەکەت سەردانی کردی، لەو کاتی ئەو ڕۆژەدا، یاخود لەو سەعاتەدا کە ئەو کەسە دێتەوە، من لەو سەعاتەی ئەو ڕۆژەدا دێم بۆ لات، نەك لە هەموو ڕۆژەکەدا چووبێ بۆ لای، چونکە ئەگەر لە هەموو ڕۆژەکەدا چووبایە بۆ لای و هەموو ڕۆژەکەی گرتبایە، ئەو کاتە وشەی ڕۆژ **(يَوْم)**ی پاڵنەدەدایە لای کردارێك کە بکرێ، بەڵکو ئەوە کاتێك دەکرێ کە ئەو ڕۆژە بە مانای **(إذْ)** بێ یان بە مانای **(إذَا)** بێ کە کردارەکان دەخوازن نەك ناوەکان.

واتە: کردارێك کە لەو ڕۆژەدا دەکرێ ئەگەر بڵێ: ئەو کردەوەیەی لەو ڕۆژەدایەو ڕۆژەکە پاڵبدرێتە لای کردەوەیەك واتە: کاتێکی دیارییکراو ئەو کردەوەیەی لەو ڕۆژەدا، تێدا کراوە، نەك ڕۆژەکە بە گشتیی، هەروەك دوو وێنەی بۆ هێناونەوە:

**یەکەم:** ئەو ڕۆژە دێم بۆ لات کە فڵانکەس دێتەوە، واتە: لەو کاتەدا کە فڵانکەس دێتەوە دێم بۆ لات.

**دووەم:** ئەو ڕۆژەی برایەکەت سەردانی کردی هاتم بۆ لات، واتە: لەو کاتی ئەو ڕۆژەدا کە برایەکەت سەردانی کردی، نەك لە هەموو ڕۆژەکەدا، بەڵکو ڕێك لەو کاتە دیاریکراوەدا کە برایەکەت تێیدا سەردانی کردی، منیش هاتم بۆ لات.

کەواتە: لێرە کە دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ﴾، یانی: ئەمە کاتێکی دیاریکراوی ئەو ڕۆژەیەکە قسەی تێدا ناکەن، نەك هەموو ڕۆژەکە، هەروەها کە دەفەرموێ: پۆزش ناهێننەوە، یانی:

أ- پۆزش هێنانەوەیەك کە سوودیان پێ بگەیەنێ.

ب- یاخود لە هەندێ حاڵەتدا دەرفەتی پۆزش هێنانەوەیان نادرێ و، لە هەندێ حاڵەتدا دەرفەتیان دەدرێ.

ج- یاخود مەبەست ئەوەیە لەو کاتەدا کە حەشرو حیساب دەکرێ و، سزاو پاداشت دیاریی دەکرێن، دەرفەتی قسەکردنیان نیە، بەڵام دوایی کە لە دۆزەخدا بۆ خۆیان قسە دەکەن و، هاوار دەکەن و داوای لێبوردن دەکەن، لەگەڵ ئەوەدا کە خوا دەفەرموێ: لە کاتی قیامەتدا داوای لێبوردن ناکەن و قسە ناکەن، تێك ناگیرێن، چونکە: لە دۆزەخدا قسەکردن جیایە لە قسەکردن لە کاتێك دا، کە خەڵك کۆکراوەتەوەو سزاو پاداشتیان بۆ دیاریی دەکرێن.

### مەسەلەی سێیەم:

**باسی پاداشتی پارێزکاران کە لە سێبەرو سەرچاوان و نێو میوەی جۆراو جۆری ئارەزوومەندیاندا دەبن و، پێیان دەگوترێ: بخۆن و بخۆنەوە بێ گرفت و بەڵا دەبن و نۆشی گیانتان بێ و، ئاوا خوا پاداشتی چاکەکاران دەداتەوەو، بێبڕوایانیش سزای سەختیان هەیە، لەسەر بەدرۆدانانی ڕۆژی دوایی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى ظِلَـٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى ظِلَـٰلٍ وَعُيُونٍ ﴾، بە دڵنیایی و مسۆگەریی پارێزکاران لە سێبەران و لە نێو کانیی و سەرچاوان دان، وشەی (ظِلاَل) خوێندراوەتەوەش: (ظُلَل)، (ظُلَل) کۆی (ظُلَّة)یە، واتە: شتێك کە سێبەر دەکات، (ظِلاَل)یش کۆی (ظِلّ)ە، واتە: سێبەر.

پێشتریش باسم کرد، زانایانی مەشرەب ئەشعەریی، وەك: هەر کام لە **(الرازي)** و **(الشوكاني)** گوتوویانە: **(إِنَّ الْمُتَّقِيْن: لِلشِّرْك وَالْكُفْرِ)** ئەوانەی خۆیان پاراستوە لە کوفرو شیرك، ئەوانە: ﴿ فِى ظِلَـٰلٍ وَعُيُونٍ ﴾، لە بن سێبەران و لە نێو کانیی و سەرچاوان دان، بەڵام پێشتریش گوتم و ئێستاش دووبارەی دەکەمەوە: ئێمە نابێ ئایەتەکانی قورئان بەپێی ئەو بیرۆکانەی قوتابخانە ئیسلامییەکان، کە کۆمەڵە مسوڵمانەکانی شوێنکەوتووانی تەوژمە فیکریی و سیاسییەکان تەبەننییان کردوون، ئایەتەکان مانا لێ بدەینەوە، لێرەدا خوا دەفەرموێ: بێگومان پارێزکاران لە سێبەران و لە نێو کانیی و سەرچاوان دان، ئایا پارێزکاران کێن؟ بێگومان ئەوانەن کە خۆیان دەپارێزن لە هەر شتێك کە خوا پێی ناخۆشە، ئنجا ئایا خوا تەنیا کوفرو شیرکی پێ ناخۆشە؟ ئایا خوا درۆی پێ ناخۆش نیە؟ ئایا ستەمی پێ

ناخـۆش نیـە، ئایا خـوا ﷻ زینـاو قەتـڵ و ڕێگریـی و تێکـدانی ئاسـاییشی خەڵـك و، بوختـان و ئەوانـەی هەموویـان پـێ ناخـۆش نیـن؟ بـە دڵنیایـی، بـا، کەواتـە: نابـێ، لـە کاردانـەوەی (**معتزلـة**)دا و لەبەرئـەوەی ئـەوان گوتوویانـە: هـەر کەسـێك یـەك گونـاح بـکات، مانـای وایـە خـۆی لـە سـزای خـوا نەپاراسـتوەو ناچێتـە بەهەشـت! لـە کاردانـەوەی ئـەوەدا ئێمـەش بڵێیـن: نەخێـر خۆپارێـزەران و پارێـزکاران ئەوانـەن کـە تەنیـا خۆیـان لـە کوفـرو شـیرك دەپارێـزن، کـە لـە ڕاسـتییدا ئەگـەر (**معتزلـة**) تێیـان پەڕانـدوە، (**أشـاعرة**)ش کورتیـان هێنـاوەو، ڕاسـتییەکەی ئەوەیـە کـە لێـرەدا خـوا دەفەرمـوێ: ئەوانـەی خۆپارێـزن، پارێـزکارن، سـەرفرازن، ئنجـا ئایـا خۆیـان لەچـی دەپارێـزن؟ بێگومـان لـە هـەر شـتێك کـە خـوا پێـی ناخۆشـە، ئاشکراشـە: خـوا شـیرك و کوفـرو ئیلحـادو نیفاقـی پـێ ناخۆشـە بـە پلـەی یەکـەم و، لەوانـە هـەر خـۆش نابـێ، مەگـەر خاوەنەکەیـان لێیـان بگەڕێتـەوەو تۆبـە بـکات، بـەڵام وێـڕای ئەوانـە خـوا گوناحـە گەورەکانیـشی پـێ ناخۆشـن و، گوناهـە گچکەکانیـشی پـێ ناخۆشـن، بـەڵام هـەر کامیـان بەپێـی خـۆی، ئنجـا ئەگـەر کەسـێك خـاوەنی ئیـمان بـێ، دەگونجـێ خـوا لێیخـۆش بـێ، بەبـێ تەوبـەش، هەڵبەتـە بـە تەوبـەوە خـوا لـە هەمـوو کـەس خـۆش دەبـێ، بـەڵام تۆبـەی سـاغ و ڕاسـت، بـەڵام بەبـێ گەڕانـەوە (**توبـة**)، دەگونجـێ خـوای پـەروەردگار لێیـان خۆشـبێ و دەشـگونجێ لێیـان خـۆش نەبـێ، بـەڵام بـە نسـبەت شـیرکەوە خـوا هەرگیـز نایبـوورێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾النسـاء، واتـە: خـوا لـەوە نابـوورێ هاوبـەشی بـۆ دابـنرێ، بـەڵام جگـە لـەوە بـۆ هـەر کەسـێك بیـەوێ لێـی دەبـوورێ، واتـە: بەبـێ گەڕانـەوە، چونکـە بـە گەڕانـەوەوە لـە هەمـوو کـەس دەبـوورێ، وەك لـە تەفسـیری سـوورەتی (**النسـاء**)دا بـە تەفصیـڵ باسـمان کـردوە، کورتـە باسـێکمان لـە بـارەی گەڕانـەوەوە بـۆ لای خـوا کـردوەو، لـە کتێبـی: (گەڕانـەوە بـۆ لای خـواش)دا بـە تەفصیـڵ بـاسی ئـەو مەسـەلەیەمان کـردوە.

کەواتە: وشەی: (**الْمُتَّقِيْن**) واتاو چەمکەکەی گشتییەو، بۆمان نیە لە خۆوە تایبەتی بکەین بە شتێکەوەو، (**معتزلة**) کە دەڵێن: هەر کەسێ یەك گوناح بکات، نەك هەر تەقوای نیە، بەڵکو ئیمانیشی هەڵدەوەشێتەوە، بێگومان زێدەڕۆییان کردوە، بەڵام لە بەرانبەر وان دا (**مرجئة**)ش - کە (**أشاعرة وماتريدية**)ش کەم و زۆر لە ژێر کاریگەریی فیکری (**مرجئة**)دان، واتە: پاشینەکانیان مەرج نیە (**أبو الحسن الأشعري**) و (**أبو منصور الماتريدي**) خۆیان وابووبن - کە دەڵێن: گوناح زیان بە ئیمان ناگەیەنێ، ئەوانیش کەمتەرخەمییان کردوەو کورتیان هێناوەو، ڕای ڕاست ئەوەیە کە گوناح زیان لە ئیمان دەداو، ئیمان بە گوناهان کەم دەكات و، بە تاعەت زیاد دەکات، بەڵام وەك (**معتزلة**) گوتوویانە - هەروەها (**خوارج**) یش گوتوویانەو لە (**معتزلة**)ش زیاتر ڕۆیشتوون - هەر کەسێك یەك گوناح بکات خاوەن ئیمان نەماوە، ئنجا (**معتزلة**) دەڵێن: خاوەن ئیمان نەماوە، بەڵام نەشبۆتە کافر، بەڵکو (**له منزلة بين المنزلتين**) پێگەیەکی لە نێوان دوو پێگەکانی دا هەیە، بەڵام (**خوارج**) دەڵێن: هەر کەسێ یەك گوناحی گەورە بکات، گوناحی گەورەش یان چواندنی واجبێکە یان شکاندنی قەدەغەیەکە، سیفەتی ئیمانی لەسەر لاچووە، ئەوان تێیان پەڕاندوەو (**مرجئة**)ش کورتیان هێناوە کە دەڵێن: مرۆڤ هەرچەند گوناحان بکات، زیان بە ئیمانی ناگات، بێگومان ئەوەش بەزایەدان و کەمتەرخەمییە.

پارێزکاران ئەوانەن کە خۆیان دەپارێزن، هەم لە شیرك و کوفرو نیفاق و ئیلحادو، هەم خۆشیان لە گوناحان دەپارێزن بە گەورەو گچکەوە.

ئنجا ئەوانەی لە نێو سێبەران دان و، لە نێو کانیی و سەرچاوان دان، ئەو پارێزکارانەن.

٢)- ﴿ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ ﴾، لە نێو میوە جۆراو جۆرەکانیش دان، لەوەی ئارەزووی دەکەن، ﴿ مِمَّا يَشۡتَهُونَ ﴾، (**أي مَا يَتَمَنَّوْنه وَيَشْتَهونَهُ مِن أَنْوَاعِهَا**)، لەوەی لە جۆرەکانی میوە ئارەزووی دەکەن و حەزی لێ دەکەن.

٣)- ﴿ كُلُوا۟ وَٱشۡرَبُوا۟ هَنِیٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، (پێیان دەگوترێ:) بخۆن و بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێ بەهۆی ئەوەوە کە دەتانکرد، ﴿ كُلُوا۟ وَٱشۡرَبُوا۟ هَنِیٓـَٔۢا ﴾، واتە: پێیان دەگوترێ، ئەمە گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، ئنجا ئایا کێ وایان پێ دەڵێ؟ دەگونجێ خوای بەرز وایان پێ بفەرموێ، دەشگونجێ فریشتەکان وایان پێ بڵێن، (هَنِيْئًا): ئەوەیە چێژێکی ڕووت بێ و، ئازارو نەخۆشیی و گرفتی ئاوێتە نەبێ، هەروەها ئەوەی لە دنیادا بە دوای دا دێ: میزو پیسایی، ئەوەشی بەدوادا نەیەت، چونکە بەهەشتییەکان پاشەڕۆکیان نیە.

٤)- ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِی ٱلۡمُحۡسِنِینَ ﴾، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، واتە: چاکەکاران چاکەیان لەگەڵدا دەکرێ و، خراپەکارانیش سزا دەدرێن، ئەمەش دوو جاران دڵخۆشکردنی بەهەشتییەکانە.

یەکەم: کە خوا پێیان دەفەرموێ: ﴿ كُلُوا۟ وَٱشۡرَبُوا۟ هَنِیٓـَٔۢا ﴾، بخۆن و بخۆنەوە، ﴿ هَنِیٓـَٔۢا ﴾، نۆشی گیانتان بێ، یان بێ گرفت بن، ﴿ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە دەتانکرد، کەواتە: ئێوە کە هاتوونە ئێرە، ئەوە پاداشتی کردەوەکانی خۆتانەو، بەرهەمی ئیمان و کردەوە چاکەکانتانە.

دووەم: کە خوا پێیان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِی ٱلۡمُحۡسِنِینَ ﴾، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، کەواتە: ئێوە چاکەکارن، بۆیە بەو جۆرە خەڵاتتان دەکەین و پاداشتان دەدەینەوە.

٥)- ﴿ وَیۡلࣱ یَوۡمَىِٕذࣲ لِّلۡمُكَذِّبِینَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و بێرەزا بۆ بەدرۆدانەران، بەدرۆدانەرانی پاداشتی خوا، کە بۆ دۆستانی چاکەکاری دایناوە.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**هۆشـداریی پێـدانی کافـران و مۆڵەتدانیـان کـە بواریـان پێـدراوە ڕابوێـرن، بخۆن و بخۆنـەوەو چێـژ وەربگـرن، بـەڵام بـا بزانـن کـە لـە لای خـوا تاوانبـارن، مادام حیسـابی قیامـەت و حیکمـەتی ژیـانی دنیایـان نەکـەن، بۆیـە سـزای سـەخت چاوەڕێیانـەو، هێنـدەش ملهوڕن، ئەگـەر پێیـان بگوترێ: خـوا بپەرسـتن و بـۆی ملکـەچ بـن، گـوێ ناگـرن، بۆیـە سـزای بێـڕەزای سـازکراو بـۆ بەدرۆدانـەران چاوەڕێیانـەو، ئەگـەر بڕواش بـە قورئـان نەهێنـن، دوای وی بـڕوا بـە چ قسـەیەك دەهێنـن!**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُواْ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ﴾، کەمێك بخۆن و بخۆنەوە، بە دڵنیایی ئێوە تاوانبارن.

**(قَلِيْلاً)**: یانی: أ- **(أكْلاً وَتَمَتّعاً قَلِيْلاً)** خواردن و ڕابواردن و بەهرە وەرگرتنێکی کەم، بخۆن و بەهرە وەربگرن. ب- یاخود: ﴿كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا﴾، **(أي فِي زَمَن قَلِيْل)** بخۆن و ڕابوێرن لە ماوەی کەمی ژیانی دنیادا، بێگومانیش هەم خواردن و ڕابواردنەکە لە خودی خۆیدا کەمەو، هەم کاتەکەش کە بەسەری دەبەن لە خواردن و ڕابواردن دا، هەر کەمە.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ﴾، **(الأَمْـر مُسْـتَعْملٌ فِي الإمْهَـال وَالإنْـذَار، أي: لَيْـسَ تَمَتُّعُكُـم بِـشَيء، لأنَّـهُ قَلِيْـل وَخِيْـم العَاقِبَـة)**، لێـرەدا فەرمـان بەکارهێـنراوە بـۆ مۆڵەتـدان و ترسـاندن و هەڕەشـەلێکردن، واتـە: ڕابواردنتـان و خواردنتـان شـتێك نیـە، چونکـە کەمـە، سـەرەنجامەکەشی خراپـە.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُم مُّجۡرِمُونَ﴾، (إنَّ) بۆ جەختکردنەوەو داکۆکییکردنە، بەڵام لێرەدا هەواڵدانەو مەبەست پێی هەڕەشەلێکردنە، چونکە تاوانباریی، سزاباریی بەدوا دادێ، بۆیەش بە (إنَّ) ئامرازی جەختکردنەوە، تاوانباریی ئەوان جەختکراوەتەوە، چونکە نکووڵییان لەوە کردوە کە تاوانبار بن و، خۆیان پێ چاکەکار بووەو خۆیان پێ تاوانبار نەبووە، بۆیە خوا دەفەرموێ: بە دڵنیایی ئێوە تاوانبارن، ئنجا کە تاوانباریش بوون، مانای وایە دەبێ چاوەڕێی سزاو تۆڵەی خوا بکەن.

٢)- ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران، واتە: بەدرۆدانەرانی ئەوە کە: تاوانباران و خراپەکاران سزا بدرێن و لێیان بپێچرێتەوە.

٣)- ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرۡكَعُواْ لَا يَرۡكَعُونَ﴾، ئەگەر پێشیان بگوترێ: ڕکووع ببەن، ڕکووع نابەن، پێشتریش گوتم: وشەی (ركوع) ئێمە لە زمانی کوردییدا کە بەکاری دێنین، بۆ پایە گرنگەکەی نوێژ، بەکاری دێنین، نوێژ چەند پایەیەکی گرنگی هەن، وەك نیەت هێنان و، ڕاوەستان و، چەمینەوە، کە ڕکووعە، پاشان هەڵسانەوە، دوایی کڕنووش بردنەکان، دوایی خوێندنی تەحییات، ئەوانە پایە گرنگەکانی نوێژن و دووبارەش دەبنەوە، ئێمە وشەی ڕکووع هەر بۆ ئەوە بەکاردێنین، بەڵام ڕکووع لە زمانی عەرەبییدا، جگە لە مانای پایەیەك لە پایەکانی نوێژ کە ڕکووعە، بە مانای چەمینەوەش بەکاردێ و، بە مانای ملکەچییش بەکاردێ و، ئەوە مانا مەعنەوییەکەیەتی.

لێرەدا وای تێدەگەم زیاتر مەبەست پێی مانا مەعنەوییەکەی بێ، واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: بۆ خوا ملکەچ بن، بۆ خوا بنووشتێنەوەو بچەمێنەوە، بە چەمانەوەو نووشتانەوەی مەعنەویی، مل بۆ خوا نەوی بکەن، سەر بۆ خوا دابخەن، لە بەرانبەر خوادا بچووکیی بنوێنن، کە هەر بچووکن و، خوا خاوەنی ئەوپەڕی مەزنیی و گەورەییە، مرۆڤیش کە بەشێکە لە موڵکی خوا، وای شایستەیە، لە بەرامبەر خوادا، خۆی بناسێ و کە خۆی ناسیی مانای وایە بۆ خوا ملکەچ

دەبێ، ئەگەر ئاوایان پێ بگوترێ، ئەوان بۆ خوا ملکەچ نابن، لە بەرامبەر خوادا ناچەمنەوە، دەشگونجێ هەر مەبەست پێی ڕکووع[1] بێ، چونکە ئەگەر پێیان بگوترێ: نوێژ بکەن، کە یەکێك لە پایە گرنگەکانی نوێژیش بریتیە لە ڕکووع، نوێژ ناکەن و خوا ناپەرستن.

٤)- ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ بەدرۆدانەران، واتە: بەدرۆدانەرانی پەیام و ئایینی خواو، شەریعەتێك کە خوا ناردوویەتی.

٥)- ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴾، لە دوای وی (دوای ئەم قورئانە)، بڕوا بە چ فەرمایشتێك دێنن؟ لێرەدا ئەم پرسیارکردنە بۆ سەرسوڕماندن و نکوولیلێکردنە **(للتَّعْجِيْب وَالإِنْكَار)**، واتە: ئەگەر بڕوا بە قورئان نەهێنن، مانای وایە بڕوا بە هیچی دیکە ناهێنن، چونکە قورئان دوا فەرمایشتی خواو دوا کتێبی خوایە بۆ کۆتا پێغەمبەری خۆی دایبەزاندوە، دوای قورئان، خوا ﷻ جارێکی دیکە بەشەر نادوێنێتەوە، دوا دواندنی خواو، کۆتا فەرمایشتی خوا، لە دوو توێی قورئان دایە، لە دوای قورئان، خوا جارێکی دیکە بەشەر نادوێنێتەوەو، لە دوای موحەممەد ﷺیش، نوێنەرێکی دیکەی خۆی نانێرێتەوە، کەواتە: ئەگەر بڕوا بە قورئان نەهێنن و، بە دوای پێغەمبەر موحەممەد ﷺ نەکەون، مانای وایە نایانەوێ بڕوا بێنن.

مانایەکی دیکەشی ئەوەیە: ئەگەر بڕوا بەو قورئانە مەزنە نەهێنن، کە لە بەرانبەری دا دەستە پاچەو دەسەوسانن کە نەك وێنەی قورئان بێنن، بەڵکو وێنەی دە سوورەت، بگرە وێنەی یەك سوورەتی بێنن، یەك سوورەتی سێ ئایەتیی، ئەگەر بڕوا بەو قورئانە نەهێنن، ئایا بڕوا بە چی دیکە دێنن؟ واتە: ئەو قورئانە هێندە مەزنە، هەر کەسێ بڕوا بە قورئان نەهێنێ، بڕوا بە هیچ شتێك ناهێنێ، هەڵبەتە پێشتریش گوتمان: تاکە موعجیزە کە پێغەمبەری کۆتایی خوا ﷺ وەك بەڵگەی سەلماندنی ڕاستیی لە دەعوای پێغەمبەرایەتیی دا، بەکاری هێنابێ، بریتی

---

(١) واتە: ڕکووع بردنی نێو نوێژ.

بـووە لـە قورئـان، بـەڵام ئایـا پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ تەنیـا قورئـانی هەبـووە، وەك موعجیـزە؟! بـە دڵنیایـی نەخێـر، پێغەمبـەری خـوا ﷺ موعجیـزەی زۆر بـوون بـۆ وێنـە[١]:

١- ئاو لە نێوان پەنجە موبارەکەکانی هەڵقوڵاوە.

٢- پێغەمبەر ﷺ دوعای کردوە خواردنی کەم زۆر بووە، خواردنێك کە بەشی سێ چوار کەسی کردوە، بەشی چەند سەد کەسی کردوە، چەند جارێك ئەوە دووبارەبۆتەوە.

٣- پێغەمبەری خوا ﷺ دەنکە چەو و بەرد لە دەستی دا تەسبیحاتی کردوە.

٤- بەرد سڵاوی لێکردوە.

٥- پێغەمبەری خوا ﷺ بنکە دارخورمایەك کە وتاری لەسەر داوە، وەك بەچکە حوشتر ناڵاندوویەتی، دوای ئ مینبەرێکیان بۆ دروست کردوە، چۆتە سەر مینبەرەکە، هەتا هاتۆتە خوارو دەستی پێدا هێناوە.

٦- پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وا هەبووە، نەخۆشێ هاتۆتە لای دوعای بۆ کردوە، یەکسەر چاك بووە.

٧- دوعای بۆ کەسێك کە چاوی لە دەستداوە کردوەو چاوەکەی داناوەتەوە، لە جاران چاوەکەی جوانترو تیژتر بووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتانەی زۆر بوون، بەڵام هیچ کام لەوانەی بەکارنەهێناوە بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، بەڵکو تاکە بەڵگەیەك بەکاری هێنابێ بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتییەکەی، بریتی بووە لە قورئان، چونکە ئەگەر ئەوانی دیکەی بەکارهێنابایە، وەك بەڵگە، ئێستا ئێمە پەکمان دەکەوت، ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی کراوە، ئێمە پێمان ناکرێ، مانای وایە پەکمان دەکەوت بۆ سەلماندنی ڕاستیی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام

(١) لەکتێبـی حەوتەمـی مەوسـووعەی: [الإسـلام کـما یتجلـى فـی کتـاب اللـه] دا بـە ناونیشـانی: (خاتـم النبیـن محمـد: )

پێغەمبەری خوا ﷺ، تەنیا ئەم قورئانەی وەك بەڵگە بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی هێناوەتەوە، ئەم قورئانەش لە بەردەستی ئێمەدایە، هەروەك لە مانا گشتییەكەشیدا باسمانكرد كە لە سووڕەتی (**العنكبوت**)دا، خوا فەرموویەتی: ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾﴾، واتە: (بێبڕوایەكان گوتیان:) دەبووایە نیشانەكانی بۆ دابەزن، (موعجیزەی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو، موعجیزەی بەرهەست، خواش ﷻ دەفەرمویّ:) بڵێ: نیشانەكان تەنیا لە لای خواوەن و من تەنیا ترسێنەرو ورياكەرەوەیەكی ڕوون و ئاشكرام (یاخود ئاشكراكەرم)، {دوایی خوا دەفەرمویّ:} ئایا بۆ ئەوان بەس نیە، ئێمە كتێبێكمان دابەزاندۆتە سەرت بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە، لەوەدا بەزەیی و پەندو بیرخەرەوە هەیە بۆ كەسانێك بڕوابێنن.

واتـە: كۆمەڵێـك كـە دەیانـەوێ بڕوابێنـن، ئـەوە قورئـان بەڵگەیـە لەبـەر دەسـتیان، ئەگـەر نەشـیانەوێ بڕوابێنـن، ئەگـەر جگـە لـە قورئـان چەنـدان موعجیـزەی دیكەشـمان بـۆ تـۆ ڕەخسـاندبانایە، ئـەی موحەممـەد ﷺ! هـەر ئیمانیـان نەدەهێنـا، چونكـە: ئەگـەر دز دز بـێ، تاریكـە شـەو زۆرن!

ئایا بێبڕوایەكان بەئەركەكانی شەریعەت ئەركداركراون؟!

لێـرەدا زانایـان مەسـەلەیەكیان باسـكردوە: ئایـا بێبڕوایـەكان ئەركـدار كـراون بـە ئەركـەكانی شـەریعەتەوە، ئایـا ئەركـەكانی شـەریعەت ئەوانیـش دەگرنـەوە، كـە بڕوایان بـە ئەسـڵی دیـن نیـە؟

(**فخرالدین الرازي**) دەڵێ: بەڵێ، بەڵام (**إبن عاشور**) دەڵێ: نەخێر!

منیـش دەڵێـم: لـە ڕاسـتییدا ئـەم ئایەتـە پەیوەندیـی بـەوەوە هـەر نیـە، بێگومـان كەسـێك كـە بانـگ دەكـرێ بـۆ ئیسـلام، پێشـێ بانـگ دەكـرێ، بـڕوا بە ئەسـڵی ئیسـلام

بێنێ، ئنجا دوایی داوای لێ دەکرێ، پابەند بێ، تاکو بڕوای بە بنچینەکانی ئیسلام نەبێ، یان خوا نەناسێ و، خوا بە پەرستراوی خۆی نەزانێ و، موحەممەد ﷺ بە ڕابەرو پێشەواو سەرمەشق و ڕەوانەکراوی خوا نەزانێ و، قورئان بە بەرنامەو بە دوا کتێبی خوا نەزانێ، چۆن بەندایەتیی بۆ خوا دەکات و، پەیڕەویی لە پێغەمبەر ﷺ دەکات و، شوێن قورئان دەکەوێ؟!.

کەواتە: شتێکی ئاشکرایە کە پێشێ خەڵك بانگ دەکرێ بۆ بڕواهێنان بە بنچینەکانی ئیسلام، دوایی داوای لێ دەکرێ پابەند بێ بە لقەکانی دینەوە، ئەم ئایەتەش لێرەدا هیچ پەیوەندیی بەو مەسەلەیەوە نیە، بەڵکو ئەمە دڵدانەوەیە بۆ بڕواداران، کە کتێبەکەیان قورئانەو لە دوای قورئان هیچ کتێبێکی دیکە نیە، شایستەی ئەوە بێ، خەڵك ئیمانی لەسەر بێنێ و، با بزانن کە ئەم قورئانە بەسە بۆ ئەوەی خەڵك ئیمانی پێ بە خوا بێنێ و، پێی ببێتە بڕوادار، بۆ کەسێك لە ئیمان و بڕواهێنان بخەفتێ، بەڵام کەسێك کە بە قورئانێ ئیکتیفا ناکات، هەرچەندە تێشیگەیشتوە، ئەوە لە ڕاستییدا هەر نایەوێ ئیمان بێنێ و، با بڕواداران دڵنیابن کە کتێبەکەیان ڕاسترین و تەواوترین کتێبەو، بەڵکو تەنیا کتێبی ڕاست و تێرو تەواوو دەستکاریی نەکراوی خوایەو، شایستەی ئەوەیە، مرۆڤ شوێنی بکەوێ و بیکاتە بەرنامەی ژیانی، کەواتە: بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوایەکان بڕوای پێناهێنن، با لە بارەیەوە نەکەونە دوو دڵیی و گومانەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە بەڕاستیی ئیمان بە قورئان دێنن، ئیمانێکی بێ خلتەو قووڵ و مەحکەم، ئیمانێکی وا، کە هەرچی پابەندییە، پەلکێشی بکات و، هەرچی سیفەتی بەرزە، پەلکێشی بکات بۆمان، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، کە وەك بۆ قورئان شایستەیە، بۆ دوا فەرمایشتی خوا، شایستەیە ئاوا مامەڵەی لەگەڵ دا بکەین..

# دەستپێک

بەرێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٦)ی (**ذي القعـدة**)ی سـاڵی (١٤٤١)ی كۆچییـە، بەرانبـەر (٢٧/ حوزەیرانـی/٢٠٢٠)ی زایینیـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ، دەسـت دەكەیـن بـە تەفسـیركردنی سـوورەتی (**النَّبَأ**)، وەك عـادەتی خۆمـان، پێشـەكی پێناسـەو نێوەڕۆكی ئـەم سـوورەتە دەخەینـەڕوو لـە حـەوت بڕگـەدا:

## پێناسەی سوورەتی (النبأ)و بابەتەكانی

### یەكەم: ناوی ئەم سوورەتە:

نـاوی هـەرە بـاوی ئـەم سـوورەتە موبارەكـە: (**سُـورَةُ النَّبَـأ**)ە، چونكـە وشـەی (**النَّبَأ**) لـە سـەرەتاكەیەوە هاتـوە: ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ۝١ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ۝٢﴾، واتـە: لـە چـی لـە یەكـدی دەپرسـن؟ لـە بـارەی هەواڵـە مەزنەكـەوە، بـەڵام وێـڕای ئـەو نـاوە، (**سُـورَةُ النَّبَـأ**)، چـوار نـاوی دیكەشـی بـۆ بەكارهاتـوون:

أ: (**سُورَةُ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ**)،

ب- (**سُورَةُ عمَّ**)،

ج- (**سُورَةُ التَّسَائل**)،

د- (**سُورَةُ المعصرات**).

كەواتـە: ئـەم سـوورەتە پێنـج نـاوی بـۆ بەكارهاتـوون، بـەڵام نـاوی باوتـر و ناسراوتـری، بریتیـە لـە: (**سُـورَةُ النَّبَـأ**).

## ٢)- شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـووڕەتە بـە یەکدەنگیـی هەمـوو زانایـان: سـووڕەتێکی مەککەییـە، وەك (السـیوطي) لـە تەفسـیرە ناودارەکـەی خـۆی: (الـدر المنثـور)دا[1]، هێناویەتـی و پاڵیشـیداوەتە لای (إبن الضُّریس والنحاس و ابن مردویە والبیهقي)و ئـەم دەقەشـی هێنـاوە: {عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَة ﴿ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ۝١ ﴾ بِمَكَّـة}، واتـە: لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـەوە ﵄ گێردراوەتـەوە گوتوویەتـی: سـووڕەتی: ﴿ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ۝١ ﴾ لـە مەککـەدا دابەزیـوە.

هەروەهـا (السـیوطي)، هـەر لـە سـەرچاوەی ناوبـراو (الـدر المنثـور)دا، هەمـان شتیشـی پاڵداوەتـە لای عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، ئەویـش هـەر گوتوویەتـی: (نَزَلَـتْ سُـورَة: ﴿ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ۝١ ﴾ بِمَكَّـة).

نەشـمزانیوە هیـچ زانایـەك لـەو بـارەوە ڕاجیایـی و مشـت و مـڕی بووبـێ، کـە ئـەم سـووڕەتە لـە مەککـەدا دانەبەزیوە.

## ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

لـە موصحەفـدا ژمارەکـەی حەفتـاو هەشـت (٧٨)ە، چونکـە ئـەم بـەش (جـزء)ی سـێیەم، سی و حـەوت (٣٧) سـووڕەت دەگرێتـە خـۆی و، ئـەم سـووڕەتە یەکەمینیـان و حەفتـاو هەشـتەمین سـووڕەتە کـە لـە سـووڕەتی فاتیحـەو سـەرەتای موصحەفـەوە دێـی بـەڵام، لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا، بـە پێـی ڕای جابیـری کـوڕی زەیـد کـە یەکێکـە لـە زانایـانی شـوێنکەوتووان (تابعیـن)و، سـەرنجی ئـەوەی داوە: کام سـووڕەت پێـش کام سـووڕەت و، کام سـووڕەت دوای کام سـووڕەت دابەزیـوە؟ دەڵـێ: ئـەم سـووڕەتە سـووڕەتی هەشـتا (٨٠)یەمینـەو، پێـش سـووڕەتی (النازعـات) دابەزیـوەو،

---

(١) ج٣، ص٣٨٩.

دوای سـووڕەتی (المعـارج)، پێشـتریش گوتوومانـە ئـەوە بـۆ چوونێکـی ئیجتیهادیـی ئـەو زانایەیـەو دەگونجـێ نەپێکابـێ و، بـە ڕای بەنـدە ئـەم سـووڕەتە لـە سـەرەتایەکانی قۆناغـی مەککەیـە، بـەڵام ئـەو وای دانـاوەو، گریـمان زووتـر دابەزیبـێ یـان درەنگـتر، شـتێك لـە بابەتەکـە ناگـۆڕێ.

## ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:

زۆربـەی هـەرە زۆری ژمێرەرانـی ئایەتەکانـی قورئـان، ژمـارەی ئایەتەکانـی ئـەم سـووڕەتەیان بـە چـل (٤٠) دانـاوەو، هەندێکیشـیان بـە (٤١)یەکیـان دانـاوە، بـەڵام زیاتـر ژمـارەی چـل (٤٠) تەبەنیـی کـراوە، بـە تایبـەت لـەو موصحەفانـەی لەبـەر دەسـتی ئێمـە دان و، لـەم دەڤەرانـەی ئێمـە چـاپ کـراون، بۆیـەش وا دەڵێـم: تاکـو ئەگـەر کەسـێك موصحەفێکـی لـە شـوێنێك لـە وڵاتێـك کەوتـە بەرچـاو، کـە ئـەم سـووڕەتە (سـورة النبـأ)، چـل و یـەك (٤١) ئایەتـە، بـا سـەری سـوڕنەمێنێ، کورتیـی و درێژیـی ڕستەکانیشـە دەبێتـە هـۆی جیاوازیـی ژمـارەی ئایەتـەکان، چەنـد جارێکـی دیکـەش باسـمان کـردوە.

## ٥)- نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

تـەوەری سـەرەکیی ئـەم سـووڕەتە، بریتیـە لـە ڕۆژی دوایـی و، هـەر چـل (٤٠) ئایەتەکـەی ئـەم سـووڕەتە موبارەکەیـان لـێ پێـك دێ، بـەم جـۆرە دابـەش بـوون، بەسـەر قۆنـاغ و ڕووداوەکانـی ڕۆژی دواییـدا:

بابەتـی یەکـەم: لـە پێنـج ئایەتەکانـی: (١ - ٥)دا، باسـی مشـتومڕو پرسـیارکردنی بێبڕوایانـە لـە بـارەی ڕۆژی دواییـەوە لـە نێـو خۆیانـدا، کـە لـە بارەیـەوە مشـت و مـڕو ڕاجیاییـان بـووە.

بابەتـی دووەم: لـە دوازدە ئایەتەکانـی: (٦ - ١٧)دا، باسـی خسـتنە ڕووی یـازدە (١١) بەڵگەیـە لەسـەر هاتنـی ڕۆژی دوایـی، خـوا ﷻ دوای ئـەوەی باسـی ڕاجیایـی

و پرسیارکردن و نکووڵییلێکردنی بێبڕوایان دەکات لە بارەی ڕۆژی دواییەوە، یازدە (١١) بەڵگە دەخاتە ڕوو لە دەورو بەرماندا‌و، لە خۆماندا، لەسەر ئەوەی ڕۆژی دوایی حەقەو ڕاستەو دێ.

بابەتی سێیەم: لە سێ ئایەتەکانی: (١٨ - ٢٠)دا، باسی قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییە، کە ئاخیر زەمانەو، پێچرانەوەی لاپەڕەی ئەم گەردوونەیە.

بابەتی چوارەم: لە دە (١٠) ئایەتەکانی: (٢١ - ٣٠)دا، باسی دۆزەخ و دۆزەخییانە: کە چۆن ئازارو ئەشکەنجە دەدرێن و، لەسەر چی ئەو سزایە دەدرێن؟.

بابەتی پێنجەم: لە شەش ئایەتەکانی: (٣١ - ٣٦)دا، باسی بەهەشت و بەهەشتییانە.

بابەتی شەشەم و کۆتایی: لە چوار ئایەتەکانی: (٣٧ - ٤٠)دا، باسی خوای پەروەردگارو هەندێك لە سیفەتەکانی و، باسی ڕۆژی دوایی و، سەرەنجامی پەشێمانانەی بێبڕوایانە، کە خۆزگە دەخوازن بەوەی هەر گڵ بوونایە، یاخود ببوونایەوە بە گڵ و خاک.

## ٦) تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

دەگونجێ ژمارەیەك تایبەتمەندیی لەم سوورەتە موبارەکەدا باس بکرێن، بەڵام بەڕای من ئەم چوار (٤)ە سەرەکییەکانن:

١- لەم سوورەتەدا ڕۆژی دوایی، بە: (النَّبَأُ العَظِيْم) ناونراوە لە ئایەتی دووەمداو، نایەتەوە یادم لە هیچ سوورەتێکی دیکەدا ئەو ناوە، (هەواڵی هەرە گەورەو مەزن) کرابێ بە ناوی ڕۆژی دوایی.

٢- یازدە (١١) بەڵگە لەم سوورەتە موبارەکەدا، لەسەر هاتنی قیامەت هێنراونەوە، لە دوازدە ئایەتەکانی: (٦ - ١٧)دا.

٣- تەنیا لەم سوورەتەدا خۆزگە خواستنی کافر بە: گڵ بوون، باسکراوە، لە ئایەتی ژمارە (٤٠)دا، لە هەموو قورئاندا تەنیا لە ئایەتی ژمارەی چل (٤٠)ی ئەم سوورەتەدا باس کراوە، کە بابای کافر لە ڕۆژی دواییدا خۆزگە دەخوازێ گڵ بووایە، یاخود ببووایەوە بە گڵ.

٤- چەند تەعبیرو وشەیەك تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

أ- (عمّ يتساءلون).

ب- (كواعب).

ج- (كِذَّاب).

د- (لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا).

## ٧)- دابەشکردنی ئایەتەکانی:

ئێمە کۆی ئەم چل ئایەتەی ئەم سوورەتە موبارەکە، بۆ دوو دەرس دابەش دەکەین:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٢٠)، بیست (٢٠) ئایەتی یەکەم دەگرێتە خۆی، کە باسی ڕۆژی دوایی و بەڵگەکانی و، هەندێك لە نیشانەکانی ئاخیر زەمان، لەو بیست (٢٠) ئایەتەدا، خراونە ڕوو.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی: (٢١ - ٤٠)، بیست (٢٠) ئایەتی دووەمی ئەم سوورەتە موبارەکە، کە باسی دۆزەخ و دۆزەخییەکان، بەهەشت و بەهەشتییەکان و، پایە بەرزیی خوای بێ وێنەو، باسی قیامەت و پەشێمان بوونەوەی بابای بێبڕوا، کە خۆزگە دەخوازێ گڵ بووایە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان بیسـت (٢٠) ئایەتـی یەکـەم دەگرێتـە خـۆی و لـە بارەیانـەوە دەڵێیـن: خـوا ﷻ لـە سـەرەتای بیسـت (٢٠) ئایەتـی یەکەمـی سـوورەتی (النَّبَأ)دا دەفەرمـوێ: ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾، ئایا ئەوانـە لـە بـارەی چییـەوە لـە یەکدیـی دەپرسـن؟ دوایـی هـەر خـۆی ڕوونـی دەکاتـەوەو وەڵامدەداتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ﴾، لـە بـارەی هەواڵـە مەزنەکەوەیـە، یـانی: ڕۆژی دواییـە ئـەوەی تێیـدا کەوتوونـە کێشـەو مشـت و مـڕو بگـرەو بـەردە، دوایـی دەفەرمـوێ: نەخێـر بـا واز بێنـن بـە زووی دەزانـن، جارێکـی دیکـەش بـاواز بێنـن بـە زوویـی دەزانـن، ئنجـا خـوا ﷻ لـە دوازدە (١٢) ئایەتـی دواییـدا، ئایەتەکانـی: (٦ - ١٧)، یـازدە (١١) بەڵگـە دێنێتـەوە لەسـەر سـەلماندنی بوونـی ڕۆژی دوایـی و، پووچەڵیـی گومـان و دوو دڵیـی بێبڕوایـان لـە بـارەی هاتنـی ڕۆژی دواییـەوە، یـازدە (١١) بەڵگەکانیـش ئەوانـەن:

**یەکەم:** ڕاخستنی زەویی و ئامادەکردنی بۆ مرۆڤ، کە لەسەری بژی.

**دووەم:** وەك گوڵمیخ لێکردنی چیایەکان، کە وەك چۆن گوڵمیخەکان و سینگەکان بە دەوری چادرو ڕەشماڵ دا دەچەقێنرێن، تاکو ڕاگیری بکەن، چیایەکانیش ئاوا زەوییان ڕاگیر کردوە.

**سێیەم:** بە جووت خوڵقێنرانی مرۆڤەکان.

**چوارەم:** بە مایەی پشوودان و سرەوتن گێڕانی خەوو نووستن.

**پێنجەم:** بە پۆشاك گێڕانی شەوگار.

**شەشەم:** بە جێی تێدا کاسبیی کردن و بژیو پەیداکردنی ڕۆژگار.

**حەوتەم:** بنیاتنانی حەوت ئاسمانی مەحکەم و بەهێز لە سەروومانەوە.

**هەشتەم:** گێڕانی خۆر بە چرایەکی تیشکدەری زۆر ڕوون و پڕشنگدار.

**نۆیەم:** دابەزاندنی ئاوی بە لووزەوو بە خوڕ لە هەورە گوشراوەکانەوە.

**دەیەم:** کە سەرەنجام خوا ﷻ بەو ئاوە بە خورزەمە، دانەوێڵەو ڕووەکی پێ دەڕوێنێ لە زەوی دا.

**یازدەیەم:** هەروەها خوا باغ و چڕو پڕەکانیشی پێ دەڕوێنێ.

ئنجا دوای خستنە ڕووی ئەو یازدە (١١) بەڵگەیە، کە لە هەمان کاتدا یازدە (١١) چاکەو نیعمەتی خواشن، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا ﴿١٧﴾ ﴾، بە دڵنیاییەوە ڕۆژی لێکهەڵاواردن کاتەکەی دیاریکراوە.

کەواتە: خوا ﷻ کە ئەم گەردوونەی بە ڕێك و پێکیی خوڵقاندوەو، ئەم هەموو چاکەو نیعمەتانەی بە ئێوە داون و، توانای ئەوەشی هەیە زیندووتان بکاتەوەو، ئەو خوای پەروەردگارە وای لێ چاوەڕان دەکرێ، سزاو پاداشتێك دابنێ بۆ ئێوە، چونکە ژیانی ئێوە هەمووی ڕێك و پێکییە، بەڵام ئەگەر بێت و ژیانی دنیا، قۆناغێکی دیکەی بە دوادا نەیەت، کە قۆناغی سزاو پاداشتە، ئەو کاتە ژیانە دنیاییەکەتان وەك ڕۆمانێکی بێ تام و چیرۆکێکی بێ ئەنجام دێتە بەرچاوو، ئەوەش شایستەی خوای کاربەجێ نیە.

ئنجا لە سێ ئایەتی دواییشدا، باسی هەندێك لە کارەسات و ڕووداوەکانی ئاخیر زەمان دەکات، کە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییە، دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴾، ئەو ڕۆژەی فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، ئێوەش پۆل پۆل، کۆمەڵ کۆمەڵ دێن، ﴿ وَفُتِحَتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ أَبْوَابًا ﴾، ئاسمانیش کرایەوەو بوو بە دالان دالان، بوو بە دەروازە دەروازە، ﴿ وَسُيِّرَتِ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴾، چیایەکانیش ڕۆێنران و هەڵقەنران لە شوێنی خۆیان و بوونە تۆزو گەردی، وەك تراویلکە، هەڵبەتە: (وَفُتِحَتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ أَبْوَابًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ الْجِبَالُ فَكَانَتْ

سَرَابًا ﴿٢٠﴾)، لە نیشانەکانی ئاخیر زەمانن، بەڵام ئەوە کە دەفەرمویٚ: ﴿ فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجًا ﴾، بە دڵنیاییی ئەمە پەیوەستە بە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییەوە کە قۆناغی قیامەتەو، لێرەدا خوای پەروەردگار تێکهەڵکێشی کردوون.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢﴾ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ مُخۡتَلِفُونَ ﴿٣﴾ كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ ﴿٥﴾ أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا ﴿٦﴾ وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ﴿٧﴾ وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ﴿٨﴾ وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا ﴿٩﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا ﴿١٠﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشٗا ﴿١١﴾ وَبَنَيۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعٗا شِدَادٗا ﴿١٢﴾ وَجَعَلۡنَا سِرَاجٗا وَهَّاجٗا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡمُعۡصِرَٰتِ مَآءٗ ثَجَّاجٗا ﴿١٤﴾ لِّنُخۡرِجَ بِهِۦ حَبّٗا وَنَبَاتٗا ﴿١٥﴾ وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا ﴿١٦﴾ إِنَّ يَوۡمَ ٱلۡفَصۡلِ كَانَ مِيقَٰتٗا ﴿١٧﴾ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجٗا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ أَبۡوَٰبٗا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلۡجِبَالُ فَكَانَتۡ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، (ئەو خەڵکە) لە بارەی چییەوە لە یەکدی دەپرسن؟ ﴿١﴾ لە بارەی هەواڵە مەزنەکەوە! ﴿٢﴾ ئەو (هەواڵ)ەی تێیدا ڕاجیاو مشت و مڕ کەرن؟ ﴿٣﴾ نەخێر وانیە (کە ئەوان دەڵێن) بە زوویی دەزانن ﴿٤﴾ دیسان وانیە بە زوویی دەزانن ﴿٥﴾ ئایا زەوییمان نەکردۆتە (نشینگەیەکی) وەك ڕایەخ؟ ﴿٦﴾ چیایەکانیشمان کردوونە گوڵمیخ ﴿٧﴾ بە جووتیش دروستمان کردوون ﴿٨﴾ نووستنیشتانمان گێڕاوە بە (مایەی) پشوودان و ئاسوودەیی ﴿٩﴾ شەوگاریشمان گێڕاوە بە پۆشاك (داتاندەپۆشێ) ﴿١٠﴾ ڕۆژگاریشمان گێڕاوە بە

(هـۆکاری) بژیـوو گـوزەران ﴿١١﴾ لـە سەرووشـتانەوە حـەوت (ئاسـمانی) مەحکـەم و قاییمـمان بنیاتنـاون ﴿١٢﴾ چرایەکـی تیشکدەریشـمان بـۆ ڕەخسـاندووون ﴿١٣﴾ لـە (هـەورە) گوشراوەکانیـش ئاوێکـی بـە خورزەمـمان دابەزانـدوە ﴿١٤﴾ تاکـو دانەوێڵـەو ڕووەکـی پـێ (لـە زەویـدا بڕوێنیـن و) دەربێنیـن ﴿١٥﴾ هەروەهـا باخـە چـڕو پـڕەکان ﴿١٦﴾ بـە دڵنیاییـەوە ڕۆژی هـەڵاواردن (ی پـاك و پیسـان) ژوانگـەدارە ﴿١٧﴾ ئـەو ڕۆژەی فـوو بـە کەڕەنـادا دەکـرێ، ئنجـا پـۆل پـۆل دێـن (بـۆ گۆڕەپانـی کۆکرانـەوە) ﴿١٨﴾ ئاسـمانیش کرایـەوەو بـوو بـە دەروازە گـەل (و دالاّنـدالاّن بـوو) ﴿١٩﴾ چیایەکانیـش ڕۆێـنران (هەڵکەنـران و وردو خاشـکران و) بوونـە (تـۆزو گـەردی وەك) تراویلکـە ﴿٢٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَتَسَآءَلُونَ): لـە یەکـدی دەپرسـن، (**السُّؤالُ: اسْـتِدْعَاءُ المَعْرِفَـةِ، أو مَـا يُـؤَدِّيَ إلى المَعْرِفَة، أو اسْـتِدْعَاءُ مَـالٍ، أومَـا يُـؤَدِّيَ إلى المَـال**)، (**سُؤال**): بریتیـە لـە داواکردنـی زانیاریـی، یـان شـتێك کـە ببێتـە هـۆی پەیدابوونـی زانسـت، یـان داواکردنـی مـاڵ و سـامان، یـان شـتێك کـە ببێتـە هـۆی پەیداکردنـی مـاڵ و سـامان.

(عَمَّ)، لـە ڕیشـەدا (**عَـنْ مَا**)یـە، (**عَـنْ**) پیتـی (**جَـرّ**)ەو، (**مَـا**)، (**مَـا الإسْـتِفْهَامية**)یەو، بـۆ پرسـیارکردنە، کەواتـە: ﴿عَمَّ﴾، ئەلیـف (أ)ەکـەی لاچـووە، ئەگەرنـا لـە بنچینـەدا (**عَـنْ ما**)یـە، واتـە: (**عَـنْ أيِ شَيءٍ؟**)، لـە بـارەی چییـەوە لـە یەکـدی دەپرسـن، چونکـە وشـەی (**تَسَـاؤل**): (**تَفَاعُـلٌ مِـنَ السُّـؤال**) واتـە: پرسـیار لـە یەکـدی دەکـەن.

(ٱلنَّبَإِ): (**النَّبَـأ: خَـبَرٌ ذُو فَائِـدَةٍ عَظِيْمَـةٍ يَحْصُـلُ بِـهِ عِلْـمٌ أو غَلَبَـة ظن**)، (**نَبَـأ**): هەواڵێکە سـوودێکی مەزنـی هەیـە، بـە هـۆی ئـەو هەواڵـەوە زانیاریـی یاخـود گومانێکـی زاڵ پەیدادەبێ.

(ٱلْعَظِيمِ): (عَظُمَ الشَّيء: كَبُرَ عَظْمُهُ، ثُمَّ اسْتُعِيْرَ لِكُلِّ كَبِيْرٍ، مَحْسُوسَاً أو مَعْقُولاً)، (عَظِيْم): لە (عَظُم)ەوە هاتوە، (عَظُمَ الشَّيء) واتە: ئێسقانەکەی گەورە بوو، دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر شتێك قەبارەکەی گەورە بێ، چ بەرهەست بێ، چ نا بەرهەست بێ.

(مِهَٰدًا): (المَهْدُ: مَا يُهَيَّأُ للصَّبِيّ، وَالمَهْدُ وَالمِهَاد: المَكَانُ المُمَهَّدُ المُوطَّأ)، وشەی (مَهْد) ئەوەیە کە بۆ منداڵی گچکە ئامادە دەکرێ، (بە کوردیی دەڵێن: لانکە یان بێشکە، پێشی دەگوترێ: جۆلانە)، هەروەها وشەی (المَهْدُ وَالمِهَاد) واتە: شوێنێکی خۆشکراو، ئامادەکراو، سازکراو.

(أَوْتَادًا): کۆی (وَتِد وَوَتَد)ە، (وَتَدْ) سینگ، گوڵمیخ، بە کەسرەو، بە فەتحەش دەگوترێ: (وَتَدْتُهُ أَتِدُهُ وَتْداً)، واتە: دامکوتا، دایدەکوتم، داکوتران.

(سُبَاتًا): (أَصْلُ السَّبْتِ: قَطْعُ العَمَلِ، سَبَتَ السَّيْرَ: قَطَعَهُ، سَبَتَ شَعْرَهُ: حَلَقَهُ)، کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ۝٩﴾، واتە: خەوەکەتمان گێڕاوە بە مایەی پشوودان و ڕاوەستان و ئۆقرە گرتن، وشەی (سُبَات) لە (سَبْت)ەوە هاتوە، (سَبْت) بە مانای وەستاندنی کار، دەگوترێ: (سَبَتَ السَّيْرَ)، {(سَيْر) یانی: زوێڵە چەرم}، چەرمەکەی بڕی، (سَبَتَ شَعْرَهُ)، واتە: قژی خۆی بڕی، پرچی خۆی تاشی.

(مَعَاشًا): (العَيْشُ: الحَيَاةُ المُخْتَصَّةُ بِالْحَيوَانِ، وَهُوَ أَخَصُّ مِنَ الحَيَاةِ)، (عَيْش): یانی: ژیانێکی تایبەت بە ژیاندارانەوە، کە تایبەتترە لە ژیان، {یانی: وشەی (عَيْش) و (حَيَاة) هەردووکیان بە مانای ژیانن، بەڵام وشەی (عَيْش) مانایەکەی تایبەتترە لە (حَيَاة) چونکە خوای پەروەردگار وشەی (حَيَاة)ی بۆ بەکاردێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۝٢٥٥﴾ البقرة، بەڵام وشەی (عَيْش)ی بۆ بەکارنایەت}.

(المَعِيْشَة: مَا يُعَيِّش)، (مَعِيْشَة) ئەوەیە کە مرۆڤ دەژیەنێ، (المعجم الوسيط) لە بارەی (مَعَاش)ەوە سێ واتای هێناون:

١- (مَا تَكُونُ بِه الحَيَاةُ مِنَ المَطْعَمِ وَالمَشْرَبِ وَنَحْوِهِمَا)، (مَعَاش): ئەوەیە کە دەبێتە هۆی ژیان لە خواردن و خواردنەوەو وێنەی ئەوان.

٢- (زَمَانُ التَمَاسِ العَيْشِ وَمَكَانُهُ)، کاتی خەفتان لە گوزەران و شوێنەکەی، هەردووکیان پێیان دەگوترێ: (مَعَاش) کاتی کاسبیی کردن و هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی بژیوو، شوێنی هەوڵدان بۆ پەیداکردنی بژیو.

٣- (المُرَتَّبُ الَّذِي يَتَقَاضاه مِن قَضَى مُدَّةً مُعَيَّنَة فِي خِدْمَة الحُكُومَة بَعْدَ انْقِطَاع عَنِ العَمَل)، ئەو ئەندازە سامانەی کەسێك کە ماوەیەکی لە خزمەت حکومەت دا بردۆتە سەر، دوای ئەوەی لە کار دادەبڕێ {کە پێی دەڵێن: (خانەنشین)}، وەری دەگرێ، ئەوەش پێی دەگوترێ: (مَعَاش).

دەڵێم: وشەی (مَعَاش) مەرج نیە، تەنیا خانەنشین بگرێتەوە، بەڵکو هەموو ئەو کارمەندانەی مووچە لە میریی وەردەگرن، مووچەکەیان پێی دەگوترێ: (مَعَاش).

وشەی (مَعِيشَة) کە بە مانای (مَعَاش)یش دێ، بە هەرسێ واتایەکە، بە (مَعَايِش) کۆ دەکرێتەوە، (عِيْشَة: عِيْشَة رَاضِيَة)، (حَالَةُ الإِنْسَانِ فِي حَيَاتِه)، (عيشة) بریتیە لەو حاڵەتەی مرۆڤ کە لە ژیانیدا دەیبێ.

(شِدَادًا): (الشَدُّ: العَقْدُ القَوِيُّ، وَشَدَدتُ الشَّيء: قَوَّيْتُ عَقْدَهُ)، (شِدَاد) لە (شَدَّ)ەوە هاتووە، (شَدَّ العَقد)، گرێیەکەی توند کرد، (الشدُّ العَقْدُ القَوِي)، (شَدَّ) یانی: گرێدانێکی بەهێز، دەگوترێ: (شَدَدتُ الشي) شتەکەم توند کرد، بەهێزو قایمم کرد.

(شِدَاد) کۆی (شَدِيْدة)یە، بەهێزو مەحکەم و وەسفە بۆ حەوت ئاسمانەکان: ﴿سَبْعًا شِدَادًا﴾، حەوت ئاسمانە بەهێزەکان.

(سِرَاجًا وَهَّاجًا): (السِّرَاجُ: الزَّاهِر بِفَتِيْلَةٍ وَدُهْنٍ، وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنْ كُلِّ مُضِيءٍ)، (سِرَاج): چرا، ئەوەی فتیلەی هەیەو ڕۆنی تێدەکرێ، دوایی بۆ هەر تیشکدەرێك

بەکارهاتـوە، وەك لامپـاو فانـۆس، بـە فتیلەیـان گوتـوە، چـرا ڕەشـکەو، قەندیلیشـیان پـێ گوتـوە، بـەڵام دوایـی بەشـەر وردە وردە بـەرەو پێشـەوە چـووە لـەو بـارەوەو کردوویەتـی بـە فانـۆس و، کردوویەتـی بـە لامپـاو، کردوویەتـی بـە لۆکـس، دوایـی کردوویەتـی بـە چـرای کارەبایـی و بلاجکتـۆرو، هـەر خـواش دەزانـێ دەیـکات بـە چـی دیکـەش.

(**وَهَّاج**): (**الوَهَجُ: حُصُولُ الضَّوْءِ وَالحَرِّ مِنَ النَّار**)، (**وَهَج**): بریتیـە لـە پەیدابوونـی تیشـك و گەرمایـی لـە ئاگـرەوە، دەگوتـرێ: (**تَوَهَّجَتِ النارُ وتَتَوهَّجُ النارُ**)، واتـە: ئاگرەکـە بڵێسـەی داو بڵێسـە دەدات.

(**ٱلْمُعْصِرَٰتِ**): کـۆی (**المُعْصِرَة**)یـەو (**مُعْصِرَة**)ش، لەسـەر کێشـی (**مُفْعِلَة**)یـە، بـەڵام بـە مانـای (**مَفْعُولة**)یـە، وەك: (**غُرْفَةٌ مُضِيْئَة**)، (**مُضِيْئَة**)، ئەگـەر تەماشـای کێشـەکەی بکـەی بـە ڕواڵـەت واتـە: ڕووناککـەرەوە، بـەڵام لـە ئەسـڵدا بـە مانـای ڕووناککراوەیـە، (**غُرْفَةٌ مُضِيْئَة**) واتـە: ژوورێکـی ڕووناککـراوە، (**السُّحُبُ المُعْصِرَات**)یـش واتـە: هـەورە گـوشراوەکان، لەسـەر کێشـی (**مُفْعِلـة**)ن، بـەڵام بـە مانـای (**مفعولـة**)ن، واتـە: ئـەو هەورانـەی گـوشراون، لـە ئەنجامـی موتوربە بوونیانـدا، بایەکان لەسـەریەك کەڵەکەیان دەکـەن و، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا هـەورەکان موتوربـە (تلْقیـح) دەبـن و ئاویـان لـێ پەیدادەبـێ، لـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەزرەدا.

(**ثَجَّاجًا**): (**ثَجَّ المَاءُ وَأَتَى الوَادِي بِثَجِيْجِهِ**)، (**ثَجَّ المَاء**): واتـە، ئاوەکـە بـە خـورزەم و بـە خوڕیـی هـات، دەگوتـرێ: (**وَأَتَى الوَادِي بِثَجِيْجِهِ**) دۆڵەکـە ئاوەکـەی بـە زۆریـی هێنـا، هەروەهـا لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەرﷺدا هاتـوە: {**أَفْضَلُ الحَجِّ: العَجُّ وَالثَجُّ**} (**أخرجـه الترمـذي: ٨٢٧، وابـن ماجـه: ٢٩٢٤، والحاكـم: ١٦٥٥، وقـال: صحيـح الإسـناد، والدارمـي: ١٧٩٧، وأبـو يعلـي: ١١٧**) واتـە: باشـترین حـەج، (**عَجّ وَثَجّ**)، (**عَج**) واتـە: دەنـگ بـەرز کردنـەوە بـە (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَ لَبَّيْك**) بـە زیکـرەکان، (**ثَجّ**)یـش، واتـە: ڕشـتنی خوێـن، قوربانیـی، واتـە: ئـەو دووە ئەرکـە گەورەکانـی حەجـن، بـە تایبـەت زیکـرە

باوەکـە: (**لَبَّيْـكَ اللَّهُـمَّ لَبَّيْـكَ، لاَ شَرِيـكَ لَـكَ لَبَّيْـكَ ، إِنَّ الْحَمْـدَ وَالنِّعْمَـةَ لَـكَ وَالْمُلْـكَ ، لاَ شَرِيـكَ لَـكَ**)، ئەمـە لەگـەڵ سـەر بڕینـی قوربانیـی دا باشـترینی ئەرکەکانـی حەجـن.

بێگومانیـش وەسـتان لـە عەرەفـات (**الوقـوف بعرفـة**) گەورەتریـن پایـەی حەجـە، وەك پێغەمبـەری خـوا فەرموویـەتی: [**الحـج عرفـة**] (**أخرجـه أحمـد: ١٨٧٩٦، وأبـو داود: ١٩٤٩، والترمـذي: ٨٨٩، والنسـائي: ٣٠٤٤، وابـن ماجـه: ٣٠١٥، والحاكـم: ٣١٠٠، وقـال الحاكـم: صحيـح**).

(حَبًّا ): (حَـبّ) یـانی: دانەوێڵـە، تاکەکـەی (حَبَّة)یـە، دانەوێڵـەش بـە برنـج و گەنـم و جـۆو نیسـك و نـۆك و مـاش، بـە هـەردوو جـۆری ڕەش و سـپیی و، هـەرزن و زوڕات هەمـوو ئەوانـە دەگوتـرێ.

(وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا ): (**الجَنَّـةُ: كُلُّ بُسْـتَانٍ ذِي شَـجَرٍ يَسْـتُرُ بِأَشْـجَارِهِ الأَرْضَ**)، (**جَنَّـة**): هـەر باخێکـە خـاوەن درەخـت بـێ و درەختەکانـی هێنـدە چـڕو پـڕ بـن، زەوییەکەیـان داپۆشـیبێ. (**جَنَّـة**)ش بـە (**جَنَّـات**) کـۆ دەکرێتـەوە.

(أَلۡفَافًا ): (**إِلْتَـفَّ بَعْضُهَـا بِبَعْـض لِكَثْرَة الشَّـجَر، لَفَفْـتُ الـشَّيءَ لَفّـاً، واللَّفِيْـفُ: المَجْتَمِـع**)، (**أَلْفَـاف**): هەندێـك گوتوویانـە تاکێکـە، کـۆی نیـە و وشـەکە بـۆ خـۆی وایـە، یـان (**أَلْفَـاف**) کـۆی (**لَـفّ**)ە، واتـە: پێکداپێچـراو، درەختەکانیـان بـە نێـو یەکـدا چـوون و لێـك ئـاڵاون، چونکـە (**جنـاتٍ أَلَفَافـاً**)، یـانی: ئـەو باخانـەی درەختەکانیـان زۆرن، دەگوتـرێ: (**لَفَفْـتُ الـشَّيءَ لَفّـاً**) شـتەکەم بـە پێچانـەوە پێچایـەوە، (**لَفِيْـف: مُجْتَمِـع**): واتـە: کۆمەڵـە خەڵکێـك کـە کۆبوونـەوە سـەر یـەك.

(مِيقَٰتًا ): (**المِيْقَـاتُ: الوَقْـتُ المَـضْرُوبُ للـشَّيءِ، الوَعْـدُ الَّـذِي جُعِـلَ لِلوَقْـت**) واتـە: ژوانگـە، کاتێـك کـە دانـراوە بـۆ شـتێك، ئـەو بەڵێنگەیـەی دانـراوە بـۆ کاتێـك (کـە شـتێکی تێـدا دەبـێ).

(ٱلصُّورِ ): (**الصُّـور: قِيـل مَثـل القَـرْن يُنْفَـخ فِيْـه**)، گوتـراوە: وەك قـۆچ و شـاخە فـووی پێـدا دەکـرێ، هەندێکـی دیکـەش مانایەکـی ڕەمزییـان پێـداوە.

(أَفْوَاجًا): (جَمْعُ فَوْج: الجَمَاعَـة المَـارّةُ المُسْرِعَـة)، (أفْـوَاج) كـۆی (فَـوْج)ەو، ئەویـش بـە كۆمەڵێـك دەگوتـرێ كـە بـە خێرایـی بـڕۆن.

(وَسُيِّرَتِ): (السَّـيْرُ: المُـضِيُّ فِي الأَرْض): (سَـيْر) بریتیـە لـە ڕۆیشـتن بـە زەویـدا، (سُـيِّرْت) بـۆ مانایەكـەی بـە كوردیـی گوتوومـە: ڕۆێـنراو، واتـە: لـە شـوێنی خـۆی ڕۆێـنراو هەڵقەنـدرا.

(سَرَابًا): (الـسَّرَابُ: اللاَّمِـعُ فِي المَفَـازَةِ كَالمَـاء، وَذَلِـكَ لانسَرَابِـه فِي مـرأى العَـيْن)، (سَرَاب): بریتیـە لـەوەی لـە بیابـان و دەشـتدا بریقـە دەدات، لەبەر ئـەوەی لەبەر چـاو دەڕوات و شـەپۆل دەدا، مـرۆڤ لـە دوورەوە وا دەزانـێ ئـاوەو، لـە ڕاستییشـدا ئاو نیـە، بۆیەش كوردەواریـی خۆمـان ناویـان لێنـاوە: تراویلكە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، ئـەوەش مەبەسـتی ئەوەیـە:

**١-** ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

**٢-** ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

**٣-** ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بەرز مەزن دەکەم.

**٤-** ئەم کارە بۆ هێنانەدیی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ﴾، لـە بـارەی چییـەوە لـە یەکـدی دەپرسـن؟ دوای ئــەوەی پێغەمبــەری خاتــەم ﷺ، خــوا ﷻ دوا پەیامــی خــۆی پێــدا نــاردوەو دوا فەرمایشــتی خــۆی بــۆ دابەزانــدوە، خەڵــك و کۆمەڵگایەکــەی پێیــان شــتێکی نامـۆو سـەیر بـووە، ئـەو شـتانەی ئـەوان عادەتیـان پێـوە گرتـوون، بوونـە نەریتێکـی ڕیشـەدار لـە ژیانیانـدا، چ لـە ڕووی فیکرییـەوە، چ لـە ڕووی ئاکارییـەوە، چ لـە ڕووی خێزانییـەوە، چ لـە ڕووی کۆمەڵایەتیـی و، لـە ڕووی ئابووریـی و، لـە ڕووی سیاسـییەوە، پێیـان وابـووە هـەق هـەر ئەوەیـە، کـە ئـەوان لەسـەرینی!، بـەڵام پەیامـی خـوا کـە بـە پێغەمبـەری کۆتاییـدا، نێـردراوە وەك پەیامـی هەمـوو پێغەمبـەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّـلام**)، بێگومـان بۆیـە هاتـوە کـە ژیانـی ئـەو خەڵکـە بگـۆڕێ، پێشـێ جـۆری بیرکردنــەوەو بووناســیی تێڕوانینیــان بگــۆڕێ، ئنجــا ئیــمان و عەقیدەیــان، دوایــی هەڵوێسـت و هەڵسـوکەوتیان لەگـەڵ خـوادا، پاشـان لـە نێـو خۆیانـدا، بۆیـە هەمیشـە خەریکـی مقـۆ مقـۆو مشـت و مڕ بـوون لـە نێـو خۆیانـدا، لـە بـارەی پێغەمبـەرەوە ﷺ و لـە بـارەی قورئانـەوە، ئـەوە هیـچ گومانێکـی تێدانیـە، بـەڵام لێـرەدا بـە پێـی ڕەوتـی ئایەتـەکان بۆمـان دەردەکـەوێ، ئـەوەی زیاتـر لـە نێـو خۆیانـدا پرسیاریان لـە

بارەوە کردووەو، مشت و مڕیان لە بارەیەوە کردوە، بریتی بووە لە ڕۆژی دوایی و ئەوە کە: دوای ئەم ژیانی دنیایە، قۆناغێکی دیکەی ژیان دێ، سزا هەیەو، پاداشت هەیەو، بەهەشت هەیە، دۆزەخ هەیە، ئەگەرنا بێگومان، لە یەکدی پرسیارکردن و پێکەوە مشت و مڕ کردن و مقۆ مقۆ کردنی بێبڕوایان، تەنیا لە بارەی ڕۆژی دواییەوە نەبووە، ئەگەر ئایەتەکە بەس: ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾، بووایە: (لە بارەی چی لە یەکدی دەپرسن؟)، ئەو ئەگەرانەی هەموویان هەبوون، کە ڕوونکەرەوانی قورئان باسیان کردوون، لە بارەی خودی موحەممەد پێغەمبەرەوە h، لە بارەی وەحییەوە، لە بارەی پەیامی خواوە، بە گشتیی کە هێناویەتی، لە بارەی ڕۆژی دواییەوە...هتد.

بەڵام بە پێی سیاق کە دوایی دەفەرموێ: ﴿عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ۝٢ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ۝٣﴾، لە بارەی هەواڵە مەزنەکەوە کە ئەوان تێیدا ڕاجیان، مشتومڕکەرن، ئەمە زۆر بە ڕوونیی دیاریی دەکات، کە پرسیار لە یەکدی کردن و مشت و مڕ پێکەوە کردنەکەیان، لە بارەی ڕۆژی دواییەوە بووە، دوایی دەفەرموێ: ﴿عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ﴾، لە بارەی هەواڵە مەزنەکەوە، (نَبأ) وەك (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: (**خَبَرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيْمةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ أو غَلَبة ظَنّ**) (نبأ) بریتیە لە هەواڵێك کە سوودێکی مەزنی هەبێت، بە هۆیەوە زانیاریی یاخود بە لای کەمەوە گومانی زاڵ پەیدا ببێ.

ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ﴾، ئەو هەواڵە مەزنەی ئەوان تێیدا ناکۆکن، تێیدا مشت و مڕ کەرن، تێیدا ڕا جیاوازن، ﴿كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾، ﴿كَلَّا﴾، وەك زۆرجاران گوتوومانە: (**كَلِمَةُ رَدْعٍ وَزَجر**)، وشەیەکە بۆ پەرچدانەوەو تێوە خوڕین بەکاردێ، یانی: با واز بێنن، نەخێر وانیە، وەك ئەوان دەڵێن، یان وەك ئەوان گومان دەبەن و بیر دەکەنەوە، کە دنیا شاری بێ خاوەن بێ، لە دوای ئەم ژیانەی دنیا قۆناغێکی دیکە نیە!، با واز بێنن لەو جۆرە بیر کردنەوانە، ﴿سَيَعْلَمُونَ﴾، لە مەودوا بە زوویی دەزانن، ﴿ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾، دوایی جارێکی

دیکە با وازبێنن، لەمەودوا بە زوویی دەزانن، چی دەزانن؟ دەزانن کە ماقووڵ نیەو ناگونجێ ڕۆژی دوایی نەبێ، ناگونجێ ژیانی مرۆڤ لەم قۆناغەی ئێستادا کورت هەڵبێ و، هیچ قۆناغی دیکەی بە دوادا نەیەت، چونکە ئەو کاتە ژیانی مرۆڤ ڕۆمانێکی بێ تام و چیرۆکێکی بێ ئەنجام دەردەچێت، وەك کاتی خۆی لە هەندێك لە کتێبەکانمدا گوتوومە، ئنجا خوا ﷻ دوای ئەو، پێنج ئایەتەی، وەك زەمینە خۆشکردن و پێشەکی بوون، لە دوازدە ئایەتەکەی دوایی دا، ئایەتەکانی: (٦ - ١٧)دا، یازدە لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی دەخاتە بەرچاوو، لە هەمان کاتدا کە چاکەو نیعمەتیشن، بەڵگەشن، لەسەر ئەوەی ناگونجێ ژیانی مرۆڤ لە چوار چێوەی ژیانی دنیادا، کورت هەڵبێ و، هیچ قۆناغی دیکەی بە دوادا نەیەن، بەڵێ ئەو یازدە شتە، هاو کات لەگەڵ ئەوەدا کە چاکەو نیعمەتەکانی خوان و، بەڵگەو نیشانەی بەرزیی و مەزنیی و پەروەردگارێتیی خوان، هاوکات بەڵگەشن لەسەر هەبوونی ڕۆژی دوایی، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی خوا ﷻ لە کۆتایی ئەو یازدە نیشانەو بەڵگەیەو، ئەو نیعمەت و چاکانەی خۆیدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ يَوۡمَ ٱلۡفَصۡلِ كَانَ مِيقَـٰتٗا ١٧﴾، بە دڵنیایی ڕۆژی لێك هەڵاواردن کاتێکی دیارییکراوی هەیە، واتە: لە کاتی دیارییکراوی خۆیدا، ئەو ڕۆژی لێك هەڵاواردنە، دێ.

ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا، زیاتر هەڵوەستە دەکەین لە بەردەم ئەو یازدە چاکەو نیعمەتەی خوادا، ئەو یازدە بەڵگەو نیشانانەی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و مشوورخۆرێتیی و خاوەندارێتیی خواو، ئەو یازدە بەڵگەیەی ڕاستیی هاتنی ڕۆژی دوایی دا، چونکە ئەو یازدە شتەی خوا باسیان دەکات، لە یەك کاتدا سێ ئامانج دەپێکن:

أ- هەم یازدە چاکەو نیعمەتی خوان و دەیانخاتە بەرچاوی مرۆڤەکان.

ب- هەم یازدە بەڵگەن لەسەر مەزنیی و بەرزیی و مشوورخۆریەتیی و پەروەردگارێتیی و باڵادەستیی خوا، بەسەر کەون و کائیناتدا.

ج- هەم یازدە بەڵگەشن لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی، سەرەتا دەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَـٰدًا ﴾، ئایا زەوییمان نەگێڕاوە بە ڕایەخ؟ ﴿ مِهَـٰدًا ﴾، هەم بە مانای ڕایەخ دێ و، هەم بە مانای شوێنێکی تەخت و لە بار دێ و، هەم بە مانای لانکەو بێشکەش دێ، ئایا زەوییمان بۆ وا لێ نەکردوون؟ ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴾، چیایەکانیشمان کردوونە گوڵمیخ، ﴿ أَوْتَادًا ﴾، کۆی (وَتِدْ) یان (وَتَدْ)ە، بە کوردیی دەڵێین: گوڵمیخ یان سینگ، ئەوەی وڵاخی پێ دەبەسترێتەوە، یاخود چادر و ڕەشماڵ و تاوڵی پێ قایم دەکرێ، لەو لای لای تاوڵەکە، دادەکوترێن، ڕەشماڵ و تاوڵەکە بە چەند پەتێکی مەحکەم بەو سینگ و گوڵمیخانەوە دەبەسترێ بۆ ئەوەی نەجووڵێ.

﴿ وَخَلَقْنَـٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾، هەروەها ئێوەمان بە جووت دروست کردوە، نێر و مێ، ژمارەی ئەو نێرو مێیانەو ڕێژەکەیان، لەوەتی خوا مرۆڤی لەسەر زەوی داناوە، ئەو ژمارەو ڕێژەیە تۆزێ هەڵکشان و داکشانی هەیە، بەڵام بە هاوکۆیی (**معدَّلي**) نێرو مێ یەکسانن، ﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴾، هەروەها خەوەکەشتانمان گێڕاوە بە مایەی سرەوتن و پشوودان و ئیسڕاحەت.

﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴾، شەوگاریشمان کردوە بە پۆشەر، ﴿ لِبَاسًا ﴾، یانی: پۆشاك، واتە: شەوگار، وەك پۆشاکێك داتاندەپۆشێ، ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴾، ڕۆژگاریشمان کردوە بە مایەی ژیان و گوزەران، ﴿ مَعَاشًا ﴾، بە مانای ژیان دێ و، بە مانای پەیداکردنی بژێو دێ و، بە مانای شوێن و کاتی تێدا پەیداکردنی بژیوو ڕۆزییش دێ.

﴿ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴾، لەسەرووتانەوەش حەوتی مەحکەممان بنیاتناون، مەبەست حەوت ئاسمانەکانن، ﴿ شِدَادًا ﴾، کۆی (شَدِیْدة)یە، واتە: مەحکەم و قایم، ئنجا هەرچەندە ئێمە حەوت ئاسمانەکان نابینین، بەڵام خوا ﷻ خاوەنی ئەم گەردوون و کەون و کائیناتەیەو، کەسانێك ئەو شتانەیان بۆ

ڕوون دەكاتـەوە، لـە دوو حاڵەتـان بـە دەرنیـن: یـان خـوا دەناسـن، یـان نایناسـن، ئەگـەر بیناسـن، دەزانـن خـوا هەرچـی بفەرمـوێ، وایـە، ئەگـەر نەشیناسـن، پێـش ئـەوەی بـڕوا بـەوە نەكـەن، كـە خـوا حـەوت ئاسـمانی دروسـت كـردوون، بـڕوا بـە بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی خـوا ناكـەن.

﴿ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴾، هەروەهـا چرایـەكی تیشـكدەرو بـە شـۆقمان گێـڕاوە، كـە مەبەسـت پێـی خـۆرە، ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴾، لـە (هـەورە) گوشراوەكانیـش ئاوێكـی بـە خـورزەم و بـە خوڕمـان دابەزانـدوە، لـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەزرەدا، بۆچـی؟ ﴿ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴾، تاكـو دانەوێڵـەو ڕووەكی پـێ دەربێنیـن، (حـبّ) (نَكِـرة) نەنـاسراوە، واتـە: جۆرەكانـی دانەوێڵـە: (گەنـم و جـۆ و برنـج و نیسـك و نـۆك و هـەرزن و مـاش و زوڕات و ...)، هەمـوو جۆرەكانـی دانەوێلـە كـە لـە خـوا دابەشـی كـردوون، بەسـەر ناوچەكانـی زەوی دا، بـۆ وێنـە: لـە لای ئێمـە: گەنـم و جـۆو برنـج و نیسـك و نـۆك و مـاش و هـەرزن، هـەن، لـە شـوێنانی دیكـەش جـۆری دیكـە هـەن، ﴿ وَنَبَاتًا ﴾، هەروەهـا ڕووەكەكانیـش جـۆراو جـۆرن، دارو درەخـتن، تـەڕەكارن، سـەوزەن، گیـاو گۆڵـە جـۆراو جۆرەكانـن، گـوڵ و گوڵـزارن، هەموویـان دەگرێتـەوە.

﴿ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴾، هەروەهـا باخـە چـڕو پـڕەكان و، لێـك ئـاڵاوەكان و پێكداچووەكانیـش، بـۆ ئـەوەی ئەوانـەی پـێ دەربێنیـن، بۆیـە ئـەو ئـاوە بـە خورزەمەمـان لـە هـەورە گـوشراوەكان دابەزانـدوە.

ئنجـا: ﴿ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَٰتًا ﴾، بـە دڵنیایـی ڕۆژی لێـك هـەڵاواردن، كاتەكـەی دیارییكـراوە، بـە بەڵگـەی ئـەوەی خـوا ﷻ ئـەو هەمـوو چاكانـەی لەگـەڵ ئێـوەدا كـردوون، ئـەو هەمـوو نیعمەتانـەی بـۆ ئێـوەی ڕەخسـاندوون، ئـەو هەمـوو شـتانەی زۆر بـە ڕێـك و پێكیـی هێناونـە دی، كەواتـە: ئـەوە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ژیانـی دنیـا تاكـە دەرفەتـی ژیانـی مـرۆڤ نیـە، بەڵكـو قۆناغێكـی دیكـەی بـەدوا دێ، كـە بریتیـە لـە قۆناغـی لێـك هـەڵاواردن و لێـك جیاكردنـەوەی پـاك و پیـس.

ئنجا لە سێ ئایەتی كۆتایی دا باسی ئەو ڕۆژە دەكات و دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ﴾، ئەو ڕۆژەی فوو بە كەڕەنادا دەكرێ، ﴿ فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجٗا ﴾، ئنجا ئێوە كۆمەڵ كۆمەڵ، پۆل پۆل دێن، هەڵبەتە ئەگەر مەبەست فوو پێدا كردنی یەكەم بێ، دوای فوو پێدا كردنی یەكەم، ئاخیر زەمان دێ، بەڵام: ﴿ فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجٗا ﴾، دوای فووی دووەمە، بۆیە لێرەدا مەبەست فوو پێدا كردنی دووەمە، كە مرۆڤەكان پۆل پۆل دێن.

بەڵام كە دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ أَبۡوَٰبٗا ﴾، ئاسمانیش كرایەوە، ئنجا بوو بە دەروازەو دالاندالان، ئەمەش بە دڵنیایی لە قۆناغی یەكەمی ڕۆژی دوایی دایە، كە ئاخیر زەمانەو لەو كاتەدا، ئەم گەردوونە، بەم شێوەیەی نامێنێ، ئاسمان وەك لە شوێنی دیكەش دا فەرموویەتی، ئەو پێكهاتەیەی ئێستای نامێنێ.

﴿ وَسُيِّرَتِ ٱلۡجِبَالُ فَكَانَتۡ سَرَابًا ﴾، چیایەكانیش ڕۆێنران، ئنجا بوونە تراویلكە، واتە: بوونە تۆزو گەردێك كە لە دوور ڕا تەماشای بكەی، وەك تراویلكە دێتە بەرچاو، وەك شەپۆلی ئاو كە ئاویش نیە، بێگومان ئەمەش لە قۆناغی یەكەمی ڕۆژی دواییدایە كە ئاخیر زەمانە، كەواتە: لێرەدا خوا ﷻ هەندێك لە ڕووداوەكانی قۆناغی یەكەم و قۆناغی دووەمی پێكەوە تێكەڵ و ئاوێتە كردوون.

كەواتە: بەو بەڵگانەی باسكران، ئێوە دڵنیا بن، ڕۆژی دوایی لەو كاتەدای بۆی دیاریكراوە، هاتنەكەی مسۆگەرە، چونكە ناگونجێ خوا ﷻ گەردوون و ژیانی مرۆڤی هێندە بە ڕێك و پێكیی ڕەخساند بێ، كە چی ژیانەكەی لە ژیانی كاتیی و كورتی دنیادا كورت هەڵبێ و، بە مردنی مرۆڤ هەموو شتێك كۆتایی پێ بێ و، دوایی كەس بە مرۆڤەكان نەڵێ: لە كوێوە هاتوون و، بۆ كوێ چوون و، چیتان كردو، چۆنتان كرد؟!.

# مەسەلە گرنگەكان

## مەسەلەی یەكەم:

**پرسیاركردن لە بارەی لە یەكدی پرسینی بێبڕوایانەوە، لە بارەی هەواڵە گرنگ و مەزنەكەی ڕۆژی دوایی، كە تێیدا لە مشت و مڕدان و، بەرپەرچدانەوەی گومان و قسەو قاڵیان و، دڵنیاكردنەوەیان كە بە زوویی ڕاستیی ئەو هەواڵە دەزانن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ۝١ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ۝٢ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ۝٣ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ۝٤ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ۝٥﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾، لە بارەی چییەوە لە یەكدی دەپرسن؟ ﴿عَمَّ﴾، دوو پیتە (**عَنْ**) لەگەڵ (**مَا**)، (**عَنْ**) پیتی (**جَرّ**)ە، بەڵام (**مَا**): ناوی پرسیاركردن (**إِسْمٌ اسْتِفْهَامٍ**)ەو، لە ئەسڵدا (**عَنْ مَا**)یە، بەڵام ئەلیف (ا)ەكەی لێكراوەتەوەو بۆتە (**عَمَّا**) واتە: (**عَن أي شَيءٍ**) لە بارەی چییەوە: ﴿يَتَسَآءَلُونَ﴾، لە یەكدی دەپرسن؟، (**تَسَاؤُل**)، (**تَفَاعُلٌ مِن السُّؤال**)، (**سُؤال**) یانی: پرسیاركردن، (**تَسَاؤُل**) یانی: لە یەكدی پرسین، مانایەكەشی دوو ئەگەری هەن:

١- ئایا هەر بە جیددیی لە یەكدییان پرسیوە، لە بارەی ڕۆژی دواییەوە، كێ زانیاریی زیاتری لە لایە؟

٢- یاخود پرسیاركردنێكی ڕووكەشیی بووە، وەك گاڵتە پێكردن: ئایا دەزانن ڕۆژی قیامەت دێ؟!

وشەی: ﴿عَمَّ﴾، لە (**عن**) و (**ما**) پێكهاتووەو لە هەر شوێنێك لە قورئان دا پیتی ژێردارەكەو (**جرّ**) وەك: (**عن**) و (**ل**) و (**في**) و (**من**)خرابێتە سەر (**مَا**)ی (**إستفهامية**)

یـە، ئەلیـف (أ)ی (مـا) لابـراوە: ﴿فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾﴾النازعـات، یـان: ﴿لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ ...﴿٤٣﴾﴾التوبـة، یـان: ﴿فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾﴾الطـارق، لـە چەنـد شـوێنێکی دیکـەش دا هاتـوە، چونکـە کـە ئەلیفەکـە لا دەبـڕێ، لەسـەر زمـان سـووکتر دەبـێ.

٢)- ﴿عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ﴾، لە بارەی هەواڵە مەزنەکەوە، ﴿ٱلنَّبَإِ﴾، (**خَبَرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيْمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ أو غَلَبَة ظَنٍّ**) (نَبَأ): هەواڵێك سوودێکی مەزنی هەبێ و بە هۆیەوە زانیاریی یاخود بە لای کەمەوە، گومانی زاڵ وە دەست دێ.

٣)- ﴿ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ﴾، ئەو (هەواڵە مەزن)ەی ئەوان تێیدا مشت و مڕ کەرن، ڕا جیان، ئایا مشت و مڕو ڕا جیاییەکەیان هەر لە نێو خۆیان دابووە، یان لەگەڵ جگە لە خۆیان دا بووە؟ ئەمەش دوو ئەگەری هەن:

١- دەگونجێ ڕا جیایی و مشت و مڕەکەیان هەر لە نێو خۆیان دابووبێ، یەکێکیان گوتوویەتی: زیندوو دەبینەوە، یەکی دیکە گوتوویەتی: زیندوو نابینەوە، یەکێکی دیکە گوتوویەتی: تەنیا ڕووحەکان زیندوو دەبنەوە، ئەوی دیکەیان گوتوویەتی: هەر زیندوو نابینەوەو نکووڵییشی لە بوونی خوای بەدیهێنەر کردوە.

٢- ڕا جیاییان بووە لەگەڵ ئەهلی ئیمان دا، ئیمانداران گوتوویانە: زیندوو دەبینەوەو، ئەوانیش گوتوویانە: نەخێر زیندوو نابینەوە.

٤)- ﴿كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾، نەخێر (وانیە کە دەڵێن، با واز بێنن) لە مەودوا بە زوویی دەزانن، (س)ی (سَيَعْلَمُونَ): (**لِلتَّأْكِيْد والتَّقْرِيْب**) بۆ جەختکردنەوەو نیزیکخستنەوەیە.

٥)- ﴿ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾، ئنجا نەخێر (وانیە) لەمەودوا بە زوویی دەزانن، ﴿كَلَّا﴾، وشەیەکە بۆ بەر پەرچدانەوەو تێوە خوڕین و لابردن (**نفي**) بەکاردێ، واتە: وانیە وەك ئێوە دەڵێن، واز بێنن، بە زوویی دەزانن، ﴿ثُمَّ﴾، واتە: ئنجا، یان جارێکی دیکە، دیسان واز بێنن بە زوویی دەزانن.

دەپرسین: ئایا ﴿كَلَّا﴾، کە (كَلِمَةُ رَدعٍ وَزَجْرٍ) وشەی بەرپەرچدانەوەو تێوە خوڕینە، بەرپەرچدانەوەو تێوە خوڕینە بۆ ئەوەی:

أ- واز بێنن لە پرسیار لە یەکدی کردن.

ب- یاخود وازبێنن لە مشت و مڕ پێکەوە کردن و ڕاجیا بوون؟

هەردووکیان هەڵدەگرێ، بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: با وازبێنن، بە زوویی دەزانن، کە قیامەت هەر خوا دەزانێ کەنگێ دێ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە {مَنْ مَاتَ فَقَد قَامَتْ قِيَامَتُهُ}، هەر کەسێك مرد قیامەتی وی، هاتوە، کەسێك مرد، لە خۆی حاڵیی دەبێ و تێدەگات کە پێشتر تێنەگەیبوو، حاڵیی دەبێ کە وەختی خۆی نکووڵیی لە قیامەت دەکرد، لە سزاو پاداشتی خوا دەکرد، حاڵیی نەبووە، کەواتە: زوو بۆی دەردەکەوێ.

پێشتریش گوتمان: لە بارەی ئەوەوە کە ئایا ئەو هەواڵە مەزنە چییە؟ ١- هەندێك گوتوویانە: وەحییە، ٢- هەندێك گوتوویانە: قورئانە، ٣- هەندێك گوتوویانە: پێغەمبەرە ﷺ.

٤- بەڵام بە سەرنجدانی ڕەوتی ئایەتەکان زۆر جوان دیارە، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، ڕۆژی دواییش زیاتر قۆناغی دووەم و قیامەتەکەی، واتە: هەڵسانەوەو زیندوو بوونەوەو سزاو پاداشت.

**مەسەلەی دووەم:**

**هێنانەوەی یازدە جۆرە بەڵگە لەسەر هەبوونی ڕۆژی دوایی، کە بریتین لە: ڕاخرانی زەوی، سینگ بوونی چیایەکان، بە جووت دروستبوونی مرۆڤان، ئیسراحەت پێکردنی خەو، پۆشاك بوونی شەوگار، گوزەران تێداکردنی ڕۆژگار، حەوت ئاسمانەکان مەحکەم لەسەروو بنیاتنراون، خۆری تیشکدەر ڕەخسێنراوە، ئاو دابەزێنراو لە هەورە گوشراوەکان، پێڕوانی دانەوێڵەو ڕووەك و باخە چڕو پڕەکان، ئەمانەش هەموویان واتە: ڕۆژی هەڵاواردنی پاك و پیسان، بە مسۆگەریی دێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴿٦﴾ وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا ﴿١٧﴾﴾.

کورتە باسێک:

یازدە چاکەو نیعمەتی خوا، کە یازدە بەڵگەشن لەسەر پەروەردگارێتی خواو هاتنی ڕۆژی سزا و پاداشت.

بەڕێزان!

بە باشم زانی لێرەدا بۆ تیشکی زیاتر خستنە سەر چەمك و واتای ئەم دوازدە ئایەتە موبارەکە، بە تایبەتی ئەو یازدە نیعمەت و چاکەیەی خوا لە شێوەی یازدە بەڵگەدا، هەم لەسەر پەروەردگارێتیی خۆی، هەم لەسەر ئەوە کە ڕۆژی دوایی دەبێ بێ، خستوونیە ڕوو، لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی لە مەوسووعەی

(ئیمان و ئیلحاد) لە چاپی دووەمی دا[1] هێناومە، بە ئەندازەیەك پوختكردنەوەوە، بیخەمەڕوو، سەرەتاش بە مانای كورت و دەقاو دەق بە ئایەتەكاندا دەچم:

خوا ﷻ دەفەرموێ:

١- ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴾، ئایا زەوییمان نەكردوە بە لانكەو بێشكەو، بە ڕایەخ، كە ڕاخراوە؟.

٢- ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴾، چیایەكانیشمان كردوونە گوڵمیخ، ﴿ أَوْتَادًا ﴾، كۆی (وَتَد) یان (وَتِد)ە، ئەویش واتە: گوڵمیخ، سینگ كە چادرو ڕەشماڵی پێ دەبەستنەوە، یان وڵاخی پێ دەبەستنەوە.

٣- ﴿ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾، ئێوەشمان بە جووت دروستكردوە، واتە: لە نێرو مێ، هەر لە ئادەم و حەواوە بگرە تاكو ئێستاش دوای ئێستاش.

٤- ﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴾، نووستنی ئێوەشمان گێڕاوە بە مایەی پشوودان و ئیسڕاحەت كردن.

٥- ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴾، شەوگاریشمان بۆ گێڕاون بە پۆشاكێك داتاندەپۆشێ.

٦- ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴾، ڕۆژگاریشمان بۆ گێڕاون بە مایەی ژیان و گوزەران و كارو كاسپی تێدا كردن.

٧- ﴿ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴾، لەسەرووتانەوەش حەوت ئاسمانی مەحكەممان دروست كردوون.

٨- ﴿ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴾، هەروەها چرایەكی زۆر ڕۆشن و تیشكدەرمان ڕەخساندوە، كە مەبەست خۆرە.

---

(١) {دروەشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر تیشكی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا}، بەرگی یەكەم لاپەڕە: ٤٦٦ - ٤٨٠، چاپی دووەم.

٩- ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴾، لە هەورە گوشراوەکانیش ئاوێکی بە خورزەممان دابەزاندوە.

﴿ ٱلْمُعْصِرَٰتِ ﴾، کۆی (**مُعْصِرة**) لە کێشی (**مُفعِلة**)یە، بەڵام بە مانای (**مَفْعُولة**)یە، وەك (**غُرْفَة مُضِيْئَة**)، واتە: ژوورێکی ڕووناك کراوە، نەك ژوورێکی ڕووناك کەرەوە.

١٠- ﴿ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴾، بۆ ئەوەی بەو ئاوە بەخورزەم دابەزێنراوە لە هەورە گوشراوەکاندا، دانەوێڵەو ڕووەکی پێ بڕوێنین.

١١- ﴿ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴾، هەروەها باخە چڕو پڕو لێك ئاڵاوەکانیش.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَٰتًا ﴾، بە دڵنیایی ڕۆژی لێك هەڵاواردن، ژوانگەدارە (کاتی دیارییکراوی هەیە)، ﴿ مِيقَٰتًا ﴾: (**المِيْقَات عَلَى زِنَةِ اسْمِ الآلَة، وَأُرِيْدَ بِه نَفْسُ الوَقْتُ المُحَدَّد بِه الشَّيء**)، (**مِيْقَات**) هەرچەندە لە سەر کێشی ناوی ئامڕازە، بەڵام مەبەست پێی خودی ئەو کاتەیە کە دیارییکراوە ئەو شتەی تێدا دەبێ.

ئنجا با تۆزێ سەرنجی هەر کام لەو یازدە نیعمەتە بدەین، کە خوای پەروەردگار وەك یازدە بەڵگە لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی خستوونیە ڕوو:

١)- ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴾، ئایا زەوییمان بۆ نەکردوون بە لانکەو بێشکە، یاخود وەك ڕایەخ بۆمان ڕانەخستوون؟ شایانی باسە: ئەو زەوییەی ئێمە لەسەری دەژین، ئایا هۆی چییە ئاوا بە ئاسوودەییەوە لەسەری دێین و دەچین؟ بەهۆی ئەوەوەیە کە هێزی کێشندەی زەوی بە ئەندازەی (١سم٢/ ١کغم)، هەر سانتیمەتر دووجایەك قورسایی یەك کیلۆگڕامی دەکەوێتە سەر، بەڵام لەسەر مانگ: (٦سم$^{٢}$/ ١کغم)، واتە: ئەگەر شتێك لێرە (٦٠ کغم) بێت لەوێ (١٠ کغم)ە، بۆیە ئەوانەی دەچن بۆ سەر مانگ دەبێ کۆڵێکی قورسیش لە کۆڵێ بنێن، بۆ ئەوەی کە هەنگاویان هەڵێنا، زۆر هەڵنەبەزنەوە.

ئایا بۆچی خوا ﷻ زەوی ئێمە بە لانکەو، بێشکە دەچوێنێ؟ چونکە زەوی بە لای کەمەوە پێنج جۆرە جووڵەو سووڕانەوەی هەن:

١- خولانەوەی بە دەوری خۆیدا بە خێرایی (٢٨ کم لە خولەکێك دا)، کە بە بیست چوار سەعات ئەو خولە تەواو دەکات و دەبێتە هۆی پەیدا بوونی شەوو ڕۆژ.

٢- سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا کە لە هەر چرکەیەك دا (٣٠کم) دەبڕێ، واتە: شەست (٦٠) ئەوەندەی خێرایی خولانەوەی بە دەوری خۆیدا، ئەویش بە سووڕگەیەکی: (٢٣،٥) پلە لار، کە ئەگەر ئەو لارییەی نەبووایە، چوار کەشەکانی ساڵ دروست نە دەبوون، بەڵکو ئەو کاتە ئێمە دوو وەرزی ساڵمان دەبوون، زستان و هاوین و، بەهارو پایز نەدەبوون.

٣- سووڕانەوەی زەوی بە دەوری داڵی وەستاو (**الكَوْكَبُ جَاثِي**)دا، یان داڵی هەڵنیشتوو، کە بە خێرایی (٢٠کم/ چرکەیەك) دایە.

٤- سووڕانەوەی زەوی بە دەوری چەقی کاکێشاندا، زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا، واتە: خۆرو هەر نۆ (٩) خڕۆکەکەی کە بریتین لە: مەرریخ و زوحەل و عە**طارد**و زوهرەو موشتەریی و ئۆرانۆس و نیپتۆن و پلۆتۆ، وێرای زەوی، بە خێرایی (٢٠٦ کم/ لە چرکەیەك دا).

٥- سووڕانەوەی زەوی لەگەڵ کاکێشاندا ئەویش بە خێرایی (٩٨٠کم/ لە چرکەیەکدا) جارێکی دیکە زەوی ئەو جووڵەیەشی هەیە.

کەواتە: بە لای کەمەوە زەوی ئەو پێنج سووڕانەوەیەی هەن، کەچی ئێمە ئەو زەوییە نابینین بەرمان بداتەوە، بۆیە خوا ﷻ تەشبیهی کردوە بە لانکەو بێشکەوە، لانکەو بێشکەو جۆلانەش منداڵ ڕادەژێنێ و دەیجووڵێنێ، بەڵام منداڵەکە ناخاتە خوار.

٢)- ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴾، ئایا چیایەکانیشمان نەکردوون بە گوڵمیخ؟ یاخود: چیایەکانیشمان کردوونە گوڵمیخ، دەگونجێ ئەم ڕستەیەو ئەوانی دیکەش بۆ پرسیارکردنەکە نەگەڕێنەوە، بۆچی خوا ﷻ چیایەکان دەچوێنێ بە گوڵمیخەوە، بە سینگەوە؟

زانایانی زەویناسیی (جیولۆجیی) دەڵێن: هەر بەرزاییەك لەسەر زەوی، بنك و ڕەگ و ڕیشەیەكی هەیە بە ناخی زەویدا چۆتە خوارێ، (١٠ - ١٥) هێندەی خۆی بە زەویدا چۆتە خوار، واتە: چەندەی بە دەرەوەیە (١٠ - ١٥) هێندەی بە زەویدا چۆتە خوار، لە تەفسیری نابلوسیی دا دەڵێ: (چەندەی بە دەرەوەیە، دوو سێ هێندەی بە ناخی زەویدا چۆتە خوار)، بەڵام زەغلوول نەججار كە لەو بوارەدا لە (دكتور محمد نابلسی) شارەزاترە دەڵێ: هەر چیایەك كە دەیبینی چەندەی بە دەرەوەیە، (١٠ - ١٥) هێندەی بە ناخی زەویدا چۆتە خوار، بۆ وێنە: بەرزترین لووتكەی چیا، لووتكەی (ئیڤریست)ە، لە چیای هیمالایاو (٨٨٦٤) م، واتە: نزیكەی (٩ كم) لە ئاستی دەریاوە بەرزە، بەڵام زانایانی زەویناسیی بۆیان دەركەوتوە كە (١٣٠ كم) بە ناخی زەویدا چۆتە خوارێ، واتە: (١٠ - ١٥) هێندەی بە ناخی زەویدا چۆتە خوارێ، (١٣٠،٠٠٠م)، كەواتە: كە خوا دەفەرموێ: چیایەكانمان گرتوون بە گوڵمیخ، ئەمە وێكچوواندنێكی پڕ بە پێستی چیایەكانە، هەڵبەتە خواش كە خۆی چیایەكانی خوڵقاندوون، دەزانێ چەندەش دایاندەبەزێنێ و، دەیانباتە خوارو، كاتێك وەسفی چیایەكان دەكات، بەو شێوەیە وەسفیان دەكات كە لە واقیع دا هەن.

بۆیە زانایان دەڵێن: زانست لە كوێ بوەستێ، وەحیی لەوێوە دەست پێدەكات و، كۆتایی زانست سەرەتای وەحییە.

٣)- ﴿وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا﴾، ئێوەشمان بە جووت دروست كردوە، دیاردەی جووتێتیی (**ظاهرة الزّوجية**)، نەك هەر لە دنیای مرۆڤدا، بەڵكو لە هەموو دروستكراوەكاندا، بنچینەی گشتیی خوایە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ۝٤٩﴾ الذاريات، لە هەموو شتێكدا جووتمان دروست كردوە، بەڵكو بیرتان بێتەوە {كەسێك ئەو هەموو جووتانەی دروست كردوون، خۆی تەنیایەو تاكە}.

ئێستا زانایان بۆیان دەركەوتوە كە نەك هەر مرۆڤ و، ژیانداران نێرو مێیان هەیە، بەڵكو ڕووەكیش، ئنجا ڕووەكیش هەیە نێرەكەی جیایەو مێیەكەی جیایە،

وەك دارخورما تۆوی نێرەكەی بۆ مێیەكەی دەبەن، بەڵام زۆربەی ڕووەك و شینا وردەكان، مێیەكەیان لە نێو خۆیاندایە، بەڵكو ئێستا زانایان بۆیان دەركەوتوە كە لە نێو گەردیلەشدا، كە خشتی یەكەمی دروست بوونی ماددەیە، دیسان هەردووك بارگەی سالیب و موجیب هەن، گەردیلە لە سێ پێكهاتەی سەرەكیی پێك دێ: ئەلیكترۆن، پرۆتۆن، نیۆترۆن، پرۆتۆن و نیوترۆن نێوكەكە پێكدێنن و، پرۆتۆن بارگەیەكی موجیب و گەرمی هەیە، نیۆترۆن بێ بارگەیەو ئەلیكترۆنیش بارگەیەكی ساردو سالیبی هەیە.

٤)- ﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴾، خەوی ئێوەشمان گێڕاوە بە مایەی ئیسراحەت و پشوودان، یەكێك لە زانایان[1] باسی خەو دەكات كە لە كاتی خەودا چی ڕوودەدات:

١- زانایانی توێكاریی كە لە جەستەی مرۆڤ دەكۆڵنەوە، دەڵێن: لە كاتی خەوتندا مێشك هۆرمۆنی (سیرۆتۆنین) دەردەدا، كە خەوێنەرە، یانی: كاتێك دەتەوێ بخەوی، مێشك هۆرمۆنی سیرۆتۆنین دەردەكات، كە خەوێنەرە، ئنجا خەوت لێ دەكەوێ.

٢- لە كاتی خەوتندا هۆرمۆنی گەشە كردن هانی خانەكان دەدات، خۆیان تازە بكەنەوە.

٣- لە كاتی خەوتندا بەكارهێنانی پرۆتینەكان لە مێشك و چاوەكان دا زیاد دەكەن و زیاتر بەرهەم دەهێنرێن.

٤- خەوتن دەبێتە هۆی تازە كردنەوەی خانەكانی جەستە، بە تایبەت خانەكانی مێشك.

٥- خەوتن دەبێتە هۆی ئەوەی ئینسان دوای خەو، باشتر شتی بێتەوە بیر، كاتێك مرۆڤ مێشكی كول وماندوو دەبێ، كە دەخەوێ و ئیسراحەت دەكات و پشوودەدا، باشتر شتی دێتەوە یاد.

---

(١) (د. زغلول النجّار) لە كتێبی (الإنسان من الميلاد إلى البعث)دا، لاپەڕە (٤٤٥ - ٤٤٧)، هەروەها كتێبی (الموسوعة الذهبية في إعجاز القرآن و السنة النبوية)، (د. أحمد مصطفى متولّي)، لاپەڕە: (٣٠٤ - ٣٠٧).

٦- لە کاتی خەوتندا ئینسان لەو ژەهرانەی کە بریتین لە دەردراوو پاشەڕۆکی خانەکان، دەربازی دەبێ و دێنەوە نێو خوێن، دوایی لە جەستە دەردەکرێن، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴾، خەوتنمان گێڕاوە بە مایەی پشوودانتان، زۆر تەواو و لە جێی خۆیەتی و، پڕ بە پێستی واقیعە بێ کەم و زیاد.

٥)- ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴾، شەوگاریشمان گێڕاوە بە پۆشاك، یاخود: ئایا شەوگاریشمان نەکردوە بە پۆشاك؟ ئەگەر بگێڕرێتەوەو با بدرێتەوە بۆ سەر: ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَـٰدًا ﴾، بۆ پرسیار کردنەکە، مرۆڤ وەک چۆن پۆشاك لەبەر دەکات و، عەورەتی دادەپۆشێ، بە هەمان شێوە شەوگاریش مرۆڤ دادەپۆشێ، هەم ئیسڕاحەتی تێدا دەکات، هەم خۆشی لە هەندێ لە جل و بەرگەکانی خۆی سووك دەکات، بگرە جل و بەرگی هەر لەبەریش دانەبێ، شەوگار بۆی دەبێتە پۆشاك و دایدەپۆشێ، بە دڵنیایی مرۆڤ کاتێ ئیشێك کاسبییەك دەکات، پێویستیی بە جۆرە جل و بەرگێك هەیەو، کە جەنگ دەکات پێویستیی بە جۆرە جل و بەرگێك هەیەو....هتد، بەڵام کە دەخەوێ و ئیسڕاحەت دەکات، پێویستە ئەو بەرگ و پۆشاکانە دابنێ، ئنجا شەوگار بە هۆی تاریکییەکەیەوە، قەرەبووی ئەو پۆشاکەی بۆ دەکاتەوە، خوا شەوگاری کردووین بە پۆشاك.

٦)- ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴾، ڕۆژگاریشمان بۆ گێڕاون بە مایەی ژیان و گوزەران، یان: ئایا ڕۆژگاریشمان بۆ نەکردوون بە مایەی ژیان و گوزەران؟ (**مَعَاش**) هەم بەو بژێوە دەگوترێ کە بە ڕۆژ پەیدا دەکرێ، هەم بە کاتی پەیدا کردنی بژێوو، هەم بە شوێنی پەیداکردنی بژیویش دەگوترێ، ئنجا ئەگەر دنیا ڕووناك نەبووایە بەهۆی ڕۆژگارەوەو، زەوی بە دەوری خۆیدا نەخوولابایەوە لە بەرامبەر خۆرداو، نیوەی نەبووبایە بە ڕۆژو نیوەی نەبووبایە بە شەو، ئەو کاتە نە بە ڕۆژ کەسابەتمان بۆ دەکرا، نە بە شەویش ئیسڕاحەتمان بۆ دەکرا.

٧)- ﴿ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴾، لەسەرووشتانەوە حەوت ئاسمانی مەحکەممان خوڵقاندوون، یان: ئایا حەوت ئاسمانی مەحکەممان لەسەرووتانەوە نەخوڵقاندوون؟

هەڵبەتە ئێمە نازانین سنووری ئەو حەوت ئاسمانانە کوێیەو چۆنە؟ بۆیە ئەوانەی لەو بارەوە هەندێك قسەی دیکەیان کردوون، نەیانپێکاوە، بۆ وێنە: هەر کام لە: (**إبن عاشور**) و، (**محمد راتب النابلسي**) و (**محمد عفيف طبارة**) و (**محمد عبده**) لە تەفسیری بەش (**جزء**) ی (**عمّ**)داو، زۆری دیکەش دەڵێن: مەبەست لە حەوت ئاسمانەکان، ژمارەی حەوت بۆ زۆرییە، یان دەڵێن: مەبەست حەوت خڕۆکەن، بەڵام ئەو قسانە ڕاست نین، چونکە لە چەندان ئایەت دا خوا دەفەرموێ: (حەوت ئاسمانمان خوڵقاندوون)، کە زانست تاکو ئێستا نەگەیشتوە بەوەی بزانێ سنووری ئاسمانی یەکەمیش تاکو کوێیە، چ جای شەشەکەی دیکە بزانێ، بەڵام ئایا بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ ﴾نوح، ئایا نەتاندیوە، ئایا سەرنجتان نەداوە؟ کاتی خۆی لە تەفسیری (سووڕەتی نووح)دا لەو بارەوە باسمان کرد، کە کەسێك خوا بەو شێوەیە دەیدوێنێ، لە دوو حاڵ بەدەر نیە: یان بڕوای بە خوا هەیە، یان بڕوای بە خوا نیە، ئەگەر بڕوای بە خوا نەبێ، دەبێ بەر لەوەی لە حەوت ئاسمانەکان بکۆڵێتەوە، لە شتی دیکە بکۆڵێتەوە، چونکە بەر لەوەی بڕوای بەوە نەبێ، کە خوا ئەو هەواڵەی پێدەدا، هەر لە بنەڕەت دا بڕوای پێی نیە، کەسێکیش کە بڕوای بە خوا هەیە: خوا بۆ خۆی خاوەنی گەردوونەو دەفەرموێ: حەوت ئاسمانمان خوڵقاندوون، عەرشم خوڵقاندوە، درەختی کۆتایی (**سدرة المنتهي**)م خوڵقاندوە، ئنجا ئایا لە کوێن و سنووریان کوێیە؟ خوای بەدیهێنەریان دەیزانێ، تۆی بڕواداریش باوەڕو متمانەت بە خوای پەروەردگار هەیەو، خواش هەواڵ دەدا، بۆیەش خوا وەك شتێکی بەڵگە نەویست و ئاشکرا هەواڵت پێدەدا، چونکە بەس خۆی دەزانێ چی خوڵقاندوە، ئێمەو مانانێکیش کە بڕواداریین، باوەڕی سەدا سەدمان بە خوای پەروەردگار هەیە، بەڵکو ئەگەر شتێك بە چاوی خۆمان ببینین بە ئەندازەی ئەوەی خوا هەواڵمان پێدەدا، متمانەمان پێی نیە، چونکە چاومان بە هەڵە دادەچێ و، گوێمان بە هەڵەدا دەچێ و، عەقڵمان بە هەڵە دادەچێ، بەڵام ئەوەی خوا بیفەرموێ، سەدا سەد وایە.

٨)- ﴿ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴾، ئەگەر بچێتەوە بۆ پرسیار کردنەکە: ئایا چرایەکی تیشکدەرو زۆر پڕشنگدارمان بۆ نەهێناونە دی؟ ئەگەر هەر وەك هەواڵدانێك بێ: چرایەکی

تیشکدەرو پڕشنگدارمان بۆ هێناونە دی، مەبەست پێی خۆرە، کە لە هەر چرکەیەکدا (٦٥٥) ملیۆن تەن، نایترۆجین دەگۆڕێ بۆ (٦٥٠) ملیۆن تەن هێلیۆم، واتە: پێنج ملیۆن تەن لە هەر چرکەیەکدا لە خۆر دەبێتە وزە، ئنجا ئەگەر بتەوێ بزانی لە ساڵێکدا چەندە؟، دەبێ: بڵێین: (٥,٠٠٠,٠٠٠) تەن × ٦٠ × ٦٠ × ٢٤ × ٣٦٥ = ٢,٦٢٨,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠.

واتە: (٥) ملیۆن تەن × (٦٠) چرکە = ٣٠ ملیۆن تەن، لە خولەکێک دا، ئنجا ٣٠,٠٠٠,٠٠٠ تەن × (٦٠) خولەك × (٢٤) سەعات × (٣٦٥) ڕۆژ = دوو تریلیۆن و ٦٢٨ ملیار تەن وزە لە ساڵێکدا، بەڵام یەکێك بۆی هەیە بڵێ: چۆن خۆر مادام لە ساڵێك دا دوو تریلیۆن و ٦٢٨ ملیار تەن وزە لە ساڵێکدا سەرف دەکات و لێی دەچێتە دەر، بۆچی هەر تەواو نابێ؟!

زانایان دەڵێن: بە مەزەندە خۆر تاکو ئێستا (٥ ملیار) ساڵ تەمەنی بەڕێ کردووە، بایی (٥) ملیار ساڵی دیکەش نایترۆجینی پێماوە بیگۆڕێ بۆ هێلیۆم، ئەوەش لە حاڵێکدا خۆر تەمەنەکەی بەردەوام بێ، کەواتە: خۆر زۆر زۆر گەورەیەو، بە مەزەندە دوو هەزار تریلیۆن تریلیۆن (٢,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) (٢[٢٧]) تەن قورسەو، بارستایی (**كتلة**)ەکەی (٣٣٣،٠٠٠) هێندەی هی زەوییە[1].

٩)- ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴾، لە هەورە گوشراوەکانیش ئاوێکی بە خورزەممان دابەزاندوە، یان: ئایا لە هەورە گوشراوەکانیش ئاوێکی بە خوڕمان دانەبەزاندوە؟، هەورە گوشراوەکانیش بەم جۆرە دێنە دی: تیشکی خۆر لە ئاوی دەریایەکان دەداو هەڵم پەیدا دەکات، هەڵمەکە دێ بۆ ناوچە ساردەکان، با دەیهێنێ، ئنجا کە دێ بۆ ناوچە ساردەکان، بارگەی ساردو بارگەی گەرم پەیدا دەبێ لە هەورەکاندا، ئنجا ئەو بارگە سارده بۆ ئەوەی خۆی دەرباز بکات، بەرەو زەوی دێ لە کاتێکی دیارییکراودا، کە دەبێتە هەورە تریشقەو، جارێ واش هەیە بەرەو سەرێ دەچێ، دیسان دەبێتە هەورە

---

(١) السماء في القرآن الكريم، د. زغلول النجارة ٤٤١-٤٤٢ص.

تریشقەو، سەرەنجام هەورەکان بەهۆی گوشاری هەواوە متوربە دەبن و، نیشانەی متوربەبوونەکەیان ئەو هەورە تریشقانەن، ئنجا کە گوشران و متوربە بوون، ئاویان لێ دێتە خوار، بە شێوەی باران و بەفر و تەزرە، هەر بۆیەش جاری وایە هەوران دەبینین، بەڵام باران و بەفر و تەزرە نیە، بۆچی؟ چونکە هەورەکان متوربە نەبوون.

١٠)- ﴿لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا﴾، بۆ ئەوەی بەو ئاوەی بە خورزەممان دابەزاندوە، دانەوێڵەو ڕووەکی جۆراوجۆر دەربێنین.

دانەوێڵەش ئێمە زیاتر ئاشنای: گەنم و جۆو برنج و نیسك و نۆك و ماشی سپیی و ماشی ڕەش و هەرزن و زوڕات و ئەوانەین، بەڵام گومانی تێدانیە جگە لەوانەش دانەوێڵەی دیکە لە وڵاتانی دیکەدا هەن، شایانی باسیشە: لە جۆرەکانی گەنم و جۆرەکانی جۆو جۆرەکانی برنج و نیسك و نۆك و ماش زوڕات، لە هەر کام لەوانە دەیان و سەدانیش هەن،

بەڵام خوا دابەشی کردوون بەسەر زەویدا، بە پێی هەڵکەوتەی جوگرافیی پارچەکانی زەوی، هەروەها ڕووەکەکانیش دیسان زۆرو جۆراو جۆرن.

١١)- ﴿وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا﴾، هەروەها بەهۆی ئەو ئاوە بە خورزەم دابەزێنراوەوەی لە هەورە گوشراوەکان دێتە خوارێ، باخە چڕ و پڕەکانیش دەڕوێنین، **(أَلْفَاف)** واتە: لێك ئاڵاو و پێکداچوو، لە (لَفّ)وە هاتوە، واتە: پێچای، ئاڵاندیی، لوولی کرد.

١٢)- ﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَٰتًا﴾، بە دڵنیایی ڕۆژی لێك هەڵاواردن دیارییکراوە، ژوانگەی بۆ دانراوەو پاش و پێش ناکات.

کەواتە: خوا ﷻ ئەو یازدە نیعمەتە، ئەو یازدە نیشانەیە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕۆژی دوایی دەبێ بێ، ئنجا ئەوانە هاوکات لەگەڵ ئەوەی یازدە چاکەو نیعمەتی خوان، یازدە بەڵگەشن لەسەر زانایی و کارزانیی و میهرەبانیی و دەسەڵاتی بێ سنووری خوا ﷻ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**باسی فوو پێدا کردنی کەڕەناو، کۆمەڵ کۆمەڵ هاتنە گۆڕەپانی مرۆڤەکان و، کرانەوەی ئاسمان و گۆڕانی بۆ چەندان دەروازەو، دالآن دالآن بوونی و، ڕۆیترانی چیایەکان و هەڵکەنرانیان لە شوێنی خۆیان و، دوایی وردو خاش بوونیان، وەك تۆزو گەردێکی تراویلکە ئاسا:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾﴾.

## شیکرنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ﴾، ئەو ڕۆژەی فوو بە سووردا دەکرێ، زۆر باسی سووڕ کراوە لە قورئاندا، زۆربەی زانایان وشەی (صور)یان بە (بوق) داناوە، واتە: کەڕەنا، کە شتێکە فووی پێدا دەکرێ و دەنگێکی بێڕەزای لێ دێ، بۆ کۆکردنەوەی خەڵك، زانایان گوتوویانە: (صور) لەسەر شێوەی قۆچ (قَرْن)ە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە[1]، (قَرْن)یش بە مانای قۆچ، شاخ دێ، لەبەر ئەوەی لەسەر شێوەی شاخ و قۆچی ئاژەڵە، هەندێکیش گوتوویانە: (صور) شتێکی ماددیی نیە، مەخلووقێك بێ و لە لایەن فریشتەیەکەوە فووی پێدا بکرێ، بەڵکو ئەوە تەعبیرێکی ڕەمزییە، وەك چۆن ئەگەر بویسترێ خەڵکێك بانگ بکرێ و کۆبکرێتەوە یان بڵاو بکرێ، ئێمەی بەشەر عادەتمان وایە بۆ وێنە: فەرماندەی سوپایەك بیەوێ سوپایەکەی کۆ بکاتەوە، جاڕچیی جاڕ دەداو، بە بووقێك بانگ دەکرێن، خوای پەروەردگاریش ویستوویەتی ئێمە حاڵیی بکات کە لە ڕۆژی دواییدا، وەك چۆن ئێوە ئەگەر بتانەوێ خەڵکێك کۆبکەنەوە، بانگیان دەکەن، ئێمەش ئاوا کۆیان دەکەینەوە.

---

(١) (كيف أنعم وصاحب القرن قد التعتم القرن.....) رواه الترمذي: ٢٤٣٩، وصحَّحه الألباني..

بەڵام پێم وایە ئەو ڕایە ڕاسترە کە دروستکراوێك هەیە بە ناوی صوور، کە لەسەر شێوەی قۆچە، یان پێغەمبەر ﷺ وای ناو ناوە، چونکە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتووەو سەنەدەکەشی ڕاستە، لە لای زانای فەرمووده ناسی هاوچەرخمان شێخ ئەلبانیی خوا لێی خۆشبێ، وەك دوایی باسی دەکەین، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرمویٚ: ﴿يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ﴾، لە قورئاندا بە زۆریی فوو بە کەڕەنادا کردن بە شێوەی بکەر نادیار (مَجْهُول الفاعل) هاتوە، دەفەرموێ: ﴿نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ ...﴾ ﴿١٠١﴾ المؤمنون، یان دەفەرموێ: ﴿يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ﴾، وشەی: ﴿يَوۡمَ﴾، لێرەدا پاڵدراوە بۆ لای ڕستەی: ﴿يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ﴾، ﴿يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ﴾، ﴿يَوۡمَ﴾، دەبێتە پاڵدراو (مضــاف)و ﴿يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ﴾، دەبێتە پاڵوەلادراو (مضاف إليه): ﴿يَوۡمَ﴾، (مَبْنِيٌّ)یە لەسەر (فتح)، چونکە (ظَرْف)ەو، ﴿يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ﴾، لە شوێنی (مَجْرُوْر)ەو دەبێتە پاڵوەلادراو (مُضَاف إلَيْهِ)، یانی: ئەو ڕۆژەی فوو بە کەڕەنادا دەکرێ.

٢)- ﴿فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجًا﴾، {(ف) بۆ بەدواداهاتن (فاء التعقيب)ە}، یەکسەر کە فوو بە کەڕانادا دەکرێ، کۆمەڵ کۆمەڵ دێن، ﴿أَفۡوَاجًا﴾، کۆی (فَوْج)ە، (الفَوْجُ: الجَماعَةُ المُتَصاحِبَةُ مِن أُناسٍ مُقَسَّمِينَ بِاخْتِلافِ الأغراضِ)، یەکێك لە زانایان وای لێك داوەتەوە، دەڵێ: (فَوْج) کۆمەڵە خەڵکێکن پێکەوەن، لە کەسانێکی دابەش بوو بە پێی جیاوازیی مەبەست و ئامانجەکانیان، واتە: مەرج نیە هەموویان یەك شێوە بن، بەڵام هەموویان پێکەوە کۆکراوەن، کە دەفەرموێ: ﴿فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجًا﴾، ئەمە ڕستەیەکی (حالية)یە، واتە: لە حاڵێکدا کە ئێوە کۆمەڵ کۆمەڵ دێن، یاخود: ئەوەی لە شوێنی حاڵە ڕستەی دواییە کە دەفەرموێ:

٣)- ﴿وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ أَبۡوَٰبًا﴾، {لە حاڵێکدا فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، ئێوە پۆل پۆل دێن}، ئەوەش لە حاڵێکدایە کە ئاسمان کراوەتەوەو، بۆتە چەند دەرگایەك، چەند دەروازەیەك.

وشـەی ﴿ وَفُتِحَتِ ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (فُتِّحَـت)، یانـی: زۆر کراوەتـەوە، کەواتـە: مانایەکـەی ئـاوای لـێ دێ: ئـەو ڕۆژەی فـوو بـە کەڕەنـادا دەکـرێ، یەکسـەر ئێـوە کۆمـەڵ کۆمـەڵ دێـن، لـە حاڵێکـدا ئاسـمان کراوەتـەوەو بۆتـە چەنـد دەرگاو دەروازەیـەك یـان چەنـد دالانێـك، ئەمـەش لێـرەدا وێچواندنێکـی مانـا گەیەنـەر (تَشْبِيه بَلِيْغ)ەو لـە بنەڕەتـدا ئاوایـە: (فَكَانَت كَالأَبْوَاب)، ئاسـمان وەك دەرگاو دەروازە کراوەکانـی لێهـات، دالان دالان بـوو.

٤)- ﴿ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴾، چیایەکانیش ڕۆێنران، ئنجا بوونە تراویلکە، (سَارَ) یانی: (مَشَى) ڕۆیی، ﴿ وَسُيِّرَتِ ﴾، یانی: ڕۆێنران، هەڵکەندران و وەجووڵە خران، ﴿ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴾، دوای ئەوەی بە جووڵە دەخرێن، پێکدادەرێن، وردو خاش دەبن، سەرەنجامەکەی بوونە تراویلکە، ڕستەی: ﴿ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴾یش، دیسان وێچواندنی ئەوپەڕ (تشبیه بلیغ)ە، یانی: چیایەکان ئەوەندە وردو خاش بوون، بوونە تۆزو گەردێك کە ئەگەر لە دوورەوە تەماشات کردبایە، وەك تراویلکە دەهاتە بەرچاو، (التَّسْيِيرُ: جَعْلُ الشَّيْءِ سَائِرًا، أَيْ مَاشِيًا، وَأُطْلِقَ هُنَا عَلَى النَّقْلِ مِنَ الْمَكَانِ)، (تَسْيير): بریتیە لەوەی شتێك وا لێ بکەی بڕوات، بەڵام لێرە بەکارهێنراوە بۆ گواستنەوە لە شوێنی خۆ، یانی: هەڵکەندران.

(المعجـم الوسـيط)[1] ئـاوا پێناسـەی (سرَاب) دەکات، (مَـا يُـرَى فِي نِصْـف النَّهَـارِ مِـن اشْـتِدَاد الحَـرِّ كَالمَـاءِ فِي المفَـاوز يَلْصَـقُ بِـالْأَرْضِ)، (سَرَاب): کـە بـە کوردیـی تراویلکـەی پـێ دەڵێـن، ئەوەیـە کـە لـە نێوەڕاسـتی ڕۆژێ دا، {لای نیـوەڕۆ، پێـش نیـوەڕۆ، چرقـەی گەرمـای نیـوەڕۆ}، لـە کاتێکـدا گەرمـا تونـدو سـەخت دەبـێ، لـەو شـوێنانەی گەرمـە سـێرن (لـە بیابانـدا) دەبینـرێ لـە شـێوەی ئاودا لـە حاڵێکـدا کـە بەزەوییەوە نووسـاوە.

کاتێـك تەماشـای دەکـەی، شـەپۆلان دەدا، ئەوانەی سـەفەری بەغدادو شـوێنەکانی دیکـە دەکـەن لـە شـوێنی بیابانیـی، کاتێـك تەماشـا دەکـەن، هـەوا وەك شـەپۆلی ئـاو دێتـە بەرچاویـان، ئـەوە تراویلکـە (سَّرَابُ)ی پـی دەڵێـن.

---

(١ ) ص: ٨٢٥.

یەکێکی دیکە لە زانایان ئاوا پێناسەی دەکات: (**وَالسَّرَابُ: مَا يَلُوحُ فِي الصَّحَارِي مِمَّا يُشْبِهُ المَاءَ وَلَيْسَ بِمَاءٍ، وَلَكِنَّهُ حَالَةٌ فِي الجَوِّ القَرِيبِ، تَنْشَأُ مِنْ تَرَاكُمِ أَبْخِرَةٍ عَلَى سَطْحِ الأَرْضِ**)، واتە: سەڕاب ئەوەیە کە لە بیابانان دێتە بەرچاوو شێوەی ئاو دەکات و ئاویش نیە، بەڵکو حاڵەتێکی هەوایی نیزیکە، لە ئەنجامی کەڵەکە بوونی هەڵمەکانی کە لە ڕووی زەوی هەڵساون، دروست دەبێ.

لە بارەی {فوو کردنەوە بە کەڕەنادا}، جارانی دیکەش باسمان کردوە، کە هەرچەندە دەگونجێ (فووکردن بە کەڕەنادا) تەعبیرێکی ڕەمزیی بێ چونکە لە قورئاندا خوا ﷻ هەندێک جاران هەندێک تەعبیری ڕەمزیی بەکاردێنێ بۆ حاڵییکردنی ئێمە، بۆ وێنە: لە بارەی بەری درەختی زەققوومەوە دەفەرموێ: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾﴾ الصافات، بەرەکەی میوەکەی وەك سەری شەیتانان وایە، بێگومان هیچ کەس سەری شەیتانانی نەبینیوە، بەڵام لە خەیاڵ و ئەندێشەی هەموو کەسدا، شەیتان شتێکی قێزەون و دزێوو ناشیرینەو، دەبێ سەریشی دزێوو قێزەون و ناشیرین بێ، لێرەدا خوای کاربەجێ خەیاڵی ئێمە دەدوێنێ، کەواتە: ئەوە لە ڕووی زمانەوانیی و ڕێزمانییەوە بواری تێدا هەیە، بەڵام مادام فەرمایشتی پێغەمبەرمان ﷺ هەیە لە لایەك و لە لایەکی دیکەشەوە: لەو هەموو ئایەتە موبارەکانەدا، فوو بە کەڕەنا (صور)دا باسکراوەو، هیچ ڕێگرێکیش نیە، ئامێرێك هەبێ و فریشتەیەك تەرخان کرابێ بۆ فوو پێدا کردنی، جارێك فووی پێدا دەکات، ئاخیر زەمان دەقەومێ و گەردوون دەپێچرێتەوەو، جاری دووەم فووی پێدا دەکات، قیامەت دەقەومێ و، ئەوانەی لەسەر زەوی بوون بە جند و بە مرۆڤەوە، هەموویان زیندوو دەکرێنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**كَيْفَ أَنْعَمُ وَصَاحِبُ الْقَرْنِ قَدْ الْتَقَمَ الْقَرْنَ وَحَنَى جَبْهَتَهُ يَسَّمَّعُ مَتَى يُؤْمَرُ فَيَنْفُخُ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ الله ﷺ: كَيْفَ نَقُولُ؟ قَالَ قُولُوا: حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا**}، (**رواه الترمذي: ٢٤٣٩، عن أبي سعيد الخدري، وصحّحه الألباني في سنن الترمذي**)، واتە: چۆن خۆشیی وەربگرم (دڵ بە دنیا خۆش بکەم

و ڕابوێرم لە دنیادا) لە حاڵێکدا خاوەنی قۆچ (قرن)، کەڕەنایەکەی بە دەمەوە گرتوەو نێو چەوانیشی نوشتاندۆتەوەو خوار کردۆتەوەو گوێی هەڵخستوە، کەی فەرمانی پێ دەکرێ، فووی پێدا بکات، هاوەڵانی پێغەمبەر خواش ﷺ گوتیان: چۆن بڵێین؟ فەرمووی بڵێن: {**حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ عَلَى اللهِ تَوَكَّلْنَا**}، خوامان بەسەو باشترین کارپێسپێردراوەو تەنیا پشتمان بەوە بەستوە.

هەرچەندە هەندێك لە زانایانیش مشت و مڕیان هەیە لە بارەی سەنەدی ئەم دەقەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە زۆربەی زانایان هێناویانەو، تەنانەت زانایان باسی ئەو فریشتەیەشیان کردوەو ناویان هێناوەو، لە هەندێك دەقاندا هاتوە کە ناوی (**ئیسرافیل**)ە، ئەو فریشتەیەی دانراوە، بۆ فوو کردن بە کەڕانادا بە دوو جارو دوو قۆناغ، جاری یەکەمیان کە فووی پێدا دەکات، ئاخیر زەمان دەقەومێ، جاری دووەم کە فووی پێدا دەکات، قیامەت دێتە پێش، وەك دوایی لە سوورەتی (**النازعات**)یشدا باس دەکەین و، کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**الزمر**)یشدا، باسمان کرد، چونکە لەوێ خوا ﷻ زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی باسی هەردوو فووەکانی کردوەو دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾**الزمر**، واتە: (جاری یەکەم) فوو بە کەڕەنادا کرا، ئنجا هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەبوون، هەموویان مردن (یاخود بێ هۆش کەوتن) جگە لەوەی خوا بیەوێ، نەمرێ (یان بێ هۆش نەبێ)، دوایی جارێکی دیکە فووی پێدا کرا، یەکسەر هەموویان هەڵسانەوەو چاوەڕێ بوون، تەماشایان دەکرد، (تاکو بزانن خوا فەرمانی بە چییە!).

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە بیسـت (٢٠) ئایەتـی نیـوەی دووەمـی سـوورەتی (النبـأ) پێکهاتـوە، لـەو بیسـت (٢٠) ئایەتـەدا خـوا ﷻ لـە دە (١٠) ئایەتـی یەکەمـدا باسـی دۆزەخ و دۆزەخییـان و ئـەو سـزاو جەزرەبەیـەی دەیچێـژن لـە دۆزەخـدا، دەکات.

لـە دە (١٠) ئایەتـی دووەمیشـدا، وێـڕای بەهەشـت و بەهەشـتییەکان، باسـی هەندێـك لـە سـیفەتەکانی خـوای بـەرزو بـێ وێنـە دەکات و، هەندێـك باسـی مەزنیـی ڕۆژی قیامەتیـش کـراوە.

هەروەهـا لـە کۆتاییـدا باسـی ئـەوەش کـراوە، هەموو کەسێك لـەو ڕۆژەدا تەماشـا دەکات، بزانـێ چـی کـردوەو، هـەردوو دەسـتی چییـان پێشخسـتوە بـۆ ئـەو ڕۆژەو، بابـای بێبـڕواش خۆزگـە دەخـوازێ گڵ بووایـە.

﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتۡ مِرۡصَادٗا ٢١ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابٗا ٢٢ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا ٢٣ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا ٢٤ إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا ٢٥ جَزَآءٗ وِفَاقًا ٢٦ إِنَّهُمۡ كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا ٢٧ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا ٢٨ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا ٢٩ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا ٣٠ إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ مَفَازًا ٣١ حَدَآئِقَ وَأَعۡنَٰبٗا ٣٢ وَكَوَاعِبَ أَتۡرَابٗا ٣٣ وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا ٣٤ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا كِذَّٰبٗا ٣٥ جَزَآءٗ مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابٗا ٣٦ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلرَّحۡمَٰنِۖ لَا يَمۡلِكُونَ مِنۡهُ خِطَابٗا ٣٧ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ صَفّٗاۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَقَالَ صَوَابٗا ٣٨ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلۡحَقُّۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ٣٩ إِنَّآ أَنذَرۡنَٰكُمۡ عَذَابٗا قَرِيبٗا يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ٤٠﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی دۆزەخ لە بۆسەدایە ﴿٢١﴾ بۆ یاخییان جێی بۆ لا گەڕانەوەیە ﴿٢٢﴾ ڕۆژگارانێك (ی بێ کۆتایی) تێیدا دەمێننەوە ﴿٢٣﴾ نەفێنکایەتیی تێدا دەچێژن نە خواردنەوە ﴿٢٤﴾ بێجگە لە ئاوی کوڵیوو زووخاو ﴿٢٥﴾ (ئەو سزایەش) سزایەکی تێرو تەواوو گونجاوە ﴿٢٦﴾ چونکە ئەو (بێبڕوا ملهوڕ)انە بە ئومێدی لێپرسینەوە نەبوون ﴿٢٧﴾ بەسەختییش ئایەتەکانمانیان بە درۆ دانان ﴿٢٨﴾ ئێمەش هەموو شتێکمان بە نووسین سەرژمێر کردوە ﴿٢٩﴾ دەجا بیچێژن (ئەی بێبڕواینە!) جگە لە ئازار بۆتان زێدە ناکەین ﴿٣٠﴾ بێگومان پارێزکاران بە مراد گەیشتنیان هەیە ﴿٣١﴾ باخ و بێستان و (ڕەزی) ترێیەکان ﴿٣٢﴾ هەروەها (ئافرەتە) تازە مەمك کردوە هاو تەمەنەکان ﴿٣٣﴾ هەروەها دەفری پڕ کراو ((لە خواردنەوەی جۆراو جۆر) ﴿٣٤﴾ قسەی پووچ و درۆی تێدا نابیستن ﴿٣٥﴾ (ئا ئەوە) پاداشتدانەوەیە لە پەروەردگارتەوە، بەخششێکی ژمێرراو (و ئەندازەگیریی کراو)ە ﴿٣٦﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە (خوای) بە بەزەیی (دروستکراوەکان) مافی دواندن (و داوا لێکردن)ییان نیە ﴿٣٧﴾ ئەو ڕۆژە کە ڕووح (جیبریل) و فریشتەکان بە ڕیز دەوەستن، قسە ناکەن، جگە لەو کەسەی (خوای) بە بەزەیی مۆڵەتی بدات و (قسەی) ڕێك و ڕاستیش بڵێ ﴿٣٨﴾ ئەو ڕۆژەش چەسپاوە (و دێ)، ئنجا هەر کەس ویستی بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە ﴿٣٩﴾ بە دڵنیایی (خەڵکینە!) ئێمە لە سزاو ئازارێکی نیزیك ترساندوومانن و وریامان کردوونەوە، ڕۆژێك مرۆڤ تەماشا دەکات دوو دەستەکانی چییان پێشخستوەو (بابای) بێبڕواش دەڵێ: ئەی خۆزگە گڵ بوومایە ﴿٤٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مِرْصَادًا): (الرَّصَـدُ: الإِسْـتِعْدَاد للتَرَقُّـب، المَرْصَـدُ: مَوْضِـعُ الرَّصَـدِ وَالمِرصَـادُ نَحْـوَهُ، لَكِـن يُقَـالُ للمَـكَان الَّـذِي اخْتُـصَّ بِالتَرَصُّـد، وَالمِرْصَـاد: طَرِيْـقُ الرَّصْـدِ وَالمُرَاقَبَـةِ أَو مَوْضِعِـهِ، وَهُـوَ لَـكَ بِالمِرْصَـاد، أَي: يُرَاقُبُـكَ وَلَا تَفُوتـهُ)، وشـەی (رَصَـد): بـە مانـای خـۆ ئامادەکردنـە بـۆ چاودێریـی، (مَرْصَـد) شـوێنی چاودێریـی تێداکـردن و تێـدا چوونـە بۆسـەیە، (مِرصَـاد) یـش بـە هەمـان شـێوە، {شـوێنی تێـدا چوونـە بۆسـەو چاودێریـی تێـدا کردنـە}، بـەڵام (مِرصَـاد) تایبەتـە بـەو شـوێنەوەی چاودێریـی تێـدا دەکـرێ و بۆسـەی لـێ دادەنـرێ، (مِرصَـاد)، بـە ڕێـی چاودێریـی تێـدا کـردن، یاخـود بـە شوێنەکەشـی دەگوتـرێ، (هُـوَ لَـكَ بِالْمِرْصَـادِ)، واتـە: ئـەو چاودێرییـت دەکات و تـۆ لـە دەسـتی دەربـاز نابـی.

(لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا): (طَاغِـيْن) کـۆی (طَاغِي)یـە، کـە لـە (طَغَـى)وە هاتـوە، (طَغَـى يَطْغَى طُغْيَانَـاً، والطُّغْيَـانَ تَجَـاوُزُ الحَـدِّ فِي العِصْيَـان)، (طُغْيَـان): بریتیـە لـە سـنوور بەزانـدن لەسـەر پێچپیکردنـدا، واتـە: یاخیـی بـوون و لـە سـنوور دەرچـوون، ئنجـا (طَاغِـيْن) یانـی: یاخییـان و لـە سـنوور دەرچـووان، لەسـەر پێچپیکردنـدا.

(مَـَٔابًا): (الأَوْبُ: ضَرْب مِـنَ الرُّجُـوعِ)، (مَـئَـاب) شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوە، لـە (آب)ەوە هاتـوە، (آبَ، يَئُـوُب، أَوْبـاً)، (آبَ)، گەڕایـەوە، (يَئُـوُب) دەگەڕێتـەوە، (أَوْبـاً)، گەڕانـەوە، بـەڵام (أَوْب) جۆرێکـی تایبەتـە لـە گەڕانـەوەو، بریتیـە لـە گەڕانـەوەی ئەوانـەی خاوەنی هەسـت و ویسـتن، ئەگەرنـا ناگوتـرێ: (آبَ الفَـرَسُ) یـان (آبَ الغَنَـم) ئەسـپەکە گەڕایەوە، مەڕەکـە گەڕایـەوە، ئـەوان وشـەی (عَـادَ) و (رَجَـع) یـان بـۆ بـەکاردێ، بـەڵام (آبَ) بـۆ خـاوەن ویسـت و هەسـتان بەکاردەهێـنرێ، بـۆ فریشـتان، بـۆ مرۆڤـان، بـۆ جنـدان.

(المَـآبُ: المَصْـدَر مِنْـهُ واسْـم الزَّمَـان وَالمَـكَان)، وشـەی (مَئَـآب): بـە مانـای چـاوگ دێ، واتـە: گەڕانـەوە، دەشـگونجێ نـاوی کات بـێ، واتـە: کاتـی گەڕانـەوە، هەروەهـا دەشـگونجێ شـوێن بـێ، شـوێنی بـۆ لا گەڕانـەوە.

(لَّٰبِثِينَ فِيهَآ): لەوێدا دەمێننەوە لەو دۆزەخەدا دەمێننەوە، دەگوترێ: (لَبِثَ فِي المَكَانِ: أَقَامَ بِهِ مُلَازِماً لَهُ)، واتە: لەو شوێنەدا مایەوە پێوە پەیوەست بوو.

(أَحْقَابًا): (قِيلَ جَمْعُ الحُقُبِ: وَهُوَ الدَّهْر)، (أَحْقَاب) گوتراوە کۆی (حُقُب)ە، کە بە مانای ڕۆژگار دێ، (وَالحِقْبَةُ مُدَّة مِنَ الزَّمَان مُبْهَمَةٌ)، (حِقْبَة)، ماوەیەك لە کات کە نادیارە چەندە.

(حَمِيمًا): (الحَمِيْم: المَاءُ الشَّدِيْدُ الحَرَارَة)، ئاوێکی زۆر گەرم، بە کوردیی دەڵێن: ئاوی داغ، ئاوی کوڵاو.

(وَغَسَّاقًا): (الغَسَّاقُ: مَا يَقْطُرُ مِن جُلُودِ أَهْل النَّار)، ئەوەی لە پێستی دۆزەخییەکان دێتە خوار (لە کێم و زووخاو ئاوو زەڵزەڵە)، پێی دەگوترێ: (غَسَّاق).

(دِهَاقًا): (دِهَاقاً: أي مُفْعَمَة)، واتە: پڕ، پڕکراو، (أَدْهَقَ و دَهَقَ الكَأس: أي: مَلَأَها)، ئەگەر پەرداخێك یان دەفرێك پڕ بکرێ لە خواردنەوەیەك، دەگوترێ: (دَهَق، وأدْهَق)، (وَكَأْسٌ دِهَاقٌ أي: مُمْتَلِئَة)، دەفرێکی پڕ، (دِهَاق)، یانی: پڕکراو، لە شەڕاب یان لە هەر جۆرە خواردنەوەیەك.

(كِذَّابًا) (أي: تَكذيباً)، (كِذَّاب)، لێرەدا چاوگە بە مانای (تَكذيب)، بە درۆ دانان.

(وِفَاقًا): (الوِفَاق: مَصْدَرُ وَافَقَ وَهُوَ مُؤَوَّلٌ بِالْوَصْف أي: مُوَافِقاً للعَمَل الَّذِي جُوزُوا عَلَيْه، وَالوَفْقُ المُطَابَقَةُ بَيْنَ الشَّيْئَين، وَافَقْت فُلَاناً، وَوَافَقْت الأَمْرَ: صَادَفْتَه، وَالإتِّفَاق مُطَابَقَة فِعل الإنسَان القَدَر، وَيُقَالُ ذَلِك فِي الخَير وَالشّر)، وشەی (وِفَاق)، چاوگە لە (وَافَق)ەوە هاتوە، ئنجا (وِفَاق) لێرەدا بە وەسف مانا کراوە، ﴿ جَزَآءً وِفَاقًا ﴾، یانی: (مُوَافِقاً)، گونجاو {(مُوافِق) بە کوردیی دەڵێن: لەگەڵ گونجاو، پێکەڵپێك، پڕ بە پێست}، (مُوَافِقاً للعَمَل الَّذِي جُوزُوا عَلَيْه)، واتە: پڕ بە پێست و پێکەڵپێك لەگەڵ ئەو کردەوەیەدا کە لەسەری سزا دراون.

(وفق)یش پێکەوە گونجان و پێکەوە بوونی دوو شتانە، دەگوترێ: (وَافَقْت

**فُلَانَاً، وَوَافَقْتُ الأمْرَ**)، لەگەڵ فلانکەسدا پێکەڵپێك بووم، ئەو چی گوت منیش وام گوت، ئەو چی کرد، منیش وامکرد، (**وَافَقْتُ الأمْرَ**)، واتە: کارەکەم وەك خۆی ئەنجامدا، (**إتِّفَاق**)یش یانی: ڕێککەوتن لەنێوان دوولایەن یان زیاتردا.

(مَفَازًا): (**المَفَازَةُ: الفَلَاةُ القَلِيلُ المَاء، سُمِّيَ تَفَاؤلاً بِالْخَلَاصِ مِنْهَا**)، (**مَفَازَة**): بە دەشتێك دەگوترێ ئاوی کەم بێ، {یاخود ئاوی هەر نەبێ}، بۆیەش (**مَفَازة**) بە مانای سەرفرازیی و بەمراد گەیشتن و دەرباز بوون دێ، وەك گەشبینییەك گوتراوە: (**مَّفَازَةٌ**)، واتە: شوێنێك کە خەڵك لێی دەرباز دەبێ، وەك گوتراوە: (**تَّفَاءلُوا بِالْخَيْرِ تَجِدوهُ**)، گەشبین بن و هەمیشەی چاوەڕوانیی چاکە بکەن، تووشی چاکە دەبن، کەواتە: لێرەدا (**مَّفَازاً**)، (**أي فَوْزاً وَالفَوْز: الظَّفَرُ بِالخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلَامَة**)، (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: (**فَوز**)، بریتیە لە وەدەستهێنانی خێرو خۆشیی لەگەڵ دەستەبەرکرانی سەلامەتیی دا.

کەواتە: (**مَفَاز**) بە مانای چاوگ دێ، {سەرکەوتن و بە مراد گەیشتن}، بە مانای شوێنی تێدا بە ئامانج گەیشتنیش دێ.

(حَدَآئِقَ): (**جَمْعُ حَدِيقَة: قِطْعَةُ مِن الأرْضِ ذَات مَاء سُمّيت تَشْبِيهاً بِحَدَقَة العَيْن في الهَيْئَة وَحُصُول المَاء فِيْهَا، وَجَمْعُ حَدَقَةِ: حِدَاق، وأَحْدَاق**)، (**حَدَائِق**)، کۆی (**حَدِيقَة**) یە، (**حَدِيقَة**) پارچە زەوییەکە، ئاوی تێدابێ، بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە، چوێنراوە بە چاوەوە، لە شێوەکەی دا کە چاویش ئاوی تێدایە، ئنجا کۆی (**حَدَقَةَ**) ی چاو، گلێنەی چاو، بریتیە لە (**حِدَاق، وَأَحْدَاق**)، هەردووکیان کۆی (**حَدَقَة**) ن، کۆی (**حَدِيقَة**)ش (**حَدَائِق**)ە، بە کوردیی (**حَدِيقَة**) دەبێتەوە باغ و بێستان، چونکە (**حَدِيقَة**)، وەك دواییش باسی دەکەین، بریتیە لە باخ و دارستان و میوەو شیناوردێك دەوری تەنرابێ و پەرژین یان دیوار هەبێ.

(وَكَوَاعِبَ ): (**كَوَاعِب**) کۆی (**كَاعِب**)، واتە: ئافرەتێك کە تازە مەمکی کردوون، ئافرەتی تازە پێگەیشتوو، ئەویش لە (**كَعْبُ الرِّجْل**)، لە گوێزینگی پێ، هاتوە،

هـەر پێیەکـی مـرۆڤ دوو گوێزینگـی هـەن، لای دەرێـی و لای ژوورێـی، (**العَظْـمُ الَّـذِي عِنْـدَهُ مُلْتَقَـى القَـدَم وَالسَّـاق**)، (**كَعْـبٌ**)، ئێسـكێكە لـەو شـوێنەی پـێ و لاق پێـك دەگـەن.

وشـەی (**كَوَاعِـب**)، کـە کـۆی (**كَاعِـب**)ە، دەگوتـرێ: (**كَعَـبَ الثَّـيُ كَعْباً وَكَعَابـة**)، واتە: مەمکـی خـڕ بـوو، دەرکـەوت، (**كاعـب**) کچێکـە مەمکـی شـۆڕ نەبووبنـەوە، ئافـرەت کـە دەکەوێتـە تەمەنـەوە مەمکـی شـۆڕ دەبێتـەوە، وشـەی (**كَوَاعِب**)یـش لەبـەر ئـەوەی تەنیـا بـە ئافـرەت وا دەگوتـرێ، بۆیـە پێویسـت نـاکات (ة)ی مێینـە بخرێتـە سـەر تاکەکـەی و پێـی بگوتـرێ: (**كَاعِبَـة**)، هـەروەك بـە ئافرەتـی حەیـزدار دەگوتـرێ: (**حَائِـض**)و ناگوتـرێ: (**حَائِضَـة**)، چونکـە پێویسـت نـاکات بـە تـای مێینـە (**تـاء تأنيـث**) جیـای بکەیـەوە، لەبـەر ئـەوەی کەوتنـە بـێ نوێژیـی، تایبەتـە بـە ئافرەتانـەوە، ئـەو حاڵەتـی سـینگ و مەمـك خڕبوونـەش، هـەر تایبەتـە بـە ئافرەتانـەوە.

(أَتْرَابًا): (**أَتـرْاب**) کـۆی (**تـِرْب**)ە، یانـی: (**الأقْـرَان فِي السِّـنُ**)، ئەوانـەی هاوتەمەنـن، ئنجـا پێکـەوە هاوتەمەنـن ئـەو ئافرەتانـە، یاخـود لەگـەڵ مێردەکانیانـدا هاوتەمەنـن، هـەردوو واتایەکـەی هـەن، وشـەی (أَتْرَابًا) کـۆی (**تـِرْب**)ە واتـە: هـاو تەمـەن، بۆیـە واگوتـراوە:

أ- یان لەبەر ئەوەی پێکەوە پێ دەگەن و یەکسانن، وەك پەراسووەکان (**تَرَائِب**)، کە بە ئەو پەراسووانەی دەوری سینگ دەگوترێ، ئەوانیش تەمەنیان بە ئەندازەی یەکە.

ب- یان لەبەر ئەوەی ئافرەتانی دنیا کە پێکەوە لە دایك بووبن، پێکەوە کەوتوونە زەوی، ئەوانیش هەروان.

ج- یان لەبەر ئەوەی کاتی خۆی کە گچکە بوون، پێکەوە یارییان بە گڵ (تراب) کردوە.

(أَتْرَابًا)، ئەو ڕیشە زمانەوانییانەی هەرسێکیان هەن.

(وَكَأۡسٗا): (الكَأْسُ: الإِنَاءُ بِمَا فِيْهِ مِنَ الشَّرَاب، وَسُمِّيَ كُلُّ وَاحِدٍ منهما بِانْفِرَادِه: كَأْسَاً)، (كَأس)، دەفر، بەڵام بە مەرجێك شەڕاب و مەی تێدابێ و، هەر کام لە دەفر (كَأس)ەکە، خۆی بە تەنیاو، شەڕابەکەش کە لە نێوی دایە، هەردووکیان (كَأس)یان پێ دەگوترێ.

(دِهَاقٗا): (دِهَاقَا: أي مفعمة)، پڕ کراو.

(خِطَابٗا): (الخِطَاب: الكَلَام)، دواندن، قسە لەگەڵدا کردن.

(صَوَابٗا): (الصَّوَابُ: السَّدَادُ وَالحَقّ)، (صواب) یانی: قسەی بە جێ و ڕێك و ڕاست.

(ٱلۡمَرۡءُ): زۆربەی تەفسیرەکان بە (الرَّجُل)یان لێکداوەتەوە، بەڵام بۆ پیاو وشەی (رَجل) هەیەو، وشەی (المَرْء)، بۆ پیاوو ئافرەت بەکاردێ و، ئەگەر بویستریّ تایبەت بکریّ بە ئافرەتەوە دەڵێن: (إمْرَأة)، (ة)ی مێینەی دەخرێتە سەر، بەڵام وشەی (المَرْء)، لە ئەسڵدا بۆ پیاوو ئافرەت بەکاردێ، تەنیا کاتێك ئافرەت جیا دەکرێتەوە، دەگوترێ: (إمرَأة)، ئەگەرنا مادام (ة)یەکەی پێوە نەبێ، واتە: مرۆڤ، وەك وشەی (إنسَان)، بۆ مێ و بۆ نێر بەکاردێ.

وشەی (مُرُوءَة)یش هەر لە (المَرْء)ەوە هاتوە، کە ئاوا پێناسە کراوە: (المُرُوءَة: آدَابُ نَفْسَانِيَّة تَحْمِل مُرَاعَاتُها الإنْسَان عَلَى الوُقُوفِ عِنْدَ مَحَاسِن الأَخْلَاق وَجَمِيْل العَادَات)، (مرُوءَة)، جوامێریی، چەندە ئەدەبێکی دەروونیین ڕەچاو کردنیان مرۆڤ وا لێ دەکات، بە ڕەوشتە جوانەکان و نەرێتە پەسندەکان بڕازێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای پـەروەردگار لـەم بیسـت (٢٠) ئایەتـەی کۆتایـی سـوورەتی (النبأ)دا، وەك پێشـتریش باسـمان کـرد، هـەم باسـی دۆزەخ و ئەهلـی دۆزەخـمان بـۆ دەکات، کـە ژیـان و گوزەرانیـان لەوێـدا چۆنـەو، هـۆکاری چوونـە نێـو دۆزەخیشـیان باس دەکات، هـەم باسـی بەهەشـت و بەهەشـتییانمان بـۆ دەکات، دوایيـش لـە کۆتایيـدا، باسـی چەنـد سـیفەتێکی بـەرزو بـێ وێنـەی خـوا ﷻ و سـام و هەیبەتـی خـوا، دەکات، کـە هیـچ کـەس مافـی ئـەوەی نیـە، لـە خزمـەت خـوادا قسـە بـکات، مەگـەر خـۆی مۆڵەتـی لەسـەر بـێ و قسـەی ڕاسـت بـکات، پاشـان سـەرەنجامی مـرۆڤ لـە ڕۆژی دوایيـدا دەخاتـە ڕوو کـە چـۆن هەمـوو کـەس تەماشـا دەکات: چیکـردوە؟ بابـای کافریـش خۆزگـە دەخـوازێ هـەر گڵ بووایـە، دەفەرمـوێ:

﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا﴾، بـە دڵنیایـی دۆزەخ کەمینگەیـە، بۆسـەیە، شـوێنێکە سـزای خـوا لەوێـدا بـۆ بێبڕوایـان لـە بۆسـەدایە، وشـەی ﴿مِرْصَادًا﴾، بـە مانـای شـوێنی چاودێریـی کـردن و، بـە مانـای بۆسـەو، بـە مانـای شـتێکیش کـە لە بۆسـەدایە، هاتـوە، کەواتـە: دەگونجـێ ئـاوا لێـك بدرێتـەوە: دۆزەخ بۆسـەیەو چاوەڕوانـکارە بـۆ بێبڕوایـان، یاخـود شـوێنی بۆسـەدانان و چاودێرییکردنـە، ﴿لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا﴾، بـۆ لـە سـنوور دەرچـووان لەسـەرپێچییدا، شـوێنی بـۆ لا گەڕانەوەیـە، ﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا﴾، ڕۆژگارانێکـی زۆر تێیـدا دەمێننـەوە، دوایـی لـە بـارەی ئـەم ئایەتـە موبارەکـەوە، زیاتـر قسـە دەکەیـن، کـە هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: ئەمـە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوە کـە سـزای دۆزەخییـان لـە دۆزەخـدا، کاتێـك دێ کۆتایـی دێ، بـە گشـتیی، بـەڵام دوایـی قسـەی زانایـان لـەو بـارەوە دێنـن و، لێرەش ئەوەنـدە دەڵێیـن: ئەمـە هـەر ئەوەنـدە دەگەیەنـێ کـە ڕۆژگارانێکـی زۆر، لـە دۆزەخ دا دەمێننـەوە، چونکـە: ﴿أَحْقَابًا﴾، کـۆی (حُقُـب) و (حُقْبَة)یـە، واتـە: ماوەیـەك لـە کات، ئنجـا خـواش نەیفەرمـووە ئـەو کاتانـە، خـاوەن کۆتایـی و سـنووردارن، گرنـگ ئەوەیـە لـە دۆزەخـدا کاتـەکان

تێدەپەڕن بێبڕوا سزا دراوەكان كاتی زۆریان بەسەردا تێدەپەڕن، بەڵام خوا نەیفەرمووە كاتەكان سنووروو كۆتاییان هەیە، ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا ﴾، هیچ جۆرە فێنكایەتیی و خواردنەوەیەكی تێدا ناچێژن، ﴿ إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا ﴾، جگە لە ئاوی داغ و كوڵاوو كێم و زووخاو، ﴿ جَزَآءٗ وِفَاقًا ﴾، ئەوەش سزایەكی پێكەڵپێكە، سزایەكی پڕ بە پێست و گونجاوە، خوا ﷻ بە زۆریی وایە كە باسی سزادانی بێبڕوایان دەكات، باسی هۆكاری سزادرانەكەشیان دەكات و، كاتێ باسی پاداشتی بەهەشتییەكان دەكات، باسی هۆكاری پاداشتدرانەوەكەشیان دەكات، لێرەش دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا ﴾، {بۆیەش بەو جۆرە سزا دەدرێن}، چونكە ئەوانە بە ئومێدی لێپرسینەوە نەبوون، زانایان: ﴿ يَرۡجُونَ ﴾، یان بە (**یخافون**) لێكداوەتەوە، واتە: لە لێپرسینەوە نەدەترسان، بەڵام وشەی ﴿ لَا يَرۡجُونَ ﴾، یانی: ئومێدەوار نەبوون، ئەمەش توانج گرتنە لە بێبڕوایەكان كە بڕواداران، ئومێدەوار بوون و، چاوەڕوان بوون و، هیوایان هەبوو بە لێپرسینەوە، چونكە دەیانزانی شتی باشیان لە هەگبە دایە، وەك گوتراوە: ئەوەی پاكە بێ باكە، بەڵام ئەوانە هیچ ئومێدێكیان نەبوو بۆ لێپرسینەوەو ئومێدی خێریان نەبوو، چونكە دەیانزانی چییان كردوە! ﴿ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا ﴾، بە بەدرۆ دانانێكی زۆر بێڕەزاش، ئایەتەكانی ئێمەیان بە درۆ دانان، ﴿ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا ﴾، ئێمەش هەموو شتێكمان سەرژمێر كردوە بە نووسین و تۆماركردن، بەو جۆرە تۆمار كردنەی هەر خوا دەیزانێ چۆنە، ﴿ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا ﴾، {پێیان دەڵێین: یان پێیان دەگوترێ:} بیچێژن، بەس سزاو ئازارتان بۆ زیاد دەكەین، واتە: ئەگەر شتێكتان بۆ زیاد بكەین، هەر سزاو ئازارە، ئەگەرنا بە تەمای هیچی دیكە مەبن.

ئنجا دێتە سەر باسی بەهەشت و بەهەشتییەكان و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴾، بە دڵنیایی بۆ پارێزكاران، واتە: ئەوانەی خۆیان پاراستوە، لە دنیادا لە كوفرو شیرك و نیفاق و ئیلحادو، گوناهە گەورەكان و تاوان و لادان، بۆ ئەوان بە

مـراد گەیشـتن و بـە ئـاوات گەیشـتن و دەربـاز بـوون هەیـە، ئایا لـە چییدا بەرجەسـتە دەبـێ، ئـەو دەربـاز بـوون و بـە ئـاوات گەیشـتن و بـە مـراد گەیشـتنە؟، ﴿ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴾، باخـەکان و ترێیـەکان، (**حدائـق**) کـۆی (**حديقة**)یـە، کـە باخـی شـوورەو پەرژیـن کـراوە، ترێیەکانیـش بێگومـان دارمێوەکانـن، ﴿ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴾، ﴿ وَكَوَاعِبَ ﴾، کـۆی (**كَاعِـب**)ە، واتـە: ئافرەتـی تـازە مەمـك كـردوو، ﴿ أَتْرَابًا ﴾، کـۆی (**تِـرْب**)ە، واتـە: ئافرەتانـی تـازە پێگەیشـتووی هاوتەمـەنی مێـرد، یـان ئافرەتـەکان لـە بەینـی خۆیانـدا هاوتەمەنـن. ﴿ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴾، هەروەهـا لـەو بەهەشـتەدا پێکـی پـڕی جـۆری شـەڕاب هەیـە، یـان لـە جۆرەکانـی دیکـەی خواردنـەوە هەیـە، بـەڵام زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: مەبەسـت پێـی شـەڕابە، چونکـە دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴾، لـەو بەهەشـتەدا، یـان لـە کاتـی ئـەو شـەڕاب خواردنەوەیـەدا، نابیسـتن نـە قسـەی پـووچ، نـە درۆ کـردن، بـە پێچەوانـەی ئەهلـی شـەڕابەوە کـە لـە دنیـادا سـەرخۆش دەبـن، عەقـڵ لـە دەسـت دەدەن و، قسـەی بـێ جـێ دەکـەن و درۆو دەلەسـەو شـتی خـراپ دەڵێـن،﴿ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴾، ئـەوەش پاداشـتێکە لـە پەروەردگارتـەوە، بەخششـێکی ئەندازەگیریـی کـراوە، بـە خششـێکی ژمێـردراوەو لـە گۆتـرە نیە، ﴿ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، پـەروەردگاری ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی لـە نێوانیاندایـە، بـە بەزەییـە، خوێندراویشـەوە: (**رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا**)، (ٱلرَّحْمَٰنِ) خوێندراویشـەتەوە: (**الرَّحْـمَانُ**)، پـەروەردگارو خاوەنەکانـی ئاسـمانەکان و زەوی ئـەوەی دەکەوێتـە نێوانیانـەوە، بـە بـە زەییـە، ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴾، مـافی قسـە کردنیـان لەگەڵـی نیـە، واتـە: هیچکـەس مافـی ئـەوەی نیـە، لـە خـۆوە خـوای پـەروەردگار بدوێنـێ و داوای لـێ بـکات و قسـەی لەگـەڵ بـکات، بـە پێچەوانـەی خەیاڵپـڵاوی هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـەوە، کـە پێیـان وایـە پەرسـتراوەکانیان شـەفاعەت و تکایـان بـۆ لـەلای خـوا دەکـەن، ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا ﴾، ئـەو ڕۆژەی ڕووح و فریشـتەکان بـە ڕیـز دەوەسـتن، ﴿ ٱلرُّوحُ ﴾، هەرچەنـدە هەندێك لـە زانایـان گوتوویانـە: دروسـتکراوێکی خوایـە نازانیـن چۆنـە! هەندێکیـش گوتوویانە:

مەبەست پێی ڕووحی مرۆڤەكانە، بەڵام ﴿ ٱلرُّوحُ ﴾، لە قورئاندا كە بەكارهاتوە، بۆ جیبریل بەكارهاتوەو، لە چەند شوێنێكیشدا زۆر بە ڕوونیی دیارە، بۆ وێنە:

أ- ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴾، لە سوورەتی (**القدر**)دا.

ب- هەروەها ﴿ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴾، لە سوورەتی (**المعارج**)دا، واتە: (جیبریل) -- كە نازناوەكەی (روح)ە -- لەگەڵ فریشتەكان بە ڕیز دەوەستن، ﴿ لَّا يَتَكَلَّمُونَ ﴾، قسە ناكەن، ﴿ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴾، مەگەر كەسێك (خوای) بە بەزەیی مۆڵەتی دابێ و قسەی ڕاست و بەجێش بكات، ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ ﴾، ئا ئەو ڕۆژە ڕۆژێكی چەسپاوە، هەقە، دێتە دی، ڕۆژێكی دادگەرانەیە، ﴿ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴾، ئنجا هەر كەسێك ویستی بەرەو لای پەروەردگاری ڕێی گرتە بەر، بۆ لای پەروەردگاری گەڕایەوە، ﴿ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ترساندوومانن، ئاگادارمان كردوونەوە لە سزایەكی نیزیك، ئایا ئەو سزایە نیزیكە كەنگێیە؟ ﴿ يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ﴾، ئەو ڕۆژەیە كە مرۆڤ تەماشا دەكات، دەستەكانی چییان پێشخستوە؟ هەر كەسە تەماشا دەكات، بزانێ چ بەرهەمێكی هەیە؟ چی لە ژیانی دنیاوە بردوە بۆ قیامەتێ و پێشیخستوە؟، ﴿ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴾، بابای بێبڕواش دەڵێ: خۆزگە گڵ بوومایە، واتە: خۆزگە هەر دروست نەكرابامایە، یاخود: خۆزگە كە دەمردم و دەبوومەوە گڵ، زیندوو نەكرابامایەوە، یان كاتێك كە ئاژەڵەكان دەبینێ دوای سزاو پاداشت دانەوەیان و دادگایی كرانیان -- وەك لە فەرمایشتێكدا هاتوە -- دەبنەوە بە گڵ و خۆڵ، ئەویش خۆزگە بە حاڵی وان دەخوازێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**دۆزەخ بۆسەگای یاخییانە، ڕۆژگارانێکی بێ کۆتایی، تێیدا دەمێننەوە، هیچ فێنکایەتیی و خواردنەوەی تێدا ناچێژن، جگە لە ئاوی داغ و زووخاو، ئەوەش سزای پڕ بە پێستیانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِلطَّاغِينَ مَآبًا ﴿٢٢﴾ لَابِثِينَ فِيهَا أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَاءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾﴾.

### شیکردنەوە ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا﴾، بە دڵنیایی دۆزەخ بۆسەگایە، واتە: شوێنی بۆسەدانانە، یاخود: دۆزەخ خۆی بۆسەیە، **(الطبري)** دەڵێ: **(أي ذَاتُ الرَّصَدِ لأَهْلِهَا الَّذِيْن يُكَذِّبُونَ فِي الدُّنْيَا بِهَا)** واتە: خاوەن بۆسەیە، بۆ کەسەکانی، ئەوانەی لە دنیادا پێی بێبڕوا بوون.

وشەی ﴿مِرْصَادًا﴾، پێشتریش گوتمان:

**أ-** بە مانای ئەو شوێنە دێ، کە بۆسەی تێدا دادەنرێ.

**ب-** بە مانای خودی بۆسەکەش دێ.

**ج-** بە مانای شوێنی چاودێریی لێ کردن **(مَكَانُ الرَّصْدِ)**یش دێ.

**٢)-** ﴿لِلطَّاغِينَ مَآبًا﴾، بۆ سنووربەزێنان (لە سەرپێچیی خوای پەروەردگاردا)، شوێنی بۆلا گەڕانەوەیە، **(سُفيان)** کە یەکێکە لە ڕاوییەکان و پێدەچێ **(سفيان الثوري)** بێ، **(الطبري)**، ئەو دەقەی لێیەوە هێناوە، دەڵێ: **(مَئَابَاً: أي مَرْجِعَاً وَمَنْزِلًا)** (جامع البيان: ٣٦١٥٩)، واتە: **(مئاب)** شوێنی بۆ لا گەڕانەوەو شوێنی تێدا سەقامگیر بوونە.

٣)- ﴿ لَّبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابًا ﴾، ڕۆژگارانێك (ی بێ كۆتایی) تێیدا دەمێننەوە، وشەی: ﴿ لَّبِثِينَ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (لَبِثِيْنَ)، بەڵام (الطبري) دەڵێ: (لا بثين) ڕاست و دروستترە، هەرچەندە ئەویش یەكێكە لە خوێندنەوەكان.

﴿ لَّبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابًا ﴾، ﴿ لَّبِثِينَ ﴾، كۆی (لَابِث)ە، (لَابِث) ناوی بكەر (اسْمِ الفَاعِل)ەو لە (لَبِثَ)ەوە هاتوە، (لَبِثَ فِي المَكَان): (أَقَامَ فِيْهِ مُلَازِمَاً لَهُ)، واتە: لەو شوێنە مایەوەو پێیەوە پەیوەست بوو، (قتادة)، كە (الطبري)، لێیەوە هێناوە لە بارەی: ﴿ لَّبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابًا ﴾ەوە، گوتوویەتی: (وَهُوَ مَالَا انْقِطَاعَ لَهُ كُلَّمَا مَضَى حُقْبٌ جَاءَ حُقْبٌ بَعْدَه) (جامع البيان: ٣٦١٦٥)، واتە: بریتیە لە كاتێكی بێ كۆتایی، هەتا ماوەیەك لە كات دەڕوا، ماوەیەكی دیكە لە كات دێ.

(حُقْبٌ)، كە بە (حُقْبَة)ش هاتوە، واتە: ماوەیەكی نادیار لە كات، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ماوەكەی هەشتا ساڵە، بەڵام هەر ساڵە هێندەی سەد ساڵە، یان هەر ساڵە بە قەدەر پەنجا هەزار (٥٠،٠٠٠) ساڵە، ئەوەش هەمووی قسەی زانایانەو، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ڕۆژگارانێكی زۆر، ﴿ أَحۡقَابًا ﴾، كەواتە: ﴿ لَّبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابًا ﴾، یانی: ماوە بە دوای یەكدا هاتوە نەزانراوەكان، لە وێدا دەمێننەوە.

(الحسن البصري) كە (الطبري) لێیەوە هێناویەتی، گوتوویەتی: (أَمَّا الأَحْقَابُ: فَلَا يَدْرِي أَحَد مَا هِي، وَأَمَّا الحُقْبُ الوَاحِد، فَسَبعُونَ أَلْفَ سَنَةٍ كُلّ يَوْمٍ كَأَلْفِ سَنَة) (جامع البيان: ٣٦١٦٩)، واتە: (أَحْقَاب)، هیچ كەس نازانێ چییە، بەڵام (حُقْب)ێك بریتیە لە حەفتا هەزار (٧٠،٠٠٠) ساڵ، هەر ڕۆژێكی بە قەدەر (١٠٠٠) ساڵە، لەگەڵ ئەوەشدا كە نازانن چەند (حُقْب)یشە، ئێمە دوایی هەڵوێستەیەكی باش دەكەین، لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەكەدا، كە هەندێك لە زانایان ئەوەیان لێ هەڵێنجاوە، دەبێ كاتێك بێ كۆتایی بێ بە سزادرانی دۆزەخییان لە دۆزەخدا بە هەموو جۆرەكانیانەوە، واتە: چ گوناهبارانی ئیماندار، چ بێبڕوایان، گوتوویانە:

(**أحْقَـاب**) كـۆی (**حُقْـب**)ەو (**حُقْب**)یـش هـەر چـۆن بـێ ماوەیەكـە لـە كات، بـا نادیاریـش بـێ، ئنجـا خـوای پـەروەردگار (**حُقْـب**)ی كۆكردۆتـەوە، كەواتـە: چەنـد ماوەیەكـی نادیـار لـە كات، كەواتـە: ئـەو كاتـەش سـنووردارە، كـە دۆزەخییەكانـی تێـدا سـزا دەدرێـن، لـەو ڕسـتە قورئانـە ئەوەیـان وەرگرتـوە، بـەڵام وەك باسـمان كـرد هـەر كام لـە (**قتـادة**) و (**الحسـن البـصري**) ڕەحمەتـی خوایـان لـێ بـێ، وایـان لێكداوەتـەوە كـە (**حقـب**) كاتێـكی نادیـارە.

٤)- ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴾، له وێدا نایچێژن له دۆزەخدا، نه فێنكایەتیی نه هیچ جۆره خواردنەوەیەك، (**بَرْد**) به نەزانراو (**نَكِرَة**) هاتوه، هەروەها (**شَرَاب**)یش هەر به (**نَكِرَة**) هاتوه، ڕەوانبێژان گوتوویانه: (**النَّكِرَةُ فِي سِيَاقِ النَّفِي يُفِيْدُ العُموم**)، نەزانراو له ڕەوتی لابردن دا مانایەكەی گشتگیره، واته: هیچ جۆره فێنكایەتییەك و هیچ جۆره خواردنەوەیەك لەوێدا ناچێژن، لێرەدا (**شَرَاب**) به مانای مەی خواردنەوه نیه، چونكه ئەوان لەوێدا خوا خوای چۆڕه ئاوێكیانه شەڕابی چی! لێرەدا (**شَرَاب**) به مانای خواردنەوەیه، یانی: هیچ جۆره خواردنەوەیەك و هیچ جۆره فێنكایەتییەك ناچێژن لەوێدا، ئەدی چی تێدا دەچێژن؟!

٥)- ﴿ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴾، جگه له ئاوی داغ و كێم و زووخاو.

(**غساق**)

أ- واته: كێم و زووخاو، ئەوه یەكێكه له واتایەكانی.

ب- یاخود: (**غَسَّاقاً**)، به مانای (**زَمْهَرِيْر**)، سەرماو زوقمێكی زۆر.

ج- هەندێكیش: (**غَسَّاقاً**) یان به (**المُنْتِن**) لێكداوەتەوه، خواردنەوەی بۆگەن.

د- (**فخرالدين الرازي**)یش كه له ئەسڵ دا فارس بووەو زمانی فارسیی زانیوه، له یەكێك له زانایانەوه دەڵێ: (ئێمه له پێشووانی خۆمانمان بیستوه كه وشەی (**غَسَّاق**) له خاشاكی فارسییەوه هاتوه، (خاشاك)یش شتی قێزەونه، ئێستاش له كوردیی دا هەر بەكاری دێنن، دەڵێن: (زبڵ و خاشاك) واته: خشپ و خاڵ و ئەوەی گەسك دەدرێ، شتی پیس، بەڵام

زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: (**غَسَّاق**) چ بە گیرە، چ بە بێ گیرە، واتە: (**غَسَّاق**)، یانی: (**الصَّدِيْد**)، کێم و زووخاو، یان (**مَا يَسِيْلُ مِنْ جُلُودِ أَهْلِ النَّار**) ئەوەی لە پێستی دۆزەخییەکان دێتە خوار کە کێم و زووخاو و زەڵزەڵەیە.

٦)- ﴿ جَزَآءً وِفَاقًا ﴾، ئەوەش سزایەکی پێکەڵپێکە، وشەی ﴿ وِفَاقًا ﴾مان پێشتر مانا کرد، (**هَذَا عَلَى وِفْقِ هَذَا**)، واتە: ئەو دووە پێکەڵ پێك و پڕ بە پێستن، بە ئەندازەی یەکن، واتە: ئەو سزایە پڕ بە پێست و پێکەڵپێکە لەگەڵ کردەوە خراپەکانی ئەواندا.

کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ ﴾، ئەم هەڵاواردنە پێی دەگوترێ: (**إِسْتِثْنَاءٌ مُنْقَطِع**) هەڵاواردنی دابڕاو، چونکە ئاوی کوڵاو داغ و کێم و زووخاو بەشێك نین لە فێنکایەتیی و خواردنەوەی ئاسایی، کەواتە: هەڵاوێردراو (**مُسْتَثْنَى**) لە جینسی لێهەڵاوێردراو (**مُسْتَثْنَى مِنْه**) نیە، بۆیە پێی دەگوترێ: هەڵاوێردراوی دابڕاو، چونکە بۆ وێنە: ئەگەر یەکێك بڵێ: (**مَا شَرِبْتُ إلا المَاءَ**)، دەگوترێ ئەوە هەڵاوێردنێکی پەیوەستە، (**إِسْتِثْنَاء مُتَّصِل**) چونکە ئاو بەشێکە لە جینسی خواردنەوە، بەڵام لێرەدا کێم و زووخاو و ئاوی داغ و کوڵاو بەشێك نین، نە لە فێنکایەتیی و نە لە خواردنەوەی ئاسایی.

کورتە باسێک: مانەوەی بێبڕوایان لە دۆزەخدا هەتاهەتایی و نەبڕاوەیە، بەشێک لە زانایان لە بارەی ئەم ڕستە قورئانییەوە کە دەفەرموێ: ﴿ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴾، لە دۆزەخدا دەمێننەوە چەند ماوەیەکی زۆر، گرفت و ئیشکالێکمان لەبارەی بە هەمیشەیی مانەوەی بێبڕوایانەوە لە دۆزەخدا بۆ دروست بووە، بەهۆی وشەی (**أحقابا**)ەوە: باسی (**أَحْقَاب**)مان کرد، کە کۆی (**حُقْب**)ە یان: (**حُقْبَة**)یە، ئەویش ماوەیەکی نەزانراوە لە کات، دەڵێین: ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، هیچ دوو دڵییەکمان بۆ دروست نابێ کە لێرەدا مەبەست لە: ﴿ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴾، کاتێکی نەبڕاوەو هەتا هەتاییەو، هەر کام لە (**قتادة**) و (**الحسن البصري**)یش گوتوویانە: لێرەدا مەبەست لە (**أَحْقَاب**) ماوە بە دوایەکدا هاتووە نەبڕاوەکانن، ماوە بە دوایەکدا هاتووەکانی بێ کۆتایی.

ئنجا ئەگەر تەماشای قورئان بکەین دەبینین بەلای کەمەوە لە سێ ئایەتی قورئاندا، لە سێ شوێنی قورئاندا، خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە کە بێبڕوایەکان بۆ هەتا هەتایەو، بە بێ بڕانەوە لە دۆزەخدا دەمێننەوە:

١- لە سوورەتی **(النساء)** لە ئایەتەکانی: (١٦٨ - ١٦٩)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿١٦٩﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوا بوون و ستەمیان کردوە، ناگونجێ خوا لێیان ببوورێ و ناشگونجێ ڕێشیان پێشان بدات، (ڕێی دەرباز بوون لە دۆزەخ)، مەگەر ڕێی دۆزەخیان پێشان بدات، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێیننەوەو ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە.

٢- هەروەها لە سوورەتی **(الأحزاب)** لە ئایەتەکانی: (٦٤ – ٦٥)دا، دیسان ئەو ڕاستییە دووبارە بۆتەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿٦٥﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا نەفرینی لە بێبڕوایان کردووەو کڵپەی دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، هیچ سەرپەرشتیارو یارمەتییدەرو هاوکارێکیان چنگ ناکەوێ.

٣- هەروەها لە سوورەتی **(الجن)** لە ئایەتی (٢٣) دا، هەمان ڕاستیی کە بێبڕوایان بە بێبڕانەوەو کۆتایی لە دۆزەخدا دەمێننەوە، هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾، واتە: هەر کەسێك سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەرەکەی بکات، {واتە: سەرپێچیی یەکجاریی و بە ڕەهایی}، ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە، بە هەمیشەیی و بێ کۆتایی تێیدا دەمێننەوە.

ئنجا وەك چۆن لێرەدا، بە هۆی ئەو ڕستە قورئانییەوە، زانایان جۆرێك لە ئیشکال و گرێ و گۆتاڵیان بۆ دروست بووە، بەڵام بە سەرنجدانی ئەو ئایەتانەی سوورەتەکانی: **(النساء والأحزاب والجن)**، ئەو ئیشکالە لادەچێ، چونکە ئەگەر ئایەتێك مانای ڕوون نەبێ، یاخود جۆرێك لە ئیشکال و گرفت دروست بکات،

دەبێ مانایەکەی لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەکانی دیکەدا، کە مانا ڕوونن، تەماشای بکەین.

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ ﴾، خوا کتێبی دابەزاندۆتە سەر تۆ، ئایەتانێکی مەحکەمیان (مانا ڕۆشنیان)هەن، ئەوانە ئەسڵ و بناغەی کتێبن، ئایەتانێکیشیان هەن، مانای وێکچوویان هەن، (واتە: ئەو مانایەش هەڵدەگرێ و، ئەوەش هەڵدەگرێ، وەك ئەم ئایەتە موبارەکەی ئێرە).

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ ﴾، ئنجا ئەوانەی دڵیان لادانی تێدایە، بە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون، کە مانای وێکچوویان هەن، بە هاندەری لادان و تاوان و بە هاندەری مانای لێکدانەوەیان، ﴿ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴾، تەنیا خواش ﷻ مانایەکەیان دەزانێ، ﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ﴾، هەروەها قووڵبووەوان بە زانیاریی دا، {ئەگەر لەسەر ﴿ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴾، نەوەستی، یانی: ڕۆچووانیش بە زانیاریی دا مانایەکەیان دەزانن، بەڵام ئەگەر بوەستی، یانی: تەنیا خوا مانایەکەیان دەزانێ}، ﴿ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ ﴾، {ڕۆچووان بە زانیاریی دا} دەڵێن: بڕوامان پێی هەیە، هەمووی لە لایەن پەروەردگارمانەوەیە، چ ئەوەی مانایەکەی ڕۆشنەو یەك مانا هەڵدەگرێ، چ ئەوانەی زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن و مانای وێکچوویان هەن و پێیان دەگوترێ: (**مُتَشَابه**).

ئنجا وەك چۆن لە بارەی ئەم ئایەتەوە ئەو ئیشکال و گرێیە بووە، بەڵام بەهۆی ئەو ئایەتانەوەی مەحکەمن، دەزانین مەبەست پێی کاتە لە دوای یەکە بێ کۆتاییەکانن، بە هەمان شێوە لە سوورەتی (**الأنعام**)یش دا ئایەتی ژمارە (١٢٨)، چەمك و واتایەکی بەو جۆرەی هەیە و ئەمەش دەقەکەیەتی: ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ وَقَالَ أَوۡلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ

﴿رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾، کە شوێنی مەبەست ئێرەیە: ﴿قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾، (خوا) فەرمووی: شوێنی تێدامانەوەتان ئاگرە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، بە دڵنیایی پەروەردگارت کارزانی زانایە.

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، مەگەر خوا بیەوێ، لێرەدا هەر مەبەست پێی ئەوەیە، کە ویستی خوا ﷻ نەبەستراوەتەوەو دەستی دەسەڵاتی خوا بەستراو نیە، بەڵام خۆی ئەو بڕیارەی داوە، کە دەبێ بە هەمیشەیی بمێننەوە.

کاتی خۆی لە تەفسیرکردنی (**الأنعام**)دا بە درێژیی قسەمان لەو بارەوە کرد.

هەروەها لە سووڕەتی (هود)یش ئایەتەکانی: (١٠٦ و ١٠٧ و ١٠٨)دا، دیسان چەمك و واتایەکی بەو جۆرە هەیە، کە کاتی خۆی تەفسیرمان کردو هەڵوەستەمان لەبەردەم ئەو ئایەتانەدا کرد> دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾﴾، ئەوانەی خراپەکار بوون (خۆیان تووشی بەدبەختیی کردوە) لە دۆزەخ دا دەمێننەوە بە هەمیشەیی، بۆ ئەوان هەناسە دانەوەو هەناسە هەڵکێشانێك هەیە، هەتا ئاسمانەکان و زەوی بەردەوام بن، تێیدا دەمێننەوە، مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بیەوێ، بێگومان پەروەردگارت بکەری هەر شتێکە بیەوێ، ئەوانەش کە بەختەوەر کراون (بە ئاوات گەیەنراون)، لە بەهەشتدان، تێیدا دەمێننەوە، هەتا ئاسمانەکان و زەوی بەردەوام بن، مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بیەوێ، بەخششێکی نەبڕاوەیە.

کاتـی خـۆی قسـەمان لـە بـارەی ئـەو سـێ ئایەتـە موبارەکەشـەوە کـرد، کـە تەنیـا مەبەسـت پێیـان ئەوەیـە:

**یەکەم:** ویستی خوای پەروەردگار ڕەهاو کراوەیە.

**دووەم:** خوا ﷻ بە پێی عەقڵی ئێمە دەماندوێنێ، ئێمە ئەگەر شتێك بمانەوێ بڵێین بێ کۆتاییە، دەڵێین: ﴿مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾، هەتا دنیا دنیایە، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ بەپێی عەقڵی ئێمەو باوی ئێمە فەرمایشتەکەی خۆی فەرمووە، ئەگەرنا ئەوەی لێ وەرناگیرێ کە ژیانی دۆزەخییان و بەهەشتییان کۆتایی پێ بێ.

چونکـە: سـێ ئایـەت لـە قورئانـدا وشـەی: ﴿أَبَدًا﴾، واتـە: بـێ کۆتایـی، بـێ سـنوور، بـێ بڕانـەوە، بـۆ سـزای کافـرەکان لـە دۆزەخـدا بەکاردێنـن و، زیاتـر لـە سـێ ئایەتیـش بگـرە دەیـان ئایـەت لـە قورئانـدا بـۆ بەهەشـتییەکان باسـی ژیانـی بـێ کۆتایـی، بەهەشـت دەکـەن، بۆیـە زانایـان بـۆ مانـا لێکدانـەوەی ئـەم ڕسـتە موبارەکـە، چەنـد وەڵامێکیـان داونـەوە:

١- یەکێك لە وەڵامەکان ئەوەیە گوتوویانە: (**أَحْقَابًا أَي: مُدَداً طَوِيْلَةً بِلَا نِهَايَة**)، ماوە درێژەکانی بێ کۆتایی.

٢- یەکێك دیکە لە زانایان دەڵێ: ﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا﴾، واتە: لەو جۆرە سزایەدا، چەند ماوەیەکی یەك لە دوای یەك تێیدا دەمێننەوە، دوایی بە جۆرێکی دیکە سزا دەدرێن.

٣- هەندێکی دیکە وەك هەوڵدان بۆ تەئویل کردن گوتوویانە: مەبەست پێی بڕوادارە ئیماندارەکانن، کە دەچنە دۆزەخەوەو دوای ماوەیەکی زۆر وساڵانێکی زۆر، دێنە دەرێ و دەربازیان دەبێ.

ئەو سێ ڕایەش هەر سێکیان گونجاون.

بـەڵام ڕایەکـی دیکـە هەیـە، شـتێکی نەگونجـاوە، گوتوویانـە: (**مَنْسُـوخَةٌ نَسَـخَتْهَا ((فَلَـنْ نَزِيْدَكُـمْ إِلَا عَذَابًـا)))**، واتـە: ئـەم ئایەتـە مەنسـووخەو ئـەوە نەسـخی کردۆتـەوە

کە دەفەرموێ: ﴿ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾، بیچێژن هەر سزاو ئازارتان بۆ زیاد دەکەین، ئێمەش دەڵێین: هەواڵەکانی خوا ﷻ نەسخیان هەر تێدا نیە، تەنانەت لە لای ئەوانەش کە بڕوایان بە نەسخ هەیە لە قوڕئاندا، کە ئێمە هەتا ئەم لەحزەیە یەك ئایەتمان لێ عاسێ نەبووە، ناچار بین بڵێین: ئەو ئایەتە، بەڵێ بێژەکەی هەیە، بەڵام مانایەکەی مەنسووخەو کاری پێ ناکرێ، تاکو ئێستا ئێمە ئایەتێکی ئاوامان لە ڕاست ڕا نەهاتووەو، نەسخ بەو واتایەی ئایەتێك هەبێ بخوێندرێتەوە، بەڵام حوکمی پێ نەکرێ، لە قوڕئاندا نیە، بەڵام لەسەر ڕای ئەوانەی دەڵێن نەسخیش هەیە، هەواڵەکانی خوای پەروەردگار نەسخیان هەر بەسەر دانایەت، چونکە کە خوا هەواڵی دا لە بارەی شتێکەوە، هەواڵ یانی: ئەو شتە بەو شێوەیە دەقەومێ، یاخود بەو شێوەیە ڕوویداوە، ئەوە چۆن نەسخ دەبێتەوە؟ حوکم دەگونجێ خوا ئێستا بفەرموێ وا بکەن، دوایی بفەرموێ: وامەکەن، ئەوە ڕێی تێ دەچێ، هەرچەندە شتی واش لە قوڕئاندا نیە، بەڵام هەواڵ خوای پەروەردگار بفەرموێ: فڵانە شتە دەبێ لە ڕۆژی دواییدا، یان: فڵانە شتە بووە لە ڕابردوودا ڕوویداوە، چ پەیوەندیی بە ڕابردوو، چ بە داهاتووەوە بێ، هەر مەعقووڵ نیە، نەسخی بەسەر دابێ.

لە کۆتایی ئەم مەسەلەیەش دا ئەم دەقە دێنن لە تەفسیرەکەی **(الطبري)** یەوە بە ژمارە: (٣٦١٥٤) دەڵێ: (**كَانَ الْحَسَنُ إِذَا تَلَا هَذِهِ الآيَةَ:** ﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴾ **قَالَ: أَلَا إِنَّ عَلَى البَابِ الرَّصَدَ، فَمَنْ جَاءَ بِجَوَازٍ جَازَ، وَمَنْ لَمْ يَجِئْ بِجَوَازٍ احْتُبِسَ**)، واتە: حەسەنی بەصرایی کاتێك ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴾، بە دڵنیایی دۆزەخ بۆسەگایە {یان خۆی بۆسەیە، یان شوێنی چاودێریی کردنە بۆ بێبڕوایان}، دەیگوت: ئاگادار بن! لەسەر دەرگا چاودێر هەیە، بۆسە هەیە، ئنجا هەر کەسێك هۆکاری ڕەتبوونی پێ بێ، ڕەت دەبێ، بەڵام هەر کەسێك هۆکاری ڕەتبوونی پێ نەبێ، {مۆڵەتی ڕەت بوونی پێ نەبێ}، ڕا دەگیرێ.

هەروەها لە حەسەنی بەصڕایییەوە ئەم دەقەش هەر هاتووە لە تەفسیری (**الطبري**)دا بە ژمارە: (٣٦١٥٥)، گوتوویەتی: (**قَالَ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَحَدٌ حَتَّى يَجْتَازَ النَّارَ»**)، واتە: هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت تاکو بە ئاگردا ڕەت نەبێ، دەبێ بەسەر پشتی دۆزەخدا ڕەت بێ و ئەوێ هەڵبوێرێ، ئنجا دەچێتە بەهەشتەوە.

مەسەلەی دووەم:

**هـۆکاری ئـەو سـزادرانەیان، بێبڕواییـان بـوو بـە لێپرسـینەوەو بـە درۆدانانـی ئایەتەکانـی خـوا، خـواش هەمـوو شـتێکی زۆر بـاش سـەرژمێر کـردوە، بۆیـە پێیـان دەفەرمـوێ: بیچێـژن هـەر سـزاو ئازارتـان بـۆ زێـدە دەکەیـن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَـٰهُ كِتَـٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾ ﴾.

## شیکرنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴾، بە دڵنیایی ئەوان بە ئومێدی لێپرسینەوە نەبوون، واتە: ئەو بێبڕوایانە بۆیە تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە بوون و، تووشی ئەو سزایە پڕ بە پێستە بوون، چونکە بە ئومێدی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت درانەوە نەبوون، (**الرَّجَاءُ: تَرَقُّب الأَمْرِ المَحْبُوب**)، (رَجَاء)، بریتیە لە چاوەڕێکردنی شتێکی خۆشویستراو، بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوانە هیچ ئومێدێکی خێریان نەبووە، کەواتە: مەبەست لە: ﴿ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴾، یانی: (**لَا يَخَافُونَ حِساباً**)، لە لێپرسینەوە نەترساون، چونکە ئەوانە هیچ ئومێدێکی خێریان نەبووە، کە لە ڕۆژی دواییدا تووشی خێر بن! ئێمەش دەڵێین: خوا وشەی (**يَخَافُوْن**)شی بەکارهێناوە، لە شوێنی دیکەداو، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴾، لەبەر ئەوەیە کە دوای ئەوەی باسی بڕواداران کراوەو، ئەوانیش هەواڵی سزادرانی لە خوا یاخییەکانیان، زۆر لە قالب خۆشەو، زۆر پێی دڵخۆش بوون و ئومێدەواریش بوون بە پاداشتی خوا، ئنجا لێرەدا بۆ بێبڕوایەکان ئەوە باسکراوە، کە هیچ ئومێدێکیان نیەو نا ئومێدبوون لە لێپرسینەوە، بەڵام بڕواداران ئومێدەوار بوون، بە ڕۆژی لێپرسینەوەو (ئەوەی پاکە بێ باکە)، کەسێك کە لە ژیانی دنیای دا چاکەی کردوە، دیارە ئومێدەوار دەبێ بەو لێپرسینەوەیەی لەگەڵیدا دەکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴾، دەڵێ: (**الحِسَابُ: عَدُّ الأعْمَال وَالتَّوْقِيف عَلى جَزَائِها أي: لَا يَرْجُونَ وُقُوع حِسَاب عَلى أعْمَال العِبَاد يَوْم القِيَامَة**)، وشەی (**حِسَاب**) بە مانای ژماردنە {**حَسَبَ، يَحْسِبُ، أي عَدَّ يَعُدُّ**}، لێرەدا مەبەست ژماردنی کردەوەکانەو وەستێنرانی مرۆڤە لەسەر سزاو پاداشتی کردەوەکان، واتە: ئەوانە بە ئومێدی ئەوە نەبوون لێپرسینەوە بێتە پێش، لەسەر کردەوەی مرۆڤەکان لە ڕۆژی قیامەتدا.

**٢)**- ﴿ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كِذَّابًا ﴾، {تاوانێکی دیکەشیان ئەوە بوو}، کە بە بەدرۆدانانێکی زۆر سەخت و بڕەزا، ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دادەنا.

ئایەتەکانیش مەبەست پێیان ڕستەکانی قورئانە، ئەمە زیاتر لەگەڵ ڕەوتی ئایەتەکاندا دەگونجێ، ئەگەرنا ئایەت دەگونجێ مەبەست پێی دیاردەو دیمەنەکانی خواو دروستکراوەکانی خوا بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی موعجیزەکانی پێغەمبەران بێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئایەتە خوێندراوەکانە.

وشەی (**كِذَّاب**) چاوگی (**كَذَّبَ**)یە، واتە: ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانا، بە بە درۆ دانانێکی زۆر سەخت و بڕەزاو خەست، چونکە (**كِذَّاب: مَفْعُوْل مُطْلَق مُؤَكِّدٌ لِعَامله لإِفَادَة الشِّدَّة**)، (**كِذَّاب**) بەرکاری ڕەهایەو جەختکەرەوەی بکەرەکەی خۆیەتی کە بریتیە لە (**كَذَّب**)، بۆ ئەوەی ئەوە بگەیەنێ کە بە درۆدانانەکەیان زۆر سەخت و بڕەزایە.

**٣)**- ﴿ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَـٰهُ كِتَـٰبًا ﴾، ئێمە هەموو شتێکمان سەر ژمێر کردوە، بە تۆمار کردن و نووسین.

ئەو نووسینەش هەر خوا دەزانێ چۆنە.

﴿ أَحْصَيْنَـٰهُ ﴾، (**الإِحْصَاء: حِسَاب الأشْيَاء لِضَبْط عَدَدِهَا**)، (**إِحصَاء**) بە کوردیی سەرژمێرەو ژماردنی شتەکانە، بۆ ئەوەی بزانی ژمارەکەیان چەندە؟ ﴿ كِتَـٰبًا ﴾،

(مَفْعُوْل مُطْلَق مَصْدَر بِمَعْنَى الكِتَاب، وَهُوَ كِنَايَةٌ عَنْ شِدَّة الضَبْطِ لأنَّ الأمُورَ المَكْتُوْبَة مَصُونَة عَنِ النِّسيَان وَالإغْفَال)، ﴿ كِتَٰبًا ﴾، دەبێتە بەرکاری ڕەهاو چاوگە بە مانای نووسین و، کینایەیە بۆ ئەوەی چاك کردەوەکانیان کۆنترۆڵ کراون، چونکە ئەو شتانەی دەنووسرێن و تۆمار دەکرێن و دەپارێزرێن لە لەبیر چوونەوەو فەرامۆش کردن.

وشەی: ﴿ كِذَّابًا ﴾، وەك گوترا: چاوگەو چەند وشەیەکی دیکەش لەسەر ئەو کێش (وَزْن)ە هاتوون، وەك: (قَصَّرَ، قِصَّار)، هەروەها (قَضَا، قِضَّاء)، (خَرَّق، خِرَّاق)، (فَسَّر، فِسَّار)، هەموو ئەوانە چاوگن، (قِصَّار) واتە: زۆر کورتکردنەوە، (قِضَّاء) واتە: زۆر دادوەریی کردن، (خِرَّاق) واتە: زۆر دڕین، (فِسَّار) واتە: زۆر ڕوونکردنەوە.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ:

٤)- ﴿ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾، ئنجا بچێژن هەر ئازارتان بۆ زیاد دەکەین.

(ف)ی ﴿ فَذُوقُواْ ﴾، (للتَّفْرِيْحِ وَالتَسبُّب)، بۆ لق لێکردنەوەیە، {یانی: بینا لەسەر ئەوەی پێشێ}، هەروەها بۆ بوونە هۆکارە {یانی: شتەکانی پێشێ هۆکاری ئەوەن}، بۆیە دەفەرموێ: بیچێژن، ﴿ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾، تەنیا ئازارتان بۆ زیاد دەکەین، فەرمانکردنیش لێرەدا: ﴿ فَذُوقُواْ ﴾، بەکارهێنراوە بۆ سەرزەنشتکردن و ڕەخنە لێگرتن.

کە دەشفەرموێ: ﴿ فَلَن نَّزِيدَكُمْ ﴾، (الزِّيَادَة: ضَمَّ شَيءٍ إلى غَيْرِهِ مِن جِنْسٍ وَاحِدٍ)، زیادە بریتییە لە خستنە پاڵی شتێك بۆ شتێك هەر لە جۆری خۆی.

(الطبري) دەڵێ: ﴿ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾، (أي سَنَزِيْدُكُم عَذَاباً زِيَادَة مُسْتَمِرَّةً فِي أزْمِنَة المُسْتَقْبَل)، ئێمە بە بەردەوام ئازارو سزاتان لە کاتەکانی داهاتوودا بۆ زیاد دەکەین.

**(الطبري)** بە ژمارە: (٣٦٢٠٣) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاصەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، هێناویەتی، گوتوویەتی: (**لَمْ تَنْزِل عَلَى أهْلِ النَّار آيَةٌ أشَدُّ مِنْ هَذِه:** ﴿ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾)[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەمر کوڕی عاص، گوتوویەتی: هیچ ئایەتێک دانەبەزیوە، سەختترو توندتر بێ لەسەر دۆزەخییەکان، لەم ئایەتە موبارەکە: ﴿ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾.

کە دەفەرموێ: دەبیچێژن هەر ئازارتان بۆ زیاد دەکەین، **(الطبري)** ئاوا مانای لێکداتەوە: (**ذُوقُوا أَيُّهَا الْقَوْمُ! مِنْ عَذَابِ اللَّهِ الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ فِي الدُّنْيَا تُكَذِّبُونَ،** ﴿ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾ **عَلَى الْعَذَابِ الَّذِي أَنْتُمْ فِيهِ لَا تَخْفِيفًا مِنْهُ، وَلَا تَرَفُّهًا**)، واتە: ئەی کۆمەڵە خەڵکەکەی نێو دۆزەخ! لە ئازارو سزای خوا بچێژن، کە لە دنیادا بە درۆتان دادەنا، ئێمە ئەو ئازارو سزایەی تێیدان، هەر بۆتان زیاد دەکەین، نەك لێتان سووك بکەین و حاڵەتێکی خۆشتان بۆ برەخسێنین.

**(إبن عثيمين)**، ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیری بەش **(جزء)**ی **(عم)** دا[2]، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾، بیچێژن هەر ئازارو سزاتان بۆ زیاد دەکەین، بەو بۆنەوە ئەم ئایەتە موبارەکە دێنێ لە سوورەتی **(غافر)** ئایەتی ژمارە (٤٩): ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴾، دۆزەخییەکان بە دۆزەخەوانەکان دەڵێن: لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە یەك ڕۆژ سزامان لەسەر سووك بکات، دەڵێ: ئەوە چوار شتی تێدان:

**١-** ڕاستەوخۆ داوایان لە خوا نەکردوە، بەڵکو داوایان لە دۆزەخەوانەکان کردوە، داوایان بۆ لە خوا بکەن.

**٢-** دەڵێن: ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾، لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە، ناڵێن: **(ادْعُوا ربَّنا)**، لە پەروەردگارمان بپاڕێنەوە، چونکە ڕووی ئەوەیان نەبووە، خۆیان بە بەندەی ئەو پەروەردگارە دابنێن.

---

(١) جامع البيان: ص١٥، ج٣٠.

(٢) ص٣٢، ٣٣.

٣- دەڵێن: ﴿ يُخَفِّفْ عَنَّا ﴾، بۆمان سووك بكات، ناڵێن: ئازارەكەمان لە كۆڵ بكاتەوە.

٤- دەڵێن: ﴿ يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴾، یەك ڕۆژ، ناڵێن: بە یەكجاریی سزایەكە لابدات.

خوا بە لوتف و كەڕەمی خۆی، لە سزاو ئازارو مەینەتیی و ناڕەحەتییەكانی ئەو ڕۆژە، بمانپارێزێ و، بە ڕەزامەندیی خۆی و بە دیداری خۆی شادمان بكات.

## مەسەلەی سێیەم:

**باسی بەئامانج و بە بەمراد گەیشتنی پارێزکاران و، گەیشتنیان بە باخ و بێستان و ڕەزە ترێیەکان و، ئافرەتانی تازە پێگەیشتووی تازە مەمک کردوو و، پێکی پڕ لە خواردنەوە کە قسەی پووچ و درۆکردنی تێدا نابیستن، ئەوەش وەك پاداشتێکی بەخشراوو حیسابکراوە لە خوای پەروەردگارەوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا﴾، بە دڵنیایی بۆ پارێزکاران سەرفرازیی هەیە، ﴿إِنَّ﴾، بۆ داکۆکییکردن و تۆخکردنەوەی ئەو مەبەستەیە، دەویسترێ بگەیەنرێ، ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا﴾، بە دڵنیایی بۆ پارێزکاران سەرفرازیی و بە ئاوات گەیشتن هەیە، دەرباز بوون و بە مراد گەیشتن هەیە، **(الطبري)** ئاوای لێك داوەتەوە: (﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ﴾، **مَنْجى مِنَ النَّار إلى الجَنَّة وَمَخْلَصاً مِنْهَا لَهُم إليْهَا، وظفراً بِمَا طَلَبُوْا**)، بۆ پارێزکاران شوێنی دەرباز بوون هەیە، لە ئاگر بەرەو بەهەشت و، شوێنی قوتار بوون هەیە لە ئاگری دۆزەخ و، ڕزگار بوون بەرەو بەهەشت و وەدەست هێنانی ئەوەی عەودالی بوون و مەبەستیان بووە (کە ڕەزامەندیی خواو پاداشتی بەهەشتە).

**(الطبري)** لە **(قتادة)**وە بە ژمارە: (٣٦٢٠٦) دێنێ، دەڵێ: (﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ﴾ **إِي وَاللَّهِ مَفَازًا مِنَ النَّارِ إِلَى الجَنَّةِ، وَمِن عَذَابِ اللَّهِ إِلَى رَحْمَتِهِ**)، بەڵێ بە خوا دەرباز بوونێك لە ئاگری دۆزەخ بەرەو بەهەشت و، لە سزاو ئازاری خوا بەرەو بەزەیی خوا، هەیە.

وشەی: **(مَفَاز)** لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە: **(مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ، يَعْنِي فَوْزاً)**، **(مَفاز)** چاوگێکی میمییە بە مانای: سەرکەوتن و بە مراد گەیشتن، تەنوین **(تنوين)**ەکەش

بـۆ گەورەیـی و مەزنیـی پێشـاندانی ئـەو بـە مـراد گەیشـتنەیە واتـە: بـە جۆرێکـە ناگونجـێ وەسـف بکـرێ.

وشـەی: (مَفَـاز) وەك چـۆن بـە چـاوگ هاتـوە، بـە مانـای نـاوی شـوێنیش هاتـوە، واتـە: (**مَكَان الفَوْز**) ئـەو شـوێنەی مرۆڤـی لێـی دەربـاز دەبـێ و لێـی سـەرفراز دەبێ، کـە مەبەسـت پێـی بەهەشـتە.

ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو بردنەوەیـە، ئـەو بـە مـراد گەیشـتنە، ئـەو بـە ئامانج گەیشـتنە، شـیدەکاتەوە لـە چەنـد موفرەدەیەکـدا، پێشـێ دەفەرموێ:

**٢)-** ﴿ حَدَآئِقَ وَأَعۡنَٰبٗا ﴾، باخ و بێستانانێك و ترێیانێك (ی ناوازەو دەگمەن)، بە نەناسراو (**نكرة**) هاتنی (**حدائق**) و (**أعناب**) گەیەنەری ئەو ڕاستییەیە کە هەر کامیان: باخەکان و ڕەزەترێیەکان، یەکجار ناوازەو دەگمەنن، بەڵکو بێ وێنەو هاوتان.

﴿ حَدَآئِقَ ﴾، کـۆی (**حَدِيْقَة**)یـەو، بریتیـە لـە بـاخ و بێسـتانێك پەرژیـن و شـوورەی بـۆ کرابـێ و دیـواری بـەدەوردا کرابـێ.

﴿ وَأَعۡنَٰبٗا ﴾، کـۆی (**عِنَـب**)ە، یانـی: تـرێ، بـەڵام لـە هەمـوو قورئانـدا خـوای تـاك و پـاك باسـی داری ترێـی نەکـردوە، کـە بـە کوردیـی دەگوتـرێ: داری تـرێ یـان ڕەز، یـان دار مێـو، بـە عەرەبیـی پێـی دەگوتـرێ: (**كَرْم**) و بـە (**كُرُوم**) کـۆ دەکرێتـەوە، بـەس بـە (**أَعْنَـاب**) هێناویەتـی، پێـم وایـە حیکمەتەکەشـی ئەوەیـە کـە داری تـرێ بـۆ خـۆی درەختێکـی جـوان و بەرچـاو نیـە، بـە زەوییـەوە پـان دەبێتـەوە، یـان دەبـێ بڵنـد بکرێتـە سـەر کەپرەکـە، یـان پـان دەبێتـەوەو، زۆر بەرچـاو و دیـار نیـەو، دیمەنێکـی زۆر سەرنجڕاکێشـی نیـە، وەك باغـی درەختـی: خورمـاو هەنـارو هەنجیـرو خـۆخ و .... هتـد، بەڵکـو لاسـکێکی باریکـی هەیـەو هێشـووە ترێیەکانـی پێـوەن، بۆیـە خـوا ﷻ هـەر بـە: (**أَعْنَـاب**) دەیهێنـی کـە کـۆی (**عِنَـب**)ەو، مەبەسـت پێـی درەختەکەیەتـی و میوەکەشـیەتی، ﴿ وَأَعۡنَٰبٗا ﴾، ترێیـەکان بـە کوردیـی پێـی دەگوتـرێ: ڕەز، وشـەی: ڕەز یـانی: بـاخ و درەختـی مێـو، کـە تـرێ دەگـرێ.

٣)- ﴿ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴾، هەروەها ئافرەتانی تازە مەمك كردووی هاوتەمەن، ﴿ وَكَوَاعِبَ ﴾، كۆی (كَاعِب)ە، یانی: ئافرەتی تازە مەمك كردوو، لە (كَعْب)ەوەیە كە گوێزینگی مرۆڤە، ئەو شوێنەی لاق و پێ بە یەكەوە دەبەستێتەوە، هەموو مرۆڤێك دوو گۆزینكی هەن، یەكێك بە دیوی ژووریداو، یەكێك بە دیوی دەرێ داو خڕن، واتە: ئەو ئافرەتانە تازە پێدەگەن، نەك كەوتبنە تەمەنەوە، ئافرەت كە دەكەوێتە تەمەنەوە، مەمكەكانی شۆڕ دەبنەوە.

لە سۆنگەی ئەوەوەش كە وشەی (كَاعِب) بەس بۆ ئافرەت بەكاردەهێنرێ، پێویست ناكات (ة)ی مێینەی بخرێتە سەر، وەك (حَائِض) و (حامل) ئافرەتێك كە دەكەوێتە حەیزەوە، یان تۆلدار دەبێ، لەبەر ئەوەی بەس ئافرەت دەكەوێتە حەیزەوەو تۆلدار دەبێ، پێویست ناكات بڵێین: (حَائِضَة) و (حاملة)، (كَوَاعِب)یش كۆی (كَاعِب)ە، پێویست ناكات بڵێین: (كَاعِبة).

﴿ أَتْرَابًا ﴾، كۆی (تِرْب)ە، (تِرْب)یش هاو تەمەنە، یانی: كەسێك كە لەگەڵ جگە لە خۆیدا هاوتەمەنە، دوایی (كواعب) و (أتراب) هەردووكیان زیاتر شی دەكەینەوە، لە چییەوە هاتوون؟ بەڵام با جارێ شتەكانی دیكەش باس بكەین كە خوای پەروەردگار ئەو سەرفرازیی و بە ئاوات گەیشتنەی پارێزكارانیان پێ تەفسیر دەكات، پێشێ باغ و بێستانەكان، دوایی ڕەزو ترێیەكان، ئنجا ئافرەتانی تازە مەمك كردووی هاو تەمەن، كە پێكەوە هاوتەمەنن، یان لەگەڵ مێردەكانیاندا هاوتەمەنن، هەردوو واتایەكان دەگەیەنێ.

٤)- ﴿ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴾، پێكێكی پڕیش، پەرداخێك یان دەفرێكی پڕ لە شەڕاب، ئنجا ئایا شەڕاب، لێرەدا مەبەست پێی (مەی)یە كە لە دنیادا خەڵك پێ سەرخۆش دەبن، بەڵام لە بەهەشتدا بە دڵنیایی وانیە، یان مەبەست پێی هەر جۆرە خواردنەوەیەكە؟ هەردووكیان دەگرێتەوە، بەڵام بە بەڵگەی: ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا ﴾، مەبەست (مەی)یە.

﴿ دِهَاقًا ﴾، (إسْـم مَصْـدَر دَهَـقِ، أو أدْهَـقَ، وَالدَّهَـقُ وَالإدْهَـاق: مَـلْأُ الإنَـاءِ)، وشـەی: (دِهَـاق) ناوێکـی چاوگـە، لـە (دَهَـق) یـان (أدْهَـق)ە، (دَهْـق) و (إدْهَاق)یـش هەردووکیـان چاوگـن، واتـە: پڕکردنـی دەفـر، پڕکـردنی قـاپ.

٥)- ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴾، لەوێدا نابیستن، نە قسەی پووچ و نە درۆکردن، یاخود: ﴿ فِيهَا ﴾، ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ شەڕابەکە، چونکە لە زمانی عەرەبیی دا مەی (خَمْر) مێینەی (مَجَازي)یە، واتە: لە کاتی ئەو شەڕاب خواردنەوەیەدا، نە قسەی پووچ دەبیستن، وەك خەڵکی دنیا، کە شەڕاب دەخۆنەوەو سەرخۆش دەبن، نەقسەی پووچ و درۆ و دەلەسە دەکەن، هەر دوو واتەیەکە دەگەیەنێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست ئەوە بێ: لە بەهەشت دا، قسەی درۆو قسەی پووچ نابیستن.

٦)- ﴿ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴾، ئەوەش پاداشتێکی بەخشراوی ژمێرراوە لە پەروەردگارتەوە، (عطاء) بەخششێکی ناوازە، ﴿ حِسَابًا ﴾، تێرو تەواو، یاخود: (حِسَاب)، ژمێردراو.

کورتە باسێک: حەوت ڕوونکردنەوە لەبارەی ئایەتکانی: ٣١-٣٧ ەوە.

ئێستاش با زیاتر ئەو وشانە، شی بکەینەوە:

**یەکەم:** (الطبري) ئەو ئایەتە موبارەکانەمان ئاوا بۆ تەفسیر دەکات، لە تەفسیرە ناودارەکەی خۆیدا، دەڵێ: (**إنَّ لِلْمُتَّقِينَ ظَفَرًا بِمَا طَلَبُوا مِن حَدَائِقَ وَأَعْنَابٍ؛ وَالحَدَائِقُ: جَمْعُ حَدِيقَةٍ، وَهِيَ البَسَاتِينُ مِنَ النَّخْلِ وَالأَعْنَابِ وَالأَشْجَارِ المَحُوطِ عَلَيْهَا الحِيطَانُ المُحْدِقَةُ بِهَا، لِإِحْدَاقِ الحِيطَانِ بِهَا تُسَمَّى الحَدِيقَةَ، فَإِنْ لَمْ تَكُنِ الحِيطَانُ بِهَا مُحْدِقَةً، لَمْ يُقَلْ لَهَا حَدِيقَةٌ، وَإِحْدَاقُهَا بِهَا: اشْتِمَالُهَا عَلَيْهَا. (وَأَعْنَابً): يَعْنِي: كُرُوم أَعْنَابٍ، وَاسْتُغْنِيَ بِذِكر الأَعْنَاب عَنْ ذِكر الكُرُوم**).

(الطـبري) ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ عادەتـی وایـە زۆر بـە شـێنەیی و بـە ڕوونیـی قسـە لەسـەر مانـاو چەمکـی ئایەتـەکان دەکات، دەڵـێ:

بـە دڵنیایـی بـۆ پارێـزکاران، گەیشـتن هەیـە، بـەوەی داوایـان کـردوەو عەوداڵـی بـوون، {کـە پاداشـتی خوایـەو ئەویـش لەچیـدا بەرجەسـتە دەبـێ؟}، (حَدَائِـقَ وَأَعْنَابـاً)، (حَدَائِـقَ) کـۆی (حَدِيقَةٍ)یـە کـە بریتیـە لـە بـاغ و بێسـتان و دارو درەخـت و ئـەوەی لـە دارخورمـاو دار تـرێ و، درەختانـی دیکـە پێـك هاتـوە، بـە مەرجێـك دیـواری بـە دەورەدا کرابـێ، شـوورای بـۆ کرابـێ، ئـەو دیوارانـەی دەڕواننـە نێـو ئـەو باخانـەوە، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی دیـوارەکان بەسـەر باخەکـەدا دەڕوانـن، بۆیـە پێـی گوتـراوە: (حَدِيقَـةٍ)و، ئەگـەر شـوورەو دیـواری بـۆ نەکرابـێ و، ئـەو باخـە دیـوارەکان دەورەیـان نەدابـێ، پێـی ناگوتـرێ: (حَدِيقَـة)، دەورەدانی ئـەو دەرو دیـوارو شـوورایەش بریتیـە لـەوەی دیـوارەکان ئـەو باخـە بگرنـە نێـو خۆیـان.

(أَعْنَاب)یـش درەختـەکانی ترێیـە، یـانی: دارمێـوەکان {(کُـرُوم) کـۆی (کَـرْم)ە واتـە: دارمێـو}، (کُـرُوم أَعْنَـابٍ)، واتـە: دارمێوەکانـی ترێیـەکان، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی باسـی ترێیـەکان کـراوە، بۆیـە بـە پێویسـت نەزانـراوە باسـی دارمێـوەکان بکـرێ.

(الطـبري) لێـرە ناڵـێ و لـە تەفسـیرەکانی دیکەشـدا نایەتـە یـادم باسـی حیکمەتـی ئەوەیـان کردبـێ، بۆچـی لـە هەمـوو قورئانـدا خـوا ﷻ باسـی (مێـو) درەختـی ترێـی نەکـردوە، بـەڵام پێـم وایـە لەبـەر ئەوەیـە کـە درەختـی تـرێ، درەختێکـی ئەوەنـدە بەرچـاوو سـەرنجڕاکیش نیـە، دارمێـو تەنیـا لاسـکە دارن بـە زەوییـەوە پـان دەبنـەوە، یـان ئەگـەر کەپرێکـی بـۆ بکـرێ، بەسـەر کەپرەکـەدا بڵاودەبێتـەوە، ئـەوە نیـە قیـت و کەڵەگـەت و هەڵچـوو بـێ و لـق و پۆپـی هەبـن، لاسـکە دارێکـی ڕەقـە، وەك وایـەری کارەبـا، بـەڵام ئـەو هێشـووە ترێیانـە دەگـرێ، ئنجـا ئـەوەی زیاتـر سـەرنج ڕادەکێشـێ، خـودی هێشـووە ترێیەکانـن، بۆیـەش خـوای کاربەجـێ هـەر باسـی ئەوانـی کـردوە.

**دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا﴾، پێشتریش باسمان کرد، (**كَاعِب: الْمَرْأَة التي تكَعَّب ثديُها، أي صَارَ كَالكَعْب، أي اسْتَدَار وَنَتَأ، وَلَمْ تَلحَقْهُ تَاءُ التَّأْنِيْث لاخْتِصَاص الْمَرْأَة بِه**)، (**كَاعِب**) ئەو ئافرەتەیە، مەمکی وەك گوێزینگ خڕ بوو بێ، {شۆڕ نەبووبێتەوە}، بۆیەش (ة)ی مێینەی پێوە نیە، چونکە ئەو حاڵەتە تایبەتە بە ئافرەتەوە.

﴿ أَتۡرَابٗا ﴾، کـۆی (تِـرْب)ە، یـانی: هاوتەمـەن، یاخـود: هاوکـووف و هاوشـێوە، ئەویـش دوو واتایـان دەگرێتـەوە:

**١-** لەگەڵ مێردەکانیاندا هاوتەمەنن، یان هاوشێوەن و هاوسرووشتن.

**٢-** ئافرەتانی بەهەشت لەگەڵ یەکدی دا، هاو تەمەن و هاو سرووشت و هاو شێوەن.

هـەردوو واتایـەکان دەگرێتـەوە، بـەڵام زیاتـر واپێدەچـێ مەبەسـت هاوتەمەنیـی و هاوشـێوەیی لەگـەڵ هاوسـەرەکانیان بێ.

(**أتراب**)یش لە چییەوە هاتوە؟ زانایان سێ ئەگەریان بۆ داناون:

**أ-** (**أَتْرَاب**) کۆی (**تِرْب**)ە، لە (**تَرَائِب**)ەوە هاتوە، (**تَرَائِب**)، بە پەراسووەکانی دەوری سینگ دەگوترێن، ئەو پەراسووانە هەموویان دوو دوو وەك یەکن، مرۆڤ بیست و چوار پەراسووی هەیە، دوازدە لەوبەرو دوازدە لەوبەر، ئەو بیست و چوارە، هەردوو دوویان وەك یەکن و بە ئەندازەی یەکن.

**ب-** دەشگونجێ لەوەوە هاتبێ کە ئەو ئافرەتە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، وەك چۆن دوو منداڵ کە پێکەوە لە دایك دەبن، پێکەوە دەکەونە سەر سەر زەوی (**تُرَاب**)، دەگونجێ لەوەوە هاتبێ، لە دنیاشدا دەگوترێ: (**هَذَا تِرْبٌ هَذَا**)، یانی: ئەوە لەگەڵ ئەوەدا هاوتەمەنن و پێکەوە لە دایك بوون.

**ج-** هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: لەوەوە هاتوە: کەسانی هاوتەمەن کە منداڵ بوون، پێکەوە یاریی و گەمەیان کردوە بە گڵ و خۆڵ (**لَعِبُوا بَالتُّرَاب**)، گرنگ ئەوەیە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە هاوشێوەو هاوتەمەنی یەکدین.

**سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا ﴾، (**كَأْس**) بریتیە لە دەفرێك ئامادە کرابێ بۆ شلەمەنیی تێدا خواردنەوە، ئنجا شەڕابە، شەربەتە، ئاوە، ماستاوە، هەرچی هەیە، بەڵام بە پێی ڕەوت بۆمان دەردەکەوێ، کە لێرەدا مەبەست پێی شەڕابە، ﴿ دِهَاقٗا ﴾یش، ناوی چاوگەو یان لە (**دَهَق**)وە هاتوە، یان لە (**أَدْهَق**)وە، هەردووکیشیان بە مانای: (پڕی کردن)، (**دِهَاق**)یش ناوی چاوگە، یانی: پڕ، ﴿ وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا ﴾، یانی: پێکی پڕ لە شەڕاب.

**چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا﴾، پێشتریش گوتمان: هەردوو ئەگەرەکەی هەن:

**أ-** لە بەهەشتدا قسەی پووچ و درۆ نابیستن، یان بە درۆ دانانی یەکدی نابیستن، وەك خەڵکی دنیا کە شەڕاب دەخۆنەوەو سەرخۆش دەبن و قسەی بێ جێ دەکەن.

**ب-** لە کاتی شەڕاب خواردنەوەکە دا، قسەی پووچ و درۆ نابیستن، هەردوو واتایەکە هەڵدەگرێ.

**پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ﴾، پاداشتە لە پەروەردگارتەوە، ئەمە بۆ دڵخۆشکردنی بەهەشتییانە، کە ئەو پاداشتەی دەتاندرێتەوە، لە پەروەردگارو مشوورخۆرو خاوەنتانەوەیە، واتە: شتێکتان کردوە، خوا بەو شێوەیە پاداشتان دەداتەوە، بە دڵنیاییش مرۆڤ ئەگەر بزانێ شتێك کە دێتە دەستی، بەری ڕەنجی خۆیەتی، زیاتر پێی دڵخۆش دەبێ.

**شەشەم:** کە دەفەرموێ: (عطاءً)، یانی: هەرچەندە ئەو پاداشتە بە هۆی کردەوە چاکەکانەوەیە، بەڵام هەر بەخششی خوای پەروەردگاریشەو، کردەوەکان تەنیا هۆکارن بۆ ئەوەی مرۆڤ بچێتە بەهەشت، بەڵام نرخی بەهەشت نین، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**لَنْ يُدْخِلَ أحَدًا عَمَلُهُ الجَنَّةَ، قالوا: ولا أنْتَ يا رَسولَ اللَّهِ؟ قالَ: لا، ولا أنا، إلَّا أنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ برَحْمَةٍ منه وفَضْلٍ**} (**أخرجه البخاري: ٥٣٤٩، ومسلم: ٢٨١٦**)، واتە: هیچ یەکێك کردەوەکەی نایخاتە بەهەشت، گوتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ گوتی: منیش مەگەر خوا بە بەزەیی و بە خششی خۆی دامپۆشێ.

واتە: کردەوەی هیچ کام لە ئێوە بارتەقاو نرخ و بەهای بەهەشت نیە، بەڵێ هۆکارە بۆ چوونە بەهەشت، هەروەك کوفرو کاری خراپی بێبڕوایان، هۆکارە بۆ چوونە دۆزەخ، بەڵام بەدڵنیایی ئیمان و کردەوەی باشی ئیمانداران، نرخ و بەهای ئەو بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەو بێ کۆتاییە نیە، بەڵکو تەنیا هۆکارە.

**حەوتەم:** کە دەفەرموێ: (**حِسَاب**) لێرەدا دوو واتای هەن:

**أ-** یان لە (**حَسَب**)ەوە هاتوە، (**حَسَبَ: أي: عَدَّ**)، ژماردی، (**حِسَاب**)یش، واتە: ژماردن، یانی: ئەو پاداشتە بە ژماردنەو هەروا لە گۆترە نیە.

**ب-** یاخود: ﴿ حِسَابًا ﴾، لە (**أَحْسب**) ەوە هاتووە: (**أي أعْطَاهُ مَا كَفَاهُ فَهُوَ بِمَعْنَى: الإحْساب لأَنَّ مَنْ أعْطِيَ مَا يَكْفِيْه قَالَ: حَسْبِي**)، (**أَحْسَب**)ە، واتە: هێندەی پێدا بەشی بکات (**إحْسَاب**)، واتە: پێدانی شتێك بە کەسێك کە بەشی بکات، بە ئەندازەی پێویستیی بێ و پڕ بە پێستی بێ، لەبەر ئەوەی کەسێك شتێکی بدرێتێ بەشی بکات، دەڵێ: (**حَسْبِي**)، واتە: ئەوەندەم بەسە.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

باسی خوای بە بەزەیی کە خاوەنی گەردوون و ئاسمانەکان و زەوییەو، هیچ کەس هیچ شتێکی لە بەرانبەریدا بە دەست نیە، لە ڕۆژی وەستانی جیبریل و فریشتانیش دا، هیچ کەس نادوێ، مەگەر خوا مۆڵەتی بدات و قسەی ڕاست و ڕەواش بکات، ئەو ڕۆژەش هەق و چەسپاوەو، مرۆڤیش ڕێی لە بەردەم دا ئاچووخ و کراوەیە بەرەو خواو، خواش لەو سزا نیزیکە ترساندوونی (مرۆڤەکانی ترساندوون) کە بابای بێبڕوا تێیدا حەز دەکات، گڵ و خۆڵ بووایە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلرَّحۡمَٰنِۖ لَا يَمۡلِكُونَ مِنۡهُ خِطَابٗا ﴿٣٧﴾ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ صَفّٗاۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَقَالَ صَوَابٗا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلۡحَقُّۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرۡنَٰكُمۡ عَذَابٗا قَرِيبٗا يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ﴿٤٠﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایەو، بە بەزەییە، وشەی: ﴿ رَّبِّ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**رَبُّ السَّمَاوَات وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الرَّحْمَانُ**) واتە: هەرکام لە (**ربُّ**) و (**الرحمان**) بە (**رَفع**) یش خوێندراونەوە، ئنجا ئەگەر بە ژێر (**کسرة**) بخوێنرێنەوە، ئەو کاتە (**ربِّ**) دەبێتە تەفسیر بۆ وشەی (**رب**) کە پێشتر هاتوە، لە: ﴿ جَزَآءٗ مِّن رَّبِّكَ ﴾دا، پاداشتتان لە پەروەردگاتانەوە بۆ دێ، ئنجا ئایا ئەو پەروەردگارە کێیە؟ ﴿ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾، بەڵام ئەگەر بە ڕەفع بخوێنرێنەوە، ئەوە پێی دەگوترێ: (**جُمْلَة ابْتِدَائِية اسْتِئنَافِيَة**)، ڕستەیەکی لە نوێ دەستپێکەر، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە.

﴿ وَمَا بَيْنَهُمَا ﴾، (ما) لێرەدا (مَوْصُولَة)یە، واتە: هەرچی دەكەوێتە نێوانیانەوە (الَّذِي يَقَع بَيْنَهُما) نێوان ئاسمانەكان و زەوی، (الرَّحْمَانُ) یان ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، بە بەزەییە.

٢)- ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴾، مافی قسە كردن و دواندنیان لەگەڵیدا نیە، لێرەدا: ﴿ لَا يَمْلِكُونَ ﴾، ڕاناوەكەی دەچێتەوە بۆ هەموو دروستكراوەكان، ئەگەر مرۆڤن، ئەگەر جندن، ئەگەر فریشتەن، خاوەنی ماف نین، خوا ﷻ بدوێنن، لێرەدا: (المُلْكُ بِمَعْنَى القُدْرَة، فَنَفِي المُلْكِ نَفِي الإِستِطَاعَة)، كە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ ﴾، (ملك) بە مانای توانایەو، لابردنی (توانا) لابردنی (پێكران)یشت.

(خِطَاب): بریتیە لە قسەیەك كە بەرانبەر بە كەسێكی ئامادە دەكرێ، كەسێك كە ئامادەیە لە لای بابای وتەبێژ، یاخود وەك ئامادە بوو وایە، ئنجا لێرەدا كە یثفەرموێ: ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴾، وشەی: ﴿ خِطَابًا ﴾، مانای هەواڵ پێدان و داواكردنیشی خراونە نێو، واتە: هیچكەس بۆی نیە، هەواڵێك بە خوا بدات، یاخود داوایەك لە خوای پەروەردگار بكات، یاخود لەو كاتەدا قسەیەك بكات.

٣)- ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا ﴾، ئەو ڕۆژەی رووح و فریشتەكان بە ڕیز دەوەستن، ﴿ ٱلرُّوحُ ﴾، هەندێكیان گوتوویانە: ﴿ ٱلرُّوحُ ﴾، دروستكراوێكی خوایە، ئێمە نازانین چییەو چۆنە؟ هەندێكیش گوتوویانە: ﴿ ٱلرُّوحُ ﴾، مەبەست پێی ڕووحی مرۆڤەكانە، (أل)ی ناساندنی لەسەرەو مەبەستی پێ تێكڕایە، واتە: جینسی ڕووحەكان، ڕادەوەستن لەگەڵ فریشتەكاندا بە ڕیز، بەڵام لە ڕاستییدا پێویست بەو تەئویل و مانایانە ناكات، چونكە خوا وشەی: ﴿ ٱلرُّوحُ ﴾ی لە قورئان دا بۆ (جبريل) بەكارهێناوە، لە چەند مەقامێكدا، بۆ وێنە:

١- ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾الشعراء.

٢- ﴿ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴾المعارج.

٣- ﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ .......(١٠٢) ﴾النحل.
٤- ﴿ تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ (٤) ﴾القدر.

ئنجا هیچ دروستکراوێکی دیکەش خوا پێی نەناساندووین لە قورئاندا، وشەی: ﴿ الرُّوحُ ﴾ی، بۆ بەکاربهێنرێ، تاکو بڵێین: مەبەست پێی ئەوەیە، ناشگونجێ مەبەست پێی ڕووحی مرۆڤەکان بێ، چونکە لەو ڕۆژەدا تەنیا ڕووحەکان نین دەوەستن، بەڵکو مرۆڤەکان بە ڕووح و جەستەوە -- جەستەیەك کە خوا دەزانێ چۆنە! -- بە ڕووح و جەستەوە دەوەستن، لەو گۆڕەپانەدا کە خوا بۆ کۆکردنەوەو لێپرسینەوە دایناوە، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا ﴾، ئەو ڕۆژەی ڕووح و فریشتەکان بە ڕیز دەوەستن، (الروح) مەبەست پێی جیبریلە.

٤)- ﴿ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴾، هیچ کامیان نادوێن مەگەر کەسێك (خوای) بە بەزەیی مۆڵەتی دابێ و قسەی ڕێك و ڕاستیش بکات، نادوێن، نە جیبریل دەدوێ، نە فریشتەکان دەدوێن، ﴿ لَّا يَتَكَلَّمُونَ ﴾، قسە ناکەن، ﴿ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴾، مەگەر کەسێك (خوای) بە بەزەیی مۆڵەتی دابێ، تەنیا دەبێ خوا مۆڵەتی دابێ، ﴿ وَقَالَ صَوَابًا ﴾، ئنجا دەبێ قسەی ڕێك و ڕاستیش بکات، یاخود: مەگەر کەسێك (خوای) بە بەزەیی مۆڵەتی دابێ، کە قسەی ڕاست بکات، (**الإِذْن: إسْمٌ لِلْكَلامِ الَّذِي يُفِيْد إِبَاحَة فِعْلٍ للمَأذُون، وَهُوَ مُشْتَقٌّ مِن أذنَ لَه: اسْتَمَع إلِيْهِ**)، (**إِذْن**): ناوە بۆ قسەیەک ئەوە دەگەیەنێ بابای مۆڵەتدراو، ڕێی دراوە کردەوەیەك بکات، لە وشەی: ﴿ أَذِنَ لَهُ ﴾، داتاشراوە: (**أَذِنَ لَهُ: أي اسْتَمَعَ إلَيه**)، گوێی بۆ گرت، ﴿ وَقَالَ صَوَابًا ﴾، ئەمە دوو واتایان دەگەیەنێ:

أ- (و) بۆ بادانەوە (**عطف**)یەو، ئەم ڕستەیە دەگێڕێتەوەو بای دەداتەوە سەر ڕستەی پێشێ، کە دەفەرموێ: ﴿ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ ﴾، (**أي: إلاَّ مَنْ قَالَ صَوَاباً، فَمَنْ لَمْ يَقُل صَوَاباً، لَا يُؤذَن لَهُ**)، واتە: کەس نادوێ لەو ڕۆژەدا، [مەگەر کەسێك (خوای) بە بەزەیی مۆڵەتی دابێ و] کەسێکیش قسەی ڕاست بکات، واتە: کەسێك قسەی ڕاست نەکات، مۆڵەتی نابێ.

**ب-** یاخود: (و)ی ﴿ وَقَالَ صَوَابًا ﴾، واوی حاڵە (**واو الحَالية**)یە، یانی: لە حاڵێکدا کە قسەی ڕاستیش دەکات، واتە: حاڵە بۆ (مَنْ)، ﴿ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴾، لە حاڵێکیش دا، ئەو کەسەی خوا مۆڵەتی دەدا، قسەی ڕاست و ڕێکیش بکات، (**أي: يَأْذَنَ الله لِمَنْ يَتَكَلَّمُ بِمَا يُرْضِي الله**)، یانی: خوا مۆڵەت دەدا بە کەسێك، بە مەرجێك کە قسە دەکات، بە جۆرێك بدوێ، جێگای ڕەزامەندیی خوا بێ.

**٥)-** ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ ﴾، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی چەسپاوە، یاخود ڕۆژێکە حەقی تێدا دەچەسپێ، دادگەریی تێدا دەچەسپێ.

**٦)-** ﴿ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴾، ئنجا هەر کەسێك ویستی بەرەو پەروەردگاری ڕێی گەڕانەوەی گرتە بەر.

ڕستەی: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ ﴾، زانایان بە سێ واتا مانایان کردوە:

**١-** ئەو ڕۆژەی ڕۆژێکی چەسپاوە.

**٢-** ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی دادگەریی تێدا دەچەسپێ.

**٣-** تەنیا ئەو ڕۆژە شایستەی ئەوەیە ناوی لێ بنرێ: ڕۆژ، ڕۆژێکە بەڵام ڕۆژ.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴾، پیتی (ف)، لێرەدا: (**الفاءُ الفَصِيحَةُ تُفصح عَنْ شَرْطٍ مُقَدَّرٍ ناشِئٍ عَنِ الكَلامِ السَّابِقِ، والتَّقْدِيرُ: فَإذا عَلِمْتُمْ ذَلِكَ كُلَّهُ، فَمَن شاءَ اتِّخاذَ مَآبٍ عِنْدَ رَبِّهِ، فَلْيَتَّخِذْهُ**)، فائی (**فصيحة**)یە، مەرجێك دەگەیەنێ کە لە قسەیەکی پێشترەوە مەزەندە کراوەو ئەو دەیگەیەنێ، واتە: ئەگەر هەموو ئەو شتەی باسکرا، زانیتان، ئنجا هەر کەسێك بیەوێ ڕێی گەڕانەوەی بەرەو پەروەردگار بگرێتە بەر، با بیگرێتە بەر.

**٧)-** ﴿ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا ﴾، ئێمە ئێوەمان لە ئازارو سزایەکی نزیك ترساندووەو وریامان کردوونەوە.

(**الإنْـذَار: الإخِبَـار بِحُصُـول مَـا يَـأتِي فِــي المُسْـتَقْبل القَريْـب**)، (**إنْـذَار**) هاواڵدانێکـە بـەوەی لـە داهاتـووی نیزیـك دا دێ، یـانی: بـۆ بابـای ترسـێنراوو ئاگادارکـراو، خراپـەو مەترسییەکی نیزیـك هەیـە، یاخـود: (**إنْـذَار**) بریتیـە لـە ئـاگادار کردنەوەیـەك لەگـەڵ ترسـاندن دا. (**إعـلامٌ مـع تخويـف**).

(**مَـآب**): ١- یان چاوگی میمییە، یانی: گەڕانەوە(**الرجوع**).

٢- یان شوێنی بۆ لا گەڕانەوەیە (**محل الرجوع**).

٣- یان کاتی تێدا گەڕانەوەیە (**وقت الرجوع**).

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّآ أَنذَرۡنَٰكُمۡ عَذَابٗا قَرِيبٗا ﴾، ئێمـە ئێوەمـان لـە ئازارێکـی نیزیـك ترسـاندوە، بۆچـی دەفەرمـوێ: نیزیـك؟ چونکـە:

١- هەموو هاتوویەك نیزیکە، (**كُلُّ آت قَرِيْب**).

٢- مرۆڤەکان ئەگەر جارێ ئاخیر زەمانیشیان بەسەردا نەیەت، گرنگ ئەوەیە هەر کەسێك مرد، بۆ خۆی لە حاڵی خۆی حاڵیی دەبێ (**مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامت قِيَامَته**)، کەواتە: سزای خوا هەر چۆن بێ، نیزیکە، چ بەو ئیعتیبارەی هەموو کەسێك مردنێکی لە ڕێگایەو مردنەکەشی نیزیکە، چ بەو ئیعتیبارەی هەرشتێك بێ، هەر نزیکە، ئەویش ئاخیر زەمان و ڕۆژی دواییە.

٨)- ﴿ يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ ﴾، ئەو ڕۆژەی مرۆڤ تەماشا دەکات، دوو دەستەکانی چییان پێشخستوە؟ (ما) کە دەفەرموێ: ﴿ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ ﴾:

١- دەگونجێ (**مَوْصُوْلَة**) بێ، یانی: (**الَّذي قَدَّمَت يَدَاه**)، مرۆڤ تەماشا دەکات، دوو دەستەکانی چییان پێشخستوە؟.

٢- دەشگونجێ (ما)ی پرسیارکردن (**ما الإسْتِفْهَامية**)بێ، یانی: (**أي شَيء قَدَّمَت يَدَاهُ**)؟، مرۆڤ سەرنج دەدا بزانێ دوو دەستەکانی چییان پێشخستوەو، چییان کردوە؟.

٩)- ﴿ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِي كُنتُ تُرَٰبًا ﴾، بابای بێبڕواش دەڵێ: ئەی خۆزگە گڵ بوومایە، وشەی: ﴿ ٱلْمَرْءُ ﴾:

أ- هەندێك لە زانایان دەڵێن مەبەست پێی: پیاو (**الرَّجُل**)ەو، ئەگەر بیانەوێ بڵێن: مرۆڤێكی مێینە، دەڵێن: (**إمْرَأة**).

ب- بەشێكی دیكەش لە زانایان دەڵێن: وشەی (**مَرْء**)، بە مانای مرۆڤ (**إنسان**)ە، بەگشتیی و ئەگەر ویسترا دیارییبكەن، كە ئەو مرۆڤە ڕەگەزەكەی مێیە، ئەو كاتە دەڵێن: (**إمْرَأة**)، ئەگەرنا (**مَرْء**) پیاوو ئافرەت دەگرێتەوە، بەبێ بە ڕەچاوكردنی ڕەگەزەكەی، (**التفسير المنير**)[1] دەڵێ: (**المَرْء عَام يَشْمِل الذَّكَر وَالأُنْثَى وَالمُؤْمِن وَالكَافِر**)، وشەی (**مَرْء**) گشتییە نێرو مێ و، بڕوادارو بێبڕوا دەگرێتەوە، پێشم وایە ئەو ڕایە ڕاستە، كە تەماشای بەكارهێنانی وشەی (**مَرْء**) دەكەین لە قوڕئانداو، لە زمانی عەرەبییدا، مەبەستیان پێی مرۆڤە، بەبێ لەبەر چاوگرتنی ڕەگەزەكەی، داخۆ نێرە یان مێیە.

لێرەدا (**إبن عُثَيمين**)، لە تەفسیری بەش (**جزء**)ی (**عمّ**)دا[2]، لە تەفسیری ئەو ڕستەیەدا كە دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِي كُنتُ تُرَٰبًا ﴾، بابای بێبڕوا دەڵێ: خۆزگە گڵ بوومایە، سێ مانایانی بۆ دادەنێ:

١- ﴿ يَٰلَيْتَنِي كُنتُ تُرَٰبًا ﴾، (**فَلَمْ أُخْلَق، لِإنَّ الإنْسَان خُلِقَ مِن تُرَاب**)، واتە: هەر گڵ بوومایەو دروست نەكرابامایەو نەكرابامایە مرۆڤ.

٢- ﴿ يَٰلَيْتَنِي كُنتُ تُرَٰبًا ﴾، (**فَلَمْ أُبْعَث وكُنْت تُرَاباً فِي أَجْوَاف القُبُور**)، خۆزگە هەر گڵ بوومایەو دوای ئەوەی دەمردم، هەر بە گڵ و خۆڵیی مابوومایەوە، لە نێو هەناوی گۆڕەكانداو زیندوو نەكرابامایەوە.

---

(١) ج٣٠، ص(٣٩١).

(٢) تفسير جزء (عمّ) ص ٣٨.

٣- ﴿يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا﴾، (**كَمَا كَانَتْ هَذِهِ البَهَائِمُ**)، (لە ڕۆژی دواییدا، دوای ئەوەی ئاژەڵان دادوەرییان لەنێواندا دەکرێ، دەبنەوە بە گڵ و خۆڵ)، بابای کافریش خۆزگە دەخوازێ و دەڵێ: بریا وەك ئەو ئاژەڵانە بوومایە (و مرۆڤ نەبوومایە، ئێستا منیش دەبوومەوە خۆڵ و دەربازم دەبوو لە سزا).

لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە کە (**الطبري**) بە ژمارە: (٣٦٢٧١)، هێناویەتی: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَحْشُرُ الْخَلْقَ كُلَّهُمْ، كُلَّ دَابَّةٍ وَطَائِرٍ وَإِنسَانٍ، يَقُولُ لِلبَهَائِمِ وَالطَّيرِ كُونُوا تُرَابًا، فَعِنْدَ ذَلِكَ يَقُولُ الكَافِرُ: يَا لَيْتَنِي كُنْتُ تُرَابًا**}، (**إسنادُهُ حسن، كما قال الطبري**).

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیهێنێ کە فەرموویەتی: خوا هەموو دروست کراوەکان کۆ دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییداو هەموو ژیانداریك و هەموو باڵندەیەك، هەموو مرۆڤێك، دوایی بە ژیانداران و باڵندەکان دەفەرموێ: ببنەوەی گڵ و خۆڵ، (دوای ئەوەی دادگایی لە نێوانیاندا دەکرێ)، ئنجا لەو کاتەدایە بابای بێبڕوا دەڵێ: خۆزگە منیش گڵ بوومایە.

یانی: ئێستا منیش لەگەڵ ئەوانەدا دەبوومەوە گڵ و خۆڵ و، تووشی ئەو سزاو جەزرەبەیە نەدەبووم، کە چاوەڕێم دەکات.

لێرەدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**النبأ**) یاخود سوورەتی (**عم**) دێنین و، لە خوای پەروەردگاری میهرەبان دەپاڕێینەوە، یارمەتییمان بدات و هەرچی زیاتر عەقڵ و دڵمان ڕۆشن بکاتەوە، بە ڕووناکیی و بەرەکەتی قورئان و، یارمەتییمان بدات: چۆن قورئان دەفەرموێ، بەو شێوەیە ڕەفتار بکەین و، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتییماندا، ئەم قورئانە بکەینە چرایەك و ڕووناکیی و بەرەکەتێك، بەسەر دەوروبەرماندا بیگشتێنین و دەوروبەریشمانی لێ بەهرەمەند بکەین.

## دەستپێك

بەڕێـــــــزان!

خــوا پشــتیوان بــێ ئەمــڕۆ کــە (٩)ی (ذي القعــدة)ی ســاڵی (١٤٤١)ی کۆچییــە، بەرانبــەر (٣٠/حوزەیرانــی/٢٠٢٠)ی زایینــی، لــە شــاری هەولێــر، دەســت دەکەیــن، بــە تەفســیر کردنــی ســـوورەتی (**النَّازِعَــات**) و، وەك عــادەتی خۆشــمان، پێشــەکی پێناســەو نێــوەڕۆکی ئــەم ســـوورەتە موبارەکــە دەخەینــە ڕوو لــە حــەوت بڕگــەدا:

## پێناسەی سوورەتی (النازعات) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئــەم ســـوورەتە نــاوی هــەرە بــاوی: (**سُــورَةُ النَّازِعَــات**)ە، هەڵبەتــە زۆرێــك لــە زانایانیــش بــۆ وێنــە: (**البخــاري**) لــە کتێبــی (**الصحیــح**)ی خــۆی لــە (**کتــاب التفســیر**) دا بــە نــاوی (**سُــورَةُ والنَّازِعَــاتِ**) هێناویەتــی، بــەڵام وێــڕای ئــەو نــاوە بــە: (**سُــورَةُ السَّــاهِرَة**) و (**سُــورَةُ الطَّامَّــة**) و (**سُــورَةُ المُدَبِّرَات**)یــش هاتــوە، چونکــە ئــەو وشــانە تەنیــا لــەم ســـوورەتەدا هاتــوون.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بــە یەکدەنگیــی زانایــان ئــەم ســـوورەتە موبارەکــە لــە شــاری مەککــە دابەزیــوەو، لــەو بــارەوەش ئــەم دەقــە هاتــوە: {**عَــنِ ابْــنِ عَبَّــاسٍ رضــى اللــه عنهــما، قَــالَ: نَزَلَــتْ سُــورَةُ النَّازِعَــاتِ بِمَكَّــةَ**} (**أخرجــه الســيوطي في الــدر المنثــور: ج٨، ص٤٠٣، ونســبه لابــن**

**الضَّريس والنّحاس وابن مردويه والبيهقي، وقال: وأخرج ابن مردويه عن عبدالله بن الزبير مثله)** بڕوانە: (**الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٤٩٢**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄، گوتوویەتی: سووڕەتی (**النَّازِعَات**) لە مەککە دابەزیوە، لەو سەرچاوانەدا کە ئاماژەم پێدان، ئەو دەقە هاتوە، ئیبنو مورْدەوەیهیش هێناویەتی لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە، کە گوتوویەتی: ئەم سووڕەتە موبارەکە لە مەککە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ئەم سووڕەتە موبارەکە لە موصحەفدا ڕیزبەندییەکەی حەفتاو نۆ (٧٩)یە، یانی: لە سووڕەتی (**الفاتحة**)ەوە کە دێی ئەم سووڕەتە موبارەکە ژمارەکەی (٧٩) یەو، لە دابەزینیشدا ژمارەکەی هەشتاو یەك (٨١)ە، پێش (**الإنفطار**)و دوای (**النبأ**) دابەزیوە، ئەوەش وەك جارانی دیکەش ئاماژەم پێداوە، بۆچوونێکە زانایان - بە تایبەت (**جابر بن زيد**) کە ئێمە زیاتر پشت بەو دەبەستین لە دیارییکردنی ڕیز بەندیی سووڕەتەکان لە کاتی دابەزینیاندا - بەڕاو بۆ چوونی خۆیان ئەوەیان گوتوە، نەك دەقێکی لەسەر بێ.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

زۆربەی هەرە زۆری ژمێرەرەرانی ئایەتەکان، ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتەیان بە چل و پێنج (٤٥) داناوەو، بەشێکیش بە چل و شەش (٤٦) یان داناوەو، زیاتر ژمارەی چل و شەش (٤٦) تەبەننیی کراوە، بە تایبەتی لەو موحەفانەی لەو ناوچانەی ئێمەدا هەن.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:

تـەوەری بنەڕەتیـی ئـەم سـووڕەتەش هـەر باسـی ڕۆژی دوایـی و هاتنـی سـزاو پاداشـتە، بـەڵام بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ و ناردنـی بـۆ لای فیرعـەون، کـە دوازدە (١٢) ئایەتـی بـۆ تەرخانکـراون ئایەتەکانـی: (١٢ - ٢٦)و، ئاماژەیەکیـش بـە هەندێـك لـە دیمەنەکانـی گـەردوون، کـە ئەویـش حـەوت (٧) ئایەتـی بـۆ تەرخانکـراون، ئایەتەکانـی: (٢٧ - ٣٣)، نێواخنـی ئـەو بابەتـە بنەڕەتییـەی ئـەو سـووڕەتە کـراون، کەواتـە: (١٢ + ٧ = ١٩)، نـۆزدە (١٩) ئایـەت، بـۆ ئـەو دوو بابەتـە نێواخـن کـراوە تەرخانکـراون، ئنجـا (٤٦ - ١٩= ٢٧) واتـە: بیسـت و حـەوت (٢٧) ئایـەت لـە سـەرەتاو لـە کۆتاییـەوە لـە بـارەی ڕۆژی دواییـەوەن، کـە بریتیـن لـە چـواردە (١٤) ئایـەت لـە سـەرەتایەوەو، سـێزدە (١٣)ش لـە کۆتاییـەوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

سێ تایبەتمەندیی گرنگم لەم سووڕەتەدا کەوتوونە بەرچاو:

**١-** جگە لە سووڕەتی **(الزمر)**، باسی دووجار فوو کرانەکان بە کەڕەنادا، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، بە دوو وشەی: ﴿ٱلرَّاجِفَةُ﴾و ﴿ٱلرَّادِفَةُ﴾، لە سووڕەتی **(الزمر)** دا ئاوا هاتوە: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ...﴿٦٨﴾﴾، بەڵام لێرەدا ئاوا هاتوە: ﴿يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾﴾.

**٢-** لەم سووڕەتەدا دەق لەسەر ئەوە کراوە، کە زەوی دوای ئاسمان دروست بووە: ﴿ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾﴾، واتە: ئایا دروستکرانی ئێوە قورسترە یان ئاسمان؟ (خوا) بنیاتی ناوە. شەوگارەکەی تارێك کردوەو تێشك و ڕووناکییەکەی دەرهێناوە، دوای ئەوەش (خوا) زەوی پانڕاخست و ئامادەکرد.

ئەمەش دەقە لەسەر ئەوە كە زەوی پاش دروست كرانی ئاسمان دروست بووە.

بۆیەش وا دەڵێم: چونكە كاتی خۆی لە كاتی تەفسیری سووڕەتی (**فصلت**)دا لەو بارەوە مشت و مڕێكی زانایانمان باسكرد، كە زانایان هەندێكیان ڕایان وایە زەوی پێش ئاسمان دروست كراوە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ ﴿١١﴾﴾**فصلت**، لە وێ ڕوونمان كردەوە، كە (ثُمَّ) لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی باسكردنە، نەك ڕیز بەندیی دروستكردن، بەڵام ئێستا كە زانستی فیزیایی و گەردووناسیی بەرەو پێشەوە چووە، ئەوە بۆتە شتێكی بەڵگە نەویست كە زەوی یەكێكە لە كۆمەڵەی خۆرو نۆ خڕۆكە بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە، خۆریش ئەستێرەیەكە لە نزیكەی تریلۆنێك، هەزار (١٠٠٠) ملیار ئەستێرە لە كەهكەشانی كاكێشانداو، كەهكەشانی كاكێشانیش یەكێكە لە دوو سەد (٢٠٠) ملیار كەهكەشان و، بە ڕایەكی دیكەی زانایان: یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠).

كە لە گەردوونی بینراو (**الكون المنظور**)دا هەن.

كەواتە: ئەم زەوییەی ئێمە لە ڕووی قەبارەوە شتێكی زۆر بچووكە لە نێو گەردووونداو، ناگونجێ سەرەتا زەوی دروست كرابێ، ئەم ئایەتەش زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ كە دوای ئەوەی خوا ئاسمان یانی: گەردوونی خوڵقاندوە ئەو دروستكراوانەی هەر خوا ﷻ دەزانێ سنووریان تاكو كوێیە؟! ئنجا لە نێو ئەواندا، دوایی زەوی دروست كردوە: ﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا ﴿٣٠﴾﴾**النازعات**.

**٣-** چەند وشەو تەعبیرێك تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون و، ئەوانەی بە زەقیی هاتوونە بەرچاوم، ئەمانەن:

١- ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا﴾.

٢- ﴿وَٱلنَّـٰشِطَـٰتِ نَشۡطًا﴾.

٣- ﴿يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ﴾.

٤- ﴿تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ﴾.

٥- ﴿وَاجِفَةٌ﴾.

٦- ﴿ٱلۡحَافِرَةِ﴾.

٧- ﴿نَّخِرَةً﴾، (نَاخِرَة).

٨- ﴿زَجۡرَةٌ﴾.

٩- ﴿بِٱلسَّاهِرَةِ﴾.

١٠- ﴿وَأَغۡطَشَ﴾.

١١- ﴿ضُحَىٰهَا﴾.

١٢- ﴿ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾.

دەشگونجێ وشەو تەعبیری دیکەش پەیدا بکرێن، کە تایبەتن بەم سوورەتە موبارەکەوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

کۆی چل و شەش ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکە، دەکەینە یەك دەرس، چونکە هەموویان پێکەوە پەیوەست و تێکهەڵکێشن، وەك جارێ دیکەش باسم کردوە، هەر سوورەتێك کە دەمەوێ تەفسیری بکەم، زۆر سەرنجی دەدەم، وێڕای ئەوەی تەماشای تەفسیرەکان دەکەم، زۆریش بۆ خۆم تێوەی ڕادەمێنم و لێی ورد دەبمەوە، ئایا دەگونجێ بۆ چەند برگە بۆ چەند تەوەر دابەش بکرێ؟

بەڵام هەندێك لە سووڕەتەكان، واتێكهەڵكێشن بە ئاسانیی ناگونجێ بڕگە بڕگەو دابەشی بكەی، بۆ چەند دەرسێك، ئەم سووڕەتەش یەكێكە لەو جۆرە سووڕتانەو، چواردە ئایەتی سەرەتا باسی ڕۆژی دوایی بە تایبەت ئاخیر زەمان، دەكەن و، دوایی قیامەتیشی لەگەڵ دا تێكهەڵكێش دەكرێ.

هەروەها سێزدە ئایەتی كۆتاییش دیسان باسی ڕۆژی دوایی و قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ و... هتد دەكەن.

ئنجا دوازدە ئایەت دەربارەی بەسەرهاتی مووسا عليه السلام و، حەوت ئایەتیش لە بارەی پێشاندانی كۆمەڵێك لە دیاردە و دیمەنەكانەوە لە گەردووندا هەن، وەك بەڵگە لەسەر دەسەڵاتی بێ سنووری خواو، مشوور خۆریی خوا سبحانه وتعالى و، سیفەتە بەرزو ناوازەكانی خوا سبحانه وتعالى، ئەوە نۆزدە (١٩) ئایەت.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە كـۆی چـل و شـەش ئایەتەكـەی **(النازعـات)** پێـك دێنـێ، كـە دابـەش دەبـن بـۆ پێنـج تـەوەر:

تـەوەری یەكـەم: ئایەتەكانـی: (١ - ١٤)، سـوێند خواردنـی خـوا ﷻ بـە پێنـج شـت و، باسـی دووجـار فـوو كرانەكـە بـە كەڕەنـاداو، شـڵەژان و كۆسـت كەوتنـی بێبڕوایـان و، چەنـد مەسـەلەیەكی دیكـە لەگـەڵ ئـەو بابەتـە سـەرەكییەدا نێواخـن كـراون.

تـەوەری دووەم: ئایەتەكانـی: (١٥ - ٢٦)، واتـە: دوازدە ئایـەت، باسـی بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ و هارووونـی براشـی و، ناردنـی بـۆ لای فیرعـەون و، بـە نەرمیـی و میهرەبانیـی دواندنـی و، لـە بەرانبـەردا خـۆ بـە زلگرتنـی و ملهوڕیـی و عینادیـی و یاخیبوونـی فیرعـەون و سـەرەنجام سـزادانی.

تـەوەری سـێیەم: ئایەتەكانـی: (٢٧ - ٣٣)، واتە: حەوت ئایەت، باسی سەرنجڕاكێشـانی مرۆڤان بۆ دروسـتكرانی ئاسـمان و زەوی و پێكهاتە سەرەكییەكانی زەوی.

تـەوەری چـوارەم: ئایەتەكانـی: (٣٤ - ٤١)، واتـە: هەشـت ئایـەت، باسـی هاتنـی قیامـەت و سـەرەنجامی هـەر كام لـە یاخییانـی ئـارەزوو پەرسـت و، خۆپارێزانـی خواپەرسـت و خـۆ مەرزەمكـەر لـە بەرانبـەر ئـارەزووە ناشـەرعییەكان دا.

تـەوەری پێنجـەم و كۆتایـی: ئایەتەكانـی: (٤٢ - ٤٦)، واتـە: پێنـج ئایـەت، باسـی پرسـیار كـران لـە پێغەمبـەری خـوا لـە بـارەی ئاخیـر زەمانـەوەو، ڕاگەیاندنـی خـوا كـە ئەركـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ زانینـی ئـەو كاتـە نیـە، بەڵكـو ئەركـی ئـەو تەنیـا ترسـاندنی كەسـانێكە كـە سـام و هەیبەتیـان هەیـە، بەرانبـەر بـەو ڕۆژە، بـۆ ئـەوەی وریـا بـن و، تووشـی سـزاو جەزرەبـەی خـوای دادگـەر نەبـن لـەو ڕۆژەدا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٣﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. سوێند بەو (فریشتە)انەی دەرکێشەر (ی گیانی بێبڕوایان)ن بە توندیی ﴿١﴾ هەروەها سوێند بەو (فریشتە)انەی کێشەر (ی گیانی بڕواداران)ن بە نەرمیی و سێنایی ﴿٢﴾ هەروەها سوێند بەو (فریشتە) انەی مەلەکەرن (بە خێرایی لە نێوان ئاسمان و زەویدا دەفڕن) ﴿٣﴾ ئنجا سوێند بەو (فریشتە)انەی (بۆ جێ بەجێکردنی ئەرکەکانیان) لە یەکدی پێشکەوتووەوەن ﴿٤﴾ ئنجا سوێند بەو (فریشتە)انەی کاروبار بەڕێوەبەرن ﴿٥﴾ ئەو ڕۆژە کە (زەوی) بە ڕاتەکێنرانێکی تایبەت (دوای فووکردنی یەکەم بە کەڕەنادا) دەلەرزێ ﴿٦﴾ (فووکردنی دووەمی) بە دواداهاتووشی شوێن دەکەوێ ﴿٧﴾ دڵانێك لەو ڕۆژەدا بە تەپەتەپ (و هەراسان)ن ﴿٨﴾ چاوەکانیان زەبوون و بە ترس و لەرزن ﴿٩﴾ (بێبڕوایان) دەڵێن: ئایا ئێمە (دوای مردن زیندوو دەکرێینەوەو) گێڕدراوە دەبین بۆ حاڵەتی پێشوو؟! ﴿١٠﴾ ئایا ئەگەر بوونیە ئێسکە کلۆرو ڕزیوو؟ ﴿١١﴾ (ئەگەر وابێ) کەواتە: ئەو گەڕانەوەیە زیانبارانەو دۆڕاوانە دەبێ ﴿١٢﴾ (بەڵێ): بێگومان ئەو (کار)ە، تەنیا یەك تێوە خوڕینە ﴿١٣﴾ (ئیدی دوای فووکردنی دووەم بە کەڕەنادا) یەکسەر ئەوان لە گۆڕەپان دا دەبن ﴿١٤﴾ (ئەی موحەممەد!) ئایا (هەواڵی) باس و خواسی مووسات بۆ هاتوە؟ ﴿١٥﴾ کاتێك پەروەردگاری لە دۆڵی تواى پاککراوەدا بانگی کرد ﴿١٦﴾ (پێی فەرموو:) بچۆ بۆ لای فیرعەون، چونکە ئەو (لە خوا) یاخیی بووە ﴿١٧﴾ ئنجا (پێی) بڵێ: ئایا حەز دەکەی خۆت پاك و چاك بکەی؟ ﴿١٨﴾ هەروەها بەرەو لای پەروەردگارت ڕێنماییت بکەم (تاکو بیناسی و بڕوای پێ بێنی و) سەرەنجام بە مەزەنگرتنەوە سامی لێ بکەی؟ ﴿١٩﴾ ئنجا (مووسا) گەورەترین نیشانەی پێشان دا ﴿٢٠﴾ کەچی (فیرعەون) بە درۆی داناو سەرپێچیی کرد ﴿٢١﴾ دواییش پشتی هەڵکردو (دەتبینی) شێلگیرانە (لە دژی مووساو پەیامەکەی) هەوڵی دەدا ﴿٢٢﴾ ئنجا خەڵکی کۆ کردەوە،

یەکسەر بانگی کرد: ﴿٢٣﴾ گوتی: من بەرزترین پەروەردگارتانم ﴿٢٤﴾ ئنجا خواش بە سزادانی (سڵەمێنەرەوانەی) کۆتایی و یەکەم (دوارۆژ و دنیا) گرتی ﴿٢٥﴾ بە دڵنیایی لەوەدا پەند هەیە بۆ هەر کەس ترس و سام بکات (لە خوای بەرزی مەزن) ﴿٢٦﴾ (ئەی خەڵکینە!) ئایا دروستکردنی ئێوە قورسترە یان ئاسمان؟ (خوا) بنیاتی ناوە ﴿٢٧﴾ ئەستووریی و بەرزییەکەی بڵند کردوە، ئنجا ڕێك و پێکی کردوە ﴿٢٨﴾ شەوگارەکەشی تاریك کردوەو تیشك و ڕووناکییەکەشی دەرهێناوە ﴿٢٩﴾ دوای ئەوەش زەوی ڕاخست و ئامادە کرد (بۆ ژیان و گوزەران) ﴿٣٠﴾ ئاوەکەی و (ڕووەك و) لە وەڕگایەکەی لێ دەرهێنا ﴿٣١﴾ چیایەکانیشی چەسپاندن (و پێیدا ڕۆبردنە خوار) ﴿٣٢﴾ (کە ئەو هەڵکەوتەی زەوی ببێتە مایەی) بەهرە وەرگرتن و گوزەرانی خۆتان و ئاژەڵانتان ﴿٣٣﴾ ئنجا هەر کات ڕووداوە بێ‌ڕەزا داپۆشەرەکە هات ﴿٣٤﴾ ئەو ڕۆژەی مرۆڤ دێتەوە یادی چ کۆششێکی کردوە! ﴿٣٥﴾ دۆزەخیش بۆ هەر کەسێك ببینێ، وەدەرخرا ﴿٣٦﴾ ئنجا هەر کەس (لە خوا) یاخیی بووبێ ﴿٣٧﴾ ژیانی دنیاشی هەڵبژاردبێ (بەسەر هی دوارۆژدا) ﴿٣٨﴾ (ئەوە) بە دڵنیایی دۆزەخ سرەوتگایەتی ﴿٣٩﴾ بەڵام کەسێك سامی لە پێگەی پەروەردگاری کرد بێ و، خۆی لە ئارەزوو (ی ناشەرعیی) گێڕابێتەوە ﴿٤٠﴾ ئەوە بێگومان بەهەشت سرەوتگایەتی ﴿٤١﴾ لە بارەی ڕۆژی دواییەوە لێت دەپرسن: چ کاتێك (کاتی) لەنگەر گرتنیەتی؟ ﴿٤٢﴾ باسکردنی (و زانینی کاتەکەی) کەی کاری تۆیە؟ ﴿٤٣﴾ کۆتایی و سەرەنجامەکەی تەنیا بۆ لای پەروەردگارتە ﴿٤٤﴾ تۆ تەنیا ترسێنەرو وریاکەرەوەی کەسێکی ترس و سامی لێی هەبێ ﴿٤٥﴾ ئەو ڕۆژەی دەیبینن وەك تەنیا ئێوارەیەك یان چێشتەنگاوەکەی (لە ژیان دا) مابنەوە ﴿٤٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا): (نَـزْعُ الـشَّيءِ: جَذْبُـهُ مِـنْ مَقَـرِّه، كَنَـزْعِ القَـوْسِ عَـن كَبِـدِهِ)، (نَـزْع): بریتیـە لـە دارِنیـن و ڕاکێشـانی شـتێك بـە توندیـی، لـە شـوێنێ کـە لێیەتـی، وەك چۆن کـەوان دەکێـشرێ، (وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا): (المَلاَئِكَـة تَنْـزِع الأَرْوَاحَ مـن الأشـباح)، ئـەو فریشـتانەی ڕووحـەکان لـە کەلەشـەکان، جەسـتەکان وەردەگـرن.

(غَرۡقٗا): (الغَـرْقُ: الرُّسُـوبُ فِي المَـاء وَفِي البَـلاء)، (غَـرْق): بریتیـە لـە نغـرۆ بـوون لـە نێـو ئـاوداو لـە بـەڵاو نارِەحەتییـدا، دەگوتـرێ: (أَغْـرَقَ فِي الـشَّيءِ: جَـاوَزَ الحَـدَّ وَبَالَـغَ)، لـە سـنوور تێپەڕانـدو زۆر بـە سـەختیی ئـەو کارەی ئەنجام دا، کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: (وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا): واتـە: ئـەو فریشـتانەی بـە توندیـی ڕووحـەکان دەکێشـن، زۆربـەی زانایـان، گوتوویانـە: ئـەو بـە توندیـی کێشرانـە، بـۆ ڕووحـی بێبڕوایەکانـە.

(وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا): (نَشَـطَ يَنْشـطُ: نَـزَعَ يَنْـزِع)، واتە: ڕایکێشا ڕادەکێشـی، (نَشَـطْتُ العُقْـدَةَ: عَقَدْتُهَـا)، واتـە: گرێیەکـەم گرێـدا، (والنَّشْـطُ: العَقْـدُ الَّـذِي يَسْـهُل حَلُّـه)، (نَشْـط)، بـە گرێیـەك دەگوتـرێ بـە ئاسـانیی بکرێتـەوە، بۆیـە زانایـان گوتوویانـە: (وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا)، واتـە: ئـەو فریشـتانەی ڕووحـی بـڕواداران بـە نەرمیـی و بـە هێواشـیی لـە جەسـتەیان دەکێشـن.

(وَٱلسَّٰبِحَٰتِ): لـە (سَـبْح)ەوە هاتـوە، (السَّـبْحُ: المَـرُّ السَّرِيـعُ فِي المَـاء أَو فِي الهَـوَاءِ)، (سَـبْح): بریتیـە لـە ڕۆیشـتنی خێـرا بـە نێـو ئـاودا، یـان لەنێـو هـەوادا (کـە مەلـەی پێ دەگوتـرێ و فڕینـی پێدەگوتـرێ) (سَـبَحَ، سَـبْحَاً، وسِـبَاحَةً)، واتـە: بـە خێرایـی ڕۆیشـت.

(فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا): (التَّدْبِـيرُ: التَّفَكُّـرِ فِي دُبُـر الأمْـرِ)، (تَدْبِـير): بریتیـە لـە بیرکردنـەوە لـە سـەرەنجامی کارەکـە، بۆیـە بـە کوردیـی ئەگـەر بڵێیـن: تەگبیـری کـرد، مشـووری خـوارد، سەرپەرشـتییکرد، ئـەوە مانـای (تَدْبِـيْر)ە.

(تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ): (الرَّجْـفُ: الإِضْطِـرَاب الشَّـدِيْد)، (رَجْـف): بریتیـه لـه لەرزینـەوەو هەژانێکـی بـه هێـز، دەگوتـرێ: (رَجفَـتِ الأَرْضُ وَرَجَـفَ البَحْـرُ)، زەوییەکـه لەرزییـەوەو دەریاکـه هـەژا، هەروەهـا (رَجْفَـة) بـه مانـای: (الصَّيْحَـةُ وَالزَّلْزَلَـة)، چریکـەو لەرزینـەوەش، هاتـوە.

(ٱلرَّادِفَةُ): (الـرِّدْفُ: التَّابِـعُ، وَرِدْفُ المَـرْأَةِ: عَجِيْزَتُهَـا)، (رِدْف): بـه مانـای شـوێنکەوتوو، شـتێك لـه دوای شـتێکەوە، (رِدْفُ المَـرْأَةِ)، سـمت و پاشـەوەی ئافـرەت، (الـرَّادِف: المُتَأَخِّـرّ)، (رَادِف)، دواکەوتـوو، لێـره کـه دەفەرمـوێ: ﴿ تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴾، یانـی: (تَتْبَـعُ الرَّجْفَـةَ الأُوْلَى)، بـه دوای لەرزینـەوەی یەکـەم دادێ (فـووی دووەم کـه بـه کەڕەنـادا دەکـرێ، بـه دوای فـووی یەکـەم دا دێ، لـه دوای فـووی یەکـەم ئاخیـر زەمـان دەقەومـێ (تێکچوونـی گـەردوون) و، لـه دوای فـووی دووەمیـش و قیامـەت و زینـدوو کرانـەوە ڕوو دەدات).

(وَاجِفَةٌ): (المُضْطَرِبَـةُ مِـنَ الخَـوْفِ، وَجَـفَ كَـضَرَبَ)، (وَاجِفَـة)، یانـی: تـرس و لـەرز لێنیشـتوو، (وَاجِفَـة)، لەسـەر کێشـی (ضَرَبَ)یـه، وەك (وَجَـف، يَوجِـف، ضَرَب، يَـضْرِب)، (وَجْـفْ وَجِيْـفْ وُجُـوف)، هـەر سـێکیان چاوگـن، واتـه: تـرس و سـام ڕێنیشـتن، یاخـود شـڵەژان، (الوَجِيْـفُ: سُرْعَـةُ السَّـيْر)، خێـرا ڕۆیشـتن، ﴿ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ٦ ﴾الحـشر، واتـه: هیـچ وڵاخـه بـەرزەو حوشـترتان بەخێرایـی نەڕۆیشـتاندبوون بـۆ ئـەو جەنگـه، لـه زمانـی عەرەبییدا گوتـراوە: (أَوْجَـفَ وَأَعْجَـف): واتـه: وڵاخەکـەی بـه خێرایـی لێخوری و لـەڕو لاوازی کـرد، (چونکه مانـدووی کردوە).

(أَءِنَّا لَمَرۡدُودُونَ): ئایـا ئێمـه گێڕدارەوەیـن؟ (الـرَّدُّ: صَرْفُ الـشَّيء بِذَاتِـهِ أَو بحَالَـة مِـنْ أَحْوَالِـه)، (ردّ): بریتیـه لـه گێڕانـەوەی شـتێك بەخـودی خـۆی یـان بەحاڵێـك لـه حاڵەکانـی، (المَـرْدُوْد: الـشَّيءُ المُرْجَـعُ إِلى صَاحِبِـه)، (مَـرْدُود): شـتێکه بگێڕدرێتـەوە بـۆ خاوەنـی، گوتـراوە: ماڵـی قەڵـب سـەر بـه خاوەنیەتـی، کەواتـه: (أَءِنَّا لَمَرۡدُودُونَ): واتـه: ئایـا ئێمـه گێڕدراوەیـن؟

(ٱلۡحَافِرَةِ): (الحَالَـةُ القَدِيْمَـة: رَجَـعَ عَـلَى حَافِرَتِـهِ، وَرَجَـعَ الشَّـيْخُ إلى حَافِرَتِـهِ: هَـرِمَ، الحافـرة: الأَرْض الَّتِـي جُعِلَـتْ قُبُورَهُـمْ، أَي: أَنَحْـنُ مَـرْدُودُونَ فِي الحَافِـرَة)، (حَافِـرَة): بریتیه لـه حاڵەتـی پێشـتر، (رَجَـعَ عـلى حافرتـه)، واتـە: گەڕایـەوە بـۆ حاڵەتـی پێشـوو، (رَجَـعَ الشَّـيْخُ إلى حَافِرَتِـهِ) واتـە: پیربـوو (گەڕایـەوە بـۆ حاڵەتـی پێشـێ، سـەردەمی منداڵیـی) (حافـرة) زەوییـەك كـە كـراوە بـە گۆڕەكانیـان، ﴿أَءِنَّا لَمَرۡدُودُونَ فِي ٱلۡحَافِرَةِ﴾، (أَنَحْـنُ مَـرْدُودُونَ فِي الحَافِـرَة)، ئایا لـە كاتێكـدا ئێمـە لـە چاڵـی مـەرگ دایـن، دەگێڕرێینـەوەو زینـدوو دەكرێینـەوە؟!

(نَّخِرَةٗ): (نَخِـرَتِ الشَّـجَرَةُ: بَلِيَـت، نَخْـرَة الرِّيْـحِ، أَي: هُبُوبُهَـا، وَالنَّخِـيْرُ: صَـوْتٌ مِـنَ الأَنْـف)، (نَخِـرَتِ الشَّـجَرَة)، درەختەكـە كلـۆر بـوو، بـۆش بـوو، (نخـرة الريـح) دەنگـی بـا، هەروەهـا دەنگـی لـووتی كەسـێك كـە پرخـەی دێ (نَخِـيْر)ی پێدەگوتـرێ.

(كَرَّةٌ): (الكَـرّ: العَطْـفُ عَـلَى الـشَّيء بِالْـذَّاتِ أَو بِالْفِعْـل)، (كَـرّ): بریتیـە لـە گەڕانـەوە، بـۆ شـتێك خـودی ئـەو شـتە یاخـود كردەوەكـەی.

(زَجۡرَةٞ): واتـە: تێخوڕیـن بـە كوردیـی، (الزَّجْـرُ: طَـرْدٌ بِصَـوْتٍ، ثُـمَّ يُسْـتَعْمَلُ فِي الطَّـرْد تَـارَةً وَفِي الـصَّ وْتِ أُخْـرَى)، (زَجْـر): بریتیـە لـە دەركردنـی كەسـێك بـە دەنـگ، دوایـی بـە كارهێـنراوە هـەم بـۆ دەركـردن، هـەم بـۆ دەنـگ، بـە جیـا جیـا.

(بِٱلسَّاهِرَةِ): (وَجْـه الأَرْضِ)، (سَـاهِرَة)، واتـە: ڕووی زەوی، (أَرْضُ القِيَامَـة)، گۆڕەپانـی قیامـەت، (وَحَقِيْقَتُهَـا الَّتِـي يَكْـثُر الـوَطء بِهَـا فَكَأَنَّهَـا سَـهَرَت بِذَلِـكَ)، (سَـاهِرَة)، ئـەو زەوییەیـە زۆری پـێ لێـنراوە، وەك لەبـەر ئـەوە شـەونخوونیی كێشـابێ، خـەوی لـێ نەكەوتبـێ.

(طُوًى): (طَوَيْـتُ الـشَّيء طَيّـاً)، شـتەكەم پێچایـەوە، (طُـوَى)، نـاوی ئـەو دۆڵەیـە كـە یەكـەم جـار خـوا تێیـدا وەحیـی بـۆ مووسـا نـارد.

(نَكَالَ): (نَـكَلَ عَـنِ الـشَّيءِ: ضَعُـفَ وَعَجَـزَ، وَنَكَلْتُـهُ: قَيَّدتُـهُ، وَالنِّـكْلُ: قَيْـد الدَّابَـةِ وَحَدِيْـدة اللِّجَـام، وَنَكَّلْـتُ بِـهِ: إِذَا فَعَلْـت بِـهِ مايُنْـكَلُ بِـهِ غَـيْرُه)، (نَـكَلَ عَـنِ الـشَّيءِ) واتـە: بـێ هێـز

بـوو و دەسـتە پاچـە بـوو، لـە بەرانبـەر ئـەو شـتەدا، (وَنَكَلْتُـهُ: قَيَّدتُـهُ)، بەسـتمەوەو کەلەپچـەم کـرد، (نِـكْل) بـەو ئاسـنە دەگوتـرێ کـە لـە پێـی ئـاژەڵ دەکـرێ، هەروەهـا بـەو (لغـاو)ەش دەگوتـرێ: کـە لـە زاری وڵاخـە بـەرزە دەکـرێ بـۆ ئـەوەی لـەوەڕ نەخوا، (نَكَّلْتُ بِـه)، کارێکـم پـێ کـرد جگەلـە خـۆی پێـی تەمبـێ خـواردوو بـێ.

(لَعِبْرَةً): پەنـدو ئامۆژگاریـی، (أَصْـلُ العَـبْرِ تَجَـاوزٌ مِـنْ حَـالٍ إلى حَـالٍ، وَالإعْتِبَـار وَالعِـبْرَة: الحَالَـة الَّتِـي يُتَوَصَّـلُ بِهَـا مِـنَ مَعْرِفَـة المُشَـاهَد إلى مَـا لَيْـسَ بِمُشَـاهَد)، وشـەی: (عَـبْر)، لـە ئەصڵـدا بـە مانـای تێپەڕینـە لـە حاڵێکـەوە بـۆ حاڵێـك، (اعْتِبَـار وعِـبْرَة)، بـەو حاڵەتـە دەگوتـرێ: کـە بەهـۆی شـتێکی زانـراوەوە بـە شـتێك نەزانـراو، دەگـەی.

(بَنَاهَا): واتـە: دروسـتی کـردو بنیاتـی نـا، (بَنَـى الشَّيءَ يَبْنِيْـه بَنايـة وَبَنـاءً وَبُنْيَانـاً: أَقَـامَ جِـدَارَه وَنَحْـوَه)، شـتەکەی دروسـتکرد دروسـتی دەکات، (بَنايَـةً وَبَنْـاءً وَبُنْيَانـاً) هەرسـێکیان چـاوگ (مصـدر)ن واتـە: دیوارەکـەی دروسـت کـرد، یـان شـێوەی دیوارەکـەی دروسـت کـرد.

(سَمْكَهَا): (سَـمَكَ يَسْـمُكُ سُـمُوكاً: عَـلَا وَارْتَفَـعَ)، (سَـمَكَ يَسْـمُكُ)، واتـە: بەرزبـوو، بەرزدەبـێ، (سُـمُوك)، بەرزیـی، بەرزکـراوە (سَـامِك)، بـەرزو هەڵچـوو، (سَـمَكَ الشَّيء سَمْكاً: رَفَعَـهُ)، شـتەکە بـەرز کـردەوە، (سَـمْك: سَـقْف)، (سَـمْك) بـە سـەربان دەگوتـرێ و بـە ئەسـتووریی و بەرزییـش دەگوتـرێ.

(فَسَوَّاهَا): (سَـوَّى الشَّيءَ: قَوَّمَـهُ وَعَدَّلَـهُ وَجَعَلَـهُ سَوِيّاً)، واتـە: شـتەکەی ڕێکخسـت و هاوسـەنگی کـردو چاکـی کـرد.

(وَأَغْطَشَ): (غَطَـشَ اللَّيْـلُ يَغْطِـشُ غَطْشَـاً: أَظْلَـمَ)، شـەوەکە تاریـك بـوو، تاریـك دەبـێ، تاریـك بـوون، (وَأَغْطَـشَ اللَّيْـلُ وَالبَـصَرُ: أَظْلَـم)، شـەوەکە یـان چاوەکـە حاڵەتێکـی (غَطْـش) و (إغْطَـاش) یـان بەسـەرداهات، یانـی: تاریـك بـوو، چاوەکـە نەیبینـی و تاریـك بـوو، جەوەکـە تاریـك داهـات، (أَغْطَـشَ اللَّيْـل)، کەواتـە: (أَغْطَـش القَـوْمُ)، واتـە: خەڵکەکـە چوونـە نێـو تاریکاییـەوە (وَأَغْطَـش اللـه اللَّيْـل)، واتـە: خـوا شـەوەکەی تاریـك داهێنـا.

(ضُحَىٰهَا): (الضُّحَى: ضَوءُ الشَّمْس)، (ضُحَى): بریتیە لە تیشكی خۆر، (وَارْتِفَاع النَّهَار وَامْتِدَادُهُ)، بەرزبوونەوەی ڕۆژ و درێژە كێشانی ڕۆژگار.

(دَحَىٰهَآ): (دَحَى الشَّيءَ: بَسَطَهُ وَوَسَّعَهُ)، واتە: زەوییەكەی پانڕاخست و فراوانی كرد، ئامادەی كرد.

(وَمَرْعَىٰهَا): (مَوْضِع الرَّعِي)، واتە: شوێنی لێ لەوەڕاندن، (الرَّعِيُ: حِفْظُ الحَيْوَان إمَّا بِغِذَائِه الحَافِظ لحَيَاتِه، وَإمَّا بِذَبِّ العَدوِّ عَنْهُ)، (رَعِي) بریتیە لە پارێزگاریی لێكردنی ئاژەڵ، چ بەوەی ئەو خۆراكەی بدرێتێ كە ژیانی دەپارێزێ، چ بەوەی دوژمنی لێ دوور بخرێتەوە.

(أَرْسَىٰهَا): (رَسَى الشَّيءُ يَرْسُوا رَسَّاً: ثَبَتَ، وَأَرْسَاهُ غَيْرُهُ)، (أرْسَها)، لە (رَسِي)وە هاتوە، (رَسَى الشَّيءُ يَرْسُوا رَسَّاً)، واتە: شتەكە چەسپا، دەچەسپێ، چەسپان، (وَأَرْسَاهُ غَيْرُهُ)، واتە: جگەلە خۆی چەسپاندی.

(مَتَٰعًا): (المَتَاعُ: كُلُّ مَا يُنْتَفَعُ بِهِ عَلَى وَجْهٍ، فَهُوَ مَتَاعٌ وَمُتْعَة)، هەر شتێك بەهرەی لێ وەربگیرێ بە شێوەیەك لە شێوەكان، پێی دەگوترێ: (مَتَاع) و (مُتْعَة) یانی: بەهرە لێ وەرگیراو.

(ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ): كارەساتە هەرە گەورەكە، لە (طَمَّ)وە هاتوە، دەگوترێ: (البَحْر المَطْموم)، واتە: دەریایەكی هەڵكردوو، دەریایەك بەسەر هەموو شتێك دا زاڵ بێ و بەرز بێتەوە.

(وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ): دۆزەخیش هێنرا، پێشاندرا، (بَرَز: ظَهَرَ بَعْدَ خَفَاءٍ)، (بَرز) دەركەوت دوای ئەوەی پێشێ پەنهان بوو، (بَرَزَ لَهُ)، بۆی دابەزی، خۆی لە كۆمەڵەكەی جیا كردەوەو بۆ چووە مەیدانێ.

(وَءَاثَرَ): (آثَرَهُ إيْثَاراً: فَضَّلَهُ وَاختَارَه)، هەڵیبژاردو گوڵبژێری كرد.

(ٱلْمَأْوَىٰ): (المَلْجَأ الَّذِي يُؤْوى إِلَيْه)، پەناگە ئەو شوێنەی پەنای پێ دەبردرێ، دەگوترێ: (فُلَان مَأْوى المَحَاوِيج)، فڵانکەس پەناگەی ئاتاجانە، کەسانێك کە ئاتاج دەبن پەنای پێ دەبەن و هاوکارییان دەکات.

(مَقَامَ رَبِّهِۦ): (المَقَام: المجلِس)، (مَقَام)، شوێنی دانیشتنە، (المَقَام: الإقَامَةُ ومَوْضِعُ القَدَمَيْنِ)، وەستان و شوێنی دوو پێیەکان، بۆ کەسێك کە ڕادەوستێ (المَقَام: الإقَامَة) شوێنی لێمانەوە، هەروەها بە مانای شوێنی لێ نشتەجێ بوون دێ، دوایی دەخوازرێتەوە بۆ پێگەی مەعنەویی، واتە: سام و هەیبەتی خوا، یان پێگەی بێ وێنەی خوا.

(مُرْسَىٰهَا): واتە: شوێنی لێ چەسپان، شوێنی لەنگەر لێگرتن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکانە: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾﴾، دوو گێڕراوە هاتوون:

**أ- {عَن طَارِقِ بنِ شِهَابٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَزَالُ يَذْكُرُ مِنْ شَأْنِ السَّاعَةِ حَتَّى نَزَلَتْ:** ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾﴾} **(أخرجه النسائي في تفسيره: ٦٦٦٥، والطبري في جامع البيان: ج٣٠، ص٣١، والطبراني في المعجم الكبير: ٨٢١٠، وقال مؤلِّفا: الإستيعاب في بيان الأسباب قلنا: وهذا سند صحيح، والطارق رضي الله عنه، رأي النبي ﷺ ولم يسمع منه هو من صغار الصحابة).**

واتە: تاریقی کوڕی شیهاب (کە یەکێکە لە هاوەڵان، بەڵام ئەو کاتە تەمەنی گچکە بووە، ئەگەرنا بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتوە)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام باسی کاروباری ڕۆژی دوایی (ئاخیر زەمانی) دەکرد هەتا ئەم ئایەتە موبارەکانە دابەزین: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾

﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ ﴾، لە بارەی ڕۆژی دوایی (یان ئاخیر زەمان)ەوە پرسیارت لێ دەکەن، کەنگێ لەنگەر دەگرێ، لەنگەر گرتنەکەی کەیە؟ تۆ هیچ پەیوەندییت بە باسکردنیەوە نیە، (زانینی کاتی هاتنی ئاخیر زەمان عایدی تۆ نیە)، کۆتایی زانیارییەکەی تەنیا بۆ لای پەروەردگارتە، تۆش تەنیا ترسێنەرو وریاکەرەوەی ئەو کەسەی، ترس و سامی بەرانبەر بەو ڕۆژە هەیە.

ب- هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە: {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: لَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ ﷺ يَسْأَلُ عَنِ السَّاعَةِ حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ ﴾}، **(أخرجه الطبري في جامع البيان: ج٣٠، ص٣١، والبزار في مسنده: ٢٣٧٩، والحاكم في المستدرك: ج١، ص٥٠٣، وقال: هذا حديث لم يُخَرَّجْ في الصحيحين، وهو محفوظ صحيح على شرطهما معاً، وقد احتجّا معاً بأحاديث ابن عيينة عن الزهري عن عروة عن عائشة رضي الله عنها)**.

واتە: دایکمان خاتوون عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەردەوام لە بارەی (السَّاعَةِ)ەوە پرسیاری دەکرد، (لە خوای پەروەردگار داوای کردوە) هەتا خوا ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ ﴾، تۆ چ پەیوەندییەکت بە باس و خواسیەوە هەیە، کۆتاییەکەی بۆ لای پەروەردگارتە.

دیارە دەقەکە وا هاتوە، ئەگەرنا لە هەندێك دەقی دیکەدا هاتوە، کە بێبڕوایەکان پرسیاریان لێکردوەو، لێرەش خودی ئایەتەکە هەر وادەگەیەنێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ ﴾، پرسیارت لێدەکەن، کەواتە: دەبێ ئەوانەی پرسیاریان کردوە، بێبڕوایەکان بوون، چونکە بڕوایان پێی نەبووە، پرسیارکردنەکەشیان دەگونجێ:

أ- وەك گاڵتە پێکردن، یان نکووڵیلێکردن بووبێ.

ب- دەشگونجێ بە جیددیی بووبێ: ئایا کەیە؟ بەڵام هەردوو دەقەکان - هۆی هاتنە خواری ئایەتەکانیان - وا هاتوون[1].

---

(١) (الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص ٤٩٢ و ٤٩٣) ئەو دوو دەقەی هێناون.

## کورتە باسێک لە بارەی سوێندەکانی قورئانەوە

بەڕێـــــزان!

بەمەبەستی بەگشتی تیشک خستنە سەر بابەتی سوێندەکانی قورئان، کە زۆر دوبارە بوونەوە خوا یاربێ، لە پێنج برگەدا ئەم کورتە باسە دەخەینەڕوو:

١- مانای سوێند خواردنی خوا.

٢- ئامانجی سوێند.

٣- پایەکانی سوێند.

٤- حیکمەتی سوێند خواردنی خوا.

٥- کۆی ئەو سوورەتانەی بە سوێند دەستیان پێکراوە.

بۆ ئەوەی بە گشتیی بەر چاومان ڕۆشن بێ، ئەگەرنا ئەو سوورەتانەی تێپەڕیون، ئەو سوێندانەی لە پێشیانەوە هاتوون، هەموویان قسەمان لێ کردوون، ئەوانەی دێشن، بە تایبەت قسەیان لێ دەکەین، بەڵام بە گشتیی بە باشم زانی ئەم کورتە باسە لە بارەی سوێندەکانی قورئانەوە بکەین، لەبەر ئەوەی لە سەرەتای بیست و سێ (٢٣) سوورەتی قورئان دا، سوێند خواردن هاتوەو، خوا بە سوێند دەستی پێکردوون.

### بڕگەی یەکەم: وشەکانی سوێند خواردن:

بۆ (سوێند خواردن) سێ وشە هاتوون لە قورئاندا: ١- (قَسَمْ) و ٢- (حَلِف) و ٣- (يَمِيْن).

١)- (قَسَمْ)، وەك:

أ- ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢﴾ القيامة.

ب- ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ٧٦﴾ الواقعة.

٢)- (حَلِف) وەك:

أ- ﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ ٧٤﴾ التوبة.

ب- ﴿وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ المجادلة: -١٤-.

٣)- هەروەها (يَمِيْن)یش هاتوە، بەڵام نەك لە حاڵەتی كردار (فِعْل)دا، بەڵكو لە حاڵەتی ناو (اسم)دا، وەك:

أ- ﴿ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡ ٨٩﴾ المائدة.

ب- ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةً﴾ المجادلة: ١٦.

١- وشەی (قَسَمْ)، (أَقْسَم، يُقْسِم، فَهُوَ مُقْسِم)، سوێندی خوارد، سوێند دەخوا، ئەو سوێند خۆرە.

٢- (حَلَفَ، يَحْلِفَ، فَهُوَ حَالَفٌ)، سوێندی خوارد، سوێند دەخوا، ئەو سوێند خۆرە، ئەگەر بویستری زێدەڕۆیی لە واتایەكەی دا بكرێ، دەگوترێ: (حَلاَّف).

٣- بەڵام وشەی: (يَمِيْن)، بەس بە حاڵەتی ناو (اسم) هاتوەو وەك كردار نەهاتوە.

پێویستە بزانرێ كە بۆ ئێمەو مانان، دروست نیە بە جگەلە خوا و سیفەتەكانی خوا، سوێند بخۆین وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ}، (أخرجه مالك: ١٠٢٠، وأحمد: ٤٥٩٣، والبخاري: ٥٧٥٧، ومسلم: ١٦٤٦، وأبو داود: ٣٢٤٩، والترمذي: ١٥٣٤) واتە: هەر كەسێك سوێند دەخوات با سوێند بە خوا بخوات، ئەگەرنا بێ دەنگ بێ، واتە: سوێند بە زاتی خوا بخوات و بڵێ: (بە خوا، یان بە پەروەردگار)، یان بە یەكێك لە سیفەتەكانی خوا، بۆ وێنە: (بە فەرمایشتی خوا كە قورئانە)، بە زانیاریی خوا، بەبەزەیی خوا.

بەڵام خوا ﷻ بۆ خۆی هەم سوێندی بە زاتی خۆی خواردوە، هەم سوێندی بە کردەوەی خۆی خواردوە، هەم سوێندی بە دروستکراوەکانی خۆشی خواردوە.

## بڕگەی دووەم: ئامانجی سوێند:

بۆ خواو بە نسبەت ئێمەشەوە کە سوێند دەخۆین، ئامانج و مەبەست لە سوێند خواردن، بریتیە لە جەختکردنەوەی ئەو هەواڵەو، داکۆکیی لە ڕاستییکردنی و، دڵنیاکردنەوەی لایەنی بەرانبەر، خوا ﷻ بە پێی عەقڵی ئێمەو باوی ئێمەو ئاستی ئێمە، ئێمە دەدوێنێ، بۆیە ئەویش کە سوێند دەخوات، ئامانجی سەرەکیی لە سوێندەکان، بریتیە لە دڵنیاکردنەوەی ئێمەو جەختکردنەوە لەسەر ڕاستیی ئەو شتەی دەیفەرموێ، بەڵام بەدڵنیاییی - وەك دوایی باسی دەکەین - حیکمەتی سوێند خواردنەکانی خوا ﷻ جگە لەوەی خەڵك دڵنیا بکاتەوەو، داکۆکیی بکات لەسەر ڕاستیی ئەو مەبەستانەی دەیانفەرموێ، وێڕای ئەوە، هەندێك حیکمەتی دیکەش لە سوێندەکانی خوای پەروەردگاردا هەن، کە دوایی لە بڕگەی چوارەم دا باسیان دەکەین.

کەواتە: ئامانجی سوێند خواردن بریتیە لە ساغکردنەوەی ئەو هەواڵەو، داکۆکیی لێکردنی و، دڵنیاکردنەوەی لایەنی بەرانبەر.

بۆ وێنە خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَـٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾﴾ **الواقعة**، ئەگەر تەماشا بکەین ئامانج و مەبەستی سوێند خواردنەکە زۆر ڕوونە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: نەخێر (ڕاست نیە، وەك ئێوە دەڵێن، ئەی بێبڕوایەکان) سوێند دەخۆم بە ڕێ و شوێنەکانی ئەستێرەکان و، ئەگەر بشزانن ئەوە سوێندێکی مەزنە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ﴾، ئەوە سوێند لەسەر خوراو

(مُقْسَم عَلَيْه)ەكەیە، ئەم قورئانە (ئەوەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە)، قورئانێكی بەڕێزو بەخشندەیە، ﴿ فِي كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴾، لە نووسراوێكی شێردراوەدایە، كە مەبەستی زانیاریی خوایە، یان مەبەستی (اللَّوْح المَحْفُوْظ)ە، ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴾، فریشتە پاككەرەوەكان، نەبێ دەستیان نایگاتێ، ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، لە لایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە دابەزێنراوە.

كەواتە: خوا ﷻ سوێندی خواردوە بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەكان، لەسەر ئەوەی ئەم قورئانە، قورئانێكی بەڕێزو بەخشندەیەو، لە نووسراوێكی پەنهان و شێردراوەدایەو فریشتە پاكەكان نەبێ، دەستیان نایگاتێ و، لە لایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە دابەزێنراوە.

هەروەها سوێندەكانی دیكەش هەموویان ئامانجی سەرەكیی لێیان، ڕاگەیاندنی ڕاستییەكەو داكۆكیی لەسەركردنی ڕاستییەكە، ئنجا چ ئەو ڕاستییە باس كرابێ، چ باس نەكرابێ، وەك لە بڕگەی سێیەمدا باس دەكەین.

## بڕگەی سێیەم: پایەكانی سوێند:

سوێند خواردن سێ پایەی هەن:

پایەی یەكەم: خودی سوێند خواردنەكە.

وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾ ﴾الإ نشقاق، بە زۆریی كرداری سوێند خواردن بە پیتی (ب)، دەست پێدەكات، جاری واش هەیە بە پیتی (و)، وەك (والله)، جاری واش هەیە بە پیتی (تَ)، بەڵام پیتی (ت) تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە: (تالله)، بەڵام هەردووك پیتی (و) و (ب) گشتیین بۆ سوێند پێ خواردن.

کەواتە: پایەی یەکەمی سوێند خواردن، بریتیە لە خودی سوێند خواردنەکە کە بە پیتەکانی: (و) و (ب) و (ت) ئەنجام دەدرێ.

پایەی دووەم: بریتیە لە سوێند پێخوراوەکە.

ئەو شتەی سوێندی پێ دەخورێ، وەك ئەو نموونانەی هێنامانەوە:

١- ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴾، خوا سوێندی خواردوە بە (شَفَق)، واتە: ئەو سوورایییەی لە ئاسۆی ئاسماندا دەمێنێ، دوای خۆرئاوا بوون.

٢- ﴿ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴾، هەروەها سوێندی خواردوە بە شەوگار کە دادێ.

٣- ﴿ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴾، دیسان سوێندی بە مانگ خواردووە کاتێك جێخونکە دەکات و دەگاتە (١٤ و ١٥)، کەواتە: پایەی دووەمی سوێند بریتیە لە: سوێند پێخوراو.

ئنجا دەتوانین بڵێین: بە گشتیی خوا سوێندی بە سێ شتان خواردوە.

١- یەکەم: بە زاتی خۆی، وەك:

أ- لە سوورەتی (**الذاريات**) لە ئایەتی (٢٣)دا دەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: سوێند بە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، خوا سوێند خواردوە بە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، کە خۆیەتی.

ب- هەروەها لە سوورەتی (**الحجر**)، لە ئایەتی (٩٢)دا دەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾.

ج- هەروەها لە سوورەتی (**النساء**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ﴾.

٢- سوێند پێخوراوی دووەم: بە نسبەت خوای پەروەردگارەوە، سوێندی خواردوە بە کردەوەی خۆی، بۆ وێنە: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴿٥﴾ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴿٦﴾ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ ﴾، ئەمانە هەموویان لە سوورەتی (**الشمس**)دا هاتوون لە ئایەتەکانی: (٥ و ٦ و ٧)دا:

أ- ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا﴾، سوێند بە ئاسمان و بە دروستکردنەکەی.

ب- ﴿وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا﴾، سوێند بە زەوی و بە پانڕاخستنەکەی.

ج- ﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا﴾، سوێند بە نەفس و بەو زاتەی ڕێکیخستوە، کەواتە: جاری وایە خوا ﷻ سوێند دەخوات بە کردەوەکەی خۆی.

هەڵبەتـە: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ۝٥ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ۝٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧﴾، تەفسیری دیکەشیان هەیە، کە (ما) مەبەست لێرەدا پێی خوای پەروەدگارە واتە: ئەو زاتەی دروستیکردوە، دەشگونجێ (ما)، لێرەدا (ماالمصدرية)یە بێ.

٣- سوێند پێ خوراوی سێیەم: بۆ خوای پەروەردگار، ئەوەیە کە سوێند دەخوات بە دروستکراوەکانی خۆی، بۆ وێنە: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ۝١﴾النجم، سوێند بە ئەستێرە، کاتێك ئاوا دەبێ، هەڵبەتە زۆربەی سوێند پێخوراوەکانی خوای پەروەردگار، دروستکراوەکانن، وەك: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ۝١ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ۝٢ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ۝٣ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ۝٤﴾الذاريات، هەروەها لە سوورەتی (**الصافات**)دا: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ۝١ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ۝٢ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ۝٣﴾الصافات، ئنجا ئەو شتەش کە سوێندی پێ دەخورێ، دەگونجێ ئاشکرا بێ و دەشگونجێ پەنهان بێ، یانی: (**مُظْهَر**) بێ، وەك: ﴿فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ ۝٢٣﴾الذاريات، یاخود (**مُضْمَر**) بێ، وەك: ﴿لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ ۝١٨٦﴾آل عمران، واتە: سوێند بە خوا تاقی دەکرێنەوە لە سامانیشتانداو لە خودی خۆیشتاندا.

پایەی سێیەمی سوێند خواردن: وەڵامی سوێند یاخود سوێند لەسەر خوراوە (**مُقْسَم عليه**)کە.

بە زۆری وایە خوا ﷻ وەڵامی سوێندەکان دەقرتێنێ، لەبەر ئەوەی دیارو ئاشکرایە، بۆ وێنە: کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (**النازعات**)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا ۝١ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ۝٢ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ۝٣ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ۝٤

﴿فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ٥﴾، دیـار نیـه سـوێند لەسـەر خوراوەکـه چییـه، بـەڵام بـه سـیاق و سـەلیقه دەزانـرێ، یانـی: ﴿لَتُبۡعَثُنَّ ٧﴾التغابـن، بـه دڵنیایـی زینـدوو دەکرێنـەوە، هەروەهـا لـه زۆر شـوێناندا، خـوا وەڵامـی سـوێندەکەی قرتانـدوە، بـۆ ئـەوەی زیاتـر لـه واتایـەك هەڵبگـرێ.

## بڕگەی چوارەم: حیکمەتەکانی سوێند خواردنەکانی خوا ﷻ:

حیکمەتی سوێند خواردنەکانی خوا ﷻ زۆرن، بەڵام ئێمه پێنج حیکمەتی سەرەکیان لێ باس دەکەین:

**١-** یەکەم حیکمەت که ئامانجی سەرەکیی سوێند خواردنه، بریتیه له جەختکردنەوە لەو ڕاستییەی ڕادەگەیەنرێ و، دڵنیاکردنەوەی لایەنی بەرانبەر، خوای پەروەردگار سوێند دەخوات بۆ ئەوەی لایەنی بەرانبەر دڵنیا بکاتەوە، بۆ وێنه خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ٢﴾القلم.

سـوێند بـه قەڵـەم و بـەوەی دەینووسـن، تـۆ بەهـۆی چاکـەی پەروەردگارتـەوە شـێت نـی. لێـرەدا دوێنـدراو پێغەمبـەری خوایـه ﷺ لەبـەر ئـەوەی ناحەزەکانـی تۆمەتباریـان دەکـرد، کـه شـێته، یاخـود جـادووی لـێ کـراوەو دەسـتی لێوەشـێنراوە.

**٢-** حیکمەتێکی دیکەی سوێند خواردن، ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکه که خەڵکێك نکووڵیی لێ دەکات، بۆ وێنه: ڕۆژی دوایی، خوا ﷻ له سووڕەتی **(القیامة)**دا دەفەرموێ: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢﴾القیامة، لێرەدا حیکمەتی سوێند خواردن به ڕۆژی قیامەت، ئەوە بووە که ئەوان نکووڵییان کردوە له ڕۆژی هەڵسانەوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: نەخێر (ڕاست ناکەن)، سوێند دەخۆم به ڕۆژی هەڵسانەوە، هەروەها (ڕاست ناکەن) سوێند دەخۆم بەنەفسی زۆر ڕەخنەگر (لەخۆی)، ئنجا ڕۆژی هەڵسانەوە که خواش سوێندی پێ بخوات، مانای وایه ڕۆژێکی مەزنەو ڕاستەودێ، خوا دڵنیایی دەداته ئەو کەسانەی سوێندەکەیان بۆ دەخوات، لەسەر ئەوە.

٣- سێیەم جاری وا هەیە، خوا ﷻ سوێند بە شتێك دەخوات، تاكو سەرنجی خەڵك ڕابكێشی بۆ بایەخی ئەو شتە، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ۝١ وَطُورِ سِينِينَ ۝٢ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ۝٣﴾التين، واتە: سوێند بە هەنجیرو بە زەیتوون و، سوێند كێوی سیناو، سوێند بەم وڵاتە بە هێمن و ئاسایشە (كە مەبەستی پێ مەككەیە) واتە: خوا ﷻ سەرنجی خەڵك ڕادەكێشێ بۆ گرنگیی هەنجیرو زەیتوون و كێوی سیناو مەككە، یاخود: ئەو شوێنەی هەنجیرو زەیتوونی لێ دەڕوێن، كە شام و فەلەصطینەو، ئەوەش ڕای هەندێك لە زانایانە.

هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (**الذاريات**)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ۝١ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ۝٢ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ۝٣ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ۝٤﴾الذاريات، كە ئەوە هەم بۆ دڵنیاكردنەوەی لایەنی بەرانبەرە، هەم بۆ سەرنجڕاكێشانی خەڵكیشە بۆ گرنگیی ئەو شتانەی خوا سوێندی پێ خواردوون: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا﴾، سوێند بەو بایانەی ڕادەماڵن بە ڕاماشتن، ﴿فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا﴾، ئنجا سوێند بەو بایانەی باری قورس هەڵدەگرن، یاخود كەشتییەكان كە لە دەریادا باری گران هەڵدەگرن، ﴿فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا﴾، ئنجا سوێند بەوانەی زۆر بە ئاسانیی دەڕۆن، كە هەورەكانن، لە فەزادا دەڕۆن، یاخود دیسان مەبەست پێی كەشتییەكانن، ﴿فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا﴾، هەروەها سوێند بەوانەی كاروبار دابەش دەكەن، كە مەبەست پێی فریشتەكانن.

٤- جاری واش هەیە خوا ﷻ سوێند بە هەندێك شت دەخوات، لەبەر ئەوەی كەسانێك بوون شتە ماددییەكانیان، نادیدە گرتوون، یان بە كەمیان تەماشا كردوون و زێدەڕۆییان كردوە، لە لایەنی ڕووحیی و مەعنەویی دا، لەسەر حیسابی لایەنی ماددیی و بەرهەست.

بۆ وێنە: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ۝٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ۝٧٦﴾الواقعة، واتە: نەخێر ڕاست ناكەن، سوێند دەخۆم بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەكان و، ئەگەر بشزانن ئەوە سوێندێكی مەزنە، كەواتە: ئەو شتانەی خوا سوێندیان پێ دەخوات، چ ڕێ و شوێنی ئەستێرەكان بن، چ ئەستێرە:

﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ١﴾ النجم، چ كێوی (طور) و... هتد: ﴿وَٱلطُّورِ ١ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ٢ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ٣ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ٤ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ٥ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ٦﴾ الطور، چ قەڵەم و دێڕ: ﴿وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١﴾ القلم، بەڵێ ئەوشتانەی خوا سوێندیان پێ دەخوات، كە شتە ماددییەكانن، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوانەیە كە ئەم دنیاو واقیعە ماددییەی تێیدا دەژین، نادیدەیان گرتوون و زێدەڕۆییان كردوە لە ڕووی ڕووحیی و مەعنەوییەوەو، دنیاو لایەنی ماددیی و واقیعییان، وەك خەون و خەیاڵ تەماشا كردوە، كە نەخێر وانیە، وەك ئێوە دەڵێن، ئەوەتا خوا سوێند دەخوات بە ئەستێرەو مانگ و خۆرو، سوێند دەخوات بە گەردوون و، سوێند دەخوات بە ئاسمان و بە زەوی.

٥- حیكمەتێكی دیكەی سوێند خواردنی خوا ئەوەیە، خوا ﷻ دەیەوێ بۆ چوونی خەڵكێك ڕاست بكاتەوە بەرانبەر بە دروستكراوەكانی، كە بە پێچەوانەی ئەوانەی پێشێوە، ئەمان زێدەڕۆییان كردوەو، پێیان وابووە ئەو دروستكراوە ماددییانە هەن و، لە پشتیانەوە شتێكی دیكە نیە و دەستی بەدیهێنەر و خاوەن پەروەردگارێک لەوبارەوە لەكاردا نەبووە و نییە!

بۆ وێنە: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ١ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ٥ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧﴾ الشمس، وەک دەبینین خوای بەرزی مەزن لەم ئایەتانەدا یازدە (١١) سوێندان دەخوات:

١،٢: سوێند بە خۆر و بە تیشكەكەی ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾.

٣: سوێند بە مانگ كە بەدوای خۆردا دێت ﴿وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا﴾.

٤: سوێند بە ڕۆژگار كە زەوی دەدرەوشێنێتەوە ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا﴾.

٥: سوێند بە شەوگار كە دایدەپۆشێ -واتە: زەوی- ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا﴾.

٦،٧: سوێند بە ئاسمان و بە بنیاتنەرەکەی -کە خوایە- ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا﴾ .

٨،٩: سوێند بە زەوی و بە پانڕاخەرەکەی -کە خوایە- ﴿وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا﴾ .

١٠،١١: سوێند بە نەفس و بە ڕێکخەرەکەی ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا﴾ .

کەواتە:

بزانن کە خۆر و مانگ و ڕۆژ و شەو و ئاسمان و زەوی و نەفس، بەدیهێنەر و خاوەن مشوورخۆرێکیان هەیە کە خوای بەرز و وێنەیە.

هەروەها دەشگونجێ زۆر حیکمەتی دیکە لە بارەی سوێند خواردنەکانی خوای پەروەردگارەوە بخرێنە ڕوو.

بڕگەی پێنجەم و کۆتایی: کۆی سوێندەکانی خوا ﷻ لە سەرەتای سووڕەتەکاندا، بە پێی تێڕامانی من ئەو سووڕەتە موبارەکانەی بە سوێند دەست پێدەکەن، ئەگەر هیچیانم لە بیر نەچووبن، بیست و سێ (٢٣) سووڕەتن و، بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف ئەمانەن:

١- سووڕەتی یەکەم: سووڕەتی (یس): ﴿يسٓ ١ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ٢﴾، [دوو پیتی] یاسین، سوێند بە قورئانی قسەزان و کاربەجێ، دوایی هەر یەکسەر وەڵامی سوێندەکەش هاتوە: ﴿إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ٣﴾، واتە: بە دڵنیایی تۆ لە ڕەوانەکراوانی (ئەی موحەممەد ﷺ!)

٢- سووڕەتی دووەم: سووڕەتی (الصافات)، کە خوا ﷻ بە سێ سوێندان دەستی پێدەکات: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ١ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجْرًا ٢ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكْرًا ٣ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَٰحِدٌ ٤ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ ٥﴾، لەوێشدا دیسان خوا سێ شتە سوێند پێخوراوەکان هاتوون، بەڵام سوێند لەسەر خوراوەکەش هەر هاتوە، دەفەرموێ: سوێند بە ڕیز بووەکان بە ڕیز بوون، ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجْرًا﴾، هەروەها ئەوانەی تێوە دەخوڕن، بە تێوە خوڕین، ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكْرًا﴾، ئنجا ئەوانەی زیکر دەخوێننەوە

یاخود زیکر باس دەکەن، کە بە ڕای زۆربەی زۆری زانایان هەرسێکیان مەبەست پێیان فریشتەکانن، ئەو فریشتانەی بە ڕیز دەوەستن و، ئەو فریشتانەی شەیتانەکان دەردەکەن و، ئەو فریشتانەی ئایەتەکانی خوا، (**ذکر**)ی خوا دەخوێننەوە بەسەر پێغەمبەران دا، وەڵامی سوێندەکەش: ﴿إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَاحِدٌ﴾، بە دڵنیایی پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ڕۆژهەڵاتەکانە.

٣- سوورەتی سێیەم: سوورەتی (ص)ە، کە بە سوێند دەست پێدەکات: ﴿صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ۝١﴾، بەڵام وەڵامی سوێندەکە نەهاتوە.

صاد (پیتێکە) سوێند بە قورئانی خاوەن بیرکردنەوە، یان خاوەن پەندو ئامۆژگاریی.

٤- سوورەتی چوارەم: کە بە سوێند دەست پێدەکات، سوورەتی (**الزخرف**)ە: ﴿حمٓ ۝١ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝٢﴾، (**حا**) (**میم**) سوێند بە کتێبی ڕۆشن، یان ڕوونکەرەوە.

٥- سوورەتی پێنجەم: سوورەتی (الدخان): ﴿حمٓ ۝١ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝٢﴾، (**حا**) (میم) سوێند بە کتێبی ڕۆشن، یان ڕوونکەرەوە.

ئەمانە هەموویان، واتە: سوورەتەکانی: (یس، ص، الزخرف، الدخان)، دوایی سوورەتی (ق)یش کە لە دوایی ئەوانەوە دێ، لە هەموویان دا سوێند بە قورئان خوراوە.

٦- سوورەتی شەشەم: سوورەتی (ق) ئەویش دیسان بە سوێند دەست پێدەکات: ﴿قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ۝١﴾.

قاف، سوێند بە قورئانی خاوەن شکۆ، لەوێش دیسان وەڵامی سوێندەکە نەهاتوە بە ئاشکرا، بەڵام لە پەردەدا هاتوە: ﴿قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ۝١ بَلْ عَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ۝٢﴾، وەك: سوێند بە قورئان، بە قورئانی خاوەن شکۆ، تۆ ڕەوانەکراوی، یاخود زیندوو دەکرێنەوە.

٧- سوورەتی حەوتەم: سوورەتی (**الذاريات**)ە، كە ئەویش بە سوێند دەست پێدەكات: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ۝١ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ۝٢ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ۝٣ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ۝٤ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ ۝٥ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ ۝٦﴾، سوێند بەو بایانەی ڕاماڵەرن بە ڕاماشتن، ئنجا سوێند بەو كەشتییانەی  باری قورس هەڵگرن، یاخود: بەو هەورانەی باری قورس هەڵگرن (كە بارانە)و، سوێند بەو كەشتییانەی بە ئارامیی ڕۆیون (لە دەریادا)، (یاخود: سوێند بە هەورەكان) و، سوێند بەوانەی كاروبار دابەشكەرن (سوێند بەو چوارانە) ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ ۝٥ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ ۝٦﴾، ئەوەی  بەڵێنتان پێ دەدرێ ڕاستەو، سزاو پاداشت دێ، دەردەكەوێ و دەچەسپێ.

٨- سوورەتی هەشتەم: سوورەتی (**الطور**)، خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ۝٢ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ۝٣ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ۝٤ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ۝٥ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ۝٦ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ ۝٧ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ ۝٨﴾، لەوێشدا دیسان وەڵامی هەر پێنج سوێندەكە،  هاتوە سوێند بە **طوور** [ناوی كێو و چیایە بە گشتیی، یاخود چیایەكی تایبەتە كە مووسا ﷷ لەسەری گفتوگۆی لە خزمەت خوای پەروەردگاردا كردوە]،  و بە كتێبێكی نووسراو (كە دەگونجێ مەبەست پێی تەورات بێ) لە پێستێكی نووسراودا [(یاخود: مەبەست پێی قورئانەو خوا هەواڵیداوە كە ئەو قورئانە) دەنووسرێتەوە لە پێست و چەرمدا] ئنجا سوێند بە ماڵی ئاوەدان [كە (كەعبە)یە، یاخود ماڵێك لە ئاسمان و كەعبەی فریشتەكانە]و سوێند بە سەربانی بەرز كراوە (كە ئاسمانە) و سوێند بە دەریای پڕكراو، [یاخود: دەریای كڵپە سەندوو]، سزاو ئازاری پەروەردگارت دێ و، هیچ بەر پەرچدەرەوەشی نیە.

٩- سوورەتی نۆیەم: كە بە سوێند دەست پێدەكات، سورەتی (النجم)ە: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ۝١ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ۝٢ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤﴾، لەوێشدا دیسان سوێند پێخوراو هاتوەو، سوێند لەسەر خوێندراویش هەر هاتوە، سوێند بە ئەستێرە كاتێك  ئاوا دەبێ، یاخود دەكەوێ، ﴿مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ﴾، هاوەڵەكەتان (كە موحەممەدە ﷺ) نە ڕێی لێ تێكچووەو نە بێمرادو بێ

ئاکامیش بووە، ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴾، لە ئارەزووشەوە قسە ناكات، ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾، بەڵكو (ئەو قورئانە) سرووشی خوایە بۆی دەكرێ.

١٠- سوورەتی دەیەم: سوورەتی **(القلم)**ە: ﴿ نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: نوون، سوێند بە قەڵەم و بەوەی دەینووسن، تۆ (ئەی موحەممەد!) بەهۆی چاكەی پەروەردگارتەوە شێت نی.

١١- سوورەتی یازدەیەم: سوورەتی **(القيامة)**یە: ﴿ لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: نەخێر (وانیە) سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت، نەخێر (وانیە) سوێند دەخۆم، بە نەفسی ڕەخنە لە خۆگر، وەڵامی سوێندەكەش نەهاتوە، بەڵام بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، واتە: ئێوە زیندوو دەكرێنەوەو سزاو پاداشتتان لە پێشە.

١٢- سوورەتی دوازدەیەم: سوورەتی **(المرسلات)**ە، كە بە پێنج سوێندان دەست پێدەكات: ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ ﴾، لەوێشدا دیسان وەڵامی سوێندەكە هاتوە: ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴾، ڕای زاڵتری زانایان ئەوەیە: كە مەبەست پێی بایەكانە، ئەو بایانەی نێردراون بە دوای یەكداو، بە توندیی هەڵدەكەن، ئنجا: ﴿ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ ﴾، مەبەست پێیان فریشتەكانن كە باڵەكانیان بڵاو دەكەنەوەو، هەق و ناهەق لێك جیادەكەنەوە، **(ذكر)**ی خوای پەروەردگار فڕێ دەدەن و دەهاوێن و، دەیبێرن بۆ پێغەمبەران، وەڵامی سوێندەكەش ئەوەیە: ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴾ ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ دێ و، ڕوو دەدات.

١٣- سوورەتی سێزدەیەم: كە بە سوێند دەست پێدەكات، سوورەتی **(النازعات)**ە: ﴿ وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ ﴾، ئەمانەش پێنج سوێندن كە ئێمە دوایی بە درێژیی قسەیان لەسەر دەكەین، دیسان ئەمانیش وەڵامی سوێندەكان دیار نیە، بەڵام بە سیاق دەیزانین.

١٤- سووڕەتی چواردەیەم: سووڕەتی (**البروج**)ە: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ﴿١﴾ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴿٣﴾ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ﴾، ئەمانیش چوار سوێندن دیسان وەڵامی سوێندەکە دیار نیە، بەڵام بەسیاق و سەلیقە زانراوە.

١٥- سووڕەتی پازدەیەم: سووڕەتی (**الطارق**)ە: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴿٢﴾ ٱلنَّجْمُ ٱلثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴿٤﴾ ﴾، لێرەدا وەڵامی دوو سوێندەکە دیارە، سوێند بە ئاسمان و بە **طاریق**، ئەو ئەستێرەیەی دێ، ﴿ ٱلنَّجْمُ ٱلثَّاقِبُ ﴾، ئەستێرەیەکی کونکەرە (بە تیشکەکەی دڕ بە تاریکیی دەدا) ﴿ إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴾، هیچ نەفسێك نیە، مەگەر پارێزەرێکی بە سەرەوەیە.

١٦- سووڕەتی شازدەیەم: سووڕەتی (**الفجر**)ە: ﴿ وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾ ﴾، ئەمانتش پێنج سوێندن و وەڵامی سوێندەکان دیار نیە، سوێند بە بەرە بەیان و، سوێند بە دە شەوەکان، (زۆربەی زانایان دەڵێن: دەشەوەکەی مانگی (**ذي الحجة**)ن کە شەوی کۆتاییان جەژنی قوربانە)، ﴿ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴾، سوێند بە جووت و بە تاك (جووتەکە هەموو دروستکراوانی خوان، تاکیش خوای پەروەردگارە)، ﴿ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴾، سوێند بە شەوگار کە دەڕوا، ﴿ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴾، ئایا لەو شتانەدا سوێند خواردن هەیە، بۆ خاوەن عەقڵان؟ (هەموو ئەوانە شایستەن سوێندیان پێ بخورێ؟).

١٧- سووڕەتی حەڤدەیەم: سووڕەتی (**البلد**)ە: ﴿ لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: وانیە (وەك ئێوە دەڵێن) سوێند دەخۆم بەم وڵاتە، لە حاڵێکدا تۆ نیشتەجێی لەم وڵاتەدا، ﴿ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ﴾، هەروەها سوێند بە هەر دایك و باببێك و بە هەر ڕۆڵەیەك، ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴾، (ئەوە وەڵامی سوێندەکەیە) بە دڵنیایی مرۆڤمان لە ڕەنج و نارەحەتییدا خوڵقاندوە، (ژیانی مرۆڤ هەمووی بریتیە لە ڕەنج و زەحمەت و هەوڵدان و تێکۆشان، یاخود دروست بوونی مرۆڤ بە قورسیی و زەحمەت هاتوەو بە قۆناغی جۆراو جۆردا تێپەڕیوە).

**١٨-** سوورەتی هەژدەیەم: کە بە سوێند دەستی پێکردوە، سوورەتی (**الشمس**)ە: ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ﴿١﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴿٢﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ﴿٣﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ﴿٤﴾ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴿٥﴾ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴿٦﴾ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾، ئەمانیش یازدە سوێندن و دوو ئایەتی (٩ و ١٠)ش وەڵامی سوێندەکەن و، ئەمە تاکە سوورەتێکە یازدە سوێندی تێدا خوراون، خوای پەروەردگار سوێند دەخوا بە یازدە شتان، وەڵامی سوێندەکەش ئەوەیە: ئەو کەسەی خۆی پاک و چاك دەکات، سەرفرازەو، ئەو کەسەی خۆی لە بن چڵکی گوناهان دا پەنهان دەکات، پەشێمان و بەدبەخت و بێمرادە.

**١٩-** سوورەتی نۆزدەیەم: کە بە سوێند دەست پێدەکات، سوورەتی (**الليل**)ە: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ﴿١﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾﴾، ئەوانش سێ سوێندن، وەڵامی سوێندەکانیش ئەوەیە: ﴿إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ﴾، تێکۆشان و هەوڵەکانی ئێوە جۆراو جۆرن.

**٢٠-** سوورەتی بیستەم: کە بە سوێند دەست پێدەکات، سوورەتی (**الضُّحى**)یە: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾﴾، سوێند بە چێشتەنگاوو سوێند بە شەوگار، کە بە تاریکییەکەی دادەپۆشێ، ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾، ئەوەش وەڵامی سوێندەکەیە، پەروەردگارت نە وازی لە تۆ هێناوەوەو نە لێشت تووڕەیە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە کافرەکان بانگەشەیان دەکرد.

**٢١-** سوورەتی بیست و یەکەم: کە بە سوێند دەست پێدەکات، سوورەتی (**التين**)ە: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾﴾، خوا سوێند دەخوات بە چوار شتان: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ﴾، سوێند بە هەنجیرو، بە زەیتوون و، سوێند بە **طووری** سینا (کێوی دەشتی سینا) و، سوێند بەم وڵاتە پڕ هێمن و ئاسایشە (کە مەبەست پێی مەککەو دەوروبەریەتی)، ئنجا وەڵامی سوێندەکەش هاتوە: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ

﴿فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ﴾، بەڕاستیی مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەی ماددیی و مەعنەویی دا هێناوەتە دی.

**٢٢**- سووڕەتی بیست و دووەم: کە بە سوێند دەست پێدەکات، سوورەتی (**العاديات**)ە: ﴿وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ضَبۡحٗا ١ فَٱلۡمُورِيَٰتِ قَدۡحٗا ٢ فَٱلۡمُغِيرَٰتِ صُبۡحٗا ٣ فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا ٤ فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا ٥ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ٦﴾، ئایەتی شەشەمیش وەڵامی سوێندەکەیە، خوای میهرەبان سوێند دەخوات بەو ئەسپانەی بە خێرایی دەڕۆن و سیفەتەکانی دیکەشیان باس دەکات، دوایی دەفەرموێ: بەدڵنیایی مرۆڤ بەرانبەر بە پەروەردگاری بێخێرە.

**٢٣**- سووڕەتی بیست و سێیەم و کۆتایی: کە بە سوێند دەست پێدەکات، سووڕەتی (**عصر**)ە: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢﴾، واتە: سوێند بە (**عصر**)، نوێژی ئێوارە، یان ڕۆژگار بە گشتیی، بە دڵنیایی مرۆڤ لە زیانباریی دایە، واتە: مرۆڤێك کە دەستی هیدایەتی خوای بەبەزەیی نەگەیبێتێ، دوایی بە چوار مەرجان ئەو مرۆڤانەی تووشی زیانباریی نابن، جیایان دەکاتەوە، کە بریتین لە: ئیمان و، کردەوەی باش و، یەکدیی ڕاسپاردن بە هەق و، یەکدی ڕاسپاردن بە خۆڕاگریی.

ئەو بیست و سێ سووڕەتە لە قوڕئاندا، بە سوێند دەست پێدەکەن.

بەڵام وێڕای ئەوە چەند سوێندێکیش لە نێو سووڕەتەکان دا هاتوون، بۆ وێنە:

١- سووڕەتی (**الواقعة**): ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥﴾.

٢- هەروەها لە پێش ئەودا سووڕەتی (**الذاريات**): ﴿فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقّٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ﴾.

٣- هەروەها لە سووڕەتی (**التكوير**) لە نێوە ڕاستەکەیدا: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ١٥ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ١٦ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ١٨ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ١٩﴾.

٤- هەروەها لە سووڕەتی (**المعارج**)دا: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾﴾.

هەروەها لە سووڕەتی (**الإنشقاق**)دا: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾﴾، هەڵبەتە لە شوێنی دیکەشدا دیسان سوێند هەر خوراون لە نێو سووڕەتەکان دا، بەڵام تەنیا ئەو بیست و سێ سووڕەتە بە سوێندەکان دەستیان پێکردوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرمویّ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، کە ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای باڵادەست دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجا خوا دەفەرمویّ: ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ۝١ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ۝٢ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ۝٣ فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ۝٤ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا ۝٥﴾، لێرەدا خوا ﷻ پێنج سوێندان دەخوات، زانایان لەوبارەوە زۆر مشت و مڕیان کردوە، کە ئایا مەبەست لەو پێنج سوێندانە چی و چییە؟ ئایا هەر یەك شتە، یاخود چەند شتێکە؟ کە دوایی ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر تیشکی دەخەینەسەر.

بەڵام ئێستا هەر بە کورتیی دەڵێین: زۆربەی زانایان دەڵێن: ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا﴾، واتە: سوێند بە فریشتە دەرکێشەرەکانی ڕووحی بێبڕواو تاوانباران بە توندیی، چونکە وشەی: (نَزْع)، بە مانای ڕاکێشانی شتێکە لە شوێنی خۆیەوە، وشەی: ﴿غَرْقًا﴾ش بۆ خستنە ڕووی ئەوەیە، کە ئەو ڕاکێشانە گەیشتۆتە کۆتایی، یانی: (**مُغْرِقِيْن فِي النَّزْع**)، گەیونە کۆتایی و زۆر بە توندیی ڕایانکێشاون، کەواتە: مەبەست ئەو فریشتانەن، یان ئەو کۆمەڵە فریشتانەن کە ڕووحی مرۆڤەکان بە تایبەت مرۆڤە تاوانبارو بێبڕوایەکان، بە توندیی ڕادەکێشن.

﴿ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ﴾، وەك چۆن (نَزَعَ) یانی: (جَذَبَ)، ڕای كێشا، (نَشْط)یش هەر بە مانای وەرگرتن دێ، بەڵام (نَشْط) بریتییە لە وەرگرتنی شتێك بە سووكیی، یان بە ئاسانیی، (أُنْشوطَة)، بە گرێیەك دەگوترێ، بە ئاسانیی بكرێتەوە، كەواتە: ﴿ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ﴾، یانی: سوێند بەو فریشتانەی ڕووحی هەندێك لە مرۆڤەكان، كە مرۆڤە بڕواداره چاكەكارەكانن، بە ئاسانیی وەردەگرن و بە ئەسپایی بە دەستیانەوە دێن.

﴿ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ﴾، سوێند بەو فریشتانەی بە مەلەكردن (لە هەوادا) مەلە دەكەن، چونكە (السَّبْحُ: المَرُّالسَّرِيعُ فِي الـمَاء أو فِـي الهَوَاء)، (سَبْح): ڕۆیشتنی خێرایە لە ئاوداو لە هەوادا، فریشتەكانیش كە خوای پەروەردگار لە ئاسمانەوە دەیاننێرێ بۆ سەر زەوی، بۆ ئەنجامدانی ئەو كارانەی پەیوەندییان بە مرۆڤەكانەوە هەیە، بێگومان هەم بە بەرگە هەوادا، هەم پێش بەرگە هەوا، بەو فەزا فراوانەدا كە هەر خوا دەزانێ، ماوەكەی چەندە، دەیبڕن، ئنجا دەگەنە سەر زەوی.

كەواتە: سوێند بەوانەی بە خێرایی دەڕۆن، خێراییەكی سەر سووڕهێنەر.

﴿ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ﴾، سوێند بە فریشتە بە پێشكەوتووەكان بە پێشكەوتنەوە (سَابِق)، كەسێكە پێش كەسێك كەوتبێتەوە لە ڕۆیشتندا، فریشتەكانیش پێشبڕكە دەكەن، یان خێرایی دەكەن، لێرەدا مەبەست لە پێشبڕكە كردن خێرایی كردنەو كەسێك لەگەڵ كەسێكدا پێشبڕكە بكات، دەیەوێ هەموو تینی خۆی تێبكات و بە خێرایی بڕوات.

﴿ فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ﴾، سوێند بەو فریشتانەی كاروبار بەڕێوە دەبەن و سەرپەرشتیی كارەكان دەكەن، (أمْرًا) بە نەناسراو (نكرة) هاتوە، واتە: ئەو كارانەی وەسف ناكرێن، یاخود مەبەست پێی زۆرییە، یانی: ئەو كارە زۆرانەی نایەنە ئەژمار.

ئنجا وەك دوایی باسی دەكەین، هەندێك لە زانایانیش مانای دیكەیان لەو سوێندانە داوەتەوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێیان ئەستێرەو خڕۆکەکانن.

ب- هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێیان ڕووحەکانن.

ج- هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێیان ئەسپی موجاهیدو جەنگاوەرەکانن.

د- هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێیان ئەو کەوانانەن کە ڕایانکێشاون، تیریان پێ هاویشتوون ... هتد.

بەڵام مانایەك کە زیاتر بە عەقڵ و دڵەوە دەنووسێ و، لەگەڵ سیاقی ئایەتەکانیش دا دەگونجێ و، ئەوەش دێنێ کە خوای پەروەردگار سوێندی پێ بخوات و، بۆ هەمووو مرۆڤەکانیش بشێ بە درێژایی کات و بە پانایی زەمین، ئەوەیە کە مەبەست پێیان فریشتەکانن، چونکە ئەگەر کەوان بێ، ڕۆژگاری تیرو کەوان بەسەرچووە، کاتی خۆی کەوانیان ڕاکێشاوە و تیرەکەیان پێ هاویشتوەو، هەروەها ڕۆژگاری ئەسپیش تێپەڕیوە، خوای پەروەردگاریش نەك تەنیا لێرە بەڵکو لە چەند شوێنێکی دیکەش دا بۆ وێنە: لە سەرەتای سوورەتی (**الصافات**)دا، هەر سوێندی خواردوە بە فریشتەکان، کە کاروباری گەردوونی پێ سپاردوون، وەڵامی سوێندەکەش لێرەدا دیار نیە، بەڵام دەزانین کە مەبەست پێی ئەوەیە: سوێند بەو فریشتانەی ئەو کارانە ئەنجام دەدەن، ئێوە زیندوو دەکرێنەوەو سزاو پاداشت چاوەڕێتان دەکات، بە چی دەزانین؟ بەوە دەزانین کە ئەم سوورەتە هەمووی وەك لە پێناسەکەیدا گوتمان: چواردە ئایەتی سەرەتای، هەروەها سێزدە ئایەتی کۆتایی هەموویان لە بارەی ڕۆژی دواییەوەن، ئنجا بەسەرهاتی مووساش عليه السلام، لە دوازدە ئایەتدا و، دوایی هەندێك لە دیاردە سەرنجڕاکێشەکانی گەردوون لە حەوت ئایەتدا نێواخن کراون، ئەوانیش دەکەنە نۆزدە ئایەت، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوەی ئامانجی سەرەکییە لەم سوورەتەدا، باسی ڕۆژی دواییە.

ئنجا خوا تعالى دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ﴾، ئەو ڕۆژەی لەرزینەوەکە دەلەرزێتەوە، یاخود ئەو ڕۆژەی زەوی دەلەرزێتەوە، ﴿ٱلرَّاجِفَةُ﴾، دەگونجێ

مەبەست پێی خودی لەرزینەوەکە بێ، کە لە دوای فووی یەکەم بە کەڕانادا دێتە دی، دەشگونجێ مەبەست پێی زەوی بێ، ئەو زەوییەی لە ئەنجامی فوو کردن بە کەڕانادا، بۆ جاری یەکەم دەهەژێ و دەلەرزێتەوە.

﴿ تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴾، شوێنکەوتووەکە بە دوای دادێ، شوێنکەوتووەکە **(الرادفة)** مەبەست پێی فووی دووەمە، لە ئەنجامی فووی دووەمیش دا ئاسمانەکان و زەوی جارێکی دیکە دەلەرزن، بۆ جاری یەکەم ئاخیر زەمان پەیدادەبێ و، بۆ جاری دووەم قیامەت و زیندووکرانەوەو هەڵسێنرانەوە پەیدادەبێ، دەشگونجێ مەبەست لە: **(الرَّادِفَة)** هەر خودی ئەو دەنگە گەورەیە بێ، کە لە ئەنجامی فوو کردن بە کەڕەنادا دەبێ، واتە: فووی یەکەم دەکرێ و، فووی دووەمی بەدوا دێ.

﴿ قُلُوبٌ يَوۡمَئِذٖ وَاجِفَةٌ ﴾، دڵانێك لەو ڕۆژەدا پڕ ترس و لەرزو، هەراسانن، ئۆقرەیان لێ هەڵگیراوە.

﴿ أَبۡصَٰرُهَا خَٰشِعَةٞ ﴾، چاوەکانیان ترس و بیمان لێ دەبارێ، چاوەکان مات و حەیرانن.

﴿ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرۡدُودُونَ فِي ٱلۡحَافِرَةِ ﴾، دەڵێن: ئایا ئێمە دەگێڕدرێینەوە بۆ حاڵەتی پێشێمان، ﴿ لَمَرۡدُودُونَ ﴾، یانی: **(مُرْجَعُونَ)**، ئایا ئێمە دەگێڕدرێینەوە؟ ﴿ فِي ٱلۡحَافِرَةِ ﴾، ئەمە تەعبیرێکە لە زمانی عەرەبییدا: **(رَجَعَ فـي حَافِرَتِه، رَجَعَ فـي الحَافِرَة)**، گەڕایەوە بۆ حاڵەتی پێشووی، مەبەستیان پێی ئەوەیە: ئایا ئێمە دوای ئەوەی دەمرین، جارێکی دیکە دەهێنرێینەوە بۆ ژیان، (ژیانێکی دیکە کە لە ڕۆژی دواییدایە)؟ ﴿ أَءِنَّا ﴾، خوێندراویشەتەوە: **(إنَّا لَمَرْدُودُونَ)**، پرسیار کردنەکەش پرسیاری لێکردنی نکووڵییکەرانەو ڕەخنە گرانەیە، ئەگەر خوێندنەوەی: **(إنَّا لَمَرْدُودُونَ فـي الحَافِرَة)**ش بێ بە شێوەی پرسیارکردنە، ئایا ئێمە دەگێڕدرێینەوە بۆ حاڵەتی پێشێمان و دوای ئەوەی مردین، جارێکی دیکە، دەخرێینەوە نێو ژیانێکی

دیکـە؟ ﴿ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴾، ئایا دوای ئـەوەی بووین بـە ئێسـقانی پڕتـووکاوو ڕزیـو؟ یـانی: ئـەوە شـتێکی زۆر دوورەو هەرگیـز ناگونجـێ شـتی وا ڕووبـدات.

﴿ قَالُواْ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴾، گوتیـان: کەواتـە: ئـەوە گەڕانەوەیەکـی زۆر زیانبارانەیـە، واتـە: گەڕانەوەیەکـە ئێمـە زۆر زیانـی لـێ دەکەیـن، ئەگـەر وابـێ، هەڵبەتـە لێـرەدا مەبەسـتیان پێـی ئـەوە نەبـووە، بڕوایـان بـەو گەڕانەوەیـە هەبـێ، ئنجـا ئـەو زیانـەش هەبـێ کـە لـەو گەڕانەوەیـە دەیکـەن، بەڵکـو ئـەوە جۆرێـك بـووە لـە توانجـدان و گاڵتـە پێکـردن، خـوای پەروەردگاریـش لـە وەڵامیانـدا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴾، ئـەو زینـدوو کرانـەوەو لێپرسانـەوەو هاتنـی قیامەتـە، تەنیـا یـەك تێوەخوڕینـە، ﴿ زَجْرَةٌ ﴾، بەمانـای یـەك جـار تێوەخوڕیـن دێ، کـە بریتیـە لـە فەرمانکـردن و ڕێگرییکـردن لـە کەسـێك بـە تووڕەیـی، بـە کوردیـی دەڵێیـن: تێوەخوڕیـن، یـانی: یـەك تێوەخوڕینـە، ﴿ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴾، ئنجـا هەموویـان دەکەونـە گۆڕەپانێـکی تەخـت و فـراوان و سـپییەوە (**السَّاهِرَة**) واتـە: زەوییەکـی سـپیی و سـاف، واتـە: دەکەونـە نێـو مەیدانـی مەحشـەر، دوایـی لەوبـارەوە دوو فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوا دێنیـن، کـە دەفەرمـوێ: ئـەو شـوێنەی مرۆڤەکانـی لەسـەر کۆدەکرێنـەوەو، سزاو پاداشـتی لەسـەر دیاریـی دەکـرێ لـە نێـو مرۆڤەکانـدا، دەشـتێکە وەك نانێکـی سـپیی وایـە، بـێ گـرێ و گرفـت و، مـرۆڤ لەو سـەری تاکو ئەو سـەری دەتوانـێ ببینـێ[1]، واتـە: مـرۆڤ شـێوەی پێکهاتـەی ئێسـتای نامێنـێ، چونکـە ئێسـتا بـەس تاکـو ماوەیەکـی دیارییکـراو دەبینـێ، بـەڵام هەمـوو ئـەو مرۆڤانـەی خـوا دروسـتی کـردوون، هەروەهـا جنديـش، لـە مەیدانێـدا کۆدەکرێنـەوەو مرۆڤێـك لـەو سـەری تاکـو ئـەو سـەری هەموویـان بتوانـێ ببینـێ، مانـای وایـە پێکهاتـەی مـرۆڤ جۆرێکـی دیکەیـە، هـەم ئـەو گۆڕەپانـەش کـە خەڵکـی لـێ کۆدەکرێتـەوە، شـتێکی دیکەیـەو جگەلـە ئـەم زەوییـەی ئێمەیـە، ئـەو زەوییـەی ئێمـە خـڕو بازنەییـەو،

---

(١) بڕوانە: بڕگەی (١٤) لە مەسەلەی یەکەم.

ئەگەر مەیدانێك هەبێ بە هەموو زەوی دا بڵاو بێتەوە، مەیدانەكە وەك تۆپی لێ دێ، كەواتە: هەندێكی دیار دەبێ و زۆربەی دیار نابێ.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ڕووداوی مووسا ﷺ و، ڕەوانەكرانی بۆ لای فیرعەون، ئەو بەسەرهاتەی مووسا كە دوازدە ئایەت دەگرێتەوە ئایەتەكانی: (١٥ - ٢٦) و، خوا ﷻ تێكهەڵكێشی دەكات لەگەڵ ئەو باس و خواسەدا، واتە: ئێوە كە بڕوا ناهێنن بە ڕۆژی دوایی ئەی بێبڕوایەكان و، گاڵتەی پێدەكەن و، بە سەرسووڕمانەوە باسی دەكەن، دەبووایە پەند وەربگرن لە فیرعەون كە كاتی خۆی مووساشمان نارد بۆ لای فیرعەون و، زۆر ئامۆژگاریی كردو، زۆر بە نەرمیی دواندی، بەڵام بە قسەی نەكردو، سەرەنجام تووشی سزاو جەزرەبە بوو و سەری بە فەتارەت چوو، ئێوەش لە حاڵێك دا كە موحەممەدمان ﷺ وەك دوا پەیامبەرو ڕەوانەكراوی خۆمان نارد بۆ لای ئێوە، كە لێی بەهرەمەند بن و، ئەو هۆشدارییەی پێتان دەداو، ئەو ترساندنەی پێیتان دەترسێنێ، بە جیدیی وەری بگرن، دەرس و پەند و عیبرەت لە فیرعەون وەربگرن و لە جگەلە فیرعەون وەربگرن، كە گوێی بۆ مووسا نەگرت و، سەرەنجام تووشی سزای خوای دادگەر بوو، لە دنیاو لە دواڕۆژدا، دەفەرموێ:

﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴾، (ئەی موحەممەد!) ئایا بەسەرهاتی مووسات قسەو باسی مووسات بۆ هاتوە، (پێت گەیشتوە)؟ لێرەدا خوا زۆر بە كورتیی باسی بەسەرهاتی مووسادا دەكات، لە میانی ئەو دوزادە ئایەتەدا، بەڵام لە سوورەتەكانی دیكەدا بە تایبەتی: (**الأعراف وطه والشعراء والقصص**)دا كە پێشتر هەموویانمان تەفسیر كردوە، ستایش بۆ خوا، خوای پەروەردگار بەدرێژیی باسی بەسەرهاتی مووسا و فیرعەونی كردوە، بۆیە لێرەدا بە كورتیی و گوشراویی و زیاتر شوێنی مەبەست باس دەكات، كە ئەو سەرەنجامەیە فیرعەون تووشی بوو، لەبەر ئەوەی گوێی نەگرت بۆ پەیامەكەی مووسا، ﴿ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴾، كاتێك پەروەردگاری بانگی كرد لە دۆڵی **طوای** پاككراوەدا، لە سوورەتی

(**طه**)شـدا، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾ ﴾، بەدڵنیایـی (ئـەی مووسـا!) تـۆ لـە دۆڵـی بـە پاكگیـراو و خاوێنكـراوە دای كـە نـاوی (**طوی**)یـە، خـوای پـەروەردگار بانگـی كـرد: ﴿ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، بـڕۆ بـۆ لای فیرعـەون، چونكـە ئـەو یاخیـی بـووە، (**طُغْيَان**): بریتیـە لـە: (**تَجَاوُز الحَدِّ فِي العِصْيَان**)، سـنوور بەزانـدن لـە سـەرپێچیی كردنـدا ﴿ فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴾، پێـی بڵـێ: ئایـا ئـارەزووت نیـە خـۆت پـاك و چـاك بكـەی! ﴿ هَل لَّكَ ﴾، تەعبیرێكـی عەرەبییـە بەكاردەهێـنرێ بـۆ دوانـدن بـەو پـەڕی لوتـف و میهرەبانییـەوە، یانـی: (**هَـلْ لَـكَ رَغْبَـة إلى أنْ تَـزَكَّى**)، ئایـا ئـارەزووت هەیـە پـاك و چـاك بی؟ یـان (**هَـلْ لَـكَ الإِسْـتِعْدَاد إلى أنْ تَـزَكَّى**)، ئایـا ئامـادەی خـۆت چـاك و پـاك بكـەی؟ ﴿ وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ ﴾، بـەرەو پەروەردگاریشـت ڕێنماییـت بكـەم و سـام و هەیبەتـی خـوا بچێتـە دڵـت؟ پێشـێ مووسـا عليه السلام بـۆی پێشـنیار دەكات، كـە خـۆی پـاك و چـاك بـكات، دوایـی پێـی دەفەرمـوێ: ئایـا ڕێنماییت بكـەم بـەرەو پـەروەردگارت، بـۆ ئـەوەی ترس و سـام و هەیبەتـی پـەروەردگارت بچێتە دڵـت؟ چونكـە لـە ڕاسـتییدا هیدایەتـی خـوا تەنیـا دەچێتـە دڵ و دەروونێكـەوە پاڵفتە كـرا بـێ، پـاك و چـاك كرابـێ، هـەروەك چـۆن كەسـێك بیـەوێ تۆوێـك لـە زەوی دا بوەشـێنێ، پێشـێ ئـەو زەوییـە دەكێڵـێ و هەڵیدەوێژێـرێ و ئامـادە دەكات، هەروەهـا كەسـێك بیـەوێ ڕەزێـك، باخێـك لـە زەوییـەك دا بنێـژێ، پێشـێ دەبـێ هەڵیبوێژێـرێ و پاكـی بكاتـەوەو ئامـادەی بـكات، بـەڵام بـەو هەمـوو پیـس و پۆخەڵییـەوە، كـە فیرعـەون هەیەتـی ئەگـەر خـۆی پـاك و چـاك نـەكات، نەمامـی، ئیـمان لـە دڵیـدا نانێـژرێ و، تـۆی بـڕواو تەقـوا، لـە زەوی دڵیـدا سـەوز نابـێ!

﴿ فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴾، ئنجـا نیشـانە هـەرە گەورەكـەی پێشـان دا، نیشـانە هـەرە گەورەكـەی مووسـا عليه السلام گۆچانەكـەی بـووە، هەروەهـا دەسـتیشـی بـووە، هەندێكیش دەڵێـن كـۆی ئـەو نـۆ نیشـانەیە بـوون كـە خـوا پێـی داون، وەك دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ ﴿١٠١﴾ ﴾**الإسراء**، كـە ئەمـە هـەم لـە سـوورەتی (**النمـل**) دا هاتـوە، هـەم لـە سـوورەتی (**الإسراء**)یـش دا: نـۆ نیشـانەمان بـە مووسـا دابـوون،

واتە: نۆ بەڵگە، کە هەر کامێکیان بە تەنیا بایی ئیسپاتکردنی دەعوای مووسای دەکرد، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿فَأَرَىٰهُ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ﴾، نیشانە هەرە گەورەکەی پیشاندا، یان لەبەر ئەوەیە کە نۆ نیشانەکان و بەڵگەکان بە یەك بەڵگەو نیشانە دانراون، یاخود مەبەست لە نیشانە هەرە گەورەکە، بەس گۆچانەکەیەتی کە فڕێی دەدا، دەبوو بە حەزیاو ئەژدیهایەکی گەورە، ﴿فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ﴾، بە (ف)ی بەدواداهاتن (تعقیب) هێناویەتی، ﴿فَكَذَّبَ﴾، واتە: یەکسەر دوای ئەوەی مووسا ئەو نیشانە هەرە گەورەیەی پیشاندا، فیرعەون بە درۆی دانا، یانی: مووسای بە درۆ دانا، نیشانەکەی خوای بە درۆی دانا، پەیامی خوای بە درۆی دانا، هەمووی دەگرێتەوە، ﴿وَعَصَىٰ﴾، هەروەها سەرپێچیی کرد، واتە: سەرپێچیی لە مووسا کرد، کە بە دەم بانگەوازەکەیەوە بچێ، سەرپێچیی لە فەرمایشتی خوا کرد، سەرپێچیی لە خوای پەروەردگار کرد، هەموویان دەگرێتەوە، بۆیە هەرکام لە: ﴿فَكَذَّبَ﴾ و ﴿وَعَصَىٰ﴾، بەرکارەکەیان قرتێنراوە، تاکو زیاتر لە واتایەك هەڵبگرن، ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ﴾، دوایی هەر بەو بەوەندەش وازی نەهێنا، کە بە درۆی داناو سەرپێچیی کرد، بەڵکو پشتی هەڵکردو ڕۆیی و هەوڵیشی داو دەستی بە تێکۆشان و خەبات کرد لە دژی مووسا عليه السلام، ﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ﴾، ﴿فَحَشَرَ﴾، دیسان بەرکارەکەی قرتێنراوە، واتە: کۆی کردەوە، بەدڵنیایی خەڵکی کۆ کردۆتەوە، هەندێك لە ڕوونکەرەوان گوتوویانە: (**فَحَشَرَ السَّحَرَةَ**)، جادووگەرەکانی کۆکردنەوە، چونکە لە سوورەتی (**الشعراء**)دا دەفەرموێ: ﴿قَالُوٓاْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾﴾، گوتیان: خۆی و برایەکەی دوابخەو بە شاراندا جارچییان بنێرە، هەر جۆرە جادووگەرێکی شارەزاو زانات بۆ بێنن.

ئنجا ئەوەی ئەوێ دیارە باسی ئەوەیە کە کۆکەرەوانی جادووگەرەکانیان ناردوون، بەڵام لێرە بەدڵنیایی مەبەست پێی جادووگەرەکان نیە، چونکە لێرەدا فیرعەون دەڵێ: ﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾﴾، کۆی کردەوەو بانگی کرد، واتە:

خەڵکەکەی کۆکردەوە، جەماوەری میسری کۆکردەوەو، بانگی کرد، ﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴾ ﴿٢٤﴾، گوتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزترینتانم، ئاشکرایە مەبەستی پێ خەڵکی میسر بووە بە گشتیی، واتە: ئەی خەڵك و جەماوەر! من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم.

﴿ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ﴾، ئنجا خوا سزای تەمبێکەرانەی دواڕۆژو یەکەم (دنیا)ی دا، (أَخْذ) بریتیە لە گرتن، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ سزادان، یانی: (فَعَاقَبَهُم الله عِقَابَ الأخِرَةِ والأولَى)، خوا سزای دواڕۆژو دنیای دا، بۆچی سزای دواڕۆژ پێشخراوە؟ چونکە سزای دواڕۆژ سزای پڕ بە پێستە، بۆ بێبڕوایان، بەڵام سزای دنیا کەم و زوو تێپەڕە.

﴿ نَكَالَ ﴾ یش بریتیە لە: (العُقُوبَة المُنَكِّلَة)، سزایەکی تەمبێکەر، سڵەمێنەرەوە، (العُقُوبَة الَّتِي يُنَكِّلُ بِهَا غَيْرُهُ)، ئەو سزایەی بەسەر کەسێکدا دەدرێ، بەڵام جگەلە ئەوی پێ دەسڵەمێتەوەو دەپرینگێتەوەو تەمبێ دەبێ، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ﴾، بەڕاستیی لەوەدا پەندێکی گەورەو مەزن هەیە، بۆ کەسێك سام و هەیبەتی هەبێ بەرانبەر بە خوا ﷻ.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەو ئاماژە کورتە، بە بەسەرهاتی مووساو فیرعەون، کە شیاوی ئەوەیە پەندو عیبرەتی لێ وەربگیرێ، چ بۆ بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، چ بۆ هی هەموو چاخ و سەردەمەکان، وەك عادەت قورئان بە زۆریی وایە، کە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، دوایی بۆ گەردوون و دەوروبەر، یان جاری وایە سەرنجی بۆ گەردوون و دەوروبەر ڕادەکێشێ دوایی بۆ مێژوو، وەك لە سوورەتی (ق)دا واهاتوە: پێشێ خوا سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ ئاسمان و زەوی و دابارینی ئاو و، ئەو دانەوێڵانەو ڕەزو باخانەی پێی دەڕوێن، دوایی سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، لێرەش دا بە پێچەوانەوە: پێشێ سەرنجی بۆ مێژوو ڕاکێشان، دوایی سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ گەردوون، چونکە لە ڕاستییدا

هەم كتێبی مێژوو، كتێبێكە زۆر دەرس و پەندو عیبرەتی لێوەردەگیرێن، هەم كتێبی گەردوونیش ئەگەر مرۆڤ تێوەی ڕامێنێ، زۆر دەرس و پەندو عیبرەتی تێدا دەخوێنێتەوە، ﴿ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ﴾، ئایا دروستكردنی ئێوە قورسترو زەحمەتترە یاخود هی ئاسمان، وەك چەند جارێكی دیكەش باسمان كردوە، وشەی ئاسمان؟ ئەگەر بە تەنێ بێ (سماء) یاخود بە كۆ بێ ﴿سَمَٰوَٰتٍ﴾، یان بە وشەی حەوت ئاسمانەكان ﴿سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾، هەموویان مەبەست پێیان گەردوونە، یانی: كۆی دروستكراوی خوا ﷻ، زەویش كە باس دەكرێ لە بەرانبەریدا، زەوی شتێكی بچووكە لە نێو گەردووندا، بەلام بە نسبەت ئێمەی مرۆڤەوە زەوی ئەگەر لە ئاسمان گرنگتر نەبێ، كەمتر گرنگ نیە، چونكە ژیانی ئێمە بە زەوییەوە پەیوەستە، بەنسبەت ئێمەوە زەوی ئەوندە گرنگە، ئەگەرنا لە ڕووی قەبارەوە، زەوی شتێكی زۆر بچووكە لە نێو گەردووندا، چونكە زەوی یەكێكە لە نۆ خڕۆكەكەی كە بە دەوری خۆردا دەخولێنەوەو، خۆریش خۆی و نۆ خڕۆكەكەی بە دەوری دالی ڕاوەستاودا دەخولێنەوەو، خۆریش ئەستێرەیەكە لە دوو سەد ملیار ئەستێرە، بە هەندێك سەرژمێریش دەڵێن: یەك تریلیۆن، واتە: هەزار ملیار ئەستێرە، كە لە نێو كەهكەشانی كاكێشاندان، كەهكەشانی كاكێشانیش یەكێكە لە دوو سەد ملیار كەهكەشان، یاخود یەك تریلیۆن كەهكەشان لەوەی هەتا ئێستا هاتۆتە بەرچاوی دوور بینەكان و دەبینرێ.

خوا دەفەرموێ: ئایا دروستكرانی ئێوە قورسترە یاخود ئاسمان؟ ﴿بَنَىٰهَا﴾، بنیاتی ناوە، دروستیكردوە، ﴿رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا﴾، (سَمْك)، واتە: بەرزیی و ئەستووریی، بەرزییەكەی، زۆر بەرز كردەوە، وەك لە سوورەتی (**الرحمان**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ۝٧﴾، لەوێدا كورتە باسێكمان كردوە لە بارەی فراوانیی و بەرزیی گەردوونەوە، ﴿فَسَوَّىٰهَا﴾، ڕێكیخستوە، یانی: ئاسمان و گەردوونی زۆر باش، ڕێكخستوەو چاكی كردوە، هەر شتێكی لە شوێنی خۆیدا داناوە، ﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا﴾، شەوەكەی تاریك داهێناوەو،

ڕووناكییەكەشی دەرهێناوە، ئەمە وەك دوایی باسی دەكەین، ئیعجازێكی زانستیی تێدایە، چونكە پێشتر وازانراوە وەك چۆن بۆ ئێمە كاتێك ڕۆژ دەبێتەوە، دنیا ڕووناكە، وایانزانیوە گەردوون هەمووی وایە، بەڵام لە دەرەوەی بەرگە هەوای زەوی، هەرچەندە ئەستێرەكان وەك تیشكێكی باریك دەبینرێن، بەڵام گەردوون هەمووی تاریكە، مەگەر لە ئەستێرەكان نزیك ببینەوە، كە هەمووی تەقینەوەی نێوەكییە، ئەگەرنا ئێمە بەس بە هۆی بەرگە هەواوە دنیامان بۆ ڕووناكەو، هەر شوێنێك بەرگە هەوای لێ نەبێ، تیشك ناشكێتەوەو كە تیشكیش نەشكاوەیە، دنیا ڕووناك دانایە، بەڵكو تیشكەكە وەك دەزوویەك و گوللەیەك دەڕوات.

﴿وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾ دوای ئەوە زەویشی پانڕاخستوە، ئەمەش وەك دوایی باسی دەكەین، دەقە لەو بارەوە كە دوای دروستبوونی ئاسمان، دوای دروست بوونی گەردوون، ئنجا خوا زەوی لە نێو گەردوون دا دروست كردوە، چونكە زەوی و هەموو كۆمەڵەی خۆر لە خۆر جیابوونەوە، هەروەك چۆن مانگ لە زەوی جیابۆتەوە، بۆیەش بێگومان پێشێ دەبی خۆر بووبێ، ئنجا دوایی زەوی دروست بووبێ، هەروەك پێشێ زەوی بووە، ئنجا مانگیش دروست بووە، چونكە هەندێك لە زانایان پێشێ، وایانزانیوە زەوی پێش ئاسمان دروست بووە! بەڵام بە پێی گەردوونناسیی نوێ زەوی بەشێكی بچووكە لە نێو ئاسمانداو، دوای ئەوەی گەردوون دروست بووە، ئنجا لە نێوی دا زەوی دروست بووەو، زانایان بە مەزەندە دەڵێن: مێژووی زەوی دەگەڕێتەوە بۆ چوار ملیارو هەشتسەد ملیۆن ساڵ، یان حەوتسەد ملیۆن ساڵ و، تەمەنی خۆر دەگەڕێتەوە بۆ پێنج ملیار ساڵ، بەڵام تەمەنی گەردوون دەگەڕێتەوە بۆ سێزدە ملیار و حەوتسەد، یاخود هەشتسەد ملیۆن ساڵ، لەمەوبەر، ﴿دَحَىٰهَآ﴾، یانی: (بَسَطَهَا وَوَسَّعَها ومَهَّدَهَا)، فراوانی كردو لێكیكێشایەوەو ئامادەی كرد، ﴿أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا﴾، هەم ئاوەكەی لێ دەرهێناو، هەم لەوەڕگایەكەی لێ دەرهێنا، گژو گیاو لەوەڕو ڕووەكی لێ دەرهێنا، ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا﴾، چیایەكانیشی چەسپاندن و

داکوتان لە زەویدا، بێگومان داکوترانی چیایەکانیش لە زەویدا پێش هاتنەدەری ڕووەك و گژوگیاو لەوەڕو زەمەند بووە لە زەوی دا، بەڵام خوای پەروەردگار لە باسکردن دا خستوویەتە دوایە، چونکە ئەوەی بۆ ئێمەی مرۆڤ زیاتر گرنگە ئاوەو، لە دوای ئاویش ڕووەکە، ﴿مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾، ئەوەش هەمووی وەك بەهرە پێدانێکە لە لایەن خوای بەخشەرەوە بۆ ئێوەو بۆ ئاژەڵانتان، یانی: هەم ئاژەڵانتان، هەم ئێوە بەبێ ئاوو سەوزایی و ڕووەك و دارو درەخت ژیانتان نابێ.

ئەمەش ئەو حەوت ئایەتەی خوای پەروەردگار کە، چەند دیاردە و دیمەنێکی گەردوون و دەوروبەری تێدا خستنە بەرچاومان.

کەواتە: ئەی ئەوانەی نکووڵیی دەکەن لە هاتنی ڕۆژی دوایی! خوایەك کە ئەو گەردوونەی بەو شێوە خوڵقاندوە، ئەو ئاسمانەی بەو بەرزییە ڕێکیخستوەو، ئاوا شەوەکەی تاریك داهێناوەو، تیشکەکەی لێ دەرهێناوەو، بەو شێوەیە زەوی پانڕاخستوەو، ئاوی شیرینی تێدا پەیدا کردوەو، لەوەڕگایەکانی لێ پەیدا کردوون و، چیایەکانی تێدا داکوتاون، خوایەکی ئاوا ﷻ دەتوانێ زیندووتان بکاتەوەو لێی عاسێ نابن و، ناشگونجێ زیندووتان نەکاتەوەو سزاو پاداشتتان نەداتەوە، لە حیکمەت و ڕەحمەت و کەرەم و دادگەریی ئەو خوایە ﷻ زۆر دوورە مرۆڤەکان بخوڵقێنێ و، دوایی وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچن و سزاو پاداشتیان نەداتەوە!

دوایی جارێکی دیکە خوا دێتەوە سەر باسی ڕۆژی دوایی: ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾، ئنجا هەر کاتێك ڕووداوە هەرە گەورەکە هات، ﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾، دەگوترێ: (**طَمَّ الـوَادِي**)، واتە: دۆڵەکە پڕ بوو، (**طَمَّةٌ: أي غَلَبَةٌ**)، بەسەریدا زاڵ بوو، (**طَمَّ البَحْرُ وَهُو مَطمُوم**)، دەریایەکە زاڵ بوو بەسەر هەموو ئەو شتانەی لە دەورو بەریدان، کەواتە: ﴿ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾، یانی: ئەو ڕووداوە هەرە گەورەئەی زاڵ دەبێ بەسەر هەموو شتێکدا، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، ئنجا چ مەبەست پێی قۆناغی یەکەمی بێ، کە ئاخیر زەمانەو تێکچوونی گەردوونە، چ قۆناغی دووەمی بێ، کە قیامەت و هەڵسانەوەیە، ﴿يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ﴾، ئەو

ڕۆژەی مـرۆڤ وەبیـری دێتـەوە، چـی کـردوەو هەوڵـی بۆچـی داوە! ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴾، دۆزەخیش ڕانوێنراو هێنرایە پێشـەوە بـۆ کەسێك ببینێ، ﴿ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴾، (أَمَّا)، (حَرْف تَفْصِيْلٍ)، پیتی ڕوونکردنەوەیـە، ئنجا هـەر کەسێك یاخیـی بـوو بێ، لـە سـنوور دەرچووبێ لەسـەرپێچیی کردنـدا، ﴿ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾، ژیانـی دنیاشـی هەڵبـژارد بـێ بەسـەر ڕۆژی دواییـدا، ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾، بـە دڵنیایـی کڵپـەی دۆزەخ سرەوتگایەتـی، یـانی: ئـەو شـوێنەی تێیـدا دەسرەوێ و پشـووی و تێدا دەدا، ئەوێیـە، ئەگـەر شـوێنێك هەبـێ تێیـدا بحەوێتـەوەو بـسرەوێ و پشـوو بـدات، هـەر دۆزەخـە.

﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴾، بـەڵام کەسـێك لـە پێگـەی پـەروەردگاری بترسـێ، یاخـود: لـە وەسـتانی پـەروەردگاری بترسـێ لـە ڕۆژی دواییـدا، بـۆ سـزاو پاداشـت دانـەوەی مرۆڤـەکان، یاخـود: لـە وەسـتانی خـۆی لـە بـەردەم پەروەردگاریـدا بتـرسێ، ﴿ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴾، خـودی خۆیشـی بگێڕێتـەوە لـە ئـارەزووەکان، واتـە: لـە ئـارەزووە ناشـەرعیی و ناڕەوایـەکان، ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾، بـە دڵنیایـی بەهەشـت جێـگاو سرەوتـگای ئـەو کەسـەیە، بەهەشـت ئـەو شـوێنەیە کـە تێیـدا دەحەوێتـەوەو سـەقامگیر دەبـێ.

ئنجـا خـوا ﷻ لـە پێنـج ئایەتـی کۆتاییـدا، ڕوو لـە پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ دەکات، کـە زۆرجـار بێبڕوایـەکان هەڵیـان دەپێچـا: ئایـا ئـەو قیامەتـەی تـۆ باسـی دەکـەی، یـان ئـەو ئاخیـر زەمانـەی تـۆ دەڵێـی، کەنگـێ دێ؟ دەفەرمـوێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴾، پرسـیارت لـێ دەکـەن لەبـارەی کاتەکـە (سـاعَة)وە کەنگـێ کاتـی لەنگـەر گرتنەکەیەتـی؟ ﴿ مُرْسَىٰهَا ﴾، چاوگـی میمییـە بـە مانـای (رُسُوّ)، لەنگـەر گرتـن، یـانی: کەنگـێ دەوەسـتێ و لەنگـەر دەگـرێ؟ یاخـود: (مُـرْسى) بـە مانـای شـوێنی لەنگـەر گرتنـە، یاخـود بـە مانـای کاتی لەنگەرگرتنـە، وشـەی: ﴿ ٱلسَّاعَةِ ﴾ش لێـرەدا دەگونجـێ بـە مانـای کـۆی ڕۆژی دوایـی بـێ، دەشـگونجێ بـە مانـای ئاخیـر زەمـان بـێ، قۆناغـی یەکەمـی ڕۆژی دوایـی، کـە دوای فـووی یەکـەم بەکەڕەنـادا، دێتـە دێ،

یاخـود مەبەسـت پێـی قۆناغـی دووەمـی بـێ، کـە لـە دوای فـووی دووەم بـە کەڕەنـادا، دێتـە دی، کـە قیامەتـە، چونکـە وشـەی: ﴿ٱلسَّاعَةِ﴾، بـۆ ئاخیـر زەمـان بـەکاردێ، بـەڵام زۆرجاریـش بـۆ ڕۆژی دوایـی بەگشـتیی بـەکاردێ و، هەندێـك جاریـش تەنیا بـۆ قیامـەت بـەکاردێ، بـەڵام بـە زۆریـی بـۆ کاتـی کۆتایـی هاتنـی ژیانـی دنیـاو گـەردوون بەکارهاتـوە، ﴿فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ﴾، خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: تـۆ چ پەیوەندییەکـت هەیـە بـە باسـکردنیەوە، یانی: کـەی ئـەوە ئیشـی تۆیـە، بزانـی ڕۆژی دوایـی کەینـێ دێ؟ یاخـود: ئاخیـر زەمـان کـەی دێ؟ یـان قیامـەت کـەی دێ؟ ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ﴾، کۆتاییەکـەی واتـە: زانیاریـی هەبـوون بـە کۆتایـی، ئـەو ڕۆژە کـە کـەی دێ و لەنگـەر دەگـرێ؟ بـۆ لای پەروەردگارتـە، واتـە: کۆتایـی هاتنـی ئـەو ڕۆژەو زانیاریـی هەبـوون لـەو بـارەوە، پەیوەسـتە بـە پەروەردگارتـەوە، ئـەدی ئایـا ئەرکـی پێغەمبـەری خـوا چییـە ﷺ؟ ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا﴾، بێگومـان تـۆ تەنیـا ترسـێنەرو وریاکـەرەوەی ئـەو کەسـەی، لێـی بترسـێ و سـام و هەیبەتـی بەرانبـەری هەبـێ، ئەرکـی تـۆ بـەس ئەوەیـە، ئەرکـی تـۆ ئـەوە نیـە، بڵێـی: قیامـەت فڵانـە ڕۆژێ دێ و، فـڵان ڕۆژێ ئـەو دنیایـە تێکدەچـێ، مـرۆڤ پەکـی لەسـەر ئەوە نەکەوتـوە، بزانێ کـەی دنیـا تێـك دەچـێ؟ چونکـە ئەگـەر ئـەوەش نازانـێ کـەی ئاخیـر زەمیـن دێ، کـەی کۆتایـی بـە ژیانـی مـرۆڤ دێ لەسـەر زەوی، هـەر دڵنیایـە کـە بـە مسـۆگەریی کاتێـك دێ، کۆتایـی بـە ژیانـی دنیـای دێ، کەواتـە: بـا بزانـێ چـۆن ژیانەکـەی بـەڕێ دەکات! چونکـە ئەگـەر کۆتایـی هەمـوو ژیانـی خەڵکـی سـەر زەوی لـێ دیـار نەبـێ، کـە لـە ئاخیـر زەمانـدا دێتـە دی، کۆتایـی ژیانـی خـۆی هـەر لـەلای مسـۆگەرە، کـە مردنییەتـی بۆیـە دەفەرمـوێ:

﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا﴾، ئـەو ڕۆژەی دەیبینـن وەك تەنیـا ئێوارەیـەك، یاخـود چێشـتەنگاوێك مابنـەوە، ﴿عَشِيَّةً﴾، بریتیـە لـەو کاتـەی ڕۆژ لـە نێـوە ڕاسـتی ئاسـمان لادەدا، تاکـو ئـاوا دەبـێ، دوای نیـوەڕۆ تاکـو شـێوان، **(ضحـى)** ش بریتیـە لـەو کاتـەی خـۆر هەڵـدێ، هەتـا خـۆر دەگاتـە نێوەڕاسـتی ئاسـمان،

واتـە: چێشـتەنگاو، یاخـود پێشـنیوەڕۆ، کاتێـك کاتەکـە (ساعَة) دەبینـن، وەك تەنیـا دوای نیوەڕۆیـەك، یاخـود پێـش نیوەڕۆیـەك مابنـەوە، ﴿لَمْ يَلْبَثُوٓا۟﴾، (لَـمْ يَمْكُثُوا لَـمْ يَبْقُـوا)، وەك نەمابنـەوە لـە دنیـاداو نەیانگوزەراندبـێ، تەنیـا دوای نیوەڕۆیـەك، یـان پێشـنیوەڕۆیەك، ئـەوەش حەقیقەتێکـی زۆر مەزنـە کـە ئێمـەی خەڵکـی سـەر زەوی پێوەرمـان بـۆ کات، پەیوەسـتە بـە جووڵـەی زەوی بـە دەوری خۆیـدا لـە بەرانبـەر خـۆردا، کـە شـەو و ڕۆژ پەیـدا دەکات و، بـە خێرایـی سی (٣٠) کـم لـە خولەکێکـدا، هەروەهـا جووڵـەی زەوی بـە دەوری خـۆردا کـە بـە خێرایـی (٣٠کـم/ چرکـە)، واتـە: شەسـت هێنـدە خێرایـی خولانـەوەی بـە دەوری خۆیدا خێراتـرو، لە ئەنجامـی ئەوەش دا، هـەم شـەو و ڕۆژمـان بـۆ دروسـت دەبـن، هـەم سـاڵمان بـۆ دروسـت دەبـێ.

کەواتـە: کاتـی ئێمـەی خەڵکـی سـەر زەوی، بریتیـە لـە شـەوو ڕۆژ و، شـەو و ڕۆژەکانیـش، هەفتـە پێـك دێنـن و، هەفتـەکان مانـگ پێکدێنـن و، مانگەکانیـش سـاڵ و، ساڵەکانیش تەمەنـی مـرۆڤ پێکدێنـن، بـەڵام کاتێـك مـرۆڤ ئـەم ژیانـە زەمینییـەی بەجـێ دێڵـێ و دەچێتـە دەرەوەی چوارچێـوەی زەوی، لـەوێ کات (زمـن) چەمکێکـی دیکـە پەیـدا دەکات، هـەر ئێسـتاش کاتێـك ئێمـە لـەم ژیانـە دنیاییـەش دایـن، ئێسـتا هەندێـك لـە خڕۆکـەو ئەسـتێرەکان، کات لـە ئـەوان دا چەمکێکـی دیکـەی هەیـە، خڕۆکـە هەیـە بـە ملیۆنێـك سـاڵ جارێـك بـە دەوری خۆیـدا دەخولێتەوە، کاتێـك زەوی ئێمـە لـە بیسـت و چـوار سـەعاتدا جارێـك بـە دەوری خۆیـدا دەخولێتـەوە، کەواتـە: شـەوو ڕۆژی ئـەوان ملیۆنێـك سـاڵە، هـی ئـەو خڕۆکەیـە ئـەو ئەسـتێرەیە، بـەڵام لـە ڕۆژی دواییـدا، یـان دوای جیابوونـەوەی ڕووح لـە لاشـە، کات واتایەکـی دیکـەی بـۆ پەیـدا دەبـێ و، وادیـارە لـەو کاتـەدا کات دەوەسـتێ و، ئێمـە ئێسـتا مەحکوومـی خولانـەوەی زەوی و شـەوو ڕۆژ بـە دوای یەکداهاتنـی زەوییـن، جەستەکەشـمان دیـارە لـە خاکـی سـەر زەوی پێکهاتـوەو، مەحکوومـی ئـەو یاسـا فیزیایـی و کیمیایـی و بایۆلۆجییانەیـە کـە خـوای پـەروەردگار بـۆ دروسـتکراوەکانی سـەر زەوی دایناون، بـەڵام کاتێـك ڕووحمان لـە جەسـتەی خاکییـمان دێتـەدەرو، دەچێتـە قۆناغـی بـەرزەخ

و دواتریش دەگوازێتەوە بۆ قۆناغی قیامەت، کات ئەو چەمکەی ئێستا دەیزانین، نایمێنێ، بۆیەش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: وەك دوای نیوەڕۆیەك، یاخود چێشتەنگاوێك مابنەوە، لە شوێنێکی دیکەش لە سوورەتی (**طه**)دا دەفەرموێ: هەیانە دەڵێ: سەعاتێك ماوینەوەو هەیانە دەڵێ: ڕۆژێك ماوینەوە، لە سوورەتی (**الروم**)یش دا، دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾﴾، ئەو ڕۆژەی قیامەت ڕادەبێ، تاوانبارەکان سوێند دەخۆن تەنیا یەك سەعات ماونەوە، چونکە تەماشای ڕۆژی دوایی دەکەن، کات لەوێ تێناپەڕێ و وەستاوەو، کە ژیانی دنیایان دێتەوە بیر دەڵێن: ژیانی دنیامان لە چاو هی ئێرە، تەنیا سەعاتێك بووە، یان هەر تۆزێك بووە.

خوا بە لوتفی کەرەمی خۆی وامان لێ بکات، قەدری ئەم ژیانە دنیاییەمان بزانین و، قەدری ساڵ و مانگ و هەفتەو ڕۆژ و خولەك و چرکەکانی تەمەنمان بزانین بزانین چۆن بەڕێیان دەکەین، تاکو کاتێك ئەم ژیانە دنیاییەو، جەستەکەمان ئەم پۆشاکە خاکییە ئەم بەرگە خاکییە، جێ دێڵێ و دەچێتە قۆناغی بەرزەخ، پاشان دەچێتە قۆناغی قیامەت، لەوێ سەر بەرز بین و ڕوو سوور بین و بڵێین: خوایە! ژیانەکەمان بەو شێوەیە بەڕێ کرد کە تۆ پێت خۆشەو، شەریعەتی تۆ بۆی دیاری کردبووین.

دیارە ئەویش بەهۆی زیاتر بەهرە وەرگرتن لە قورئان، لە کۆتا فەرمایشتی خوا بۆ مرۆڤەکان و، بەهۆی پەیڕەویی کردن لە ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە بێگومان ژیانی پێغەمبەری خاتەم و ڕێبازەکەیشی، هەر بریتیە لە جێبەجێکردنی قورئان لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی خۆیدا.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

سوێند خواردنی خوا ﷻ بە فریشتەكان كە بە توندیی گیانی بێبڕوایان دەكێشن و، بە نەرمیی هی بڕواداران و، بە خێرایی بە هەوادا دەڕۆن و، پێشبڕكە دەكەن و، سەرپەرشتیی كارەكان دەكەن و، باسی لەرزینەوەی زەوی دوای فووی یەكەم و بەدواداهاتنی فووی دووەم و، دڵ وەتەپە تەپ كەوتنی بێبڕوایان و، چاو كزو مات بوونیان و، نكووڵییكردنیان لەوەی زیندوو بكرێنەوەو، وەڵام درانەوەیان: كە ئەوە تەنیا یەك تیوە خوڕینی دەوێ و، یەكسەر هەموویان دێنە مەیدانی كۆكرانەوەوە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَإِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَإِذَا كُنَّا عِظَامًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا ﴿٥﴾﴾، پێشتریش لە مانا گشتییەكەی دا تیشكمان خستە سەر ئەو پێنج سوێندە، كە زانایان زۆر لە بارەیانەوە مشت و مڕیان بووە، كە ئایا:

١- مەبەست لەو پێنج سوێندە، پێنج شتن، شتی سەربەخۆو جیا جیا.

٢- یاخود یەك شتن.

٣- یاخود شتی جۆراو جۆرن و مەرج نیە، هەر كامێكیان شتێكی سەربەخۆ بێ، بە گشتیی ئەو سێ ڕایە هەن، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: ئەو پێنج شتەی خوا سوێندی پێ خواردوون، هەموویان یەك شتن و فریشتەكانن.

منیش لە مانای دەقاو دەقەكەی و لە مانا گشتییەكەشیدا، هەر ئەو مانایەم وەرگرتوە.

ڕایەكانیان بەم شێوەیەن:

١- هەندێكیان دەڵێن: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا ١ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ٢﴾، مەبەست پێیان فریشتەكانن.

بەڵام: ﴿وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ٣ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ٤﴾، مەبەست پێیان جەنگاوەرانن.

﴿فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ٥﴾یش زۆربەی هەرە زۆریان دەڵێن: مەبەست پێی فریشتەكانن.

ئەوە ئەگەر شتی جۆراو جۆر بن.

٢- ئەگەر یەك شتیش بن، زۆربەی زانایان دەڵێن: فریشتەكانن.

٣- هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست پێیان ئەستێرەو خڕۆكەكانن.

٤- هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست پێیان وڵاخی جەنگاوەرانن.

٥- هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست پێیان تیر هاوێژەكانن كە لە ڕێی خوادا جەنگ و جیهاد دەكەن.

بەڵام ئەوەی ئێمە زیاتر پەسەندمان كرد، ئەوەیە كە مەبەست پێیان فریشتەكانن.

(الطبري) لە بارەی: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ﴾ەوە، دەڵێ: (**إِنَّ اللَّـهَ تَعَالَى ذِكْرُهُ أَقْسَمَ بِالنَّازِعَاتِ غَرْقًا، وَلَمْ يُخَصِّصْ نَازِعَةً دُونَ نَازِعَةٍ، فَكُلُّ نَازِعَةٍ غَرْقًا، فَدَاخِلَةٌ فِي قَسَمِهِ،**

**مَلَكاً كَانَ أَوْ مَوْتاً، أَوْ نَجْماً، أَوْ قَوْساً، أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ**)، دوایی لە بارەی: ﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ٢ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ٣ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ٤﴾یشەوە، هەروا دەڵێ، بەڵام لە بارەی: ﴿فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ٥﴾ەوە، لە (**قتادة**)ەوە بە ژمارە: (٣٦٣٠٧) دەیهێنێ: کە مەبەست پێیان فریشتەکانن، (**الطبري**) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] ئەو ڕایانە دێنێ.

واتە: خوا سوێندی خواردوە بە: (**النَّازِعَاتِ غَرْقاً**) (**نَازِعة**)یەکیشی لە (**نَازِعة**)یەکی دیکە جیا نەکردۆتەوە، کەواتە: هەموو ئەوانەی ئەو سیفەتەیان بەسەردا بچەسپێ (**نازعة غَرْقاً**)، فریشتە بن، یاخود مردن بێ (هەندێکیان وایان لێکداوەتەوە) ئەستێرە بێ، یان کەوان بێ، یان جگەلەوانە، هەموویان دەگرێتەوە، هەروەها: ﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ٢ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ٣ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ٤﴾یش بەهەمان شێوە.

بەڵام پێشتریش گوتمان ئەو ڕایەمان زیاتر پێ ڕاستە، کە مەبەست لە هەر پێنجیان فریشتەکانن.

**١)-** ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا﴾، سوێند بەو فریشتانەی دەردەکێشن، (**ملائكة المَوْت تَنْزِع الأرْوَاح مِنَ الأجْسَاد، غَرْقاً مَصْدَر مُؤَكِّد بِحَذْف الزَّوَائِد أي: إغْرَاقاً وَتَشدِيداً فِي النَّزْع**)، واتە: سوێند بەو فریشتانەی ڕووحەکان لە جەستەکان وەردەگرن بە وەرگرتنێکی توند، وشەی ﴿غَرۡقٗا﴾ یش چاوگی جەختکەرەوەیە، دوای ئەوەی زیادەکانی لێ قرتێنراون، واتە: زۆر بە قووڵیی و بە توندیی لە وەرگرتندا وەردەگرن.

**٢)-** ﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا﴾، سوێندیش بەو فریشتانەی بە نەرمیی و ئەسپایی ڕووحی بڕواداران لە جەستەکانیان دەردێنن. (**النَّشْطُ: الجَذْبُ، وَالخُرُوجُ والإخْرَاجُ بِرِفقٍ وَسُهُولَةٍ، وَحَلُّ العُقْدَةِ**)، (**نَشْط**): بە مانای ڕاکێشان و هاتنەدەرو دەرهێنانی بە نەرمیی و ئاسانیی، هەروەها (**نَشْطُ**) بە کردنەوەی گرێش دەگوترێ، (**أُنْشوطَة**)ش گرێیەکە بە ئاسانیی

---

(١) ج١٥، ص(٣٠-٣٣).

بکرێتەوە، دەگوترێ: (نَشَطَ يَنْشِط أي: خَرَجَ يَخْرُج)، کەواتە: ﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا﴾، واتە: سوێند بەو فریشتانەی بە نەرمیی و هێواشیی ڕووحیی بڕواداران لە جەستەکانیان دەردێنن.

٣)- ﴿وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا﴾، سوێند بەو فریشتانەی مەلە دەکەن، بە مەلە کردن، پێشتریش گوتمان: (السَّبْحُ: السَّيْرُ السَّرِيْع فِي الـمَاء و فِي الهَوَاء)، (سَبْح): بریتیە لە ڕۆیشتنی خێرا لە نێو ئاوداو لە نێو هەوادا، (والسَّبْحُ: الإسْرَاع فِي الحَرَكَة)، (سَبْح): بریتیە لە خێراییکردن لە جووڵەدا، مەرج نیە مەلەی نێو ئاو بێت، یاخود مەلەی نێو هەوا بێ، بەڵام بە زۆریی وایە ئەوەی بە نێو ئاودا دەڕوا، بە خێرایی دەڕوا، هەروەها ئەوەی بە نێو هەوادا دەفڕێ، مەل و باڵندە، بە خێرایی دەڕۆن، لەوەوەش (سَبْح) بەکارهێنراوە بۆ هەر ڕۆیشتنێکی خێرا، بێگومان فریشتەکانیش زۆر بە خێرایی دەڕۆن.

٤)- ﴿فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا﴾، ئنجا سوێند بەو فریشاتانەی پێش دەکەون بە پێشکەوتن.

٥)- ﴿فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا﴾، ئنجا سوێند بەو فریشتانەی کاروبار بەڕێوە دەبەن، (المَلَائِكَة المُدَبِّرُوْن لِلأمُوْر الموْكُوْلَة إلَيْهِم)، ئەو فریشتە سەرپەرشتیارو بەڕێوەبەری کاروبارانەی، ئەو کاروبارانەی پێیان سپێرراون، بەڕێوەیان دەبەن و مشووریان دەخۆن.

چۆنیەتیی پێکەوە پەیوەست بوونی ئەو سوێندانەش بەمجۆرەیە: سوێند بەو فریشتانەی ڕووحی بێبڕوایان و تاوانباران بە توندیی دەردەکێشن لە جەستەکانیان و، سوێند بەو فریشتانەی ڕووحی بڕواداران و چاکەکاران بە نەرمیی و بە هێواشیی لە جەستەکانیان دەردێنن، هەروەها سوێند بەو فریشتانەی بە خێرایی دەڕۆن، دوای ئەوەی ڕووحەکانیان وەرگرتوون، وەك پێش یەکدیی بکەونەوە، ئاوا پێش دەکەونەوە، وەك پێشبڕکەیان بێ، یاخود: ڕووحەکان پێش دەخەن، بەرەو بەهەشت، ئەگەر چاکەکاربن، یان بەرەو دۆزەخ، ئەگەر خراپەکار بن، یاخود: ئەو فریشتانەی پێش شەیتانەکان دەکەونەوەو شەیتانەکان ناتوانن هەر توخنیان بکەون، ئنجا سوێند بەو فریشتانەی دوایی کاروباری ئەو ڕووحانەی

کێشاویانن، بەڕێوە دەبەن و، جگە لە کاروباری ڕووحەکانیش، هەر کارێك خوا پێی سپاردوون، بەڕێوەی دەبەن. وەڵامی سوێندەکانیش وەك پێشتریش باسمان کرد، باس نەکراوە، بەڵام بە سیاق دەزانین، چونکە سوورەتەکە بە زۆریی باسی قیامەت و زیندووبوونەوەو ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشتە، کەواتە: سوێند بەو پێنج کۆمەڵە لە فریشتەکان، کە ئەو کارانە دەکەن، ئێوە زیندوو دەکرێنەوەو سزاو پاداشت دەدرێنەوە، دوایی کە دەفەرمویّ: ﴿ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ۝٦ تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ۝٧ قُلُوبٞ يَوۡمَئِذٖ وَاجِفَةٌ ۝٨ أَبۡصَٰرُهَا خَٰشِعَةٞ ۝٩ ﴾، دەلالەت لەسەر سوێند لە سەر خوراو (**مُقْسَم عَلَيْه**)ەکە دەکات، یانی: وەڵامی سوێندەکە، چونکە دەفەرمویّ: ئەو ڕۆژەی لەرزینەوەکە دەلەرزێتەوە، دوایی شوێنکەوتووەکەی بە دوادا دێ، لەو ڕۆژەدا دڵانێك هەراسان و بە تەپە تەپن و، چاوەکانیان (چاوی ئەو خاوەن دڵانە)، مات و بە ترس و لەرزن، کە مەبەست بێبڕوایانن.

٦)- ﴿ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴾، ئەو ڕۆژەی لەرزیوەوە دەلەرزێتەوە. وشەی: (**الرَّجْف**) بە مانای: (**إضْطِرَاب**) دێ، واتە: لەرزینەوەو هەژان و تێکەوە ڕاشەقێنران، زانایان بە دوو جۆر ئەم ئایەتەیان لێکداوەتەوە:

أ- (**الطبري**) لە (**إبن عباس**)ەوە بە ژمارە: (٣٦٣٠٩) هێناویەتی، دەڵێ: (**الرَّاجِفَة: النَّفْخَةُ الأولَى، والرَّادِفَة: النَّفْخَة الثَّانِية**)، (**رَاجِفَة**) (لەرزینەوە) فووی یەکەمەو (**رَادِفَة**)، (بەدواداهاتوو) فووی دووەمە، کە لەلایەن فریشتەیەکەوە بە کەڕەنادا دەکرێ، لە لایەن ئەو فریشتەیەوەی بۆ ئەوکارە تەرخانکراوەو ناوی بە ئیسڕافیل هاتوە.

هەروەها (**الطبري**) لە (**الحسن البصري**)یەوە بە ژمارە: (٣٦٣١١)، هێناویەتی، دەڵێ: (**هُمَا النَّفْخَتَانِ: أَمَّا الْأُولَى فَتُمِيتُ الْأَحْيَاءَ، وَأَمَّا الثَّانِيَةُ فَتُحْيِي الْمَوْتَى؛ ثُمَّ تَلَا الْحَسَنُ:** ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ۝٦٨ ﴾).

واتـە: (**الحسـن البصري**)یـش ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ، هـەروەك عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازبـێ)، هەمـان بۆچوونـی هەیـەو دەڵـێ: مەبەسـت دوو فووەکانـە، کـە بـە کەڕانـادا دەکرێـن، فـووی یەکـەم هەرچـی ژیانـدارە دەیمرێنـێ، (هەرچـی خـاوەن ژیانـە، لـە ئەنجامیـدا هەموویـان دەمـرن) و، لـە ئەنجامـی فـووی دووەمـدا مـردووان زینـدوو دەبنـەوە، دوایـی حەسـەنی بەصڕایـی ئـەو ئایەتـەی سـووڕەتی (**الزمـر**)ی خوێنـدەوە، کـە ئـەم ئایەتـەی ئێـرە و ئـەو ئایەتەی سـووڕەتی (**الزمـر**)، بـە پێـی زانیاریـی مـن تاکـە دوو ئایەتێکـن لـە قوڕئانـدا، باسـی هـەردوو فـووەکان بـە ڕوونیـی و ڕاشـکاویی بکـەن، ئایەتەکـەی سـووڕەتی (**الزمـر**)، دەفەرمـوێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ٦٨﴾، فـووی بـە صـووڕدا کـرا، ئنجـا هـەر کـەس لـە ئاسـمانەکان و زەوی دا هەیـە، جگـە لـەوەی خـوا بیـەوێ، هەموویـان مـردن، [یـان: هەموویـان لـە هـۆش خۆیـان چـوون] دوایـی فووێکـی دیکـەی پێـدا کـرا، یەکسـەر هەموویـان ڕاوەسـتا بـوون، چاوەڕێیـان دەکـرد.

هـەروەك چـۆن لێرەش دەفەرمـوێ: ﴿يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ٦ تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ٧﴾، ئـەوە ڕایەکـی زانایانـە کـە: (**الرَّاجِفَـةُ والرَّادِفَةُ**)یـان بـە دوو فـووەکان کـە بـە کەڕانـادا کـراون، لێکدەدرێتەوە.

**ب-** ڕایەکی دیکەش هەیە، کە: (**الرَّاجِفَةُ هِيَ الأَرْض المُضْطَرِبَة**)، واتە: ئەو زەوییەی دەهەژێ و دەلەرزێتەوە، لە ئەنجامی فوو پێدا کردنی یەکەم بە کەڕەنادا، کە مەبەست پێی هاتنی ئاخیر زەمانە.

**٧)**- ﴿تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ﴾، بەدوادا هاتووش شوێنی دەکەوێ، مەبەست لە (**الرادِفَة**) ئاسمانەکانن، ئەوانیش بە دوای زەوی دا دەلەرزنەوەو دێن و دەچن و، ئەو حاڵەتەی ئێستا هەیانە، نایانمێنێ.

ئـەو دوو ڕایـەش هـەر تێکهەڵکێش دەبنـەوە، چونکـە لـە ئەنجامـی فـووی یەکـەم بـە کەڕەنـادا، زەوی و ئاسـمانەکانیش ئـەو حاڵەتـەی ئێسـتایان نامێنـێ و، لـە ئەنجامی

فووکردنـی دووەم دا، - وەك ئایەتـی (٦٨)ی سـوورەتی (الزمـر)، ئامـاژەی پێـداوە - قیامـەت و هەڵسـانەوەو زینـدوو کرانـەوە، دێتـە پێـش.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەو ڕۆژە دەکات:

٨)- ﴿ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴾، دڵانێك هەن لەو ڕۆژەدا هەراسان و بێزارو بە ترس و لەرزن، (**الوَجْفُ: الإضْطِرَابُ، وَجَف وَجْفَاً وَوَجِيْفَاً وَوُجُوفَاً: اضْطَرَب**)، (**وَجْف**)، یانی: هەژان و ڕاتەکێنران و لەرزین، (**وَجْفَاً وَوَجِيْفَاً وَوُجُوفَاً**)، ئەوانە هەر سێکیان چاوگن، یانی: (**اضْطَرَب**)، لەرزیی و ڕاتەکێنرا، دلآنێك لەو ڕۆژەدا هەراسانن و بە تەپە تەپن.

٩)- ﴿ أَبْصَـٰرُهَا خَـٰشِعَةٌ ﴾، چاوەکانیان زەبوون و ملکەچن، یانی: چاوەکانی خاوەنی دڵەکان، (**خُشُوُع**) لە ئەصڵدا بریتیە لە زەبوونیی و ملکەچیی، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە چاوەکان زەبوون و ملکەچن، واتە: چاوەکان ماتن و پڕترس و لەرزن، داماون، مرۆڤ ئەگەر ترس و لەرزێکی زۆری لێ بێ، دەگوترێ: (چاوی کەوتوون)، ئەوەش ئەو کاتەیە کە فووی دووەم بە کەڕەنادا دەکرێ، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی بێبڕوابوون، دڵیان هەراسان دەبێ و بە ترس و لەرز دەبن، چاویشیان تەمی خەم و نارەحەتیی لێ دەنیشێ و چاوەکانیان دادەمێنن و کز دەبن.

١٠)- ﴿ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴾، دەڵێن: ئایا ئێمە گێڕداوە دەبین بۆ حاڵەتی پێشوومان؟ ئەمە قسەی دنیایانە خوا دەیکات، ئەو بێبڕوایانەی ئەو ڕۆژە چاوەڕێیانەو بەو شێوەیان لێ دێ، ئێستا دەڵێن: ئایا ئێمە گێڕداوە دەبین بۆ حاڵەتی پێشوومان؟ (**المَرْدُود: الشَّيءُ المُرجَّع إلى صَاحِبَه، أي: مُرْجَعُونَ إلى الحَيَاة**)، (**مَرْدُود**)، شتێکە بەسەر خاوەنیدا بدرێتەوە، ﴿ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴾، ئایا ئێمە دەگێڕدرێینەوە، بۆ ژیانێ کە کاتی خۆی لە دنیادا گوزەراندوومانە، ئایا جارێکی دیکە ژیانمان دێتەوە بەر؟ (**الحَافِرَة: الحَالَة القَدِيْمَة**)، حاڵەتی پێشوو وەك لە دنیادا ژیاوین، (**رَجَعَ إلى حَافِرَتِهِ**)، ئەمە تەعبیریکی عەرەبییە، ئەگەر کەسێك لە حاڵێکەوە گواستبێتیەوە بۆ حاڵێك، دوایی بگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی پێشێ، دەڵێن: (**رَجَعَ فِي حَافِرَتِه، رَجَع إلى حَافِرَتِه**)، ئەگەرنا وشەی:

(حَفْر)، بە مانای هەڵکەندنەو (حَافِرَة)ش کەسێکە ئەو شوێنە هەڵدەکەنێ وو شوێنە هەڵقەندراوەکە (مَحْفُور)ی پێدەگوترێ، (هەڵقەندراو) بەڵام ئەوان مەبەستیان بەو تەعبیرە چوونەوەو هەڵگەڕانەوەیە بۆ حاڵەتی پێشوو.

١١)- ﴿أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً﴾، ئایا کاتێك بووینەوە بە ئێسکە ڕزیو و پرتووکاوەکان؟ ئەمە خوێنراویشەتەوە: (إِذَا كُنَّا عِظَامًا نَخِرَة)، هەر بە ئاوازی پرسیارکردن، هەردوو خویندراوەکان هاتوون، هەروەها ﴿نَّخِرَةً﴾، بە (نَاخِرَة)ش خوێندراوەتەوە، (النَّخِر: نَخَرَ العَظْمُ: بَلِيَ فَصَارَ فَارِغَ الوَسَطِ مثل القَصَبَةِ)، ئەگەر ئێسقان کلۆر بێ و برزێ، نێوەڕاستەکەی بۆش دەبێ، وەك قامیشێك و قانگە لۆشکێکی لێ دێ (کە نێوەکەی بۆشە).

١٢)- ﴿قَالُواْ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾، گوتیان: کەواتە: ئەوە گەڕانەوەیەکی زیانبارانەیە، واتە: ئەگەر ئێمە دوای ئەوەی دەمرین، بگێڕدرێینەوە بۆ حاڵەتی پێشێمان، کە ژیانمانە، جارێکی دیکە بگێڕدرێنەوەو زیندوو بکرێینەوە، بەدڵنیایی ئەو گەڕانەوەیەمان گەڕانەوەیەکی زیانبارانەیە، وشەی: ﴿كَرَّةٌ﴾، (الكَرَّةُ: المَرَّة مِن الكَرِّ وَهُوَ الرُّجُوعُ بَعْدَ الذَّهَاب)، (كَرَّة)، یەکجارە لە (كَرّ)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە گەڕانەوە دوای ڕۆیشتن، گوتراوە: (كَرٌّ عَلَى مَا فَرَّ)، واتە: لەوەی لێی ڕاکردوە، بۆی گەڕاوەتەوە.

(الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] ئاوا ئەم ئایەتە موبارەکەی مانا کردوە: (أَئِنَّا لَمَرْدُودُونَ إِلَى حَالِنَا الأُولَى قَبْلَ المَمَاتِ، فَرَاجِعُونَ أَحيَاءَ كَمَا كُنَّا قَبْلَ هَلاَكِنَا، وَقَبْلَ مَمَاتِنَا؟ وَهُوَ مِن قَولِهِم: رَجَعَ فُلاَنٌ عَلَى حَافِرَتِهِ: إِذَا رَجَعَ مِن حَيْثُ جَاءَ؛ وَمِنْهُ قَوْلُ الشَّاعِرِ:

أَحَافِرَةٌ عَلَى صَلَعٍ وَشَيْبٍ ... مَعَاذَ اللَّهِ مِن سَفَهٍ وَطَيْش).

واتە: ئایا ئێمە گێڕدراوە دەبین بۆ حاڵەتی پێشێمان، پێش ئەوەی بمرن، ئایا دەگێڕدرێینەوە بە زیندوویەتیی، وەك چۆن پێش ئەوەی لە بەین بچین و بمرین،

---

(١) ج١٥، ص٣٠.

زیندوو بووین؟ ئەوەش لەو قسەیانەوە هاتوە: (**رَجَعَ فُلَانٌ عَلَى حَافِرَتِهِ**)، ئەم تەعبیرە بەکاردێنن بۆ کەسێك کە لە کوێوە هاتوە، بگەڕێتەوە بۆ وێ، ئەو قسەیەی شاعیریش هەر لەوەوە هاتوە، کە دەڵێ: (**أَحَافِرَةٌ عَلَى صَلَعٍ وَشَيْبٍ ... مَعَاذَ اللَّهِ مِنْ سَفَهٍ وَطَيْش**)، ئایا دوای ئەوەی سەر رووتاواتەوەو موو سپیی بووە، بگەڕێمەوە بۆ حاڵەتی پێشێ، پەنا بە خوا لە نەفامیی و هەڵەشەیی. کەسێك بووە، گلەیی لە خۆی کردوە، کە دوای ئەوەی کەوتۆتە تەمەنەوە، گوناهو تاوانی کردوە، وەك سەردەمی گەنجێتیی و نەفامیی.

ئەوان ئاوا دەپرسن بە نکووڵییکردنەوەو دەڵێن: ئایا دوای ئەوەی ئێمە بووینە ئێسقانە ڕزیوو پرتووکاوەکان، دەگێڕدرێینەوە بۆ حاڵەتی پێشوومان؟ ﴿ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴾، گوتیان: کەواتە ئەوە گەڕانەوەیەکی زیانبارانەیە، خواش ﷻ لە وەڵامیاندا دەفەرموێ:

١٣)- ﴿ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴾، ئەوە تەنیا یەك تێوە خوڕینە، ﴿ زَجْرَةٌ ﴾، جارێکە لە (زَجْر)، ئەویش قسەیەکە فەرمان کردن و ڕێ لێگرتنی تێدا بێ، بەڵام بە تووڕەیی، بۆیەش فەرموویەتی: ﴿ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴾، هەرچەندە ﴿ زَجْرَةٌ ﴾، خۆی یەکجارە لە تێوەخوڕین، بەڵام بۆیە بە: ﴿ وَٰحِدَةٌ ﴾، جەختی لێکردۆتەوە، تاکو وانەزانرێ: بۆیە گوتراوە: ﴿ زَجْرَةٌ ﴾، چونکە بۆ جۆرە، ئنجا کە وشەی: ﴿ وَٰحِدَةٌ ﴾ ی خرایە سەر، کەواتە: هەر یەك تێوەخوڕینە، کە مەبەست پێی فووی دووەمە، چونکە فووی یەکەم، بەڵێ یەکەمە، بەڵام دووەمی هەیە، بەڵام فووی دووەم، یەك فووەو دووەمی نیە، تازە هیچ فوو کردنی دیکە بەکەڕەنادای بەدوا دانایەت!

١٤)- ﴿ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴾، یەکسەر ئەوان دەچنە ساراوە، (**سَاهِرَة**)، (**الأَرْضُ المسْتَوِيَة البَيْضَاء التِّي لانَبَات فِيْهَا**)، (**سَاهِرَة**): زەوییەکی یەکسانی سپییە، ڕووەکی تێدانیە.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: بۆیە دەشت و بیابان پێی دەوگوترێ: (**سَاهِرَة**)، چونکە ئەو کەسەی پێیدا دەڕوات، هەردەم بێدارەو ناوێرێ بخەوێ، لەبەر جرو

جانـەوەرو درنـدەی لـەو دەشـتە هـەن، ئنجـا ئـەو گۆڕەپانـەی خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: خەڵك هەموویـان لـەوێ کـۆ دەبنـەوە، لـە دوو فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە، کـە وەسـفی ئـەو دەشـت و ساراو گۆڕەپانەمـان بـۆ دەکات، ئـەو شـوێنەی مەیدانـی کـۆ کردنـەوەو لێپرسـینەوەیە:

**١-** یەکێك لە فەرمایشتەکان دەفەرموێ: {**يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لأحد**}، (**أخرجه البخاري: ٦١٥٦، ومسلم: ٢٧٩٠، وابن حبان: ٧٣٢٠**) واتە: خەڵك لە ڕۆژ هەڵسانەوەدا لەسەر زەوییەکی سپیی، وەك نانێکی گەنمی سپیی کۆ دەکرێنەوە، نیشانەی بۆ هیچ کەس تێدا نیە، واتە: ڕێك و یەکسان و تەختە.

**٢-** هەر لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە کە دەفەرموێ: {**إِنَّ اللَّهَ يَجْمَعُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَيُسْمِعُهُمْ الدَّاعِي وَيُنْفِذُهُمْ البَصَر**}، (**أخرجه البخاري: ٣١٨٢**)، واتە: بێگومان خوا لە ڕۆژی قیامەتدا پێشووەکان و دواییەکان لە یەك دەشتدا، (لە یەك مەیدان و گۆڕەپاندا) کۆدەکاتەوە، ئەو کەسەی بانگیان دەکات، بە هەموویان دەبیستێنێ و، ئەو کەسەش تەماشایان دەکات، چاوی هەموویان دەبینێ.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە ئـەو دەشـت و گۆڕەپانـە، نابـێ لەسـەر زەوی بـێ، وەك پێشـتریش باسـمان کـرد، چونکـە زەوی ئێمـە خـڕو هێلکەیـی هەڵکەوتـوەو، چاو تەنیـا تامەودایـەك دەبینـێ و دوایـی کـووڕ دەبێتـەوە، نـەك هـەر لـە وشـکانیی دا، بەڵکـو لـە دەریاشـدا هەروایـە، کەشـتییەك کـە بـەرەو ڕووت دێ، پێشـێ، لای سـەرێی دەبینـی، پاشـان وردە وردە ئـەوی دیکـەی دەردەکـەوێ، چونکـە بـە هـۆی هێـزی کێشـندەیی زەوییـەوە، دەریایەکانیـش کـە بـە دەوری زەوییـەوەن، ئەوانیـش کـووڕ بوونـەوە.

هەروەهـا پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: ئـەو کەسـەی بانگیـان بـکات، هەموویـان دەنگەکـە دەبیسـتن، کـە هەرگیـز شـتی وا لـە دنیـادا نیـە، ئـەو دەنگـە هێنـدە بەهێـز بـێ بگاتـە هەمـووان، هەروەهـا دەفەرموێ: کەسـێك تەماشـایان بکات،

هەموویـان دەبینـێ! ئـەوەش بەڵگەیەکـی دیکەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو گۆڕەپانـە هیـچ پەیوەندیـی بـەو زەوییـەی ئێسـتامانەوە نیـە، ئێمـە لـە سـوورەتی (**إبراهیـم**) دا لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو ئایەتـە موبارەکـەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژە نـە زەوی وەك خـۆی دەمێنـێ، نـە ئاسـمانەکان و، هەموویـان بـۆ خـوای تاکـی ملپێکەچکـەر دێنـە گـۆڕێ، واتـە: دێنـە ئـەو گۆڕەپانـەوە کـە خـوا ﷻ باسـی کـردوە، لـەوێ کورتـە باسـێکمان لەوبـارەوە کـردوە.

کورتە باسێک: سێ هەڵوەستە

هەڵوەستەی یەکەم: ئەگەر تەماشای کۆی ئایەتەکانی قورئان بکەین، ئەوانەی لە بارەی فریشتەکانەوە دەدوێن، بۆمان دەردەکەوێ کە خوا ﷻ فریشتەکانی کردوونە هۆکارێك لە نێوان خۆی و بەڕێوەبردنی کارەکانی گەردووندا، بە تایبەتی ئێمەی مرۆڤ، ئایەتەکان زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، ئنجا نەك هەر لە دنیادا، بەڵکو لە ڕۆژی دواییشدا، خوا ﷻ کاروبارەکانی بە فریشتان سپاردوون، با چەند بەڵگەیەک لەو بارەوە بێنینەوە:

أ- بە نسبەت دروستبوونی مرۆڤەوە، وەك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ هاتوە، ئەوە فریشتەکانن ڕووح دەخەنە بەر جەستەی ئەو کۆرپەلەیەی لە منداڵدانی دایکی دایە، دوای ئەوەی قۆناغەکان تێدەپەڕێنێ، وەك لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا ئاماژەی پێکراوە، کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾، کە زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست پێی ڕووح بە بەرداکردنیەتی.

ب- ئنجا پاراستنی فریشتەکان بۆ مرۆڤ و نووسین و تۆمار کردنی کردەوەکانی: ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ ﴾**الإنفطار**، ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾ق.

ج- ئنجا گیانکێشان: ﴿ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ﴾**الأنعام**، ﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ ﴾**السجدة**.

د- ئنجا کاروباری وەحیی: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾**الشعراء**، تێکڕای پێغەمبەرانیش (**عَلَيْهِم الصَّلَاة وَالسَّلَام**)، هەر جیبریل وەحیی بۆ هێناون.

هـ- دیسان کاروباری ڕۆژی دوایی و، کاروباری بەهەشتیش و، دۆزەخیش بۆ وێنە: سەرنجی ئایەتەکانی کۆتایی (**الزمر**) بدە، ئایەتەکانی: (٧١ - ٧٥). بەڵێ ئەگەر سەرنجی کۆی ئایەتەکان بدەین، بۆمان دەردەکەوێ کە خوا ﷻ کاروباری دنیاو دواڕۆژی بە فریشتەکان سپاردوون، بێگومان خوا ﷻ هەر کاتێك بیەوێ، کارێك بکات، وەك چۆن ئێمە بە شتێك بڵێین ببە، یەکسەر دەبێ، ئاوایە بۆ خوا، واتە: کاتی تێناچێ و، ماندووبوونی پێناوێ، بەڵام دیارە خوا ﷻ حیکمەتی وای خواستوە کاروباری ئەم گەردوونە، لە دنیاو دواڕۆژدا بە فریشتەکان بسپێرێ.

هەڵوەستەی دووەم: ئەو ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴾، کە وەك باسمان کرد، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە: ﴿ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴾، مەبەست پێی فریشتەکانەو، ئەگەر لەوانی دیکەدا ڕاجیاییەکیان هەبێ، بەڵام لەمەدا ڕاجیاییەکی وایان نیە، کە لێرەدا مەبەست پێی فریشتەکانن، ئنجا لێرەدا بە باشم زانی لە تەفسیری (**روح المعاني**)ی (**الألوسي**) قسەیەك بخوازمەوە، کە تەنیا چەمك و واتایەکەی دێنم، دەڵێ: [کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴾، زۆربەی هەرە زۆری زانایان - ئەگەر نەڵێین یەکدەنگن - ڕایان وایە کە مەبەست پێی فریشتەکانن و ئەوانن کە کاروبارەکانی خوا بەڕێوە دەبەن، هەندێك لە زانایانی گەردووناسی پێشووش، بە هەڵە داچوون، لەوەدا کە پێیان وابووە، ئەستێرەو خڕۆکەکان، جۆرێك لە ویست و خواستیان هەیەو، کاریگەرییان هەیە بەسەر ژیانی مرۆڤەوەو، ئێستاش لەگەڵدابێ هەندێك لەوانەی باسی ئەستێرەناسیی دەکەن، باسی کەلووەکان (**أبراج**)و، جووڵەی خڕۆکەو ئەستێرەکان دەکەن و، گوایە کاریگەرییان هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤ لە ڕووی مەعنەوییەوەو، لە ڕووی ماددییەوەش، بێگومان لە ڕووی ماددییەوە ئەستێرەکان، ئەو تیشکانەی دەیاننێرن و ئەو شەپۆلە کارۆموگناتیسییانەی دەیاننێرن، کاریگەرییان هەیەو، ئەوە شتێکی سەلمێنراوو عیلمییە.

بەڵام ئەوە كە كاریگەریی مەعنەوییان هەبێ، هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیە، وەك (**الآلوسي**)یش، (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: (**بَاطِلٌ عَقْلاً وَنَقْلًا**)، واتە: ئەوە شتێكی پووچە لە ڕووی عەقڵەوەو، لە ڕووی نەقڵەوەش، چونكە خوای پەروەردگار كاروباری گەردوونی بە فریشتەكان سپاردوە، هەڵبەتە لە ڕووە ماددییەكەیەوە، ئەوە دیارە شتە ماددییەكان كاریگەریی ماددیی خۆیانیان هەیە، بەڵام كەسێك بڵێ: خڕۆكەو ئەستێرەكان لە ڕووی مەعنەوییەوە كاریگەرییان هەیەو، جۆرێك لە عەقڵ و هەست و شعووریان هەیە، ئەوە لە ڕاستییدا نە شتێكی عیلمییەو، نە لە ڕێی نەقڵەوەش، شتێكی وا هەیەو، نە لە ڕێی عەقڵیشەوە.

شتێكی دیكە ئەوەیە كە ئەم ئایەتە موبارەكە ئەوەش بە درۆ دەخاتەوە، كە هەندێك لە ئەهلی تەصەووفی لادەر، پێیان وابووە دۆستانی خوا دوای مردن كاریگەرییان هەیە، بەوەی شیفای كەسێك بدەن، یان كەسێك كە خەریكە بخنكێ، دەربازی بكەن، یان كەسێك بەسەر دوژمندا سەربخەن، یان كەسێك كارێكی بۆ بكەن، كە هەندێكیان ئەو كاریگەرییە تایبەت دەكەن بە پێنج لە دۆستانی خواوە، كە ناویان لێ دەنێن: (**أَوْتَاد**)! بەڵام (**الآلوسي**)، قسەكی جوان دەكات و دەڵێ: (**وَالكُلُّ جَهْلٌ وَإِنْ كَانَ الثَّانِي أَشَدُّ جَهْلاً**)، واتە: ئەوە هەمووی نەزانیی و نەفامییە، هەرچەندە دووەمیان (كە دەڵێ: خوا كاروباری ژیان و زەوی بە ڕووحەكانی پێنج لە دۆستانی خۆی دەسپێرێ) نەفامییەكەی توندترو سەخترە.

دوایی (**الآلوسي**) دەڵێ: بەڵێ نابێ لەوەدا دوو دڵییمان هەبێ كە خوا ﷻ دوای مردنیش چاكە لەگەڵ دۆستەكانی خۆیدا دەكات بەو شێوەیەی حیكمەتی خۆی بیخوازێ، وەك ئەوەی بێنە خەوی كەسێك و ڕێنمایی و ئامۆژگاریی بكەن، یاخود شتێكی وەبیر بێننەوە، ئەو شتانە ئاساییین كە خوای پەروەردگار لەگەڵ هەندێك لە دۆستانی خۆی دا دوای مردنیشیان، بەڵام ئەوە كە خوا كاروباری خەڵكی سپارد بێ بەو ڕووحانەو، بە ڕووحی چەند كەسێكی دیاریكراو، ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نیە.

هەڵوەستەی سێیەم: (**الرازي**)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا ئاماژە بەقسەیەك دەکات و پاڵی دەداتە لای (**أبو حامد الغزالي**)، دەڵێ: (**قالَ: إنَّ الأَرْواحَ الشَّرِيفَةَ إذا فارَقَتْ أَبْدانَها، ثُمَّ اتَّفَقَ إنْسانٌ مُشابِهٌ لِلْإنْسانِ الأَوَّلِ في الرُّوحِ والبَدَنِ، فَإنَّهُ لا يَبْعُدُ أنْ يَحْصُلَ لِلنَّفْسِ المُفارِقَةِ تَعَلُّقٌ بِهَذا البَدَنِ حَتّى تَصِيرَ كالمُعاوِنَةِ لِلنَّفْسِ المُتَعَلِّقَةِ بِذَلِكَ البَدَنِ عَلى أعْمالِ الخَيْرِ، فَتُسَمّى تِلْكَ المُعاوَنَةُ إلْهامًا، ونَظِيرُهُ في جانِبِ النُّفُوسِ الشِّرِّيرَةِ وسْوَسَةٌ**).

واتـە: (**أبـو حامـد الغـزالي**)، دەڵـێ: ڕووحـە بەڕێـزو پاکـەکان، کاتێـك لـە جەسـتەکان جیـا دەبنـەوە، ئەگـەر مرۆڤێـك هەبـێ، وەك ئـەو مرۆڤـەی پێشـێ بچـێ کـە مـردوە، لـە ڕووح و لـە جەسـتەیدا، دوور نیـە ئـەو ڕووحـەی مـردووە، جۆرێـك لـە پەیوەسـتیی هەبـێ بـەو جەسـتەیەوەو، وەك هاوکارێـکی ئـەو ڕووحـەی پەیوەسـت بـەو جەسـتەیەوەی، لـێ بـێ و شـتی چاکـی فێـر بـکات، بـۆ کاری خێـرو ئـەو هاوکارییـەش بـە خورپـە (**إلهـام**) ناودەبـرێ و، هەروەهـا هـی ڕووحـە خراپەکارەکانیـش بـە خوتخوتـە (**وسوسـة**) ناودەبـرێ.

گوایـە (**أبـو حامـد الغـزالي**)، کتێبێکـی هەیـە تێیـدا ئامـاژەی بـەوە کـردووەو (**الـرازي**) یـش ئاماژەی پـێ دەکات.

ئنجـا (**الآلـوسي**) قسـەیەکی جـوان دەکات، دەڵـێ: (**وَلَـمْ أرَ مَـا يَشْـهَد عَـلَى صِحَّتِـه فِي الكِتَـاب وَالسُّـنَّة وَكَلَام سَـلَف الأُمَّـة، وَقَـد ذكـر الإمَـام نفْسـه فِي المَبَاحِـث المَشْرقِيَّـة اسْـتِحَالَة تَعَلّـق أَكْـثَر مِـنْ نَفْـسٍ بِبَـدنٍ وَاحِـد، وَكَـذَا اسْـتِحَالَة تَعَلُّـق نَفْـس وَاحِـدة بِأكْـثر مِـنْ بَـدن**) واتــە: نەمدیــوە ئــەوەی هێناویەتــی هیــچ بەڵگەیــەك لــە قورئــان و ســوونەتداو قسـەی زانایانـی پێشـین، ئـەوە پشـت ڕاسـت بکاتـەوە و (**الرازي**)یـش خـۆی لـە کتێبی (**المَبَاحِـث المشْرقِيَـة**)دا دەڵـێ: موسـتەحیلە زیاتـر لـە ڕووحێـك پەیوەسـت بـێ بـە جەسـتەیەکەوە، هەروەهـا زیاتـر لـە جەسـتەیەك چەنـد ڕووحێـك پێـوەی پەیوەسـت بـن.

دەڵێـم: ئـەوەی (**الـرازي**) وەك پشـتگیرییكردن لـە (**أبـو حامـد الغزالي**)یـەوە دەیهێنـێ، دەچێتـەوە نێـو جوغـزی ئـەوەی پێـی دەگوتـرێ: (**تَنَاسـخ الأرواح**) (دۆنـا دۆن)و ئـەوەش شـتێكی پـووچ و ئەفسـانەیەو، لـە ئاینیـی هیندۆسـیی و بوزایـی دا هەیـە، بێگومـان مـرۆڤ كـە دەمـرێ تـازە كۆتایـی دێ و، تەكلیفـی شـەرعیی لەسـەر نامێنـێ.

بەڵـێ: دەگونجـێ كەسـێك دۆسـتی خـوا بـوو بـێ، بێتـە خـەوی كەسـێك و ڕێنماییەكـی بـكات و لێـی بەهرەمەنـد بـێ، وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـووە و دێتـە خـەونی زۆر كـەس، ئـەوەش ئەزموونكـراوە، دیسـان جگەلـە ئەویـش هـەر كەسـێك لـە قـەدەر خـۆی، دەگونجـێ بتوانـێ لـە ڕووی زانیارییـەوە سـوود بـە كەسـێك بگەیەنـێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی پوختەیەکی بەسەرهاتی مووسا ﷺ، کاتێك خوای پەروەردگار لە دۆڵی بە پاکگیراوی (طوى)، بانگی کردو، ناردیە لای فیرعەونی یاخیی کە بانگی بکات بۆ خۆ پاك و چاککردن و، سام و هەیبەت هەبوون بەرانبەر بە پەروەردگاری، کەچی هەرچەندە نیشانە مەزنەکەی وەك بەڵگەی سەلمێنەری پێغەمبەرایەتیی خۆی، پێشان دا، بەڵام فیرعەون ملی نەداو لەسەر بەدرۆ دانان و سەرپێچیی بەردەوام بوو و، بانگەشەی پەروەردگارێتیی هەرە بەرزی بۆ خۆی دەکرد، سەرەنجام خوا سزای دوارۆژ و دنیای داو، کردیە پەندو عیبرەت بۆ خەڵکی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

بەرلەوەی بچینە سەر وردەکارییەکانی چەمك و واتای ئەم ئایەتە موبارەکانە، چۆنیەتیی پەیوەست بوونی ئایەتەکان پێکەوە باس دەکەین، کە پێشتریش هەر ئاماژەمان پێداوە: لە چواردە ئایەتی پێشوودا خوا ﷻ دوای سوێند خواردنی بە پێنج جۆر لە فریشتەکان، لەسەر ئەوەی زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشت دێ، ئنجا باسی هەندێ لە دیمەنەکانی ڕۆژی دوایی کردو، باسی هەردوو فوو پێدا کردنەکانی بە کەڕەنای دا کرد، لێرەش خوا ﷻ باسی بەسەرهاتی مووسا ﷺ و ڕەوانەکرانی بۆ لای فیرعەون، نێواخن دەکات، واتە: ئەی بێبڕوایەکان کە بێبڕوان بە ڕۆژی دوایی و، بێبڕوان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بە کۆتا پەیامی خوا، پەندو دەرس وەربگرن لە فیرعەون، کە وەك چۆن خوا پێغەمبەری کۆتایی

نـاردوه بـۆ لای ئێـوه، کاتـی خۆیشـی مووسـای عليه السلام وێـڕای هاڕوونـی بـرای نـارد بـۆ لای فیرعـەون، بـەڵام هەرچەنـدە مووسـا زۆر بەدڵسـۆزانەو میهرەبانانـە دوانـدی، ئـەو لەسـەر ملهوڕیـی و تـاوان و لادانـی خـۆی بـەردەوام بـوو، سـەرەنجام بـوو بـە پەنـدی زەمانـەو بـۆ خەڵـك کـرا بـە دەرس و پەنـدو عیبـڕەت، کەواتـە: ئێـوەش پەنـد وەربگـرن لـە فیرعـەون، تاکـو وەك فیرعـەون نەبنـە پەنـد بـۆ خەڵکـی دوای خۆتـان!

١)- ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾، ئایا هەواڵ و باسی مووسات بۆ هاتوه! ﴿أَتَىٰكَ﴾، واته: بۆت هاتوه، بەڵام لێرەدا یانی: ئایا پێت گەیشتوه؟ ﴿حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾، (**الحَدِيثُ: الخَبَرُ، وَأَصْلُهُ فَعِيلٌ بِمَعْنى فَاعِلٍ مِن حَدَثَ الأَمْرُ إذا طَرَأَ وكانَ، أي: الحادِثُ، وَالأصْل: خَبَرُ الحَدِيثِ، أيْ: خَبَرُ الحَادِثِ**)، وشەی: (**حَدِيث**)، واته: هەواڵ، (**حَدِيثُ**) لەسەر کێشی (**فَعِيل**)ە، بە مانای (**فاعِل**)، واته: (**حادِث**)، ئەویش یانی: (**حَدَثَ الأمْرُ إذا طَرَأَ وكانَ**)، واته: کارێك ڕوویدا کەواته: ڕووداوێك کە ڕوودەدا پێی دەگوترێ: (**حادِثٌ**)، ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾، لە ئەسڵدا یانی: (**هَلْ بَلَغَك خَبَرُ حَادِث إرْسَال مُوسَى إلى فِرْعَوْن**) ئایا هەواڵی نێردرانی مووسا بۆ لای فیرعەونت پێ گەیشتوه؟ بەڵام ئەوە هەمووی کورت کراوەتەوەو بۆتە: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾، ئایا هەواڵی مووسات بۆ هاتوه، واته: باس و خواسی هەواڵی ڕووداوی نێردرانی مووسا بۆ لای فیرعەونت بۆ هاتوه، چۆن بوو؟!

٢)- ﴿إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى﴾، کاتێك پەروەردگاری لە کێوی پاککراوەی (**طُوی**)دا بانگی کرد، (**إذْ**): (**وإذْ اسْمُ زَمَانٍ، وَاسْتُعْمِلَ هُنَا فِي المَاضِي**)، (**إذْ**) بۆ خۆی ناوی شوێن، (**ظَرْف الزَّمَان**)ە، بەڵام بەکارهێنراوە بۆ ڕابردوو، چونکە باسی ڕابردوو دەگێڕێتەوە.

(**الـوَادِ المُقَـدَّس**)، (**الـوَادِ: المَـكَانُ المُنْخَفِـضُ بَيْنَ الجِبَـالِ، وَالمُقَـدَّسُ: المُطَهَّـرُ وَطُوًى: اسْـمُ مَـكَانٍ**)، (**وادي**): شـوێنێکی لێژایـی و نزماییـە لـە نێـوان چیایەکانـدا، ئێمـە دەڵێیـن: دۆڵ، شـیو، (**وَالْمُقَـدَّسُ: الْمُطَهَّـرُ**)، (**مقـدس**) یانـی: پاککـراوە، هەڵبەتـە پاککراوەییەکەی بەهـۆی ئـەوەوە بـووە، کـە خـوا لەوێـدا مووسـای دوانـدوە، وەك لـە سـوورەتی (**طـه**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿إِنِّىٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ١٢﴾، واتـە:

بێگومان من پەروەردگارتم ئنجا نەعلەکانت (پێڵاوەکانت) دانێ، چونکە تۆ لە شیوێکی پاککراوەی کە [ناوی] (**طُوًى**)یە.

(**طُوى**) بە تەنوینیش خوێندراوەتەوەو بە ئەلیفی مەقصوورە (**طُوى**)ش خوێندراوەتەوە ﴿ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴾، خوا بانگی کرد لە دۆڵی بە پاکگیراوی (**طُوى**) دا، چی پێ فەرموو؟

**٣)-** ﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، (فەرمووی:) بڕۆ بۆ لای فیرعەون بە دڵنیایی ئەو یاخیی بووە، ﴿ إِنَّهُۥ ﴾، (**إنَّ**) پیتی جەختکردنەوەیە ناوەکە مەنصووب و هەواڵەکە مەرفووع دەکات (**حَرْفُ تَأْكِيْدٍ تَنْصِبُ الإسْم وَتَرْفَعُ الخَبَر**)، بەڵام لێرەدا مانای پاساوی خراوەتە نێو، واتە: بچۆ بۆ لای فیرعەون، چونکە یاخیی بووەو لە سنوور دەرچووە، (**الطُّغْيَانُ: هُوَ مُجَاوَزَةُ الحَدِّ فِي العِصْيَانِ**) (**طُغْيَان**): بریتیە لە سنوور بەزاندن لە سەرپێچیی کردندا.

**٤)-** ﴿ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴾، ئنجا (پێی) بڵێ: ئایا ئامادەی خۆت پاك و چاك بکەی؟ وشەی: ﴿ تَزَكَّىٰ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**تَزَّكَّى**)، ئنجا وشەی: ﴿ هَل لَّكَ ﴾، پێشتریش باسمان کرد: لە زمانی عەرەبییدا، دەگوترێ: (**هَلْ لَكَ إلى كَذَا**)، یانی: (**هَلْ لكَ مَيْلٌ إلى كَذَا**)، ئایا ئارەزوومەندی بۆ ئەو شتە؟ یان دەگوترێ: (**هَلْ لَكَ فِي كَذَا**) یانی: (**هَلْ لكَ رَغْبَةٌ فِي كَذَا**)، ئایا تامەزرۆییت بۆلای فلان شتە هەیە؟ کەواتە: لێرەدا کە مووسا عليه السلام بە فیرعەون دەفەرموێ: ﴿ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴾، یانی: ئایا تۆ ئامادەیی و ئارەزووت هەیە، خۆت پاك و چاك بکەی؟ چونکە ﴿ تَزَكَّىٰ ﴾، و (**تَزَّكَّى**)، (**تَزَّكَّى**) ش لە ئەسڵ دا (**تَتَزَكَّى**)یە، یانی: ئایا ئامادەی پرۆسەی خۆ پاك و چاککردن لە خۆتدا ئەنجام بدەی؟

**٥)-** ﴿ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴾، هەروەها بەرەولای پەروەردگارت ڕێنمایی و ڕاستە ڕێت بکەم ئنجا لێی بترسیی (سام و هەیبەتی خوات بچێتە دڵ و دەروونەوە، ئایا بۆ ئەمە ئامادەییت هەیە؟!).

بێگومان ئەمە زۆر شیوازێکی نەرم و نیان و میهرەبانانەیەو، وەك پێشنیارکردن وایە، جوڵاندنی ئارەزوویەتی بە شێوازێکی زۆر نەرم و نیان و، ئەوەش هەر

جێبەجێکردنی فەرمانی خوایە کە لە سووڕەتی (طه)دا، بە مووساو بە هاڕوونی بـرای دەفەرمـوێ: ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾، قسـەیەکی نەرمی لەگەڵ بکەن، بەڵکو بیری بێتەوەو پەند وەربگرێ، یاخود ترس و سام و هەیبەتی بچێتە دڵ.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ ﴾، بەدڵنیاییی هیدایەتی خوا ناچێتە هەموو دڵ و دەروونێکەوەو، دەبێ ئەو دڵ و دەروونە، پاڵفتەو پاك و چاك بووبێ، ئامادەیی وەرگرتبێ، ئنجا هیدایەتی خوای لێ میوان دەبێ، دواییش کە هیدایەتی خوا چووە دڵی مرۆڤەوە، ئنجا سام و هەیبەت و ڕێز و حورمەت و بە گەورەو مەزنگرتنی تێدا پەیدا دەبێ، بەرانبەر بە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی خۆی.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَهۡدِيَكَ ﴾، لێرەدا هیدایەت دەگونجێ بە مانای ڕێنمایی بێ و، دەشگونجێ بە مانای ڕاستە ڕێکردن بێ، کەواتە: (**أهديك**) یانی:

أ- ڕێت پیشان بدەم و ڕێنماییت بکەم.

ب- ڕاستە ڕێت بکەم و بتخەمە سەر ڕێی ڕاست.

٦)- ﴿ فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴾، ئنجا نیشانە هەرە گەورەکەی پیشاندا، (**الآيَةُ: حَقِيقَتُهَا العَلَامَةُ وَالأَمارَةُ، وَتُطْلَقُ عَلَى الحُجَّةِ المُثْبِتَةِ**)، وشەی: ﴿ ٱلۡأٓيَةَ ﴾، بە مانای نیشانە دێ، (بە مانای ئەوەش دێ، شتێکی پێ بناسێ) بەڵام بۆ بەڵگەیەکی ئیسپاتکەریش بەکاردەهێنرێ، کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴾، نیشانە هەرە گەورەکەی پیشاندا، زانایان زۆریان قسە لەبارەی نیشانە هەرە گەورەکە کردووە:

١- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی دەستیەتی.

٢- هەندێکی دیکەش گوتوویانە: مەبەست پێی گۆچانەکەیەتی.

٣- هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی هەردووکیانە.

٤- هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی هەر نۆ نیشانەکانن، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾الأسراء.

بەڵام بە پێی هەردووك ئایەتی (٢٢ و ٢٣)ی سوورەتی (طه)، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ﴾، کەواتە: دەگونجێ مەبەست پێی دەستی و گوچانەکەی بێ، بەڵام ئەگەر مەبەست یەکێکیان بێ، دیارە گۆچانەکە نیشانەیەکی گەورەتر بووە لە دەستی، دەشگونجێ مەبەست پێی هەر نۆ نیشانەکە بێ، کە خوا ﷻ نۆ موعجیزەی دان بە مووسا، وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)داو، لە تەفسیری سوورەتی (**الأسراء**)داو، لە سوورەتی تەفسیری (**النمل**)دا باسمان کردوە.

بەڵام ئایا فیرعەون ئامادە بوو؟ نەخێر: ﴿ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾.

٧)- ﴿ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴾، یەکسەر بە درۆی داناو سەرپێچیی کرد، بە (**ف**)ی (تعقیب) یانی: یەکسەر بە دوای ئەوەدا کە گوێبیستی پەیامەکەی مووسا بوو، بە درۆی داناو سەرپێچیی کرد، چی بە درۆ دانا؟ (**فَكَذَّبَ مُوسَى، أو فَكَذَّبَ رِسَالَةَ مُوسَى، أو فَكَذَّبَ الله، أو فَكَذَّبَ لِقَاءَ الله...**)، مووسای بەدرۆ دانا، یان پەیامەکەی مووسای بەدرۆ دانا، یان خوا بەدرۆ دانا، یان دیداری خوای بەدرۆ دانا، هەمووی دەگرێتەوە، بۆیە بەرکارەکەی قرتێنراوە، بە درۆی دانا، هەموو شتێکی بە درۆ دانا بە ڕەهایی، ﴿ وَعَصَىٰ ﴾، هەروەها سەرپێچیی کرد، لە کێ؟ (**عَصَى الله، أو عَصَى رَسُولَ الله، أو عَصَى رِسَالَةَ الله..**) هەمووی دەگرێتەوە، سەرپێچیی لە خوا کرد، سەرپێچیی لە پێغەمبەری خوا کرد، سەرپێچیی لە پەیامی خوا کرد.

٨)- ﴿ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴾، (هەر بەوەندەش وازی نەهێنا کە بە درۆ دابنێ و سەرپێچیی بکات، بەڵکو) دوایی پشتی هەڵکرد، هەوڵیشی داو کۆششی کرد، (**ثُمَّ: للتَّرْتِيبِ الرُّتْبِيِّ إذْهُمَا أَشَدُّ مِنَ الأَوَّلَيْنِ**)، (**ثُمَّ**) بۆ ڕێزبەندیی پلە پلەییە، چونکە ئەم دووانە (پشت هەڵکردن

و هەوڵدان لە دژی مووسا (عليه السلام) گرنگترن لە بە درۆ دانان و سەرپێچیی کردنەکە، واتە: هەر بەوەندە وازی نەهێنا کە بۆ خۆی بە درۆ دابنێ و سەرپێچیی بکات، بەڵکو پشتیشی هەڵکردو دەستیشی کرد بە هەوڵدان و کۆشش کردن، کە نەهێڵێ خەڵکیش ئیمانی پێ بێنێ، یاخود: هەر بەوەندە وازی نەهێنا کە بە درۆ دابنێ و سەرپێچیی بکات، بەڵکو هەوڵی لە بەینبردن و کوژانەوەی ئەو ڕووناکییەشی دا، کە خوا (تعالى) وەك ئایین و پەیامی خۆی بە مووسادا (عليه السلام) ناردبووی.

٩)- ﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ﴾، کۆی کردەوەو بانگی کرد، یانی: (**فَحَشَرَ النَّاس**)، خەڵکی کۆکردەوە، لێرەدا دیسان بەرکارەکەی قرتێنراوە، چونکە ئاشکرایە، کێی کۆکردەوە، خەڵکی کۆکردۆتەوە، هەندێك لە ڕوونکەرەوانیش گوتوویانە: ﴿فَحَشَرَ﴾، واتە: جادووگەرەکانی کۆکردوونەوە، کە لەو دوو ئایەتەی سووڕەتی (**الشعراء**) یان وەرگرتوە: ﴿وَٱبۡعَثۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٖ ﴿٣٧﴾﴾، بە شاراندا جاڕچییان و کۆکەرەوان، بنێرە هەموو جادووگەرێکی زانات بۆ بێنن، بەڵام بێگومان ئەو سیاقەی ئەوێ، جیایەو باسی کۆکردنەوە جادووگەرانەو، لێرەدا باسی کۆکردنەوەی خەڵك و جەماوەرە بە گشتیی، چونکە جادووگەرەکان پێویستییان بەوە نەبووە فیرعەون پێیان بڵێ:

١٠)- ﴿فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾، ئنجا گوتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم. ئەوان بە گەورەو پەرستراو و هەموو شتێکی خۆیانیان زانیوە، بۆیەش جادوویان بۆ کردوە، پێش ئەوەی ئیمان بێنن، بەڵام خەڵك و جەماوەرەکە فیرعەون کۆی کردنەوە.

﴿فَنَادَىٰ﴾، (**النِّدَاءُ: رَفْعُ الصَّوْتِ بِدَعْوَةِ أَحَدٍ لِيَحْضُرَ**)، (**نِدَاء**) بانگکردن، دەنگ بەرزکردنەوەو دەنگ هەڵێنانە، بۆ بانگ کردنی کەسێك تاکو ئامادە بێ، ئنجا کە بانگی کردن، بە دەنگی بەرز چی گوت؟ ﴿فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾، گوتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، گومانی تێدانیە کە گوتوویەتی: ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾، مەبەستی پێی ئەوە نەبووە، من ئێوەم دروست کردوەو دەژێنم و دەمرێنم،

نەخێر، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە کە حوکمڕانی هەرە بەرزو باڵادەستتان منم، یانی: بەس منم کە دەبێ فەرمانبەرییم بۆ بکەن بە ڕەهایی و، دەبێ هەر بە قسەی من بکەن، مەبەستی ئەوە بووە: نەچن بە قسەی مووسا بخەڵەتێن و، جگە لە من کەسێکی دیکە بپەرستن، یان جگە لە من سەرپەرشتیارێکی دیکە بۆ خۆتان پەیدا بکەن! ئەگەرنا مەبەستی ئەوە نەبووە: من ئێوەم بە دیهێناوەو ئێوە دەژێنم و دەمرێنم، چونکە وشەی: (رَبٌّ)، هەموو ئەو واتایانە دەگرێتەوە، بەڵام وێڕای ئەوە (رَبٌّ) مانای سەرپەرشتیاری دنیاییش دەگەیەنێ و، فیرعەون مەبەستی ئەوە بووە، واتە: سەرپەرشتیاری هەرە بەرزی دنیاتان، منم، بەڵام بێگومان خوا ﷻ لێی نەگەڕاوە، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچێ:

١١)- ﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ﴾، خوا ﷻ گرتی وەك سزادانی کۆتایی و یەکەم، ﴿نَكَالَ﴾، (مَفْعُوْل مُطْلَقٌ «لأَخَذَهُ» بِتَأوِيْلِ فِي الأُولى والثَّانِية، أَي: عَذَّبَهُ عَذَابَهُما، غَرْقاً فِي الأُوْلَى، وَحَرقاً فِي الأخِرَة)، وشەی: ﴿نَكَالَ﴾، بەرکاری ڕەهایە بۆ (أَخَذَه)، (أَخَذَهُ) یانی: گرتی و سزایدا، واتە: لە جیاتی یەکەم و دووەم سزای دا، سزای دنیا بە خنکاندن و نغرۆ کردن لە دەریای سووردا‌و، سزای دواڕۆژیش بە سووتاندن، لە قۆناغی بەرزەخ دا، لە پێش قیامەتیش دا. ﴿نَكَالَ﴾، (العُقُوبَةُ المُنَكِّلَة للْغَيْر مِنَ النِّكْل)، ﴿نَكَالَ﴾: بریتیە لە سزایەکی سڵەمێنەرەوە بۆ ئەوی دیکە، ئەوەیە کەسێك سزا بدەی و بە هۆی سزادانی ئەوەوە، جگەلە ئەو عیبرەتی لێوەربگرێ و پێی تەمبێ بێ و بسڵەمێنێتەوە، لەوەی وەك ئەوەی پێشێ بکات، کە سزا دراوە.

ڕوونکەرەوەیەك دەڵێ: (النَّكَال: إِيقَاعُ الأَذَى الشَّدِيدِ عَلَى الغَيْرِ مِنَ التَّشْهِيرِ بِذَلِكَ بِحَيْثُ يُنَكِّلُ، أَيْ يَرُدُّ وَيَصْرِفُ مَنْ يُشَاهِدُهُ عَنْ أَنْ يَأْتِيَ بِمِثْلِ مَا عُومِلَ بِهِ الْمُنَكَّلُ بِهِ)، ﴿نَكَالَ﴾: بریتیە لە سزادانێکی سەختی کەسێك بە شێوەیەك هەر کەسێك ببینێ، بسڵەمێتەوەو بپرینگێتەوە، لەوەی کارێك بکات کە بابای سزادراو کردوویەتی.

١٢)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴾، بەڕاستیی لەوەدا پەند هەیە بۆ هەر کەسێك بترسێ، ئەگەر کەسێك سام و هەیبەتی خوای لە دڵ دا نەبێ، هەزار شت ببینێ، پەندی لێوەرناگرێ و دەرسی لێ فێرنابێ، (**جمال الدین قاسمي**)، خاوەنی (**محاسن التأويل**)[1] لە تەفسیرەکەیدا، دەڵێ:

(**أي: في أَخْذِهِ وَمَا أَحَلَّ بِهِ مِنَ العَذَابِ وَالخِزْيِ، عِظَةٌ وَعِبْرَةٌ لِمَنْ يَخَافُ الله وَيَخْشَى عِقَابَه، وَيَعْلَمُ أَنَّ هَذِهِ سُنَّتُهُ فِي كُلِّ مَنْ يُقَاوِمُ الحَقَّ وَيُحَارِبُهُ**)، واتە: لە گرتنی خوادا بۆ فیرعەون و، لەوەدا کە سزای بەسەردا سەپاندو سەرشۆڕی کرد، پەندو ئامۆژگاریی هەیە، بۆ هەر کەسێك لە خوا بترسێ و، لە سزای خوا سام و هەیبەت بکات و، بزانێ ئەوە یاسای خوایە، لە مامەڵەی لەگەڵ هەر کەسێکدا کە بەرهەڵستیی و دژایەتیی هەق بکات، بەهەمان شێوە سزا دەدرێ.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لێرەدا خوا ﷻ باسی یاسایەکی خۆی دەکات، بەڵێ: باسی ڕووداوێکی دیارییکراو دەکات، بەڵام کە دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴾، مانای وایە ئەوە بەرجەستە بوونی یاسایەکی خوایە لە ژیانی مرۆڤدا، کە هەر کەسێك دژایەتیی پەیامی خوا بکات، سەرەنجام ئاوای لێ دێ، درەنگ یان زوو.

---

(١) ج١٠، ص٤٧.

**مەسەلەی سێیەم:**

**پرسیارکردنی سەرزەنشتکارانە، کە ئایا دروستکرانی مرۆڤان قورسترە یان هی ئاسمان؟ خوا دروستی کردوەو بڵندی کردوەو ڕێکیخستوەو، شەوگارەکەی تاریك کردوەو، ڕووناکییەکەی دەرهێناوە، پاشان زەوی پانڕاخستوەو ئاوو لەوەڕگایەکەی لێ دەرهێناوە، تاکو بۆ خەڵك ببێتە مایەی بەهرەی خۆیان و ئاژەڵەکانیان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

وەك پێشتریش گوتمان، دوای ئەوە خوا ﷻ سەرنجی ڕاکێشان بۆ مێژوو و، نموونەیەکی بەرجەستەیی مێژوویی خستە بەر چاوی بێبڕوایەکان، کە نێردرانی مووسا ﷺ و، هاروونی ﷺ برای بوو بە پەیامی خواوە، بۆ لای فیرعەون و، سەرەنجام ملنەدانی فیرعەون بۆ هەق و، بەردەوام بوونی لەسەر ملهوڕیی و، سزادانی خوای پەروەردگار بۆی بە جۆرە سزایەك، کە جگەلە خۆیشی پێی تەمبێ بێ، ئنجا خوا ﷻ سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، زۆرجاران خوا ﷻ سەرنجی مرۆڤان ڕادەکێشێ بۆ گەردوون، بۆ دیاردەو دیمەنە دڵبزوێن و سەرنج ڕاکێشەکانی گەردوون و دەوروبەر، دوایی سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، چونکە لە ڕاستییدا هەم مێژوو کتێبێکە زۆر جێی سەرنج و تەماشاو جێی پەندو عیبرەتە، هەم گەردوونیش کە سیفەتەکانی خواو یاسایەکانی خوای تێدا بەرجەستەن، زۆر شایستەی ئەوەیە مرۆڤ زۆر سەرنجی لێ بدات، تاکو هەرچی زیاتر شکۆداریی و پایە بەرزیی خوا ﷻ و، سیفەتە بەرزو مەزنەکانی لە ڕووپەڕی دیاردەو دیمەنەکانی گەردووندا بخوێنێتەوە:

١)- ﴿ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ﴾، ئایا دروستکرانی ئێوە قورسترو زەحمەتترە، یاخود هی ئاسمان، لێرەدا ئەم پرسیارکردنە ﴿ ءَأَنتُمْ ﴾، هەمزە (أ)ەکە (**هَمْزَة الإسْتِفْهَام**)ە، بەڵام پرسیارکردنی (**تقريري**)یە، بە کوردیی دەبێتە پرسیارکردنی دانپێپێداهێنان، واتە: بەرانبەرەکەت وادار بکەی، دانپێدابێنێ، چونکە هیچ دەرفەتی نیە، دانی پێدانەهێنێ.

وشەی: ﴿ ٱلسَّمَآءُ ﴾، دەڵێین: ئاسمان، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئاندا مەبەست لە: ﴿ ٱلسَّمَآءُ ﴾، و ﴿ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ﴾، و ﴿ سَمَٰوَٰتٍ ﴾، کۆی گەردوونە، ئەوەی ئێمە تاکو ئێستا بەس گۆشەیەکیمان بە دوور بین و تەلەسکۆبەکان لێ بەدی کردوە.

**٢)-** ﴿ بَنَىٰهَا ﴾، (خوا) ئاسمانی بنیاتنا، دروست کرد، (**البِنَاء: ضَمُّ الأَجْزَاء المُتَفَرِّقَةِ بَعْضِهَا إِلَى بَعْض، مَعَ رَبْطِهَا بِمَا يُمْسِكُهَا حَتَّى يَكُوْنَ عَنْهَا بُنْيَة وَاحِدَة**)، (**بِنَاء**): بریتیە لەوەی بەشە پرژو بڵاوەکانی شتێك بخرێنەوە سەر یەك و، بە یەکەوە پەیوەست بکرێن، هەتا لە هەموویان یەك شت دروست بێت، (وەك چۆن لە ئاوو چەو و لم و چیمەنتۆ و گەچ و شیش و چی و چی، هەمووی بینایەك دروست دەکرێ).

**٣)-** ﴿ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴾، [(**سَمْك**): بەرزیی و ئەستووریی]، (خوا) بەرزییەکەی هی ئاسمانی بەرز کردەوەو بڵند کردو ڕێکیخست، (**السَّمْكُ: قَامَةُ الشَّيءِ**)، هەموو تەنێك پانیی هەیە، لە ڕووی جەستەییەوە، پانیی ئەو بارەیەتی کە کەمترەو، درێژیی هەیەو قووڵیی (**عُمْق**) یاخود (**سَمْك**) بەرزییشی هەیە.

جاری واش هەیە شتێك چوارلایەکەی بە ئەندازەی یەکن و پێی دەگوترێ: چوارگۆشە، ئەگەرنا ئەو لایەی کەمترە و، کەم بەرترە پێی دەگوترێ: پانایی (**عُرْض**)، لایەکەی زیاتر پێی دەگوترێ: درێژایی (**طُوْل**)، قووڵیی و ئەستوورییەکەشی پێی دەگوترێ: بەرزیی (**سَمْك**).

﴿ فَسَوَّىٰهَا ﴾، (**أي: فَعَدَّلَهَا بِوَضْع كُلِّ جرم فِي مَحَلِّهِ**)، ڕێکیخست بەوەی هەر شتە لە شوێنی خۆیدا دابنێ.

٤)- ﴿ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ﴾، شەوەكەی تاریك داهێناو ڕووناكییەكەشی لێ دەرهێنا، ﴿ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا ﴾، (أي: جعل لَيْلَهَا مُظْلِماً)، شەوگاری گەردوونی تاریك داهێنا، (غَطَشَ وَأغْطَشَ)، هەردووكیان هاتوون، واتە: تاریكی داهێنا، (ضُحَى) هەرچەندە بە مانای چێشتەنگاو دێ، بەڵام بە مانای تیشكیش دێ.

٥)- ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴾، زەویشی دوای ئەوە، پانڕاخست و ئامادە كرد، ئەمەش بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكرایە لەسەر ئەوە زەوی دوای دروستكرانی ئاسمان، دروستكراوەو بەو شێوەیە بۆ ژیانی مرۆڤ ئامادە كراوە، زانیاریی گەردوونناسیی ئێستا ئەوەی لە لای بۆتە شتێكی زۆر ڕوون.

بۆیەش وا دەڵێم، چونكە لە تەفسیرەكاندا زۆر مشت و مڕی لە بارەوە كراوە، ئایا ئاسمان پێشێ دروستكراوە یان زەوی؟ لە ڕاستییدا ئەگەر كاتی خۆی جێی مشت و مڕ بوو بێ، ئێستا دوای بەرەو پێشچوونی گەردوونناسیی و، دوای ئەوەی بۆمان دەركەوتوە، كە زەوی یەكێكە لەو نۆ خڕۆكەیەی بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە و، خۆریش ئەستێرەیەكە لە ئەستێرەكانی كەهكەشانی كاكێشان، كە زانایان دەڵێن: بە مەزەندە یەك تریلیۆن ئەستێرەی تێدایە، كەهكەشانی كاكێشانیش یەكێكە لە دوو سەد ملیار، بەڵكو هەندێكیش دەڵێن یەك تریلیۆن، (هەزار ملیار) كەهكەشانی دیكە، كە هەتا ئێستا كەوتوونە بەر چاوی دوور بین و تەلسكۆبەكان، ئێستا ساغ بۆتەوە كە خڕۆكەی زەوی دوای ئەوەی گەردوون هەمووی دروست بووە، ئنجا خوا ﷻ لە نێو گەردووندا، ئەم زەوییەی ئێمەی بەو شێوەیە هەڵخستوە، كە لە سوورەتی (فصلت)دا خوا ﷻ باس دەكات، زەوی چۆن بە چەند قۆناغان دا تێپەڕیوە، لە وێ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٩ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ١٠ ﴾، ئەم دوو ئایەتە بە پێزە لێیان وەردەگیرێ، كە زەوی بە چوار قۆناغان ئەم حاڵەتەی ئێستای پەیدابووە كە ژیانی لەسەر دروست بێ و، دواتر ژیانی

مرۆڤی لەسەر دروست بێ، ئەوە بە چوار قۆناغان دا تێپەڕیوە، کاتی خۆیشی لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (فصلت)دا بە درێژایی لەو بارەوە قسەمان کردوە، گرنگ ئەوەیە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾، زەوی دوای ئەوە یانی: دوای ئەوەی ئاسمانی بنیاتناو بەرزییەکەی بەرز کردەوەو، ڕێکیخست و، شەوەکەی تاریك داهێناو، ڕۆژەکەی ڕووناك کرد، ئنجا دوای ئەوە، زەویشی ڕێکخست و پانڕاخست و ئامادەی کرد، چی لێکرد؟

٦)- ﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا﴾، هەم ئاوەکەی لێ دەرهێنا لە زەوی و، هەم لە وەڕگایەکەشی لێ دەرهێنا.

٧)- ﴿وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا﴾، هەروەها چیایەکانیشی چەقاندن و داکوتان، ﴿أَرْسَىٰهَا﴾، (**أي: أثْبَتَهَا وَرَسَّخَهَا**)، چیایەکانی داکوتان و چەسپاندنی لە زەویدا، هەڵبەتە چەسپاندنی چیایەکان و داکوتانیان، کەوتۆتە پێش ئەوەی زەوی ئاوو لەوەڕگای تێدا پەیدا بن، بەڵام لە باسکردندا دواخراوە، ئەگەرنا لە دروستکردندا بەدڵنیایی چیایەکان داکوتراون و، ئنجا دوایی لە ئەنجامی هەبوونی چیایەکاندا، هەڵمی ئاو کە لە دەریاکانەوە هەڵساوە، لەسەری چیایەکاندا کۆبۆتەوەو، بۆتە باران و بەفرو تەزرەو داباریوەتە خوارەوەو، ئاویش دروست بووەو، لە ئەنجامی ئەوەش دا لە وەڕگا دروست بووە، دوای ئەوەی کانیی و سەرچاوەکان دروست بوون، لەوەڕگایەکانیش دروست بوون.

٨)- ﴿مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ﴾، [خوا هەموو ئەوشتانەی ڕەخساندوون] تاکو بەهرە بێ بۆ ئێوەو بۆ ئاژەڵەکانتان: ﴿مَتَٰعًا﴾، لە ڕووی ڕێزمانییەوە دوو حاڵەتی هەن:

أ- یان (**مَفْعُوْل لَهُ**)یە، یانی: (**فَعَلَ ذَلِكَ تَمْتِيعاً لَكُمْ وَلأنْعَامِكُم**)، خوا ئەوەی کرد بۆ ئەوەی، بەهرە بگەیەنێ بە خۆتان و بە ئاژەڵەکانتان

ب- یاخود: ﴿مَتَٰعًا﴾، (**مَصْدَر مُؤَكِّد لِفِعلِه المُضْمَر، أي: مَتَّعَكُم بِذَلِكَ مَتَاعَاً**) چاوگێکی جەختکەرەوەیە بۆ کردارە شێرراوەکەی، واتە: خوا ﷻ بەوە ئێوەی بەهرەمەند کرد، بە بە هرەمەند کردن.

## دوو سەرنج دانی کورت لە زەوی و لە چیایەکان

### ١- زەوی:

(**د. محمد راتب النابلسي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**تفسیر النابلسي**)دا[1]، دەڵێ: ئەو ڕۆکێتە فەزاییەی نێردرا بۆ سەر مانگ، کە دیارە لێرەوە بۆ مانگ (٣٦٠٠٠٠ - ٣٨٠٠٠٠)کم و، تیشکیش لە چرکەیەکدا (٣٠٠،٠٠٠)کم دەبڕێ، کەواتە: لێرەوە بۆ مانگ چرکەیەك و ٥/١ ی چرکەیەك یان کەمتریشە.

بەڵام ئەو ڕۆکێت (**مركبة**)ەی هەڵیاندا بۆ ئەوەی ئەو ماوەیە ببڕێ، بیست و چوار هەزار ملیۆن یاخود بیست و چوار ملیار (٢٤،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) دۆلاری تێچوو تاکو سەرنشینەکانی ئەوانەی تێیدابوون بچنە سەر مانگ، لە حاڵێکدا زەوی کێشەکەی: (٦٠٠٠) ملیۆن ملیۆن ملیۆن (٦٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)تەنە، واتە: (٦) بیست و یەك سفری لە پێشەوە بن و، بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە بە خێرایی (٣٠) کم/ لە چرکەیەکدا، واتە: (١٠٨,٠٠٠)کم/ لە سەعاتێکدا، یانی: ئەگەر ئەو ڕۆکێتە بەخێرایی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، ڕۆیشتبایە، بە نزیکەی سێ سەعات و ئەوەندە دەگەیشتە سەر مانگ، بەڵام ئەو مەرکەبەیەی هەڵیان داوە بۆ سەر مانگ سێ شەو و سێ ڕۆژان بەڕێوە بووەو، ئەو هەموو پارەیەشی تێچووە!

### ٢- چیایەکان:

کە خوا دەفەرموێ: چیایەکانی لە زەویدا داکوتان، زۆرجاران باسی چیایەکانمان کردوە، لێرەشدا چەند شتێك لە بارەی چیایەکانەوە باس دەکەین:

---

(١) ج١٠، ص٢٣٥.

١- ئەو چیایانە دەبنە هۆی ئەوەی لە خێرایی سووڕانەوەی زەوی، چ بە دەوری خۆیدا، چ بە دەوری خۆردا، بگرنەوە، چونکە چیایەکان بەرزن و وەک کۆسپ و بەربەستێک لەخێرایی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا و، بە دەوری خۆردا، کەم دەکەنەوە.

٢- چیایەکان بۆ خڕۆکەی زەوی، وەك پەیکەری ئێسکیی وان بۆ جەستەی مرۆڤ، پەیکەری ئێسك لە جەستەی مرۆڤ دا، چ دەورێك دەبینێ، کە جەستەی مرۆڤ بە پەیکەری ئێسکەوە ڕاوەستاوە، چیایەکانیش بۆ زەوی ئەو دەورەی دەبینن.

٣- هەروەها چیایەکان دەبنە هۆی ئەوەی زۆرێك لە خێرایی بایەکان بگرنەوە، (با)یەکان کە بەهێزەوە هەڵدەکەن، ئەگەر بەهۆی ئەو چیایانەوە نەبێ کە لە تەوژم و خێراییان دەگرنەوە ئەو بایانە زۆر بەهێزتر دەبوون و زۆرشتیان ڕادەماڵی.

٤- چیایەکان مەخزەنن بۆ ئاو، ئێمە ئاوی شیرینمان لە کوێ دەست دەکەوێ؟ بێگومان لە ڕێی باران و بەفرو تەزرەوە، ئەو باران و بەفرو تەزرەیەی بە زۆریی لەسەر لووتکە بەرزەکانی چیایەکان دەبارن و، خوا لەوێ بۆمانیان عەمبار دەکات.

٥- هەروەها چیایەکان وێڕای ئەوە مەخزەن و عەمبارن بۆ هەموو جۆرەکانی کانزا، بەتایبەت ئاسن و مس و زێڕو زیوو تێکڕای ئەو کەرەستانەی مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبێ.

٦- هەروەها چیایەکان شوێنێکیشن، زەوییان وا لێ کردوە ببێتە شوێنی گەشت و هاوینە هەوارو جێگای فێنك و خۆش.

٧- دەورێکی دیکەی چیایەکان ئەوەیە کە پانتایی زەوییان فراوان کردوە، بەهۆی بنارو دۆڵ و شیوو قەدپاڵ و لووتکەکانی چیایەکانەوە، ئەوە لە کوێ کە زەوی هەمووی تەخت بووایە، بەڵام ئێستا بە هەر دۆڵ و شیوو قەد پاڵی چیایەك دا دەڕۆی، بەملادا دەڕۆی و، بەولادا دەڕۆی، پانتایی زەوی فراوانتر بووەو، دیمەنێکی جوانتریشی بە زەوی داوەو، چیاو دۆڵ و شیوو قەدپاڵەکانیان بوونە شوێنی  زۆرێك لە شارو دێیەکان و، ئەو شوێنانەی خەڵك بۆ تەماشا کردن و دیدەنییان دەچێ.

### مەسەلەی چوارەم:

**باسی هاتنی ڕووداوی هەرە گەورە کە لەو ڕۆژەدا مرۆڤ دێتەوە یادی، چ کۆششێکی کردوە، ئەگەر چاك، ئەگەر خراپ، دۆزەخیش ڕادەنوێنرێ و، خەڵکیش دەبنە دوو بەش: یاخییانی دنیاپەرست: کە ئەوانە سرەوتگایان دۆزەخە و، ترساوان لە پایەی بەرزی خواو خۆ مەرزەمكەر لە ئارەزووی ناهەق، ئەوانەش سرەوتگاو شوێنی حەوانەیان بەهەشتە:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴾، ئنجا هەرکات کارەساتە هەرە گەورەکە هات، پیتی (ف)، (فَاء التَّفْرِيع)ەو، ئەو باس و بابەتەی دەخرێتە ڕوو، بنیاتی دەنێ لەسەر ئەوەی پێشەوە، لە ئایەتەکانی پێشێدا خوا ﷻ دوای ئەوەی لە چواردە ئایەتی سەرەتادا، سوێندی خوارد بە پێنج کۆمەڵ لە فریشتەکان، دوایی سەرنجی ڕاکێشان هی هەموو لایەك، بە تایبەتی بێبڕوایەکان بۆ بەسەرهاتی ڕەوانەکرانی مووسا ﵇ بۆ لای فیرعەون و، یاخیی بوونی فیرعەون و بەردەوام بوونی لەسەر یاخیی بوونی و سەرەنجام سزادرانی، دوایی سەرنجی ڕاکێشان بۆ ئاسمان، پاشان بۆ زەوی و بۆ پێکهاتەکانی زەوی، کە خوا ﷻ زەوی وا ڕەخساندوە، مرۆڤ لەسەری بژی، خوایەك کە ئەوە شوێن دەستیەتی، هەم لە مێژووی بەشەردا، هەم لە گەردوون و دەوروبەردا، ناگونجێ لە مرۆڤان بگەڕێ بەبێ لێپسرانەوە و بە بێ سزاو پاداشت، بچنە دەریای نەبوونەو ببنە بەردی بن گۆمێ، بۆیە ڕۆژێك دێ ئەم گەردوونە، ئەو لاپەڕەیەی ئێستای دەپێچرێتەوەو لاپەڕەیەکی دیکەی بوون دێتە ئاراوە، خوا دەفەرموێ:

١)- ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴾، ئنجا هەر كات ڕووداوە هەرە گەورەكە هات، ئەو ڕووداوە هەرە گەورەیەش مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، دەشگونجێ مەبەست پێی بەس قیامەت بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی هەردووكیان بێ، كە پێشێ ئاخیر زەمان دێ، دوایی فوو كردنی یەكەم بە كەڕەناداو، دوای فووكرانی دووەم بە كەڕەناداش قیامەت دێ، دەگونجێ: ﴿ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴾، ناو بێ بۆ هەردووكیان، یانی: بۆ ڕۆژی دوایی و، دەشگونجێ تەنیا ناو بێ بۆ دووەمیان: قیامەت.

وشەی: ﴿ ٱلطَّآمَّةُ ﴾، زانایانی ڕوونكەرەوەی قوڕئان:

أ- هەندێكیان بە: (**الدَّاهِيَة**)یان لێكداوەتەوە، واتە: بەڵایەك كە دێ و خەڵك تێیدا سەراسیمەو مات و حەیران دەبێ.

ب- هەندێكیان بە: (**الحَادِثَة الَّتِي تَطُمّ**)، بەوە لێكیان داوەتەوە، ئەو ڕووداوەی زاڵ دەبێ بەسەر هەموو شتێكداو، هەموو شتێكدا دادەپۆشێ، دەگوترێ: (**طَمَّ الوَادِي أي: عَلَى وَغَلَبَ وَتَفَوَّقَ**) (طَامَّة) بە بەڵایەك دەگوترێ، خەڵك هەمووی داپۆشێ و وابێ لە هەمووی شتەكانی دیكە كە هاتوون، گەورەتر بێ و خەڵك لەبەر ئەو بەڵایەو ئەو ڕووداوە، ئاگای لە هیچی دیكە نەمێنێ.

گوتراوە: (**الطَّامَّةُ: الحَادِثَةُ الَّتِي تَطُمُّ، أَيْ: تَعْلُو وَتَغْلِبُ وتَفُوقُ أَمْثَالَهَا مِنْ نَوْعِهَا**)، ئەو ڕووداوەی دادەپۆشێ و زاڵ دەبێ، بەرزتر دەبێ لە هاووێنەكانی خۆی لە جۆری خۆی، كە بێگومان مەبەست لە: ﴿ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴾، ڕۆژی دواییە، چ قۆناغی دووەم بێ بە تایبەت، چ هەردوو قۆناغەكە بێ، (**«إذا» ظَرْفٌ لِلْمُسْتَقْبَلِ لِذَلِكَ إذَا دَخَلَ على المَاضِي صُرِفَ لِلإستِقْبَالِ**)، (**إذَا**)، لێرەدا (**ظَرْفٌ**)ە بۆ داهاتوو، بۆیە كاتێك (**إذَا**) دەچێتە سەر كرداری ڕابردوو، ئەو كردارە ڕابردووە مانایەكەی دەگۆڕێ بۆ داهاتوو، (**جَاءَت**) یانی: هات، (**هات**) بۆ ڕابردووە، بەڵام كە (**إذَا**)ی چووە سەرێ، ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ﴾، (كاتێك هات) مانایەكەی دەگۆڕێ بۆ داهاتوو، واتە: هەر كاتێك لە داهاتوودا، ڕووداوە هەرە گەورەكە هات، چی دەبێت؟:

٢)- ﴿يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ﴾، ئەو ڕۆژە مرۆڤ بیری دێتەوە ئەوەی کردوویەتی و ئەنجامی داوە، ئەو هەوڵەی داویەتی، (**التَّذَكُّرُ: يَقْتَضِي سَبْقَ النِّسْيَانِ وَهُوَ امْحَاءُ الْمَعْلُومِ مِنَ الْحَافِظَةِ**)، (**تَذَكُّر**)، بیرهاتنەوە، خوازیاری ئەوەیە دەبێ لە بیرچوونەوەیەك بووبێ، لە بیرچوونەوەش بریتیە لە سڕانەوەی زانیارییەك لەهۆشدان کە پێشتر لە لای مرۆڤ بووە، بەڵام دوایی مرۆڤ لە بیری چووە، وشەی: (**تَذَكُّر**): لە قورئاندا زۆر بەکارهێنراوە، چونکە لە ڕاستییدا خوا مرۆڤی وا ڕەخساندوەو خوڵقاندوە، کە لە هەموو ئەو ڕاستییانەی وەحیی خوا هێناونی، ڕیشەکەیان لە زگماك و ناخی مرۆڤدا دانراون، بۆیە مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە، وەحیی خوا ئەو ڕاستییانەی بێنێتەوە بیرو، دوایی بۆی ڕوون بکاتەوە، ئەگەرنا وەك ئەسڵ و ڕیشەیان یان هەن: ١-بڕوا بوون بە بوونی خوا ﷻ و، بە پەروەردگارێتیی خوا، بە خاوەندارێتیی خوا، بە تەنیا پەرستراوێتیی خوا. ٢- بڕوا بوون بە دیداری خواو، بەوەی لە حیکمەتی خوا ناوەشێتەوە، مرۆڤەکان وێڵ بکات و پەیامیان بۆ نەنێرێ و، پێغەمبەریان بۆ نەنێرێ، شێوەی ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی بۆ دیاریی نەکات، ئەو ڕاستییانە لە ناخی مرۆڤدا هەن و زگماکی مرۆڤ هەستیان پێ دەکات، کە ئەم دنیاو گەردوونەو، ئەم مرۆڤە دەبێ خاوەن و بەدیهێنەرێکی هەبێ و پەروەردگارێکی هەبێ و ڕۆژێکی دانابێ، ئەو مرۆڤە لێی بپرسرێتەوە، خوا ﷻ وای لێ چاوەڕێ دەکرێ، مادام بەرنامەو سسیتمی بۆ هەموو شتێك داناوە، دەبێ بە مرۆڤیشی پێشاندا بێ، چی بکات و چۆن بژیی و، چی و حەڵاڵە، چی حەڕامە، و چی چاکەو چی خراپە؟

﴿مَا سَعَىٰ﴾، (**مَا**) لێرەدا (**مَا الْمَوْصُولَة**)یە، یانی: (**الَّذِي سَعَى**)و بەرکارەکەی قرتێنراوە، یانی: (**مَا سَعَاه، مَا كَسَبهُ**)، ئەوەی هەوڵی بۆ داوەو وەدەستی هێناوە، ئەو کۆششەی کردوویەتی، مرۆڤ بیری دێتەوە.

٣)- ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ﴾، دۆزەخیش ڕانوێنراو ئاشکرا کرا، خراپە گۆڕێ، بۆ هەر کەسێك ببینێ، (**تَبْرِيزُ الْجَحِيمِ: إِظْهَارُهَا**)، (**بُرِّزَ، بَرَّزَ، يُبَرِّزُ، تَبرِيزاً**)، واتە: دەرخرا،

دەردەخرێ، دەرخستن، یانی: دۆزەخیش هێنرایە گۆڕێ و ئاشکرا کرا، بۆ هەر کەس ببینێ، واتە: بۆ هەموو کەس، چونکە لەوێدا هەموو کەس دەبینێ.

هەتا ئێستا وەڵامی (إذَا) نەهاتوە، هەر کاتێك ئەوە بوو، مرۆڤ ئەوەی دێتەوە یاد کە کردوویەتی و دۆزەخیش ڕادەنوێنرێ و پێشاندەدرێ بۆ هەر کەسێك ببینێ، ئەمە وەڵامی (إذَا)نییە، چونکە (إذَا)، وەك چۆن (ظَرْفٌ)ە بۆ داهاتوو، مانای بەمەرجگرتنیشی گرتۆتە خۆی و تێیدایە، هەر کاتێك ئەوانە بوون، چی دەبێ؟وەڵامی (ژذا) لە ئایەتەکانی ٣٧،٣٨،٣٩ ئنجا ئایەتەکانی: ٤٠،٤١ دا دێ. ٤- ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ﴾، ئنجا هەر کەسێك یاخیی ببێ، (الطُّغْيَان) (مُجَاوَزَةُ الحَدِّ فِي العِصْيَان)، (الطغيان) بریتیە لە سنوور شکاندن لە سەرپێچییکردن دا، واتە: سەرپێچییردنێکی زۆر بێڕەزا، بە کوردیی دەڵێین: یاخیی بوون، هەڵگەڕانەوە، لە سنوور دەرچوون.

وشەی: (أَمَّا)، پێشتریش گوتوومانە: (حَرْفُ التَّفْصِيل)، پیتێکە بۆ درێژە پێدان و ڕوونکردنەوەی ئەو مەبەستەی دوایی دێ، لە زمانی عەرەبییدا مانایەکەی ئاوایە: (مَهْمَا يَكُن مِن شَيء)، هەر شتێك ببێ، دوایی خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ﴾، ئنجا هەر کەس، یاخیی ببێ، (مَنْ)، واتە: هەر کەس، بۆ تاك و بۆ دووان و بۆ کۆو بۆ نێرو بۆ مێ، بۆ هەمووان بەکاردێ، هەر کەسێك یاخیی بووبێ لە سنوور دەرچوو بێ، لە سەرپێچیی کردنی خوادا.

٥)- ﴿وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا﴾، ژیانی دنیاشی هەڵبژارد بێ، (الإِيثَار: تَفْضِيلُ شَيْءٍ عَلَى شَيْءٍ عِنْدَ عَدَم إمْكَان الجَمْع بَيْنَهُمَا)، (إيثَار): بریتیە لە هەڵبژاردنی شتێك بەسەر شتێکدا، کە نەگونجێ هەردووکیان پێکەوە کۆبکرێنەوە، ئنجا کەسێك ژیانی دنیای هەڵبژاردبێ بەسەر ژیانی ڕۆژی دواییدا، واتە: دنیای لە باوەش گرتبێ و دوارۆژی وەلا نابێ، ئەگەرنا وەك دوایی باسی دەکەین، ئەگەر کەسێك دنیاش بە ئەندازەی خۆی گرنگیی پێ بدات و، دوارۆژیش بە ئەندازەی خۆی گرنگیی پێ بدات، کارێکی ڕاست و ڕەوای کردووە و شەریعەت وا دەڵێ، شەریعەت نەهاتوە، بڵێ: واز لە دنیا بێنە، چونکە تۆ لە دنیا دای

و ناگونجێ وازی لێ بێنی و پشتی تێبکەی، بەڵام نابێ بیکەی بە ئامانج و، دەبێ تەنیا بە ئەندازەی ئەوەی دەیهێنێ گرنگیی پێ بدەی، هەروەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ دا هاتوە، دەفەرموێ: {وَلاَ تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا، وَلاَ مَبْلَغَ عِلْمِنَا}، (**أخرجه ابن المبارك في الزهد: ٤٣١، والترمذي: ٣٥٠٢، وقال: حسن غريب، والحاكم: ١٩٣٤، وقال: صحيح على شرط البخاري**)، واتە: خوایە! دنیا مەکە بە گەورەترین ئامانجمان، (گەورەترین شت کە خەفەتی لێ بخۆین و گرنگیی پێ بدەین )و، مەیکە بە ئەوپەڕی زانیارییمان [کە عیلم و عەقڵمان هەر هەتا سنووری ژیانی دنیا بڕبکات].

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: هـەر کەسێك یاخیـی بـوو بێ لـە بەرانبـەر خواداو، سـنووری بەزاندبێ لـە سـەرپێچیی کردنی خـواداو، ژیانـی دنیاشـی هەڵبژاردبێ:

٦)- ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە دۆزەخ سرەوتگایەتی، (**أل**)ی سەر (**مَأْوَى**)، لێرەش و لە دواییش دا کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾، لە هەردوو شوێنەکاندا (**أل**)ەکە بۆ ناساندنە، بەڵام ناساندنی (**عَهْد**)، واتە: سرەوتگایەکەی هی کەسێك لە خوا یاخیی بێ و دنیا هەڵبژێرێ، دۆزەخەو، کەسێکیش لە پێگەی بەرزی پەروەردگاری بترسێ و، خۆی لە گوناهان بگێڕێتەوە لە ئارەزووە ناشەرعییەکان، سرەوتگایەکەی بەهەشتە.

٧)- ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ ﴾، بەڵام کەسێك لە پێگەی پەروەردگاری بترسێ، (**مَقَام**)، لە ئەسڵدا (**مَكَانُ القِيَامِ**)، شوێنی لێ ڕاوەستان، دوایی بەکارهێنراوە بۆ خودی ئەو شتەی پاڵی دەدرێتە لا، واتە: بەهۆی مەزنگرتنی ئەو کەسەوە، کە لەوێ وەستاوە، شوێنەکە بە مەزن دەگیرێ، ئەمە وەك وشەی: (**جَنَاب**) و وشەی: (**كَنَف**)، دەگوترێ: جەنابی تۆ، (**جَنَاب**) بە مانای تەنیشت و (**كَنَف**) بە مانای پەنایە، بەڵام دوایی پاڵ دەدرێتە لای خودی ئەو کەسە.

کەواتــە: ﴿ مَقَامَ رَبِّهِۦ ﴾، واتــە: ١- پێگــەی بــەرزو بــێ وێنــەی پــەروەردگاری. ٢- ﴿ مَقَامَ رَبِّهِۦ ﴾، واتــە: (**قِيَامُـهُ أَمَـامَ رَبِّـهِ**)، ڕاوەســتانی لــە پێــش پــەروەردگاری،

چونکە (مَقَـام) وەك چـۆن بـە مانـای شـوێنی وەسـتان دێ، دوایـی بەکاردەهێـنرێ بـۆ خـودی ئـەو زاتـەی وەسـتاوە، بەهەمـان شـێوە بـە مانـای وەسـتان لـە بـەردەم پەروەردگاریشـی دا دێ، واتـە: هـەر کەسـێك ترسـی ئـەو حاڵەتـەی هەبـێ کـە لـە بـەردەم پەروەردگاریـدا:

ڕادەگیرێ بۆ پرسیارو وەڵام و، لێپرسراوانە سزاو پاداشت بۆ دیارییکران.

٨)- ﴿ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴾، نەفسیشی لە ئارەزووەکەی قەدەغە بکات، (**النَّفْس**) یش (**أَل**)کەی بۆ ناساندنە، بەڵام (**عِوَضٌ عَنِ المُضَافِ إِلَيْهِ**)، قەرەبووی پاڵوێدراو دەکاتەوە، یانی: (**وَنَهَى نَفْسَهُ**)، خۆی قەدەغە بکات، ﴿ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴾، لە ئارەزووان، (**الهَوَى**) کە (**أَل**)ی ناساندنی لەسەرە، بەدڵنیایی مەبەست پێی تێکڕا (**جنس**)ی (**هَوَى**) نیە، بەڵکو ناساندن (**تعريف**)ەکە بۆ (**عهد**)ە، یانی: ئارەزووە ناڕەوایەکە، ئنجا ئەگەر (**هَوَى**) مەبەست پێی کۆی ئارەزووەکان (**مُشْتَهَيَات**)بێ، سەرجەم ئەوشتانەی مرۆڤ ئارەزوویان دەکات، بێگومان تەنیا مەبەست پێی ئارەزووە ناڕەواو ناهەقەکانە، واتە: هەموو ئارەزووە ناشەرعیی و ناڕەوایەکان، ئەگەرنا وشەی: (**هَوَى**) وەك چۆن بۆ ئارەزووی نا شەرعیی و ناڕەوا بەکاردەهێنرێ، بۆ ئارەزووی ڕەواش بەکاردێ و، بێگومان مرۆڤ پابەند نەکراوە خۆی بگێڕێتەوە لە ئارەزووی ڕەوا، بۆ وێنە: خواردن و خواردنەوە، خەوتن و، بەرگ و پۆشاك و، جێگاو ڕێگاو، هاوسەرگیریی و، پارەو سامان، ئەوانە هەموویان ئارەزوو کراو (**مُشْتَهَيَات**)ن، بەڵام لە ڕێی شەرعییەوە و بە ئەندازەی پێویست، بەدڵنیایی نەك هەر لە مرۆڤ قەدەغە نیە بیانخوازێ و هەوڵی دەستەبەرکردنیان بدات، بەڵکو جاری وایە لەسەریشی پێویست دەبێ، چونکە ئەگەر وانەکات دەبێ چاوی لە دەستی ئەم و ئەو بێ، یاخود ژیانی دنیایی هەر بەڕێوە ناچێ، ئنجا کەسێك لە پێگەی بەرزی پەروەردگاری بترسێ، یاخود لە وەستانی خۆی لە بەردەم پەرەوەردگاریدا بترسێ و، خۆی لە ئارەزووە ناڕەواکان بیگێڕێتەوەو خۆی قەدەغە بکات:

٩)- ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾، ئەوە بە دڵنیایی بەهەشت سرەوتگایەتی، بەهەشت شوێنی حەوانەوەیەتی، وشەی: (**هَوَى**)، (**هَوَى يَهْوى هَوَاىً**) ئارەزووی کرد، ئارەزووی

دەکات، ئارەزوو کردن، (هَوَى) چاوگە، بەڵام بە مانای بەرکارە، وەك (خَلْق)، بە مانای دروست کردنە، بەڵام بۆ دروستکراو (مَخْلُوق) بەکاردێ، کەواتە: (هَوَى)، لە ئەسڵدا چاوگە، بەڵام بە مانای ئارەزوو بۆ کراوە، یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێ: **(وَالمَقْصُود بِالْهَوَى: مَا تَرْغَبُ فِيْه قِوَى النَّفْسِ الشَّهَوِيَة وَالغَضَبِيَّة مِمَّا يُخَالِفُ الحَّق وَالنَّفْعَ الكَامِل)**، مەبەست لە (هَوَى) ئەوەیە کە هێزە ئارەزوو خوازو هێزە تووڕەییەکانی نەفس، ئارەزووی دەکەن، لەوەدا کە پێچەوانەی هەق و سوودی تەواوە، واتە: پێچەوانەی بەرژەوەندیی تەواوە، کە بریتیە لە وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا ﷻ.

کەواتە: ئەم ئایەتە موبارەکانە، دوو هاوکێشەیان خستوونە ڕوو:

هاوکێشەی یەکەم: ﴿ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾ هەر کەس لە خوا یاخیی بێ و، لە سەرپێچیی خوادا سنوور ببەزێنێ و ژیانی دنیاش هەڵبژێری (ژیانی دنیا هەڵبژێرێ بەسەر ڕۆژی دواییدا)، ئەو دەرەنجامەی بۆ پەیدادەبێ: ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾، (جَحِيْم): کڵپە سەوزەکەی ئاگرە، ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ سرەوتگاو شوێنی حەوانەوەیەتی.

هاوکێشەی دووەم: ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴾، بەڵام هەر کەسێك لە پێگەی بەرزو بێ وێنەی پەروەردگاری ترسی هەبێ و خۆی لە ئارەزووەکان بگێڕێتەوە، ئەمە پێشەکی یەکەم و پێشەکی دووەم، دەرەنجامەکەی: ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾، بە دڵنیایی بەهەشت سرەوتگاو شوێنی حەوانەوەیەتی:

**(طُغْيَان + إِيْثَار الحَيَاة الدُّنْيَا = الجَحِيْم).**

**(خَوْف مَقَام الرَّبّ + نَهيُ النَّفس عَن الهَوى = الجَنَة).**

پێویستە ئەو ڕاستییە جارێکی دیکەش جەختی لەسەر بکەینەوە، کە لێرەدا خوا ﷻ نەیفەرمووە: ئەو کەسەی ژیانی دنیای خۆشدەوێ، یان ژیانی دنیا گرنگیی پێدەدا، بە ئەندازەی خۆی، بەڵکو دەفەرمووێ: ﴿ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾، ژیانی دنیای هەڵبژاردوە (هەڵیبژاردوە بەسەر ڕۆژی دواییدا)، ئنجا ئەو

هەڵبژاردنە مانای ئەوە نیە، کە گرنگیشی بە ڕۆژی دوایی داوە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە هەڵیبژاردوەو ئیکتیفای پێ کردوە، ئەگەرنا کەسێك لە ژیانی دنیادا تێپەڕێنێ، بەڵام بڕواشی بە ڕۆژی دوایی هەبێ، بەدڵنیایی ئەوە گوناهبارە، بەڵام جێگای دۆزەخ نیە، بەو واتایەی ئەهلی دۆزەخ بێ، بە یەکجارەکیی، چونکە لە ئایەتەکانی دیکەداو، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە مرۆڤ دەبێ بە ئەندازەی ئەوەی ژیانی دنیا دەیهێنێ و، ژیانی دنیا بە باشیی دەگوزەرێنی، گرنگیی و بایەخی پێ بدات و خەمی لێ بخوات، بەڵام گرنگ ئەوەیە تێنەپەڕێنێ و، نەیکاتە ئامانجی و، لەسەر حیسابی ڕۆژی دوایی نەبێ و، بە پێی بەرنامەی خواو لە ڕێیەکی شەرعییەوە بێ و بە ئامڕازەی شەرعییەوە بێ، ئەگەر وا بێ، ئەو کاتە ئەو کەسە هیچ گلەیی نایەتە سەر.

ئەوی دیکەش کە دەفەرموێ: ﴿وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ﴾، دەبێ بگوترێ: مەبەست ئارەزووە ناشەرعییەکان و ناهەقەکانن، یان دەبێ بگوترێ: ﴿وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ﴾، لە تێپەڕاندن لە داواکردنی ئارەزووەکاندا خۆی گێڕاوەتەوەو خۆی مەرزەم کردوە، ئەگەرنا وشەی (**هَوَى**) کە وەك چاوگەو بە مانای بەرکار (**مفعول بە**)ە، یانی: ئارەزووکراو، بێگومان ئەوەی مرۆڤ ئارەزووی دەکات، هەیە ڕەوایەو، هەیە ناڕەوایە.

بەکورتیی:

أ- یان دەبێ بگوترێ: لە ئەصڵدا مەبەست لە (**الهَوَى**) هەموو ئارەزووە ناڕەوایەکانن.

ب- یان دەبێ بگوترێ: (**الهَوى**)، (**أل**)کەی بۆ (**عَهْدَ**)ە، واتە: ئارەزووە ناشەرعییەکە.

کەواتە: مرۆڤ دەبێ خۆی لە ئارەزووە ناشەرعییەکان بپارێزێ، ئەگەرنا هەموو ئارەزوویەك، مرۆڤ پابەند (**ملزم**) نیە خۆی لێ بگێڕێتەوە، بەڵکو ئارەزووی خراپ و ڕێی خراپ، بۆ تێرکردنی ئارەزووان حەرامەو ناشەرعیە.

## بەرپەرچدانەوەی قسەیەکی (إبن عُثیمین)

لێرەدا بەر لەوەی ئەم مەسەلەیەی چوارەمە بە جێبهێڵین بە چاکم زانی، قوڵە باسێکی کورت لەسەر قسەیەکی **(إبن عثیمین)** ڕەحمەتی خوای لێ بێ و بەرپەرچدانەوەی بکەم:

**(إبن عثیمین)** کە یەکێک بوو لە زانایانی دیاری ئیسلام لە تەفسیرەکەی خۆی[1] **(تفسیر جزء عمَّ)**دا قسەیەك دەکات بە بۆچوونی من تێیدا نەیپێکاوە، بۆیە بە چاکم زانی ئەو هەڵەیەی ڕاست بکەینەوە، دەڵێ:

**(وَلِلإِنْسَانِ ثَلَاث نُفُوس: مُطْمَئِنَّة وَأَمَّارَةٌ وَلَوَّامَةٌ، أَمَّا المُطْمَئِنَّة فَفِي قَوْلِهِ تَعَالَى:** ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ٣٠﴾**الفجر، وَأَمَّا الأَمَّارَة فَفِي قَوْلِهِ تَعَالَى:** ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٣﴾ **يوسف، وَأَمَّا اللَّوَّامَة فَفِي قَوْلِهِ تَعَالَى:** ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢﴾**القيامة، وَالإِنْسَانُ يُحِسّ بِنَفْسِهِ بِهَذِهِ الأَنْفُسِ).**

ئەمە دەقی قسەکەیەتی.

واتە: مرۆڤ سێ جۆرە نەفسی هەن:

**١-** **(مُطْمَئِنَّة)**، ئارام گرتوو، ئۆقرە گرتوو، **(أَمَّارَة)**، زۆر فەرمانکەر بە خراپە، **(اللوّامَة)**، ڕەخنە لە خۆگر و، گلەیی لە خۆکەر،

**١-** هەرچی جۆری یەکەمی نەفسە، **(النَّفْسُ المُطْمَئِنَّة)**، ئارامگرتوو لە قسەی خوای بەرزدا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ٢٨

---

(١ ) تەفسیری بەشی (عم)، لاپەڕە (٥٣ -٥٤).

﴿فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ٣٠﴾، **الفجر**. واتە: ئەی نەفسی ئارامگرتوو (ئۆقرە گرتوو) بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، تۆش ڕازیی و، ئەویش لە تۆ ڕازییەو، بچۆ نێو بەهەشتەکەمەوەو بچۆ نێو بەندەکانمەوە.

٢- **(النَّفْس الأمَّارَة)** لە قسەی خوای بەرزدا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٣﴾، **یوسف**. واتە: خۆم دوور ناخەمەوە لە هەڵەو پەڵە، چونکە نەفس زۆر فەرمان بە خراپە دەکات، مەگەر ئەو حاڵەتە ی پەروەردگار بە بەزەیی بنوێنێ، بێگومان پەروەردگارم لێبوردەی بە بەزەییە.

٣- **(النَّفْس اللَّوَّامة)** لە قسەی خوای بەرزدا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢﴾، واتە: نەخێر (وانیە) سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت و، نەخێر (وانیە ئەی هاوبەش دانەرەکان!) سوێند دەخۆم بە نەفسی ڕەخنە لە خۆگر.

دوایی دەڵێ: **(وَالإنْسَان يُحِسّ بِنَفْسِه بِهَذِه الأنْفس)**، مرۆڤ لە خودی خۆیدا هەست دەکات بەو سێ جۆرە نەفسانە.

ڕەخنەکەی منیش ئەوەیە:

خوا ﷻ لە قورئانداو، پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە فەرمایشتەکانیدا باسی یەك نەفسیان کردوە، جارێ لە ئایەتەکاندا، خوا ﷻ بۆ هەموو مرۆڤێك باسی جەستەیەکی خاکیی و ڕووحێکی خوایی کردوە: ﴿فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٧٢﴾، کاتێك جەستەکەیم ڕێکخست و، لەو ڕووحەی تایبەتکراوی خۆمە، فووم بە بەردا کرد، بۆی بە کڕنووش دابکەون. هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ**}، **(أخرجه: مسلم: ٩٢٠)**، واتە: کاتێك ڕووح لە جەستە دەچێتە دەرێ، چاو شوێنی دەکەوێ... کە دیارە ڕووحی پێ دەگوترێ، وەك هەقیقەتی خۆی، کاتێك دەچێتە نێو جەستەش وشەی، نەفسی بۆ بەکاردێ، بەڵام هەر یەك شتن.

بەڕاستیی پێم سەیرە (**إبن العثیمین**) ڕەحمەتی خوای لێ بی، تووشی ئەو هەڵەیە بووە، وایزانیوە مرۆڤ سێ نەفسی هەن، نەخێر یەك نەفسی هەیەو، من لە کتێبەکانی خۆمدا بە تایبەت لە کتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خواچوون)دا، هەروەها لە کتێبی: (گیانی ژیان) و لە کتێبی: (خواپەرستیی و تەزکیە و تەقوا)، کە یەکێکە لە کتێبەکانی: (مەوسووعەی: بەرەو باشتر پێگەیشتن و پێگەیشتن)، لەو چوار کتێبانەداو لە شوێنی دیکەش دا باسم کردوە، کە خوا یەك نەفسی بە هەر کام لە مرۆڤەکان داوە:

**١-** ئەو نەفسەش لە ئەسڵدا ئەگەر مرۆڤ لێی گەڕێ، زۆر فەرمان دەکات بە خراپە (**أَمّارة بالسوء**) دەبێ.

**٢-** دوای ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا خەریك دەبێ، دەچێتە حاڵەتێکی میانجیی و زۆر فەرمان ناکات بە خراپە، بەڵکو جار جار خراپە دەکات و، خاوەنەکەی دەیگێڕێتەوە بۆ چاکە و، دەکەوێتە حاڵەتی (**اللَّوَّامَة**)، واتە: لەسەر خراپە ڕەخنە لە خۆی دەگرێ، بەڵام هی پێشێ هەر فەرمان بە خراپە دەکات.

**٣-** لە قۆناغێکی دیکەدا کە مرۆڤ زیاتر لەگەڵ خۆیدا خەریك دەبێ، دەچێتە قۆناغی (**مُطْمَئِنَّة**)و ئەو نەفسە ئارامدەگرێ لەسەر جادەی شەریعەت و، ئۆقرە گرتوو و داسەکناو دەبێ و بەملاولادا ناڕوا، تاوان ناکات و، شایستەی ئەوە دەبێ خوا بیدوێنێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾، ئەی نەفسی ئارام گرتوو، ئۆقرە گرتوو، لەسەر جادەی شەریعەت، کە هەڵبەزو دابەزت نەماوەو، لادان و تاوانت نەماوە!

لەم تەفسیرەدا عادەتم وایە: دوای ئەوەی تەماشای تەفسیرەکان دەکەم، وێڕای ئەوەی لە تەفسیرەکان بەهرەمەند دەبم، ئەگەر شتێکی دیاریکراوییش هەبێ و بە پێویستی بزانم، هی تەفسیرێك باسی دەکەم، بەڵام وێڕای بەهرە لێ وەرگرتنەکان و ئاماژە کردن بە تەفسیرەکان، ئەگەر تێبینیی و ڕەخنەو

سەرنجیشم هەبێ، لەسەر تەفسیری یەكێك لە زانایان، لە تەفسیركردنی ئایەتێك دا كە تێیدا، نەپێكابێ، هەر كەسێك بێ هەر لە (**الطبري**)یەوە بگرە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، بەڵكو لە پێش (**طبري**)یشدا، ئەگەر لە هاوەڵان و لە شوێنكەوتووانیشەوە شتێك هاتبێ كە عەقڵم نەیبڕێ، ئنجا چ ئەو قسەیە ئەو هاوەڵە كردبێتی، یاخود ئەو زانای تابیعینە گوتووبێتی، یاخود پێشەوایەكی دیكە گوتبێتی، هەروەها سەنەدەكەی ڕاست بێ، یان بە دەمی ئەوەوە گوترابێ، گرنگ ئەوەیە هەر شتێك بە پێوستی بزانم و پێم وابێ لە مانا لێكدانەوەی ئایەتەكەی خوای پەروەردگاردا نەپێكاوە، بە ئەركی شەرعیی سەرشانی خۆمی دەزانم، كە ئاماژەی پێ بكەم، وەك زانایان گوتوویانە: فلان زانایە لە لامان خۆشەویستە، بەڵام هەقمان لەو خۆشتر دەوێ.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوانەی لە بارەی هاتنی قیامەتەوە لێی دەپرسن، با بزانن ئەوە هیچ پەیوەست نیە بەوەوەو، تەنیا پەروەردگاری کۆتاییەکەی دەزانێ، موحەممەد ﷺ تەنیا ترساندنی ئەوانەی سامی لێدەکەن، ئەرکیەتی، کاتێکیش دێ پێیان وا دەبێ تەنیا ئێوارەیەك یان چێشتەنگاوێك لە ژیانی دنیادا ماونەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴾، لە بارەی (**ساعَة**)ەوە لێت دەپرسن: کەیە کاتی لەنگەر گرتنەکەی؟ وشەی: (**ساعَة**) وەك جارانی دیکەش باسمان کردوە، دەگونجێ مەبەست پێی ئاخیر زەمان بێ، کە لێرەدا وا پێدەچێ، واتە: تێکچوونی ئەم گەردوونە، چونکە بەدڵنیایی پێش ئەوەی قیامەت بێ، دەبێ ئاخیر زەمان بێ، ئنجا دوایی قیامەت دێ، بۆیە یەکێك لە بێبڕوایان دەپرسێ: ئەو ئاخیر زەمانەی تۆ دەیڵێی کە ئەم دنیایە کۆتایی دێ کەی دێ؟ هەرچەندە وشەی: (**سَّاعَة**) لە قورئاندا جاری وایە بۆ کۆی ڕۆژی دوایی بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەتیشەوە بەکارهاتوە، بەڵام بە پێی سیاق مانایەکەی دیاریی دەکرێ، لە بارەی (**ساعَة**)ەوە، یانی: ئەو کاتە دیارییکراوەی دنیای تێدا کۆتا دێ، یاخود: لە بارەی ئەو کاتەوەی کە ڕۆژی دوایی تێدا دێ، لێت دەپرسن: لەنگەرگرتنەکەی کەیە؟ ﴿ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴾، (**أَيَّانَ**) وەك پێشتریش گوتوومانە: (**إِسْمُ يُسْتَفْهَم بِه عَن تَعيينِ الوَقْت**)، لە ئەسڵدا ﴿ أَيَّانَ ﴾، بریتیە لە: (**أَيُّ آنٍ**)، چ کاتێك، ناوێکە پرسیاری پێ دەکرێ، لە بارەی دیارییکردنی کاتێکەوە بۆ شتێك، ﴿ مُرْسَىٰهَا ﴾، («**مُرْساها**»

مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ لِفِعْلِ أَرْسى، والإِرْساءُ: جَعْلُ السَّفِينَةِ عِنْدَ الشّاطِئِ لِقَصْدِ النُّزُولِ مِنها، تَشْبِيهًا لِلسَّاعَةِ بِالسَّفِيْنَةِ الجَارِيَةِ)، ﴿ مُرْسَىٰهَا ﴾، وشەی: (مُرْسَى)، چاوگێکی میمییە، لە (أَرْسى)وە هاتوە، (أَرْسى)، واتە: چەسپاندی (مُرْسَى)، واتە: چەسپاندن (إِرْساء) بە کوردیی دەڵێین: لەنگەر پێگرتن، بریتیە لەوەی کەشتی لە لای کەناری دەریا، لەنگەری پی بگیرێ تاکو ئەوانەی سواریی بوون، سەرنشینەکانی دابەزن، لێرەدا خوا ڕۆژی دوایی چواندوە بە کەشتییەکەوە کە بەسەر دەریادا دەڕوات، دوایی لە کەناری دەریا لەنگەر دەگرێ.

ئەم ژیانە دنیاییەش دەڕوا دەڕوا دەڕواو کاتێك دێ، کۆتایی دێ، وەك چۆن کەشتییەکە لەنگەر دەگرێ لە کەناری دەریاو، دەبێ سەرنشینەکانی دابەزن، ئەم ژیانە دنیاییەش کاتێ دێ، کۆتایی دێ، هەموو ئەوانەی لەسەر زەویین ئەوانەی لەو کاتەدا خاوەنی ژیان دەبن، هەموویان کۆتاییان پێ دێ، ئنجا کە لێی دەپرسن، ئایا ئەو پرسینە پرسیارکردنی ڕاستەقینە بووە، کە بزانن کەنگێیە؟ دەگونجێ، بەڵام زیاتر وا پێ دەچێ مەبەست پێی پرسیاری لێکردنی نکووڵیلێکردن و گاڵتە پێکردن بووبێ، ئەوە لەو بێبڕوایانە دەوەشێتەوە، خوا دەفەرموێ:

٢)- ﴿ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴾، تۆ چ پەیوەندییەکت بە باس و خواسی (کاتەکە)وە هەیە؟! ﴿ فِيمَ أَنتَ ﴾، («فِيمَ» اسْمُ اسْتِفْهامٍ بِمَعْنى: أَيُّ شَيْءٍ ؟ مُسْتَعْمَلَةٌ فِي التَّعْجِيبِ مِن سُؤالِ السَّائِلِينَ عَنْها ثُمَّ تَوْبِيخِهِمْ)، وشەی: (فِيمَ أَنْتَ)، ناوی پرسیارکردنە بە مانای (أَيُّ: شَيْءٍ)، چ شتێك، بەڵام لێرەدا بەکارهێنراوە بۆ سەرسوڕماندن لە پرسیارکردنی پرسیارکەرەکان، پاشان سەرزەنشتیکردنیان، واتە: تۆ چ پەیوەندییت بە باس و خواسی هاتنی (ساعَة)ەوە هەیە، کاتەکە (سَّاعَة)ش، ئاخیر زەمانە، یاخود ڕۆژی دواییە.

٣)- ﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴾، کۆتاییەکەی بەرەو لای پەروەردگارتە، ﴿ مُنتَهَىٰهَآ ﴾، (المُنْتَهى: أَصْلُهُ مَكانُ انْتِهاءِ السَّيْرِ، ثُمَّ أُطْلِقَ عَلى المَصِيرِ)، لە ئەسڵدا (مُنْتَهى) ناوی شوێنە، شوێنی کۆتایی هاتنی ڕۆیشتن، بەڵام بە مانای سەرەنجام بەکارهاتوە، واتە: سەرەنجامەکەی بەرەو لای پەروەردگارتە، کە بەدڵنیایی لێرەدا مەبەست ئەوەیە: زانیاریی سەرەنجامەکەی و، زانیاریی هاتنی کاتی کۆتاییەکەی بۆ لای پەروەردگارتە.

٤)- ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخۡشَىٰهَا﴾، تۆ تەنیا ترسێنەرو وریاکەرەوەی ئەو کەسەی سام و هەیبەتی هەیە بەرانبەری بەرانبەر بە ئاخیرزەمان (سَّاعَة)، بەرانبەر بە ڕۆژی دوایی، یان بەرانبەر بە قیامەت.

وەك چـۆن وشـەی: ﴿مُنذِرُ مَن يَخۡشَىٰهَا﴾، هاتـوە، دیسـان: (مُنْـذِرٌ مَـنْ يَخْشَـاهَا) ش، خوێندراوەتـەوە، واتـە: بـە تەنوینیـش.

٥)- ﴿كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَهَا لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾، ئەوانەی پرسیار دەکەن کاتێك ئەو (کارەسات)ە دەبینن، ﴿لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾، وەك ئەوە وان کە تەنیا ئێوارەیەك، یاخود چێشتەنگاوێك مابنەوە،﴿عَشِيَّةً﴾: ئەو کاتەیە کە لادانی خۆر لە نیوەڕاستی ئاسمانەوە دەست پێدەکات، تاکو ئاوابوونی.

(ضحـى) بریتیـە لـەو کاتـەی لـە هەڵهاتنـی خـۆرەوە دەسـت پێـدەکات، تاکـو خـۆر دەگاتـە نیوەڕاسـتی ئاسـمان، بـە کوردیـی بـە (ضحـى) دەڵێـن: چێشـتەنگاو، بـە (عشـية)ش دەڵێـن: ئێـوارە، بـەڵام بـە پێـی بـاو (عـرف) زۆر کـەس (ئێـوارە) تەنیـا بەسـەروحەدی شـێوان دەڵێـن و، چێشـتەنگاویش بـەو کاتـە دەڵێـن کـە ڕۆژ ئەندازەیـەك بـەرز دەبێتـەوە.

یەکێـك بـە یەکێـك دەڵـێ: (أَتَيْتُـكَ غَـدَاةً أو عَشِـيَّتَهَا) واتـە: بەیانیـی هاتمـەلات یـان ئێوارەکـەی، لێـرەش: (أو ضُحَاهَـا)، ڕانـاوی (هَـا) گێڕراوەتـەوە بـۆ (عَشِـيَة) لەبـەر ئـەوەی هەردووکیـان پێکـەوە پەیوەسـتن، هەردووکیـان لـە یـەك ڕۆژدان، یەکیـان کۆتاییەکەیەتـی و، ئـەوی دیکەشـیان سـەرەتایەکەیەتی، ﴿عَشِيَّةً﴾، واتـە: (مَسَـاء)، ئێـوارە ﴿ضُحَىٰهَا﴾، واتـە: (صَبَـاح)، بەیانیـی ئنجـا لەبـەر ئـەوەی هەردووکیـان هـی یـەك ڕۆژن، بۆیـە (ضحـى) پاڵدراوەتـە لای (عَشِـيَة).

کـە دەفەرمـوێ: ﴿عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾، (أو) یـان، بـۆ سەرپشـککردنە لـە وێکچوانـدن دا، واتـە: بـە خەیاڵـی ئـەوان وایـە، تـۆ سەرپشـکی و ئـەوان وا بیـر دەکەنـەوە، کـە لـە

ژیانـی دنیـادا یـان ئێوارەیـەك مابوونـەوە، یاخـود چێشـتەنگاوێك مابوونـەوە، كۆتایـی تەفسـیری ئـەم سـوورەتەش بـەم دوو فەرمایشـتەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ:

**١-{قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ وَمَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟ قَالَ مَا أَعْدَدْتُ لَهَا إِلَّا أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، قَالَ: الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ} (أخرجه البخاري: ٦١٦٧، ومسلم: ٢٦٣٩).**

واتـە: پیاوێـك بـە پێغەمبەرخـوای گـوت، ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ (ساعة) كەنگێ دێ؟ (واتـە: ئاخیـر زەمـان، یاخـود ڕۆژی دوایـی) ئەویـش پێـی فەرمـوو: چیـت بـۆ ئامـادە كـردوە؟ گوتـی: جگەلـە خۆشویسـتنی خـواو پێغەمبەرەكـەی هیچـم بـۆ ئامادە نەكـردوە، ئەویـش ﷺ فەرمـووی: مـرۆڤ لەگـەڵ ئـەو كەسـە دایـە كـە خۆشیویسـتوە.

یـانی: مـادام پێغەمبـەری خـوات خۆشویسـتوە، لـە ڕۆژی دواییـش دا لـە خزمـەت پێغەمبــەر دای ﷺ.

**٢- {مَنْ أَحَبَّ لَقَاءَ اللهِ أَحَبَّ اللهُ لَقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ الله كَرِهَ الله لِقَاءَهُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَكْرَهُ الْمَوْتَ! فقَالَ: ليسَ ذاكِ، ولَكِنَّ المُؤْمِنَ إذا حَضَرَهُ المَوْتُ، بُشِّرَ بِرِضْوانِ اللَّهِ وكَرامَتِهِ، فليسَ شَيءٌ أحَبَّ إلَيْهِ ممَّا أمامَهُ، فَأَحَبَّ لِقاءَ اللَّهِ، وأَحَبَّ اللَّهُ لِقاءَهُ}، (أخرجه البخاري: ٦٥٠٧).**

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: هـەر كەسـێك دیـداری خـوای حـەز لـێ بـێ، خـواش حـەز بـە دیـداری دەكات و، هـەر كەسـێ پێـی خـۆش نەبـێ بـە دیـداری خـوا بـگات، خـواش حـەز بـە چـارەو دیـداری نـاكات، عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گوتـی: ئـەی پێغەمبـەر خـوا ﷺ! هەموومـان ڕقـمان لـە مردنـە (كەیفـمان بـە مـردن نایـەت) فەرمـووی: مەبەسـت ئـەوە نیـە، بەڵكـو بـڕوادار كاتێـك دەچێتـە حاڵەتـی سـەرە مەرگـەوە، مـوژدەی پـێ دەدرێ بـە ڕەزامەندیـی خـواو ڕێـز لێگرتنـی خـوا بـۆی، ئنجا هیـچ شـتێك لـە لای خۆشەویسـتتر نابـێ لـەوەی بگاتـە ئـەوەی لـە پێشـیەیێ و حـەز بـە دیـداری خـوا دەكات، بۆیـە خـواش لـەو كاتـەدا حـەز بـە دیـداری دەكات، (مەبەسـت پێـی ئەوەیـە).

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ کـە سـەرەنجام خێـر دەبـن و بـە شـێوەیەك بژیـن و ژیانـە دنیاییەکەمـان وا بگوزەرێنیـن، کـە کۆتاییەکـەی وابـێ هـەر کاتێـك مردنمـان گەیشـتە سـەر، حـەز بکەیـن زوو بـە خزمـەت خـوای پـەروەردگارو بـە دیـداری خـوا شـاد بیـن و، بـە دیـداری پێغەمبـەری خـوا ﷺ شـاد بیـن، پێشـێ لـە قۆناغـی بـەرزەخ داو، پاشـانیش لـە قۆناغـی ڕۆژی دوایـی و قیامەتـدا، هەڵبەتـە ژیانـی پـاك و چـاك و بـە پێـی شـەریعەت بەڕێوەبردنیـشی، بێگومـان سـەرەنجامەکەی خێـرە، چونکـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: هـەر کەسـە لەسـەر چـی بـژی لەسـەر ئـەوەش دەمـرێ و، لەسـەر چیـش بمـرێ لەسـەر ئـەوە زینـدوو دەکرێتـەوە[1]، لێرەشـدا کۆتایـی بـە تەفسـیرکردنی کـۆی سـوورەتی **(النازعـات)** دێنیـن.



(١) {يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ} أخرجه عبد بن حميد: ١٠١٣، ومسلم: ٢٨٧٨، وابن حبان: ٧٣١٩، والحاكم: ٣٦٨٨.

# نێوەڕۆک